## ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە




ناونیشان : کەشتیی فریشتەکان «کتێبی دووەم»

بابەت : ڕۆمان

نوسەر : بەختیار عەلی

ژمارەی چاپ: یەکەم

تیراژ: 10000

نرخ: 15000

ژمارەی سپاردن : 1396

بەرگ: ئارام عەلی

ساڵی چاپ: 2013

چاپخانە: کارۆ

دابەشکردنی : ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

## چیرۆکی ئەزمێرا و نامەکان

سەعات دەی بەیانی بوو کە سەلام باباجان کارمەندی دێرینی ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەن، بەرپرسی بەشی وەرزش، ماشێنەکەی کە ئۆپڵێکی مۆدێل کۆن بوو وەستان و بە کاوەخۆیەکی زۆر بەرەو حەوشی پێشەوەی بینای ڕۆژنامەکە هەنگاوی نا. ماوەیەکی زۆر نەبوو بنکەی عەزیزم وەتەن هاتبووە ئەم کوچەیەوە، جێگایەک بوو لە سەنتەری شاردا. شەفیق هروری «سەرنوسەر» هەر ئەو بینایەی بینی بە باشترین جێگای دونیای لە قەڵەمدا، جێگایەک بوو نە دوور بوو لە خەڵک نە زۆریش نزیک، بەشی خۆی لە دەزگا دەوڵەتییەکانەوە نزیک بوو، نزیکییەکی ئارامبەخش، بیناکە ڕوکار و سیمایەکی هەبوو، دڵنیاییەکی قووڵی بە بەرپرسانی دەوڵەت دەبەخشی، تا ترسیان دەرهەق بە ڕۆژنامەکە هێور بێتەوە و وەک شتێکی نامۆ و زیاندار سەیری نەکەن، دڵنیایی کەسانێک دەزانن دوژمنە نەگریسەکەیان ئارام وا لەبەرچاویاندا و جڵەوی وا لە بندەستیاندا. بەڵام جێگاکە توانای بە ڕۆژنامەنوسانیش دەدا زوو بگەنە هەرجێگایەک و هەر بەرپرسێک بیانەوێت. سەنتەری شار هەمیشە جێگایەکی بێلایەنە، جێگایەکە هی کەس نییە، خەڵکی وادەزانن موڵکی ئەوانە و دەوڵەتیش ئەو وەهمە پەروەردە دەکات کە ئەم ناوەڕاستە مەلعونە کە هەردەم بە جۆرێکی بێمانا دەبێتە سەمبولی هەموو شارێک، موڵکی ئەوە. بەڵام لە جەوهەردا سەنتەری شار دەکرێت ماڵی گشتی هەمووان بێت، هەتا موڵکی ئەو غەریبانەش بێت کە دێن و بۆ ماوەیەک لێرەدا دەمێننەوە. ڕۆژنامەکە لەو جێگا ناوازەیەدا، هەستی بەو ئارامییە دەکرد کە لە مێژبوو سەرنوسەر بەدوایدا دەگەڕا. گەرچی ڕۆژنامەکە سەرەتا وەک ئۆرگانێکی بێلایەن دەستی پێکردبوو، بەڵام هێدی هێدی بە جۆرێکی بەرچاو هەڵوێستێکی

ناڕەزایی و تورەی دەرهەق بە سەرجەم کێشەکانی وڵاتەکە لەخۆگرتبوو، بووبوو بە جێگای نوسەرە ناڕازیی و نەیارەکان. هەتا زۆر لە بەرپرسانی حیزب و دەوڵەت وەک هێزێکی ئانارشی و ئاژاوەباز ناویاندەنا. ئێستا بوونی لە سەنتەردا ئەو دڵنیایەی پێدەبەخشی کە بەوجۆرەش لە دەرەوەی سیستم نییە و بووە بە بەشێکی قەبووڵکراوی ئەم دونیایەی ئەمڕۆ. هەر شتێک لە سەنتەری شاردا جێبگرێت واتە بە شارەکە نامۆ نییە و بۆتە پارچەیەک لە جەستەی ئاشکرای ئەو جێگایە، لە داهاتووشدا لەوانەیە ببێت بە بەشێک لە یادەوەری و بە سەمبولێک لە سەمبولەکانی فەرهەنگ و تێفکرین لەم شوێنەدا. شەفیق هروری کە یەکەمجار ئەم بینایەی لێرەدا بینی و لەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا لەسەر کرێکەی کەوتە گفتوگۆ، هەستێکی خۆشی هەبوو، گەر بنکەی ڕۆژنامەکە بێتە ئێرە، بە جۆرێکی سەمبولیش بێت دەبێتە نیشانەی ئەوەی کە تا ئەندازەیەک هەم ئەو و هەم نوسەرانی دیکەی هاوڕێی قەبووڵکراون، چوونەتە ناو ڕەوتی شتە ئاساییەکانەوە، خۆیان چەسپاندوە و هێزێکی ڕاکێشانی ناو سیستم هەیە بەرەو خۆی کێشیاندەکات. عەزیزم وەتەن وەک تاکە ڕۆژنامەی ئەهلی، لە دە ساڵی ڕابوردوودا لە هەموو لایەکەوە لە ژێر گوشاردا بوو، بەڵام ئێستا شەفیق هروری هەستیدەکرد، هێدی هێدی فێربووە دەکرێت چ هێڵێک ببەزێنێت و چی نەبەزێنێت. گەرچی ڕۆژانە بۆ بە دواداچوونی شکاتە زۆرەکانی سەر ڕۆژنامەکە بە ڕێگای پۆلیسخانە و دادگاوە بوو، بەڵام هەستێکی ناوەکی سەیری هەبوو کە ئەو ڕۆژگارە تەڵخ و تاریکانە تێپەڕیون و ئێستا خۆی و ڕۆژنامەکە بوون بە دوو نیشانەی دیاری ناو ژیانی سیاسی و کولتووری شارەکە، سیفەتە ناوازە و سیحرییەکەی جارانیان لە دەستداوە، کە خۆی بە سیحری شتە غەریبەکان ناویدەنا، بەڵام بەرامبەر بەو لە دەستدانە، هێمنی و قەبووڵ و شتێک لە شانازیی و ئاسوودەگیان بردۆتەوە.

سەلام باباجان، بەچاوێکی خەواڵووەوە سەیری تابلۆی ڕۆژنامەکەی کرد کە بە گەورەیی بەسەر بیناکەدا هەڵواسرابوو «عەزیزم وەتەن ــ ماڵی ڕاستەقینەی حەقیقەت» ... هەموو ڕۆژێک بەر لەوەی پێبخاتە ناو بیرۆی

سەرەکییەوە، سەیرێکی ئەو تابلۆیەی دەکرد، هەر کاتێکیش کە دەیبینی ڕوناکی خۆرەکە وەها بەرەو ڕووی بوو، هەستی بە سووتانەوەی چاو و کەمێک لە نیوەکوێری دەکرد. وەک کەسێکی بەرپرس لە هەواڵی وەرزش، مەسەلەی حەقیقەت و ناحەقیقەتی زۆر بۆ گرنگ نەبوو ... لە دڵی خۆیدا گووتی «بەشی وەرزش لە هەموو ڕۆژنامەکاندا یەک شتە، هیچ شتێک وەک بەشی وەرزش و هەواڵی وەرزش لە شارێکی وەهادا بێمانا نییە، کە دانیشتوانی جگە لە خواردن و خەو بیر لە هیچ ناکەنەوە». سەلام باباجان لە چەند ساڵی ئیشکردنیدا وەک ڕۆژنامەنوسێکی وەرزشی، سەرنجیدابوو کە هەواڵی وەرزش و خولیای دەنگوباسی وەرزشی هێندەی خەڵکیان تەپۆکردوە، هێندەی وای لێکردون مانگانە سەدان سەعات لەبەردەم تەلەفزیۆنەکانیاندا قوون داژەنن و بەدەم خواردنی چەرەس و چپس و پاقلاوە و ساردییەوە خۆیان سەرگەرمبکەن، کارێکی دیکەی نەکردوە. لە بەر خۆیەوە گووتی، بووە بە تلیاک، تلیاکی تازەی خەڵک، کاتێک دەیانەوێت هیچ نەکەن و وادەربکەون سەرگەرمن و شتێک دەکەن. لە ناخەوە تورەییەک دایگرت، ڕۆژ دوای ڕۆژ ئیشەکەی خۆی وەک بێماناترین و مردووترین ئیشی ناو ڕۆژنامەکە دەهاتە بەرچاو. دڵنیابوو جگە لە هەندێ خەڵکی هەرزە و نەفام، کەس سەیری ئەم لاپەڕانە ناکات، ساڵانێک بوو دەیزانی خەڵکی جگە لە مانشێتە گەورەکان پارە بە هیچی تر نادەن، دەشیزانی وەک ڕۆژنامەنوس هەرگیز نەیتوانیوە هەواڵێکی وەرزشی گرنگ یاخود نوێ یان سەرنجڕاکێش بڵاوبکاتەوە تا کارەکەی خۆش و سەرنجڕاکێشبکات. هەموو ژمارەیەک لەسەدا حەفتای لاپەڕە وەرزشییەکانی بە وێنەی گەورەی یاریکەرە ناسراوەکان پڕدەکردەوە. گەرچی ئیشەکەی ئەو کارێکی بە سیاسەتەوە نەبوو. بەڵام لە بەر هۆیەکی نادیار، ئیشکردن لەم ڕۆژنامەیەدا گێنگڵ و ترس و دوودڵییەکی قووڵی تێدا دروستدەکرد. زۆربەی ستافی ڕۆژنامەکە بە جۆرێکی شەڕانگێزانە دژی ئەم دەسەڵاتە بوون کە هێدی هێدی تا دەهات داندارتر و قەپگرتر دەردەکەوت. دەوڵەت سەردەمانێک ڕێگای بە ڕۆژنامەکە دابوو تا وەک جۆرە حوکمڕانێکی دیموکراس دەربکەوێت، ویستبووی لە ڕێگای گۆڤاری

بوهاران و هەفتەنامەی عەزیزم وەتەنەوە بۆ ئەمریکی و ئەورووپییەکانی بسەلمێنێت کە لە دەوڵەتە ترسناک و تۆقێنەرەکەی سەدام حوسەین جیاوازە، بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی مانگ و ساڵەکاندا بڵاوکراوە ئازادەکان بوو بوونە گرێیەکی کوشندە بۆیان، بوو بوونە چقڵێک هەر شتێکیان دەنوسی لە گەروی حاکمان دەچەقی. ئێستا ئیشکردن لە ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەندا، بۆ هەر کەس جۆرێک لە هەیبەت و پرستیشی دروستدەکرد، کەسانێکی دی کە لە ڕاگەیاندنی حیزبی و دەوڵەتیدا کارابوون، هەروا ئاسان و یەکسەرە چەشنە ڕێز و هەیبەتی وایان دەست نەدەکەوت. سەلام باباجان لەگەڵ ئەوەشدا ڕقی لە کاری ئەم ڕۆژنامەیە بوو، هەموو شتێک لەوێ بۆنی نیفاق، دووڕوویی، ڕکابەری نامەردانەی لێدەهات. ئەو بە ڕیزێک هەنگاوی خاو بەرەو ناو ڕۆژنامەکە ڕۆیشت، سەیری لێهات بەو بەیانییە زووە ژنێکی ئەسمەری ئەفریقایی لە بەردەم دەرگای ڕۆژنامەکەدا ببینێت. ماوەیەک بوو هەمیشە یەکەم کەس دەگەیشتە بیرۆکانی عەزیزم وەتەن، شتێک لە بێزاری لە ژیان بەیانیان زوو لە خەوی هەڵدەستاند و بەرەو ڕۆژنامەکە هەڵیدەگرت، دەیویست زووتر بگات بۆ ئەوەی کەمترین خەڵک ببینێت ... بەڵام زۆر بەیانی خەڵکانی زوڵملێکراو و بێکەس و هەژاری دەبینی، کە بۆ شکایەت لە زوڵمێک دەهاتنە بەر دەرگای نوسینگەی سەرەکی، وەک ئەوەی ئەم ڕۆژنامەیە دواهەمین ئومێدیان بێت. بەڵام ساڵ دوای ساڵ سەرنجی ئەوەی دابوو، ڕۆژنامەکە بەدەگمەن قسە و سکاڵای ئەو خەڵکە هەژارانە بڵاودەکاتەوە. وەک شەفیق هروری دەیگووت «ڕۆژنامەکە سیاسەتی خۆی هەیە». سەلام بە وردی نەیدەزانی ئەو سیاسەتە چییە، زۆرجاریش کە لە کۆبۆنەوەی هەیئەتی باڵای ڕۆژنامەکەدا دادەنیشت هەوڵیدەدا لەو سیاسەتە تێبگات کە ڕۆژنامەکە دەیگرێتەبەر، بەڵام هیچ کات تێنەدەگەیشت ... سیاسەتێکی ئاڵۆز، سیاسەتێکی پڕ پێچ و پەنا، کە تێگەیشتنی بۆ کەسێکی وەک سەلام باباجان ئەستەم بوو. تا، تائەوکات ڕێکەوتی نەکردبوو، لە بەیانییەکی زوودا ژنێکی ئەفریقایی لە بەردەم بیرۆی ڕۆژنامەکەدا ببینێت. وەک زۆربەی پیاوانی شار، ژنی ڕەشپێستی پێ جوان نەبوو، سەیری لێدەهات کە دەیبیست ئەورووپییەکان

نرخێکی بەرز لەسەر جوانی ئەم چەشنە ژنانە دادەنێن، بەڵام ئێستا کە ئەم خانمەی دەبینی، بۆ یەکەمجار هەستێکی تەماوی دایدەگرت، کە بۆچوونەکانی دەربارەی جوانی ڕەگەزی ڕەش هەڵەیەکی گەورەن. «هەموو مەخلوقێک جوانی خۆی هەیە، هەتا سەگیش»، لە قووڵایی دڵیدا وایگووت و پاش ئێستێکی کەم شەرمێکی قووڵ لە قسەکەی خۆی دایگرت، خەجاڵەتی ئینسانێک دەزانێت نابێت هیچ مرۆڤێک بە سەگ بشوبهێنێت. وەک بیەوێت بەسەر ئەو هەڵە کوشندەیەی خۆیدا زاڵ بێت و بیسڕێتەوە بەخۆی گووت «ئەفریقییەکان هەم جوانترین و هەم بەهێزترین مەخلوقاتی خودان. گەر ئەو هێزەی بەدەست ئەوروپییەکانەوەیە بکەوتبایەتە دەستی ئەفریقییەکان لەوانەبوو دونیا باشتر بێت ... هیچ جنسێک وەک ئەو ئەوروپییە سورفلانە قەتڵ و عامی نەکردوە. بەڵام کێ چوزانێت؟». گەرچی زۆر خەواڵوو بوو، گەرچی هەستیدەکرد خەو کووتاوێتی و تەمبەڵی و نەجوڵانی زۆر دایانهێزراندوە، بەڵام چاوانی هێشتا بەشی ئەوە وریایان تێدا بوو، جوانی ئەم ژنە ببینێت، کە بەویقار و هێز و مل بەرزییەکەوە دانیشتبوو. هیچ کات شتی وای لە ژنی ئەم شارە نەبینیبوو، شتێک لە فەخر و لەخۆدڵنیایی کە تەنیا لە ڕۆیشتن و دانیشتندا دەردەکەوێت، ژنانی شارەکە هەتا جوانترین و بەویقارترین و دڕترینیشیان شتێک لە تێکشکان لە ڕۆیشتن و دانیشتنیاندا بوو، بەدەگمەن ژنێکی بدیبایە شانازی و ڕەزامەندی لە هەنگاویدا بێت. ژنە ئەفریقاییەکە بە کوردییەکی شکاو خۆی پێناساند و گووتی «من ئەزمێرام، دەمەوێت مامۆستا شەفیق هروری ببینم». سەلام باباجان بە ئەسپایی دەرگای سەرەکی کردەوە و دەرگای دووەمی دالانێکی بچوکیشی واڵاکرد و بەرەو ژووری میوانەکانی ڕۆژنامەکە پێش ئەزمێرا کەوت و تکای لێکرد دانیشێت تا سەرنوسەر دەگات. گووتی «هەرئیشی دادگای نەبێت، زوو دێت». سەلام بە غەمگینییەوە پرسیاری لە هۆی سەردانەکەی خانم کرد و ئەو تێیگەیاند، هۆکەی نهێنییە و تا خودی سەرنوسەر نەبینێت ناتوانێت هیچ بڵێت. سەلام وایدانا یەکێک بێت لەو ژنە خزمەتچییانەی لە ماڵە بەرپرسەکاندا کاردەکەن و بەردەوام سووکایەتیان پێدەکرێت، ئینجا بە

چەند هەنگاوێکی تەمبەڵانە بەرەو لای چێشتخانەکە چوو. چێشتخانەکەی عەزیزم وەتەن، ژوورێکی چڵکن و بچکۆلە و پیس بوو بە تەباخێکی گازی کۆن و بوتڵێکی ژەنگاوی و هەوایەکی بەشەر خنکێنەوە. لە کاتێکدا خەریکی ئەوەبوو کەمێک ئاو بۆ چاییەکی خێرا دەمبکات، بیری لەوە کردەوە کە ئەو لە مێژە ڕۆژنامەکە بەتەواوی ناخوێنێتەوە، لە مێژە تەنیا مانشێتە گەورەکان دەبینێت و هیچ کات دانابەزێت بزانێت لە ناوەوە، لە نابەینی دێڕەکاندا چ باسە. هەستیکرد بەشی هەرە زۆری خەڵکیش هەر وادەکەن، هەستیکرد ڕۆژنامەکە بەو تیراژە کەمە، بەو جۆرە خوێنەر و خوێندنەوەیەوە، بێماناترین کارێکە کە دەشێت بکرێت. سەلام ئەو حاڵەتەی وەک بەشێک لەو نەخوێندەوارییە گشتییە تەماشاکرد کە هێدی هێدی بڵاودەبێتەوە. ئەو لە دڵی خۆیدا ناوی دەنا تاعوون. زیاد لە دوو ساڵ بوو هەستیدەکرد تووشی ئەو تاعوونە بووە، تاعوونی ئەوەی مرۆڤەکان هیچ ناخوێننەوە، هەموو ئەو کتێب و ڕۆژنامانەی دەردەچن هیچ نین جگە لە درۆی گەورە، نە هیچ شتێکی ڕاستەقینە دەنوسرێت و نە هیچ شتێکی ڕاستەقینە دەخوێنرێتەوە... ئەو دڵنیابوو ئەوە تاعوونە، دڵنیابوو کتێب و ڕۆژنامەکان بۆیە دەردەچن، تا ئەو تاعوونە بشارنەوە، تا وادەربیخەن کە تاعوونی وا لە گۆڕێ نییە، کتێبخانەکان بۆیە دەکرێنەوە تا هەمووان بۆ خۆیانی بسەلمێنن کە تووشی ئەو تاعوونە نەبوون، کتێبەکان بۆیە دەفرۆشرێن تاخەڵکی لە بەر چاوی خۆیان و بە بەڵگەوە بیسەلمێنن سەلامەتن، هەندێک کتێبەکان بۆیە دەخوێننەوە تا نەچنە ژێر باری ئەو نەخۆشییەوە کە ئەو دەیبینێت، تاعوون... تاعوون. سەلام دڵنیابوو کە هەموو کارمەندان و پەیامنێران و ڕۆژنامەوانانی عەزیزم وەتەن تووشی ئەو تاعوونە بوون، هەتا هەندێک لە نوسەرە گەورەکانی ڕۆژنامەکەش ئەو دەردەیان گرتووە... ساڵانێک بەر لەوەی ببێت بە بەرپرسی لاپەڕەی وەرزش، خولیایەکی گەورەی بۆ ئەدەبیات هەبوو، دەیویست لەو بوارەدا شتێک بە شتێک بکات، بەڵام هەر چەند کتێبێکی ڕەخنەیی یان ڕۆمانێکی ئەستووری دەگرت بە دەستییەوە، دەیزانی کاری وا چەند سەختە. هێدی هێدی سەرنجی ئەوەیدا کە خوێندنەوەکانی تا بێت بێزۆحتر و بێگیانتر

دەبن، کەمتر تێدەگات نوسەران دەڵێن چی، کەمتر دەتوانێت لە قووڵایی ناوەڕۆکەکان تێبگات، کەمتر دەتوانێت ڕستەکان و بەشەکان و پارچەکان پێکەوە گرێبداتەوە، بەڵام جورئەتی نەبوو دان بەوەدا بنێت. زۆر بە وردی وەک مشکێکی زیرەک سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد و دەیزانی هەمووان بە دەست هەمان دەردەوە دەناڵێنن. کەس هیچی ڕاستەقینە ناخوێنێتەوە، ئەوەشی دەخوێنێتەوە پێناچێت هیچی لاجێهێشتبێت... تاعوون ئەوەیە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و کتێب بپچڕێت، پەیوەندییە نهێنییە، ڕۆحییە، قووڵەکەی، بەڵام ئێستا ئەو تاعوونە لە هەموو جێگایەک بڵاوبۆتەوە. ئەو ئێستا لە هەر کات باشتر دەزانێت گەورەترین پێوەر بۆ پێوانەکردنی پچڕانی پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤەوە، پچڕانی پەیوەندی مرۆڤە بە کتێبەوە. ئەو وەک کەسێک لە بەشی هەواڵسازی وەرزش لە هەمووان باشتر دۆخەکەی دەبینی.

چاکەی دەمکرد و بیریکردەوە ئەم خانمە ئەفریقاییە چ بەدبەختە، گەر بیەوێت ڕۆژنامەنوسەکان یان خوێنەرەکانی «عەزیزم وەتەن» بە فریاییبکەون. گەر خوێنەرێک مابێت، ئەوا کەسێکە تەنیا بۆ ئەوە دەخوێنێتەوە بیسەلمێنێت تاعوون ئیفلیجی نەکردوە. سەلام چایەکی بۆ ئەزمێرا برد کە بە هێمنی و ویقاری ژنێکی بە سەبرەوە لەسەر کورسییەکی پلاستیکی کۆن و سپی دانیشتبوو. بێئەوەی ئەزمێرا تێبگات دەڵێت چی، بە خەندەیەکی تاڵەوە گوتی «تاعوون هەموومانی گرتۆتەوە... خانم، باوەڕ مەکە کەس هەواڵی بەدبەختی ئەفریقاییەک لێرە بخوێنێتەوە، خەڵکەکە بەشی خۆیان بەدبەختن. من خۆشحاڵم کە لە بەشی وەرزش کاردەکەم، لەوێ کەمتر تووشی ئازاری ویژدان دەبم». سەلام کوڕێکی باریک و درێژ بوو، کەمێک پانتۆڵەکەی هەڵکێشا و چاکەی بۆ ئەزمێرا خستە سەر تەپڵەکێکی سووری کۆن و گوتی «تۆزێکی تر مشکە نەخوێندەوارەکان دێن. من بە هەموویان دەڵێم مشکە نەخوێندەوارەکان، هەر چییەک لەم ڕۆژنامەیە و ڕۆژنامەکانی تریشدا کاردەکەن، زۆربەمان زۆرجار ئەو بابەتانەش ناخوێنینەوە کە بڵاویدەکەینەوە... بۆیە گەر هیوات

بەوەیە لێرە کەسێک هەیە هەقت بۆ بستێنێت، خۆت تووشی دەردەسەری مەکە، هەستە و برۆ...». ئەزمێرا بە زەحمەت تێگەیشت ئەم رۆژنامەنوسە غەمگینە دامێزراوە دەڵێت چی، بە دەنگێکی ژنانەی نەرم کە خاڵی نەبوو لە دڵنیایی و تورەیی، بە سەلامی گووت ئەو نامەیەکی پێیە، دەبێت بیگەیێنێتە دەستی سەرنوسەر، شتێکی گرنگ هەیە دەبێت بگاتە رۆژنامەکان. کە ئەزمێرا وایگووت سەلام بەنائومێدی گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی و دەرگاکەی داخست و لە دڵی خۆیدا گووتی «لەم شارەدا هیچ هەواڵێکی گرنگ نەماوە». لەمێژە گەیشتبووە ئەو بڕوایەی ئەم شارە هەواڵی گرنگی تێدا نییە، هیچ شتێکی گرنگ لێرە نییە شایستەی ئەوەبێت مرۆڤ رۆژنامەی بۆ دەربکات و بیکاتە هەواڵ ... شارەکە خۆی پوچە، هەواڵەکانی پوچن، سیاسەتەکان تێیدا پوچە، لەبەر ئەوە بە دڵنیاییەوە رۆژنامەیەک لە جێگایەکی وا بێبایەخ و پەراوێزی و پوچدا دەربچێت، ئەویش هەر پوچ دەبێت. سەلام هەستیکرد لەناخی دڵیدا هەست بە شەرمێکی قووڵ دەکات، هەستیکرد ئەوەی ئەم ژنە رەشپێستە جوانە، چاوەڕوانییەکی هەیە کە بە ئەو و بەئەم رۆژنامەیە تێرناکرێت، شەرمەندە و وەڕزیدەکات. بە جۆرێک لە خۆی تورەبوو، نەیتوانی لە ژوورەوە خۆی بگرێت و هاتەدەرێ بڕوات بۆ لای ماشێنەکەی و لەوێ کەمێک تایەکانی بپشکنێت تا خەیاڵی ئەم تاعوونە لەسەری دەرچێت، دوو رۆژ بوو دەیویست تایەکانی بپشکنێت و هەر یادی دەچوو، ئێستا یەکجارە ئەو بیرۆکەیە پەڕییەوە سەری و ویستی بەر لەوەی دووبارە یادیبچێتەوە سەیرێکی تایەکان بکات. لە رێگادا بەرەو لای ماشێنەکە سەرنوسەری بینی بە پێچەوانەی عادەتی خۆیەوە، ئەمرۆ لەرۆژانی دی زووتر گەیشتبووە رۆژنامەکە. شەفیق هروری هەندێ رۆژ سەعات یازدە دەگەیشتە بیرۆی کاری خۆی، ئەو درەنگ هاتنەی زۆر لە کارمەندەکانی نیگەراندەکرد، هێندەی دەگەیشتە ئەوێش وەک عادەتی هەمیشەیی خۆی چەند جارێک دەستی دەشت، پەنجەی تەڕی بە ناو قژە کەم و تەنک و چەورەکەیدا دەکێشا. ئەو رۆژە لە قاتێکی رەشدا بوو. بەیانیان گەلێک چالاک دەردەکەوت، وەک ئەوەی بە درێژایی شەو وزەی لە چاوگێکی

نهێنی وەرگرتبێت، بەڵام ماوەیەک بوو پێشی سەری بە جۆرێکی بەرچاو دەرووتایەوە، هەر کات لە ئاوێنەدا سەیری خۆی دەکرد توڕەدەبوو، کە دەگەیشتە بیرۆ ڕوخۆش و سەرەحاڵ بوو، بەڵام هێندەی لە بەر ئاوێنەکەدا سەرە رووتاوەکەی خۆی دەبینی، دڵی دەگیرا و هێمنی لەدەستدەدا. سەلام لەدڵی خۆیدا گووتی باشترە بەرلەوەی بچێتە تەوالێتەکە و سەیری ئاوێنەکە بکات ئەزمێرا ببینێت، چونکە دواتر کە دڵی گیرا، مرۆڤ نازانێت لەگەڵ ئەم میوانە بەدبەختەدا چۆن ڕەفتاردەکات، کە خوا دەزانێت لە چ ماڵە دەوڵەمەندێکدا کاردەکات و بەردەستی چ ژنە دەوڵەمەندێکی گەڵگەنیوی پاشەڵپانە، لەوانەی ناتوانن حاجەتی خواردنەکەی خۆیان بشۆن و شیر بۆ منداڵەکەی خۆیان دروستبکەن. سەلام سەرنجی دابوو، کە شەفیق هروری ساڵ دوای ساڵ گۆشەگیرتر و بیرۆکراسی تر و توڕەتر دەبێت، بە جۆرێک ئێستا هیچی لەو ڕۆژنامەنوسە دڵگەرمەی دە ساڵ لەمەوبەر ناچێت کە لە پێناوی ئازادی بیروڕا و عەدالەتی کۆمەڵایەتیدا خەباتیدەکرد. شەفیقیش هەر ئەزمێرای بینی دەمودەست خەیاڵی بۆ ئەوەچوو، کێشەکەی بەشێک بێت لە گرفتی ئەو کرێکارە بیانیانەی کۆمپانیاکانی بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە، بەنرخێکی ناچیز دەیانکەنە خزمەتکار، لەو ساڵ و نیوەی ڕابوردوودا، کێشەی ئەم بەردەستە بیانیانە زۆر گەورە بووبوو، هەندێک لە دەوڵەمەند و بەرپرس و پارەدارەکان لە سەگ بەدتر ڕەفتاریان لەگەڵ دەکردن. بەشی هەرە زۆری ئەو بەستەزمانانە کەسێک نەبوو لە ژێر خۆری خودادا بەرگریان لێبکات، هەتا سەندیکا ناوخۆییەکانی کرێکاران ئەوانیان بە بەشێک لەخۆیان نەدەبینی، شەفیق هروری دەیزانی کردنەوەی فایلی ئەم میوانە بیانیانە سەرئێشەیەکی گەورەی لەدواوەیە، دڵنیابوو گەر باسی وەها بوروژێنێت جگە لە بەدبەختی و ناکامی دەستکەوتی دیکەی نییە، لەدڵی خۆیدا گووتی «گەر کێشەی ئەم خانمە لەگەڵ کۆمپانیا یان بەرپرسەکاندا بێت، جگە لەوەی کە ئامۆژگاریبکەم، بە جۆرێک لە جۆرەکان بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی و جارێکی تر هەڵەی وەها دووبارەنەکاتەوە، جگە لەوەی بڵێم میوانی بەڕێزم بۆ وەدەستخستنی بژێوی ڕوو لەمجۆرە جێگایانە مەکە کە

ئینسانەکان بەر لە هەر کەس خۆیان وەک حەیوان تەماشادەکەن، ئینجا وەرە بگاتە سەر خەڵکی وڵات و مەملەکەتانی دی، چارەیەکی ترم نییە».
بەڵام دەموچاوی ئەزمێرا لەوە جیدیتر و ساردتر و ڕەقتربوو، بۆنی ئازاری ژنە کارگەرێکی چەوساوەی لێبێت. ئەزمێرا تێیگەیاند کە کارێکی گەلەک نهێنی هەیە و دەبێت دوو بە دوو لە جێگایەکی داخراودا بیبینێت. شەفیق هروری ماوەیەک بوو وەک پیاوێکی گرنگ بە ڕێگادا دەڕۆیشت، شوێن و ناوی وەک ڕۆژنامەنوسێکی ناودار، جۆرە ڕۆیشتن و وەستان و سەیرکردنێکیان بەسەردا سەپاندبوو کە هەر خۆی دابووی بە خۆی و هەر خۆشی بە تەنها خۆشی لێدەهات، زوو زوو لە دەرەوەی وڵاتەوە داوەتدەکرا و لەوێ وتەی دەدا و باسی لە دۆخی میدیا و دیموکراسییەت دەکرد لە خۆرهەڵاتدا، ماوەیەک بوو کە ئەو هەموو ڕێزەی چنیبووەوە، نەریت و کرداری پتر شێوەی بەرپرسە حیزبییە باڵاکانی گرتبوو. کەسێک وریابایە و لە زووەوە چاوی چاودێری بخستایە سەر ، دەیتوانی ببینێت کە لەو چەند ساڵەدا چەند گۆڕاوە، ئەو بایەخ و حورمەتەی لە خەڵکی وەرگرتووە چەند گۆڕیویانە، چ ساردی و بێباکی و غرورێکیان تێدا خوڵقاندوە ... ئێستا تەواوی کاری سەرنوسەری لا بووبوو بە ڕۆتینێکی کوشندە، زۆربەی کات هەستی بە غرور و ماندووبوون دەکرد، هەستیدەکرد ناوبانگی ڕۆژنامەکە تائەندازەیەکی زۆر قەرزداری ئەوە، بە جۆرێک نەیدەتوانی «ناوخاسی قەزاتەکە»، وەک هاوڕێکانی بەگاڵتەوە دەیانگووت لە ناوخاسی خۆی جیابکاتەوە. بە نابەدڵی فەرمانبەرێکەوە کە قەدەر ناچاریکردوە گوێ لە کێشەی ئەوانی تر بگرێت، پێش ئەزمێرا کەوت بۆ نوسینگەکەی خۆی، کە لە بەر قسەی خەڵک و لە ترسی تانەی دۆستان لە ژوورێکی بچوک و بێڕەونەقدا بوو. ژوورەکە کورسی و مێزێکی تەختە لە ناوەڕاستیدا بوو، جگە لە چەند پارچە پەڕەیەکی پەرتەوازە لەسەر مێزەکە، شتێکی تری تێدا نەبوو. گەرچی زۆر خەونی بە بیرۆیەکی جوان و شکۆدار و مۆبیلچنەوە دەبینی، بەڵام دەیزانی کاری وەها تانە و تەشەری خراپی بۆ دەهێنێت، دڵنیابوو دەڵێن سەیرکە ژوورێکی وەک سوڵتان ڕازاندۆتەوە و جێگە کاری وەک ژووری وەزیر و شالیارانە، کەچی لاف و گەزافی ماف و

بەرگری لە خەڵک لێدەدا... ئێستا ژوورەکەی هیچ لە ژووری ڕۆژنامەنوسی هەرە ناوداری وڵات نەدەچوو، بەڵکو دەکرا ژووری هەر فەرمانبەرێکی ئاسایی هەر دائیرەیەکی گەندە و بێبەهای شار بێت. هێندەی هروری لەسەر مێزەکەی خۆی دانیشت، ئەزمێرا ویقارێکی وەرگرت و بە ئەسپایی زەرفی نامەکەی لیوا جەنگیزی لە جانتاکەی دەرهێنا و بە زەحمەتێکی زۆر گووتی، دوو شەوە لیوا جەنگیز گیراوە، بێسەرو شوێنە، من ئیشکەری ئەوم، لەم ماوەیەی دواییدا من و لیوا بە تەنها لەو ماڵەدا دەژیاین، هیچ کەس جگە لە من خەبەری گرتنی لیوای نییە، بەرلەوەی بگیرێت دوو نامەی دامێ بیگەێنمە تۆ و گۆڤاری بوهاران. ئەوە نامەکەی جەنابی لیوایە، فەرموو بیخوێنەوە.

«لیوا جەنگیز» ناوێک نەبوو کەس نەیناسێت، یەکێک بوو لە پیاوە کلاسیکییەکانی شۆڕش، ڕۆژانە لە چیرۆکەکانی سەرزاری خەڵکدا ناوی دەهات، زۆر لە چیرۆکەکان درۆبوون، هەندێک تاوان دەخرانە پاڵی دەستێکی نەبوو تێیاندا، زۆر تاوانیشی کردبوو کەس نەیبیستبوون. لە بەرئەوە شەفیق هروری هێندەی ناوی منی بیست و خوێندییەوە، فیکەیەکی سەرسامی لێدا و گووتی «واو ... لیوا جەنگیز دوو ڕۆژە گیراوە و کەس نازانێت». فیکەکەی تەنیا فیکەی سەرسامی نەبوو، فیکەیەکی سەیر بوو، ئەزمێرا پێشتر فیکەی وای نەبیستبوو، پێدەچوو فیکەیەکی تایبەتی سەرنوسەرەکان بێت، هەم تۆنی سەرسامی هەم ترس و دوودڵی تێدابوو. هروری نامەکەی بە وردی خوێندەوە، وەک لە شتێک بترسێت، وەک بەدوای پەیامێکی نهێنی، یاخود ئاماژەیەکی ژێرەوانکێدا بگەڕێت، دوای تەواوکردنی خوێندنەوەی یەکەم، جارێکی تر نامەکەی بە چاویلکەوە خوێندەوە، نەبا شتێکی تێدا بێت چاوی ئاسایی نەیبینێت. شەفیق هروری پیاوێکی جوان نەبوو، سیمای لە سیمای یاریکەرێکی بۆکسێن دەچوو، ئاسەواری لێدان و پێداکێشانی کۆن بە لچ و لووتییەوە بێت، لە هەندێ جێگادا قۆقز و لە هەندێ شوێنیدا قوپاو، لۆچ و لوویەکی زۆری هەبوو، پشت چاوانی بەردەوام هەوکردو و بەرچاوانی دوو کیفی ئەستوور و

داکەوتوویان لەسەربوو. گووتی «وای کە کارێکی پێچدار و سەختە. نازانم چیت پێبڵێم، پێشتر دەبێت لەگەڵ ستافەکەدا قسەبکەم ... ئاە، حەتمەن لەگەڵ ئەنوەر پۆخانیشدا، دەبێت پێکەوە لەسەر شتێک رێکبکەوین... ئێستا ترسێکی زۆرم هەیە، نازانم دەشێت ئەم نامەیە بڵاوبکەمەوە یان نا... کارەکە ئاسان نییە، بەقەد مێزەری فاڵچییەکی ساختەچی پێچدارە». ئەوە گوزارەیەکی زاڵی بوو، کێشە ئاڵۆزەکانی بە مێزەری پێچاوپێچی فاڵچییەکان و شێخە دەستبرەکان دەشوبهاند.

ئەزمێرا شتێکی ئەوتۆ زۆری بۆ قسەکردن نەبوو، لەڕاستیدا نەشیدەزانی ئاخۆ بڵاوکردنەوەی ئەو نامەیە، دواجار بەسوودی منە یاخود نا، بەڵام دەستووری من وەهابوو نامەکان بگەیێنێت. ئەو بە هەمان ئەو ویقارە بێدەنگەی سەرەتاوە، وەک چۆن هاتە بەر بیرۆی رۆژنامەکە، بە هەمان شێوەش چووەدەرێ. دەبوو دوای ماوەیەکی کورتی تر لە گۆڤاری بوهاران بێت. لە ڕاستیدا نەیدەزانی دوای جێبەجێکردنی ئەو کارە دەشێت چی بکات، تەنیا شتێک لە خەیاڵیدا بوو، ئەوە بوو درێژترین ماوە لە چاوەڕوانی ئازادی مندا دابنیشێت. دەبێت بڵێم ئەزمێرا لەو ڕووەوە وەفادارییەکی بێوێنەی نیشاندا و تا ئێستاش لە مرۆڤە هەرە ڕۆحسوک و دڵسۆزەکانە لەلام.

بەر لەوەی ئەزمێرا بگاتە گۆڤاری بوهاران، شەفیق هروری بە تەلەفون تەواوی چیرۆکەکەی لە «ئەنوەر پۆخان» گەیاند. پۆخان وەک هروری لەو ساڵانەی دواییدا چەندین جار گیرابوو، حیزب و دەوڵەت خستبوویانە ژێر گووشاری توندەوە، بەڵام ئەو هەموو گوشار و ئازارە لە بری ئەوەی تورەیبکەن، توندتر و ناتەباتری لێ بسازێنن، کەسێکی پراگماتی نەرم و مایل بە رێکەوتنیان دروستکردبوو. لە ماوەی ئەو ساڵەی ڕابوردوودا، چ لە ستوونەکەی خۆی و چ لە چاوپێکەوتنە تەلەفزیونییەکاندا، نەرمییەکی بەرچاوی دەردەخست ... نەرمییەکەی نە لە ترسەوە بوو، نە لە بڕوایەکی تەباخوازانەوە، بەڵکو لە ماندووبوون و نائومێدییەوە بوو. جیاوازی لەگەڵ هروریدا دروست لەو خاڵەدا بوو. ئەم باوەڕی بەوە نەمابوو کە

چاکسازییەک لە وڵاتەکەدا بکرێت، باوەڕی بە شۆڕشیش نەبوو، وڵاتەکەی لە بەردەم قەیرانێکی سیاسی قووڵدا دەبینی. لە هەر وڵاتێکدا ئازادی و چاکسازی و شۆڕش و ملکەچیش پێکرا پێکەوە مەحاڵ بن، ئیدی ئەو جێگایە جەهەنەمی تەواوە، باشترین شتیش بۆ ئەوەی مرۆڤ بەرگەی ئەو جەهەنەمە بگرێت ئەوەیە بۆ خۆی بژی. پۆخان ڕای وابوو هەندێک قۆناغ لە مێژوودا هەن، کە تێیدا مێژوو خۆی هیچ پەیامێکی ڕۆشن و ئاشکرای نییە، بەدبەختترین سیاسەتمدار و ڕۆشنبیریش ئەوانەن کە دەکەونە سەردەمی لەوجۆرەوە، چونکە هەر کات مێژوو خۆی نەیزانی بەرەو کوێ دەڕوات، مرۆڤەکانیش کارێکی ڕۆشنیان نابێت بیکەن، خۆیان تووشی کێشەی لاوەکی دەکەن و دەیانەوێت لە هیچ ببنە قارەمانی خەیاڵی. ئێستا پۆخان هەستیدەکرد ڕەخنەی خۆی و هاوڕێکانی لە دەوڵەت بوونەتە قسەی دووبارە، خودی ژیان لەم شارەدا بۆتە شتێکی سواو، ئەوە وایدەکرد قسەکانی ئەمانیش دووبارەبێت، ستەم دووبارەیە، زوڵم دووبارەیە، خەبات دژی ستەم دووبارەیە، هەموو شتێک بە جۆرێکی بێمانا و ناخۆش و وەڕزکەر دووبارەیە. سەیربوو هەمیشە هەمان شت ڕوویدەدایەوە و هەمووان بەجەشنێک لە ناویدا دەژیان وەک ئەوەی نوێ بێت. دۆخی وڵاتەکە وەک جەنجەڕێکی لەق و لۆقی لێهاتووە کە بە دەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە و دەسوڕێتەوە و هیچیش ورد ناکات، لێرەوە وروژاندنی زۆر جگە لە ناڕەحەتی و پەشێوی هیچی لێ سەوز نابێت، دەبێت بوەستین و بژین تا شتەکان لەم ڕیتمە مردووەی خۆیان دەردەچن ... یان خەڵک شۆڕش دەکەن، یان پاشاکانی مەملەکەت دەمرن. ئەوە نهێنی پشت نەرمی پۆخان بوو ... کەسێک بوو لە چاوەڕوانی شتێکدا دانیشتبوو، دەیویست تا ئەو ساتە دێت، ڕۆحێکی پراگماتی بخاتەگەڕ، بکرێت بێ دەردەسەری بژی و بمێنێتەوە.

نامەکەی لیوا جەنگیز مایەی پەشۆکانێکی گەورە بوو بۆ ئەو ... هێندەی ئەژمێرا لە ژوورەکەدا دەرکەوت، تێگەیشت ئەمڕۆش ڕۆژێکی خۆش نابێت. پیاوێکی باریک و سپیکەلە بوو بە دوو چاوی بچوک و ڕیشێکی

پرۆفیسۆری و نیشانەیەکی ڕەشی گەورەوە لە ژێر ملیدا. دەنگێکی گڕی هەبوو کەم و زۆر لەگەڵ قیافەیدا نەدەگونجا. چەندین ساڵ بوو، بە هۆی ناڕێکی پەیوەندییەوە لەگەڵ ژنەکەیدا، ڕۆژی ئاسوودەی بەخۆیەوە نەبینیبوو، خۆشترین کاتی ئەو ساتانە بوو کە لە بیرۆی گۆڤارەکە لەسەر مێزەکە خەوی لێدەکەوت. بەڵام لە گۆڤارەکەش بەردەوام هەواڵێک هەبوو ئاسوودەیی تێکبدات، ئەم بەیانییە کە هروری تەلەفونی بۆ کرد و چیرۆکەکەی لیوا جەنگیزی بۆ گێڕایەوە، لە دڵی خۆیدا گووتی «هروری سەگ... هروری سەگی کوڕی سەگ... دەزانم بۆ زەنگ بۆ من لێدەدەیت، هەواڵێکی باش و بێ دەردەسەر بایە ئاسان بە منت نەدەدا... قەحبەباب». لە ناخی دڵەوە ڕقی لە هروری بوو، ناوبانگی ئەو وەک ڕۆژنامەنوس لەم زۆرتر بوو، گەرچی ئەم لە هروری زۆرتر گیرا بوو، لەو زۆرتر دەردەسەری چەشتبوو، هەڕەشەی زۆرتری لێدەکرا، بەڵام شتێکی نادیاریی تێدابوو نەیدەهێشت وەک ئەو ناوبانگ پەیدابکات... ئاخۆ تۆنی ناخۆشی دەنگی بوو؟ کەم توانایی بوو لە قسەکردندا؟ بێزاریی و پەرتی و بێهۆشی بەردەوامی بوو، بە هۆی ژنەکەیەوە؟ چی بوو؟ نەیدەزانی. بەڵام شتێک هەبوو وایدەکرد هروری هەمیشە لەم ناودارتر و لە پێشتر بێت... هەتا کەناڵە تەلەفزیۆنەکانیش هەمیشە هروری داوەتدەکەن، گەر ئەو کاتی نەبوو ئەوسا بیر لە ئەنوەر پۆخان دەکەنەوە. ماوەیەکە گۆڤاری بوهارانیش هیچ هەواڵێکی گرنگ و گەورە و نهێنی دەست ناکەوێت، هەموو مانشێتە گەورەکان بووە بە موڵکی عەزیزم وەتەن، وەرزی زێڕینی تیراژە زۆرەکانیش وەختە بەسەر دەچێت. هەموو لە گۆڤارەکە پاشەکشەی کارەکانیان دەگێڕایەوە بۆ دەستکورتی و نەزانی ئەو، خۆشی بە ئاشکرا هروری بەوە تاوانبار دەکرد کە تۆڕێک پەیوەندی گومان لێکراو و نائاسایی لە ناو دەوڵەت و حیزبدا هەیە هەواڵی پێدەدەن و کاری وا ئاسان نییە بەو بکرێت، بەڵام هەر جارێک هەواڵێکی گرنگی لە عەزیزم وەتەندا دەبینی دڵی لە ناخەوە ژانیدەکرد. دەبوو دواجار شتێک بکات، دەبوو هەندێ سەرچاوەی گەورە و نهێنی و تایبەتی هەواڵ مسۆگەر بکات، دەبوو بجوڵێت.

ئەم بەیانییە هروری گەلێک بە ئەدەب و ڕەسمی و هاوڕێیانەش قسەی لەگەڵ کرد، لەو ساڵانەی دواییدا ڕێکەوتیکردبوو زۆرجار توند و بە تۆنی بەرز قسە لەگەڵ یەکدابکەن. هروری پێیگووت «بۆ دابەزاندنی ئەم هەواڵە پێویستیم بە مشورەتی تۆیە. لیوا پیاوێکی ترسناکی ناو دەزگا ئەمنییەکان بووە، دەزانم دەستی زۆر گەورە و کێشەی ئاڵۆز لە پشت چیرۆکەکەوە وەستاون، داگرتنی نامەکەی لیوا و بەمجۆرە تەواوی ژیانی سیاسی دەدات بە یەکدا، دەترسم پەڕلەیەکی تێدا بێت و داوێک بێت ئێمە تێیبکەوین».

ئەنوەر پۆخان سەیری لێهات، جەنابی لیوا لە ناو ئەو هەموو دۆست و کارمەند و ناسیاوەدا، دواجار کچێکی ئەتیوپی بەم کارە ڕاسپاردوە. کاتێک ئەزمێرا بە باڵا ڕێک و نیگا ڕێک و ڕۆیشتنە بێ لەنجەکەیەوە لە بەر دەرکی گۆڤارەکەدا دەرکەوت، پۆخان ئارەزوویەکی شێتانەی تێدا بوو زوو نامەکە وەربگرێت و بیخوێنێتەوە. ئەوەی کردبووی بە ڕۆژنامەوان ئەم کونجکۆڵییە منداڵانەیەی بوو، کە تا بچووایەتە تەمەنەوە گوڕدارتر دەبوو.

ئەزمێرا سەرنجی دا بیرۆکانی گۆڤاری بوهاران لە ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەن پاکتر و نوێتر دیارن، هەتا خودی پۆخانیش شیکپۆش و تەمیزتر بوو، ڕاستی هیچ خۆشی لە قیافەتی هروری نەهات، کە پتر لە یاریکەرێکی گەمژە دەچوو، لەوانەی دوای یاریی قاتێک لە بەردەکەن و بۆ کامێراکان پێدەکەنن. بە پێچەوانەی هرورییەوە خۆشیشی لە قیافەی پۆخان هات، کە خاڵی بوو لە هەموو ئاسەوارێکی غروری زیاد. ئەو وەک زۆربەی ژنانی دونیا حەزی لە شتێک غرور بوو بۆ پیاو، بەڵام جۆرێک نا بیانکاتە کەسێکی بادیهەوا و داخراو. پۆخانیش کە یەکەمجار چاوی بە ئەزمێرا کەوت بیریکردەوە، بەوەدا «لیوا» کچێکی وای بۆ ئەم کارە هەڵبژاردوە، نەیویستوە نهێنییەکەی بخاتە بندەست کەسێکی هاوزمانی خۆی. ئەزمێرا لە چاوی پۆخاندا نارەحەتییەکی قووڵی خوێندەوە، نامەکەی بە کونجکاوییەوە خوێندەوە، بەڵام چاوانی دڵنیاییان تێدا نەبوو، واهاتە خەیاڵی وەک ئەوەی پۆخان بڵێت «بە جەهەنەم ئەم کابرایە چی

بەسەردێت». ئەزمێرا دەیزانی زۆر کەس پێیان خۆش دەبێت لیوا دەردێکی کوشندە بگرێت و کۆتاییەکی ڕەش و تاریکی ببێت بە نەسیب، بەڵام چاوەڕوانی نەدەکرد هەمان هەست لە چاوی ئەو دوو کەسەشدا بخوێنێتەوە کە لیوا لە هەموو ئەو شارەدا متمانەی پێکردبوون. نیگا تورە و نائارامەکانی ئەنوەر پۆخان بەسبوون بۆ ئەوەی ئەزمێرا لەدڵی خۆیدا بڵێت «وای ئەو جەنگیزە بەدبەختە، چ پیاوێکی بێکەسە». دەکرا ئەو بروایەی ببایەتە بڕوایەکی هەمیشەیی و نەگۆڕ، گەر بۆ ڕۆژی دواتر بولبولیار زەنگی نەدابایە و نەهاتبایە و چاوانی پڕ نەبان لە خەفەت و غەمخۆری.

کە ئەزمێرا لە بیرۆکەی ئەنوەر پۆخان هاتە دەرێ، تەواو نائومێدبوو، بە جۆرێک غەمگین و بەدحاڵ بوو دواتر کە بیریدەکردەوە شتێکی ئەوتۆی دەربارەی ئەو ڕێگایە بیرنەمابوو کە لە نێوان بیرۆکەی پۆخان و ماڵەوەدا بڕیوێتی، ئەوەشی یادکردبوو چەندی خواستووە تا دەگاتە ماڵ و بە چ کوچە و شەقامێکدا هاتۆتەوە ... کچەکە گەرچی شارەزاییەکی زۆری لە زیندەگی سیاسی وڵاتی ئێمەدا نەبوو، بەڵام بەوەدا شتێک لە نوێگەریی و پێشکەوتنی ڕەواڵەتیانەی لە شارەکەدا دەبینی، ڕای وابوو کە ویژدان و حوکمی مرۆڤەکان لەسەر یەک دەبایە هێورتر و بەرەحمانەتر بێت. ئەو لەوەدا لەسەر هەقبوو، شارەکە خەریک بوو وەحشیگەریی خێڵەکی و سەرەتایی بە وەحشیگەریی کۆمەڵگا تەکنیکییە بەرزەکان تێکەڵدەکرد، ئەزمێرا شتەکانی دەبینی، بەڵام نەیدەتوانی ناویان بنێت، هێندەبوو دەیزانی دڕندەیی مرۆڤی جەنگەڵ و دڕندەیی مرۆڤی ئەم سەردەمە بە شێوەیەکی ئاڵۆز لێرەدا ئاوێتەبوون. واتە شارەکەی گەرچی بە مەکینەیەکی گەورە دەچوو، بەڵام ددانی مەکینەکە بۆنی گیای دارستانەکانی لێدەهات ... بۆنی ئەو خوێنە کاڵەی نێچیرەکان دەمێک لە دارستانەکاندا یەکتری دەخۆن.

دوای ڕۆیشتنی ئەزمێرا، ئەنوەر پۆخان دەرگای ژوورەکەی لەسەر خۆی داخست و دەستیکرد بە بیرکردنەوە. هەر کات دەرگاکەی دابخستبایە،

هەموو دەیانزانی کێشەیەکی قورسی هەیە و بیری لێدەکاتەوە. گەرچی ئەو وەک هەر کەسێکی تر دەیتوانی لە بارودۆخی ئاسایشدا بیربکاتەوە، بەڵام هەر کات دەرگاکانی دادەخست زیاتر لە بیرکردنەوەی خۆی دڵنیادەبوو... پۆخان دڵنیابوو کە بەشی زۆری ئادەمیزادان بیرناکەنەوە، لەرێگای هەندێک ئایدیا و بیرۆکە و ڕستەوە تەنیا بەرگری لە خۆیان دەکەن و پەلاماری ئەوانی دی دەدەن. بیرکردنەوە شتێکی ترە. هەمیشە ئەو ڕستەیەی دووبارەدەکردەوە «مرۆڤ شەڕانگێزە، بەڵام بیرکردنەوە شەڕانگێز نییە». لە پشت دەرگا داخراوەکانی بیرۆکەیەوە گەیشتە ئەو بڕوایەی کە گرتنی لیوا جەنگیز بە فەرمانی شەخسی سەرۆک بووە. بەوەدا ئەنوەر خەیاڵێکی فراوانی بوو، گووتی لەم چەند ساڵەی دواییدا لیوا جەنگیز ئاشکرا نییە سەر بە چ کەسایەتی و قوتبێکی ناو حیزبە. مەرج نییە لیوا تاوانێکی دیاریکراوی کردبێت، ڕەنگە تەنیا سەردەمی بەسەرچوو بێت، لەوانەیە ڕۆژگاری تێپەڕیبێت، وەزیفەیەکی تایبەتی نەمابێت بیکات. لە حیزبدا بەردەوام هێزی تازە و خەڵکی نوێ دێنە سەرەوە، لەوانەیە ویستبێتیان لە چاوان دووریبخەنەوە. خۆی سەرەتا بەو بیرکردنەوەیەی خۆی ڕەزامەند بوو، هەستیکرد گەر ئەوە هۆی سەرەکی گرتنی لیواش نەبێت، ئەوا هۆیەکە لە هۆکان. لیوا لە پێنج ساڵی ڕابوردوودا تا دەهات ناوی کاڵتر و کاڵتر دەبووەوە. ئەوەی بۆی نەبوو بچێتە بورجەوە، ئەوەی کرابووە کارمەندێکی پلە دووی ناو ئاسایش، ئەوەی کەم لە بۆنە و ئاهەنگە حیزبییەکاندا دەردەکەوت، وایانکردبوو تەنیا هێزی ڕاستەقینەی ناوەکەی و ڕابوردووی بێت، لە سەردەمێکدا هیچ یەک لەو دوو شتە نرخێکی ئەوتۆ ڕاستەقینەیان نەبوو.

کە شەفیق هووری بینی، هەستیکرد ئەویش بەدوای بەهانەیەکدا دەگەڕێت تا هەواڵی گرتنەکەی لیوا جەنگیز بڵاونەکاتەوە. هەر دووکیان لە قاوەخانەی «باستیلیۆس» یەکیان بینی، ئەمساڵ لە چاو ساڵاندا کەم بە دیداری یەک گەیشتبوون. ساڵانی پێش، کاتێک حیزب و دەوڵەت گوشارێکی زۆر گەورەیان دەخستە سەر هەردووکیان، ناچاربوون زوو زوو

کۆببنەوە و کاری هاوبەش بکەن، هەڵوێستی وەک یەک دابرێژن و پێکەوە بەیاننامە دەربکەن و داوای کۆمەک لە ڕێکخراوە بیانییەکان بکەن. بەڵام هەردووکیان هەستیاندەکرد کارێکدەکەن لەو کارانەی کە لە هەموو لایەکەوە دەکەونە بەر گلەیی و گازەندە. پارساڵ کە دوو ڕۆژنامەنوس لە هەلومەرجێکی نادیاردا بە دەست هەندێک لە هەوادارانی دەسەڵات کوژران، خەڵکانێک مایەی خوێنەکەیان خستە ملی سیاسەتی توندی ئەم دوو بڵاوکراوەیە کە بێرەچاوکردنی دۆخی تایبەتی ئەم هەرێمە وا لە ڕۆژنامەنوسان دەکەن دەست لە هەمانەی وا وەردەن، هەموو دەزانن تەنیا ماری ژەهراوی تێدایە. ئێستا هەر دووکیان دەیانزانی نە دەسەڵات و نە خەڵک و نە ڕۆژنامەنوسەکانی دی خۆشیان ناوێن. هەردووکیان بە نهێنی لەوەدا تەبابوون کە وروژاندنی شتی گەورە، جگە لە دەردیسەری بۆ ئەوان هیچی تری تێدا نییە. کە لە «باستیلیۆس» یەکیان بینی، هەردووک مۆن بەرامبەر یەک دانیشتن. هەر دووکیان نامەکەی لیوایان پێ بوو، هەر یەکەیان چەند کۆپییەکیان لە نامەکە گرتبوو، بەڵام هیچ کامیان شتێکی لەسەر بابەتەکە لای کەس نەدرکاندبوو، هەردووکیان ترسان هەواڵەکە لە ناو ستافەکەدا بڵاوبێتەوە، گەر هەواڵەکە بڕۆیشتبایە ئیتر بەری پێ نەدەگیرا. ئەنوەر سەری قسەی کردەوە و گووتی «من پێموایە سەردەمی ئەمجۆرە سیاسیانە بەسەرچووە، گرتنی جەنگیز نیشانەی کۆتایی مێژووییەکە کە پێویستی بە کەمێک تراژیدیا هەیە بۆ ئەوەی بەتەواوی بەسەربچێت و ئاوا بێت. گرتنەکەی شتێکی زۆر گرنگ نییە، بەیانی کە قسەمانکرد تۆم گەلێک دوودڵ و ناڕەحەت بینی، پێویست بە ناڕەحەتییەکی وەها ناکات». هروری لە دڵەوە دەیویست نامەکە بڵاونەکاتەوە، بەڵام لەوە دەترسا گەر ڕۆژێک نهێنی نامەکە ئاشکرابێت، قورس لە سەریان تەواو ببێت. هروری کەمێک سەری داخست و هەندێ چەناگەی خوراند و گووتی « لەوانەیە خەبەرەکە گرنگییەکی ئەوتۆی نەبێت، لیوا دەمێکە لە ڕیزی پێشەوەی سیاسییەکاندا نییە، دەترسم لە بەر شتێکی ڕۆتینی گیرا بێت، دەترسم ئێمە بیکەینە هەرا و دواتر بابەتەکە شتێکی بێمانا و هیچی لێدەرچێت». هەردووکیان لەو بەینەدا

تەنیا دوو قاوەی سادەی بێشەکریان داوا کردبوو، کە قاوەکان هاتن هروری بە وێنەی پیاوێک غەمێکی ڕاستەقینەی هەبێت دەستی خستە ژێر چەناگەی و گووتی «ئەی چی بکەین؟». پۆخان دەیویست خۆی کەمێک سەرەحاڵتر نیشانبدات، گووتی «بابەتەکە دوو دیوە، یان ئەوەیە زۆر بێبایەخ و ڕۆتینییە، یاخود زۆر ترسناک و کێشدارە. من ئەگەری دووەمیش لە مەسەلەکە ناکەمە دەرێ، بەوەدا لیوا پێش ئەوەی بگیرێت زانیویتی دەگیرێت، ترسێکی گەورەی هەبووە. بەوەدا متمانەی بە کەسی تریش نەکردوە، ئیشکەرە ئەفریقاییەکەی نەبێت، بە دووری نازانم شتێکی گەورە لە گۆڕێ بێت. تا کاک شەفیق ئەو ئەگەرە مەخەرە لاوە کە لەوانەیە شتێکی ترسناک لە پشت ئەم نامەیەوە بێت». شەفیق بێئەوەی ڕوخساری خۆی بگۆڕێت یان ڕۆشنیبکاتەوە، گووتی «لیوا لەم ساڵانەی دواییدا بایەخی خۆی لەدەستدابوو. من شتێکی زۆری دەربارە نازانم، بەڵام دڵنیام بێکەس بووە، دڵنیام پشت و پەنایەکی قایمی لە حیزبدا شک نەبردوە، گەر وانەبووایە نامەی بۆ ئێمە نەدەنوسی». پۆخان کەمێک بیریکردەوە و گووتی «تۆ لەسەر هەقیت. بێگومان لە ئێمە بەهێزتری شک نەبردوە پەنای بۆ بەرێت. بەڵام هەموو دەزانین لیوا جەنگیز کەسایەتییەکی خۆشەویست نییە، نە خەڵک زۆر خۆشیاندەوێت و نەحیزبیش. گەر لەسەری بێینە دەنگ وادەردەکەوێت وەک ئەوەی میدیای ئازاد لەسەر کۆنە جەلادێک هاتبێتە قسە. لەسەرئەوە دەمانخەنە بەر تانە و تەشەر، دەڵێن کوڕی هەژاران و بەدبەختان بگیرێن و بێسەروشوێن خرێن ئەمانە پەنجە ناجوڵێنن، بەڵام بروانن بۆ کەسانی پایەدار و پیاوانی دەسەڵاتدار چ ئازا و لەسەرەپێن... وادەڵێن، بێگومان وادەڵێن».

ئەو ڕۆژە وەک بڕیارێکی سەرەتایی هەردووکیان لەسەر ئەوە ڕێکەوتن جارێ نامەکە بڵاونەکەنەوە و بێدەنگی لێبکەن، هەوڵبدەن بۆ ئەم مەسەلەیە بەدواداچوونی زیاتر بکەن. بەڵام لە ناخی ئەنوەر پۆخاندا، نیازێکی تر هەبوو کە لەو ساتەدا نەیدرکاند و شاردییەوە تا بتوانێت سوودێکی گەورەی لێ ببینێت.

# هوشیاربوونەوە

لە ڕۆژی سێهەممدا لە بیمارستان.

بێهۆش لەسەر تەختێکی ڕەق کەوتووم. نازانم دونیا شەوە یان ڕۆژ. چاو هەڵدەهێنم و یەکەم شت دێتە خەیاڵم ئەوەیە، بزانم ڕوناکیم لێوە دیارە یاخود نا. هەر کات مرۆڤ هەستی بە شەو و ڕۆژ نەما، ئیتر کەوتۆتە دۆخی بێهۆشی تەواوەتییەوە. چاودەکەمەوە و بۆ ڕوناکی دەگەڕێم، سەرەتا لە تاریکییەکی ئەستوور زیاتر هیچ نابینم، دڵنیانیم ئەو تاریکییە تاریکییەکی سروشتی ناو چاوی خۆمە یاخود زوڵمەتی بێبنی دونیایە. لە نێوان ئەو دوو جۆر تاریکییەدا جیاوازییەکی بەرچاو هەیە کە من لەو ساتی بێهۆشییەدا ناتوانم بیری لێبکەمەوە. تاریکی ناو ناخ بە چاڵێکی قووڵ دەچێت، بە خەرەندێکی ناکۆتا کە ڕۆحت ڕۆچووبێتە ناوی. چەشنە تاریکییەکە دەمێک دەکەوێتە بەر تیشکی خۆر لە ڕۆشنترین ساتەکانیدا، هێشتا هەستدەکەیت شتێک لە زوڵمەت هەیە کە ماوە و لاناچێت. تاریکی ناو ناخ تاکە شێوەیەکی تاریکییە کە بە هیچ جۆرە تیشکێک ڕوناک نابێتەوە. تاریکی دەرەوە هەمیشە درزێکی تێدایە، لە ئامێزی سروشتدا تاریکی ڕەها بوونی نییە، زوڵمەتی گەردونی هیچ کات لە هەموو سوچ و ڕووبەر و کەلێنێکیدا وەک یەک ئەستوور نییە، هەمیشە لێوارێکی تەنکی تێدایە کە جۆرە تیشکێکی نهێنی لە جێگایەکی نادیارەوە دزەی کردۆتە ناوی، ئەوە تەنیا تاریکی ناخە کە تیشک ناتوانێت زەفەری پێببات و دیواری لە هەر دیوارێک ئەستوورترە. کە چاومکردەوە لەناو هەردوو چەشنە تاریکییەکەدا نوقمبووم، تاریکی بێدەری سروشت و تاریکی بێمەودای دەروون. جوانی گەورەی بێهۆشی لەوەدا نییە کە مرۆڤ دەبات بۆ ناو تاریکییەکی تر، تاریکییەکی قووڵتر لە تاریکی ناخ و تاریکی سروشت. بێهۆشی بەڵگەیە لەسەر بوونی جێگایەکی تر، جێگایەک نە سەر بە

جیهانە و نە سەر بە خەیاڵ. بێهۆشی بازێکی گەورەیە بۆ ئەو دیوی ئەم دونیایە. مرۆڤ بۆیە بێهۆش دەبێت، تا لە ڕێگای بێهۆشییەوە تێبگات جۆرە بوون و ژیانێکی تر دەشێت هەبێت. بێهۆشی سەفەر نییە بەرەو هیچی، بەرەو نەمانی هەست، بەڵکو سەفەرە بۆ جێگایەکی نادیار، بۆ شوێنە لەیادکراوەکانی بوون کە هۆشی لاواز و کەمتەرخەممان نایگاتێت. مرۆڤ کە لە هۆشدەچێت، دەچێت بۆ کوێ؟ ئەوە پرسیارێکە هیچ کات وەڵامێکی نییە، چونکە ئەو دونیایەی لە بێهۆشیدا سەفەری بۆ دەکەین، دونیایەکە نە ئێمەی مرۆڤ دەیناسین و نەخوداش پێی ناساندوین... لە بەردەرکی بێهۆشیدا تابلۆیەکی گەورە هەیە، تیرێکی لەسەرە و ئاماژە بۆ بوونی جێگایەکی تەماوی و نەناسراو دەکات، شوێنێک کە هیچ ناونیشانێکی نییە، بەڵام جگە لەو دەروازە بچوکەی لێوەی دەچینە ژووری، دەروازەیەکی نادیاری دیکە هەیە بۆ دەربازبوون. ئەگین گەڕانەوەی دوای بێهۆشی چ مانایەکی هەیە. کە لە بێهۆشی ترازام وامدەزانی لە جیهانی فریشتە هەڵهاتووەکەی ناخم گەڕاومەتەوە، ئەو شوێنەی نەمبینیوە و نەمزانیوە هەیە، بەڵام هەیە و جێگایەکی دوور و تاریکیشە، زۆر دوور. کە هاتمەوە بەر خۆم، هەستمکرد لەو بەشە بێدەنگکراو و تاریکەی بوونم بووم، جێگایەک هەمیشە فەرامۆشمکردوە، کیشوەرێکی خنکاو پڕە لە هەستی نەناسراو، لە منی دیکە، لە بوونەوەرانی نغرۆ لە ناخی مندا. کە چاوانم کردەوە بە کەسێک دەچووم بەپەیژەیەکی درێژدا بەرەو باڵا سەربکەوێت، کەسێک لە ناخی خۆی دێتە دەرێ و بەو پەیژەیەدا بەرەو ئەو ژیانە سارد و سەیرە دەگەڕێتەوە کە دەیخاتەوە ناو مەملەکەتی شتە ڕۆژانەکان.

لە ناکاو هەموو شتێک لە پێشچاوم ڕووناک بووەوە، گوێم لە دەنگی چەند کەسێک بوو فارسی و ئینگلیزی لەسەر سەرم قسەیاندەکرد. بێئەوەی لە هیچ وشەیەک تێبگەم، هەوڵمدا هەستم و پێخەفم جێبهێڵم، هیچ هەستێکی نەخۆشیم نەبوو، بە جۆرێک خەیاڵم ساف و هەستم ڕۆشن بوو، هەتا بە کەسێکیش نەدەچووم لەخەو هەستابێت، هوشیاریم یەکجار و بە

چەشنێکی ئازاربەخش گەڕابووەوە، وەک هورووژمی توندی ئاوێکی پۆنگ خواردو. هەندێ پزیشک و کارمەندی گەنجی بیمارستانەکە لەسەر سەرم بوون، دەمتوانی ڕۆشن بیانبینم... دەمزانی بارودۆخی تەندروستی بولبولیار زۆر خراپ بوو، لە شەوی دووهەممدا لەوێ لە هۆش خۆم چووم و لە بەر قاپی پزیشکاندا کەوتم. بولبولیار یەکسەر پەڕییەوە خەیاڵم، لە یادم بوو دەمێک لە هۆش چووم، بە نیازی بانگهێشتی پزیشکێک بە واوەیلا ڕامکردبووە پێشدەمی دەرگای ئەوان. دکتۆرەکانم ئێستا گەلێک هێمن دەدوان، دەنگیان ئەو ئاوازە خۆشەی تێدابوو کە پڕبوو لە میهرەبانی ئێرانیانە، جۆرێک لە میهرەبانی جیاوازە لە شێوەکانی تری میهر و سۆز کە لە نێو هۆز و نەتەوەکانی دیکەی ئەم دەڤەرەدا دەبینرێت، کە هەستام بە هێمنی دایان نامەوە، یەکێک بە کوردی پێیگوتم «شوکور بۆ خودا دەردێکی خراپت نییە، کەمێک سەبربکە، دوایی بە مەیلی خۆت کوێ دڵت گرتی برۆ» . هەستمکرد نازانن من یاوەری نەخۆشێکی ترم، هەندێک شتم گووت کە ئێستا لە یادم نییە چی بوون. وەها بوو وەک دکتۆرەکان نەمبیستن، دکتۆرێکیان لێدانی دڵی گرتم و تای پێوام و بە فارسی گووتی «تەنیا ماندووبوویت، هیچت نییە، کەمێک دەرمان وەربگرە و پشووبدە... » . قسەی دکتۆرەکە وەک ئاوازی باڵندەیەکی دوور و غەریب هاتە گوێم. ئینجا بێئەوەی بیر لە بولبولیار بکەمەوە، بێئەوەی هەستبکەم ئەو جۆش و خرۆشەی پێشترم تێدایە بۆ ڕزگارکردنی، بە شتێک لە ئاسوودەیی و بێباکییەوە گەڕامەوە و سەرم خستەوە سەر بالیفەکەم. نیوسەعات بێباکانە پشوومدا بێئەوەی بیر لە هیچ بکەمەوە، لەو کاتەوەی فریشتەکەم ترازابوو، کاتی وەها ئاسوودە و بێباکیم نەچەشتبوو، بەڵام بۆ یەکەمجار هەستم بە دیوێکی سارد و مردوو کرد لەخۆمدا کە تا ئەو کات هەستم پێ نەکردبوو، کە پاڵمدایەوە هەستمکرد دەتوانم لەزەتێکی زۆر گەورە لە نەمانی باڵەکانم ببینم، چەندەها ساڵ بوو کە دەخەوتم، کە دەگەڕام سەنگی ئەو باڵانە لە ژێر پشت و لەسەر شانم وەها گەورەبوون ئاسوودەییان دەتاراند، وەلێ بۆ یەکەمجار پاڵدەکەوتم و تێدەگەیشتم مانای چی مرۆڤ فریشتەیەک بە کۆڵییەوە نەبێت. وەها بوو وەک لە

سەفەری بێهۆشیمدا چووبێتمە قووڵایی ناخی خۆم و لەوێدا بە کەرەستە و ئەداتێکی نهێنی لە خۆم ڕوانیبێت و بینیبێتم فریشتەکەم بەڕاستی مردووە. کە سەرم نایە سەر سەرین و بە چاوێکی گێژ و مەستەوە لە بنمیچی هۆڵی بیمارستانەکەم ڕووانی، بیرم تەنیا لە خۆم و فریشتەکەم کردەوە ... ئەوە نەبێت، هیچ شتێکی تری گرنگم شک نەدەبرد بیری لێ بکەمەوە. تێگەیشتم ترازانی فریشتە دوو جۆری هەیە، یەکێکیان ئەو ترازانە ماددییە ئاشکرایەیە کە من بینیم و تیا ژیام. ترازانی دووەم ئەو هەستکردنە ڕۆحییەیە بە بۆشایی لە ناخی تاریکی خۆماندا. من کە لەو بێهۆشییە هەستامەوە، دڵنیابووم شتێکم لەدەستداوە و ئەو لە دەستدانەش نەوەک ناخۆش نییە، بەڵکو ئاسوودەمدەکات و وادەکات بێغەمتر لە جاران بژیم. یەکەمجار لە ژیانمدا هەستمکرد بووم بە کەسێکی بارسووک و خۆشڕەوت، وەک کەسێک لە ژێر چاودێرییەکی گەورە دەربازبووبێت، هەستێکی سووکەڵەم بوو. بۆ یەکەمجار دوای پتر لە بیست ڕۆژ هەستمدەکرد ترازانی فریشتەکەم چ باش و چ سوودبەخشە. کە پزیشک و تیمارچییە ئێرانییەکان لێم دووڕکەوتنەوە، بۆ دوو سەعات ئاسوودە پاڵکەوتم و بولبولیارم لە یادکرد، دڵڕەقییەکی خۆشتام و فێنک دەرونی گرتبووم. لەسەر جێگاکەم بۆ یەکەمجار بە قووڵی و لەزەتێکی تایبەتییەوە بیرم لە چییەتی و چۆنێتی دڵڕەقی کردەوە. دڵڕەقی دوو جۆری هەیە، یەکێکیان دڵڕەقییەکە مرۆڤ خۆی ئەنجامی دەدات، زادەی کار و کرداری خۆیەتی، هەر تراژیدیایەکی لێبکەوێتەوە دەستکرد و بەرهەمی دڕندەیەکی تایبەتە کە لە بوونی قووڵی خۆمان ناترازێت، وەک ئەو کاتەی من گوللەم نا بە ژنە دیلەکانەوە... ئەوە دڵڕەقی تایبەتی من بوو، دڵڕەقییەک خودا نەیدابووە من، بەڵکو زادەی کارخانەکانی خۆم و ژیانم بوو.

ئاسوودە دەستم خستبووە ژێر سەرم و بە نیگایەکی ڕۆشنەوە، بە خۆشحاڵی کەسێکەوە لە ڕۆژێکی فێنک و هەتاو دا لە حەوزێکی شینی مەلە هاتبێتە دەرێ و لەسەر جێپشوویەکی نەرم لە لێواری ئاودا خۆی

لەبەر خۆر هەڵخستبێت، ئاوا لەسەر تەختەخەوی بیمارستان پاڵکەوتبووم، کە بیرم لە کوشتنی ئەسپەکان و ژنەکان کردەوە، هەستێکی دژوار و دەرزیئاسا وەک جاران دڵی نەدەژەنیم و سۆزمی نەدەخرۆشاند. بەر لە ترازانی فریشتەکەم هەستی وا ئاسوودەم نەبوو... ئێستا ئاسوودە و بێخەیاڵ بووم، ئەو بێهۆشییە وەها بوو وەک ئەوەی ڕۆحی منی سەر لە نوێ لەگەڵ دۆخێکی نوێدا ڕێکخستبێتەوە.

جۆری دووەمی دڵڕەقی کە بیرم لێ کردەوە ئەو دڵڕەقییە ڕەسەن و ئەزەلییەیە کە لە دونیا و سروشتدا هەیە، دەستکردی خودا و قەدەر و مرۆڤەکانی ترە. ڕەفتاری مرۆڤ بەرامبەر ئەم دوو جۆرە دڵڕەقییە جیاوازە، زۆربەی مرۆڤەکان دەرهەق بە دڵڕەقی خۆیان کوێر و بێباکن، بەڵام زۆرجار دڵڕەقی دووەم تووشی هەراسان و لەرزیان دەکات، دڵڕەقی خۆیان بە ڕەوا و گونجاو دەبینن، زۆرجاریش دڵڕەقی ئەوانی تر دەکەنە بەهانە تا پەت بۆ دڵڕەقی خۆیان بەرەڵابکەن. من ئەو ڕۆژە کە لە بیهۆشی وەئاگا هاتمەوە، هەستمکرد هیچ دڵڕەقییەک ئیتر نامجوڵێنێت و ئازارم نادات. ڕاستە ئەو دەمیش لە ناخی دڵمدا بڕیارمدا هەموو شتێک بکەم فریشتەکەم بژی و بمێنێتەوە، بەڵام مەسەلەکەم وەک پاراستنی شتێکی بەنرخ هاتە پێشچاو کە پەیوەندییەکی زۆر گرنگی بە مۆراڵی تایبەتی منەوە نییە، وەک چۆن دەوڵەمەندێکی بەدکار و حەزنەخۆش دەیەوێت تابلۆیەکی قەشەنگ بۆ ئەو بێت، بەوجۆرە حەزم لە پاراستنی فریشتەکەم بوو، نەمدەویست بمرێت و جێمبهێڵێت، نە لەبەرئەوەی مردنی تەواوەتی ئەو مردنی دیوێکی گرنگی خۆم بوو، بەڵکو لە ناخی دڵمەوە هەستم بە دوودڵییەکی گەورە دەکرد، وام هەستدەکرد ئەوەی جێیهێشتووم شتێکی منە و دواجار گەر لە دونیادا نەمێنێت نازانم چی ڕوودەدات. چۆن هەموو مرۆڤێک وەهمێکی هەیە و پێوەی دەنووسێت، منیش بڕیارمدابوو دەست بەو وەهم و خولیایەوە بگرم. ئێستا وەک کوڕێکی گەوج و نالەبار لەو فریشتە نەگریسەم دەڕوانی کە باوکی لە ماڵ دەریدەکات، بەڵام ئاواتی مردن و فەوتانی بۆ ناخوازێت... وەک زۆر شتی دیکەی دونیا کە

دەمانەوێت هەبن و بژین، بەڵام دوور لە ئێمە. لێرەدا دەبێت تکایەک بکەم و بڵێم، دەبێت بزانن من هەمیشە هەستێکی تێکەڵاو و ناکۆکم بەرامبەر فریشتەکەم هەبووە، ئەم کتێبە گەورەیەش هیچ نییە جگە لە نوسینەوەی مێژووی ئەو هەموو وێستگە و هەستە ناکۆک و نەخۆشانەی منی بەو بوونەوەرەوە گرێداوە، لەبەرئەوە هەر کات، هەر ڕستەیەک لەسەر پەیوەندی من و ئەو دەخوێننەوە وامەزانن ئەوە دوا هەست و دوا ڕستە و دوا وێستگەیە، چونکە لەمجۆرە پەیوەندیانەدا دوا هەست و دوا ڕستە و دوا وێستگە بوونیان نییە.

بە سافی و ڕۆشنی و بێدڵگرانی، هەستمکرد کە قەیرانی ئەو چەند ڕۆژەم تێپەڕاندوە کە مەراقی فریشتەکەم و بولبولیار دونیایان تەنیبووم، لە بەردەم خۆم و دونیادا پەرێشان و ماندوو دەردەکەوتم... ئێستا دەمتوانی بە هەستێکی سادە و ئاساییەوە وەک جاران دەستبکەمەوە بە کاری حیزبی و هەست بە هیچ نادڵنیاییەک نەکەم. لە ساڵانی دووروودرێژی خەباتی سیاسیمدا، کەسم نەبینیبوو لە بەر ئازاری ویژدان بمرێت یان هەر واز لەکار و سیاسەت بهێنێت. بۆیە ئەستەم بوو لەو کاتەدا گەمژەیی وەها بنوێنم و لێگەڕێم ویژدان لە کارم بخات، ویژدان وەک گووتم جەلادە تایبەتییەکەی خۆمانە کە دەکرێت هەندێجار بێدەنگی بکەین. لە وڵاتێکدا توندوتیژیی زۆر بێت، مرۆڤەکان ناچارن پێکڕا و بە کۆ دەست لە ویژدانیان هەڵگرن. دەبێت بڵێم، ویژدان شتێکە تەنیا بۆ ڕۆژانی ئاسایی کراوە، شتێکە لە چەشنی کەمالیات، تایبەتی سەردەمێکە ژیان لەبەردەم هەڕەشە و مەترسیدا نەبێت. من لەپاڵ ئەو هەستە تاریکەی وەفاداریدا بۆ حیزب، هەستێکی ترسناکی واقعیەتیشم هەبوو... من پیاوێکی واقعی بووم. دەزانن چەند ترسناکە مرۆڤ واقعی بێت؟ ساڵانێک دواتر کە چیتر واقعی نەمام، تێگەیشتم مرۆڤ دەمێک واقعی دەبێت چ بوونەوەرێکی ترسناکی لێدەردەچێت، دەمێکیش ئەوە لەدەستدەدات، وای خودایە، خۆی تووشی چ دەردەسەریی و نەهامەتییەک دەکات.

دوای چەند سەعاتێک، کە دکتۆرەکان ڕێگایان پێدام هەستم و جێگاکەم چۆڵبکەم، بە هێمنی و بێهیچ شپرزەییەک، بەرەو لای بولبولیار گەڕامەوە. خاویی هەنگاوەکانم نیشانەی ئاسوودەگییەکی ترسناک بوو، وەک جەنگاوەرێک بێباک لە مەیدانی دوای جەنگدا بە نێو تەرمی کوژراوانی دوژمندا هەنگاوبنێت و لەزەت لەو ڕۆشتنە هێمن و بێترسەی ببینێت. دەڕۆیشتم و دەمویست درەنگتر بگەمە بەردەمی بولبولیار، وەک ئەوەی بەو خاوی و هێمنییەم بیسەلمێنم کە دوای ترازانی ئەو فریشتەیەم، سەردەمێک دێتە پێشێ، ڕۆژگاری بەردەوامیمە لەسەر ژیانی ڕابوردووم، ڕۆژگارێکە خاڵی لە دوودڵی و بەدخەیاڵی ساڵانی پێشوو. کە چوومەوە سەر هۆشەنگ، سەیر بوو بەلامەوە لە جێگاکەیدا بە چاوانی کراوەوە لە پەنجەرەیەکی تەنیشتی خۆی دەڕوانی. پێدەچوو چەند سەعاتێک بێت هۆشی هاتبێتەوە، پێدەچوو پێکەوە هۆشمان تێکەڕابێتەوە. نیگاکانی قورس و نیشتووبوون... ئاسەواری چەندە ڕۆژ نەخۆشی و بێهۆشی بە نیگایەوە بوو، بەو ڕیشە ژاکاوەوە دیمەنی پەیامبەرێکی غەمگینی دەدا. لە بینینی من کەمێک سەراسیمە بوو، وەک نەمناسێتەوە یاخود بوونی من لەوێکانەدا تورەیبکات، یاخود هەر نەزانێت ئەم جێگایە کوێیە و خۆی لەو پێخەفەدا چی دەکات، لە بێدەنگییەکی قووڵ و ئاڵۆزەوە ئاڵابوو. کە چوومە بەردەمی، نیگاکانی چەشنێک بوون وەک لەو دیوی منەوە بۆ شتێکی دی بڕوانێت. ماوەیەک بێدەنگ سەیری یەکترمان کرد، بەو چاوە گەش و ڕوخسارە هێمنەوە بە دەرویشانی دەکرد و بەوانیشی نەدەکرد... ڕوخساری گەڕۆکێکی ڕۆحانی هەبوو. بۆ چرکەیەک کە لێم دەڕوانی کەشتییەوانێکی ماندووم هاتە بەرچاو لە تۆفاندا بۆ دوورگەیەک گەڕابێت و نەیدۆزیبێتەوە، شتێک بوو لەوجۆرە، دەریاوانێک لە ئاودا بۆ ئەبەد ونبووبێت، کاروانچییەک ڕێگاکان ببەن و ببەن و نەگاتە جێگا، مەلەوانێک لە گۆمێکی کەنار سەرابی و بێ ئاسۆدا، کەسێک بەدوای مرواریدا چووبێتە بنی دەریا و هیچی نەدیبێت و ئێستا بۆ هەناسەیەک سەری دەرهێنابێتەوە، پێڵوەکانی تەڕێتییەکی نادیار و بریسکەی تیشکێکیان لەسەر بوو، کە ئاو و تیشکی ئەم جێگایە نەبوون، وەک

خەڵکی شوێنێکی دوور لێرە هاتە بەرچاوم. یەکەم شت پرسی ئەوەبوو «هەڤاڵ، باڵەکانت کوان؟». دەنگی غەمگین و بریندار هاتە گوێم، وەک دەنگی کەسێکی نەخۆش نەبوو، بەڵکو لە دەنگی کەسێکی پرسەدار دەچوو، تازە لە شینێکی گەورە هەستابێ. هیچ هەستێکی تایبەتیم نەبوو، نە بەرامبەر فریشتەکەم، نە بەرامبەر خۆم، نە بەرامبەر ئەو. نیازم نەبوو دەمودەست وەڵامی بدەمەوە. تاکە شتێک لەو ساتەدا دەمزانی ئەوە بوو کە نامەوێت فریشتەکەم بگەڕێتەوە و ناشمەوێت لە دەستی بدەم، دڵنیا نەبووم ئەم دۆخە ڕۆحییەی ئێستا تێیدا دەژیم چەند بەردەوام دەبێت، دەمزانی فریشتەکەم لەو ساڵە دوور و درێژانەی ململانێدا، زۆر بیر و بۆچوون و خەیاڵی تێدا چاندووم کە ئاسان ناسڕێنەوە... هەستمدەکرد چۆن لە چاوانی نابینایەکدا ئاسەواری وێنە دێرینەکانی دونیا دەمێنێت، لەدوای کۆچی فریشتەکانیش، ئاسەواری بوونی جارانیان لە ناوماندا دەژی. مرۆڤ کە بۆ جارێک دونیای بینی، دواتر بشبێتە نابینا، یادگاریی و وێنەکانی لە یاد ناچنەوە، شێوەکان و ڕەنگەکان و ڕۆشنییەکان بۆ ئەبەد لە سەریدا دەمێننەوە. ئەو ساتە کە بەرامبەر بولبولیار وەستام، بیرم لەوە کردەوە من ئەم پیاوە نەخۆشەم هێناوە ڕزگاریبکەم؟ دەمزانی بەراورد بە ڕۆژانی پێشوو ساردبوومەتەوە، چیتر ئەو پاڵهێزە گەورەیە لە خۆمدا هەست پێناکەم کە ڕۆژانی پێشووتر داگیریکردبووم، بووبوومەوە بە وەفاکەی جاران، بە هەڤاڵ جەنگیزەکەی حیزب و شۆڕشی لە هەر شت لا گرنگتر بوون، بەڵام هێشتا دەنگێکی کز وەک چرکەی کاتژمێرێک لە ژێرزەمینێکی دوورەوە بێت، دەنگێک چەندین دیواری خامۆشی ببڕێت و کز کز بگاتە گوێم، دەیترساندم. دەمزانی چیتر فریشتەیەکم نەماوە بمترسێنێت، زۆر جۆری خولیا و خەیاڵات کە خەڵکی دی دەخەنە ژێر بەرداشی خۆیانەوە و دەیانهاڕن چیتر ناتوانن من ئازاربدەن، بەڵام لەو ساتی غروور و بێباکییەشدا، دەمزانی ئەو باڵدارە نەگریسە لێرە بێت یان نا، مرۆڤ کە خولیای ژیانێکی تر کەوتە سەری، ئەو خولیایە لە ناوەوە وەک کرم دەیخوات. فریشتەکان بەر لەوەی بڕۆن نامەیەک لە ڕۆحماندا جێدەهێڵن و پێماندەڵێن «جۆرێکی تر بژی»، نامەیەکی کورت و بێمانا و

ترسناک وەک خودی ژیان خۆی، چما فریشتە دەتوانێت شتێکمان پێبلێت لە ژیان خۆی نەچێت؟... ئەو دەنگە کزە وایدەکرد نەمەوێت فریشتەکەم لەدەستبدەم. بەڵام هەر ئەو کات دەشمپرسی بۆ ژیانێکی دی هەڵبژێرم، ئەم ژیانەی خۆم عەیبی چییە و لە چی کەمە؟. دڵنیابووم هیچ ژیانێکی تر نییە لەمەی خۆم باشتر... دەزانم هەمیشە دەنگێکی تر هەیە دەڵێت تۆ دەکرا باشتر بیت، بەڵام ئەوە درۆیە و هیچی تر ... نەدەکرا باشتربم، نەدەکرا کەس باشتر بێت لەوەی کە هەیە، هەتا سەدام حوسەینیش نەیدەکرا لەوە باشتربێت، هەموو شتێک لۆژیکی خۆی هەیە، هەر سەردەمە و بۆ باشە و خراپە سنووری خۆی هەیە. خراپە بۆیە دروستکراوە تا هەبێت، بەڵام خراپە چییە؟ سەردەمی وا هەیە سەربڕینی مریشکێک تێیدا تاوانە، سەردەمی واش هەیە سەربڕینی هەزاران منداڵان وەک بەشێک لە پێداویستییەکانی ژیان و مانەوە سەیردەکرێت. من واتێدەگەیشتم گەر ئێمە هەموومان باشتر بووینایە، گەر من و هەڤاڵ شێرخان و سەرۆک و لیڤیتانت و ئەوانیدی هەموو لەوە باشتربووینایە کە هەین، کەسانێکی تر ئەو کارانەیان دەکرد کە ئێمە کردمان، هەر قۆناغە و کۆمەڵێک کاری هەیە دەبێت بکرێن، کۆمەڵێک کوشتار و دڵڕەقی تێدایە دەبێت تاقیببنەوە ... هەتا کارە زیاد و بێسوود و نەفامەکانیش، ئەوانیش بەشێکن لەو سەردەمە، بەشێکن لە خۆراکی سەر ئەو سفرەیە. بەشی هەرە زۆری ژیان و مێژوو لە کاری زیاد و بێسوود دروستبووە. من دەبوو ئەو ژنانە بکوژم، نە لەبەرئەوەی پێویست بوو بیانکوژم، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو جۆرە تاوانانە بەشێک بوون لە ڕەوتی مێژووی من و ئەوان، بەشێک بوون لە ڕووداوەکان و لە دونیا... ئەوەی هەندێک ژن بکوژم، هەمیشە بەشێک بووە لە ئارەزووی ئەو جانەوەرە دێرین و دڕندەیەی ناو ناخم، دەبوو ئەو دیوەی من بێتەدەرێ و خۆم ببینم، گەر نەهاتبایەتە دەرەوە، گەر من نەمبینیایە، جیهان جوانتر نەدەبوو، بەڵکو نوقسان و درۆزن دەینواند. مێژوو لە هەزاران ساتی بچوک و بڕیاری کتوپڕ و ڕوداوی بێبەهانە دروستبووە، ژیانی منیش بە هەموو هەڵەکانییەوە بەشێک بوو لە تابلۆی گەورەی ئەو عەسر و زەمانە، گەر ئەوە نەبایە نیگارەکان ناتەواو دەهاتنە

پێش چاو، کۆمەڵێک کوشتاری بێمانا هەیە مرۆڤەکان بەتەنیا نایکەن، بەڵکو هەموو پێکەوە بۆ تەواوکردنی تابلۆکە پێویستمان پێیەتی، وەک چۆن هونەرمەندێک هەمیشە پێویستی بە برێک بۆیەی زیاد هەیە تا بۆشاییەکانی سەر نیگارەکەی خۆی پێبگرێت، چۆن لەخوداترسێک پێویستی بە کۆمەڵێک نوێژی زیاد هەیە، خەوبینێک پێویستی بە کۆمەڵێک خەونی زیاد هەیە... سیاسییەکیش پێویستی بە هەندێک کوشتاری زیاد هەیە.

لەوساتەدا دەمتوانی پشتبکەمە بولبولیار و فریشتەکەم و بڕۆم و بچمەوە سەر کاری خۆم. بەڵام وام بە خەیاڵدا هات شتێک بکەم بۆ هەموومان باش بێت. لەوساتەدا وابیرمکردەوە کە من لە ناخدا مرۆڤێکی باشم، خراپەکانم شتی کورت و ساتەوەختین ... بۆ ئێستێکیش کە سەیری بولبولیارم کرد، بەخۆم گووت چاکە جەوهەری هەموو مەخلوقاتە، منیش ئەو جەوهەرەم تێدایە و دەبێت هەوڵبدەم گەر بۆمکرا و زیانی بۆ خۆم و برواکانم نەبوو، باشبم، دڵنیابووم وەک چۆن پێویستیم بە خراپە هەیە، ئاوهاش پێویستیم بە چاکە هەیە، هەردووکیان بۆ من یەک تامیان هەبوو. ئێستا بۆ من شتێک نەبوو ناوی چاکە یاخود خراپە بێت، بەڵکو گرنگ ئەوەبوو کامیان لەو ساتەدا گوزارشت لە ئارەزووی من دەکەن. بولبولیار جارێکی دی دەربارەی باڵەکانم پرسیاری لێکردمەوە، من ئەمجارە بەئەسپایی لێی نزیکبوومەوە و توند دەستیم گرت و گووتم «بولبولیار دەتوانیت بڕۆیت، دەتوانیت هەستیت؟ ئێمە ئێستا لە ئێرانین، دەبێت بگەڕێینەوە». لەسەرەخۆ خۆی جوڵاند و کەوتە سەر پشت. ماوەیەکی کەمێک درێژ چاوانی داخست و بێئەوەی هیچ بڵێت چووەوە ناوخۆی. حەزمدەکرد بە زووترین کات ئێران جێبهێڵم. دەمزانی نازانێت چی بڵێ. هەندێک جێگا لە ژیاندا تەواو وەک هەندێک جێگا وان لە ناو فیلمێکدا کە چیتر سیناریۆنوسەکە نازانێت دەبێت چی ڕووبدات. جێگایەکە هەموو حەزدەکەین شتەکان لەوێدا بوەستن و بگەڕێینەوە بۆ ماڵێ و دوای ئەوە هیچی دی ڕوونەدات، بەڵام دەشزانین کە دەبێت شتەکان بڕۆن، دەبێت

شتێکی تر ڕوویدات. لەو ساتەدا ئاواتم دەخواست هەموو ئەم ژیانەی من ڕۆمانێک بووایە و پێنوسەکەم دابنایە و بڵێم تا ئێرە و بەسە با ئیدی هیچی دی ڕوونەدات. بولبولیار لەوساتەدا لەو دۆخەدا بوو، کە دەیزانی دەبێت شتێکی دی ڕوویدات، هەموو دەمانزانی کە دەبێت شتێکی دی ڕوویدات، بێئەوەی بمانەوێت ڕوویدات، بێئەوەی بزانین چییە، بەڵام دەمانزانی هەمیشە شتێکی تر هەیە کە ڕوودەدات، شتگەلێکی تر، چەندین ڕووداو کە ناتوانن نەبن، ئێستا نین، بەڵام دەستێک هەیە ناهێڵێت نەبن. خراپترین سیفەت لە زەمەندا ئەوەیە کە هەمیشە بەردەوامە.

لای زۆربەی خەڵک، ئەو ڕۆژانی ترسناکی کۆڕەوە، ساتی کۆتایی دونیا بوو... ڕەوەکە بەو ڕوخسارە تراژیدییە گەورەیەوە، ترۆپکی مێژووییەک بوو ڕیشەکەی دەگەڕایەوە بۆ سەدان ساڵ لەمەوبەر، ساتەوەختی هەرەسێکی قەشەنگ بوو، کۆتایی تراژیدیی و جوانی شۆڕشێک کە جگە لەشکستی وا گەورە بە هیچ شتێکی دی هەڵنەدەستایەوە، کۆتایی قەقنەسئاسای میللەتێک کە دواجار دەبوو ببێتە خۆڵەمێش تا لە خۆڵەمێشەکەیەوە میللەتێکی تر باڵبگرێت، بەڵام چ میللەتێک؟. من درەنگ زانیم ئەودەم سەرتاپای دونیا، چاوی تەواوی ئەم ئەستێرەیە لەسەر ئەم بستەخاکەی ئێمە بووە. لەو ساتەدا من تاکە کەسێک بووم ئەو شکستەم وەک پەردەی کۆتایی نمایشێکی ئەفسانەیی سەیرنەدەکرد، بەڵکو وەک پردی پەڕینەوە لە بەرگی یەکەمی کتێبێکەوە بۆ بەرگی دووەمی. من یەک وانە لە مێژوو فێربووبووم، ئەویش ئەوەیە هەمیشە و بە جۆرێک لە جۆرەکان دۆڕاوەکان براوەی ڕاستەقینەن، هەستدەکەم جاران وانەبووە، کە دەڵێم جاران، مەبەستم دوو ساڵ لە مەوپێش نییە، بەڵکو دوو سەد ساڵ و بگرە زیاتریش. جاران ئەوەی دەدۆڕا بۆ هەمیشە و بەتەواوی دەدۆڕا، بەڵام ئێستا وا نییە، سنووری دۆڕا و براوە ئاسان جیاناکرێتەوە... نازانم بۆ وایە، بەڵام هەستدەکەم ئەوەش نەخۆشییەک بێت لە ئەورووپییەکانەوە بۆمان مابێتەوە. من لە ئەزموونی خۆمەوە فێربووبووم لە براوەکان

نەترسم، براوەکان ترسناک نین، بەڵام وای لە دەست دۆڕاو... دۆڕاو مەترسییەکی بەردەوامە و دەشێت لە هەر ساتێکدا هەستێتەوە و بە هێزێکی نوێوە بگەڕێتەوە. نازانم چۆن، بەڵام ورد سەیری مێژووبکەن دەبینن کە قسەکەم بەهانە و لۆژیکی خۆی هەیە، هەر ئەوەش وایدەکرد، بە جۆرێکی بێمانا لە فریشتەکەم بترسم. لەو ساتەدا دڵنیابووم گەرچی ئێمە دۆڕاوین، گەرچی ملیۆنان ژن و پیاوی ترسنۆکین و داومەنەتە کێوان، بەڵام وەک ئیلهامم بۆ هاتبێت فیلمێکی دیکە لەسەری مندا ئیشیدەکرد، شتێکی دیکەم دەبینی، من بە جۆرێک لە جۆرەکان «کە دڵنیام هەستێک بوو، ڕوونتر لە هەر شتێکی دی دیوە پێکەنیناویی و بێماناکەی مێژووی نیشاندەدایەوە» خۆمانم وەک سەرکەوتوو دەهاتە پێشچاو. لەو ساتەدا کە دەمویست شتەکان بۆ بولبولیار بگێڕمەوە و هێشتا دوودڵ بووم لەوەی ئایا دەست پێبکەم یاخود نا، ئەو ئیلهامە بێمانایەم بۆ هات، کە ناوی دەنێم ئیلهامی کارمەندە ڕەسەنەکانی بواری سیاسەت و ئاسایش، هەستێکی نابەجێ و سەیربوو کە دڵنیام لای هەر کەس بمدرکاندبا قاقا دەکەوت بە پشتدا، هەستێک بوو پێیدەگوتم کە ئیتر سەردەمی دەسەڵاتی بەعسییەکان بۆ هەتاهەتایە کۆتاییهاتووە. ئاه، خۆشەویستان چاوەڕوانی چی دەکەن؟ کارمەندێکی ئاسایش دەبێت چ جۆرە ئیلهامێکی تری بۆ بێت، هەڵبەت ئیلهامی کەسێکی وەک من وەک ئەو ئیلهامە نییە کە دەچێت بۆ حەزرەتی مەحوی یاخود بۆ تایەر بەگی جاف یان هەر یەکێک لەو شاعیرانەی دەشێت لای ئێوە گرنگ بن. ئەو ژێرخانەی داگیرکەرە عەرەبەکان لە سەد ساڵی ڕابوردوودا لە کوردستان دروستیانکردبوو بۆ هەتا هەتایە هەرەسی هێنابوو ... هەست و بۆنم وەک شەڕکەرێکی دێرین پێیدەگوتم دروستکردنەوەی ئەوەی کە ڕووخاوە بۆ بەعسییەکان ئەستەمە. گەرچی خەڵک خۆیان ئامادەدەکرد وەک فەلەستینییەکان دەیان ساڵ لە سەر سنوورەکان لە خێوەتدا بژین، بەڵام لەو بیمارستانەدا و لە ترۆپکی ئەو بەدبەختییەدا من هەستێکی خراپم نەبوو. نەمدەویست ببمەوە گەڕیدە و ئاوارەی شارەکانی ئێران ببم، حەزمبوو ئەوەی ماوە لە کاری ڕاپەڕین تەواویبکەم، شەرمم لەخۆم دەکرد

دوای هەموو ڕاکردنێک لەم کەنارە نالەنگەر و بێپێشوازەدا بگیرسێمەوە. ئێرانییەکان میهر و لوتفیان دەنواند و بەزەییان زۆر بە ئێمەدا دەهاتەوە، نزیکی حەڤدە ساڵ بوو ئێمە هەر خەریکی هەڵهاتن و گەڕانەوە بووین بۆ ناو خاکی ئەوان، بەڵام وەک هەموو بەزەییەک شتێک لە قێز و نزمبینی قووڵیش لە چاویاندا بوو، قێزێک ڕەنگە دواتر و لەسەردەمانێکی تردا ببێتە مایەی کینەیەکی ناوەکی و نهێنی و ئەبەدیی. ئێرانییەکان وابوون، هەمیشە خۆیان لە میللەتەکانی تری ئەم ناوە بە گرنگتر دەبینی ... بۆچی نازانم؟ مەسەلەکە هەر ئەوە نەبوو ئەوان دیزی و قورمە سەبزیان دەخوارد و ئێمە نەماندەخوارد، بەڵکو شتی تریش بوو، بۆ نمونە گەر ئێرانییەک بچووبایە بۆ ئاسمان هەموو ئەوانی دیش وایان هەستدەکرد چوون بۆ ئاسمان، یان گەر یەکێکیان لە زۆرانبازیدا مێدالیکی ئاڵتوونی ببردایە گەورە و بچوکی مەملەکەت وایاندەزانی خۆیان ئەو مێدالەیان گرتووە، ئەوان بەوجۆرەن، گەر یەکێکیان شتێک بزانێت ئەوانی دیش هەموو وادەزانن دەیزانن، بەڵام ئێمە وانەبووین، گەر هەمووشمان شتێک بزانین وادەزانین کەسمان نایزانین. ئەوە چاڵێکی قووڵی لە نێوان ئێمە و ئەواندا هەڵکەندبوو، کە گەورەتر بوو لە چاڵی زمان و مەزهەب. دەمویست تا زووە پەلی بولبولیار بگرم و لێرە دەرچم. چی دەقەومێت گەر ئێرانییەک بزانێت من فریشتەیەکم هەیە، ئەوسا هەموو ئێرانییەکانی دیش دەزانن، دوایی دڵنیام چیرۆکەکە بە بەدبەختی و دەردەسەرییەکی زۆر بۆ من تەواو دەبێت. بەتایبەت دەزانم ئێرانییەکان زۆر مەستی شتی ئەودنیایی و ئەفسانەیین. وەک شتێک ڕاموەشێنێت، هەر چاوانی گەشی بولبولیارم بینی، هەر ئەو خەفەتە قووڵەی ناو نیگای کەوتە بەر دیدەم، شتێکی نهێنی پاڵی پێوەنام ئەم مەملەکەتە بۆ خەڵکی خۆی چۆڵبکەم و بمەوێت جارێک بەبێ ئەم وڵاتە جوان و فراوان و سەیرە، چارەنوسی خۆم بخەمە سەر ڕێ و وابکەم کارم نەکەوێتەوە ئەم خاک و دەڤەرە.

بولبولیار ماوەیەک چاوانی لێکنا و دواتر کردنییەوە و بە ئەسپایی پرسی «بۆ تەواو نابێت؟». من لەوساتەدا خەیاڵم لای تەواوبوونی هەتاهەتایی

بەعسییەکان بوو، بەڵام ئەو گووتی «بۆ لاوازیی و گێژیم تەواو نابێت، دەمەوێت هەستم». من دەستم خستە ناو دەستی و کەمێک لە جێگاکەی خۆیدا ڕاستمکردەوە. بە دەنگێکی کز گووتی «چ خۆشە بێهۆشی». ئەوە هەمان هەستی قووڵی منیش بوو دەمێک لە بەر دەرگای پزیشکاندا بێهۆش بووم و دواتر هەستامەوە. نەمزانی بۆ بولبولیار خۆشی لە بێهۆشی هاتووە، بەڵام چاوانی ئەویش بریسکەیەکی قووڵ و پڕ نهێنی تێدا بوو، وەک ئەوەی بێهۆشی لە حەقیقەتێکی قووڵی بنی ژیان دڵنیایکردبێتەوە. پێمگووت «دوێنێ شەو حاڵت زۆر خراپ بوو. چوومە لای دکتۆرەکان، لەوێ لەبەر دەرگای پزیشکەکان منیش بێ هۆ کەوتم و بێهۆش بووم ... بەڵام پێمبڵێ چ خۆشییەکی تێدایە بێهۆشی؟». بولبولیار گووتی «نازانم. خۆشییەکەی ئەوەیە هیچ کەس نابینیت. ئەوە جیاوازییەتی لەگەڵ مردندا. لە مردندا وەک دەڵێن کەسانێک لەو دیوەوە چاوەڕوانتن، بەڵام لە بێهۆشیدا نا... هیچ کەس نابینیت، خۆتی بە تەنیا، مردن نییە بپرسیت لەودیوەوە چی هەیە، ژیانیش نییە بپرسیت دوای ئەوە چیبکەم، نە مرۆڤی لێیە و نەخودا، ئەو دوورییەیە کە هەمیشە سەیرمکردوە و ڕوانیومە بۆی». کەمێک بیرمکردەوە و لە دڵی خۆمدا گووتم «کابرا لەسەر هەقە». جوانی بێهۆشی لەوەدایە مرۆڤ دەمرێت، بەڵام بێئەوەی بەهەشت یان دۆزەخ یان خودا ببینێت دەگەڕێتەوە... بولبولیار سەیرێکیکردم و گووتی «وەک ئەوەیە سەرێک لەو دونیا بدەیت و لە سەر سنوورەکانەوە بنواڕیت و ببینیت هیچی تێدا نییە، جگە لە تاریکی». دوای ئێستێک شتێکی ترسناکی بۆ زیادکرد و گووتی «وەک مردن هەر تاریکی بێت، تاریکی و هیچی تر. خەڵکی بێهۆش پێیدا بڕۆن و تەواو». ئەو وێنەیە هەم سەرسامیکردم و هەم ترساندمی. بولبولیار مردنی بە ترسناکترین شێوە بۆ وێنا دەکردم، ئێمەی ئادەمیزادان نامرین، بەڵکو بێهۆش بە تاریکییەکی ئەبەدیدا سەفەردەکەین. بێهۆش بە تاریکیدا ... بێهۆش ... بە تاریکیدا دەڕۆین، دەڕۆین، دەڕۆین و ناگەینە هیچ جێگایەک. گووتم «وازبهێنە، مردن خۆی خۆش نییە، تۆش هێندەی تر داوودەرمانی ژەهراوی پێوە مەکە، خوادەتگرێت، هەردووکمان دەردەدار و نەخۆشین، حەوسەڵەی

ئەوەمان نییە بیربکەینەوە چ جەهەنەمێ لەویتر خراپترە، خوادەتگرێت بیبڕەوە». من نەمویست زۆر لەسەر ئەو وێنەیە بوەستم، خۆشی بێهۆشی لای من، خۆشی ڕزگاربوونم بوو لە دەست ئارەزووەکانی خۆم، لە دەست خەیاڵاتێک ئەشکەنجەیان دەدام، دەمویست مردنیش هەر بەوجۆرە ببینم. گووتم «ئەمڕۆ هەوڵدەدەم بزانم پزیشکەکان ڕێگا دەدەن لە بیمارستان بڕۆینە دەرێ؟». ماندوو چاوانی لێکنا و گووتی «کێ منی هێنایە ئێرە؟». پرسیارەکەی چەشنێک بوو وەک تاوانێکی گەورەی دەرهەق کرابێت. گووتم «من ... تۆ لە دۆخێکی باشدا نەبوویت، ژیانت لە مەترسیدابوو. بێهۆش لەسەر سنوور تۆم دۆزییەوە، تەنها بوویت، کەست لەگەڵ نەبوو، یەکێک لە ژێر خێوەتێکی پەڕپوتدا فڕێیدابوویت و ڕۆیشتبوو، خەریکبوو دەمردی. کوڕی ئاسمان تۆ لە کوێ بوویت، من لە پێش گرتنی کەرکوکەوە تا دوو ڕۆژیش پێش ئەم ڕاکردنە کون و قوژبنی شارت بەدوادا گەڕام و نەمدۆزیتەوە. پێم ناڵێی لە کوێ خۆت وا قایمدەکەیت... خێرت ناگا بەوجۆرە خۆت دەشاریتەوە». وەک هێشتا نەزانێت چی ڕوویداوە، گووتی « بۆ لەسەر سنوور؟». گووتم «شۆڕش تەواو، ڕاپەڕین شکستی هێنا، دەوڵەت گەڕاوەتەوە بۆ شارەکان، ملیۆنەها خەڵک هەڵهاتوون. چییە؟ هیچ شتێکت یاد نییە یان خۆت بە گەمژەییدا دەدەیت تا من بخەیتە قسە... نازانم کێ تۆی گەیاندبووە سەر سنوور، یەکێک تۆی لە ژێر چادرێکدا داپۆشیبوو و ڕۆیشتبوو». چاوانی لێکنا و وەک شتێکی ترسناکی بەیادا بێتەوە دەستی گرت بەدەموچاوییەوە و گووتی « نەخۆشبووم، بێهۆش و نیوەبێهۆش، نازانم هەندێک شتم لە یادە، دەزانم بە نەخۆشی منیان گواستەوە ... هیچ نازانم، بەڵام هەڤاڵ بەڕاست باڵەکانی تۆ کوان؟».

ئەوە ساتی حەقیقەت بوو، توند دەستیم گرت و هەموو شتێکم لادرکاند. پێمگووت من ئەوەندە باش نیم بمەوێت لە خۆڕا ڕزگارتبکەم، من پەرێشان بووم، فریشتەکەم ترازا و پێویستم بە کۆمەکی تۆیە تا نەمرێت. پێمگووت فریشتەکەمم لە جێگایەک پاراستووە و دەمەوێت نەمرێت، بەلامەوە گرنگە

نەمرێت، با هەرچی بووە کارێکبکەین زوو بگەینەوە فریای. بەڵام ئەوەشم خستەسەر و گووتم بولبولیاری هاوڕێم، بەڕاستی نازانم چی لێبکەم، ناتوانم لەگەڵیدا بژیم، ناتوانم لەگەڵیدا تەبابم، نامەوێت ژیانی خۆم بۆ ئەم مەخلوقە غەریبە و داواکارییەکانی تەرخانبکەم، ناتوانم گوێی خۆم لە هەموو ڕاستییە گەورە و تاڵەکانی ئەم ژیانە کەڕبکەم و بێم و دوای هاواری دەنگێک بکەوم کە نازانم چی دەوێت. گووتم هیچ کەس ناتوانێت ببێتە کەسێکی تر، هەموو یەک ژیانمان هەیە و تەواو، دێین و دەکەوینە سەر ڕێگایەک و دەمانبات. بیرکردنەوە لەوەی ببین بە کەسێکی تر، گەمژەییە. تکایە گەر دەتەوێت یارمەتیم بدەیت، ئەو قسە پوچانەم بۆ دووبارە مەکەوە، سەبارەت بەوەی خۆم بگۆڕم، کەس خۆی بۆ ناگۆڕێت، لە سەرەتاوە چۆن لەدایکبووین هەروا دەبین.

تووڕەبووم، هەڵچووم، گووتم فریشتەکان گەمژەن، من دەمەوێت ژیانی خۆم بژیم، دەمەوێت خەوی بوونی دونیایەکی باشتر و مرۆڤێکی باشتر و منێکی باشتر لەوەی کە هەیە لەخۆمدا بکوژم. هەموو ئەو شتانەی کە ڕوویاندا دەبوو ڕووبدەن. هاوارمکرد و گەرووم نوسایەوە، دەستەکانم عارەقیان دەردا، سوور هەڵگەڕام، گەرووم گیرا، بەجۆشێکی بێوێنەوە باسم لەوەکرد کە کارەساتی ئەم ژیانە لە خەونی دونیایەکی باشەوە هەڵنەهاتووە، ڕاستە بەهەشت دایکی هەموو دۆزەخەکانە، ئەوە هەموو گوێرەکەیەکی عاقڵیش دەیزانێت، بەڵام لە بنەڕەتدا بیرۆکەی منی باش، منی فریشتەیی، باوەگەورەی هەموو خەتاکانە. هاوارمکرد و گووتم ئەم فریشتە مەلعونانە هیچ کات نەیانتوانیوە گوناهێک لەسەر زەوی بگێڕنەوە. لالێوانم کەفێکی سپی چڕی دەچنی، چاوانم زەق و زۆپ و سوور دەیانڕوانی و لە تووڕەیی زیاتر هیچیان تێدا نەبوو. بە ساردییەوە گووتی « چیتر فریشتەکەت ڕۆیشتووە، بۆ تووڕەیت. دەتوانیت بەوجۆرە بژیت کە خۆت دەتەوێت... تووڕەمەبە ... دەتوانیت چۆن ژیاویت وابمێنیتەوە، هەر بەو دەموچاوەی خۆتەوە. ئاە خوایە کەسم نەدیوە وەک تۆ ژیانی خۆی خۆشبوێت. چییتە بەشەر، بۆ وادەکەیت؟ کە ئەوەندە دڵت بە خۆت خۆشە، خۆت بۆ

دەفەوتێنی، بچۆ جێگایەک خۆت قایمبکە و با هەوای خراپیشت لێت نەدات». بەخۆشحاڵییەوە، بە خەندەیەکەوە کە ڕوخساری کەسێکی نەخۆش و هیستیریی دەدامێ سەیرمکرد و گووتم «ڕاستدەکەیت، من کەسێکی وا خراپیش نیم، دەتوانم هەر بەو جۆرە بژیم کە هاتووم. تا من خۆم خۆش ناوێت، بەڵام بیرۆکەی ئەوەی ببم بە کەسێکی تر دڵم تەنگدەکات. هۆشەنگ تۆ نازانیت ئەوە چ خۆشییەکی زۆری تێدایە بۆ من کە هەروا بمێنمەوە ... ئێستا ڕازیم بە دەموچاوی خۆم، تۆش ئیتر لێمگەڕێ». لە ناکاو سەری لێم نزیککردەوە، چاوانی کز و ماندووی بوونە دووچاوی گەش و گەورە، هەستمکرد بیلبیلەی شتگەلێکی نهێنی تێدایە کە تا ئەو کات نەمدیوون. شتێک لە توڕەیی تێدابوو کە کینەی ئەو شەوەی بەیادا هێنامەوە کە دەبوو تیرباران بکرێت و من لە بەر لوولەی تفەنگەکان دوورم خستەوە و ڕزگارمکرد. پرسی «بەڵام تۆ کەی دەموچاوت بووە؟ کەی؟». هەستمکرد زۆر نمەک حەرامە، دەیزانی من چەندجار لە مردن پاراستوومە، کەچی ئێستا وای پێدەگووتم. من دڵخۆشییەکی وەها ترسناک و شێتانە گرتبوومی گوێم لەو توانجە کوشندەیەی نەگرت. هەستمدەکرد ئەمڕۆ دەتوانم زۆر لەزەت لە دڵڕەقی خۆم ببینم ... ساڵەهای ساڵ بوو هەموو جۆرەکانی دڵڕەقی لە ژێر نازناوی «واجیب» «فەرمان» «پێداویستی» دا دەژیام، بەڵام ئێستا لە چاوانمدا شتێکی نوێ دەبریسکایەوە، شتێک ناوی دەنێم لەزەتبردن لە وەی لە بەر دەستمدایە، دەستگرتن بەو شتەوە کە هەمە، ئەو چۆلەکەیەی لە دەستدایە و باشترە لە سەد چۆلەکەی سەر دار. لەوساتەدا هەستمکرد بە ڕاستی دەرگای شتێکی نوێ و هەستێکی تایبەتی لە مندا کراوەتەوە کە پێشتر نەمبووە، خۆشبەختییەکی شەڕانی، بەختیارییەکی دڕندانە، وەک شادی پڵنگێکی دڕ و بێڕەحم کاتێک دەم دەخاتە هەناوی نێچیرێکی بچوک و ناسکەوە. تا ئەو کاتە هەرچییەکم کردبوو، وەک شۆڕشگێڕێک لەزەتم لێ بینیبوو، بەڵام ئێستا وەک خۆم، وەک کەسێکی ئازاد کە ژەمی خۆی دەخوات، کەسێک دەتوانێت بنیشێتە سەر خوانێک خوانی خۆیەتی، بنیشێتە سەر سفرەیەک سفرەی ئارەزووی نهێنی خۆیەتی. بۆ ساتێک

دەستی بولبولیارم گرت، کەفێکی سپی لە لا لێوەکانمەوە دەچڕی، چاوانم لێکنا، هەستمکرد «من» گرنگترین شتی دونیام، گرنگترین کەسی دونیام، گرنگترین بوونەوەری سەر زەویم. هەستمکرد کەس گرنگ نییە ئەو مەخلوقە نوێیە نەبێت کە دوای ئەو بێهۆشییە ئێستا لە ناخمدا هەڵدەستێت، مەخلوقێکە درێژکراوەی ئەم ساتە مێژووییە تاریکەی شۆڕش و نەتەوە و وڵات نییە، بەڵکو لە وێرانەکانی خودی خۆمەوە هاتۆتەوە دەرێ، لە کەلاوە گەورەکانی ڕۆحی وەفای ڕەفعەت بەگەوە هەڵدەستێت و دەیەوێت بژی، بوونەوەرێکی بەهێزە کە تەنیا توانای لەزەتم تێدا بەهێز ناکات، بەڵکو توانای وێرانکردنیشم تێدا دەبزوێنێت.

دەستی بولبولیارم گرت و گووتم «هەستدەکەم زۆر بەهێزم، هەستدەکەم لە هەموو ئەو سەردەم و ساڵانە بەهێزترم کە تێیدا شۆڕش هەموو ئازادییەکی دابوومێ، هەستدەکەم پێویستیم بە دونیایەک هەیە بۆ ئەوەی بیگۆڕم». بولبولیار سڵێکی کتوپڕی کردەوە، دەستی ڕاپسکان و وەک هەست بە شتێکی ناخۆش بکات، گەڕایەوە دواوە. لە وریایی بولبولیار سەرم سوڕما، دڵنیابووم تێدەگات دەڵێم چی. گەرچی نەخۆش بوو، بەڵام هەستی بەو کیمیا ترسناکەی ناخی من کرد دەجوڵێت و دەجۆشێت و هەستی نوێم پێدەبەخشێت. وەک لە چاوانمەوە ببینێت چی لەقووڵایی ڕۆحمدا ڕوودەدات گەڕایە دواوە و گووتی « هەڤاڵ لێت دەترسم، چیتە؟ بۆ وەهات لێهاتووە، عەجایەب، چ شێوەیەکی خراپت گرتووە، چ سامناک بوویت. خەریکە لەو گورگە دەچیت کە لەیلا لە پێخەفی داپیرەیدا دەیبینێت». ئینجا پێکەنینێک پێکەنی کە پێشتر لێم نەبیستبوو، پێکەنینێکی ئازاراوی، زۆر زۆر ئازاراوی، وەک گوزارشت بێت لە غەمێک خەریکە لە ناوەوە بیکوژێت. گووتی «گەر وابێت هەڤاڵ... گەر وابێت ئەوەشی کە دێت هەر خراپ و نالەبارە. گەرچی دوای کارەسات من هەمیشە چاوەڕوانی خۆشیم، بەڵام کە تۆ بەمجۆرە دەبینم نائومێد دەبم. ڕوخسارت عەجایەب ترسناکە». بۆ چرکەیەک سیمای وەها ماندوو بوو، لە بیمارێکی بێچارە دەچوو کە دەردی دەرمانی نەبێت... منیش ترسام و بۆ

ئێستێک گەڕامەوە دواوە. لە سەیرکردنی ئەودا دوو کەرتبوونی قووڵی ناخی خۆم بینییەوە، سەیرمکرد و تێگەیشتم، بوومەتە کەسێک لە یەککاتدا دەتوانم دوو دیوی ترسناکم هەبێت، دەتوانم هەم باوەش بە بولبولیاردا بکەم و پێپبلێم برام، هەم گوللەیەکیش بنێم بە نێوچاوانییەوە و سەیری جێگا برینەکەی بکەم و خەندەیەک بگرم و بڕۆم. هەستمکرد بە جۆرێک لە جۆرەکان پێمخستۆتە ئەو سەردەمەوە کە من و مرۆڤەکان هیچ حەقیقەتێکمان نییە. تا ئەوساتە بە پەڕۆیەکی گەورە خۆم دەشاردەوە کە ناوی شۆڕش بوو، بەڵام کە دەمبینی ترازانی فریشتەکەم و ئەم ڕەوە گەورەیە بە جۆرێک لە جۆرەکان هاوکاتی یەک بوون، لەرزی لێدەهێنام. هەستمکرد چەند ڕۆژە ئەم ملیۆنەها مرۆڤە لە فاشیستەکان ڕاناکەن، لە بەعسییەکان ناترسن، بەڵکو لە خۆیان هەڵدێن، شتێک هەیە لێیان جیادەبێتەوە و لێیان دەترازێت، تاعوونێکی مێژوویی ... من وەک ڕەوی کۆمرۆڤێک دەمبینی کە خۆی لە ئاوی ڕووبارێکی تاعوونی هەڵدەکێشێت، ڕووبارێکی پڕ میکرۆبی ترسناک کە نازانم کەی ئاسەوارەکانی لە ژیانیاندا دەردەکەوێت، وەک ئەوەی ئەو ڕاکردنە گەورەیە دوا سەمای دەستەجەمعی و دوا سروتی هاوبەشیان بێت پێکەوە، دوای ئەوە سەردەمێک دێتە پێشێ خۆیان لە هەر پەیوەستێکی هاوبەش پاکدەکەنەوە، دەبنە بوونەوەرانێک کە هەر کەس تەنهایی و چەپەڵی خۆی سەربەخۆ و جیا لەوانی تر دەژی، سەردەمێک بە جۆرێک لە عەشقی خۆیاندا نوقمدەبن، بە جۆرێک شەیدای ڕازانەوەی خۆیان دەبن، ئەوە لە بیردەکەن کە کەسانێکی زیندووی دیکە لەم نیشتیمانەدا هەن و دەژین. من لەو بیمارستانە خۆرهەڵاتییەدا، لە کاتێکدا دکتۆر و سیستەرەکان بە بەزەییەوە سەدان بەهەلاکەت چووی کۆڕەوەکەیان چارەدەکرد، لە کاتێکدا هاوار و ناڵەی چەندین نەخۆشی کۆڕەوەکە قاوشە جیاجیاکانی بیمارستانەکەیان دەلەراندەوە، وەک ئیشراقێکی شەیتانی لە ناوەوە ڕۆشنمبکاتەوە، دەمبینی ئەو هەڵهاتنە گەورەیە، ئەو کۆچە مەزنە ئاوێنەی حاڵی میللەتێکە بۆ ئەبەد لە یەکدەترازێت، بۆ ئەبەد دەبێتە ملیۆنەها ڕۆحی تاک و جیا و ناپەیوەست ... لەو ساتەدا وەک ئەوەی لە قووڵایی حەقیقەتێکی گەورەوە سەر

دەربهێنم، وەک ئەوەی شتێکی گرنگ بە بولبولیار بڵێم، گووتم «هۆشەنگ، لە من مەترسە، بەتەنیا من ترسناک نیم. ئینسانەکان بۆ دەموچاوێکی نوێ دەگەڕێن، بۆ خۆیان دەگەڕێن، بەڵام ئەمجارە لە ئاوێنەیەکی دیکەدا ... لەم هەڵهاتنە گەورەیەدا، هیچ کەس لە مەرگ ڕاناکات، من لەسەر سنوور لە هەموو بەدبەختییەکەدا ژیام و بینیم، مرۆڤەکان پێکەوە ڕاناکەن، بەڵکو پێکەوە لەیەک ڕادەکەن. من لەسەر سنوور، لە ناو خێوەتەکاندا تێگەیشتم شتێک نییە ناوی نەتەوە بێت، بەڵکو شتێک هەیە ناوی مرۆڤە بەقاچە بچوک و خۆپەرست و ترساوەکانییەوە لە خۆی هەڵدێت». ئینجا هەناسەیەکی قووڵم کێشا و وەک بمەوێت دیوێکی تەلیسماویی و هێمادار ببەخشمە قسەکەم، گووتم « ئێستا نا بولبولیار، چەندین ساڵی تر تێدەگەیت من دەڵێم چی، بولبولیار، لەم ڕۆژە عەجایەبانەدا کە خەڵکی دوو قاچیان هەیە و چواری تری بۆ قەرزدەکەن و ڕادەکەن، ئەوە تەنیا فریشتەکان نین کە لە مرۆڤ دەترازێن، بەڵکو مرۆڤەکانیش لە یەکتر دەترازێن. لە منی وەربگرە، من پیاوێکی سەر بە دەزگای ئەمنییەتی شۆڕشم، دەزانم کەی کەسێک لە خۆی ڕادەکات و خۆی لە خۆی دەشارێتەوە... ئەوە بەشێک بووە لە ئیشی من وەک بەرپرسی ئەمنییەت، تێبگەم خەڵکی کە لە خۆیان هەڵدێن دەچن بۆ کوێ ... ئەمە ڕەو نییە، ئەمە ترازانی فریشتەکەی شارە لە جەستەی خۆی، دوای ئەمە شارێکی ترسناک دروستدەبێت، کە نازانم چییە و چۆنە». بولبولیار دەمودەست هەستیکرد، ئەو بێهۆشییەی شەو بە جۆرێکی ترسناک کاریکردۆتە سەر خەیاڵم و پێدەچێت بە جۆرێکی بەد شەڕانگێزێتییەکی خەوتووی تێدا زیندووکردبێتمەوە. ئەو ڕاستییەی من لەو ساتەدا دەمبینی بولبولیار نەیدەبینی. جارێکی تر دەستم برد و توند گرتم و گووتم « پێمبڵێ دەتوانیت فریشتەکەمم بۆ هەڵبگریت.. دەتوانیت یان نا. چیت بوێت و لەتوانامدا بێت بۆت دەکەم، بەمەرجێک کارێک بکەیت فریشتەکەم نەمرێت ... بەس کارێک بکە بژی ... تا دەتوانێت بژی، با دوای مردنی منیش هەر بمێنێتەوە، هەر لێرە بێت... دەبێت بیپارێزیت، بەتایبەتی لە من. ڕەنگە دونیا پێویستی پێیبێت، ڕەنگە ڕۆژگارێک بێت

منداڵەکانمان بێ فریشتە لەدایکببن... هەڵیگرە بۆ ئەو سەردەمە. گەر من ویستم بیکوژم، تکایە تۆ ئاگات لێ بێت».

لەو کاتەدا دەنگی کۆمەڵێک پزیشک هات کە سیستەرێک بە عەرەبانەیەکی بیمارستانەوە لە پێشیانەوە دەڕۆیشت. من ئاوڕمدایەوە و چاوانم پڕ بوو لە سەرسامی بوونەوەرێک کە نازانێت لە ناو هەستە ئاڵۆز و ناکۆکەکانی خۆیدا، چۆن ڕێگایەک بدۆزێتەوە و بێتەدەرێ.

## مستەفا شوکاک و برینداریکی نەناسراو

دکتۆر مستەفا شوکاک، لە دووهەم ڕۆژی ڕاپەڕینەوە چووە خەستەخانەی سەرەکی شار و ئەرکێکی ماندووکەری گرتە ئەستۆ، ئیدی بێوچان و شێتانە، شەو و ڕۆژ بۆ پاراستنی ژیانی بریندارەکان لە کاردا بوو. ئەو ماوەیە ژوورێکی بچوکی لە بیمارستان وەرگرت و زۆر شەو لەوێ دەخەوت و لەو خواردنە بێتام و ناخۆشانەی بیمارستانیشی دەخوارد. گیانی کارکردن و خۆبەخشینی بە جۆرێک ناوازەبوو، دکتۆرەکانی دی وەک شێت سەیریاندەکرد. ڕیشی هێشتبووەوە و هەردەم غەمگینییەکی دڵتەزێنیش سیمای گرتبوو. لەو ڕۆژەوە کە فریشتەکەی ماردینی مرد، ئارەزوویەکی نەبوو هیچ لەسەر کەشتیی فریشتەکان ببیستێت، یەکجار پشتیکردە کەشتییەکە و ویستی بۆ ئەبەد خانمی مەلەکبین و مەهدائیل و بولبولیار لەیادبکات. دەبێت بڵێم کە کاری دکتۆر شوکاک شێتانە و خودکوژانە بوو، هەموو دەیانگووت دکتۆر بەو کارە زۆر و بێپشووە مەبەستێتی خۆی ئازاربدات، نەوەک خزمەت بە بریندار و پەککەوتە زۆرەکانی ڕاپەڕین بکات. کەمخۆری، کەمخەوی، ماندوێتی، تەنهایی، غەمۆکی، ئیشی زۆر و تاقەت پڕوکێن، ئەوە ژیانی دکتۆر بوو. بەڵام دکتۆر خۆشی ڕای وابوو کە شەڕی لە ساڵۆنی نەشتەرگەریی و قاوشە ساردەکانی بیمارستاندا، شەڕە لەگەڵ

مردنی خۆیدا. دکتۆر ئێستا چیدی ئەو کورەی سەرەتا نەبوو کە پێیاندەگووت فریشتەیە و خودا بەتایبەت ناردویێتی بۆ کۆلێژی پزیشکی، ئێستا هۆکاری تر پاڵیان بە شوکاکەوە دەنا خۆی لە ئیشدا بخنکێنێت. ئەو دەیگووت ئینسان بوونەوەرێکی هیچە، تاکە شتێکی باشی ئەم مەخلوقە ئەوەیە کە لەگەڵ مەرگدا شەڕدەکات، بە دەنگی بەرز لە سالۆنەکان و قاوشەکان و لە بەردەم زامدارەکاندا دەیگووت «تاکە شتێکی باشی ئەم جانەوەرە دەبەنگەی کە ناوی ئینسانە ئەوەیە دەتوانێت لەگەڵ ئەو ئیبلیسەدا کە ناوی مردنە زۆرانبگرێت». دواتر قاقایەکی بچوک و کورتی لێدەدا تا لە زەبری ئەو وشەی «دەبەنگە» کەمبکاتەوە، کە دڵنیابوو دڵی هەمووان رادەچڵەکێنێت. بەردەوام خۆی لە جەنگێکی گەورەدا دژ بە مەرگ دەبینییەوە، جەنگێکی بێسنوور و بێمەودا و گەردونی. ڕۆژانی ڕاپەڕین هیچ پزیشکێک نەبوو وەک ئەو دەستبەرداری هەموو ساتێکی ئارامی بێت، هەندێجار بە شێوەیەک ماندوویێتی کاری لە جەستە بچوک و لاوازەکەی دەکرد، وەختبوو لە کاتی نەشتەرکاریدا و بەدیار بریندارەکانەوە بێهۆش دەبوو. لە شەوی کۆڕەوەکەدا بە تەنیا لە بیمارستان مایەوە، شەوێک بوو لەو شەوانەی دکتۆر شوکاک هەرگیز لە یادی ناکات. زۆربەی خەڵک لە بەیانییەوە نەخۆشەکانی خۆیان لە بیمارستان دەردەهێنا و دەیانبردنەوە بۆ ماڵ. سەرەتا پزیشک و سستەرەکان وەک ڕۆژانی ڕابوردوو بە هیمەتێکی زۆرەوە ئیشیاندەکرد، شتێک لە درێغی و کەمتەرخەمی بە کەسەوە دیارنەبوو، بەڵام ئەو دەنگوباسانەی لە باشوورەوە دەهاتن، هەمووانی تووشی پەشۆکان کردبوو، دەنگی بەرزی ڕادیۆکان و هاواری حەماسەت بزوێنی بێژەرەکانی شۆڕش، ئەو هەواڵانەی نەدەشاردەوە کە هێزی پیادە و تانکی بەعسییەکان دوای ئەوەی لە شارانی باشوور ڕاپەڕینیان سەرکووتکردوە، بەرەو باکوور دەکشێن. دکتۆر شوکاک بە چاوی خۆی دەیبینی چۆن ترس دەستی پزیشکە هاوکارەکانی دەبەستێت و کاریان بۆ ناکرێت، چۆن سیستەرەکان لێویان دەلەرزێت و تواناییان نامێنێت. ترسی دکتۆرەکان لە گەڕانەوەی بەعسییەکان و لە سزای دڵڕەقانەی ئەوان وەها گەورەبوو نەیاندەتوانی

چەقۆ و مەقەستی نەشتەرگەریی بگرن، بینی چەند نەخۆشێک لەبەر شپرزەیی دکتۆر و سیستەرەکان دەمرن. دەمەو ئێوارە ئاشکرابوو کە فاشیستەکان بەخۆیان و تانک و زرێپۆشەکانیانەوە پێشڕەوییەکی زۆریان کردوە و هێزەکانیان زۆر لەدەروازەی سەرەکی شار دوورنین. بەر لەوەی تاریکایی شەو دابێت، دکتۆرەکان لەگەڵ بەڕێوەبەری بیمارستاندا بەپەلە کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بڕیاربدەن چیبکەن. شارەکە چۆڵیدەکرد، دەبوو ئەوانیش بڕیارێک بۆ چارەنوسی خۆیان و خێزانەکانیان بدەن، شوکاک تاکە کەس بوو نەچوو بۆ کۆبوونەوەکە. بڕیاری دابوو لە نەخۆشخانە لەگەڵ نەخۆشەکاندا بمرێت، بەڵام گەر نەخۆشەکان هەموو دەرچوون، ئەوسا چی؟ شوکاک گووتی بێگومان نەخۆشی تر دەبێت، خەڵکانێکی بەدبەخت و بێچارە دەمێنن کە رووداوەکانە ئێرە و کاریان دەکەوێتە بیمارستان. سەیربوو بەلایەوە کە دکتۆرەکان پێکڕا بڕیاریاندا بیمارستان چۆڵبکەن و لەگەڵ هەڵهاتووەکاندا ڕووبکەنە دەرەوەی شار، بەهانەشیان ئەوەبوو گەر خەڵک شار چۆڵبکەن، ئەوا بە دڵنیاییەوە لە دەرەوەی شار زیاتر پێویستیان بە دکتۆرە تا ناو شار، هەتا دەرمان و کەلوپەلی پێویستی ناو مەخزەنی بیمارستانەکەیان بارکرد تا لە دەرەوەی شار بیانکرێت خەستەخانەیەکی گەڕۆک دابمەزرێنن. بەرلەوەی دونیا تاریک بێت، تاکە تاکە پزیشک و نەخۆش لە بیمارستانەکەدا مابوونەوە. ئەوەی سەرنجی دکتۆر شوکاکی ڕاکێشا نەخۆشە بێکەسەکان بوون، کە کەسیان نەبوو بێن و هەڵیانگرن، ئەوانە پەراکەندە لە ژوور و قاوشەکانی بیمارستاندا دەمانەوە، بێئەوەی کەس بۆ سەرپەرشتی و خزمەتیان لەوێبێت، یاخود خۆشیان بتوانن هەستن و بەپێی خۆیان بڕۆن ... بڕیاری دابوو تا یەک نەخۆش لە بیمارستانەکەدا بێت و پێویستی بەم بێت نەڕوات، گەر هەموو نەخۆشەکانیش بڕۆن، هەر نابێت بیمارستان چۆڵ بکرێت. بەر لە نیوە شەو تەنیا خۆی و دە نەخۆشێک لە بیمارستانەکەدا بوون، لە پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیەوە کاروانی گڵۆپی ئەو ماشێنانەی دەبینی بە هەزاران هەزار شار جێدەهێڵن، سەر شەقامەکان پێکڕا بەو هەموو ماشێن و پیادەڕەوانە جەنجاڵ بوو کە بە کۆڵەوە لە پشتیاندا

شاریان جێدەهێشت. دکتۆر لە بەر پەنجەرەکەدا سەرسامانە سەیری شاری لەدایکبوون و منداڵی و ژیانی خۆی دەکرد خاڵیدەبێتەوە. ساتێک بوو تێیدا مێژوو کوێردەبێت، چارەنوسەکان دەکەونە ناو تەمێکی تاریک و ڕەشەوە، هیچ مرۆڤێک، هیچ جێگایەک، هیچ درەخت و کوچە و پەنجەرەیەک نازانێت چی بەسەردێت. دکتۆر گووتی گەر بەعسییەکان بێنەوە، ڕەنگە لەم بیمارستانەدا بمکوژن... بەڵام قەیدی چییە؟ مرۆڤەکان هەر دەبێت لە جێگایەکدا بمرن، دوای ئەوە ئەم چی هەیە بە مردن بیدۆڕێنێت؟ بەعسییەکان پێشتر کوشتبوویان، چەندین جار کوشتبوویان، ئەو کاتە کوشتیان کە لیڤیتانت گرتی و دایە دەست ئاسایشە عەرەبەکان، لەوێ هەموو ڕۆژێک دەیانکوشت و زیندوویاندەکردەوە. ئەو کاتە کوشتیان کە وەک پزیشکێکی گەنج تێکەڵ بەو هەموو خوێن و لاشە و برینەی مەیدانەکانی شەڕیان کرد، ئەو کاتە کوشتیان کە بەخۆی و فریشتەیەکی غەریبەوە گێڕایانەوە بۆ ئێرە و ئالودەی ئەم شوێنە و تووشی شەومەستیان کرد... ئێستاش کە قافڵەی ئەو سەدان هەزار مرۆڤەی دەبینی، غەمێکی کوتوپڕ گەروی گرتبوو، غەمێکی خنکێنەر لەوانەی تەنیا گریانی قووڵ و درێژ دەتوانێت سووکیبکات. بەڵام نەیویست بگری، توند دانی نا بە لێوی خۆیدا و گووتی «کێ دەیزانی مێژووییەکی وا خوێناوی لە دیمەنێکی وا ئەفسانەیی و سەیردا کۆتایی دێت؟». دکتۆر گەرچی لە زۆر کەس زیاتر ئازاری بەدەست فاشیستەکانەوە کێشابوو، بەڵام لە ڕۆژانی ڕاپەڕیندا هەستی بە ئازادی نەکرد. لە شەوی یەکەمی ڕاپەڕیندا ویستی هەستبکات دونیا گۆڕاوە، هەستبکات شتێکی قووڵ لە جیهانی ئەو و خەڵکانی تردا بەسەرچووە و سەردەمێکی نوێ بە ڕێگاوەیە، بە پاڵتۆیەکی ڕەشی تەنکەوە کە بۆ باڵای ئەو درێژ بوو هاتە دەرەوە، پیاسەیەکی خێرا و بەپەلە و کورتی بە ناو شەودا کرد. شەوێکی سەنگینی باروتاویی بوو، دکتۆر چەندین ساڵ بوو لە بیمارستان ئەو بۆنی باروتە دەچوو بە سەریدا. لە کاتێکدا کوچە کوچە وەک تارماییەکی ون بەشاردا دەگەڕا، لە کاتێکدا لەتاریکیدا لە ڕوخساری ئەو خەڵکانە ورددەبووەوە کە زۆریان بۆ هەڵمژینی هەوای ئازادی شەو هاتبوونە دەرەوە، دکتۆر شوکاک هەستی بە

هیچ نەکرد، بەڵکو بە نائومێدییەکی قووڵەوە بیریکردەوە، کە مرۆڤەکان چ بەدبەختن کاتێک بیر دەکەنەوە کە کوشتنی دوژمن، یان داگیرکردنی هەندێک بینا، یان سووتاندنی هەندێک شوێن دەتوانێت ئازادیانبکات. دڵنیابوو ئازادی ڕاستەقینەی مرۆڤ ڕزگاربوونێتی لە مۆتەکە و دێوەزمە و خەوە ترسناکەکانی ناوەوەی خۆی. لە دوای مردنی فریشتەکەی ماردینییەوە، ئەو مۆتەکە ترسناکانە نەیاندەهێشت بخەوێت. هەندێک شەوان زۆر بە ترسەوە لەخەو ڕادەپەڕی، هەموو شتێک لە ژیانیدا بۆنی نائومێدی و تەنهایی لێدەهات. ئەو شەوە لەسەر کۆچەیەکدا وەستا و بە ڕاستە شەقامێکی درێژدا ڕوانی کە کپییەکی کوشندە و ترسناک گرتبووی. لە وێدا سەیری ئاسمانی کرد و خەندەیەکی گرت، هەورێکی قورس سنگی دادابوو، ڕەشێتی هەورەکە شەوی تاریکتر و تاریکتر کردبوو. ئەو هەر بەو خەندەیەوە ماوەیەکی درێژ بە تاریکیدا ڕۆیشت، خەندەیەکی بێمانا کە هەندێ شەو «گەر مەستی تەواو بێهۆشی نەکردایە» لەسەر جێگای خەوتنەکەشی دەپەڕییە سەر لێوی، خەندەیەک هیچ مانایەکی نەبوو، هیچ خۆشییەک یان یادگارییەکی لەپشت نەبوو، خەندەیەک وەک خەندەی پیاوێک هەموو ژیانی بەدوای سندوقێکی شاردراوەدا گەڕابێت و دواجار ئەو سندوقەی دۆزیبێتەوە، سەری هەڵدابێتەوە، گەنجینەیەک لە سکەی تەلا و زیوی هاتبێتە بەرچاو، بەڵام هێندەی دەستی بردبێت و سکەکانی گرتبێتە دەست، لە مشتیدا بووبێتنە تۆز. خەندەکەی خەندەی پیاوێک بوو جەوهەریی پوچ و تۆزئاسای هەموو زێڕ و زیوە درۆکانی دونیای ناسیبێت. لەوساتەدا حەزی لە مەستییەکی درێژ و بەردەوام بوو، لە مێژبوو حەزیدەکرد هەتا لە سالۆنی نەشتەرگەریشدا هەر مەست بێت، دەیویست هیچ کات ئاگای لە دونیا نەمێنێت، هەتا لەو ساتەدا کە ترسناکترین نەشتەرکاری دەکات و ژیان و مردن لە ژێر پەنجە ناسک و نەرمەکانیدا سەمادەکەن، ئەم بێهۆش بێت، وەک ئامێرێکی وردەکار ئیشبکات بێئەوەی وەک مرۆڤ هەست بە بوونی خۆی بکات ... ڕقی لەوە بوو کە ناتوانێت لەو هەستە ڕزگاری بێت کە ئەم کەسێکە و ناوی مستەفا شوکاکە و ژیانێکی هەیە و ڕابوردوویەکی غەمگین بەدواوەیەتی... ئێستا کە هاتبووە

دەرێ تا بزانێت لە شەوی یەکەمی ئازادیدا دەبێت هەوا چۆن بێت، هەور چۆن ببارێنێت و باران چۆن بکەوێتە سەر زەمین، ئەو هەستە ئازاریدەدا کە ئەم ناتوانێت هیچ شتێک لە خۆی و لە دونیادا بگۆرێت. کە بەو خەندەوە شەقامەکانی شەوی تەیکرد، لە ناکاو لەخۆی پرسی «دکتۆر شوکاک تا کەی ژیانت ناگۆریت، تا کەی هەر دەستت لە خوێن و مردن و لەشی هەلاهەلادا دەبێت، تاکەی بەرگەی نالّینی ئینسان دەگریت؟».
گەرچی مرۆڤی خۆش نەدەویست، گەرچی سۆزێکی تایبەتی و گشتی بۆ ئەم بوونەوەرە نەبوو، بەڵام لە هەمووان زیاتر کاریدەکرد و کۆمەکی دەگەیاند. بەخۆی گووت «هۆکەی ئەوەیە رِقم لە مردنە، لەوەتەی نەغەدە جێیهێشتووم خۆم لە شەرێکی گەورەدا دەبینمەوە لەگەڵ مردندا ... ژیان پوچە، بەڵام مردن هەزار جار پوچترە، بەتایبەت مردنی ئەوانیدی».
هەستێکی سەیری هەبوو، هەر چەند نەخۆشێک یان بیمارێکی لە مردن رزگاردەکرد، پێیوابوو کارەکەی وەک نامەیەکی خۆشەویستی وەهایە بۆ نەغەدە ماردینی... پەیوەندییەکی راستەوخۆی نەدەدۆزییەوە، بەڵام لە ناخی خۆیدا جۆرە پردێکی نهێنی لە نێوان ئیشەکەی و عەشقە کوشندەکەیدا دروستکردبوو، وەک ئەوە بوو لە رێگای رێگرتن لە مردنەکانی دییەوە، رێگا لە کۆچ و مردنی نەغەدە بگرێت لە ناخی خۆیدا.
بە خۆی گووت «هەستێکی بێمانایە، نەغەدە چووزانێت من چی دەکەم، ئادەمیزادەکانی تر هەر بۆیان گرنگ نییە دکتۆرەکان چەند ژیان رزگاردەکەن، هەر بۆیان گرنگ نییە ئێمە لە بیمارستان چی دەکەین، هەموو وادەزانن دکتۆرەکان تەنیا لە بەر پارە کاردەکەن. رەنگە واشبێت، رەنگە بەشی هەرە زۆری پزیشکەکان نەخۆش تەنیا وەک نێچیرێکی باش و دەغیلەیەکی هەڵنەپچراو ببینن، بەڵام من ... من دکتۆرە مەست و بێفەرِ و ژنحیزەکەی شار، وانیم». کە وایگووت زەردەخەنەیەکی گەورەتری گرت، لەوەتەی نەغەدە بەجێیهێشتووە، هەستدەکات بۆتە مەخلوقێکی پێکەنیناوی، کەسێک شایەنی ئەوەیە بیر لە خۆی بکاتەوە و خەندەیەکی وا پوچ و گاڵتەجارِ بکەوێتە سەر سیمای. کە گەنج بوو، کە یەکێک بوو لە قوتابییە هەرە زیرەکەکان، کە چووە کۆلێژی پزیشکی و هەموو شانازییان

پێوەدەکرد، چاوەڕوانی ئەوە نەبوو ڕۆژێک ببێتە کەسێکی وەها لە هەر ڕوویەکەوە لێی بڕوانیت شایەنی پێکەنین بێت. هەموو ئەو پیاوانەی لە خۆشەویستیدا دەبن بە ژێرەوە بە جۆرێک لە جۆرەکان شایەنی پێکەنینن. قاقایەکی بەرزی لێدا، دڵنیابوو ژیان کردوێتی بە کەسێک شایەنی وەها قاقایەکە. دەیزانی ئەو حوکمەی گەلێک دڵڕەقانەیە، بەڵام مەبەستی بوو لەگەڵ خۆیدا دڵڕەق بێت. ئێستا ئەو هەستەی کە شەڕێکی گەردونی هەیە دژ بە مردن، شتێک ئارامیدەکردەوە، لایەنیکەم ڕوخسارێکی باشتری پێدەبەخشی لەوەی وەک کەسێک دیاربێت کە تەنیا شایستەی خەندەیە. بە خۆی گووت «دکتۆر گەر واز لە ئیشەکەت بهێنیت، دەتوانیت چی بکەیت... چ سەنعەت و کارێکی تر هەیە مانا بدات بە ژیانت؟». گەرچی پرسیارەکەی کرد، بەڵام وەک هەمیشەش ئارەزووی نەبوو بیر لە وەڵامی پرسیاری وەها بکاتەوە. خێرا بەکوچەکانی شەودا گەڕایەوە بۆ بیمارستان و شتێک لە دڵنیایی قووڵ لە دڵیدا بوو کە ڕاپەڕین و هەرەسی فاشیستەکان جیهانی نەگۆڕیوە. شتەکان پێکڕا وەک خۆیانن، باران، هەور، تاریکی، مۆتەکەکان، ترسەکان، شڵەژانەکان، نەخۆشییەکان، هەموویان لە ناوەوە و دەرەوە وەک خۆیانن. «جیهان ناگۆڕێت، ناگۆڕێت. گوناهی شۆڕشگێڕان نییە، گوناهی دونیایە» بە حەسرەتەوە وایگووت و بە پەلە کەوتە ڕۆیشتنێکی نائارام کە لە دوورەوە پەشۆکان و شێوانی بۆ هەر کەسێک دیاربوو.

شەوی یەکەمی ڕەوەکە، کاتێک لە پەنجەرەوە سەیری قافڵەی درێژی ئوتومبێلەکانی دەکرد لە شار دەچنە دەرێ، هەموو شتێکی بێمانا بینی. هەوای باراناویی، ترسی خەڵک، گەمژەیی فاشیستەکان. لە ناکاو هەستیکرد هۆی هەڵنەهاتنی ئەم هەر بەڕاستی دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزوویەکی قووڵی مردن لەناخیدا، هەستیکرد ژیانی ئەم تاکە ژیانێکە لەم شارەدا شایەنی ڕزگارکردن نییە، شایەنی ئەوە نییە جەستەی خۆی بخاتە بەر ئەو زەحمەتە و ڕزگارییکات. دواتر کە سەربوردی ئەو ڕۆژانەی بۆ بولبولیار گێڕایەوە و ئەویش وشە وشە چیرۆکەکەی بۆ من گواستەوە، گووتی «لەو کاتەوەی

نەغەدە جێیهێشتبووم، هەستم نەکردوە شایەنی خۆشەویستی خۆمبم. ژیانم شتێکی وەها نەبوو هەوڵبدەم لە چنگی هیچ شتێک قووتاریبکەم». بەڵام هەستیشیکرد گەرچی ژیانی شایەنی ڕزگارکردن نییە، بەڵام لە دەستی نایەت و ناتوانێت خۆی ئاسان بیبەخشێتە مردن. ژیان ئەگەر زۆریش بێنرخ بێت هێشتا لە مردن بەرزترە. لەبەرئەوەی مردن هیچ نییە جگە لە دوژمنێکی بێڕەحم و تاریک و بێمانای هەموو شتێک، تەنیا دوژمنی ئێمە نییە، بەڵکو دوژمنی ئەو ئەستێرە دوورەشە کە ئێستا لەوسەری گەردون لە تەپوتۆز و ئاگری خەلیقەتدا دەسازێت ... بیریکردەوە خودا گەر هەبێت و نەبێت، مردن هەر لە دەستکردی هێزێکی دڵڕەقە. دڵنیابوو گەر خودا هەبێت مردن نییە، گەر مردن هەبێت خودا نییە. هەستەکانی ئاڵۆز و تێکەڵاو و ناکۆک بوون، نەیدەزانی چی دەڵێت و بە تەواوی چۆن بیردەکاتەوە. هەر لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانی و ناوازەیی ئەو شەوە سەرسامیدەکرد، گووتی «ڕەنگە بەعسییەکان چەند سەعاتێکی تر بگەن و لە حەوشی بیمارستانەکەدا تیربارانمبکەن». سەیری حەوشی بیمارستانەکەی کرد و بیری لەوە کردەوە کە دەبێت لە کویادا بیکوژن. حەزی لە جێگایەکی تایبەتی نەبوو، لە هەرجێگایەکدا بیکوژن جیاوازییەکی ئەوتۆ گرنگی نییە، بەڵام هەر بیکوژن بیکوژن، خۆشترە لە ڕوناکترین شوێنی مەیدانەکەدا گوللەبارانیبکەن، جێگایەک دەشێت خودا لەوێدا جوانتر ببینێت ... هەموو مەیدانەکەی سارد و مردوو و گۆڕئاسا هاتە بەرچاو. لە کاتێکدا سەیری گۆڕەپانی خاڵی و ساردی بیمارستانەکەی دەکرد، لەخۆی پرسی «مستەفا پێمبڵێ، تۆ هیچ کات لە دڵەوە باوەڕت بەخودا بووە؟». خۆی لە پرسیارەکەی خۆی پێکەنی. پرسیارێکی بێمانا بوو لەوانەی دەبوو یەکێکی تر لێی بکات ... لەوەتەی هاوڕێتییە نزیک و گەرمەکەی لەگەڵ مەهدائیلی فریشتەدا نەماوە، کەس نەماوە ئەو جۆرە پرسیارانەی لێ بکات... زۆر لەو پرسیارە بێمانایانەی مەهدائیل تووڕەدەبوو. سەری نا بە شوشەی پەنجەرەکەوە و هەستیکرد زۆر بیری مەهدائیلی فریشتە دەکات، زۆر زۆر، فریشتەیەکی کەللەڕەقی نەگریس کە بۆ ئەوە باش بوو لە جەنگدا بیکەیت بە شۆفێری ئیسعافەکانی سوپا تا برینداریک نەمێنێت لە گۆڕەپاندا

هەڵی نەگرێتەوە. بە خەندەوە گووتی «مەلعونی کوڕی مەلعون، مەهدائیل». دوو مانگ بوو هیچ خەبەرێکی لە کەشتییەکە نەبوو، هەموو شتێکی دەکرد نەگەڕێتەوە بۆ ئەوێ، دەیویست تەواو ئەو دونیایە لە یادبکات، لەو ڕۆژانەدا لە بیمارستان کەسێکی باڵداریشی بینیبوو، بەڵام خۆی وا لە بان گرتبوو وەک هەر نەیبینیبێت. دکتۆر وەک وەڵامی خۆی بداتەوە، گووتی «هیچ کات، من مرۆڤ و خودام بۆ گرنگ نەبووە، بەس ژیانم مەبەستە. مرۆڤ و خودا یەک سەرچاوەی هاوبەشیان هەیە کە ژیانە، گەر خودا هەبێت کەواتە بوونەوەرێکی زیندوە، ناکرێت خودا پێش ژیان کەوتبێت». دکتۆر ژیانی وەک شتێکی گشتیتر و گەورەتر و گرنگتر لە هەموو شتێک دەبینی. ژیان تەنیا بەو مانایە نا کە زیندەگی بوونەوەرانی تر دەگرێتە بەر، بەڵکو بەو مانایەی هێزێکە ئەگەری ئەوەی تێدایە مەخلوقی لە مرۆڤ باشتر دروستبکات. باوەڕێکی زۆری بە مۆراڵی خودایی نەبوو، بەڵام باوەڕی بەو هێزە نهێنییە هەبوو کە لە ژیاندایە... زۆرجار کە چارەسەری نەخۆشەکانی دەکرد، هەستیدەکرد ژیان وەک هێزێکی نادیار لە ناویاندا شەڕدەکات، وەک هێزێکی ناهوشیاریی گەورە، دڵنیابوو کاری هوشیارانەی ئەو وەک پزیشک تەنیا کۆمەکە بەو هێزە لە بن نەهاتووە ناهوشیارە کە بەو پەڕی هێزەوە شەڕ بۆ مانەوەی مرۆڤ دەکات. دڵنیابوو کە ژیان هێزێکی ناهوشیارە، مەزنییەکەشی لەوەدایە کە هوشیاریی ناتوانێت پەکی بخات. ئەگەر ژیان هوشیار بایە، هەر زوو مەکینەی خۆی دەکوژاندەوە. گەر هێلکە هوشیار بایە، هیچ جوجکێکی چکۆلەشی هەڵنەدەهێنا، گەر زەوی هوشیاربایە گوڵێکیشی نەدەگرت، سپێرم هوشیاربووایە نە دەگەیشتە قووڵایی گونگوڵی هیچ ژنێک و خۆی دەکوشت، سێکس بۆیە وا بەهێز و بێهۆشانە دەمانبات، چونکە گەر هوشیاربایە کەسمان ئازاری درێژکردنەوەی ئەم بەزمەمان نەدەگرتە ئەستۆ. لەو ساتەوەی هوشیاریی دروستدەبێت، هێزی مەرگ گەورەتر دەبێت. دکتۆر تەماشایەکی کاروانی هەڵهاتووەکانی کرد و گووتی «ئەو کارەساتانەی هوشیاریی دروستیاندەکات، دەبێت ژیان... ژیانی ڕووت ڕاستیانبکاتەوە». کە لە قافڵەی ڕەوکەرانی دەڕوانی، سەرسام بوو لە هێزی مرۆڤ لەسەر سەرکەوتن بە سەر مردندا و لە

خواستی قووڵی بۆ مانەوە بە زیندوویی، ئێستا نەیدەتوانی ستایشی مرۆڤ نەکات لەسەر مانەوە بە زیندوویێتی، زیندوویێتییەکی ڕووت، خاڵی لە هەموو شتێک جگە لە خودی ڕووت و قووتی ژیان و هیچی دی. هەستیکرد ئەوەی کە دەیبینێت خەڵکان بە پرتاو هەڵدێن، ئەوە خواستی ژیانە دەیانجوڵێنێت. دەیزانی ئەو هێزە هێزی مرۆڤ خۆی نییە، بەڵکو پاڵنەرێکی ناهوشیار و کوێرە مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا دەبات، دڵنیابوو ئەم مرۆڤانەی ڕادەکەن هیچیان عەقڵ هەڵی نەگرتوون، بەڵکو تینێکی کوێر، خواستێکی ناهوشیار بۆ مانەوە دەیانبات. گووتی «هێزێکی تاریک ئەم مرۆڤانە دەجوڵێنێت، هێزێک عەقڵ نایخاتە گەڕ، گەر عەقڵ بیخستبایەتە گەڕ، وەک من هەزار بەهانەی دەدۆزییەوە، وا لە خەڵکی بکات لە ماڵی خۆیاندا دانیشن». لە دڵی خۆیدا گووتی «ئەوە تاکە هێزێکە من لەم گەردونەدا ڕێزی دەگرم، تاکە هێزێکە شایەنی ڕێزە ... هێزی کوێر و ناهوشیاری ژیان». بیریکردەوە، فریشتەکان زۆر هوشیارن، فریشتەکان لە باغی ئەزموونی مرۆڤدا گەورەبوون، زادەی باغێکی ترسناکن کە باغی هوشیارییە، فریشتە نەگریسەکان ئەو بەشەی ئێمەن کە تامی سێوە حیزەکەی ئادەم هێشتا لە دەمیاندایە. ئەوەی بەرگەی ژیان ناگرن، ئەوەی بەرەو مەرگ دەڕۆن، پابەندی ئەوەیە هۆشیان بەرەو مەرگ ڕێنماییاندەکات. مرۆڤ نابێت دەرک بە پوچی بوون بکات، دەبێت هەموو شتێک بکەین نەهێڵین مرۆڤ دەرک بەپوچی بوون بکات، چونکە هێندەی هەستی بە پوچێتی کرد، دەیەوێت بمرێت. لێیان بگەڕێ ڕابکەن، لێیان بگەڕێ دە قاچی دیکە قەرزبکەن و لەم شارە هەڵبێن، با هەستبکەن شتێک بۆ ژیانی خۆیان دەکەن، با هەستبکەن زۆر بوونەوەری بە نرخن، واهەستبکەن گەر ئەوان نەبن لاسەنگی ئەم ئەستێرەیە تێکدەچێت، گەر وابێت باشتر هەڵدێن. دکتۆر مستەفا شوکاک دڵشادبوو کە خەڵک هەموو وەک ئەو لەو پوچییە تێنەگەیشتوون. مرۆڤ کە ئەو هێزە کوێر و ناهوشیارەی ژیانی تێدا نەما دەبێتە بوونەوەرێکی ترسناک، بەڵام سوپاس بۆ گەردون کە ئەو هێزە بێبن و ناکۆتایەی لە خۆیدا پاراستووە.

بەپەلە گەڕایەوە بۆ قاوشەکە ... بڕیاریدا هەموو نەخۆشەکان لە یەک جێگادا کۆبکاتەوە و خۆشی لە جێگایەکدا بنکە بگرێت دەرگای سەرەکی بیمارستانی لێوە دیار بێت، دەبوو زوو زوو بچێتە قاتی سەرەوەش تا لە بەرزاییەوە ببینێت لە شەقامە نزیکەکانی دەوروبەردا چی دەگوزەرێت. گواستنەوە و ڕێکخستنی جێگای بیمارەکان چەند سەعاتێکی ویست. دکتۆر لەو ماوەیەدا بە جۆرێک نوقمی کاربوو، ئاگای لەدەرەوە بڕا. نەخۆشەکان هەندێکیان لە حاڵی بێهۆشیدا بوون، هەندێکیشیان سەرەحاڵ و نۆربڵێ بوون. هەندێکیان پێشمەرگەی بریندار بوون، ترسێکی کوشندەیان بوو، دەیانگووت هەموو شار چۆڵە و سبەی کە فاشیستەکان دێنە ناوەوە، دێنە بیمارستان و تیربارانیان دەکەن. دکتۆر بیری نەدەهات بە درێژایی ساڵانی کارکردنی وەک پزیشک، سۆزێکی تایبەتی بۆ نەخۆشێک بووبێت، توانیبێتی ببێت بە هاوڕێی نەخۆشێک، نە لەبەرئەوەی وەک پزیشکان هەڵگری هەوایەکی ئەرستۆکراتی ئەوتۆ بوو خۆی لە ئاستی بیمار و دەردەداراندا بەرزتر و بەهێزتر ببینێت، بەڵکو لەبەرئەوەی بە درێژایی ژیانی وەک پزیشک، نەخۆشێکی نەبینیبوو ئازاری خۆی لە ئازاری هەموو مرۆڤەکانی تر بە گەورەتر نەبینێت. هەموو نەخۆشێک پێیوایە ئەو تاکە مەخلوقی ئازارکێشی دونیایە و خودا و سروشت بوغزێکی تایبەتی و کینەیەکی ناوازە و ڕیزپەڕیان بەرامبەر ئەو هەیە. هیچ نەخۆشێکی نەبینیبوو ڕوو لە خودا نەکات و نەڵێت «خودایە بۆ منت بەم دەردەبرد، هەموو خەڵکی خۆشبەخت و باشن و تەنیا من بەدبەختی دەکێشم». ئەوە توڕەتری دەکرد لە مرۆڤ ... لەلای سەیربوو مرۆڤەکانی سەر ئەم زەوییە، هێشتا لەو ڕاستییە تێنەگەیشتوون کە بەشی هەموومان لە ئازار بەئەندازەی یەکە، هیچ مرۆڤێک نییە ژانێکی کوشندەی نەبێت، ئازارێکی نهێنی و گەورەی نەبێت، مرۆڤ گەر برینێکی بەرچاویشی نەبوو ئەوا بوغزێک و گرێیەکی هەیە دەیچەوسێنێتەوە. ئەو هەموو ساڵە کە خەریکی چاکردنەوە و بڕین و دوورینەوەی لەشی ئەو گەنجانە بوو کە لە بەرەکانی جەنگدا دەپێکران، ئەو هەستەی نەبوو کە ئەو مرۆڤانەی ئەمێستا لە ماڵی خۆیاندا دانیشتوون دەشێت لەمانە کە پێکراون و خەریکی نۆشینی

شەرابی مردنن بەختەوەرترین، زەوی هیچ نییە جگە لە فەرشێکی ڕاخراوی ئازار، گەورەیی لەش لەوەدایە مەکینەیەکی وەها ترسناکە بەرگەی هەموو ئەو جۆرە ئازارە جۆراوجۆرانە دەگرێت. گەورەیی ئەم ئۆرگانە زیندووانە کە لە ناوەوە لێدەدەن، گەورەیی ئەو وزە فیزیکییە بێهۆشە کە ناوی ژیانە ئەوەیە، بەرگەی زۆر ئەشکەنجەی ترسناک دەگرێت و ناوەستێت. ئینسان خۆی پێویستی بە ئازارە، بۆی دەگەڕێت، لە جێگای عاسی دەریدەهێنێت. لە خۆی پرسی « ئازار بە جەوهەر لەو ژیانەوە هەڵناقوڵێت کە دەژین، بەڵکو لەو ژیانەوە دێت کە ناژین ... ئەو برینانەی تێماندەکەن ئازاریان کەمترە لەو برینانەی کە دەستمان پێیان ناگات». بۆ ئێستێک بیری لەوە کردەوە کە ژانی گەورەی ئەم لەوەوە نییە کە نەغەدە بەجێیهێشت، کە فاشیستەکان ئەشکەنجەیان دا، کە خەڵک بەردەوام سووکایەتی پێدەکەن، بەڵکو لەوەوەیە کە چیتر هیچ ئازارێکی تری نییە بۆی بژی. نەغەدە دواهەمین ژیانی بوو، هەموو ژیانەکانی بوو، بیریکردەوە ئەگەر نەغەدەی تا ئێستا هەبایە ئێستا بووبوو بە پیاوێکی منداڵدار، بووبوو بە کەسێکی دی، وەک ئەو سەدان هەزار پیاوەی ئەمشەو لەشار دەرچوون، ژن و منداڵەکانی دەخستە ماشێنێکەوە و لەشار هەڵدەهات. ئێستاش کە جگە لە خۆبەخشین هیچ کارێکی تری نییە بیکات، هۆکەی ئەوەیە ئەم هیچ ژیانێکی نییە کەس بەرێتە ناوی، هیچ ژیانێکی نییە ڕزگاریبکات. دوا هاوڕێی مەهدائیلی فریشتە بوو، کە ئەویش وەک ئەم هیچ ژیانێکی نەبوو. فریشتەکان هەموویان کاتێک دەبن بە فریشتە، دوا ژیانی خۆیان دەژین. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو لە دڵی خۆیدا گووتی «منیش فریشتەم». بە گاڵتەی نەبوو کە بەخۆی گووت «منیش فریشتەم»، گوزارەکە لای ئەو هێندەی جۆرێک بوو لە سوکایەتیکردن بەخۆی ستایش نەبوو، بۆ کەسێکی پزیشک و ژیاندۆستی وەک ئەو، فریشتەکان بوونەوەرگەلێک بوون توانای ژیانیان نەبوو، لە نەخۆشێک دەچوون دەستیان لە دیواری مردن دابێت یان چووبێتنە جۆرێک لە بێهۆشی هەتاهەتاییەوە. ئەم ژیانەی ئەمیش جۆرێکە لە بێهۆشی هەتاهەتایی، هەموو ژیانێک کە بوو بە جۆرێک لە دووبارەکردنەوەی هەمان خواست، دەبێت بە جۆرێک لە بێهۆشیی

ئەبەدیی. بە هێمنی سەری خستە ناو دەستییەوە و گووتی «ئەی فریشتە مەلعونەکەم دەمکوژیت». ماوەیەک بوو زۆر جار هەستی بەو لاوازییە گەورەیە دەکرد کە تەنیا لە فریشتە نەخۆشەکاندا بینیبووی، هەستی بە شلبوونی دەست، سپی هەڵگەڕان، لاوازی بێئەندازە و نەمانی ئارەزووی خواردن دەکرد ... بە ترسێکەوە بە خۆی گووت «چ کوشندەیە مرۆڤە باشەکانی سەر زەوی تووشی دەردی فریشتەکان ببن». کە وایگووت بە پەلە دابەزی و بەرەو دەرگای دەرەوەی بیمارستانەکە ڕۆیشت و بەخێراییەکی لە ئەندازەبەدەر کردییەوە و لەسەر پێپلکانەکە وەستا و سەیری ئاسمانی کرد، هەوای هەڵمژی و گووتی «من مرۆڤم، فریشتە نیم». ترسێکی گەورەی پێوەدیاربوو، ترسێک خۆشی شەرمی لێدەکرد، هەستیکرد هەستەکان و قسەکانی بە جۆرێکی بێمانا ناکۆکن. بەڵام دڵنیابوو فریشتەکان ناتوانن چیتر لێرە بژین، شارەکە و وڵاتەکە و سەردەمەکە بە جۆرێک ئالودەبوون، هەر فریشتەیەک ناموسی فریشتانەی هەبێت، ناتوانێت لەم دەڤەرەدا بژی. بەڵام ئەو کەسێکە باوەڕی بە هیچ جۆرێک لە خودکوژی نییە، نە خودکوژی هێمنانە و نە خێرا و دەستوبرد. سەیری ئاسمانی کردەوە، بۆ ئێستێک واهاتە بەرچاوی هەورە سەنگین و ئەستوورەکانی بەهار خەریک بێت پەرتەوازەبن، بایەکی نادیار و هەست پێنەکراوی باکووری بیانتارێنێت ... ئێستا پێویستی بە ئیرادەیەکی گەورە بوو تا بیسەلمێنێت مرۆڤە و فریشتە نییە، بیسەلمێنێت ساغە و نەخۆش نییە. هاتبووە دەرێ تا هەوا هێز و تینێکی بداتێ، سەرمای شەو خوێنی بجوڵێنێت و ئەو خەیاڵە بەدە لە سەریدا دەربکات. لەزەتێکی زۆری لە جوڵەی هەورەکان بینی کە بێباک دەڕۆیشتن و کارێکیان بەوەوە نەبوو لەسەر زەوی چی دەگوزەرێت. هەوای شێدار و فێنک خێرا دەیانخستەوە سەرحاڵ، لە دوور ژاوەژاوێکی کپ دەهات، کە ژاوەژاوی جەستەی برینداری شاربوو وەختێک لە خۆی دەترازێت. بە هێمنی بەرەو گەراجی ئۆتومبێلە فریاگوزارەکان چوو، ویستی بزانێت بۆ کاتی پێویست هیچ ئۆتومبیلێک ماوە یان شۆفێرەکان و پزیشکەکان و فەرمانبەرانی بەشی فریاگوزاری هەموویان بردوون. گەراجی ماشێنەکانی فریاکەوتن دەکەوتە ڕاستی بینای

بیمارستانەکەوە، لە سوچێکدا دوور لە ڕوانگەی ئەو ... هێدی هێدی بە لا تەنیشتی بیمارستانەکەدا ڕۆیشت، بەو شەوە، لەو هێمنییەدا خۆی وەک مەخلوقێکی نامۆ بەم سەر زەمینە هاتە بەرچاو، کەسێک ناتوانێت لەگەڵ خەڵکدا بێت، لە کاتێکدا دەیان هەزار مرۆڤ بە ترسێکی قووڵەوە هەڵدەهاتن، شار بۆنی سام و نائومێدیی و هەراسانی لێدەهات، هەمووان سەروماڵی خۆیان جێدەهێشت و دەڕۆیشتن، ئەم وەک سەر بەم ئەستێرەیە نەبێت، بە سەدرییەکی سپی کارکردنەوە هەوای شەو هەڵدەمژێت و دەیەوێت دڵنیابێت نەخۆش نییە. بە تووڕەییەوە بەخۆی گووت «مستەفا شوکاکی تەرەس، تۆ خەڵکی کوێیت؟». پرسیارێکی لە ناکاو و سەیربوو، پێشتر هەرگیز بۆنەیەکی وەها نەهاتبووە پێشێ پرسیاری وەها لەخۆی بکات، لە شوێنی خۆی وەستا و چاوانی لێکنا و پڕ بە سینەی هەوای ساردی ڕاکێشایەوە و بە نائومێدییەکەوە خەریکبوو بیخاتە گریان، گووتی «هیچ کوێ، من خەڵکی هیچ شوێنێک نیم». ویستی بڵێت «من بەشێکم لە وزەیەکی بەرەڵا و بێئاراستەی ژیان... بەشێکم لە وزەیەکی وێڵ کە ماڵ و نیشتەجێی نییە» بەڵام گێڕایەوە، چونکە دڵنیانەبوو ئەو بۆچوونەی چەندە ڕاستە. بەڵام بە تووڕەییەوە دەستی جوڵاند و وەک قسە لەگەڵ کەسێکی تردا بکات، بە دەنگی بەرز گووتی «من بەڕێکەوت لێرە لەدایکبووم و دەژیم، بەڵام خەڵکی ئێرە نیم». پاش تۆزێک کەمێک هێوربووەوە، خەندەیەک گرتی و گووتی «دڵنیام، زۆر دڵنیام خەڵکی ئێرە نیم. بۆ ئەبەد تەنیام، خەڵکی هیچ شوێنێک نیم». ئەوە لەو ساتانە بوو کە نەیدەزانی چۆن سەیری خۆی بکات، ڕقی لەخۆی بێت، بەزەیی بەخۆیدا بێتەوە یاخود خۆی خۆشبوێت؟ هەوای ساردی شەو بە جۆرێکی بێمانا هەر سێ جۆر هەستەکەی لە ناخدا تێکەڵکردبوو. بێئیرادەی خۆی دەستی برد بۆ ناوچاوانی و بینی چەند دڵۆپە عارەقێکی سارد لەسەر نێوچاوانێتی، بێئەوەی ئارام بێتەوە، خێراتر بەرەو لای گەراجەکە هەنگاوی نا ... جگە لە ئەمبولانسێکی سکراب و بێتایە کە چەندین مانگ بوو لەوێدا بوو، هیچی تری نەبینی، تەواوی ئەمبولانسەکانیان بردبوو، لەگەڵ سەرەتای ڕاپەڕینەوە تا ئێستا زۆربەی

کەرەستە و شمەکی دەوڵەتی کرابوونە موڵکی شەخسی، بێئەوەی کەس بتوانێت یان بکرێت بێتە دەنگ. لە گەڕانەوەیدا بەرەو لای نەخۆشەکان، سەرێکی لە گەنجینەی داو و دەرمانەکانیش دا، ئەوێش پاکوتەمیز، بە جۆرێکی سەرسوڕهێنەر گسکی لێدرابوو، هەتا سەرە کانیۆلایەکیشی نەدۆزییەوە. بەخۆی گووت «کەواتە تەنیا دەرمان لە بیمارستاندا مابێت، ئەوەیە کە لە دۆلابی پزیشکەکان و ڕەفەکانی بەشی فریاگوزاری ماون». دڵنیابوو ئێستا گەر نەخۆشێکی بەدحاڵ ڕووی تێبکات، جگە لەوەی کەمێک بێهۆشیبکات و لە ئازاری کەمبکاتەوە، هیچی دی بۆ ناکرێت.

کە گەڕایەوە بۆ قاوشی نەخۆشەکان، زۆربەیان خەوتبوون، ئەوانەشی وریابوون لە بێدەنگییەکی قووڵدا نوقمبوون، لەو بێدەنگییە بێسنوورانەی نیشانەی بێمانایی و پوچی هەموو قسەیەکە. هەندێک شەو لە ژیانی ئادەمیزادەکاندا هەیە، دەبێتە دەلیلێکی گەورە کە داهێنانی زمان چ کردارێکی پوچە، ئەمشەو لەو شەوانەیە. دکتۆر شوکاک هەمیشە باوەڕی وابووە کە پوچترین کارێک مرۆڤ کردبێتی و بە بەدبەختییەکی بێسنوور بەسەریدا شکابێتەوە، داهێنانی زمانە. باوەڕی وابوو ترسناکترین شتێک مرۆڤ پێش بۆمبی ئەتۆم بەرهەمی هێنابێت، زمانە. «زمان لە شەوێکی وەهادا چ سوودێکی هەیە؟ ها پێمبڵێ چ سوودێکی هەیە؟» زۆر بە توڕەییەوە لە خۆی پرسی. لەو کاتەوەی نەغەدە وای بەسەرهێنا ڕقی لە زمانە، سەیربوو بەلایەوە لەبری ئەوەی ڕقی لە شیعر بێت ڕقی لە زمان بوو. ماوەیەکی زۆر لەگەڵ مەهدائیلی فریشتەدا لەسەر ئەو بابەتی زمانە لە جەنگ و جەدەلدا بوون. مەهدائیل وای دەبینی زمان تاکە کەرەستەیەکی کاریگەرە کە کار لە فریشتەکان دەکات، بەڵام شوکاک بەپێچەوانەوە ڕای وابوو گەر زمان نەبایە فریشتەکان ئەسڵەن لە مرۆڤ نەدەتۆران. بە توڕەییەوە دەیگووت هیچ قسەیەکی مرۆڤ، هیچ کتێبێکی، نرخی ڕاستەقینەی سێوێکی نییە کە درەختێک بە بێدەنگ و بێ هیچ قسەیەک دەیبەخشێت، نرخی ڕاستەقینەی هێلکەیەکی نییە کە مریشکێک بێ هیچ منەتێک دەیکاتە دیاری بۆ دونیا... هەتا خوداش ئەو کاتە خۆی دەخاتە

ژێر پرسیارەوە کە قسەدەکات، تاخودا بێدەنگە، مەخلوقێکی مەزن و تەلیسماوی و ناکۆتایە، بەڵام کە دادەبەزێتە ناو زمان، دەکەوێتە ژێر هەزار پرسیارەوە. هەمیشە لە دواهەمین پێکی شەودا، کە توڕەدەبوو دەستی دەدا بە مێزەکەدا و بە مەهدائیلی فریشتەی دەگووت «پێمبڵێ کامیان موعجیزەی زیاتر تێدایە، ئەو کتێبانەی ناویان لێناون کتێبە گرنگ و پیرۆزەکان یان پەڕی تاوسێک یاخود چریکەی بولبولێک یان بۆنی مێخەکێک ... کامیان؟». دکتۆر دڵنیابوو کە ئیلحاد لەدوای دابەزینی کتێبە ئاسمانییەکانەوە دەستی پێکردوە، تا خودا بێدەنگە هیچ کۆمەڵگا و بوونەوەرێک نییە گومان لە بوونی بکات، بەڵام کە خودا پەنادەباتە بەر زمان، بەر نوسینی کتێب، لەوێوە هەقمانە هەموو گومانی لێبکەین، زمان کەرەستەیەکی بێفەڕ و نوقسان و کەمسوودی مەخلوقێکی بەدکاری وەک مرۆڤە، ئەوەی خودایەک بە هەموو مەزنی خۆی دادەبەزێت تا بەم کەرەستە بێفەڕە گوزارشت لە خۆی بکات، جێگای گومانە. مەهدائیل لەویادا هەمیشە قاقا پێدەکەنی و دەیگووت «وای دکتۆر، تۆ بۆچوونەکانی ئەلیائیلی فریشتەم بۆ دووبارەدەکەیتەوە... هەمان ئەو بۆچوونانەی کە خۆم بۆم گێڕاویتەوە».

ئێستا زۆر لەزەتی لەو بێدەنگییە دەبینی کە نیشانەی تەواوەتی پەککەوتنی زمان بوو.

کە گەڕایەوە لای بیمارەکان، لەسەر کورسییەکی تایبەت دانیشت و قاچی خستە سەر تەپڵەکێکی نزم و خەوی پێدا کەوت. تا بەیانی هەموو شتێک هێمن بوو، لە دەوروبەری بیمارستان شتێکی ئەوتۆ ڕووی نەدا شایەنی باس بێت، لەگەڵ خۆرهەڵاتدا، دکتۆر خۆی بەرچاییەکی سادەی بۆ نەخۆشەکان ئامادەکرد. دەرمانی پێویستی پێدان و هەموو لە ڕادیۆیەکی بچوکەوە گوێیان لە هەواڵەکان گرت. ئاژانسە دەرەکییەکان ڕاپۆرتی ئەوەیان دەدا کە هێزە دەوڵەتییەکان بە سەدان تانکی سەربازیی قورسەوە کە لە باشوور کشاونەوە، بەرەو باکوور هێرش دەبەن، ئاشکرابوو ئەمڕۆ فاشیستەکان دووبارە دەگەڕێنەوە و دەگەنە شار. دکتۆر شتێکی دەربارەی

ئامادەکارییەکانی خەڵک و پێشمەرگە بۆ جەنگ و بەرگری نەدەزانی، سەیری لێهات کەس نایەت سەرێکی بیمارستان بدات بزانێت لە چ حاڵێکدایە. دکتۆر ویستی جگە لە نەخۆشەکانی بیر لە هیچ شتێکی دی نەکاتەوە، هیچ شتێک. هەموو ڕۆژ جگە لە پاککردنەوە و ڕێکخستن و ئامادەکردنی خواردن بۆ بیمارەکان، کارێکی دیکەی نەکرد. لە پێش نیوەڕۆدا کە دەنگی تۆپباران دەستی پێکرد، ئاشکرابوو تۆپەکان دەورووبەری شار دەکوتن، لەگەڵ ئەوەشدا دکتۆر هەندێک جێگای ئامادەکرد و چی لەفاف و برینپێچ و کەرەستەی تیمارکردنی هەبوو خستییە شوێنێکی نزیک دەست. هەموو ڕۆژ تا ئێوارە هیچ شتێکی تایبەتی لە نزیکی بیمارستانەکەوە دەرنەکەوت، شار تەواو چۆڵبوو، لەدوای نیوەڕۆوە دکتۆر هەستیکرد هەتا باڵندە و مێرووەکانیش شاریان جێهێشتبێت. بەردەوام لە پەنجەرەکانی نهۆمی دووەوە سەیری دەرەوەی دەکرد، ئاشکرابوو سوپا لەسەرەخۆ و بێترس دێتە ناو شارەوە، دڵنیابوو هێزەکانی دەوڵەت ماندوون، دەیزانی تین و تاوی شەڕی قورسیان نییە، گەر تووشی بەرگرییەکی قورس نەبن، ئەوا بەزەحمەت خۆیان لە شەڕەوە دەئاڵێنن، بەڵام دڕندەیی دەرهەق بەبێ دیفاعان کارێکی سەخت نییە. دیسانەوە بیری لەوە کردەوە کە دەشێت ئەو و هەموو نەخۆشەکان تیربارانبکەن. دڵنیابوو شار تەواو چۆڵە، بەعسییەکان هیچ نێچیرێکیان دەست ناکەوێت، دوور نییە هەموو تۆڵەی خۆیان لەمان بکەنەوە، دووریش نییە لە پاداشتی چۆڵکردنی شارەکە و بەدەستەوەدانی بەبێ شەڕ لە هەموو شتێک بگوزەرێن و شەوێکی بێخەیاڵ و ئاسوودە لە شاردا ڕۆژبکەنەوە ... لە نزیکی ئێوارەدا یەکەم تانکی سوپای بینی بە هێمنی کیسەڵێکی نەخۆش و خەواڵووەوە لە شەقامی باشووری بیمارستانەوە بە کاوەخۆ تا ئەوسەر جوڵا، نەخۆشەکان کەسیان نەیاندەتوانی هەستن و بە چاوی خۆیان چاودێری شەقامەکان بکەن، لە بەرئەوە دکتۆر تاکە سەرچاوەی هەواڵیان بوو، ئەو هەموو شتێکی نوێی بۆ دەبردن، بە درێژایی ڕۆژ ئەوەی بۆ دووپاتکردبوونەوە کە شەقامەکان چۆڵن و گولله تۆپەکان دوور دەپێکن... لە ئێوارەدا کە دەرکەوتنی یەکەم تانکی پێڕاگەیاندن،

ترسێکی گەورەی لە چاویاندا خوێندەوە، ترسێک لە ترسی نەخۆشی و بومەلەرزە و ئافەت گەورەتر. هەموو چەندین سەعات لە چاوەڕوانیدا بوون، بەڵام هیچ ڕووی نەدا. هەندێجار دەستڕێژی پچڕ پچڕیان دەبیست، هەندێجار گوێیان لە ناڵەی موشەکێک یان تۆپێک یان خومپارەیەک دەبوو، بەبێ ئەوەی بەدڵنیاییەوە بزانن دەنگەکان لە کوێوە دێن. نەخۆشەکان لەو ژوورەدا ئێستا بیریان لە هەموو سیناریۆ و ئەگەرەکان دەکردەوە، قسەیەکی زۆریان لەوە دەکرد کە ئاخۆ وێنەی دونیای دەرەوە چۆن بێت. ئایا ڕەوکەران هەموو لە چیا چوون بەودیودا و سەر قافڵەیان گەیشتۆتە ئێران؟ ئایا ئەو فڕۆکە و کۆپتەرانەی بەسەر شاردا دەفڕن، کەسیان کوشتبێت؟. دکتۆر سەرنجیدا نەخۆشەکان هەر یەکەیان جۆرە خەیاڵێکیان هەیە، هەستیکرد هەندێکیان شەڕانگێزییەکی شاردراوە لە ڕوانینیاندا هەیە، ئارەزوویەکی نهێنی و نەبینراویان هەیە هەموو ئەم شارە و شارەکانی دیش بە وێرانی ببینن، ناتوانن ئەوە لە تۆن و نیگا و جوڵەیاندا داپۆشن کە وێرانەیی خۆشحاڵیاندەکات... هەندێکیشیان بە پێچەوانەوە ترسێکی قووڵیان لە وێناکردنی دیمەنەکانی کاولکاری و کوشتندا هەبوو، بە هەموو جۆرێک دەیانەویست بڵێن هەموو شتێک لە دەرەوە ئاساییە، هیچ ڕووی نەداوە و ڕوونادات. دکتۆر لە نیهانی خۆیدا گووتی «دوو جۆر ئادەمیزاد لەم دونیایەدا دەژین، هەردوو ئەو جۆرە ئێستا لێرەن، لەم قاوشەدان... یەکێکیان بەردەوام دەیەوێت جیهان پڕبێت لە ڕوداو، پڕبێت لە شتی نوێ، لە کارەساتی سەرنجڕاکێش، ئەوانە چەشنێکن لە مرۆڤ کە ناتوانن بێ ڕوداو بژین، لە جیهان دڵنیانین، خۆشباوەڕ نین، گومانکار و کارەسات پەرەوەرن. جۆرێکی تریش مرۆڤ هەن لە خۆی دەچن، وەک ئەو گەمژەن، لەو باوەڕەدان هەرگیز هیچ شتێکی گرنگ ڕوونادات، باوەڕیان بەدەورووبەریان هەیە، بێترس خۆیان دەدەنە دەست شتەکان، بەڵام ڕۆژێک دێت چاودەکەنەوە و دەبینن لە چ جێگایەکی هەڵەدا بوون. دکتۆر بەخۆی گووت «هەتا دوای خیانەتی نەغەدەش، نەبووم بە کەسێکی عاقڵ، نەبووم بە کەسێکی کارەسات بین ... ئەو ترسە کەمەی هەمە، بە کاریگەریی بینینی بەردەوامی لاشە و خوێنە، بەڵام ڕاستگۆبم لەگەڵ خۆم و زەق و

زۆپ دانی پێدابنێم، من هێشتا خۆشباوەڕێکی گەمژەم، باوەڕم بەم کەسە دەبەنگە نییە کە پێیدەڵێن مرۆڤ، بەڵام باوەڕم بە قەدەرە، هەستدەکەم هیچم لێ ناکات». سەیربوو بە لایەوە دوای بینینی ئەو هەموو جەستە زامدار و لەشە هەلاهەلایەی مرۆڤ، دوای تێپەڕینی ئەو هەزاران نەخۆشە بە ژێر دەستیدا، هێشتا کارەساتبینێکی ڕاستەقینە و سەرپەڕی لێدەرنەچووبوو. هەتا ئەوەی کە بیری لە مردنی خۆی دەکردەوە، وەک کارەسات نەیدەبینی... بە خەندەیەکی منداڵانەوە کە دەمێک بوو بەوجۆرە نەکەوتبووە سەر ڕووی، بەخۆی گووت «من ئەوەندە گەمژەم هەتا مردنی خۆشم بە کارەسات تێناگەم». تا شەو درەنگ لە نێوان نەخۆشە خۆشبین و بەدبینەکاندا جەنگ و جەدەل بوو، هەتا هەندێک لەو نەخۆشانەی کە زمانیان گۆی نەدەکرد و تەنیا بە ئاماژە قسەیاندەکرد، بە سەر و دەست و ئیشارەت بەشداری گفتوگۆ بوون. دکتۆر بە بێدەنگی و خۆشحاڵییەوە گوێی لە هەردوو لایەنەکە گرت، ئەو کاتانەی کە دەبوو هەستێت و نان ئامادەبکات، دەرمانەکان بهێنێت، بڕوات و ببینێت لە کوچە و شەقامە نزیکەکاندا چ باسە، دەیویست خێرا بگەڕێتەوە و گوێ لە ڕاز و دەمەتەقێکان بگرێت. ئەزموونی خۆی لەگەڵ ژیاندا پێیدەگووت، بەدبینەکان لەسەر هەقن، هیچ شتێک لەسەر زەوی نییە باوەڕی پێبکەین. بەڵام خۆشبینی و خۆشباوەڕی بە دونیا و ژیان، جۆرێکە لە نەخۆشی. وەک چۆن سەدان ساڵ لە ئەزموون نەیانتوانیوە ماسییەکان فێربکەن خۆیان لە قولاپ بە دووربگرن و هەر سیحری خۆراک زیاتر کێشیاندەکات، ئەزمونی بەدبەختی زۆریش ناتوانێت مرۆڤ فێری بەدبینی بکات. دکتۆر خۆی وەک ماسییەکی خۆشبین هاتە پێشچاو، کە گەستنی سەدان قولاپی ژەهراوی نەیانتوانیوە فێریبکەن گومانی ژەهراوی لە هەموو شتێک هەبێت، بەخۆشحاڵییەکی بێماناوە، بە شادی منداڵێکی نەفامەوە بە خۆی گووت «من گەمژەم». دڵنیاش بوو گەمژەیە... دڵنیابوو... چونکە گەرچی ڕۆژانە نیشانەی دڕندەیی لە مرۆڤ بینیبوو، ڕۆژانە ئەو برینانەی سارێژکردبوو کە مرۆڤ دەیکاتە مرۆڤ، بەڵام هێشتا وەک پێویست ترسی لێیان نەبوو، هێشتا لە قووڵایی ناخیدا باوەڕی وابوو هیچی ترسناک

ڕووناداتت. لە کاتێکدا خەریکی خواردن ئامادەکردن بوو، بە دەنگی بەرز و لەبەرخۆیەوە گووتی «شوکاک گوێبگرە... ژیان هێزێکە بۆ هەمووومان، بۆ نەخۆش و گەمژەکانیش، هێزێکە بۆ سەراپای مەخلوقاتی ئەم سەر زەمینە. پێویست ناکات وەها خۆشبین بیت، نا هیچ پێویست ناکات، گەر ئەمشەو بتکوژن مردنت مانایەکی دەبێت، لایەنیکەم لەو ساتەدا کە فیشەکەکان دەتپێکن، مانایەکی بۆ خۆت هەیە، دواجار لە پێناوی نەخۆشەکانتدا دەمریت. هەڵبەت مانایەکی تاریک و ئازاراوییە، بەڵام مانایە». دکتۆر هەستیکرد ئەوەی چەند شەوێکە نەیخواردۆتەوە کەمێک گەشبینیکردوە، ڕاستە هەمیشە ژیانپەرست بووە، بەڵام لە ڕۆژێکی وا سامدار و بەد دا کە هەموو ڕادیۆکانی دونیا قسە لە کارەساتێکی گەورە دەکەن، ئەم لەم بیمارستانە چۆڵەو لە ناوەڕاستی هەموو بەدبەختییەکاندا، دەیتوانی وەکو گەمژەیەک گەشبین بێت، دەیتوانی بڵێت خۆشبەختانە خەڵکی شار بێدەردەسەرییەکی ئەوتۆ لەم جەهەنەمە گوزەران و ئێستا لەودیو چیاکانەوە لەخێوەتی ئەمان و ئاسوودەگیدان. «ئەوە گەمژەییەکی فەلسەفییە» وای بەخۆی گووت. لەکاتی ئامادەکردنی خواردنی ئێوارەدا، بیری لەوە کردەوە گەر مەهدائیل لێرەبایە و زاراوەی «گەمژەیی فەلسەفی» ببیستایە، پێی سەرسام دەبوو. مرۆڤ دڕندەیە، تێکشکێنە، بێڕەحمە... بەڵام جۆرێک لە گەمژەیی فەلسەفی وامان لێدەکات خۆمان بدەینە دەست ئەم مەخلوقە قێزەونە بەدڕەوشتە، باوەڕی پێبکەین، چارەنوسمانی تەسلیمبکەین. هەستیکرد هەر ئەو خۆشباوەڕییە وای لێکردوە سەرەتا گەمژانە باوەڕ بە «نەغەدە» بکات. ئێستا کە بیر لەو ماوە کورتەی پێکەوە ژیانیان دەکاتەوە، هەستدەکات هەموو نیشانەکان ئاشکرا دیاربوون کە نەغەدە خیانەتی لێدەکات... بەڵام ئەوەی ڕێگای لەم گرتووە ببینێت، گەمژەییەکی فەلسەفی بووە. بەخۆی گووت «گەمژەیی فەلسەفی ئەوەیە بچیتە ناو قەفەزی پڵنگێکی برسی و ئومێدت بەوە بێت سەلامەت بێیتە دەرەوە». تۆزێک وەستاو هەستیکرد ئەم هەموو ژیانی دەچێتە ناو قەفەزی پڵنگەکەوە و هەرجارەی بە برینێکی قووڵەوە دێتەوە. کە ئەوەی بەیادا هاتەوە نەغەدە چی بەرامبەر کردوە، وەختبوو بگری،

دڵی توند گوشرا، ویستی هەموو شتێک دانێت، هەموو ئەم بیمارستانە بەجێبهێڵێت و بگەڕێتەوە ماڵەوە و دەرگاکە لەخۆی دابخات و نەیەتەدەرێ، وەک ئەوەی شتەکان دوێنێ ڕوویاندابێت، دوێنێ و بەس ... بۆ ساتێک هەموو گەشبینی و گەمژەییە فەلسەفییەکانی ڕەوینەوە و دونیای هێندە ترسناک بینی کە مرۆڤی عاقڵ گەر بتوانێت دەبێت بەشی دە ساڵ زەخیرە بباتە ژوورێک و نەیەتەدەرێ، تاچاوی بەم مەخلوقە درۆزنە دڵڕەقە نەکەوێت کە ناوی ئادەمیزادە. هاوارێک لە ناخییەوە گووتی «ژیان بێمانا نییە، بەڵکو مرۆڤ بێمانایە». بەڵام بێئەوەی ئەو بۆچوونە کۆنەی خۆی بەجیدی بگرێت، دەستیکردەوە بە کارکردن و لە چێشتخانەی بیمارستانەکەدا دەستیدایە هەڵپچڕینی هەندێک قوتوی ماسی بۆ نەخۆشەکان.

شەوی دووەمی دوای ڕەوەکە شار هێمن بوو، هەتا دکتۆر چەندین جار بە سەدرییە سپییەکەیەوە تا بەردەرکی دەرەوەی بیمارستان ڕۆیشت و گەڕایەوە، دکتۆر سەرنجیدا کە بە درێژایی ڕۆژ زۆر کەم ئارام و سرەوتی بووە، بەردەوام وەک دەستێکی نهێنی بیهێنێت و بیبات جوڵاوە. ئەو چالاکی و هێزەی خۆی لاسەیربوو. جاران گەر شەو یەکێک بە مەستی بیدیبایە، لە خۆی دەپرسی، چۆن ئەم نیوەلاشەیە دەتوانێت کاری پزیشکان بکات. بەڕۆژیش لە بیمارستان گەرچی هەموو کاری خۆی دەکرد، بەڵام تین و تاوی زیندوویەکی ڕاستەقینە، لە جوڵە و ڕەفتاریدا نەبوو، هەموو شتێک ئازاریدەدا، هەموو شتێک ساردی دەکردەوە، هەموو شتێک بەرەو پەشیمانی دەیبرد. هەستیکرد ئەوەی ژیانی ئەم چەند ساڵەی زۆر سەختکردوە، نیگای سووکانەی پزیشکە یاوەرەکان و کیژە دکتۆرەکانە کە بەردەوام بە گومان و قێز و شتێک لە بێزاریشەوە سەیریدەکەن. ئێستا کە بە تەنها ئەم بیمارستانە دەباتەڕێوە، هەستناکات هەمان ئەو هەستە ناخۆشانەی هەبێت، بەپێچەوانەوە چاپوک و پڕتاویشە، هەتا غایلە و سێبەری سەنگینی مەرگ ناتوانن لە هێزی ئەو کەمبکەنەوە.

ڕۆژی سێیەم نزیکی نیوەڕۆ، هێزێکی سەربازیی لە نزیک بیمارستان نیشتەجێبوو، تا ئەو کات شار تەواو چۆڵ و مردوو بوو. لە نیوەڕۆدا ئەفسەرێکی عەرەب هاتە بیمارستان، پیاوێکی باریکی سپیکەلەی چاویلکە لەچاوبوو، یەکێک بوو لەو ئەندازیارە ئەکادیمیستانەی، فاشیستەکان بە زۆر کردبوویانە ئەفسەری سوپا، بە زمانێکی بەغدادی ڕۆشن قسەیدەکرد، دکتۆر لەودیو وشەکانییەوە ئاسان کلاس و ڕەچەی ئەرستۆکراتیانەی دەخوێندەوە، لەوانەبوو کە وەحدەکەیان لە جەنگی کوێتدا بەرپرسی پاراستنی سەلامەتی و دروستکردنەوەی هەندێک پردی ناو پایتەخت و دەورووبەری بوو، هێزەکەیان زۆربەی ئەندازیار و تەکنیککار و لۆژیستیک بوون، بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی ڕاپەڕیندا، بەعسییەکان بە ناچاریی و لەبەر کەمی هێز، ئەم هێزە هەندەسییە بچوکەشیان ناردبوو بۆ جەنگ. ئەفسەرەکە بێخەوی و شەکەتییەکی زۆری پێوە دیاربوو، لە بری پرسیار و لێپێچینەوە، بە شەرمێکەوە داوای دەرمانێکی کرد بۆ تەسکینی ددان ئێشەیەکی بەهێز، کابرا ئاشکرا دەم و ددانی هەوێکی خراپیان کردبوو، بن پوکەکانی تەواو زەردبووبوون، چاوانی وەک کەسێک چەندین شەو بێت نەخەوتبێت، سوور و ئاوسابوون، نیگاکانی پتر پڕبوون لە پاڕانەوە تا هەڕەشە. دواتر داوایکرد بۆ چەند سەعاتێک لە جێگایەکی هێمن و گونجاودا بخەوێت، گووتی گەر بۆ چەند سەعاتێک جێخەوێکی بچوکم بدەنێ بە کەڵکی پشووی ئادەمیزادان بێت، زۆر سوپاسگوزارتان دەبم. بیمارستانەکە هەمووی تەختەخەوی خاڵی بوو، دکتۆر دەرگای ژوورێکی بۆ کردەوە و پێیگووت دەتوانێت چەند دەیەوێت بخەوێت. ئەفسەرەکە چەند سەعاتێک خەوت و دواتر بێدەنگ هەستا و بە ساردیی کەسێکی ماندووەوە، بەدەم ناڵەی ئازاری ددانەوە بە هێمنی بیمارستانەکەی بەجێهێشت.

شەو درەنگ، دەمێک دکتۆر دەیویست چاوێک بنێتە خەو، سەدرییە سپییەکەی دانا و لەسەر تەختێک ڕاکشا، هێشتا چاوانی گەرم نەبووبوون، کە دووبارە لەسەر دەنگی هاواری ئەفسەرە عەرەبەکە وریابووەوە.

ئەفسەرەکە بە دەنگی بەرز و شتێک لە تووڕەییەوە لە حەوشی بیمارستانەکەوە بانگی لە دکتۆر کرد. نەخۆشەکان زۆربەیان لەخەو راچەنین... شوکاک وەک پیاوێک لەو جۆرە ساتەوەختانەدا زۆر ژیابێت، جلی پزیشکانی پۆشی و بە ویقاری دکتۆرێکەوە کە خۆی بە پاسەوانی حەرەمی بیمارستان دەزانێت، بە چەند هەنگاوێکی کاوەخۆ و سەبورانە چووەدەرێ. ئەفسەرەکە دوو سەربازی خودە لەسەر و گەنجێکی چوارشانەی مەدەنیپۆشی لەگەڵدا بوو. بە شتێک لە شپرزەییەوە، گووتی «دکتۆر پێویستیمان بە یارمەتی تۆیە تا بریندارێک هەیە بیگوازینەوە. پێویستیمان بە یارمەتی دەستوبردی تۆیە». ئینجا بە دەست ئاماژەی بۆ گەنجەکە کرد و گووتی «تکایە بۆی ڕوونبکەرەوە، بەدەم ڕێگاوە هەموو شتێکی بۆ ڕوونبکەرەوە... هەموو شتێک، من لەبەر ئازاری ددانم حەوسەڵەی قسەکردنم نییە». ئەفسەرەکە و سەربازەکان، دکتۆر و گەنجەکەیان دایە پێش خۆیان و بەرەو لای بیمارەکە کەوتنە ڕێگا. گەنجەکە بە دەنگێکی ڕۆشن، بە وریایەکی لە ئەندازەبەدەر و فەزاحەتێکی تایبەتییەوە کە کەمجار لە گەنجی هاوتەمەنی ئەو چاوەڕواندەکرێت، گووتی «دکتۆر چیرۆکەکە بەمجۆرەیە، ئەو بیمارەی کە ئێستا دەچین بۆ لای باوکی منە، ناوی مەهدی سلێمانە، من کوڕی ئەوم، ناوم ماکوانە، ماکوان مەهدی، مەحەلێکی بۆیەکردنی ئوتومبێلم لە نزیک گەراجی بەغداد هەیە، لە ناوچەی سەناعی. باوکم بە مەهدی دەریایی بەناوبانگە، تا نەڵێیت مەهدی دەریایی کەس نایناسێتەوە. هاوەڵەکانی وایان ناوناوە، چونکە دەڵێن هەموو ژیانی لە بەحری مەیدا مەلەیکردوە، دەڵێن هیچ کەس وەک ئەو شارەزای مەی و مەستی و ڕشانەوە و بێهۆشی نییە. ئێستا سوپاس بۆ خودای میهرەبان، ماوەیەکە باوکم وازی لە هەموو شتێک هێناوە و ڕێگای خوداناسی گرتۆتەبەر، مەلاکانی هاوڕێی باوکم دەڵێن خودا یاربێت، ئەو دەریایە لە دەریای مەیەوە دەبێتە دەریای ئیمان... دیارە هەموو دڵمان بەوە خۆشە، من و دایکم و ژنەکەی دیکەشی. کورتەی بەسەرهاتەکە ئەوەیە، باوکم ماوەیەک لە مەوبەر لە ئاگرێکی گەورەدا دەستێکی و نیوەی ڕوخساری دەسووتێت، باوکم دەڵێت لە کاتی

ئازادکردنی کەرکوکدا وای لێهاتووە، بەڵام بۆچی وای لێهاتووە و لە کوێ، ئەوە شتێکی ئەوتۆ گرنگ نییە. من وەک کوڕە گەورەی ئەو، هەموو واجبێکی خۆم جێبەجێکرد، هەر لە شەوی یەکەمەوە، گەرچی زۆر پەشۆکام، بەڵام بە ئەرکی فرزەندانەی خۆم هەستام و هێنامە ماڵی خۆم و چی لەسەرشانمە وەک کوڕێک ئەنجاممدا... باوکم هیچکات باوکێکی باش نەبووە بۆ من. دەزانم ئێستا کاتی ئەو قسانە نییە، هەر کەسێکی تریش بێت لە جێگای ئێوە دەڵێت زوو بمگەیێنە سەر بریندارەکە بزانم لە چ حاڵ و وەزعییەتێکدایە، بەڵام هەندێک قسە هەن بە جۆرێکی ناخۆش لە ناو زگی ئینساندا دەمێننەوە، هەندێک ڕاز هەن وەک ژەهر وەهان، دکتۆر، مرۆڤ ناتوانێت لە دڵی خۆی دەریان نەکات، چونکە گەر بمێننەوە خەومان لێ حەرامدەکەن. ئا دەبێت پێتان بڵێم ئەم پیاوە هیچ کات بۆ من باوکێکی باش نەبووە. خولاسەی چیرۆکەکە ئەوەیە، دوای سووتانی باوکم لەو ئاگرەدا، چەند ڕۆژێک باوکم منی نارد بەدوای کەسێکدا بگەڕێم ناوی «هۆشەنگی بولبولیار»ـە، زۆر مەبەستی بوو بیدۆزمەوە و زانیاری لەسەر پەیدابکەم، نەوەک من بەتەنیا، بەڵکو هاوڕێکانی باوکیشم هەر بۆ ئەو کەسە دەگەڕان کە ناوی هۆشەنگە، بەڵام بێهودە بوو، چۆن بیدۆزینەوە، هەتا وێنەیەکیشمان نەبوو... ئاشکرا کوڕەکە لە ناو شاعیر و شیعر دۆستاندا ناسراو بوو، پشکنین و گەڕانەکانم بۆیان سەلماندم کە هەتا لە گەڕەکی غەمپاشاش کەسایەتییەکی دیارە و خەڵکی خۆشیاندەوێت، بەڵام لە کوێ بوو، چی بەسەرهاتبوو؟ کەس نەیدەزانی. باوکم چ کارێکی بەم بولبولیارە هەبوو، ئەوەیان بەسەرهاتێکی ترە. گوایە ئەمانەتێکی گرنگی لایە و دەبێت وەریبگرینەوە. بەڵام ئەمانەتەکە چییە؟ من نازانم. لە پێرێوە کە ئەم ڕاکردنە دەستیپێکردوە، کە خەڵک شار چۆڵدەکەن، باوکم جگە لە خەیاڵی دۆزینەوەی بولبولیار نیازێکی تری نییە، لەڕاستیدا قەبووڵم نەبوو باوکم بەو دۆخە خراپەوە کە ناتوانێت بەدەستی خۆی نان بخوات، بەجێیبهێڵم. نا لەبەر باوکم نەمهێشت ژنەکەشم لەگەڵ ماڵی باوکیدا بڕوات و بە ڕوونی پێمگووت ئێمە دەمێنینەوە و خزمەتی باوکم دەکەین، من ناتوانم پیاوێکی وا نەخۆش کە برینەکانی هێشتا پێویستیان

بە دەرمان و خۆشی پێویستی بە خزمەتە، بخەمە بەر کۆچی وا سەخت. بەڵام هەموو بەدبەختییەکە ئەمشەو دەستی پێکرد، بەڵێ بەدبەختی گەورە ئەمشەو دەستی پێکرد، کاتێک لە ناکاو میوانێکی نەناسراو لە دەرگای ماڵی ئێمەیدا و داوای بینینی باوکمی کرد، کابرا ڕێگایەکی سەخت و درێژی گەڕانەوەی لە سنوورەوە تا ماڵی ئێمە بڕی بوو ... کابرا ئەو سەرکێشییە گەورەیەی کردبوو بە پێچەوانەی ئەو خەڵکەوە بێت و گوێ نەدات بە هیچ مەترسییەک و هەواڵی هۆشەنگی بولبولیار بۆ باوکم بهێنێت. باوکم هەر هەواڵەکەی بیست ... هەر پێیانگووت بولبولیار ڕووی لە چ خاڵێکی مەرز کردوە، بێئەوەی گوێبداتە تەندروستی خۆی، گوێبداتە برینەکانی، لە جێگا هەستا تا لەگەڵ قاسیدەکەدا بکەوێتە ڕێگا بۆ سەر سنوور. بەڵام بەر لەوەی زۆر لەماڵ دووربکەوێتەوە، سەربازەکان تەقەیان لێکرد و ئاوا زامداریانکرد ... باوکم پیاوێکی باش نییە، بەڵام بووە بە کەسێکی خواناس و ئیماندار، منیش جگە لە ئیتاعەی کوڕێک بۆ باوکی چارەم نییە. ئەوە کورتەی چیرۆکەکەیە. ئێستا دوو گوللەی پێوەیە، یەکێکیان لە سەرشانی و ئەویتریان لە پوزیایەتی. دوو تفەنگ لە دوو جێگای جیاوازەوە تەقەیان لێکردوە، یەکێکیان بە نیازی کوشتن، ئەویتریان بە نیازی ترساندن».

دواتر گەیشتنە بەردەم زنجیرەیەک تانکی سەربازیی کە بە جۆرێکی زنجیرەیی لە شەقامێکی نزیک بیمارستانەکەدا وەستابوون. دکتۆر شوکاک ماوەی نێوان بیمارستانەکە و تانکەکانی بە نیو کیلۆمەتر قەبڵاند. سەربازەکان دوای ئەوەی تەقەیان کردبوو، زامدارەکەیان گواستبووەوە بۆ ناو یەکێک لە تانکەکان و لەوێدا لەسەر بەتانییەکی بۆری سەربازیی ڕایانکێشابوو. پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانە بوو، بە قژێکی ماش و برنجی لوولەوە. ئاشکرا خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیشت بوو، دکتۆر لە ساڵانی کارکردندا لە بیمارستانی عەسکەری، زۆرجار برینداڕانی لە هەلومەرجی دژواردا گواستبووەوە، ئێستا سوودی لە پەتۆی ژێر زامدارەکە بینی و دەستەبەرەیەکی لێ سازکرد و لەگەڵ ماکوان و دوو سەربازەکەی دیکەدا

هەڵیانگرت، دکتۆر گەرچی بەپرتاو بیمارەکەی بەرەو بیمارستان دەگواستەوە، بەڵام بە درێژایی ڕێگای گەڕانەوە خەیاڵی لای قسەکانی ئەو کوڕە بوو. دەبێت چ پەیوەندییەک لە نێوان «بولبولیار» و ئەم پیاوەدا هەبێت؟. چی بولبولیاری هێناوەتەوە ناو ئەم شەوە سەیرەوە؟ ئەم زامدارە نیوەگیانە کێیە و چ ئەمانەتێکی لای بولبولیارە؟.

بە پەلە بریندارەکەی لە ژوورێکی نزیک لە نشینگەی نەخۆشەکانی ترەوە خەواند و هەموو کارێکی پێویستی بۆ کرد تا خوێنبڕانی بگیرسێتەوە. پیاوەکە بونیادێکی تۆکمە و بەهێزی هەبوو. کوڕە گەنجەکەی، گەرچی ئەویش چکۆلە و ڕیوەڵە نەبوو، بەڵام بەراورد بە قیافەی باوکی، هێشتا خاو و نەگەیو دیاربوو. دکتۆر جگە لەوەی ڕێ لە خوێنبڕانی زیاتر بگرێت، برینەکانی بۆ پاکبکاتەوە، ئاوی وزەبەخشی بۆ هەڵبواسێت، کارێکی لە دەست نەدەهات. پیاوەکە بە جۆرێک پتەو و بەهێز دیار بوو، دڵنیابوو ئاسان بەرگەی ئەو دوو زامە دەگرێت کە هیچیان جێگای کوشندەیان نەگرتبوو. لایەکی ڕوخساری پێکراوەکە برینپێچێکی گەورەی لەسەربوو، لەفافێکی گەورە کە نیوەی دەموچاوی و بەشێکی پشتەسەر و گەردنی گرتبوو، دەستێکێشی هێشتا لە لەفاف پێچرابوو. دکتۆر لە کوڕەکەی پرسی «باوکت چ کارەیە؟». ئەو بێدەنگبوو، پاش ئێستێک گووتی «نازانم، باوکم هەمە کارەیە، هەمە کارە ... بەڵام ئیشە سەرەکییەکەی نازانم چییە؟ ئەوەتەی فامکردۆتەوە ئیشێکی تەواوی نەبووە». وەڵامەکەی کەمێک بێمانا و سەیر هاتە گوێی دکتۆر، بێئەوەی لەسەری بڕوات، گووتی «خۆت دەبینیت، جگە لە من بیمارستان هیچ پزیشک و سیستەرێکی تێدا نییە، تەنیای تەنیام، بەشی هەرە زۆری کەرەستە و دەرمانەکانیش براون، لە بەرئەوە کارێکی زۆر زۆرم بۆ ناکرێت، ئەوەی بۆم بکرێت دەیکەم، خۆشبەختانە پێناچێت برینەکانی کوشندەبن ... دڵنیام زوو چاکدەبێتەوە».

هەستی نەکرد قسەکانی ئازاری کوڕەکەی دابێت، بە کاوەخۆ وەک باوەڕ بە هێزی ژیان بکات لەم پیاوەدا، گووتی «شتێک هەیە ناوی ئیرادەی

ژیانە لە مرۆڤدا، ئەوە لە دەرمان و داروویی ئێمە بەهێزترە». کوڕی کابرا پەرچەکردارێکی وەهای نیشان نەدا. دکتۆر گووتی «شەو دەبێت تۆش لێرەبیت، چوونە دەرەوە لە ئێستادا ترسناکە، یاری بە ژیانی خۆت مەکە. هێزەکانی دەوڵەت لە هەموو تارماییەک دەترسن. لێرە دەتوانیت دانیشیت و ئاگات لە باوکت بێت. من نەخۆشی ترم زۆرن، هەر کات هەستت بە شتێکی نائاسایی کرد، بانگم بکە». گەنجەکە پێشنیارەکەی دکتۆری پێخۆش بوو.

هەفتەیەک دوای ئەو شەوە، ژیان لە شار و خەستەخانەکەدا کەمێک هێمن بووبووەوە. هێدی هێدی هەندێک لە پزیشکان و کارمەندان گەڕانەوە بیمارستان. چوار ڕۆژ دوای هاتنی مەهدیی دەریایی بۆ بیمارستان، یەکەم گفتوگۆی ڕاستەقینە و ورد لە نێوان ئەو و دکتۆردا ڕوویدا. هەڵبەت مەهدی دووەم ڕۆژ دوای کەوتنی لە بیمارستان هۆشی هاتەوە بەر، بەڵام دکتۆر پێیگووت کە نابێت لێرە بڕۆیت تا دوو نەشتەرگەریی ڕاستەقینەت بۆ نەکرێت و گوللەکان لە لەشت دەرنەیەن، چونکە هەر جوڵەیەکی نابەجێ دەشێت دووبارە ژیانت بخاتە مەترسییەوە. کابرا زۆری پەلە بوو بگاتە جێگایەکی دیکە و کارێکی نهێنی و تایبەت جێبەجێبکات. دکتۆر هەر ڕۆژی دواتر لە شەوی کەوتنی، سەرنجیدا ڕوخساری کابرا لەوە زۆرتر سووتاوە کە شەو لە تاریکی و لە بەر ڕۆشنایی کزی چراکاندا بینی. پێستی ئاسەواری برینێکی گەورەی پێوە بوو، بە جۆرێک پێدەچوو چاوێکی لەدەستدابێت. نەخۆشەکە کاتێک بۆ یەکەمجار هۆشی هاتەوە بەر خۆی و چاوە ساغەکەی کردەوە، لە بینینی دکتۆر ترسا، وەک ئەوەی بینینی ئەو خورپەیەکی خستبێتە دڵییەوە وەهابوو. سەرەتا هیچ شتێک لەبوونی خۆی لەو ژوورە تاک و تەنهایەدا تێنەگەیشت. بەڵام کوڕەکەی بە ملکەچی کوڕێکی ترسنۆکەوە، چیرۆکی شەوی زامداربوونی بۆ گێڕایەوە، ئاشکرا بینینی دکتۆر مایەی ناڕەحەتییەکی بەرچاو بوو بۆی، وەها بوو وەک بیناسێت و چاوەڕوانی دیداری وەها نابەجێ نەبووبێت و نەیەوێت لە بەردەم ئەودا زمان هەڵهێنێت. دەمێک زانی کوڕەکەی باسی بولبولیاری بۆ

دکتۆر کردوە، زۆرتر گرژ و نائاسوودە بوو، وەک یەکێک نهێنییەکی گەورەی ئاشکرابووبێت، ویستی دەمودەست لە بیمارستانەکە ڕابکات، بەڵام برینەکانی وەها جەستە و قاچیان قورسکردبوو، نەیدەتوانی بە ڕێکی هەستێت و پێ بنێتە سەر زەوی. چوارەم ڕۆژ، دەمێک دکتۆر بۆ پرسین لە تەندروستی و گۆڕینی لەفافە خوێنینەکان چووە سەری، بە هێمنی لێیپرسی «دەتوانم بزانم چۆن هۆشەنگی بولبولیار دەناسیت؟». تا ئەوکاتە قسەیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ یەک نەکردبوو، بە نیگەرانی و توڕەییەوە، گووتی «من نایناسم، نایناسم. هێند هەیە ئەمانەتێکم لایەتی دەمەوێت وەریبگرمەوە، شتێکی تایبەتی خۆمە. کەسێکی تر داویەتی بەو، من بە هیچ جۆرێک نایناسم ... مەڵێ دەیناسیت». شپرزەیی و توڕەیی بە جۆرێک گرتبوویان، هەر کەس بیبیستایە دەیزانی درۆدەکات. دەنگی ئاشنابوو، دکتۆر هەستیکرد ئەم دەنگەی لە جێگایەک بیستووە، بەڵام بە جۆرێکی تر و بە تۆنێکی تر، بەڵام دەنگی کێیە؟ هیچ شتێکی بە خەیاڵدا نەهات و هیچ کەسێکی نەکەوتەوە یاد. دکتۆر هەستیکرد ناتوانێت لەسەر پرسیارکردن بەردەوام بێت، دڵنیابوو هیچ زانیارییەکی گرنگی لەم پیاوە سووتاو و زامدار و توڕەیە دەست ناکەوێت کە بێزارییەکی شەیتانی لە سەیرکردن و دەنگیدا بوو، دڵنیابوو ئەم پیاوە هەر شتێکیش بڵێت درۆیە. تا بەدگومانی نەچێنێت گووتی « بولبولیار هاوڕێی منیشە، گووتم گەر زانیارییەکت لەسەری هەبێت... شتێکی دەربارە بزانیت؟ منیش ماوەیەکە نازانم کەوتۆتە کوێوە». دکتۆر درۆیکرد هیچ ئارەزوویەکی نەبوو شتێکی دیاریکراو لەسەر بولبولیار بزانێت، هێند هەبوو کونجکۆڵ بوو شتێک لە پەیوەندی بولبولیار بەم پیاوەوە تێبگات. دەبێت بڵێم دکتۆر لەوساتەدا خەیاڵی بۆ هیچ شتێکی خراپ نەچوو، شتێکی ئەوتۆی نەدەزانی وابکات خراپ بیربکاتەوە. وەک هەمیشە بێدەنگ و دوورەپەرێز و دڵسۆز برینەکانی «دەریایی» تیمارکرد و بەجێیهێشت. سێ شەو دوای ئەوە، مەهدی هێندەی کەوتەوە سەر پێی خۆی، بە دزییەوە لە بیمارستان هەڵهات و دکتۆر تا چەند هەفتەیەک دواتر کاتێک بولبولیار لە هەلومەرجێکی دژواردا هات بۆ لای، ئەم پیاوەی بیرنەکەوتەوە.

نزیکی مانگێک دوای لە هەڵهاتنی ئەو لە بیمارستان، ئێوارەیەک بولبولیار لە بەردەم ژووری پزیشکەکاندا بە چاکەتێکی کۆنەوە دەرکەوت و بە ئەسپایی باوەشی بە دکتۆردا کرد، پێیگووت بە درێژایی هەموو ئەو ماوەیە زۆر بیری لەلای بووە، هەردووکیان وەک دوو برا و دوو دۆستی نزیک لەگەڵ یەک ڕەفتاریانکرد، دوای ئەوە هەردووکیان بۆ چەند سەعاتێک لە ژوورە بچوکەکەی دکتۆردا دانیشتن و قسەیانکرد ... دوای ئەو قسانە، شوکاک هەستیکرد پێویستە، زۆر پێویستە تا زووە مەهدی دەریایی بدۆزێتەوە.

## من و لیڤیتانت و باهیری

نەغەدە ماردینی و لیڤیتانت دوای دوو ساڵ دابڕان، یەکدیان بینییەوە. ساتی یەکەمی دیداریان نە ساتێکی زۆر سارد بوو نە گەرم. دیداری دوو کەسی غروورداربوو کەسیان نەیاندەویست بە دەرخستنی عاتیفەیەکی زۆر لە سەنگی خۆیان دابەزێنن و کارێکبکەن لاواز و بچوک دەربکەون. هیچیان عاتیفەیەکی جۆشداریشی نەبوو بیەوێت بیشارێتەوە، نەک هەر ئەوە، بەڵکو لە قووڵاییدا کەسیان پێویستییەکی گەورەی بەویتر نەبوو، دەیانتوانی ئاسان بێ یەک بژین. لیڤیتانت و نەغەدە نە ئەوە بوو یەکیان خۆشبوێت، نە ئەوە بوو ڕقیان لە یەک بێت، تەنیا شتێک لە نێوانیاندا نەبێت پەیوەندی عاتیفی بوو. نەغەدە لیڤیتانتی وەک سەمبولێکی هەتاهەتایی بۆ بێباکیی و یاخیبوونی خۆی دەویست، یاخیبوون لە خودی خۆشی، لە ڕابوردووی، لەو شتانەی کە دەشێت مرۆڤێک بە درۆ بڵێت ئیمانم پێیانە. لیڤیتانتیش دەیویست بە داگیرکردنی نەغەدە، شتێکی نەگیراو و ئەستەم و ئەفسانەیی لە خۆی نزیکبکاتەوە. بە درێژایی هەموو ساڵانی زیندەگی هاوبەشیان، لیڤیتانت ئەو کەسە هێزدار و ترسناکەیە کە لە پشتەوەڕا هەموو سەحنەکانی نمایش بۆ خانمی ماردینی دیکۆردەکات،

فەزایەک لە دەوری دەسازێنێت، بتوانێت ئاسان و بێترس لە هیچ نوشوستی و غەمێک پەتی بێباکی خۆی تا ئەوسەر ڕابکێشێت، نەغەدەش ئەو ژنەیە کە هەیبەتێکی ڕۆحانی دەبەخشێتە بێڕەحمترین پیاوێک مێژووی ئەم شارە بەخۆیەوە دیبێتی. وەک لیڤیتانت بە خۆی و بە دونیا بڵێت، گەر شاعیرانی پیاو عاشقە سۆزانین و شەیدای ژنی بێ بەند و بارن، شاعیرانی ژنیش ئەوەتا عاشقی پیاوە توند و کوتەکدار و بەهێزەکانن، چەندە مەبەستی بوو بوونی نەغەدە لە پاڵیدا لە ترسی هەمیشەیی خۆی کەمبکاتەوە، ئەوەندەش مەبەستی بوو، بوونی خۆی لە پاڵ نەغەدەدا وەک بۆنەیەک بۆ بچوککردنەوەی شاعیران و سەنعەتە ڕیسواکەیان بەکاربهێنێت. هەردووکیان دوو کاراکتەری وەک یەک بەهێزبوون، بەڵام چوویبوونە دۆخێکی هێمنی ئەوتۆوە کە کەسیان ئامادە نەبوون شەڕانگێزی ئەویتر بوروژێنێت. لەو ژن و مێردانە بوون گەر خۆشەویستی بێتە نێوانیانەوە، ژیانیان وێراندەکات، خۆشەویستی هەستێک بوو لە هیچیاندا نەبوو، هەردووکیان هەموو شتێکیان دەکرد بۆ ئەوەی خۆشەویستی لە ژیانی خۆیان دەربکەن، چونکە دەیانزانی گەر بێت و پەیوەندییەکەیان لەو ڕیتمە سارد و هێمنە دەرچێت، لەوانەیە ژیانیان وێران بێت و یەکدی نابوت بکەن. نەغەدە لە ئەزموونەکانی پێشوویەوە فێربووبوو، هیچ شتێک وەک خۆشەویستی و کینە پەیوەندی مرۆڤ ئاڵۆزناکات. ئاە گەر مرۆڤ بیتوانیبایە خۆی لە هەردووکیان ئازادبکات، گەر ڕۆژێک لە خەو هەستابایەن و بماندیبایە مرۆڤ چیتر نە خاوەنی خۆشەویستی و نە هەڵگری کینەیە، ئەوسا ژیان ڕیتمێکی وەردەگرت ئارام و بێپشێو. هەستیدەکرد هەستە توند و جۆشانە ترسناکەکانی ساڵانی پێشوو، بە جۆرێک ناخیان لە ڕیشەوە هەڵتەکاندوە، چیتر خەزێنەی عاتیفەی بۆ ئەبەد لە هەر تنۆکە سۆزێک خاڵی بۆتەوە. خۆشی مرۆڤێک بوو وەها دەرهەق بە عاتیفە تورە، وەک خانمێک لە هۆدەیەکی پڕ لە سیپاڵی کۆندا، بە خولیایەکی شێتانەوە ماڵ پاکبکاتەوە، ئاوها هەر شتێک بۆنی عاتیفەی لێبهاتایە، وەک جلکی دێرین و دڕاو توڕی دەدایە دەرەوەی ژیانییەوە. پەیوەندی ئەوان لەوانە بوو لەسەر پێکەوەبوونی بێدەنگ، فەرامۆشکردن، بێباکی دروست بووبوو.

ئەو ڕۆژە دوای ئەو هەموو دوورییە یەکیان بینییەوە، ساتی دیداریان شاهیدی ئەو ڕاستیانە بوو کە نە دۆستن و نە دوژمن، دەتوانن پێکەوە یان دوور لەیەک بژین، بێئەوەی شتێکی ئەوتۆ لە کەسیان بگۆڕێت. هیچ بەهانەیەکیان نەبوو بە یەک دڵخۆش و بەهانەیەکیشیان نەبوو لە یەکدی بێزار بن.

شەوی یەکەم، کاتێک دوای ئەو هەموو دابڕانە پێکەوەخەوتن، لیڤیتانت ئەو ڕاستییە ئەزەلییەی بۆ دووبارەبووەوە کە هیچ ئارەزوویەکی سووتێنەر و شێتانەی بۆ لەشی ئافرەت تێدا نییە، ئەگەر شتێک هەبێت و بۆ سێکس بیجوڵێنێت، ئەو تاریکییە گەورەیەیە کە لە ناو ڕۆحی ئافرەتدا هەیە، هەتا هەستیکرد دەمێک بە کەرەستە نێرانەکەی دەچێتە لەشی نەغەدەوە، بۆ ئەو پەڵە تاریک و ڕەشە دەگەڕێت. ناڵە و نرکە و نوکە و نازی ئەم مەخلوقە لاوازە هەستێکی ئەوتۆی پێنەدەبەخشی، تاکە شتێک دەیبزواند، بۆنی عارەقەی نێرێکی گەورە بوو کە لە ژێر ئەشکەنجەدا تێکدەشکێت. شتێکی نهێنی لە ناخیدا ڕێگای پێ نەدەدا بەرامبەر لەشی ژن توند و دڵڕەق بێت، وەک ئەوەی لە ئەزەلەوە وا خرابێتە سەرییەوە کە لەشی ژن خۆی تێکشکاوە و توانای هیچ جەنگێکی نییە. لەزەتێکی لەوەدا نەدەبینی لەگەڵ لەشێکی وەهادا پاڵبکەوێت و عەشقبازیبکات، سێکسکردنی لەگەڵ ئافرەتدا وەک دابەزینێکی ترسناک دەبینی لە هێز و قودرەتی خۆی. ئەو کاتانەش لەگەڵ نەغەدەدا جووتدەبوو وەک ئیشێکی ساردی میکانیکی، وەک خۆ خاڵیکردنەوەیەکی بێهەست هەموو شتێکی دەکرد. دواتر کە هەموو ئەوساتە نهێنیانەی بۆ من باسدەکرد، دەیگووت نەوەک لەزەت نابەم، بەڵکو هەموو ئیرادەی خۆم دەخەمە کار تا لەزەت نەبەم ... سەرچاوەی لەزەتی گەورەی ئەو لە جیگایەکی ترەوە دەهات، ئەو لەزەتی لەوە دەبینی نێرەکان زەلیلبکات، بیانشکێنێت، وایان لێ بکات قێزیان لە خۆیان بێتەوە، ببن بە بەردەستی ئەو، وادیاربن وەک بوکەشوشەی قوڕمیشن و ئەو دەیانجوڵێنێت. ئەوە شالەزەتی لیڤیتانت بوو، نەوەک خەوتن لەگەڵ ژنێکدا کە بەر لەوەی تۆ جارێک چێژی لێ ببینیت، ئەو دە

جار چێژت لێ دەبات. لەش لە بنەڕەتدا لای لیڤیتانت بۆ ئەوە بوو تێکبشکێت، بۆ ئەوە نەبوو ماچبکرێت، بەوەدا ئەو شتێکی ئەوتۆی لەسەر ڕۆح نەدەزانی، جگە لە جەستەی جێگایەکی تری شک نەدەبرد یاری لەسەر بکات. بەڵام هەندێجار جەستەی ڕووتی نەغەدەی وەک جەستەی تێکشکاوی مردوویەک دەبینی، تاکە هێزێک هەندێک جار بەرەو سێکس دەیجوڵاند، ئەوە بوو وەک جۆرێک لە کوشتنی مەجازی سەیریدەکرد، وەک ئەوەی تەواوی ئەو گەمەیە بۆ ئەوە بێت لە دواچرکەدا، لە دوا ترۆپکی ئۆرگازمدا، ئەو نەغەدە بکوژێت. نەغەدەش دەیزانی لیڤیتانت کاتێک لە گەڵیدا دەخەوێت، لەگەڵ خۆیدا ناخەوێت، بەڵکو لەگەڵ مردنیدا دەخەوێت. گەرچی سێکسی لیڤیتانت سێکسێکی دڕندانە و وەحشی نەبوو، شتێک نەبوو بچێتە قاڵبی سادییەتە باوەکانەوە، بەڵام هەر کات دەگەیشتە دواچرکەکانی ئەو ئیشە، کە تەماشای چاوانی گێژی نەغەدەی دەکرد، وەک مردوو دەیبینی، وەک ئەوەی ڕژانی شەهوەتەکەی دەسرێژێک بێت لەگوللەی ژەهراوی و لە ڕەحمی نەغەدەدا تەقاندبێتی... هەندێجار هەستێکی نادیار و تەماوی، بەڵام خۆش و سەرسوڕهێنەری هەبوو کە ئەوەتا بە ئەندامەکەی دەیکوژێت، ئەو هەستە وایدەکرد جارجار بیر لە سێکس بکاتەوە یان حەزی لێبکات، گەر ئەوەش نەبایە، لەوانەبوو خۆی بۆ هیچ ژنێک ڕووت نەکاتەوە. نەغەدەش حەزی لەو مردن و خاوبوونەوە کوشندەیەی دوای سێکس بوو، هەردووکیان زۆر خێرا ئۆرگازم دەبوون، هێند خێرا کە فریانەدەکەوتن بزانن چەند لەشی یەکدیان پێویستە، بەوەدا درەنگ درەنگ لەگەڵ یەکدا دەخەوتن، ئۆرگانەکانیان میکانیکی گرژدەبوو و خاودەبووەوە، بەڵام نەغەدە سەرنجیدەدا کە ئۆرگازمەکانی خۆی توند و خاوبوونەوەکانی توندتربوون، هەستی بە لەرزینی ڕانەکانی خۆی دەکرد کە هێدی هێدی تا دەهات گۆشتنتر و ئەستوورتر دەبوون، ماسولکەکانی دەبینی توند وەک بومەلەرزەیەک ڕایانوەشێنێت دەلەرزێن، بە جۆرێک گەر بەپێوە بایە ئەژنۆی نەیدەگرت و دەکەوت ... نەغەدە بە جۆرێکی درێژ ئەو هەستە سەیرانەی بۆ هاوڕێ ژنەکانی دەگێڕایەوە و ئەوانیش دەیانهێنایەوە بۆ سەر سفرەی پیاوان و دەیانگووت ماردینی بەوجۆرە

ئۆرگازم دەبێت. دەیگووت لە ساتی ئۆرگازمدا وەک دولفینێکم لێدێت کە بە هەموو توانای خۆی بەرەو دەرەوەی ئاو بازدەدات، هەموو لەشم توند بەرەو باڵا تەکان دەخوات، کە خاویشدەبمەوە، لەشی خۆم سووکدەکەم و لێدەگەڕێم هەموو گیانم بلەرزێت و تەکانبدات و نەسرەوێت، وەک کەوتنە خوارەوەی گەڵایەک کە بەو جۆرە لە سەرەوەڕا بەرەو خوار بەربێتەوە. ژنەکانی هاوڕێی لە وەسفی ورد و شاعیریی نەغەدە بۆ ئۆرگازمی خۆی، سەریان دەسوڕما و قاقا پێدەکەنین، خۆشیان لە بێشەرمی و بێباکی نەغەدە دەهات، لەگەڵیشیدا هەستیان بە ترس و ئیرەیی دەکرد. لیڤیتانت ئەو هەستەی لە چاویدا دەبینی و بە هەستی گیاندان و مردن بەراوردیدەکرد. بە پێچەوانەی زۆربەی پیاوانەوە کە بەر لە سێکس، حەز لە تەماشای جەستەی ژن دەکەن، لیڤیتانت لە کۆتاییدا، لەو ساتەدا کە نەغەدە شەکەت و عارەقاوی و نیوە مردوو دەکەوت، حەزی بوو سەیربیکات، سەیری لێدەهات چۆن نەغەدە واخێرا جەستەی بەرەو لوتکەی نەشئەیەکی بەهێز بەرزدەکاتەوە و دایدەگرێتەوە. وەک بەحرێک دەهاتە پێشچاوی بە ئارەزووی خۆی هەڵچێت و بە ئارەزووی خۆی بنیشێتەوە. لیڤیتانت نەیدەتوانی ئەو هەستە بخاتە قاڵبی وشەوە، نەیدەتوانی گینگڵ و پێکدادانەکانی ڕۆحی لە شێوەی ڕستەی ڕووندا دابرێژێت، هەتا نەغەدە خان جارێک پێمی گووت کە هۆمەر کەمدووترین پیاوێک بووە لە ژیانیدا بینیبێتی. ئەو زۆربەی کات ئەگەر لە ماڵ بایە و بەرامبەر نەغەدە دابنیشتایە، جگە لەوەی بێدەنگ سەیربیکات، هیچی دیکەی نەدەگووت، هەرکاتیش باسی ژیانی خۆیان بۆ من کردبێت، هەردووکیان گووتوویانە جوانترین شتی ژیانی هاوبەشیان بێدەنگییە. بەڵام داننان بەوەدا بۆ من سەخت بوو، من ماوەی درێژ لەگەڵ لیڤیتانتدا ژیابووم و دەمزانی ناتوانێت گوزارشتی ڕۆشن لە هەموو شتێک بکات، بەڵام ئەوە بەو مانایە نەبوو لیڤیتانت قسەنەزانێکی بێزبان و هیچ نەڵێیە، یان فەلسەفەیەکی تایبەتی ژیانی نییە، بە پێچەوانەوە لە ناو هەموو ئەو پیاوە شەڕانی و بەدڕەفتارانەدا کە دەمناسین، لیڤیتانت خاوەنی فەلسەفەیەکی خۆی بوو، کەم تا زۆریش دەیزانی گەر بە زمان نەبێت،

ئەوا بە کردار گوزارشتی لێبکات. هەر ئەوەش وایدەکرد من حەز بە دانیشتنی بکەم و تا بێت زیاتریش ڕقم لێی بێت.

دوای ڕاپەڕین کە لیڤیاتانت هاتەوە، من لەو باوەڕەدا بووم هەوڵێکی نەپساو دەدات بچێتەوە سەر هێڵی زیندەگی پێشووی. بەڵام لێزانییەکی بێوێنەی نواند، لیڤیاتانت گەرچی خوێندەوارییەکی وەهای نەبوو، بەڵام هەست و بۆنی بە جۆرێک تیژبوون پێش هەمووان دەرکی بە ڕۆحی ئەو سەردەمە تازانە دەکرد کە لە دوورەوەڕا سەرەتا تەماوییەکانی خۆیان بە ترسەوە دەرخستبوو. کە یەکەمجار لە شاردا بینیمەوە قاتێکی خۆڵەمێشی لە بەردابوو، قژی بە جۆرێکی بەرچاو کورتکردبووەوە، وەک هەمیشە بۆشناخ و لووتبەرز و بێدەنگ دیاربوو، بەڵام کەمێک گەشبین و ڕوو کراوەتر لە جاران. هەمیشە تارمایی تەنهاییەکی سەنگین لە دەوری سەمایدەکرد، بەڵام تەنهاییەک نا کە بەرگێکی ڕۆمانسی دەکاتە بەری مرۆڤ. سەیربوو بەلامەوە کە لە بۆینباخ و پێڵاوی چەرمی ئیتالیدا ببینم، پێدەچوو بە جلە تازەکانی پێمان بڵێت بوومەتە مرۆڤێکی نوێ. ئەوە ئەو نمایشە بوو کە لیڤیاتانت هەر بە غەریزە سەرەتاییەکەی خۆی زوو فێری دەستوور و یاساکانی بوو. جلەکانی وەک جاران هەر بەدیوی ڕەشدا دەیاننواند، بەڵام وەک ساڵانی زوو قەترانی نەبوون. لەکاتێکدا ئێمە پیاوانی قاڵ لە دوکەڵی سەردەمی پێشوودا، هەر بە هەمان وێنەی کۆنەوە چووینە سەر سەحنەی سەردەمە تازەکان، لیڤیاتانت زوو دەمامکێکی تری کردە سەر. من دەمزانی کە لیڤیاتانت ناگۆڕێت، بەڵام چەند کەس لیڤیاتانتی وەک من دەناسی؟ هیچ کەس ... لەڕاستیدا هیچ کەس. ئێوارەیەکیان لە سەرەتای ئابی ساڵی نەوەدویەکدا، خۆی و خانمی نەغەدە ماردینی داوەتی ماڵی خۆیانیان کردم، هەر لە سەرەتاوە هەستمکرد لیڤیاتانت خەرجییەکی زۆری کردوە و دەست بڵاوییەکی بێئەندازەی نواندوە، لەسەر مێزەکە هەوڵیدەدا شێوەی دانیشتن و نیگاکردنی ئەو ڕووکارە سەربازییە ڕەقە بەردات و لە شێوە ویقارێکی عەسکەرییەوە بەرەو ویقاری سەرمایەدار و پارەدارەکان وەرگەڕێت. خۆی وا دەرخست کە دەیەوێت خۆی ونبکات و

کارێکی بە دەسەڵات و سیاسەتەوە نەبێت، لەسەر نانخواردن سەیرێکی درێژی کردم و بە هێمنی گووتی، ئیتر دەیەوێت وەک بازرگانێکی سەربەخۆ بژی و کاری بە کەسەوە نەبێت. دڵنیابووم ڕاستی نالێت، خۆشی دەیزانی ئەوە نیاز و قسەی دڵی نییە، بەڵام من دژی شتێکم نەگووت و جەنگ و جەدەلێکم لەگەڵ بەرپا نەکرد. لەسەر سفرەکە وام هەستکرد کەسیان ئارەزوویان نییە باسی سیاسەت و ئەو ململانێ توندانە بکەین کە لە مەیداندان. من هەموو بەهار و هاوینی ئەو ساڵەم لە فەزای شەڕدا بردبووە سەر، بەعسییەکان لە هەموو لایەکەوە لە ژێر گوشاردا بوون باکوور چۆڵبکەن و هێزەکانیان بکشێننەوە، بەڵام ئەوە بێ جەنگ و بێ گورزی چەکداریش نەدەکرا. ڕاستە من جەنگاوەر نەبووم، بەڵام وەک شارناسێکی ئەزموودار، وەک یەکێک دەتوانێت گەورە و بچوکی شتەکان سەبارەت بە دوژمن بپشکنێت و مەیدان بە وردی بخوێنێتەوە و شیبکاتەوە، لە ژووری چالاکییە عەسکەرییەکانی حیزبدا بەرپرسی هەواڵگری بووم و لە گرتنی بڕیاریشدا بەشداربووم. دەبوو هەرچییەکمان کردوە بەعسییەکان ناچاربکەین بکشێنە دواوە و شار چۆڵبکەن. دیارە گەڕانەوەی بەعسییەکان بۆ ناو شار دوای ڕەوەکە گەمژەییەکی گەورە بوو، بەعسییەکان گەمژەترین هێز و شێوەی حوکمڕانی بوون مێژووی خۆرهەڵات لە کۆن و نوێدا بەخۆیەوە بینیبێتی، ئەوان هەمیشە ئەو کارەیاندەکرد کە وەک بەڵا و موسیبەت بەسەر خۆیاندا دەشکایەوە. ڕاستە هێزێکی زۆر زۆریان لە هەموو کوچە و کۆڵانێکدا بڵاوکردبووەوە، بەڵام هێزێکی نامۆ و بێڕیشە بوون، لە ماسییەکی زۆر زل دەچوون لە حەوزێکی شوشەی لێڵ و بچوکدا گیریان خواردبێت. لە دوای ڕەوەکە دەمێ گەڕامەوە شار، لە بری سەیری هێز و تفاق و تانکی دوژمن بکەم، دوو ڕۆژم تەرخانکرد بگەڕێم و لە چاوی سەربازانی دەوڵەت بنوارم. بۆ ئەوەی بزانیت سوپایەک چەندە بەهێزە، دەبێت لە شێوەی نیگاکردن و وەستان و ئاوڕدانەوە و ڕۆیشتنیان بنواڕیت، نەوەک لە چەک و تفاقیان. من دوای دوو سێ گەشتی خێرا، ئەو فەراسەت و ڕوودۆزییە دێرینەی لە خوێندنەوەی مرۆڤدا هەمبوو، گواستمەوە بۆ خوێندنەوەی ئەم زلهێزە گەورانەش کە بەعسییەکان بە

جۆرێک نارێک و دوور لە لۆژیکێکی سەربازی بە هەموو لایەکدا پەرتەوازەیانکردبوون. ئاشکرا هێزەکە هێندەی لە مردن دەگەڕا تاقەتی جەنگی نەبوو، ئەوەم لە هەموو نیگا و تێڕوانین و ڕەفتارێکیاندا دەخوێندەوە... چەند پێکدادانێکی کەم و کورت ئەو بڕوایەیان زیاتر لاچەسپاندم کە ئەم سوپایە بە جۆرێک بێ ئەزنۆ و بێ ئیرادە بووە، قاچی جارێکی تر ئاسان ئەم سەرزەمینە ناگرێت. لەودەمەدا ئاسان نەبوو ئەم بڕوایە بە دەنگی بەرز لە هەموو جێگایەکدا بڵێیت، خەڵکی هێشتا ترسێکی بێوێنەیان لە بەعسییەکان هەبوو، بەڵام ترس لە سوپا هێندەی درێژکراوەی ڕابوردوو بوو پەیوەندییەکی بە حەقیقەتی ئەم هێزە نەخۆشەی ئێستاوە نەبوو. سوپا بە جۆرێکی ترسناک کەوتبووە سەرچۆک و نەیدەویست گەر بۆ نمایشێکی کورتیش بووە بێتەوە سەر قاچ. بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا سووربووم کە دەبێت زۆر توند و بێبەزەیی لەم هێزە بدەین، لە ژووری چالاکییە عەسکەرییەکاندا پێمداگرت و گووتم گەر بێت و تا کۆتایی پاییز بەعسییەکان لێرە دەرنەکەین، لەوانەیە دواتر هەموو شتێک بگۆڕێت و ئەو ئیشە ئاسانەی ئەمڕۆ ببێتە کاری نەکردە. لە ڕاپۆرتێکدا بۆ سەرۆکەکانم نوسی «یان ئێستا سەری ئەم ئەژدیها نەخۆشە دەپەڕێنین یان هەرگیز. چونکە دواتر ئەم هێزە لەرزۆک و بێدەستە، وەک ئەختەبوتێکی ترساو، سەد باڵی تر دەردەکات، بنج دەگرێت و ڕیشە دەهاوێتەوە و لێدانی کارێکی سادە نابێت». وەک دواتر زانیم برادەرانی ئەنجومەنی باڵا ڕاپۆرتەکانی منیان ورد خوێندبووەوە، چەند ساڵێک دواتر یەکێکیان گووتی «ئەو ڕاپۆرتانەی ئێوە گرنگییەکی مێژوویيان هەبوو تا شۆڕش دووبارە بڕیاری ئازادکردنەوەی شارەکان بدات و دۆخی هێرشبەر وەرگرێت». نەمدەزانی کابرا بەو قسانە کڵاوم دەنێتە سەر و دەمنێتە بەر کلکان یان ڕاستییەکی مێژوویی تۆماردەکات کە کەسانی تر نەیاندەتوانی وەک ئەو ساف و ڕۆشن ببینن و دانی پێدا بنێن. هەرچییەک بێت، ئەو کات و ئێستاش باوەڕم وایە، تێگەیشتن لە دوژمن بەشێکی گرنگی جەنگە، بەڵام لەویش گرنگتر تێگەیشتنە لە خود. من گەرچی لە حیزبدا بە شلەشاری و ڕاحەتخواز ناسرابووم، لە پشتەوە

تانەی ئەوەیان لێدەدام کە ماوەیەکی کورت نەبێت پێشمەرگەیەکی چەک لە شان و پیاوی ڕاستەقینەی سەنگەر نەبووم. بەڵام لەو برگەیەدا لە مێژووی ولاتەکەم، پێداگرییەکی سەختم کرد و هاوارمکرد «هەڤاڵان یان ئێستا یان هەرگیز... یان ئێستا یان بۆ هەمیشە و تا قیامەت فاتیحە لەسەر ئازادی خۆمان بخوێنین». من لە هەموو هێرشە گەورەکانی هاوین و پاییزی ساڵی 1991 دا بۆ سەر سوپای بەعس، وەک سایکۆلۆژیست، لۆژستیک، پلاندانەر، جەنگاوەر، بەشدار بووم.

ئەو ڕۆژە کە چووم بۆ داوەتەکەی خانمی ماردینی و لیڤیتانت، سەرم پڕبوو لە هەوای جەنگ، لە پلان بۆ دەرکردنی بەعسییەکان، لە خەیاڵات دەربارەی ئەو نەخشە گونجاوانەی دەشێت لە پەلامارەکانی داهاتوودا بیگرینە بەر، بە جۆرێک فیکر و غایلەم نوقمی هەوای جەنگ بوو، سەیرم لێهات لیڤیتانت لەو بەرگە مەدەنییە تازانەدا ببینم. بە دەنگی بەرز لەسەر سفرەکە باسم لە بێمروەتی ئەمریکایی و ئەوروپییەکان کرد کە دەبوو هێڵی پاراستنی ئاسمانی هەرێمی ئێمە تا ژێر کەرکوک و ڕووە و ناوچەکانی حەمرین ڕابکێشن، چونکە گەر ئێمە ئەم هەرێمەش ئازادبکەین، دەڤەرێکی نائارام و برسی دەبێت و لە هەزار دەردەوە دەناڵێت. گەرچی من بە حەماسێکی زۆرەوە دەدوام، هەتا هەستم بە نوسانی گەروو و عارەقەی ناو لەپم دەکرد، بەڵام بابەتەکانم لای لیڤیتانت و خانم سارد و ناجۆر دیاربوون. جارێک لەکاتی خواردندا، خانمی ماردینی بە هێمنی سەری لەسەر قاپەکەی بەرزکردەوە و پێمی گووت «هەندێک گۆڕانکاری لە دونیادا هەیە بێ ئێمە و بێ حەماسەتێکی زۆر لە کەسانی وەک من و تۆوە دێنەپێشێ، پێویست ناکات ئێمە خۆمانی وا بۆ بڕەتێنین». وای گووت و بە ئارامی و بە نوکی پەنجە پاڵی بە بەلەمێک قەرەخەرمانەوە نا بۆ بەردەمم و گووتی «نانەکەت بخۆ و ئەوەندە خەیاڵ مەخەرە سەر بەعسییەکان، زۆر بیریان لێ مەکەوە... گەر زەمانێک بەسەرچوو بۆ خۆی بەسەر دەچێت، وەک ژیانی ئێمە، وەک ژیانی من و تۆ». بێئەوەی تێبگەم مەبەستی چییە، نیگەران سەیرمکرد و دەنگی ناڕەزایم

بەرزکردەوە، لەوانە نەبووم باوەڕ بەوە بهێنم دوژمن چەندە لاواز بێت خۆ بەخۆ بمرێت، من شۆڕشگێڕ و جەنگاوەر بووم، دەمزانی جیهان تەنیا لە سایەی شەڕی گەورەدا دەگۆڕێت. ماوەیەک قسەم لەوە کرد بەعسییەکان تەنیا پێویستیان بە پاڵێکی ئێمە هەیە تابڕوخێن، بەڵام گەر ئەو پاڵە لە کاتی خۆیدا نەبێت، لەوانەیە زوو تینیان تێبگەڕێت و هەمووومان ڕاپێچی بیابانەکان بکەنەوە و بە زیندویی بماننێژن، بەتایبەت دەمزانی بەعسییەکان حەزێکی زۆریان لە زیندەبەچاڵکردنی دوژمنە. حەماسەتی من هیچ پەرچەکردارێکی گەرمی لای خاوەن داوەتەکە دروست نەکرد و بە ئارامی لەسەر خواردن بەردەوام بوون. کەمێک ون و سەرەوێڵ دیاربووم، ئەو کات بۆ هەر ماڵێکی ئەم وڵاتە بچووبایت، ڕووت لە سەر هەر سفرەیەک بکردبایە، بابەتەکان هەر ئەو باسانە بوون کە من بەخۆشحاڵییەکی زۆرەوە، وەک کەسێک لە نزیکەوە لە ناویدا دەژیم دەموروژاندن. لەزەتێکی بێوێنەم لەوە دەبینی نان بخۆم و وادەربکەوم لە بەر سەرقاڵی جەنگێکی گرنگ ناچارم خێرا تیکەکەم لە گەروو ئاودیوبکەم تا ئەرکێکی گرنگتر لە دەست نەدەم. دواتر تێگەیشتم کە نوقمبوونی من لەو جیهانەدا، تێکەڵبوونی کوشندەم لەگەڵ ساتەوەختە بچوکەکاندا، بینینی دیمەنە گەورەکانی لێ حەرام کردوم. لەو دانیشتنەوە تۆنی قسەکردنی خانمی ماردینی لەگەڵ مندا شێوەیەکی تایبەتی وەرگرت، تۆنێک هەمیشە شتێک لە سەرزەنشتی تێدایە. ئەو تۆنە بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە، نەرمدەبێتەوە و توندەبێتەوە، بەڵام هەرگیز لاناچێت. هەر ئەو کات لەسەر خوان و سفرەی داوەتەکەم سەرنجی ئەوەم دا کە پیاوانی سەردەمی جەنگ چەند زوو دەتوانن دەموچاوی خۆیان بگۆڕن و دەمامکێکی مەدەنی بکەنە سەر. لیڤیتانت لە جلە نوێکانیدا بە جۆرێک بە قیافە و سیحردار بوو، دڵنیابووم گەر ئەندامە باڵاکانی تری حیزب لەم جلە شارییە شیکانەدا ببینن، دەچنە سەر دینی و شەڕواڵ و پشتێنیان توڕدەدەن و دەبنە قاتپۆش و کۆگایی. من لە کاتی دەستشتن و دەستسڕیندا، بەلیڤیتانتم گووت «هەڤاڵ، هێشتا زووە بۆ ئەم ئاسوودەگییە، هێشتا زووە. بیرت نەچێت بەعسییەکان ڕاستە توانا و

ئیرادەیەکیان نەماوە، تەنیا هەوڵی پاراستنی پاشەڵی خۆیانە... بەڵام لێرەن. تائەوان لێرە بن، من دڵنیایی و ئارامی ناچێژم و ناتوانم وەک تۆ جلی ڕاحەت و ئاسوودە بپۆشم». لیڤیتانت گووتی «وەفا من و تۆ دوو هاوڕێی کۆنین، چاوت بکەرەوە، دونیایەکی تازە بەڕێوەیە، تۆزێک وریا بە، من ئەم قسەیە بە کەسی تر ناڵێم. ئینسان دەبێت بزانێت چۆن قاچ دەخاتە ناو ئەم دەور و زەمانەوە». ئەو کات بە ڕوونی نەمدەزانی چی دەڵێت، دواتر تێگەیشتم مەبەستی ئەوەبوو، لەو ڕۆژگارانەدا کە دێن و بەڕێوەن، مانای هێز، نمایشەکانی، جلوبەرگەکانی، کەرەستەکانی، چەکەکانی هەموو دەگۆڕێن. لیڤیتانت هەر لیڤیتانت بوو، هەر خۆی بوو، بەڵام دەیزانی دونیا گۆڕاوە، منیش کەسێکی دیکە بووم، وەک ئەو دڵنیابووم دونیا گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، بەڵام هێشتا بە ڕوونی و ڕۆشنی لەم جیهانە نوێیە حاڵی نەبووبووم. ئەو یەکەمجار و پێش هەمووان بازی دەدایە ناو حەوزێک ئاوەکەی هێشتا لیخن و لێڵ نەبووبوو، دەیتوانی لە ڕۆشنی و سافیدا ماسی خۆی ڕاوبکات. کە وایگووت، خەندەیەکی گاڵتە پەڕییە سەر لێوم، نیازم بوو پێیبڵێم «عەزیزم لیڤیتانت، هێز لای منە، منم تا ئێستا دەستم لە باروت و هەناسەم هەر لە گۆڕەپانی جەنگدایە، نەوەک لای تۆ کە نازانم بەم قاتە موزەخرەفەتەوە دەتەوێت بڵێیت چی». زیندەگی درێژی من و لیڤیتانت لە ئێران هەردووکمانی فێرکردبوو وشەی لە بابەتی «موزەخرەف»، «عەوەزی»، «عەقەبماندە» «خاهشدەکەم» ـی ئێرانیان بهاوینە نابەینی قسە و باسمانەوە، بەڵام حورمەتی خوان و دەستپوختی ڕەنگینی چێشتکەرە نەناسراوەکانی ماڵی ئەو ڕێگای ئەوەی لێگرتم لاقرتیباز و گاڵتەجاڕ قسەبکەم.

ئەوە دواهەمین خوان و داوەتی نێوان من و لیڤیتانت و خانم نەبوو، بەڵکو سەرەتای زنجیرەیەکی زۆر داوەت و داوەتی دووبارە بوو کە ساڵانێکی درێژ لەگەڵ لیڤیتانت و خانمدا پێکەوە گۆڕیمانەوە، بەڵکو دەکرێت بڵێم ئەوە سەرەتای سەرهەڵدانی چاغ و سەردەمی زێڕینی داوەت و خوانە

شاهانەکان بوو کە ساڵانی دواتر و لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی نوێدا بووە دیاردەی هەرە گەورەی ژیانی ئەم شارە.

لیڤیتانت وەک خۆی دەرخست وەها دەرهەق بە سیاسەت بێخەیاڵ و کەمتەرخەمیش نەبوو، کەسێک بوو هاتبووە دەرێ تا ساتێک و کاتێکی گونجاوتر و گرنگتر بدۆزێتەوە و بگەڕێتەوە. ئەزموونی زۆری لە ناو شۆڕش و دەوڵەتدا فێریانکردبوو، چوونە دەرەوە لە حیزب و هاتنەوە چ هونەرێکی کاریگەر و سەرکەوتووە گەر باش لێی بزانیت. سەیربوو بەلامەوە کە لیڤیتانت گەرچی پلەیەکی حیزبی و کارێکی وەها دیاری نەبوو، بەڵام زوو زوو دەبووە میوانی سەرۆک و هەڤاڵی جێگر و ئەندامانی بیرۆی سیاسی، وەک دەمبیست زۆر شەو لەماڵی ئەودا خوانی گەورە سازدەکرێت و دەستەجەمعی دەخۆنەوە و مەستدەبن و ڕاوێژدەکەن. هەتا بەر لە دەرکردنی بەعسیش لە شار، خوان و داوەتەکانی لیڤیتانت دەستیان پێکردبوو، سەیربوو لەلام گەر داوەتی منی بکردبایە تەنیا داوەتیدەکردم، کەم ڕێکەوتی دەکرد من هاوشان لەگەڵ ئەندام و هەڤاڵانی تردا بخاتە سەر خوان ... ئەوە سەرەتا سەیر بوو بەلامەوە، بەڵام دواتر سەرنجمدا ئەوە تەنیا لیڤیتانت نییە کە وا لەگەڵ من ڕەفتار دەکات، بەڵکو زۆربەی هەڤاڵان نایانەوێت لەگەڵ کەسێکی دیدا داوەتمبکەن، وەک ئەوەی شتێکی پیس و بەدبۆ لە مندا بێت و ئەوانی تر بەرگەی نەگرن. ئەوە سەرەتای کەنارخستنی من و لادانی بەکاوەخۆم بوو، کە گەلێک لەسەرەخۆ بەڕێوەچوو، تنۆک تنۆک هات و دڵۆپ دڵۆپ تکا، هەمیشەش تا زەمان زیاتر بڕۆیشتبایە، تا ڕووداوی نوێ بهاتبایەتە پێش، من ڕوونتر و ئاشکراتر دەمبینی و هەستم پێدەکرد.

لیڤیتانت ڕۆژ دوای ڕۆژ لە بەرچاوی من دەگۆڕا، تا دەهات ماسکێکی ئەستوورتری دەخستە سەر ڕوخساری، من کە بەراوردمدەکرد، خۆشم لە ڕوخساری جارانی زۆرتر دەهات کە لە ئێستا ڕەقتر و ساردتر بوو، بەڵام سروشتی و ڕاستگۆتر دیاربوو، ساڵانێک دواتر کە ئەو ڕوخسارە ڕەقە ترسناکەی بە جۆرێکی بەرچاو هەستایەوە و ژیانی هەموومانی خستە ژێر

ڕەحمەتی ئارەزووەکانی خۆی، زانیم هەڵەبووم و بریا هەمیشە هەر ئەو ڕوخسارەی هەبایە کە ساڵی یەکەمی دوای ڕاپەڕین لە خۆی گرتبوو. من لە نیگا و وەستان و ڕەفتاریدا هەمان دڵڕەقی دێرینم دەبینییەوە، بەڵام هەستمدەکرد لیڤیتانت گەمەی زۆر گەورە و شتی زۆر ترسناکی لە ژێر سەردایە و بەم ڕوخسارە تازەیەوە نەبێت ئەو یاریانەی بۆ ناکرێت. دەمزانی کە سەردەمێکی نوێ دەستی پێکردوە، بەڵام خۆ بڕیاریش نەبوو هەموو ئینسانەکان بە دەموچاوی نوێوە بچنە ناو ئەم جیهانە نوێیەوە.

بۆ جاری دووهەم کە لیڤیتانت داوەتیکردم، زۆر سەیر و ڕۆشنتر لە جاری یەکەم پێیگووتم «وەفا تۆ ناتوانیت بەم ڕوخسارەوە تێکەڵی ئەم دونیا تازەیە بیت، من جێگایەک دەزانم دەتوانێت کۆمەکمانبکات». سەرەتا نەمزانی مەبەستی چییە، بەڵام قسەکەی کونجکۆڵییەکی تێدا جوڵاندم. بە سەرسامییەوە پرسیم «ڕەشمارا، مەبەستت چییە. ڕوخساری من چ عەیبێتی؟ هیچ خەوش و نالەبارییەک لەسەر و فەساڵمدا دەبینیت، وەها منی عەیبدارکردبێت، شایەنی ڕاستکردنەوە و چەکوشکاری بێت؟». بە هەمان ئەو نیگا سارد و سەربازیی و ڕەقەیەوە، وەک ئەو ڕۆژەی لە پسمامان منی نایە بەر ئەزموونێکی ڕەشەوە، بە هێمنی و بێرۆح گووتی «عەیبی نییە، هیچ عەیبی نییە، بەڵام لەم سەردەمەدا باشترە سەر و ڕوخسارێکی ترت هەبێت».

ئێوارەیەکیان لیڤیتانت لە تەک خۆیدا بردمی بۆ ماڵێکی تازە لە یەکێک لە گەڕەکە خۆش و دەوڵەمەندەکانی شاردا، ماڵێک لە دەرەوە بچوک دیاربوو، لە کوچەیەکدا کە کەسانی وەک من بەدەگمەن یاخود هەرگیز ڕێیان تێی ناکەوێت. لیڤیتانت لە دەرگای دا و دوای ڕاوەستانێکی درێژ، پیاوێکی بچکۆلانە دەرگاکەی کردەوە، کەسێک بوو پانتۆڵێکی سپی و کراسێکی شینی کاڵی لەبەردابوو، قایشە ڕەشەکەی لە ناوەڕاستی ئەو دوو پارچە کاڵەدا ناشیرین دەردەکەوت و بە جۆرێکی خراپ کابرای لە کەمەرەوە کردبووە دووبەش. ڕوخسارێکی سوورهەڵگەڕاوی باریکی بوو، لەوانەی هەمیشە هەستدەکەیت هەر ئێستا لە حەمامێکی گەرم هاتوونەدەر. سەر و

سمێڵی لووس و سافتەراش بوو، لەوانە دەچوو کە بە تاشینی سەریان دەیانەوێت ئاسەواری ڕووتانەوەیەکی درێو بشارنەوە، بە کاوەخۆ دەڕۆیشت و دەستی بە جۆرێکی ژنانە دەجوولاند. کە لیڤیتانتی بینی، وەک میوانێکی زۆر عەزیز ببینێت سەری داگرت و بە دەنگێکی زۆر نەرم کە زیاتر لە دەنگی کەسێکی نەخۆش دەچوو، داوای لێبوردنی کرد کە ئەو ماوەیە ئێمەی وا لە بەردەم دەرگا ڕاگرتووە. پیاوەکە پێدەچوو لەسەر کارێکی تایبەت هەستابێت و بیەوێت زوو بچێتەوە سەر ئیشی خۆی، بە بێدەنگی ئێمەی بە دالآنێکی درێژدا برد، ماڵەکە لە ناوەوە درێژکۆلە و تاریک و قووڵ بوو، سەراپای ڕاڕەو و ژوورەکانی بە مۆکێتێکی نیللی ڕاخرابوون کە لەو سەردەمەدا مۆکێتی وەها گەلەک ناوازە و کەم بوو، بێدەنگییەکی تەلیسماوی و قورسیش لە ناو ماڵەکەدا زاڵبوو. بە چەند دالآنێکی پێچاوپێچدا ڕۆیشتین، هەر ڕاڕەوێک و کۆمەڵێک دەرگای داخراو و ئەستووریان لەسەر بوو. لە سەرنجی یەکەمدا شوێنەکە لە ئوتێلێکی کۆن دەچوو تازە نوێکرابێتەوە و خرابێتە خزمەتی کارێکی دیکەوە، بەلآم هەرچەند بیرمدەکردەوە ئەم کۆلآن و کوچەیە شوێنی ئوتێل نەبوو، لیڤیتانت تا ئەوکات سوور بوو لەسەر ئەوەی هیچ نەدرکێنێت، پێم نەڵێت ئێرە کوێیە و ئێمە لێرە چی دەکەین. دوای چەند چرکەیەک ئێمە و یاوەرە سەرتاسەکەمان گەیشتینە بەر دەرکی دەرگایەکی گەورە، گەورەتر لە دەرگاکانی تر، لەوێ دەرگاکەی بە سووکی کردەوە و بە دەنگێکی ناسک و لاواز گووتی «جەنابی عومەر بۆتانییە... خۆیەتی، لەکاتی خۆیدا هاتووە، بەپێی وەعدەکەی لەگەڵ جەنابتاندا». کە دەرگاکەی زیاتر کردەوە، پیاوێکی بالآبەرزی بەقیافەتم بینی، لەوانەی ڕیشێکی پرۆفیسۆری دەهێڵنەوە و سمێڵێکی ئەستوور و بادراوی دەنێنە بان، کراسێکی سپی و هێلەگێکی ڕەشی لە بەردابوو، دەستەسرێکی شینی خستبووە گەردنی و سەعاتێکی گەورەی کردبووە مەچەکە ئەستوور و وەرزشوانەکانی. سەعاتەکە زۆر گەورە بوو، گەورەترین سەعاتێک بوو تائەو کات لە ژیانمدا دیبێتم، لە چەرمێکی بریقەداری قاوەیی پان بەسترابوو... بە جۆرێک کاتێک سەیرتدەکرد یەکەم شت سەرنجی ڕادەکێشایت ئەو سەعاتە

سەیرەی مەچەکی بوو. کە چووینە ژوورێ و دەستمان بۆ تەوقە ڕاکێشا، لیڤیتانت کابرای پێناساندم ناوی « باهیری» بوو، گەرچی بە ڕەچەڵەک کوردبوو، بەڵام بە «لوبنانی» بانگیاندەکرد. دەموچاوێکی سپی پان و دوو چاوی ڕەشی گەورەی هەبوو، خاڵێکی ڕەشی گەورە لە سەرچەناگەی بوو، قژی بە ڕێکخستنێکی تایبەت بەرەو دوا هەڵدابووەوە و جێلێکی زۆری لێدابوو. هەستمکرد لیڤیتانت زۆر خاتری ئەوی دەوێت، دوای چاخواردنەوەیەکی هێمن و دوای ئاڵوگۆڕکردنی هەندێک وشە دەربارەی دۆخی دونیا. بێئەوەی هیچ بڵێم، لوبنانی ڕووی تێکردم و گووتی «حەزرەت، من بەختەوەر دەبم گەر ئێستا گوێم لێبگریت و بزانیت جەنابی لیڤیتانت بەڕێزتانی بۆ هێناوە بۆ ئێرە». من کونجکۆڵ هەموو گیانم کردە گوێ و گووتم «دەی منیش دەمەوێت بزانم ئێرە چییە و ئێوە کێن؟ ڕاستت دەوێت لیڤیتانت لەو بارەیەوە شتێکی پێ نەگووتووم و هیچی بۆ نەدرکاندووم». کابرا بەسەر و شێوە لە قژبڕێکی ژنان، لە ئارایشتکەرێکی ئەکتەرە ناسراوەکان دەچوو. ئەوجارەش سەلیقە و ڕوودۆزیم درۆی لەگەڵ نەکردم و پاش ئێستێکی کورت بۆم دەرکەوت باهیری لە کاری ئارایشتدا دەستبەکارە و ئوستادی بەرزی ئەو هونەرەیە، لە بەیروت کاری کوافێریی کردوە و شانە بە دەستی ژنانی چینی هەرەباڵای ئەوێ بووە. وردە وردە لە مەکیاژی ژنانەوە کارەکەی خۆی فراوانکردوە و بەرەو ئارایشتی پیاوان ڕۆیشتووە، هاوشان بەوە لە زانکۆی ئەمریکی زانستە سیاسییەکانی خوێندوە و بە نامەگۆڕینەوە هەندێک کۆرسی سایکۆلۆژیاشی وەرگرتووە و ماوەیەکی درێژیش لەگەڵ کۆمەڵێک تیپی شانۆی جیاوازدا وەک ئەکتەر و ماکێر چالاک بووە. وەک خۆی بە خێرایی و بە کورتی بۆی باسکردم، دواتر بیریکردۆتەوە هەموو ئەم زانیارییە جیاوازانە لە داڕشتنی زانستێکی نوێدا بخاتە کار کە خۆی ناوی دەنا «زانستی ئارایشتی موتڵەق». بە ڕوونی بۆی باسکردم کە جیاوازییەکی قووڵ و گەورە هەیە لە نێوان زانستی نەشتەرگەریی جوانکاریی کە تەنیا فۆرمی هەندێک بەشی دەموچاو دەگۆڕێت، لەگەڵ زانستی ئارایشتی موتڵەقدا کە دەستکاریی شێوەی قسەکردن، وەستان، سەیرکردن، دەست جوڵان، دانیشتن، ڕۆیشتن،

نانخواردن، عەشقبازی و هەموو شتێکی تر دەکات. وەک باهیری بۆی شیکردمەوە، زانستی ئارایشتی موتڵەق زانستێکی گشتی نییە، واتە وەک زانستەکانی دی، هەندێک قاڵب و یاسا و فۆرمی نەگۆڕیان نییە تا بەسەر هەموو کەسێکدا وەک یەک تاقیبکەنەوە، بە پێچەوانەوە لە سەنتەرەکەیان کە ناوی سەنتەری «زامو» ـایە «هەڵبەت ئەوەش کورتکراوەی سێ دەستەواژەی زانستی ئارایشتی موتڵەق بوو». هەموو مرۆڤێک وەک حاڵەتێکی تایبەت سەیردەکرێت، هەموو مرۆڤێک پێویستی بە جۆرە ئارایشتێکی تایبەتە کە بۆ کەسێکی تر دەست نادات. لێرەوە تیمێکی پشکنینی سەرەتایی هەیە کە لە چوار کەس پێکهاتوون کە هەریەکەیان سەر بە لکە زانستێکن، ئەوان کەسی دیاریکراو دەخەنە ژێر پشکنینەوە، خەونەکانی، خواستەکانی، شێوەی کارەکەی، ئاواتەکانی، نیازەکانی هەموو دەخوێننەوە، لەسەر ڕۆشنایی ڕاپۆرتی ئەوان ماکێرەکانی سەنتەر و ڕاهێنەران و پسپۆڕانی ڕوخسار بەرنامەی ئارایشتی موتڵەق ڕادەگەیێنن. لەوانەیە ئامادەکردنی ڕاپۆرتی سەرەتایی مانگێک پتری بوێت و لەلایەن کەسی «بێڕوخسارەوە»ـەوە «وەک ئەوان ناویان دەنا» پێویستبکات چەندەها دانیشتنی خسوسی ئامادەبێت، ڕاشکاوانە قسەبکات، بە وردی بواری کاری داهاتووی خۆی دەستنیشانبکات، کۆمەک بە باسکارانی سەنتەر بکات و هیچ نەشارێتەوە. لە بەرابەر ئەوەدا ئارایشتگەرانی سەنتەر دواجار ڕوخسارێکی نوێت دەدەنێ، زمانێکی تازەت فێردەکەن، فێرتدەکەن چۆن لە دونیا تازەکەتدا دەریکەویت و ڕەفتاربکەیت و کاریزمایەک بۆ خۆت دروستبکەیت. باهیری پتر خۆی وەک فەیلەسوفی سەنتەرەکە دەردەخست، فەیلەسوفێک تەنیا کاری ئەوە نییە لە ڕووی فەلسەفییەوە کارەکان پاساوبدات، بەڵکو بە وردی سەرپەرشتی ڕەوتی گەشەی هەموو حاڵەتێک دەکات، هەندێجار ناچاردەبێت لە بواری تایبەتیدا پسپۆڕی تایبەتی بەکرێ بگرێت و پسپۆڕ بانگهێشتبکات یان هیچ نەبێت پرس و ڕایان پێبکات. ئەو گوتی ناکرێت بۆ کەسێک کە دەیەوێت لە پاشەڕۆژدا ببێتە وەزیر هەمان چارەسەریی بەکاربهێنین کە دەیدەینە کەسێک دەیەوێت سبەی ببێتە پۆلیس. باهیری لە سەرەتای قسەکانیدا گوتی «

حەزرەتی وەفا بەگ. هەموو مرۆڤێک پێویستی بە ئارایشتە. گوێم لێبگرن و خەیاڵی کۆنتان دەربارەی هونەری مەکیاژ بە هەڵەتاندا نەبات، ئارایشتی ژنانە، بەشێکی بچوکی هونەری ئارایشتکردنە، کەس نییە ئارایشت نەکات، هەموومان بە پلەی جیاواز ئارایشتدەکەین. مەعالیتان ڕەنگە بڵێن وا نییە، ڕەنگە بڵێن من ئارایشتم نەکردوە، بەڵام خۆی ئارایشت نەکردن ئەوپەڕی ئارایشتە. ئینسان کاتێک ئارایشت ناکات بەوەش هەر سورەتێک لەسەر خۆی دەداتە خەڵکی تر، وەک ئەو کەسانەی کە ئارایشتدەکەن ... ئەوە حەقیقەتەکەیەتی ... جەنابی حەزرەت. بەڵام هەندێک کەس هەن دەق بە شێوە و شەمایلێکی دیاریکراوەوە دەگرن، من ئێستا کە لە ئێوە دەڕوانم، هەستدەکەم ئێوە لە ژیانتاندا ئارایشتکارێکی باش بوون، یەعنی ناڵێم مەکیاژتانکردوە، باشترین جۆری ئارایشت ئەوەیە مرۆڤ پۆدر و کرێم و مەیکاپ و ئەو شتانەی تێدا بەکارنەهێنێت، باشترین جۆری مەکیاژ ئەوەیە کە وا دەزانین زۆر سروشتییە، هەرخودی مرۆڤەکە خۆیەتی. بەڵام جەنابی حەزرەت یەکێک لەو وشانەی من حەزم لێی نییە، وشەی سروشتییە، تەبیعی، تەبیعی چییە... سروشتی چییە؟ مرۆڤ دەتوانێت ئەم وشەیە بۆ کەر، بۆ ئەسپ، بۆ پشیلە بەکاربهێنێت، بەڵام بۆ ئینسان نا. جەنابی مەعالی، ئەم وشەیە بۆ حەیوان کراوە نەوەک ئینسان. مرۆڤ کەی بوونەوەرێکی تەبیعی بووە؟ لەو ڕۆژەوەی لە باوە ئادەم داکەوتووین، هیچ کات تەبیعی نەبووین. ئەوە ڕای منە حەزرەت گیان، لەوانەیە یەکێکی تر ڕایەکی تری هەبێت. تۆ ئەو منداڵە بگرە جەنابی مەعالی کە ئێستا لەدایکدەبێت، ئەو بگرە، دەتوانیت بڵێیت تەبیعییە؟... دەتوانیت؟ ڕاستەوخۆ بە کینە یان مەحەبەتی دەوروبەر گەمارۆدەدرێت، ڕاستەوخۆ بە جل و بۆدرە و زمان و گۆرانی و هاواری ناتەبیعی گەمارۆدەدرێت. مرۆڤ لە یەک ساتدا تەبیعییە، ئەویش ئەو ئان و ساتەیە کە دەمرێت، لە ساتی ڕۆح دەرچووندا، بەڵێ ڕۆح دەرچوون تەبیعییە، لەوەدا قسەم نییە، بەڵام لەوە بترازێت کەس لەم جێگایەی ئێمەدا هەقی نییە باسی تەبیعیبوون بکات، وشەکە لای ئێمە قەدەغەیە. جەنابی لیڤیتانت باسی ئێوەی بۆ کردوم، جەنابی لیڤیتانت دەزانێت دونیایەکی تازە بەڕێوەیە. ئەو شتەکان

ڕوونتر دەبینێت، حەزرەتیان زوو تێگەیشت من خەریکی چیم. من یەکەمجار جەنابی لیڤیتانتم بەڕێکەوت بینی، پێمگووت بێئەوەی دەستبەرداری موحیبەتی بێسنوورت ببیت بۆ ڕەنگی ڕەش دەتوانیت پێبخەیتە ئەم عەسرە تازەیەوە، خوابکات ئەمریکییەکان ڕوو نەکەنە هیچ وڵاتێک، ئیتر ڕواڵەت دەبێتە شتێکی گرنگ. ئەمریکییەکان و ئیسلامییەکان هەردووکیان دوو هێزی ڕواڵەت پەرستن، مەزهەر هەموو شتێکە لایان. ئەگەر درۆدەکەم و شتێکی نابەجێ دەڵێم، بموەستێنە و با گفتوگۆبکەین، بەڵام من هەستدەکەم لە پەنجا ساڵی داهاتوودا ئەم دوو هێزە ژیانی ئێمە دەبەنبەڕێوە. هەر ئەمریکییەکان عاشقی ڕواڵەت نین، مێژوو کەم هێزی ڕواڵەتپەرستی وەک ئیسلامییەکانیشی دروستکردوە. مەلعونە ئەوەی ئەوە نەبینێت، سوێند بە قەبری حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی، مەزهەر و توانای تەمسیل لە ئیسلامییەکان بستێنەوە هیچیان نامێنێتەوە، من لە لوبنان چەند بە چەند ڕواڵەتسازیم بۆ کەسانێک لە شێخەکان دەکرد، حەزرەت تۆ لە من بپرسە، ئیسلامی سیاسی لەسەر ئیمان، لەسەر عەشقی خودا کارناکات، ئیشی گەورەی لە ناو هونەری مەکیاژدایە، لە جبەی شێخەکانەوە تا بورقوعی سەراپاپۆشەکان هەمووی مەکیاژی موتڵەقن، بورقوع ... خۆداپۆشینی تەواو، ئەوە ئەو پەڕی مەکیاژە، حەزرەتی من. مەکیاژ جگە لە شاردنەوەی دەموچاوی تایبەتی خۆمان هیچی تر نییە. بورقوعیش، پەچەی سەروبانیش هێنانەدی ئەو نیازەیە کە هەر مەکیاژکارێکی شارەزا خۆی بۆ دەکوژێت و هەوڵی بۆ دەدات، ئەوە فەلسەفەی منە، دەتوانیت ناوی بنێیت فەلسەفەی ئارایشتی موتڵەق یا فەلسەفەی باهیری. جەنابی حەزرەتی وەفا بەگ، مرۆڤ گەر دەمودەست خۆی نەداتە دەست یەکەم سەرنج، ڕاستر و ڕوونتر دونیا دەبینێت. ماوەیەکە هاتوومە ئەم شارە، پێشتر هەموو زانیارییەکم کۆکردۆتەوە تا کۆمەک بە ئینسانەکان بکەم گونجاوترین و لەبارترین ڕوخسار بەخۆیانەوە بگرن. خەڵکێکی زیرەک و وردبین لە وڵاتی ئێوەدا هەن منیان داوەتی ئەم جێگایە کردوە. هەر زاتێکی گرنگ بیەوێت شوێن و مەقامێک بۆ خۆی مسۆگەربکات، بۆ ساڵانی داهاتوو پێویستی بە دەموچاوێکی نوێ دەبێت...

حەزرەت خوا عافووت بکات، تۆش بە هەیئەتێکی تازەوە دەبیتە پیاوێکی تر».

باهیریم گەلەک بەویقار و کاریگەر هاتە بەرچاو، دەنگێکی جوان و شێوازێکی سەرنجراکێشی لە قسەکردندا هەبوو، پێدەچوو سالآنێکی زۆر مەشقی کردبێت تا بتوانێت لەسەر هەموو وشەیەک بەڕاستی بوەستێت و بۆ هەموو ڕستەیەک تۆنێکی گونجاو بدۆزێتەوە و بۆ هەموو مانایەک جوڵەیەکی لە باری دەست هاویاربکات. ژوورەکەی باهیری جیاواز لە ناوەڕۆکی کارەکەی گەلەک سادە بوو، بەڵام من وا لە قسەی تێگەیشتم کە لە ژێر خودی سادەیشدا دەمامکێکی شەیتانی هەیە، ئەو بۆی ڕوونکردمەوە کە لەسەر ڕاسپاردەی لیڤیتانت دەیەوێت من بۆ سەردەمانی داهاتوو ئامادەبکات، گووتی «لیڤیتانت حەزی لێیە هاوڕێ و دۆستانی نزیکی لە داهاتووشدا هەر پلەوپایەدارین و لە دەسەڵاتدا بمێننەوە. ئەوەی تۆی هێناوە بۆ ئێرە دەلیلی ئیخلاس و دڵسۆزییە». ئەو دەیویست تا زووە سیمایەکی تازەم بداتێ و بۆ دەورو زەمانێک تەیارمبکات کە بەڕێوەیە. گووتی «تۆ پیاوی شۆڕش بوویت، گەنجی خۆتت لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا بردۆتە سەر، گوڵی عومرت داوە بە وان، دەی ئیتر بەسە، ئێستا زەمانە خەریکە دەچەرخێت، لەوانەیە وا پێویستبکات لەم عالەمە تازەیەدا بە جۆرێکی تر دەربکەویت ... ئیشی من ئەوەیە جۆرێک مەکیاژت بدەمێ بە کەڵکی سبەی بێیت».

دوو شەو و دوو ڕۆژی دامێ تا بیربکەمەوە، گووتی بەرنامەم هێدی هێدی پڕدەبێت، خەڵکانێکی زۆر هەن دەرکیان بە گرنگی ئیشەکەمان کردوە، تا زوو وەڵاممبدەیتەوە، باشتر کارت بۆ دەکەم، زووتر دەتخەمە ناو پرۆگرامەوە. باهیری لەوە زیاتر زانیاری نەدامێ، گووتی ئیشەکەی منیش نهێنی خۆی هەیە، تەنها ئەوانە تێیدەگەن و دەیبینن کە دەچنە قووڵاییەوە. تا قسەیدەکرد من زیاتر پێی سەرسام دەبووم. بەڵام ئەزموونی دوور و درێژی من لە کاری شۆڕشگێڕانەدا فێریکردبووم، لە هەر کەس بە گومانبم بە هێزی وشە و گوزارشتی ڕەوان خەڵک فریوبدات.

سەرەتا گومانەکانم لە باهیری، گومانی سادەی ئەو سەردەمە بوو، ئەودەم هەر کەس بە جۆرێکی تایبەت و نائاسایی بجولابایەتەوە دەمودەست گومانی ئەوەمان لێدەکرد، ڕەوانەکراوی بەعسییەکان بێت تا لە ژێرەوە فیتنەیەک بنێتەوە. ئەوەی باهیری لە لوبنانەوە هاتبوو، لە کەش و هەوایەکی وا ئالۆز و لە ڕۆژگارێکدا کە هێشتا هیچ نیشانەیەکی ڕوونی دیارنەبوو کەوتبووە کار، لەم کاولئاوایەدا خۆی بە هونەرێکی سەیرەوە سەرقالکردبوو، بۆ من ئاسان قووت نەدەچوو. من لە قووڵایی ڕۆحی خۆمدا بە درێژایی ساڵان بڕوایەکی نهێنی و تایبەتم دروستکردبوو کە دەستبەرداربوون لێی هەم سەخت و هەم نادروست بوو، لەو باوەڕەدا بووم کەس لە وڵات و مەملەکەتی خۆشبەخت و خۆشگوزەرانەوە ڕووناکاتە ئەم وێرانەخاکەی ئێمە، مەگەر نیازێکی بەدی هەبێت یان لە مرۆڤە هەرە باڵاکانی سەر زەوی بێت یان باری تەعالا خۆی تایبەت بۆ کارێکی خسوسی ناردبێتی. باهیری کەسێکی مرۆڤدۆست و لە خۆبوردە نەبوو، بەڵکو ئالۆز و تەماوی هاتە پێش چاوم، هەر زوو تێشگەیشتم کە ڕەواندنەوەی غوباری سەر ژیانی کارێکی ئاسان نییە. هەتا ختورەی ئەوە کەوتە دڵم، لیڤیتانت نەیکردبێ و لەگەڵ هەندێک شانە و تۆڕی نهێنی بەعسییەکاندا دەستی یەک خستبێتەوە، بەڵام دەمزانی کە لیڤیتانت چ کەسێکی وردحیساب و لەپارێزە، دڵنیابووم ناکەوێتە هەڵەی وەهاوە و لە بڕوایەکی بەتینەوە بە باهیری منی هێناوەتە ئێرە. لیڤیتانت بەوە منی ئارامکردەوە کە باهیری پیاوێکی زیرەکە و دەزانێت لە چ هەرێم و لە چ سەردەمێکدا بەهرەکانی خۆی دەخاتە کار و لە کوێ بازاڕی ڕەواجی دەبێت. ئامۆژگاریکردم بایەخێکی باش بە قسەکانی بدەم و زوو دەستبکەم بە خۆسازدان لەگەڵ ڕۆژگارە نوێکاندا کە بەدڵنیاییەوە ڕەحم بە کەس ناکەن. ئەوەی لە قسەکانی لیڤیتانتدا سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو بە بڕوایەکی نەپساوەوە قسەی لەوە کرد کە دەبێت لە دەور و زەمانێکدا کە دێت ئێمەومانان بە بەهێزی بمێنینەوە، بەڵام بەوەدا ئێمە چ لە زانست و چ لە شەهادە و چ لە لێزانی زماندا بەهرەیەکی وامان لە مشتدا نییە، دەبێت تا زووە فریای خۆمان بکەوین و جلی ئەو پیاوانە لە بەربکەین کە

لێزان و شارستانین و دەتوانن لە گۆمی لیخنی شارە تازەکاندا مەلەبکەن. لە چاوانی لیڤیاتانتدا ئەو ترسە گەورە و دێرینەی جارانم خوێندەوە، ترس لە لاوازی، ئەو ترسەی هەمیشە بەدوایەوە بوو، ترس لەوەی ڕۆژێک بێت لە ڕیزی پیاوە بەهێزەکاندا نەبێت، ئەوە کردبووی بە کەسێکی وردبین بۆ خوێندنەوەی ئایندە، بۆ هەڵسەنگاندنی بچوکترین ئەگەرەکانی پاشەڕۆژ.

جگە لە گومانی سیاسیم لە باهیری، ئەوکات و بە کاریگەریی ئەو کارلێکە ڕۆحییانەی تێیدا دەژیام، بە جۆرێکی بێمانا و توند ئەو پێشنیارە سەیرەی باهیریم گرێدایەوە بە زۆربوونی دەسەڵاتی شەیتان لە ژیانمدا، شەیتانێک دوای کۆچی فریشتەکەم دەیەوێت ببم بە کەسێکی تر و پارچەیەکی ترم لێ ببێتەوە. ترسام خۆم بدەمە دەست باهیری لەتێکی تر لە بوونم بکاتەوە و بە جۆرێک لەتبم، وەفا ڕاستەقینەکەی خۆم هیچ کات بۆ نەدۆزرێتەوە. نا من لە پارچەپارچە بوون دەترسام، زۆر لە پارچەپارچەبوون دەترسام. لەو ڕۆژەوەی فریشتەکەم ترازا، هێدی هێدی ترسێکی ناوەکی کتوپڕ گرتمی کە ئیدی شەیتان ڕۆڵێکی زیاتر لە ژیانمدا دەگێڕێت، هەستێک گەرچی نەیدەتوانی بمخاتە ژێر هیچ گوشار و حەسرەتێکی دینی و دونیاییەوە، بەڵام وەک لە تاریکستانی ئیمانێکی کۆنی ناو دڵمەوە بێت ناوەناوە دزەیدەکردە خەیاڵم و ئۆقرەی لەبەر هەڵدەگرتم. لەو کەسانە نەبووم کە هەر بە فیترەت بیر لە شەیتان دەکەنەوە، کە وادەڵێم هۆکەی ئەوەیە لە ژیانمدا کەسانێک هاتوونە ڕێگام لە سەرەتاوە باوەڕیان بە شەیتان بووە، ترساون لێی، نە لەبەر خودا، بەڵکو لەبەر خودی شەیتان، وەک مەخلوقێک کە ئەویش وەک یەزدان ناتوانیت هەروا خۆتی بدەیتە دەست، ئەویش وەک هیچ یەک لە هێزە گەورەکانی گەردون جێی متمانە نییە، جار هەیە بەسوودە و جار هەیە وا خراپەکارە، جگە لە نەگبەتی دیاری تری بە دەستەوە نییە. لە ساڵانی ڕابوردوودا بیرێکی ڕاستەقینە و زۆرم لە خودا و شەیتان نەکردبووەوە، لەو کاتەوەی فریشتەکەم ڕۆیشتبوو هەستم بە لاوازییەکی ترسناک دەکرد کە دەشێت هەر شتێک زەفەرم پێببات و بمکات بە دڕندەیەک دواجار خۆم

وێرانیکەم. لەو کاتەوەی فریشتەکەم مردبوو، نەمدەویست هیچ شتێکی تر لە مندا بگۆڕێت، دەمویست دەست بەخۆمەوە بگرم و هەرەس نەهێنم. ئەوەی ئاگاداری ترازانی فریشتەکەم بووم، دۆخێکی تایبەتی و ناوازەی بۆ دروستکردم کە جیاوازە لە دۆخی مرۆڤە ئاساییەکان کە لە بوون و نەبوونی فریشتەیەک لە ڕۆحیاندا بێخەبەرن، ئەوەی بەچاوی خۆم لەتبوونی خۆم بینی، بە دەستی خۆم مەخلوقێکم هەڵگرت کە نیوەی خۆم بوو، منی خستە دۆخێکەوە وریابم و نەهێڵم زۆرتر لە بەریەک بترازێم، دەبوو دەست بەو شتانەوە بگرم کە هەمە، دەترسام دواجار وەها هەڵبوەشێم هیچ پارچەیەکم نەزانێت پارچەکەی ترم خەڵکی کوێیە. لەو گۆڕەدا باهیری شەیتانی ئەو دونیایە بوو، کە دەیویست جارێکی تر من بسڕێتەوە و لەخۆمم ونبکات، لە بەرئەوە ترس و نەفرەتێکی قووڵم بەرامبەر پەیداکرد. من بڕیارمدا وەک خۆم، واتە وەک مرۆڤ درێژە بە ژیان بدەم، بەڵام بە دروستی نەمدەزانی وەک مرۆڤ بوون چۆنە؟. لای من ئەو بڕیارە یەک مانای هەبوو، ئەویش ناکۆکییەکانم بە تەواوی بژیم... لێگەڕێم هەم هوشیاری و هەم دڵڕەقی بمبەن، هەستمکرد ونبوونی فریشتەکەم ویژدانی نەکوشتووم، ویژدان شتێک نییە فریشتەکەی ناخمان بیبەخشێت، هەتا هەموو شەیتانەکانی سەر زەویش لە هەناوماندا نیشتەجێبن ویژدانمان هەر دەمێنێت، هەتا دوای بەدترین خەتاش ویژدان لە جێگای خۆیەتی، ویژدان کەرەستەیەکی ئازارە نەوەک کەرەستەیەکی خۆشبەختی و شادومانی، ژووری ئەشکەنجەکەی دڵمانە، هاودەستی جەلادەکانی دەرەوەشە. من کە سیخوڕێکی ترسناک بووم بەسەر خۆم و بەسەر دونیاوە، وەک نەخۆشێک تووشی واهیمەی لاوەکی بووبێت، زۆر لە دڵمم دەڕوانی و خۆکوڵیم دەکرد. شتێک دوای ترازان هەستم پێکرد ساردی بوو، ئادەمیزادەکانم دەبینی و هیچ شتێک نەیدەجوڵاندم، ئێستا شتێک لە ناومدا تا دەهات ڕەقتر و ترسناکتر دەبوو ... شەوان کە دەخەوتم خەوم بەو ساتانەوە دەبینی کە ژنەکانم تێدا کوشت، نیگاکانیان دەهاتەوە خەوم، بەڵام هەستم نەدەکرد ئازار دەچێژم یان ئەشکەنجەیەکی ڕۆحیم هەیە، بەڵکو شریتێکی ناوەکی و فیلمێکی دێرین بوو کە یادەوەریم

وازی لێ نەدەهێنا. یادەوەرییەکم هەبوو وێنەی قوربانییەکانی زۆر هەڵدەگرت، ئەو کات نەمدەزانی سوودی ئەم یادەوەرییە مەلعونە چییە، کە هەموو شتێک تۆماردەکات، هەموو شت دەنوسێتەوە، لە چەندەها ئەرشیفی ناوەکی و دەرەکیدا دەیانپارێزێت... یادەوەرییەک لە تیژترین جۆرەکانی یادەوەری، وەک چەقۆی لەتکەر و زاموەشێن.

ئەوکات کە ئەو پێداگرییەم لەسەر جەنگ دەکرد، دەمویست بە شەڕێکی یەکسەرە و دەستەویەخە فاشیستەکان لە شار دەربکەین، هەستمدەکرد شەڕ شادییەکی تێدایە تا ئەوکات وەک پێویست نەمدیوە و لەزەتیم نەچەشتووە. بەخۆم دەگووت، منیش دەبێت چێژی خۆم لەم ڕووداوە گەورانە وەربگرم. تا ئەو کاتە من هیچ نەبووم جگە لە داردەستێکی مێژوو، بەڵام دوای ترازانی گەورە، ئێستا مێژوو شانۆی من بوو، وەک جاران ئەکتەرێک نەبووم هەر ڕۆڵی پیاوکوژ و سیخوڕ و دڵڕەقم پێبدەن، نا، لە ئێستا بەدواوە من نمایشەکە بۆ خۆم دەنوسم، دەبێت ڕۆڵی منیش بەو جۆرە بێت کە خۆم دەمەوێت. چیتر من بکەرێکی نادیار نەبووم، کە دەنگێکی غەیبی فەرمانی پێدەکات، هێزێک لە سەروو خۆیەوە ناچاریدەکات، ئیتر ئازاد بووم، فریشتەکەم ئازادی کردبووم. ئێستا لە بری ئەوەی سەرۆک و نیشتیمان و حیزب پێمبڵێن کەسێک بکوژە، من بە سەرۆک و نیشتیمان و خودام دەگووت کێ بکوژن «هەستێکی وەهام هەبوو».



دوا ڕۆژەکانی دەسەڵاتی فاشیستەکان بوو لە شاردا، من لە ئەنجومەنی سەربازیی پێم لەسەر ئەوە داگرت شەڕ تا کۆتاییە گەورەکانی درێژە پێبدەین و واز لەوە بهێنین دیالۆگەکانی بەغدادمان لەگەڵ دەوڵەت دەست

و پێمان لە زنجیر نێن و لە جوڵەمان بخەن. بەردەوام دەمگووت «با بڕۆین پاکیانبکەینەوە، دەی گووی لێ بارێت فرسەت لەمە باشتر کەی دێتە دەستمان». هەر کات وشەی پاککردنەوەم بە کاردەهێنا، دەنگم تۆنێکی ڕەق و ترسناکی تێدەکەوت، وەک دەنگی حاکمێکی دڵڕەق کاتێک حوکمی سێدارەی کەسێک دەخوێنێتەوە و پێیوایە بەو دەنگە زوڵاڵ و بێباکەی، دەتوانێت بەسەر ماهییەتی گوناهبارانەی بڕیارەکەی خۆیدا سەربکەوێت. من لە ئەنجومەنی عەسکەریی دەستم دەکێشا بە مێزەکەدا و بێئەوەی جگە لە شەڕ نیازی ترم هەبێت، هەمووانم بۆ دوا پەلامار تەیاردەکرد، وەک جاران دەنگم دەنوسا و عارەقەم دەردەدا، بەڵام هەستمدەکرد شتێکی قووڵ لە ناخی خۆمدا گۆڕاوە، شتێکی زۆر قووڵ... هەستمدەکرد وەک جاران بۆ ئەم نیشتیمانە، بۆ ئەم شارە، بۆ ئەم خەڵکە هاوار ناکەم، بەڵکو خۆم لەزەت لەو هاوارە دەبینم، تامێکی لەسەر زار و لە گەرومدا هەیە کە پێشتر لە پشت هیچ هاوار و بڕیارێکەوە نەمدیوە. تامی ئەوەی من بەو پەڕی ئازادی، بەو پەڕی لەزەتەوە مێژوو بەو جۆرە دروستدەکەم کە خۆم دەمەوێت. من وەفای ڕەفعەت بەگ، من هاوڕێ جەنگیز، پیاوی هەرە شارەزای ئەمنییەتی وڵات و مەملەکەت. ئێستا هەستم بە بارسووکییەکی ترسناک دەکرد، وەک ئەوەی لە بری ئەو دوو باڵە قورسەی فریشتەکان کە توند بە زەوییەوە دەیاننوساندم، دوو باڵی شەیتانی لەشم سووکبکەن و بەسەر مەخلوقات و بوونەوەراندا بەرزمبکەنەوە و بمگەێننە بڵندایی فەلەک.

لە کۆتایی هاویندا شتەکان ڕوو لە یەکلابوونەوە بوون. وەک نیگای وردەکارم دەیگووت، تفاق و چەکی بەعسییەکان هیچ نەبوون جگە لە دیکۆری شانۆگەرییەکی خراپ کە هیچ ئەکتەرێک نەبوو خۆی تێدا بنوێنێت، لە دوو سێ شەڕی بچوکدا بەعسییەکان بە جۆرێکی بێمانا و پێکەنیناوی شکان، بەزین و ڕمانیان لەوەش خراپتر بوو کە من پێشبینیمدەکرد، هێزەکانیان شپرزە و نارێک، بەدتر لە هەرەسی جارانی عوسمانییەکان لە هەموو جێگایەک پاشەکشەیاندەکرد. سەیربوو لام، چەند

مانگێک لەوەوبەر ملیۆنەها کەس لە ترسی ئەم هێزە لاوازە شاریان چۆڵکردبوو، کەچی سوپای دوژمن ئێستا وەها لاواز و لەیەکترازاو بوو، هەموو جەنگاوەرێکی ڕاستەقینەیان بێتاقەت و وەڕزدەکرد. لە دواهەمین ڕۆژەکانی ژیانی سوپای بەعس لەم شارەدا، هێزەکانیان بە جۆرێکی وا نارێک و بێ سیستەم بە کۆڵانەکاندا بەشکردبوو، هەر کەس بیدیبایە دەیگووت، ئەمە هیچی لە پاشماوەی ئەو سوپایەش ناچێت کە نۆ مانگ لە مەوبەر جیهان حیسابی لەشکرێکی ئەفسانەیی بۆ دەکرد. هەتا ژن و منداڵانی شاریش ئەو شپرزەیی و سەرلێشێوانەیان لە ڕەفتاری سەربازەکاندا دەبینی کە لە کاتی خواردنی قسعەکانیشیاندا دەستیان بە لەرەی مردن دەلەرزی. لە دوا ئێوارەدا، دوای ئەوەی لە سەنتەری شاردا تەواو تێکشکان، نزیکی هەشتا سەربازیان لە باشووری شار، داڵدەیان بۆ بینای قوتابخانەیەک بردبوو، نە لە پێش و نە لە پاشیان هیوایەک نەبوو لەم تۆڕ و تەپکە خوێنینە دەربازبن. من لەگەڵ هەڤاڵێکی پێشمەرگەدا بەناوی «سەی باقی» ئەرکی گەمارۆدان و گرتنی هێزەکەمان گرتە ئەستۆ، سەی باقی لە من زیاتر کوڕی جەنگ و سەنگەر بوو، بەڵام لەوانە نەبوو حەزی لە خوێنرێژی زیادە بێت. سەرەتا هێزەکەی دوژمنمان بە جۆرێکی بێڕەحمانە کوتا، هەردووکمان دەمانزانی کە دەیانەوێت خۆیان بدەن بە دەستەوە، بەڵام بۆ یەکەمجار خۆشیم لە کوشتار دەبینی، دڵ پڕ لە شادی لەسەر بیکەیسییەک دانیشتم و بانگهێشتم لە فاشیستە ترساوەکان کرد بۆ شەڕ، ئەوان وەک مشک لە ژوورەکانی قوتابخانەکەدا خۆیان حەشاردابوو، منیش لە دەرەوەی بیناکە و لە دووری سێ سەد مەترێکەوە بە بڵندگۆیەکی دەسک سوور، بانگهێشتی شەڕم لێدەکردن و دەمگووت «مشکە کوێرەکانی بەغداد، فاشیستە گەمژەکان وەرنە دەرێ و تۆزێک بۆ سەرۆکی فەرماندە بجەنگن». گەرچی جەنگاوەرێکی زۆر شارەزا نەبووم و لە مێژبوو شەڕی ڕاستەقینەم نەبینی بوو، بەڵام ئەو ئێوارەیە هەم هەوای جەنگ و هەم مەیلی کوشتن وەها لە کەللەی دابووم، هەستێکم هەبوو بۆنی خوێن خوماریکردوم. لە هەموو لایەکەوە بەرەو گەمارۆی قوتابخانەکە کشاین، سەربازە فاشیستییەکان هەر زوو ویستیان

چەکەکانیان ڕادەستبکەن و بێنەدەرێ... سەی باقی و جێگرەکەی هەردووکیان زوو ڕازیبوون، نەیاندەویست شەڕ بۆ شەڕ بکەن، هەر دووکیان گووتیان «چەکەکان وەردەگرین و دەیانکەینە دیل، یاخود ئازادیاندەکەین بڕۆنەوە سەر ژیانی خۆیان، سەربازی بەدبەخت چی بکات و چ گوناهێکیان کردوە». من پێداگرییەکی زۆرم کرد و گووتم، دوژمن کەی لە بەهێزیدا تەسلیمبوونی لە ئێمە قەبووڵکردوە؟. ئەو شەوە بۆ یەکەمجار هەستمکرد ئیتر بۆ خۆم، بۆ غەریزە بەدەکانم، بۆ ئاژەڵە ترسناکەکەی ناوەوەم ئیشدەکەم. گەر هەڤاڵان سەرسەختیان نەکردبایە، نیازم بوو ئەو شەوە تەواوی سەربازە عەرەبەکان سەرببڕم و لاشە بێسەرەکانیان تا ناوەڕاستی شار ڕاکێشم و لەوێدا هەندێکیان بۆ چەند ڕۆژێک هەڵواسم. بەڵام سەی باقی و پێشمەرگەکانی تر توند بەرابەرم وەستان و گووتیان «کەی دیل کوشتن ئیشی پیاوە، دونیا لە ئێستادا چاوی لەسەر ئەم شەڕەیە، هەر نامەردی و ناهەقییەک دەرهەق بەم سەربازە ڕەش و ڕووتانە، لە دونیا و قیامەتدا ڕیسوایی بۆ خۆمان و ئەژدادمان دەهێنێت... هەڤاڵ جەنگیز تۆ کەی وابوویت، کەس تا ئێستا تۆی بەمجۆرە نەبینیوە، چیت لێ قەوماوە و چ خەوێکت دیوە برا گیان». من وەک پڵنگێکی بریندارم لێهاتبوو کە زۆر برسییەتی و کەچی دەستی ناگاتە نێچیرێکی نزیک. کە هەڤاڵانم وایان گووت، هەستێکی زۆری شەرم و تووڕەیی دایگرتم و نەمدەزانی چی بکەم. ئەوان نەیاندەزانی من هەستێکی تازە تاقیدەکەمەوە، هەستێک دەشێت هەر سەرکردەیەکی جەنگ لە دونیادا، لە هەموو بەرەیەکدا، لە هەموو نەتەوەیەکدا تاقیکردبێتەوە، هەستی ئەوەی ئەم جەنگە و لەم ساتەدا، بووە بە جەنگی تایبەتی من، بووە بە شەڕێک من هەڵمگیرساندوە، من درێژەی پێدەدەم، من یاساکانی دیاریدەکەم، دەمەوێت بە ئارەزووی منیش بڕوات بەڕێوە.

ئەو شەوە دوای ئەوەی منیان بە تووڕەیی لە مەیدان دوورخستەوە، ناکام و شەرمەندە شوێنی جەنگم بۆ ئاشتیخوازەکان جێهێشت و گووتم «کارم بە سەرکەوتنی وا سارد و سپییەوە نییە و ئەمە بە بڕیاری خۆم نازانم».

تورەبووم لە هەموو ئەوانەی نەیاندەزانی من چ هەستێکی سەیر و ناوازەم هەیە و نامەوێت وا ئاسان لە دەستی بدەم. کە مەیدانم جێهێشت و گەڕامەوە بۆ شار، خۆم کرد بە کوچەیەکی کۆنی گەڕەکی قەساباندا، لەوێ کۆڵانەکان تەسک و دیواران ئەستوور و درێژن، مرۆڤ دەتوانێت نیوسەعات بڕوات و واهەستبکات لە تونێلێکی سروشتیدا گوزەردەکات. من لە مێژبوو حەزمدەکرد لە هەناوی ئەو شارەدا نەفەقێکی درێژ و تاریک بۆ خۆم لێدەم تا هەرکات وەڕزبووم تونێلێکی خۆم هەبێت لە ناویدا پیاسەبکەم و کەس نەمبینێت، هەستێکی خراپم هەبوو کە ڕقم لە هەموو دونیایە... دەتوانم بە جۆرێکی ترسناک دڵڕەق بم. نزار ئیدریسم بیرکەوتەوە و ویستم بیبینم. دەبوو نزار ببینم... ئەو دەیتوانی کۆمەکمبکات، ئەو بە درێژایی ژیانی شەڕی بۆ خۆی کردبوو ... دەبوو بزانم ئەم هەستە نوێیەم چییە و چۆن ڕکێفیبکەم؟.

لەو کۆڵانە درێژ و تونێلیانەی گەڕەکی قەساباندا، قسەکانی حەڤدە ساڵ لە مەوبەری نزار وەک خۆی هاتنەوە بیرم« کاک وەفا، گەر تۆ ئەسپەکانت بۆ خۆت کوشتبێت، ئا گەر تۆ ئەسپەکانت لە بەر خاتری خۆت کوشتبێت، لە بەر هاواری ئەو حەیوانەی ناوەوەت، لەبەر هاوار و لورەی ئەو گورگەی ناو ناخی خۆت، ئەوا سڵاوی منت لێبێت. بەڵام گەر ئەسپەکانت بۆ لیڤیتانت یان بۆ شۆڕش کوشتبێت... نا ... من سڵاوی وات بۆ نانێرم». دەمویست زوو نزار بدۆزمەوە و بڵێم «نزار، ئێستا دەتوانم تەنها بۆ خۆم ئیشبکەم، نە بۆ حیزب، نە بۆ خودا، نە بۆ نیشتیمان، تەنیا بۆ خۆم».

## تێڕامان لە خود، بە چاوی سیخوڕێک

هەمیشە ئەو هەستە ترسناکەیە و دووبارە دەگەڕێتەوە. ئەو هەستەی کە من، من نیم.

ئەوانی تر هەموو دەتوانن باز بەسەر ئەو هەستەدا بدەن و فەرامۆشییبکەن، بەڵام من ناتوانم. دڵنیام لە داهاتوودا ئەم نەخۆشییە زۆر بڵاودەبێتەوە، دەبێت بە دەردی هەموو خەڵکێکی هوشیاریی ئەم شارە، بە نەخۆشی ئەوانەی دەتوانن گەر لە پەراوێزیشدا بووە، شتێک بیر لە خۆیان بکەنەوە و بپرسن «ئایا بەڕاستی من هەم، بەڕاست من خۆمم دروستکردوە یان ماشێنێکی دەستکردم و دونیا دەمجوڵێنێت؟». ئاە ... ئێستا با لەوەگەڕێم، دەی من ئەم کتێبە گەورەیە بۆ دەنوسم، گەر لە بەر ئەوە نەبێت چیرۆکی دوو کەرتبوونی خۆم و گەڕانم بەدوای یەکپارچەییدا بگێڕمەوە. دوو کەرتبوونێک بە تەنیا من بەدەستییەوە ناناڵێنم، بەڵکو ئەم دونیایەش کە تێیدا دەژین وەک من گرفتار و گیرۆدەیەتی.

بابگەڕێمەوە بۆ سەرەتا، بۆ ئەو کاتەی لەگەڵ بولبولیاردا بەرەو ئەم دونیا تازەیە هەنگاوی یەکەممان نا.

لە گەڕانەوەماندا لە خۆرهەڵاتی کوردستانەوە بۆ باشوور، بە واژەی ئێرانیان، ماشێنێکی «دەربەستمان» گرت و هاتینەوە ئەمدیو. بولبولیار مەترسی مەرگی تێپەڕاندبوو، بە خێرایی ڕووی لە هەستانەوە دەکرد، بەڵام توند خۆی لە پاڵتۆیەکی ڕەشی ئەستوورەوە پێچابوو کە خێرخواکان لە کوردانی خۆرهەڵات بەخشیبوویان و ئێمەش لە بەرپرسانی بیمارستان وەرمانگرت، وەها لە پاڵتۆکەوە ئاڵابوو، وامدەزانی لە ژێر ئەو بەرگە ئەستوورەشەوە هەر دەلەرزێت، بەڵام نا، تا دەهات سەرەحاڵتر و باشتر دەبوو. دوای نیوسەعات لە جوڵەی ماشێنەکە، زۆری بۆ خۆی هێنا و وەک

بیەوێت بەسەر ئەو قێز و کینە دێرینەی جارانیدا بەرامبەر من سەربکەوێت، بە درێژیی چیرۆکی ژیانی خۆی لە کەشتیی فریشتەکان بۆ گێڕامەوە. هەستدەکەم ئەو ڕۆژە سەرەتای وەرگەڕانی هەستە شەڕانگێز و بەدەکانی بوو بەرامبەر بە من، هەڵبەت هەموو هەستێکی نوێ کۆمەڵێک سەرەتای هەیە، ئەمەش یەکێک بوو لە سەرەتا زۆرەکانی ئەو هەستە. هەر کات مرۆڤ بیەوێت هەستێکی توند بۆ پێچەوانەکەی بگۆڕێت، وەک ڕق بکاتە عەشق یان وەفا بگۆڕێت بۆ خیانەت، بەردەوام بۆ سەرەتای تازە دەگەڕێت تا خۆی ڕەوا ببینێت و بە دروستی ئەو هەستە نوێیەی بخاتە سەر ڕەوتی خۆی. من دڵنیابووم بولبولیار چەندین ساڵە لە سەرەتاوە بۆ سەرەتا دەڕوات و هیچ کات بە تەواوی لەو کینە و تووڕەییەی کۆن ڕزگاری نابێت. ئەو کاتەی قسەیدەکرد، من و ئەو وەک دوو بوونەوەر، هەر یەکەمان مەخلوقێکی نامۆ و نەناسراوی سەر ئەستێرەیەکی تر بدوێنین، کونجکۆڵ و تیژ لە یەکمان دەڕوانی، هەر یەکەمان دەمانویست ئەوی دی تا بنی بنەوە بخوێنینەوە. ئەو زۆر مەبەستی بوو بزانێت من دوای فریشتەکەم چیم بەسەرهاتووە، لە چاوم و لە دەنگم و لە دەستمدا بۆ ئاسەواری گۆڕانێکی گەورە دەگەڕا، منیش دەمویست بزانم ئەم هاوڕێ نەخۆشەم کە تا ئێستا چەندین جار لە مەرگ ڕزگارمکردوە، چۆن لێمدەڕوانێت و بە چی چاکەم دەداتەوە. چیرۆکەکەی لای من سەیر و خەیاڵی بوو، هەموو ئەو کاتەی قسەیدەکرد، دەفتەرەکەمم دەرهێنا و زۆری قسەکانیم نوسییەوە، نەوەک ڕستەیەک یان شتێکی گرنگی بەسەرمدا ڕابورێت. بە کەیفی چیرۆکنوسێکی بەدنیازەوە گوێم لە بەسەرهاتی سەرهەڵدان و سووتانی کەشتیی فریشتەکان گرت، ئەوە یەکەمجار بوو بە ڕوونی هەموو بەسەرهات و چیرۆکی کەشتییەکە ببیستم. کە قسەیدەکرد زوو زوو نۆبەتە ترسی بۆ دەهاتەوە، دووجار وەستاندم ترپەی دڵیم پێوا و پێمگووت «بەردەوامبە، هەڤاڵ بەردەوامبە، هیچ نییە». دواجار گووتی «دەبێت ڕێزانی مەلەکبین بدۆزمەوە، دەزانم نهێنییەک لە پشت سووتانی کەشتییەکەوەیە». چیرۆکی کەشتییەکە شتێکی سەیر بوو، بەڵام لەوجۆرە چیرۆکانە نەبوو سەرنجی من ڕابکێشێت، هەر شتێک پەیوەندی بە

سیاسەتەوە نەبایە، منی لەگەڵ خۆیدا نەدەبرد. ئەوکات کە چیرۆکەکەی بەو هەموو وردەکارییەوە گێڕایەوە، من ئەوەندەی لەزەتم لە ترس و هەراسانییەکانی بولبولیار دەبینی، چیرۆکەکەم بەو ئەندازەیە بۆ گرنگ نەبوو، هەتا هۆی تۆمارکردنیشی لەو کاتەدا، دەگەڕایەوە بۆ بایەخی تایبەتیم بە کەسی بولبولیار، نەوەک بە کەشتیی فریشتەکان. خۆشحاڵبووم وەک هەمیشە هێزێکی خودایی تێدا نابینم، هەمیشە وەک کەسێکی بەتوانا هاتبووە بەر چاوم کە شتێک نییە لەم دونیایەدا شپرزەیبکات، بەڵام ئێستا نەخۆشی و مەراق گەیشتوونەتە سەر ئێسکانی، خەیاڵی پەرت و ترسەکانی کاریگەرییەکی زۆریان لەسەری هەبوو. سەیری ریشە ژاکاو و چاوە گەورەکانیم دەکرد و پەرێشانییەکی وەهام تێدا دەبینی، بە ڕوخساری جارانی نائاشنابوو. دواجار، دوای ئەوەی زۆرم نوسی و زۆرم لە سەر چیرۆکەکە لای خۆم تۆمارکرد، گووتم «بولبولیار، لە حیکایەتی ئەم کەشتییەی خۆت گەڕێ. من کارم بەمەوە نییە، گوناهم چییە گوێ لە شتێک دەگرم نازانم خەیاڵپڵاوی سەری خۆتە یان ڕاستییە. لێیگەڕێ برام. ئێستا نازانم چی لەو تەیرەی خۆم بکەم، بەڕاستی وەک پێم گووتی دەمەوێت بیدەم بە تۆ، بە مەرجێک هیچی دەربارە نەبیستمەوە. درۆت لەگەڵ ناکەم، پێویستم بە فریشتە نییە، پێویستم پێی نییە ... نامەوێت بمرێت، بەڵام کاتی ئەوەم نییە فەرمان و ئیشی گرنگی شۆڕش بەجێبهێڵم و خەریکی تەیرێکی وا بم ... تۆ پیاوێکی مرۆڤدۆستی، سروشتدۆستی، مەلەکدۆستی ... تۆ دۆستی هەموو شتەکانی، دۆستی شیعری، دۆستی شەویت، دۆستی تەنهاییت، کارێک بکە ئەم تەیرە نەکەوێتە ملم». وەک لە چاوقایمیم هەست بە بێزاری بکات، دەستی خۆی بە توڕەییەوە ڕاکێشا و وەک یەکێک حەقیقەتێکی سواو بۆ گەمژەیەک دووبارەبکاتەوە، گووتی «گەر تۆ نەتەوێت فریشتەکەت خۆی دەمرێت». من بەتوڕەییەوە گووتم «وا نییە، فریشتەکەی من وانییە، لەوانەیە فریشتەکانی کەشتییەکەی تۆ وابووبن، بەڵام ئەم فریشتەیەی من وانییە، من چەندین ساڵە لەگەڵمدایە، بە زۆر، دوای گوناهی گەورە، دوای ئەوەی ناچاریکردم ژیانی خۆم پڕبکەم لە تاوان وازی لێهێنام، دڵنیام لەو فریشتە

پڕ و پوچانەیە هەر دەژی و دەبێتە مایەی بەدبەختی و نەگبەتی گەورە بۆ من، بۆیە دەڵێم بیبە و با من هیچی دەربارە نەزانم. دوای ئەوە من ڕاستییەکی ترت پێبڵێم، من نامەوێت بمرێت، هەستێکی ناخۆشم هەیە لە ناوەوە پێمدەڵێت با نەمرێت، نازانم ئەو هەستە لە کوێوە هاتووە، بەڵام چەند ڕۆژە لە دڵمدایە و هەر دەیهێنم و دەیبەم». وەک ڕوون و ڕۆشن بمخوێنێتەوە یان تەنیا بە سەیرکردنی دەستم بزانێت چ تاوانێکم کردوە، گووتی «ئەوەندە ئەو قسانە مەڵێرەوە، بۆ نایکوژیت، بیکوژە، چۆن گوللەت نا بە سەری ئەسپەکانەوە، ئاوها نەختێک گوللە بنێ بە سەری ئەویشەوە، خۆ تۆ کێشەیەکی ئەوتۆت نییە دەمانچەکەت دەربهێنیت و کەی ویستت بیتەقێنیت». لە بن وشەکانییەوە هەستمکرد چاوانم و دەنگم و هەناسەم دەخوێنێتەوە، دڵنیابووم دەزانێت لە فریشتەکەم دەترسم. نەیدەزانی بۆچی لێی دەترسم، بەڵام هەموو شتێک لە مندا قسەی لەو ترسە دەکرد. بە تووڕەییەوە گووتی «ترسی مرۆڤ لە فریشتەکەی ناخی تەواو نابێت، فریشتەکەت بژی یان بمرێت، لەگەڵتدا بێت یان ترازابێت، هیچ کات لەو ترسە ڕزگارت نابێت. کە فریشتەکەت دەڕوات، ترسێکی قووڵ داتدەگرێت، تازە لەوە ڕزگارت نابێت». من سەیری چاویم کرد و دڵنیابووم دەزانێت من دەترسم، لە دڵی خۆمدا گووتم «تۆ چووزانیت ... تۆ چووزانیت کە مرۆڤ بۆ هەتاهەتایە لە فریشتەکەی دەترسێت؟»، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەیری ڕۆحی خۆم کرد و هەستم بەو ترسە کرد.

ئێستا بە پێویستی دەزانم بێمە سەر ئەو ڕاستییە ترسناکە کە دەرەنجامی تێڕامانی دوور و درێژ و قووڵی چەند ساڵەمە لە سەر ڕۆحی خۆم بێ فریشتە، ڕەنگە کەسانێک بڵێن بوەستە و ئەم بەشە هەڵگرە بۆ کۆتایی کتێبەکەت، بەڵام نا... پەلەمە بزانن کە لە ساڵانی ڕابوردوودا، لەو ساتەوەی لەگەڵ بولبولیاردا بە ماشێنێکی دەربەست کە شۆفێرێکی ئەهلی کامیاران لە پشت فەرمانەکەیەوە بوو، هاتینەوە هەرێمی خۆمان، تا ئەم کاتەی دانیشتووم و لەبەر ڕۆشنایی لایتێکی کزدا ئەم دێڕانە بۆ ئێوە دەنوسم، ئەو ترسە جڵەویکردوم. ترسی من لە فریشتەکەم هەستێکی پڕ

ناکۆکی و دوودڵی بوو، ترسێکی دوو دیو، وەک چەقۆیەک لە هەر سەرێکەوە بیگرێت بتبڕێت، جارێک ترس بوو لەوەی ئەم مەخلوقە بمرێت و دوای مردنی من تەنهاییەکی قووڵ یان شێوانێکی ترسناکی دەرون بژیم، جارێکیش ترس بوو لەوەی بژی و وەک تارماییەک بەدوامەوە بێت و پلانەکانم لێ تێکبدات. دۆاجار ئەو فریشتە مەلعونە باش یان خراپ بەشێکی نەگریسی من بوو. ئەوەتەی ترازابوو هەستێکی زۆرم بە چۆڵی هەبوو ... بەڵێ چۆڵی. ڕەنگە وشەکە بۆ هەمووتان سەیربێت. تا ئەو کاتەش ترازا هەستم نەدەکرد هەستی لەو جۆرە لە دونیادا هەبێت، وەک ڕۆحی تۆ ماڵێک بێت، فریشتەکەت منداڵی ئەو ماڵە بێت و ڕۆژێک ڕۆیشتبێت و ئیدی نەگەڕابێتەوە. ئەمجۆرە هەستە جیاوازە لەگەڵ هەستی تەنهاییدا، مرۆڤ لە تەنهاییدا هەست بە پچڕانی پەیوەندی بەوانی دییەوە دەکات، ئاوڕ لە خۆی و ژیانی خۆی دەداتەوە و مرۆڤێکی نزیک لەخۆیەوە نابینێت، سەیردەکات و کەس لە ئاسۆکانی ژیانیدا دیار نییە. بەڵام هەستی چۆڵی شتێکی ترە، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە کەسەکانەوە نییە، بەڵکو جۆرە هەستێکی ترسناکە بە وشکبوونەوەی ناوەوە و خاڵیبوونەوەی ناو ناخ، وەک ئەوەیە لە ناکاو ڕۆحت وەک بیابانێکی گەورە گەورە و بێسنووری لێهاتبێت، ڕەنگە چواردەورت هەمووی مرۆڤ بن، بەڵام پێکڕا جێگایەک نەگرن و بەتاڵییەک پڕنەکەنەوە. چۆڵی بریتییە لە هەستی ئەوەی هیچ شتێک لە ژیاندا ئەو بۆشاییە قووڵەی دەرونت داناخات، ئەو چاڵە گەورەیەی کە لێی دەڕوانیت و تا ناکۆتا قووڵ دەبێتەوە و بنی نییە. ژیانت وای لێدێت، وەک ئەوەی عومرت تابلۆیەک بێت کە تۆ نیگارەکان دەکێشیت و لە ناکاو دەستێکی نهێنی دێت و دەیانسڕێتەوە. تۆ هەر وێنە دروستدەکەیت و لەگەڵ ڕووبەرە بەتاڵەکاندا دەجەنگیت، کەچی بەردەوام سەر تابلۆکەت بێڕەنگ و ڕووی جانفازەکەت سپییە. بەردەوام شتێک دەکەیت بۆ ئەوەی بۆ خۆتی بسەلمێنیت کە تۆ لە چۆڵەوانیدا نیت، ژیانت پڕ دەکەیت لە خەڵک، لە ڕووداو، لە جەنگ، لە قێز، لە سێکس، لە هەر شتێک بە نیاز و بە ڕێکەوت بەخەیاڵتدا تێپەڕێت، کەچی هەمیشە ئەو بیابانە گەورەیە لەوێیە و لە نێو ناچێت... من سەدان شەو لە ناکاو

هەستاوم بچمەدەرێ، هێندەی قاچم خستۆتە سەر فەرشی ژوورەکەم، ئەو هەستە ترسناکەم هەبووە گەر هەنگاوی دووەم قاچم بنێمە سەر زەوی، ڕۆدەچم و بەردەبمەوە... دەزانن ئەوە چ ترسێکی گەورەیە، هەستیت و بترسیت لەوەی هەنگاوی داهاتووت بەربوونەوەیە. هەستکردن بە چۆڵی، تەنیا هەستکردن نییە بە بۆشبوونێکی ناوەکی، بە پوچی، بە بێهودەیی و بێهیوایی ئاسایی، بەڵکو هەستکردنە بەوەی هیچ شتێک لێرە نییە، مانگ لێرە نییە، خۆر لێرە نییە... هیچ شتێک... هیچ شتێک... چۆڵی ئەوەیە هەموو شتێک قورسایی خۆی لەدەستدەدات، هەموو شتێک دەبێت بە وێنەیەکی کاڵ کە لە پشتییەوە جگە لە بۆشی و بێمانایی و درۆ هیچی تر بوونی نییە. من چەندەها جار لە بەهاردا، لە ناوەڕاستی ئەو وەرزە جوانەدا وەستاوم و هەستم نەکردوە لە ناوەڕاستی سروشتدام، بەڵکو ئەو هەستەم هەبووە کە لە ناو وێنەی تەماوی و خۆنەگری جێگایەکی چۆڵدام کە هونەرمەندێکی درۆزن دروستیکردوە، هەستمکردوە لە خەودام و ئەمە دیوە فریودەر و تێپەڕ و پڕفێڵەکەیەتی ... ئیدی هەموو شوێنەکان دەبن بە وێنەی درۆزنی خودایەک یان هونەرمەندێک یان دەستێکی گەردونی نادیار کە بە خۆشییەکی گەورەوە فریومان دەدات. لەو ساتانەدا، تەواوی وجود وەک فاقەیەکی گەورەی لێدێت کە تەقیوە بە دڵماندا.

چەند ساڵێک دوای ترازان، بەردەوام خەوێکی زۆر ناخۆشم دەبینی، وام هەستدەکرد زارم کراوەتەوە و سەعاتێکی گەورەی لمین لەسەر دەممە، دەنک دەنک لم لە گەردنی تەسکی ئەو سەعاتەوە ئاودیو دەبێت و دەنکەکانی دەڕژێنە ناو گەروم... لمێکی نەرم و ورد و خنکێنەر بەردەوام دەڕژێت و دەڕژێت و دەڕژێت، منیش هیچ هێزێکم نییە دەمم دابخەم و سەرم دوور بخەمەوە. هەستمدەکرد گەر فریشتەکەم بگەڕێتەوە، لەوانەیە ئەو هەستانە کەمتر بمخۆن. ئەو کاتانەی کە لەگەڵ ئەودا نزیکبووم هەستم بە چۆڵی، بە موتڵەقییەتی چۆڵی، بە بێسنووری و ناکۆتایی چۆڵی کەمتر بوو، کەمتر لە ناو ڕۆژانی ساردی چۆڵ و ژووری ساردی چۆڵدا دەخنکام، بەڵام ئێستا وەک بوکەشوشەیەکی میکانیکی و

قورمیشکراوم لێهاتووە کە لە ڕووبەرێکی خاڵیدا لە هەر شتێکی مانادار دێم و دەچم.

من ساڵانێکی دوور و درێژ لەو گەمژانە بووم کە باوەڕم وابوو، مرۆڤەکان بوونەوەری بەدبەخت و غەمگین و بێچارەن، بەڵام لە کۆتاییدا تێگەیشتم، نا... مرۆڤەکان بە گشتی بەختەوەرن، بە جۆرێکی گەمژانە بەختەوەرن، تاکە شتێک ئەم بوونەوەرەی لەسەر زەوی هێشتۆتەوە ئەو بەختەوەرییە ساختە و درۆزنانەیە کە خۆی لە ناودا خنکاندوە، ئەو شادمانییە ساختانەشی وەها لەخۆیدا ناواخنکردوە، ئازارە قووڵ و ڕاستەقینەکانیشی ڕەنگ و بۆی شتی ساختەیان گرتووە، بە جۆرێک هەر کات مرۆڤێکی غەمگین دەبینین هەر زوو لە پشت غەمەکەیەوە دەمامکێکی ساختە دەدۆزینەوە وادەکات غەمەکەی وەک درۆ دەربکەوێت، ئەو مرۆڤەی شادییەکانی درۆن غەمەکانیشی درۆن. من بۆ خۆم هیچ کات مرۆڤێکی باش نەبووم، مرۆڤێکی دڵنەرم نەبووم، بەڵام تەنیا شتێک لێی دەترسام ئەوەبوو کە هەستێکی درۆزنم بەرامبەر خۆم هەبێت... ئایا ئازادم یان دیلم؟ ئایا دڵخۆشیم ڕاستەقینەیە یان ساختە؟ ئایا گەر غەمگینم ئەوە غەمی خۆمە، یان پەژارە و پرسەیەکە ئەوانی تر بۆیان نوسیووم؟. ئەو پرسیارانە زۆر ئەشکەنجەیان داوم، من هەستمدەکرد فریشتەکەم بۆیە تۆراوە، بۆیە هەست بە چۆڵی دەکەم، چونکە هیچ شتێکی خۆمم نییە، هەڵبەت مەبەستم لە بیروڕا و بۆچوون و ئەو شتانە نییە، نا، بەڵکو مەبەستم لە هەموو هەستەکانمە، خۆشییەکانم، غەمەکانم، دوودڵییەکانم. من ساڵەهای ساڵ گەر لە دڵەوە پێکەنیبێتم، گەر لە دڵەوە گریابم... هەمیشە بێ ئاگای خۆم، گریان و پێکەنینم ساختەبوون.

دڵنیام ئێستا یەکێکتان دەڵێت، دووبارە ئەم پیاوە چەپەڵەی ساڵانێکی درێژ لە دەزگا ئەمنییەکاندا کاریکردوە، کەوتەوە فەلسەفەلێدان و تیوریزەکردنی پەرێشانی و لاوازیی و بیماریی خۆی، بەڵام لە ڕاستیدا چ ئادەمیزادێک هەیە بتوانێت بێ فەلسەفەلێدان بیر لە قووڵایی ژیانی خۆی بکاتەوە؟ کێ هەیە ژیانی من ژیابێت و بتوانێت بێ هەوڵی فەلسەفاندنی

بگاتە مانایەک بۆ خۆی؟ کاتێک هەموو عومرت وەک پیاوێکی بەدفەساڵی ئاسایش ژیابیت، مەگەر تەنیا تێفکرینی ورد بتوانێت بتگێڕێتەوە سەر بنچینەی لە دەستچووی خۆت ... بەدبەختی من ئەوە بوو ڕۆشنبیرێک نەبووم بۆ هەواوهەوەس بیر لە دونیا بکەمەوە، بەڵکو قوربانییەک بووم کە بۆ بەدەستهێنانەوەی خۆم هەموو ڕێگایەکم دەگرتە بەر. ئەو ڕۆحەی ڕۆژێک دەیفرۆشیت، دەبێت ڕۆژێک بیکڕیتەوە.



بولبولیار، لە ماشێنەکەدا بێبڕانەوە قسەیدەکرد، هیچ کات بولبولیار وا درێژ و ورد باسی ژیانی خۆی نەکردبوو، بێئەوەی بوەستێت چیرۆکە جیاوازەکانی زیندەگی خۆی دەگێڕایەوە، دەنگی هەمیشە هێمن، یەک ڕیتم، قووڵ بوو... من زۆرجار پێمدەبڕی، بەڵام ئەو هەمیشە لە کویادا دەپچڕا دەهاتەوە سەر خەت.

کە گەیشتینەوە ئەودیو سنوور، بولبولیار سەرسام و بێورتە دیمەنی ئەو سەدان هەزار مرۆڤە پەرتەوازە و ئاوارەیە تەزاندی، من نەمهێشت لەگەڵ دیمەنە غەمگینەکاندا زۆر تێکەڵ بێت و خۆی بە ئازاری ڕەوکەرانەوە ماندووبکات. کەژا و کەژ و دۆڵا و دۆڵ بولبولیارم برد بۆ لای فریشتە نەخۆشەکەم. ترسێکی گەورەم هەبوو مردبێت، یان ڕۆیشتبێت، کە چووین دەرگاکەمان کردەوە ژوورەکە خاڵی بوو، دەستوبرد نائومێدبووم و گووتم «بە دڵنیاییەوە فریشتەکەم ڕۆیشتووە و بەس خودا دەزانێت ئێستا لە چ کەند و لە بن چ دۆڵێکدا مردووە». بولبولیار شارەزا بوو، دەیتوانی بۆنی هەناسەی جێماوی فریشتەکان بکات، هەوایەک گەر فریشتەی پێدا تێپەڕیبێت دەیزانی و لە هەوای ئاسایی جیایدەکردەوە. گووتی «نا.. نەمردووە، جێگاکە بۆنی فریشتەی مردووی لێنایەت. بۆنی فریشتەی مردوو

دەناسمەوە، گەر بمردایە ئێستا بۆنمدەکرد... دڵنیام نەمردووە». دواتر دەستمانکرد بە گەڕان و لە دووری چەند سەد مەترێک لە ماڵەکەوە، لە بنی درەختێک و لە ناو گیای بەهاردا دۆزیمانەوە. وریا و بەهێزتر بوو لەوەی من چاوەڕوانمدەکرد، بە جۆرێک هەتا بولبولیار سەیری لێهات، گوێتی پێشتر تەنیا مەهدائیلی بینیوە ئاوا خۆگر و سەرەحاڵ بێت. ئێستا لە مرۆڤێکی ئازاد و بێباک دەچوو. دەمێک لە ناو سەوزە گیاکەدا دانیشتبوو، وەک ئەکتەرێک هاتە بەرچاوم، بۆ گرتنی دیمەنی فیلمێک دانیشتبێت، هەر لە یەکەم ساتەوە ئەو هەستە ناکۆکە لە ناوەوە گرتمی هەم باوەشی پێدابکەم و هەم بیکوژم. هەستێک هێندە دژ و دوو جەمسەر بوو، نەدەکرا هیچیان هەڵبژێرم. سەرەتا ئەو دوو ئارەزووەم وەک جۆرە بەشبوونێکی کاتی وەرگرت، لەو هەستە دژوار و دوو دیوانەی زۆرجار بەرامبەر هەندێک شت دایاندەگرتم. ڕۆژێکی تابڵێی جوان بوو، سروشت پاکترین و جوانترین ساتەکانی خۆی دەژیا ... هەوا وەها فێنک و ئامێزی گیاکان وەها گەرم و هێمنی دۆڵەکەش بە جۆرێک بەهەشتیانە بوو، دەکرا هەموو فریشتەکانی دونیا بێن و لەوێدا خۆیان لە بەر موعجیزەی بەهاردا هەڵخەن. ڕۆژە خۆشەکانی بەهار تاکە موعجیزەی ڕاستەقینەی سروشتن، نەزستان موعجیزەیە، نە هاوین، نەپاییز ... هەرسێ ئەو وەرزە لەم دەڤەرەی ئێمەدا شەیتان دروستیکردون، تاکە وەرزێک کە خودا لوتفیکردوە و دابەزیوە و باغەوان و کارگەری خۆی بەتایبەت بۆ ناردوە بەهارە. ئەو ماوە کورتەی بەهاری لێ دەرچێت، ئیتر وڵاتی ئێمە هەموو شتێکی ڕەنج و ئەشکەنجەیە ... فریشتەکەم شانسێکی گەورەی هێنا کەمن ئەوم لە جۆرە ڕۆژێکی وەهادا، لە سەوزییەکی سیحراویدا، لەژێر ئاسمانێکی بەوجۆرە ساف و ئارامدا بینییەوە. هەندێک کەس و هەندێک شت هەن مرۆڤ دەیانبەستێتەوە بەو ساتەوەختەوە کە بینیوونی، دەیانبەستێتەوە بەو کوچەیەوە ، بەو شەقامەوە، بەو باغەوە، بەو بۆنەوە، بەو ڕوناکییەوە کە ڕێکەوت لەوێدا ئامادەبوون. من نازانم بۆ وام هەستکرد ئەوساتە ساتی یەکەم بینین و بەرخوردی ڕاستەقینەمە لەگەڵ ئەم مەخلوقە باڵدارەدا، ڕەنگە هۆکەی ئەوەبێت ڕۆژانی سەرەتا من دەرونم بە

جۆرێک پەشێو و ئاڵۆزبووە، بە جۆرێک ترس و هەڵچوون و ئازاری ترازان تووشی لەرزینی کردبووم، نەمدەتوانی تەواو شێوەی پەیوەندی خۆم بەم مەخلوقەوە دیاریبکەم. بەڵام دوای ئەو بێهۆشییەی بیمارستان، دوای ئەوەی لەبەردەم دەرکی دەرگای پزیشکاندا بێهۆش کەوتم، وەک ئەوە بوو بە هەستێکی ڕوونترەوە لە جاران هوشیاربووبێتمەوە، تا هەستەکانم هەر ناکۆک و ناتەبابوون، بەڵام چیتر شپرزەیی و پەشێویان لە خۆیان تەکاندبوو، نارێکی یەکەمجاریان بەردابوو و بووبوونە دوو جەمسەری ڕوون و بێگرێ، کە ئاشکرا یاریان بە دەروونم دەکرد.

کە بینیمان دڵنیابووم هەستە ناکۆک و ئاڵۆزەکانی من دەخوێنێتەوە، کە یەکەم نیگای تێگرتم، دڵنیابووم دەزانێت خواستێکی ترسناکم هەیە بۆ کوشتنی، دڵنیابووم بە جۆرێک لە جۆرەکان ئاگاداری نیازەکانی دڵمە، زانیم دەمناسێت، دەزانێت چی کیمیاییەکی مەلعون لە ناخمدا شتەکانی خستۆتە جۆش، بەڵام دڵنیاشبوو ئێستا و لەم ساتەدا و لەناو ئەم جوانییەدا ناتوانم ئازاری بدەم. بە پێچەوانەی منەوە، بینینی فریشتەکە بولبولیاری زۆر مەست و دڵخۆش کرد، چاوانی شادییەکی زۆر و دەنگی تۆنی بەختەوەرییەکی گەورەی پێوەدیاربوو، ئەو بەر لە من باوەشی پیاکرد و گووتی «سڵاو وەفائیلی ئەزیزم»... ئاشکرابوو ئەو ناوەی دەمودەست لەویادا دروست نەکردبوو، وەفائیلی بە جۆرێک لە زار هاتەدەرێ، وەک پێشتر زۆر مەشقی لەسەر گووتنی کردبێت، وەک ئەوەی ساڵانێک بێت بیری لێ کردبێتەوە، یاخود بەدتریش وەک ئەوەی پێشتر بینیبێتی و دانیشتبێت و قسەی لەگەڵ کردبێت. من هەستێک پێیدەگووتم برۆ و بیگرە ئامێز و بینوسێنە بەخۆتەوە، وەها توند بیگرە بگەڕێتەوە ناو رۆحت و هەناوت، هەستێکی دیش پێمی دەگووت بیکوژە. بولبولیار کە جەستە و نیگا و ڕۆحی منی لە بن ئەو دوو لەرزەدا دەبینی، دەیزانی دۆخێکم هەیە شایەنی ڕێز و بەزەییە. خودی وەفائیلیش لە نێوان ئەو دوو هەستەی مندا وەستابوو، وەک من حەزیدەکرد بمرێت و حەزیشیدەکرد بژی.

بولبولیاریشم ئاسایی و بەهێز هاتە بەرچاو، لە ژێر خۆرەتاوی بەهاردا، هەوای پاک و شینایی ئاسمان هێزێکیان پێبەخشیبوو ئاسەواری دەرد و نەخۆشی هەفتەکانی ڕابوردووی بە ئەستەم پێوە دیاربوو. من و فریشتەکەم بێ هیچ قسەیەک ماوەیەکی درێژ تەنیا سەیری یەکمان دەکرد، زۆر لە یەکدەچووین، دووانەیەک بووین نەماندەزانی بۆ بەیەکەوە بووین، بۆ هەر لە زگی دایکمانەوە خودا لێکی جودا نەکردبووینەوە. سەیربوو لام من نزیکی هەژدە ڕۆژ زیاتر لە ئامێزم گرتبوو، پێکەوە خەوتبووین، کەچی ئێستا وەک ئەوەی شەیتانە بەدکردارەکانی ناخم ئاگری خۆیان لە ژێر ڕۆحمدا جۆشدابێت، وەک ئەوەی نەمناسیبێت، لە ناکاو دیوارێکی ترسناک کەوتبووە نێوانمان، وەک سەردەمانێک کە ڕقم لێیبوو، وەک دەمێک باڵە درێژ و ئابڕوبەرەکانی هەستێکی سەنگین و خەفەکەریان پێ دەبەخشیم، ئێستا هەمان هەستی تووڕەیی دایدەگرتمەوە. دەنگێک لە ناخمدا دەیگووت مرۆڤ فریشتەیەکی وا بەد و مەلعونی بۆچییە، کە جگە لە لێڵکردنی ناخ کاری تری نییە. بولبولیار لە من زیاتر لەو نزیکبووەوە، ئەزموونی درێژی لەگەڵ فریشتەکاندا توانای ئەوەی دابوویە سڵ لەم گیاندارە باڵدارە ئاڵۆز و مەتەڵدارانە نەکات کە بوونیان بۆ من پرسیارێکی بێوەڵام بوو. دڵنیابووم فریشتەکەم بولبولیاری خۆشدەوێت، دڵنیابووم چەندین ساڵە ئەوە لە ژێرەوە هانمدەدا، جار دوای جار ببم بە قەڵغان و سوپەر بۆ ئەم پیاوە کە دەبوو سەردەمانێک لەوەوبەر، دەمێک شۆڕشگێڕە ڕادیکالەکان ڕیز لە دوای ڕیز بەرەو سەر پەتی سێدارە دەچوون، لە بن دارەکاندا تیرباران دەکران، لە ژوورەکانی ئەشکەنجەدا گیانیان لەدەستدەدا، لە پلانی خوێنینی هەڤاڵە شۆڕشگێڕەکاندا دەکوژران، بە ڕێگایەک لەوانە گیانی لەدەستبدایە ... بولبولیار وەک بزانێت ئەم بوونەوەرە باڵدارە «نەوەک من»، بەردەوام ئەوی ڕزگارکردوە، باوەشی پیاکرد. ساڵەهای ساڵ بوو هەر کاتێک بەجیدی منی نیگاکردبێت، ڕوانینی پڕبووە لە نەفرەت. بەڵام چاوانی ئێستا تەژیبوون لە سۆزی هاوڕێیەک کاتێک دوای چەندین ساڵ، هاوڕێیەکی دوور و دێرینی دەبینێت، هاوڕێیەک لە مێژە چاوەڕوانێتی، وەک ئەوەبوو ئەو هەموو ساڵە پەیوەندی خۆی بە منەوە

نەپچڕاندبێت، تا بگاتە ئەم ڕۆژە، بگاتە ساتێک جەوهەری من ڕوو بە ڕوو ببینێت، باوەش بەو بەشەی بوونمدا بکات کە لەگەڵ مندا ناتەبا و لەگەڵ ئەودا تەبایە.

لەو ساتەدا ترسێکم هەبوو کە ئیتر من و بولبولیار ببینە دوژمن، دووربکەوینەوە و چیتر پەیوەندیمان نەمێنێت. من ڕاستی دەڵێم، هەتا لە بەدترین ساتەکانی ڕەوشت و ڕەفتارمدا، هەتا کاتێک ناوم وەک یەکێک لە دڕندەکان کەوتە سەر زاران، هێشتا شتێک قووڵ لە ناخمدا بولبولیاری وەک تەنیا هاوڕێ سەیردەکرد... ڕاستە هێدی هێدی بەدترین ڕەفتارم لێ دەرکەوت، بەڵام هیچ کات ئەو هەستەم ون نەکردوە کە من هاوڕێیەکم هەیە ناوی بولبولیارە. ساڵانی داهاتوو، من و ئەو گەلەک ڕۆژگاری هەوراز و سەرولێژمان دەبێت، بەڵام لە بەدترین سەردەم و ڕۆژگاریشدا، زەمانێک وەک دڕندەیەک دەژیام و وەک جانەوەرێک بەرامبەر دونیا ڕەفتارمدەکرد، هەمیشە دەنگێکی قووڵ و بەهێز و پڕ ئاواز لە ناخمدا بانگیکردوە «هاوڕێم ... هاوڕێم بولبولیار».

من و وەفائیل پاش ئێستێکی زۆر درێژ باوەشێکی پڕ ترس و دوودڵیمان بەیەکداکرد. من وەک نەمەوێت درۆی لەگەڵ بکەم، دەستمکردە قسەکردن لەگەڵ فریشتەکەمدا. پێمگووت «وەفائیل، ئەم ناوە لە دەستکردی هاوڕێی هەرە ئازیزم بولبولیارە، دڵنیام تا لە من نزیک بیت و ڕۆژانە ئاگاداری دەروون و ڕەفتارم بیت ئازاری زۆرتر دەچێژیت، تۆ باشتر لە هەر کەسێکی تر من دەناسیت، من کەسێک نیم هیوای چاکبوونم لێبکرێت، کەسێک نیم ئومێدم بێت بتوانم لە ریشەوە خۆم بگۆڕم و بەوجۆرە بژیم تۆ دەتەوێت، من ئێستا خۆشحاڵم کە زیندوو و سەرەحاڵ دەتبینم، بەڵام من لەگەڵ فریشتەدا پێم ناکرێت. من پیاوێکی ئازادم، ئازادییەکەشم ریشەیەکی شەیتانی هەیە، لە بەرئەوە نازانم لە داهاتوودا من و تۆ چۆن پێکەوە دەیگوزەرێنین، دەزانم شتێکی زۆر لە تۆ لە ناخی مندا جێماوە، شتێکی زۆریش لە من لە تۆدا هەیە، نە مرۆڤی خالیس لەم دونیایەدا هەیە و نە فریشتەی خالیسیش، بەڵام ئێستا پێشنیارم ئەوەیە تۆ ماوەیەک لەگەڵ

بولبولیاردا بژیت، ئەو تاکە مەلەکناسێکە بیناسم و بزانم دەتوانێت ئەو کارە لە ئەستۆ بگرێت، تەنیا کەسێکە دەزانێت فریشتەکان دەبێت چی بکەن و چۆن بژین، من ئیشێکی زۆرم هەیە، وڵاتەکە سەراپای شڵەقاوە، ملیۆنەها خەڵک هەڵهاتوون، هیچ کەس نازانێت چارەنوسی مەملەکەتە داماوەکە بۆ کوێ دەچێت. دڵنیام گەر تۆ فریشتەیەکی باش بیت، دەزانیت من ئەرک و فەرمانێکی قورسم لەسەرە بۆ میللەت و وەتەن و سەرۆکەکانمی بکەم ... بتوانم لە ژێر باری هەر فەرمانێک دەرچم، ناتوانم ئێستا لە ژێر ئەو بارە بڕۆمەدەرێ، کە ئا لەم کارەساتە گەورەیەدا پشت لە حیزب و وڵاتەکە بکەم کە بە ڕاستی ڕۆژی میحنەتە و کاتی پیاوی مەردە، ئێستا خەڵکی پێویستیان بە دڵسۆزیی و وەفاداری هەیە، گەر خەبات بە درێژایی ئەم ساڵانە پێویست نەبووبێت، ئەوا لەم کاتەدا پێویستە و ناتوانم خۆمی لێ بدزمەوە».

دەمزانی باشترین شتێک بۆ هەمووممان ئەوەیە من لەم ئاژەڵە باڵدارە دووربم. هەم لەوە دەترسام بە جۆرێک شەیدابیم بمەوێت سەراپای ژیانم بۆ دۆستایەتی و هاودەمی ئەو تەرخانبکەم، هەم لەوە دەترسام نیازی کوشتنی بمخاتە سەر کەڵکەڵەیەکی بەد و شەوێک شێتانە بیخنکێنم و لاشەکەی وەک سەگ ڕابکێشم و لەتاریکیدا بیکەم بەژێر گڵەوە. بولبولیار بە وەزیفە و فەرمانی خۆی دەزانی ئەم فریشتەیە بگرێتە خۆی. لای ئەو، وەفائیل دواهەمین فریشتەی زیندووی دونیا بوو، دەیویست لە ڕێگای ئەوەوە سەر لەنوێ ڕێگایەکی نوێ بەرەو دونیای فریشتەکان پێکوڵبکات. چۆن من لەو ساتەدا بە فەرمانی خۆمم دەزانی بگەڕێمەوە ناو حیزب و سەیربکەم سەرۆکەکانم چ ئەرکێکم پێدەسپێرن، بولبولیاریش وەک خزمەتی فریشتەکان بە قەدەر و وەزیفەی ئەبەدیی خۆی بزانێت، چاوەڕوانی ئەوە بوو، من وەفائیلی پێشکەشبکەم و خۆی بۆ پاراستنی تەرخانبکات. من لە سەرەتاوە گوتم کە ئەو لەو شۆڕشگێڕانە بوو کە بە «خۆشەویستییەکی بێسنوورە بۆ تەواوی شتەکان، بۆ ڕەگەزی ئادەمیزاد، بۆ ئەو شتانەی شایستەی پاراستنن» کاریدەکرد. دڵنیابووم بولبولیار زۆر

پێویستی بەم فریشتەیەی منە تا بتوانێت مانایەک بە پاشەڕۆژی خۆی ببەخشێت و درێژە بەو جۆرە ژیانە تایبەتییەی بدات کە درێژکردنەوەی تادەهات سەختتر دەبوو. لە مێژوودا هەندێک سەردەم دێنەپێشێ، کەسانێک کە لە دەورو زەمانی تردا مانا و وەزیفەی بایەخداریان بووە، نرخ و بەهایەکی ڕاستەقینەیان نامێنێت، ئیتر ناچاردەبن بە زۆر لە پەراوێزی ژیان و لە کەناری ڕووداوە گەورەکاندا بۆ مانای بوونی خۆیان بگەڕێن، بولبولیار بۆ ئەوەی ئومێدێکی هەبێت و هەژاریی نەگاتە ئەو سنوورەی ڕۆحیشی خاڵیبکاتەوە، پێویستی بە شتێک هەبوو، دەیویست لە ناوەڕاستی ئەو کارەساتەدا شتێکی هەبێت بۆی بژی، لە وەفائیلیش بەنرختر شتێکی تری دەست نەدەکەوت.

لەو کاتەوەی بەرەو سنوور بەڕێکەوتین و دەستیکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی کەشتییە سووتاوەکە، تێگەیشتم ئەم پیاوە جارێکی تر ناتوانێت لە دونیای فریشتەکان بێتەدەرێ ... ئەوە تەنیا سەرمایەی ئەو بوو، تەنیا نهێنییەکی قوڵی بوو کە مانای بەبوونی دەبەخشی و لە ناکامی ڕزگاریدەکرد. ئەوکات بولبولیارم وەک نەخۆشێک بینی کە عاشقی دەردی خۆی بووە، خۆشم وەک نەخۆشێکی دی کە نایەوێت دان بە دەردی خۆیدا بنێت، وەفائیلیشم وەک خودی دەردەکە دەبینی.

ئەو ڕۆژە بەر لەوەی لە یەکتر جیابینەوە، بەر لەوەی هەر یەکەمان ڕێگای خۆی بگرێت، کە ساڵەهای ساڵ لە یەکدەترازێت و ناگاتەوە بە یەک، بولبولیار دەستی خستە ناو دەستمەوە و پێیگوتم «هەڤال، من ئەم فریشتەیە دەبەم، تکایە دوامان مەکەوە، ڕاومان مەنێ و سیخوڕەکانت مەخەرە دوامان و لێگەڕێ ئاسوودە ونببین... تکایە». ئەو قسەیە لەو ساتەدا بۆ من سەیربوو. ساڵانێک دواتر خۆشی باوەڕی وابوو ئەو قسانەی نامەنتیقی بوون و وەهابووە وەک ئیلهامێکی ناوەخت وشەکانی بخاتە زار. داواکەی لەو ساتەدا بێمانا هاتە گوێم، سەرسام سەیرمکرد و هیچم نەگووت، نە پەیمانم دایە، نە گووتم لە دووتان ناگەڕێم، نە هیچ بەڵێنێکی دیکەشم پێدا. چما لە ناو جەرگەی ئەو ڕەوەدا من دەمزانی دونیا بە چی

دەگات و دونیا چۆن تەواو دەبێت، تا لە مانای ئەم درەوشانەوە کتوپڕەی خەیاڵ تێبگەم کە ناکاو بەر دیدەی بولبولیاری ڕۆشندەکردەوە؟. ئەوان ئێوارەیەکی درەنگ بەرەو جێگایەکی نادیار بەڕێکەوتن و منیش بۆ ڕۆژی دوایی دەمە و بەیان، ئەو خانووە دێرین و ڕوخاوەم جێهێشت و دەستمکردە زیندەگییەکی نوێ. دەمی ماڵاوایی ئەوان دونیا ڕوو لە شەو بوو، بینیمن کەم کەم لە بەرچاو وندەبن و ڕەنگی خوێنینی خۆرئاوابوون لە خۆیدا دەیانخنکێنێت، گەرچی دڵی من پڕبوو لە پەژارە و گومان و پرسیاری گەورە، بەڵام کاتێک لە دواوە سەیرمدەکردن دەڕۆن و دووردەکەونەوە، نەدەکرا سەرسامی هێمنی و جوانیان نەبم. هەندێ سات هەیە جوانی دەگاتە ترۆپکی تەواوەتی خۆی، زۆربەی خەڵک دەمرن و جوانی لەو ترۆپکە مەزن و ناکۆتایەی خۆیدا نابینن. بەڵام کاتێک لەو ئێوارە فێنک و ئەفسوناوییەی بەهاردا، ئەو دوو بوونەوەرەم دەبینی هەنگاو بە هەنگاو لە تیشکە لازوردییەکانی پێش هاتنی شەودا نوقمدەبن، وەک جوانترین و خودایترین تابلۆ هاتنە بەرچاوم کە تا ئەوکات بە چاوانم دیبێتم.

## تاعوون

کە ئەزمێرا قسەکانی لەگەڵ شەفیق هروری کرد، سەلام باباجان بە پێچەوانەی ئەخلاقی خۆپارێز و شەرمنییەوە، کونجکۆڵی و گوێبزێوییەکی لە ناکاو پاڵی پێوەنا گوێ بنێت بە دەرگاکەوە و هەموو قسەکانی خانم و سەرنوسەرە ناودارەکەمان ببیستێت، دواتریش کە ئەزمێرا ماڵاواییکرد، گوێی لە هەموو تەلەفونەکەی سەرنوسەر بوو بۆ ئەنوەر پۆخان. سەلام سەرسام بوو، وەک هەر کەسێکی دی کە چیرۆکی گرتنی کەسێکی پرتاو ببیستێت، سەرەتا لە خۆی پرسی «دەبێت بۆ لیوایان گرتبێت؟». بەڵام پاش ئێستێک و کەمێک بیرکردنەوە، هەر لە خۆی پرسی «بۆ دەبێت لیوا

نەگیرێت؟ دەبێت چ سەرسامییەکی تێدا بێت لیوا بگیرێت؟ ئەوەی لیوای گرتووە پێماندەڵێت هیچ کەسێک نییە نەگیرێت، بەڵام گرتن و نەگرتنی لیوا چی لە دونیا دەگۆڕێت؟ هەتا گەر هەواڵەکەش بڵاوبکەنەوە چ ترسێکی تێدایە؟ کێ دەیخوێنێتەوە؟»». سەلام باباجان تەواو بڕوای بەوەبوو کە تاعوونی نەخوێندنەوە و یادچوونەوە بڵاوبۆتەوە. شەو کە گەڕایەوە بۆ ماڵ، شتێک لە خەیاڵیدا بوو ئەوەبوو، هەواڵەکە بنێرێت بۆ یەکێ لە پەیجەکانی ئینتەرنێت. بەڵام پاش ماوەیەک ڕای گۆڕی و گووتی جارێک بابوەستم، بزانم ڕۆژانی داهاتوو چی دەبێت. دوای بیرکردنەوەیەکی درێژ بڕیاریدا بۆ خۆی و بۆ هەمووانی بسەلمێنێت کە بە ڕاستی تاعوونێکی کوشندە بڵاوبۆتەوە، میللەتێک پێکڕا جگە لە کتێبی قوتابخانە هیچ کتێبێکی تر بەجیدی ناخوێنێتەوە، هیچ هەواڵێک نایجوڵێنێت. سەلام لە دڵی خۆیدا گووتی « تاکە خولیای ئەم خەڵکە بووە بەوەی خۆیان دەربخەن، سەردەمێکە مرۆڤ خۆی خستۆتە بازاڕێکی گەورەوە، تا تەنیا پڕوپاگەندەی پوچ بۆ خۆی بکات». لە دواکەوتنی بەردەوامی هەواڵی وەرزشەوە فێربووبوو کە یاریزانەکانیش یاری ناکەن، هەموو جوڵە و لێزانین و هەوڵیان جۆرێکە لە ڕیکلام کە پەیوەندی بە بەهرەوە نەماوە، تەواوی شتەکان لە سەرەتاوە تا کۆتایی نمایشن. هەستیکرد ڕقێکی بێسنووری لە وەرزشە، ئێستا وەک ڕووکاری پێشەوەی دونیای ساختەکار سەیریدەکرد. سەرەتا وەرزشی لە بەرئەوە حەز لێ بوو چونکە وایدەزانی هەموو کەسێک لە ناویدا تەنیا مافی ڕاستەقینەی خۆی وەردەگرێت، بەخت گەر ڕۆڵێکیشی هەبێت، ڕۆڵێکی سروشتی و جوانە. بەڵام دوای چەند ساڵێک کارکردن لەو بوارەدا ئێستا تێدەگات، وەرزش جگە لە نیشانەیەکی گەورەی دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لە سروشتی خۆی، جەستە لە حەقیقەتی خۆی، کێبڕکێ لە جوانی خۆی هیچی تر نییە. کە جۆش و خرۆشی خەڵکی دەبینی بۆ تیمێک لە وڵاتێکی تر، لە کیشوەرێکی دوور دەیزانی بەوە مرۆڤەکانی ئەم شارە نەبوونەتە هاوڵاتی جیهانی، نەبوونەتە بەشێک لەم ئەستێرەیە، بەڵکو بە هۆی هاتوهاوار و جۆشی یارییەوە ئەو تاعوونە بیر خۆیان دەبەنەوە کە تووشی بوون، تاعوونی بێئاگایی و یادچوونەوە،

نوقمبوونیان لە یاریدا بەڵگەبوو بۆ ئەوەی لێرە نین، نەوەک تەنیا لەم وڵاتە نین، بەڵکو لەم سەرزەمینە نین، بەڵگەبوو کە وەرزش کۆمەکیاندەکات جۆشێکی خێرای کتوپڕ بژین کە بۆ دوو تا سێ سات وادەخاتە خەیاڵیانەوە دەژین، شتێک هەیە لەگەڵ ئەوانی تردا کۆیاندەکاتەوە، تەنها نین. هەموو شتێکی ئەم دونیایە تەنیا هەڵچوون و جۆشی ڕوکەشە، زوو کەفدەکات و زوو دەنیشێتەوە. بەخۆی دەگووت «نیشتیمانی کەف، ڕووداوی کەف، مرۆڤی کەف». ئێستا هەستیدەکرد وەرزش و یاری بۆ ئەم دەروێشانەی کەف دەرفەتێکی ڕاستەقینەیە هەستی خۆیان بژین، چونکە ئەو هەستانەی وەرزش خۆی دەیانبەخشێت، هیچ نین جگە لە هەستی کەفئاسا. وەرزش درۆی ژیانێکی گەرمی پێشکەش بەم مرۆڤە داخراو و بەدبەختانە دەکرد کە ژیانیان وەک سەهۆڵ سارد بوو، تا بۆ ساتێک گەرمییەکی درۆزن بژین. نیگای ژیانێکی جوڵاوی دەبەخشی، ژیانێک کە شتێکی تێدایە باسیبکەن، بابەتێکی تێدایە لێی بدوێن، لە دونیایەکدا کە سەلام باباجان تا دەهات هەستیدەکرد خەڵکی هەر سەرگەرمییەکی خێرا و ڕاگوزەریان پێویستە و هیچی تر. بەخۆی گووت «تورەبوونە سیاسییەکانیشمان هەر کەفن، هەتا شۆڕشەکانیشمان گەر ڕووبدەن لەوانەیە هەر کەفێکی سپی بن». بیریکردەوە کە ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەن چییە جگە لە کەفێکی بێهودەی سپی کە حەفتانە لە تەشتی ئەم شارەوە سەردەکات، کەفێک خۆی وادەردەخات لە خوێن و گۆشت و ئێسکی ئەم شارەوە هاتۆتە دەرێ، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ نییە جگە لە هەندێک کەف و بڵق کە دەڕۆن و بە هەوادا دەچن و لە ئاوەڕۆ و زێرابی هەستی ئادەمیزادەکاندا وندەبن. گووتی «ئینسان هیچ کارێکی گرنگ و باشی نەماوە بیکات». سەلام باباجان دەیویست بۆ خۆی بسەلمێنێت کە تاعوون بڵاوبۆتەوە، ئەوە هەستێکی دڵتەزێن و خەفەکەربوو، بەڵام دەربازێکی نەبوو، وەک مۆتەکە سوارملی بووبوو. بە ئەسپایی و لە ژێر لێوییەوە گووتی «تاعوونی جاران باشتر بوو، خەڵکی دەیانبینی، ئەمجۆرە تاعوونانەی ئێستا ترسناکن، نابینرێن» . هەستیکرد خۆی یەکەمین کەسە هەست بە بڵاوبوونەوەی ئەو تاعوونە دەکات. دەبێت

شتێک بکات، شتێک دڵنیابێت تاعوونی وەها هەیە. ئێوارە بەر لەوەی بڕواتەوە بۆ ماڵێ، چوو بۆ بەشی ئەرشیف، لەوێ ژنێک بە ناوی نیشتیمان خان بەرپرسی ئەرشیفی ڕۆژنامەکە بوو، چەند جار سەلام بچووبایە بۆ ئەوێ دەیبینی لە جانتاکەی دەستیدا خەریکی دەرهێنان یان دانانەوەی کەرەستەیەکی مەکیاجکردنە، هەستێکی سەیری هەبوو کە ئەم ژنە هەمیشە یان لە سەرەتای مەکیاژکردن یان لە کۆتاییدایە. ژیانی لەو دووانە بەدەر نەبوو، قەیرە کچێک بوو لەوانەی چاوەڕوانی دووروودرێژی «بەختی باش» بەدبەختیان کردبوو، خوشکەکانی تری لە شوودا بە جۆرێک بەدبەخت و ناکام بوون ئەویان تووشی ترس و هەراسێکی ڕۆحی گەورە کردبوو. ڕەتکردنەوەی بۆ چەند داواکارێک تەنیا لە ڕووی ئەو ترس و هەراسانییەوە بوو، بەڵام ئێستا لەسەر لێواری ئەوەدا بوو ڕقی لە هەموو پیاوێک و لە هەموو دونیا بێت، بەتایبەتیش ڕقی لە باباجان بوو کە حەزی هەم لە خۆی و هەم لە ناوەکەی و هەم لە دەرکەوتنە کتوپڕ و بێهۆکانی نەبوو. سەلام بێئەوەی بۆی گرنگ بێت نیشتیمان خان چۆن بیری لێدەکاتەوە، داوای بەستەبەندی ڕۆژنامەکانی ئەو دوو ساڵ و نیوەی دوایی کرد و هەر خۆی بێئەوەی بوار بدات خانم لە جێگای خۆی هەستێت، هێمن لەسەر ڕەفەکان هەڵیگرتن و هاتەدەرێ... ڕەفتارێک ژنەکەی ئەرشیف هیچ کات خۆشی لێ نەدەهات. لەڕێگای گەڕانەوەدا بۆ ماڵەوە دەمێک لە ترافیکی شێت و بێڕەحمی شاردا گیریکرد، شتێک بیری لێدەکردەوە، ئەوەبوو چۆن بیسەلمێنێت تاعوون بڵاوبۆتەوە، چۆن خۆی لێبپارێزێت. ڕۆژنامەکانی بردەوە تا کەمێک بیانخوێنێتەوە و دڵنیابێت ئەم لەسەر هەقە. لە ماڵەوە کاتێک تەماشای ژمارە کۆنەکانی کرد، سەرسامبوو، هەموو ژمارەیەک چەند شتێکی دڵتەزێن و سەرسوڕهێن و ویژدانهەژێنی تێدا بوو، بەڵام هەموو شتەکان سارد و بێدەنگ و بێپرسیار ڕۆیشتبوون، لە نوسینی نوسەرە ناسراوەکانی ڕۆژنامەکەشدا بیروڕاگەلێکی خوێندەوە کە لە هەندێکیان تێنەدەگەیشت، کەچی ئەوەی تێیدەگەیشت سەرسامیکردبوو، سەیربوو لای ئەم قسانە بێکاردانەوە و بێ بەدواداچوونی تر لە شوێنی خۆیاندا مردوون. تا زیاتر بیخوێندبایەتەوە زیاتر

هەستیدەكرد وڵاتەكە لە بەستەڵەك و سەهۆڵبەندانێكی بە كاوە خۆدا نوقم بووە. شەو لەسەر جێگاكە گووتی هەزاران ساڵ لەمەوبەر چاغە سەهۆڵینەكان بەسەرچوون، ئێستا سەردەمێكی تر سەری هەڵداوە، سەهۆڵ بەندانێكی نوێ و لە جۆرێكی تر. دڵنیانەبوو ئەمە چ جۆرە بێهۆشییەكی نوێیە كە لە هەموو لایەكەوە دێت، دەیزانی ئێستا هەموو هوشیارانە بێهۆشن، ئەوە جیاوازی گەورەی ئەم سەردەمەیە لەگەڵ چاخ و ڕۆژگارەكانی تردا، لە سەردەمەكانی تردا مرۆڤ كەمتر ڕێگا و كەرەستەی لە بەردەستدا بوو بۆ ئاگاداربوون لە ئەوانی تر، بەڵام لەم سەردەمەدا مرۆڤ وەك لافاو كەرەستەی چاودێری ئەوانی تر دروستدەكات و كەچی لە هەمانكاتدا لەزەتێكی بێسنوور لە فەرامۆشكردن دەبینێت، بچوكبوونەوەی دونیا مەودای نێوان مرۆڤەكانی زۆر گەورەكردوە، تا دونیا بچوكتر بێتەوە مرۆڤ لە یەك دوور دەكەوێتەوە سەلام باباجان تا زیاتر بیریبكردایەتەوە زیاتر دەترسا، ئەو شەوە چەندجارێك چووە تەوالێتەكە، هەر كاتێك لە بیركردنەوە و دەرەنجامگیریدا بگەیشتبایە بونبەست، میزەڵدانی دەیخستە ژێر فشارێكی توندەوە، وەك ئەوەی هەموو فشارەكانی عەقڵی دواجار تەنیا لە ڕێگای خاڵیكردنەوە میزەڵدانییەوە هێور ببنەوە. «چۆن؟» سەلام لە خۆی پرسی «بۆ مرۆڤ لەیەككاتدا دەیەوێت هەم ببینێت و هەم خێراش هەموو شتێك لە یادبكات؟»، بەدەم میزكردنەوە بەدەستێكی چوكی گرتبوو و بە دەستەكەی تری سەریخوراند و بیریكردەوە و گووتی « دیارە، فزوڵی مرۆڤ بەهێزترە لە ئەخلاقی؟»، مرۆڤ دەیەوێت هەموو شتێك ببینێت، هەموو شتێك بزانێت، تەماشای ژیانی نهێنی ئەوانی تر بكات، ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و تەلەفون و هەموو شتەكان بۆ ئەوە لەوێن تا بەدیوێكدا ئەو خواستە تێربكەن، نەهاتوون ئینسان فێربكەن و زانیاری بدەنێ... مرۆڤ زانیاری ناوێت، بشیەوێت بۆ ماوەیەكی كاتی و ڕاگوزەر پێویستی پێیەتی، بەڵام نهێنی دەوێت، مرۆڤ تا نوقمیبكەیت لە نهێنی ئەوانی تردا تێر ناخوات ... مرۆڤ ئاژەڵێكی برسییە كە بەردەوام دەڵێت بمدەرێ، بمدەرێ، بمدەرێ... نهێنی ئەوانی ترم بدەرێ، ژیانیانم بۆ ئاشكرابكە، پێمبڵێ چی دەكەن، تا بتوانم پێیان

پێبکەنم، بەرزیانیکەمەوە، سووکایەتیان پێبکەم، بۆیان بگریم. مرۆڤ مەبەستێتی هەموو نهێنییەک بزانێت، تا ماوەیەک یاری پێ بکات و دواتر لە یادیبکات. دەیەوێت بە نهێنی ئەوانی تردا ڕۆچێت، سەیری بەرامبەرەکەی بکات و بڵێت «دەزانم خەریکی چیت»، بەو نیگایە بیترسێنێت و بیخاتە ژێر دەستی خۆی. بۆ ئێستێک سەیری میزەکەی خۆی کرد و بە بۆڵەیەک لە ژێر لێوییەوە، گووتی «ئێمەش لە ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەن، هەر ئەو کارە دەکەین». هەستیکرد ماوەیەکە ڕۆژنامەکە لە چاودێریکردنی دەوڵەتەوە بووە بە ئامێری چاودێری خەڵکانی سادە، تاوانبارە بچوکەکان، سۆزانییە بەستەزمانەکان کە لە برسا لەشیان دەفرۆشن، نەخۆشە دەروونییەکان. گرنگ ئەوەیە خوێنەران شتێک ببینن و نهێنییەکیان دەستبکەوێت کە خۆیان نایگەنێ.

کە سەلام باباجان لە تەوالێت گەڕایەوە، گلۆپەکانی داگیرساندەوە و بە وردی کەوتە سەیرکردنی ژمارەکانی ڕۆژنامەکە، لاپەڕە لاپەڕە... بیریکردەوە کە «عەزیزم وەتەن» بە گشتی، هەمووی بە سەریەکەوە بە جۆرێک داڕێژراوە مرۆڤ نەتوانێت لەسەر هیچ هەواڵێک یان تراژیدیایەک یان ڕووداوێک بوەستێت. بەڵام چار چییە؟ هەموو ڕۆژنامەکانی تریش وان، هەموو کەناڵەکانی دونیا وان، مرۆڤ بووە بە بوونەوەرێک کە دەیەوێت بۆ کورتە ساتێک حەقیقەت ببینێت و دواتر فەرامۆشیبکات. لەسەر جێگاکەی کەوت و بە دەنگی بەرز هاواریکرد «تاعوون ... تاعوون». پەتۆکەی دا بە خۆیدا و گووتی «هیچ کەس لە ڕۆژنامەکە و لە دونیادا ئاگای لە بڵاوبوونەوەی ئەم تاعوونە نییە. گەر منیش باسیبکەم و شتەکە بوروژێنم چی ڕوودەدات؟ ... هیچ ... چونکە ئەویش وەک هەواڵێکی ڕاگوزەر تێدەپەڕێت. خراپترین جۆری تاعوون ئەوەیە کە هەواڵی بڵاوبوونەوەی تاعوون خۆی سەرنجی کەس ڕاناکێشێت».

ئەو شەوە زۆر کەم خەوی لێکەوت، جارێکی تر لە ژێر پەتۆکەی هاتەدەر و چووەوە سەر ڕۆژنامەکان. دووبارە و چەندبارە هەندێک لە هەواڵەکانی خوێندەوە، هێندە لاپەڕەی هەڵدایەوە، چاوانی نیشتبوونە سەر ئاو و

ژانیاندەکرد. نزیکی دەمەوبەیان شەکەت و کەنەفتە لە جێگاکەدا بێهۆش کەوت، خەوێکی قووڵ و مردووئاسا لەگەڵ خۆیدا بۆ چەندین سەعات بردی، ڕۆژی دوایش درەنگ بەئاگاهاتەوە... زۆر درەنگ. خەواڵوو تەلەفونێکی بۆ ڕۆژنامەکە کرد و گووتی، هەندێک ئیشی تایبەتی هەیە و ناتوانێت تا چەند سەعاتێکی تر بێتە سەر کار. ماوەیەکی درێژ کەمهۆش و بێتین لە جێگاکەدا بوو، سەیربوو بەلایەوە هیچ شتێکی شەوی یاد نەمابوو، وەک ئەوەی هەموو دوێنێی ڕۆژێکی سپی بووبێت، بیری بوو بە درێژایی شەو هەواڵی سەیر و عاجباتی لە ڕۆژنامەکەدا خوێندۆتەوە، بیری بوو لەگەڵ خۆیدا باسی لە بڵاوبوونەوەی تاعوونی لە یادچوونەوە کردوە، بەڵام لەوانە زیاتر هیچی دی لە بیرنەبوو. سەرەتا خۆی ڕاوەشاند و وایدەزانی ئەوە هەستێکی تێپەڕ و کاتییە، بەڵام نا... دوای نیوسەعاتی تریش لە جێگاکەدا مایەوە و خەیاڵی خۆی فشاردا و مێشکی خۆی گووشی تا چیرۆکێک لە چیرۆکەکانی شەوی بیربکەوێتەوە، بەڵام ئەستەم بوو... هیچ شتێکی ئەوتۆ وردی یادنەبوو شایەنی باس بێت... هیچ شتێک.

## زانستی ئارایشتی موتڵەق

ئەو ڕاستییەی هەموو سەردەمێکی نوێ پێویستی بە ڕوخسارێکی نوێ هەیە، هێشتا تەواو لای من نەچەسپیبوو. قسەیەک بوو لە قسە زۆرەکان کە بەردەوام دەکرا، دەکرا ڕاست بێت و دەکرا هەڵەش بێت. ساڵانێک دواتر کە بیرم لێکردەوە، بەخۆم گووت سەردەمێک باهیری ئەو کارەی ئەنجامدەدا، من لە تەپوتۆزی جەنگ و لە سەردەمی جۆشی شۆڕشگێڕانەدا بووم. هێشتا ڕوون نەبوو ئێمەی پێشمەرگەی دێرین و شۆڕشگێڕانی خەباتی ژێرزەمینی، بۆ ئەبەد دەسەڵاتی شارەکان دەگرێنە دەست و دەمێنینەوە یاخود نا. زۆر کەس لەو باوەڕەدا بوون پاشەکشەی سوپا

تەکتیکی و بۆ مەبەستی خۆ کۆکردنەوە و زەمینەسازییە تا لە هەل و دەرفەتێکی گونجاودا دووبارە لەشکرکێشی گەورە ئەنجامبدەنەوە. ئەودەم پڕ بە دڵ حەزمدەکرد سەرۆک ببینم، حەزمدەکرد لێیپرسم بزانم ئەمریکایی و ئەوروپییەکان چی بەڵێنێکیان داوەتێ. خوالێیخۆش بێت، شتێکی زۆر گرنگی بۆ ئێمە ئاشکرا نەدەکرد، بیویستبایە شتێکی گرنگ بڵێت بە پەیامنێر و ڕۆژنامەنوسە بیانییەکانی دەگووت، نەوەک بە هەڤاڵانی نزیکی خۆی، هەتا ئەندامانی بیرۆی سیاسی حیزبیش لەوەدا لە ئێمە بەخت و نێوچاوانیان زیاتر نەبوو. جێگرەکانی خۆشی هەر هەواڵە گرنگەکانیان لە زاری ڕۆژنامەنوسە بیانییەکانەوە دەبیست. خودا لە گوناهی ببورێت، زۆر کەیفی بەوە دەهات بێگانان ببینێت. کەیفی بە هەموو میللەتێک دەهات کورد نەبێت، هەر خەڵکی ئەم دەڤەرە نەبا و زمانی دایکی کوردی نەبا، ئەو کەیفی پێدەکرد. دواتر کە ئەمریکاییەکان پلەوپایەیان بەرزکردەوە، ئەوەیان لێ قەدەغەکرد هەر کەس و ناکەسێک ببینێت، ئەوە بوو بە مەراقی گەورەی ژیانی. بەتایبەت لە ساڵانی دواییدا وەک دەمبیست نەخۆشییەکەی تادەهات کاریگەرتر دەبوو، ئەوەی لە هەموو جێگایەک و لە نزیک هەموو کوردێکەوە هەستی بە بۆیەکی ناخۆشدەکرد، ئازاری دەدا. گرفتی گەورەی ژیانی ئەوەبوو کە تەنیا کوردان خۆشیان لێدەهات و دەیانکرا ببنە پارێزەر و پاسەوانی. بەڵام بۆی ئێمە هێڵنجی پێدەدا و دەیخستە سەر ڕشانەوە. ئیتر بە دەستەسرێکی هەمیشەییەوە لە بەر لووتیدا پێشوازی لە ئەندامانی بیرۆی سیاسی و هەوادارانی حیزبیش دەکرد. من لە ساڵانی دواییدا تەواو لێی دابرابووم، هەر هەوڵێکم دەدا بچمە دیداری و شکایەتی حاڵی خۆمی ببەمە لا نەیاندەهێشت و دەستم بە دەرگای جەنابیدا نەدەگەیشت. هەڵبەت شتەکان هەمووی بە دەست خۆی بوون، هەر کات بیگوتبایە «جەنگیز ئەو قووندەرە بێننە کنم» دەبوو بچم، بەڵام گەر بیگووتبایە وای جەنگیزی باوەحیز، سەگی سەگ باوک، قەسەم بە خەتمی کەلام پێ نانێیتە بەر قاپی ژووری بابی خۆت، ئیتر هێز نەبوو بتوانێت بە دووری دە کیلۆمەتریش من لە نیشتەجێی ئەو نزیکبخاتەوە. بیستبووم تەنیا «ڕەحیمە خان» ـی خێزانی و «نەغەدە

ماردینی»، بێ پەرۆی بەر لووت پێشوازیدەکات. بەڵام گۆڕی پڕ لە نور بێت، بۆ بێگانەکان وانەبوو، دەڵێن خۆشترین و بەسەفاترین کاتی ئەو دەمانەبووە کە پێشوازی لە هەیئەتە دیپلۆماتییەکان دەکرد، هەرکات سیاسەتمەدارە تورکەکان و برا ئێرانییەکانمانی لە سوپای پاسداران دەبینی، دەڵێن توند نووساندوونی بە خۆیەوە و گووتوویێتی «وای بابە گیان. لەو بۆنە خۆشەتان».

من بارودۆخ هەرچۆنێک بایە، سەرۆک ڕازیبایە یاخود نا، باهیریم بۆ گرنگ نەبوو. زانستی ئارایشتی موتڵەق دەیترساندم، بەڵام مل نەدانم بۆ باری ئەو نەشتەرکاری و جوانسازییەی باهیری، ئاسەوارەکانیساڵ دوای ساڵ لە ژیانی مندا دەرکەوتن. من ئەو سەردەمە لۆژیک و تێفکرینی ئارایشتی موتڵەقم بەلاوە نامۆ و ناشۆڕشگێڕانە بوو، بە ڕوونی بە لیڤیتانتم گووت کە تاوەکو مەترسی گەورە مابێت، نابێت هەستبکەین سەردەمی نوێ بە ڕێگاوەیە. بەڵام بەردەوام لە بیرۆی سەرۆکەوە دەنگۆی شتی گرنگ دەهات و هەڤاڵانی تر دەیانگووت ژیانمان سەرلەبەر دەگۆڕێت و سەردەمێکی تازە وا لە بەر دەرگای ژیانماندا. ئەو کات جەنابی سەرۆک کە لە سەفەر گەڕاپەوە، هەمووان دەیانگووت «مژدەی خۆشی هێناوە، قەولی لە ئەمریکییەکان وەرگرتووە دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنێت»، بەڵام من دەمزانی ئەوە چ کڵاو لەسەر نان و دەستبرییەکە، ئەوەتەی دوو گوێم لێرواوە، هەر سەرۆک بۆ پشکنینی مایەسیری یان پڕکردنەوەی دانێکی کلۆر چووبێتە دەرەوە، گووتوویانە سەرۆک دێتەوە و بەیاننامەی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی دەخوێنێتەوە. ئەوجۆرە درۆیانە دەهری و بێتاقەتیان دەکردم، وەک سەدان هەزار کوردی تر باوەڕم بەوە نەبوو عەرەبەکان لێمانگەڕێن قوون لەسەر خاک و ئاوی خۆمان دابنێین. ڕاموابوو نادەکرێت هێز کۆبکەینەوە، چەک زەخیرەبکەین، دەزگای ئەمنییەت بەهێزبکەین. لەبەر ئەوە هەر لە سەرەتاوە ڕاموابوو نابێت جلی پێشمەرگە دابکەنین، نابێت هەڵبژاردن و ترۆهاتی تر ڕێکبخەین، ئەوەش لە پێشچاوی هەندێ کردمی بە کەسێکی دواکەوتوو و کۆنەمەیل، کەسێک نایەوێت تۆزی

هەشتاکان لە خۆی بتەکێنێت. من ئامادەنەبووم هیچ جۆرە گۆڕانکارییەکی گەورەی ترم بەسەردا بێت، پێمداگرت و گووتم لە شاربین یان شاخ پێشمەرگایەتی بەردەوامە، چواردەوەری کوردستان دوژمن تەنیوێتی، گەر بێخەیاڵ بین و ناتەیار دەربکەوین دەمانخۆن و دەبینە پووشی دەم با. وەک جاران دەستێک جلی کوردی کەتافییەداری بۆر و تا ئەندازەیەک شلەپەتم لەبەردەکرد، سەرم بەردەوام زلتر و گۆشتن دەبوو، یەکێک نەیناسیبام بە خاوەن دوکانێکی سەوزەفرۆشی دەزانیم، کە براکەی پێشمەرگەیە و جلی ئەوی لەبەرکردوە. لە سیاسەتمەدار و بەرپرس نەدەچووم، بەڵکو ڕوخسارێکی تا بڵێی بازاڕیانەم هەبوو، بەردەوام پشتێنم شل و ڕانکم دادەکەوت. ئەو ناگورجی و هەڵوەشانەم ڕێگر نەبوون هەمووان لە ئەنجومەنی باڵا و بیرۆی سیاسی من بە تەنیا کەس بزانن کاروباری ئەمنییەتم بدەنە دەست. ڕۆژێکی باراناویی پاییز، سەرۆک دواجار ناردی بەدوامدا و لە بەردەرگاوە بە تووڕەیی و ترشی پێشوازی لێکردم، بێئەوەی بهێڵێت من دەمبکەمەوە، گووتی «کورم، ئەوە چۆن دەبێتن، مەملەکەتێ بەو حەزەمەتە کۆتیە بندەسمان و ئەمن و تۆ، وەک تەرسی بنی کەران و قشپلی ژێر کلکی بزنۆکێ، لێرە لێیکەتینە... هەسە هەسە، ئەمن ئەمنم دەوێ. هەمی وەکی تەڕاحی بکەوین لە کێندەر ڕۆژ دەبێتەوە». سەرۆک زۆر پەلەی بوو، لە شاردا دەزگایەکی ئەمنی بەهێز دابمەزرێنم، پەلەی بوو حیزب بۆ خۆی ببێتە چاوێکی چاودێری گەورە، تووڕەبوو لەوەی سەربەخۆ کارم نەگرتۆتە دەستی خۆم و هەموو تەنیا چاوەڕوانی دەمی ئەوین، گووتی «برو.. برووو... لە منەوە هەموو دەسەلاتێکت هەیە، کلکی کێهان دەبری ببیرە. دەی ئەوە من پشت و پێشی عالەمت دەنێمە بن دەست، ئەوە عەرزیی و ئەوە گەزیی، با ببینم و شانوشەوکەوتی خۆتم لۆ دەرخە». ئەوە سەرەتای بەرزبوونەوە ئەفسانەییەکانی من بوو کە نزیکی دە ساڵی ڕەبەق و زیاتریش دەخایەنێت بەر لەوەی هێدی هێدی هێڵی نگینم دابەزێت و لە مەخزەنی حیزبدا کۆتاییم بێت.

دەمێک من پێشنیارەکەی باهیریم ڕەتکردەوە نەمدەزانی لە داهاتووی دووردا کاریگەرییەکی وەها گەورەی لەسەرم دەبێت، باهیری لام ترسناک بوو، هەتا زۆر شەو خەوم پێوە دەبینی، وەک نەشتەرکارێک دەهاتە بەرچاوم بیەوێت بە زۆر ماسکێکی ئاسنین بخاتە سەر سەرم کە ئیتر هیچ هێزێک نەتوانێت دایبماڵێت، کە بیرم لێدەکردەوە دەکەوتم بەسەر ڕاستییەکی ترسناکدا، حیزب جاران کار و خەباتی لێمان دەویست، ئێستا ڕوخساری لێمان دەوێت. دواتر باهیری بە جۆرێکی سەیر بازاڕی گەرم بوو. لەو سەردەمەدا بەشی هەرەزۆری کادێرەکانی سەردەمی شاخ، چوونە «ئەکادیمیای زامو» و لەوێ کۆرسی درێژیان بڕی. نازانم بۆچی لە ناکاو باهیری وشەی «ئەکادیمیای» بە سەنتەرەکەیەوە لکاند، بەڵام خودی وشەکە کاریگەرییەکی پۆزەتیڤی هەبوو، وایکرد کادێرە باڵاکانی حیزب ژنەکانیشیان بنێرن، کە ئەودەم ئیدی هەموو بە جل و مەکیاجی تازەوە دەردەکەوتن و بە نازێکەوە دەیانگووت لە «ئەکادیمیا» دەوامدەکەین. بەشی هەرە زۆری هەڤاڵانی ئێمە لە ژێر دەستی باهیریدا ڕوخسارێکی دیکەیان وەرگرت. ئەو ماوەیە تێڕوانینی باهیری و هونەریشی بۆ ئامادەکردن و پێگەیاندنی کادێرانی تازە بۆ سەردەمی تازە، ئاسۆی نوێی بەخۆیەوە بینی. لە ساڵانی دواتردا، ئەکادیمیاکەی باهیری جێگای زۆر شتی گرنگی لە ژیانی سیاسی ئێمەدا گرتەوە، هەر بۆشاییەک کەمی ئایدۆلۆژیا و ئەخلاق دروستیانکردبوو، ئارایشتگای باهیری پڕیدەکردەوە. هەموو بە جۆرێکی شێتانە ڕوویانکردە کۆرسەکانی ئەو، من و هەڤاڵ شێرخان و هەندێک کادێری دیکەی عەسکەریی نەبێت. شێرخان لە چیا چۆن بوو، لە شاردا وەک خۆی مایەوە، وەک جاران جلی دەپۆشی، وەک جاران مۆن و گرژ بوو، هەمیشە بۆنی دەمی دەهات، پشیلەی دەکوشت، کۆمەڵێک سۆزانی نهێنی خۆشی هەبوو شەوان بەڕیز دەچووە ماڵیان و سواریان دەبوو.

لە ئەکادیمیا، سیاسییەکان سەرلەنوێ بە وردی فێری ئەوە دەکران لە ژیانی شاردا چۆن ڕەفتاربکەن، لە نینۆککردنەوە فێردەکرانەوە تا دەگاتە

چۆنێتی لە پێکردنی گۆرەویی و هەڵگرتنی تەلەفون و شێوەی سڵاوکردن و زەردەخەنەگرتن، باهیری لە ئێران و لوبنانەوە هەندێک خەڵکی شارەزای هێنا تا هەندێک لە بەرپرسە زۆر بەرزەکان، ئەوانەی تەماحیان لە پەرلەمان یان وەزارەت یان بەرزتر بوو، فێری ئەتەکێتی نانخواردن و بەکارهێنانی کەوچک و چەتاڵ و چۆنێتی دانانی دەسرەی بەربەرۆک بکات. باهیری هێدی هێدی لەو ڕێگایەوە تادەهات بازرگانیی خۆی گەورەتر دەکرد و وەک زانیم لەگەڵ لیڤیتانت و بەرپرسێکی باڵای تردا ڕێکەوتن کە هەموو ئەو شتانەی باهیری دەیەوێت، کاڵای تایبەت بێت و زۆرینەشیان شتگەلێک بن لە بازاڕی ناوخۆدا نەبن. لیڤیتانت سەرەتا بە دامەزراندنی کۆمپانیایەکی هاوردنی جل و قوماشی ئینگلیزی دەستی پێکرد. باهیری جۆری کاڵا و قوماشەکانی دیاریدەکرد و لیڤیتانتیش دەیخستنە بازاڕەوە، لەو دەمەوە ئەو نەریتە کەوتەوە کە زۆربەی پیاوانی پارەدار، دەسەڵاتداران، کەسانی سەر بە حکومەت، هەموو یەکجۆر جل و بەرگیان دەپۆشی، بوونە هەڵگری یەک شێوازی خواردن و ڕۆیشتن و خۆگۆڕین و قسەکردن. دەمێک کەناڵە تەلەفزیونییە کوردییەکان کەوتنە کار، خەڵکانێکی زۆر سەریان لەوە سوڕما کە سیاسییەکانی کورد، هێندە لە یەکتر دەچن، مرۆڤ وادەزانێت هەموو یەک نیگارکێشی نەزان دروستیکردون، لێکچوونیان تەنیا تایبەت نەبوو بە بیرکردنەوە و وشەسازی و شێوەی گوزارشت لە خۆکردن، بەڵکو دەگەیشتە هەڵبژاردنی شێوەی دەستەسڕ و ژمارەی قۆپچەکانی سەر کراس و ڕەنگی تەزبێح و شێوەی پژمە و کۆکەکردنیش. ساڵی نەوەدوچوار کە شەڕی ناوخۆ دەستیپێکرد، بازرگانی باهیری و لیڤیتانت گەشەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی بوو، باهیری خەڵکێکی زۆری لە کۆرسە عاجباتییەکانی خۆی خزاندبوو، زۆربەیان خەڵکانێک بوون دەیانویست لە داهاتوودا ببن بە پلەدار، هەڵبەت ژنانێکیشی تێدا بوو دەیانویست ببن بە گۆرانیبێژ، بە بێژەری تەلەفزیۆن، بە پەرلەمانتار، بەڵام زۆرینە هەر ئەو پیاوانە بوون کە چاویان لە پلە و پایەی بەرزی داهاتوو بوو. مانەوەی من وەک خۆم، سەرەتا خزمەتیکردم تا لە بەرچاوی عەوامی خەڵک «کە هێشتا ترسیان لە گەڕانەوەی

فاشیستەکان هەبوو» وەک کەسێک دەریکەوم کە نەگۆڕاوم. ساڵانی شەڕی ناوخۆ، باهیری ئەکادیمیاکەی دانەخست و بەشداربووانیشی نەهاتنە کزی. دەستە دەستە دەموچاوی تازەی بۆ ژن و پیاوان دروستدەکرد تا لەم ڕۆژگارە نوێیانەدا توانای دەرکەوتن و حوکمڕانیان هەبێت، ڕۆژانی جەنگ سروشتی وانەکان بۆ هەندێک کەس گۆڕانکاری قووڵی بەسەردا هات، بەڵام بۆ کەسانێک کە ژیانی مەدەنی نیاز و ئاواتیان بوو، پرۆگرامە چڕ و داڕێژراوەکانی باهیری هەر لە جێگای خۆیدا بوون. لیڤیتانت لەو دەمەدا هێدی هێدی کەوتبووە ئیشکردن لە بورجدا، زۆر ڕۆژ خەڵک دەیانبینی دەچێتە سەر جێگای بیناکە و تەنیا سەیریدەکات و بیردەکاتەوە، هەندێ ڕۆژیش گروپێک کرێکاران دەردەکەوتن و دەچوونە ناو بیناکەوە و لە دەوروبەری کەمێک خۆیان سەرقاڵدەکرد و دەڕۆیشتن. ئیشەکانی لیڤیتانت لەسەر بناغەکانی بورج سەرەتا سەرنجی کەسی ڕانەکێشا، بەڵام وەک خۆی قسەی بۆ من دەکرد، هیوایەکی گەورەی هەبوو ئەو بینایە بگەیێنێتە جێگایەک مرۆڤ لەوێوە گەر دووربینی باشی هەبێت کەنارەکانی دەریا ببینێت. هەرجارێک داوەتی لیڤیتانت بووبم باسی بورجی بۆ کردوم، هەر کاتێک ئەو دەستیبکردایە بە باسی بورج، من نیگایەکی نەغەدە ماردینیشم دەکرد و دەمویست بزانم ئەو سەرنجی چییە. بەڵام لە هەمووی سەیرتر بۆ من خودی نەغەدە ماردینی بوو کە بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی منەوە، خۆی تێکەڵ بە کۆرسەکانی باهیری کردبوو، چوست و چالاکیش لە هەموو وانەکانی ئەکادیمیادا ئامادەبوو. دواتر نەغەدە زۆر گۆڕا، بە جۆرێک ئەوانەی دەیانناسی، تێگەیشتن هونەری باهیری لە دوورخستنەوەی مرۆڤدا لە شێوەی خۆی چ ترسناک و کاریگەرە. هونەرێک وردە وردە بۆ من دەبێتە ترسناکترین هونەرێک تا ئەوکات بینیبێتم.

## لە ناو وێرانەی کەشتیدا

دوای گەڕانەوەی خەڵک لە ڕەوەکە، گەرچی هێزەکانی دەوڵەت نزیکی شەش مانگێک لە شاردا مانەوە، بەڵام ئەو کاتە و دواتریش قۆناغێکی پاشاگەردانی دەستیپێکرد. سەردەمێک هەم جوانییەکانی ئازادی و هەم مەترسییەکانی تەواو دەبینران. گومان لەوەدا نییە کە خەڵکی پێکڕا ڕقێکی قووڵیان لە فاشیستە عەرەبەکان بوو. هەموو ئامادەبوون ئازادی بگۆڕنەوە بە نان، دەتوانم بڵێم، هیچ کات ڕێناکەوێت میللەتێک هەمووی لەسەر شتێک بەوجۆرە تەبابێت، بەڵام سەر سفرەش حوکمی خۆی هەیە. چەند ئادەمیزادەکان سووربن ئازادی بگۆڕنەوە بە نان، بەڵام دوای چەند ژەمێک برسێتی ڕاستەقینە، مرۆڤەکان دەبێت لەو هەوای جۆش و حەماسەتە بێنە دەرێ و بۆ ژەمە خواردنێکی باش بگەڕێن. خەڵکی کە دەڵێن ئازادی گرنگترە لە نان، مەبەستیان هەم ئازادی زۆر و هەم نانی زۆرە، نەوەک ئازادییەکی کەمیان هەبێت یان هیچ نەخۆن و زاد لە سەر سفرەیان نەبێت. چونکە هەموو دەزانن کەسانی مردوو ئازادیان پێویست نییە، دەبێت هیچ نەبێت بەشی ئەوە زیندووبن بتوانن شانازی بەوەوە بکەن کە جارێک توانیویانە و شەهامەتی ئەوەیان بووە نان ببەخشن و ئازادی وەدەستبهێنن. بەڵام گەر کەسێک ناچاربێت دەستبەرداری تەواوی ڕزقی گەنجینەکراوی بێت، دواجار ناچارە بۆ تیکەیەک نان لە ماڵ بێتەدەرێ و هەموو چەشنێکی بەدکاری و تاڵانی و دزی بکات. لەو سەردەمەدا خەڵکانێک بە تاڵانی زۆر دەوڵەمەندبوون، بەڵام خەڵکانێکی تریش لە بەر برسێتی زۆر، شەوان دەمامکیان دەبەست و بۆ شەوکوت دەهاتنە دەرێ ... بە گشتی ڕۆژگارێک هاتە پێشێ مرۆڤ لە ژیانی خۆی زۆر دڵنیانەبوو، چەندەها باندی دزی دەرکەوتن کە بە ڕۆژی نیوەڕۆ

دەچوونە سەر ماڵان و لە ژێر هەڕەشەی دەمانچەدا ئاڵتون و پارە و شتی گرانبەهایان دەپێچایەوە. باندێکی دزیش دەرکەوت جگە لە ئارد هیچی تری نەدەدزی. بۆیە گەر شەو مرۆڤ بە کۆڵانێکی تاریکدا بڕۆشتبایە و هەستیبکردایە کەسانێکی نەناس لێی نزیکدەبنەوە، جگە لەوەی دووقاچی تر قەرزبکات و بە خێرایی باو بروسکە لەو جێگایە دووربکەوێتەوە ڕێگایەکی تری لەبەردەمدا نەبوو.

بولبولیار لەو کاتەوەی لەگەڵ وەفائیلی فریشتەدا گەڕابووەوە بۆ شار، لە ژێر زەمینی ماڵی هاوڕێیەکیدا لە غەمپاشا نیشتەجێ بوو و لەسەر ئەو خواردنانەش دەژیا کە ڕێکخراوە بێیانییەکان دەیان بەشییەوە. ئارەزوویەکی سەیری تێدابوو وەفائیل بەرێت بۆ کۆشکە سووتاوەکە، دەیویست لەوێ ژوورێک چاکبکات و بچێتەوە سەر رەوتی زیندەگی جاران، دەیویست شەو و ڕۆژ لەوێ بێت بزانێت چی ڕوودەدات، بزانێت ڕێزان دەگەڕێتەوە. ئەو ڕۆژەی هاتەوە بۆ شار، بۆ بەیانی سەرێکی لە قوتابخانەکەی ڕێزان داو پرسی ئاخۆ دەربارەی خانمی مەلەکبین هیچ دەزانن. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە و هەموو مامۆستاکان سەرسامانە پێیانگووت کە «ست ڕێزان» لە پێش ڕەوەکەوە بە دوو هەفتە نەهاتووە و کەس سەروسۆراغی نازانێت و ماڵ و نیشتەجێکەشی سووتاوە و کەس هەواڵی لە مان و نەمانی نییە. هەر ئەو ڕۆژە ترسێکی نادیار بولبولیاری لە وێرانەی کەشتییە سووتاوەکە دوورخستەوە. هەمیشە شتێک بەرەو ئەوێی دەبرد و بەڵام بەر لەوەی لێی نزیک ببێتەوە، هێزێک پەشیمانیدەکردەوە و وەردەگەڕا و دەگەڕایەوە. دە شەو بەسەر گەڕانەوەیدا تێپەڕی، بێئەوەی جورئەتی ئەوەی هەبێت بچێتە بەر دەرگای کەشتییەکە، دە شەو بەردەوام دەیویست بڕوات و ترسێک دەیبردەوە دواوە. ترسێک وەک ئەوەی بچێتە سەر گۆڕی کەسێکی نزیک و ترسی ئەوەی هەبێت مردووەکە هێندەی ئەو ببینێت بە کفنەکەوە گۆڕ بدڕێت و هەستێت و بکەوێتە دوای. ترسێک بوو لەوەی تارمایی هەموو فریشتە سووتاوەکان پەلاماریبدەن، وەک خۆی بە گوناهباری گەورە بزانێت لە

نغرۆبوونی کەشتییەکەدا، لە یازدەهەمین شەودا تینێکی گەورەی دایە خۆی و چی ئیرادەیەکی نهێنی هەبوو خستییە کار و بە کۆمەڵێک هەنگاوی جێگر و نەگۆڕ، وەک کەسێک لەدڵەوە بڕیاری بۆ جەنگی مان و نەمان دابێت، بەرەو سووتماوەی کەشتییەکە ڕۆیشت. لەگەڵ هەموو هێز و جورئەتێکدا، هێشتا ئەو ترسە لەدڵیدا بوو کە ئارامی لێ زەوتکردبوو، ترسی کەسێک دەرگای تونێلێکی تاریک دەکاتەوە و دەزانێت لە پشت ئەو دەرگایەوە شتی ترسناک خۆی حەشارداوە. لە نزیکی سەعات هەشتی شەودا گەیشتە بەر دەرگای دەرەوەی کەشتییەکە، پێدەچوو لەو کاتەوەی جێگاکە گڕیگرتووە دەرگاکەی کراوە بووبێت. بە نەرمی پاڵێکی پێوە ناو گوێی لێبوو جانەوەرێکی بچوک لەودیوەوە هەڵدێت، دەرگاکە زۆر سووک کرایەوە، جیرەیەکی سامناک و درێژی لێوەهات، دیاربوو ئەو ماوەیە با هێندەی هێناوە و بردووە، ڕایەڵە ئاسنینەکانی سواون و ئاسان دەسوڕێنەوە. یەکەم شەوی هاتەوە یاد کە مەهدائیل باسی ئەم دەرگایە و کلیلەکانی بۆ کرد. ئەو کلیل بە دەستی کەشتییەکە بوو، ئەوەی کلیلەکانی ئەم دەرگایەی لە دەستدا بوو شانازی هەرە گەورەی ژیانی مەهدائیل بوو. بولبولیار دەیزانی بەهرە و کەرەستەی پشکنینی قووڵی پێ نییە، کاراکتەرێک نییە هێزێکی پشکنینی پۆلیسانەی هەبێت، دەیزانی گەر شتێکی ڕوون نەیەتە بەردەستی لە ناو چیرۆک و سەرەداوە جیاوازەکاندا وندەبێت. بە ترسێکەوە هەنگاوی یەکەمی نایە ئەو دیو دەرگاکەوە، هەستیکرد دەوروبەری کەشتییەکە و باغەکانی بەردەمی لە جاران گەورەتر دیارن. لە دڵی خۆیدا گووتی «هەموو خاکێکی وێران، بەرین و فراوانتر لە شوێن و زەمینی ئاوەدان دەردەکەوێت». دوای چەند هەنگاوێک وەستا و هەستیکرد بۆنی سووتان دەچێت بە سەریدا. ئەوە هەستێکی غەمگینی پێبەخشی، وایدەزانی ئەو بارانە زۆرەی بەسەر ئەم جێگایەدا باریوە بۆ سووتانەکەی بردبێت، کەچی ئەوەتا ئێستاش ئەو بۆنە وەک خۆی دێتەوە بە سەریدا. گەرچی تاریکبوو، بەڵام هەندێ لە درەختەکان بەحوکمی بارانی زۆری ئەو بەهارە، خێرا و شێتانە سەوزبووبوون... لە تاریکیدا بۆنی گەڵا نوێکانی کرد، بۆنی ئەوەی کرد باغچەکە بێباک لە مرۆڤ و

فریشتەکان، مێژووی هەمیشەیی خۆی دەژی. سەیری لە هێزی ئەفسوناوی مرۆڤ هات، لە یەککاتدا دەیتوانی بۆنی کۆشکە سووتاوەکەش و بۆنی بەهاری شێتووێتی سەر درەختەکانیش بکات. بە هێمنی بە ناو درەختەکاندا ڕۆیشت و بەر لەوەی ڕووبکاتە کۆشکەکە، لایەکی بەلای گۆڕستانی فریشتەکاندا کردەوە، لەویادا لایتە دەستییەکەی دەرهێنا و گرتییە گۆڕەکان. سەیری لێهات کە بینی زۆر لە کێلەکان شکاون، ئاشکرا کەسێک بە پیکێکی گەورەی بەرد شکاندن چەندین کێلی شکاندبوو... بولبولیار بە ترسێکەوە لە هەندێک لە کێلە شکاوەکان نزیک بووەوە، دیاربوو دەستێکی توڕە هەوڵیدابوو وەک گەرداوێکی شێت گۆڕەکان هەڵبکەنێت و ئاسەواریان لەسەر زەوی بسڕێتەوە. ئەو کێلانەی نەشکابوون، بۆیەیەکی خەستیان بەسەردا ڕژابوو، بە جۆرێک ناو و یادەوەرییەکان نەخوێنرێنەوە. بینینی دیمەنی گۆڕە شێوێنراوەکان ترسێکی گەورەیان خستە دڵی بولبولیارەوە، بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا هەستیکرد دەستی و ئەژنۆکانی دەلەرزێن، چەند ساڵێک لە وەوبەر دەمێک بردیان بۆ تیرباران، ئەژنۆکانی نەلەرزین، بەس ئێستا وەک لە بوونەوەرێکی نادیاری شەیتانی بترسێت، سەیری دەوروبەری خۆی کرد، ئاوڕی لەداوەوە دایەوە، چاوانی پڕبوون لە ترس لە تاریکی، لە درەختەکان، لە هەوای فێنکی شەو، لە بێدەنگی شتەکان. ویستی بگەڕێتەوە، بەڵام خواستێکی تاریک بەرەو ناو کەشتییەکە ڕایکێشا، هەموو شتێک بێدەنگ بوو، لە ناو درەختەکاندا ئاسەواری ئەوە دیارنەبوو کەسانێک بێرەدا ڕۆیشتبن. هەستی نەکرد هیچ کەس دەستی بۆ درەختەکان بردبێت، گەڵا و چڵەکان هێمن لە ئارامی پێش خەودا بوون... سەرسامبوو بە بێلایەنی ترسناکی سروشت، لەو ماوەیەدا چەندین جار ئەو پرسیارەی بۆ دروستبووبوو کە بۆ سروشت دەرهەق بە هەموو شتێک وەها بێلایەنە، بۆ هەرگیز ڕیتم و ڕەوتی خۆی تێکنادات، ئێستاش درەختەکانی بێلایەن و بێباک بینی، وەک مەخلوقاتێک لە خۆیاندا نوقمبن و لە هەموو شتێکی دی دابڕابن. لە نزیک کەشتییەکەوە، وەک چاوی فێڵی لێبکات، لە هەوادا ئەو شەبەنگە ئەبەدییەی بینییەوە کە بەر لە چەند ساڵ لەوەوبەر

یەکەم جار بەسەر باڵەخانەکەوە بینی، ئەوە دووەم جار بوو ئەم شەبەنگە وا بە ڕوونی و زۆر ڕۆشن ببینێت، جارانی دی کاڵ و بێڕەونەق بینیبووی. لە دڵی خۆیدا گووتی، هیچ نییە جگە لە هەڵەیەکی تری بینینەکانی من، هیچ نییە جگە لە یەکێک لەو دیمەنانەی فریوی چاوم دەدەن. لە نزیک کەشتییەکەوە بۆسووت زۆر بەهێزتر بوو، کە چووە ناوەوە هەستیکرد لە جێگایەکەوە بنمیچێکی کۆشکەکە ڕوخاوە و ئاوێکی زۆر لە بەشی سەرەوەی بیناکەوە هاتۆتەخوار. گوژمی باراناوی بەهاری ئەو ماوەیە، بەشی هەرە زۆری خاشاک و سووتەکی سەرەوەی بەرەو ژێرەوە ڕامالیبوو، بۆ شێیەکی خنکێنەر تێکەڵ بە کزەیەکی سارد و هەوایەکی بۆسۆدار بووبوو. بۆ یەکەمجار هەستیکرد ئاگرەکە کارێکی بەدی بە هەموو بیناکە کردوە، بە جۆرێک چاکردنی ماوەیەک و پارەیەکی زۆری دەوێت، لە هەندێ جێگادا شێلمانەکانی توابوونەوە، دیوارەکان درزیان بردبوو، بنمیچەکان تەقیبوون. شتەکان لە ژوورەکاندا سووتابوون، بووبوونە خۆڵەمێش، بەڵام هەستیکرد کەسێک هاتووە و پاشماوەی ئێسک و پروسکی فریشتەکانی کۆکردۆتەوە و بردوونی. بیری بوو ئەو بەیانییەی کە کەشتی بەجێهێشت، ئێسکی فریشتە سووتاوەکان لەسەر جێگاکان و لە ناو ژوورەکان و لە ڕاڕەوەکاندا کەوتبوو. ئێستا ئاسەواری هیچ لاشەیەکی نەبینی. شەرمی لە خۆی هات، ئەو ماوەیە نەخۆشی نەیهێشتووە بگەڕێتەوە و تەرمی فریشتەکان بە جۆرێکی لایەق بنێژێت. ئاشکرا دوای ئاگرەکە دەستێکی نادیار لە کەشتییەکەدا ئیشیکردبوو، بولبولیار لەخۆی پرسی «ئەو دەستە کێیە؟». دەبێت هەر ئەوەی کەشتییەکەی سووتاندوە، کێلەکانیشی شکاندبێت و ئێسکەکانی بردبێت؟. وەڵامی نەبوو. بە نائومێدییەکی غەمگین و ترسناکەوە وەک لە تارماییەکی دڕندە ڕابکات بە پەلە لە پلەکەکانی کەشتییەکە دابەزی و بە ڕۆیشتنێکی خێرا بەرەو دەرەوە هەڵهات. لە ڕاستیدا ڕاکردنەکەی هێندە پرتاو بوو، پاڵتۆکەی لە پشتییەوە وەها هەوا گڤیدابوو هەر کەسێک بیدیبایە، وایدەزانی دوای شەڕ و تێکهەڵچوونێکی ناخۆش لە ماڵ و کەسی خۆی زیزە و بۆ جێگایەکی دی هەڵدێت. لە بەر دەرگاکە بە جۆرێکی کتوپڕ ترسەکانی زۆربوون، هەستە

قووڵەکانی پێیان گووت شتێکی ناخۆش بەڕێوەیە. کەمجار ترسی لە شتی نزیک بووە، لەو مرۆڤانە بوو کە تەنیا لە شتی دوور دەترسن، بۆ تەماشاکردنی شتە ترسناکەکان تەنیا چاو دەبڕنە شوێنە نادیارەکان، گەرچی زۆر لە مەترسیدا ژیابوو، بەڵام کەمجار هەستیدەکرد، شتە ترسناکەکان وەها لێی نزیکبن. ئەوە نهێنی نیگاکردنی هەمیشەیی بوو بەرەو دوور. بەڵام ئێستا گزەیەکی فێنکی بەهارە، لەگەڵ خۆیدا بۆنێکی نائاسایی دەهێنا، هەستیکرد کەسێک یان چەند کەسێک، یان خەڵکانێکی زۆر بە نهێنی چاودێریدەکەن، هەستێکی قورس و خەفەکەر بوو، سەرەتا تەنها وەک هەستێکی نادیار و دەرونی پێشوازیکرد، بەڵام دوای ئەوەی چەند هەنگاوێک لە دەرگای کەشتییەکە دوورکەوتەوە، دڵنیابوو کەسانێکی ڕاستەقینە لەوسەری کوچەکەوە بەدوایەوەن، لە تاریکیدا بە ڕۆشنی نەیدەبینین، بەڵام دڵنیابوو لە دوو کەس کەمتر نین. بۆ ساتێک وای بە خەیاڵدا هات بگەڕێتەوە دواوە، خۆی بکاتەوە بە کەشتییەکەدا، بەڵام ترسا لەوێدا گیری بدەن و دەرچوونی بۆ نەبێت، بۆیە جگە لە هەنگاوی خێرا زیاتر هیچی تری بەدەستەوە نەبوو. خەیاڵی بۆ ئەوەچوو دەستەیەک بن لە دزانی شەو، کە بۆ نێچیری ئاسان کوچەکان دەگەڕێن. بەڵام نا... پاش ئەوەی ئەم کەمێک خۆی گورجکردەوە، دەنگێکی نێر و فەرمایشتکەر لە دواوە تێیخوڕی «بولبولیار بوەستە». دەنگێکی نەناس و ترسناک بوو، ڕەق بوو وەک بەرد، هەوای شەو سامێکی زۆرتری لێ بارکردبوو، گەر لە جێگایەکی وا تاریک و چۆڵدا نەبایە، گەر ڕۆژ بایە و لە بازاڕێکی جەنجاڵدا بایە، لەوانەبوو نەترسێت، بەڵام بانگی وەها لە ساتێکی وەهادا کە خۆی پڕە لە ترس و چاوەڕوانی، دڵخوڕپێن بوو. گەر گوێی لە ناوی خۆی نەبایە بەوجۆرە بانگدەکرێت، ڕەنگ بوو تا ئەو ئەندازەیە نەترسێت، بەڵام ئێستا دڵنیابوو کەسانێک کە نیازێکی بەدیان هەیە بەدوای ئەمەوەن. ئاوڕێکی کورتی دایەوە و لە دوورییەکەوە کە هێشتا بەشی هەڵهاتنی تێدابوو، تارمایی دوو کەسی دیکەی بەقەد و قەوارەی بینی لە سەرێکی دییەوە بەرەو ڕووی دێن. جگە لەوەی ڕابکات هیچی تری بە خەیاڵدا نەهات، کە گەیشتە سەری ئەو شەقامەی بەرەو ناو کۆڵانە تەسکەکان و بە ئاڕاستەی

غەمپاشا دەیبرد، هەستیکرد ئەو دووانە تەنیا نین و لەو سەری شەقامەکەوە کەسانێکی دیکەش جیا لەوانی پێشوو لە ئاڕاستەیەکی بەرامبەرەوە بە خێرایی بەرەو ڕووی ڕادەکەن، دڵنیابوو کەسانێکن ویستویانە بیخەنە ناو تەپکەی خۆیان و هەر سێ ڕێگاکەی لێبگرن، بەڵام هاتنە دەرەوەی خێرا و کتوپڕی ئەو، پلانەکەی تێکدابوو. ئەوە یەکەمجار بوو هەستبکات ئاوها بەدوایەوەن، بە خێراییەکی شێتانە خۆی کرد بە کوچەکاندا و وەک لەشی یەکپارچە تین و وزە بێت کەوتە ڕاکردنێکی خێرا، کوچەکان لەوێدا بە جۆرێک تێکەڵ و بەیەکداچوون، دۆزینەوەی هیچ کەسێک لە نێویدا ئاسان نییە، تا توندتر ڕایدەکرد و تا پێچاو پێچی کوچەکان زیاتر قووتیاندەدا، پتر هەستی بە ئەمان دەکرد. تا گەیشتەوە غەمپاشا ڕایکرد، هەندێجار کورتە ئێستێکی دەکرد و ڕادەوەستا و سەیری دواوەی دەکرد، بەڵام زوو هەستیکرد ئەوانەی بەدوایەوە بوون شانسێکیان نەبووە ئەم بگرن. بیریکردەوە وای ئەگەر چەند هەنگاوێک نزیکتربانایە و بیانگرتایە، چی بەدبەختییەک دەبوو. کە گەیشتەوە ماڵێ، بەر لەوەی بڕواتە ژوورێ، بەوردی دەوروبەری پشکنی و تەماشایکرد، کە گەیشتە ژوورێ و وەفائیلی بینی هێمن لە پێخەفەکەی خۆیدا نوستووە، هەناسەیەکی دڵنیایی هەڵکێشا. بەڵام دڵە خورپێیەکی تێکەوتبوو ئاسان نەدەگەڕایەوە سەر دۆخی جاران. دڵنیابوو ئەو کەسانەی دوایکەوتن، چاودێریانکردوە تا دەربکەوێت، زانیویانە درەنگ یان زوو دەگەڕێتەوە بۆ سەردانی کەشتییەکە، بەڵام کە وا کتوپڕ سەری لە کەشتی دابوو، فریانەکەوتبوون لە کاتی خۆیدا بگەنە سەری. ئێستا دڵنیابوو کە لەچەند ڕۆژی داهاتوودا ماڵەکەشی دەدۆزنەوە. بەڵام کێن و بەدوای چیدا دەگەڕێن؟ بەڕاستی نیازیان خراپە؟ بۆ ئەم وادەترسێت؟. هیچ کات، لە سەختترین ساتەکاندا بەوجۆرە نەترسابوو. هەستیدەکرد دەنگێکی نهێنی لە ناخیدا پێیدەڵێت لە دەست هەر کەسێکی نەناس ڕابکە لێت نزیک ببێتەوە.

تادەهات پەیوەندی لەگەڵ وەفائیلدا ئارامتر و جوانتر و ڕۆحانیتر دەبوو. وەفائیل فریشتەیەکی بەهێز و کراوە و زیرەک بوو، تەندروستییەکی باش و جووتێ باڵی بەهێز و مەیلێکی توندی بۆ سەربەخۆیی تێدا بوو، بەڵام هێشتا تەواو بە تیشک و هەوا و ڕوناکی ڕانەهاتبوو. بولبولیار لەم فریشتە بەهێزەدا سەرەتای سەردەمێکی تازە و دەستپێکی هەوڵێکی تری دەبینی بۆ چوونە ناو دونیای فریشتەکانەوە. ئێستاش سەیربوو بەلایەوە کە بۆ تەنیا ئەو و کەسانێکی زۆر کەم ئەم دونیایە دەبینن، دونیا ونبوو و نغرۆکەی مرۆڤ، ئەو بەشەی ژیان کە بووە بە ژێر تەپوتۆزی جەنگ و پێکدادان و خواستە کورتبینەکانمانەوە. ئەو بەشەی مرۆڤ کە هەرگیز بۆی نەبووە ببێتە حەقیقەت. هەستیدەکرد نازانێت وەفائیل بۆ کوێ بەرێت، دەبێت کەشتیی فریشتەکان لەبیربکات، جگە لە مەترسییەکان، بیناکەش بە جۆرێک داڕوخاوە لەوەدا نییە ئاوەدانبکرێتەوە. گەر ئەمانەی بەدوای ئەوەوەن نەیاربن، لەوانەیە وەفائیلیش ببینن، کێ چوزانێت، لەوانەیە ژیانی لە مەترسیدا بێت. ئێستا جگە لە دکتۆر نەزمی و دکتۆر شوکاک، کەسی تری لە یاد نەبوو، نە مەهدائیل ماوە، نە ڕێزانی مەلەکبین، نە باوەڕی بە نەغەدە ماردینییە، هەڤاڵ جەنگیزیش هیچ کات شوێنی متمانەی تەواو نییە. دڵنیابوو نەغەدە ناتوانێت وەفائیل ببینێت، ئەو لە شاعیرانی وشەیە نەوەک شاعیرانی ڕۆح، بۆیە ئەستەمە بتوانێت وەفائیل بە باڵەکانییەوە ببینێت. لە ناخی دڵەوە هەمیشە غەمی بۆ نەغەدە دەخوارد، بەڵام ئێستا دەشترسا و نەشیدەزانی دەبێت خانم هەر لە کوێ بێت.

ڕۆژی دوایی، بە دوودڵی و پەرێزەوە چوو بەرەو بازاڕ. تا لای نیوەڕۆ ئازاد و بێگرفت بە شاردا سوڕایەوە، هەستی بە هیچ شتێکی ناسروشتی نەکرد. لە نزیکی نیوەڕۆدا، بێئەوەی بزانێت چۆن و لە کوێوە و بە چ نیازێک دەرکەوتوون، لە ناوەڕاستی قەیسەرییەکاندا دوو کەس توند قۆڵیانگرت و گوتیان «مامۆستا دەیەوێت بتانبینێت، هیچ شتێک مەکە، مەجوڵێ، ئارام بڕۆ با تووشی دەردەسەری نەبیت». هەر دوو پیاوەکە لە چاو بولبولیاردا

نۆر زل و باڵابەرزتربوون، دوو کەسی سەر زلی کۆسە بوون، جلی وەک یەکیان پۆشیبوو، یەکجۆر پێڵاویان لە پێ کردبوو، هەردووکیان بۆ سیرێکی توندیشیان لێدەهات. وەها لە بولبولیار قیافەدارتربوون، بەڕاستی کێشەیان هەبوو، بێئەوەی سەرنجی هەموو بازاڕ ڕاکێشن، بنوشتێنەوە و بیپێچنەوە و دەستبەستیبکەن. هێشتا نەیانتوانی بوو بەخۆیانەوە بیجەڕێنن، کە بولبولیار هەستیکرد زلی ئەم دوو مەخلوقە هێندەی دەستیاندەگرێت کۆمەکیان پێ ناکات، وەک منداڵێک لە ژێر دەستی دوو گەورە خۆی ڕاپسکێنێت، کاتێک خەریکبوون لە قۆڵ و بازووەوە شەتەکی بدەن، لە چاوترووکانێکدا دەستی ڕاتەکاند و بە خێراییەکی ئەفسوناوی لە ژێر دەستیان خلیسکا و وەک ماسییەکی بچوک لە دەمی دوو تیمساحی زل دەرچێت، خۆی کردەوە بە گۆمی حەشاماتە قووڵەکەدا و لە جەنجاڵی بازاڕدا خۆی ونکرد. ماوەیەکی درێژ ڕایکرد و ڕایکرد و ڕایکرد تا هەناسەی پێنەما، کە وەستا لە نزیک کەلاوەیەکەوە بوو، دڵی زۆر توند لێیدەدا، تا ماوەیەک چاوی نەدەکرایەوە بزانێت لە کوێیە و چی لە دەورێتی، لە ژیانیدا بە ئەندازەی ئەم دوو جارە توند و درندانە ڕای نەکردبوو، هەستی بە ئێشێکی زۆر توندکرد لە ماسولکە و ئەژنۆکانیدا، عارەقەیەکی زۆر قژی تەڕکردبوو، بەدەست قژی هەڵدایەوە بۆ سەرەوە و چاوانیکردەوە و بینی لە نزیک شوێنێکی لاچەپەکی دابەشکردنی بەنزیندایە و دەیان منداڵ لە سەرەدان دەبەکانیان پڕبکەن. کوڕانێکی چڵکن کە هەموو گیانیان لە گریس و بۆ بەنزین و ڕەشیدا بوو، لەسەر چۆنێتی پڕکردن و ڕیزگرتن شەڕیان بوو ... بەر لەوەی بگەڕێتەوە بۆ غەمپاشا، نزیکی سەعاتێک لە پشت ئەو تەنکەری بەنزینەوە خۆی شاردەوە، هەستیکرد ئەو هەموو بۆنە جیاوازە کەمە کەمە گێژییدەکەن و ئارەزووی خەوتنێکی قووڵی تێدا دەبزوێنن. بێئەوەی بزانێت ئاخۆ خەوتووە یان بێهۆش بووە، ماوەیەک خامۆشی و وەستانێکی قووڵی هۆش ژیا. لە ڕێگای غەمپاشا وەک ئەوەی هەر ڕابکات بەردەوام عارەقی دەردەدا، ترسی ئەوەی لێ نیشت دووبارە نەخۆشبکەوێت و بکەوێتەوە جێگا... هەستیکرد ناتوانێت بیربکاتەوە. تەنیا شتێک لێی دڵنیابوو ئەوەیە ژیانی لە مەترسیدایە و هیچی دی، بەڵام

کێن ئەوانەی ڕاوی دەنێن و بۆ ڕاوی دەنێن و بۆ ویستیان لە ڕۆژی نێوەڕۆ و ناوەڕاستی بازاڕدا بیفڕێنن. نەیدەزانی.



دوو ڕۆژ دوای ئەوە بولبولیار، دکتۆر مستەفا شوکاکی بینییەوە. دکتۆر هیچی دەربارەی سووتانی کەشتیی فریشتەکان نەبیستبوو. گەرچی ماوەیەکی درێژبوو کەشتی سووتابوو، بەڵام دکتۆر ئەو ماوەیە لە بیمارستان بەس خەریکی نەخۆش و زامداران بوو. ئەو بە هێمنی چیرۆکی شەوی سووتانی کەشتییەکەی بۆ گێڕایەوە، چۆن خەوتووە، چۆن بەئاگاهاتۆتەوە، چۆن ڕایکردوە، چۆن ویستوێتی خۆی بخاتە ناو ئاگرەکەوە، چۆن کڵپەی ئاگرەکە گەیشتۆتە ئاسمان. دکتۆر کە گوێی لە چیرۆکەکە بوو چاوانی پڕبوون لە فرمێسک و ماوەیەک بە بێدەنگی گریا، وەک برایەک باوەشی بە بولبولیاردا کرد و لە ئامێزی حەسرەتی نا، ماوەیەکی درێژ هەنسک خنکاندی و غەم و حەسرەت وەها گووشیان، هیچی بۆ نەگووترا. بولبولیار وەک بیەوێت دکتۆر ئازاربدات، گەلەک غەماوی و تاڵ ساتەکانی سووتانی بیمارستانی بۆ وێناکرد. ئەوەشی بۆ زیادکرد کە ئەو دوای ئاگرەکە چەند هەفتەیەک تووشی نەخۆشییەکی قورس هاتووە و تایەکی بەهێز بێهۆشی خستووە و جەنگیز لەسەر سنوورەوە بردوێتی بۆ بیمارستانێک لە ئێران. لە هەمووی سەختتر بۆ دکتۆر، هەواڵی دیارنەمانی ڕێزان و مەهدائیل بوو. بولبولیار گووتی «لە شەوی ئاگرەکەوە ئەو دووانە دیار نین و هیچ دەربارەی چارەنوسیان نازانین، من لاشەی سووتاوی هەموو فریشتەکانم بینییەوە ئەوان نەبێت، ئیتر خەبەرێکم نییە، نەگەڕاوم، نازانم ... هەموو ئومێدم ئەوەیە نەسووتابن». بولبولیار گووتی «دکتۆر بۆیە هاتووم، چونکە هەستدەکەم تەنیام، دەترسم، چەند ڕۆژێکە چەند کەسێکی نەناس بەدوامەوەن، بەڵام

جگە لەتۆ هاوڕێیەکی تر شک نابەم باوەڕم پێی بێت. دەمەوێت یارمەتیم بدەیت چیبکەم... دەمەوێت بزانم ئەو کەسە غەریبانە کێن. ئەو شەوە یەکەمجارم بوو چوومەوە ناو وێرانەی کەشتییەکە و لەوێوە دوامکەوتن، گەر هەڵەم بکردبایە، گەر چەند دەقیقەیەک زووتر نەهاتبامایە دەرێ، نازانم چی دەبوو. دەزانم کەسانێکی زۆرن، یەک کەس یان دووان نین، خەڵکێکی زۆرن ... بە جۆرێک ئەو ڕۆژە لە ناوەڕاستی بازاڕدا ویستیان بمرفێنن. دوای ئەوە دکتۆر پێمبڵێ ... کاری ئێمە ڕوو لە کوێیە، پێمبڵێ کاری ئێمە ڕوو لە کوێیە؟». دکتۆر پەرێشان بوو، هەواڵی سووتانی کەشتییەکە لە دۆخی خۆی دەریکردبوو، دوای مردنی فریشتەکەی خانمی ماردینی بڕیاریدابوو کۆتایی بە پەیوەندی خۆی لەگەڵ جیهانی ئەم بوونەوەرە غەمگینانەدا بهێنێت، خۆی لە کێشە و بەدبەختی کەمی نەبوو، ڕۆژانە لاشە و برینێکی زۆر بە ژێر دەستیدا تێدەپەڕی، دەیگووت ئەو ئازارەی بەدەست مرۆڤەوە دەیکێشم بەسمە، گەر غەمی فریشتەکانیشی بچێتە سەر چی لە بەدبەختێکی وەک من دەمێنێتەوە. لەو ڕۆژەوەی لە کەشتییەکە هاتبووەدەرێ، هەتا چاوانی خۆی ڕاهێنابوو باڵەکان نەبینێت و فەرامۆشیانبکات، وەک نەبوو ئەژماریانبکات، وەک ئەوەی شتێک بن لە خەیاڵ و خورافەتی ناو زیهنی خۆی. ئەو ڕۆژەش بە بولبولیاری گووتەوە «بولبولیار، من و تۆ نەخۆشین، هەستێکی بۆگەنمان هەیە کە پێماندەڵێت جوانی مرۆڤەکان لە ناوەوە ژاکاوە، ئەوە چۆتە سەرمان و ئەم بەدبەختییەی بۆ دروستکردووین». هەردووکیان دەیانزانی فریشتەکان هەن، فریشتەکان لەگەڵ مرۆڤدان، دەتۆرێن، توڕەدەبن، نەخۆشدەکەون و دەمرن، هەردووکیان دەیانزانی دکتۆر تاکە پزیشکی فریشتەکانە، بەڵام دکتۆر دەیویست ڕابکات و خۆی لە هەموو شتێک بدزێتەوە. بە دەم هەنسکەوە گووتی «دەتوانم چی بۆ تۆ بکەم؟ چۆن یارمەتیت بدەم؟ دوای سووتانی کەشتییەکە دەکرێت چی بکەین؟». ترسێک لە چاوی بولبولیاردا بوو، کەس پێشتر شتی وەهای لە گلێنەیدا نەبینیبوو، بە دەنگێک کە هیچی لە دەنگی ئەو کوڕە سارد و مۆنۆتۆنە نەدەچوو کە جاران دەیناسی، گووتی «دکتۆر من دەترسم، دەترسم جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ

کەشتییەکە، دەبێت بزانین کێ کەشتییەکەی سووتاندوە، کارێکی تریش هەیە دەبێت بیکەین، ئەویش پێکەوە سەیری ئەو ئەرشیفە بکەین کە لای منە، من بەتەنیا هێزی ئەوەم نییە ئەو ڕێگایە بڕۆم... هێزی ئەوەم نییە، دەبێت تۆ لەگەڵمدا بیت». بولبولیار بە ڕوکەش نەخۆش دیارنەبوو، بەڵام ئاسەواری دەردێکی قورس بە جوڵە و نیگا و هەڵسوکەوتییەوە بوو. دکتۆر کەمێک فرمێسکەکانی سڕی، چوو کەمێک ئاوی کرد بە دەموچاویدا و گەڕایەوە. بولبولیار نیمچە بێهۆش، وەک یەکێک لە دوورەوە هاتنی لافاوێکی ترسناک ببینێت، سەیری دکتۆری دەکرد. ئەو پاش ئەوەی چەند جارێک هەناسەی هەڵکێشا کەمێک خۆی گورجکردەوە و وەک دکتۆرێک بزانێت عاتیفەی ڕووت سوودی نییە، بە هێمنی دەستیگرت و گووتی «بولولیار ... تۆ نەخۆشیت، زۆر نەخۆشیت، کوڕم زۆر نەخۆشی». سەیربوو بەلایەوە کە گووتی «کوڕم»، ڕاستە ئەو چەند ساڵێک گەورەتربوو، بەڵام هێندەش نا بچێتە ڕیزی باوکی. دکتۆر هەستیکرد کە خۆشی زۆر نەخۆشە، هەستیکرد ئەویش پێویستی بە کەسێکە کۆمەکیبکات و فشاری خوێنی بپێوێت و لێدانی دڵی بگرێت. بەڵام وەک ڕەفتاری هەمیشەیی کە خواستی بوو خێرا فریای هەموو نەخۆشێکی ئەم دونیایە بکەوێت، ترپەکانی دڵی بولبولیاری گرت، تای پێوا، فشاری خوێنی گرت. هەموو شتێک باش بوو. دکتۆر شتێک لە دڵنیایی پزیشکانە کەوتە سەر سیمای، بەڵام بولبولیار بە هەمان ڕوخساری ترساوەوە، گووتی «هەموو شتێکت باشە، نا دکتۆر هەمووشتێک باش نییە. تەندروستی قووڵی ئینسان لە جێگایەکی تردایە دکتۆر، لەم ژمارە ڕووتانەدا نییە، ئەم ژمارانە تەنها دیوی دەرەوەی تەندروستی منن. تەندروستی ڕاستەقینەی مرۆڤ لە جێگایەکدایە بەم ئامێرانە ناپێورێت». دکتۆر شوکاک وەک هەموو پزیشکەکان، ڕقی لەوە بوو کەسێک گومان لە هێز و دانایی زانستەکەی بکات، پزیشکێکی فانەتیک بوو، کە بڕوایەکی ترسناکی بە ئامێر و ژمارە و نرخە ماتماتیکییەکانی پشکنین هەبوو. قسەکەی بولبولیار کەمێک ڕایگرت، بێنەوەی بە شێوەی جاران پەرچەکردارێکی توند دەربخات، هەناسەیەکی قووڵی تری هەڵکێشا و بە

هێمنی گووتی «هەموو شتێکی دونیا بە زمانی ژمارە گوزارشت لە خۆی دەکات، ڕۆحیش وەک کۆمەڵێک ژمارە دەپێورێت و دەردەکەوێتەوە». بولبولیار بەدەم داخستنی قۆپچەکانی کراسەکەیەوە، گووتی «فریشتەکەی مرۆڤ، هیچ پزیشکێک، هیچ ئامێرێک، هیچ تیشکدۆزێک نایبینێت. شتەکە لە ژێرەوەیە، لە ڕۆحدایە... من و تۆ هەردووکمان خەیاڵمان نەخۆشە. هەموو ئەوانەی فریشتەکان دەبینین خەیاڵیان نەخۆشە. عەقڵمان ساغە، تۆ جەنابی دکتۆر عەقڵت ساغە، دەستت ساغە، چاوت ساغە. منیش وەرە بمپشکنە، دەردێکی وەها کوشندەم نییە، بەڵام گەر خەیاڵ نەخۆش بوو، هیچ دەرمانێکی نییە، هیچ ئامێرێک نایدۆزێتەوە». دکتۆر شوکاک لە جلە سپییەکانیدا غەمگین سەیریکرد و پاڵیدا بە لۆکەرێکی خۆڵەمێشیی گەورەوە کە جگە لە یەک دوو دەست جلی سپی پزیشکی هیچی تری تێدانەبوو، وەک نەیەوێت زیاتر لەسەری بڕوات و سەرسەختییکات بە ئەسپایی گووتی « خەیاڵمان زۆر نەخۆشە». دکتۆر بە ترسێکەوە وایگووت، وەک ئەوەی تێگەیشتبێت هەردووکیان چ دەردێکی سامناکیان هەیە. بولبولیار بە نائومێدی کەسێکەوە هیچ ڕوناکییەک لە ئاسۆی ژیانی خۆیدا نابینێت، گووتی « ئامێرەکانی تۆ ناتوانن ئەوە ببینن کە من دونیایەکی تر دەبینم، دونیایەک هەر کات مرۆڤ بینی دەزانێت، ژیان هەڵەیەکە هەرگیز ڕاست ناکرێتەوە». دوا ڕستەی وەها گووت وەک دەستی لە هەموو شتێک شتبێت.

دکتۆر زۆر گوێی نەدا بە قسەکانی بولبولیار، لە هەموو شتێک نائومێد بوو، ئاشکرا ڕووداوەکانی چەند مانگی دوایی کاریگەرییەکی خراپیان لا جێهێشتبوو، گووتی «بەڕاستی دەمەوێت گەر بتوانم تەواو خۆم لە فریشتەکان دووربخەمەوە. دەترسم دواجار من و تۆ لە شێتخانەدا بگیرسێینەوە، ئێمە بەڵگەیەکی زانستی و ڕاستەقینەمان نییە بیسەلمێنین کە لە مرۆڤدا فریشتەیەک هەیە، نە دین لە پشتمانە، نە زانست، نە سیاسەت. ڕەنگە هەندێک نوسەر و نیگارکێش هەبن پشتمان بگرن. بەڵام بە درێژایی مێژوو هەتا جارێکیش نەبووە، زۆرینەی خەڵک باوەڕ بە

نوسەرێک یان نیگارکێشێک بکەن. خەڵک دوای سیاسییەکان، دوای سەرکردە دینییەکان، دوای ئاغا نەفامەکانیان دەکەون، بەڵام هیچ کات رووی نەداوە دوای شاعیرێک بکەون ... چۆن بیسەلمێنین کە فریشتە هەیە، چۆن خەڵک تێبگەیێنین؟». پاش ئێستێک گوتی «لە شارێکی وا گەورەدا، هەمووی چەند کەسێکی کەم فریشتەکان دەبینن، نیوەیان باوەڕ بە چاوی خۆیان ناکەن، گەر باوەڕیشی پێبکەن پێیانوایە ئەوەی دەبینن زادەی خەونێک یان زیندەخەونێکی قووڵە و هیچی تر. پێمبڵێ چاوی من و تۆ و ئەو مەلەکبینە بێدەنگ و ترساوانەی کەشتییەکە بەسن تا بڕوا بە خەڵک بهێنین؟... کێ باوەڕمان پێدەکات؟ ژمارەی ئێمە هەزاران جار لە ژمارەی ئەوانە کەمترە کە پێیان وایە جنۆکە و شەولەبان هەیە و دەردەکەون بۆ خەڵک و دەیانترسێنن، مرۆڤ هەزاران ساڵە باوەڕی بەوە هێناوە کە دەشێت شەیتان بچێتە گیانییەوە، باوەڕی بەوە هێناوە کە دەشێت رۆحی خۆی وەرگەڕێت و بچێتە رۆحی کۆترێک، قالۆنچەیەک، شەوگەردێکەوە. بەڵام هیچ کات باوەڕی بەوە نەبووە فریشتەیەک بچێتە گیانییەوە. دوا ئەوە من بیرم لێکردۆتەوە، مەسەلەکە لای من کە پزیشکم جۆرێکی ترە. بیهێنە پێش چاوی خۆت ژنێکی دووگیانی نەخۆشت بۆ دەهێنن، لە ساتێکدا دەکەویتە بەر دوو رێگا و دەبێت یەکێکیان هەڵبژێریت، یان ژنەکە ڕزگاربکەیت یاخود منداڵەکە... کامیان ڕزگار دەکەیت؟ تۆ پێم بڵێ ژنەکە ڕزگاردەکەیت یان منداڵەکە کە هێشتا دونیای نەدیوە؟. بێگومان ژنەکە ڕزگاردەکەیت. منیش لە نێوان دووڕیانێکی وەهادام، لەوەدام بپرسم - ژیانی مرۆڤەکە ڕزگاربکەم یان ژیانی فریشتەکەی ناوی؟ -. بێگومان مرۆڤەکە ڕزگاردەکەم، هۆشەنگ گیان توانام نەماوە وەک جاران لە دوو دونیادا بم کە نازانم کامەیان دونیای ڕاستەقینەیە. ئەم ئێشی ڕزگارکردنی فریشتانە بۆ دکتۆر نەکراوە، ئەوەم بەسە کە دەیکێشم، ئەو هەموو مەراقەم لێ زیادیشە کە لە دەست ئێش و ئازاری خەڵک دەیخۆم». دکتۆر هەستیکرد کە قسەدەکات کەمێک هەناسەی سواردەبێت، وشەکان وەک جاران ئاسان و خێرا نایەنەدەرێ، تەمەنی وردە وردە دەڕواتە سەرێ و تا دێت کێشەی سەیرتر و وردتری بۆ

دروستدەبێت. کەمێک وەستا و لەناکاو شتێک کەوتەوە خەیاڵی و گووتی «بەڵام باشبوو هاتی، باشبوو دەرکەوتیتەوە، دەمەوێت شتێکت لێ بپرسم: تۆ کەسێک دەناسی بە ناوی مەهدی دەریاییەوە؟». بولبولیار دوای بیستنی قسەکانی دکتۆر دڵتەنگتر دیاربوو، ئەوەی دکتۆر چیتر حەزی لە باسی فریشتەکان نەبوو نائومێدیکرد، کەمێک بیریکردەوە و سەری داخست و گووتی «نا، ناوی وەهام نەبیستووە... مەهدی دەریایی؟». «بەڵێ مەهدی دەریایی». دکتۆر کەمێک وەستا و دەستی بە دەرمانێکی پاکژکردنەوە سڕی و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە هێمنییەوە، وەک هاوڕێیەک دڵسۆزانە چیرۆکێک بۆ هاوڕێیەک بگێڕێتەوە، گووتی «گوێبگرە بولبولیار، ڕەنگە ئەوەی ئێستا بۆت دەگێڕمەوە سوودێکی هەبێت، لەوانەیە قسەیەکی بێماناش بێت. نازانم ... هەستدەکەم سەرەداوێکم لابێت بۆ ئەم چیرۆکە، لەوانەیە واش نەبێت. من لەو نائومێدانەم کە باوەڕم وایە مرۆڤ لە هیچ تێناگات، نازانم کە ئەم چیرۆکەت بۆ دەگێڕمەوە بە ڕێگایەکی باشدا دەتبەم یان خراپ. گوێبگرە، دەمێک سوپاکەی سەدام حوسەین هاتەوە شار، من تاکە دکتۆرێکی گەمژەی بیمارستانەکە بووم مامەوە و پاراستنی هەندێک نەخۆش و کەلوپەلی بیمارستانەکەم لە ئەستۆ گرت. لەو شەوانەدا، پیاوێکی زامدار کەوتە بیمارستان ناوی مەهدی دەریایی بوو، بەشێکی زۆری لەشی لە ئاگرێکی گەورەدا سووتابوو، لایەکی وەها سووتابوو ناسینەوەی سەخت بوو، بەو سووتاوییە زۆرەوە شەو هاتبووە دەرێ لە دووی تۆ بگەڕێت. کەسێک هەواڵی ئەوەی بۆ بردبوو تۆ لە سەر سنووریت، لە ترسی ئەوەی نەبا بڕۆیت بەو دیودا و لە مەملەکەتێکی گەورەی وەک ئێراندا ون ببیت، زۆری لەخۆی کردبوو بگاتە سەر سنوور و تۆ ببینێت. ئیتر کەوتبووە بەر تەقەی سەربازانی دەوڵەت و بریندارببووبوو. پیاوێکی ئاڵۆز هاتە بەرچاوم. لەو کەسانەی نزیکترین خزمی خۆیان ناتوانێت شتێکی زۆر دەربارەیان بزانێت. بە قسەی ئەو پیاوە، تۆ ئەمانەتێکی ئەوت لایە و دەبێت بیدەیتەوە».

بولبولیار سەرسام گووتی« ئەمانەتی کەسێک بە ناوی مەهدی دەریاییەوە؟ من ناوی وام نەبیستووە». دکتۆر ئێستا لە جاران زیاتر مەراقی بوو بزانێت ئەم کابرایە کێ بووە و چ نیازێکیشی بە بولبولیار بووە. بەدەم قسەکردنەوە چووە بەردەم تاقە ئاوێنەی ژوورەکە و گووتی «من زۆربەی ئەو زانیاریانەم لە کوڕەکەی وەرگرت ... ڕەنگە ئەو تەنیا کەس بێت بکرێت یارمەتیمان بدات. خۆشبەختانە ناونیشانێکم هەیە گەر لەوێ بێت، ئەوەی من بۆت باسدەکەم کاری چەند هەفتە لەمەوبەرە. کوڕەکەی ناوی ماکوان مەهدییە، بۆیەچی ئۆتومبیلە لە خۆرئاوای شار، لە نزیک گەراجی گەورە، بەپێی قسەکانی خۆی بێت، دەبێت لە گوزەری فیتەر و میکانیکییەکاندا دوکانی هەبێت، یان هیچ نەبێت گەر لەوێ بپرسین لەوانەیە شتێکمان دەستبکەوێت».

بولبولیار گووتی « دکتۆر ئێستا ترسم لە جاران زیاترە، پیاوێک لە شەوێکی وادا بۆ دەبێت بۆ من گەڕابێت؟ پیاوێک کە نایناسم. من هیچ کەس لەوانە ناناسم کە بەدوامەوەن، دوائەوە دەترسم لە کوڕەکەی نزیک ببمەوە، دەترسم بەپێی خۆم بکەومە ئەو چاڵەوە کە دەیانەوێت بکەومە ناوی. ئێستا جگە لەوەی خۆم ونبکەم، شوێن پێ و ئاسەواری خۆم بسڕمەوە، شتێکی تر لە خەیاڵمدا نییە».

دکتۆر هەستی بە ترسی بولبولیار کرد و ویستی ئارامیبکاتەوە، بەڵام سوودی نەبوو. خۆی لە دڵەوە پەشێو و شپرزە بوو، بیستنی چیرۆکی مەهدی دەریایی شپرزەتری کرد. هەموو ئەو ساڵانەی پێکەوە لە کەشتی بوون، بولبولیار هێمن و تەنها بوو، دەمانێکیش هەردووکیان لەسەر فریشتەکەی خانم ناکۆک بوون، کەسیان ڕقی لەوی دی هەڵنەگرت، زۆرجار لەیەک توڕە و بێزار دەبوون، بەس بولبولیار کەسێک نییە بتوانی ڕقت لێی بێت. دکتۆر لە دڵی خۆیدا گووتی گەر نەغەدە لە سەرەتاوە لەگەڵ ئەم کوڕەدا خیانەتی لێکردبام ئەوەندە بریندار نەدەبووم. دکتۆر وەک ئەمجارە ناچاریی بیجوڵێنێت، نەوەک هێمنی و جوانی دونیای فریشتەکان بەنەرمی گووتی «بەوەدا تۆ زۆر دوودڵ و نائارامی، بەر لەوەی هیچ بپرسین دەبێت

جێگایەکی ئەمینت هەبێت. تۆ ناتوانیت لە ماڵی خۆتدا دانیشیت. باشترین شت ئەوەیە شوێنی خۆت بگۆڕیت». بولبولیار گووتی « دکتۆر، لە ئێستادا بۆ دوو شت زۆر پێویستم پێتە، یەکەم من شوێنێکم گرتووە بۆ هەڵگرتنی ئەرشیفی کەشتییەکە، توانای ئەوەم نییە کرێکەی بدەم، تا دەمێک شتەکان ڕووندەبنەوە یارمەتیمبدە کرێی ژێر زەمینەکە دابینکەم، دووەم، دەبێت نەکەومە دەست ئەوانەی بەدوامەوەن، چونکە نازانم کێن و چیان دەوێت». دکتۆر گەر بیویستایە شتێک بکات کوڕێکی دەستبەکار بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشا و دڵنیابوو ناتوانێت لە ڕۆژێکی واسەختدا دەست لە هۆشەنگ بەردات، دەستی خستە سەر شانی و گووتی «خەمی کرێکەت نەبێت، بەڵام گەر دەزانی جێگای ئەرشیفەکە باشە و شوێنێکە نادۆزرێتەوە، خۆشت جارێ بچۆرە ئەوێ و مەیەرە دەرێ، خۆم فرسەت دەهێنم و جارجار هەموو پێویستییەکت بۆ دەهێنم، لە ئێستادا خۆت دەرمەخە ... بۆ ئەوەی بزانین مەهدی دەریایش کێیە، خۆم دەکەومە دوای و دەپرسم و بزانم چی لە تۆ دەوێت». لە ئێستادا بولبولیار لەوە زیاتر پێویستی بە یارمەتی نەبوو. باوەشێکی نەرمی بە دکتۆردا کرد و گووتی «دڵخۆشم هاوڕێ گیان، بەس نییە برایەکی وەک تۆم هەیە». کە باوەشی پیاکرد، دووبارە بۆن و بەرامەی تایبەتی دکتۆرەکان چووەوە بە سەریدا، بۆنێک هەستیکرد پتر وەک بۆنی برینە نەوەک بۆنی دەرمان. بۆن و هاڵاوێک، مەرگی بیری بولبولیار دەخستەوە.

## نزار ئیدریس لە سەرەتای دەستپێکردنی دونیای تازەدا

کە نزار ئیدریسم بینییەوە مەست بوو، لە سەر کورسییەکی شکۆداری شێوەشاهانە دانیشتبوو و بەتەنیا دەیخواردەوە، خەڵوەتی بە خەڵوەتی مەستێکی کامەران نەدەچوو، بەڵکو شکست و بێزاریی پێوە دیاربوو. کە بەرامبەری دانیشتم، گووتم «نزار تەواو، حیسابی هێزەکانی دەوڵەت فت،

ئەمێستا خۆم لە شەڕ دێمەوە. ئەمڕۆ هەموو جەنگەکانمان بردەوە، بە ئاسانی دوا سەنگەری بەعسییەکانمان گرت. عەزیزم دەبێت ساڵانی داهاتوومان بەبێ بەعس بەینە سەر. ئەوەی ماومانە لە ژیان بەبێ فاشیست و عەرەبە دڕندەکان بژین». دەنگم و چاوم ترسێکی گەورەیان تێدابوو، لەو کاتەوەی نزار ئیدریسم بینی، ئەو شتە کەوتە خەیاڵم کە بەبێ بەعسییەکان ژیان چۆن دەڕوات، بەبێ دوژمن چۆن بژین؟. لەو کاتەوەی فامکردبووەوە تا ئەمڕۆ لە جەنگێکی گەورە و بێبڕانەوەدا بووم دژ بە عەرەبە بەعسییەکان، دژ بەم سەدامییە دڕندانە کە تاسەر ئێسقان ڕقم لێیان بوو. ڕاستە سەردەمانێک زۆر لێیان نزیک بووم، ڕۆژانە دەمبینین، دەستم دەخستە ناو دەستیان، بەڵام ئەوەی دوژمنێکی گەورەم بوون و دەبایە ژیانم بۆ جەنگی ئەوان تەرخانبکەم، هەستێکی توند و هەمیشەیی بووە لەلام. ئەم ئێوارەیەش کە فاشیستەکانمان لە شار دەرکرد، سووربووم لەسەر ڕۆیشتنی هەتاهەتایی ئەوان، دەبوو کۆتاییان بێت... دەبوو وەرچەرخانە مەزن و شکۆدارەکەی مێژوو ڕووبدات، بەڵام ئێستا کە بەعسییەکانم بەو چەشنە تێکشکاو دەبینی، خەیاڵم تەنیا لای ئەوە بوو، لە داهاتوودا ژیانی من بێ فاشیستەکان چۆن دەبێت؟. بۆ یەکەمجار هەستم بە بۆشاییەکی کاریگەر کرد، دیاربوو تەواوبوونی جەنگ لەگەڵ بەعسییەکاندا، پەیوەندی من و هەموو دونیا تێکدەدات. گەرچی ماوەیەکی درێژبوو دڵنیابووم بەعسییەکان بوونەتە بەشێک لە ڕابوردوو، سەردەمیان لەم دەڤەرە تەواو بووە، بەڵام لەو باوەڕەدابووم مرۆڤ تا دوژمنێکی باشی دیکەی ئامادەنەکردبێت، هەق نییە دەستبەرداری دوژمنی یەکەمی خۆی بێت. دەمزانی نوشوستی فاشییەکان بۆ خەڵک و بۆ مێژوو گرنگە، بەڵام ئەی بۆ من؟ من گرنگترم یان مێژوو؟ من گرنگترم یان خەڵک؟ من چی بکەم؟ لەسەر چ بنەما و بەپێی چ ئیمانێک درێژە بە ژیانی جارانم بدەم؟. دەمزانی تا ئەوکاتە ڕۆحی خۆم لە پێناوی شتێکدا بە بارمتە بە شۆڕش بەخشیبوو، بەڵام ئێستا دەبێت ڕۆحی خۆم وەربگرمەوە، چیتر بەهانەیەکم نەبوو وائاسان ڕۆحی خۆم بە کەس ببەخشم، بەڵام چیم لە ڕۆحی خۆم بکردایە؟ چۆن وەرمبگرتایەتەوە؟.

تاکە کەسێک بتوانم ئەم پرسیارەی لێبکەم نزار ئیدریس بوو، ئەو تاکە کەسێک بوو ڕۆحی خۆی لە هیچ ئان و زەمانێکدا بە کەس نەفرۆشتبوو، ئازادبوو، بەڵام ئازادییەکی تایبەت بەخۆی کە لەگەڵ دونیادا بەش ناکرێت، ئازادیەکی شەیتانی کە ئاسان لاسایی ناکرێتەوە... لەو کەسانەبوو کە دڵنیابووم لە هەر کوێ بووبێت، تەنیا کاری بۆ خۆی کردوە.

باوەڕم نەدەکرد نزار بەوجۆرە ببینمەوە، من حیکایەتی ئەو شەوەتان بۆیە بۆ دەگێڕمەوە، تا بزانن دونیای نوێ بە چ هەستێکەوە لە دڵی ئێمەدا دەستیپێکرد. گەرچی ئەو شەوە من لە سەرکەوتووان بووم، بەڵام هەستێکی نادیار ئاگاداریدەکردمەوە کە هیچ شتێک لە سەرەتای سەردەمێکی نوێ ترسناکتر نییە، خۆم ئەو ترسەم تێدابوو، بەڵام قووڵایی ڕاستەقینەی ئەو ترسەم بەتەواوی لە چاوی نزاردا بینییەوە.

ئەو شەوە شپرزە و بێقەرار چەند ماڵ و چەند جێگا لە دووی گەڕام، دەبوو ببینم، دەبوو بزانم لە کۆتایی ئەم سەردەمەدا بیر لە چی دەکاتەوە، دواجار لە ژێر زەمینێکی ڕازاوە و خۆش ئەساسدا دۆزیمەوە، لەسەر مێزێکی پڕ مەی و مەزە دانیشتبوو. جێگاکە پەناگەیەکی نهێنی بوو کە کەسێکی خوداپێداو بۆ ڕۆژی تەنگانە دروستیکردبوو، تا گەر ڕۆژێک بەدبەختی ڕووی تێکرد، دواجار لەم ژێرزەمینە جوانەدا، هەستی شکۆ و تامی خۆشبەختی نەدۆڕێنێت. جێگاکە ویقارێکی کلاسیکی تێدابوو، وەک ئاماژە بێت بۆ دیکۆر و ئەکسسواری سەردەمێک کە هێدی هێدی بە ناخی زەویدا ڕۆدەچوو، تا لەسەر نغرۆبوون و خنکانی جۆرە دونیایەکی تازە سەرهەڵبدات. نزار جێگاکەی بۆ شەوێک خواستبوو، وەک بیەوێت لە ناو شکۆدارترین شێوە و دیکۆرەکاندا، دوا شەوی ئەو دونیا کۆنە بژی. سەیری لێهات توانیومە بەم نیوەشەوە لەو ژێرزەمینەدا بیدۆزمەوە، چاوانی ئاوساو و خەواڵووبوون، بەڵام لێوی خەندەیەکی گاڵتەجاڕی گەورەی لەسەر بوو. کە باسی شەڕەکانی ئەمڕۆم بۆ کرد، کە بینی من بە جلی مەیدانی جەنگەوە هاتووم بۆ لای، ئەو خەندەیەی لە بری کاڵبێتەوە، گەورەتر و ڕوونتر بوو. بێئەوەی دەست لە شەرابەکەی بەردەمی بەردات،

گلاسێکی بۆ منیش تێکرد و سەری بە سەرسامی بادا و گووتی «هەڤاڵ، دونیا بێئابڕوویەکی عەجیبە. دوێنێ شەو ئەم کاتانە بەعسییەکان هەموو شتێک بوون، کەچی ئەمڕۆ لە درۆیەکی گەورە بەولاوە هیچی تر نین. بۆ من دوور ... زۆر دوور دیارن. سەردەمێک بوو هات و ڕۆیشت... ئیتر جگە لە ماڵاوایی هیچی دیمان لە دەست نایەت... خودا حافیز، خوداحافیز ... من وەک تۆ نیم، تۆ دڵسۆزیت، کەسانی وەک تۆ دەبێت ڕۆژگار سوپاستانبکات، تۆ وەک ئەو هێسترە وایت کە زەمانە باری خۆی لەسەر شانت دەنێت و نەقیزەیەکت لێدەدا و دەڵێت بڕۆ». وەک جاران تۆنی گاڵتەکردن لە دەنگیدا نەبوو، بەڵکو هەستمکرد دڵی بۆم دەسووتێت. دەمێک منی بە هێستر ناونا لە دڵەوە پێم ناخۆش بوو، بەڵام زانیم ڕاستدەکات، من هێستری ئەو عەسرە بووم، باربەرێکی شاهانەی ئەو ڕۆژگارە کە بە کۆڵی خۆم قورسایی زەمان و زەمینم دەگواستەوە بۆ سەردەمێکی تر.

نزار لە کاتی ئاساییدا سەیریدەکرد بزانێت قسەکانی چ کاریگەرییەک جێدەهێڵن، تیلەیەکی چاوە مەست و مۆنەکانی تێدەگرتیت و لەزەتی لەوە دەبینی هەست بە دڵشکان بکەیت، بەڵام ئەو شەوە وانەبوو، هەتا نیگایەکی کورتیشی تێنەگرتم، بزانێت بەو وەسفانەی ڕووم تاڵ دەبێت یان نا. بێئەوەی بۆ ساتێک ئەو هەستەم لا ونبکات کە بۆ من دەدوێت، هاتەوە گفت و گووتی «من تۆ نیم، من دەبێت سوپاسی ڕۆژگار بکەم، من کەسێکی مشەخۆرم، بە هەموو هوشیارییی خۆمەوە بوومەتە مشەخۆر، من مشەخۆریم هەڵبژاردوە نەوەک ئەو من هەڵبژێرێت، خۆم چ بارێکم هەیە دەیخەمە سەر شان و ملی ئەو زەمانەی تێیدا دەژیم و وەک هێستر دەیدەمە بەر خۆم. مێژوو لای من کاروانێکی گەورەیە، ئەرکێتی من بگوازێتەوە... من چ کارم بە مێژووە، گەر وەک حوشتر نەتوانم سواری ببم. هەڤاڵ وەفا، لە مێژوودا مرۆڤ یان هێسترە یان خاوەنی هێسترەکەیە، ناکرێت لە یەککاتدا هەم هێسترەکە و هەم خاوەن هێسترەکەش بێت، تا ئێستا هەڤاڵ تۆ لە ڕیزی بارگیر و ولاغەکاندا

بوویت، تۆ هێسترەکە بوویت، منیش خاوەن هێسترەکە بووم. لە ئێستا بەدواوە چۆن دەبێت؟ نازانم. ئێستا هەستدەکەم ئەو دەوروزەمانە بەسەرچوو، زۆر لە مێژە ئەو هەستەم هەیە. هەستێکی سەیرە هەڤاڵ، چاودەکەیتەوە و دەبینیت سەدەیەک کۆتایی هاتووە... چاودەکەیتەوە و سەیردەکەیت بۆشاییەکی قووڵ لە بەر قاچتدا دروستبووە، بۆ من وەک ئەوە وایە لە ناکاو لەجێگایەکی بەرزەوە کەوتبێتمە خوار. هەرواشە ... ئێمە چیین جگە لە کەسانێک کە بەردەوام دەکەوینە خوار».

دەنگی لە دەنگی نزاری جاران نەدەچوو، شتێکی تێدابوو نامۆ بوو بەو، غەم نەبوو، نائومێدی نەبوو، بەڵکو لاوازییەک بوو لە جۆرێکی تایبەتی، لاوازیی کەسێک دەزانێت چەندە فێڵباز و بەتوانا بێت هێشتا هێزی بەسەر ڕەشەبای زەماندا ناشکێت. لەوەتەی دەمناسی، بەردەوام شادییەکی شەیتانی لە دەنگ و نیگایدا بووە، کەچی ئێستا بووبوو بە کەسێک لەوانەی بە ڕوونی هەست بە دۆخی تراژیدیی خۆیان دەکەن. تراژیدیا لەوەدا نییە بزانیت جەنگێکت دۆڕاندوە، لەوەدایە بزانیت ئەگەرێکی گەورە هەیە، هەموو جەنگەکانی تریش بدۆڕێنیت. نزار لەو شەوەدا لەسەر ئەو کورسییە شاهانەیە، کە ڕەنگی ڕابوردووی هەبوو، جۆرە هەستێکی وەها لەناوەوە دەیخنکاند. دڵنیابووم نزار غەم بۆ بەعسییەکان ناخوات، بەڵام نەیدەزانی ئەو ڕۆژگارە تازەیەی سەرهەڵدەدات چییە و ئەو دەتوانێت چۆن لە ناویدا بژی. خراپترین سزایەک بۆ مرۆڤە خراپەکان ئەوەیە، دونیا وەها تاریکبکەیت، ئەوان بە ڕوونی و ئاسانی قوربانیی خۆیان نەدۆزنەوە. نزاریش لە جۆرە دۆخێکی وەهادا بوو، جێگای خۆی لەدەستدابوو، نەشیدەزانی لەو سەردەمانەدا کە دێن و بەڕێوەن، دەتوانێت لە چ مەیدانێکدا ڕاوبکات و لە چ وەردێکدا تانژی خۆی بەربداتە گیانی نێچیران.

ناخۆشترین هەستێک مرۆڤ تووشی ببێت ئەوەیە، کاتێک هەستدەکات دوێنێ بۆتە ڕابوردوویەکی زۆر دوور، بەڵام لە هەمانکاتدا دەبینێت سبەینێش هێندە دوورە، هەرگیز نایەت و نایگاتێت. هەردووکمان لەو

ساتەدا ئەو هەستەمان هەبوو، هەم دوێنێ بە بەرتەقای سەدان ساڵ و هەم سبەی بە بەرتەقای چەندین سەدە دوورە.

نزار بەو دەنگەوە کە باربوو بە نائومێدی، گووتی « هەڤاڵ گەرچی بەعسییەکان چەند سەعاتێکی کەمە جێیانهێشتووین، کەچی واهەستدەکەم ئەوان تەنیا وەهمێک بوون، وێنەیەکی گەورەبوون بەرۆکیان گرتین و ئەم جۆرە مرۆڤەیان لێ دروستکردین کە دەیبینیت ... بەعسییەکان هەر ئاوێنەیەک بوون، من و تۆ لە ناویدا سەیری خۆمان دەکرد. دەسەڵات نەدەمانکات بە خەڵکی باش و نە بە خراپ، بەڵام ئاوێنەیەکمان دەداتێ سەیری خۆمانی تیابکەین».

چەندین ساڵ بوو بەعسییەکان کۆمەکیانکردبووین پێناسەیەک بۆ خۆمان بدۆزینەوە، ئێستا ئەوان نەمابوون، ئێستا ئاسان نەبوو شتێکی تر بدۆزینەوە خۆمانی پێ پێناسەبکەین. هەستمکرد ئەوە هەردووکمانی خستۆتە چاڵێکی قووڵەوە. لە دڵی خۆمدا گووتم «ڕاستە. گەر دڕندەیەک نەبێت، دڕندەیەکی زۆر گەورە، ئەوکات من دڕندەیی خۆم چۆن و بە چی بپێوم؟».

بێئەوەی هیچ بکەم پێکەکەی ئەوم بەتوڕەییەوە هەڵداو بە قۆڵی کراسەکەم دەمم سڕی و لە قاپێکی قووڵدا دەستم بۆ دەنکێ چەرەس برد و هەستمکرد زۆرم برسییە، بەڵام جگە لەو هەستە خەنجەرئاسایەی برسێتی، چەندین هەستی نێزەدار و بریندارکەر لە ناوەوە دەیانبڕیم. نزار چیتر ئەو گەنجە نەبوو کە حەڤدە ساڵ لە مەوبەر لە دیوەخانی مەنسوور ئاغای زێڕوەلیدا لە سێناسکێ قسەیدەکرد، بەڵکو ئەو زەردەخەنە پڕ مەکر و گاڵتەجاڕەی هێدی هێدی تێکەڵ بە مۆنییەک دەبوو گەلێک مەکربازتر و شەڕانیتر لە جاران دەریدەخست، ئیتر خەندە شەیتانییەکانی ئەو غەمەیان نەدەشاردەوە کە شەو درەنگان زەفەریان لێدەهێنا. وەها بوو وەک بە درێژایی ڕۆژ گاڵتە بە ژیان و گەردون بکات، بەڵام شەو بچوکی خۆی بیربکەوێتەوە و تاڵییە ڕاستەقینەکانی دونیای بێتەوە بەرچاو. لەو ساڵەدا

چەند شەومان پێکەوە بەسەر بردبێت، درەنگان، دوای ئەوەی نیوەشەومان ڕەتدەکرد و قاچمان دەنایە ڕۆژی نوێوە، ڕوخساری بەتەواوی دەگۆڕا، مۆنتر و مۆنتر دەبوو، دەگەیشتە ئەوەی توانای پێکەنین و لاقرتیکردنی نەمێنێت. زۆرجار کە هەستیدەکرد ئەو دۆخە خەریکە دەیخات، هەڵدەستا و ناڕەحەت جێیدەهێشتم، تا بەو ڕوخسارەوە نەیبینم.

پێدەچوو ئەمشەو چاوەڕوانی کەسی نەکردبێت، دەرکەوتنی من تورەتریکردبوو ... هێند مەست نەبوو جڵەوی خەیاڵ و بیرکردنەوەی خۆی لەدەستبدات، بەڵام بە جۆرێک لە خۆیدا نوقمبوو، بۆی گرنگ نەبوو من ئەو غەمگینییە نهێنییەی ببینم و بە پەژارە و دڵتەنگییەکەی دڵخۆشبم. دەیزانی هەموو ڕقمان لە یەکە، دەیزانی بەدبەختی یەکتری بەختیارماندەکات، بەڵام ئەو شەوە هیچی نەکرد نەهێڵێت من بە بەدبەختییەکەی ئەو بەختیاربم.

کەمێک بە بێدەنگی سەیری بنمیچەکەی کرد، وەک زیرەکی هەمیشەیی خۆی لە دەست نەدابێت و بزانێت بیر لە چی دەکەمەوە، بێئەوەی سەیرمبکات گووتی «لەمڕۆوە دەبێت بە جۆرێکی تر بژین، هەر تۆ نا، هەمووومان. جەنگیز دونیا وایە، تاسەر لەسەر یەک ئاواز سەماناکات». هەناسەم سواربووبوو، بۆ یەکەمجار هەستمدەکرد برسێتی و هەناسەسواری پەرێشانیانکردوم، تورە دەمنواند، کاتی هەڵمژینی هەوا سکم بەشێوەیەکی سەیر بەرزدەبووەوە و دەنیشتەوە. گووتم «نزار پێمبڵێ، چیم بەسەر دێت گەر شۆڕش تەواو بێت، گەر ببم بە کەسێک ئیتر بۆ هیچ بیر و بڕوایەک کارنەکەم، هیچ شتێکی گەورە لە ژیانمدا نەمێنێت؟؟».

دەیزانی مەبەستم چییە، زەردەخەنە ناشیرین و بەدەکەی کەوتەوە سەر لێوی، ئەو زەردەخەنەیەی تا دەمرم خۆشم لێی نایەت و بێزارم لێی.

سەیرێکی قووڵی کردم، وەک دۆعایەکی شەیتانیم بەسەردا بخوێنێت، گووتی «هەمووی بۆ ئەوەیە بمێنیتەوە، هەمووی بۆ ئەوەیە». تێنەگەیشتم مەبەستی چییە. پێکەکەی پڕکردەوە و بە ڕق و قێزێکی

قوولەوە، بێئەوەی سەیری من بکات هەڵیدا و گووتی «شۆڕش تەواو، ئیتر دەبێت هەر کەسە و بۆ خۆی ئیشبکات. تۆ بۆ خۆت ئیشدەکەیت، جەنابی سەرۆک بۆ خۆی ئیشدەکات، شەیتان بۆ خۆی ئیشدەکات، خوداش لەسەروو هەموومانەوە بۆ خۆی ئیشدەکات». گووتم «تۆ هەمیشە ئیشت بۆ خۆت کردوە دەمەوێت پێمبڵێی چی بکەم، بۆیە هاتوومە لات ڕێنماییمبکەیت. دەمەوێت ڕۆحی خۆم وەربگرمەوە و ئیتر تۆزێک لە غەمی خۆمدا بم. تا ئێستا هەر چییەکم کردوە بۆ حیزب بووە، بە ئەمری جەنابی سەرۆک بووە، بە ئەمری ئەنجومەن بووە. تۆ ناڵێیت من هێستری حیزب بووم، لەوەدا لەسەر هەقی، هەرچییەکم کردوە بە عەقڵی هێستر کردومە، وڵاغی ئەوانی تر بووم. بەس لەو کاتەوەی ئەو ژنانەم کوشت شتێک لە مندا گۆڕاوە، دەمەوێت لە غەمی خەو و خەیاڵاتی خۆمدا بم. ئەم ڕۆژانەی دوایی کە دیسان شەڕی بەعسییەکانمان دەکرد، بۆ من ڕۆژانێکی خۆش بوون، چووبوومەوە هەوای جاران، دەمگووت بۆ شۆڕشە، بۆ ئەم شارەیە، بۆ ئەم حیزبەیە، بەڵام تەواو ... نزار، ئەمشەو هەستدەکەم ئیتر هیچ نییە دامپۆشێت، هەست بە ڕووتی دەکەم».

دەنگم تەنیا پرسیار و سەرسامی تێدا نەبوو، بەڵکو ترسی تێدا بوو.

بە نائومێدییەوە گووتی «منیش تەواو، تەواو... تۆ کاتێک هۆشت هاتۆتەوە، هەموو شتێک تەواوبووە». زۆرتوڕەبوو، پەرداخەکەی بە هەموو هێزی خۆی کوتا بە زەوییەکەدا و گووتی «بۆ منیش هەموو شتێک تەواو». پارچەی شکاوی پەرداخەکە بەو ناوەدا بڵاوبووەوە. سەرسام بووم لەو ڕەفتارەی، لە هەفتەکانی پێش ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕیندا هەرجارێک دیبێتم، داب و ڕەوشتی دۆستانەی ڕەچاوکردبوو، بەڵام ئێستا بە یەکجار وادەرکەوت وەک حورمەتی من نەگرێت، وەک ڕێزی لا نەمابێت و ڕێگا بەخۆی بدات هەر بێئەدەبییەک مەیلی لێ بێت بیکات. بە کەمێک ئارامییەوە کە هیچ لەگەڵ دڵ لێدان و هەڵچوونی ناخمدا نەدەگونجا، گووتم «چی تەواو؟». گووتی «لەوەوبەر هەموو کارتان بۆ شۆڕش دەکرد من نەبێت، ئیتر ئاسان نییە، لەمڕۆوە ئیتر هەمووتان تەنیا بۆ خۆتان

ئیشدەکەن. لە سەرۆکەوە بیگرە تا ئەندامەکانی خوارەوە، ئیتر هیچ شتێک وەک جاران نامێنێت. تۆش وەکو پیاوێکی گێل و گێژۆکە هاتوویت کۆمەکت دەوێت، فێرتبکەم چۆن بۆ خۆت بژیت ... ئەوە شتێکە سەردەمەکە خۆی دەتداتێ، شتێکە لەخۆیەوە دێت». وەک پەشیمان بێت لەو توڕەییە گەورەیەی، وەک هەوڵبدات بەسەر کینە و بێزارییە ڕەشەکانی خۆیدا زاڵ بێت. لە شوێنەکەی خۆی هەستا و بە هێمنی گووتی «گوێبگرە گەر قسەی منت دەوێت، دوو ڕێگات لەبەرە. یان ئەوەیە واز لە هەموو شتێک بهێنیت و ئیشێک بدۆزیتەوە و بۆ خۆت بژیت. پیاوە شەریفە گەمژەکان وادەکەن، دەچن ئیشێکی تر دەدۆزنەوە، ماڵێک پێکەوە دەنێن، ژنێکی گەلگەنیو دەخەنە ناوی و دەبن بە پیاوی ناو پیاوان و دادەنیشن. بەڵام من دەزانم تۆ وەها گەمژە نیت، لەو ڕۆژەوەی ژنەکانت لەبەردەممدا کوشت زانیم تۆ هێندە شەریف نیت، لەو ڕۆژەوەی بۆ جاسوسی هاتیتە سێئاسکێ دەتناسم. پیاوێکی بەهرەت هەیە، گەر بتەوێت شەیتان بە شاگرد ناگریت و بێ یارمەتی ئەویش کاری خۆت هەر دەکەیت. گەر دەتەوێت بۆ خۆت ئیشبکەیت، ئێستا نابێت بیدرکێنیت ... سەردەمی شۆڕش پیاو دەیتوانی هەموو شتێک بکات بێئەوەی پێویستی بەوە بێت هیچ شتێک بۆ کەس ڕوونبکاتەوە... ئەوە پیاوێکی کۆیلە لە پیاوێکی ئازاد جیادەکاتەوە، من لەسەر بیرو بۆچوونی خۆمم، چەندین ساڵ لەوەوبەر چیم پێگووتی هەر ئەوەیە. ئازادی ئەوەیە. گەر ئەوەش نەبێت، ئیدی وشەیەکی بۆش و بێمانایە».

بۆ عارەقی دەمی کە لە دوورەوە دەگەیشتە من، نیشانەبوو لە مێژە دەخواتەوە، دیاربوو بەر لە هاتنی منیش زانیاری هەبووە بەعسییەکان تێکشکاون و هاتووە لەم خەڵوەتەدا بیربکاتەوە. پەرێشان دیاربوو، ناوەوەی ئاڵۆزییەکی گەورەی تێکەوتبوو، سەیرکردن و گوێگرتن لەو کەمێک خۆمی بیربردمەوە، ئەوەی نزارم لە دۆخێکی وەها ناخۆشدا دەبینی، دەمبینی پڕبووە لە دوودڵی و پرسیاری تاریک، خۆشحاڵیدەکردم. حەزمدەکرد پێیبڵێم ئاواتەخوازم بەدبەخت بیت، ئاواتەخوازم هیچ کات

ئاسوودە نەبیت، من ڕقم لێتە ... بێنەوەی پێویستیم بە هیچ هۆیەکی دیاریکراو بێت ڕقم لێتە، بەڵام بە پیاوێکت دەزانم گەر نەبیت، دونیا ڕوویەکی خۆی لەدەستدەدات، دەموچاوی تۆ زۆر یارمەتیم دەدات لەبەر ئاوێنەدا دەموچاوی خۆم ببینم.

دەمزانی گەر ئەوانەشی پێبڵێم قسەکانم نە برینداری دەکەن، نە مانایان هەیە بۆی. لەو خەیاڵاتانەدا بووم، بە مەکر و شەڕانگێزییەوە گووتی «هێی هەڤاڵ ... خۆت دەزانیت، من کە کۆمەکم بە ئێوە کرد، شۆڕشم بۆ گرنگ نەبوو، شارم بۆ گرنگ نەبوو، خودام بۆ گرنگ نەبوو. با شتێکت پێبڵێم، تۆ بەمجۆرە نابیتە کەسێکی ئازاد، ڕۆحی خۆتت بۆ وەرناگیریتەوە، چونکە گێل و نەفامیت. کە تۆ ژنە عەرەبەکانت کوشت، ئازاد نەبوویت، بەڵکو ئارەزووەکانی منت ڕزگاردەکرد، تۆ هێستری من بوویت. بەڵام هێندە هێسترێکی بێهۆشیت، وادەزانیت ژنەکانت بۆ خۆت کوشتووە. هێی هەڤاڵ، ئەی چی ... گەر لیڤیتانت ئەسپەکانی پێ کوشتبیت، ئەوا ئەمجارە من ژنەکانم پێ کوشتی. تۆ ناتوانیت ئازاد بیت، چونکە هێشتا گوناهێکت نەکردوە گوناهی خۆت بێت... من کە کەسێک دەکوژم نامەوێت بڵێم خودا ویستی، وەتەن بانگەوازی هەڵدا، شۆڕش فەرمانیدا، دەمەوێت پڕ بە دڵ هاواربکەم من ویستم... من». قسەکانی وەک هەمیشە توڕەیاندەکردم، وەک کەسێک تەم و ناڕوونییەک لە بەرچاوی بڕەونەوە و لە پشت پەردەکانەوە ڕاستییەکی بەسوێ ببینێت، غەمگین، بەڵام توڕە بووم. چاوانی مەست بوون و دەنگی مەست، گووتی «هەڤاڵ، بەڵام ئیتر تەواو. سەرکەوتنی شۆڕش بەدبەختی بوو بۆ من، دڵنیام ڕۆژگارێک دێت دەتوانم لە هەر سەردەمێکی تر خۆشتر بژیم، بەڵام بۆ هەموو شتێک دەبێت بەهانەم هەبێت، ڕوونکردنەوەم پێبێت، بە خەڵک بڵێم بۆ؟ بە دادگاکان بڵێم بۆ؟».

تۆنێکی گریاناوی دەنگی گرکردبوو، سەیریکردم و تێگەیشت من بە بینینی لەم لاوازیی و ترسەدا بەختەوەرم، خۆی هێورکردەوە و دانیشت و ڕیتمی قسەکانی خستە سەر ئاوازێکی هێمن، بەئەسپایی و لە ژێر لێوییەوە

گووتی «ئەوسا من لە شاردا هەموو شتێک و ئێوە لە شاخ هەموو شتێک بوون. بەڵام ئێستا ئەوە مەحاڵە. تۆ بوەستە دەبینیت ماوەیەکی تر ئێرە دەبێتە جەنگەڵ... سەردەمێک منت لە سێئاسکێ بینی، من تاکە عاقڵی ناوتان بووم، کامتان هەیە وشەی شۆڕش، کورد، کوردستان، خەڵک، جەماوەر، زەحمەتکێشان مەستی نەکردبێت؟ کێتان هەبوو وشەکانی ئەو قاموسەی وەک قولاپی ژەهراوی قووت نەدابێت؟ هەمووتان کۆمەڵێک سەرخۆش بوون و ئەو وشانە لە خشتەی بردبوون، کۆمەڵێک سەرخۆش... من تەنیا کەسێک بووم سەیرمدەکردن و لە ژێرەوە پێدەکەنیم. بەڵام ڕۆژگارێک بەڕێوەیە، هیچ کەس ئەو وشانە مەستی ناکات. ئەمشەو بەعسییەکان ڕۆیشتن و هەموو ئەو درۆ و خورافاتانەیان لەگەڵ خۆیاندا برد کە ئێوە پێی مەستبوون، تۆ و برادەرەکانت لە حیزبدا، لە بەرەی کوردستانیدا، لەمشەوەوە هەمووتان لە من هوشیارترن... نازانیت ئەوە چەند ناخۆشە بۆ من؟».

مەستییەکەی وردە وردە بەریدەدا، حەسرەت و توڕەییەکەی کارێکیان دەکرد کاریگەریی عارەقەکە خێرا بڕەوێتەوە. دەستیکرد بە گەڕان بە ژوورەکەدا، من لەجێگای خۆم دانیشتبووم، بەڵام دەنگی هەناسە و خیزەی سنگم ئەو ناوەی پڕکردبوو. گووتی «دەزانم ئێستا یەکێک دەڵێت وشەی تازە دێت، خەڵک قسەی تر دەدۆزنەوە پێی مەست بن، دروشمی نوێ دروستدەکەن، هوتاف بۆ شۆڕشی نوێ دەکێشن، بەڵام وانییە هەڤاڵ، جارێکی تر هیچ وشەیەک نایەت وەک ئەوانەی ڕابوردوو خەڵک مەستبکات. جارێکی دی بەم زووانە هیچ جۆرە وشەی وا کاریگەر نابیستینەوە».

تەنیا گوێمدەگرت و سەیرمدەکرد و هەستە تێکەڵاوەکانی ناخم وەڕزیاندەکردم.

ئێستا کەم کەم دەچووەوە سەر ڕیتمی جارانی خۆی، بەو نیگا شەیتانییەوە کە هەموو ساغێکی نەخۆشدەخست، بە لاقرتییەوە گووتی «هەڤاڵ پێت وایە شۆڕشگێڕەکانی هاوڕێت، شێخ و مەشایەخەکانی شاخ،

لێرە لە من باشتردەبن. چ کەسێک هەیە نەزانێت من خراپەکارم، مشەخۆرم، حەیوانێکی پیس و چەپەڵ و خۆژێنم کە بەس دەمەوێت بمێنمەوە ... هەموو کەس دەزانێت من چ کەسێکی دڵ ڕزیو و کرمەڵۆکم ... هیچ کات شاردومەتەوە؟ هیچ کات گووتوومە نزار ئیدریس پیاوێکی بە ویژدان و بە شەرەفە؟ بەڵام باوەڕناکەم هاوڕێکانی تۆ ناموس و سەربڵندی منیان هەبێت. گەر من لە ساڵانی ڕابوردوودا لەزەتم لەوە بینیبێت هەموو شەرەفێک بشکێنم، چ ئابڕوویەک قایمە ئەتکیبکەم، وادەزانی سولالە و نەوەی بێشەرەفان لەمڕۆدا و لە مندا تەواو دەبن، هەڵەی هەڤاڵی عەزیز، سبەی ئەم شارە پڕدەبێت لە هەزاران کەس، من لە بەردەمیاندا وەک فریشتە دەنوێنم... بە من دەڵێیت حەزت لە ئافرەتە، سبەی کەسانێک دێن لە من داوێن پیستر دەبن، بەڵام وەک من نابن، وەک من بێترس و لە ئازادییەوە خراپە ناکەن، تاکە هێزی من ئەوەیە لە ئازادییەوە خراپە دەکەم. ئازادی لای من خراپەیە و لە خراپە جیانابێتەوە ... درۆزنن ئەوانەی ئازادی و ئەخلاق پێکەوە گرێدەدەن».

لەویادا بە دەنگی بەرز پێکەنی، چاوانی هەمان ئەو نیگایەی جارانی تێکەوتەوە کە نیگای کەسێک بوو لە منداڵییەوە خوێنێکی شەڕانی و درندە لە دەماریدا دەگەڕێت. توند شانی گرتم و وەک بیەوێت شتێکم تێبگەیێنێت کە تێیناگەم، گووتی «هاوڕێکانت ئیتر بە ترس و لەگەڵ هەستکردن بە گوناهـدا سوار دۆستەکانیان دەبن، هاوشان بە هەستی شەرم و ڕیسوایی دزیدەکەن». دووبارە دەنگی هێمنکردەوە و گووتی «خەڵکانێک دروستدەبن کە دەدزن، تاڵانیدەکەن، هەزار جار لەمن زیاتر بۆ خۆیان ئیشدەکەن، بەڵام دەبێت خۆیان بشارنەوە، هەر شتێکیان کرد دەبێت دەمامکێکی ئەستوور بخەنە سەر دەموچاوی خۆیان، تەنیا بەو دەمامکەوە دەتوانن بژین، بەڵام مرۆڤ کە دەمامکی خستە سەر دەموچاوی ئیتر تەواو، دەبێت هەموو ژیانی خەریکی ئەوەبێت دەمامکەکەی نەکەوێت ... تێدەگەیت ... من بۆیە بەختەوەربووم، چونکە ئەوەندەم هێز هەبوو بتوانم دەمامک نەکەمە سەرم، ژیانی خۆم لەوەدا

سەرف نەکەم، خەریکی دەمامک بم. پێویستیم بەوە نەبوو دەستکاری دەموچاوی خۆم بکەم. دەمتوانی بڵێم من ئەمەم... ئەم پیاوەم و تەواو. بەڵام هەڤاڵ، ئەمڕۆ ئەو سەردەمەش بەسەرچوو. ڕۆژگارێک بەڕێوەیە من لە چاو ئێوەدا دەبم بە حەزرەتی پەروانە. هونەری من لە چاو هونەری ئێوەدا دەبێتە یاری منداڵان ... من تیاچووم، تیاچووم. سەردەمێک دێت نزار ئیدریس، بلیمەتی عەسری خۆی، قۆڵبڕی ناوازەی حەفتا و هەشتاکان لە چاو درۆزن و ساختەکارە تازەکاندا، وەک گەوج و گەمژە دەردەکەوێت... ئەمشەو سەرەتای ئاوابوونی سولالە بەستەزمانەکەی منە ... بەڵام شتێک ئێوە پێی ناگەن ئەوەیە، بەو جۆرە ئازادبن کە من ئازادبووم، ئەوە شتێکە هیچ کات پێی ناگەن، بۆیە دڵنیابە تۆ و هەڤاڵەکانت، جیهانێک دروستدەکەن پڕ لە دەمامک و پڕ لە قێز».

لەگەڵ قسەکانی ئەودا هەناسەم توندتر و توندتر دەبوو، سەیرم لێهات کە وا سەیری پاشەڕۆژ دەکات، خەمی من تەنیا ئەوە بوو گەر فاشیستەکان نەمێنن چۆن و چی مانایەکی تری پیرۆز و مەزن بۆ شەڕە گەورەکانی ژیانم بدۆزمەوە. بەڵام نزار دەردێکی تری هەبوو، بە جۆرێک قسەیدەکرد، من هیچ چارێکم نەبوو جگە لەوەی گێلانە بپرسم «ئەی تۆ چۆن دەژیت؟ لە پاشەڕۆژدا چی دەکەیت؟ پلانت چییە؟ پێمبڵێ». گووتی « هەڤاڵ جەنگیز، من لە منداڵییەوە جگە لەوەی هەموو زنجیرێک بپسێنم هیچی ترم نەکردوە، باوکم و دایکم وەک حەیوانێکی دەستوپێ بەستراو هێنامییانە دونیاوە، من کوڕی مەلا بووم، کوڕی پیاوێک پیشەکەی دروستکردنی حەرام و حەڵاڵ بوو. پێمبڵێ چ شتێک لەوە پیستر هەیە کوڕی کەسێک بیت، پیشەکەی ئەوە بێت قەناعەت بە خەڵک بکات بەدبەختی خۆیان خۆش بوێت ... حەرام چییە؟ شتێکە دروستکراوە تا من بیشکێنم. دەزانی چی؟ من ڕۆژێک ئەو پیاوەم بە دەستی خۆم کوشت، وەک سەگ سەریم گرت و خستمە ناو حەوزی مزگەوتەکەی خۆیەوە، بۆ ئەوەی لەوە زیاتر دونیا بە حەپەحەپی خۆی وەڕزنەکات. گوێبگرە ئەوە یەکەمجارە لە ژیانمدا ئەو نهێنییە دەدرکێنم، من مەلا ئیدریسم کوشت،

هەموو گومانیان لە من بوو، بەس کێ دەیتوانی و جورئەتی دەکرد بڵێت تۆ کوشتووتە. من ئەوکات ڕام وابوو هەموو باوکی خۆیان بکوژن، بەڵام لە هەموو سەردەمێکدا تەنیا یەک قارەمان دروستدەبێت کە دەتوانێت باوکی خۆی بکوژێت، قارەمانی ئەو سەردەمەش من بووم. ڕۆژێک منی بردە حوجرەکەی خۆیەوە ئامۆژگاریمبکات، پێمبڵێ واز لە چاوبازیی و کچبازیی بهێنم و نەکەومە سەر کەڵکەڵەی حەزکردن لە دونیای ژن، ویستی بیرمبخاتەوە خودا هەیە، دۆزەخ هەیە، شەیتان هەیە کە ئیشی تەفرەدانی ئینسانە. پێکەنینم بە هەموو قسە پوچەکانی دەهات. تێدەگەیت، خەندەم بۆ گرت و گووتم «مەلا گیان وەرە دەستنوێژێک بگرم و نوێژێک بکەم و بە پشتی تۆ، داوای تۆبە لە خودای گەورەمان بکەم». نەیزانی بۆ کوێی دەبەم، مزگەوتەکە چۆڵبوو، لە قەراغ حەوزەکە وامکرد بخلیسکێت و بکەوێتە ئاوەکەوە، تا هێزم تێدابوو فشارمدا و گووتم «بگەڕێوە بۆ لای خودای خۆت، قووڵ ئاو هەڵمژە و بە جبەی ئیمانەوە بچۆرەوە حزوری باری تەعالا». خنکاندم و پێدەکەنیم، خنکاندم و تا ئەمڕۆ هەست بە هیچ ئازارێکی ویژدان ناکەم. بەڵام بەردەوام گەڕاوم یەکێک بدۆزمەوە ئەم چیرۆکەی بۆ بگێڕمەوە، لە هیچ جێگایەکدا پیاوێکی وەهام نەدیوە ئەو ئەمانەتەی ڕۆحی خۆمی بدەمێ. ئەو ڕۆژە کە تۆ ژنەکانت کوشت، لە دواوە سەیرمدەکردی، چ هێمن، چ ئاسنین، چ ئیرادەدار ئەو کارەت کرد. جگە لەوەی ئافەرینت بکەم هیچی ترم لە دەست نەدەهات، لەویادا زانیم گەرچی تۆ هێشتا کۆیلەیت، هێشتا عاشقی ئەوەی لغاوی خۆت بدەیتە دەستی ئەم و ئەو، بەڵام تۆ تەنها کەسێکیشی دەتوانم نهێنی خۆمت پێبڵێم، تەنیا کەسێکی تێمدەگەیت، دەزانیت دەڵێم چی... تۆ دەتوانیت وەک من بیت، بەڵام ئەخلاقی شۆڕشگێڕانە شێواندویتی، فاسیدی کردویت. ئەخلاقی شۆڕشگێڕانە پیاوکوژ دروستدەکات، بەڵام پیاوکوژێکی درۆزن کە خۆی لێ بۆتە پێغەمبەر. تۆ هێزی ئەوەت تێدایە قارەمانێکی گەورە بیت، بەڵام بوویت بە هێستر. هەڤاڵ، من سەری مەلا ئیدریسم گرت و گووتم مەلا برۆ بۆ بەهەشت، سوار شەسەندەفەرەکەت بەو برۆ بۆ بەهەشت، بەڵام ژیان نەقڵیات نییە یەکێک بەردەوام هاواربکات و بەخەڵک بڵێت ـ سواربن

بۆ بەهەشت، سوارین بۆ بەهەشت ـ. لێگەڕێ ئێمە بژین و گوناهی خۆمان بکەین و بە ڕێگای خۆماندا بڕۆین و ئەوەندە بە فلتەفلتەکانت تورە و نیگەرانمان مەکە. دونیا لەوە ناخۆشترە پێویستیمان بە هیچ واعیزێک بێت قسەمان بۆ بکات. لەو ڕۆژەوە هەر شتێک بێتە سەر ڕێگام و بزانم ئازادیم دەخاتە مەترسییەوە، تێکیدەشکێنم، هیچ کاتێکیش حەقیقەتی خۆم نەشاردۆتەوە... من دەزانم هەمووان وەک هەتیوێکی داوێنپیس و بێبار و بێبڕوا سەیرمدەکەن، بەڵام لە قووڵایدا من تاکە قارەمانم، من تاکە قارەمانی ئەو عەسر و زەمانە بووم. گەر ئەم دونیایە ئەخلاقی هەبێت، دەبێت خەڵاتی خۆی ببەخشێتە من. بەڵام تەواو، ئیتر ژیان بێدەمامک جەهەنەمە. لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشەوە، دونیا پڕدەبێت لە پیاوکوژی دەمامکدار کە لە قیافەی پێغەمبەراندا خۆیان نیشاندەدەن، لە قیافەی سیاسەتمەدار، بازرگان، وەزیر، قایمقامدا دەردەکەون، هەوڵدەدەن ئەوپەڕی سادە و زیرەک و بەڕێزبن، بەڵام لە ناخدا هیچ نین جگە لە مرۆڤی برسی. هەتا زۆر برسیتر لە منیش، لەدوای ئەمشەو هیچ کەس ناتوانێت بە دەموچاوی ڕاستەقینەی خۆیەوە بژی، نە من و نە تۆ. نازانم، لەوانەیە شۆڕشی منیش لێرەدا تەواو بووبێت... منیش سێ ڕێگام لەبەردەمدایە، سێ ڕێگا ...». وای گووت و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دەستی وەک دەمانچەیەک گردکردەوە و ڕوویکردوە سەری خۆی و گووتی «یان خۆم بکوژم». کە وایگووت چاوانی بریسکەیەکی قووڵ و ڕۆمانسی و بوێرانەی تێدابوو، دڵنیابووم ئەو بریسکە نهێنییەیە دەیان ژنی مەستکردوە و بۆتە هۆی ئەوەی شێتانە بکەونە دوای «یان ڕازیبم بەوەی بەدەستمهێناوە و دەستی پێوەبگرم و خۆم لەسەر شانۆ بکێشمەوە و ئیتر دەرنەکەوم ... یاخود دەموچاوی ڕاستەقینەم داپۆشم و خۆم بکەم بە کەسێک وەک هەر کەسێکی تر، ببمەوە بە شۆڕشگێڕێکی ڕەشۆکی ترسناک، ببمەوە بە یەکێک لە ئێوە، ماوەیەک خۆم ونبکەم و لەوسەر لە قات و پانتۆڵی جەنتڵمانێکدا بگەڕێمەوە».

تا نزیکی دەمەوبەیان هەر لەو قسانەی کرد، من لە جێگایەکدا زانیم هیچی بۆ من پێ نییە، هەستام و خوداحافیزیم لێکرد و هاتمەوە باوەشی شەو. ئەو شەوە بێ هیچ وەڵامێک دەربارەی چارەنوسی خۆم لای نزار ئیدریس هاتمەدەرێ. نزار دواتر ماوەیەک نوقمی بێدەنگییەکی کوشندەبوو، لە ناکاو لە چاوان ونبوو، وەک ئەوەی زەوی قووتی دابێت و ئاسمان هەڵیکێشا بێت، ئیدی کەس نەیدەزانی لە کوێیە و هەواڵی دەست نەدەکەوت. دەمێک ناوی هاتەوە بەردەمم، ئیدی کاتی بوو باجی هەندێک لە گوناهەکانی خۆی بدات. ئێستا دەزانم پەرێشان بوونی ئەو شەوەی، نیشانەی ئەوەبوو کە بە ڕوونی داهاتووی غەمگینی خۆی دەبینێت... لە مێژوویەکدا هێندە دڵڕەقە، هیچ جانەوەرێک چەندە پێستی ئەستوور و ئێسکی قایم بێت، ناتوانێت بەرگەی سوڕ و خولاندنەوەی چەرخە گەورەکانی بگرێت. نزار مەلەوانێکی لێزان و شارەزا بوو، دەیزانی لە چ چرکە و ساتێکدا دەبێت خۆی بکات بە ژێر ئاودا و کەی و لە چ جێگایەکیشەوە سەردەربهێنێت، بەڵام بەخت بە جۆرێک دوژمنی بوو، وریایی و دانایی نەیانتوانی تا سەر کۆمەکی پێبکەن.

## تاعوون و کتێب و تاوان

لە ساڵی 2006 لە ڕووداوێکی سەیردا دوو کوڕی گەنج ژیانیان لەدەستدا، هەر دوو گەنجەکە لەسەر یەکێک لە شەقامە گشتییەکانی شار و لە یەکێ لەسەعاتە هەرە جەنجاڵەکاندا بەئاشکرا و بێ هیچ شەرمێک بە بەرچاوی خەڵکەوە برانە ناوەڕاستی جادە و بە دوو دەستڕێژی درێژ کوژران. هەر دووکیان برابوون، یەکێکیان تەمەنی هەژدە ساڵان و ئەویتریان تەمەنی حەڤدە بوو. کەسانێک لەو ساتەدا لەوێدا بوون، تاوانبارەکانیان بینی. هەموو خەڵک زانیان لە ماشێنی کێ دابەزیون، کێ فەرمانی بە بکوژەکان داوە تەقەبکەن و کێ لە پشت ڕێکخستنی تاوانەکەوە بوو. بکوژی سەرەکی کوڕێکی «سەید ئیقباڵ» بوو، ئەندامی

بیرۆی سیاسی حیزب و هاوکارەکانیشی بۆدیگاردەکانی خۆی بوون.
کوژراوەکانیش دوو قوتابی بوون لە پیاسەیەکی ئێواران دەگەڕانەوە، دوو
برای کچێک بوون کوڕەکەی سەید ئیقباڵ شێتانە عاشقی بووبوو.
چیرۆکەکە وایە؛ دوای چەندین هەوڵی کوڕەکەی سەید ئیقباڵ کە ناوی
جەوانمەرد بوو، کیژە شەرمن و بەستەزمانەکە نەیوێرابوو ملبدات بۆ هیچ
جۆرە یارییەک و خۆی لەوە پاراستبوو وەڵامی تەلەفون، ئیمەیل، ئێس ئێم
ئێسی کوڕە بداتەوە. هەڵبەت جەوانمەرد سەرەتا هەموو ڕێگا نەرم و
نیانەکانی تاقیکردبووەوە، کە هەوڵەکانی بێدەرەنجام بەر دیواری ڕەق و
ئەستووری بێمەیلی کیژەکە کەوتبوون، ڕقێکی نێرانەی شێت لە ناویدا
کڵپەی سەندبوو. چەند نامەی هەڕەشەی بۆ کچە ناردبوو، بە ڕوونی
نوسیبووی گەر لەوە زیاتر دڵی بشکێنێت، لە سزای دڵشکانی خۆیدا
بەدبەختیدەکات و براکانی دەکوژێت. هەمووان «لەوانە جەنابی
بەڕێوەبەری پۆلیسیش» هەڕەشەکانیان بە فشە و فیشاڵی گەنجێکی
درۆزن دانابوو، گوایە لەو ڕێگایەوە غەمی عەشقێکی ناکام بەبادەدا.
ئێوارەیەک تاوانەکە ڕوویدا، شار لە گەورەیی گوناهەکە لەرزی و وەک ئاگر
لە پوش بەردەیت هەواڵەکە بڵاوبووەوە، بەڵام ئەوەی سەیربوو دەمێک
مەفرەزەکانی پۆلیس چوونە سەر ماڵی بکوژەکە، سەید ئیقباڵ خۆی و
هێزی هاوشانی بە چەکەوە دامەزرابوون و ڕوون و ئاشکرا بە پۆلیسە
بەدبەختەکانیان گووت، هیچ کەسێک لەم دونیایەدا ناتوانێت کوڕی سەید
ئیقباڵ یان یەکێک لە پاسەوانەکانی بگرێت. مەسەلەی گرتن و نەگرتنی
کوڕەکەی سەید ئیقباڵ لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا بووە مەسەلەیەکی
گەورەی ڕای گشتی، خەڵکی لە سەرتاسەری وڵاتدا لەمسەر بۆ ئەوسەر
داوای گرتنی گوناهبارانیان دەکرد، بەڵام لە گەرمەی ئەو هەرا زۆرەدا بوو،
سەید ئیقباڵ شەو لە تەلەفزیۆنەکانەوە لە پاڵ سەرۆکی خوالێخۆشبوودا لە
کۆبوونەوەیەکی گرنگدا دەرکەوت، هەر دوو لنگی پانکردبووەوە و بە
تەزبێحێکی دەنک زلی سوورەوە لە ناوگەڵیدا، قاقای لێدەدا.
دەرکەوتنەکەی سەید ئیقباڵ لەگەڵ سەرۆکدا، نامەیەک بوو لە شەخسی
سەرۆکەوە «خودا لە گوناهە بێشومارەکانی خۆش بێت» بۆ هەمووان، تا

تێبگەن هیچ کەسێک بۆی نییە لە ئاستی ئیقبالّدا زار بکاتەوە و شتێک بڵێ، سەرۆکی پۆلیس و جەنابی داواکاری گشتی کە دوو ڕۆژ لەسەریەک ئەو دیمەنەیان لە هەواڵەکانی سەعات شەش و هەشت و دەی شەودا بینی، زوو لە پەیامەکە تێگەیشتن و ژێرا و ژێر لە بەڕێوەبەری کەناڵی تەلەفزیونی حیزبیان پرسی و بۆیان دەرکەوت، هەر جەنابی سەرۆک خۆی «خودا غەرقی نور و بەخشندەیی خۆیی بکات» فەرمانی دانان و دووبارەکردنەوەی دیمەنەکانی داوە. ئەو کات هەر یەک لە جەنابی بەڕێوەبەری پۆلیس و داواکاری گشتی تەکنیکی خۆیان هەبوو، هێدی هێدی ڕیتمی شتەکەیان هێورکردەوە، گوتیان بەدوای گوناهباراندا دەگەڕێین، بەسزای خۆیانیان دەگەێنین، لێکۆڵینەوە دەکەین و عەدالەت درەنگ یان زوو هەر دەگاتە نیازی خۆی. مەسەلەکە ماوەیەک بابەتی سەرەکی ڕۆژنامەکان بوو، بوو بە کێشەیەکی سەمبولی بۆ نەبوونی دادپەروەری و زوڵم. بەڵام لە ناکاو وەک ئاوی دەریایاک چۆن دادەکشێت و پاشەکشەدەکات، مەسەلەکە خامۆش بوو، چیرۆکی تاوانەکە باسی لە ناواندا نەما، فایلی کوژراوەکان کرا بە ژێرەوە و تۆزی ڕووداوی تر و کێشەی تر نیشتنە سەری.

سەلام باباجان، بەرلەوەی ڕۆژنامەکان بگێڕێتەوە بۆ ئەرشیف، هەندێ لەو هەواڵانەی کۆپیکرد کەپابەند بوون بە «کێشەی سوداد و سەلام» «کە ناوی هەردوو برا کوژراوەکە بوون» تا لەبیری نەچنەوە. ئێستا دەبوو هەموو شتێک چەند جارێک بخوێنێتەوە، بیکاتە تێبینی و بەردەوام بگەڕێتەوە سەری تا لە بیریان نەکات. شتێک دەیویست تاقیبکاتەوە ئەوە بوو، ئاخۆ بەڕاست تاعوونی بیرچوونەوە بڵاوبۆتەوە یان نا. بۆ ڕۆژی دوایی کەچوو بۆ ڕۆژنامەکە، نیازی بوو لەگەڵ بەرپرسی لاپەڕەی ڕوداوەکانی ناوخۆدا «کاک جیهانگیر» قسەبکات و زانیاری زیاتری لێوەربگرێت، بەڵام سەیری لێهات کە بەرپرسی بەشی ڕوداوەکان هیچ شتێکی دەربارەی ئەو کێشەیە یاد نەمابوو، باباجان چەند هەوڵیدا کێشەی سوداد و سەلامی بهێنێتەوە یاد، بێسوود بوو. تا لاپەڕە کۆپییەکانی

دەرنەهێنا، تا کابرا شتەکانی هەموو نەخوێندەوە ڕووداوەکەی بەیادا نەهاتەوە. سەلام هەستیکرد کاک جیهانگیر جگە لە ڕوداوگەلێک لەم دوو هەفتەیەی دوایدا ڕوویانداوە شتێکی تری یاد نییە، هیچ شتێک. حاڵەتەکە لای سەلام سەیربوو، بەڵام جیهانگیر پێکەنی و گووتی «دەڵێی چی؟ جاری وایە ناوی خۆشم بیردەچێتەوە، ناوی منداڵەکانی خۆشم بیردەچێتەوە، تۆ دەڵێیت چی». باباجان ئەو چەند ڕۆژەی لە گەڕاندا بردەسەر، دەچووە هەر جێگایەک بەدوای ئەوەوە بوو بزانێت کێ بەسەرهاتی سوداد و سەلامی بیرماوە... هیچ کەس بەسەرهاتەکەی یادنەبوو، هەتا ڕوویکردە دادگا و هەندێک پشکنینی وردی کرد، چووە کن دادوەری گشتی و بەرپرسی تایبەت بە مەلەفی تاوانەکە، سەیربوو کەس شتێکی ئەوتۆی لە خەیاڵدا نەمابوو. هێشتا دوو ساڵ بەسەر کێشەکەدا تێنەپەڕیبوو، کەچی خەڵک تەواوی تاوانەکەیان فەرامۆشکردبوو. باباجان خۆی تێکەڵ بە هاوڕێ کۆنەکانی سوداد و سەلام کرد، ئەوانیش نە شتێکیان لەسەر تاوانەکە بیر مابوو، نە شێوەی کوژراوەکانیان دەهاتەوەیاد. سەیرترین شت ئەوەبوو کە هەتا دایک و باب و خوشکی دوو کوژراوەکەش یادگارییەکی کاڵ و کەم نەبێت لەسەر سوداد و سەلام هیچیان بیر نەبوو، بە جۆرێک دوای ساڵێک لە تاوانەکە کچەکە بە حوسن و ڕەزای خۆی شوویکردبوو بە کوڕەکەی سەید ئیقباڵ و وەک خۆی بە شانازییەوە دەیگووت «زەماوەندێکی شازیان بۆ سازکردبوو». بەڵام لە وانەش ترسناکتر ئەوەبوو، پیاوکوژەکان خۆشیان هیچیان یادنەبوو... هیچ شتێک.

ئەوە تەنیا حاڵەت نەبوو کە وەک دەستێکی غەیبی بیسڕێتەوە، لە یادەوەری هەموو خەڵک سڕداربووەوە، سەلام باباجان دوای دوو کێشەی تریش کەوت، کە وەک کێشەکەی سوداد وسەلام گرنگ بوون، لەگەڵ ئەوانیشدا گەیشتە هەمان ئەنجام و بینی لە یادەوەری خەڵکدا ئاسەوارێکیان نییە. هەر سێ ئەو حاڵەتە سەلامی خستە سەر ئەو بڕوایەی کە بڵاوبوونەوەی تاعوونی فەرامۆشی و یادچوونەوە ڕاستییەکی گەورەیە.

سەلام بەوەوە نەوەستا بزانێت نەخۆشی یادچوونەوە تەنیا هەواڵە گرنگەکان دەگرێتەوە یان نا، بەڵکو بڕیاری ئەوەشیدا تێبگات ئاخۆ چەند کەسی تر هەست بەم تاعوونە دەکات، دەیەها پرسیاری گەورە و شتی سەیر لە سەریدا کۆبووەوە و سەرە داوی هەموویشیان دەگەڕایەوە سەر ئەوەی بتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە «دەرهەق بە نهێنی ونبوونی لیوا جەنگیز دەتوانێت چی بکات؟». شتەکان بە جۆرێک زۆربوون و ئازاریاندەدا، دۆخێکی ڕۆحی وەهای بۆ دروستبووبوو بە سەختی گینگڵی پێدەدا و دەیتلاندەوە. تاکە نوسەرێک لەو ساڵانەدا زۆر دەیخوێندەوە و بۆی گرنگ بوو «سەلیم ئەسفەر» بوو، کە هەندێجار بە ناوی سین ئەسفەرەوە شتی بڵاودەکردەوە، بەڵام هەموو پێیاندەگووت مامۆستا ئەسفەر. ئێستا تەمەنی لە چل و پێنج بەرەو ژوورە، پیاوێکی بێدەنگی باریک و ڕیشن کە کتێبەکانی لە بازاڕدا هەم ڕەواجیان بوو، هەم جیدی و فیکرباریش دەردەکەوتن، چەند ساڵێک بوو ناو بە ناو ستوونێکی لە«عەزیزم وەتەن» دا هەبوو، کە بە ڕێکی نەیدەنوسی و هەرجارەی فاسیلەیەکی باش دەکەوتنە نێوان بابەتەکانییەوە. یەکێک بوو لەو نوسەرانەی بە تەنیا دەژیا، جارێک لە وتارێکیشیدا نوسیبووی، هەموو نوسەرێکی گەورە دواجار تەنیایی دەیکوژێت. سەلام کەیفی بە نوسین و ئیستیدلالە فەلسەفییەکانی دەهات، گەرچی هەندێجاریش شتێکی ئەوتۆیان لێ تێنەدەگەیشت، بەڵام ساتی خوێندنەوە، لە کاتێکدا ڕیزبەندی بۆچوونەکانی دەبینی، ئەو بیرکردنەوە ئاڵۆزەی هەست پێدەکرد دەمێک لە پشت ڕستەکانەوە هەوڵدەدات ڕێگایەک بدۆزێتەوە سادە و ڕوون بێتەدەرێ، هەم خۆشی لە شێوازی دەهات و هەم بەزەیشی پێدا دەهاتەوە. سەلیم وەک جیدیترین کەسی مەملەکەتێک دەردەکەوت کە کەسی جیدیی تێدا نەبوو. ئەو بێئەوەی گوێبداتە خوێنەر، وەک نوسین دیالۆگێکی تایبەتی نێوان خۆی و خۆی بێت، قەڵەمی دەنایە سەر کاغەز و بیروڕا ئاڵۆز و فەلسەفییەکانی خۆی دەنوسی، بەڵام بەخت لەوەدا هاوکاری بوو، ژمارەیەک لە چیرۆکەکانی لای عەوامی خەڵکیش شوێنی ستایش بوون. ئێوارەیەک باباجان بەخۆی و باڵا باریک و خوارەکەیەوە،

دوای تەلەفونێکی کورت و ڕێکەوتنێکی خێرا، سەردانێکی سەلیم ئەسغەری لە ماڵە بچوکەکەی خۆیدا کرد. چاوپێکەوتنی ئەو دووانە ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی مندا بینی، هەردووکیان دوو بوونەوەری پەراوێزی و نامۆن، سەلام زیاتر لە لەقلەقێک دەچێت بووبێت بە ئادەمیزاد، لۆقی باریک و ملی باریک و کەپووی سوور و درێژ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا شتێک لە جوانیی تێدایە ناوی دەنێم، جوانی باڵندە ترسنۆکەکان.

سەلام کە لەبەردەرکی ماڵی نوسەرە ناودارەکەدا دەرکەوت، ماندوو دیاربوو، بێزاری و ترسێکی زۆر لە چاویدا بوو، چاکەتێکی شینی لەبەردابوو درێژتر و تەنهاتر لە ڕۆژانی دی و لە حەقیقەتی ئاسایی خۆی دەریدەخست. ترسێکی قووڵی تێگەڕابوو، هۆی سەردانەکەشی لەوە ئاڵۆزتر و سەیرتربوو بتوانێت لە هەندێک وشەدا کورتیبکاتەوە، زۆر دەترسا لەبەردەم سەلیم ئەسغەردا وەک گەمژە دەربکەوێت. کابرای نوسەر وایدەزانی وەک زۆرێک لە ڕۆژنامەنوسانی تر بۆ چاوپێکەوتن هاتووە، بەڵام کەزانی کوڕەکە بەرپرسی لاپەڕەکانی وەرزشە، تۆزێک سەرسام وەستا و بە هێمنی گووتی «جیاوازی نییە، فەرقێکی ئەوتۆ ناکات، بەرپرسی هەر لاپەڕەیەک بیت، هەمووی وەکو یەکە، هەمووتان هەمان پرسیاردەکەن».

مامۆستا ئەسغەر کە تێگەیشت سەلام دەیەوێت ڕای لەسەر نەخۆشییەک بزانێت، زیاتر کەوتە دوودڵی و گومانەوە. بە دەنگێکی کەمێک غەمگینەوە، گووتی «هیوادارم بە هەڵە نەهاتبی. من کە دکتۆر نیم برا گیان». سەلام باباجان نەیدەزانی چۆن بچێتە سەر پرسیارەکەی خۆی، دەبوو بە ڕێگایەکی کەمێک پێچپێچ و ناڕاستەوخۆدا بڕوات، گووتی «مامۆستا بمبورە، ڕاستییەکەی من بۆ شتێکی خسوسی لێرەم، پرسیارەکە ڕەنگە بێمانا بێت، بەڵام هەندێک پرسیار هەیە، نە پزیشک، نە مەلا، نە سیاسەتمەداران ناتوانن وەڵامیبدەنەوە، بەبڕوای من تەنها نوسەران دەتوانن ئەوە بکەن، ئەو نوسەرانەی شتێک دەفامن و دەگەن بە قووڵاییەکی دونیا کە کەسانی نەزان و بێچارەی وەک ئێمە پەی پێنابەین. هەستدەکەم ماوەیەکە خەڵک کاتێک دەچنە بازاڕ و ڕوو لە

کتێبفرۆشییەکان دەکەن و شتێک بۆ خوێندنەوە دەکڕن تەنیا مەبەستیانە نیشانیبدەن کە تووشی تاعوونی بێباکی و بیرچوونەوە نەبوون تاعوونی بێباکی و بیرچوونەوە. نازانم بۆ؟ بەڵام بە هەر هۆ و بەهانەیەک بێت، دەمەوێت بزانم هەستی ئێوە وەک نوسەر بەرامبەر ئەو دیاردەیە چییە، چۆن دەیبینن و تیا دەژین؟». مامۆستا ئەسغەر، دەستێک چاکەت و پانتۆڵی خۆڵەمێشی کۆنی لەبەردابوو، پەنجەکانی باریک و درێژ بوون و کەمە لەرزێکیان تێدابوو، ئەو لەرزە لە کاتی ئاساییدا زۆر بەرچاو نەبوو، بەڵام دەمێک جگەرەیەکی دادەگیرسان هەموو کەس دەیبینی. بە گومانێکەوە سەیریکرد و مژێکی لە جگەرەکەی دا و گووتی «دەتەوێت بڵێیت چی؟». کابرای نوسەر هێمن و گومانکار بوو، زۆر کەیفی بە کەسانی ڕەشبینیش دەهات، بەڵام سەرەتا نەیویست هیچ لە هەستی بەدبینانەی خۆی بە ڕوونی بدات بە دەستەوە. سەلام گووتی «مامۆستای عەزیز. گەرچی دەزانم کاتێکی بەنرخ لە ئێوە دەگرم کە دەکرێت لە شتێکی بەسوودتردا سەرفیبکەن، لەوەی دانیشن و گوێ لە من بگرن. من خوێنەرێکی ئێوەم، نا درۆی وەها ناکەم بڵێم خوێنەرێکی باشم، بۆیە لێرەم چونکە ئەسڵەن ناتوانم خوێنەرێکی باش بم. ئەو نەخۆشییەی من باسیدەکەم دەرمانی لای پزیشکان و دەرمانفرۆشان نییە، هەستێک بۆ لای ئێوەی هێناوم هەستی کاڵوکرچی خۆمە ... من لەو باوەڕەدام ئێوە باشترین نوسەری وڵاتەکەن. دەمەوێت بزانم ئاخۆ کەسێکی تر دەزانێت دەردی من چییە و باسی چی دەکەم. دڵم پێمدەڵێت نەخۆشییەک بڵاوبۆتەوە وادەکات هیچ شتێک نرخی نەبێت، هیچ شتێک ... خەڵکی باشترین کتێب ناناسنەوە، گرنگترین نوسین فەرامۆشدەکەن، گرنگترین ڕوداو بەسەریاندا تێدەپەڕێت، هەمیشە بۆ بەهانەیەک دەگەڕێن خۆیان بدزنەوە، هەر شتێک کۆمەکیانبکات خۆیان لە حەقیقەت بشارنەوە، خۆیانی دەدەنە دەست. چۆن خۆیان لە نەخۆشی دەپارێزن خۆشیان لە کتێب و بیرکردنەوە دەپارێزن، بەردەوام هەڵپەیانە شتەکان زوو تێپەڕن و بیربچنەوە، گەر بشیانەوێت شتێک بزانن بۆ ئەوەیە دەمودەست فەرامۆشیبکەن. هەر شتێ ماوەیەک ئاسوودەییان بشێوێنێت، خێرا

دەیخەنە زبڵخانەی ژیانیانەوە... دەمەوێت بزانم خەڵکی ئەم شارە بۆ وایان لێهاتووە، نازانم ئایا من شتەکان ڕاست دەبینم یان بەهەڵەدا چووم، نەخۆشم یان نا؟».

سەلام دەنگێکی تیژ و غەماوی هەبوو، شێوەی قسەکردنی کاریگەر و سەرنجڕاکێش بوو. هەردووکیان چەند ساتێکی کورت لە یەکتری وردبوونەوە، سەلیم ئەسفەر لەوە لاوازتر و ڕەقەڵەتربوو کە سەلام لە وێنە کۆنەکانیدا دەیبینی،ماڵەکەی هیچ نەبوو جگە لە کۆمێکی گەورە لە هەڵپژان و بێنەزمی، هیچ شتێک لەجێگای خۆیدا نەبوو، یان ڕاستتر بڵێم هیچ شتێک جێگایەکی نەبوو تا لەوێدا بێت، کتێب، ڕۆژنامە، سی دی، جل، بوتڵی شەراب، قوری چا، تاوەی پیس هەموو بە جۆرێکی سەیر بەسەریەکدا کەوتبوون و لەو گۆڕەی هەڵپژابوون.

سەلیم ئەسفەر، بێئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە نارێکی ژووری دانیشتنەکەی سەرنجی میوانەکەی ڕاکێشاوە، گووتی «بۆ وادەزانیت من ئاگام لە شتی وایە. چی وات لێدەکات لە من بپرسی؟». باباجان هۆیەکی زۆر بەرچەستەی نەبوو، نەیدەزانی بۆ لەناو هەزاران کەسدا کە دەنوسن و شت بڵاودەکەنەوە ئەوی هەڵبژاردوە، بەڵام بۆ ئەوەی زۆر بێمانا دەرنەکەوێت، گووتی «چونکە تۆم زیاتر خوێندۆتەوە، وارێکەوتووە کە بەیانیانی یەکشەممە ڕۆژنامەکە دەردەچێت، زۆربەی کات دوای ئەوەی سەیرێکی گشتی دەکەم، یەکەم شت نوسینەکەی ئێوە، یان ستوونەکەی مامۆستا عەلادین شاهی دەخوێنمەوە، نازانم بۆ... چونکە لە بنەڕەتدا گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی کە ئیشەکەی خۆم وەک ڕۆژنامەوان لە بەشی وەرزش مانایەکی نییە. چ مانایەکی هەیە خەڵک بزانن دوو تیپی گەمژە لەو پەڕی دونیا کامیان خاڵی زۆرتر یان کەمترە، گەمژەکان نەبن کەس دوای بابەتی وەها بێسوود و پڕوپوچ ناکەوێت. هەستدەکەم لە ڕۆژنامەشدا ئەو بەشانە گرنگن کە لەڕاستیدا بابەتی ڕۆژنامە نیین. بۆ نمونە هەواڵەکان، ڕیپۆرتاژەکان، هەموو چەند سەعاتێک دەژین و دەمرن، بەڵام

شیعرێکی جوان لە ڕۆژنامەدا بێت، لە کتێبدا بێت، لە گۆڤاردا بێت، دواتر دەژی... هەر دەژی... ڕۆژنامەکە دەمرێت، شیعرەکە هەر دەمێنێتەوە».

هەر کەس قسەی لەگەڵ سەلامدا بکردایە، دەیزانی کوڕێکی زۆر خوێندەوار و زیرەک نییە، بەڵام هەستێکی تیژ و وردی هەیە، چاوانی پەشۆکانی کەسێکی پڕ پرسیاریان تێدابوو، نەوەک زیرەکی مەخلوقێک بتوانێت سەربەخۆ بگاتە هەموو وەڵامێک. ئەسغەر بە بێخەیاڵییەوە فەرمووی لێکردە سەر مێزێک کە چەندین کتێب و ڕۆژنامە و پیاڵەی پیس و نەشۆراوی لەسەربوو. کە دانیشتن، مامۆستا قاچی خستە سەر قاچ و بە دەنگێک نیشانەکانی سەرەتای پیری پێوە دیاربوو، گووتی «شتێکی ئاساییە، مرۆڤ بەرەو ئاسوودەیی دەڕوانێت، هەموو کەس دەیەوێت بە کەمترین ماندووبوون زیندەگی بباتەسەر، هیچ شتێکی تێدا نابینم عەجایەب بێت، مرۆڤ درەنگ یان زوو هەموو شتێک لە یاد دەکات، بەر لە ئێمە ملیارەها کەس بەسەر ئەم ئەستێرەیەدا تێپەڕیوون، ئێستا ئێمە هیچ شتێک دەربارەیان نازانین». دەنگی تۆنێکی تێدابوو، وەک ئەوەی هەموو بابەتەکە نارەحەتیبکات، سەلام بە خێرایی پێیبڕی و گووتی «مەبەستم لەوە نییە .. مەبەستم». مامۆستا بە نارەحەتییەوە پێیبڕییەوە و گووتی «دەزانم، دەزانم، باس لەوە نییە. بەڵکو لەوەیە، نەخۆشییەکی سامناک هەیە، نەخۆشییەکە تۆ هەستت پێکردوە، یان ڕاستتر بڵێم ئەمڕۆ هەستت پێکردوە». باباجان بە هێمنی سەری لەقاند و گووتی «من چەند ڕۆژێکە هەستی پێدەکەم». سەلیم ئەسغەر دەستی ڕاوەشاند و مژێکی قووڵی لە جگەرەکەی دا و گووتی «نا، نەخۆشییەکی نوێ نییە، چەند ساڵێکە بە ڕوونی دیارە، من بە جۆرێک سەرسام دەبم گەر لە سوچێکدا، لە چایخانەیەکدا، لە لاکۆڵانێکدا کەسێک بدۆزمەوە تووشی ئەو دەردە نەبووبێت». باباجان بە دوودڵی و نارەحەتییەوە گووتی «ئەی بۆ لەسەری نانوسیت، بەڕێز کاک سەلیم بۆ لەسەری نانوسیت؟». خێرا بەرسڤیدایەوە و گووتی «لەبەرئەوەی ترسناکە، لەوە ترسناکترە کە مرۆڤ لە سەرەتاوە بیری لێدەکاتەوە. شتەکان بەوجۆرە نین کە تۆ دەیانبینیت،

لەوە ئاڵۆزترن ». سەلام گووتی «ئۆوە» سەری خوراند و پرسی «لە چ ڕوویەکەوە ئاڵۆزە، کە ئەوە بابەتێکی سیاسی نییە، تا لێی بترسیت؟»، سین ئەسفەر لە کاتی قسەدا هێمن بوو، زۆر سەیری جگەرەکەی دەستی دەکرد، بێزارییەکانی زیاتر لە لەرینەوەی دەنگیدا دەردەکەوتن نەوەک لە ڕوخسار یان جوڵانەوەیدا، جووتە چاوێکی بێلایەنی هەبوو، نیگاکانی خۆ بە خۆ شتێکی ڕۆشنیان دەربارەی دەرونی ئاشکرا نەدەکرد. لەو کاتەوەی لەگەڵ باباجان قسەیدەکرد، وادەردەکەوت کەمێک غرور و کەمتەرخەمی نوسەرانی تێدابێت، بەڵام وەک ئەم گەنجە باریکە ماندووە ڕێزێکی کتوپڕی تێدا دروستکردبێت، دەنگی گۆڕا و سەری بەرزکردەوە و بە نیگایەکەوە خاڵی نەبوو لە حورمەت، وەک سوپاسگوزار بێت سەلام دەرفەتی ئەوەی پێبەخشیوە شتێکی قووڵ لە ناخی خۆیدا ئاشکرابکات، گووتی «مەترسیدارە زۆر، لەبەر ئەوەی گەر دەربارەی بنوسین، هەموو سیحری خۆی لەدەست دەدات. حەقیقەتی قووڵ هەمیشە دەبێت بە نهێنی بمێنێتەوە». سەلام دەستەپاچە سەیریکرد و گووتی « چۆن؟ ئەی خەڵک بە چ شێوەیەک خۆیان بپارێزن؟»، مامۆستا جگەرەکەی لەسەر لێواری تەپڵەکێکی پڕ لە سووتوو دانا و گووتی «هەڵەیت وابزانیت خەڵک دەیانەوێت خۆیان بپارێزن. بۆ خۆیان بپارێزن؟ کێ گووتوویەتی کە خەڵک دەیانەوێت خۆیان بپارێزن؟ مرۆڤ تەنها لە پێناوی ئاسوودەگیدا خۆی دەپارێزێت نەوەک لە پێناوی زیرەکی و هوشیاریدا. زیرەکی و هوشیاریی دوو شتی گرنگ نین، بەڵام ئاسوودەیی و خۆشی بنەڕەتین.... بەڕێزتان ناوتان سەلام بوو، بەڵێ سەلام. ڕاستە هەموو دەیانەوێت خێرا بەسەر هەموو شتێکدا تێپەڕن، خواستێک لەسەری خەڵکدایە نامێڵێت لەسەر هیچ شتێک بمێننەوە، ئەوەش ژیانیان ئاساندەکات. بەوجۆرە بێ کێشە دەژین. مرۆڤ شەیدای ئەوەیە بڵێت من هیچم پێ ناکرێت. دڵنیام ئادەم یەکەم کەس بووە وای گووتووە، دڵنیام لەو ساتەدا کە خودا لەگەڵ حەوادا فڕێیداونەتە سەر زەوی، سەیرێکی حەوای کردوە و گووتوێتی - چی بکەم، هیچم پێ ناکرێت - ئەوە یەکەم ڕستەی مرۆڤ بووە لەسەر زەوی». کەمێک وەستا، بەڵام لەوە نەدەچوو بیربکاتەوە، پێدەچوو تەنیا سەیری

باباجان بکات و بیەوێت باشتر و ڕوونتر ببینێت، دوای ئێستێکی کورت، گووتی «ئەوە بە مانای ئەوە نییە کە مرۆڤ نایەوێت بزانێت، بەڵام مرۆڤ فلتەرێک لەسەری خۆیدا دادەنێت تا زانین ژیانی لێ تێک نەدات. لە سەردەمەکانی تردا زانین کەم بوو کاری ئەو فلتەرەش کەمتر بوو، لە سەردەمی ئێمەدا ئەو جۆرە فلتەرە کاری زۆرترە، لە شاری ئێمەشدا زۆر بەهێزترە، خەڵکی دەیانەوێت خۆشبەختتر بن ... ببورە جارێکی تر ناوی بەڕێزتان چی بوو ؟... سەلام باباجان، بەڵێ جەنابی کاک سەلام. من دەزانم کە خەڵکی ئەم شارە، ژیانی ئەم شارە، هەموو شتێکیان لەسەر فەرامۆشییە. نازانم تۆ بۆچی وادەزانیت خۆت یەکەم کەسی هەست بەوە دەکەیت ... نا دەمێکە دەردەکە بڵاوبۆتەوە، چەندین ساڵە. بێگومان لەگەڵ تۆدام شارستانییەتی گەورە لەسەر فەرامۆشی دروست ناکرێت. من واهەستدەکەم لە دونیادا دوو شت هەن مرۆڤ دەبێت زۆر لەسەریان بوەستێت، کتێب و تاوان... کتێب و تاوان دوو شتن شایستەی ئەوەن مرۆڤ لەسەریان بوەستێت، ئەوە ئەزموونی منە وەک نوسەر. مرۆڤی عەوام بەگشتی، ئینسانگەلی سادە کە لە شتێکدا شارەزاییان نییە، دەبێت توانایان تێدابێت لەسەر ئەو دوو شتە بوەستن، چونکە شارستانییەتی ڕاستەقینە لەسەر ئەو دوو کۆڵەکەیە ڕاگیراوە. بەڵام کاک سەلام، ماوەیەکە ئێمە لەم شارەدا، ڕەنگە لە تەواوی دونیاشدا چووینەتە سەردەمێکەوە کە کەس لەسەر کتێب و تاوان ناوەستێت، ئەوەش تا ڕادەیەک شتێکی سەیرە، شتێکە ژیانی ئەم خەڵکە لە خەڵکی دونیاکانی تر جیادەکاتەوە ... ڕەنگە ئەم شارە بەهەشت بێت، ڕەنگە من و تۆ نەزانین، خۆ بڕیار نییە حەقیقەت لای من و تۆش بێت، وا نییە؟ خۆ من و تۆش ئەو هەقە نادەینە خۆمان کە ئێمە تەنیا دوو پیاوی ڕاستین لە دونیادا. من زۆرجار کە بیری لێدەکەمەوە، دەڵێم خەڵکی ئەم شارە لە بەهەشتدا دەژین، بەهەشت کتێب و تاوانی تێدا نییە، خەڵکی ئەم شارەش هەردووکیانیان لە ژیانی خۆیان کردۆتە دەرەوە ... ڕەنگە لە بەهەشتیشدا کتێب و تاوان هەبێت، بەڵێ حەتمەن دەبێت هەبێت، بەڵام مرۆڤەکان هەستی پێناکەن، نایبینن. وەکو ئێرە. خەڵکی ئەم شارە لە بەهەشتدان،

خەڵکی ئەم شارە لە بەهەشتدان، کەسیان بیر لە کتێب و تاوان ناکەنەوە».

سەلام باباجان هەستیکرد، جەنابی مامۆستا ئەسغەر خەریکە لە قسەکردنیشدا دەچێتە جێگایەکەوە، بە جۆرێک قووڵ و تاریکە تێیناگات. ورد سەیری دەموچاوی کردەوە، لەوە نەدەچوو کەسێک بێت ژیانی لە نوسین و بیرکردنەوەدا بردبێتە سەر، دەموچاوی لە داربڕێکی کێوی دەچوو عومری لەگەڵ تەور و تەراشدا گوزەراندبێت. بە شپرزەیی ژوورەکەیدا دیاربوو بۆ نوسین نەبێت، بۆ هیچ شتێکی دی زۆری لە خۆی نەکردوە.

سەلام ویستی وردتر بێت، ئێستا دڵنیابوو ئەم پیاوە دەتوانێت کۆمەکیبکات، بەڵام وەرگرتنی کۆمەک لە پیاوێکی وەها ئاسان نییە، مرۆڤەکان دەتوانن ئاسان برێک پارە وەک یارمەتی وەربگرن و بیخەنە گیرفانیان، بەڵام بۆ ئەوەی یارمەتی کەسێکی حەکیم وەربگرن، پێویستیان بەوە هەیە خۆیان شتێک لە حیکمەتیان تێدا بێت. لە فێربووندا تەنیا سەرمایەی خۆت کۆمەکتدەکات، تا بتوانیت لە حیکمەتی ئەوانی دیش تێبگەیت. سەلام گووتی «جەنابی دکتۆر ... من دەپرسم». دەستی ڕاوەشاند و گووتی «نا دکتۆر نیم، هیچ نیم، پیاوێکی تەنهام لە ماڵێکی تەنهادا و بیردەکەمەوە». سەلام لە ناخیدا کەسێکی شەرمن بوو، زۆر زوو بریندارتدەبوو، بە هێمنی سەری دانەواند و گووتی «ببورە، هۆی سەردانەکەم لە بەر کێشەیەکی گرنگە. ڕاستە ئەو هەستە ناخۆشانەم هەیە، بەڵام وەک دەڵێن هەموو شتێک هۆ و بەهانەی خۆی هەیە. هۆی هەموو ئەو پەشێوییەم نهێنییەکە بەڕێکەوت کەوتم بە سەریدا. کەسێک هەیە تا ماوەیەک لەوەوبەر لە بەرپرسە زلەکانی دەزگای ئەمنییەت بوو، ڕەنگە تۆ بیناسی، ناوی ئەسڵی وەفای ڕەفعەت بەگە، لە دەزگای ئەمنییەتدا بە ناوی لیوا جەنگیز بەناوبانگە، لە پیاوە هەرە نزیکەکانی سەرۆک بووە، لە حیزبییە هەرە دڵسۆزەکان، سەگێکی دڕی بەر ماڵی حاکم ... بەڵام ئێستا ماوەیەکە گیراوە، ڕاستییەکەی بێسەروشوێنە. من

زانیاریم هەیە حیزب خۆی گرتوویێتی، بەڵام لە کوێ زیندانە نازانم ... ماوە یان مردووە نازانم. سەرەتا ویستم هەواڵی گرتنەکەی بڵاوبکەمەوە، هەڵبەت من وەک کەسێک کە تەنیا بەرپرسی هەواڵی وەرزشم، بۆم نییە بۆ شتی وا دەست لە کاروباری ڕۆژنامەکە وەردەم. ویستم بەدزیی هەموانەوە نوسینێک بنوسم بۆ پەیجێک ناوی «کورد پۆرتاڵ»ـە لە ئینتەرنێتدا، مرۆڤ لەوێ دەتوانێت هەموو شتێک بڵاوبکاتەوە، ویستم حەقیقەتی ونبوون و گرتنی لیوا جەنگیز ئاشکرابکەم، کە چەندین ڕۆژە ڕوویداوە و تا ئێستا هیچ کەس شتێکی دەربارە نازانێت، کابرا شتێکی بچوک و کەم نەبوو، زۆری ئەم دەوڵەت و دەزگا و شتانە خۆی دروستیکردون، لە سەرەتای شۆڕشەوە لەگەڵ حیزبدا بووە، ئێستا هیچ کەسێک جگە لە ئیشکەرەکەی و هەندێ کەسی تر ئاگایان لە چیرۆکەکەی نییە، بەسەرهاتەکەی بە ئاڵۆزی گەمارۆدراوە. کێشەکەی من لیوا جەنگیز نییە، بەڵکو ئەوەیە من لە گەرمەی بیرکردنەوەمدا سەبارەت بە ئاشکراکردنی حەقیقەتی گرتنی ئەم کابرا دڕندەیە، ڕوو بە ڕووی ئەو پرسیارە بوومەوە «گەر بڵاویشی بکەمەوە چی؟». هەستمکرد تاعوونێکی ترسناک بڵاوبۆتەوە، مرۆڤەکان هەموو شتێک لە یاددەکەن، هەموو شتێک؟ هەواڵەکە دەخوێننەوە، پاش چەند ڕۆژێکی تر هیچ نیشانەیەک لە خەبەرەکە و لە مرۆڤەکان و لە حەقیقەتەکان لە خەیاڵی کەسدا نامێنێت. من هاتم لە جەنابت بپرسم بزانم چی بکەم؟».

مامۆستا ئەسغەر، بێئەوەی پێوەی دیاربێت هەواڵەکەی بیستووە یان ئاگاداری شتێکی وەهایە، گووتی «ژیان شەڕە، هەندێک هەیە تێکدەشکێن و دەکەونە ژێرەوە، لیوا جەنگیزیش تێکشکاوە. لە هەموو شوێنێکدا مرۆڤی تێکشکاو هەیە، لە ناو خودی ئینسانیشدا نیوەیەکی تێکشکاو هەیە. بۆ لێیناگەڕێت نوقم بێت؟ واز لە لیوا بێنە نوقم بێت و وەک هەر شتێکی تر بچێتە ژێرەوە».

سەلام باباجان بە خێرایی سەری خۆی خوراند. جووڵەی دەستی خاڵی نەبوو لە نیشانەکانی دوودڵی و بێئارامییەکی قووڵ و گووتی « جەنابتان

چیرۆکنوسن، تێدەگەن مانای چی لە پڕێکدا کەسێک بیەوێت ببێت بە قارەمان. من وەک سەلام باباجان، هیچ کات بەشێک نەبووم لە ژیانی ئەم شارە، بۆیە کە دەرفەتێک دێتە پێشێ، ئیتر بەڕاستی دەمەوێت بەکاریبهێنم. کە نهێنییەک دەزانم ئازارم دەدات... نازانم چی لێبکەم. لە منداڵییەوە وابووم، سەردەمێک باش بووم، ئێستا نەخۆشییەکەم دووبارە سەری هەڵداوەتەوە. لە مێژووی خۆمدا وەک ڕۆژنامەنوس، زۆر لەگەڵ نهێنی و شتدا سەروکارم نەبووە. ئەوە بواری من نەبووە، ئیشی من وەرزش بووە. بەڵام لە ناکاو بە ڕێکەوت ئەم نهێنییەم زانی و ئێستا ئازارمدەدات». سین ئەسغەر گووتی «تێدەگەم، مرۆڤ هەموو شتێکی بۆ لە یاددەکرێت، نهێنییەک نەبێت کە تەنیا خۆی دەیزانێت». سەلام سەری خوراندو بە شەرمێکەوە، گووتی «ئێستاش پرسیارەکەم ئەوەیە ئاخۆ نرخی یادەوەرییەکانی ئەم لیوا گەورەیە دەبێت چەند بێت؟ دەبێت چەند شتی گرنگ بزانێت کە جگە لەو هیچ کەسێکی تر نایانزانێت؟. هەستدەکەم گرتنی لیوا پەیوەندی بەوەوە هەیە کەسانێک دەیانەوێت شتێک ونبکەن، کابرا ڕەنگە شتێک بزانێت و بیانەوێت دەمکوتیبکەن... ئەگینا دوای ئەو هەموو ساڵە لە نۆکەریی و خزمەتکاریی بۆ لە ناکاو بە دزییەوە بەمجۆرە بێسەروشوێنی دەکەن... ها؟ بۆ من پرسیارێکە دەیهێنم و دەیبەم و ناگەمە هیچ. بەڵام مامۆستا ئەسغەر، لای من چیرۆکەکە دیوێکی تریشی هەیە. من هەستمکرد گەرچی لە گرنگترین ڕۆژنامەی وڵاتدا کاردەکەم، بەڵام هیچ کەسێک نابینم بە ڕاستی ئەو شتەی دەیخوێنێتەوە یان دەینوسێت بەلایەوە گرنگ بێت یان یادی بمێنێت. ئەسڵەن جەنابی مامۆستا ئەسغەر ... ئەسڵەن. من چەند ڕۆژێک لەوەوبەر لە ناکاو خانمێکی ئەفریقاییم بینی خۆی کرد بە ڕۆژنامەکەماندا، یەک جار لەوێدا هەستم بەو شتەکرد، ئێمەی ڕۆژنامەنوس، لەوێ ئەسڵەن کارمان بەسەر خەڵک و چارەنوس و ماف و ئازارییانەوە نییە، ئێمە تەنیا کارمان بە هەواڵەوە هەیە... شتێک نییە لە ڕۆژنامەکەی ئێمە ناوی ئینسان بێت، تەنیا یەک شت هەیە ناوی هەواڵە. سەرێک لە ڕۆژنامەکەمان بدە بە ڕوونی هەست بەوە دەکەیت، هەموو سەرقاڵی هەواڵن. زۆر ڕۆژ واهەستدەکەم

هەواڵ شتێک نییە لە دەرەوە بێت و ئێمە بەرجەستەیبکەین، نا، هەواڵەکان دەمودەست لای ئێمە دروستدەکرێن. تەواو ئەوە یاسای سەرەکییە. هەواڵ شتێکی تێپەڕ و مردووە، دەبێت هەمیشە بگۆڕێت، دەبێت بەردەوام شتێکی نوێ بێت، من چەند وەختە لەو ڕۆژنامە مەلعونەی عەزیزم وەتەندام کە هەڵبەت باشترین و بێلایەنترین ڕۆژنامەی وڵاتە، چەند ساڵە لەگەڵ ستافێکی گەورەدا دەژیم و هەموو شتەکان ڕیتمێکی میکانیکیان وەرگرتووە. دەبێت لەگەڵتدا دروونەکەم، من لیوا جەنگیز ناناسم، قەت نەمبینیوە، خۆیم بۆ گرنگ نییە، بەڵکو خۆمم بۆ گرنگە، ئەم تاعوونەم بۆ گرنگە. دەمەوێت بزانم بۆچی بێباکم. ئەوە بۆتە پرسیار بۆم... سەرەتا هەستمدەکرد نەخۆشییەکە لە منە، دەمگووت هەمووی گوناهی ئەو لاپەڕە پیس و بێفەڕەی وەرزشە، بەڵام هەفتە لە دوای هەفتە و مانگ لە دوای مانگ و ساڵ لە دوای ساڵ، بۆم دەرکەوت هەموو وەکو منن. سەرەتا دەمگووت تف لە من، بە جۆرێک سەری خۆم خستۆتە ئەم کارەوە، بە جۆرێک دونیای یاریگا و یانە و تۆپ منیان داگیرکردوە هەر هەستی ئینسانیم تێدا نەماوە، بووم بە بەرد. دەمگووت بە نەعلەت بیت سەلام بۆ وات لە خۆت کرد. بەڵام نامەوێت درۆت لەگەڵدا بکەم، من ئەسڵەن شەیدایەکی سەوداسەریی وەرزش نیم، ئەسڵەن... لەوانە نیم کە یانەیەکی خۆم هەبێت حەزی لێبکەم، یاریزانێکی خۆم هەبێت حەزی لێبکەم، مەشقکارێکی خۆم هەبێت بەهەبەهەی بۆ بکێشم. نا مامۆستا من لەوانەم کە ژیانی خۆیان بە هەڵەدا دەبەن، حەزیان لە شتێکە و بۆیان ناکرێت، لە بەرئەوە خۆیان دەدەنە دەست یەکەم کارێک کە دێتە بەردەمیان، وەک کەسێک کە حەزی لە دڵخوازێکی خۆیەتی و بۆی نابێت و دواتر خۆی دەداتە دەست یەکەم کەس کە دێتە سەر ڕێگای، منیش وابووم. ڕۆژێک بیرمکردەوە ئەمە چ دەردێکە مرۆڤ والێدەکات پێ بەسەر سەری نزیکترین هاوڕێی خۆیدا بنێت، خەیاڵ و خولیا و ئازاری دراوسێکەی خۆی بۆ گرنگ نەبێت، بەڵام گەر یاریزانێکی گەمژە لە دووری سەدان هەزاران میلەوە شوتێکی خوار لێدا دڵتەنگ دەبێت، هاواردەکات، دەکێشێت بە سەری خۆیدا، بەسەر ژنەکەیدا دەقیرێنێت. جەنابی مامۆستا

ئەسفەر گەر سالێک ببیت بە ڕۆژنامەوانی وەرزش، تێدەگەیت چ گەمژەییەک بلاوبۆتەوە. من ئێستا لەو گەمژەییە ڕادەکەم، دەمەوێت هەستبکەم ئینسانم...». مامۆستا ئەسفەر ورد گوێی دەگرت، چاوانی هەمان ئەو نیگا بێگوزارشتەی لەسەر بوو کە لە سەرەتاوە سەلام هەستی پێکرد. لە هەناسەیەکدا بە هێمنی قسەکانی بە سەلام بڕی و گووتی «خۆشی و ئازارێک وەرزش دەیبەخشێت، خۆشی و ئازارێکی درۆزنە. ماوەیەکە خەڵکی ئەم شارە زۆر حەزیان لەو سەرکەوتن و دۆڕانە درۆیانەیە، ئەوە یارمەتی هەمووومان دەدات دۆڕانە ڕاستییەکان لە بیربکەین... وەرزش کۆپییە درۆزنەکەی ژیانە، کە لە ژیان خۆی زیاتر فریومان دەدات. هەر سەردەمە و مرۆڤ بە جۆرێک خۆی لە یاد دەکات، مرۆڤ کە دەزانێت خۆی هیچی پێ ناکرێت، بۆ پاڵەوانێکی تر دەگەڕێت. وەرزش بۆ شارێکی وەک ئەم شارە دۆڕاوانەی دونیا زۆر بە سوودە، لەگەڵ تیپێکدا تێکەڵدەبن و بردنەوە و دۆڕانەکانی دەکەن بە بردنەوە و دۆڕانی خۆیان، ئەوە بەختەوەریان دەکات، ئاسوودە دەبن... بەڵێ ئاسوودەیی لە هەر شت گرنگترە. نا لێگەڕێ سەلام، بە هۆی وەرزشەوە ئینسانەکان ئەو بوونە بچوک و بێنرخ و پەراوێزییەی خۆیان دەکوژن و تێکەڵ بە شتێکی لە خۆیان بەهێزتر دەبن... مرۆڤ کە ویستی خۆی لە بیربکات، هەموو دونیاش لە بیردەکات. لێگەڕێ ئێمە ناتوانین بەر بەو جۆرە لە ئاسوودەیی بگرین، با کارمان بەسەرییەوە نەبێت». سەلام باباجان گووتی «نا جەنابی مامۆستا، من حەدم نییە ئامۆژگاری ئێوەبکەم، بەڵام دەمێک چیرۆکی لیوا جەنگیزم بیست، بێئەوەی بزانم بۆ، هەستمکرد من ئێستا شتێک دەزانم کە کەسی تر نایزانێت، ڕاستی چارەنوسی مرۆڤێک کەوتۆتە دەستم لەوانەیە بکرێت کارێکی بۆ بکەم. هەموو مرۆڤێکی بچوک و بێبەهرەی وەک من لە ژیاندا، یەکجار دەرفەتێکی بۆ هەڵدەکەوێت بێتە سەر شانۆ گەورەکەی ژیان و لەویادا شتێک بکات دواتر شانازی پێوەبکات، بەڵێ جەنابی مامۆستا، مرۆڤ بەبێ شانازی ناژی... وانییە. ئەو شانازییەی چەند ساڵە لە وەرزش وەدەستی دەهێنم شانازییەکی درۆزن بوو. لە ساتێکدا هەستمکرد من یان دەبێت تەواو درێژە بەو ژیانە

بدەم کە تێی کەوتووم یاخود ئیستێک بکەم و بڵێم ئێستا بەرپرسم لە حەقیقەتێک، لە نهێنییەک کە کەسی تر نایزانێت من نەبێت ... بۆیە هاتم بۆ لای بەڕێزتان».

مامۆستا ئەسغەر زۆر ورد گوێیدەگرت. دواتر بە هێمنی پرسی «ئەی دەتەوێت چی بکەیت؟ نیازی چییت هەیە؟». سەلام گووتی «ببورە مامۆستا هێشتا تەواو نەبووم، هێشتا هەندێک شتم ماوە. ئەم قسانەی ئێستا بۆ ئێوەی دەکەم، زادەی بیرکردنەوەیەکی درێژە کە دەمێ وەختە لە خەیاڵمدا کۆبوونەتەوە و کەس شک نابەم بۆیان باسبکەم. ئەوەی زیاتر من دەترسێنێت نەمانی جیدییەتە، دەزانم ئەم قسەیە زۆر ڕۆشنبیرانە دەردەکەوێت، جیدییەت مەبەستم سەیرکردنی خەڵکی ئەم شارەیە بۆ یەکتری. من کە لە ڕۆژنامەکە دادەنیشم زۆرجار ڕۆشنبیران دێن بۆئەوێ، هەموو قاچ دەخەنە سەر قاچ و ئاسوودەن، هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە جیدییەت بەرەو نەمان دەچێت، هەتا ناجیدیترینیشیان بە حەماسێکی بێوێنەوە قسە لە نەمانی جیدییەت دەکات. باشە دەکرێت بڵێیت هەر ئێمە وانین، دەتوانیت بڵێیت سەیری حاڵی عەرەبەکان بکە چۆن بەرەو دوا دەگەڕێنەوە، سەیری حاڵی تورکان بکە، دەتوانیت بڵێیت بەشەرییەت لەم سەردەمەدا بێباک بووە، بڵێیت مرۆڤەکان بۆ خۆشبەختی خۆیان دەگەڕێن و نایانەوێت هەواڵی ناخۆش و دڵتەزێن ماوەیەکی زۆر ژیان و هەست و بیرکردنەوەیان ئالودەبکات. باشە، من هەق دەدەم بە کەسێک بەڵگە و بەهانەی وەها بخاتە بەردەمم، بەڵام نەمانی جیدییەت نەخۆشییەکی جیهانی نییە، مەسەلەکە ئەسڵەن پەیوەندی بە دونیای دەرەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە خۆمانەوە هەیە. من سەرەتا کە دەستم بە خوێندنەوە کرد، هەستمکرد ناتوانم جیدی بم، ناتوانم تۆ یان مامۆستا عەلادینی شاهی، یان ئوستاد کوردۆ بخوێنمەوە و تێبگەم. بەڵام دوای ئەوە تا ئەمڕۆ شتێکی ئەوتۆم نەکردوە، مرۆڤ کە نەیتوانی بیر لەوە بکاتەوە بۆ تێناگات کەواتە جیدی نییە... من ئەگەر نوسەرێکی گەمژە نەبوومایە لە ڕۆژنامەیەکی گەمژەدا، دەبوو بپرسم بۆ تێناگەم. بەڵام هەرگیز نەمپرسیوە، ناتوانم بپرسم، دەترسم، نازانم وەڵامی ئەو پرسیارە بۆ کوێم

دەبات. مامۆستا ئەسفەر ببورە، بەڵام نازانم بۆچی هەموو ئەو شتانە لەگەڵ بیستنی چیرۆکی ئەو ژەنراڵەدا کەوتەوە یادم. هەمیشە هەمان پرسیارە، هەمان تاعوونە، ئەوەی نازانین وەڵامەکان بۆ کوێمان دەبەن، ئەوەیە کە بەرێزتان ئێستا باستانکرد، ئەوەیە. گەر یەکێک بەرامبەر کتێبێکی گەورە و گرنگ بێدەنگ بوو، دەتوانێت بەرامبەر تاوانێکی گەورەش بێدەنگ بێت. بمبورە... بمبورە ڕەنگە حوکمێکی هەڵەبێت، ڕەنگە تۆ نەتویستبێت ئەم دەرەنجامگیرییەی لێ بکەیت، بەڵام بوەستە، ئەسڵەن من لە خۆمەوە دەڕوانم، باس لە ڕۆحی خۆم دەکەم ... من وام، ئەوەی ناتوانم لە نوسینێکی باش تێبگەم هەر لەسەر هەمان ڕێگایە کە دەمباتەوە بۆ ئەوەی هەموو تاوانێکیشم بیربچێتەوە و هەست نەکەم پەیوەندی بە منەوە هەیە، من وەهام، من ماوەیەکی درێژە هەستدەکەم هیچ شتێک پەیوەندی بەمنەوە نییە، ستافی ڕۆژنامەکەش هەموو وەهان. جەنابی مامۆستا، ئەسڵەن دەزانی ئێمە لەچی دەچین؟ چوویتە سینەما؟ ... ئێمە لە ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەن لەو ئامێرە سارد و بێرۆحە دەچین کە فیلمەکە لێدەدەین، دەبینین کە ئەکتەرەکان دەگرین، بینەرەکان دەگرین، بەڵام ئێمە وەک مەکینەیەکی سارد دەخولێینەوە و لە دیمەنێکەوە بێوەستان دەچینە سەر دیمەنێکی تر، وێنەیەک لادەبەین و وێنەیەکی دی ڕادەکێشین. ئەوە دۆخی منە، ئەوە تاعوونی منە، ئەوە ئەو دەردەیە کە من بەدەستییەوە دەناڵێنم. من گووتم، من سەرهەنگ ناناسم، ئەسڵەن نایناسم، بەڵام دەزانم پیاوێکە بەشێک بووە لەو مێژووە، دەڵێن دڕندە بووە، بەڵام من نازانم تا چەند جانەوەر یان دڕندە بووە، هیچ نازانم، بەڵام لە ناکاو هەستمکرد کە لە بەردەم پرسیارێکی گەورەدام، گەر جەنابی لیوا بە بێدەنگی بچێتە ژێرەوە و وەک سەدانی تر ونبێت، چی ڕوودەدات و چ کارێکی بە منەوە هەیە؟ بەڵام ئەی ئەگەر بڵاویبکەمەوە چی ڕوودەدات و چ کاریگەرییەکی بە هەموومانەوە هەیە؟. من بە ئێوەم گووت دەمەوێت بۆ یەکجار، بۆ یەکجار، دوای وەڵامی پرسیارێکی گەورە بکەوم. ئەوە هەقی خۆمە یان نا؟ هەقی خۆمە وەک مرۆڤێکی بچوک کە دەمەوێت ڕۆڵێکی گەورە بگێڕم، کارێکی لەو جۆرە بکەم یان نا؟ چەندین

ساڵە وەک گەمژە دوای ئەوە کەوتووم بزانم چ تیپێکی گەمژە لەوسەری دونیا بردویەتییەوە یان دۆڕاندویەتی، بزانم ئینتەر میلان بردویەتییەوە یان مانچستەرسیتی، بایەر منشن خاڵی زۆرترە یان فێردەر برێمن یان بروسیا دۆرتمۆند. ئێستا دەمەوێت بۆ یەکجار واز لەم هەموو گەندوگووە بهێنم و سەیری ئەو دیو پەردە ئاسنین و دیوارە ترسناکەکانی ئەم شارە بکەم؟ دەمەوێت بزانم چی لە پشتی ئەم بێدەنگییە ئاسنینەوە هەیە کە لە من ونە؟ دەمەوێت لە ژیان خۆی پرسیاربکەم، نەوەک لە سێبەرەکەی. هەموو خەڵک بە جۆرێکی ترسناک لەم شارە ڕادەکەن، هەیانە وەک من خۆی بە سەیرکردنی یاری پروپوچەوە سەرقاڵدەکات، هەیانە خۆی لە تەماشاکردنی سریاڵ و فیلمدا خنکاندوە، هەیانە سەیری پەڕەیەکی نوسەرێکی خۆمان ناکەن و دەکەونە پەرستنی شاعیر و ڕۆماننوسە فارس و عەرەب و بیبانییەکان... هەمووشی یەک دەردە، هەمووشی ئەوەیە هەستبکەیت لەم وڵاتەدا نیت، لەم شارەدا نیت، دەرگایەکت دۆزیوەتەوە لە خۆت و لە شارەکە بتباتە دەرێ، ئێستا من دەمەوێت ڕێگایەک بگرم بمهێنێتەوە بۆ ئەم شارە، بۆ ناو دڵی شارەکە. باوەڕت بێت کە ڕۆژانە لەو سەیارەیەی خۆمدا دەچم بۆ دەوام یان دەگەڕێمەوە، هەست ناکەم خەڵکی ئەم شارەم. دەمەوێت شتێک بکەم ئەو هەستەم هەبێت. دەزانم یەکێک دێت و دەڵێت جا دڵی ئەم شارە لە تاریکی زیاتر چی تێدایە؟ دەزانم وادەڵێن... بەڵام گەر جگە لە زوڵمەتی ڕووتیش هیچی تێدانەبێت، من دەمەوێت بەرەو ناخی بڕۆم. هەستدەکەم ئەو ڕۆژنامە چەپەڵە منی فڕێداوەتەوە ناو شوێنێک لەوێوە تەنیا تارمایی ژیان دەبینم، هەموو شتێکم زوو بیردەچێتەوە، هیچ شتێک بە جیدی ناگرم، ئەسڵەن بووم بە مەخلوقێک لە ناو وردەکاریی شتە پوچەکاندا نوقمبووم... وردەکاری شتە هەرە پوچەکان ... هەموو شتێک زوو فەرامۆشدەکەم، زۆر زوو. ڕەنگە سبەینێ بمبینیت تەواو لیوا جەنگیزم یادچوو‌بێتەوە، بڵێم ئەم کابرایە کێیە، بەردەوام تێبینی و سەرەقەڵەم دەنوسم تا شتەکان و ناوەکانم بیرنەچنەوە. من دەزانم تاعوونەکەم گرتووە، بەڵام ئەوانی تر نازانن. بۆیە هاتووم بۆ لای ئێو، دەمەوێت بە ئارامی نەخنکێم و پەلەقاژێیەک بکەم، دەمەوێت بەر لەوەی

بخنكێم دەست بە شتێكەوە بگرم. من بەچاوی خۆم دەبینم، هەموو ستافی ڕۆژنامەكە دەبینم، هەموو خەڵك دەبینم دەخنكێن و ئاسوودەن، بە هەڵمەت و جۆشەوە بەرەو ئەو خنكانە مەلەدەكەن. من دەمەوێت بەر لەوەی تەواو یادەوەری خۆم لەدەستبدەم هاوارێك بكەم، بەڵكو یەكێك بمبینێت و بزانێت بەدبەختێك خەریكە نوقمدەبێت ... هەر ئەوەیە مامۆستا ئەسفەر من بۆ ئەوە لێرەم. ئەسڵەن من لە بەر خۆم لێرەم، چونكە دڵنیام نەخۆشم ... نازانم تۆ چۆنیت، دەمەوێت كەسانێك بدۆزمەوە نەخۆش نەبن، دەزانم كەسانێك لەم شارەدا هەن، لەم دونیایەدا هەن كە نەخۆش نین، بەڵام لە كوێن؟ كێن؟ دەتوانن یارمەتی من بدەن یان نا؟ نازانم».

مامۆستا ئەسفەر كەمجار كەسێكی بینی بوو وا بە ڕوونی گرفتی خۆی بزانێت و بوێرێت باسیبكات. بۆ ئێستێك چاوی نوقاند و وای هاتە پێشچاو، سەلام كەسێك بێت لە چیرۆكێكی خۆی ڕایكردبێت كە ناونیشانی «نەخۆشخانەی نەخۆشییە نەبینراوەكان» بوو، كە پاڵەوانەكانی هەر یەكەیان نەخۆشییەكی تایبەتی هەبوو جگە لە خۆیان كەسی دیكە نەیدەبینی. دەیزانی خەڵكی ئەم شارە ڕقیان لە هەر كەسێكە بزانێت دەردی خۆی چییە، چونكە كەسانی نەخۆش دەرگای ئەوەیان بۆ دەخەنە سەر پشت، فەنتازیای ڕەشی خۆیان بخەنە كار، بە جۆرێك ئەوان هەم دەرد و هەم دەرمانی بۆ دیاریبكەن. خەڵكی ئەم شارە بوار نادەن هیچ نەخۆشێك باسی نەخۆشییەكەی خۆی بكات، بەڵكو ئەوان بۆی دیاریدەكەن چییەتی، بۆ تووش بووە، دەبوو چی نەكردایە، دەبێت چی بكات. ئێستا یەكەمجار كەسێكی دەبینی دەیزانی بەدەست چییەوە دەناڵێنێت. ئەمجارە وردتر سەیری سەر و سیمای باباجانی كردەوە، دیاربوو لەو گەنجە غەمگینانەیە كە هەر لە سەرەتاوە پیر دیارن، پرسی «لەگەڵ هیچ كەسێكی تردا قسەت كردوە؟». باباجان گوتی «نا ، هیچ كەس نازانێت من دەڵێم چی، چونكە سەیركردنیان بۆ بیرچوونەوە جیاوازە لەگەڵ مندا، ئەوان پێیان وانییە هیچیان بیرچووبێتەوە... هەر كەس

پێیوایە خۆی بەشی خۆی کێشەی هەیە، کە کاتی ئەوەی نەبێت بیر لە دەردی ئەم و ئەو بکاتەوە، هەستدەکەن ناچارن بەشێک لە دەرد و مەراقی ئەم دونیایە فڕێبدەنە لاوە تا بیانکرێت بژین و فریای دەردی خۆیان بکەون. لەوەشدا ناهەقیان ناگرم». مامۆستا ئەسغەر پرسی «گەر هەواڵی گرتنی لیوا جەنگیز بڵاوبێتەوە چی دەبێت؟ گەر بڵاونەبێتەوە چی دەبێت، ئەوە پرسیارەکەیە؟». «گەر بڵاوبێتەوە چەند هەفتەیەک خەڵکی قسەی لەسەردەکەن، دواتر بیردەچێتەوە... دڵنیام، بەڵام گەر بڵاونەبێتەوە چی دەبێت؟». مامۆستا ئەسغەر پاڵیدایەوە و بەویقارێکەوە کە پتر لەویقاری نوسەرە گەورەکان دەچوو، گووتی «گەر بڵاونەبێتەوە دەبێت بە مەتەڵ، دەبێت بە نهێنییەکی قووڵ، دەبێت بە پرسیارێکی موگناتیسی کە دەتوانێت هەندێک کەس ڕابکێشێت یارمەتیمان بدەن بزانین لیوا لە کوێیە... گەر چیرۆکی لیوا ئاشکرا بێت و ئاسان بەسەر خەڵکدا تێبپەڕێت، گەر هەموو بزانن لیوا لە کوێیە، ئەوسا کەس بۆی گرنگ نامێنێت لیوا چی بەسەر دێت، بەڵام گەر بە نهێنی بمێنێتەوە، گەر بیخەینە قاڵبی نهێنییەکی گەورەوە، ئەوسا لەوانەیە بتوانین ڕزگاریبکەین».

باباجان بە خەندەیەکی شەرمنانەوە گووتی «من ئەسڵەن نامەوێت لیوا ڕزگاربکەم. دەمەوێت شتی دژی ئەو تاعوونە بکەم. شتێکی گەورە، دەمەوێت ژیانی خۆم ڕاستبکەمەوە، بیخەمەوە سەر خەتێک مانای هەبێت. بۆ ئەوە جەنابی مامۆستا دەبێت دوای شتێکی گەورە و ڕاستەقینە بکەوم، بە جۆرێک یادەوەری خۆشم پێویستی بەوە بێت نەخەوێت و غافڵ نەبێت. دەمەوێت ئەو بێباکییە لە خۆمدا بکوژم».

مامۆستا ئەسغەر پاڵیدایەوە و پرسی« من دەتوانم چیت بۆ بکەم؟». باباجان سەیرێکیکرد و لێی پرسی «دەتوانیت چیم بۆ بکەیت؟». مامۆستا بێئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی ئەو بێت، بێئەوەی هیچ شتێک لە دەنگ و سیما و جوڵاندنەوەیدا بگۆڕێت گووتی «شەوێکم بدەرێ بیری لێبکەمەوە... یەک شەو».

ئەوە دوا قسەی گرنگی نێوان مامۆستا ئەسغەر و سەلام باباجان بوو. دوای نیو سەعات لەوە باباجان بە سەرێکی گێژەوە لە ماشێنەکەی خۆیدا بەرێگاوە بوو بەرەو ماڵ. تاکە هیوایەک لە دڵیدا بوو، ئەوە بوو شتێک بکات، توانای خۆی لەسەر تێپەراندنی ئەم تاعوونە بەهێزتر بکات .

## یاداشتەکانی مەهدائیلی فریشتە

شەوێکی زۆر درەنگ، هۆشەنگی بولبولیار و دکتۆر مستەفا شوکاک لە بەردەم مزگەوتی مەلا حەسەنی کوێستانیدا یەکیان بینی، شەوێکی شێداری بەهاربوو، هەموو شتەکان بۆنێکی تایبەتیان لێدەهات، کە هەم بۆنی شەو بوو، هەم بۆنی خەوتووی بەهار. بولبولیار نزیکی دە دەقیقە لە بەردەم مزگەوتەکەدا وەستا تا دکتۆر شوکاک بەخۆی و بەڕازیلییە شڕەکەیەوە گەیشت. ئەو ماوەیە لەوێدا وەستابوو، تەرخانیکرد بەس هەوای پاکی شەو هەڵمژێت. دڵنیابوو بۆنی کوچەکان و شەقامەکان و باغچەکان لەشەودا جۆرێکی ترن، جۆرێکی جیاواز لە بۆنی ڕۆژ. لە دڵی خۆیدا گووتی «لە شەودا کیمیایەکی تر حوکمی دونیا دەکات، یاسای تر، هێزی تر، سروشتی تر». گەرچی بەهار نیوەی تێپەڕاندبوو، بەڵام دونیا هێشتا ساردبوو، بولبولیار لە غەمپاشاوە بە خێرایی هاتبوو تا لە کاتی خۆیدا بگاتە بەر مزگەوتەکە و دکتۆر ببینێت، غەمپاشا بەشەو لە هەموو وەرزەکاندا ساردبوو، لەو گەڕەکە سەیرانەی دونیا بوو کە هیچ کات بەتەواوی گەرمی نابێتەوە، هەمیشەش دوای نیوەشەوان، کزەیەکی دڵتەزێنی هەیە، کە پێدەچێت هەوای ئەو هەژارییە ئەزەلییە بێت کە لەم کوچەیەدا هاتوچۆ دەکات. کە گەیشتە بەر مزگەوتەکە، هەستیکرد هەم دەستەکانی و هەم قاچی تەزیون... بەڵام دڵنیابوو پلەی گەرما وەهاش نزم نییە بەو شێوەیە بیتەزێنێت، لەبەرەوە بەخۆی گووت «بە هۆی تەزینی ڕۆحەوەیە». ئەوە دێرێکی زۆر کۆن بوو لە قەسیدەیەکی نەغەدە

ماردینی بە ناوی «جەلادی فریشتەکان»ـەوە. «هەمووی بە هۆی تەزینی ڕۆحەوەیە کە زستان زووتردێت، گەرمی تۆ دەڕوات و بەفر جێگای دەگرێتەوە» هەموو دێڕەکەی لە بەر خۆیەوە دووجار گووتەوە و لەخۆی پرسی «وای خانم چەند لە مێژە شیعرێکی تەواوی تۆم نەدیوە... چەندە». لەوەدا بوو بیر لە شیعرەکانی ماردینی بکاتەوە، کە دکتۆر بەخۆی و ماشێنەکەیەوە لەوسەری کوچەکەوە دەرکەوت. پڕ بە دڵ ئاواتی خواست دکتۆر دانەبەزێت و باوەشی پیابکات، حەزی لە بۆنی دکتۆرەکان نەبوو... لە بۆنی مرۆڤی ئاسایی یان بۆنەکانی دیکەی ناو سروشت نەدەچوو، بۆنێک بوو لەبری ئەوەی پاکژی و تەندروستی بیربخاتەوە، نەخۆشی و میکرۆبی بە یادا دەهێنایەوە. خۆشبەختانە دکتۆر لە ماشێنەکەی دانەبەزی، بولبولیار سواربوو، پێکەوە گەڕانەوە بۆ غەمپاشا، لەوێ وەفائیلی فریشتەیان هەڵگرت و بەرەو ئەو ژێر زەمینە بەڕێکەوتن کە ئەرشیفی فریشتەکانی تێدابوو.

ژێرزەمینەکە لە ماڵێکی چکۆلانە و سەربەخۆ دەچوو، بۆ خێزانێک بیەوێت لانکەیەکی هەمیشەیی بۆ ژیان بدۆزێتەوە باش نەبوو، بەڵام بۆ کەسانێک لە تەنگانەدابن، داڵدەیەکی کاتی و پەناگایەکیان بوێت، کاری ڕاییدەکرد. ئەرشیفی فریشتەکان لەوە کەمتر بوو کە دکتۆر چاوەڕوانیدەکرد، لەو کاتەوەی بولبولیار باسی ئەم ئەرشیفەی کردبوو، وای دانابوو سەدان کارتۆن و فایل و سندوقی پڕ یادگاریی ببینێت، بەڵام ئێستا کەمێک نائومێد و دڵشکاو هاتە بەرچاو. ئەرشیفەکە لە چەند کارتۆنێکی گەورە کە نزیکی بیست دانەدەبوو، زیاتر هیچی تر نەبوو، بەشی هەرە زۆری کەلوپەل و جلوبەرگی جیاوازی فریشتەکان بوو، کە ساڵانی خۆشبەختی لە کەشتییەکەدا لە بەریانکردبوو. ئەوەی دیش هەندێک دەفتەری یاداشت و چیرۆک بوو، کە لەو چەند ساڵەدا فریشتەکان نوسیبوویان و گێڕابووینەوە، لەگەڵ هەندێک ڕۆمان و وێنە و کتێبی تایبەت بە فریشتە و بەسەرهاتەکانیان... لە ڕاستیدا ئەرشیفەکە جێگایەکی کەمی لە ماڵەکەدا گرتبوو، هێشتا ڕووبەرێکی زۆر بۆ خواردن و خەوتنی چەند کەسێک بەتاڵ

بوو. دکتۆر هەندێ پێخەف و خواردنی کەمی هێنابوو، بکرێت جارێ بولبولیار و فریشتەکەی لێرە بمێننەوە. هەر ئەو شەوە پێکەوە لەگەڵ دکتۆر موستەفا شوکاکدا سەری هەندێک لە کارتۆنەکانیان کردەوە، زۆربەی ئەرشیفەکە چیرۆکی ئەو فریشتانەبوو کە خەونیان بە ژیانێکی دییەوە بینی بوو و خەونەکانیان و بەسەرهاتەکانیان نوسرابووەوە، زۆربەیان دەستنوسگەلێک بوون لەو دەستنوسە بێکەڵکانەی دەرەنجامی دروستکردنی ئەو چیرۆکە خەیاڵیانەبوون کە مەلەکبینەکان لەگەڵ فریشتەکاندا دروستیانکردبوو، هەموو ئەو کارتۆنانە ڕێزانی مەلەکبین بە دەستی خۆی لێی نوسیبوون «ژیانە خەیاڵییەکان». هەندێک لە کارتۆنەکانی دی لێیان نوسرابوو «دۆسییەی فریشتەکان». لە ناو هەمووان‌دا کارتۆنێک سەرنجی ڕاکێشان، وەک سندوقێکی بچوک بوو، لەسەری نوسرابوو «یاداشتی فریشتەکان بە ڕیوایەتی خۆیان». تا ئەو کاتە هیچ کامیان نەیانزانیبوو کە دەشێت فریشتەکان یاداشتیان نوسی بێت، هەردووکیان هەموو شتەکانی دییان جێهێشت و ئەو کارتۆنە بچوکەیان کردەوە. کارتۆنەکە سی و پێنج دەفتەری تێدابوو، کە هەر سی و پێنجیان لە ڕەنگی یەک بوون، دەفتەری ئەستوور و تەلدار و بەرگ شین... هەر سی و پێنجیان ڕێزانی مەلەکبین خۆی پۆلێنیکردبوون و ژمارەی لێدابوون. دەفتەرەکانیان هەڵڕشت و یەکە یەکە کەوتنە سەیرکردنی بەرگەکانیان، «ژیانی ئەلیائیلی فریشتە بە ڕیوایەتی خۆی - بەرگی یەکەم»، «ژیانی ئەلیائیلی فریشتە بە ڕیوایەتی خۆی - بەرگی دووەم» «ژیانی لەیلائیلی فریشتە بە ڕیوایەتی خۆی - بەرگی چوارەم» «ژیانی ئێرفانیلی فریشتە بە ریوایەتی خۆی - بەرگی حەوتەم» «ژیانی مەهدائیلی فریشتە بە ڕیوایەتی خۆی - بەرگی دووەم» .... دۆزینەوەی یاداشتەکانی مەهدائیلی فریشتە، گرنگترین ڕووداوی ئەو شەوەیان بوو. یەکەمجار دکتۆر شوکاک بەندی یەکەمی بیرەوەرییەکانی مەهدائیلی دۆزییەوە، هەڵیگرت و بە ئەسپایی گووتی «دەبێت لێرەوە دەست پێبکەین». کەسیان نەیاندەزانی کە مەهدائیل یاداشتی نوسیوە، یان هیچ یەک لە فریشتەکان یاداشتیان نوسیوە. ئەو ڕۆژەی بولبولیار ئەرشیفەکەی

گوێزایەوە، سەیری هیچ شتێکی نەکرد، بەتەنیا لەگەڵ شۆفێرێکدا شتەکانیان بارکرد و دایانگرت بێئەوەی چرکەیەک کاتی هەبێت بەفیڕۆی بدات. بولبولیار هاتەوەیادی کە لە ماوەی بەر لە سووتانی کەشتییەکەدا، خاتوو ڕێزانی مەلەکبین هەندێ جار لە ژوورەکەی خۆیدا دەنگی دەهات، هەندێ جاریش ئەم دەیتوانی دەنگەکان جیابکاتەوە، ئاشکرا لە نێوان هەموو دەنگەکاندا دەنگی مەهدائیلی دەناسییەوە، بەڵام دڵنیا نەبوو ئاخۆ هەموو ئەو دەنگانەی تر کە کپ بوون، کە تەماوی و خنکاو دەگەیشتنە گوێی ئەو، دەنگی ئەوبوون یان نا؟. ئەو شەوە بولبولیار دوای ئەوەی دکتۆر بەجێیهێشت و وەفائیلی فریشتە بە ئارامی خەوی لێکەوت، دەستیکرد بە خوێندنەوەی یاداشتەکانی مەهدائیلی فریشتە، کە دەرگای دونیایەکی سەیریان لێکردەوە. هەڵبەت من خۆم یاداشتەکانی مەهدائیلی فریشتەم نەبینیوە، بەڵام ساڵانێک دواتر بولبولیار تەواوی ناوەڕۆکەکەی بە وردییەکی ناخۆش و بێزارکەرەوە بۆ گێڕامەوە، وەک ئەوەبوو ئەو تێکستەی ددیانجار خوێندبێتەوە، وەک ئەوەی تەواوی تێکستەکەی لەمسەر بۆ ئەوسەر بە هەموو وردەکارییەکان و هەڵەکانی نوسینەوە لە بەر بێت، وەک ئەوە بوو تێکستێک بێت خۆی لە خەیاڵدا نوسیبێتی و بیڵێتەوە... بەڵام لەڕاستیدا هۆی لەبەرکردنەکەی ئەوە نەبوو کە تەنیا قووڵ لەگەڵ هەموو حەرفێکیدا ژیاوە، بەڵکو ویستبووی لە بەر بایەخی تێکستەکە لەسەری خۆیدا هەڵیبگرێت، نەوەک جارێک لە جاران بفەوتێت و دواتر هیچ یاداشتێکی ڕاستەقینەی فریشتەیەک لەسەر زەمین دەست نەکەوێت. من لێرەدا کورتەیەک و چڕکراوەیەکی ئەوەی بولبولیار بۆمی گێڕایەوە دەنوسمەوە، ئەوەی ئێوە دەیخوێننەوە، یاداشتەکانی مەهدائیلی فریشتەیە بە ڕیوایەتی من، لێوا وەفای ڕەفعەت بەگ، نەوەک خودی تێکستە بنەڕەتییەکە بەو جۆرەی کە مەهدائیل نوسیویێتی، لێرەوە چڕکردنەوە و لادان و کورتکردنەوەیەکی زۆر لە هەموو بەشەکانی ئەو یاداشتە دووروودرێژانەدا کراوە تا بگونجێت لە جێگایەکی وەک ئێرەدا وەزیفەی خۆیان بگێڕن. یاداشتەکان تەنیا یاداشتی ڕۆژانەی فریشتەیەک نین کە توانا و وزەیەکی گەورەتری لە فریشتە نەخۆشەکان تێدایە، بەڵکو

بەڵگەنامەی خەباتی فریشتەیەکە کە ویستویێتی بژی و بمێنێتەوە و دۆستی ئێمەی مرۆڤ بێت. بەوەدا من یاداشتی هیچ فریشتەیەکی ترم نەبینیوە، بەوەدا سەربوردی وردی هیچ فریشتەیەکی ترم نەخوێندۆتەوە، دەبێت بڵێم کە ناتوانم ئەم یاداشتانە بە نوسینی هیچ فریشتەیەکی تر بەراوردبکەم. بەڵام دەبێت بڵێم کە مەهدائیل بە زمانێکی سادەی ئینسانی، بە زمانێک کە کەرەستەی کەسێکە زمانی حیکایەتکردنی تاقیکردۆتەوە، شتەکانی گێڕاوەتەوە. لێرەدا من بە دووری نازانم کە لە خودی تێکستەکەدا هەندێک لە فەلسەفە و تێڕوانینی بولبولیار بۆ ژیان پەرێبێتەوە و وەک بەشێک لە یادەوەرییەکانی مەهدائیل لێرەدا هەڵگیرابن، بەڵام چیرۆکەکە پتر ڕوونیدەکاتەوە مەهدائیلی فریشتە کێیە و چ جۆرە مەخلوقێک بووە.

## چیرۆکی مەهدائیلی فریشتە «1»

**«چەند بەشێکی وەرگیراو لە یاداشتەکانی مەهدائیلی فریشتە. گێڕانەوەی لە ڕووی تێکستە ئەسڵییەکەوە : هۆشەنگی بولبولیار. کورتکردنەوە و داڕشتنەوەی: مامۆستای چیرۆکنوس سەلیم ئەسفەر»**

ناوم مەهدائیلی فریشتەیە، بەڵام فریشتەی ڕاستەقینە وەک ئینسانی ڕاستەقینە وەهایە، کاتێک دێتە دونیاوە ناوی نییە. ناونان بۆ من شتێکی سەیربوو، من تەنیا خۆم وەک فریشتە دەبینی، فریشتە و بەس. زۆر زەحمەتە بۆ فریشتەیەک بە وردی بزانێت چ ڕۆژێک هەستی بە بوونی خۆی کردوە، بەش بە حاڵی خۆم نازانم، ناکرێت فریشتەکان وەک تۆوی درەخت تەماشابکەین، وەک شتێک کە لە ڕۆحی کەسێکدا دەڕوێن و سەوزدەبن و باڵدەگرن و دوایی دەفڕن، واتە چی زانیارییەکتان لەسەر سوڕی ژیانی ڕووەکێک یان مێشێک یاخود کرمێکی ئاوریشم هەیە،

لەبیرییبەنەوە و بەوجۆرە بیر لە لەدایکبوونی فریشتە مەکەنەوە. نا، فریشتە بوونی یەک ئینسانە لە دوو جیهاندا، بوونی یەک ئینسانە لە دوو دۆخ و دوو بیرکردنەوەی جیاوازدا، کەرتبوونی کەسێکە لە نێوان خۆی و پێچەوانەکەیدا... ئەو دیوەی تری هەموو شتەکانە کە مرۆڤ بە چاو نایبینێت ... وەک دیوی ئەو دیوی مانگ کە ئێمە لێرەوە نایبینین، وەک دیوی ئەو دیوی خۆر کە نازانین چۆنە. وەک دیوی ئەودیوی گەردون کە هەرگیز نایبینین و نازانین چییە، وەک دیوی ئەو دیوی ژیان کە نازانین ئاخۆ هەیە یان نییە، وەک دیوی ئەودیوی زەمەن کە نازانین وەستانە یان تێپەڕین، وەک دیوی ئەودیوی مردن کە دەشێت سەدان دیوی هەبێت. فریشتەکانیش دیوی ئەودیون، دەشێت هەمان شت بن وەک چۆن دیوی ئەودیوی شوشەیەک هەمان شتە، دەشێت شتێکی هەزارجار جیاوازیش بن، وەک چۆن دیوی ئەودیوی تابلۆیەکی قەشەنگ هەزار جار لە دیوی نیگارەکەی جودایە. من دیوی ئەودیو بووم، دیوی ئەودیوش هەمیشە جێگایەکی ئاڵۆز و تەلیسماوییە. دیوی ئەودیو ئەو شوێنەیە زۆرجار خۆشی نازانێت چییە، بەس تەنها دەزانێت دیوی ئەودیوە و هیچی تر.

مرۆڤ وەک چۆن لە دەرەوە ئاوێنەیەکی هەیە سەیریدەکات، لە ناخیشدا ئاوێنەیەکی هەیە، ئاوێنەکەی دەرەوە ئەو ڕوکەشەی پیشاندەدات کە لەخۆی دەچێت، بەڵام ئاوێنەکەی ناوەوە ئەو ڕوخسارەی تری پیشاندەدا کە لەخۆی ناچێت. فریشتە ئەو دوژمنەیە کە مرۆڤ لە ناو خۆیدا بۆ خۆی دروستدەکات، وەک چۆن هیچ شتێک نییە دیوی ئەودیوی نەبێت، هیچ مرۆڤێکیش نییە دیوی ئەودیوی نەبێت... بەڵام ئاخۆ دیوی ئەودیو هەمیشە فریشتەیە، هەمیشە هەمان شتە، ئەوەیان لە توانای مندا نییە وەڵامی بدەمەوە. من مەهدائیلی فریشتە کە هیچ نیم جگە لە فریشتەیەک کە نازانێت بۆچی فریشتەیە، وەک چۆن تۆ نازانیت بۆچی مرۆڤیت و توتی یاخود گوڵە نێرگسێک نیت. من تەنیا وێنەیەک بووم لەو ئاوێنەیەدا، تەنیا دوژمنێک بووم.

ناوەوەی ئینسان وەک سەردابێکی تاریک وایە، مرۆڤ کە دەڕواتە ناوی هەمیشە بۆ خۆی دەگەڕێت. لە ناخی مرۆڤدا هیچ شتێکی تێدا نییە جگە لە خۆی، هیچ شتێک، جیهان، خەڵکانی تر، حوکمەکانیان تەنیا لەسەر ڕووپۆشی دەرەوەی ئینسان دەوەستن، بەڵام ناوەوەی ... ناوەوەی جگە لە خۆی هیچی تری تێدا نییە. بەڵام خۆی شتێکی بەتاڵە، ناوەوەی ئینسان شوێنێکی عاسی، نەبینراو، مەلعون و بەتاڵە. هەر کات مرۆڤ ویستی خۆی بگرێت، جگە لە هەوا، هیچی دی دەست ناکەوێت.

ڕۆح لە هەموو مرۆڤێک و لە هەموو دەمێکدا نییە، ڕۆح لە هەندێک مرۆڤ و لە هەندێک کاتدا هەیە. من تا خاوەنەکەم گەیشتە پۆلی سێی ناوەندی و تەمەنی بوو بە پازدە ساڵ ڕۆحی نەبوو، بەو مانایەی پێویستی نەبوو ڕۆحی هەبێت، ئەو تەنیا جەستە و هەست و عەقڵ بوو، بێ ڕۆح. مرۆڤ هەیە قەت ڕۆحی بۆ دروست نابێت... هەمیشە ئەو توێژاڵکە تەنکەیە لە پێست و ئێسک و نیگای کێشراو و وشەی نوسراو کە ئەوانی تر لەسەری دەنوسن و نیگاری لەسەر دەکەن.

ڕۆح پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژانەوە نییە، وەختە بڵێم ڕۆح شۆڕشی ئینسانە دژ بە خۆی. پەیوەندی بە هێزێکی زۆر ترسناکەوە هەیە کە لە ناخی ئینساندا دروستدەبێت و شارێکی ناوەکی بۆ دروستدەکات. ڕۆح ئەو شارەیە کە مرۆڤ لە ناو خۆیدا دژی هەموو شار و شوێنە ڕاستەقینەکان دروستیدەکات. شارێکە یان نییە یاخود کە بوو، زۆر زۆر گەورەیە.

فریشتەکەی ئینسان لەو شارەدا دروستدەبێت، لە سەر ئاوێنە گەورەکانی ئەو شارە کە هەموو ئەو وێنانەی مرۆڤیان لەسەرە کە مرۆڤ نایانگاتێت، دیوارەکانی شاری ڕۆح پڕن لە ئاوێنە و من لە سەر ئەو ئاوێنانە دروستبووم.

هەر کاتێک مرۆڤ دێت و ئەو شارە دەگەڕێت، ئەو بەشە لەخۆی دەبینێت کە لە خۆی ناچێت. ڕۆح بۆیە لە مرۆڤدا دروستدەبێت تا مرۆڤ بتوانێت لە خۆی یاخی ببێت. هەموو ئەوانەی دەتوانن سەیری ڕۆحی خۆیان بکەن،

تووشی دوودڵییەک دەبن، تووشی ئەو پرسیارە دەبن: چی بکەم؟ هەوڵبدەم وەک ئێستابم، وەک ئەم کەسە بم کە ئەوانی تر دەمبینن و دەمناسن، یان دەبێت شتێکی دیکە بم؟.

مرۆڤ بوونەوەرێکە دەتوانێت خۆی نەوێت، ئەوە تاکە شتێکی جەوهەرییە لە گیانەوەر و شتەکانی دیکەی جیادەکاتەوە. تووتییەک ناتوانێت شێوە و ژیانی خۆی قەبووڵ نەکات، بەڵام مرۆڤێک دەتوانێت.

من مەهدائیلی فریشتە، بەیانییەک هەستام و ئیدراکم بە بوونی خۆم گەیشتبووە پلەی کەماڵی خۆی، گەیشتنی فریشتەیەک بە پلەی کەماڵی ئیدراک زۆر سەختە، بەرەنجامی ململانێیەکی ناوەکی و رۆحی گەورەیە، تەواو وەک گەیشتنی دەروێشێک وایە بە پلەی دەرککردنی جەوهەری خۆی وەک دەرککردنی ئینسان بە جەوهەری خۆی بەرامبەر بە جەوهەری خودا.

من منداڵییەکی ڕاستەقینەم نییە، زۆربەی فریشتەکان منداڵییەکی ڕاستەقینەیان نییە، چونکە زۆرجار لە منداڵدا مرۆڤ و فریشتە بە جوانی پێکەوە دەژین.

بەڵام رۆژێک دێت فریشتەکەت دەبێت بڵێت نا، هاوارێکبکات، هەر هاوارێک بێت، بۆ هەر شتێک بێت. ئەو هاوارە لە دڵی خاوەنەکانماندا تۆزێک عەجایەب دەکەوێتەوە، وەک ئەوەی شتێک پەڕیبێتە گەروویان، پژمەیەکی ناوەختیان لێپەڕیبێت، خەفەتێکی کتوپڕ بەرۆکی گرتبن، مۆتەکەیەک لە خەودا چووبێتە وێزەیان، یاخود گوێیان لە هاوارێکی دوور بووبێت. هەر کەسە و بە جۆرێک ساتی یەکەمی ئەو هاوارە دەژی، هەیە قورگی پێی دەخورێت، هەیە تووشی سکچوون دەبێت، هەشە هەر هەستی پێناکات.

لە ساڵانی شەستەکاندا ئەم شارە شانۆی جەنگێکی گەورەبوو، نەتەوەپەرستەکان و کۆمۆنیستەکان شەڕێکی قورسیان بوو، لەسەر دوو شت شەڕیاندەکرد و لە یەکدیان دەکوشت کە هیچیان بوونیان نەبوو، لەسەر نەتەوە و پرۆلیتاریا. دوای ئەوەی لە خاوەنەکەم جیابوومەوە و

بوومە فریشتەیەکی بەهێز و تەندروست، ساڵانێکی زۆر کتێبم خوێندەوە، خولیام بوو تێبگەم ئەم مەخلوقە کە ناوی مرۆڤە لە چ جۆرە بەردێک تاشراوە و مەعدەنەکەی چییە. ئەو ساڵانە گەیشتمە ئەو بڕوایەی شەڕی شەستەکانی ئەمشارە کە سەرەتاکانی هوشیاریی منی تێدا پژا، شەڕی نێوان نەتەوەپەرستەکانی کورد و شیوعییە مارکسیستەکان، شەڕێکی بێسوود و بێمانا بووە. شەڕێک بووە لە دەوری دوو خەیاڵ سوڕاوەتەوە کە مرۆڤەکان بڕوایان بەخۆیان هێناوە کە بوونیان هەیە، بێئەوەی بوونیان هەبێت. من گەرچی فریشتەیەکی زانانیم بەو مانایەی بکرێت بڵێم لە ڕشتەیەک لە ڕشتەکاندا دەستی باڵام هەیە، بەڵام زۆر حەزم لە کتێب بوو، فریشتەکان هەموو حەزیان لە کتێبە، بەشی هەرە زۆری ئەو کتێبە باشانەی لە دونیادا نوسراون، فریشتەکان نوسیویانن و بە ناوی مرۆڤەوە بڵاوبوونەتەوە.

من لە گەشتی خۆمدا بە دوای ناسینی فریشتەکانی هاوجنسم و ئینساندا گەیشتمە ئەو بڕوایەی زۆربەی جەنگە قورسەکان زۆرجار لە پێناوی وەهمێکدا بوون، کە ئەگەر مەخلوقێکی عاقڵ لە دەرەوەی ئەم ئەستێرەیەوە بێت و لەو مێژووە بڕوانێت، سەری لەم بوونەوەرە دەسوڕمێت کە چ دەستخەڕۆیەکی گەمژەیە، کە جاری وایە سەدان ساڵ دەچێتە جەنگێکەوە لە پێناوی یەک وشەدا، وشەیەک وەک خودا، یان نەتەوە، یان چەوساوەکان، بێئەوەی ئەو وشەیە هیچ مانایەکی هەبێت ... منیش وام، من مەهدائیلی فریشتە کە ئێستا دانیشتووم و دەمەوێت ڕاستگۆیانە مێژووی خۆم بنوسمەوە، خۆم بە مرۆڤی ئەستێرەیەکی تر دەزانم. لەڕاستیدا لەو ماوەیەدا کە من تێیدا ژیام هیچ فریشتەیەکی ترم نەدەبینی وەک خۆم لە کاروباری ئینسانەوە ئاڵابێت، وەک من خولیای بێت تێکەڵاوی سیاسەت بێت، ڕۆژنامە بخوێنێتەوە، هەتا ماوەیەک دوای هەرەسی شۆڕشەکەی بارزانی بیرم لەوە کردەوە ببمە پێشمەرگە و خۆم تێکەڵی سیاسەت بکەم. من لەو فریشتە بێمانایانە بووم کە زۆر لە مرۆڤەوە نزیکن. هەتا بۆ ماوەی چەند مانگێک بۆ شانۆگەری «فریشتە لە

بابل دەنیشێتەوە» پرۆڤەمکرد، بەس دواجار کەسێکیان دۆزییەوە لە من باشتر ڕۆڵی فریشتەی دەبینی، نمایشەکەیان دا بەو. من تکام لە کاکی دەرهێنەر کرد بە«دەبڵ کاست» نمایشبکەین، قەبووڵی نەکرد و گووتی «لە ژیانمدا کەسم نەدیوە بەقەد تۆ خراپ دەوری فریشتە ببینێت، وای بەشەر تۆ ئەسڵەن هەر نازانیت فریشتە چییە». بایەخی من و سەرسامیم بە دونیای مرۆڤ، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی دەرککردنم بە خۆم، کە هێشتا دوو چاوی تینوو بووم و لە ناخی خاوەنەکەمەوە دەمڕوانی. خاوەنەکەم «مەهدی» ناوبوو، دواتر ناوی مەهدائیل لە ناوی ئەوەوە داتاشرا. لە سالآنی شەستدا گەنجێکی کوردپەروەری تووڕەبوو، یەکەمین شتێک منی لە خەو هەستاند و وایکرد هەست بە نامۆییەکی قووڵبکەم، ڕووداوێکی ترسناکی شەوێکی تاریک بوو، من وەک شاهیدێکی ترساو و بێدەنگ لە ناوەوە، لە پەنجەرە سەیر و سیحراوییەکانی دەرونەوە تەماشامدەکرد. لەو کاتەوە لە یادمە، کە مەهدی خاوەنم بوو بە ئەندام لە ڕێکخراوی گەنجانی تێکۆشەر و کوردپەروەردا کە لکێکی ڕێکخراوی نەتەوەپەرستترین حیزبی ئەو سەردەم بوو. گەنجانی تێکۆشەر، ڕێکخراوێکی چەکدار بوو، کاریان دژایەتی کۆمۆنیستەکان بوو، لە هەر جێگایەک شیوعییەکیان بگرتبایە ئازاریاندەدا، مەهدی لە هەموو کەسێکی ڕێکخراوەکە توندتر بوو. من کاتێک هەستم پێکرد کە بینیم ئێواران هەمیشە لەگەڵ تاقمێک لە گەنجانی شۆڕشگێڕدا، گەشتێکی بە شەقام و چایخانە و کۆلآنە سەرەکییەکاندا ڕێکدەخست، گەنجانی شۆڕشگێڕ، هەمیشە یەک یان دووانیان دەمانچە و ئەوانی تر هەموو چەقۆ و بۆکس خەنجەریان پێبوو. زۆربەی کات بەتاقم دەگەڕان، لە چایخانەیەک بەناوی چایخانەی مام کەریم کۆدەبوونەوە و لەوێوە دەردەچوون بۆ «ڕاوە شیوعی». سەرەتا هەر توانج و لاقرتی و قسەی سووک بوو، بەڵام کەمە کەمە گۆڕا بۆ شتی زۆر ترسناک. ڕۆژێکیان بە هێمنی سەیرمدەکرد و بینیم مامۆستایەکیان گرت کە سەری کەمێک سپی بووبوو، مەهدی بانگیکرد «هێی مامۆستا ساڵح، بوەستە، پرسیارێکم هەیە. ڕاستە تۆش بوویت بە شیوعی. ڕاستە؟» کابرا هیچی نەگووت، پیاوێکی بێدەنگ بوو

بەرێگای خۆیدا ڕۆیشت و ویستی خۆی لابدات، مەهدی گووتی «بۆ ڕاستی نالێیت، وادەزانی نازانین بوویت بە ئەندام لای عومەرە حیزی ئەجزاخانە». شەش کەس بوون هەر شەشیان چواردەوری ئەو پیاوە بە تەمەنەیان دا، هەر شەشیان شەرواڵ و مراخانی ڕەشیان لەبەردابوو، هەر شەشیان بۆکس خەنجەرەکانیان لە دەستیاندا بوو، مەهدی چووە بەردەمی مامۆستا و گووتی «عومەرە حیزی ئەجزاخانە بوو بەو پیاوە خەڵک تەنزیم بکات، بە گۆڕی شەهیدان ئەوە ئەمری سەرەوەیە کچەکەیت بۆ هەڵدەتلێشێنم... بەخودا جوانە. تۆ عەیب ناکەیت بەو سەرە سپییەوە، بوویت بە شیوعی، لەوە پیرتر دەبیت بێناموس، حەزدەکەیت بە هەموومان کچت بگێیەین ... حەزدەکەیت». کابرا هیچی نەگووت، سەیرێکی مەهدی کرد و بە دەنگێکی کز گووتی «ڕێگام بدەن بڕۆم». گەرووی دەنگێکی نوساو و غەمگینی تێدابوو کە هیچ کات بیرم ناچێتەوە. مەهدی سەیری ئەوانی تری کرد و گووتی «گوێتان لێبوو، گوێتان لێ بوو... ئە وخوشک حیزە گووتی چی؟ گوێتان لێ بوو؟ دەڵێت ڕێگام بدەن با بڕۆم». یەکێکیان گووتی «من گوێم لێ نەبوو، نەوەڵا، گوێم لێ نەبوو، توخودا مەهدی پێیبڵێ بۆم بڵێتەوە». کۆڵانەکە کۆڵانێکی تەسک بوو، کەم پیادەڕەوی پیادەهات، مەهدی گووتی «ئەو هەڤاڵەمان گوێی لێ نەبوو گووتت چی، بۆی بڵێرەوە... بۆی بڵێرەوە». مامۆستاکە گووتی «ڕەجایە ڕێگام بدەن بڕۆم». یەکێکیان شەرواڵێکی زۆر فشی لەبەردا بوو، جامانەیەکی لە مل پێچابوو، لە کابرا نزیکبووەوە و گووتی «گەماڵ باوک، شیوعی شتە تۆ بوویت بە شیوعی. چییە، بەم پیرییە زەوقت لە دایکت هەستاوە، دەتەوێ سوار خوشکی خۆت بیت ... ئینسانێک ناموسی بێت بۆ قەومی خۆی هەوڵدەدا یان بۆ لینین و ستالینی حیز، بۆ کامیان؟» یەکێکی تریان گووتی «ئەوە عومەری ئەجزاخانە، ژنەکەی و ژنی عوسمانی برای هەردووکیان حیزن، هەموو کەس دەزانێت، ئەنوەری بازرگان لەپێش و پاشەوە لەگەڵ هەردووکیان خەریکە. ناشێت تایەفەکەی تۆش حیزبن و ئێمە نەمانزانیبێت». پیاوەکە کەمێک سوور بووەوە، مامۆستایەکی لاوازی گەنمڕەنگ بوو. ویستی هەنگاوێک بنێت و بڕوات کە

مەهدی یەکەم شەقازلەی لێدا، بە دەنگی بەرز بەوانی دیکەی گووت «بە بۆکسی ئاسن نا... بە بۆکسی ئاسن نا ... بەوە لێیمەدەن. هەر تۆزێک پڕ شەقی بکەن و تەواو». زیاد لە دە دەقیقە بە هەموویان لەو مامۆستا لاوازەیاندا، دواجار بەر لەوەی بە خوێنەوە بەجێی بهێڵن، کە لەسەر زەوییەکەوە کەوتبوو، مەهدی تفێکی تێکرد و گووتی «سبەی دەچیت بەو ژن حیزە دەڵێیت، من گووی مفتم خواردوە کە گووتوومە دەبمە شیوعی... تێگەیشتی ... دەچیت دەڵێیت گووی مفتم خواردوە... کێرم بە لینینی خوشک حیزیش».

ئەو شەوە من بۆ یەکەمجار بە هەموو هێزم لە ناخی مەهدیدا جوڵام، یەکەم جار چنگم گیرکرد و شتێکم لە ناخیدا ڕوشاند، بێئەوەی بزانم ئاخۆ هەستی بە هیچ کردوە یان نا. ڕۆژان و مانگانی داهاتووش تا نزیکی چوار ساڵ، مەهدی لە ڕاوکردنی شیوعییەکاندا بەردەوامبوو، یەکەم کەسێک ئەو کوشتی، قوتابییەکی ئامادەیی پیشەسازی بوو، کوڕێکی گەنج ناوی عادیل بوو، بەرپرسی ڕێکخستنی خوێندکارانی کۆمۆنیست بوو لە خوێندنگاکەی خۆیان، ڕۆژێک لەگەڵ سێ کەسی دیکەدا لە ڕێکخراوی گەنجانی تێکۆشەر، عادیلیان گرت و بردیانە قەراغ شار و لەوێ بە بەرد سەریان پانکردەوە. ڕووداوەکە ترسناک بوو، هەتا ئەوانەش کە حەزیان بە چارەی کۆمۆنیستەکان نەدەکرد، بە ئیشێکی ترسناکیان زانی. دوای ئەوە کارە دزێوە، مەهدیان لە شارەوە گواستەوە بۆ جێگایەک کانی تەیریان پێدەگووت، من لەوێدا تەواو ڕوخساری ترسناکی مەهدیم بینی. ئەو لە کانی تەیر سەرپەرشتی چەند گروپێکی کوشتن و ڕاوکردنی شیوعییەکانی لە ئەستۆ بوو، بەسەر هەموو شار و شارۆچکەکاندا «شیوعی - کوژ»ـەکانی بڵاودەکردەوە. لەو ساڵانەدا مەهدی ژیانێکی سەیری هەبوو، بەیانیان لەخەو هەڵدەستا، لەسەر سفرە دادەنیشت تا دەیکرد پەنیری پێستە و هەنگوینی دەخوارد، دوایی دەستی دەخستە بەر پشتێنەکەی و بە جێبێکی زەیتونی دەکەوتە پیاسەکردن بە گوندەکانی دەوروبەردا، هەمیشە لەجێگایەک لایدەدا و دەبوو نیوەڕوان لە ماڵە جوتیارێک

مریشکێکی بۆ سەربڕن و نانی باشی بدەنێ، کاتێکی زۆری بە دۆمینە و تاوڵەوە دەبردەسەر، حەزێکی بێوێنەی لە فیشەک تەقاندن بوو، زۆرجار لە جێبە زەیتونییەکەی دادەبەزی بۆ ئەوەی لە هەرد و کێوان نیشانە لە شتێک بگرێتەوە یان تەقە لە باڵندەیەک یان گیاندارێک بکات. تەقە لەزەتی گەورەی ژیانی بوو، کاتێک ناڵەی گوللەکانی گوێ لێدەبوو، هەوایەکی سارد و فێنک هەناوی دادەگرت، هەستیدەکرد ئەو دەنگە نیشانەی توانای ئەوە. زۆرجار بۆ دوور دەڕۆیشت، لە هەموو شوێنێک سۆراغی کۆمۆنیستەکانی دەکرد. تا باشتر خۆی بلەوەڕێنێت و خۆی وەک پیاوێکی گرنگ دەربخات، لە جووتیارە شیوعییەکانی دەدا، دەغڵی دەسووتاندن، هەڵیدەواسین و فەلاقەیدەکردن. زۆر ڕۆژ لەسەر خەلە و خەرمانی خەڵک لایدەدا، لە ڕەز و بێستانی جووتیارەکاندا بێپرس دەیخوارد، لە دەواری کوردە غەوارەکاندا دەخەوت، لەگەڵ ئاغاکاندا مەجلیسی دادەمەزراند، بەردەوامیش دەمانچە چواردەخۆرەکەی لەبەر پشتێنەکەیدا بوو. هەموو ئەو ڕەفتارانەی منی هار دەکرد. لە ساڵی شەست و حەوتدا، من یەکەمجار باڵەکانم درێژکردە دەرێ، لەو ساڵەدا هەستمکرد بوونم لە ناو ئەم بوونەوەرە دەغەڵە دڵڕەقەدا وەک بوونمە لە زیندانێکی ترسناکدا، شەو و ڕۆژەکانم وەک ژیان بوو لە ژێرزەمینێکی تاریک و ترسناکدا، هێدی هێدی دەبووم بە ژێر ڕۆتینی ئەو ڕۆحە تەپۆیەوە کە بەسەر مەهدیدا زاڵدەبوو. وردە وردە تادەهات عەقڵی خاوتر و خاوتر دەبووەوە، زۆر دەخەوت، بەشی هەرە زۆری خەیاڵی لای زگی و ژێر زگی بوو. تا ڕۆحی تەمەڵتر بووایە دڵڕەقتر دەبوو، وای لێهات هاوینان لە ژێر کەپرێکدا دەکەوت و مێش گەمارۆیان دەدا و زستانان لە جێگایەکی گەرمەوە دەناڵا و بەردەوام نان و شیر و قەیماغیان دەهێنایە بەر دەست، هەموو شەوێک بەدەست خۆی ئاسوودەدەکرد، شەهوەتەکەی وەک کەتیرەی سپی بە متیل و بەتانی و جلەکانەوە دەنوسا و دواتر دەبوو ژنی جووتیارێکی بەدبەخت سپاڵ و نوێنەکانی بشوات. بەدروست نەیدەزانی چی لە ژیان دەوێت، بەڵام لەزەتێکی زۆری لە دەبەنگی و تەمەڵی خۆی دەبینی، تا تەمەڵتریش دەبوو دڵڕەقتر دەبوو. تەمەڵی و دڵڕەقی دوو

هاوسێی ئەبەدیین، هەمیشەش پێکەوە گرێدراون. تەنیا کار و کرداری ئەوەبوو، ئەو ڕاپۆرتانە بخوێنێتەوە کە لەسەر شیوعییەکان دەهاتن. لەسەرەوەڕا ڕاسپێردرا بوو خۆی بە بەرپرسی تۆقاندن و ڕاونانی شیوعییەکان بزانێت و لەو ڕووەوە چی لەدەستدێت دریغی نەکات. مەهدی ئەوکارەی خۆی پێخۆش بوو، لە کاتێکدا پێشمەرگە ڕاستەقینەکان بە ڕاستی لە بەرەکانی جەنگدا شەڕی دەستە و یەخەیان لەگەڵ داگیرکەرە عەرەبەکان و ژەنراڵەکانی سوپای دڕندەی عێراقدا دەکرد، ئەو لە ناو بۆنی ڕزینی ڕۆژەکانی خۆیدا، لە وەرزی گەنینی ناوەوە و دەرەوەی خۆیدا دەژیا. زۆرجار دەهاتەوە شار، دەسەڵاتی دەوڵەت لەوە لاوازتر بوو بگرێت ڕێ لە هاتوچۆی پێشمەرگەکان بۆ ناو شار بگرێت. ڕۆژێک لە چایخانەکەی مام کەریم لەگەڵ دەستەیەک لە هاوڕێ کۆنەکانیدا دانیشتبوو، وەک جاران قەڵەمێکی خستبووە پشتی گوێی، قاتێک شاڵی شەکەریی لە بەرکردبوو، جووتێک کلاشی تازە و سپی خستبوە سەر پێی و دەستەسڕێکی سووری کردبوو بەبەر پشتێنە ڕەشەکەیدا و لنگی تا دەکرێت کردبووەوە تا ئاسانتر باوەش بە مێزی دۆمینەکەدا بکات. لە کاتی گەمەکردندا، جارجار دەستی دەبرد و قوومێکی لە چاکەی دەدا و دەمی دەتەقاندو دەیگووت «تێیکە مام کەریم، تێیکە». لە ساتێکدا کە زۆر لە مەراقی ڕیزکردنی پولەکانیدا بوو، چەند دڵۆپە چایەکی بە شەڕواڵەکەی خۆیدا ڕشت. دڵۆپەکانی ئەو چا غەلیز و پڕڕەنگە «وەک خۆی دەیگووت» وەک بۆ ئەو دەستە جلە تازانە تێزاب بێت، بەپەلە هەستاو چووە ژووری تا لەبەردەم دەستشۆرەکەدا، بە پەڕۆیەکی پاک شەڕواڵەکەی خاوێنبکاتەوە. لە بەردەم ئاوێنەکەدا سەری بەرزکردەوە و باڵەکانی منی بینی... ئەوە یەکەمجاربوو باڵەکانم ببینێت. بە وردی سەیریکرد، وردتر، وردتر، وردتر ... هەستی بە ترسێکی گەورە کرد. من چاوانیم دەبینی چۆن پڕدەبن لە سامێکی گەورە، بینیم چەند جارێک بە ترسەوە دەیانتروکێنێت، بینیم دەیانگلۆفێت، بینیم بە سامەوە ئاوڕدەداتەوە، بینیم دووبارە دەڕوانێت و نیگای یەک پارچە ترسی بێگەردە، بینیم گێژدەبێت، بینیم سەری دەسوڕێتەوە و چاوانی

سەرەوژێر دەبن، بینیم دەسوڕێتەوە و بە پشتدا دەکەوێت و بێهۆش دەبێت ... بێئەوەی من هەستبکەم ئەوەی دەکەوێت و بێهۆش دەبێت منم.

مەهدی نەیزانی چی بووە، چەند ڕۆژێک نەخۆشکەوت، بەڵام بە ڕوونی تێنەگەیشت چی ڕوویداوە. لەو پیاوانەبوو ئیدارکێکی بەهێزی هەبوو، بەڵام هیچ تەفسیرێکی بۆ باڵەکان نەبوو. لە خەیاڵی خۆیدا گووتی «لەوانەیە بیم بە داڵ». هەڵبەت بینینی باڵەکان زۆر پەرێشان و ناڕەحەتیاندەکرد، تەنیا دڵخۆشی ئەوەبوو کە کەس نایانبینێت، ئەوەش هەستێک بوو منی زۆرتر نیگەران و توڕە دەکرد. لەڕاستیدا من ئەو کات حەزمدەکرد هەموو خەڵک باڵەکانم ببینێت، هەموو ئادەمیزادان بپرسن ئەمە باڵی چ جۆرە گیانەوەرێکە لە ناو تۆدا... بەڵام مرۆڤ کە دڵنیادەبێت باڵەکانی نابینرێن، ئیتر ئاسوودە دەبێت، شەرمی نامێنێت، لەو پرسیارە ڕزگاری دەبێت ئاخۆ ئەوانی دی وەرگەڕانی بۆ جانەوەر دەبینن یان نا. مەهدی دوای بینینی باڵەکان هەر بێباک بوو، وەک جاران گەنجێکی تەپۆ و مشەخۆر و دڵڕەق بوو کە دنیای لە ناو سێگۆشەی جەهەنەمی ورگی و گوونی و دەمانچەکەیدا کورتکردبووەوە. زۆر مەبەستم بوو بزانێت من هەم، لەبەرئەوە کەوتمە جوڵە و تەکانی توند، وەها ڕامدەتەکاند بزانێت مەخلوقێکی تر لە ناخیایەتی، وەها هاوارمدەکرد بزانێت دەنگێکی تر لە دەرونیدایە... باڵەکانم بەهێزبوون و تەکانیان توندبوو، ڕاستە نەمدەتوانی کابرا بەرزبکەمەوە، بەڵام هەوا و گێژەنێکی وام دروستدەکرد بزانێت شتێک هەیە بەهێز و ناوەکی لەخۆی نادیدەیە و دەبێت تێفکرێت. لە پێناوی حەقیقەتدا دەڵێم، ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت فریشتە هەر ئینسانە دەمێک دیوی ئەودیوی ژیان دەبینێت، تیوری منە... من مەهدائیلی فریشتە، ئەو بیرۆکەیەم لە کەشتیی فریشتەکاندا بڵاوکردەوە، چونکە دەمزانی ئەوەی مانا بە بوونی فریشتەیەک دەدات ئەم ژیانە نییە کە ئینسانێک تێیدا دەژی، بەڵکو ئەو ژیانەیە کە تیا نەژیاوە. من بووم لە کەشتیی فریشتەکان ئەو بڕوایەم بڵاوکردەوە کە فریشتە تەنیا بەرپرسی چاکەکردن نییە، بەڵکو بەرپرسی خەزنەیەکی گەورەشە کە هەموو ئەو ژیانانەی تێدا

هەڵگیراوە مرۆڤ فەرامۆشیکردون و تیایاندا نەژیاوە، ئیتر دوای من هەموو ئەو قسانەیان وەک توتی دەگووتەوە. ئەم ژیانەی من بینیم لەوە پوچ و نزمترە، فریشتە بتوانێت لە ناویدا ببێتە هاوکار و هاوبەشی مرۆڤ. ژیانی ئێستای سەر ئەم ئەستێرەیە بەشێکی کەمی لە کاری فریشتەکانە، بەشی هەرە زۆری لە کاری مرۆڤی بێباک خۆیەتی. دەمێک دڵنیابووم مەهدی من نابینێت، هێدی هێدی نۆبەتەکانی دەرکەوتن و پەلامارەکانم زۆرتر بوون. هەڵبەت دەبێت پێتان بڵێم، وەک چۆن منداڵێک ناتوانێت ئەزموونی خۆی لە زگی دایکیدا بگێڕێتەوە، فریشتەش ناتوانێت هەموو ئەزموونی خۆی لە ناخی مرۆڤدا بگێڕێتەوە، ئەوانەی یادمماون، تەنیا وەک سێبەرێکی تەماوی لەسەرمدان، نازانم نۆبەتەکانی پەلامارم ملکەچی چی خواست و ئارەزوویەک بوون. ژیانی دواترم لەسەر زەوی، ژیانێکی فریشتانە نەبوو، زۆرتر لە ئینسانەوە نزیک بووم تا فریشتە. بۆیە ئەو فریشتانەی زۆر پیردەبن دواجار تەواو بیریاندەچێتەوە چی بوون و چیین، وەک چۆن منداڵێک لە منداڵییەکی زووەوە هەڵیبگریت و بیگوازیتەوە بۆ وڵاتێکی تر، ئیتر چی لە نیشتیمانی یەکەمی یاددەمێنێت؟. خۆشبەختن ئەو فریشتانەی زوو دەمرن، فریشتەی پیری وەک من، دونیای مرۆڤ وا دەیبات خۆی لە یاد دەچێتەوە. لایەنیکەم ئەوان وەک فریشتە دەمرن، نەوەک من کە ئێستا نازانم چیم و بە چ ناوێکەوە دەمرم. شەڕی من لەگەڵ مەهدیدا سەختبوو، چونکە بە هیچ زمانێک تێنەدەگەیشت فریشتەیەک لە ناخیدا هاواردەکات و دەتوانێت شتگەلێکی گرنگی پێبڵێت. هەستدەکەم من وەک فریشتە لەوانەیە زمانێک قسەم کردبێت ئەو تێنەگەیشتبێت دەڵێم چی. من ئەزموونی دواترم لەگەڵ ئینساندا ڕاستی سەیری بۆ ئاشکراکردم، مرۆڤەکان بەشی هەرە زۆریان لە بەشێکی ژیانیاندا دەنگێک دەبیستن، هاوارێک تێیناگەن، دەڵێن ژاوەژاوێک لە مێشکماندایە، دەڵێن گوێیان لە دەنگ و ئاوازی سەیرە کە نازانن چییە و لە کوێوە دێن، شەو ڕادەچڵەکێن و وادەزانن دەنگی غەریبێکیان بیستووە، بە ڕێگادا دەڕۆن و لە ناکاو ئاوڕێک دەدەنەوە، هەستدەکەن یەکێک

بانگیکردون، بەڵام هەرگیز تێناگەن ئەوە دەنگی فریشتەکەی ناخی خۆیانە.

لەو ڕووەوە خاوەنم منی شەرمەزارکرد.

من کە هاتمەدەرێ وەها غەمگین و تووڕەبووم، چۆن بێگانەیەک هەندێجار شەرمدەکات ناوی خاک و وڵاتی خۆی بڵێت، ئاوها شەرمدەکرد بڵێم فریشتەی چ کەسێکم و لە جەستەی چ تەپۆیەک ترازاوم. لە کۆتایی ساڵانی شەستدا، مەهدی ڕوخساری مەخلوقێکی قێزەونی هەبوو، کەسێکی لەخۆبایی کە هەردەم شەڕواڵێکی فشی لە پێدایە و بە دەموچاوی کەسێکەوە کە زیادەخۆری و چڵێسی تەنگەتاویانکردوە، دەڕوانێت. هەر کەسێک وێنەیەکی ئەو سەردەمەی مەهدی ببینێت و بە ویژدان بێت، دەزانێت مەهدی لەو سەردەمی شۆڕشەدا ڕوخساری دیارە کە لە خەو و هێڵنج و باوێشک و قرقێنە و پیسایی زیاتر بەرهەمێکی تری بۆ مرۆڤەکانی دەوروبەری نییە. هەموو سەیرکردنەکانی بۆ زوومی کامێراکە چەشنێک بوون بیەوێت خۆی بشارێتەوە، بیەوێت قیافەیەک بگرێت و ڕوخسارێکی تر بداتە خۆی کە نییەتی. شێوەی سەیرکردنی مرۆڤ بۆ زوومی کامێرا زۆر ڕاستی لەسەر ئاشکرادەکات، زۆر کەس هەن بە نیگایاندا دیارە دەیانەوێت شتێکی پیس بشارنەوە، دەزانن کە کامێرا جگە لە ڕوخسار بەشێک لە ڕۆحیش وێنەدەگرێت، مەهدی هەمیشە ویستویێتی ئەو بەشە لە خۆی بشارێتەوە کە نەیناسیوە و نەیزانیوە چی تێدایە، لەبەر ئەوە وێنەکانی ڕوون دەریدەخەن بوونەوەرێک بووە لە خۆی هەڵهاتووە. مەهدی بۆیە خۆی زۆر بە شیوعییەکانەوە سەرقاڵدەکرد، تا بتوانێت خۆی لە ژیانی خۆی بدزێتەوە، خۆی لە خۆی بەدووربگرێت. یادم نییە کەی و چۆن بەتەواوی ترازام... دواتر زانیم ترازانم بەپێی ڕۆژژمێری زاینی لە سەرەتای حەفتاکاندا بووە، کۆتایی ساڵی 1971 یان سەرەتای 1972. یەکەم ساتی ترازانی خۆم بیرە، بریندار و حەپەساو و نیوەگیان وەک مەخلوقێک لە تەمێکی ترسناکی سەر دەریا خولقابم، وەک خەوی دەریاوانە نەخۆشەکانی ناو ئاو منیان دروستکردبێت، هەڵم و هاڵاوێکی زۆر لە

دەوری لەشم بوو... ترازان لەڕاستیدا بۆ من وەک جیابوونەوەی دوو گۆشت نەبوو، ڕاستە ڕەنگە بۆ مرۆڤەکان وەها بێت، ئەوان زۆربەی کات وا هەستدەکەن پارچەیەک گۆشت لە لەشیان دەبێتەوە و ناخیان بە چەقۆیەک لەتدەبێت، بەڵام بۆ من نا ... بۆ من وەک خۆهەڵدانی دیلێک بوو کە ساڵەهای ساڵ لەسەر ڕووی کەشتییەک بەسترابێتەوە بۆ ناو دەریا، دیلێک لە ناکاو هێزێکی تۆفاناساوی تێدا کۆدەبێتەوە و بە هەموو توانای خۆی هاواردەکات و زنجیرەکان دەشکێنێت و خۆی فرێدەداتە ئاوەوە. جیابوونەوەی من بەو شێوەیە بوو، جوڵەی باڵەکانم بۆ ترازان وەک پەلکوتانی مەلەوانێکی ناو دەریابوو. کە هاتمەدەرێ وەک منداڵێکی زل بووم، منداڵێکی گەورە و باڵدار و ڕووت... منداڵ خۆشبەختە و دواتر دەزانێت چۆن دروستبووە و لە کوێوە هاتۆتەدەر، فریشتە نیعمەتی وەهای چنگ ناکەوێت. فریشتە لە شوێنێکی نادیاری مرۆڤدا دەژی و لە دەرگایەکی نادیاریشەوە هەڵدێت. وەک چۆن مرۆڤ عاشق دەبێت و عەشق بێڕەحمانە دەستدەخاتە بینی و خەریکە دەیخنکێنێت، بەڵام بەیانییەک هەڵدەستێت و لە ناکاو هەستدەکات چیتر عاشق نییە، چیتر ئەو هەستە کوشندەیە ئازاری نادات، چیتر عەشق لە هیچ جێگایەکەوە سەر و سەکووتی دیار نییە. ئەوکات دەپرسێت: وای عەشق چی لێهات، وای لە کوێوە چوو، چی بەسەرهات؟... بەڵام وەڵامِ نییە. عەشق لە چ دەرگایەکەوە لە ڕۆحی مرۆڤ دەچێتەدەرێ، فریشتەکانیش ڕەنگە لە هەمان دەرگاوە دەربچن، ڕەنگە ئەوە هەمان دەرگا بێت کە شێتی، کە غەم، کە خەونیشی لێوە دێتە ژوورێ. ئەو دەرگایە لە کوێدایە؟ نازانم، بەڵام دڵنیام دەرگایەکی وا نهێنی لە مرۆڤدا هەیە.

کە هاتمەدەرێ، سەرەتا هەستم نەکرد بە خواستی خۆم ترازاوم، وامدەزانی چۆن هێزێکی نهێنی ماسییەک لە دەریا فرێدەداتە دەرێ، ئاوا دەستێکی نادیار و بەهێز منی فرێداوەتەدەرێ. ڕاستە من هەوڵمدەدا بترازێم، بەڵام لە کاتی ترازاندا هێزێکی بێهۆش و بەهێز و گەورەش بەرەو دەرەوە پاڵی پێوەدەنام. کە هاتمەدەرێ و دوای گێژییەکی درێژ

چاومکردەوە، مەهدیم بینی نیوە مردوو لەسەر زەوییەکە کەوتبوو، گیانی نوقمی ڕشانەوە و خوێن بوو، چاوانی وەک چاوی مردوو هەڵگەڕابوونەوە... من سەیرمکرد و ویستم بپرسم «دەمناسیت ؟». ئەو لەو کاتەدا چاوە نیوە مردووەکانی بەرزکردەوە و پرسی «تۆ کێیت؟». دڵنیابووم لە هیچ تێناگات، وادەزانێت خەون دەبینێت یان چاوانی ڕێشکەوپێشکە دەکەن یان زۆر نەخۆشە و جانەوەری سەیر دێنە پێش چاوی. من گووتم، من فریشتەکەتم و ئیتر نامەوێت لەگەڵتدا بژیم. لەوە ماندوو و نەخۆشتر بوو بزانێت چی دەبیستێت و چی دەڵێت، نەیدەتوانی بزانێت بوون و نەبوونی من مانای چی، بە چەشنێک ترازانی من شەکەتیکردبوو بە دەنگێکی بێزار گووتی «هەرچییەک بیت، شتێکی حیز و سەگبابیت و لە خوشک و دایکت بەم»، وای گووت و جارێکی تر بەسەر و ژێر ڕشایەوە، ئەوە سەرەتای هەستکردنم بوو بەوەی ئینسان چ مەخلوقێکی بۆگەنە. نەیدەزانی من لە ناو ئەو هاتوومەتەدەرێ، زۆربەی خاوەن فریشتەکان باوەڕناکەن، دەمێک فریشتەکەی خۆیان دەبینن وادەزانن لە ناکاو جوبرائیل پەیامێکی بۆ هێناون و بوونەتە پێغەمبەر، یان بە هۆی لەرز و تاوە تووشی واهیمە و بزرکانی خەیاڵ بوون. بیرمە کە من مەهدیم جێهێشت هێشتا نوقمی پیسی و ڕشانەوەی خۆی بوو، من وەک فریشتەیەکی بەهێز و تا ئەندازەیەک مەغرور هاتمە دونیاوە، بەر لەوەی ماڵەکەی جێبهێڵم چووم بە ئاوی سارد خۆم شت و لە ناو جلەکانیدا دەستێک جلی کوردی نوێم دەرهێنا و لە بەر ئاوێنەیەکی گەورەی ژوورەکەدا قیافەی خۆم چاککرد و لە شوشەیەک عەتری بچوک کە هەر بە ئەندازەی چوکلێتێک دەبوو خۆم بۆنخۆش کرد، پشتێنێکی جوانم لەسەر جلەکانم بەست و دەستم برد لەسەر تاقێک کە دوو شەکردانی پڕ شەکری کلۆیان تێدابوو، لایتێکی دەستیم خستە گیرفانم و دوو پاکەت جگەرەم هەڵگرت و چی پارەیەک لە باخەڵی مەهدیدا بوو دەرمهێنا و ڕۆیشتم. بۆچی وامکرد نازانم ... ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت کە بەردەوام ئەو بەیانیان وایدەکرد، دوو پاکەت جگەرەی دەخستە گیرفانی و هەندێک پارەی هەڵدەگرت و دەچووە دەرێ.



ئەو شەوە بولبولیار تەنیا تا ئەو جێگایەی لە بیرەوەرییەکان خوێندەوە. دوای ئەوە دەفتەرەکەی داخست و سەری خستە سەر بالیفێکی نزم و تا بەیانی لێی خەوت.

## سەرەتاکانی ئیشکردنم بۆ سەرهەڵدانی جیهانێکی نوێ

کە مرۆڤ ڕقی لە فریشتەکەی بوو، دەبێتە مرۆڤێکی تر. گەر بکرێت فریشتەکەت فەرامۆشبکەیت و بڵێیت بە جەهەنەم برۆ ژیانی خۆت بژی و منیش ژیانی خۆم دەژیم، ئەوە کۆتاییەکی خۆش و سەرنجامێکی جوانە بۆ چیرۆکێکی زۆر غەمگین. بەڵام مرۆڤ زۆرجار بێئەوەی بەخۆی بزانێت، ڕقێکی توندی بەرامبەر بەو مەخلوقە لا دروست دەبێت. من بێئەوەی بزانم چۆن و بۆ، لەگەڵ دەستپێکردنی پاییز و خەزانی ساڵی 1991 دا، لە ناکاو ناخم پڕبوو لە کینەیەکی وەها. کینەیەک، لە کینەی کتوپڕی باوکێکی نەخۆش دەچوو لە کوڕی خۆی، یاخود بەپێچەوانەوە، لە کینەی بێهۆ و بێبەهانەی کوڕێکی نەخۆش لە باوکی. کینەیەک بەهێزتر لە ڕقی هەندێک ژن و پیاو لە یەکتر، کە بەهێزترین و دڵڕەقانەترین جۆری ڕقە لەسەر زەوی. لەگەڵ دەستپێکردنی خەزاندا من بەیانییەک هەستام و ئەو خولیایە لەسەریدام برۆم و وەفائیل بکوژم، هەستمکرد بوونی ئەو لەسەر زەوی هەمیشە بەرەو دوا دەمگێڕێتەوە، هەستمکرد چارم نییە جگە لەوەی

بیکوژم. ئەو بەشێک بوو لە ڕابوردوویەکی دوور، گەڵایەکی وەریو بوو، وەک چۆن درەخت دەتوانێت گەڵا زەردەکانی خۆی فڕێدا منیش دەبوو ئەو گەڵا ژاکاوەی خۆم، ئەو کاژە ترسناکەم توڕدەم، تا با بیبات و بمرێت. ئێواران دەچووم بۆ باغێکی دەرەوەی شار و بیرمدەکردەوە و دەمگووت «بۆ درەخت دەتوانێت دەستبەرداری ئەو هەموو گەڵا مردووانەی بێت، بۆ من ناتوانم؟. بۆ مار دەستبەرداری کاژی خۆی دەبێت و من بۆ نامکرێت دەستبەرداری بم، ئەی فریشتە هەر کاژێک نییە ڕۆحمان فڕێی دەدات. ئەوەی دەبێت شتێک بمرێت، پارچەیەک لە خۆمان فڕێبدەین، بەشێکە لە یاساکانی سروشت، بەشێکە لە ڕێسای گەردون». بینینی خەزان هێزێکی دەدامێ ڕقم لە فریشتەکەم بێت. بۆیە دەچوومە دەرەوەی شار تا پاییز بە هەموو هێز و جەبەروتی خۆیەوە ببینم، پاییز یەکێکە لەو وەرزانەی لە شاردا دەست ناکەوێت. من سەیرم لێدەهات کە شاعیرانی شار، ئەوانەی دوو شەو بەرگەی ژیانی ناو سروشتیان نەدەگرت، شیعری ڕۆمانسییان بۆ پاییز دەنوسی، شار چما درەختی تێدابوو تا پاییزی تێدابێت. بۆ ئەوەی خەزان وانەم بداتێ و لە حیکمەتی ترازان و وەرین تێبگەم، ڕوومدەکردە دەرەوەی شار، بۆ جێگایەک درەختەکان بەڕاستی ژانی پاییزی دەچێژن. دەمزانی تا ئەو وەفائیلە مەلعونە لە ژیاندا بێت، من وەک درەختێک دەبم تەنیا بیر لە گەڵای کۆنی خۆی بکاتەوە، دەمویست ببم بە کەسێکی نوێ، ئەوە هەم بۆ من و هەم بۆ دونیا باشتر بوو، دەبوو گەڵای تر بگرم، دەبوو چرۆی تر دەربکەم. دەبوو بە هەموو توانا و ئیرادەیەکەوە ئەم فریشتەیە لە ژیانمدا بسڕمەوە، تا خۆم بۆ داهاتوو ئامادەبکەم ... داهاتووو ... داهاتوویەکی گەورە ... داهاتووووووویەک من چاوەڕێی شتی زۆر گەورەی لێدەکەم.

بەو فریشتەیەوە خۆم وەک پێغەمبەرێک دەهاتە بەرچاو کە ئەگەرچی بانگەشەی دینێکی نوێ دەکات، کەچی خۆی بتێکی کۆنی هەیە و شەوانە سوژدەی بۆ دەبات.

ئەوەی ڕاسپێردرام سەرلەنوێ دەزگای ئاسایش بە شێوازێکی کوردیانە دروستبکەمەوە، وایکرد پتر بیر لە کوشتنی وەفائیل بکەمەوە. ئەو ئەرکە شتێکی کەم نەبوو، لە قووڵایی دڵمدا هەستمدەکرد سەرۆک منی ڕاسپاردوە ناوکی یەکەمین دەزگا گەورەکانی حوکمڕانییەکی کوردی نوێ لەسەر زەوی دابمەزرێنم. دڵنیابووم بە کارێک ڕاسپێردراوم بۆ ماوەیەک شتێکی نوێ لەسەر ئەم ئەستێرەیە دروستدەکات و ساڵانی داهاتوو نرخی گەورەی دەبێت. ئەوەی لەو ڕێگایەدا دەهاتە ڕێگام گەورەبوو، دەمویست هەم خۆم و هەم هاوکارەکانم خاڵی بن لە بەزەیی، خۆیان خۆشبوێت. بۆ یەکەمجار هەستمدەکرد هێزی دەسەڵات لەوەدا نییە لە خۆت ببوریت، بەڵکو دەبێت عاشقی خۆت بیت، تا سەر ئێسقان عاشقی خۆت بیت، تەنیا ئەوانە دەتوانن دەسەڵاتێکی پتەو و هەمیشەیی دروستبکەن کە عاشقی خۆیانن، منیش هێدی هێدی دەکەوتمە عەشقی خۆمەوە. ئەو ماوەیە چەند جارێک شارم بەدوای هۆشەنگی بولبولیاردا تەیکرد، بەڵام نەمدۆزییەوە ... نەمدەویست کەس تێبگەێنم، دەمویست وەفائیل بێدەنگ بکوژم و بینێژم، بە جۆرێک ئەم دەست بەو دەست نەزانێت. دواجار ئەو فریشتەی من بوو، هەقی خۆم بوو چی لێدەکەم بیکەم، بولبولیار هەقی نەبوو هیچ هەڵەیەک بکات. بەڵام دروستکردنی دەزگای ئەمنییەت کارێکی وەهای خستە ئەستۆم تا ماوەیەک ئاگام لە هیچ نەما. هەر سەرەتا بێئەوەی بزانم، لە ناو خەڵک و لە ڕیزەکانی حیزبدا ناوم وەک «عەقید جەنگیز» ڕۆیشت. فەرمانێک لە جێگایەکی نهێنییەوە هات و تەواوی ئەندامە بەرزەکانی حیزبی ناچارکرد بە من بڵێن «عەقید». گەرچی زۆربەی ئەوانەی لە حیزبدا چالاکبووین شەهادەیەکی وەهامان نەبوو، یان ئەوانەشی شەهادەیان بوو هیچ کات وەزیفەی ئەسڵی خۆیان نەبینیبوو، بەڵام لەو زەمانەدا هەموو بەرپرسەکانمان یەکی نازناوێکی تایبەتیان بەخۆیانەوە لکاند «حاکم سەلیم» «دکتۆر ڕەواندزی» «پرۆفیسۆر موکری» «ڕائید کۆپری» «قادری موهەندیس». هەر کەسێک نازناوی بەرپرسە سیاسی و عەسکەرییەکانی حیزبی بدیبایە، دەیگووت «بەهـ بەهـ چ ڕەوزە و ڕیازێکی پڕ زانست و هونەرە حیزب». نازناوی عەقیدیش لەو سەرەتایەوە بە من

لکا، گەرچی هەتا سەلامقوتی سەربازیشم نەدەزانی. لەو سەردەمەدا گەر گەمژەکان عەقڵیان بایە و بیانگووتایە «دکتۆرامان لە ئەستێرەی تۆرانتۆسدا هەیە» کەسێک نەبوو بتوانێت بڵێت وانییە. من کێشەیەکم لەگەڵ ئەوەدا نەبوو نازناوی عەقید بە ناوەکەمەوە بلکێت، بەپێچەوانەوە وام هەستکرد ئەوە نازناوێکی شانازییە کە میللەت دەیداتە پاڵەوانەکانی خۆی، ئەوانەی وەک من دڵسۆزانە لە دروستکردنی ئازادیدا بەشداربوون. من بە خێراییەکی بێوێنەوە کەوتمە کار، لە خودی سەرۆکەوە ئاسانکاریم بۆ کرا و ڕێگام بۆ کرایەوە چۆن دەمەوێت ئیشبکەم، سەرەتا لە ڕێکخراوەکانی حیزبەوە دەستم پێکرد، لەوێدا کەسانێکم چاند چاوی من بن. دەبێت بزانن من لەو ساڵانەدا تەکنیکەکانی چاودێریم وەها بەهێزکرد و دەزگای ئەمنییەتم بە جۆرێک فراوانکرد، ئەستەم بێت هیچ کات حیزب یان دەوڵەت یان شارەکە لە دەزگاکەی من جیابکرێنەوە. ئەو ماوەیە لەسەر شێوەی تیورەکەی باهیری «زانستی چاودێری موتڵەق»ـم دامەزراند. شەوانە دەگەڕامەوە ماڵ و بە وردییەکی زۆر و لەزەتێکی بێوێنەوە کتێبی «چاوی خودا»ـم دەنوسی، کە کتێبێکی نهێنی بوو، بە نیازی ئەوە دەنوسراو تەنها ئەوانە بیخوێننەوە کە لە شار و شوێنە گەورەکاندا دەبن بە بەرپرسی ئاسایش لەگەڵ هەندێک لە ئەفسەرە هەرە بەرزەکانی دەزگادا. کتێبێکی ترسناک کە دەبوو تەنیا چەند نوسخەیەکی کەمی هەبێت و نەکەوێتە دەست هەموو کەس. سیستمی من سیستمێکی بێسنوور و ڕەها بوو، لەناو هەموو مرۆڤێکدا پیاوێکی ئاسایش هەیە، دەبوو ئەو پیاوە لە خەو هەستێت، دەبوو هەموو مرۆڤێک نیوەی ببێتە مرۆڤێکی چاودێرکراو و نیوەی ببێتە مرۆڤێکی چاودێرکەر. دەبێت بڵێم ئەزموونی خۆم لەگەڵ فریشتەکەمدا وای لێکردبووم بتوانم مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی شیاو بۆ دابەشبوون ببینم. لەوێوە، لەو سەرەتایەوە ڕۆڵی ترسناکی من دەستپێدەکرد، ڕۆڵێک دواتر بە تێپەڕینی زەمان ئاشکراتر و ئاشکراتر دەبێت. من دەمزانی دەوڵەتە بەهێزەکان و دەزگاکانی ئەمنییەت لە هەموو دونیادا دەیانەوێت مرۆڤ بکەن بە ڕەقیب بەسەر خۆیەوە، بەڵام من تەماحم لە شتێکی تربوو، نیازم بوو مرۆڤ لەتبکەم، بە جۆرێک

بەشێکی بەشەکەی تری بخنکێنێت. شانۆی ڕۆحی مرۆڤم وەک مەیدانێکی نمایش سەیردەکرد کە لە بری ململانێی دوو هێز، دەبوو تاوانێکی کوشتنی ڕاستەقینەی لەسەر نمایشبکرێت. ئێستا دەمزانی کە فریشتەیەک لە ناو مرۆڤدایە، دڵنیابووم هەر ئینسانێک کە دەیبینم فریشتەیەک لە ناخیدایە، ئەوەش دەیترساندم. من شتێکم نەبوو کە هەموو ئەوانی تر هەیانە ... شتێک کە دەشێت ترسناک بێت، کە نازانم لە ناخی ئەوانی تردا وەزیفەی چییە، نازانم چ وەسواسێک دەخاتە دڵی ئەوانی ترەوە. وای ... چۆن دەگەمە ئەوەی وابکەم مرۆڤەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان وەک من لەو مەخلوقە نەناسراوە ڕزگاریان بێت. چیبکەم بۆ ئەوەی لە نێوان مرۆڤ و فریشتەکەیدا دیوارێک دروست ببێت؟.

هەموو خولیای ئەو پاییزەم بوو بەوەی دوای کاروباری ئاسایش، بگەڕێمەوە ماڵ و بیربکەمەوە بەچی ئەم شارە وا لێبکەم هەموو بە ئاگا و بێئاگا ئیش بۆ من بکەن، ببن بە تەنێکی بێدەنگ و ڕامکراو. دەمزانی ئیشی دەزگای ئاسایش هیچ کات پاراستنی ژیانی خەڵک نەبووە، تەنیا ئیشی ئەوەبووە خەڵکی تێبگەن ئازاد نین، بۆیە بۆ شتێک دەگەڕام ڕۆحەکان بهێنێتە جۆش و جەستەکان بخاتە سەر خەونی گەورە، هەستمدەکرد ئیشی من هەر ئەوە نییە لەشێکی تێکشکاو و دەستەمۆ دروستبکەم، بەڵکو ئیشم ئەوەیە ئەو جەستە دەستەمۆیە والێبکەم هەمان ئەو خەونە ببینێت کە من دەیبینم، هەمان ئەو ژیانە بژی کە من بۆی دادەنێم، ئەو فیداکارییە بنوێنێت کە من داوای دەکەم، ئەو ئیشە بکات کە من پێویستم پێیەتی... من دەمویست یەک ئامێردی گەورە دروستبکەم کە بتوانم ئەو کارانە بکات کە لەسەری مندایە. ئەوەی سەرۆک دەستی کردمەوە و دەسەڵاتی ڕەهای دامێ، خەونەکانمی هەوپێکرد و ئاوسان. شەوانێکی زۆرم بردە سەر و تەنیا بیرمدەکردەوە، نەمدەتوانی ڕازی ڕاستەقینەم لای کەس بدرکێنم. شەوێکیان خەیاڵم بۆ ئەوە چوو بچمە لای دکتۆر زەندیان، کە وەک زیرەکترین پیاوی ناو حیزب سەیردەکرا، پیاوێک بوو ئەوەندە زیرەک بوو، سەرۆک دروستکردنی دەزگایەکی ڕاگەیاندنی

گەورەی پێسپاردبوو، بڕیاربوو لە داهاتوویەکی نزیکدا، هەم تەلەفزیۆن دابنێن و هەم ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە دەربکەن. من لە ساڵانی خەباتی چیادا دوور بە دوور ناویم بیستبوو، بەڵام لەو دوو ساڵەدا کتێبێکی لەسەر «ئەمنی قەومی» بە عەرەبی نوسیبوو، لەگەڵ کتێبێکی تردا بە ناوی «کورد لە ستراتیژی زلهێزەکانی دونیادا». ئەو کات ئەو ناونیشانانە هێدی هێدی خەریکبوو عەقڵ و خەیاڵی ڕۆشنبیرە سیاسییەکانی ئێمەیان داگیردەکرد. ئەوجۆرە ناونیشانە قەبانە دەمودەست ڕوخساری ڕۆشنبیریان دەبەخشی بە خاوەنەکەی، سەرۆک «خوا لێیخۆش بێت» هەر باسی ئەو دوو کتێبەی بیست، بێئەوەی کتێبەکانی دیبێت، زەندیانی خۆشبەختی بانگکرد و لە کادێرێکی ڕادیۆی شۆڕشەوە کردی بە بەرپرسی هەموو ڕاگەیاندنی حیزب. دکتۆر خۆی قەمووڕێکی پشت کۆماوە بوو، جووتێک چاویلکەی ئەستووری لە چاودەکرد و بە جووتێک پێڵاوەوە کە هەمیشە دوو ژمارە لە قاچی خۆی گەورەتر بوون، لە هەموو جێگایەک دەردەکەوت، لە شاخ بەردەوام شەڕواڵێکی کورت و فشی لە پێدەکرد، هەر کاتیش دەربکەوتایە کتێبێکی ئەستوور لە بندەستیدا بوو. نازناوی دکتۆر لەوەوە هاتبوو کە خۆی دەیگووت «گەر پێشمەرگە نەبووایە، ئێستا لە زانکۆ، دکتۆر یان پرۆفیسۆری فەلسەفە بوو». ئیدی هەمووان باوەڕیان بەو ئەفسانەیە کردبوو، هەر بۆ قەرەبووی مەعنەوی ئەویش نازناوی دکتۆریان پێبەخشیبوو. خۆی بە شانازییەوە دەیگووت «ئەو دکتۆرایەی جەماوەر دەیبەخشێت هەزار جار لەو دکتۆرایە موقەدەسترە کە زانکۆکان دەیبەخشن». بەوەدا من کرابوومە بەرپرسی دەزگای ئەمنییەت و ئەو کرابووە بەرپرسی ڕاگەیاندن، دەبوو ڕێکخستن و تێگەیشتنێکمان لە نێواندا هەبێت. تا ئەو شوێنەی دواتر من بینیم و ناسیم، زەندیان جگە لە پلەیەکی دیاریکراوی خوێندەواری، بەهرەیەکی وەها گەورەی نەبوو. کاتێک سەرۆک ئەو کارە گەورەیەی خستە ئەستۆ، ئەو تووشی شپرزەیی و دوودڵییەکی زۆر بوو، زەندیان حەزیدەکرد وەک هەمیشە بە پێڵاوە زلەکانییەوە بە شاردا بسوڕێتەوە، کتێبێک بخاتە بن هەنگڵی و لە چایخانەکاندا بە دەنگی بەرز باسی سیاسەت بکات، هیچ کات خەوی

بەوەوە نەبینیبوو لە ناکاو چاوبکاتەوە و ببینێت بووە بە بەرپرسی هەموو دەزگای ڕاگەیاندنی حیزب، خەوی بەوەوە نەبینیبوو سەرۆک زەرفێکی پڕ دۆلاری بداتێ و بڵێت «کورم گوێێ رەپی لێ مەخەفێنە، برۆ کارانم بۆ ڕاپەڕرێنە ... هەقیشت بەسەر پارە و مارەوەی نەبێتن، ئەوە بابی خۆت دەداتێ». ئەو بڕیارە زەندیانی تووشی دوودڵی کردبوو، نەیدەزانی هەر ڕۆشنبیرەکەی جاران بمێنێتەوە یاخود قۆڵی لێهەڵبکات و هێدی هێدی ببێت بە یەکێک لە سەرانی نوخبەی باڵای حیزب. دەیزانی ئێرە شارە، ڕاگەیاندنی شار شتێکی سەختە، هەر کۆڵانێک دەگریت خەڵکانێکی تێدایە لەوانەی خۆیان بە مۆدێرن و ڕۆشنبیر و نوسەر دەزانن، دەیزانی کە ئەم گەنجە شارییە لووسکانە چەند زمان درێژ و هیچ لەباردانەبوون، دەیزانی بەفیترەت بێئەدەب و شەڕانی بارهاتوون. هەمیشە لە بەردەم هاوکارەکانیدا دەیناڵاند و دەیگووت «شار حەیابەرە ... شار شەرەف و ناموس بە پیاوەوە ناهێڵێت». هەڵبەت لە بیرۆی سیاسی حیزب کەسانێک هەبوون زۆر دژی بڕیاری سەرۆک بوون، دەیانگووت «زەندیان... ئەو قەمووری کوێرە؟ ئەو قوزپشتە؟ وای حاڵمان جوان دەبێت ئەو ببێتە چاوساغمان». ئەوەش هێندەی تر زەندیانی خستبووە دوودڵییەوە، بە جۆرێک من دەمبیست لە ماڵەوە لە منداڵەکانی دەدات، چێشت دەڕژێنێت، شت دەشکێنێت، بە پێڵاوی قوڕاوییەوە دەچێتە سەر هۆرتەکان، هەمووشی وەک خۆی دەیگووت بە هۆی ئەوەوە کە «جەنابی سەرۆک حورمەتی لێناوم و پلەوپایەی داومەتێ».

ئێوارەیەکیان زەندیان هات بۆ لام. من ئەو کات ماڵێکی تایبەتیم لە گەڕەکەکانی باکوور گرتبوو، حیزب دە پێشمەرگەی بۆ پاراستن نابووە ژێر دەستم، شۆفێرم بوون، چێشتکەرم بوون، جلیان بۆ ئوتودەدام، پێڵاویان بۆ بۆیاخدەکردم، ئێشکیان دەگرتم. ماڵەکەم هێشتا لە سەرەتای بناغەداناندا بوو، ئەساسێکی وەهای تێدا نەبوو، من هەر لەسەر نەزمی ژوورەکەی ماڵی شوعلەخان تەختەخەوێک و کورسی و مێزێکم لە ژوورەکەی خۆم دانابوو، لەگەڵ دوو کورسی نایلۆن بۆ میوان. ئەو ڕۆژەی

زەندیان هات بۆ لام، کارەباچییەک لەگەڵ پەیژەیەکی درێژدا گڵۆپەکانی بۆ چاکدەکردم و دوو بۆیەچیش ژووری میوانەکەیان بۆیەدەکرد. ئەوکات من لەسەر مێزێک لە مەتبەخەکە دانیشتبووم، بە پەلە برنج و فاسۆلیایەکی گەرمم دەخوارد، کە ئەو بەخۆی و دوو پاسەوانەوە لە بەردەممدا قیت بووەوە. پیاوێکی بچکۆلانەی پڕ جوڵە بوو، ئەوە یەکەمجارم بوو ئاوا زۆر لە نزیکەوە بیبینم، جووتێک چاوی وەها بچکۆلەی بوو، چەندمکرد بزانم ڕەنگیان چ جۆرێکە بۆم دیاری نەکرا. گەرچی هێشتا سەرما و سۆڵەی پاییز گوڕزی خۆی نەوەشاندبوو، ئەو ڕەینکۆتێکی ڕەشی درێژی لەبەرکردبوو، شەپە شەپ بە پێڵاوە زلەکانییەوە دەڕۆی. زۆر بەپەلە خۆی پێناساندم و گووتی «من دکتۆر زەندیانم، سەرۆک خۆی قسەی لەگەڵ کردووم بێمە لات و تەنسیقبکەین». «تەنسیق» لەو وشە پیسانە بوو کە ڕقم لێیان بوو، بەڵام بەردەوام دووبارەدەبووەوە. من لەگەڵ خۆمدا بردمە ژووری دانیشتن، بەدەم ڕێگاوە گووتی «بەدبەختیی ڕاستەقینەی شۆڕشگێڕ ئەو ڕۆژە دەستپێدەکات کە شۆڕش سەردەکەوێت، ها... ئیتر هەموو ژیانی تێکدەچێت، کاتی خواردنی، کاتی خەوی، هەتا شێوەی ڕۆیشتنیشی دەگۆڕێت، عەفوومکە کاتی پیسابیکردنیشی وەک خۆی نامێنێت. زۆر دانانیشم، ژن و منداڵم لە خوارەوە داناوە، هەر گووتم بتناسم». کە گەیشتینە ژوورەکەی خۆم، وردتر سەیرمکرد، بە جۆرێک شپرزە و نارێک هاتە بەرچاوم، دڵنیابووم ماوەیەکی تر ناچار دەبێت بچێتە لای باهیری. بەم شەڕواڵ و ڕەینکۆتەوە پتر لە شۆفێری پاسەکانی ناو شار دەچوو تا لە بەرپرسی ڕاگەیاندنی حیزب، پیاوێک بوو ڕێکخستنی سەخت بوو. وەک من بوو، لەو کەسانەبوو کە ناتوانن بایەخێکی گەورە بە ڕوکاری دەرەوەی خۆیان بدەن. کاتێک دانیشت هەر قسەیدەکرد «سەرکەوتنی شۆڕش موسیبەتە، موسیبەتێکی ڕاستەقینەیە. تا شۆڕش سەرنەکەوتووە ئینسان دەتوانێت خۆی بناسێت، بەخۆی دەڵێت شۆڕشگێڕ و ئاو بێنە و دەست بشۆ، دەزانێت قاچی لە کوێدایە، سەری لە کوێدایە، دەستی لە کوێدایە، بەڵام کە شۆڕش سەردەکەوێت هەموو شتێک تێکدەچێت، مرۆڤ ئیتر نازانێت چیش بخوات، لەو کاتەوەی گەڕاومەتەوە

شار و دەزانم ئێمە بەڕاستی بووین بە فەرمانڕەوای ئەم حەشاماتە خواردنیشم تێکچووە... بە عەزابەوە ناندەخۆم، بە عەزابەوە دەخەوم، بەعەزابەوە قومێک عارەق دەخۆمەوە، هیچ شتێک لە دەممدا تامی نییە». سەیربوو، دکتۆر زەندیان زۆر بێبەربەست و ڕاستەوخۆ لەگەڵ مندا قسەیدەکرد، گەرچی ئەوە یەکەمین دیدارمان بوو، بەڵام وەها ئولفەتدار بوو بە زوویی هەموو دیوارێکی نێوان من و خۆیی شکاند. دیارە ناوی منی بیستبوو، کە قسەیدەکرد دەمزانی چەند خەیاڵی لای قسەکانێتی هێندەش خەیاڵی لای ئەوەیە سەیری من بکات و بەوردی بمپشکنێت، خۆی لەو کەسانە بوو کە دەتوانن مۆنۆلۆگێکی ناوەکی خۆیان بە ئاشکرا و بە دەنگی بەرز لە ناو خەڵکدا بخوێننەوە، بێئەوەی شەرم بیانگرێت. دانیشتم و فەرمانمدا دوو چامان بۆ بهێنن. دواجار دەستێکم بەسەری لووسمدا هێنا و گووتم «ئاە، چۆن موسیبەتە؟ خۆ شۆڕش تا قیامەت بەردەوام نابێت». بە دەنگێکی غەمگین گووتی «ڕاستە، ڕاستە. من قسەم لە مەنتیق نییە، قسەم لەوەیە کە شۆڕش سەردەکەوێت کەسانی وەک ئێمە دەکەونە دۆخێکەوە پێی ڕانەهاتووین. وەک ئەوەی هەموو ژیان لە حەمامێکی گەرمدا بووبیم و دوایی لەپڕدا بمخەنە حەمامێکی سارد و بڵێن دەی حاجی ئاغا بە ئاوی سارد خۆت بشۆ. ئاسان نییە. ئیتر تا دوێنێ ئیشوکارمان ئەوەبوو خەڵک بکەینە شۆڕشگێڕ، ئێستا ئیشەکە هەمووی پێچەوانە بۆتەوە. ئیشەکە هەمووی دەبێت بەوەی چۆن نەهێڵین خەڵک شۆڕشگێڕ بن... ببورە، منداڵەکانم لە خوارەوە مەعتەلکردوە... ببورە، وایە. تەواوی ئەرکەکەش دەکەوێتە ئەستۆی من و تۆ. تۆ لە ڕێگای ئاسایشەکانتەوە و من لە ڕێگای کادێرەکانی ڕاگەیاندنەوە. ئیشەکەمان سەختە. مەرج نییە ئەوەی مەلە باش دەزانێت، بتوانێت کەشتییەکی گەورە و جوانیش باش لێبخوڕێت. من دەقاو دەق ئەوەم بە جەنابی سەرۆک گووت. من کاتێک لە شاخ لە ژێر بۆردومان و کیمیاییدا بووین، کاتێک بە دەست و بازووی ڕووت لە بەحرەکەدا مەلەمدەکرد، هەستم بە ئەمان و سەلامەتی لە ئێستا زۆرتر بوو. هەندێجار ناو بەحر لە ناو کەشتییەکی خۆش و گەورە سەلامەتترە. ئێستا نازانم لەبەرچی، بەڵام

هەستم بە دڵنیایی و سەلامەتی ونکردوە... هەڤاڵ گیان هەستم بە خۆشی و ئارامی لەدەستداوە». ڕوو بە ڕوو سەیرمکرد و گەرچی دەمزانی قسەکانی ڕاستن، بەڵام شەیتانتر و نیازدارتر بووم لەوەی سووک و ئاسان بچمە ژێربار و هیچی بۆ بسەلمێنم. گووتم «خەڵکی ئێستا چ بەهانەیەکیان هەیە شۆڕشگێڕبن. ئێمە بۆ دەرکردنی بەعسییەکان شەڕمانکرد، ئێستا تەواو، ڕۆژێکی نوێیە... هیچ کەس بەهانەیەکی نییە شۆڕشگێڕ بێت، شۆڕشگێڕیی خۆ یارییەکی خۆشتامی منداڵەوردکان نییە، ئێ جەنابی دکتۆر، خۆ هەر کەس و لە هەر زەمانێکدا بۆی نییە شۆڕشگێڕ بێت».
سەیرێکی ژوورەکەی کرد و وەک بە دڵی بێت گووتی «هێشتا زووە، جەنابی عەقید هێشتا زووە، زۆر زووە. ئێستا ئەم ژوورەتم بە دڵە. بەس هەڤاڵانمان لە ئێستاوە دەستیان پێکردوە. ماوەیەکی تر ئەم ژوورە وانامێنێت، نە ماڵی من وەک ئێستا دەمێنێتەوە نە ماڵی تۆ. ئەوسا خەڵک بەهانەیان دەبێت شۆڕش بکەن. هیچ حاکمێک لە دونیادا نەبووە، کەم و زۆر بەهانەی شۆڕش نەدا بەدەستەوە. کە خەڵکی شۆڕش ناکەن بۆ ئەوە نییە کە بەهانەیان نییە، بەڵکو لە بەر ئەوەی بیری لێ ناکەنەوە، ئیشی من و تۆ ئیتر ئەوەیە کارێکبکەین خەڵک بیر لە شۆڕش نەکەنەوە، سەرۆک من و تۆی بەو ئەرکە سپاردوە. بەس ئێمە کوردین شۆڕش لە خوێنماندایە، گەر خودا حاکم بوو شۆڕش بەسەر ئەودا دەکەین، گەر شەیتان حاکم بوو بەسەر شەیتاندا... بۆیە لێرەم. جەنابی عەقید ڕاستییەکت پێبڵێم، پێمخۆشە تائێستا جلی پێشمەرگایەتیت نەگۆڕیوە، من دکتۆر زەندیانم، تا ئێستا دوو کتێبم نوسیوە، گەر پێشمەرگە نەبوومایە، خودا دەزانێت ئێستا لە چ زانکۆیەکی ناوداری دونیادا مامۆستا بووم».

ئەوە ئەو ڕستەیە بوو کە لەسەری مندا مایەوە « کارێکبکەین خەڵک بیر لە شۆڕش نەکەنەوە ». لەو ڕستانە بوو کە خێرا لەسەری خۆمدا تۆماریاندەکەم و بیریان لێدەکەمەوە. گەرچی دواتر ڕۆژگار بۆی دەرخستم دکتۆر پیاوێکی وەها لێهاتوو نییە کاری لەوجۆرەی لەدەست بێت، بەڵام ئەو ڕستەیە بۆ من لە ڕستە بایەخدار و سەرەتاییەکانی ئەو سەردەمە

تازەیە بوو. ئەو ڕۆژە دکتۆر گووتی هاتووم سەرەتا یەکتر بناسین. گووتی «من و تۆ ئیشێکی گەورەمان لە ئەستۆیە، من مێژووی شۆڕشەکانی دونیام خوێندۆتەوە، ئاە دەزانیت ئێمە لە قۆناغێکی پڕوپوچی مێژوودا سەرکەوتووین، حاجی ئاغا تەواوی شۆڕشە ڕاستەقینەکانی دونیا هەموو ڕوخان. کە بیر لە هەرەسی ئیمپراتۆرییەتی کۆمۆنیستی و دەوڵەتی سۆڤێتی و کۆتایی بەلشەفیکەکان دەکەمەوە غەم دامدەگرێت... ئەها وەک ئەوەیە ئێمە عومرێک تەنیا کتێبە هەڵەکانمان خوێندبێتەوە. بیرم زۆر لێکردۆتەوە، دوێنێ بە دایکی منداڵەکانم گووت، لە ڕۆژانی داهاتوودا کتێبخانەکەم چاکدەکەم، هەموو کتێبەکانی لینین و ستالین دەسووتێنم... هەمووی ... عەقید خۆت بخەرە جێگای من ئەوسا تێدەگەیت چەند خراپە مرۆڤ عومرێک تەنیا کتێبە سەقەتەکان بخوێنێتەوە. کتێبخانەیەکی گەورە کتێبی هەڵەی خوێندبێتەوە کە دوایی تەواو، لە ناکاو ئیتر هیچیان سوودی قرانێکی قەڵبیان نییە، ئێمە چەپەکانی ئەم وڵاتە بەو دەردە چووین. یەکی کتێبخانەیەک کتێبی بێ سوودمان خوێندۆتەوە. بیهێنە پێش چاوی خۆت. ئێستا ئێمە خوێندەوارەکانی شۆڕش لەگەڵ نەخوێندەوارەکاندا وەک یەکمان لێهاتوە... چووینەوە یەک جێگا... ئەوە بەڕاستی دڵم تەنگ دەکات. با بڕۆم عەقید با بڕۆم، منداڵەکانم لە خوارەوە چاوەڕێمدەکەن. دەیانبەم بۆ ماڵی خەسووم، دەمەوێت زوو بتبینمەوە، دەبوو یەک بناسین. شتەکە لە دەستی من و تۆدا نییە، مرۆڤ کە بوو بە شۆڕشگێڕ ئیتر خۆی دەداتە دەست قەدەر».

وەک چۆن بەدەم قسەوە هاتە ژوورێ، دوای بیست دەقیقە بەدەم قسەوە چووەدەرێ، هاتن و چوونی وەها خێرا و سەیربوو من هیچی لێ تێنەگەیشتم، پێڵاوە دەڵبەکانی ڕاکێشاو گەڕایەوە بۆ لای ژن و منداڵەکانی. بچکۆلە و سەیر و ناڕازیی هاتە بەرچاوم، بەڵام تینی ئەوەشی تێدا بوو ببێتە کەسێک کە لە نائومێدی خۆیدا ناچاری خۆگونجاندن و خۆ کۆکردنەوە بێت. کەسێک بوو لەوانەی من دەتوانم لەگەڵیاندا ڕێکبکەوم.

هەر ئەو شەوە بیرم لەوە کردەوە باشترین ڕێگایەک بۆ ئەوەی خەڵکی ئەم شارە لە فریشتەکانیان جیابکەمەوە، ئەوەیە نەهێڵم گوێ لە ناوەوەی خۆیان بگرن... دەبێت هەمیشە شتی گەورە هەبێت، دەبێت دونیای دەرەوە جەنجاڵ بێت، دەبێت شتەکان بجوڵێن، دەبێت لە مێژوودا زرمە و ناڵە هەستێت، ئادەمیزادەکان سەرقاڵبن، شتەکان وەک لەسەر ڕێئاسنی مەرگ بن سەرو و خوار بکەن، دەبێت بەردەوام دوژمن هەبێت، ترس هەبێت، مرۆڤەکان کاتیان نەبێت بۆ خۆیان، هەمیشە ژیانیان بە هێزێکەوە نوسابێت لە دەرەوەی خۆیان. ئەوە دەرەنجامی بیرکردنەوەی من بوو، هەروا ئاسانیش نەگەیشتمە ئەو ئەنجامە، جگە لە ساتە زۆرەکانی تێفکرین کە شەوانێکی زۆرم بۆ تەرخانکرد، ڕۆژانێکیش بە عەقڵی سیخوڕێکەوە چاودێری نێچیرێکی ترسناک بێت، بە شانێکی نیوەکووڕ و چاویلکەیەکی ڕەش و کلێتەیەکی خورییەوە دەچوومە بازاڕ و لە خەڵک ورددەبوومەوە، وەک جاران بە چاوێک تەماشام نەدەکردن کە کاری ئێمەیە ئازادیانبکەین، بەڵکو وەک هۆردوو و گاگەلێکی ناڕێک و ترسناک دەمبینین کە وەک ئاژەڵێکی گەورە دەبێت شتێکیان بدەیتێ ئارامیانبکاتەوە. تا من لەو ئایدۆلۆژیستانە نەبووم باوەڕم وابێت کە بکرێت بە ئامۆژگاری مرۆڤەکان دەستەمۆبکرێن. بۆ ئەوەی بتوانیت مرۆڤ بگریت و نەهێڵیت بیر لەخۆی بکاتەوە، دەبێت دونیای دەرەوە هەمیشە جەنجاڵ و پڕ هەرا بێت، دەبێت دەنگی تفەنگ بێت، دەنگی پارە بێت، یان هیچ نەبێت دەنگی شەهوەت بێت. من لە بازاڕدا دەگەڕام و لە ژێر چاویلکە ڕەشەکەمەوە دەمبینی کە ئەم خەڵکە چ بوونەوەرێکی فزوڵن، چ چاوچنۆک و گوێچنۆک و کونجکۆڵن، دەمبینی جۆرە ئاژەڵێکن تا شتێک هەبێت لەدەرەوە تەماشایبکەن خۆیان بیرناکەوێتەوە. جارێکیان شەو کە گەڕامەوە و تێبینییەکانم لەسەر ئەو بوونەوەرە دەنوسی کە ناوی مرۆڤە، نوسیم «مرۆڤ چییە؟ بریتییە لە تەماحەکانی، لە خولیا ڕەشەکانی، دێوێکی برسییە کە دەیەوێت خۆی لە هەموو شتێک تێربکات». ئاوها بوو کۆتایی شۆڕش منی خستە بەردەم پرسیارێکی بێمانا، ترسناک، خنکێنەر، پرسیارێک کە دەبوو وەڵامیبدەمەوە تا بتوانم بژیم «مرۆڤ چییە؟». لە

سەردەمی شۆڕشدا مرۆڤەکان لای من ناویان کورد بوو، ناویان ڕەنجدەران بوو، ناویان جووتیارانی هەژار بوو، بەڵام ئێستا لەم شارەدا کە تادەهات جەنجاڵتر و جەنجاڵتر دەبوو کاری وا نەکردەبوو. ناکرێت پێناسەی مرۆڤ لە ژێر ئەو ناوانەدا کورتبکەمەوە، ئەو جۆرە پێناسانە بە کەڵکی هیچ شتێکی من نەدەهاتن، ئێستا لای من مرۆڤ بوو بوو بە شتێکی تر، تادەهات زیاتر وێنەی جانەوەرێکی وەردەگرت. بەڵێ دوای ئەو هەموو ساڵە، ئێستاش دەڵێم، مرۆڤ بوونەوەرێکی تێرنەخۆرە، فریشتەکەی ناخی وادەزانێت تێردەخوات، بەڵام من لیوا جەنگین، دەزانم ئەو قسەیەی ئیمانداران کە دەڵێن خودا مرۆڤی لەسەر شێوەی خۆی دروستکردوە زۆر ڕاستە، بەڵام بەجیاوازییەکی بچوکەوە. خودا برسێتییەکی گەورەی تێدایە بۆ خەلقکردن، دروستکردن و دروستکردنی بەردەوام، دروستکردن و تێکدان. خالیق کە وەک ئێمە لە ژێر جەبری نان و ئاو و سێکسدا نییە، لە ژێر خولیای خەلقی هەمیشەییدا دەژیی. من جارێک مامۆستایەکی فەلەک پێیگووتم «جەنابی عەقید ئاسمان زۆر سەیرە، گەر بکرێت جارێک پیاسەیەکی چەند ڕۆژە بە گەردوندا بکەیت، دەبینیت لە نێوان ئەستێرەکاندا چ باسە، هەر زوو هەستدەکەیت هێزێکی گەورە بەردەوام خەریکی تاقیکردنەوەی شتێکە، وەک ئەوەی ماددەیەکی بێشومار کەوتبێتە دەستی ئەندازیارێکی وەسواس و لە هەوڵدا بێت ماڵێکی جوانی لێدروستبکات و بۆی نەکرێت. لە ئاسمان بەزمێکە مەپرسە، بەردەوام ئەستێرە لە دایکدەبێت و دەمرێت، بەردەوام شتی نوێ تێکەڵدەکرێت، بەردەوام هەسارە و خۆر دەردەکەون و ونده‌بن ... گەر گەردون بە هەموو گەورەیی خۆیەوە ببینین، دەزانین خالیقیش ئازار و وەسواسی خۆی هەیە». خودا ئەو وەسواسە گەورەیەی خۆی، بە جۆرێکی تر بەخشیوە بە مرۆڤیش. مرۆڤ هەمیشە برسییە، نە لەبەر ئەوەی برسییە، بەڵکو لە بەر ئەوەی حەزی لە برسێتییە. من لە خۆمەوە سەرنجمداوە، مرۆڤ عاشقی برسێتی خۆیەتی، من وەفای ڕەفعەت بەگ، هەمیشە جۆرە برسێتییەکم تێدابووە کە هیچ کات تێرنەبووە، ژیانم شاهیدی ئەو برسێتییە گەورەیەیە، هیچ بوونەوەرێک عاشقی برسێتی خۆی نییە مرۆڤ نەبێت. هەستدەکەم

ئەوە تاکە شتێکە فریشتەکانمان لێی هەڵدێن و لێی دەترسن. ئەوەی فریشتەکانمان شەڕی لە دژدەکەن، جەوهەری ئێمەیە وەک بوونەوەرێک کە ژیانی لە پێناوی برسێتیدا خۆشدەوێت، لە پێناوی ئەوەی هەمیشە بخوات. هەتا دین گەورەترین بەڵگەی برسێتی مرۆڤە، مرۆڤ بە فتوحاتی ئەم دونیا تێرنابێت، دەیەوێت قیامەتیش بخوات، ئەو دونیاش، درەختە خەیاڵییەکانی ئەو دونیا، حۆرییە خەیاڵییەکانی ئەو دونیا، غیلمانە خەیاڵییەکانی ئەو دونیا. ئەوانە هەموو نیشانەی برسێتی گەورەی ئێمەن، نیشانەی تێرنەبوونی ئەم ئاژەڵەن لە خواردن و داگیرکردن. عەشقی مرۆڤ بۆ بەهەشت عەشقێتی بۆ برسێتییە ئەبەدی و تێرنەبووەکەی خۆی، لە بەهەشت مرۆڤ لە یەککاتدا دەتوانێت بۆ ئەبەد هەم برسی بێت و هەم تێر... ئەوە هۆی نەمری دینە، چونکە پەیمانێک بە مرۆڤ دەدات لەگەڵ جەوهەریدا تەبا و جووتە. منیش کە دەچوومە بازاڕ و بیرم لە ئەرکی ئەو دەزگا ترسناکەم دەکردەوە، بیرم لای ئەوە بوو جیهانێک لەم مرۆڤانە دروستبکەم کە لە یەککاتدا هەم برسی بن و هەم تێر.

من لەو پاییزەدا بیرمدەکردەوە و سەیرمدەکرد، پلانم دادەنا و دەهاتم و دەچووم، دوای ئەوەی هەر دەرەنجامێکی گرنگم دەستدەکەوت، دەستم توند دەگلۆفی و چاوانم پڕدەبوون لەخۆشییەکی منداڵانە. ئێستا مەبەستم بوو خەڵکی بگۆڕم بۆ بە بەشێک لە ڕووداوە گەورەکان، وابکەم دەنگی هاوار، بانگ، تەقینەوە، هەوەس، خوێن بیانجوڵێنێت و هەموو شتێکیان لەبیرباتەوە. مرۆڤ یان خۆی دروستدەکات یان مێژوو، دەبێت یەکێکیان هەڵبژێرێت، چونکە ئەستەمە فریای هەردووکیان بکەوێت.

من بەو شەوە وەک خولیایەکی شێتانە کەوتبێتە سەرم چووم بۆ لای دکتۆر زەندیان، لە ڕاستیدا کەسی ترم لەبەردەمدا نەبوو بڕۆمە لای. هەستمکرد ئەم دەرەنجامە ترسناکانەم ناکەم بە ڕاپۆرت و بینێرم بۆ کەسی تر ... هەموویان نهێنی سەری خۆم بوون، نهێنی تایبەتیم بوون و دەبوو خۆم ئیشی بۆ بکەم. ئێستا وەک بەڕێوەبەری گەورە و دامەزرێنەری دەزگای ئاسایشی نوێ، بۆم هەبوو لەزەت لە نهێنییەکانم ببینم...

جاسوسێک بووم هەستمدەکرد بۆ حیسابی خۆم ئیشدەکەم. ئەوە خۆشییەکی گەورە بوو ببینم دەتوانم مرۆڤەکان وەک قەرەقۆز لێبکەم، پەتێکی باریکیان پێوەبێت و من بیانجولێنم ... ئیشەکەم هێزی ئەوەی دەدامێ هەمووان وەک بوکەڵەی پەتدار سەیربکەم، هەتا سەرۆکیش. هەڵبەت دەمزانی یارییەکە یاسای خۆی هەیە، بەڵام ئەوەی نەدەبوو لە دەستی بدەم ئەو جێگایە بوو کە خۆم داگیرمکردبوو. دەمتوانی خۆشییەکی زۆر لەو شوێنە ببینم، بەختەوەریم لەگەڵ دەستبەکاربوونمدا بۆ دامەزراندنی دەزگای ئاسایش لە ترۆپکدا بوو، خۆشییەک وەک هەر خۆشییەکی ڕاستەقینە ئالودە بوو بە نادڵنیایی و گومان، تێکەڵبوو بە ترس. بەڵام ئاخۆ لەزەتی ڕەها و خالیس بوونی هەیە؟ پێمبڵێن خۆشییەک هەیە تێکەڵاوی ترس نەبێت؟ خۆشییەک هەیە نیوەی تامی بەهۆی ئەو ترسەوە نەبێت کە ئاوێتەی بووە؟. بۆ یەکەمجار بیرم لەوە دەکردەوە ئەوە منم کە دەتوانم وابکەم، ئەو دەستانەی پەتەکەی پێوەیە و دونیا هەڵدەسوڕێنێت دەستی منە، نەوەک دەستی حیزب. ئێستا لە خۆڵەمێشی وەفای ڕەفعەت بەگەوە، لە خۆڵەمێشی هەڤاڵ جەنگیزی شۆڕشگێڕەوە، عەقید جەنگیز بەخۆی و نیگا شەیتانی و سەرە لووس و دووڕڵییە شیرینەکەیەوە هەڵدەستا و دەهاتە سەر شانۆ. من سەعات بە سەعات هەستمدەکرد پێستێکی نوێ دێتەبەرم، چاوم جۆرە سەیرکردنێکی تری تێدا دروستدەبێت، خوێنم بە جۆرێکی تر دەسوڕێتەوە، ڕوخسارم پڕدەبێت لە هێما و ئاماژە و ڕوانینی تازە. من جانەوەرێک بووم کە گەرمای وەرزێکی تر لێیدەدام و لەشم دەجولاَ و لە سڕبوونێکی دێرین هەڵدەستام و بە ناو جەنگەڵێکدا دەڕۆیشتم کە بۆنی گیا و گوڵ و گەڵای هەراش و دڕندە مەستیاندەکردم، وەک ئەوەبوو هەستبکەم ئەم جەنگەڵە لەگەڵ مندا دروستبووە، وەک حەیوانێک هەستبکات ئەو هاڵاوەی لە خۆی هەڵدەستێت هەمان هاڵاوە کە لە گەڵاکان هەڵدەستێت. ئەو ماوەیە کە دەچووم بۆ سەیری خەزان، تێکەڵبوونم لەگەڵ سروشتدا بۆ بەهێزکردنی ئەو جانەوەرەی ناو ناخم بوو. دەچووم خۆم لە سروشت هەڵدەکێشا، خۆم لە درەخت و گەڵای مردوو هەڵدەکێشا. سروشت لە بەرچاوی من ئەو

سەرزەمینە شاعیرییە نەبوو کە ساڵانێک بوو شاعیرە کوردەکان وەک پەرستگای جوانی و پاکی سەیریاندەکرد، من عەقید جەنگیز، بە جلە کوردییەکانمەوە، بە قەمسەڵە زەیتونییە ئەستوورەکەمەوە، بە کەللە ساف و سفت و بریقەدارەکەمەوە، وەک گیاندارێک دەگەڕامەوە بۆ ناو سروشت. سروشت نیشتیمانی جوانی نەبوو، بەڵکو ئەوماڵەبوو کە من تێیدا هەستم بە دۆزینەوەی دیوە دڕندەکەی خۆم دەکرد. هەفتەی لایەنیکەم دووجار دەچوومە جەنگەڵ و باغان و خۆمم لە سروشتدا وندەکرد، سەرەتا کە خەزان بوو خۆم دەکرد بە ژێر هۆبەیەک گەڵاوە، دواتر کە باو باران گەڵایان هەموو ڕادا و ئاسەواریان نەما، دەچوومە سەر درەختەکان و لە نێو لق و پۆپەکانیدا دادەنیشتم و ئەو هەستەم هەبوو کە وەک گیانەوەرێک گەڕاومەتەوە بۆ ماڵی خۆم. نوقمبوون لە سروشتدا وای لێکردم تا ئەندازەیەک ئەو چاڵە فەرامۆشبکەم کە کۆچی فریشتەکەم دروستیکرد، ئێستا دیوێکی ترم لە خۆمدا دۆزییەوە، دیوێک ڕەگ و ڕیشەی لە مندا لە ڕەگ و ڕیشەی هەر فریشتەیەک بەهێزترە، ئەو جێگایەی وەفائیل چۆڵیکرد گیانەوەرێکی سروشتی تر چووە جێگای کە دەتوانێت بە کەڵبەکانی، بە قەپ، جیهان بگۆڕێت ... ئەوە بەختەوەرییەکی گەورە بوو، فریشتەکەم دەبوو بمرێت بۆ ئەوەی ئەو ئاژەڵە سروشتییە هەستێت و بچێتە جێگای.

ئەو شەوەی چووم بۆ لای دکتۆر زەندیان. دوای چەندین سەعات پیاسە لە ناو درەختەکاندا بە شۆفێرەکەمم گووت «بمبە بۆ ماڵەوە، لەوێ خۆم دەگۆڕم و دەچین بۆ لای دکتۆر». زەندیان لە ماڵێکی کرێدا لە گەڕەکی تەلارەبەرزان دەژیا. بە بیجامەیەکی تازەوە پێشوازیکردم، کە زۆر لەگەڵ نارێکی قیافەیدا دەگونجا. بێئەوەی بهێڵێت بەسەر ژن و منداڵیدا بڕۆم بردمییە ژوورێکی بچوک لە پشتەوە، کە شوێنی کتێبخانەکەی خۆی بوو. من پێمگووت «کورد ئەم هەرێمەی کەوتۆتە دەست و هاتووم تا پلانێکی گەورە داڕێژین بۆ دروستکردنی حوکمڕانییەکی درێژ خایەن». قسەکەم وابوو وەک خۆم باوەڕم بە هیچ وشەیەک لە وشەکانی نەبێت. لەوکاتەدا

هەر کەس ئێمەی بدیبایە، منێک بە دوو چاوی پڕ ترس و ئەوێک لە بیجامەیەکی چیتی خەتخەت و فشدا، دەیزانی چ سەیرە، دوو کەس لەو شێوە و شەمایلە هەڵوەشاوەدا باس لە دروستکردنی حوکمڕانییەکی درێژخایەن بکەن. زرینگەی سەیر و عاجباتی ڕستەکە دکتۆری وەستاند و گووتی «دانیشە جەنابی عەقید. سەرەتا شتێک بخۆ و پێمبڵێ حەزت لە چییە، چا بە چۆرەکەوە یان شەربەتی مێوژ؟ عارەقیشم هەیە، بە دایکی منداڵەکانیش دەڵێم دوو هەنارمان بۆ بتەکێنێتە ناو جامێک». هەستمکرد قەبەیی ئەو قسە کتوپڕ و ناکاوەی من، دکتۆری ناچارکرد قسەکانمان بەرەو شتگەلی ڕۆژانە و ئاسایی ڕاکێشێت تا شتێک لە ناواقعییەتی ڕستەکە داپۆشێت. وەک بەهانە بۆ خۆم بهێنمەوە، گووتم «چاو چۆرەک باشن، دەستتان خۆش. ئەوە باشە ... بەڵام نا جەنابی دکتۆر، خۆت دەزانیت هەموو ئیمپراتۆرییەتێکی گەورە لە دونیا وادادەنرێت. کەسانێک دەبێت بڕیاربدەن دروستیبکەن. دروستکردنی دەوڵەت وەک دروستکردنی ماڵێک وەهایە، بڕیارە ... بەر لە هەر شت بڕیارە. منیش بڕیارمداوە ئیش بۆ دارشتنی بنەماکانی حوکمێکی درێژخایەن بکەم، دامەزراندنی دەوڵەت بەر لەوەی کاری فەیلەسوفان یان سیاسەتمەداران بێت، کاری کەسانێکی وەک منە، ئیشی ئەوانەیە کە لە دەزگا نهێنییەکانی ئەمنییەتدا کاردەکەن. بەڵێ دکتۆر گیان، من بڕیارمداوە... دەزانم قسەکەم وەک قسەی شێت و دێوانان دەگاتە بیستی تۆ، بەڵام هەموو سەردەمێکی نوێ بە بڕیاری شێتانەی کەسێکی عاقڵ دەست پێدەکات، با ئەم عەسرە پێچەوانە بێت، بە بڕیاری عاقڵانەی شێتێک دەرگاکانی خۆی بخاتە سەر پشت». وام گووت و قاقا پێکەنیم، نازانم بۆ... ماوەیەک بوو، بە هەندێک ڕستەی خۆم زۆر پێدەکەنیم. دکتۆر چووە ئەو دیوەوە. هەستمکرد دەمێک بە دکتۆر گیان بانگیدەکەم کەیفی دێت و ڕووی دەگەشێتەوە. کە هاتەوە دوو ملپێچی پێبوو، یەکێکیانی دایە من و گووتی «حاجی ئاغا بیپێچە ملت، ژوورەکە ساردە، نەوت نییە بتوانین جارێ سۆباکان دابگیرسێنین، ئەوەی هەمانە دەبێت هەڵیگرین بۆ زستان. خەڵک گوێیان لە ڕادیۆی ئیسرائیل بووە، دەڵێن زستان عەجایەب سارد دەبێت. جووەکان شارەزان، دەزانن

ساڵی چەند کیلۆ بەفر لە ئاسمان دەکەوێتە خوار. جەنابی عەقید بۆ دانانیشیت، بۆ بە پێوە وەستاویت». زەندیان تازە ماڵی دامەزراندبووەوە، قەنەفەیەکی سەوزی گەورە کە دیاریبوو لە دوکانێکی فرۆشتنی مۆبیلی دەستی دوو کڕدراوەتەوە لە ژوورەکەدا بوو، ملپێچەکەم توند بەست و لەسەر قەنەفەکە دانیشتم و هەستێکی خۆش بە ئەمان و دڵنیایی دایگرتم. دکتۆر زەندیان لەسەر کورسییەکی تەختە کە تەنیا لە چایخانەکاندا بینیبووم بەرامبەرم دانیشت، ئێستا بە ملپێچەکەوە سەیرتر و خەندەهێنتر دیاربوو، بێئەوەی بزانێت لەو بیجامە فش و ملپێچە زلەدا چ دیمەنێکی پێکەنیناوی هەیە، بە ویقاری سیاسییەکەوە قسەیەکی گرنگی بۆ گووتن هەبێت، قاچە کورتەکانی خستە سەر یەک و گووتی «ئا جەنابی عەقید، هێندەیە زاراوەی حوکمی درێژخایەن بە جۆرێک لەجۆرەکان و بە شێوەیەکی غەمگین زاراوەی شۆڕشی درێژخایەنی بەیادا هێنامەوە. هەندێک وشە هەیە کاتێک دەیبیستیت مرۆڤ دڵتەنگ دەبێت، دوێنێ بە دایکی منداڵەکانم گووت، خونچە دەزانی وشەش وەک بەشەر وەهان، وەک دۆست و عەزیزانی خۆمان وەهان، دەمرن و لە جێگایاندا شتی تر دێت و دەڕوێت. بیردەکەمەوە ئاخۆ حوکمی درێژخایەن درێژکراوەی هەمان شتە کە ساڵێک لەمەوبەر پێماندەگووت شۆڕشی درێژخایەن؟. حەزت لە عارەق هەیە .. دەخۆیتەوە؟ هەڵبەت ئەگەر بلۆکی کۆمۆنیزم بەوجۆرە حەیابەرە نەڕوخابایە، گەر گۆرباتشۆف بەوجۆرە شیوعییەکانی ڕیسوانەکردبایە، ئێستا دەمانکرا قۆناغی حوکم وەک درێژکراوەی قۆناغی شۆڕش سەیربکەین... وانییە؟ ئێمە لە مارکسیزمدا وا فێربووین. بەڵام ئا ئێستا قۆناغی حوکم، هەر حوکمە، ئێستا پەیوەندییەکی بە شۆڕشەوە نەماوە، هەر ئەو ڕۆژە بەخێرانمم گووت، ئیتر نازانم چی لە ڕابوردووی خۆم بکەم. ئەوەتا ئەمریکییەکان بەسەر سەرمانەوەن، شەو و ڕۆژ بە گوێی سەرۆکدا دەخوێنن. چیتر ناتوانین پێیان بڵێین ئیمپریالیست، دەبێت خۆمان لەوە بپارێزین، وەک لقێک لە لقە شکاوەکانی شیوعییەت دەربکەوین، باش بوو ئەم دوا سەفەرەی سەرۆک بۆ ئەورووپا ئەو ترسەی لەسەر ئێمە ڕەواندەوە، ئەمریکییەکان یەک شتیان لا گرنگە، کۆمۆنیستی یان کۆمۆنیست نیت؟.

ئەوەش تۆزێک گێژ و بێتینم دەکات. ڕەنگە تۆ نەزانی من باسی چیدەکەم، هەڤاڵانی تر بۆیان گرنگ نەبێت. بەڵام من نایشارمەوە شتەکان هەموو پێکەوە، هەموویان بەسەر یەکەوە زۆر تووڕە و بێتاقەتم دەکەن».

ئاوهابوو... لە ناکاو ڕوخساری پاڵەوانێکی تراژیدی غەمگینی دەدایە خۆی.

من دەستم توند لەیەک خشاند و بە چاوێکەوە پڕبوو لە بریقەی شادی، گووتم «من دەمەوێت لە بیریبکەم، ئێستا دەمەوێت جارانم لە بیربچێتەوە ... هەموو شتێک نا ... یەکجار هەموو شتێکم بۆ فرێنادرێت، بۆ نموونە بە جۆرێک لە جۆرەکان حەزم لەم جلە کوردییانەیە، ئێستا ئاسان وازی لێناهێنم ... ڕۆژێک دەبێت واز لەوانەش دەهێنم، ئەوە هێشتا هەستێکم دەداتێ کە لە هەموو شتێ دانەبڕاوم، بەڵام ناخ حسابە، جەنابی دکتۆر ناخ حسابە. من ئێستا بە دڵ و دەروون پیاوی ناو عەسرێکی تازەم».

دەنگم بەرزکردەوە و هەستمکرد ڕوومەتم و پێستی سەرم تەواو گەرمدەبن، هێند گەرم، دەمتوانی لەویادا دەفتەری تێبینییەکانم دەربهێنم و لەسەر تینی سووتێنەری لەشم شتێکی جوان بنوسم.

دیاربوو شتێک لەو گەرمایەی من پەڕییەوە بۆ لای دکتۆر، چاوم تێبڕی و گووتم «من هەستدەکەم ڕابوردووم فڕێداوەتە دوای خۆم... ئێستا کاتی ئەوەیە بزانین چیبکەین بۆ ئەوەی ئاسوودە حوکمڕانی شارەکەمان بۆ بکرێت. بەعسییەکان ڕۆیشتن، ئیتر نایەنەوە، حیزبەکانی تر وەک سەگ دەمیان کردۆتەوە، شارەکە لە گوێرەکەیەکی تۆپیو دەچێت هەر یەکەو دەیەوێت پارچەیەکی ببات بۆ خۆی. تۆ دەڵێیت چی؟ ... دەڵێیت چی ... لە گوێرەکەی تۆپیو ناچێت؟. دەبێت ئیشبکەین، من و تۆ و ئەوانی تر، با ئیشبکەین، با پلانمان هەبێت».

بەوردی سەیریکردم، چاوانی هێند بچوک بوون، جگە لەوەی بە ئاراستەی نیگایدا دەمزانی لە من دەڕوانێت، چاوانیم هەر نەدەبینی. گووتی

«شتەکان هەروا بە هێمنی نامێننەوە، ئەمە پاییزی یەکەممانە، پاییزی تری زۆر بە دوادا دێت. گرنگ ئەوەیە حیزب چی دەوێت، حیزب چۆن بیردەکاتەوە». بە دەنگێکی بێشەرمانە و بەرز پێکەنیم و گووتم «حیزب بیرناکاتەوە، حیزب ئیتر بیرناکاتەوە، جاران حیزب هەمووی یەک لەشی گەورە بوو، یەک کەشتی بوو، یەک کەشتی زەبەلاح ... زۆر زەبەلاح ... زل زل. ئیتر وانییە، ئیتر وانییە دکتۆر، ئیتر حیزب لە دێوێک دەچێت پارچەپارچە بوویێت. هەر پارچەیەی بۆخۆی ئیشدەکات. ئیشی من و تۆش ئەوەیە لێگەڕێین هەر بەشەی بۆ خۆی ئیشبکات بێئەوەی تەواو بترازێت و هەڵوەشێت. ئیشی من و تۆ گرتنی پەتە باریکەکانە بەیەکەوە تا باڵندەکان نەفڕن. گەر ترازاش هەڤاڵ، گەر ترازاش، با ئێمە لەو پارچەیەدا بین کە ناخنکێین، لەو پارچەیەدابین کە باڵی شل نییە و ناکەوێتە خوارەوە».

دەنگم هەم خۆشی و هەم ترسی تێدابوو، هەم مژدە و هەم هەڕەشە.

هەستمکرد دکتۆر لە چاوانم دەترسێت، دەزانێت کەوتوومەتە بارێکی ڕۆحی تایبەت و نەخۆشەوە. ئەو نەیدەزانی لەو کاتەوەی چوومەتە دەزگای ئەمنییەتی شۆڕشەوە، شێتێتییەکی نەرم یەخەی گرتووم، کاتی قسەکردن ئاوا سووردەبمەوە، عارەق دەردەدەم، هەناسەم سوار دەبێت. کەمێک خۆی گرژکرد، وەک قسەکانی منی بەدڵ نەبێت، وەک ئەوەی پێشتر بۆچوونی وای نەبیستبێت، گووتی «جەنابی عەقید دەنگت شتێکی تێدایە دەمترسێنێت. دەڵێن تۆ گرفتی بێ ژنی و تەنهایشت هەیە، وانییە؟ هەموو کارێکی خراپیان لەسەر دەنگ هەیە. بۆ تا بارودۆخ باشە و دونیا ئارامە ژنێک ناهێنیت و ماڵێک پێکەوە نانێیت؟» وەک بیەوێت لاسایی پێکەنینەکەی من بکاتەوە، پێکەنی. من بە چاوێکی جیدیترەوە سەیرمکرد، حەزمدەکرد بە ڕوونی بزانێت جیاوازی نێوان پیاوێکی گرنگی ناو دەزگای ئاسایش و ڕۆشنفکرێکی قەڵتاغی ناو ڕاگەیاندن چییە. من دەمناسین، دەمزانی ئەم خوێندەوارانە چ غرورێکی خۆڕسک و خۆبەزلزانییەکی خوداڕسک لە سەریاندا ئاوێتەبووە، لەزەتیشم لەوە دەبینی

تۆزێک لەمن بترسێت. بێخەیاڵ لەو نیگا تیژەی من درێژەی دایە و گووتی «من پێمواپە شۆڕش تەواو بووە، بەڵام حیزب ... حیزب نا. حیزب شتێک نییە کۆتایی بێت. حیزب وەک شەمەندەفەر وایە، لەوانەیە شۆفێرەکەی خراپ بێت، سەرنشینەکانی چەوت و نالەباربن، بەڵام دەشێت لە وێستگەیەکی تردا خەڵکانی باش سەرکەون، شۆفێری چاکمان دەستبکەوێت. حیزب مەکینەیە، ئاشەکەیە، نەوەک ئاشەوانەکە بێت. حاجی ئاغا لە داهاتوودا شتێک نامێنێت ناوی میللەت بێت بەرگری لێبکەین. ئەوەی من نەخۆش دەخات ئەو حەقیقەتەیە... ئەوەیە، بەس حیزب دەمێنێتەوە. بۆیە ئەو ڕۆژە وتم سەرکەوتنی شۆڕش موسیبەتە، بەڕاستی موسیبەتە. لەو ڕۆژەوەی بەعسییەکان لە شار چوونە دەرەوە، میللەت نرخی نەماوە. ئەوە شتێکە بە ڕۆح و دڵ لێیدەترسم».

دکتۆر بەو پەڕیی ئاسوودەگییەوە دانیشتبوو قسەیدەکرد. من بەو نیگایانەوە کە پڕبوون لە شادییەکی بێهۆ، لە بەختەوەریی کەسێک ترسی لە خۆی و نیازە تاریکەکانی ناخی نییە گووتم «بۆیە هاتووم تا بزانین چی بکەین، دەبێت دونیا بجوڵێنین، دەبێت شت ڕوویدات، دەبێت شارەکان و گوندەکان نەخەون. لەدوای سەرکەوتنی شۆڕش دونیا کۆتایی نایەت... مێژوو قەت ناوەستێت، دەبێت شتەکان بەوپەڕی خێرایی و توندییەوە بڕۆن. دەبێت شار بجوڵێت، دیوارەکان بهەژێن، زەوی بلەرێتەوە. ئەوە ئاواتی منە، ئەوە ئیشی منە. من جەنابی دکتۆر هەست بە تین و تاوێکی گەورە دەکەم لە خۆمدا... جەماوەر کێیە؟ بە سەد ساڵ جارێک کلکێک دەجوڵێنن و ناوی دەنێن شۆڕش، هەمیشە دەبەنگترین مەخلوقیش هەڵدەبژێرن ببێتە سەرۆکیان. من تەواو کاک دکتۆر تەواو، باوەڕم بەس بەخۆمە، بەس بە تۆیە، باوەڕم بەوانەیە کە بۆ خۆیان ئیشدەکەن ... جەماوەر چونکە بۆ خۆی ئیش ناکات، وەک بێگار سەیری شۆڕش دەکات. ئێستا ئیشی من و تۆ ئەوەیە بزانین دونیایەکی ترمان لەسەر ڕێیە و دەبێت خۆمانی بۆ ئامادەبکەین». سەیریکردم و خۆی واپیشاندا کە لە ناو بیرکردنەوەیەکی قووڵدا ونبووە، تۆزێک سەر لێوی خوراند و گووتی

«ڕاستە، کێشەیەکی تیوریی قووڵە. شۆڕش نەماوە و مێژووش ناوەستێت. هیچ شتێک لە شۆڕشگێڕێکی بێئیش موسیبەتتر نییە، بەڵام کاکی خۆم، شار پڕبووە لە شۆڕشگێڕی بێئیش، دوێنێ لە گوندەماران سەرێکم لە مەکتەبی سیاسیدا، بە درێژایی ڕێگاکە پێشمەرگەی خەواڵو و بێکار قەتارەیان بەستبوو، لە بنکەکانی مەکتەبی سیاسی ژوورەکان پڕبوون لە پێشمەرگەی نوستوو، بەستەزمانانە نازانن لەم گۆڕانکارییە گەورانەدا چ کارەن و چییان بەسەر دێت».

وەک ئەوەی ڕاستییەکی گرنگم دەستکەوتبێت، دەستی خۆم توند هەڵگلۆفی و گووتم «دەبینیت، دەبینیت، دەبێت هەموو لەخەو هەستن، دەبێت هیچ کەس نەخەوێت، تەواو جەنابی دکتۆر، شتەکان لەسەر ئێمەن، مێژوو وەک گیاندارێکی تۆپیوە، دەبێت ئێمە بیخەینە سەرپێ و بیجوڵێنین، من و تۆ. ڕقم لەو گیاندارە تۆپیوە مەلعونەیە، بەڵام ئێمە، من و تۆ و ئەوانی تر... من و تۆ و ئەوانی تر، دەیخەنە سەر لۆقەکردن». وەها بوو وەک نوکتەیەکی خۆشم گێڕابێتەوە، وەک دونیا بووبێتە موڵکی من، چەند قاقایەکی بەرزم لێدا و گووتم «دکتۆر وەرەقە و قەڵەمێک بهێنە، بزانین من و تۆ چیبکەین. تا چەندین ساڵی داهاتوو من و تۆ حوکمدەکەین، هەڤاڵ خۆت ئامادەبکە، خۆت ئامادەبکە. کوا عارەق هەڤاڵ کوا؟. بەخونچە خان بڵێ عارەق بهێنێت ... ئەی چۆن دەخۆمەوە، بە خۆشحاڵییەوە دەخۆمەوە. بە خونچە خان بڵێ دەنکە هەنارمان بۆ بتەکێنێتە قاپێکی گەورەوە، پێی بڵێ، تا خودا هێزی داوەتێ شتی خۆش بهێنێت، چونکە تا چاو بڕبکات و تا خودا هێزی داوینەتێ، ئیتر من و تۆ فەرمانڕەواین ... حاکمی ڕاستەقینەین. دەستت بهێنە دکتۆر، دەستت بهێنە، گەر من و تۆ دەستبخەینە ناو دەستی یەک دەتوانین بومەلەرزەیەکی وەها دروستبکەین، هەم زەوی و هەم ئەستێرەکان بلەرزێنێتەوە... دەمەوێت خودا سەیری من و تۆ بکات و سەر بلەقێنێت و بڵێت، وای ئینسان چ شێتە».

دکتۆر زەندیان لەژێر چاویلکەکەیەوە سەیرێکی درێژی کرد. هەستیکرد شتێکی نائاسایی دەبیستێت. بێئەوەی شێوازی خۆی بگۆڕێت، گووتی «پلان دەبێت بیرۆی سیاسی دایبنێت، نەوەک من و تۆ ... وانییە؟». من هەستام و بەسەرسامی گووتم «بیرۆی سیاسی؟ وای قوڕ بەسەرمان و خاک بە دامێنمان، گەر بە دیار بیرۆی سیاسییەوە دابنیشین. دەزانی ئەندامانی بیرۆی سیاسی ئێستا چی دەکەن؟ دەتەوێت پێتبڵێم یەکە یەکە چی دەکەن، کامیان لە کوێ دەخواتەوە؟ کامیان لای چ قەحبەیەکە؟ کامیان لە چ ماڵێک داوەتە و پشتێنی کردۆتەوە و تیکەی چەور دەگلێنێت؟ دەتەوێت؟. دکتۆر هەموو سەردەمێک دووجۆر حاکمی هەیە، حاکمە ئاشکراکان، لەگەڵ حاکمە نهێنییەکان... زۆر لە حاکمە ئاشکراکان تەنیا دیکۆرن، تەنیا لە خەیاڵی خۆیاندا حاکمن، وادەزانن حاکمن بەڵام نازانن کەسانێکی تر کە لە ژێر ئەوانەوەن حوکمدەکەن، ئەوان تەنیا لە بەرچاوی خەڵک حاکمن، لە سەر تەخت یان نزیک لە تەخت کورسییەکیان گرتووە و لەسەری خەوتوون... بەڵام حوکمڕانی ڕاستەقینە ئێمەین، ئەوانی خوارەوەن... تۆ چی دەڵێیت بەدبەخت، حاکمی ڕاستەقینە من و تۆین، خۆم و خۆتین برا گیان. ئیتر من و تۆ دەبێت ئەوە دەستنیشانبکەین خەڵکی ساڵێکی تر، دووانی تر، چۆن دەژین و چۆن بیردەکەنەوە. وا ئەو خەڵکە مەبینە، ئەوانە چەند خۆیان بە گرنگ و لووتبەرز دەزانن، بەڵام پێویستیان بە ئێمەیە. دەبێت کارێکبکەین هەموو حیزبی ئێمە، هەوادارەکانمان، شتێکیان هەبێت شانازی پێوەبکەن. دەبێت شتێک بدەین بە خەڵک شانازی پێوەبکەن، خەڵک شانازیان دەوێت، شانازی بە هەر شتێکەوە بێت، بە هەر شتێکەوە، بە جەنگێکەوە، بە شەهیدێکەوە، بە سەرۆکێکەوە».

دکتۆر زەندیان وەک خەوێکی موگناتیسی لێکەوتبێت، هەستا و وەرەقە و قەڵەمێکی هێنا. شێوەی ڕۆیشتنی لە ڕۆیشتنی شاگردێکی ماندوو دەچوو نابەدڵ بۆ بێگارێک بچێت. تا گەڕایەوە، نەیدەزانی دەبێت کاری من بەو قەڵەم و کاغەزە چی بێت.

من نەخشەی دروستکردنی دەوڵەتێکی بچوکم لەسەردا بوو. بە پێکەنینێکی شێتانەوە، بە حەماسی منداڵێکەوە، بە خێرایی شەیتانێکەوە دەستمکرد بە نەخشەکێشان، هێڵکارییەکی ئاڵۆز و تێکەڵاو و سەخت، نەخشەی دەوڵەتێک کە بە خەیاڵێکی هیستیرییەوە پلانم بۆ کێشابوو.

دەبوو من ئەو کارەبکەم، جگە لە من کەسێکی تر نەبوو بیکات. من وەفای ڕەفعەت بەگ، تاکە کەسێک بووم بە عەقڵی ئەندازیارێکی ورد لەو شەوی پاییزەدا لەگەڵ دکتۆر زەندیان هێڵکاری سەرەتاییم بۆ ئەم حوکمڕانییەی ئەمڕۆ کێشا، نەخشەی دروستکردنی سوپامان دانا، شوێنی کردنەوەی کۆلێژە عەسکەرییەکانمان دەستنیشانکرد، بیرمان لەوە کردەوە چۆن گەنجە لە خۆباییەکان بکەینە ئەفسەر و چۆن پیرەکان بکەین بە ژەنراڵ، چۆن پلەوپایەی سەربازی دابەشبکەین، چۆن بنکەیەک دامەزرێنین بۆ دروستکردنی جاسوس، چۆن کادێر پەروەردەبکەین و بینێرین بۆ دەوڵەتەکانی دراوسێ، چیبکەین ڕۆحی کوردایەتی لەو شوێنانەدا لەخەوهەستێنین کە مردون. پلانم دەکێشا و بە دکتۆرم دەگووت «ئینسان پێویستی بە غرورە، وەرە من و تۆ غرور بدەین بە خەڵک». ڕێکخراوەکانی حیزبمان بە جۆرێکی شەیتانی و جەهەنەمی گرێدایەوە بە دەزگای ئاسایش و بنکەی کۆکردنەوەی زانیارییەوە. نەخشەی گەورەکردنی حیزبمان کێشا، چۆنێتی دروستکردنی قوتابخانەیەکی کادێرانی ئاسایشمان باسکرد، بیرمان لە ناوی چەندین زیندانی ئاشکرا و نهێنی کردوە، ناوی هەموو ئەو دەوڵەمەند و سەرمایەدارانەمان نوسی کە دەبێت نابودیانبکەین، ناوی هەموو ئەو نوسەرانەی کە دەبێت ناویان لە یادەوەریدا بسڕینەوە، لەسەر کاغەز مەکتەبێکی پێگەیاندنی کادێرانی ڕاگەیاندنمان کردەوە کە دەبوو دواڕۆژ ببێت بە زانکۆیەکی سەربەخۆ. بڕیارماندا هەموو پۆست و پلەیەک بە خەڵکانێک پڕبکەینەوە کە بە دەزگاکانی ئێمەوە گرێدرابن. دکتۆر زەندیان ئەو شەوە نەیدەزانی چۆن ئەم شتانە دەبنە حەقیقەت، باوەڕی بەوە نەبوو ئەم خەیاڵاتەی سەر کاغەز ببن بە ڕاست. نەیدەزانی زۆربەی شتە گەورەکانی دونیا زۆرجار پلانێک بووە و لەسەری گەمژەیەکی وەک

من و ئەوەوە دەستیان پێکردوە. ساڵانێک دواتر کە مەکتەبەکە بوو بە ئەنستیوت، ئەنستیوتەکە بوو بە کۆلێژ، کۆلێژەکە بوو بە زانکۆ، دکتۆر زەندیان ئەو ئاواتەی هاتە دی ببێتە سەرۆکی زانکۆ. من ئەوکات هێدی هێدی لە پۆست و پلە و پایە دادەگیرام، مانگ دوای مانگ بچوکتر و بچوکتر دەکرامەوە، بەڵام کە دکتۆر بوو بە سەرۆکی زانکۆ، نامەیەکی بچوکی بۆ ناردم و نوسی بووی «سوپاس بۆ شەوە جوانەکانی پاییزی نەوەدویەک». ئەوکات من و زەندیان لە مێژبوو دوژمن بووین، حیزب هەموو پلانەکانی منی دزیبوو، خەڵکانێکی تر خۆیان کردبووە خاوەنی نەخشەکەم، خۆشم پڕبووبووم لە خولیای تر، لە خودام دەویست کەس پرۆژەی دامەزراندنی ئەم حوکمڕانییە نەخاتە ملی من و فەرامۆشمبکەن. کە ئەو نامە چکۆلەیەی زەندیانم بۆ هات، چەندجار خوێندمەوە و چاوم پڕبوو لە ئاو و گووتم «ئای دکتۆر زەندیان، هەی بێشەرەف». ئەوکات کەس بیری نەمابوو کە ئەم فەرمانڕەواییەی ئەمڕۆ، بەم شکۆ و گەورەییە ترسناکەی خۆیەوە من دروستمکردوە، من پلانیم کێشاوە، من ڕەنگرێژی بناغەکانی بووم ... هیچ کەس ئەوەی نەدەزانی، گەر شتێکی وەهاشم بگووتایە وەک شێت تەماشایاندەکردم، وەک کەسێکی خەڵەفاو کە خەریکە عەقڵی لە دەست دەدات. ئەو شەوە تا درەنگ من پلانم دەکێشا و زەندیان سەیریدەکردم و گوێیدەگرت و کۆمەکیدەکردم و پەشیمانیدەکردمەوە، منیش زوو زوو پێکە عارەقم هەڵدەدا، ملپێچەکەمم شلدەکردەوە و توندمدەکرد، دەمنوسی و هەناری مێخۆشی ئەو پاییزە غەمگینەم دەخوارد، دەمگووت «هەڤاڵ، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ وەها سەرقاڵ بێت فریشتەکەی ناخی خۆی لەبیربچێتەوە». زەندیان نەیدەزانی من باسی چی دەکەم، کە پیاڵەی عارەقم پڕدەکرد و دەکەوتمە وڕێنە دەربارەی فریشتەکەم، دڵنیادەبوو کە سەروکاری لەگەڵ شێتێکی تەواودایە، من هیچ کات لە پیاوێکی دانا و عاقڵ نەچووم، ئەوەش نهێنی خۆشبەختی و بەدبەختییە گەورەکانی زیندەگیمە. لە چاوانیدا دەمخوێندەوە کە هێدی هێدی وەک شێت سەیرمدەکات، وەک کەسێکی ترسناک. بەڵام دەیزانی لە ئێستا و لەم ساتەدا من قودرەتم

بەدەستەوەیە. پێمدەگووت «وەرە دکتۆر، وەرە دونیایەکی تازە دروستبکەین، پلان دابنێین، پرۆژەی گەورە دەست پێبکەین». ئەو سەرەتا شتەکانی وەک گەمەیەکی خۆش دەبینی، وەک خەیاڵێک تەنیا لەسەر کاغەزەکانی من دەمێنێتەوە، وەک گەڕانی سیاسییەکی دێوانە لە ڕۆژانی بێئیشیدا بۆ شتێک سەرگەرمیبکات. تا شەو زیاتر دەچووە پێش، تا عارەقەکە گێژتری بکردبایە و مەستی پتر بچووبایە سەر ڕوخساری، مەترسی ئەم خەیاڵاتانە زۆرتریان بۆ دەهێنا و دڵیان پڕدەکرد لە سامێکی ناوەخت. من دەمزانی دەترسێت، بەڵام لەپی دەستم وەها عارەقی کردبوو، سەرم وەها جۆشی تێکەڕابوو، گەرووم وەها نوسابوو، بۆم گرنگ نەبوو ئەو هەست بە چی دەکات، بە جۆش و گەرمییەوە دەمگووت «دکتۆر شانازی بە خۆتەوە بکە، تا مردن شانازی بە خۆتەوە بکە. هەموو کەسێک، وەها ئاسان بۆی هەڵناکەوێت و بەخت یاری نابێت، نەخشە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێک بکێشێت. میللەتانی تر سەدان ساڵ پێش ئێمەی کورد لەسەر خاکی خۆیان ئەو حوکمڕانییەیان دامەزراندوە، ئێستا کەس بیری نەماوە کێ ئەو پلانەی داناوە، دەوڵەت و فەرمانڕەوایی هێندەی دیارییەکی خودابووە بۆیان، دەستکەوتێکی مێژوویی نەبووە. ڕەنگە هیچ کات و لە هیچ شوێنێکیش پلان نەبووبێت، ڕەنگە شتەکان خۆیان هەروا هاتبن، ئەوە دوای ئەوە و لە سەرەخۆ مەملەکەتی خۆیان دروستکردبێت و هەر جارەی یەکێک پارچەیەکی نوێی خستبێتە سەر دیکۆرەکان. بەڵام ئەم مەکینەیەی من و تۆ دروستیدەکەین تازەیە، پێشتر کەس دەرفەتی لەمجۆرەی بۆ نەڕەخساوە، پلانی دروستکردنی فەرمانڕەواییەکی وەها فراوان دابڕێژێت، شارێکی یاری گەورە، بەر لەمن و تۆ ڕەنگە هەندێک فەیلەسوف بیریان لێ کردبێتەوە، بەڵام لەم سەردەمەدا، لە ناکاو دەوڵەتێک نەمێنێت و دوو کەسی وەک من و تۆ بۆمان هەبێت دەوڵەتێک دروستبکەین، دوو کەسی وەکو من و تۆ... ئاه، دەزانی ئەوە چ خەوێکە ... چ ئەفسانەیەکی گەورەیە. گەمژەی وا هەیە دەڵێت باوەڕ بە ئەفسانە مەکەن، ئەمە ئەفسانە نییە من و تۆ کەوتووینە ناوی؟... ها ... دەی گەر ئەفسانە نییە چییە؟ من و تۆ لە شارێکی یاریی گەورەداین کە ناوی

مێژووە... ئەحا هاورێم، بژی، سەلاوات، هورا، طوبی، زندەباد».
وامدەگووت و وەک شێتێک خەزێنەیەکی گەورە زێڕی دۆزیبێتەوە، پێدەکەنیم. دکتۆر زەندیان لەوێدا چاوانی کرانەوە، گەشییەکی کتوپڕی تێگەڕا، وەک ئەوەی جۆش و خرۆشی دڵی من دواجار کاریکردبێت و گەیشتبێتە دڵی ئەویش. بۆیەکەمجار شتێک لە شێتیم لە نیگای ئەویشدا بەدیکرد. لە نزیکەوە سەیریکردم، چاوانی زۆر هێنایە پێش و لە پشت چاویلکەکەیەوە لە درزێکی زۆر بچوکەوە ڕەنگی زەیتونی چاوە وردەکانیم بینی، سەیربوو بەلامەوە چۆن ئەم چاوە بچکۆلانانە دونیا دەبینن. لە ناکاو وەک شتێکی کەوتبێتەوە یاد، گووتی «ڕاستدەکەیت، هەڤاڵ، ئێمە بۆمان هەڵکەوتووە ڕۆژگارێکی یۆتۆپی بژین ... بەڵام، هەڤاڵ گیان، بەڵام ...». ئەوە ساتێکی گرنگ بوو، توند دەستیم گرت و بە نیگایەکەوە هەم شادی و هەم گریی لێدەباری، گووتم « هیچ مەڵێ، بەڵامی تێدا نییە. چ شتێک لەوە ئەفسانەییتر هەیە حوکمڕانییەک دروستبکەین، ئەو حوکمڕانییەش حوکمڕانییەکی کوردی بێت. لە هەموو شت سەیرتر ئەوەیە من و تۆ بێئەوەی بە خۆمان بزانین لە ساڵانێکی ئەفسانەییدا لەدایکبووین. ئەی چۆن، دکتۆر، ئێستا خۆمان نابینین، بەڵام سەد ساڵی تر کەسێک کە سەیری ئەم ڕۆژگارە دەکات، دەبینێت کە من بەم سەرە زلە ساف و تاس و لووسەمەوە، تۆ بەم چاویلکە زلانەتەوە، دوو دڵی پڕ جورئەت بووین، ئەوەی ئەم دنیایەی من و تۆ نییەتی ئیرادەیە، ئەوەش شتێکە لە من و تۆدا هەیە، من دەیبینم، هەڤاڵ من لە چاوانتدا دەیبینم. چ شتێک لەسەر ئەم ئەستێرە لە دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی خەیاڵیتر بووە؟ دەسەڵاتێکی هەتا بچوکیش، هەتا لە گوندێکدا بێت، لە شاخێکی دووورێشدا.... ها... چ ئەفسانەیەک لەوە ئەستەمتر تا ئێستا لە دونیادا بووە؟. کەچی من و تۆ ئێستا ئەو دەرفەتەمان هەیە ببین بە خاوەنی ئەو ئەفسانەیە، بە قارەمانی یەکەمی. گرنگ نییە مێژوو بۆ کێی دەنوسێت، کێ خۆی دەکاتە خاوەنی، کێ سبەی دەڵێت من داممەزراند، گرنگ ئەوەیە من و تۆ، من و تۆ، ئەم دوو پیاوە بچکۆلەیە کە لەوانەیە مێژوو هەر نرخمان نەزانێت، هەر نەمانخاتە حسابی خۆیەوە ئەوە بکەین... پێمبڵێ،

ئەوە شایەنی ئەوە نییە فریشتەکەی خۆتی بۆ بکوژیت؟ شایەنی ئەوە نییە؟».

دکتۆر زەندیان لە نێوان ترس و ئومێد و مەستیدا جۆلانێیدەکرد. تا ئەو جێگایە لەگەڵمدا بوو هاوکارم بێت ئەم شارە بگرینە دەست و بیجەڕێنین، کە زانی من خەونی زۆر گەورەم هەیە، سنووری خەیاڵی من ئەم شارە تێدەپەڕێنێت و بیر لە دەوڵەت دەکەمەوە، کەوتە سەرباری دوودڵی. من ئەمڕۆ پەشیمانم، کاتێک گووتم ئیرادەیەکی گەورە لە تۆدا دەبینمەوە ... وانەبوو، درۆمدەکرد. ئەو هەر کوردێکی ئاسایی ترسنۆک و بێخەون بوو، وەک باپیرە ترسنۆکەکانمان کە هەمیشە لە ناو شاخ و ئەشکەوت و بنبەرددا خۆیان شاردۆتەوە. من لە چاوی زەندیاندا ترسی زیاد لە دوو هەزار و پێنج سەد ساڵم دەخوێندەوە، ترسی باپیرانمان کە ئێمەیان بەم دەردە برد، لە کاتێکدا تورکەکان و عەرەبەکان و فورسەکان بە هەر چوار دەوری خۆیاندا خەریکی فتوحات بوون، خەریکی جەنگی گەورە بوون، لەشکرکێش و کیشوەرگیر بوون، سەری سوپایان لە کیشوەرێک و کلکی لە کیشوەرێکی دی تۆزیدەکرد، باپیرانی ئێمە هەر خەریکی خۆ لە چیا خزاندن بوون و سەرقاڵی خۆ شاردنەوەبوون لە ئەشکەوتەکاندا، گەر جارێکیش سەریان لە ملوانی سیپاڵە شڕی خۆیان دەرهێنابێت، بۆ تاڵانکردنی گوندەکەی دراوسێیان بووە. من لە کۆتایی شەودا مێژووی ئەو ترسەم لە ڕوخساری دکتۆردا بینی. وەک چۆن باپیرە درۆزنەکانمان جەنگاوەر نەبوون، ئەمیش دکتۆر نەبوو... هەمان درۆی مێژوویی بوو کە ئێستا لە ڕوخسارە مەستەکەی خالیق زەندیاندا بە جۆرێکی نوێ دەردەکەوتەوە. دکتۆر کەوتە دۆخێکەوە لە هەموو وشەیەکم دەترسا، لەگەڵ هەموو قسەیەکمدا ڕۆحی سەرشار دەبوو لە سامێکی گەورە، سامێک چووبووە خوێنییەوە و بووبوو بە شتێکی غەریزی لە ناویدا. منیش تا مەستتر و مەستتر دەبووم، کەمتر و کەمتر دەمویست تەماشایبکەم، ئێستا هەموو ئەو لەشە کوردییە زامدار و شێواوەم تێدا دەبینی کە مێژوو پلیشاندویەتییەوە. دکتۆر کە بیری لەوە دەکردەوە عاقبەتی سەرکێشی

وەها بە کوێ دەگات، هەموو گیانی دەلەرزی. دکتۆر وەک هەموو ئەوانی تر دەترسا دونیا بلەرزێنێتەوە، دەترسا شتەکان بە یەک گوژم بەرەو پێشەوە ببات، دەیگووت « نا .. نا نا... زۆر مەڕۆ، تۆ چی دەکەیت. هەڤاڵ شانی پێدا مەکە. مەکینەکەمان ناسکە، برغووەکانی باریکن و بە گوژمێکی وەها هەموو پارچەکانی دەترازێت و لە یەکدی دەبنەوە». من بۆیە دکتۆر زەندیانم بۆ گرنگ بوو، چونکە دەمەوێت شاهیدێکی گەورەم بۆ مێژوو هەبێت، دەبوو یەکێک هەبێت لە داهاتوودا بڵێت کە من بووم، ئەم کارماندە خەیاڵاوییەی ئاسایش بووم کە یەکەمجار بە ڕوونی پلانی دامەزراندنی ئەم دەوڵەتەم خستە سەر کاغەزێکی سپی و وەک حەقیقەت سەیرمکرد. بەڵام ئەو سەرتاپای گیانی دەلەرزی. بیجامەکانی ئێستا لە چاو سەرەتادا لەبەریدا گەورەتر دیاربوون، لەشی لە بەردەم موچڕکەکانی ئەو خەوەدا تا دەهات بچوک دەبووەوە، وەک هەموو کوردێک لەرز دەیگرت لەوەی خەونی گەورە ببینێت، ترس دەیخوارد کاتێک بیری لە ئازادی خۆی دەکردەوە، بە لەش و بە دەنگ و بە نیگایدا دیاربوو کە بەکەمترین شت دەیژەنێت، دەیویست هەڵبێت و ڕابکات و خۆی لەو خەونە جەهەنەمیانەی من بشارێتەوە. من لەو ساتەدا پڕبووم لە شێتی، یەک لەدوای یەک نەخشەم بۆ دەزگا و سوپا و هێزی گەورە دادەڕشت ... من لە گەرمەی خەیاڵات و پلاندانانەدا بووم، لە ناکاو زەندیان بێویستی خۆی دەستی گرتم و گووتی «تۆ دەڵێیت چی، دەڵێیت چی، بیر لە شتی وەها بکەینەوە هەمووومان سەردەبڕن ... عەرەبەکان و تورکەکان و فارسەکانت لە یادکردوە؟ بیرتچۆتەوە چ دڕندەن، چۆن هەر باسی دەوڵەت بکەین عەقڵی خۆیان لەدەستدەدەن. تۆ دەڵێیت چی؟»، من چاوانم بە ڕوناکی خەوێکی گەورە دەدرەوشایەوە، خەوێک پڕبوو لە جوانی، پڕبوو لە تەماحی ڕۆحێک تا ئێستا ڕانەهاتووە تەماحی ببێت. دەستیم لەسەر کاغەزەکە لادا و گووتم «لێگەڕێ جارێک بێ بیرکردنەوە لە دوژمن نەخشە بۆ داهاتوومان بکێشین، دەمەوێت بێئەوەی بیر لە هیچ بکەمەوە ئیشبکەم. دوائەوە من چیدەکەم، عەرەبەکان خۆیان ڕۆیشتوون، خۆیان ئێرەیان چۆڵکردوە، من چی دەکەم... ئەوانەی ژێر دەستەی من و تۆ دەبن کێن جگە لە خەڵکی

ئەم شارە بەدبەختە، کێن جگە لەم کوردە نەگبەتانەی برامان. سەیرکە دوای بەعسییەکان هیچ حاکمێک دەبینی بێت و بڵێت من فەرمانڕەوایەتیتان دەکەم، لە چی دەترسیت... ها لەچی، لێگەڕێ کارێکی گەورە بکەین». من دەمویست بە هەموو هێزێکەوە بەرەو ناوەڕاستی مێژوو تەکانبدەم، خۆم وەک ئەسپێکی جڵەو پچڕاو دەبینی، کە شێتانە بۆ ناو جەرگەی مێژوو غاردەدات. وەک ئەژدەهایەکی چوار سەر کە دەیەوێت زنجیرێکی ئەستوور بپسێنێت، گەر ئەو هەستەم نەبایە هیچ کات نەمدەتوانی ئەو هەموو دڵڕەقییە بنوێنم. جیاوازیشم لەگەڵ جاراندا ئەوەبوو ئێستا دڵنیابووم بۆ یەکەمجار خواستی من و خواستی مێژوو بە جۆرێکی ترسناک بوونەتە یەک و تێکەڵ بوون.

ئەو شەوە بە مەستی کاغەزەکانم کۆکردەوە و گووتم دەیانبەم بۆ سەرۆک، بە خوماری کەسێکەوە کە خەونەکانی مەستیکردوە هاتمەدەرێ، کە دواجار دەستم دایە دەست دکتۆر تەوقەی ماڵاوایی لێبکەم، هەموو لەشی دەلەرزی. پیاوێک بوو نەیدەتوانی خەون ببینێت، هەموو خەونێکیش کات و وادەیەکی هەیە کە تێپەڕی ئیتر ناگەڕێتەوە... خەون تاکە شتێکە کە دەبێت لە کاتی خۆیدا بیبینیت، گەر کاتی بەسەرچوو دەبێت بە وڕێنە.

هاتمەدەرێ ... بە مەستی شەقامە چۆڵەکانی شەوم تەیکرد، فیکر و خەیاڵم نەبوو کە شۆفێرەکەم لەسەر سوچی کوچەی ماڵی زەندیان جێهێشتووە، بە هەموو ڕێگا چۆڵ و نسرمەکانی شەودا ڕووە و ماڵ کەوتمە ڕێ، بە هەموو کۆڵانەکاندا هاتم، شادمان بووم، هەستمدەکرد خۆشبەختی خەریکە دەمکوژێت. ساتێک بوو وامدەزانی بۆ خۆم دەژیم... بۆ خۆم... هەستمکرد لە گەرمەی دامەزراندنی دەوڵەت و حوکمڕانییەکدام کە موڵکی خۆمە، دیاری منە و دەیبەخشم بە مێژوو. بۆ یەکەمجار ئەو هەستە شەمشون ئاسایە سەیرەم هەبوو کە بە ڕاستی من دەتوانم سەربەخۆ شتێکی گەورە دروستبکەم و بیبەخشم بە مێژوو. ئەوە ئەو ساتەبوو کە هەموو ژیانم بۆی گەڕابووم... لە هەوای پاکی شەودا باڵمدەکردەوە و جوانتر لە هەر کاتێک خۆم دەبینی، پیاوێکی ئازاد کە

لەدایکبووە تا مێژوو بگۆڕێت، هیچ وەزیفە و مانا و کار و هەستێکی تایبەتی خۆی نییە ئەوە نەبێت، ژیانێکی لە ناو شتە بچوک و هەستە رۆژانەکاندا نییە، بەڵام بۆ ئەوە دروستبووە کە لە ترپەی دڵی خۆی و ترپەی دڵی ئەو جانەوەرە گەورەیەدا کە ناوی مێژووە پێکەوە یەکبخات. ئەوە ئەو ساتە بوو کە بۆی دەژیام، هەم ئازادبم و هەم مێژووش بخەمە ژێر دەستی خۆم... نەفرەت لە شتە بچوکەکان، نەفرەت لە هەستە زووتێپەڕ و خواستە نزمەکان. من خودای سەردەمێکی تازەم و دەبێت ئەو هەستە لەدەست نەدەم کە خودام... من وەفای ڕەفعەت بەگ، لەو کاتەدا، لەو شەوەدا، بە ڕوونی هەستمکرد، نزیکم لەوەی ببم بە خودایەک لە خوداکانی سەر زەوی.

## زیندووبوونەوەی کێشەی کچە نابیناکەی خانم

لەدوای ڕاپەڕین، شار پیر دیاربوو، هەستێکی ترسناکم هەبوو کە لەوانەیە هەمووشتێک لەم شارە پیرەدا بە بومەلەرزەیەکی بچوک بڕوخێت. تەواوی شتەکان ڕەنگ و ڕووی شکان و پەرپوتیان گرتبوو. سەیرە دوای سەرکەوتنی هەموو شۆڕشێک، جێگاکان پیر و وێران دەردەکەون، بەوەدا شۆڕش هیچ کات دەستی ناگاتە داهاتوو، ئیدی دەستدەبات و دێرینترین تارمایی لە هەناوی جێگاکاندا دەردەهێنێت و دەیانخاتە سەر شانۆ، هەر بۆیەش شوێنەکان دوای شۆڕش هێندەی دەبن بەماڵی ئەو مردوانەی لە ڕابوردووەوە هاتوونەوە نابنە ماڵی ئەو کەسانەی خەون بە شتێکی دییەوە دەبینن. تا پایز لە کۆتایی نزیکبایەتەوە، ئەو پیرییەم لەسەر دیوار و شێوەی ماڵ و ڕوخساری شەقامەکان زیاتر دەبینی. بە جۆرێکی ترسناک هەموو شتێک پیر دەینواند، هەتا ڕوخساری گەنج و منداڵەکانیش، هەر

شتێک لەم شارەدا دەهاتە دونیاوە بە پیری دەهات، من ڕۆژێک چوومە خەستەخانەی منداڵان و لە نزیکەوە سەیری ساوا نوێ زادەکانم کرد و بە جۆرێکی عاجباتی پیر و چرچ و قرچۆک هاتنە پێشچاوم. تاکە جێگایەک دژ بە ئاڕاستەی ڕۆحی ماندووی شارەوە دەجولایەوە، ماڵی لیڤیتانت بوو. من دەمزانی لیڤیتانت ناتوانێت ڕۆحێکی نوێ ببەخشێتە ئەم سەردەمە، بەڵام دەیویست دەموچاوێکی تازەی بداتێ. ئەو ماوەیەک بوو بە جۆرێکی سەرنجڕاکێش، خەریکی نوێکردنەوە و مۆدێرنسازی ماڵەکەی خۆی بوو، چواردەوری کۆشکەکەی خۆی بە ڕوناکی و گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ کردبووە چراخان... سەیربوو بە لامەوە ئەم پیاوە مۆنە، ئەم ڕۆحە کە هەرگیز لە دڵەوە پێناکەنێت، ئاوها کەوتۆتە خولیای دروستکردنی کۆشکێکی بە ڕەونەق و شکۆدار، وەهاش بوو وەک کۆشکەکەی ئەو هەموو ڕووناکی شاری مژیبێت و دزیبێتی بۆ خۆی. بەشێوەیەک دار و دیواری بە شەوقی هەمەڕەنگ ڕۆشنکردبووەوە، ماڵەکەی وەک شوێنێکی جیاواز، وەک بەشێک لە جەستەیەکی نامۆ لە شار دەردەکەوت. هەموو شتێک لە ماڵەکەی ئەودا بۆنی دونیایەکی نوێی ڕازاوەی لێدەهات، شتەکانی تازە و بریقەدار بوون. هەستمکرد هەردووکیان چ لیڤیتانت و چ هاوسەری لە دەست تاریکییەکی قووڵی ناخیان بەرەو دونیای ئەو ڕوناکییە دەستکردە بەهێزانە ڕادەکەن. هەستدەکەم لەو ساتەوە ڕوناکی دەستکرد بووە جێگری هەر ڕوناکییەکی دیکەی ناو دڵ، بووە نیشتەجێی هەر تیشکێکی تر کە لە ناوەوە بێت. ئەوەی بۆ من عاجباتی بوو، سەرسامی گەورەی خۆم بوو بەو تیشکە بەهێزانە، تا ناخم تاریکتر و تەماویتر و ئاڵۆزتربایە، ڕۆشنایی ئەو چرا دەستکردانە بەهێزتر ڕایاندەکێشام، تا ترسم لە هێزە تاریکەکانی ناو دڵی خۆم زۆرتربایە، زۆرتر ئەو بەهەشتە پلاستیکییەی لیڤیتانت و خانمی ماردینی بەرەو خۆی فریوی دەدام. هەر کات دەچووم بۆ ماڵی لیڤیتانت چەند خولەکێک لە دوورەوە دەوەستام و سەیری ئەو چراخانە گەورەیەم دەکرد کە شەبەنگێکی شکۆمەند لە هەموو پایە و پەنجەرەکانییەوە دەهاتەدەرێ. من دەمزانی ئەوە شەبەنگی خودایی نییە، دەمزانی نوری سەر مەزاری پیاوچاکان نییە، بەڵکو ڕوناکی ڕۆژگارێکە لیڤیتانت و ژنەکەی

بەر لە هەمووان دەستیان بە دوگمەکەیدا ناوە. ماڵەکەیان بۆ ئەو کات شتێکی سەیربوو، گەرچی زۆربەی وەخت خەڵکی کارەبایان نەبوو، بەڵام جەنابی لیڤیتانت لە پێشی ئەو کەسانەدا بوو کە بەکارهێنانی مۆتۆری گەورەی بەرهەمهێنانی وزەی داهێنا، یەکەمجار بە گڵۆپی ورد و درشتی زۆر چواردەوری ماڵەکەی تیشک ڕێژ کرد، خۆشیان لەو باوەڕەدا نەبوون داگیرساندنی گڵۆپەکان کاریگەرییەکی وا سیحراوی جێبهێڵێت و خەڵک لە هەموو گەڕەکەکانەوە بێن بۆ سەیری. ئەو ئێوارەیەی کە یەکەمجار گڵۆپ و چلچراکانی داگیرساند، من هەستمکرد چ خواستێکی سەیر لە ڕۆحی خەڵکی ئەمشارەدا هەیە بۆ تیشکە دەستکرد و درۆزنەکان. شەوێک بوو سەدان کەس هاتن بۆ سەیر... ڕوناکییەکان وەها جوان بوون، وەها دڵڕفێن بوون، هەر کەسێک لەو ساتەدا لەوێدا بوو لە دڵەوە لیڤیتانتی لە هەموو گوناهە دێرینەکانی بەخشی. خەڵک ئەو تۆپەڵە نورە، ئەو کۆشکە گەورەیەیان لە ڕوناکی خۆشویست، بە نیشانەی سەرهەڵدانی شارێکی نوێیان لەقەڵەمدا، شتێک بوو وەک لە ناکاو لە ناو ئەو پیرییە کتوپڕەی شاردا سەرەداوی ڕۆژگارێکی نوێ بدات بەدەستەوە، شتێک بوو لە ناو ئەو کاولستان و پیرخاکەدا مژدەیەکی تری دەگەیاند. من ئەو ئێوارەیە دڵنیابووم کە ئەم تیشکانە لای لیڤیتانت وەک دیوارێک وەهان لە نێوان خۆی و ڕابوردووی خۆیدا هەڵیدەچنێت. سەیربوو لەو ساتەدا کە سەرەتای وەرزی برسێتییەکی دوور و درێژ بوو، خەڵکی لەبری ئەوەی توڕەبن، لەبری ئەوەی هەستبکەن هێدی هێدی سەردەمی جیاوازییە گەورەکان دەستپێدەکات، ئەم کۆشکی ڕوناکییەی لیڤیتانتیان بەخۆشییەوە وەرگرت، بە سەرەتای دەرکەوتنی جوانییەکی ونیان زانی، بە بناغەی سەرهەڵدانی شارێک کە هێدی هێدی لە بن زەوییەوە سەر دەردەهێنێت. من لەو ساتەدا کە پێمخستە ئەو کۆشکی نورەوە، تێگەیشتم خەڵک زۆر پێویستیان بە ڕوناکی درۆزنە، چیتر جۆرە مرۆڤێک لەم شارەدا دروستبووە کە تەنیا ڕوناکی درۆزن سیحریان لێدەکات. ئەو شەوە یەکێک بووم لەو کەسە کەمانەی بۆم هەبوو بچمە ماڵی لیڤیتانتەوە. ئەو جوان خۆی گۆڕیبوو، نەمدەزانی شادە یان غەمگین، وەک هەمیشە خوێندنەوەی هەستەکانی

ئاسان نەبوو، هەمان نیگا و وەستان و ئالۆزی هەبوو، وەک زیاد لە حەڤدە ساڵ لەوەوبەر، دەمێک لە پسمامان لە دەستێک جلی پێشمەرگایەتی ڕەشدا بینیم، هەمان قۆزیی، هەمان بۆشناخیی، هەمان شەڕانگێزیی. خانمیشی بە جۆرێک سەرسوڕهێن جلکی ئاهەنگی لەبەرکردبوو، نەغەدە ئێستا بەڕاست دەموچاوێکی ژنانەی بوو، هەتا دواجار کە بینیم، دەمێک داوەتی گۆشتی ئاسکیان کردم، هێشتا شتێک لە ئاسەواری ئەو کچە یاخییەی تێدا بوو، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە سەرەتای شۆڕشدا لە غەمپاشا ناسیم. ئێستا بووبوو بە ژنێکی تر، سەیرکردنی، وەستانی لە پێڵاوە پاژنە بەرزەکانیدا، شێوەی قژ داهێنان و ڕێکخستنی، ئاماژەکانی دەستی کاتێک دەیویست لە بەردەم میوانەکاندا بەخزمەت و بەڕێز دەربکەوێت، بێباکی لە جوڵاندنەوەی لەشیدا، فەرماندەرکردنی بۆ ئیشکەرەکان... پێکڕا نیشانەی دەرکەوتنی ژنێکی تر بوون لە ناو نەغەدەدا. ئەوە یەکەمین شەو بوو دەرگاکانی ماڵی لیڤیتانت، بەوجۆرە بکرێنەوە. ئەو ئاهەنگەیان بەهانە و بۆنەیەکی ئەوتۆی نەبوو، تەنیا ناویان نابوو ئاهەنگ، ئاهەنگ و هیچی تر. پێشتر لە شاردا باو نەبوو مرۆڤ تەنها ئاهەنگ بگێڕێت، هەمیشە دەبوو بۆنەیەک بدۆزێتەوە، بەڵام هەستمکرد خانم و لیڤیتانت لە بەرئەوەی هیچ بۆنەیەکی دونیایان بۆ گرنگ نییە، گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی ئاهەنگێکی بێهۆ و بێبەهانە بگێڕن. کە چوومە ژووری هەستمکرد فەزای شوێنەکە پێمدەڵێت چینێکی نوێ لە خانەدانان بەڕێوەن. لیڤیتانت زۆربەی نۆری سیاسی و خێزانی سیاسییەکانی بانگهێشتکردبوو. هەموو کە منیان بینی بە ترس و لوتفەوە سڵاویان لێکردم. چاویان زەردەخەنەیەکی گەش و لێویان لەرزێکی نهێنی لەسەر بوو. لە جێگایەکدا وەستام و دەستم خستمە سەر دەمم و وەک چاوەڕوانی هاتنی کەسێکی دیاریکراو بکەم، یاخود بۆ هاوڕێیەک بگەڕێم، کەوتمە نیگاکردن. یەکەمجار کاریگەری وانەکانی باهیریم بینییەوە، پیاوەکان زۆربەیان قاتیان لە قوماشی بریقەدار پۆشیبوو، ژنەکانیان جلی کوردی ئێجگار جوان و گران بەها. هەموو جۆرە ویقارێکیان دەردەخست کە دەمزانی تازە فێریبوون، لە دڵی خۆمدا گووتم «نەحلەت لە تۆ باهیری،

ماوەیەکی تر هەموو وایان لێدێت نەیانناسینەوە». دیاربوو زۆربەیان وانەکانی خۆنواندن و قیافەگرتن و نەریتی قسەکردنی ئەویان خوێندوە. لە ناو ئەو فوارەی تیشک و چراخانەدا خۆم لە نەغەدە نزیککردەوە، خۆی وادەرخست کە خۆشحاڵە دەمبینێت، زەردەخەنەیەکی نوێ لەسەر ڕوخساری بوو، خەندەیەک پێشتر نەمدیبوو، خەندەیەک هەستدەکەم سەرەتای ئەو دەموچاوە تازەیە بوو کە خانم لەم سەردەمە تازەیەدا دەبوو بیخاتە سەر سیمای. پرسیم «خانم، خانمی ماردینی شەوێکی شاعیرانەتان ڕێکخستووە ... سوپاس، شارەکە پێویستی بە شتێکە جار جار لە مەراق دەریبهێنێت، وای وانەبێت خەفەت ئەم خەڵکە بەستەزمانە دەخوات». من گەرچی ڕۆشنبیر نەبووم، بەشی ئەوەی شاعیرییەتی تەواو لە ناشاعیرییەت جیابکەمەوە، بەڵام بە غەریزە دڕندەکەی خۆم دەمزانی کە ئەمجۆرە شاعیرییەتە لەو شێوە شاعیرییەتە کۆنە نییە کە سەردەمانێک لە مەوبەر خانمی لە باوەشی دکتۆر شوکاک دەرهێنا. ئەوسا کچێکی یاخیبوو کە دەیویست هەموو دونیا جیاوازەکان تاقیبکاتەوە، تا ئەوپەڕی یاخیبوون بفڕێت و لەشی لە ژێر زەبری ئەو شۆڕشە تایبەتییەی خۆیدا بەسەر هەموو نێزە و چەقۆیەکدا ڕابکێشێت... بەڵام ئێستا چی؟ ژنێک بوو جوان، بە ویقار، پڕ ئەتەکێت، بەڵام بە زەردەخەنەیەکەوە کە دیاربوو زەردەخەنەی خۆی نییە. وەک ئەوەی قسەکەم هیچ شتێکی ئەوتۆ ماناداری تێدا نەبێت، گوتی «هەموو شتێک شاعیرییەتی خۆی هەیە، هەموو شتێک... هەتا پیاوکوشتنیش». کە وایگووت، سەیرێکی ماناداری منی کرد، نیگای لە بری عیشوەی ژنانە، قیزێکی نهێنی تێدا بوو. ئەوە جۆرە سەیرکردنێک بوو دواتر لە چاوی زۆر ژنی دیکەشدا بینیمەوە، بەرلەوەی ببێت بە شێوە نیگای باو و بشبێتە بەشێکی بنەڕەتی کاراکتەری منیش. ئاهەنگەکە لە هۆڵە زۆر گەورەکەی ماڵی لیڤیتانت و لە مەتبەخ و لە هەیوانە گەورەکەدا بوو، زیاد لە سەد کەس داوەت کرابووین. بۆ یەکەمجار لەو ئاهەنگەدا هەندێک خانمم بینی بیرە دەخۆنەوە، ئەوە یەکەمجارم بوو لەدوای ئەو ساڵی گێژی و مەستییەی تاران، ژنانێک ببینم ئاوا شەرابی مەستکەر دەنۆشن. لەو ئاهەنگەوە هەستمکرد هەموو بە

جۆرێک لەجۆرەکان لێم دەترسن. ئاشکرا هەموو دەیانزانی کراومەتە بەرپرسی پلاندان بۆ کاری ئاسایش، دەیانزانی من چ چاوێکی گەورە و هەمەبینم دەبێت، ژنەکان و پیاوەکان دەیانزانی لە ئێستا و داهاتوودا گەر بمەوێت دەتوانم هەموو شتێک بزانم. ئەوەش وایدەکرد لە ترسدا عاشقم بن، لە چاوی هەندێک لە کچ و ژنە گەنجەکاندا ئەو عەشقەم بینییەوە، عەشقێک لە بەشە ئارام و هێمنەکەی دڵەوە نایەت، بەڵکو لە بەشە تاریک و ترساوەکەیەوە هەڵدەقوڵێت. من لەزەتم لەوە دەبینی کە دەمبینی تەنها جێمدەهێڵن، نە لەبەرئەوەی کەسێکم نایانەوێت لێم نزیکبن، بەڵکو لە بەرئەوەی لەوە گەورەتر و ترسناکترم بمگەنێ. ئەو فاسیلەیە لە دونیا، لە مرۆڤەکان گرنگ بوو تا بزانم من کێم. بەشی هەرە زۆری شەوەکە بەتەنها بووم، گەر هەر کەسێکی تر بام جگە لە عەقید جەنگیز، ئەو تەنهاییە ئازاربەخش دەبوو بۆی، بەڵام دەمزانی تەنهایی قەدەری منە، بۆ دەبێت ئازار لە شتێک ببینم کە هەموو ژیانم لەگەڵم بووە و لەگەڵم دەبێت. لیڤیتانت هەندێجار لە دوورەوە سڵاوێکی لێدەکردم، دەموچاوی هەر سارد، نیگای هەر مات و پڕ تەلیسم بوو... بەر لە کۆتایی ئاهەنگەکە بانگمکرد، هێدی هێدی هۆڵەکە چۆڵدەبوو. شەراب کەمێک مەستیکردبووم، مەستیش کەمێک خۆشحاڵی کردبووم، خۆشحاڵیش کەمێک ئازاد و کراوەتر، پێمگووت «لیڤیتانت، من زنجیرەیەک زیندان دروستدەکەم، هەندێکیان نهێنین، پێویستیم بە تۆ دەبێت». ئەوەم بە ڕاست بوو، لە پێشەنگی کارەکانمدا دروستکردنی کۆمەڵێک زیندان بوو کە بشێت ناو و شکۆیەکیان هەبێت، من دڵنیابووم شکۆی هەموو دەوڵەتێک بە زیندانەکانییەوەیەتی. لیڤیتانت بەرامبەرم دانیشت و قاچی خستە سەر قاچ و گووتی «چ جۆرە زیندانێک هەڤاڵ؟». دەترسا زیندانەکانم زیندانی قەڵەوکردن و نازدارکردنی گوناهباران بێت، دەترسا لە سەردەمێکدا گیرسابێتەوە زیندانی مانای خۆی و زیندان شێوەی جارانی خۆی لەدەستدابێت. من پەرداخە بیرەکەمم هەڵدا و گووتم « لە زیندانی ئاساییەوە بۆ گوناهبارانی ئاسایی، تا زیندانی نهێنی و تایبەت بۆ دوژمنان. خۆت یەکێکیان هەڵبژێرە». دەمزانی لیڤیتانت شوناسی زیندانییەکانی بۆ گرنگ نییە، هیچ کات بۆی گرنگ

نەبووە ئەو کەسەی ئەشکەنجەی دەدا چۆن بیردەکاتەوە، سەر بە چ مەزهەبێکە، بەڵام گرنگ بوو بەلایەوە بێتە بەر دەستی ئەو و سنوورەکانی ئیرادەی بپێوێت. من بەر لەوەی چاوەڕوانی وەڵامی بکەم، سەری سەرسامیم بۆ چلچرا گەورەکان و فوارەکانی تیشک بەرزکردەوە، کە لە پرۆژێکتەری گەورەوە لە خوارەوە بەرەو سەرەوە دادەبەزین و ل ەسەرەوە بەرەو خوار سەمایاندەکرد، گووتم «پیرۆزە، هەڤاڵ پیرۆزە. تۆ باش دەزانیت چۆن دەرگای ڕۆژێکی تازە لە کەسانی دڵتەنگ و نەزانی وەک ئێمە بکەیتەوە». بە سەیرکردنیدا، بە وەستانیدا، بە نیگاکردنیدا، بە قسەکردنیدا، بە دەست جوڵاندنیدا دیاربوو سوودێکی گەورەی لە وانەکانی باهیری بینیوە، بێئەوەی جەوهەری مۆن و تاریکی خۆی بدۆڕێنێت. گووتی « وەک دەبینی من دەمەوێت بە جۆرێکی تر بژیم». چاوانی دڵنیایی تێدابوو، بەڵام چاو هەموو شتێک نییە، دەنگی ئاوازێکی تێدابوو من ناوم دەنا نەغمەی گومان. دڵنیابووم لە خوێنیدا هێشتا ئەو پشکۆیە دەژی و خامۆش نەبووە و خامۆشیش نابێت، ئەو کەسێک بوو زیرەکانە دەیویست خۆی ونبکات، منیش کەسێک بووم ئیشم بوو لە پشت دەمامک و وێنە درۆزنەکانەوە، ڕۆحی مرۆڤەکان ببینم. مرۆڤ کەمجار خوو و نەریتە بەدەکانی خۆی وازلێدەهێنێت، مەگەر بۆ خوو و نەریتێکی بەدتر بێت. هیچ شتێک وەک خوێن و خولیای پیس نییە، مرۆڤ دەتوانێت لە دەست گەورەترین هێزی دەرەوەی خۆی هەڵبێت، بەڵام ئەو چنگە ترسناکانەی لە ناوەوە لە ڕۆحی گیردەبن، مەگەر زەلیلی و پیری خەفەیانبکات ... دڵنیابووم ئەوەی لە خوێنەوە دێت، شتگەلێکە باهیری گێل ناتوانێت دەستکاریبکات. من پێویستم بەو بەشە سروشتییەی لیڤیاتانت بوو، پێویستم بەودیوەی بوو کە من لە دارستانەکانی پاییزدا لە خۆمدا دۆزیمەوە، بەدیوە سروشتییەکەی کە هیچ هێزێک و شارستانییەتێک دەستەمۆی ناکات. من لە ناو گەڵاکانی ئەم پاییزەدا، ئاژەڵە درەکەی دەرونی خۆم لە خەو هەستاندبوو، خەونی گەورەم پێبەخشیبوو، ئاواتی پیرۆزم دابووە دەست، خەیاڵم خستبووە کەللەی. ئێستا دەمویست لیڤیاتانت خۆی لەم باقوبریقە ڕووکەشانەدا نەخنکێنێت، گەر دەیەوێت

دەمامکێکی بێت گرفت نییە، بەڵام دەمزانی لە دڵەوە دەیەوێت زیندانێکی گەورەی هەبێت، منیش ئەوەم خستە بەر دەست و بەجێمهێشت. کە دوورکەوتەوە دڵنیابووم تووشی وەسواس و دوودڵییەکی قووڵم کردوە، دڵنیابووم خوێنێ دەجۆشێت بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە و پرسیاری زیاترم لێبکات، بەڵام ئەو ویقارە شەیتانییەی دابووی بە خۆی، ڕێگری لێدەکرد.

ئەو شەوی ئاهەنگە، من دەموچاوی ئەو دونیا تازەیەم بینی کە وردە وردە دروستدەبوو. شتێک ئەو دەموچاوەی پتر بۆ ڕوونکردمەوە، دوو داوای خانمی ماردینی بوو لە من. لە کۆتایی شەودا کە میوانەکان هێدی هێدی دەستیانکردە ماڵاوایی، ماردینی هێشتا لەو پەڕی عیشوە و جوانی خۆیدا بوو، قژێکی ڕەشی لوولکراوی بەسەر شانیدا بەردابووەوە و ڕاست و چەپ خەندەی خانمە ئەرستۆکراتێکی تازەی بەسەر میوانەکاندا بەشدەکرد . دوای ماڵاوایی لە تۆپەڵێک ژن و پیاو، وەک لە سەرەتای شەوەوە نیازی بووبێت بێتە کن من، وەک یەکێک دواجار کارێکی گرنگ بگەیێنێتە کۆتایی، کەمێک چەمکی کراسەکەی هەڵگرتەوە نەکەوێتە بەرپێی و بەرەو لام هات. من هێندەم بیرە خواردبووەوە، پێستی سەرم وەک قوونی مەیمون سوور هەڵگەڕابوو، چاوانم وردە وردە بە کاریگەریی تیشکەکان دەسووتانەوە. هاتنەکەیم بە لوتفێکی جوان لەقەڵەمدا و نیوە مەست، گووتم «سوپاس، غەمی منت نەبێت، من لەوانەم حەزم لەوەیە بە تەنها دانیشم و لە شتەکان وردبمەوە، ئەوە وەزیفەی منە» ... بەڵام ئەو گووتی «جەنابی عەقید دەبێت من سوپاستبکەم کە هاتی بۆ ئاهەنگەکە. ڕاستییەکەی دوو کارم بە تۆیە، دوو کاری گرنگ. گەر کاتت هەبێت کەمێک لات دادەنیشم و دەمەوێت تۆزێک گوێم لێ بگریت». نەغەدە گەرچی منی خۆش نەدەویست، گەرچی زۆر بە زمانی سەرزەنشت و گازەندە لەگەڵم دەدوا، بەڵام ڕەفتاری بەرامبەرم هەمیشە شتێکی تایبەتی تێدا بوو، وایدەکرد حەز بە قسەی بکەم. فەرمووم لێکرد و گووتم « من میوانی ئێوەم و تەکلیف هەمووی بەدەستی ئێوەیە». تۆزێک جلەکانی کۆکردەوە و خرمەیەکی نەرم لە خشڵەکانییەوە هات و بە هێمنی قاچی خستە سەر قاچی و

گووتی «جەنگیز، گوێم بۆ بگرە، ئەو شتەی بۆت دەڵێم تەنیا دەتوانم بۆ تۆی بڵێم. خۆت دەزانیت من کچێکی کوێرم هەیە، ئاسمان. دەزانیت من هیچ کات دایکێکی باش نەبووم، ناشتوانم دایکێکی باش بم، هێزی بەخێوکردنی منداڵم نییە، عاتیفەی دایکایەتیم تێدا نییە، ناتوانم هیچ منداڵێک بگرمە باوەش و بیلاوێنم... ئەوە باش دەزانیت. تکایە حەوسەڵەی ئەوەشم نییە کەس لەو ڕووەوە ئامۆژگاریمبکات. خۆم هەموو شتێک دەزانم، دەزانم دایکی باش وانییە، دەزانم ژن نابێت وابێت، دەزانم منداڵ دەبێت پێش هەموو شتێک بێت و تادوایی لەمجۆرە قسانە. وای خودایە هێندە ئەو قسانەیان بۆ کردوم ئێستا قێزم لە هەمووی دێتەوە. هەموو ئەو شتانە لە توانا و حەوسەڵەی مندا نییە. ئێستا منداڵەکەم شەش ساڵانە، کوێرە. من لەسەر زگ بووم تۆ هاتیتە لام و دڵنیام هەموو شتێکت لە بیرە. کچەکەم نابینایە، ناتوانێت هیچ فێربێت، بەزەحمەت قسەدەکات. چەند ساڵە پارە دەدەمە خێزانێک بۆم بەخێوبکەن. من خۆشم لە بینینی نایەت، کە دەیبینم ڕقم لە خۆم و لە دونیا دەبێتەوە. لە ڕاستیدا نامەوێت ئیدی کەس بزانێت من منداڵم هەیە، منداڵەکەم وردە وردە بیرچۆتەوە، هەتا لای ناسیاو و هاوڕێ نزیکەکانم گووتوومە مردووە. دیارە ناتوانم تا ئەو پلەیە دایکێکی خراپ بم بیکوژم. خۆت دەزانیت. بەڵام کچەکە لای من مردووە، خۆی بۆ ئەوە دروستمکرد بۆ ئەوەی دواتر بیکوژم... کوشتنی قەتڵ نا، کوشتن بەوەی فەرامۆشیبکەم و نەهێڵم ڕێگای ژیانم بگۆڕێت. تێمدەگەیت. تاوان هەیە مرۆڤ بە ڕاستی دەیکات، بەڵام پێیوایە هەرگیز نەیکردوە، تاوانیش هەیە بە خەیاڵ دەیکات و کەچی وادەزانێت بەڕاستی کردوێتی. من کچەکەمم کوشتوە، عومەریش کوشتوێتی، تێدەگەیت دەڵێم چی؟ هەڵبەت ڕوونکردنەوەی ئاسان نییە، بەڵام من و عومەر بڕیارمانداوە نەهێڵین هیچ خۆشەویستییەک ژیانمان لێ تێکبدات. لە بەر ئەوە کچەکەمان لە دڵماندا کوشتووە. ئینسان زۆرجار ناچارە نزیکترین کەسانی خۆی بکوژێت بۆ ئەوەی خۆی بناسێت، جەنگیز خۆت ئەوە لە من باشتر دەزانیت، هیوادارم تۆش بە چاوێکی واقعی سەیرمبکەیت... هیوادارم. مرۆڤ دەبێت بزانێت توانای تا کوێ دەڕوات...

دەزانم هەموو دەڵێن دایکایەتی موقەدەسە و هەزار قسەی تری لەو جۆرە. ئەی ئەگەر من کەسێک بووم ویستم خۆم تاقیبکەمەوە، ویستم بزانم تا کوێ دەتوانم هێزی خۆم ڕابکێشم، ئەوسا چی؟ دەزانم وەک کۆنە شۆڕشگێڕێک کە پێکەوە لە شانە سەرەتاییەکانی شۆڕشدا کارمانکردوە، تۆ یەکجۆر یاخیبوون دەناسیت، بەڵام جەنابی عەقید، من بە جۆرێکی تر دەیبینم. وای ئێستا حەوسەڵەی ئەوەم نییە هیچت پێبڵێم، شەوێکی خۆش بوو، لایەنی کەم من بەشی ئەوە ماندووبووم تا سبەی ئێوارە بخەوم. ئا کاک جەنگیز. من ئەو کچە کوێرەم هەیە، بەڵام هەستی دایکایەتیم نییە، ئێستا ناتوانم کەس ڕاسپێرم بۆم بەخێوبکات، خۆت دەزانیت ئەمانەی ئەمشەو بینیتن هەمووی دۆستی منن، بەڵام متمانەی تەواوم بە کەس نییە، خۆت بینیتن، هەموو دۆستی نزیکن، بەڵام کەسیانماڵی متمانە نین... کەسێک من و عومەر متمانەی تەواومان پێبێت تۆیت. عومەر زۆر متمانەی پێتە. دەزانیت ئەوە نهێنییەکی گەورەی من و ئەوە، کچێکی کوێرمان هەیە کە ناتوانین بیبینین، ماچیبکەین، بیگرینە باوەش، بیخەینە بەرچاوی میوان، لەگەڵ خۆمان بیگێڕین... نە لەبەرئەوەی شەرمدەکەین، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو مەخلوقە بەستەزمانە لەگەڵ ئەم ژیانەی من و لیڤیتانتدا ناگونجێت». کە قسەیدەکرد کەمجار سەیریدەکردم، سەیرنەکردنی بۆ ئەوەبوو دەریبخات ئەو قسانە بەشێکن لە دیالۆگێکی زۆر تایبەتی لەگەڵ من، بەشێکیشن لە قسەکردنێکی قووڵ و دوور و درێژ لەگەڵ ڕۆحی خۆیدا. بە دڵسۆزی کەسێکەوە دەیەوێت بەو پەڕی دڵسۆزی خۆی بخاتە خزمەتەوە، گووتم «خانم سەرم لە ڕێگەتانە، هەر ئێستا لیڤیتانت لەگەڵم بوو، خۆی هیچی نەگووت. بەڵام شتێک کاری تۆ بێت و بە من بکرێت درێغی ناکەم». دەمزانی هەر کات نەغەدە و هۆمەر بۆتانی شتێک بە من بڵێن ئەوە لە دۆخێکدان ناتوانن بۆ کەسی تری ئاشکرابکەن. هەردووکیان بە جۆرێک لەجۆرەکان دڵنیابوون من مێژووی ژیانیان دەزانم، نهێنییە تایبەتییەکانیان دەزانم، هەتا وردەکارییە کوشندەکانی زیندەگیان لەلام هەڵگیراوە. خانم بە هێمنییەوە بەردەوام بوو «خۆت دەزانیت منداڵێکی وەها لە ماڵی مندا تەنیا تووشی بەدبەختی

دەبێت، ئەو خێزانەی ڕامسپاردبوو بەخێوییکەن دەیانەوێت سەفەریکەن، هەموو تەماحێکم خستنەبەر کچەکە لەگەڵ خۆیان بەرن، بەڵام پیاوەکە قەبوولی نییە، دەڵێت کچی خۆمان نییە و بە هۆی ئەوەوە ئێمەش ناگەینە ئەورووپا. ئێستا ناتوانم وا ئاسان سەرپەرشتێک بۆ کچەکە بدۆزمەوە. نامەوێت کەس بزانێت ئێمە کچێکی وامان هەیە، ئەوەی لێماندەپرسێت دەڵێین کچمان نییە. لە ڕاستیدا ئەو مەخلوقە بەدبەختە بۆ من وەک مردوو وەهایە. هەموو بەیانییەک کە لە خەو هەڵدەستم لە ناخی خۆمدا دەیکوژمەوە. بۆ ئەوەی بتوانم بژیم، دەبێت بەردەوام بیکوژم. جەنابی عەقید، ئاە ڕاستییەکەی من ئەم نازناوە تازەیەتم پێخۆشە، دەبێت بە جۆرێک لە جۆرەکان لەگەڵ شتە تازەکاندا ڕابێین. بەڵێ هاوڕێم، جەنابی عەقید ... تکامە کۆمەکمبکەیت، تا سەرپەرشتێک بۆ کچەکەم بدۆزمەوە. تەنیا شت بۆ من گرنگ بێت، ئەوەیە کچەکە دوور لە ئێمە، ژیانێکی خۆی هەبێت، بخوات، بنوێت، و بێ خزمەت نەبێت. من لەگەڵ هۆمەر ڕێکەوتووم کە دڵڕەقبین، ئەوە لە هەموو شتێکی تر لامان گرنگترە، من و عومەر دوو مرۆڤی عاتیفی نین، کچەکە نابێت بزانێت دایک و باوکی هەیە، لەبەر خۆی ... تەنیا لەبەر خۆی. تا ئەوکاتەی نازانێت دایک و باوکی هەیە ئازاری نابێت، بەڵام ڕۆژێک زانی دایک و باوکی هەیە، ئەوسا ئێمە وەک گوناهبار دەردەکەوین. ئێستا تاکە گوناهێک بیکەین دەرهەق بە خۆمانە. من حەزم لەو گوناهانەیە، هەر مرۆڤەی حەزی لەجۆرە گوناهێکە. منیش حەزم لەوەیە ئەم منداڵە لەخۆم دووربخەمەوە، با هەر نەزانێت کچی کێیە، با هیچ کات نەزانێت دایک و باوکی کێن، با ژیانێکی تر بژی ... با نەزانێت کە دەکرا ژیانێکی تری هەبێت، هەست بەوە نەکات کە دەکرا بە جۆرێکی باشتر بژی، ئینسان تا ئەو ساتەی نازانێت دەکرا بە جۆرێکی تریش بژی، بەرگەی هەموو دەردێک دەگرێت، بەرگەی هەموو تاوانێک و سزایەکیش دەگرێت. جەنابی عەقید تۆ تاکە کەسی بکرێت یارمەتیم بدەیت، دەزانم دواجار نهێنییەکان دێنەوە لای تۆ، هەموو نهێنییەکان، بۆیە لە سەرەتاوە نهێنی گەورەی ژیانی خۆم دەدەمە دەست تۆ بۆم هەڵبگریت». دوا قسەی بۆ من هەم کوشندە و هەم مایەی خۆشی بوو...

کوشندەبوو چونکە من دەبووم بە عەمبارێکی تاریک و ترسناک و گەورەی نهێنییەکان، مایەی خۆشبەختیش چونکە دەمزانی من ئیتر تاکە کەسم دەزانم لەسەر لەش و لە ناو ڕۆح و لە خەیاڵی ئەم شارەدا چی دەگوزەرێت. لەو شەوەوە هەستمکرد چ ترسناکە ئیتر هەموو نهێنییەک دەزانم. بە خانمم گووت «نەغەدە خانی ئازیز، پێمبڵێ کچەکەت ئێستا لە کوێیە و ئیتر کارت نەبێت پێوەی». لە ڕاستیدا لەو ساتەدا شتێک لە خەیاڵمدا نەبوو. نەمدەزانی منداڵێکی کوێر بەرم بۆ کوێ، بەڵام دواجار لەو باوەڕەدا بووم کە جێگایەک هەر پەیدا دەکەم. خانم بەوردی ناونیشانێکی لەسەر کاغەزێک بۆ نوسیم و بێئەوەی بهێڵێت لەوێدا بیبینم یان بیخوێنمەوە قەدیکرد و هەر بەدەستی خۆی خستییە گیرفانی کراسەکەمەوە. داوای دووەمی خانم گەرچی لای خۆی ئاسانتر بوو، بەڵام بۆ من سەختتر کەوتەوە. ماردینی گووتی «ماوەیەکی درێژە هیچ شتێک دەربارەی بولبولیار نازانم. نازانم ئەو کوڕە کەوتۆتە کوێوە... تکایە ... بەڵکو سۆراغێکی بکەیت و گەر کرا پێی بڵێ سەرێک لە هاوڕێ کۆنەکەی خۆی بدات». خۆم لەو کاتەوەی لەگەڵ وەفائیلی فریشتەدا جێمهێشتن نەمدیبوو، نزیکی دوو مانگ بوو کاتێک خولیای کوشتنی فریشتەکەم کەوتە سەرم، سەر عەرد و بن عەردی بۆ دەگەڕام ... بەڵام هیچ ئاسەوارێکیان نەبوو. بە خانمم گووت، من خۆم لە بەر کارێکی تایبەت و گرنگ بۆ هۆشەنگی بولبولیار دەگەڕێم، پێشمگووت دەمێک بولبولیار خۆی بشارێتەوە دۆزینەوەی ئاسان نییە، بەڵام من هیچ شتێک لە هۆکانی دیارنەمان و ونبوونی نازانم و دڵنیابێت بەردەوام بۆی دەگەڕێم.

لە ڕۆژانی دواتردا من کچە نابیناکەی لیڤیتانت و خانمم بە جۆرێکی نهێنی گواستەوە بۆ ماڵی یەکێک لە ناسیاوەکانی خۆم. دەبوو لە سۆراغی پەیداکردنی ڕێگایەکی باشدا بم بۆ ونکردن و شاردنەوەی. بە وەزیفەی خۆمم دەزانی ئەو خزمەتە بە خانم و مێردی بکەم، چونکە مەیلێکی ناوەکی قووڵ بەرەو ئەوان ڕایدەکێشام. هەستمدەکرد دەبوو منیش ژیانێکی وا هەڵبژێرم، من بەو بێ ژنی و تەنهاییە قووڵەمەوە هەم شوێنی

گومان بووم، هەم خۆشم بەردەوام هەستمدەکرد شتگەلێکی زۆر لە ژیانمدا کەمن و لەزەتی تەواوی زیندەگیم لەدەستچووە. بەڵام خواستی تەنهایی، خواستنی پاراستنی فاسیلەیەکی گەورە لە هەموو کەسێک بەردەوام لە خەیاڵی دروستکردنی خێزان دووری دەخستمەوە. ژن لای من مەخلوقێک بوو عاشقت نەدەبوو، بەڵکو بەناوی عەشقەوە دەیویست تا بن و بناوانی رۆحت بڕوات. لەو ڕووەوە نەغەدە و لیڤیتانت بۆ من ژن و مێردێکی نمونەیی بوون، ئەوان نمایشی ژن و مێردایەتی نەبێت هیچ شتێک بەیەکەوە نەیدەبەستنەوە. هەستمدەکرد ڕقیان لە منداڵەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی نایانەوێت شتێکی بەهێز لە نێوانیاندا هەبێت، هەردووکیان دوو دونیای جیاواز دەژیان، هەردووکیان دوو ڕۆح، دوو جەستەی بەیەک نامۆبوون کە کەسیان ئامادەنەبوون لە خۆیان بۆ ئەویتر بێتەدەرێ، لەوەش گرنگتر کەسیان ئامادەنەبوون داوا لەویتریان بکات بێتە دەرێ. دوو دونیای تەریببوون هیچ کات نە شەڕ نە نمایشی پێکەوە گونجان و نەگونجانیان نەدەکرد، من بە عەقڵ و خەیاڵی ئەو سەردەمەشم وام دادەنا جوانترین ژن و مێرد ئەوانەن کە ناچنە شەڕی گونجان و نەگونجانەوە. کە بیرمدەکردەوە، دەمزانی چ جورئەتێکی بێوێنە و چاو قایمییەکی بێسنوور لە پشت ئەم هاوسەرێتییەوە هەیە، دوو کەسن کە ئامادەن تا ئەوسەری ئەوسەر ژینیان لە هەموو ئەو یاسایانە پاکبکەنەوە کە هەموو خێزانەکانی ئەم شارەی کوشتووە. نزیکی، پێکەوەگونجان، خۆشەویستی، لە یەکدی تێگەیشتن، منداڵ... ئەوە ئەو وشە باوانە بوو کە دەکەوتنە دەرەوەی ژیانی ئەوان. هەردووکیان لە ئەزموونی خۆیانەوە گەیشتبوونە ئەوەی مرۆڤ هەرگیز ناگاتە ئەوەی مرۆڤێکی تر بدۆزێتەوە نزیکی بێت، نەغەدە لە سەفەرە کورتەکەی خۆیدا بە ناو شۆڕشدا، وەک دەیگووت، تێگەیشتبوو پیاوان چ بوونەوەرێکی مەحاڵن. تێگەیشتبوو ژن هیچ کات ناتوانێت لەگەڵ پیاو، بەشێوەی پیاو، بە لۆژیکی پیاو یاخیببێت و شۆڕشبکات، یاخیبوونی دەبێت شتێکی تایبەتی خۆی بێت. بێباکی لیڤیتانت بەرامبەری، ئەوەی کە ژنەکەی بە گرنگترین شتی ژیانی نەدەزانی، ئەو ڕووبەرە گەورەیەی بۆ دروستکرد نامۆبوونی خۆی و تەنهایی خۆی و

ئازادی خۆی بە جۆرێکی هارمۆنی تێکەڵاو بکات کە ئەو دەم بۆ من هەم جوان و هەم زۆر دەگمەن بوو. ئەوەی دوو کەس بەیەکجار و بۆ هەتاهەتایە پێکەوە بگونجێن، یەکدیان خۆشبوێت، لە یەکتر تێبگەن و پردێکی بەهێزی هەمیشەیی لە نێوانیاندا هەبێت، کاری نەکردەیە. ئەو دوو هاوسەرە، هەر لە سەرەتاوە ئەو دڵڕەقییە قووڵەی ژیان بە جۆرێک چووبووە خوێنیان، بە نهێنی، بە بێدەنگ، بە بێبەزەیی لە یەکدی نزیکیکردبوونەوە، بە جۆرێک بتوانن بێئەوەی هیچ کات یەکیان خۆشبووێت پێکەوە بژین. جوانترین ژن و مێردیش لای من ئەوانەبوون کە نایانەوێت لە یەکتر بچن... بەرگەی ساردی و نەگونجان و دووری یەکتر دەگرن، تەنها ئەوەشیان بەسە ماڵێک کۆیاندەکاتەوە، ئەوەی لایان گرنگە خودی ماڵەکەیە، خودی دیوارەکانە، خودی نمایشەیەکەیە. هاوسەرێتی هیچ نییە جگە لە نمایشێکی گەورە، بەڵام کەم ژن و مێرد لەوە تێدەگەن کە ژیانیان شانۆگەرییەکی گەورەیە. ئەوانەی تێدەگەن باشترین ژن و مێردی دونیان، باشترین ژن و مێردیش باشترین ئەکتەری سەر زەوین. دەبێت بڵێم، من وەک پیاوێک کە هیچ کات عاشق نەبووم، هەمیشە بۆ ژنێکی واگەڕاوم، ژنێک تێبگات کە هاوسەرگیری لە یەکەم ڕۆژەوە تا مردن نمایشە ... ژنێک لەگەڵمدا بێت، بەڵام منی بە ئەندازەی شتەکان بۆ گرنگ نەبێت، منی بە ئەندازەی قەنەفە و کانتۆر و چلچراکان بۆ گرنگ نەبێت، منی بە ئەندازەی خۆی بۆ گرنگ نەبێت، بۆ ئەوەی منیش ئەوم بە ئەندازەی شتەکانم و خۆم بۆ گرنگ نەبێت، بۆ ئەوەی ئەو لەوێ بێت و من لێرەبم... تەنیا بەو جۆرەش ژیان و تاریکییەکانی تەحەمولدەکرێن. نا مەرج نییە ئەمجۆرە ژن و مێردە خیانەت لە یەکتر بکەن، هەر یەکەیان بڕوات و لە پشتەوە کەسێکی دی بۆ سێکس یان تێرکردنی ڕۆحی خۆی بدۆزێتەوە، ئەوە وڕێنەی گەمژەکانە کە وا بیردەکەنەوە، باشترین ئەکتەر ئەوەیە بە دڵسۆزییەکی بێوێنەوە ڕۆڵەکەی خۆی یاریدەکات، واتە دەمێک لەسەر سەحنەش دێتە خوارێ و لە هۆڵی شانۆش دووردەکەوێتەوە نابێتەوە بە خۆی، نابێتەوە بە شتێکی جیاواز لەو بوونەوەرەی لەسەر شانۆ نمایشیکردوە. زۆربەی ژن و مێردە ناعاشقەکان لەو جۆرە باشەی

ئەکتەرن، لەو چەشنە بلیمەتەن کە خۆشیان هەست بەوە ناکەن کە لە نمایشدان، ئەوجۆرە خەیاڵانە کە پێیوایە هەر کات ژن و پیاو یەکتریان خۆشنەویست، ئیتر دەرپێکانیان بۆ هەر کەسێکی تر دادەکەنن درۆیەکی گەورەیە، من وەک پیاوێکی ئاسایش کە قووڵ لە چڵپاو و زەلکاوی شارەکەدا مەلەمکردوە، ورد و درشت لەسەر نافەک و دەرپێی هەمووتان دەزانم واتان پێدەڵێم، ئەوە تەنیا وڕێنەی ئەو دەرونە نەخۆشانەیە کە پلەیەکی خودایی باڵایان بە عەشق بەخشیوە. بە پێچەوانەوە، ئەم جۆرە ژن و پیاوانە کە سێکسیان لە عەشقی رۆحی جیاکردۆتەوە، دەتوانن جوانتر سێکسبکەن، میکانیکیانە و بێ هیچ مەرج و بەند و بگرەیەکی دەرونی لەزەت لەیەکتر ببەن. من خیانەتکاری گەورەم تەنیا لە ڕیزی عاشقە گەورەکاندا بینیوە.

ئەو ساتەی کە لە سالۆنە گەورەکەی ماڵی لیڤیتانتدا سەرسام سەیری ئەو دیکۆرە قەشەنگ و دونیا ڕۆشن و ڕازاوەیەم دەکرد، دڵنیابووم ماڵێکی وا جوان بە ژن و مێردێکی عاشق دروست ناکرێت، بە ژن و مێردێک دروست ناکرێت یەکدییان خۆشبوێت، بەڵکو بەو ژن و مێردانە دروستدەکرێت کە شتەکانیان لە یەکتر خۆشتر دەوێت، ماڵەکەیان خۆشتردەوێت، خۆیانیان تاسەر ئێسقان خۆشتردەوێت. لە عەشقدا «کە دەبێت ڕاستی بڵێم و لێم نەکەن بە تیر و توانج، من شتێکی زۆری لێنازانم» مرۆڤ کاتی بەدەستەوە نامێنێت بۆ خۆشەویستی شتەکان، تەنیا سەرقاڵی ئەوە دەبێت بپرسێت ئایا ئەوی بەرامبەرم وەکو من عاشقە؟ ئاخۆ ئەمڕۆ وەک دوێنێ خۆشیدەوێم؟ ئاخۆ گەر بمرم دوای من عاشق دەبێتەوە؟ ئایا درۆم لەگەڵ ناکات؟. ئاه .. ئیتر هەزار بەند و باوی وا پوچ. من دڵنیابووم نەغەدە و لیڤیتانت خۆیان لە نەخۆشی ئەڤین پاککردۆتەوە، من دەمزانی بەشی هەرە زۆری ژن و مێردی ئەم شارە عاشقی یەک نین، بەڵام لە دەردی عەشق پاک نەبوونەتەوە، هەر لە سەر وەسواسەکانی دەژین، هەر بۆی دەگەڕێن، هەر داوایدەکەن. ئەوەی لە نەغەدە و لیڤیتانتدا گرنگ بوو، پێشەنگی ئەو ژن و مێردانە بوون کە تا دێت ژمارەیان زۆرتر دەبێت،

پێشەنگی ئەو ئادەمیزادانەی خۆیان لە بەڵای ترسناکی خۆشەویستی پاککردۆتەوە. ئەو ڕۆژەی لە جێبێکی حیزبدا منداڵە نابیناکەی ئەوانم سەرخست و لەگەڵ خۆمدا بردم، دەمزانی خزمەت بە سەردەمێکی تازەدەکەم ... من لەبەردەم خۆمدا خودای سەردەمێکی نوێ بووم، سەردەمێک کە دەبوو بە هەموو ڕێگایەک کارئاسانی بکەم لەدایک بێت. مامانی ئەو عەسرە تازەیە من بووم، لە بەرئەوە دەبوو دەستم بە هەموو جۆرە چاکە و خراپەیەک پیس بێت.

## سەلیم ئەسفەر بیردەکاتەوە

کە سەلام باباجان ڕۆیشت، مامۆستا سەلیم ئەسفەر ماوەیەکی درێژ لەسەر کورسییەکەی خۆی لە ناوەڕاستی کتێبی هەڵدراوە و ڕۆژنامەی هەڵپژاو و شمەکی پەرت و بڵاودا دانیشت و کەوتە جگەرەکێشان و بیرکردنەوە. ئەو دوو ڕۆژ بوو خەبەری لە گرتنی لیوا جەنگیز هەبوو، دواجار لە پرسەکەی سەعید یۆناندا بینی بووی. خۆی یەکێک بوو لە ئەندامە چالاکەکانی جەمعییەتی ژیانە ونەکان، کوشتنی سەعید یۆنان بەر لە هەفتەیەک، تەواو کاروباری جەمعییەتەکەی وەستان، سەعید هاوڕێی نزیکی مامۆستا ئەسفەر بوو، لەو چەند ساڵەی دواییدا پێکەوە لەسەر نوسینەوەی ژیانە ونەکان کاریانکردبوو. جەمعییەتەکە خۆی نهێنی بوو، لیوا خۆی لە ژێرەوە کارەکانی ڕێکدەخست. کەسانێکی زۆر لە دەوڵەتدا، لە حیزبدا، لە شوێنە گرنگەکانی کۆمەڵگادا، هەموو پێکرا ئەو خواستە ترسناکەیان تێدا دروستبووبوو کە پێویستیان بە ژیانێکی تر هەیە، ژیانێکی مەحاڵ، زیندەگییەک کە هیچ کات لە واقعدا دروست ناکرێتەوە، هەموو پێکرا بۆ چیرۆکێکی تر دەگەڕان، بۆ هەوڵێکی ئەفسانەیی زەمەن بگێڕنەوە بۆ دواوە و لە خۆیان و لە ژیانیان شتێکی نوێ دروستبکەن، هەوڵێک کە تەنیا لە چیرۆکدا و بە چیرۆک دەکرێت. بە جۆرێک مامۆستا ئەسفەر گەیشتبووە

بڕوایەک کە چیرۆک گەورەترین ئەلتەرناتیڤی شۆڕشە. مەترسییەکەشی لەوەوە دێت کە لەوانەیە ڕۆژێک وەرگەڕێت و بە شۆڕشی ڕاستەقینە بشکێتەوە ... واتە لە چیرۆکەوە ببێت بە حەقیقەت، بەوەش کارەساتی گەورە دەخولقێت. ماوەیەک بوو تەواو لە نوسینەکانیدا دەگەیشتە بڕوایەکی ترسناک کە دەبێت هەموو پردێک لە نێوان چیرۆک و ڕاستیدا بپچڕین. وادەهاتە پێشچاوی کە هەموو کارەساتە گەورەکان سەرەتا لە چیرۆکەوە دەستیان پێکردوە. خوداکان سەرەتا چیرۆک بوون، بوون بە دین، بوون بە حەقیقەت، بوون بە کارەسات. یۆتۆپیاکان سەرەتا چیرۆک بوون، بوون بە فەلسەفە، بوون بە ئایدۆلۆژیا، بوون بە حەقیقەت، بوون بە هێز، بوون بە کارەسات. پێشکەوتن سەرەتا چیرۆکێکە، دەبێتە تیورە، دەبێتە زانست، دەبێتە حەقیقەت، دەبێتە کارەسات. بەڵام چۆن دەکرێت پەیوەندی نێوان چیرۆک و حەقیقەت بپچڕێنین. جەمعییەتی ژیانە ونەکان کارێکی لەو جۆرەی دەکرد، هەموو کەس دەیویست دیوە فەنتازییەکەی خۆی بدۆزێتەوە. گرنگی ئیشەکەش لەوەدا بوو کە خەڵک دەبوو تێبگەن، حەقیقەت ڕووی ترسناکی دونیایە... ئەوە ئەو ڕۆحە نهێنییە بوو کە جەمعییەتی ژیانە ونەکانی دەبزواند و وایدەکرد ڕێکخراوێکی ترسناک بێت، دەوڵەت کە خۆی بە پارێزەر و دروستکەر و ستایشکەری حەقیقەت دەزانی، لێی بترسێت. بەڵام لای مامۆستا ئەسغەر حەقیقەت ئەو ساتە بوو، کە چیرۆکی تیا دەمرێت. دەبوو چیرۆک بمرێت تا حەقیقەت بژی... ئەوەش تووشی ترس و دڵەڕاوکێی کردبوو..

لەو دوو ساڵەدا کە بوو بە بەشێک لەو جەمعییەتە، سەرسامبوو لەوەی ئەو هەموو خەڵکە دەبینێت ڕقیان لە ژیانی ڕاستەقینەی خۆیانە، هەموو دەیانەوێت ژیاننامەیەکی دی بۆ خۆیان دروستبکەن. زۆرینەی خەڵک لە قووڵایی ناخیاندا قێزیان لە خۆیان دێتەوە، دەیانەوێت بچنە بەرگی کەسێکی ترەوە کە ژیانێکی تری هەیە، هەموو دەیانەوێت خودی ڕاستەقینەی خۆیان لە بیربەرنەوە و جێنشینێکی نوێی بۆ بدۆزنەوە ... ئەوە هەمان ئەو سەردەمەش بوو کە بۆ یەکەمجار مامۆستا ئەسغەر

هەستیکرد خواستێکی بەهێز هەیە، پێکەوە مرۆڤەکان بەرەو بیرچوونەوە پاڵ پێوەدەنێت. سەرەتا تەفسیری وابوو ئەم دەردی بیرچوونەوەیە گرێدراوی دۆخی کوردە وەک میللەتێکی لاواز و پارچە پارچە کە لە توانایدا نییە یادەوەرییەکی گەورە و یەکگرتووی هەبێت، بیرچوونەوە تەنیا دەرمانێتی بۆ ئەوەی بتوانێت لە ئێستادا بژی، بەڵام دواتر هەستیدەکرد ئەم تەفسیرەی زۆر ڕۆشنفکرانەیە و لەگەڵ تاک تاکی ئەو حاڵەتانەدا ناگونجێت کە دەیانبینێت. دواتر وا تەفسیریکرد کە ئێمە لەم سەردەمەدا بەتوندی کەوتووینە ناو کێشمەکێشی دوو دونیای بەهێزەوە، داهاتوویەک کە بە هەموو توانای خۆی بۆ پێشەوە ڕاماندەکێشێت، لەگەڵ ڕابوردوویەکدا کە بەهیچ جۆرێک ئامادە نییە بمرێت. مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە، بەتایبەت ئەوانەی لە جێگایەکی دوور و دواکەوتوو و داخراوی وەک ئەم شارەدا ژیاون و لە ناکاو چاویان لەسەر دونیای تازە کردۆتەوە، هەموو پێکڕا تووشی ئەو شۆکە ترسناکە بوون کە ژیانیان پێشتر هەمووی پوچ بووە. ئەم سەردەمە نوێیانە وێنەیەکیان بۆ ژیان خولقاندوە، مرۆڤگەلی سەردەم و ژیانەکانی دی هەموو تووشی ئەو ترسە گەورەیە دەکات کە نەژیاون ... لێرەوە شێتانە بۆ چیرۆکێکی نوێ دەگەڕێن، بۆ بەرگێکی تر و دەمامکێکی تر بیکەنە بەری خۆیان.

سەیرترین شت بۆ ئەو ئەوەبوو، کەسێکی وەک لیوا جەنگیز لە پشت هەموو ئەم جەمعییەتەوە بێت، وەها بوو ئەندامە تازەکان بە نهێنی خەڵکانی تریان دەدۆزییەوە، کەسانێکی تر کە ئارەزوویان بوو چیرۆکێکی نوێیان هەبێت، چیرۆکێک بیکەنە ژیانی خۆیان و ڕابوردووی خۆیان لە بیربکەن. هەموو ئیشی ئەو جەمعییەتە ئەوە بوو کەسانێک کۆبکاتەوە کە شۆڕش بەسەر ڕابوردووی خۆیاندا دەکەن، ئەوەی ڕوویداوە لە یادیدەبەنەوە و چیرۆکێکی تر دەخەنە جێگای. دەیان فەرمانبەر کە لە بیرۆکانیان بێزار بوون، دەیان بەرپرس کە هەستیاندەکرد خیانەتیان لە خەونی خۆیان کردوە، ژنانێک دەیانویست ژیانیان بگێڕنەوە و شووبکەن بەو پیاوانەی یەکەمجار عاشقیان بوون، سیاسەتمەدارانێک دەیانویست

تۆزێک لە هەناسە و ڕەنگی ئینسانی بدەن بە مێژووی خۆیان، پیاوکوژانێک دەیانویست بگەڕێنەوە دواوە و وا بژین وەک مێژوو خوێنی تێدا نەڕژابێت. هەر هەموو ئەوانە ئەو ژیانە ونەیان بە ژیانی ڕاستەقینەی خۆیان دەزانی، هەر هەموویان وایان دادەنا ئەوەی ڕوویندەداوە زیاتر گوزارشت لە خواستی ئەوان دەکات، ئەوەی نەژیاون و لەدەستیانچووە زیاتر ئاوێنەی ڕۆحی ئەوانە. هەموو کارەکە دیوێکی تراژیدی گەورەی بوو، سەلیم ئەسغەر و چیرۆکنوسەکانی تر سەرەتا کارەکەیان بە ترسناک دەزانی، هەتا هەندێکیان زۆر نابەجێ و خراپیش تەماشایاندەکرد، وەک ئەوەی لە ڕێگای دۆزینەوەی ژیانە ونەکانەوە، مرۆڤەکان خۆیان لە هەموو بەرپرسیارێتییەک بدزنەوە و دوای کۆمەڵێک گوناهی گەورە، دەمامکێکی نوێ بکەنە سەر و بۆ ویژدانێکی دی بگەڕێن کە لاپەڕە ڕەشەکانی تێدا دەرهێنرابێت و دڕێندرابێت.

سەعید گەرچی پیاوێکی ڕەق و ڕوون بوو، بەڵام لە دەرونیدا وەسواسێکی قووڵی هەبوو، وەسواسێک ناوم دەنا وەسواسی باڵندە بزێوەکان کە لەسەر هیچ چڵێک ئارام ناگرن. ڕۆژێک لە نێوان مامۆستا ئەسغەر و سەعید یۆناندا گفتوگۆیەکی قووڵ و تا ئەندازەیەک دڵترسێنیش ڕوویدا، کە بووە مایەی ئەوەی ئەسغەر وەک یۆنان هەمان ئەم ڕێگایە بگرێت و ببێتە چیرۆکنوسێکی جەمعییەتەکەی ئێمە. گفتوگۆیەک سەبارەت بەوەی کامیان ژیانی ڕاستەقینەن، ئەو ژیانەی کە تیا ژیاوین یان ئەو ژیانەی کە هەرگیز تێیدا ناژین، کامیان گوزارشت لە ڕۆحی مرۆڤ دەکەن، کامیان شوناسی ڕاستەقینەی ئێمەن؟. هەردووکیان دوو چیرۆکنوسی گەورەی ڕۆژگاری ئێستامان بوون، سەرەتا مامۆستا ئەسغەر لە گومانکاران بوو، پێیوابوو لەو ڕێگایەوە چیرۆکنوسان دەبن بە خزمەتکاری خەونی کەسانێک کە کاریان تەنیا ڕاکردنە لە خودی خۆیان. بەڵام چ مرۆڤێک هەیە ژیانێکی ونی نەبێت، کێ هەیە هەست ناکات ژیانی ڕاستەقینە، ئەو ژیانەی کە دەبوو ئەو خاوەنی بێت، لە جێگایەکی دی و لای کەسێکی تر نییە؟. سەعید یۆنان بەوە مامۆستای هێنایە سەر ڕێگا، یادیهێنایەوە ئەویش

ژیانێکی ونی خۆی هەیە، پێیداگرت کە جەوهەری بوونی ئێمە وەک مرۆڤ لەو ژیانەدایە کە هەرگیز تیا ناژین، بە دەنگە تایبەتی و ڕوخسارە ڕۆشنفکرانەیەوە گووتی «مرۆڤ هەمیشە بە نیازی دونیایەکی تر لەدایکدەبێت و خۆی لە جێگایەکی دیکەدا دەدۆزێتەوە. ئێمە تەنیا لەو شوێنەدا زیندووین کە نە ژیاوین». لە جێگایەکی قسەکانیدا ئەو بەڵگە فەلسەفی و گرنگەی بۆ هێنایەوە کە دواتر لای ئەسفەر سەرچاوەی زۆرینەی تێڕوانینەکانی بوو، گووتی «هونەری چیرۆکنوسین تا ئێستا لەگەڵ مرۆڤە خەیاڵییەکاندا سەروکاری بووە، بەشی هەرە زۆری چیرۆکنوسەکان تەنیا مرۆڤی خەیاڵیان کردۆتە ئامانجی خۆیان، چیرۆکی کەسانێک بوونیان نییە یان لە ئەگەر و نەگەردا دەژین، واتە ژیانێکیان گێڕاوەتەوە کە ژیانی کەس نییە. لە کاتێکدا چیرۆک دەتوانێت ژیانێکی تر بە هەر یەک لە ئێمە ببەخشێت. هاوڕێم سەلیم، جەوهەری چیرۆک ئەوەیە ئەو ژیانە بدۆزێتەوە کە لەسەر زەوی نەبووە، هیچ کات نەبووە و نابێت، چیرۆک لە سەرەتاوە سەروکاری لەگەڵ مەحاڵدایە، بەڵام ئەو ژیانەی چیرۆک بۆی دەگەڕێت مەرج نییە تەنیا لای پاڵەوانە خەیاڵییەکان بوونی هەبێت، ژیانی هەر یەکەمان دوو دیوە، دیوە ڕاستەقینەکەی هەرگیز ناکرێتە چیرۆک، یان گەر بشکرێت چیرۆکێکی پوچی لێ بەرهەمدێت. بەڵام دیوی ئەودیوی ئەم ژیانە هەمیشە چیرۆکە و هیچ کات نابێتە ژیان. وەزیفەی مێژوو ئەوەیە ئەو ژیانە بگێڕێتەوە کە ناکرێتە چیرۆک، وەزیفەی چیرۆکیش ئەوەیە ئەو مێژووە بگێڕێتەوە کە نابێتە ژیان. با جارێک وەک چیرۆکنوس بگەڕێینەوە سەر ڕیشە ڕاستەقینە و ئەبەدییەکانی پیشەکەمان، وەک هونەرێک کە بیریچۆتەوە سەرچاوەی هەموو حیکایەتێک، ئەو دیوەی ژیانمانە کە هەرگیز تیا ناژین».

ئەو ڕستانە بوون مامۆستا ئەسفەریان والێکرد خولیایەکی نوێی تێدا دروست ببێت و هەر مرۆڤێک وەک کتێبخانەیەکی نهێنی تەماشابکات، کە پڕە لە کتێبی نەنوسراو. جارێک لە یەکێک لە وتارەکانیدا نوسیبووی «هەموو یەکێک لە ئێمە کتێبخانەیەکی گەورەین، کتێبەکانی ناومان بە

قفڵێکی شەیتانی داخراوە، پێویستیمان بە فریشتەیەک هەیە، بێت و ئەو قفڵە بشکێنێت».

سەعید یۆنان بۆ سەلیم ئەسغەر وەک مامۆستایەکی گەورە وابوو، من هەردووکیانم لە پسمامانەوە دەناسی، دوو گرنگترین و غەمگینترین رۆشنفیکری ئەو سەردەمەش بوون. من هەر لە پسمامانەوە گوێم لە سەعید یۆنان بوو دەیگووت «رۆشنبیر چییە، گەر هەمیشە غەمگین نەبێت». ئەو ساڵ کە لیڤیتانت لە شۆرش هەڵگەراپەوە و لە شار پەیوەندی بە داگیرکەرە بەعسییەکانەوە کرد، هەر یەک لە مامۆستا ئەسغەر و سەعید یۆنان لەسەر داوەتی من هاتنە پسمامان تا چاودێری باری زیندانەکە بن و هەندێ بابەتی چیرۆکیش بۆ کارە ئەدەبییەکانی داهاتوویان بدۆزنەوە، ئەو دەم هەردووکیان دوو چیرۆکنوس بوون هەوای واقعییەتی رووت لەسەری دابوون، چیرۆکەکانیان جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ راپۆرتەکان و یاداشتەکانی مندا نەبوو، بگرە نیگای من وەک سیخورێک و توانام لەسەر بینین و پشکنین و وردبوونەوە لە توانای ئەوان گەورەتر بوو. بۆیە هەر لەو سەردەمەوە گومانم بوو چیرۆکنوسە واقعییەکان بە ئەندازەی سیخورێکی باش، پیاوێکی ئاسایشی کارامە کە خەیاڵ و عەقڵی دەخاتە سەر کارەکەی خۆی، چاویان دونیا ببینێت. گەر مەسەلە واقعییەت بووبێت، من هەمیشە لە هەموو چیرۆکنوسەکانی دونیا واقعیتر بووم، ئیشەکەم وەک پیاوی ئاسایش ئەو واقعییەتەی بەسەردا سەپاندبووم، لەبەرئەوە رۆژێک کە زانیم دەبێت لە دونیای ئەم کارە دەرچم، جگە لەوەی بکەومە خیانەتکردن لە واقعییەت چاری دیکەم نەبوو. جەمعییەتی ژیانە ونەکان دەرمانی من بوو تا لە دەردی واقعییەت رزگاربم، باشترین شت بۆ ئەوەی لە خولیای سیخورییکردن و چاودێرییکردنی واقع رزگارتبکات، کە دەردی سەرەکی ژیانی من بوون، ئەوەیە بکەویتە دوای ژیانێک کە بوونی نییە، دوای ئەو بەشەی ژیانی مرۆڤەکان بکەویت کە بیریان لێ نەکردۆتەوە و نایناسن. واهەستدەکەم لەو دەمەدا چیرۆکنوسەکانیش بە هەمان ئاڵوگۆری گەورەدا دەرۆیشتن. من و ئەوان تا

ڕوخانی شۆڕش پێکەوەبووین، لەوانەوە زۆر تەکنیکی چیرۆکنوسین و وردەکاری هونەری گێڕانەوە فێربووم، شتێک دواتر لە نوسینەوەی بەردەوامی یاداشتەکانمدا کۆمەکیکردم ڕوونتر و سافتر گوزارشت لە خۆم بکەم.

سەلیم ئەسفەر ئەو شەوە زۆر بیری لە قسەکانی سەعید یۆنانی هاوڕێی کردەوە، ئێستا شتەکانی بە پێچەوانەوە دەبینی، ئەوەی پێیدەڵێین ژیان هیچ نییە جگە لە دەمامکی بوونێکی تر کە کەسمان نایگەینێ، مرۆڤەکانی سەر ئەم ئەستێرەیە، کەسانی سەر بە هەموو شارستانییەتەکان، هەموو بەشدارن لەو شکستە گەورەیەدا کە ژیانێک ناژین ژیانی خۆیان بێت، هەموو هەوڵێکیشیان بۆ ژیان هەوڵە بۆ نزیکبوونەوە لەو مەحاڵە. لەو ماوەیەدا کە لەگەڵ جەمعییەتی ژیانە ونەکاندا ئیشیکرد، چەندەها کەسی ناسی کە بە جۆش و خرۆشێکی بێوێنەوە ژیانی ڕاستەقینەی خۆیان و ژیانە ونەکەشیان بۆ دەگێڕایەوە، تا دەهات زیاتر هەستی دەکرد کە دیوارێکی ئەستوور لە نێوان مرۆڤ و ژیانی ڕاستەقینەدا هەیە، بەختەوەرەکانیش ئەوانەن کە هەموو شتێک لەیاددەکەن و بە دەمامکەکەیانەوە ئارام دەژین.

سەلیم ئەسفەر دەیزانی ئەم کارە مەترسی خۆی هەیە، مرۆڤەکان کاتێک دەزانن ژیانێکی تر هەیە نەژیاون، لە هەموو شتێک دەکەونە گومانەوە، دەکەونە گومانەوە لە خۆیان، لە ڕابوردوویان، لە کەسانی نزیکیان، لە دەوڵەت، لە ئەخلاق، لە دین. ژیانی دووەم ژیانی ئەو مرۆڤانەیە کە ڕازی نین، ئەوانەی شتێک دژ بە خۆیان، دژ بە دونیا دەیانجوڵێنێت. ئەوەی ئیشەکەی بە ئاقاری مەترسیدا برد ئەوەبوو برێکی زۆری ئەوانەی بە دوای شوناسێکی تردا بۆ خۆیان دەگەڕان و لە ڕابوردوویان هەڵدەهاتن، بەرپرس و وەزیفەدار و دەوڵەمەند و خەڵکانی ئاسایش و کەسانی سلکی سوپابوون. چیرۆکنوسەکان بڕبڕەی پشتی گەمەکە بوون، لەو قەشانە دەچوون کە ئیمانداران لە بەردەمیاندا دان بە گوناهی خۆیاندا دەنێن، هەموو شتێکی ئاشکرا و نهێنی خۆیان بەیاندەکەن، تەنها ئەوانە دەچوونە

جەمعییەتی ژیانە ونەکانەوە کە دەیانویست هەموو ئەوەی کە تیا ژیاون و تیا نەژیاون بۆ چیرۆکنوسەکان بگێڕنەوە. لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا ژمارەی چیرۆکنوسەکانی جەمعییەت زۆر بووبوون، ڕێکخراوەکە بە نهێنییەکی زۆر و سەبرێکی زۆر ئیشی بۆ دروستکردنی ئەرشیفی ژیانە لەدەستچووەکان دەکرد، لەگەڵ کتێبخانەیەکی نهێنیدا کە دەستنوسەکانی جەمعییەتەکە هەڵبگرێت، سەدان چیرۆکی نهێنی، سەدان خەونی نهێنی، سەدان ئارەزووی کوژراو هەموو لەو کتێبانەدا بوون. هەموو شتێک لە جەمعییەتەکەدا دەبوو نهێنی بێت، شوێنەکان نهێنی بوون، وێنەگرتن و دەنگهەڵگرتنەوە لە هەندێ کاتی تایبەتدا نەبووایە زۆر ڕێگای پێ نەدەدرا، زۆربەی کات ئیشەکان لە هەندێ ژێر زەمینی تایبەتیدا دەکران، نوسینی دەست هۆکاری سەرەکی تۆمارکردن بوو، هەر شتێک وەک دەلیل لەسەر خاوەنەکانی حیساب بووایە دەستبەجێ دەسووتێنرا و لە ناودەبرا، ئەوەی هەڵدەگیرا چیرۆکەکان بوو. نەدەبوو هیچ مێردێک بزانێت ژنەکەی خەون بە چ ژیانێکەوە دەبینێت، نەدەبوو هیچ سەرۆکێک بزانێت ژێردەستەکەی چۆن سەیری ژیانی خۆی دەکات. نەدەبوو هیچ سیاسییەک بزانێت هاوڕێکانی بەدەست چ مۆتەکە و ئازارێکەوە دەناڵێنن. ژیانی ون... شتێکە هەمیشە دەبێت بەونبوویی بمێنێتەوە، چونکە هیچ دەرگایەک نییە مرۆڤەکان لێوەی بڕۆنە ناوی، دەرگای کتێب و خەون نەبێت.

سەلیم ئەسفەر لەو چەند ساڵەدا چەند جارێک من ـ لیوا جەنگیزی بینی، لیوا هەوڵیدەدا تا بکرێت زوو زوو چیرۆکنوسان ببینێت، ئەرشیفی ژیانە ونەکان گەورە بکات. جەمعییەتەکە باندێکی ناوەکی زۆر ڕێکخراو بوو، ئیشی ئەمینداریێتی جەمعییەت ناساندنی خاوەنی ژیانە ونەکان بوو بە چیرۆکنوسان. واعیز ڕێکخەری گشتی کاروبارەکان بوو. کتێبخانەی گەورەی جەمعییەتەکە کە تێکستەکانی تێدا ئەرشیف دەکرا تەنیا من ـ لیوا جەنگیز و بولبولیار دەمانزانی، واعیز بەوەدا ڕێکخەری کاروبارەکان بوو، هەندێک لە چیرۆکنوسەکان و خاوەن چیرۆکەکانی دەناسی، بەڵام سیستمی ئیشکردن لە جەمعییەتدا وابوو بواری بە واعیز نەدەدا هەموویان

بناسێت. خاوەنی چیرۆکەکان و چیرۆکنوسەکانیش هەر یەکەیان کۆپیەکی کتێبەکانی خۆیان هەبوو. دوای کوشتنی سەعید یۆنان، ترسێکی گەورە باڵی بەسەر سەلیم ئەسفەردا کێشا، ئەو خۆی لە ناو جەمعییەتەکەدا تەنیا سەعید یۆنان و واعیز و لیوا جەنگیزی دەناسی، دەیزانی ژمارەیەک چیرۆکنوسی تر لە ناو تۆڕەکەدان، بەڵام کێن؟ نەیدەزانی... هیچ کەس تواناى تێڕوانینێکی پانۆرامایی و گشتی بەسەر ڕێکخراوەکەدا نەبوو من ـ لیوا و بولبولیار نەبێت، بەڵام من کارێکم کردبوو بولبولیار هەمیشە دوور بێت و کەس نەیناسێت.

کوشتنی کتوپڕی سەعید یۆنان و گرتنی لیوا جەنگیز و خۆشاردنەوەی تەواوی واعیز، سەلیم ئەسفەریان لە هەموو شت دابڕی. ئێستا لە نابینایەک دەچوو، لە دەوروبەری خۆی تێنەگات. تەنیا سەرچاوەی هەواڵی ئەو سێ کەسە بوون، کاتێک واعیز زەنگی بۆ دا و پێیگووت «کەڵەشێرەکەم بۆ مەکڕە، بیستوومە نەخۆشە» دەمودەست تێگەیشت شتێک لە جێگای خۆیدا نییە، ئەوە ڕەمزی نهێنی نێوانیان بوو، تەنیا کاتێکیش بەکاردەهات گەر زۆر لە مەترسیدا بن و دەبوو هەموو کاروبارێک و پەیوەندییەک بێوەستان و دووڵی بوەستێنن.

مامۆستا ئەسفەر خەیاڵی بۆ خیانەت چوو. بە قسەی لیوا، چەند جارێک ڕوویدابوو کەسانێک هاتبوونە ناو جەمعییەتەکە و چەند قۆناغێکیشیان لە نوسینی هەردوو کتێبی ژیاندا بڕیبوو، بەڵام لە ناکاو پەشیمانبووبوونەوە و داوایانکردبوو هەموو شتێک بسووتێنرێت و لەو گەمە ترسناکە بچنەدەرێ. داوایەک بەر دیواری ئەستووری ڕەتکردنەوەی لیوا کەوتبوو کە کەم تا زۆر خۆی بە ژەنراڵی سەر زەمینی هەموو زیندەگییە ونەکان دەزانی. بەڵام مامۆستا نەیدەزانی کێن ئەو چیرۆکنوسانەی لەگەڵ جەمعییەتەکەدا ئیشدەکەن، گەر سەعید یۆنان بمایە لەوانەبوو بیتوانیبایە زیاتر کۆمەکیبکات، بیزانیایە چەندە ژیانیان لە مەترسیدایە.

مرۆڤ بوونەوەرێکی بەدگومانە، بەڵام کاتێک سەلام باباجان دەرکەوت، سەلیم ئەسفەر گەرچی ڕۆحێکی گومانپەروەر بوو، کەچی زوو باوەڕی بە ڕاستگۆیی ئەم گەنجە کرد. مامۆستا لە ڕۆژی کوشتنی سەعید یۆنانەوە بە ترسەوە دەچووە دەرێ، دوا تەلەفون واعیز بۆی کردبێت، ئەوەبوو هەواڵی گرتنی لیوای پێدا. ئیدی چەندە هەوڵیدا واعیزی دووبارە دەستبکەوێت و هەندێک پرسیاری لێبکات، نە تەلەفونی هەڵگرت و نە ژمارەکەی لە کاردا مابوو. ئێستا گەر ئەم گەنجە دەیەوێت بۆ ڕزگارکردنی لیوا شتێک بکات، بۆ کۆمەکی نەکات؟ تەنیا ئەو و چیرۆکنوسەکان دەزانن لە ساڵانی دواییدا لیوا گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەردا هاتبوو. دیسانەوە بەوەدا ئەو گەنجە دەرکی بەو دەردە ترسناکەش کردوە، بەوەدا دەبینێت شارەکە تووشی نەخۆشی بیرچوونەوە و یادکردنی کتوپڕ بووە، کەواتە کەسێکی وریایە، کەسێکە لە حەسرەتێکی قووڵەوە قسەدەکات و هەڵوێست وەردەگرێت. لەو کاتەوەی سەلام باباجان هاتبوو، مامۆستا ئەسفەر بەردەوام بیری لەوە دەکردەوە کە ئاخۆ دەتوانێت چی بۆ لیوا جەنگیز بکات. هیچ نەبێت کلیلی ئەرشیفی هەموو جەمعییەتەکەیان لای ئەوە، لیوا ئەو کەسەبوو کە کاری چیرۆکنوسینی کرد بە کارێکی پڕ مەترسی، چونکە بە جۆرێک دەستی بۆ قووڵایی تێکستە واقعییەکانی ژیانی خەڵک برد، لەگەڵیشیدا دیوە ترسناک و ڕام نەکراوەکەی نوسین هاتەوەدەرێ. لەگەڵ مردنی ئەودا لەوانەیە ئیشێکی زۆر بە هەدەر بڕوات. نەک هەر ئەوە سەلیم ئەسفەر دڵنیابوو کە گرتنی لیوا پەیوەندی بە کوشتنی سەعید یۆنانی هاوڕێیەوە هەیە، لیوا لەسەر هیچ یەک لەو تاوانانە نەگیراوە کە کردونی، بەڵکو لەسەر ئەو تاوانانە گیراوە کە نەیکردون... ئەوەش وادەکات شایستەی کۆمەک بێت. لیوا تاکە کەسێکە دەتوانێت بکوژانی سەعیدی هاوڕێی ئاشکرابکات.

شەو تەلەفونی بۆ سەلام باباجان کردەوە و پێیگووت «دەبێت یەکتر ببینین». سەلام خۆشحاڵ بوو، ئێستا خۆی بۆ کار و خرۆشانێکی گەورە ئامادەدەکرد کە ئەو ڕۆژنامە مردووەی عەزیزم وەتەن نەیدەتوانی

پێشکەشیبکات. دەیویست شتێک هەبێت ژیانی لەم سستی و ڕۆتینە دەربهێنێت. ڕۆژ دوای ڕۆژ ئیشەکەی گەمژەتری دەکرد، کە دەچووە بیرۆکانی عەزیزم وەتەنەوە، سەیری لێدەهات هەموو ڕۆژنامەنوسەکانی دی ئەو هەستە گەورەیەیان بە غرور و لووتبەرزی ڕۆژنامەنوسان هەبوو ئەم نەبێت. هێدی هێدی وایلێهات بڕوای بەوە هێنا کە غرور لەم سەردەمەدا پابەندی ئەوە نییە تۆ چیت کردوە و چی دەزانیت، بەڵکو پابەندی ئەو جۆرە وەستان و نیگاکردن و خۆگۆڕین و قسەکردنەیە کە خۆتی پێدەردەخەیت. ئەوە سەلام باباجانی زۆر تورەدەکرد، دەیویست بە ڕاستی شتێکبکات لەو بازنەی درۆ و نیفاقە بێتەدەرێ. چەندجار بیری لەوە کردبووەوە واز لە ڕۆژنامەکە بهێنێت، بەڵام جگە لەوە سەرچاوەیەکی گونجاوی ژیانی شک نەدەبرد، بۆیە هەموو بەیانییەک بە ناچاری و زۆر لە خۆیی ڕووی لەسەر ئیش دەکرد، ئەوەشی زۆربەی ڕۆژان بەر لە فەرمانبەران و ڕۆژنامەنوسانی دی دەگەیشتە سەر کار، پەیوەندی بەوەوە بوو دەیویست زوو خۆی لە ژوورەکەی قایمبکات و سڵاوە سەرپێییەکانیش نەکات. ئێستا حەزیدەکرد شتێک بکات پتر خۆی لە هەموو ئەم داو و قاڵب و شێوازی بیرکردنەوە و هەستکردنانە ڕزگاربکات کە شارەکە بەسەریدا سەپاندبوو. بە خۆی دەگووت، گەر ئیشێکی ترم بکردبایە مرۆڤێکی باشترم لێدەردەچوو، ئەم کەسە بێهەستەی ئەمڕۆ نەدەبووم دونیا بە پێش چاومدا دەڕوات و من هەستم بە هیچ نییە. زۆر لە دڵی خۆی دەترسا، تا بێباکتر دەبوو دڵیی پیرتر دەبوو ... ئەو شەوە دوای تەلەفونەکەی سەلیم ئەسغەر بە خۆی گووت ئیتر بەسە، دەبێت شتێک لە ژیانمدا هەبێت لە شت بچێت. ئەم نوقمبوونە بێمانایەی لە شتە پوچەکاندا دەیخنکاند، غەمگین بوو کە خودا وەک ڕۆژنامەنوسەکانی تر بە وەهمی گەورەییەکی درۆزنەوە نەیخولقاندوە، وەهمی گرنگی، وەهمی ئەوەی بەختەوەر بێت بە کارەکەی خۆی، ئەو پیشە گرنگە، ئەفسانەییە، تازەیە کە وادەکات حاکمەکان و خەڵک لە بەردەمتدا بلەرزن.

سەلیم ئەسغەر و سەلام باباجان لە چایخانەیەکی چەپەک و لاکۆڵاندا یەکیان بینییەوە، هەردووکیان کەمێک درەنگتر لە وادەی خۆیان گەیشتن، هەردووکیان ڕەقەڵە و چروساوە بوون و وەها دیاربوون کە سەرمایانە، لە لاوازی و پەشۆکاندا زۆر بە یەکدی دەچوون، گەر بهاتبایە و ئەو ڕۆژە غەریبییەیەک بیدیبانایە، لەوانەبوو وابزانێت سەلام برا بچوکی مامۆستا سەلیمە. ماوەیەک هەردووکیان لە سوچێکی چایخانەکەدا دانیشتن و هیچیان نەگووت. دەبوو تەواو دڵنیابن کەسێک گوێ لە قسەیان ناگرێت. مامۆستا نەیدەویست دەمودەست هەموو نهێنی دڵی خۆی بۆ ئەم گەنجە ئاشکرابکات، گومانی خراپی نەبوو، بەڵام دەترسا ئەم کوڕە بە هۆی نەشارەزایی و حەماسەتەوە نەزانێت چی لە زانیارییەکان بکات. سەرەتا وا خۆی بۆ دەرخست کە ئەویش دژ بەم تاعوونە هاتۆتە جەنگ و دەیەوێت کارێک ئەنجامبدات، شتێک کۆمەک بە هەردووکیان بکات، خۆیان لە نەخۆشییەکە بە دوور بگرن. بەڵام تا ئەوکاتیش مامۆستا هەر سەیری لێدەهات سەلام باباجان ئازارێکی وەها بە دەست ئەم دەردەوە دەچێژێت، دەردەکە لەو دەردانەیە کە ئازاریان نییە، بگرە دەکرێت مرۆڤ لە ڕیزی نەخۆشییە سوودبەخشەکانیشدا ڕیزبەندیبکات.

لە کاتی قسەکردندا، سەلیم ناچاربوو هەندێک زانیاری گرنگ بۆ باباجان ئاشکرابکات، پێیبڵێت کە کوشتنی سەعید یۆنان و گرتنی لیوا جەنگیز دوو ڕودوای پێکەوە گرێدراون، بڵێت ئەو دەنگۆیانەی دەڵێن کوشتنی سەعید یۆنان دەگەڕێتەوە بۆ کێشەیەکی خێزانی، چەند درۆیەکی گەورەن و پێکرا لە دەستکردی دەسەڵاتدارانن. بە دەنگێکی زۆر هێمنیش بۆی ڕوونکردەوە کە ڕۆژنامەنوسان وەک زۆربەی شتەکانی تر لەوبارەیەوە هیچ نازانن و گەر شتێکیش بڵێن لە خەیاڵاتی خۆیان دەیتاشن. مامۆستا سەلیم ئەوەشی ڕوونکردەوە، ئەوەی لەم شارەدا ڕوودەدات، شتێکی یەکجارە و تاقانە نییە، سەیر و سەمەرەش نییە، بەڵکو ئەوەتەی دونیا هەیە ئیشی دەوڵەت ئەوەبووە وابکات مرۆڤەکان بیر لە گۆڕینی ژیانی خۆیان نەکەنەوە. لە ئادەم و حەواوە شتەکان بەوجۆرە هاتوون و بەوجۆرە

دەمێننەوە. جەهەنەم دەسەڵاتە، دەسەڵاتە و هیچی تر نییە. ئێمەی کوردیش بۆیە ئێستا وا هەست بە دیوە تاریک و ترسناک و خنکێنەرەکەی دەکەین، چونکە یەکەمجارە ڕوو بە ڕوو جەوهەرە ڕاستەقینەکەی دەبینین... قۆناغێک میللەتانی تر سەدان و هەزاران ساڵ لەمەوبەر پێیدا ڕۆیشتوون. ئینجا کەوتە گووتارێکی درێژ و ئاڵۆزەوە دەربارەی شێوازە کۆنەکانی دەسەڵات و جیاوازیان لەگەڵ ئەم حاکم و تاقمانەی ئەمڕۆدا، کە سەلام وەک هەمیشە لە هەندێکی بە تەواویی تێنەگەیشت.

مامۆستا بەدەم چا خواردنەوە، ناوە ناوە قامکە باریک و درێژەکانی دەجوڵاند و دەیخستنەوە گیرفانی. چاوانی سەلام بە پێچەوانەی جەستەیەوە کە ئارام و سەکناو دیاربوو، بێئۆقرە دەردەکەوتن. مامۆستا ئەسغەر هەمیشە نوسەرە پڕهزر و قووڵەکەی سەلام بووە، هەمیشە حەزی بووە ڕوو بە ڕوو بە تەنیا بۆ ئەم قسەبکات. ئێستا لەو چایخانەیەدا کە وادیارە چاخۆرانی دەگمەنن، بەتەنیا لە نزیکییەوە دانیشتووە و قسەی بۆ دەکات، شتێکی بۆ ڕووندەکاتەوە کە عەقڵ و خەیاڵی سەلام هێشتا نایگاتێت. گووتی «ئێمەی کورد هەمیشە نوقمی خورافەتەکانی خۆمانین، میللەتێکی خورافەت پەرستین. سەرەتا هەر خەریکی کۆچبەری و ئاژەڵداری و گەرمیان و کوێستان بووین، دەسەڵاتی گەورە لە سەرمان تەبیعەت بووە، دەسەڵاتی ئاغا لەوە بچوکتر بووە بکرێت بیکەینە پێوەری باش و خراپی هەموو دەسەڵاتێک. تێدەگەیت کوڕی خۆم... دوایش دەسەڵاتی داگیرکەر هەر کات کوشندە و بەدکار بووبێت گووتوومانە ئەوانە داگیرکەرن و گوناهـ گوناهی ژێردەستییە. بەڵام جەوهەری بەدی دەسەڵات خۆی، ئەوەی بێ هیچ شتێک بونیادنەری جەهەنەمە، تازە هەستی پێدەکەین... لەدوای بەشەرییەتەوە. هەموو دونیا پێش ئێمە هەستیان بەمە کردوە، هەموویان لە مێژووی خۆیاندا لەوە تێگەیشتوون کە تەنیا دۆزەخی ڕاستەقینە، دۆزەخی دەسەڵات. ئێستا ئێمە زۆر توند هەست بەوە دەکەین، بە جۆرێک لەوانەیە تەواوی بوونمان بەرەو کۆتایی و فەنای هەتاهەتایی بەرێت. ئێمە ئێستا لە ترسناکترین دووڕیانی مێژووی

خۆماندایین. میللەتێکین هەموو بە فیترەت ڕقمان لەدەسەڵاتە، چونکە لە ئەزەلەوە دوژمنمانە، لە ئەزەلەوە دژایەتی و ڕکابەری لەگەڵ دەسەڵاتدا لە خوێنماندا بووە، بەڵام ئێستا بۆ هەموو زەرەیەکی بوونیشمان پێویستیمان پێیەتی، بێئەو ناتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین و دژی دراوسێ دڕندەکانمان بوەستینەوە. ئەم حکومەتە وەک ئەو مۆرفینە وایە کە نەخۆشی شێرپەنجە وەریدەگرێت، شتێک لە ئازاری ژێردەستییمان لە بیردەباتەوە، بەڵام خۆی مێشک و هۆش و خەیاڵمانی سڕیوەتەوە. ئێستا لە ناخی خەڵکەکەدا ململانێیەک دەرکەوتووە کە دوور نییە، نەتەوەکە بەرەو نەهامەتییەک ڕابکێشێت، بیرچوونەوە کاریگەری مۆرفینەکەیە... نا کوڕی خۆم، دەسەڵاتی کوردی هەر بە ئەندازەی دەسەڵاتەکانی دیکەی دونیا بەد و خراپەکارە، بەڵام بە درێژایی مێژوو ئێمە خۆمان لەسەر ئەو درۆیە ڕاهێناوە کە ئەگەر ڕۆژێک دەسەڵاتێکی خۆماڵیمان بوو ئەوە ڕۆژی ئازادی و شادومانیمان دەبێت. ئێستا هەموو باجی ئەو درۆیە دەدەین. من باوەڕم بەوەیە کە دەبێت دەسەڵاتێکی خۆمان هەبێت، بەڵام خۆشم لەو خەیاڵە پاککردۆتەوە، ئەم دەسەڵاتە خۆشی و سەربەرزیم بۆ بهێنێت، دەسەڵات ئاگرێکە هەموو میللەتێک دەبێت بە دەستی ڕووت بیگرێت بەدەستییەوە و هەتا ئەگەر نیوەی گیانیشی سووتاوە بەری نەدات. ئەی چۆن کوڕی خۆم، خۆرئاواییەکان لە مێژە وازیان لەم خورافەتانە هێناوە، کەچی ئێمە بۆمان تەرک ناکرێت، ئیتر لەشمان بە بیرچوونەوە، بە سڕینەوەی مێشک، لە دەست ئازارەکە ڕادەکات. لەبەر ئەوە لام شتێکی ئەوەندە سەیر نییە ئەم تاعوونە ترسناکە، لەم شارەی کوردستان، لەم جێگا لاکەوتەیەی سەر زەمیندا وەها توند بڵاوبۆتەوە».

گەر ئەو ڕاستییەی نەدرکاندبا، نەیدەتوانی بە ڕوونی بە سەلام بڵێت ئەم ڕێگایەی من و تۆ پێیدا دەڕۆین، پڕ مەترسییە. ئەمە ئیشێکی ڕۆژنامەنوسانەی ئاسایی نییە، دەستبردنە بۆ کێشەیەکی ترسناک و دژوار. ویستی بڵێ دەسەڵات لە هەقی خۆی خۆش نابێت یادەوەریمان بسڕێتەوە و وەها دەستەمۆمانبکات بەم ژیانە ڕازیبین، ڕۆژ بە ڕۆژ بڕی

مۆرفینەکەمان بۆ زیاتر دەکات تا هەموو شتێک لە یاددەکەین و بە بەختەوەریی دەژین. ویستی تێیبگەیێنێت کە ئەوان لە فیلمێکی خەیاڵی زانستیدا گیریان نەخواردوە، ئەم یادچوونەوەیە شتێکی گرنگە بۆ ئەوەی شارەکە بتوانێت بمێنێتەوە و لە ڕابوردووی خۆیدا نەخنکێت. بۆیە گرتنی لیوا، پەیوەندی بەوەوە نییە کەسێکی خراپ یان خۆفرۆش بێت، بەڵکو ئەو ساڵ دوای ساڵ بووە بە مەخزەنێکی گەورە... لەوە دەرچووە ئینسان بێت، بووە بە عەمارێک هەرچی شتێک دەبێت لە بیرمانبچێتەوە لەسەری خۆیدا هەڵیگرتووە، لیوا ئادەمیزاد نییە، لیوا بوونی نییە، ئەو تەنیا ئاوێنەیەکی ڕەشە کە هیچ کەس ناوێرێت بچێتە بەردەمی و سەیری خۆی بکات. سەلام وریایانە گوێی دەگرت، هەستیدەکرد شتێکی گرنگ لە ژیانیدا ڕوودەدات، چاوانی گەش و کراوە دەیانڕوانی، سیمای هەر نەخۆش و بێزار دیاربوو، بەڵام وەک نەخۆشێک بوو دکتۆر دواجار هەواڵێکی خۆشی دابێتێ. مامۆستا سەلیم پێیگووت «تۆ گەنجیت، باش بیر لەوە بکەرەوە کە دەشێت هەردووکمان تیا بچین». مامۆستا زۆر مەبەستی بوو ئەو کوڕە تێبگات هێشتنەوەی شتەکان بە نهێنی گرنگە تا بگەنە دەرەنجامێک، تا دەمی دابخات و هیچ لای کەس نەدرکێنێت.

سەلام بە جۆرێک مەستی ئەو خەیاڵ و ئایدیایانەی خۆی بوو، ئەو ئاگاداری و ڕێنیشانییەی مامۆستا گرنگ بوون تا هێمنتر بئاخڤێت و لە شتەکان تێبگات. زۆرجار ڕۆژنامەنوسە گەنجەکان بە جۆرێک خرۆش و سەرگەرمی دەیبردن بێئاگای خۆیان دەچوونە ناو کێڵگە مینی گەورەوە و بێباک بە ناویدا ڕاپاندەکرد. دوای قسەکانی مامۆستا ئەسفەر کە بە هێمنی و بەدەم جگەرە کێشانەوە و بە یەکجۆرە تۆنی نەگۆڕ لەزاری هاتنەدەر، سەلام دەستی خستە ژێر چەناگەی و بە حەسرەتێکەوە کە نیشانەی غەم و تێفکرین بوو بە مامۆستای گووت، هەموو ئامۆژگارییەکانی ڕەچاودەکات و ئەو چی بڵێت بەوجۆرە دەجوڵێتەوە. ئەو ڕۆژە هەر دووکیان بڕیارياندا زۆر بە نهێنی لە سەردانی ئەزمێراوە دەست بە گەشتەکەیان بکەن بۆ تێگەیشتن لە چیرۆکی لیوا جەنگیز و ڕزگارکردنی.



ڕۆژی دووەم دوای گەڕانەوەی ئەزمێرا لای شەفیق هووری و ئەنوەر پۆخان، شەوەکەی هۆشەنگی بولبولیار و یاوەرێکی لە بەردەرکی ماڵی من - لیوا جەنگیزدا دەرکەوتن. ترسێک هەبوو ماڵەکە لەلایەن پیاوان و دەستەوتاقمی پرۆفیسۆر شالیارەوە چاوەدێرکراو بێت، بەڵام هاوڕێکەی بولبولیاری دڵنیاکردەوە کە چاودێرییەکی بەرچاو یان نهێنی لەسەر ماڵەکە هەست پێ ناکرێت، هۆکەشی گێڕایەوە بۆ ئەوەی شالیار نایەوێت لە ڕێگای ئەو چاودێرییەوە سەرنجی کەس بۆ گرتنی لیوا ڕابکێشێت، نەبا لە داهاتوودا قاچی ببێتە تەڵەی گەمەیەکی خراپ و نەخوازراوەوە. بەڵام گەر ماڵەکەش چاوەدێرکراوبووایە، چار چی بوو؟ بولبولیار جگە لەوەی دەربکەوێت و بچێتە سەرەوە و ئەو ئەرکەی هەیەتی جێبەجێبکات، ڕێگای تری نەبوو. هۆشەنگ ئەو دەم تەمەنی تۆزێک لەسەر و پەنجاوە بوو، بەڵام ریشی زۆر سپی بووبوو، نیشانەکانی پیرییەکی خێرا و کتوپڕ وەک دەردێکی لە ناکاو، لێیاندابوو. ئەزمێرا پێشتر چەند جارێک بینیبووی، بەڵام ئەمشەو پیرتر لە جارانی دی هاتە بەرچاوی، دەنگی غەمێکی تێدابوو کە پێدەچوو درێژکراوەی ئازارێکی هەمیشەیی بێت. کاتێک چووە ژوورێ و لەگەڵ ئەزمێرادا دانیشت، غەمێک لە چاویدا بوو، غەمی جەنگاوەرێک لە جەنگێکدا کە هەرگیز تەواو نابێت. بە پەرێشانییەوە پرسی «خانم، دەبێت چی لە جەنابی کاک وەفا بکەن». ئەو تەنیا کەس بوو لەو ساڵانەدا منی بە ناوی خۆمەوە بانگدەکرد «کاک وەفا». خودی ئەوجۆرە ناونان و بانگکردنە بۆ من نرخێکی ڕەمزی هەبوو. ئەزمێرا وەک ئەو شتێکی ئەوتۆی نەدەزانی. دوو ساڵ بوو من بولبولیارم کردبوو بە ئەمینداری هەموو نهێنییەکانی خۆم، لە چیرۆکی ژیانە ونەکانەوە تا دەگاتە یاداشتە نهێنی و خەتەرناکەکان، ئەو هەڵگری کۆپی هەموو

یاداشتەکانی من بوو، زۆربەی خەڵک وایان دەزانی کە جەمعییەتی ژیانە ونەکان بەتەنیا بیرۆکە و خەیاڵی منە، بەڵام لە ڕاستیدا بولبولیار خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو بیرۆکەیە بوو، چیرۆکی ژیانە ونەکان لە جیهانی فریشتەکانەوە هاتبووە ناو جیهانی ئێمە، هێندە هەبوو من هەستمکرد کە فریشتەکان چەندە پێویستیان بەوەیە ژیانێکی تر بدۆزنەوە بیکەنە زیندەگی خۆیان، ئێمەی مرۆڤیش پێویستیمان بەو دیوە لەدەستچووەی خۆمان هەیە. نیوەشەو بولبولیار ئەو ئەمانەتە گەورەیەی منی گواستەوە و بردی بۆ جێگایەک لە دەستی هەر بەدنیازێک سەلامەت بێت. بۆ ئەوەی ئاگاداری ئەزمێراش بێت و لەو بەدبەختییەدا تاک و تەنها جێی نەهێڵێت، ژمارە تەلەفونەکەی بۆ جێهێشت و پێیگووت لەگەڵ هەر پێشهاتێکی خراپدا ئاگادارییبکاتەوە، یان هەر ساتێک پێویستی بە کۆمەک بوو تەلەفونی بۆ بکات. تکاشی لێکرد گەر ویستی وڵاتەکەمان جێبهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ مەملەکەتی خۆی، ئاگادارییبکاتەوە تا کۆمەکیبکات و کەسێکی تریش بۆ پاراستنی ماڵەکە بدۆزێتەوە.

کە سەلیم ئەسفەر و سەلام باباجان چوونە لای ئەزمێرا، ئەوانیش هەر دووکیان ماوەیەکی درێژ هەر خولانەوە و دەوروبەری ماڵی لیوایان خستە ژێر چاودێرییەوە، دەمێک دڵنیابوون سیخوڕانی شالیار لەو دەوروبەرە نین، پێکەوە چوونە بەر قاپی و لە دەرگایاندا. کاتێک ئەزمێرا دەرگاکەی کردەوە لە بینینی ئەم دوو پیاوە لاواز و باریکە تۆزێک سڵەمیەوە، گەرچی ئەزمێرا بە تەنهایی ڕاهاتبوو، بەڵام ماوەیەک بوو وەک خانەبگیر نەیدەوێرا بە ئازادیی وەک جاران هاتوچۆبکات، زۆربەی کات لە ماڵەوە بە ئومێدی دەسکەوتنی هەواڵێکی نوێ دانیشتبوو. ئەو پێشتریش تەنهایی زۆر چەشتبوو، بەڵام دوای گرتنی من تەنهاییەکەی لەجاران قووڵتر و کاریگەرتر بوو، ئەو تەنهاییەی لە چاوەڕوانی کەسێکدا دەیچێژیت جیاوازە لەو تەنهاییەی بێئامانج و ئەبەدیی دەردەکەوێت. تەنهایی یەکەم لە دووەم غەمگینتر و دڵتەزێنترە. ئەو تەنهاییەی چاوەڕوانە کەسێک پڕیبکاتەوە،

کوشندەترە لەو تەنهاییەی کە دڵنیایە بۆ ئەبەد خاڵییە و هیچ پڕی ناکاتەوە.

ئەزمێرا تەنیا دوای کەمێک وەستان و بیرکردنەوە، سەلام باباجانی بەیادهاتەوە، هێندەی سەلامی ناسییەوە و ئەو بەیانییە غەمگینەی بەر دەرکی ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەنی هاتەوەیاد، کەمێک گەشایەوە و شتێک لە دڵنیایی تێگەڕا. لە ژوورەوە ماوەیەکی کورت لە هۆڵەکەدا دانیشتن و سەلام ئەزمێرای تێگەیاند کە دەیانەوێت شتێک بۆ جەنابی لیوا بکەن و هەوڵێک بۆ ڕزگاری بخەنەکار. کوردییەکەی ئەزمێرا هێندەش باش نەبوو بتوانێت لەو زمان و دارشتنەی سەلام باباجان تێبگات. بەڵام ئەوەی سەلام لە ڕۆژنامەکەوە هاتووە «تاکە جێگایەک لیوا متمانەی پێیبوو» هۆکارێکی گەورە بوو ژمارە تەلەفونی بولبولیاریان پێبدات و بڵێت، ئەو لە هەر کەس زیاتر دەتوانێت کۆمەکیانبکات و ڕێنماییانبکات لە کوێوە دەست پێبکەن. دەستخستنی ژمارەکەی بولبولیار، گرنگترین کارێک بوو کە دوو جەمسەری ئەستەمی لەم چیرۆکەدا بە یەکتر دەگەیاند. سەلیم ئەسغەر دڵنیابوو کە ناتوانن لە ئێستا هیچ شتێک لە ڕاگەیاندنەکانەوە ئاشکرابکەن، چونکە دوور نییە ئەوە ببێتە مایەی کوشتنی لیوا و ونکردنی بۆ هەتاهەتایە. مامۆستا دەیزانی لیوا دەبێت ئەرشیفی جەمعییەتەکەی لای کەسێکی دیکە دانابێت، دەبێت کۆمەڵێ نهێنی تایبەتی خۆی لە جێگایەکدا قایمکردبێت، لە بەرئەوە دڵنیابوو جگە لە سەعید یۆنان و واعیز، هەندێک خەڵکی تر هەن کە ئەمینداری نهێنییەکانی لیوا جەنگیزن. ئەو شەوە کە ژمارەی دەستییەکەی بولبولیاریان وەرگرت، هەموو ئومێدی سەلیم ئەسغەر ئەوە بوو خاوەنی ئەم ژمارەیە ببینێت و پرسی پێبکات و ڕێنمایی لێوەربگرێت.

لەگەڕانەوەدا، کاتێک بە تاکسییەک بەرەو گەڕەکەکانی باشووری شار دادەبەزین، لە ڕادیۆی ماشێنەکەوە هەواڵێکی ترسناکیان گوێ لێ بوو، هەواڵێک سەلیم ئەسغەری لەسەر کووشنی ماشێنەکە وشککرد و فڕێیدایە دەریای دوودڵییەوە، هەواڵی کوشتنی چیرۆکنوس «جەوهەر جەوهەر». بەپێی هەواڵی ڕادیۆکە، دوو سەعات لەوەوبەر دەستێکی نەناس لە بەردەم

ماڵی خۆیدا تەقەی لە چیرۆکنوسی ناسراوکردبوو و دەمودەست لەوێدا گیانی سپاردبوو... ئێستا مامۆستا ئەسفەر دڵنیابوو وەرزی کوشتنی چیرۆکنوسەکان بەڕاستی دەستی پێکردوە. وەرزێک هەمیشە دڵنیابووە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەست پێدەکات.

## دکتۆر شوکاک و بولبولیار لە سەردەمێکی تازەدا

لە کۆتایی بەهاری ساڵی 1991 دا، شەوێک دکتۆر شوکاک بە ماشێنە کۆنەکەی بە مەستی لە یانەی پزیشکانەوە بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە، شەوێکی زۆر تاریک بوو، زۆربەی کوچە و کۆڵانەکانی شار نوقمی تاریکی و زوڵمەتی بێسنوور بوون. بەشی هەرە زۆری شار بێ کارەبا بوو، دکتۆریش، وەک خۆی دەیگووت کێویانە مەست بوو. ماوەیەکی کورت بوو بولبولیاری بردبوو بۆ پەناگا نهێنییەکەی و پێکەوە سەری هەندێک لە سندوقەکانی ئەرشیفی کەشتییەکەیان هەڵدابووەوە. دکتۆر دوو ڕۆژ پێشتر ئازوقەیەکی زۆر و هەندێک کەلوپەلی پێویست و کۆمەڵێک دەرمانی گرنگ و ژمارەیەک دیوانی شیعری بۆ بولبولیار و وەفائیلی فریشتە بردبوو ... ئێستا فریشتەکە تادەهات گەورەتر و قنجتر و بە کاراکتەرتر دەردەکەوت. ماڵەکەی دکتۆر هەر لە هەمان جێگای جاراندا بوو، وەک زیاد لە پازدە ساڵ لەمەوبەر دەمێک یەکەمجار بە نیازی ژنهێنان بەکرێیگرت. بۆ بەو جێگایەوە نووسابوو؟ ئایا خەونی بەوەوە دەبینی ژیان دەرفەتێکی تری پێبدات و جارێکی دی شتەکان ڕێگایەکی تر بگرنە بەر و ئەو لەگەڵ ماردینیدا یەکبگرێتەوە؟ خۆشی نەیدەزانی و بیریشی لێ نەدەکردەوە. بەڵام دڵنیابوو خۆشەویستی بۆ ئەم ماڵە، ئاماژەی خۆشەویستییەتی بۆ ژیانێک بوونی نەبووە و بوونی نابێت. تەواوی ماڵەکە ئێستا سەمبولی ئەو ژیانە ئەستەم و ئەفسانەییەی خۆی بوو کە هەرگیز نەهاتۆتە دی ... ژیانێک تێیدا نەژیاوە و تێیدا نازی، ژیانێک تەنیا چیرۆکێکە لە چیرۆکە

خەیاڵییەکانی خۆی، گەرچی هێز و گورزی لە هەر شتێکی واقعی بەهێزترە. هەر جارێک کە دەهاتەوە ناو ماڵەکە ئەو هەستەی هەبوو کە پێدەخاتەوە ناو خەونێکی ناخۆش، خەونێک کە ناتوانێت تا کۆتایی ببینێت، خەونێکە دەرگای یەکەمی لێ دەکاتەوە و دایدەنێت تا مردن لە هۆڵی چاوەڕوانییەکەیدا دانیشێت. هەستیدەکرد ئەم ماڵە دەروازەیە بەرەو جێگایەکی تر، بەڵام کوێ ... هیچ کوێ ... .

ئەو شەوە کە لە ماشێنە کۆنەکەی دابەزی لە هەر کاتێکی تر بێباکتر بوو، کاتێک خەریکبوو کلیلەکان دەربهێنێت و دەرگاکە بکاتەوە و بە پلەکەکاندا سەرکەوێتە سەرێ، چەند کەسێک لە ماشێنێکی سپیدا لە نزیکییەوە وەستان، شۆفێرەکەیان بانگیکرد «جەنابی دکتۆر، جەنابی دکتۆر، بەیارمەتی خۆت». ماشێنەکە چوار پیاوی دیکەی تێدابوو. تەنیا یەکێکیان دابەزی و دەرگای دواوەی ماشێنەکەی کردەوە. دکتۆر لە دیمەنی پیاوەکان سەری سوڕما، چوار پیاوی زۆر زل و ڕیشن بوون، هەر یەکەیان دوو ئەوەندەی پیاوی ئاسایی دەبوون. دکتۆر بە هێمنی گووتی «فەرموو برا، لە خزمەتدام». لە کاتێکدا شۆفێرەکە پرسی «تۆ جەنابی دکتۆر شوکاکی». هێشتا دکتۆر فریای وەڵام نەکەوتبوو کە هەستی بە قورساییەکی گەورە کرد لە پشتی سەریدا و ژانی لێدانێکی گەورە گێژیکرد. ئەوەندەی لە یادبوو کەوت و دەستێکی بەهێز گرتییەوە، لەوە زیاتر هیچی لە یاد نەبوو. کە چاویکردەوە کەسێک بە مۆمێکی بچوکەوە لەسەر سەری بوو. ویستی هەستێت، بەڵام ئازاری پشتی سەری بە جۆرێک توندبوو نەیتوانی لە جێگای خۆی بەرزببێتەوە، تەکانێکی خوارد بچێتە سەرلا، هەستیکرد هەردوو دەستی لە دواوە بەستراون و شانیشی ژاندەکات. گوێی لێبوو یەکێک دەڵێت «مامۆستا بەئاگاهاتەوە، ئەوەتا هاتەوە خۆش خۆی». لەو ساتەدا دڵنیابوو یەکێک بە شتێکی توند کێشاوێتی بە پشتە سەریدا و لە هۆش خۆی بردوە. خۆی ڕاپسکاند هەستێت، نەیتوانی. نیوە بێهۆش و نیوە مەست، هەم خومار و هەم بیمار وەک ئەو کاتانەی شەراب تورەیدەکرد، بەدەنگی بەرز گووتی «چییە، من

لە چ تەڕەماش خانەیەکدام. منتان بۆ بەستۆتەوە؟»، دەنگێکی گڕ کە دکتۆر نەیدەبینی کێیە و لە کوێوە قسەدەکات، پێیگووت «هیچ نییە دکتۆر، هیچ نییە، با مەستی بەرتبدات دوایی قسەدەکەین... نەعلەتی خودا لە خۆتان و ئەم شتەی دەیخۆنەوە، نازانم چ خۆشییەک لەو ژەهرەدایە کە دەیکەن بە قوڕگتاندا. خۆ تۆ دکتۆری. بەڵای خودام لێدایت، گەر باوەڕت بە خودا نییە باوەڕت بە عیلمە شەیتانییەکەی خۆت بێت، خۆ عیلمەکەش نەهی لەم ژەقنەبووتە کردوە». یەکێک دەستی دکتۆری لە دواوە کردەوە و پێیگووت «دکتۆر جارێ بنوو، ئەوە جێگایە، ئەوە جێگایەکی باش و پاکوتەمیزە لەو سوچەدا ... جارێ کاتی خەوە، بنوو. خوا کەریمە بەیانی ئینشاڵا مەستییەکە بەرتدەدا و عاقیبەتی خێر دەبێت بۆت». وایگووت و دوای ئەوەی دڵنیابوو دکتۆر جێگاکەی خۆی بینیوە بە لوتفەوە دەستی دکتۆری گرت و بردیە لای شوێنخەوی خۆی، دواتر فووی لە مۆمەکە کرد و ژوورەکە بووە تاریکستان.

تا بەیانی ڕۆژی دووەم دکتۆر شوکاک هەستی نەکرد ڕفێندراوە، کاتێک بە ئاگاهاتەوە و چاوانی گلۆفی و هەناسەیەکی هەڵکێشا و سەیری چواردەوەری خۆی کرد، ڕوونتر دەرکی بە دۆخی خۆی کرد. لە دڵی خۆیدا بە نیگەرانییەوە گووتی «چییە دیسانەوە بەزمەکەیە، دەبێت لەسەردەقی هەموو سەردەمێکدا گەوادێک من بفڕێنێت ... ئێستا چ گوناهێکمان کردوە؟». ئەمجارەش وەک گرتنی یەکەمجاری، هیچ شتێک لە هۆی ڕفاندنەکە تێنەدەگەیشت. دوای زیاد لە دوو سەعات دەرگاکە کرایەوە، سێ پیاوی زەبەلاح و بەقەد و قەوارە هاتنە ژوورەوە، هەر سێکیان وەک سێ بەتریقی زل، بە ڕیز و بە ڕێکی وەک سێ حاکم بیانەوێت بڕۆنە هۆڵی دادگاوە، دەڕۆیشتن، دەیانویست هەم ماقوڵ و هەم بە ویقار دەربکەون. پیاوێکی ڕەهەندە و چوارشانە لە ناوەڕاستیاندا دەڕۆیشت، چاویلکە لە چاوێکی سوور و سپی و برۆ زەرد و ڕیش سوور بوو، هەر سێکیان وەک لە شانۆگەرییەکی خراپدا نمایشی ڕۆڵێک بکەن وەها ڕەفتاریاندەکرد، لەسەر قەنەفەیەکی زۆر گەورە لە پاڵ یەکدا دانیشتن. بێئەوەی سەیری

دکتۆر بکەن، هەندێک قسەیان لە نێوان خۆیاندا کرد، قسەکانیان تەنیا وەک ورتە ورتی سەڵەوات خوێنێک هاتە بەرگوێی دکتۆر کە لە ژێر لێوییەوە زیکری خودا بکات. زۆری نەبرد، کەسی دەستە ڕاست، ڕووی دەمی کردە ڕیش سوورەکە و گووتی «جەنابی مامۆستا، ئەمە خۆیەتی، دکتۆر مستەفا شوکاک. دوێنێ شەو کە هێنامان مەست بوو، بەڵام ئێستا شوکور لەخودا بەزیاد بێت، وەزعی باشە». ڕیش سوورەکە وەک بە ڕێکەوت دکتۆری لە جێگایەکی گشتیدا بینیبێت و لابەلا پرسیارێک بکات، گووتی «دکتۆر جەنابیشت لەوان بوویت؟ ... لەوانەی بە ئیستیلاح خۆتان ناوناوە مەلەکبین؟»». دکتۆر سەری بەرزکردەوە و نەیزانی چی بڵێت. پیاوەکان هەر سێکیان بەهێز و تەندروست و کەیفخۆش دەردەکەوتن. دووانەکەی ڕاست و چەپ کەسی ناوەڕاستیان هەر بە مامۆستا بانگدەکرد. ئەو گووتی «برای بەڕێزم. ئاخر ئەگەر عەقڵتان بووایە دەتانزانی خوای تەبارەک وە تەعالا نیعمەتی بینینی مەلەکی بەس بە کەسانی ئیماندار بەخشیوە. پێم ناڵێیت عارەقخۆرێکی وەک تۆ، کە خوا بە گوناه لێم نەگرێت دەڵێن ژنەکەشت کابرایەکی تر هەڵیگرتووە، ئەم فەزڵ و ئیمتیازتە لە کوێ هێنا ببیتە مەلەکبین». دکتۆر بە توندی چاوی گلۆفی و چاویکردەوە، زۆرجار گەر باوەڕی بە شتێک نەکردبایە ئاوها توند چاوی دەگلۆفی و هەناسەیەکی قووڵیشی بۆ هەڵدەکێشا. سەیری لە قسەکانی کابرا هات، گووتی «ئەها. تۆ منت لەبەرئەوە فڕاندوە، چونکە مەلەک دەبینم. یەعنی مەلەک بینین شتێکی ئەوەندە خۆشە؟. بە قوربان، نازانم ناوت چییە. بچۆ هەرچی مەلەکی دنیایە ببیە بۆ خۆت و چەندەش حەزت لێیە سەیریانبکە، لێگەڕێ با من بڕۆم. من دەبوو ئێستا لە خەستەخانە بم ... وەرەقەیەکم بۆ بهێنە، هەر ئێستا وەرەقەیەکم بۆ بهێنە بۆت ئیمزادەکەم کە ئیتر نامەوێت هیچ مەلەکێک ببینم، هەر چییەکم بینی دەینێرم بۆ جەنابت، لە تۆ وایە من زۆر کەیف خۆشم بە بینینی مەلەک ... ها زۆر کەیف خۆشم؟. ئەسڵەن وانییە، من کارم پێیانەوە نییە. وەکو تریش بەڵێ، من ئەوەم، وانێکم، ئەوەم کە تۆ دەیڵێیت کە ژنەکەم هینی کردوە. وای خوایە، کەس هەیە ئەوە نەزانێت، حەزدەکەم جارێک یەکێک

ببینم ئەو حیکایەتەی منی نەبیستبێت ... تێناگەم ئەم شارە دەردێکی تری نییە، ئەوەی ئەم ژنەی من نەبێت؟»· پیاوەکە بە هێمنییەوە گووتی «کوڕم، من نالێم تۆ هیچت نەبینیوە، دەڵێم ئەوەی بینیوتە شەیتانە، جنۆکەیە، دەعجانێکی تری ناو خەیالاتی بەشەرە· ئیشی ئێمە ئەوەیە کە ڕێگای ڕاستتان پیشانبدەین. ئیشی ئێمە ئەوەیە نەهێڵین لە خەیالی گوناهبارماندا شەیتان و مەلەک تێکەڵ بێت»· دکتۆر وەک بیەوێت بڕوا، چاکەتەکەی هەڵگرت و هەستا، کراسێکی شینی کاڵی لە بەردا بوو، سێ پیاوەکە بەوردی سەیریاندەکرد، شتێک لە ناڕێکی و سڕبوون بە جوڵە و وەستان و شێوەی گرتنی چاکەتەکەیەوە دەردەکەوت· دکتۆر هێشتا بە ڕوونی پیاوەکانی نەدەبینی، ڕوناکییەکی بەهێز لەدەرگای دەرەوە دەهات و دەیدا لە چاوی. لەگەڵ ئەوەی شەو بە کراس و پانتۆڵەکەیەوە خەوتبوو هێشتا شتێک لە ڕێکی و شیکی دکتۆرەکانی هەر پێوە دیاربوو. گووتی «بە هەر حاڵ من لە هەموو ئەو شتانەی بینیومن پەشیمانم، سوێندیش دەخۆم دووبارەیان نەکەمەوە ... گەر مەبەستتان ئەوەیە تۆبەبکەم دەیکەم. ئیتر موشکیلەتان دەمێنێت؟. ئێستا بهێڵن بڕۆم»· ئەو دەستێکی بە ڕیشە سوورە درێژەکەیدا هێنا و سەیرێکی دووانەکەی هاوڕێی کرد و گووتی «دکتۆر شوکاک، برای عەزیزم، ئێمە وەک موسڵمان و خەڵکانێک کە خۆمان بە بەندەی خودا دەزانین، لەسەر تەعالیم و ڕێنماییەکانی موحەمەد ئەلموستەفا و خودای تەبارەک وە تەعالا دەڕۆین، دوو شتمان لە تۆ دەوێت، کە هەم بۆ ئیمانی خۆت باشە و هەم بۆ ئیمانی ئێمە· یەکەم لە بەردەم قاپی تەعالادا خۆمان بە بەرپرس دەزانین، کە ئەم فیتنە ترسناکەی پەیدابووە و چەند ساڵە لە ژێرەوە و بە نهێنی لە کاردایە و خۆیان ناوناوە مەلەکبینەکان بنەبڕیکەین. چونکە ئەوە لای ئێمە بیدعەی شەیتانییە و لەو سەد ساڵەی ئەخیردا بیدعەی وا هەتا لە شیوعییە کافرەکانیش نەوەشاوەتەوە· بێحورمەتیکردن بە مەلەکی خوا، وەک بێحورمەتی وایە بە تەعالا، ئەستەغفروڵا· ئیمان بە مەلەکی خودا ڕوکنێکە لە ئەرکانی دین»· دکتۆر شوکاک سەری خوراندو و گووتی « تا ئەو شوێنەی لەسەر منە ئیتر ناهێڵم هیچ یەکێک لەوانە بە من بڵێن ئێمە

مەلەکین». مامۆستا کەمێک بێدەنگ بوو، هەر دوو یاوەرەکەی بێوچان بە نیگایەکی سارد سەیری دکتۆریان دەکرد، پێدەچوو چێژێکی زۆر لە شێوەی وەستان و قسەکردن و ڕەفتاری ببینن، پێدەچوو زۆر بدەنە خۆیان تا نەتریقێنەوە و پێنەکەنن، زگی خۆیان دەگوشی نەبا خەندە و قاقایان بتەقێتەوە. پاش ئێستێکی درێژ، مامۆستا دەستی بە ڕیشیدا هێنایەوە و گووتی «خاڵی دووەم ئەوەیە پێمان بڵێیت هۆشەنگی بولبولیار لە کوێیە، دەبێت بزانین لە کوێیە، من خودای تەبارەک وە تەعالا خستوێتییە دڵمە کە تۆ دەزانیت لە کوێیە، ئیماندارانی تریش هەمان ئیلهام کەوتۆتە دڵیان... بۆیە کوڕی خۆم ڕۆیشتنی تۆ بەدەست ئێمە نییە، تۆ بە فەرمانی جەماعەت لێرەیت». مستەفا شوکاک لەویادا تەواو شپرزە بوو، بە بێزارییەوە پرسی «جەماعەت چییە؟». یەکێک لە دووانەکە وەڵامیدایەوە «دوژمنانی شەیتان». مستەفا شوکاک لەویادا چاکەتەکەی دانا و گووتی «تۆرەی ئەمەمانە، دەی من کارم بە شەیتانەوە چییە، برای باوکمە، کوڕی پورمە، چیمە؟. هیچیش لەسەر بولبولیار نازانم. گەر دەتانەوێت سوێند دەخۆم. نازانم لە کوێیە. گەر بمزانیبایە پێمدەگووتن، گەر ئێوە هیچی دەربارە دەزانن پێم بڵێن».



ئەوە سەرەتایەکی تازە بوو بۆ چیرۆکی مستەفا شوکاک و بولبولیار. شوکاک هەستیکرد کەوتۆتە دونیایەکی تازەوە کە لە دونیاکانی تر ئاڵۆزترە. پێشتر هیچ وەخت ناوی ڕێکخراوێکی لەو جۆرەی نەبیستبوو، بەڵام ئێستا دەیتوانی تێبگات ئەمانە کێن و بۆچی بەدوای بولبولیارەوەن.

بە پێچەوانەی چاوەڕوانی خۆیەوە، دوای دوو ڕۆژ، کاتێک دڵنیابوون شوێنی بولبولیار ئاشکراناکات، ئازادیانکرد.

بەشێوەک ئازادیانکرد بیریکاتەوە و بترسێت. هیچ شتێکیان پێ نەگووت، وەک ئەوە بوو تەنیا لە بوونی خۆیان ئاگاداربیکەنەوە، وەک بە ئازادکردنی پتر بیخەنە زیندانەوە، وەک لە ڕێگای چاندنی وەسواس و ترسێکی نادیارەوە بیانەوێت بۆ هەتاهەتایە ڕۆحی داگیربکەن. ئێستا دڵنیابوو ڕێکخراوەکە هێزێکی زۆر گەورە نییە، بەڵام لەو ڕێکخراوە بچوکانەیە کە دەیانکرێت داخراو و مەحکەم و هەمیشەیی بن، دەتوانن زۆر ترسناکیش بن، ئەوە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ڕێکخراوە دینییە بچوکەکان بوو، «جەماعەتی سەربازانی خودا» «جەماعەتی ئەنساری پەیامبەر» «دوژمنانی شەیتان» «موجاهیدینی عومەر» «ئەنساری عەقیدە». دکتۆر دڵنیابوو ئیتر ناتوانێت ئاسودە بێت. گەلێک پرسیاری گەورەی لادروستبوو، لە سەروو هەموویانەوە تا چەند ئیتر دەتوانێت ئازاد بێت، تا چەند دەتوانێت متمانەبکات؟. دوو شتی سەرەکی کە لە خەیاڵیدا بوون، چۆن مەلەکبینەکانی تر ئاگاداربکاتەوە، ئەوانەی دەیناسین، چۆنیش خۆی بگەیێنێتەوە بولبولیار؟. دڵنیابوو بەشێک لە کاری گرتن و بەردانی بۆ ئەوەیە بیجوڵێنن بولبولیار بدۆزێتەوە. تێگەیشت هیچ شتێک دەربارەی دوا پەیوەندییەکانی ئەو و بولبولیار نازانن، گەر بیانزانیایە ئازادیان نەدەکرد، ئەشکەنجەیان دەدا تا دەیدرکاند، هێند هەیە گرتنەکەی بۆ ئەوەیە بیخەنە خەیاڵییەوە بولبولیار لە مەترسیدایە و دەبێت شتێکی بۆ بکات. بەڵام دەبێت بولبولیاریان بۆچی بێت؟ دەبێت هەموو ئەم شتانە پەیوەندیان بە مەهدی دەرياییەوە هەبێت کە لە شەوێکی ڕەوەکەدا هاتە بیمارستان؟.

بە ڕوکەش هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی نەدەبینی.

شێوەی ئازادکردنیشی سەیر بوو، چاویان بەستەوە، سوار ماشێنێکیان کرد، لە نزیک خەستەخانەوە چاویانکردەوە و دایانگرت و گوتیان بڕۆ. دکتۆر بە ماندوویی و شپرزەیی خۆی کرد بە بیمارستاندا، بەڵام دڵنیابوو لە ژێر چاودێریدایە. لەو ساتەوە ئەو هەستەی تێدا گەورەدەبێت کە هەمیشە لە ژێر چاودێریدایە، لەدوای گرتنەکەیەوە بەدەستی لیڤیتانت هێدی هێدی ئەو ترسەی تێدا دروستبووبوو، بەڵام لە ئێستاوە ئەو

وەسواسە بە توندی لێیدەدات و بەرۆکی بەرنادات. دکتۆر لەوەدا لەسەر هەق بوو، دەیانویست بزانن دکتۆر هیچ شتێک لەسەر بولبولیار دەزانێت و دەتوانێت ناڕاستەوخۆ بەرەو حەشارگای ئەو بیانبات.

مستەفا شوکاک ڕێگای زۆر لە بەردەمدا نەبوو، یان دەبوو خۆی بولبولیار ئاگاداربکاتەوە یان یەکێکی تر ئەو کارەی بۆ بکات. خۆی لە ئێستا بەدواوە ناتوانێت متمانەی بە کەس هەبێت، نازانێت دەشێت چۆن و بە کێ و لە چ کونێکەوە چاودێرییبکەن. وەکو تریش دکتۆر هاوڕێی دڵسۆزی نەبوو، هەر هاوڕێی نەبوو، چجا یەکێک هێندە جێگای بڕوابێت کاری وا گرنگی پێبسپێرێت. تاکە کەسێک لەو ساتەدا لە خەیاڵی بوو نەوا ماردینی بوو، بەڵام چۆن دەتوانێت بیدۆزێتەوە؟. دکتۆر هەستیکرد تاکە مرۆڤێک لەو چەند ساڵەی دواییدا ساتێکی کورت ژیانی ڕاستەقینەی لەگەڵدا چەشتبێت، نەوا بووە. کە گەیشتە ژوورەکەی خۆی لە خەستەخانە لە بری بیرکردنەوە لە جەمعییەتی دوژمنانی شەیتان، لە بری بیرکردنەوە لە بولبولیار، بیری لای ئەو ماچە قووڵ و ئەفسانەییەی خۆی بوو لەگەڵ نەوادا. ئەوە تەنیا ماچی بوو دوای نەغەدە، ئیتر هیچ ژنێکی تری ماچ نەکردبوو. وەک لە ژن ترسابێت، وەک حەزبکات بۆ هەتا هەتایە لێیان دوور بێت. هەتا لە بیمارستانیش، لە ساڵۆنی نەشتەرگەریدا تا مەجبور نەبایە دەستی لە لەشیان نەدەدا، بەردەوام نەشتەرگەریی ژنانی دەدایە دەست پزیشکەکانی تر. لە دوای ماچەکەوە نەوای نەبینییەوە، سڵاوەکانی نێوان ئەو و دکتۆر جەلال ماردینیش بە جۆرێک سارد و بێڕۆحبوون بواری ئەوەی نەدەدا نزیک بێتەوە و هەواڵی بپرسێت، بەڵام زۆر ڕۆژ گەر بێئیشبایە، ساڵۆن و ڕەدهەکان و حەوشی بیمارستانەکە دەگەڕا، بەڵکو چاوی بە نەوا بکەوێتەوە، بەڵکو لە جێگایەک بیبینێت. بەڵام دیاربوو نەوا ئەو هەموو ساڵە کە دەهات بۆ بیمارستان بەدوای ئەو ماچە تاقانەیەدا گەڕاوە، بێئەوەی بزانێت و بیر لەوە بکاتەوە کە ماچێکی وا ئێستا چەند دکتۆر ئازار دەدات. لەوەدا ئازاری نەدەدا کە تاکە ماچی هەموو عومری گەنجییەتی، بەڵکو لەوەدا کە ساتی نزیکییەکی مەحاڵی نیشاندا، وەک

ئەوەی دکتۆر خواردنێک بێت جارێک پەنجەیەکی لێدەیت، تاقیبکەیتەوە و بڕۆیت. ماچێک بوو تەنیا فریشتەکەی خانمی بۆ هەتا هەتایە نەتۆراند، بەڵکو تەنهاییەکەی دکتۆری تا سنووری مەحاڵ قووڵتر کردەوە. بەڵام ئاخۆ گەر نەوای ببینیایە هێندە هەستی بە نزیکی دەکرد لەگەڵیدا، بتوانێت ڕایسپێرێت بچێتە لای بولبولیار و پێیبڵێت من دکتۆر شوکاک ناردومی. کێ دەڵێت ئەمجارە بیبینێت تەواو وەک کەسێکی نامۆ و نەناس نابێت لە بەرچاوی. لەو ساتە سەختەدا ئەو شتانە خەیاڵاتی پوچبوون. ئەو ڕۆژە دکتۆر بێئەوەی هیچ بڵێت و دەردی خۆی بۆ کەس بەیانبکات، لە بیمارستان ڕوخسەتی خواست و بۆ پشوو گەڕایەوە ماڵێ. شتەکانی وەک خەون و مۆتەکەیەکی ڕەش دەبینی، کە هێشتا تەواو سەری لێ دەرنەدەکردن. زۆرجار مرۆڤ ژیانی ڕۆژانەی خۆی دەژی و بیر لە خۆی ناکاتەوە، بەڵام لە ناکاو لە ناوەڕاستی سەرقاڵی و ڕۆتین و ژاوەژاو و هەراوزەنا گەورەکاندا چرکەیەک دێتە پێشێ دەزانێت چەند تەنهایە، دەزانێت بە ڕاستی هیچ کەسی نییە. نا ئەو هەستە بۆ دکتۆر شتێکی ئەوتۆ نوێ نەبوو، هەموو کەس دەیزانی دوای ڕۆیشتنی نەغەدە کەوتۆتە چ تەنهاییەکەوە. بەڵام مرۆڤ بەردەوام ناچارە شتێک بدۆزێتەوە تەنهایی خۆی یادبکات. ئیشکردنی بەردەوام و سەرگەرمی زۆر بە نەخۆشەکانەوە ئەو بوارەی بۆ دکتۆر ڕەخساندبوو لە خۆی هەڵبێت، هەر وەخت لە ماندووبوونی پروکێن و بێوچاندا نوقمدەبوو، ئەوەی لە یاددەکرد چ بێکەسە، چ بەدبەختە، چ ژیانێکی ناکام و گەنجییەکی بەباچووی هەیە... نا بیری نەدەکردەوە، بەردەوام ئیشیدەکرد و ئیشیدەکرد. دواجار ساتەوەختی وەهاش دەهاتە پێشێ، ساتەوەختێک کە مرۆڤ بە تەنیا خۆی بۆ ڕایی ناکرێت و پێویستی بە کۆمەکە، لەو ساتانەدا ئیتر بە ڕوونی دیارە ئەو مرۆڤە چەندە بێ کۆمەک و بێ هاودەمە، چەندە ئەم زەمینە گەورەیە تەنگە بەبەری، چەندە ئەم ژیانە بێمانایە دەرگایەکی داوەتێ ڕۆحی پێوەی ناچێت. نا دکتۆر هەتا یەک هاوڕێی دڵسۆزیشی نەبوو، بتوانێت پێیبڵێت «هاوڕێم».

کە دکتۆر گەیشتەوە ماڵەوە، شتێکی سەیر لە خەیاڵیدا بوو، فریشتەیەک بگرێت و بەودا هەواڵ بۆ بولبولیار بنێرێت. بەڵام لە دڵی خۆیدا گووتی «وای بولبولیاری بەدبەخت، بولبولیاری بەدبەخت، بەڵام بچێت بۆ کوێ، ئەو داماوە ڕوو لە کوێ بکات؟» پێش هەر شتێک دەبوو جێگایەکی ئەمین و دوور لە مەترسی لە شوێنێکدا بۆ دابینبکات. کاری وا بۆ دکتۆر ئاسان نەبوو، پیاوێک نەبوو بەهرەیەکی گەورەی لە ڕاپیکردنی کاروباری ئاڵۆزدا هەبێت، لەدوای ڕزگارکردنی نزار ئیدریسەوە، ئاڵۆزترین ئیشێک کردبێتی، کارەکانی بووە لە لای ڕێزان خانی مەلەکبین. ئێستا نەیدەزانی دەبێت بولبولیاری هاوڕێی چی لێبکات. ئەمجارە بەڕاستی ترسی لە هەموو شتەکان هەبوو، حەسرەتی خواست بۆ ئەوەی گەر ڕێزانی مەلەکبین و مەهدائیل لێرەبان، کارئاسانییەکی زۆریان بۆ دەکرد. بیریکردەوە بولبولیار لەهەر جێگایەک بێت، لەهەر گەڕەکێک بێت دەبێتە شوێنی گومان، هەر پیاوێکی تەنیا لە هەر گەڕەکێکدا بێت، پیاوەکانی تر وەک هەڕەشە بۆ سەر ئابڕوو و ناموسی خۆیان سەیریدەکەن. ئەوەی ئەو لەو ماوە درێژەدا لەو ماڵەدا ماوەتەوە هۆکەی ئەوەیە پزیشکە، بەیانیان زوو دەڕوات و شەو درەنگ دەگەڕێتەوە، هیچ کەس نایبینێت و هیچ کەس نایبینێت، پەردەکانی هەمیشە دادراونەتەوە، گڵۆپەکانی هەمیشە خامۆشن، جگە لەوە چیرۆکەکەشی لای هەمووان زانراوە. بەڵام گەنجێکی وەک بولبولیار ئەستەمە بتوانێت تەنیا بژی، مەحکەمترین جێگا بۆ ئەو دەرەوەی شارە، شاخەکانە، ناو ئەشکەوتەکانە. بۆ ئێستێک هەستیکرد لە ترسەکانیدا زیادەڕەویدەکات. بیریکردەوە کە بولبولیار پەیوەندییەکی کەمی لەگەڵ نەغەدە، ژنەکەی لیڤیتانتدا هەیە، ژمارەیەک لە سیاسییەکانیش دەناسێت، بەڵام بەس خوا دەزانێت ئێستا ئەوان لە کوێن، لە ئێرانن، لەسەر سنوورن، لە ناو شارن؟ ... کێ دەڵێت پێی بزانن بە زیانی بولبولیار ناشکێتەوە؟. ئەوەی بچێت لە نەغەدە دا بپاڕێتەوە تا بولبولیاری بۆ ڕزگاربکات، موچڕکێکی شەرمی بە هەموو گیانیدا هێنا.

کە خۆی دا بەسەر جێخەوەکەی خۆیدا زۆر ماندوو بوو، خەوی شەوانی پێشووی لە زیندانی دوژمنانی شەیتاندا، وەها پشت و ملی ئازاردابوو، ئۆقرەی نەبوو. ویستی بخەوێت، بەڵام هەم ئازاری جەستە و هەم ئازاری دەروون نەیاندەهێشت. لە ناو جێگاکەدا ئەو پرسیارە گینگڵی پێدەدا «بۆ دونیا تا بێت ناشیرینتر دەبێت؟». تیورەکەی دکتۆر بۆ مرۆڤ وەک نزمترین مەخلوقاتی دونیا، ئەو بوونەوەرەی لە هەموو بوونەوەرانی تر هەڵەی بایۆلۆژی زیاتری تێدایە، ئەو مەخلوقەی لە بونیاددا لە هەموو بوونەوەران پڕ عەیبترە، بەرەو تیورییەکی دیکەی دەبرد، تیوری ئەوەی مێژووی مرۆڤ گەڕانەوەیەکی ترسناکە بۆ دواوە. دڵنیابوو مرۆڤایەتی سەرتاپای بە پێچەوانەی ئەو ئاڕاستەیەوە دەڕوات کە دەبێت بڕوات. لە دڵی خۆیدا گووتی «قیامەتی ڕاستەقینە لەسەر دەستی ئینساندا دەبێت. سروشت هیچکات ناتوانێت ئەو هەڵە گەورەیەی خۆی ڕاستبکاتەوە، هەڵەی دروستکردنی ئینسان».

دکتۆر شوکاک وەک پزیشک بەردەوام سەروکاری لەگەڵ ئەو نوقسانی و هەڵە بایۆلۆژیانەدا بوو کە لە مرۆڤدا هەن. بەپێی ئەزموونی چەند ساڵەی دەیتوانی بەدڵنیاییەوە بڵێت هیچ بوونەوەرێک لە سروشتدا بە ئەندازەی مرۆڤ قابیلی نەخۆشکەوتن نییە، ئینسان تاکە بوونەوەرێکە بە نەخۆشی لەدایکدەبێت، ئەم دەردەشی گواستۆتەوە بۆ ناو مێژوو. مرۆڤ تا زیاتر بۆ چارەسەر دەگەڕێت، زیاتر خۆی و دونیا وێراندەکات. خۆشبەختی باڵندەکان، ورچەکان، پڵنگەکان لەوەدایە بۆ چارەسەر ناگەڕێن، پزیشکیان نییە ... گەر ورچەکانیش دکتۆرێکی وەک مستەفا شوکاکیان ببووایە، دەبوونە جۆرە توخمێکی بەدبەخت. هەموو ئاژەڵێک ئەخلاقێکی نەگۆڕی خۆی هەیە، مرۆڤ نەبێت. بەڵام بۆ دەشێت ئەوە هەڵە بێت، ئایا ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئینسان تەنیا هاواری پێچەوانەیە دژی ئەم دونیا پڕوپوچە... مرۆڤ تاکە مەخلوقێکە دەتوانێت هەمووی ڕەتبکاتەوە، هەموو ئەم گەمە گەورەیە کە هێزێکی نادیار دەیبات بەڕێوە. دکتۆر ئێستا واهەستیدەکرد کە مرۆڤ لە نەستەوە لەسەر ئەوە پرۆگرامکراوە هەم خۆی

و هەم بوون بەرەو ویرانەیی ببات. لەو چەند ساڵەی جەنگدا هەزاران سەرباز و ئەفسەر و ژەنراڵی بیماری بینیبوو، زۆربەیان لە مەیدانی جەنگدا پێکرابوون، زۆربەیان شەڕکەری گوڕەپانە خوێناوییەکان بوون، هەندێجار بە خەیاڵیدا هاتبوو لێیان بپرسێت، ئاخۆ کوشتنی ئینسان خۆشییەکی تێدایە و مرۆڤ بە لەزەتەوە شەردەکات یان ئەم جەنگە کاولکار و کوشندانە نیشانەی پرۆگرامبوونی بێئاگای مرۆڤن لەسەر شتێک کە خواستی خۆی نییە؟. دکتۆر هێدی هێدی تێگەیشتبوو کە کوشتن و ئازاردانی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە هیچ خۆشییەکی قووڵ و ڕاستەقینەی لەخۆ نەگرتووە، ڕەنگە هەندێک بە دڵێکی خۆشەوە بچن بۆ جەنگ، بەڵام کەس بە دڵی خۆشەوە ناگەڕێتەوە. لەهەموو پیاوکوژەکانی پرسی بوو، لە هەموو جەنگاوەران، بەڵام کەسێک باسی خۆشی کوشتنی بۆ نەکردبوو، هەموو باسی ناچاریان کردبوو، هەموو هەستیانکردبوو ناچارن بکوژن. کەواتە مرۆڤ ناچارە نەوەک پیاوکوژ بێت. دکتۆر لە خۆی پرسی «سەیرە. دەبێت ڕیشەی ئەم ناچارییە لە کوێوە هاتبێت؟. دڕندەیی مرۆڤ سەرچاوەکەی لە هەستێکی ترەوە سەرهەڵدەدات کە پەیوەندی بەوەوە نییە کەس حەزی لە خوێنڕێژی بێت. هەموومان هەرچییەک دەکەین ناچارین». دکتۆر لە تیورەکانیدا زیاتر دەڕۆیشت و دەیگووت گەر وابێت کەواتە کوژراوەکان وەک بکوژان بەرپرسن، دابەشکردنی مرۆڤ بەسەر بێگوناهـ و گوناهباردا هیچ نییە جگە لە هەڵەیەک لە خوێندنەوەی چیرۆکی مرۆڤدا، هەستی ناچاریی ئەو تەختی نمایشەیە کە بکوژ و کوژراو پێکەوە دروستیدەکەن. هیچ بکوژێک نییە هەستی نەکردبێت لە ڕووی ناچارییەوە لەوێدایە کە دەبێت بکوژێت، وەک چۆن هیچ کوژراوێک نییە لە ڕووی ناچارییەوە لەوێدا نەبووبێت کە دەبێت بکوژرێت. بەڵام بۆ مرۆڤ هەست بە ناچاری دەکات، بۆ؟. لەویادا وەک ئیلهامێکی ئاسمانی بۆ بێت، وەک لەناکاو لە هەموو شتێک تێبگات، ڕوناکییەکی سەیر دڵی ڕۆشندەکردەوە، لەناکاو دەیگووت «ئێستا تێدەگەم، بۆ فریشتەکان لەسەر زەوی هەن، بۆ ئەوەی مرۆڤ لەدەست ئەو هەستە ئازادبکەن... مرۆڤ ناچار نییە هیچ بکات، مرۆڤ دەیان ڕێگای تری لە بەردەمدایە،

فریشتەکان ئەو خەڵکە سادەیەن کە ئەو ڕێگایەمان نیشاندەدەن و خۆیان لێکردوین بە فریشتە، بەڵام هیچ هێزێک نییە بتوانێت ئەوە لە خەڵکی بگەێنێت، هیچ فەلسەفەیەک، هیچ زانستێک، هیچ ئاینێک ... تەنیا مرۆڤ خۆی نەبێت. مرۆڤ بەردەوام هەستدەکات ناچارە ... هەستدەکات هەرچییەکی کردوە و هەرچییەک دەکات لە بەر ناچارییە». ئا لەویادا دەوەستا و ڕقی لە مرۆڤ گڕی دەگرت. بۆ ماوەیەکی کورت ئەو هەستەی تێگەڕا کە بە هەموو خەڵک بڵێت ئێوە ناچارنین هیچ شتێک بکەن، هیچ شتێک وەک هەستی ناچاری درۆزن نییە، ئێوە ئازادن. خۆشحاڵ بوو کە ئێستا شتەکان وەها ڕۆشن دەبینێت. گەرچی ڕقی لە فریشتەکان بوو، ڕقی لە ئومێد بوو، بەڵام دەیبینی گەر فریشتەکان نەبن، دەشێت ئیتر هیچ ئومێدێک نەبێت، هیچ ئومێدێک. بڕوای وابوو مرۆڤ لەوە گەمژەترە لەمجۆرە قسانە حاڵی ببێت، قاقا بە خۆی پێکەنی. بڕوایەکی پتەوی بوو مێژووی مرۆڤ جوڵەیەکی هێمن و هەمیشەیی و بەردەوامە بەرەو بەدبەختی... لێرەوە هەموو سەرکەوتنەکان درۆن، وەک ئەو پەنیرەن کە لە ناو چەند تەڵەیەکی مشکدا دانراون تا مشکەکان زیاتر ڕابکێشێت. تاکە شتێک لەو نێوەندەدا دەیتوانی مرۆڤ بوەستێنێت ئەو شتە بوو کە بە ئیرادەی ژیان ناوی دەنا. ئەوەشی هەر لە ئەزموونی خۆیەوە وەک دکتۆر وەرگرتبوو. ئەزمونێک ئێستا ڕۆژ دوای ڕۆژ بێنرختر لە جاران سەیریدەکرد... پزیشکی چییە جگە لە درۆیەکی گەورە... ئایا لە دواجاردا کاری پزیشک نییە مرۆڤێکی ساغ دروستبکات؟ بەخۆی دەگووت : بەڵێ کاری ئەوەیە. ئەی بۆ مرۆڤێکی ساغ لەسەر زەوی بوونی نییە؟.

لەمجۆرە ساتانەدا زۆر غەمگین دەبوو. کە ناچاردەبوو گومان لە زانستەکەی بکات، موچرکێک بە هەموو جەستەیدا تێدەپەڕی. زۆری پێ سەختبوو بگاتە ئەو بڕوایەی پزیشکیش وەک شیعر، وەک ئەدەبیات، وەک دەروونناسی هەر تلیاکێکی ترە، هەر داڕوپەکی بێهۆشکەرە تا مرۆڤ بەدبەختی و نوقستانی خۆی نەبینێت، چونکە لە هەرزەکارییەوە تاکە زانستێک باوەڕی پێی بووبێت پزیشکی و داڕوسازیی بووە، کە زۆر لە دین

و هونەر بەرزتر سەیریدەکردن، چونکە پزیشکی زانستی ئیرادەی ژیانە، لە کاتێکدا تەواوی زانستەکانی تر بە جۆرێک لە جۆرەکان لەگەڵ گەمەی مردندا تێوەگلاون... ئەوە ئازاریدەدا کە ئیتر بڕوای بەم زانستەش نەمێنێت.

چەند ساڵ دوای ئەو ڕۆژە بەهارییەی ساڵی نەوەدویەکی دکتۆر، کاتێک من باسی دوو دڵییەکانی خۆمم لەگەڵ فریشتەکەمدا دەکرد. لە باغچەیەکی بچوکدا، لە ناو گوڵ و گوڵزارێکی بەهاریدا قسەم بۆ دەکرد و گووتم «سەردەمانێک خولیام بووە ڕزگارتبکەم، سەردەمانێکیش خولیام بووە بتکوژم» وەک قسەکانی شوکاک چووبێتنە ڕۆحییەوە، دەستی خستە سەر شانم و گووتی «ئەوە خواستی ژیانە لە ناو تۆدا، گەرچی تۆ جگە لە وێرانکردن هیچی تر نازانیت، بەڵام شتێک لە ناوتدایە پێیدەگووترێت تینی ژیان، ئەو تینە نا کە وا لە پیاوێک دەکات عاشق بێت و ژن بهێنێت، بەڵکو ئەو تین و توانایەی وا لە گوڵێک دەکات لە سەهۆڵبەنداندا نەمرێت، وا لە ئەمیبایەک دەکات لە ژێر سەد پلەی خوار سفر دا بژی، وا لە کەسێک دەکات کە دەست و قاچ و چاو و گوێی نییە، حەز لە ژیان بکات ...». من ئەو کات نەمدەزانی ئەم قسانە چەندە لە قسەی شوکاک و فەلسەفەی سادەی ئەو پیاوەوە نزیکن... بەڵام ئێستا دەزانم، هاتوچۆی خەیاڵ و تێفکرینەکان لە نێوان مەهدائیل و شوکاک و وەفائیل و بولبولیاردا، چ بازنەیی و یەکانگیربووە. تا ئەوکات هیچم لەسەر بیروڕا تایبەتییەکانی دکتۆر نەدەزانی.

دکتۆر دوای ئەو چەند شەو و ڕۆژە نەگریسە لای دوژمنانی شەیتان، هەموو بەهانەیەکی هەبوو واز لە هەر کارێکی ئینسانی بهێنێت، بەڵام ئەوەی بە یادا هاتەوە شتێک ئەو ڕێزی لێدەگرێت ژیانە نەوەک مرۆڤ... «مرۆڤ لە هیچ تێناگات؟ ئێستا پێشیان بڵێم ئێوە ئازادن و ناچار نین هیچ لە هیچ ناگۆڕێت... هەزاران حەکیم و هۆشمەندی تر پێیانگووتوون و سوودیشی نەبووە».

بولبولیار یەکێک بوو لەو کەسە دەگمەن و کەمانەی دکتۆر هەستیدەکرد بەرپرس نییە لە کارەساتەکانی سەر ئەم ئەستێرەیە. هەستێکی سەیربوو بەرامبەر بولبولیار هەیبوو. لە ناکاو کەسێکی دەبینی و تەنیا بە سەیرکردن هەستیدەکرد ئەم مرۆڤە بەرپرس نییە لە کارەساتە گەورەکانی دونیا. هەستێکی ناوازە و نالۆژیکی بوو، بەڵام بەهێز و بێڕەحم، بێبناغەیەکی تەواو عەقڵی، بەڵام بە گوڕم و تینەوە هۆشی داگیردەکرد. ماوەیەک بوو دکتۆر لەدوای ڕەوەکەوە، دوای ئەوەی ئەو چیرۆکە سەیرانەی خۆپەرستی و سپڵەیی خەڵکی دەبیست، ئادەمیزادەکانی دابەشدەکردە سەر ئەوانەی بەرپرسن و ئەوانەی بەرپرس نین. هەموو مرۆڤە بێباکەکانی بەبەرپرس دەزانی کە شتێک بۆ ژیان ناکەن. ئێستا مرۆڤی وەک یاریزانێکی دووڕوو دەبینی، بوونەوەرێکە جگە لە دەمامک هیچ کات دەموچاوی نەبووە و نایبێت. بەڵام بولبولیار وانەبوو، مەخلوقێک بوو بە یەک ڕوخسارەوە، هەموو ئەوانی تر دەمامکیان هەبوو، بولبولیار تەنیا کەس بوو دەموچاوی هەبوو. لەو کەسانە بوو دکتۆر هەر کات دەیبینی هەستیدەکرد دەرکەوتنی جەشنە مرۆڤێکی دی جیاواز لەوەی ئەمرۆ لەسەر ئەم زەوییە دەژی، کارێکی دژوار و ئەفسانەیی نییە. جارێک ڕێزانی مەلەکبین لە باسی بولبولیاردا پێیگووتبوو «سەیر نییە بەلامەوە کە سەردەمێک مارکسی بووە، کە ئەم کوڕە دەیبینم هەستدەکەم هەر خەیاڵپڵاوێک زانا و فەیلەسوفە بەدبەختەکان لەسەر بەشەر نوسیویانە، شتێک لە ڕاستی تێدایە». جارێکیان مامۆستا سەلیم ئەسفەریش لە وەسفی بولبولیاردا بۆ خۆمی نووسی «کەسێکە لە یۆتۆپیاکانەوە هاتۆتەدەر». بەڵام بۆ دکتۆر شوکاک لەوساتەدا بولبولیار بەشەرێکی ئەستەم بوو، وەک کەسێک بە جۆرێکی بێمانا و کوشندە تاقانەیە. حەیوانێک کە جووتێکی لەسەر زەوی نییە زاوزێی لەگەڵدا بکات. بولبولیار لای دکتۆر هەژارترین پیاوی دونیا بوو، نەوەک بەو مانایەی خاوەنی هیچ نییە، بەڵکو بەو مانایەی جگە لە دەموچاوی خۆی دەموچاوی تری نەبوو ... هەژارترین مرۆڤ ئەوەیە لە ناو ئەم کەرنەڤاڵە گەورەیەی ژیاندا کە ئادەمیزادەکان پێویستیان بەدەیان دەموچاو، دەیان شانۆ هەیە،

دەموچاوێکی تری نەبێت. هەندێک مرۆڤ هەن هیچ گوناهێکیان نەکردوە، هەتا لە گوناهی ئەسڵیشدا بەشدارنین، هەتا شتێک لە تاوانەکەی ئادەمیشیان بەر نەکەوتووە، ڕۆحیان بەر لەوەی ئادەم سێوی گوناهەکان بخوات دروستبووە... ئەو بولبولیاری بە یەکێک لەو جنسە دەگمەنە لە قەڵەمدەدا، کە پێش ئادەم لە دایکبوون.

دکتۆر پیاوێکی کەللەڕەق بوو، کەسێک نەبوو ئاسان لەشتێک بیەوێت بگوزەرێت، بەڵام کێشەی ئەوەبوو تا ئەوکاتە لە ژیانیدا جگە لە شەهادەی کۆلێژی پزیشکی و جیا لە نەغەدە ماردینی، هیچی دی لە دڵەوە نەویستبوو. ئێستا جارێکی تر لە دڵەوە خواستی بوو بولبولیار ڕزگاربکات.

ئەو شەوە درەنگ بە تەنیا چووە دەرێ، دڵنیابوو بەدوایەوەن، دڵنیابوو چەند چاوێک هەوڵدەدەن ونی نەکەن، دەیزانی زیاد لە کەسێکن، ماشێنیان پێیە، هەندێکیان دەتوانن دابەزن، بەڵام دەبوو بێباک بسوڕێتەوە، خووی وای نەبوو بێئامانج بگەڕێت، پیاوی گەڕان و وێڵگەڕیی بێمانا نەبوو. کە لە بیمارستان دەوامی دەگەیشتە کۆتایی، لە ژوورەکەی خۆی دەمایەوە، سەرخەوێکی دەشکاند، شتێکی دەخوێندەوە، دوایی دەچوو بۆ یانەی پزیشکان، لەسەر مێزێکی تەنیا دادەنیشت، دەیخواردەوە، دەیخواردەوە، دەیخواردەوە تا شەو دەهاتە کۆتایی و بێئاگا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.

دکتۆر بڕیاریدابوو کە یەکێک لە هەرە باشترین و کلاسیکیترین تەکنیکەکانی خۆدزینەوە لە چاودێری بەکاربهێنێت، فێڵێک سەردەمی شاردنەوەی نزاریش بەکاریهێنابوو ... لە ڕاستیدا شارەزای تەکنیکی تر نەبوو. ئەویش بەوەی هێندە بسوڕێتەوە تا ئەوانەی چاودێریدەکەن ماندوودەبن و توانا و تاقەتی چاودێریان نامێنێت. پلانی وابوو لە مانۆڕێکی درێژ و گەورەدا، هەم پێ و هەم ماشێن بەکاربهێنێت، نەک هەر ئەوە، لیستێکی درێژی لە ماڵی خزمە هەرە دوور و نزیکەکانی خۆی دروستکرد، ئەوانەی چەندین ساڵە نەچۆتە ماڵیان کە لەو شەوانەدا

سەردانی هەموویان بکات، بە جۆرێک هێندە ماڵە و ماڵ بکات، هێندە خۆی بکات بەم ماڵدا و بێتەدەرێ، دواجار پێهەڵگرانی نەزانن چ شوێنێک نیازێتی. ئەو تەکنیکەی ناونا تەکنیکی «کلاوکلاوێنە»، ئەوەی وابکەیت بەرامبەرەکەت هەرگیز نەزانێت تۆ ئەنگوستیلەکەت لە کوێدا شاردۆتەوە. لەو شەوەوە دکتۆر زۆر شەو تەنیا بۆ سەر لێتێکدان دێتەدەرێ و بێئامانج دەسوڕێتەوە. گرنگ ئەوەیە کەس نەزانێت ئەنگوستیلەکەی لە کوێدا داناوە. دوای دوو هەفتەی بەردەوام لە سوڕاندنەوە و شەوگەڕی دکتۆر شەوێک دوای دڵنیاییەکی زۆر خۆی کرد بە لای بولبولیاردا کە هێدی هێدی لە خەڵوەتی درێژی خۆی وەڕزەبوو. دکتۆر شوکاک کورت و خێرا بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە و گووتی لە ئێستا بەدواوە دەبێت وەفائیل بێتەدەرێ و ئەرکی گواستنەوەی شتەکان لە ئەستۆ بگرێت. پێیگووت کە هاتنی دەبێتە مەترسی بۆ سەر ژیانیان، سەردانەکانی هەمیشە دەبێت بەشێک بن لە نەخشەی ناو یارییەک بە مەبەستی وێڵکردن و سەرلێتێکدان، بە جەشنێک نەیارەکان نەزانن کەی و چۆن و بۆچی لە کوێیە. نەتوانن لە نێوان چەندەها شوێنی جیاوازدا ئەنگوستیلە ونەکە بدۆزنەوە و دەریبهێنن.

وەفائیل هێدی هێدی دەبووە فریشتەیەکی سەرەحاڵ و وریا کە گەلێک نیشانەی زیرەکیشی پێوەدیار بوو. لەو فریشتانەی دەتوانن خۆیان لە شێوەی مرۆڤدا بپۆشن و خۆیان وادەربخەن وەک ئەوەی کەسێکی ئاسایین. دکتۆر شوکاک و بولبولیار دڵنیابوون جگە لە من هیچ کەسی دی ناتوانێت وەفائیل بناسێتەوە، بەڵکو ئەو دەتوانێت وەک پیاوێکی کەچەڵی سەرزل بە دەستێک جلی پیاوانەوە بێتەدەرێ و هەموو شار بگەڕێت بێئەوەی کەس بزانێت کێیە. ئەوان ڕەنگە لە توانای منیشدا بۆ ناسینەوەی وەفائیل زێدەڕەوییان کردبێت، لەو ساتەدا بەهانەیەکی ئەوتۆشیان نەبوو وابکات زۆر لە من بترسن، خولیای کوشتنی وەفائیل چەند مانگێک دواتر کەوتە سەری من.

ڕۆژی دواتر، دکتۆر دڵخۆش و سەراسیمە بوو کاتێک وەفائیل لە دەستێک جلی جواندا هاتە بەردەمی و لە ساڵۆنی گەورەی بیمارستانەکەدا، بە ڕێزی پیاوێکەوە لە مێژبێت ئەتەکێتی ژیان لە ناو ئادەمیزادە شارستانییەکاندا فێربووە، سڵاوی لە دکتۆر کرد. وەفائیل قیافەیەکی رێک و جوانی هەبوو، کراسێکی سپی خاوێن و قاتێکی ڕەش و جووتێک پێڵاوی چەرمی بریقەداری لە پێدابوو کە بەس خودا دەزانێت چۆن و لە کوێ دەستی خستبوون، بەو سەرە کەچەڵەوە پتر لە بەڕێوەبەری کۆمپانیایەک یاخود لە پزیشکێکی پسپۆڕی دەکرد لەوانەی جوان خۆیان بۆ دەرکەوتن لە کۆنفرانسێکدا دەپۆشن. دواتر وەفائیل هەمیشە بە روخساری پیاوێکی شیک و ڕێکپۆشەوە دەردەکەوێت، هەتا لە ڕۆژانی سەختی خۆشاردنەوەشدا دەستبەرداری ئەو جوانپۆشییە نابێت، وەک مەخلوقێک لە نیهادیدا گوزارشت لە خەونێکی من بکات بۆ جوانپۆشی کە خۆم هەرگیز پێی شاد نەبووم. وەفائیل ئەو ڕۆژە چووە لای دکتۆر تا دڵنیابێت دەتوانێت بێتەدەرێ و خۆی ئازادانە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر بجوڵێت. هەر هەمان ڕۆژ، دکتۆر وەفائیلی لەگەڵ خۆیدا سواری ماشێنەکەی کرد و هەموو جێگایەکی گرنگی پیشاندا، شاری گێڕا، پێیگووت دەتوانێت شتە پێویستەکانی خۆی لە کوێ بکرێت، ماڵەکەی خۆی پیشاندا، کلیلێکی بۆ دا بە کردن تا خۆی و بولبولیار لە کاتی تەنگانەدا سوود لە ماڵەکەی ببینن. گووتی، گەرچی شوێنێکی زۆر باش و ئەمین نییە، بەڵام لە کاتی ناچاریدا لە ناو شەقام و کۆڵانان چاکترە. ئەو ڕۆژە دکتۆر زۆر خۆشحاڵ بوو، بەسەرێک وەفائیل بووبوو بە فریشتەیەکی ئازا و ئازاد، بەسەرێکیش کاری ونکردن و پاراستنی بولبولیاری بۆ ئاسانتر بووبوو.

## یاداشتەکانی مەهدائیلی فریشتە «2»

کاتێک هاتمەدەرەوە، دونیا بۆ من هەم نامۆ و هەم سادە و ئاسایش بوو. فریشتە کە دێتە دەرێ، هەم شارەزای دونیایە و هەم شارەزاش نییە. دوای ئەو هەموو ساڵە دەتوانم بڵێم، دونیای ئێمە و دونیای ئینسانەکان وەک دوو شەقامی پێچاوپێچ و بەیەکداچوون. لە هەندێ جێگادا لەیەک دوور دەکەونەوە، لە هەندێ تەوەر و پنت و جێبڕدا لێکدەدەن و لەوێدا ئێمە و مرۆڤەکان بەیەکدەگەین، ئەم دوو شەقامە لە هەندێ جێگادا بە تەنیشت یەکدا درێژدەبنەوە، ئێمە و ئەوان ڕوو بە ڕوو یەکدی دەبینین، بەڵام بەیەک نامۆین، دیوارێکی شوشەیی ئەستوور جیاماندەکاتەوە، وادەکات لە یەکتر نەگەین و بە یەکتریش نەگەین. من دوای ئەو هەموو ساڵانەی زیندەگی هاوبەش لەگەڵ مرۆڤەکاندا، سەرنجمدا چۆن مرۆڤ هەیە دەتوانێت لەیەککاتدا لەسەر هەردوو ڕێگاکە بێت، دەتوانێت فریشتەکەی خۆی و فریشتەی ئەوانی تریش ببینێت، فریشتەش هەیە هەمان شێوەیە، دەتوانێت لە جیهانی خۆیەوە دەرچێت و بڕواتە سەر زەمینی مرۆڤەکان، هەم وەک فریشتە بێت و هەم وەک مرۆڤ.

من لەوانە بووم، لەو فریشتە بەدبەختانەی کە دەمکرا لە هەموو جیهانە شیاو و نەشیاوەکاندا بژیم، هەموو ڕوخسارە شیاو و نەشیاوەکانیش لە خۆ بگرم.

هەڵبەت ئەو فریشتەیەی دێتەدەرێ دەبێت تەندروستی باش بێت تا بتوانێت بژی، گەر وانەبێت ژیانی کورت و بێبەها دەبێت. فریشتەکان کەمیان دەژین، وەک چۆن ماسی لە دەرەوەی ئاو دەمرێت ئاوها چەند هەناسەیەک هەوا دەمژن و ژانێکی کوشندە سەر تا خوار داگیریاندەکات و

بۆ هەتاهەتایە دونیا جێدەهێڵن. ئەوانەی وەک من جەستەیەکی بەهێزیان هەیە، یەکەم شت دەیکەن ئەوەیە بۆ دەستێک جلی پاک دەگەڕێن، هەموو فریشتەیەک بە شەرمێکی قووڵەوە دێتە دونیا، هەڵبەت شەرم تەنیا لە لەشی خۆی نا، بەڵکو شەرم لەوەی توانای بەرگەگرتنی درێوییەکانی مرۆڤی نەبووە، شەرمی ئەوەی نەیتوانیوە وابکات خاوەنەکەی گوێی لێبگرێت ... فریشتە لە بوکێکی تورەی هەڵهاتوو دەچێت، کە دوای ئەوەی ڕوخساری ناشیرینی زاوای بینیوە، لە شەوی زەماوەندا بە ڕووتی لە پەردە هەڵهاتووە. هەمیشە دەبێت دەستێک جل بدۆزێتەوە، چونکە دەرەوە زۆر ساردە، دەرەوە وەک ناوەوەی ئینسان نییە، دەرەوە ماڵێکی گەورە و بێسنوور و فراوانە کە هەوا لە هەموو لایەکەوە دێت و با لە هەموو شوێنێکەوە هەڵدەکات. یەکەمجار کە بەر هەوای کراوە دەکەوین، ئەوە نوێترین و سەیرترین هەستێکە دامان دەگرێت، شتەکانی تر زۆربەیان ئاسایین بۆمان، بەڵام هەوا، بۆن، شێ، مەلمەسی شتەکان تازەن ... ئەوەی کۆنە بینینە، بیستنە، تامە. کە فریشتەیەک یەکەمجار ڕادەکات خۆی داپۆشێت، بەوە دەیسەلمێنێت هیچ نییە جگە لە مرۆڤ، مرۆڤ بە شەرم و غەم و دوودڵییە قووڵەکانییەوە.

من کە هاتمە دەرێ، سەرەتا هەوای سارد ئازاری دەدام ... هەر شەوی یەکەم زانیم بوونی پەناگایەکی باش بۆ فریشتەکان لە هەر شتێکی دی گرنگترە، یەکەمجار کە سەرم بەرزکردەوە و لە ئاسمانم ڕوانی، زانیم کە دەبێت جێگایەک هەبێت فریشتەکان بگرێتە خۆی، ماڵێکی گەورە، کۆشکێک، کوچەیەک، شارێک ... کە یەکەم شەو بە ئازادی سوڕامەوە و سەرما لێیدام هەستمکرد پێویستم بە پەناگایەکە لەو کزە تیژ و ئازار بەخشانە بمپارێزێت کە لە هەموو لایەکەوە دەهاتن و هەستێکی قووڵی نامۆییان تێدا دروستدەکردم. گەرچی بۆ مردن هاتبوومە دەرێ بەڵام ئێستا کە دونیام دەبینی، شەقامەکانی شارم دەبینی، هەندێ گوڵ و ئینجانەم لە پەنجەرەی ماڵاندا دەبینی، چاوم بە هەندێک منداڵ دەکەوت یاریدەکەن... لە ناکاو نەمدەویست بمرم . پێم دەچەقاند و نەمدەویست بمرم. هەموو

فریشتەیەک کە دێتەدەرێ بە نیازی مردن لە جەستەکان دەترازێت، یاخیبوون لە مرۆڤ لە خوێنی هەموو فریشتەیەکی ڕاستەقینەدایە. من لەو فریشتە بەهێزانەم کە زۆر ژیاوم، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بڵێم، من جگە لە ستایشی یاخیبوون هیچی دیم لە دەست نایەت. هەر یاخییەکی ڕاستەقینە دەزانێت، یاخیبوونی گەورە هەمیشە لە مەرگدا دوایی دێت، ئەو یاخیبوونەی لە مەرگدا دوایی نەیەت، یاخیبوونێکی ناتەواوە.

ئەوەی دوای ترازان زۆرتر و زۆرتر بژیم، بووە خولیای من. هەر لە ڕۆژانی سەرەتاوە هەستمدەکرد ئیشێک هەیە دەبێت بیکەم، بەڵام نەمدەزانی ئەو ئیشە چییە. شەوانی یەکەم لە بازاڕی گەورەی شار، لە ژێرخانێکدا جێگایەکی گەرمم دۆزییەوە و لەوێ دەخەوتم. هێدی هێدی توانیم خۆم وەک تەنێکی سەربەخۆ و بوونەوەرێکی ئازاد ببینم، کاتی خەو دەچوومە سەر دەیان فەردە گەنم و شتێکم لوولدەکرد و دەمخستە ژێر سەرم. شەوان کە دەچوومە سەر فەردە گەنمەکان و ڕادەکشام بیرم تەنیا لای ئەوە بوو ئاخۆ من تەنهام یان نا. لە هیچ شتێک تێنەدەگەیشتم، دەمزانی شتێکم و هەم، بەڵام هیچ بوونەوەرێکی ترم لە توخمی خۆم نەدەدۆزییەوە. هەستمدەکرد هەموو مرۆڤەکان لە ماڵی خۆیاندا ئاسوودەن من نەبێت. دوور بە دوور سەرنجی ژیانی مەهدیم دەدا، دەمبینی لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەخواتەوە، قوماردەکات و شەڕدەکات. بەڵام هاوڕێکانیشی هەموو وەک ئەو بوون، دەستوەشێن، جنێوفرۆش، چەقۆکێش. لە خۆم دەپرسی ئەی فریشتەکانی ئەوان کوان؟ بۆ من بە تەنها ترازاوم و خەبەرێک لە هیچ فریشتەیەکی تر نییە؟. سەرەتا چەند شەوێک ناو بازاڕ و کوچەکانی دەوروبەر گەڕام، ئومێدم بوو مەخلوقێک لە جنسی خۆم بدۆزمەوە، بەڵام هەوڵەکانم بێئەنجام بوون. لەو شەوانەدا هەستمکرد بە جۆرێک لە جۆرەکان پەیوەندییەکی نهێنیم لەگەڵ مەهدی خاوەنمدا ماوە. هەستێک بە درێژایی ژیان وازم لێناهێنێت و بەردەوام وەک موگناتیسێکی شەیتانی ڕامدەکێشێتەوە، لە هەندێ ڕۆژگاردا دەیخەمە پشت گوێ و لە هەندێکی تردا ئازارم دەدات. چاوم دەنوقاند و دەمبینی... هەندێجار

هەستێکی سەیرم هەبوو کە بڕۆم و ببیینم، زۆر ڕۆژ وام دەکرد، کە بمزانیایە هاتۆتە بازاڕ، دوور بە دوور چاودێریمدەکرد. ئەوە خواستێکە لە هەموو فریشتەیەکدا هەیە، بزانێت خاوەنەکەی لە کوێیە و چی دەکات، ئاخۆ لەسەر هەمان ڕێگای دێرین بەردەوامە یان ڕێگایەکی تری گرتووە، هەمیشە پەتێکی نەبینراو هەیە دڵی ئێمە بە ناخی ئەوانەوە گرێدەدات. من ڕۆژانی خۆم بەوە دەبردەسەر دوور بە دوور سەیری مەهدی بکەم، زۆرجار حەزمدەکرد بڕۆم و لەگەڵیدا دانیشم و خۆمی بۆ ئاشکرا بکەم. ئەوە خولیایەکی سەیرم بوو، خولیایەک دوور نییە ڕۆژێک بەدبەختمبکات. کە دەمبینی بەو باڵاو قامەتە زلەیەوە دانیشتووە و دۆمینەدەکات، ئارەزووم بوو سەیریبکەم و کۆمەکیبکەم. لە ناخەوە شتێکی خۆخۆر دەیجوڵاندم بچم و بڵێم من فریشتەکەی ئێوەم ... بەردەوام لە خۆمم دەپرسی، دەبێت بزانێت چی ڕوویداوە؟ دەبێت بزانێت من بەشێکم لە ئەو؟ دەبێت بمناسێتەوە؟ دەبێت بزانێت من ئەو نیوەیەی تری ئەوم کە دەکرا شتێکی باشتر لەو دروستبکەم و نەمتوانی؟ پێیبڵێم من ئەو ژیانەم کە ئەو نەژیاوە و ناژی. هەندێ جاریش دەکەوتمە گومانەوە، کێ دەڵێت من نەخۆشێک نیم ئەم مرۆڤەم لەخۆڕا خستۆتە خەیاڵی خۆمەوە؟ کێ دەڵێت کەسێک نیم کە ڕابوردووی خۆمم فەرامۆشکردوە و ئێستا بۆ شتێک دەگەڕێم خۆمی لە بێکەسی پێ ڕزگاربکەم؟ ساڵانێک دواتر هەندێ جار دەیدا لە کەللەم بڵێم، ئەم باڵانە هەر خەیاڵپڵاوی خۆمانە، فریشتە هەر کەسێکی بێکەسە کە یادەوەری خۆی لەدەستداوە و لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنیدا حاشا لە هەموو ڕابوردووی خۆی دەکات. هەندێ جاریش بە تەنیا گریاوم و گووتوومە، من تارمایم، من گیانی کەسێکی مردوم و لەسەر زەوی ئاوارە بووم. هەر چییەک بێت، ڕاستی بێت یان دەرد، مەهدیم بە درێژکراوەی خۆم دەزانی. مەهدی لەو سەردەمەدا وەک ئاژەڵ دەژیا، ئیتر سەردەمی ڕاوە شیوعی تەواو بووبوو. خۆی و هاوڕێکانی جگە لە سوڕاندنەوەی بێنیش و دانیشتن لە چایخانە و شەڕکردن لەگەڵ یەکدا کارێکی دییان نەبوو بیکەن. دوای ڕێکەوتنی حکومەتی بەغدا و بەرزانی ئەو نیازی بوو لە شاردا ببێت بە شتێکی گرنگ، بەڵام حیزب جگە لەوەی پێشنیاری

ئەوەیان بۆ کردبوو ببێت بە پۆلیس بە شایەنی پۆستێکی باشتریان نەزانیبوو، ئەویش نەیدەتوانی خۆی لە قەد و قیافەی پۆلیسدا ببینێتەوە. ئیتر جگە لەوەی بە کرێی دوو خانوو دەژیا کە لە باپیرییەوە بۆی مابووەوە کار و دەرامەتی دیکەی نەبوو. ئەو بێئیشییەی وایدەکرد لە گەڕان و شەوگەڕ دا زیادەڕەوییبکات. هێدی هێدی لە حیزب دابڕا، ڕۆژ دوای ڕۆژ دونیای هاوڕێکانی زیاتر دەیبرد و گێژیدەدا، ئەو کینە نهێنی و بێهۆیەی جارانی بەرامبەر شیوعییەکان تادەهات خاوتر و خاوتر دەبووەوە، بەڵام هیچ کات هەستم نەدەکرد، ڕۆیشتنی من کاریگەرییەکی قووڵی تێدا جێهێشتبێت. وەک خۆی بوو، بێباک، مەست، ژنباز ... پیاوێک بەردەوام بۆنی بەر چایخانەکانی شاری لێدەهات، بەردەوام بە دەموچاوێکی ماندووەوە کە بێخەوی یان زۆر چرچیکردبوو، بە کڵاشەکانی سەرپێیەوە، بە پشتێنە ڕەشە شلەکەیەوە، بە ڕۆشتنە گەڵاوگەڵەکەیەوە، بە ئەڵقە و زریزە زیوەکەی دەوری ئەنگوستی، خۆی وەک کەسێکی گرنگ پیشاندەدا بێئەوەی خۆشی بزانێت ئەم گرنگییە لە کوێوە هاتووە و بەچی دەستگیر بووە. لەو کەسانەبوو کە بێهۆ پێیانوایە دەرکەوتنیان کەموکورتییەکی گەورەی لە دونیادا پڕکردۆتەوە. بێئەوەی بزانن کە دەرکەوتنیان کەم و کورییەکی گەورەی بۆ دونیا زیادکردوە.

تەنهایی من لەو ماوەیەدا زۆر قووڵ بوو، بەڵام هێدی هێدی تێگەیشتم کە چەند فریشتەیەکی دیکە لەم شارەدا هەن. لە گەشتە بێوچان و بەردەوامەکانمدا هەندێ فریشتەی دیکەم دۆزییەوە کە زۆربەیان نەخۆش و بێناسۆ و تەنها بوون، لەو شەوانەدا ئیلهامێکم بۆ هات کە من بۆیە وا بەهێزم چونکە پەیامێکم هەیە، دەبێت شتێک بکەم ئەم بەدبەختانە ڕزگاربکەم، دەبێت شتێک بکەم زۆرتر و باشتر بژین. چونکە گەر وانەبێت دواجار هەموو سەرما و برسێتی و تەنهایی دەیکوشتین. زۆربەی کات کە دونیا تەواو تاریک دەبوو لە پاشماوەی جێشتخانەکاندا دەگەڕام ~ لە بەرمیلی خۆلی کوچەی سەوزە فرۆشاندا خواردنم دەدۆزییەوە و پاکم دەکردنەوە و دەمخواردن. ئەوەی یەکەمجار منی ڕاچڵەکاند دۆزینەوەی

تەرمی فریشتەیەکی مردووبوو. شەوێک بێهۆ و بێ بەهانەیەکی تایبەت، وەک ئەوەی ئاماژەیکی نهێنی و دەنگێکی دوور هەڵمبگرێت، لەسەر پێخەفە شاهانەکەی خۆم لە ناو فەردە گەنمەکاندا هاتمە خوار و وەک بەدەم خەوەوە بڕۆم، چووم بۆ گوزەری شوشەفرۆشان. دونیا هێمن و کوچە خاڵی و شەو لە ترۆپکیدا بوو. ڕێک وەک دەنگێک بەرەو خۆیم بەرێت، کوچە بە کوچە و گوزەر دوای گوزەر بازارم تەیکرد و خۆمکرد بە کۆڵانێکدا دەچووەوە سەر ڕاستەی زەڕەنگەڕان. لەوێدا لە نزیک وەجاقی خامۆشی کەبابچییەکەوە یەکەم فریشتەی ژیانم بە مردوویی بینی... فریشتەیەکی باریک و لاواز و بچوک، تەنیا کراسێکی درێژ و پانتۆڵێکی کۆن و ڕەشی لە بەردا بوو، باڵەکانی زۆر درێژ بوون، دواتر کەم ڕێکەوتی فریشتەی وەها چکۆلانەم کرد باڵی وەها درێژی بێت. وای باڵەکانی چەند درێژ و باریک بوون. من وەک موعجیزەم بینیبێت ئەبڵەق و ڕاماو چاوانم زەق بە غەمێکی قووڵ درەوشانەوە. چوومەسەری، گیانی تێدا نەمابوو، پێدەچوو زیاد لە ڕۆژێک بێت لەویادا مردبێت. دڵنیابووم کەس نایبینێت، بەڵام وەک لە مردن و ڕیسوایی خۆم بترسم دام بە شانمدا و هەڵمگرت و بردم. نەمدەزانی بۆ کوێی دەبەم. بەسەرێک دڵخۆش بووم، چونکە ئێستا دڵنیابووم جگە لە من ئەم شارە فریشتەی تریشی تێدایە، بەسەرێک ترساو و دڵ پڕ حەسرەت بووم، چونکە مردوویەک بە شانمەوە بوو و نەمدەزانی چی لێبکەم و بۆ کوێی بەرم... لەو ساتەدا هیچ خەیاڵێکم لای ئەوە نەبوو بیر لە دروستکردنی گۆڕستانێک بکەمەوە بۆ فریشتەکان یان ئاگاداربم کە لەم شارە عاجباتییەدا دەشێت جۆرە گۆڕستانێکی لەو چەشنە هەبێت.

تەرمی فریشتە نەناسراوەکەم پێبوو، دەڕۆیشتم و دەڕۆیشتم، هەفتەیەکی ڕێک ئەو تەرمە بەشانمەوە بوو، هەفتەیەک دامنەگرت، بۆ هەر جێگایەک دەچووم لەگەڵم بوو، باڵە درێژەکانی بەسەر شانمەوە شۆڕبووبوونەوە و لەزەوی دەخشان. هەتا لە کاتی خەویشدا بەدانیشتنەوە دەخەوتم تا تەرمەکە دانەگرم، نەمدەزانی چی لەو مەیتە بکەم، بەڵام سەعات دوای

سەعات و ڕۆژ دوای ڕۆژ سەنگی تەرمەکە سووک دەبوو لەسەر شانم تا خۆی هێدی هێدی بوو بە تۆزێکی سپی و بابردی. دوای ئەوە هێدی هێدی هەندێک فریشتەی ترساو و زیندووم بینی کە توانای قسەکردن و پەیوەندی گرتنیان لەگەڵ کەسدا نەبوو. فریشتەکان هەندێجار مەخلوقاتی بێدەنگ، ڕەمیدە و هەڵهاتوون. بە گشتی فریشتەکان کەم بوون، هەندێکیان کە منیان دەبینی لە تاریکیدا خۆیان وندەکرد و نەیاندەویست قسەم لەگەڵ بکەن، بەڵام دۆستایەتییەکی بچوکم لەگەڵ فریشتەیەکی تردا دروستکرد کە ناوم نابوو، فریشتەی یەکەمی گوزەری کۆنەفرۆشان. من خۆم زۆر حەزم لە گوزەری کۆنەفرۆشان بوو، جێگایەک بوو ڕۆژانە کاتی زۆرم تێدا دەبردەسەر. لەوێ جلی کۆن و پێڵاوم تاقیدەکردەوە، بەردەوام چی چاکەتێک یان پێڵاوێکم بەدڵ بووایە دەمپۆشی و دەکەوتمە تەماشای خۆم. ڕۆژێک لە کاتێکدا سەرقاڵی تاقیکردنەوەی ڕەینکۆتێکی جوان بووم. قۆڵم درێژکرد تا باڵی ڕەینکۆتەکە هەڵکێشم، لەویادا هەستمکرد بۆ یەکەمجار دەستم بەر باڵێکی نەرم و پەڕدار دەکەوێت، پشتی لە من بوو، بێئاگا لە دونیا خەریکی هەڵدانەوەی جلە کۆنەکان بوو تا کراسێکی گونجاو بدۆزێتەوە، من قۆڵی ڕەینکۆتەکەم هەڵکێشا و ئاوڕمدایەوە و لە دواوە بە هەموو قیافەی خۆیەوە بینیم. مەلەکێکی ڕاستەقینە بوو، باریک و بێگرێ، قیافەی هیچ لەو باڵا زل و ناقۆڵا و پیاوانەیەی من نەدەچوو، هیچ لەو فریشتە مردووە لاوازەشی نەدەکرد کە بەسەر شانی منەوە بووە تۆز، فریشتەی تەواو بوو، وەک ئەو فریشتانەی دواتر لەلای نیگارکێشە گەورەکانی مێژووی وێنەکێشان بینیمەوە. دەموچاوێکی ڕێک و لووتێکی قنج و پێستێکی کاڵ و قژێکی ڕەشی نەرم. من کە باڵە سپی و پاکژەکانیم بینی بێویستی خۆم گووتم «وای چ جووتە باڵێکی جوانن». من لە سەرسامیمدا وامگووت، بەڵام فریشتەکەی بەردەمم ترسا و بۆ ئێستێک لە شوێنی خۆی وشک بوو، بێئەوەی ئاوڕبداتەوە، جلەکانی دانا و ڕۆیشت. نەدەکرا بهێڵم بڕوات، بە هێمنی قۆڵیم گرت و لەدواوە چپاندم بە گوێیدا و گووتم «مەترسە، منیش فریشتەم». ئاوڕێکی لەسەرەخۆی داوە، چاوانی پڕبوون لە ترس، لە دوودڵی، لە تەنهاییەکی بێسنوور. دیمەنی زلی

من زیاتر ترساندی، بۆ ئەوەی دڵنیابێت باڵەکانمم بۆ کردەوە و پیشانمدا. ئینجا دەستم خستە سەرشانی و پرسیم «ناوت چییە؟». بێئەوەی لە یادم بێت کە فریشتەکان ناویان نییە. ناوی نەبوو، هەتا نەشیدەزانی فریشتەیە، مەخلوقێک بوو وەک من لە دونیایەکی تایبەتیدا دروست بووبوو، لە ناکاو خۆی لێبووبوو بە ڕاست و کەوتبووە ئەم دونیایەوە. سەیربوو، ئەو کاتەی لەوم پرسی ناوت چییە، منیش ناوم نەبوو، ئەو شەوە بردمەوە بۆ عەمبار و سەر فەردە گەنمەکانی خۆم، ئەو منی ناونا «فریشتەی سەر فەردە گەنمەکان»، منیش ئەوم ناونا «فریشتەی بازاڕی کۆنەکە». ژیانمان زۆر لە یەکدەچوو، ئەویش لە دەست گەنجێکی دڵڕەق هەڵهاتبوو کە جوانی و سامان کردبوویان بە دڕندە. ئێمەی فریشتە ژیانمان زۆر لە یەک دەچوو، هەموو هەڵهاتبووین، هەموو بۆ مردن هاتبووینە دەرێ، هەموو ساتێک بووین لە ساتەکانی حاشاکردنی مرۆڤ لە خۆی، کەسیشمان نە هیوا و نە چارەنوسمان نەبوو. سەیربوو دوایی بینیمان کە بازاڕی کۆنەفرۆشەکان شوێن سەردانی فریشتەکانی تریشە، لەوێدا سێ فریشتەی ترمان ناسی. یەکێکیانمان ناونا «فریشتەی شەو»، خانمێک بوو دەستێک جلی ڕەشی لەبەردا بوو کە پڕبوو لە ئەستێرە، فریشتەیەکمان ناونا «فریشتەی پشیلەکان» کە پیرێک بوو هەمیشە دوو پشیلەی پەڕۆی لە باوەشدا بوو، بە فریشتەکەی دیشمان دەگووت «فریشتەی گوزەری ئاسنگەڕان». من لە هەموو فریشتەکانی تر تەندروستیم باشتر بوو، هەر چوار فریشتەکەی تر لاوازیی و نەخۆشی بڕستی لێ بڕیبوون و لەسەرەخۆ دەیکوشتن. تەنیا فریشتەیەک بووم بیرمکردەوە کە دەتوانم خۆم تێکەڵ بە ئادەمیزادەکان بکەمەوە و دەستبکەمەوە بە ژیان، من کەم و زۆر بە پێی پلان و بە وریایەکی زۆرەوە هەندێ ناسیاو و هاوڕێی مرۆڤیشم گرت کە دڵنیابووم گومان لە بوونم ناکەن و وەک مرۆڤ دەمبینن. لەگەڵ فریشتەکانی هاوڕێشمدا هەفتانە چەند جارێک لای کۆنەفرۆشەکان یەکمان دەبینی، فریشتەی شەو لە مزگەوتی گەورەی شاردا دەژیا و شەو لەوێ دەخەوت، فریشتەی پشیلەکانیش لە یەکێ لە گەنجینەکانی زانکۆدا ژوورێکی چەپەکی

دۆزیبووەوە و شەوان لەوێ دەمایەوە. یەکەم فریشتە کە زوو ڕەنگوڕووی مردنی گرت فریشتەی گوزەری ئاسنگەران بوو، هیچ شتێک وەک مردن زوو ناگاتە سەر فریشتەکان. ڕۆژێک فریشتەی گوزەری ئاسنگەران نەهاتەوە، بوو بە دوو ڕۆژ، بوو بە سێ ڕۆژ، بوو بە هەفتەیەک دەنگی نەبوو. ناچار من و فریشتەی گوزەری کۆنەفرۆشان چووین بە دوایدا بگەڕێین، دوای دوو ڕۆژ گەڕانی بەردەوام، بینیمان سەرکەوتۆتە سەر درەختێکی بەرز و لە ترۆپکەکەیدا پاڵیداوە بە لقێکی ئەستوورەوە و سەری بۆ ئاسمان بەرزکردۆتەوە و مردووە. ویستم سەربکەومە سەرێ و دایبگرم، بەڵام هاوڕێکەم گرتمی و گووتی «نا... لێگەڕێ، ئەوە خەونی بووە لە وێدا بمرێت و سەیری مانگ بکات». دوای ئەوە هەموو ڕۆژێک من و هەر سێ فریشتەکەی دی دەچووین بۆ سەیری لاشەکەی بەو درەختە بەرزەوە، تا وردە وردە بوو بە تۆزێکی سپی و با لەگەڵ خۆیدا بەرەو نادیار هەڵیگرت. لە ماوەی ساڵێکدا هەموو هاوڕێکانم لەدەستدا، هەر سێ فریشتەکەی تریش لە دۆخی جۆراوجۆر و بە شێوەیەکی غەمگین تەنها جێیانهێشتم. فریشتەی شەو لە سەرەتای زستاندا نەخۆشکەوت و من هێنامە عەمبارەکە لای خۆم تا خزمەتیبکەم، بەڵام هەر زوو توانای خواردن و قسەی لەدەستدا و هەموو هەوڵەکانی من بۆ زیندوو ڕاگرتنی سوودیان نەبوو، دواجار لە چلەی زستاندا و لە ڕۆژێکی زەمهەریریدا مرد. فریشتەی گوزەری کۆنەفرۆشان لە ناکاو دیار نەما، ڕۆژێک ڕۆیشت و ئیتر نەمبینییەوە، چەند بە چەند لە دوای ئاسەوارێک و نیشانەیەکی گەڕام، بەڵام تا ئەمڕۆ هیچم دەست نەکەوتوە. فریشتەی پشیلەکانیش کە خۆی پیر بوو، پێدەچوو فریشتەی پیاوێک بێت کە منداڵێکی خۆی لە تەمەنی هەشت نۆ ساڵاندا لەدەستدابێت، ڕۆژانە دەچووە بەر دەرکی قوتابخانەیەکی سەرەتایی کچان و بەرامبەر دەرگاکەی دادەنیشت و لە منداڵە وردەکان ڕادەما. جارێک دوو ڕۆژ دیار نەما، بە دوایدا چووم بۆ نیشتەجێکەی خۆی لە زانکۆ، لەوێ نەبوو، دوایی چووم بۆ بەردەم ئەو قوتابخانە سەرەتاییە و بینیم پاڵی داوەتەوە بە دیوارێکەوە و پشیلە پەڕۆکانی توند نوساندوە بە خۆیەوە و مردووە.

لە هاوینی ساڵی 1973 دا بڕیارمدا واز لەو نازومەقامە بهێنم کە چیدی خۆم وەک فریشتە ببینم، هۆی گۆڕانکارییەکەم بە پلەی یەک دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی دڵنیانەبووم من چیم. من خۆم ناونابوو فریشتە، بەڵام هاوڕێ باڵدارەکانم خەبەریان لە شتی وەها نەبوو. دەبێت لێرەدا دان بەوەدا بنێم کە من لەگەڵ فریشتەکانی ئەو دەم و دواتریش لەگەڵ سەرنشینانی کەشتیی فریشتەکاندا درۆم لە ئەسڵ و فەسڵی خۆمدا کرد، خۆم وەک فریشتەی کەسێکی زانا نیشاندا، بۆ ئەوەی ئەو کەموکورتییە پڕبکەمەوە، بۆ ئەوەی نەڵێم لە قەبرغەی پیاوێکی نەزان هاتوومەتە دەر. دەستمکرد بە سەردانی کتێبخانەی گشتی، خوێندنەوەی ڕۆژنامەی ڕۆژانە، گوێگرتن لە ڕادیۆ، بەدواداچوونی هەواڵ بوونە خولیام، بە جۆرێک لە مرۆڤە ئاساییەکان پتر عەوداڵی دەنگوباس و کێشە جیهانییەکان بووم. هەتا بۆ ئەوەی خۆم وەک مرۆڤێکی ئاسایی ببینم و خۆم چیتر لە هیچ مرۆڤێک جیانەکەمەوە و خۆم نەشارمەوە، لە چێشتخانەیەکدا بوومە یاریدەدەری چێشتکەرەکان، کەسێک کە کاری قاپشتن و پاککردنەوە و سەوزە چاککردن و جنین دەکات. نزیکی ساڵێک تەواو ئەوەم لە بیر خۆم بردەوە فریشتەم، باڵەکانم لە خۆم و لە ئەوانی تریش پەنهانکرد، وەک هەر کەسێکی سادە کە بیەوێت ژیانێکی سادە بژی و دوای خەیاڵاتی بەد نەکەوێت، کەوتمە سەر سەری ژیانێکی نوێ. هاوڕێکەم «فریشتەی پشیلەکان» ڕای وابوو کە باڵەکانمان تەنیا باڵی خەیاڵین، باڵی فەنتازین، ئێمە چەند کەسێکین تووشی دەردێکی دەرونی بووین و دوو ژیان دەژین، بە جۆرێک ژیانی یەکەممان ئاگای لە ژیانی دووەم نییە، یاخود کەسانێکین بە کاری گورزێکی ڕۆحی کوشندە تەواوی یادەوری پێشینی خۆمان لەدەستداوە و پێمان وایە کە لە ڕۆحی کەسێکی ترەوە هاتووینەدەر. من بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو قسانە شتێکی ئەوتۆم نەبوو، نەمدەزانی ئەو هەستانەی لەلامە، ئەو یادگاریانەی هەمە سەبارەت بە ڕۆژانێک لەگەڵ مەهدیدا خولیایەکی نەخۆشانەیە، کەرتبوونێکی دەرونییە یان ترازانی ڕاستەقینەی فریشتەیەکە. دەبێت بڵێم لە کتێبخانەکاندا زۆر شتم خوێندەوە، بەڵام مرۆڤ جگە لە فریشتەی ئاسمان بیری بۆ بوونی

فریشتەی تر نەچووبوو. بۆم گرنگ بوو بزانم لە جێگایەکدا دەکەوم بەسەر چیرۆکێکدا کۆمەکمبکات لەخۆم تێبگەم. هەرچیم کرد و هەرچیم خوێندەوە سوودی نەبوو. دیارە زۆر شت فێربووم، ئاشناییەکی قووڵترم بە مرۆڤ پەیداکرد، بەڵام زانیارییەکانم هەمووی لەو جۆرە بوون کە کۆمەکیاندەکردم لە مرۆڤ تێبگەم نەوەک لە خۆم. ونبوونی چەند ساڵەم لە کتێبخانەی شاردا تێیگەیاندم کە مرۆڤ هەمیشە تەنیا سەرقاڵی تێگەیشتن بووە لە خۆی، مرۆڤ هەتا کە دەیەوێت بزانێت لەوسەری گەردون چی ڕوودەدات مەبەستێتی ئەو زانیاریانە بخاتە خزمەتی خۆیەوە. مرۆڤ کە سەیری ئاژەڵ دەکات و دەیەوێت بزانێت چۆن ڕەفتار دەکات، مەبەستی نییە لە ئاژەڵان تێبگات، بەڵکو مەبەستێتی لە خۆی تێبگات. مرۆڤ ئەو مەخلوقەیە کە هەموو شتێک دەگۆڕێت بۆ ئاوێنە و لە ناویدا سەیری خۆی دەکات، کە سەیری هەور دەکات خۆی دەبینێتەوە، کە سەیری دەریا دەکات بۆ نهێنی ڕۆحی خۆی دەگەڕێت، کە سەیری گوڵ دەکات دەیەوێت لە جوانی خۆی وردبێتەوە... کە باس لە بەرد، لە ئاو، لە شەیتان، لە شەو، لە بروسکە دەکات، هەمیشە و هەمیشە تەنیا بەدوای خۆیدا عەوداڵە. بە جۆرێکیش مەبەستێتی خۆی لە هەموو شتەکاندا ببینێتەوە، لە دەرەنجامی ئەو گەڕانەدا هەمیشە خۆی وندەکات. من لە ڕێگای شەونخونی زۆرمەوە بەسەر کتێبەوە تێگەیشتم کە مرۆڤ کاتێک باس لە فریشتەکان یان باس لە خودا دەکات بۆ ئەوەیەتی خۆی ببینێتەوە. مرۆڤ بۆیە سەدان هەزار کتێب و چیرۆکی لەسەر فریشتەکان نوسیوە، چونکە ویستوێتی و توانیوێتی خۆی لەو فریشتە ئاسمانیانەدا ببینێتەوە، بەڵام ئێمە پێچەوانە بووین، ئێمە لەو جۆرە فریشتانە بووین کە مرۆڤ خۆی تێدا نەدەبینییەوە، فریشتە نامۆکانی ناخی مرۆڤ تاکە شتن مرۆڤ خۆی لە ناویاندا نابینێتەوە. من لە ساڵی 1973 و 1974 دا زۆر دەچوومە کتێبخانەی گشتی، لەوێ چەند فریشتەیەکی ترم بینی کە وەک من دەهاتن و باڵی خۆیان شاردبووەوە و دەیانەویست لە شتێک تێبگەن، بەڵام وەک سوێندێکی نهێنی لە نێوانماندا بێت، وەک پەیمانێکمان بەستبێت، کەس خۆی بۆ ئەوانیدی ئاشکرا نەکات، بەلای یەکدا دەڕۆیشتین و بە چەشنی

کەسانی ئاسایی ڕەفتارماندەکرد. دواتر کە ئەلیائیلم ناسی، سەرم سوڕما کە زانیم ئەو منی یەکەمجار لە کتێبخانەی گشتی بینیوە. ئەو مێملی کتێب بوو، ڕۆشنفکرترین فریشتەیەک بوو تا ئەمڕۆ دیبێتم، تاکە فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە لەم شارەدا ڕێکەوتمکردبێت، ئەو چەندین جار منی بینیبوو، دەیزانی لە کوێدا دادەنیشم، چۆن دادەنیشم، چی دەخوێنمەوە، بۆ چ زانیارییەک دەگەڕێم. ئێستاش لە خۆم دەپرسم ئاخۆ ئەلیائیل لە هوشیارییەکی زۆرەوە، دوای گەڕان و پشکنینێکی درێژ منی هەڵبژاردبوو تا بمکەنە کلیل بەدەستی کەشتیی فریشتەکان، یان شتەکان ڕێکەوتی ڕووتبوون. من یادم نییە ئەلیائیلم لە کتێبخانەی گشتی بینیبێت، گەرچی دواتر، چەند ڕۆژێک پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات، پێکەوە چووین بۆ کتێبخانەکە. تەواو بێهێز بووبوو، بە ئەستەم قسەی بۆ دەکرا، بە ئەستەم دەیتوانی باڵی بجوڵێنێت، بەڵام خۆشییەکی زۆری بە کتێب دەهات. یەکە یەکە ئەو جێگایانەی پیشاندام کە لە ساڵۆنی خوێندنەوەکەدا لێی دادەنیشتم، هەندێ لەو کتێبانەی پیشاندام کە دەمخوێندنەوە. دڵنیابووم لێکچوونێک لە نێوان من و گەنجێتی خۆیدا دەبینێت، بە هەیکەل و باڵایدا دیاربوو چ فریشتەیەکی بەهێزبووە، چ زانایانە توانیوێتی لە نێوان ئینسان بوون و فریشتەبووندا خۆی بگونجێنێت. ئەو ڕۆژەی مرد لە بەیانییەوە دیار نەما، من و ڕێزانی مەلەکبین هەموو ژوورەکانی بۆ گەڕاین و نەماندۆزییەوە، باغەکەمان پشکنی، سەردابی کۆشکەکە چووین، گۆڕستانەکە بە جوانی گەڕاین، بەڵام لە هیچ کونجێکەوە دیارنەبوو. ڕێزان خانی مەلەکبین بێئەوەی زۆر بیربکاتەوە، منی سوار تاکسییەک کرد و چووین بۆ کتێبخانەی گشتی، من گومانم هەبوو بەو بێهێزی و کەمتینییەی خۆیەوە توانیبێتی بە تەنیا بگاتە ئەوێ، بەڵام ڕێزان بەردەوام دەیگووت «تۆ دەمت داخە، تۆ هیچ نازانیت». کە چووین بینیمان، لە ناو کتێبەکاندا پاڵکەوتبوو، دیوانێکی بابا تاهیری عوریانی خستبووە سەر سنگی و لەوێدا مردبوو. پێدەچوو هیوای ئەوەی لە کتێبخانەیەکدا بمرێت گەورەترین ئاواتی بووبێت، نەیویستبوو ئەو ئاواتە بچوکەشی نەیەتەدی، کاتێک دڵنیابووبوو دەمرێت،

هاتبوو، بە بێدەنگ، بێئەوەی بهێڵێت هیچ ئادەمیزادێک بیبینێت، وەک فریشتەیەکی پیر لە ناو کتێبەکاندا مردبوو. لاشەکەیم دا بە شانمدا و تا کەشتیی فریشتەکان هەڵمگرت، گەرچی فریشتەکان بە مردوویی زۆربەیان سووک و کەم کێشن، بەڵام ئەو لە مردنیشدا بێکێش و سووکەدەست نەبوو. ئەو خۆی جارێک پێیگووتم «ئەوە بکە بە دەلیلی خۆت: فریشتەی ڕاستەقینە لە مرۆڤی ڕاستەقینەوە زۆر نزیکە. بەو مانایە نا کە هەردووکیان دوو بوونەوەری باشن، بەڵکو بەو مانایەی هەردووکیان دوو بوونەوەری نائومێد و تێکشکاون». ئەو ڕۆژە کە لاشەکەی ئەوم هەڵگرت و گەڕاینەوە، ئەو ڕۆژە بوو لە ساڵی 1974 کە جەنگ لەسەر داگیرکردنی چیاکانی دەوروبەری شار لە نێوان دەوڵەت و هێزەکانی پێشمەرگەدا زۆر گەرم بوو، کە هاتینە دەرەوە گوێمان لە ناڵە و زرمەی ئەو گوللە تۆپانە بوو کە سوپا لە پایگای سەربازیی شارەوە دەیتەقاندە چیاکان. ئەو کات ماوەیەکی کەم بوو چوو بوومە کەشتیی فریشتەکان، چەند ڕۆژێکیش بوو بووبووم بە هەڵگری کلیلی کەشتییەکە، هێشتاش ڕێزانی مەلەک تەواو متمانەی پێم نەبوو. کە شەڕ دەستی پێکردەوە، من زۆر نەبوو دەستم لە چێشتخانەکە هەڵگرتبوو و لای ئەوان دەژیام. دۆزینەوەی کەشتییەکە بۆ من سەیرترین و کاریگەرترین ڕووداوی ژیانم بوو. بینینی ئەلیائیل و دۆزینەوەی ئەو جیهانە نهێنی و شاردراوەیە، شتێک بوو لە دەرەوەی بڕوا و خەیاڵیش. ئەلیائیل گووتی کێشەی فریشتەکان کێشەیەکی هێندە تازە نییە لە شاردا، بە درێژی باسی ژیانی خێزانی مەلەکبینی بۆ کردم، ئەو کات خانمی ڕێزان زۆر نەبوو لە بیمارستانی نەخۆشە دەروونییەکان لە بەغداوە گەڕابووەوە. کە من چووم هێشتا ئاسەواری شێتییەک لە چاو و شێوەی سەیرکردنیدا بوو. هەڵبەت ڕاستییەکەی بۆ من ڕێزان خان هیچ کات شێت نەبووە، دەشێت خوو و ڕەفتاری لە خەڵکی سادە نەچوو‌بێت، لە عەوامی خەڵک، بەڵام هیچ کات جگە لە مرۆڤێکی تایبەت بە تێڕوانینی تایبەت و ژیانی تایبەتەوە، بە شێوە قسەکردنێکی ناوازە و شێوە ڕەفتارێکی ناوازەوە هیچی تر نەبووە. شێتەکان ئەوانەن کە دەیانەوێت هەموو مرۆڤەکان لە یەک بچن،

پێوانەکانی مرۆڤ بۆ شێتی و عاقڵی گەورەترین بەڵگەی نەفامی عاقڵەکانە. ڕێزان کچێکی منداڵکاریی تەنها بوو، بەڵام بە ئیرادەیەکی بەهێزەوە کاروباری کەشتیی فریشتەکانی گرتە دەست. کاتێک من چوومە کەشتی زۆربەی شتەکان قاڵبێکیان گرتبوو کە دەستکاریکردن و گۆڕینی ئاسان نەبوو، کەشتییەکە سەرەتا تەنیا شوێنی حەوانە بوو، لەگەڵ گۆڕستانێکدا کە یادی فریشتە بەدبەختەکان هەڵبگرێت و بیپارێزێت. تا دکتۆر شوکاک دەرنەکەوت فریشتەکان وەک نەخۆشی ئاسایی سەیر نەدەکران و پزیشکێک نەبوو بیانبینێت، بەڵکو وەک جۆرە کەسانێک کە بۆ مەرگێکی هێمن دەگەڕێن و لەوێ دوا ڕۆژەکانی ژیانی خۆیان دەبەنە سەر. بە کورتی مەیتەمێکی تایبەت بوو، کە مردووەکانی ماوەیەکی زۆرتریان دەویست تا گیان بەدەستەوە دەدەن. هەڵبەت ئەلیائیل لە یەکەمین فریشتەکان و دامەزرێنەری زۆرینەی نەرێت و کولتوورەکانی کەشتی بوو. خولیای ئەو بۆ خوێندنەوە و سەرسامبوونی بە چیرۆکەکان بەرەو ئەو بڕوایەی برد کە گەڕان بۆ جۆرە ژیانێکی تر لە چیرۆکدا کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ڕۆحی فریشتە نەخۆشەکان هەیە و دەتوانێت کۆمەکیانبکات زیاتر بژین، ڕێزان خانی مەلەکبینیش ئەو خولیا و ئایدیایەی ئەوی وەرگرت و گەورەتریکرد. ئەلیائیل سەرەتا پێیوابوو لە ڕێگای چیرۆکەوە دەتوانین ژیانی فریشتەکان تا ناکۆتا درێژ بکەینەوە، وایدەزانی مەخلوقات تا ئەوکاتەی چیرۆکێکیان هەیە نامرن. یەکەمین جار من لە دەمی ئەوەوە بیستم کە شتێک نییە ناوی ژیان بێت، ئەوەی هەیە تەنیا چیرۆکە... چیرۆکی کورت، درێژ، ناکۆتا، ئاڵۆز، تێکەڵاو، سادە، پێکداچوو، بێ سەرەتا، بێ کۆتایی، خۆش، ناخۆش. لە ڕاستیدا ئەلیائیل مامۆستایەکی دڵسۆزی من بوو، گەرچی ماوەیەکی زۆر کورت پێکەوە بووین، بەڵام پەلەی بوو هەموو زانیارییەکانی خۆی بدات بە من، پەلەی بوو هەر دەرەنجامێک پێیگەیشتووە بیگوازێتەوە، هەموو خەونی ئەوە بوو ڕۆژێک کتێبێکی گەورە لەسەر ئەم دونیایەی ئێمە بنوسرێت کە هیچ نەبێت لایەنی کەمی ئەم چیرۆکە لەفەوتان ڕزگاربکات، بەڵام بەردەوام دەیپرسی کێ هێندە بەدبەختە دانیشێت ژیانی خۆی نەژی و بوونی خۆی و هێزی

خۆی لەوەدا سەرفبکات، شتێک بنوسێت کە ڕەنگە هەرگیز نەخوێندرێتەوە، کەس تێی نەگات، کەس نەگاتە شیکردنەوەی تەلیسم و شفرەکانی ناوی... کێ خۆی دەخاتە بەر تانەی واقعبینە گەمژەکان، کە سنووری بینینیان، ئەوپەڕی تا سەر لووتی خۆیان دەگات؟ چ بەدبەختێک؟ چ مرۆڤێک دەتوانێت عومری خۆی لە نوسینەوەی هەزاران لاپەڕەی وا غەمگیندا بباتەسەر؟ دەبێت کێ بێت و چ بێچارە و تەنها بێت، چ کەسێکی غەمگین و بێهاودەم بێت، کە بەردی وەها سەنگین بنێتە سەر شانی و بێهیوا تا لوتکە سەریبخات؟. منیش بۆ ئەوەی کاری وا نەدات بە ملمدا پێدەکەنیم و دەمگووت «ئەلیائیل، ڕۆژێک مرۆڤێکی خەیاڵاتی هەر پەیدا دەبێت، کە هێندەی عاشقی نهێنی ئینسان بێت خۆی بخاتە ژێر بارێکی وەها ئەستەمەوە». کە وام دەگووت ئەلیائیل هەمیشە دەیوەستاندم و دەیگووت «بوەستە، بوەستە. تۆش مەبە بە ئینسان لێم. مەبە بە ئینسان لێم، من قسەم لە چیرۆکی هەموو مەخلوقاتە، هەموو زیندەوەران، هەر شتێک ڕۆحی تێدا بێت». ئەلیائیل ڕایوابوو چیرۆک تایبەت نییە بە مرۆڤ، بەڵکو تایبەتە بە هەموو مەخلوقاتێک، هەتا ئەمیبایەکی چکۆلانە، هەتا فایرۆسێک چیرۆکێکی ژیانی هەیە کە جیاوازە لە چیرۆکی ئەمیبایەک یان فایرۆسێکی تر، درەختێک چیرۆکێکی هەیە جیاواز لە چیرۆکی درەختێکی تری تەنیشتی... ئەو یەکەمجار پێیگووتم ئەوەی پێیدەڵێین ژیان ئەو چیرۆکەیانە کە ناچارین تیا بژین. ئەوە ئەو چیرۆکەیانە کە هیچ بوونەوەرێک ناتوانێت لێیدەرچێت، هیچ بوونەوەرێک خۆی ناینوسێت، هەمیشە دەست و قەڵەمی هێزگەلێکی تری گەورە لە پشتەوە تیا بەکارن، قەڵەمی سروشت، قەڵەمی خودا، قەڵەمی یاسا کوێرەکانی گەردون، قەڵەمی ڕێکەوت، قەڵەمی مێژوو، قەڵەمی ئێرە، قەڵەمی ئێستا، قەڵەمی ئەوانەی مردوون، قەڵەمی ئەوانەی دێن، قەڵەمی ئەو شتانەی لێرەن، قەڵەمی ئەو شتانەی دەبوو لێرەبن، قەڵەمی ئەو شتانەی کە جارێک لە جاران بوون، قەڵەمی ئەو شتانەی کە نەدەبوو هیچ کات ببن... ئەو ڕایوابوو بەشی هەرە زۆری بوونەوەران ناتوانن شتێکبکەن لەو ناچارییە دەرچن، لەو زەبرە ڕەش و زۆردارەی ناویدەنا «دونیا».

بەڵام لە قووڵایی هەموو بوونەوەرێکدا، هاوارێکی نەبیستراو هەیە، کە هاوارە بۆ ئەوەی ببێت بە شتێکی تر. هیچ بوونەوەرێک نییە نەیەوێت ببێتە بوونەوەرێکی تر، ئەوەی خۆڵە دەیەوێت ببێت بە گیا، ئەوەی گیایە دەیەوێت ببێت بە درەخت، ئەوەی درەختە دەیەوێت ببێت بە باڵندە، ئەوەی باڵندەیە دەیەوێت ببێت بە مرۆڤ، ئەوەی مرۆڤە دەیەوێت ببێت بە فریشتە، ئەوەی فریشتەیە دەیەوێت ببێت بە بوونەوەرێکی مەحاڵ کە نەدەزانێت چییە و ناوی بۆی نییە. ئەلیائیل دەیگووت، ئەوە چۆن بۆ ئەمیبایەک ڕاستە، بۆ خوداش ڕاستە، ئەوەی گەردون بەردەوام لەدروستبووندایە، بەڵگەیە کە خودا دەیەوێت ئەمڕۆی لە دوێنێ نەچێت، خودا گەر بیوستبایە دوێنێی وەک ئەمڕۆی بێت زەمەنی دروست نەدەکرد، زەمەن بەڵگەی هەرە گەورەی ئەلیائیل بوو لەسەر بوونی خودا، لەسەر گۆڕانی بەردەوامی ... بەوەدا زەمەن هەیە، خودای ئەمڕۆ ناشێت هەمان خودای دوێنێ بێت، زەمەن ئەو ڕووبارە گەورەیەیە کە خودا دروستیکردوە تا خۆی لە ناودا بگۆڕێت. ئەلیائیل تاکە فریشتەیەک بوو کە باوەڕی بە بوونی خودا هەبوو، هەموو فریشتەکانی تر بەفیترەت بێباوەڕ بوون، من لەسەروو هەموویانەوە. خودا بۆ من هەمیشە تەنیا بیرۆکەیەک بووە، شتێک نییە وەک خۆر ببینین و بڵێین ئەوەتا دیارە و بەمجۆرە کار لە بوونمان دەکات، بەڵام لای ئەلیائیل نا، خودا و گەردون لەیەک جیانەدەکرانەوە، خودا بوونەوەرێکی هەمەڕەنگ بوو کە لە عەقڵی مرۆڤدا بچوک بۆتەوە و دینە جیاوازەکان کردویانە بە شتێک زۆرتر لە دێوێکی زۆردار دەچێت تا خودا. ئەلیائیل زۆرجار بۆ من ئاڵۆز بوو، لە هەندێ جێگادا دەیگووت «ئەم گەردونەی ئێمە ڕەنگە خەونی گەردونێکی دیکە بێت، وەک چۆن گەردونێکی تر هەیە کە خەونی ئێمەیە. خودا ئەو ئوستادە گەورەیەیە کە بوار دەدات خەیاڵی تۆ حەقیقەتی من بێت، حەقیقەتی تۆش خەیاڵی من بێت». ڕای وابوو هەموو بوونەوەرێک خەونی خۆی هەیە، لە ناو سەری هەموو بولبولێکدا، هەموو پاساریيەکدا، هەموو مارمێلک یان قالۆنچەیەکدا خەونێک هەیە، خەونێک ڕەنگە وەک خەونی من و تۆ نەبێت... بەڵام خەونە. لێرەدا هەمیشە من بە گومانەوە

سەیرمدەکرد، هەمیشە دوودڵ چاوم تێدەبڕی و بە تێفکرینەوە تەماشامدەکرد. ئەوە زۆر ناڕەحەتیدەکرد، زۆر لەوە دەترسا وەک پیرێکی خەرەفاو و گەمژە سەیربیکەم کە تەنیا شت دەبزرکێنێت، هەمیشە لەویادا بە توندی دەستی ڕادەوەشاند و وەک بیەوێت شتێکی زۆر ترسناکم تێبگەێنێت کە تا ئێستا جگە لەو هیچ بوونەوەرێکی دی تێینەگەیشتووە، دەیگووت «گوێبگرە، دەبێت تێبگەیت کە چیرۆک لە ژیان گرنگترە. گەر لەوە تێنەگەیت ناتوانیت ببیتە فریشتەیەکی باش، هەمیشە وەک ئەم فریشتە نەخۆشانە دەبیت، کە لەسەر نوێنی خۆیان ڕادەکشێن و دەمرن. دەبێت بزانیت ئێمە حەقیقەت نین، ئێمە چیرۆکێکی ترین... مەبە بە کەرێکی واقعی». کەری واقعی لای ئەو کەسانێک بوون کە دەیگووت «وجودی گەورە» بە «وجودی بچوک»ـی خۆیان دەپێون. من ماوەیەکی زۆر دواتر و ساڵانێک دوای مردنی ئەلیائیلیش بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەلیائیل مەبەستی چی بووە دەمێک زۆربەی ئادەمیزادەکانی بە کەری واقعی ناودەنا، بەڵام وەک دەڵێن زەمان وەڵامی هەموو مەتەڵێکت دەداتە دەست. من تا دەچوومە تەمەنەوە و بیرم لە خۆم و لە دونیا و لەو دەکردەوە، زیاتر تێدەگەیشتم کە مەبەستی ئەلیائیل کێ و چی بووە، دەمێکیش بەو دکتۆر شوکاکە شێتە ئاشنابووم، پتر تێگەیشتم مانای چی مرۆڤ بوونی مەزنی گەردون تەنیا بە بوونی بچوکی خۆی بپێوێت. «چیرۆک» لای ئەو ژیان بوو، کاتێک دەکەوێت بەسەر دیوێکی تری خۆیدا، کاتێک لە جەبری دونیا دەردەچێت، بۆ ئەوەی جوڵەیەکی مەحاڵ بکات، ئازادیەکی مەحاڵ لەسەر زەمینێکی مەحاڵدا بەدەست بهێنێت. دیار بوو کتێبی فەلسەفی زۆری خوێندۆتەوە، ساڵانێکی زۆری لە کتێبخانەی گشتی بردبووە سەر، هەموو ژیانی بۆ تێفکرین لە گرفتی بوونی خۆی تەرخانکردبوو. لەدوا ڕۆژەکانی ژیانیدا دەیویست کارێکبکات، بۆچوونەکانی بگەنە کەسێک بتوانێت بیانپارێزێت. من جگە لەوەی قسەکانیم لە سەری خۆمدا هەڵگرت، لەو ساڵانەی دوایشدا کە شوکاک هاتە لامان و بوو بە بەشێک لە تاقمی کەشتییەکە، بۆچوونەکانی ئەلیائیلم بۆ ئەویش باسدەکرد و کاریگەرییەکانیشم بە ڕوونی لە لای دکتۆر دەبینییەوە. بەر لە

مردنی بەچەند ڕۆژێک بانگیکردم و گووتی «ئەوەی وام لێدەکات باوەڕ بە بوونی خودا بهێنم چیرۆکە. تەنیا خودا دەتوانێت هەموو ژیانەکان بژی، هەموو شتەکان بێت، هەر یەکێک لە ئێمە بەشێکین لە زیندەگییەکی مومکینی خودا، گەورەیی خودا لە خەلقی جیهاندا نییە، جیهان کۆتایە، ئەوەی دیوە ناکۆتاکەی بوون ئاشکرادەکات چیرۆکە، حەقیقەت هەمیشە تێپەڕە، تەواودەبێت، بەڵام چیرۆک دیوە ئیلاهییەکەی جیهانە هەرگیز کۆتایی نایەت، نابڕێتەوە». بەڵام بڕوایەکی زۆر ترسناکی هەبوو کە دەبوو لە هەموو دیندارێکی سەر زەوی بشاردرێتەوە، باوەڕی وابوو هیچ کتێبێک لەو کتێبانەی مرۆڤ بە ناوی خوداوە دەیانناسێت، کتێبی ئەو نین، چونکە خودا کتێب نانوسێت، چونکە گەر کتێبی نوسی واتە دەڵێت ئەمە منم و ئەوی تریان من نیم، ئەوەش کەمکردنەوەیە لە ناکۆتایی ئەو، کەمکردنەوەیە لە بێسنووریيە موتڵەقەکەی. «بۆ دەبێت خودا کتێبێک بنوسێت، لە کاتێکدا هەموو کتێبەکانی تریش هەر موڵکی ئەون؟»». چەندجار ئەو پرسیارەی لێ دووبارەکردمەوە. من گووتم «ئەلیائیل، ئەم قسانە مەکە، نە خودا قەبووڵێتی، نە مرۆڤ ... بۆ ناوی خۆت لەو نێوەدا خراپ دەکەیت». دەیگووت نا، کتێب خودا دەگۆڕێت بۆ مەخلوقێکی کۆتا... کە لە جێگایەکدا دەردەکەوێت و لەجێگایەکی تردا دەرناکەوێت، بەزمانێک قسەدەکات و بەیەکێکی تر نایکات، فەزڵی عەسرێک دەدات بەسەر عەسرێکی تردا... بەڵام خودا کاتێک خودایە کە هەموو چیرۆکەکان و هەموو زمانەکان و هەموو سەردەمەکان بێت پێکەوە. هەتا کافرەکانیش بەشێکن لە بیرکردنەوەی خودا لە بوون و نەبوونی خۆی، کتێبەکانی کوفریش بریتین لە ساتێک لە بیرکردنەوەی لۆژیکیانەی یەزدان لە شێوە بێسنوورەکانی وجودی خۆی. دوایی تێگەیشتم کە چەندە لە ژێر کاریگەریی سۆفییە گەورەکاندا بووە، وە چەندە ترسناکە ئەم قسانەی بگاتە ئەم سەردەمە و بەزاری ئەوەوە بڵاوببنەوە. دەمێک من ئەم بۆچوونانەم بۆ دکتۆر شوکاک دەگواستەوە، بە وردی و شەیداییەکی زۆرەوە گوێیدەگرت، هەستدەکەم دکتۆر تا ئێستاش لە ژێر کاریگەریی وشەکانی ئەلیائیلدا بێت، زۆرجار ڕستەکانی ئەوم لە دەمی ئەمەوە

دەبیستمەوە، دەمبینی بە جۆرێکی نوێ دایاندەڕێژێتەوە و تێکەڵ بە تێڕوانینەکانی خۆیی دەکات. زۆرجار کە دکتۆر هەندێ لەو ڕستانەی ئەلیائیلی دەگووتەوە، پێدەکەنیم و دەمگووت «گەورەترین قوتابی ئەلیائیل، تۆیت نەوەک من».

نا منیش زۆر ورد گوێم لێگرت، جبەیەکی سپی دابوو بەسەریدا و گۆچانێکی زۆر کۆنی بەدەستەوە بوو، بە ئەستەم دەیتوانی باڵەکانی بجوڵێنێتەوە، دەنگی زۆر نوسابوو، بەتانییەکی ڕەشی دابوو بە ئەژنۆیدا و وەک یەکێک دواهەمین قسەکانی ژیانی خۆی بکات سەیریدەکردم و دەدوا، من هێندەم شارەزایی لە دیندا هەبوو بزانم ئەگەرچی ئەلیائیل قسە لە ئیمانی خۆی دەکات، بەڵام تێڕوانینی لەگەڵ شێوەنیگای دینداارانی ئەم شارەدا جیاوازە و ئەگەر بیبیستن دەیکوژن. بەڵام ئەلیائیل خۆشبەخت بوو، بەر لەوەی سەردەمێک دابێت ئەو کێشانە بەڕاستی قووڵ ببنەوە، کۆچی دوایی کرد. کە قسەی بۆ دەکردم دەستی دەلەرزی، دڵنیابوو کێشەم لە تێگەیشتنی بۆچوونەکانیدا هەیە، بەڵام دەشیزانی من فریشتەیەکم دەتوانم دوای مردنی ئەویش هەوڵبدەم تێبگەم. گووتی «مرۆڤ و مەخلوقات ناتوانن هەموو ئەو ژیانانە بهێننە دی کە لە ناویاندا نوسراوە، جگە لە خودا کەس ناتوانێت هەموو چیرۆکەکانی خۆی بژی. خودا ئەو بوونەوەرەیە کە حەقیقەت و حیکایەت تێیدا لە یەک جیانابنەوە. هەر مرۆڤێک یەک ژیانی پێدەدرێت، هەر مێرولەیەک یەک ژیان، هەر درەختێک یەک ژیان، هەر باڵندەیەک یەک ژیان، بەڵام هەر یەکێک لەوانە ناکۆتا چیرۆک لە بوونیان دەبێتەوە، چیرۆک دیوی ناکۆتای شتەکانە، ئەو دیوەیانە کە هەمیشە لقی لێدەبێتەوە، شەپۆلی لێدەبێتەوە. باڵندەیەک بە هەر ئاڕاستەیەکدا بفڕێت هەر یەک ژیانی هەیە، ناتوانێت لەیەک کاتدا بەلای چەپ و بەلای ڕاستیشدا بفڕێت، بەس خودایە کە دەتوانێت لە یەک کاتدا بەلای ڕاست و بەلای چەپیشدا بفڕێت. چیرۆک تەنیا کەرەستەی خودایە بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی وجود، مرۆڤ تەنیا لە ڕێگای چیرۆکەوە دەتوانێت بۆشاییە پیس و چەپەڵەکانی ئەو بوونە سنووردار و

نەخۆشەی پێیدەڵێین دونیا پڕیکاتەوە. هەمیشە لە پاڵ هەموو ساتێکی وجوددا، هەموو شێوەیەکی وجوددا ناکۆتا چرکەی ون هەیە. مەهدائیل گوێبگرە، جوان گوێبگرە، ئەوەی پێتدەڵێم زۆر گرنگە... هەندێجار هەندێک لەو چرکە ونانە لە مەحاڵ دەردەچن، وەک چۆن لە ناکاو لە جنسێکی گوڵەوە گوڵێکی تر دروستدەبێت، لە دوو باڵندەی ڕەشەوە باڵندەیەکی سپی دروستدەبێت، لە شەیتانێکەوە کەسێکی جوان دێتەدەرێ، لە جەنگەڵێکی تاریکەوە پەپولەیەکی ڕۆشن دێتەدەرێ. ئاوها ڕێدەکەوێت چیرۆکەکانیش دەبن بە ڕاست. چیرۆک دوا هەوڵی خودایە بۆ بینینی هەموو شیاو و نەشیاوەکان... بوونی ڕاستەقینەی بێسنوور هەمیشە لە چیرۆکدایە... گرنگ نییە تۆ چیت، تۆ کێیت، سەر بە چ نەتەوەیەکی، لە چ سەردەمێکدا دەژیت، هەمیشە ئەوەی بوونی من تەواودەکات، بوونی تۆ تەواودەکات چیرۆکەکانمانە... تۆ من تەواو ناکەیت، من تۆ تەواو ناکەم. ئەوەی ئینسانەکان پێکەوە گرێدەدات، نە نەتەوەیە و نە زمان، بەڵکو ئەو ڕاستییەیە کە دەشێت من چیرۆکی دووەمی هەر مرۆڤێکی تر بم. هەر مرۆڤێکی ئەم سەر زەمینەش ژیانێک بێت لە ژیانەکانی من. نەتەوە یان زمان یان دین چییە لە بەردەم ئەو ڕاستییەدا کە تۆ بەشەکەی تری منیت. هەموو کەسێکی ئەم دونیایە هەر تۆ خۆتی، بەڵام لە شوێنێکی تر و لە بەرگێکی تردا دەژیت». من پرسیم «ئەلیائیلی بەرێز، گەر ئێمە هەین، مرۆڤەکان بۆ نازانن کە لێرەین؟. چی وادەکات مرۆڤ دەرک بە بوونی فریشتەکان نەکەن، بۆ نامانبینن و هەستمان پێ ناکەن؟». ئەلیائیل سەری ڕاوەشاند و گووتی «ئەوە یەکێکە لەو پرسیارانەی وەڵامی نییە. مرۆڤەکان وەک چۆن خودا نابینن، ڕۆحی خۆیان نابینن، عەشقی خۆیان بەدەست بۆ ناگیرێت، بەوجۆرەش ئێمە نابینن. بیهێنە پێشچاوی خۆت، کە تۆ ماسییەکی لە بنی دەریادا، لە قووڵایی ئۆقیانوسێکی دووردا، ماسییەک هەرگیز ناتوانێت سەر زەوی ببینێت، ڕۆژێک بەدکارێک دێت و باسی ئەم دونیای سەر زەوییە بۆ ئەو ماسییە بەستەزمانە دەکات، باسی مرۆڤی بۆ دەکات. ماسییەکە چی دەکات؟ چۆن دەتوانێت باوەڕبکات یان نەیکات؟. هەمیشە ئەو جیهانە

وەک شتێک دەمێنێتەوە کە لە نێوان ئەگەر و نەگەردایە، چیرۆکێکە. هەموو دونیای دەرەوەی ئاو، بۆ ماسییەک لە بنی دەریادا، جیهانێکی خەیاڵییە، چیرۆکێکی فەنتازییە ... وەک چۆن خودا بۆ مرۆڤ تەنیا چیرۆکێکە. چۆن ماسییەک ناتوانێت لە پلەی بوونی خۆیەوە بازبدات و دڵنیابێت مرۆڤ هەیە یان نییە، مرۆڤیش ناتوانێت لە سەتحی خۆی بەرزبێتەوە و بفڕێت و ببینێت و تێبگات خودا چییە. مرۆڤەکان ناتوانن لە شوێنی خۆیانەوە، لە زیندانی بوونی خۆیانەوە بازبدەن و ئێمە ببینن و تێمانبگەن، چونکە من و تۆش لە ئاستێکی تری بووندایین. وەک چۆن خودا هەتاهەتایە چیرۆکێکە بۆ مرۆڤ کە لە ئەگەری بوون و نەبوونداییە، وەک چۆن شارەکانی ئێمە بۆ ماسییەکان تا هەتاهەتایە چیرۆکێکن لە ئەگەری بوون و نەبووندان، ئێمەش بۆ مرۆڤەکان تا هەتاهەتایە لە ئەگەری بوون و نەبووندایین، لە نێوان ڕاستی و درۆدا جۆلانێدەکەین. مرۆڤ لە بوونەوەرێک دەچێت لە نهۆمی باڵەخانەیەکدا بژی، هیچ دەرفەتێکیشی نەبێت بزانێت چی لە نهۆمەکانی تردا دەگوزەرێت، کێشەی گەورەی مرۆڤ ئەوەیە هێشتا نازانێت تەنیا لە ناو نهۆمێکی ئەو باڵەخانەیەدایە، هێشتا وادەزانێت نهۆمەکەی خۆی هەموو گەردونە. هەر شتێک ئەوەی بیربخاتەوە کە ئیمانەکانی پوچن ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە. مرۆڤەکان دەبێت لە یەک بچن، هەر کات کەسێکت بینی گوتی نامەوێت لەوانی تر بچم، بڕوای پێمەکە... ئینسان مەخلوقێکی درۆزنە، زۆر کەم ڕێدەکەوێت ئینسان تاسەر دوای درۆ و دەلەسەی جنسەکەی خۆشی نەکەوێت، لە ئادەم و حەواوە درۆزنن، قارەمانی تاکیشیان بە دەگمەن تیا هەڵدەکەوێت. هیچ کات متمانەی تەواوم پێ نەکردون، خۆیان کۆپیدەکەنەوە، خۆیان دووبارەدەکەنەوە، هەر یەکێکیان باوەڕی بە درۆیەک هێنا، دەبن بە دووان، دەبن بە دە، دەبن بە سەد، ئیتر لەوانەیە ببن بە هەزاران و ملیۆنەها. ئەم بوونەوەرە چاوی نییە، چاوی هەمیشە چاوی ئەوانی ترە. من و تۆ نابینن چونکە هەموو پێکەوە بڕیاریانداوە نەمانبینن. هەر شتێک ئەوانی تر نەیبینن مرۆڤ بۆی گرنگ نییە. کاتێک باس لە چاوی خوداش دەکەن هەر باس لە چاوی خۆیان دەکەن ... ئینسان دەیەوێت ببینرێت، بۆیە

خوداشی دروستکردوە تا ببینێت، هەر شتێک نەبینرێت و نەیبینێت نرخی نییە لەلای. خوداشی بۆیە دروستکردوە تا پێیبڵێت سەیرمکە چەند جوانم، چەند باشم، چەند لە تۆ دەچم. خودا لای مرۆڤ ئاوێنەیە و هیچی تر، ئاوێنەیەک کە لە ئاسمان دانراوە. ئەمانەی من بینیومن، خودایان بۆ ئەوە دروست نەکردوە بیپەرستن، بەڵکو بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بەراوردبکەن، خۆیانی پێ بپەرستن. بە خودا دەڵێن، چۆن من خۆمت لە پێناودا بە کوشتدەدەم، سوژدەت بۆ دەبەم، ستایشتدەکەم، تۆ نەمریم پێببەخشە. خودا لای زۆربەیان لە دوکاندارێک دەچێت کە شتێکی دەدەنێ و شتێکی لێدەکڕن. چۆن بوونەوەری وەها دەتوانێت فریشتەی خۆی ببینێت... چۆن؟ فریشتە باڵندەیەکی غەمگینە. مرۆڤ هەموو ئەو شتانەی غروری بریندارەدەکەن و جوانی و باشییە درۆزنەکانی ئاشکرادەکەن دەباتە ژێرەوە و بیریاندەباتەوە. مەهدائیل... باش گوێبگرە، مێژووی مرۆڤ بریتییە لە مێژووی خۆجوانکردن. هەر شتێک بیریانبخاتەوە کە گەورە و مەزن و جوان نین، وێرانیدەکەن، لە ژێرزەمینەکانی دەروندا دەیشارنەوە. من و تۆ لە تاریکی ئەو زیندانانەوە هەڵهاتووین، دوو زیندانین و ئەم کەشتییەش دوا پەناگامانە. ناتوانین مرۆڤ ڕزگاربکەین، هیچ کات فریشتەکان ناتوانن مرۆڤ ڕزگاربکەن. فریشتە و مرۆڤ دوو شتی جیاوازن و بە جیاوازی دەمێننەوە».

من زۆر شت لە ئەلیائیلی فریشتەوە فێربووم، لەسەروو هەموویانەوە نهێنی تێنەگەیشتنی مرۆڤ لە فریشتەکان، بەڵام هیچ کات لەگەڵ ئەوەدا نەبووم فریشتەکان سەر بە دونیایەکی جیاوازتر بن. بەر لەوەی من بگەمە کەشتیی فریشتەکان، بۆچوونەکانی ئەلیائیل لەوێ باڵادەستبوون، ئەلیائیل چەندە خودا و مرۆڤی دوور لە یەکتر دەبینی، فریشتە و مرۆڤیشی لە یەک دونیادا بۆ کۆنەدەکرایەوە، دواتر دەیان فریشتەی دیکەشم بینی وەک ئەلیائیل بیریاندەکردەوە، بەڵام من نا... من هەمیشە دۆستی مرۆڤ بووم، بەو مانایەی بوونی خۆم و بوونی ئەوانم بۆ لە یەکتر جیانەدەکرایەوە. دوای مردنی ئەلیائیل من دەستمکرد بەو چاکسازییە جەوهەرییە کە دەبوو

رووبدات، چاکسازییەک ڕەنگە هەڵە بێت یان مایەی بەدبەختی بێت، بەڵام من دونیام بەوجۆرە دەبینی. فریشتەی ڕاستەقینە دەبێت بگەڕێتەوە و بزانێت چی لە مرۆڤ دەوێت، دەبێت چیرۆکە جیاوازەکەی خۆی ئاشکرابکات، دەبێت مەلەکبینەکان کۆمەکمانبکەن مرۆڤ بمانبینێت... ئەلیائیل لەگەڵ شاردنەوەی هەرچی زیاتر و زیاتری فریشتەکاندا بوو، تێگەیشتنی مرۆڤی لە ئێمە بە مەحاڵ دەبینی، بەڵام من ڕام وابوو ئێمە بەسەرێک ژیانی فریشتەکان بپارێزین، بەسەرێکیش تا دەکرێت لە مرۆڤ نزیکببینەوە. منیش ترسی گەورەی خۆم هەبوو، منیش دەمزانی مرۆڤ دەتوانێت چ بێڕەحم و دڕندە بێت، من زیاتر لە ئەلیائیلیش مێژووی ئەو دوو هەزار ساڵەی دواییم خوێندبووەوە. من شەوانێکی زۆر لە یانەی پزیشکان کە لەگەڵ دکتۆر شوکاکدا تۆزێک شەرابمان دەخواردەوە و سەرمان گەرمدەبوو، کاتێک ئەو دەکەوتە دووبارەکردنەوەی تیورەکانی خۆی، من دەمگووت «شوکاک مرۆڤ لە ئادەم و حەواوە هاتبێت یان لە مەیمونەوە، لە خانەی خوارەوەی سەر پەیژەی بوونەوەران بێت یان خانەی سەرەوە، هیچ لە هیچ ناگۆڕێت. ئەم قسانەی تۆ ڕەنگە لە ڕووی زانستییەوە و بۆ کتێب نرخێکیان هەبێت، بەڵام لە ڕووی کردارەوە قڕانێکی سواو و سەلکێک توری ڕزیو ناهێنن... مرۆڤ باش بێت یان خراپ، لەسەرەوە بێت یان خوارەوە، مرۆڤە. لەو زیاترمان نییە. نەخودا تازە کورە و کارخانەکەی دەخاتەوە کار شتێکی چاکتر دروستبکات، نە سروشت دەتوانێ لە چاککردنیدا پەلەبکات». زۆرجار بۆ تورەکردنی دکتۆر شوکاک وام دەگووت، زۆرجاریش لە نائومێدییەوە، بەڵام هەموو هەوڵم ئەوە بوو بڵێم، مرۆڤ چەند بەدکاریش بێت، چەند دڕندەش بێت، لەو زیاترمان نییە پشتی پێببەستین. نەمدەویست ئومێدم بە مرۆڤ بمرێت، لە بەر مرۆڤ نا، بەڵکو لە بەر فریشتەکان، چونکە بە چاوی خۆم دەمبینی فریشتە بێ مرۆڤ هیچ نییە جگە لە گیانێکی پەژموردە و لەشێکی بێسوود و نەخۆش.



ئەوەی لە هەموو ئەم چیرۆکەدا شوێنی سەرنجە، سەربوردی عەرەبانەی فریشتەکانە.

یەکەمجار ئەلیائیل بەرپرسی عەرەبانەکە بوو، بوونی عەرەبانەیەک تەنیا فریشتەکان بیجولێنن، یەکێکە لە تەلیسمەکان. هیچ کەس تا ئەمڕۆ نازانێت ئەو عەرەبانەیە چییە و لە کوێوە هاتووە، هێندە هەیە شتێکە پابەندی بوونی ئێمەی فریشتەیە. عەرەبانەیەکە تەنیا فریشتەکان و مەلەکبینەکان دەتوانن بیبینن، وەک دەڵێن یەکەمجار حاجی ئیسماعیلی مەلەکبین بە منداڵی لە دەشتاییەکی بەردەم ماڵی خۆیاندا بینیوێتی، ئەو تاکە کەسی دەوروبەری خۆی بووە کە توانیویتی بیبینێت، بێئەوەی بتوانێت بیجولێنێت یان جێگاکەی بگۆڕێت. لە منداڵییەوە هیچ کەس باوەڕی بە ئیسماعیل نەکردوە کە جۆرە عەرەبانەیەکی وا هەیە. پێدەچێت ئیسماعیل منداڵێکی خەیاڵاتی بووبێت و زۆرجار شتی ناوازە و سەیری دیبێت کە لە دەرەوەی توانای ئەوانی تردا بووە ببینن، هەر لێرەوە لە منداڵییەوە تۆمەتی شێتی و نەخۆشی دەرونیان داوەتە پاڵ. دیارە منداڵەکە، لە سەرەتاوە ڕۆحێکی پاکی فریشتەیی بووە، پێدەچێت زۆر فریشتە و مەخلوقاتی باڵداری بینیبێت، بەڵام نەیوێرابێت هەموو شتێک بدرکێنێت. ساڵەهای ساڵ جگە لەو هیچ ڕۆحلەبەرێک ئەو عەرەبانە دانراو و فەرامۆشەی نەبینیبوو، کە وەک ئامێرێکی نهێنی بێت و لە کەشتییەکی ئاسمانی جێمابێت لەو دەشتەدا فراوان و ڕووتەنەدا دانرابوو. وەک لە حاجی ئیسماعیلی دەگێڕنەوە , ئەو سەردەمی مێردمنداڵی زۆر شەو بەدەم خەوەوە هەستاوە و چووە لەسەر عەرەبانەکە خەوتووە، هەتا دەنگۆیەکی لەسەر دروستبووە کە ئیسماعیل سیحربازە و دەتوانێت لە هەوادا بە هەڵواسراوی بخەوێت. دەمێک ئیسماعیل گەورە دەبێت بۆ ئەوەی تۆمەتی شێتی و سیحربازیی لە خۆی دووربخاتەوە، دەکەوێتە بازرگانیی و گەڕان و

کاڵا هێنان و کاڵا بردن، تا ڕۆژێک ماندوو دەبێت و دەکەوێتە سەر هەوای کۆکردنەوەی موڵک و زەوی و زاری زۆر. ئەو ماوەیە تەواو هێزی بینینی عەرەبانەکە لەدەستدەدات، ڕۆژێک هەڵدەستێت و دەبینێت چیتر نە عەرەبانەکە لەو جێگایەدایە و نە دەتوانێت فریشتەکان ببینێت. لەو ساڵانەدا ئیسماعیل حەج دەکات و دەبێتە حاجییەکی بێڕەحم و چڵێس کە تەنیا تەماعی کۆکردنەوەی پوڵ و پارەی زۆرترە. ناوی دادەکەوێت و دەبێتە دڵڕەقترین کەسێک تا ئەوکاتە خودا لەو شارەدا دروستیکردوە.
ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە دوای ترازانی حاجیئیلی فریشتە لە جەستە و ئێسک و خوێنی حاجی، دوای ئەوەی پەیوەندییەکی تایبەت و ناوازە لە نێوان حاجیئیل و ئیسماعیلدا دروستدەبێت، دوای ئەوەی ئەو دوژمنایەتییە ناوەکییەی نێوان مرۆڤ و فریشتەکەی دەبێتە هاوڕێتییەکی دەرەکی کە لە بری ئەوەی لەسەر یەکبوون و توانەوەی ڕۆحی بەند بێت، لەسەر گفتوگۆ و گووتەی عاقڵانە دادەمەزرێت. حاجی لە ناکاو تێدەگات چ کارەساتێکی گەورەیە مرۆڤ فریشتەکەی خۆی لەدەستبدات، ئەوە هەستێکە کەمایەتییەکی بچوک لە ئادەمیزادان هەیانە، تەنیا ژمارەیەکی کەم لە خەڵک دەتوانن لە دیوی جەرگبڕ و دڵتەزێنی مردنی فریشتەیەک تێبگەن، پێدەچێت ترازانی فریشتەکە و مانەوەی لە ماڵی حاجیدا لە بەرچاوی خۆی، هۆیەک بووبێت ئیسماعیل بەسەر چیرۆکی ژیانیدا بچێتەوە و بەراوردێکی ورد لە نێوان لەزەت و شادییەکانی سەردەمی منداڵی و سەردەمی پارەداریدا بکات و ببینێت چ بەختەوەرییەکی گەورەیە، مرۆڤ لەگەڵ فریشتەکەی ناو گیانیدا تەبا بێت. ئەوەی من لە ئەزموونی خۆمەوە لەگەڵ ئادەمیزاداندا تێیگەیشتووم ئەوەیە کە قووڵترین و گەورەترین بەختەوەرییەکانی ژیان، ئەو جۆرە شادی و دەستکەوت و بەختەوەریانەیە کە مرۆڤ نایانبینێت. بەدبەختی مرۆڤ هیچ کات لەوەدا نییە کە بە فیترەت و لە ئەزەلەوە بەدبەختە، ئەوە شتێکە من تێیدا تەواو دژ بە موستەفا شوکاک بووم کە مرۆڤی وەک ئاژەڵێکی ترازیدی دەبینی، بەدبەختی مرۆڤ لەوەدایە کە هیچ کات ناتوانێت تێبگات چ خۆشبەختە وە چ بەختیارییەکی قووڵی لە بەردەستدایە و هەستی پێ ناکات. مرۆڤ

ئاژەڵێکە چاوی تەنیا لەسەر ئەوە ڕاهاتووە بۆ نەگبەتی خۆی بگەڕێت، هونەر لە دروستکردنیدا بنوێنێت، وەستا بێت لە وێرانکردنی خۆیدا، بێئەوەی هیچ کات ئەو هەموو هێزە گەورەیەی خۆشی، ئەو هەموو بەهانە گەورەیەی کامەرانی لە خۆی و دونیادا بدۆزێتەوە. لەو ساتەدا کە فریشتەکەی حاجی دەترازێت، ئەو بە وردبینییە سەیر و زیرەکییە ئەفسانەییەکەی خۆی دەستی دەگات بە جەوهەرێکی نهێنی و گەوهەرێکی درەوشەداری ژیان... گەوهەری بەختیارییە نهێنییەکان، گەوهەری ئەوەی توانایەکی سەیری ژیان و شادی لە ناو مرۆڤدا پەنهانە و تا ئەمڕۆ نەیبینیوە، ترازانی فریشتەکەی دەیخاتە بەر ترسی ئەوەی مانای ژیان بدۆڕێنێت.

لەگەڵ دروستبوونی هاوڕێتییەکی قووڵ و ڕاستەقینە لە نێوان حاجی ئیسماعیل و فریشتەکەیدا، توانای مەلەکبینین دەگەڕێتەوە بۆ حاجی، لەوێدا حاجیئیل ئەو ڕستە عاجباتی و سەیرە دەدرکێنێت کە ساڵانێکی زۆر وەک دروشمێک لە هەموو ژوور و ڕیواق و داڵانەکانی کەشتیی فریشتەکاندا هەڵدەواسرێت «مرۆڤ دەتوانێت مرۆڤ بێت، هەتا ئەگەر هەزاران شەیتانیش بیخەنە بەر پەلاماری خۆیان». ڕستەیەک ڕێزان خانی مەلەکبین تەواو لەگەڵیدا ناتەبابوو، ئەو ڕای وابوو مرۆڤ هیچ نییە جگە لە درۆی فەیلەسوفەکان، ئاژەڵێکە و تەنیا خەسڵەتی ئەوەیە جل لە بەردەکات، زۆرجار دەیگووت «گەر مەیمون خەیاتی بزانیایە، ئێستا دەبوو ئێمە شەربەتی مۆزی بۆ دروستبکەین».

دوای مردنی حاجی ئیسماعیل، ڕێزان خانی مەلەکبین بەدەستی خۆی لە هەموو جێگایەکی کەشتییەکەدا ئەو ڕستەیەی لێکردەوە و قەدەغەشیکرد هیچ فریشتەیەک بەوجۆرە قەدرزانییەوە باس لە مرۆڤ بکات. حاجی ئیسماعیل لە سەرەتاوە ڕای وابوو کە مرۆڤ خۆی فریشتەیە، فریشتەکانیش هیچ نین جگە لە فریشتەیەک لە ناو فریشتەیەکدا، بەڵام ڕێزان خانی کچی کە بە هۆی نەخۆشی و غەمۆکی و ڕەفتاری وەسواسانەوە دووچاری شێتخانەکان بووبوو، باوەڕی پێچەوانە بوو،

زۆرجار کە نائومێد دەبوو بە غەمگینی و حەسرەتێکەوە دەیگووت «مرۆڤ شەیتانێکی گەورەیە کە لە ناخیدا شەیتانێکی بچوکتری شاردۆتەوە، لە بەر بەدبەختی خۆمان ئەو شەیتانە بچوکترە ناودەنێین فریشتە». من نازانم خانم لەو ڕووەوە تا چ ئەندازەیەک بڕواکانی بەهێز و پتەون، بەڵام تا ئەو جێگایەی من خانم دەناسم و لەگەڵی دەژیم، بە درێژایی ژیانی نە ئومێدی بە مرۆڤ بووە و نە بە فریشتە. زۆرجار بە من دەڵێت «بەساقە، مەیمونەکان وەرم ناگرن، ئەگین حەوت زەمان بوو گەڕابوومەوە ناویان».

کە حاجی ئیسماعیل هێزی مەلەکبینی تێدا دروستبووەوە، یەکەمین شتێک تووشی سەرسوڕمان و گێژی کرد، بینینەوەی عەرەبانەی فریشتەکان بوو لەو دەشتاییە بەرینەی پێش ماڵی خۆیاندا. عەرەبانەکە لەوێدا بوو، وەک چۆن بیست ساڵ لەوەوبەر بۆ دواجار لەسەری خەوتبوو، وەک چۆن لە یادەوەریدا هەڵیگرتبوو، وەک هەمان ئەو وێنەیەی لە منداڵییەوە لە خەیاڵیدا چەسپ بووبوو. ڕۆژێک خۆی و فریشتەکەی چوونە بەردەمی ئەو عەرەبانەیە و لەگەڵ ئەو پەڕی سەرسامی حاجیدا بینی کە حاجیئیل چ ئاسان دەتوانێت بیجوڵێنێت. ئامێرێک ئەو ساڵەهای ساڵ نەیتوانیبوو سانتیمێک لە شوێنی خۆی دووری بخاتەوە. حاجیئیل ڕای وابوو ئەو عەرەبانەیە ئامێرێکە نەسلێکی پێشووتر لە فریشتەکان لەوێدا جێیان هێشتووە تا نەوەی نوێی فریشتەکان بزانن پێش ئەوان فریشتەی بەدبەختی تر لێرەدا ژیاون. ئەلیائیلی فریشتەش عەرەبانەکەی وەک تاکە دیارییەک حسابدەکرد کە نەسلێک لە فریشتە دەتوانن بۆ نەسلێکی تری جێبهێڵن... ئەوە تەنیا شتێک بوو فریشتەکان دەیانتوانی بیسەلمێنن مەخلوقاتێکن جیاواز لە مرۆڤ، جوڵاندن و نەجوڵاندنی ئەو عەرەبانەیە وەک هێڵی جیاوازیی و سنووری جیاکەرەوەی مرۆڤ وابوو لە فریشتەکان. هەموو مەخلوقێک بۆ ئەوەی ببێتە شتێکی جیاواز لە بوونەوەرانی تر، دەبێت شتێک بتوانێت کە ئەوانی دیکە ناتوانن ئەنجامیبدەن، وەک چۆن پڵنگێک یان شێرێک یان مەیمونێک ناتوانێت ماشێنێک یان فڕۆکەیەک لێبخوڕێت، هیچ مرۆڤێکیش بە هێز و زانستی خۆی نەیدەتوانی ئەو

عەرەبانەیە بجولێنێت، تاکە شتێک بکرایە فریشتەیەک لە مەخلوقاتەکانی تر بە ڕوونی جیابکاتەوە توانای ئەوان بوو لەسەر جولاندنی ئەو ئامێرە سادە و گەورە و سەیرە. عەرەبانەکە وەک تاتەشۆرێکی دێرین، وەک دەستەبەرەی بردنی بریندارانی لە مەیدانی جەنگدا، وەک تابووتی هەڵگرتنی مردووەکان بۆ گۆڕستان وەهابوو، نیشانەیەک بوو بۆ هەموو فریشتەیەک تا بیر لە ڕزگاری خۆی و مەترسییەکانی سەر زەوی بکاتەوە. ئەلیائیل چیرۆکێکی هەبوو، من هیچ کات تێنەگەیشتم ئەو چیرۆکەی لە کوێوە هێناوە، ئاخۆ شتێکە لە کتێبێکدا بینیوێتی یاخود بەرهەمی لێکۆڵینەوە و دەرەنجامگیری خۆی بووە. ئەو دەیگووت لەسەردەمانی زوودا، لە ڕۆژگارە هەرە هەرە دوورەکاندا، لەو سەدە تاریکانەدا کە زەوی هێشتا بە چرای بچوک ڕوناکدەکرایەوە و دەرد بە هەتوانی پیرێژنان تیماردەکرا، زەمانێک بووە کە دڵڕەقی مرۆڤ گەیشتۆتە لوتکە و ڕاکردنی فریشتەکان لە مرۆڤ چۆتە ڕێژەی باڵا. لەو ساڵانەدا دڕندەیی مرۆڤ چۆتە جێگایەک هەتا زۆربەی مەلەکبینەکانیش فریشتەیان وەک خێو و جنۆکە و شەیتانۆکەکان بینیوە و دوایان کەوتوون تا قڕانیانبکەن، لەو سەردەمەدا فریشتەکان بۆ ئەوەی بتوانن نەخۆشەکانیان بشارنەوە، بتوانن فریشتە ترازاوە بیمارەکان بگەیێننە جێگاگەلێکی پڕ ئەمان، ئەم عەرەبانانەیان سازاندوە تا پەیتا پەیتا و بە نهێنی مەیت و نەخۆش و لاوازەکان بەرەو شوێنی نهێنی هەڵگرن. ئەلیائیل بە عەرەبانەکەی دەگووت «ئامێری سەردەمی تاعوونەکان». بەر لە مردنی بە ڕۆژێک، تکای لە مندا کرد، هەرچییەکم کردوە هەوڵبدەم ئەم عەرەبانەیە بپارێزم، تا دواتر فریشتە بەهێزەکانی نەوەی نوێ، بتوانن ڕووبەڕووی قڕانە گەورەکان و کارەساتە ترسناکەکان ببنەوە. ئەو یەکەم کەس بوو کە پێیگووتم کە دەشێت ڕۆژێک بێت مەلەکبینەکان وەرگەڕێن و ببن بە گەورەترین دوژمنی ئێمە.

## دۆنکیشۆتێکی تووڕە و تەنها

لەو سەردەمەدا، بە تەواوی هەستمکرد من مەخلوقێکی تایبەتیم و لەوە دەرچووم مرۆڤ بم. کەسێکم پەیامێکی گرنگم هەیە دەبێت ئیشی بۆ بکەم. ئێستا دەمزانی من ئاسایشێکی سیاسەتمەدارم. هەندێک مانا هەیە تەنیا لە ڕێگای دووبارەکردنەوەوە دەگەنە جێگای خۆیان و دەچەسپێن، بۆیە ناچارم دووبارەیبکەمەوە، ئاسایشێکی سیاسەتمەدار ... ئاسایشێکی سیاسەتمەدار. تا جگە لەو ژیانە، ژیانێکی ترم نەبوو، خۆشبەخت بووم کە لە هیچ جۆرە زیندەگییەکی ترەوە نەگلا بووم. نە ژن، نە ماڵ، نە خۆشەویستی، نە یادگار، هیچ شتێکم نەبوو، هەتا چیرۆکێکی بچوکی خۆشم نەبوو، ئادەمیزادێکی زلی سەر ڕووتاوە بووم، بێ زیندەگی و بێ چیرۆک. زیاتر لە شتێک دەچووم تا لە مرۆڤێک ... ژیانم هیچی تێدانەبوو هی من بێت، بەسەرهاتێکم نەبوو بڵێم ئەمە سەربوردی منە و زیندەگی تایبەتیمە، هەموو مەخلوقات و زیندەوەرانی مەملەکەتی ئێمە ژیانی تایبەتیان هەبوو من نەبێت. ڕۆژ دوای ڕۆژ کە یاداشتەکانم دەنوسییەوە، دەمزانی دۆکۆمێنتێک بۆ نەوەکانی داهاتوو جێدەهێڵم تا بزانن لە قووڵایی ڕۆحێکی تەنهای ئەم سەدە و سەردەمەدا چی گوزەراوە، بزانن پیاوێک لەسەر ئەم زەوییە بووە، جگە لە سیاسەت خاوەنی هیچ شتێکی تر نەبووە، سیاسەت دروستیکردوە، هەستەکانی داوەتێ، کینەکانی پێبەخشیوە، ترسەکانیشی داڕشتووە. هەر کەسێک منی وەک جانەوەرێکی لابۆرگایی بیخستبایەتە ژێر وردبینێکی گەورەوە، دەیبینی من بە جۆرێک دونیای خۆم دەژیام، وەک ئەوەی خوێنم جگە لە کاری ئاسایش و سیاسەت هیچی دی تێدا نەبێت. سیاسەتمەدارانی وەک من کە بە عەشقەوە سیاسەتدەکەن، هیچ کات پێویستیان بە دین، بە عەشق، بە

خێزان، بە ژیانی تایبەت نییە، سیاسەت خۆی هەموو ئەو شتانەی تێدایە. لە یەککاتدا هەم دینە، هەم عەشقە، هەم خێزانە. بەڵام گرنگ ئەوەیە وەک من سەر بەو نەوەیە بیت کە بەوجۆرە کوشندەیە ژیاین، مرۆڤگەلێک جگە لەو گۆمە، ئاشنای ژینگەیەکی تر نین و ناتوانین جگە لەو ئاوە لیخنە لە دەریایەکی گەورە و لە ئاوێکی تردا مەلەبکەین.

بەدترین شت لە سیاسەتدا ئەوەیە زۆرجار بۆ ئەوانیدی کاردەکەیت، کەچی واهەستدەکەیت بۆ خۆت کاردەکەیت، هەندێجاریش بە پێچەوانەوە بۆ خۆت کاردەکەیت، بەڵام واهەستدەکەیت بۆ ئەوانی تر کاردەکەیت... ژیانی من جۆرە ڕۆمانێک بوو لە نێوان ئەو دوو فریوەدا. زۆر بەوردی دەستمکرد بە کار بۆ ئەو خەونەی کە تا دەهات پتر سەری دەئاوساندم و زۆری لە ڕۆحم دەکرد. فەسڵەکانی یەکەمی کتێبی «چاوی خودا» م بۆ ئەوە تەرخانکرد تەکنیکەکانی چاودێری و هەواڵگیریی دەستنیشانبکەم، هەر دێڕێک دەمنوسی ئەو هەستەی دەدامێ کە من دواجار ئەو تەونە عاجباتییەم دەستپێکردوە کە لە مێژە دەمەوێت بیچنم، خۆم وەک نەخشسازی پلانێکی ئەفسانەیی دەبینی کە پلانەکەی دەبێتە ئاوێنەی خۆی. بۆ ئەوەی بتوانم بە تەواوی خەون ببینم پێویستیم بە چاو بوو، چاوی خۆم بە تەنیا بەشی ئەو خەونەی نەدەکرد، بەڵکو پێویستیم بە چاوێکی گەورەتر بوو، وەک چاوی خودا، چاوی دەزگایەک هەموو جێگایەک ببینێت. مرۆڤ سەرەتا واهەستدەکات کارێکی تۆزێک ئەستەمە سیخوڕ و کرێگرتە و هەواڵدز بدۆزێتەوە، بەڵام دەبێت بڵێم کە ئەو بڕوایەتان بڕوایەکی هەڵەیە
ئەوەک من کە بە عەقڵی سیخوران لە دونیام دەڕوانی، هەتا گەر ڕۆماننوسێکی لێزانیشت بهێنایە و چەند ڕۆژێک لە شارەکەدا بژیابایە، دەیزانی خەڵکی ئێرە چ ئارەزوویەکی دڕیان بۆ چاودێری ئەوانی تر هەیە، چ خۆشحاڵن هەر یەکەیان لە نزیک خۆی چوار قوولەی ڕاست و چەپ بەرزبکاتەوە و تەنیا لە خەڵکی تر بڕوانێت و نهێنییان بپشکنێت. ژمارەی ئەوانەی لەم شارە نەفرەتییەدا لەزەت لەوە دەبینن ببنە سیخوڕ، لە ژمارەی ئەوانە زیاترە کە لەزەت لە سێکس دەبینن. سیخوڕیش لێرە تەنیا

کارێکی سیاسی نییە، بەڵکو ئەو خواستە ئاسایی و سادە و ڕۆژانەیەیە کە گەورە و بچوک پێکەوە تێیدا بەشدارن. هەر لە ڕۆژانی سەرەتاوە سەرم لەوە سوڕما ئەو هەموو کەسە خۆبەخشە چۆن ئامادەن ببن بە بەشێک لەو چاوە مەزن و هەمە بینە کە من دەمەوێت دروستیبکەم. شارەکە بە جۆرێکی ترسناک و بێبەهانە ئامادەبوو ببێت بە چاو و گوێ و هەستی من، بە شێوەیەک دەکرا کار بگاتە ئەوەی چیتر بە زەحمەت لە دەرەوەی بازنەی سیخوڕەکان خەڵکێک بدۆزینەوە بیخەینە ژێر چاودێرییەوە. من یەکەم کەس بووم کە گووتم سیخوڕ هێندە زۆر دەبێت ئیتر کار دەگاتە ئەوەی دەشێت تەنیا سیخوڕەکان بەسەر یەکەوە سیخوڕیبکەن. ئاوها بوو لە قۆناغێکدا، زۆرینەی ئەوانەی دەمانخستنە ژێر چاودێرییەوە خۆیان بە جۆرێک لە جۆرەکان چاوەدێربوون بەسەر ئەوانەی چاودێریاندەکردن. هەڵبەت من دەمزانی کە کاری پیاوانی ئاسایش لە وڵاتانی دی و لە شوێنەکانی دیدا جۆرە زانستێکی گەورەیە و دەخوێنرێت و زانکۆی هەیە، بەڵام ئەوەی لێرە پشتم پێدەبەست، فیترەتی مرۆڤ بوو لەسەر چاودێری و هەواڵدزی. دەبێت ڕاشکاوانە بڵێم ئەوەی من بێ هیچ پەروەردەیەکی زانستی دەمویست دەزگایەکی وا ترسناک دامەزرێنم، مانای ئەوە نییە عەوداڵی ئەوە نەبووم کارێکی ورد و عاقڵانە ئەنجامبدەم، من کە کتێبی چاوی خودام دەنوسی، چاوم لە کتێبێکی وەک «میر»ـی مەکیاڤیللی بوو، دەمویست شتێک بنوسم لەوجۆرە، ببێتە ئینجیلی کەسانێک کە دوای من دێن، خەونم بوو سەردەمانێکی بێتەپێشێ پێمبڵێن مەکیاڤیللی کورد، کەسێک کە پێکوڵکەری یەکەم دەسەڵاتی مەنتیقی و هێزپەرستی کوردبووە، دەسەڵاتێک بەهانەی خۆی لە خۆیەوە وەردەگرێت، نەوەک لە شێخ و ئاغا و مەلا، یان کوێخا ئایدۆلۆژییەکانەوە.

من دەسەڵاتم وەک خۆی خۆشدەویست، وەک شتێک لە هیچ شتێکی ترەوە نایەت، وەک درەوشانەوەی هێزێکی نهێنی کە ڕیشەکانی لە خودی دەسەڵاتدارەوە دێت و سەرچاوەکەی تەنیا لەوێوە هەڵدەقوڵێت، لە لەشمانەوە، لە دەمارەکانی ژیان لە جەستەماندا نەوەک لە بڕوا و

ئیمانمانەوە بە بیرۆکەیەک یان فەلسەفەیەک یان شتێکی دی جیاواز لە خۆی. من ڕام وابوو هەر حکومەتێکی نوێ لەسەر ئەم زەوییە دروستبێت وەک ئەوەیە هەمووومانی گێڕابێتەوە بۆ ڕۆژی دابەزینی ئادەم و حەوا بۆ سەر زەوی. ئێمە شتێکی نوێمان دەکرد، هیچ شتێک وەک دروستکردنی دەسەڵاتێکی نوێ مایەی سەرسامی نییە، چەند دروستکردنی مرۆڤێک خانە بە خانە و موو بە موو و دەمار بە دەمار سەختە، بونیادنانی دەسەڵاتێکی نوێ لەسەر ئەو خۆڵەمێشەی بەعسییەکان بۆیان جێیان هێشتبووین دە هێندە سەختتر بوو ... من بە هەموو جۆش و خرۆشمەوە ژیانی خۆم خستە لاوە و خۆم بۆ ئەرکی داڕشتنی ژێرخانی وڵاتێک تەرخانکرد کە دڵنیام درەنگ یان زوو لە سەد ساڵی داهاتوودا شوێنێکی گرنگی لەسەر نەخشەی دونیا دەبێت، گەر نەشیبێت وەک هەمیشە شوێنێکی گرنگی لەسەر نەخشەی تێکدانی دونیا دەبێت. من خۆم بەو ڕۆبۆتە دەزانی کە لە پاشەڕۆژەوە گەڕاوەتەوە بۆ ئەمڕۆ تا بنەمای قەوارەیەک دابڕێژێت بەرگەی کارەساتەکان بگرێت. جیاوازی نێوان من و جاسوسەکانی تر لە ئاسایش ئەوەبوو، من بۆ سەد ساڵی داهاتوو کارمدەکرد، بەڵام زۆرینەی ئەوانەی کە دەهاتنە دەزگاوە لای من، مەبەستیان ئەوەبوو مافێکی قانونی و شەرعییەتێکی سیاسیان هەبێت بۆ ئەوەی خزمەکانیان، دراوسێکانیان، دوژمنەکانیان بخەنە ژێر چاودێرییەوە. بەدەگمەن کەسێکم دەبینی لە پێناوی نیشتیماندا ببێتە ئاسایش، بەڵکو پێکڕا بۆ ئەوە دەهاتن ببن بە هەڵگری دەسەڵاتێکی نهێنی و هەستبکەن سەر بە دەزگایەکی گەورە و ترسناکن. من ئەرکم بوو کە هەموو ئەوانە بخەمە کارەوە، ئەرکم بوو وابکەم غەریزە تایبەتی و بەدەکانیان بخەنە خزمەتی منەوە، لەو ڕێگایەشەوە بیانکەم بە خزمەتکاری مێژوو. من ڕاموابوو ئاسایشی موتڵەق تەنیا لە ڕێگای چەند دوژمنێکەوە دەکرێت بەرقەرار بێت، مرۆڤ تا دوژمنی نەبێت ناتوانێت ئەوانی دی بخاتە سەر حەماسەتی کارکردن، بۆ ئەوەی وا لە پیاوی ئاسایش بکەیت لە خولیا بچوک و غەریزە بەر تەسکەکانی بێتەدەرەوە، دەبێت دونیایان وا بۆ وێنابکەیت وەک ئەوەی جەنگێکی نهێنی و گەورە بەڕێوەبێت. یەکەمین

شتێک دەتوانێت پیاوی ئاسایش والێبکات کارەکانی خۆی وەک گرنگ و بایەخدار تەماشابکات، ئەوەیە وابزانێت بەیانی دوژمنان پەلامارماندەدەن، دەبێت بۆ چرکەیەکیش ئەوە لە یادنەکەن لە شەڕێکی هەمیشەیی و گەورەدان. یەکەمین شتێک دەبوو بیخەمە عەقڵی ئاسایشە بێەزموونەکانمانەوە، بیخەمە عەقڵی هەموو تاکەکانی ئەم شارەوە ئەوەیە کە ئاشتی هیچ نییە جگە لە درۆیەکی ڕوکەش، ئاشتی ئەو دەمامکە کاتی و تێپەڕەیە کە دونیا لە هەندێک سەردەمدا دەینێتە سەر دەموچاوی خۆی. دەبوو لە ڕۆحی هەر کەسێکدا ئەو هەستە سەوز بێت کە جەنگ هەیە، جەنگێکی بەردەوام. بۆ ئەوەی بتوانم جوانترین کاریگەر بەدەستبهێنم بە وردی سەیری ئەو پەروەردە سیاسییەم دەکرد کە تورکان و عەرەبان و فارسان چەند ساڵە بەکاریانهێناوە. ڕۆژانە کتێبم هەڵدەگرت و دەمبرد بۆ دەزگا، کتێبم هەڵدەگرت و دەمبرد بۆ ئەو کوخت و کۆخەڵە بچوکانەی لەدەرەوەی شار بۆ پشووی بچوک و کورت دروستمکردبوون، هەتا لە ماشێنەکەشمدا کتێبم لەسەر سەد ساڵی ڕابوردووی خۆرهەڵات دەخوێندەوە. ئێمەی کورد بۆ ئەوەی فێرببین ڕقمان لەوانی دی بێت، پێویستیمان بەوە بوو بزانین ئەوانی دی چۆن فێربوون ڕقیان لێمان بێت. لە بەرئەوە خۆم لە جیهانی کتێبەکاندا نوقمکرد... ئەو نوسەرانەم خوێندەوە کە نەفرەت و کینە بەرهەمدەهێنن... ڕۆژگارەکە سەردەمی لێبوردن نەبوو، شتێکم دەویست تورەمبکات و وابکات وەک شێت دەست بکوتم بە سنگمدا و بەرەو شەڕ بڕۆم. خۆرهەڵات ئەو دێوە بوو چی چەشنە جانەوەرانێک کە دەشێت لە ڕەگەزی ئادەمیزادەوە بکەونەوە هەموویانی قووت دابوو، ئێستا هەموو ئەو جانەوەرە جیاوازانە لە ورگە چکۆلە و بادارەکەیدا ئارامیان نەدەگرت و پێکەوە نەدەژیان، دەبوو بەردەوام لەقە لە دەم و لووتی یەکتر بدەن تا یەکێکیان بیکرێت قاچ ڕاکێشێت و خۆی بە خاوەن ماڵی ڕاستەقینە بزانێت... هەر کتێبێکم دەخوێندەوە لە پشتییەوە دەمنوسی «تف لە تۆ خۆرهەڵات، ئەی خاکی بێفەڕی شەیتان». من هاتبووم لە ناو ئەو سندوقی شەیتانەدا جێگایەکی باشتر بۆ خۆمان بکەمەوە. پێویستم بە خەڵک بوو ... ترسناکترین شتێک

بۆ سیاسی یان پیاوی دەزگا ئەوەیە هەست بە تەنهایی بکات. دەمویست خەڵک دروستبکەم وەک من خەون ببینن، ئەم ساتە چ خەیاڵپلاو و تارمایی و وەهمێک دروستدەکات، بچێتە سەریانەوە. دەسوڕامەوە و سەرم گێژی دەخوارد و دەمگووت هەموو ساڵێک کۆمەڵێک خورافەت و وڕێنە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، مێژوونشینی تەواو ئەو کەسەیە کە دەرگای سەری خۆی دەکاتەوە و هەر چی جروجانەوەرێک هەیە بانگهێشتیدەکات... خۆم وەک کەسێک دەبینی کە سەری خۆی کردۆتەوە بۆ هەر دڕندەیەک بیەوێت بیکاتە ماڵ. زۆر پێویستیم بە زەندیان بوو، ئەم عەسرە تازەیە بێ ڕاگەیاندنێکی دڕ مانای نەبوو. چەندەها شەو لەگەڵ دکتۆر زەندیان قسەماندەکرد، بەزەحمەت هێنامە سەر ئەو بڕوایەی کە دەبێت ئێمەش هاوڵاتیانی خۆمان وەک هاوڵاتی نەتەوە داگیرکەرەکان پەروەردەبکەین، دوژمنانی کورد چۆن منداڵەکانیان لە ناو ترس و کینەدا گەورەدەکەن، دەبێت ئێمەش دەرمانێکی لەوجۆرە بدەینە منداڵەکانمان، دەبێت هەستبکەن بەردەوام جەنگێکی ترسناکی مان و نەمان بەڕێوەیە، بەردەوام هێزێکی قڕانکەر و کوردکوژ خەریکە بگاتە سەرمان. بەرامبەر دکتۆر زەندیان، شوێنگەی کەسێکم دەگرت کە بەرگرییەکی سەرسەختانە لە شتێک دەکات ناوی «پەروەردەی نەتەوەییە»، شتێک تا ئێستا دەرفەت نەبووە دایبڕێژین و کاری پێبکەین. ئەوەی زۆر سیحری لێدەکردم، ئەوەبوو دڵنیابووم بناغەی دەوڵەتێک بۆ کورد، لەسەر بنەمای مەحەبەت و میهرەبانی جگە لە بەخشینی روخسارێکی ساختە بە دونیا هیچی تری لێ سەوز نابێت. بەڵێ من لەوانەبووم کە بڕیارمدابوو لە قوربانییەوە ببین بە جەلاد. بۆ ئەو هەستانە دەگەڕام کە تووڕەیی ژێردەستەکانم و نیگەرانی هەمووان دەبزوێنێت... ئەوە تاکە ڕێگابوو بۆ ئەوەی لە جەستەیەکی تەپیوەوە ببین بە مەکینەیەک بتوانێت لە جێگای ئەو خاپوورییە گەورەیە شتێکی نوێ دروستبکات. من دەمزانی بۆ ئەوەی ئەو دۆخە دروستبکەم تەنیا پێویستیم بەدوژمنە دەرەکییەکان نییە، دوژمنە دەرەکییەکان و ترسیان چۆتە گیانمانەوە. کەروێشک چۆن لە داڵ دەترسێت، ئێمەش لە پێدەشتی خۆماندا هەمیشە بە دوای ئەو مەترسییە نادیار و دەرەکییانەدا

سەیری ئاسمان دەکەین. ئیشی من بوو لە دەزگا وابکەم هەموو کەسێک هەستبکات کە دوژمن دەشێت تەنیا چەند مەترێک لێیەوە دووربێت، دوژمن دەشێت کوردێکی خائین بێت، ڕۆشنبیرێکی بەدنمەک بێت، کۆمۆنیستێکی یۆتۆپی و ترسناک بێت کە بە ئامانجەکانی خۆی ئامانجە گەورەکان دەشارێتەوە، ئیسلامییەک بێت کە خوداپەرستی دەخاتە جێگای نیشتمانپەروەری، کەسێک بێت کە پێغەمبەری لە وەتەن بۆ گرنگترە، دەشێت حیزبەکانی دی بن، دەشێت هەموو کەسێک بێت جیا لە من و سەرۆک و هاوڕێکانمان. هەموو مرۆڤێک دەبوو هێلکارییەکی بۆ دوژمن هەبێت، دەبوو خۆی واببینێت کە بەبازنەیەکی ترسناک گەمارۆدراوە. شەوان تا سەحەر لەگەڵ دکتۆر زەندیاندا خەریکبووم، دەبوو ڕاگەیاندن بخاتە خزمەتی دەرککردن بە مەترسییەکان. نا ببورن، ئەو ترسانەی من باسمدەکردن هیچیان ترسگەلێکی خەیاڵی نەبوون، هیچیان شتێک نەبوون وەک ئەفسانە دروستیانبکەم و دەرخواردی هەواداران و هاوکارانمی بدەم. هەموو ترسی ڕاستەقینەبوون، بەوجۆرەی کە لەسەر سنگی مێژوو خەوتوون، بەوجۆرەی لە هەوای دوای ڕاپەڕیندا بوون، بەو شێوەیەی لەجیهاندا وەک تاعوون بڵاوبووبوونەوە. من جیهانم بەشێوە ڕاستەقینەکەی دەبینی، خۆرهەڵاتم وەک خۆی دەبینی، وەک جەنگەڵێکی سامناک کە پڕێتی لە دڕندەی ترسناک، وەک دارستانێک لە بن هەر دارێکیدا تۆڕێکی گەورە و فاقەیەکی کوشندە هەیە، لەسەر هەر لقێکی مارێکی ژەهراوی هاتۆتەخوار، لە ژێر بۆنی هەر گوڵێکیدا دەشێت هەناسەیەکی ژەهراوی و کوشندە هەبێت. من کوردستانم وەک خۆی دەبینی، ڕووت و قووت، بێ مەکیاژ، بێ درۆ، هەستمدەکرد ئەوەشی ئەو هێزەی داوەمەتێ شتەکان وەک خۆیان ببینم، ترازانی فریشتەکەمە.

بەبێ ئەم دکتۆر زەندیانە گەمژەیە هیچ کارێک نەدەکرا. سەردەمێک بوو، دەبوو دەنگی بێژەرەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن پێش دەنگی تۆپخانەکان بکەون. دەبوو ئەو یارمەتیم بدات، ئەندامەکانمان، هەڤاڵانمان، هاوڵاتییە دڵسۆزەکانمان بزانن ئێرە جەنگەڵە، بزانن شەڕی گەورە لە ڕێگادایە،

تێبگەن جەنگ هیچ کات و هیچ دەم تەواو نابێت. هەڤاڵ زەندیان دەیزانی دەڵێم چی، بە چاوە بچوکەکانی سەیریدەکردم و ڕەنگی زەرد دەبوو. من پێویستم بە خەڵکانێک بوو باوەڕێکی قووڵ بچێتە خوێنیانەوە و خۆیانی بۆ بدەن بە کوشت. بەڵام زەندیان لەو پیاوانە نەبوو ژیانی خۆی بۆ هیچ شتێک بەختبکات، لەو کەسانە بوو کە گەورەترین خۆشبەختی خۆیان لەوەدا دەبیننەوە کە دونیا هەمیشە لەسەر ئەو ڕیتم و ئاهەنگە بڕەقسێ کە ئێستا لەسەریێتی، لەوە دەترسا ئاوازێک ببیستێت نەتوانێت قاچەخوار و کورتەکانی خۆی لەگەڵدا یەکبخات. من دیمەنەکەم وەک خۆی دەخستە بەرچاوی دکتۆری هاوڕێم، ئەو گەرچی خۆی بە پسپۆڕی جیۆپۆلۆتیک دەزانی، گەرچی خەونی بوو جارێک لە یەکێک لە زانکۆ بەرزەکانی دونیادا ببێتە مامۆستای جیۆپۆلۆتیک، بەڵام هەمیشە بە وردەکارییەکانی تێگەیشتنی من و تەفسیری من بۆ دونیا سەرسامبوو. ئەو هیچ کات وا زەق و زۆپ ئێمەی لە ناو تەڵە و تۆڕەکەدا نەدەبینی. پێمدەگووت «دکتۆر یەک شت ئێمە ڕزگاردەکات کینە، تەنیا کینە، کینەیەکی ڕەها».
دکتۆر لە ترسی سەرۆک و تووڕەبوونە ناکاوەکانی نەیدەوێرا زۆر دەستداگرێت و بەقسەمبکات. دەبوو من دونیا چۆن دەبینم دکتۆریش جیهان وا ببینێت، بەڵام ئاسان نەبوو، دکتۆر سووک و سادە پیاوێکی ترسنۆک بوو، پیاوی ترسنۆکیش ناتوانێت جیهان بە ڕوونی ببینێت، ترسنۆکان هەردەم دۆست و دوژمنی خۆیان تێکەڵکردوە، وەک ئاژەڵێک وان لەسەر دواخستنی سات بە ساتی مردنی خۆیان دەژین. کەسانی وەک زەندیان، بە کەروێشکێک دەچن دەزانێت دەخورێت، بەڵام جۆرێک خۆی کردەکات شکارچیان هەست بە بوونی نەکەن، ئەوەی پێخۆشە لە جێگای خۆی بچەقێت، برسێتی و نەجوڵان بیکوژن لەوەی بێتەدەرێ و دوا شەڕی گەورەی خۆی بکات.

دکتۆر شەوان بیجامە دەڵبەکانی لەبەردەکرد و بە خونچە خانی دەگووت میوەمان بۆ بشواتەوە و شەرابمان بۆ ئامادەبکات تا دابنیشین و قسەبکەین، زۆری دەگووت، بەشی زۆری قسەکانی دەربارەی ترسەکانی

بوون لە تێکچوونی ڕەفتاری شۆڕشگێڕان لەم سەردەمە تازەیەدا، من هەرچییەکم دەگووت، هەرچییەکم دەکرد لە ڕاگەیاندندا شتێک بجولێنێت، بۆ بەیانی گوێم لە هەواڵی ڕادیۆکە دەگرت و مانشێتی ڕۆژنامە تازەکەم دەخوێندەوە ناثومێددەبووم. دکتۆر ئامێرێکی گەورەی کەوتبووە دەست، بەڵام نرخی ئەو مەکینەیەی نەدەزانی و دەترسا بیخاتە کار. لەسەر ئاستی دونیا نەدەیوێرا ڕستەیەک لەسەر دوژمنانی کورد بڵێت ، لەسەر ئاستی ناوخۆش نەیدەیوێرا ڕستەیەک لەسەر دوژمنانی حیزب بنوسێت، هەمیشە دەیگووت، وای هەڤاڵ شەڕمان لێ لادە، بەڵامان لێ لادە، تینی وەها کارێک بە منی بەدبەختەوە نییە.

هەرچییەکم دەکرد، دکتۆر ئەو بەرگە ترسنۆکەی خۆی فڕێنەدەدا و لەو قەپاغە کیسەڵینەی وەدەرنەدەهات، نە نەخشەکانم سوودیان هەبوو، نە قسە و لۆژیک و وتارە درێژەکانم. هەموو شەوێک سەعات دوای سەعات دانایی ئەو پیاوەم دەجولاند، عاقڵیم دەخستە گەڕ، هێزی ئیدراکیم ختوکەدەدا. وەک شەیتان دەچوومە بنکلێشەی، بە مەنتیق دەمخستە مێشکییەوە و پێمدەگووت «من و تۆ کارمان داڕشتنی بناغەیە بۆ یەکەمین دەوڵەتی کوردی ڕاستەقینە لە مێژوودا. دەبێت میللەت ئامادەی جەنگ بێت. سەیرکە بەرپرسە حیزەکانمان هەموو کەوتوونەتە دزی و فزی و تالانکردن، نابینیت ئێرانییەکان لە ژێرەوە وڵاتەکەیان تالانکرد، ئەوە میللەت سارددەکاتەوە. ئیشی من و تۆیە ڕۆحی جەنگاوەرەکەی ناخمان بپارێزین. .. گەر تۆش وەها نەرم بیت، هەر زوو دەبینە پۆپی خوراو و داری کلۆر». ئەو لە هەموو شتەکاندا لەگەڵم تەبابوو، بەڵام ترسێکی تایبەتی هەبوو کە ترسی هەموو پیاوە خوێندەوارەکانە، دەمێک بە زۆر خۆیان دەنێنە گەمەیەکەوە لە وزەی نایەن. هەر کات دەهاتە سەر ئەوەی تەواوی شتەکان بە شێوە ڕاستەقینەکەیان ببینێت، دەمبینی سەری وەک کیسەڵێکی نەخۆش دەبردەوە ناو شانی و وەها ملی بەرەو نێولەشی ڕادەکێشا، دەفەکانی شانی بەرزدەبوونەوە و سەر ئێسقانی نێوان شان و بازووی وەک دوو تۆپی خڕ، دەگەیشتنە بان هەر دوو گوێی. دکتۆر

پیاوێکی عاقڵ بوو، بەڵام لە سیاسەتدا دوو جۆر کەس زۆر ترسناکن، عاقڵی ترسنۆک لەگەڵ عاقڵی جەربەزە و چاونەترس، هەردووک ئەمجۆرە مرۆڤانە بۆ ژیان گرنگ و سوودبەخشن، وەلێ لە سیاسەتدا کارەسات دروستدەکەن. لەسیاسەتدا ترسنۆکی زۆر و ئازایی زۆر یەک یەکتری تەواودەکەن، ترسنۆک وەک نێچیرێکی لێدێت کە هەموو دەیانەوێت بیخۆن، ئازا وەک درندەیەک کە دەیەوێت هەمووان بخوات، بۆیە سیاسەت نە بەترس نە بە ئازایەتی ناکرێت، بەڵکو بە خەیاڵ و بە کینە دەکرێت. تادەهاتیش من خەیاڵ و کینەم پتر گرپیاندەگرت، سەرم پڕدەبوو لە جەنگی ئەفسانەیی یەک لە دوای یەک، خەونی سوپایەکی یەکگرتووی کورد کە لە قەراغەکانی ئامەد تورکەکان بۆردومان دەکات ... لەشکرێکی نەتەوەیی بە هەزاران سوارچاکەوە، لە ژێر زرمەی هاوەن و خومپارەدا خۆیان دەکەن بە مەهاباد دا ... سەدان هەزار سەربازی کورد، بە جبەخانەی قورسەوە، بە خودە و کۆڵەپشتەوە بەرێکی، بێوەستان، بەرەو کەرکوک مارشدەکەن. من خۆشم هەمیشە ئەو کەسەبووم کە لە نێوان ژەنراڵ و سوپاسالارەکانی ئەم لەشکرە گەورانەدا دەردەکەوتم و دژ بە هەموو ئەوانە دەوەستامەوە کە دەترسن و نایانەوێت بجەنگن. دەبێت تێمبگەن، من کوڕی کورەی جۆشان و گەرمی یارییەکە بووم، لە هەموو ئان و ساتێکیدا دەمزانی چیم دەوێت و چیم ناوێت، چی دەکرێت و چی ناکرێت؟ بەڵام دکتۆر و پیاوە بودەڵەکانی تری ئەو سەردەمە تەنیا دوودڵیان هەبوو، گومانیان هەبوو، لەبەرئەوە هیچ کات کەسی چرکە و ساتەوەختە گرنگەکان نەبوون. من وردە وردە دەکەوتمە ناتەبايیەکی سەیرەوە کە دەیترساندم، دەمبینی بەشی هەرە زۆری ئەندامانی بیرۆی سیاسی حیزب لەو کەسانەن کە حەزیان لە ئارامییە، حەزیان لەوەیە بچنە لای باهیری و بڵێن ڕۆژگارێکی نوێ هاتووە، بێئەوەی هیچ ڕۆژگارێکی نوێ هاتبێت... ڕۆژگاری نوێ تەنیا لە دوکەڵی ئەو جەنگانەوە دروستدەبوو کە لەسەری مندا بوون، بەڵام ئەوانە جارێ تەنیا دوکەڵ بوون و لەسەری منیشدا بوون و بەس. دکتۆر دەترسا ببێتە بەشێک لە کارێکی گەورە، منیش دەمزانی ئەم خەونەم بەبێ ئەو بۆ ناخرێتە سەر قاچ ... مرۆڤی

شۆڕشگێڕ و مرۆڤی کۆیلەش، تەنیا بە میدیا دروستدەکرێن. دەمویست چ مێژێکم تێدایە، چ کینەیەکم تێدایە بیهێنمە دەرەوە تا لە مێژوودا شتێکی پێ دروستبکەم، بەڵام ئیشەکە بە تەنیا نەدەکرا. دەمزانی زۆربەی پیاوان و ژنانی ئەم وڵاتە ترسێکی گەورەیان لەوە هەیە ببن بە بەشێک لە پرۆژەی مەزن و خەونی سەرکێش و کاری گەورە، هەموو بە شوێنی بچوکی خۆیان لە ژیاندا ڕازی بوون. کەچی من بە پێچەوانەی هەموانەوە، لەگەڵ سەرە سفت و دەستە عارەقاویی و لەشە گۆشتنەکەمدا، ئارەزوویەکی کوشندەی شتە گەورەکان دەیبزواندم. هەستمدەکرد من نە نیشتمانم خۆشدەویست، نەوەک جاران دیمەنی جووتیار و سەپانی کورد دەیهەژاندم، نە سۆزم بۆ کرێکارانی شار هەبوو، نە کەسێکم خۆشدەویست حەزبکەم دورگەیەکی ئارامی بۆ دروستبکەم، نە منداڵم هەبوو بمەوێت نیشتیمانێکی ئازادی بۆ جێبهێڵم ... هیچ شتێکم نەبوو وەک خەڵکانی تر هۆکارم بێت لە هەڵگیرسانی جەنگ و کەوتنەوەی ئاگر بترسم. من ئەو ڕۆحە موجەرەدە ترسناکە بووم کە تەنیا پلانم ئەوەبوو ترس لە ڕۆحی خۆم و ئەوانە دەربکەم کە لەگەڵ مندا دێنە سەنگەرێکەوە. خۆم بە پاشماوەی سوارچاکە دێرینەکانی کورد دەزانی، بە هەڵگری مەشخەڵی جەنگاوەرە خورافییەکانمان، دەبوو هەمیشە جەنگێک هەبێت تێیدا ئەو ڕۆحە سوارچاکە داگیرسابێت، ڕۆحی خانی لەپزێرین، ڕۆحی دوانزە سوارەی مەریوان، ڕۆحی مامەیارە، ڕۆحی مامەڕیشە، ڕۆحی پێشمەرگە ئەبەدییەکان ... چاوم لێکدەنا و لە کوشتنی ئەسپەکانی پسمامانەوە تا کوشتنی ژنە ئاسایشەکان، هەمووم بە مەشق و ئەزموون دەزانی تا توانام لەسەر جەنگ نەمرێت، ڕۆحم وەها لاواز نەبێت هیچ فریشتەیەک نەرمیبکات و بیخاتە ژێر چەتری ڕەحم و ترسنۆکییەوە، هەموو ژیانم پێکرا وەک خۆ ئامادەکردنێک دەبینی بۆ ئەم ساتە، ساتێک تێیدا ڕۆحی حیزب دەمرێت، ڕۆحی نەتەوە دەمرێت، بەڵام ڕۆحی داگیرساو و جەنگاوەرانەی من لە ژێر هەموو ئەو خۆڵەمێشەوە دەسووتێت و دادەگیرسێت و وەک خودایەکی نوێ دێتەدەرێ. بۆ یەکەمجار خۆم وەک خودا گریکییەکان، وەک قارەمانێکی ئەفسانەیی لە چەشنی پرۆمیسیۆس دەبینی، کە ئەرکی

پاراستنی ئاگرێکی پیرۆز لە سەر شانێتی. لەو شەوانەدا ڕوونتر تێگەیشتم کە وەڵامی ئەو پرسیارەی لای نزار ئیدریس دەستم نەکەوت چییە. من شەوێک چووم بۆ لای ئەو دەمویست بزانم لەم سەردەمە تازەیەدا فەرمان و ئەرکی بوونەوەرێکی وەک من دەبێت چی بێت. ئەوە پرسیاری هەرە گەورەی عەسر و زەمانی ئەودەم بوو لە کەسێکی وەک من، ئێستا بێ کۆمەکی هیچ بوونەوەرێک وەڵامی خۆم دەدۆزییەوە. ئەوەیە نەهێڵم ڕۆحی شەڕکەرەکان سست بێت و بپێت بە ژێر دەمامکی ئەم سەردەمەوە. من لە پاییز و زستانی ساڵی نەوەدویەک و نەوەدودوودا تێگەیشتم نەوەک تەنیا مرۆڤەکان دەمامکیان هەیە، بەڵکو سەردەمەکان و مێژووەکانیش دەمامکیان هەیە. ڕۆژانە لە گەڕان و کۆبوونەوە و سەردانەکانمدا، لە تێکەڵبوونمدا لەگەڵ شانەکانی حیزبدا بەدوای دۆزینەوە و داڕشتنی ناوکەکانی دەزگا گەورەکەم، ژن و پیاوانێکم دەهاتنەسەر ڕێگا کە بە ڕاستی دەمامکی ئەم عەسرەیان لەسەردا بوو. دەمامکێکی گەمژانە کە قسەی پوچی لەسەر دونیایەک دەکرد تێیدا دەنگی تفەنگ کپ بووە و بۆنی باروت لەسەر شەقام و دیوارەکان سڕدراوەتەوە. مرۆڤەکان هەموو ئاسوودە دەخۆن و هەڵدەستن و هیچ شتێک ڕیتمی یەک جوڵەی ژیان تێک نادات. سەری من سەرێک بوو دەمامکی وای پێدا نەدەچوو. لە کۆبوونەوەکانمدا لەگەڵ ئەندامە گەورە و بچوکەکانی ئاسایشدا هەوڵی شەمشونم دەدا، هەموو ئەو جەنگ و ترس و دوکەڵەی لەسەری خۆمدا هەیە ببیەخشم بەوانیش، هاوارمدەکرد بەسەر فەرمانبەرە بچوکەکانمدا کە جەنگ ئێستا و ئەمڕۆ دەست پێدەکات و دوور نییە سەد ساڵی ڕێک بخایەنێت. ڕامدەوەشاندن و دەمقیڕاند بە ڕوویاندا کە دوژمن سەرەتا ئەو جانەوەرەی ناو ناخی خۆیانە کە چاویان تێکدەدا و وادەکات دوژمن وەک دوژمن نەبینن. کە هەندێجار قسەم لەگەڵ ئاسایشە گەنجەکاندا دەکرد، دەمگووت «هەموو کەس دوژمنە، تا ئەو ساتەی بە ڕوونی دۆستێتی خۆی دەسەلمێنێت». دەمقیڕاند پڕ بەدەنگ «دەمامکی ئەم سەردەمەی ئێستامان ئەوەیە کە گوایە هەموو شتێک بەرەو باشی دەڕوات، بەڵام هەموو شتێک بەرەو جەنگێکی خوێنین دەبزوێت و جگە لە دڵێکی شەڕکەر

و چاوێکی وریا، هیچ شتێکی دی ناتوانێت کۆمەک بە ئێمەبکات لەم جەنگەدا سەربکەوین». وەها هاوارمدەکرد، دوایی هەستمدەکرد ژێکانی دەنگم زامداربوون. هەر چیم دەکرد، دوایی دەمبینی کە ڕۆحی من لەسەر ئاوازێک دەخوێنێت، گەلێک جیاوازە لە ئاوازێک کە ئەوانی تر لەسەری سەمادەکەن. لە هەموو شوێنێکی شار هەژاری و دەستکورتی وایکردبوو خەڵک تەنیا بیر لە زگیان بکەنەوە، کەس ئاگاداری ئەوە نەبوو لەم ساتەوەختە گرنگانەدا دەبێت ئیرادەی جەنگاوەرانەمان تا دوا پلەی خۆی داگیرسێنین. کە بە ڕۆژ دەچوومە ناو خەڵک و بازاڕ دەگەڕام، بچوکی و بێخەونی ئەم مەخلوقاتە بێزارکەر و چڵکنانە توڕەیدەکردم. بۆ یەکەمجار هەستم بەو دوورییە گەورەیە دەکرد لەو تۆپەڵە ئادەمیزادە بێڕۆح و برسی و زگپەرستەی ناوی جەماوەرە. دەگەڕامەوە بۆ ماڵ و لەسەر دەفتەری یاداشتەکانم دەمنوسی «ئەمڕۆ پیاسەیەکی درێژم بە شاردا کرد، ئەو دەیان هەزار خەڵکە برسییەی لەو مەرکەزە بچوکەدا بەدوای ناندا کۆبوونەتەوە هیچیان لێ سەوزنابێت، خەڵکێکن هەموو شتێک دەکڕن و هەموو شتێک دەفرۆشن، مێژوویان پێ دروست ناکرێت... دڵ و سەری ئەم شارە لەو مەرکەزە بچوکەدایە، بەڵام سەرێکی خاڵی و دڵێکی بێ جۆشە. هیچ شتێک لەوێ نییە سوودێکی هەبێت، جگە لە چڵک و بۆن و چڵێسی، هەڵبەت لە پاڵ هەموو جۆرە کاڵایەکی تری بێکەڵکی دونیا، ئیتر لە مەعجونی دانەوە بیگرە تا تفەنگ و تەقەمەنی ڕوسی. ئەوەی لەم بازاڕەدا دەیبینم نائومێدم دەکات، میللەتێکی برسی دەبینم کە هیچ جۆرە ڕۆحێکی تێدا نییە، ئەو ملکەچی و خۆخواردنەوە و چڵێسییە نەبێت کە داگیرکەر دروستیکردوە. مێژوو دەبێت دوور لە دەستی جەماوەر دروستبکرێت ... هەموو شتەکان تا ئێستا هەڵەبوون ... جەماوەر تاکە هێزە کە ناتوانێت دونیا بگۆڕێت».

ئەوە سەرەتای جیابوونەوەی هەتاهەتایی من بوو لەو گاڕانە ترسناکەی خەڵک کە بە هۆی بێهێزیانەوە، قێزم لێیان دەهاتەوە. من نە بازرگان بووم، نە شاعیرێکی ڕۆمانسی تا پیشە و سامانم تەنیا لە ئاشتی و

هێمنیدا گەشەبکەن، من کەسێک بووم دەمویست ژێرخانی دەوڵەتێکی نوێ دابرێژم. من جەنگاوەربووم، ئێشی من تەنیا لە سەردەمانی ئاشووبدا مانای هەبوو، بەڵام هەموو جەنگێک دەبێت بەهانەیەکی هەبێت، هەتا شەیتانیش پێویستی بە ئامانجێکی جوان و ئاواتێکی بەرز هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت وەک شەیتان دەست بەکاربێت. نا من ترسم نەبوو ئەم ماڵە خاپوور بێت، ترسم نەبوو دوژمنان ئەم شارە بگرنەوە، جەنگێکی ئەبەدی منی شادوماندەکرد، تازە لەوەدا نەمابووم بمکرێت ژیان بێ بۆنی باروت و زرمەی تفەنگ و ڕاوەدونانی درێژ و بەردەوام بەسەر بەرم. بەڵام من تەنیا بووم، ڕۆحی من ڕۆحێکی تەنیا بوو، حیزب نەیدەتوانی وەک من بیربکاتەوە، سەرکردەکانی تر هەموو دەیانەویست ئەوەی لە ژیاندا ماویانە بە هێمنی و لەسایەی ماڵ و منداڵ و لە جێگای خۆشدا بەسەربەرن. زۆرجار کە دەچووم، دکتۆر زەندیان بۆ ئەوەی سۆزم بجوڵێنێت و تێبگەم کە جەنگ و نەهامەتی خواستی ئەو نییە، منداڵەکانی دەهێنا و لە دەوری خۆی دایدەنان. وەک ئەوە بوو بڵێ گەمژە ببینە، تۆ چونکە خاوەنی هیچ نیت، ترست لە ژیانی ژن و منداڵت نییە، خاپوری جیهان و وێرانبوونی گەردونت لا وەک یەکە، بەس من نامەوێت چیتر شەڕ ببێت. ئەو دیمەنە یەکێک بوو لەو هۆیانەی وایکرد دواتر بیر لە هەبوونی منداڵێک بکەمەوە.

دەمزانی ناتوانم خۆم لە کینەکان ڕزگاربکەم. هەمیشە کینەیەکی ناکام لە دڵمدا بووە، کینەیەک بەرامبەر شتێک کە نازانم چییە، ڕقێک و بێڕەحمییەک لە ناکاو دەمگرێت کە هێوربوونەوەی بۆ نییە، لە پڕێکدا بوغزێک کە تێرنابێت دەچێتە هەناومەوە و ناتوانم جگە لە جەنگ بیر لە هیچی تر بکەمەوە. ئێستا کە هەستدەکەم دونیا کەوتۆتە دەستم، کە دەزانم فریشتەکەم دوورە لە من، لە جێگا و زەمانێکی تردا دەژی کە هیچی لە جێگا و زەمانی من ناچێت، ئەو کینەیەم لە هەر شتێکی دی زیاتر پێویست بوو، بۆ ئەوەی بۆشایی ئەو بوغزە نەمخوات و کەلێنی ئەو خۆخواردنەوانە بوونم نەڕوخێنێت. تا ئەندازەیەک دڵنیابووم لە بەری دوژمنانیشدا پیاوانێک هەن لە من دەچن، وەک من فریشتەکانیان ترازاوە،

وەک من دوای عەقڵی هێمنخواز و کەمتەرخەم ناکەون، شەو و ڕۆژ لە ژێرەوە لە ڕۆحی منداڵ و گەورەکانیاندا ترس دەچێنن، ترس لە جانەوەرێک کە ناوی کوردە، ترس لە جانەوەرێک ناوی سەرۆکە، ترس لە درندەیەکی بێڕەحم کە ناوی عەقید جەنگیزە. دەبوو دەستبەکاربین و ئامادەبین، کاتێک کە سەردەمی جەنگ هات، ئیتر سەردەمی جەنگە، خودا تا ئێستا هیچ ئاشتییەکی نەپاراستوە و نایپارێزێت.

بەیانیان زوو یەکەم شت ڕۆژنامەکەی حیزبم بۆ دەهات و دەمگرت بەدەستەوە و هەڵمدەدایەوە و پەڕە پەڕە تەماشامدەکرد، دەمویست بزانم پرۆفیسۆر زەندیان تازە چۆن بیردەکاتەوە و مەیلی بەچییە، بزانم قسەکان و خواستەکانی من بەهەند دەگرێت. دکتۆر لەو پیاوە عاقڵانەبوو کە دەیانەوێت دونیا بە پەڕی کۆتر بگۆڕن. وای، هەموو پیاوانی دەوروبەرم دووربوون لە خولیای من، من ڕۆحی کەسانێکی وەک گاریبالدی، سیمۆن بۆلیفارم لە خۆمدا هەست پێ دەکرد، بەڵام ئەو ڕۆژگارە، منی کردبوو بە دۆنکیشۆت. کە دەچوومە دارستانەکانی نزیک شار، کاتێک دەکەوتمە پیاسەی درێژ بە سەر کێو و بە ناو بێشە و بە زەلباغی سەر زێ و نێو چەمستاناندا، کە دەکەوتمە گەشت بە لاڕێ سارد و لیتاویی و چۆڵەکاندا، پڕ بە دەنگ هاوارمدەکرد: خودایە بۆ بەتەنیا من وام، کوان ئەو کەسانەی دونیا وەک من ڕووت و قووت و بێ ئومێدی درۆزن و بێ ئارایشتی فریودەر دەبینن، کوان ئەوانەی تێدەگەن دونیا جگە لە مەیدانی جەنگ هیچی تر نییە. بۆ کەس گوێی لە هاواری من نییە... سەد ساڵە بۆ ئەم ساتە شەڕدەکەین و ئەم ساتەش ئێستا لێرەیە و کەچی هەموو وەک وڵاغی گێژ سەیریدەکەین و هیچ ناکەن. زۆرجار بە هەستێکی شکاو و نائومێدەوە دەگەڕامەوە بۆ شار.

سەردەمێکی سەیر بوو، من تەنیا کەس بووم کە بیرم لە ئاشتی نەدەکردەوە، نزیکی پازدەساڵ بوو لەو شارەدا کارم بۆ ئەوە دەکرد، هیچ هێزێک جگە لە هێزی ئێمە، هیچ حیزبێک جگە لە حیزبی ئێمە، قارەمان و سەردار نەبێت. ئێستا ئەو پیاوە لاواز و شل و پلانەم دەبینی بە قوونی

فشەوە خۆیان بۆ هەڵبژاردن ئامادەدەکرد. تورەدەبووم، دەهری دەبووم، تۆزە قژەکانی لاسەری خۆم دەڕنییەوە. چۆن دەکرا خەڵکێک بکەینە سەر پشک کە وەک من ژیانی خۆیان بۆ پاشەڕۆژی ئەم شارە تەرخان نەکردوە، چۆن دەتوانین هەموو شتێک ببەخشین بە سندوقێک کە دڵنیابووم خەڵک بە گەمژەیی، بە بێباکی، بە ئارەزووی ساویلکانە پڕیدەکەنەوە... هیچ میللەتێک نییە دوای ڕادان و هەڵبژاردن پەشیمان نەبێت.

شەوێکیان دوای ماندوێتییەکی ڕۆحی گەورە بە نیازی ئەوەی دکتۆر زەندیان ڕازیبکەم فوو بە ڕۆحی کوردایەتیماندا بکات، چوومەوە لای. ئەو ماوەیە وەک سەگێکی کۆڵنەدەرم لێهاتبوو کە خاوەنەکەی هەزار جار چیلکەیەکی بێفەڕ توڕدەدات و ئەو بەدەم دەیهێنێتەوە بەردەمی... شەو دوای شەو دکتۆر چیلکە ڕەقەکەی توڕ دەدا و من وەک سەگ بە پڕتاو دەمهێنایەوە بەردەمی. ئەو شەوە دکتۆر زەندیان بەرامبەرم گۆڕا بوو، وەک جاران نەیبردمە ژوورەکەی خۆمان، وەک شەوانی تر میوەی تازە و چەرەسی بۆ دانەنام. ئاشکرا دکتۆر تورەبوو، دیاربوو بە ڕۆژ چۆتە دیوانی سەرۆک و قسەی زۆری لەگەڵ کردوە، لەوەوە هێزی گرتووە لەگەڵ من ڕەق بێت و بوار نەدات هێندە لووت لە کاروباری بژەنم. بە تایبەت دەیزانی من لە ژێرەوە کاردەکەم کادێرە چالاکەکانی ڕاگەیاندن بخەمە دەزگاوە و ئەوەیان پێبکەم کە من دەمەوێت. ئەو شەوە بۆ یەکەمجار هاواری بەسەردا کردم و گووتی، من جگە لە دۆنکیشۆتێکی گەمژە هیچی تر نیم، سەرلێشێواوێکم نازانم چیم دەوێت، دڵێکی شەڕخوازی ڕەقم کە دەمەوێت وڵاتەکە بە ڕێگای جەنگ و خوێندا ڕابکێشم، پیاوێکم دەبێت هەموو کەس لێم بترسێت. ناوینام «شەڕخوازێکی قەحبە کە دەمەوێت کوڕی خەڵک بە کوشت بدەم». تا دەیقیڕاند بچوکتر دەبووەوە لە بەرچاوم، دەیگووت «قوڕ بەسەر ئەم مەملەکەتە کاری بکەوێتە بندەستی دوو شەڕخوازی مەلعونی وەک تۆوە کە جگە لە خوێنڕێژی هیچی ترتان لە سەردا نییە».
ئینجا قوڵی بیجامەکەی هەڵکرد و بە مۆنی و لووتبەرزی کەسێکەوە دوژمنەکەی خۆی بە بێڕەحمانەترین شێوە کوشتبێت گووتی «ئێمە

دەچین بۆ هەڵبژاردن، خەباتی ئێمە ئیتر لە سەر سندوقەکانی دەنگدانە...
پیاوی شەڕخوازی وەک تۆ، شوێنی ناو زبڵدانی مێژووە ... تۆ درەنگ یان زوو جێگات زبڵدانی مێژووە».

ئەو ڕۆژە وەک دڵێکی شکاو، وەک ڕۆحێکی زامدار گەڕامەوە ماڵێ. چاوەڕوانی ئەوە نەبووم کەسێکی وەک من کە ڕۆحی سوارچاکە دلێر و مەزنەکانی لەخۆیدا هەڵگرتووە، کەسێک بە خەیاڵی خۆی مەشخەڵی زەمانێکی تازەی لە دەستدایە، بەوجۆرە سووکایەتی پێبکرێت. بەڵام دەشمزانی کە ئێستا سەرەتا و دەروازەی عەسری سووکایەتییە، سەردەمێک کە هیچ شت و هیچ ئادەمیزادێک حورمەتی نامێنێت و لە نەفرەت و شکاندن بەدوور نابێت. بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا هەستم بە لاوازییەکی ترسناک کرد، هەستمکرد جگە لەوەی بچمە دواوە و بە نهێنی خۆم بۆ ڕۆژگارێک و سەردەمێکی نوێ ئامادەبکەم، هیچی ترم بۆ ناکرێت. باوەڕم بە هەڵبژاردن نەبوو، لەبەرئەوەی هەڵبژاردن لە مێژوودا هەمیشە دواچارەسەر بووە، لە پێشدا دەبێت هەموومان هەموو هێزێک بخەینە کار، دواتر کە جەنگ تەواوبوو، کە براوە و دۆڕاو دیاربوون، ئەوسا بچین بۆ هەڵبژاردن. دەزانم ئێستا دیسانەوە هەمووتان بە گومانەوە سەیرمدەکەن، ئەوانەی چاویلکەیان لە چاودایە دایدەگرن و تۆزێک تێدەفکرن، بەڵام لە سەرەتای ساڵی هەزارونۆسەدونەوەدودوو دا کەس بەوجۆرە بیری نەدەکردەوە، هەموو دەیانویست لە مفت وڵاتێکی دیموکراسییان دەستبکەوێت. سەرۆک «خودا لە گوناهە گەورەکانی خۆش بێت» لەگەڵ ئەورووپی و ئەمریکییەکاندا ئەو خەیاڵپڵاوەیان خستە سەری هەمووانەوە کە ئەم سەرۆک عەشرەتە مەلعونانە، ئەم لەشکرانە لە خەڵکانی تەماحکار و دەسەڵاتپەرست، ئەم پیاوە زگ برسی و ناوگەڵ برسیانە دەتوانن ببنە دیموکراس. دکتۆر زەندیان و هەموو کادێرە گەورەکانی حیزب لەو باوەڕەدا بوون ئێمە هەڵبژاردن دەبەینەوە، ئەو دڵنیاییە لای من دڵنیایی گەمژەکان بوو، تێنەدەگەیشتم چۆن جەنگاوەرێکی ڕاستەقینە خۆی دەداتە دەست کاری وەها، بۆ ڕۆحێکی سەرکەشی وەک من لە لەشیاندا نییە. ئەو شەوە

کە دکتۆر زەندیان لە ماڵی خۆی دەریکردم، من پاڵتۆیەکی درێژی ڕەشم لە بەردا بوو، هەوا سارد بوو، زۆر سارد بوو. لە کاتێکدا ئەو لە بەردەرگاکەوە جنێوی بە من دەدا و سووکایەتی و فەزاعەتی پێدەکردم. من بێئەوەی ویقاری خۆم بدۆڕێنم و تووڕەبم، لە بەردەرگاکەوە گووتم «جەنابی دکتۆر، هەڵبژاردن کاتێک مانای هەیە کە براوەکان سەد دەر سەد دیاربن، هەر کاتێک براوەکان دیار نەبن، کۆتایی هەر جەنگە ... دڵنیات دەکەمەوە، پێش هەڵبژاردن بچینە جەنگەوە باشترە نەوەک دوای ئەوە بە دۆڕاویی بچین». دکتۆر دەرگاکەی بە ڕوومدا داخست و گووتی «برۆ قووندەری، قووندەر باب. چەند مانگە خەو و خۆراکت لێ حەرامکردوم. باوە حیزی قەحبەباب». لەو دیوەوە جڕتێکی درێژ و ناخۆشیشی بۆ لێدام کە دەنگەکەی تا ئێستا لە گوێمدا دەزرینگێتەوە.

ڕۆژێک سەرۆک بانگیکردم، تازە بیرۆی خۆی گواستبووەوە ماڵێکی گەورە و خۆش، مێزی گەورەی دانابوو، خەریکبوو بنەو بناوانی کۆشکێکی سەرۆکانەی تایبەتی دادەمەزراند، ڕۆژانە میوان دەستە دەستە دەهاتن و ناوبانگ و بۆی سفرە گەورەکانی خەریک بوو بە دونیادا دەڕۆیشت، بەڵام تا دەهاتیش ئەو دەردە پیسە پتر دەیگرت، دەردی ئەوەی توانای بەرگەگرتنی بۆنی ئینسانەکانی نەدەما. کە چوومە لای و بینیم پتر خەیاڵم لای خۆی بوو تا قسەکانی، هێندەم سەلیقە و زانین هەبوو بزانم بۆچی بانگهێشتیکردوم. ئەو تۆڕە سەرەتاییانەش کە وردە وردە لە هەموو سوچ و جێگایەکەوە هەواڵیان بۆ دەهێنامەوە، ئاگاداریانکردمەوە کە سەرۆک ژێر بە ژێر خەڵکانێکی ڕاسپاردوە کاری من بخەنە ژێر چاودێری و هاتوچۆم لە چاوان غافڵ نەکەن. دەمزانی چۆن و بە کێ چاودێریم دەکات، ئەوە یەکەمجاری بوو بەو چەشنە لە من تووڕە بێت، هێدی هێدی تا دەهات دەمارگیرتر و نامۆتر دەمبینی، هەندێجار تووڕەیی کەفی پێدەکرد و زمانی لە گۆ دەکەوت و جگە لە بڵمەبڵمێکی توند کە وشەکانی لێک جیا نەدەکرانەوە، هیچی دی لێ دەرنەدەهات. دەمێ لە یەکێک زیز بووایە نێوچاوانی گرژدەکرد و وەک منداڵێکی خیشن لچی دادەشۆڕان و جار جار

لە ژێرەوە تەنیا نیگایەکی تورەی لێ دەهاویشت. ئەو ڕۆژە کە منی لە بیرۆ تازەکەی بانگهێشتکرد بەوجۆرە بوو، ماوەیەک منی دانا بێئەوەی هیچم لەگەڵ بڵێت. تەنیا لە بنەوە دەیروانی و ژێر بە ژێر خێسەی لێدەکردم، بە شێوەیەک چەند جار خەریکبوو بدەمە قاقای پێکەنین. دوای ماوەیەکی درێژ کەوتە قسە توندەکانی خۆی و گووتی کە من «وەک کوڕی ئەو نەماوم» «خەریکە سەرکەپووی خۆم و حیزب لە خوومی شین دەنێم» «وەختێکە دائیرەکەم بکەمە حیزبێکی تر کە لە بن فرمانی ئەودا نییە». من وەک قوتابییەکی دێرینی خۆی و وەک گوێڕایەڵێکی هەمیشە کە ناخوازێت بە عینادی منداڵانە و بە بەرگری نامەنتیقی خۆی ناشیرین بکات، خۆم بچوککردەوە و گووتم «جەنابی سەرۆک، من قوتابییەکی نەزانی ئێوەم، هەر هەڵەیەکم بووبێت لە مەحەبەتی منەوە بووە بۆ ئێوە». دەمزانی کرنوش و ستایش شاد و مەستی دەکەن، تا دوا ئەندازە دانەوان و خودبچوکی خۆم بۆ نیشاندا و چوومە ناوەڕاستی بیرۆکەی و وەک کۆیلە کۆنەکان نوشتامەوە و گووتم ئێمە لە حیزبدا خەڵکێکی نەزانین، کە خودا بەهرەیەکی بۆ سیاسەت و غەریزەیەکی بۆ دەرککردن نەداوێنێ، گەر باوکایەتی ئەو نەبێت، گەر مێژووی سیاسی و دیپلۆماتی ئەو نەبێت، ئێستا تەحا بەس خودای گەورە دەیزانی لە چ چاڵێکی جەهەنەمدا «کابوکێ»مان دەگووت. سەرۆک بەڕاستی کەیفی لە قسەی من دەهات، دەمزانی شەیدای ئەوەیە هەموو پیاوانی نزیکی خۆی بچوک و سووک ببینێت، تا خۆمان لە بەردەمیدا زیاتر دانەواندایە، خێراتر دەیبەخشین و زووتر چاوپۆشی لە هەڵەکانمان دەکرد. من لەو ڕۆژەوە زانیم گەر دەمەوێت ڕیسوام نەکات، دەبێت تا دەتوانم خۆم بچوکتر و بچوکتر و بچوکتر بکەمەوە، تا دەتوانم لە بەردەمیدا هونەرەکانی خۆ ڕیسواکردن زیاتر بخەمە کار. شادومان دەبوو ببینێت تۆ هەست بە بچوکی و ڕیسوایی خۆت دەکەیت. نا مەسەلەکە ئەوە نەبوو سەرۆک خەڵک بکوژێت یان دوای تورەبوونەکانی تیمێکی چەکدار بانگهێشتبکات لە مەیدانی پشتەوەی ماڵەکەی خۆیدا تیربارانتبکەن، نا شتێک نەبوو لە جۆری سەدام حوسەین، پیاوێک بوو توندوتیژی زۆر لە دەماریدا نەبوو.

بەڵام گەر توڕەبایە، زۆر توڕەبایە لە جێگاکەی خۆت دووری دەخستیتەوە. هەڵبەت دواتریش کە ئارامی تێدەگەڕا و هێوردەبووەوە، دەیناردیتەوە سەر کاری خۆت یان پلەیەکیش هەڵیدەکێشای، بەڵام چیرۆکی ڕیسواییەکەت وەها لە حیزبدا دەنگی دەدایەوە تا ساڵانێک لە یادی کەس نەدەچوو و فەرامۆش نەدەکرا. سەرۆک کەسی نەدەکوشت، بەڵام چواردەوری پیاوانی خۆی وەها مینرێژدەکرد نەتوانن جگە لە یەک ڕێگا زیاتر بگرن و لە یەک شت زیاتر بیربکەنەوە. من دەمزانی لەم سەر زەمینە تاکە کەسێک دەبێت بە ڕاستی لێی بترسم ئەوە... گەر هەموو هونەرەکانی ڕازیکردنی ئەو فێرنەبم، پاشەڕۆژێکم نییە. دواجار من نە لە جەمعی ئیمانداراندا بووم تا لە یەزدان بترسم و نە ئەخلاقییەکی وەها شەرمن و ئابڕوودارم بوو لە ناوی خۆم سڵبکەمەوە، کەسێک بووم مان و نەمانی دەسەڵاتەکانم بە نیازی جەنابی سەرۆکەوە بەندبوو، بەرپرسی یەکێ لەدەزگا نهێنییە گەورەکانی ئەو بووم. ڕەنگە بمویستبایە و لێبڕابام بمتوانیایە بیکوژم و بچمە جێگاکەی، بەڵام بە ڕاستی لە جێگای ئەودا چیم بکردایە. چ کارەساتێکی شەخسی گەورە دەبوو گەر بهاتبایە و من ببوومایەتە سەرۆک. بە بڕوای من تەنیا گەمژەکان دەبن بە سەرۆک، مێژووی مرۆڤ لەسەر ئەم ئەستێرەیە شاهیدە کە کەمجار پیاوی دانا بۆتە سەرۆک، سەرۆکبوون پۆستێکە بۆ گەمژەکان تایبەتکراوە و بۆ ئەوان قۆرغە. لە نێوان سەرۆک و هاوڵاتی سادەدا گۆمێک هەیە تەنیا هەندێک ماسی دەتوانن تێیدا مەلەوان بن، من ماسی ئەو گۆمەبووم، یان ڕاستییەکەی دڕەماسی هەرە گەورەی ئەو گۆمەبووم. ئەو جێگایەی خۆم گرنگتر و سەلامەتتر بوو لە جێگای ئەو ... ئەو هەموو ساڵەی خەبات ئەوەی فێرکردبووم، ژیانی پاسەوانەکان هەمیشە لە ژیانی ئەوانەی پاسیاندەکەین زامنتر و خۆشترە. من گەرچی دە پاسەوانم هەبوو، بەڵام خۆم پاسی خۆمم دەکرد، هیچ مرۆڤێک لەوە بەدبەختتر نییە کە پاراستنی ژیانی بداتە دەست ئەوانی تر. من پاسەوانەکانی خۆم پتر وەک خزمەتکار دەبینی تا پاسەوان، جل و گۆرەویم پێ دەشۆردن و پێڵاوم پێ بۆیاغ دەکردن. ئێستاش گەرچی من کۆیلە و ئەو کۆیلەدار بوو، بەڵام من لەوانە نەبووم

ڕوکەشی دونیا بمخەڵەتێنێت، شانۆگەری دەسەڵات لەوە ئاڵۆزترە کە گەمژەکان تێیدەگەن. سەرۆک خۆشی دەیزانی کە کەم تا زۆر ژیانی لە دەست من و هەندانێکی دیکەدایە. دەسەڵاتی من بەسەر ژیانی ئەوەوە لە دەسەڵاتی ئەو بەسەر ژیانی منەوە گەورەتر بوو. من خودای ڕاستەقینە بووم، بە دەمامکێکی ڕەش و دەسەڵاتێکی کەمەوە لەسەر زەوی دەژیام.

نا ، هێندە گومانی نەدەویست، من بە فیترەت پیاوێکی ئاسایش و چاوێکی گەورەی دەزگای ئەمنییەت بووم، کە دەمتوانی بە نمایشەکانم سەرۆکیش فریوبدەم. ڕەنگە پزیشکێک بتوانێت جارێک لە جارەکان ببێتە ئەکتەر، ببێتە جاسوس، ببێتە سەرۆک، بەڵام پیاوانی ناو دەزگاکانی هەواڵگری، ئەوانەی وەک من دەخولقێن و کاریان وا لە خوێنیاندا، ناتوانن هیچی تر بن، خەڵکانی دەزگا تاکە خەڵکێکن ناتوانن لە ڕاستیدا هیچی ترین جگە لە کارەکەر و خزمەتکاری دەزگا. من گەر بشیانکردبام بە وەزیر یان سەرۆک، لە ناخمدا هەر جاسوسێکی ئەبەدی دەبووم، کەسێک ئیشی ئەوەیە نهێنی بوون و نەبوونی هەموو شتێک و هەموو سەردەمێک و هەموو مرۆڤێک بپشکنێت. کە دەگەڕام و دەمپشکنی و لە ئەنجامەکانی کاری خۆم تێدەفکریم، بەخۆم دەگووت من هەم جەنگاوەرێکی کۆڵنەدەر، هەم جاسوسێکی فەیلەسوفم. جاسوس و جەنگاوەر دوو کەس نین غەریزەی سیاسی بەهێزیان هەبێت، سیاسەت بەهانەیە، هەموو شتێک بەهانەیە، بۆ ئەوەی دەرفەتمان هەبێت وردتر ئەوانی تر بپشکنین. من تەنیا چاو بووم کە جگە لە سەیرکردن و شۆڕبوونەوەی زیاتر، جگە لە بنکۆڵکردنی دیمەنەکان تا ئەو جێگایەی خوێنی لێ بێت، تەماحی سامان و پارە و ماڵم نەبوو... ئاسایشێکی کوردپەروەر و زاهید و سۆفی بووم.

ئەو ڕۆژە کە جەنابیان «خودا لە هەموو زوڵم و زۆرێکیان خۆشبێت» بانگیکردم، زۆر سوکایەتیان پێکردم، منی بە مشکێکی نەخۆش شوبهاند کە دەچێتە عەمبارێکی پڕ گەنم و گونێ بە گونێ فەردەکان دەدڕێت، بێئەوەی بزانێت بەدوای چیدا وێڵە. بە بڕوای ئەو، سەردەمی موحەبەت و لێبوردن هاتۆتە پێش و ئێمە دەبێت باوەشی گەورەی دۆستایەتی بۆ دونیا

بکەینەوە و ئەم عەقڵییەتی شەڕ و جەنگاوەرییە بخەینە لاوە. وای خودایە... ئەو قسانە چەند ئازاریاندام، تاکە دڵخۆشیم ئەوە بوو، دەمزانی ئەمە گوژمێکی تێپەڕی سەرۆکە و هەر زوو بەسەردەچێت، لە دڵی خۆمدا دەمگووت «هەموو سەرۆک و دەسەڵاتدارەکان، جار جار تووشی نۆبەتی وا مرۆڤدۆستانە و ئاشتیخوازانە دەبن، بەس هیچ کات تاسەر لەسەر ئەو مەیل و هەوایە نامێننەوە». سەرۆک دەیویست من جگە لە کاری پاسەوانی و دواکەوتنی دەنگوباسی ئەوانەی دەیانەوێت زیان بەو بگەیێنن کارێکی ترم نەبێت و خۆم بە هیچ ئامانجێکی ترەوە سەرقاڵ نەکەم. مەبەستی بوو هەموو تۆڕەکانی ئاسایش و هەموو شتێک وەک شورایەکی ئەستوور دروستبکەم کە دواجار تەنیا بەدەوری ئەودا بەرزدەبنەوە. بە ڕوونی و ڕەوانی پێیگووتم، کاری تۆ ئەوە نییە نیشتیمان بپارێزیت، پاراستنی وەتەن کارێکە وا لە ئەستۆی ئەو، من کارم تەنیا پاراستنی ئەوە و هیچی تر، منی وەک دیوارچن و پەرژینسازێک دەبینی کە دەبێت لە نێوان ئەو و مردندا بەربەستێک هەڵچنم هەتا ئیزرائیلیش لێوەی دزەنەکات. قسەکانی سەرۆک و شێوەی تەماشاکردنی بۆ کردار و وەزیفەی من، گەلەک نائومێدکەر بوون. من خەونی گەورەترم هەبوو، خەونی دروستکردنی دەزگایەک لە ژێرەوە هەموو نیشتیمان ببات بەڕێوە، دەزگایەک هەزاران ساڵ بمێنێتەوە و گۆڕان و مردنی هیچ ئادەمیزادێک کار لە ئیشکردنی نەکەن. پیاوی ئاسایش وەک پۆلیس نییە، پۆلیس یاسا و سەلامەتی و ژیان و ماڵی خەڵک دەپارێزێت، بەڵام ئاسایش دەوڵەت دروستدەکات، پۆلیس ڕێگری لەو شتانە دەکات کە نابێت ببن، ئاسایش ڕێگا بۆ ئەو جیهانە خۆشدەکات کە دەبێت لە بنەوە سەر بەرزبکاتەوە. ئەوەش شتێک بوو کەم و زۆر دوور بوو لە خەونی سەرۆک کە خۆی بە تەنیا خالیق و باوکی هەموو شتەکانی سەر ئەم زەمینەی ئێمە دەزانی و دەیویست دوای مردنی خۆی، هەموو شتێکە ببێتە تۆز و هیچ نەمێنێتەوە.

من وەک جانەوەرێکی شکستە و شاخ شکاو، بە ملهوڕییەکی دەستکردەوە لای سەرۆک هاتمەدەرێ. شانم کووڕکرد و وەک یەکێک کوتەکێک بەر

لاسەری کەوتبێت لارەلارە لە ژوورەکەی، بێخشپە و خوداحافیزی، سەرشۆڕانە خۆم گەیاندە ئەو دیو دەرگاکەی، دەمزانی بینینی من بە بچوکی و کەساسی زۆر دڵی خۆشدەکات، حەزی لێبوو هەر کەس لە ژوورەکەی دەچێتەدەرێ لەو قەد و قەوارەیە بچوکتر بێت کە پێوەی هاتووە. ئەو نەخۆشییە دواتر لە هەموو وڵاتیشدا بڵاوبووەوە و بۆ هەر جێگایەکی گرنگ دەچوویت، دەبوو حەتمەن بچوکتر لەوەی پێشتر بوویت بێیتەدەرێ. من دەبوو ئیدی پلانەکانم بگۆڕم. دەمزانی تاکە شتێک ئێستا گرنگ و پێویستە ئەوەیە لە شوێنی خۆم بمێنمەوە. لەوەوە وازمهێنا بیر لە دروستکردنی هێڵێکی نهێنی لە ناو حیزبدا بکەم کە جڵەوی تێفکرینەکان بگرێتە دەست. گەر سەرۆک بە کاری وای بزانیبایە، بە تۆمەتی لەتکردنی حیزب و کۆدیتا و هەرزەکارێتی شۆڕشگێرانە، لە حیزب دەریدەکردم. دەبوو جارێ دۆنکیشۆتەکەی خۆم بخنکێنم و لەبری ئەو تەیرێکی دیکە بخەمە سەر شانۆ.

ڕوومکردە کارکردن و بەهێزکردنی دەزگا و جۆشدانی گیانی جەنگاوەرانەی کارمەندە گەنجەکانم. خولیای دروستکردنی خانوویەک و زیندانێکی گەورە تا بیانکەم بە مەڵبەندی گشتی ئیدارەی ئاسایشی هەرێم، کەوتە سەرم. هەڵبەت وەها گەمژە نەبووم بچم پارچە زەوییەک جیابکەمەوە و دەستبکەم بەخەندەک لێدان بۆ باڵاخانەیەکی مەزن، خۆتان دەزانن فەلسەفەی من لە کاری ئاسایشدا لەسەر دیالەکتیکێکی قووڵی نێوان دەرخستن و شاردنەوە داڕێژرابوو، لە نێوان دەمامک و حەقیقەتدا. ئاسایش تەنیا دەبێت ئەو جێگایەی دیاربێت کە پێویستە، ئیشی ئاسایش پتر کاری ونکردن و ناواخنکردنە ... ئاسایش لە توخمی ئەو ئاژەڵانەیە کە لە ژێر زەمیندا دەژین، بەشی زۆری کارمان لە بن زەویدایە، نەوەک سەر زەوی. من خانە و ماڵێکم پێویست بوو زۆر لە ڕوو نەبێت، دیمەنێکی ترسناکی نەبێت، گومان و دوودڵی دروست نەکات. گرنگ بوو بۆم ترسناک بم، بەڵام تۆقێنەر نەبم. ترس شتێکی هێور و ناوەکی و هەمیشەییە، بەڵام تۆقان پەلەکی و کەم خایەنە. جگە لەوە بەردەوام ئەندامانی بیرۆی باڵای

حیزب بە هەق و ناهەق دەیانگووت ئێمە وەک بەعسییەکان نین، ئێمە کوڕی میللەتین، نامانەوێت کەس لە دەسەڵاتمان بترسێت... شتێک منی هەم شێت و هەم ئیفلیجدەکرد. هیچ شتێک لەو بەشەی دەسەڵات بەدتر و گەمژەتر نییە کە بەردەوام دەیەوێت جوان خۆی نیشانبدات، کارێک بە بڕوای من وادەکات کەسانی وەک من کە ئامێرە ڕاستەقینەکانی حوکم و مەکینە گەورەکان دەخەینە ئیش بکەوینە درۆی گەورەوە و ئیشەکەمان تەواو سەخت بێت. دەسەڵات جگە لە ڕاستگۆیی نابێت زمانێکی تری هەبێت، زمانی ڕاستگۆیش هەمیشە توندە، خوێنینە، ئەشکەنجەسازە، ئەوە درۆیە کە دونیا پڕدەکات لە هێمنی و سەلامەتی... خودایە ئێستاش کە بەیادمدا دێتەوە، دەمامکەکانی سەر سەری ئەو سەردەمە چ چڵکن بوون، موچڕکم پیادێت.

لە جێگایەکدا نزیک لە ناوەڕاستی شار، بەڵام کەمێک چەپەک و نابەرچاو، نیشتەجێی دائیرەیەکی کۆنم بەکرێ گرت، شوێنەکە دەبوو تەنیا ئەو بەشەی دیاربێت کە ڕوویەکی مەدەنی و نوێ بە ئیشی من دەبەخشێت، ئەوەی دەبوو بیکەم ئەوە بوو، لە ژێرەوە ڕا نهۆمێکی تر دروستبکەم بڕێک لە ئیشی ئێمە ونبکات و دەری نەخات. نزیکی نۆ مانگ دەیان کرێکارم لەدروستکردنی ئەو ژێرزەمینە نهێنییەدا خستەکار. دەبوو بەر لەوەی بگەینەوە زستانی داهاتوو، شوێنکارێکی گەورەم دروستکردبێت. ژێرزەمینەکەم وادروستکرد تەنیا دوو دەرگا و دوو کلیلی هەبێت، دەرگایەکیان لە ناو ئاسایشدا و دەرگایەکی نهێنی تر لە دەرەوە، لە ناو ماڵێکی نزیکدا کە بە نهێنی بۆ کاری پاراستن و چاودێری کۆی دەزگاکە بە کرێمان گرتبوو، دوو کلیلەکەش یەکێکیان هەمیشە لای من و دووەمیان هەمیشە لای ئەفسەری خەفەر بوو. چ سەرەتایەکی جوان و سادە بوو، بۆ شوێنێکی وەها تاریک و ترسناک.



سەرەتای ساڵی نەوەدودوو بە گشتی بۆ خەڵک ناخۆش نەبوو. خەڵکی کاتێکیان دەستکەوتبوو خەریکی ژیان بن، گەرچی نەداری و برسێتی زۆربوو، بەڵام لە چاو هەژدە ساڵی ڕابوردوودا ئارامی و هێمنییەکی ترسناک و بێوێنەش باڵادەست بوو. ئەوانەی ساڵانی جەنگ ژنیان نەهێنابوو ژنیان دەهێنا، ئەوانەی دڵداریان نەکردبوو دەیانکرد، ئەوانەی بە هۆی شۆڕشەوە لە نوێنی نەرم و گەرمدا نەخەوتبوون ئێستا دۆشەکی بەرز و لێفەی ئەستووریان دەکڕی و تیا دەخەوتن. هەموو وڵاتەکەش بە بادەی دیموکراسییەت مەستبوو، سەردەمێک بوو حیزبەکان بانگەشەی هێمنی و خۆشەویستییان دەکرد، سەرکردە دوژمنەکان لەسەر سفرەی یەک دادەنیشتن و گاڵتە و نوکتەیان دەگۆڕییەوە، ئەمریکییەکان جار جار دەهاتن و دەبوونە میوانی سەرۆک و وێنەیان لەگەڵدا دەگرت و بێ هیچ قسە و باسێکی ڕوون دەڕۆیشتن. لەو سەردەمەدا من جگە لەوەی وەک مشکێک لە ژێر زەمینی دەزگاکەمدا کاربکەم، چارەیەکی دیم نەبوو، ڕۆحی جەنگاوەرانەی خۆم خستبووە کەنارەوە و هیچ دەرفەتێکم نەبوو ئاشکرایبکەم. لەو شەوەوە ئیدی بە تەواوی وازم لەوە هێنا بچمە لای دکتۆر زەندیان، ئەو هێدی هێدی خۆی لەو ڕابوردووە مارکسییە و لەگەڵیشیدا لە هەموو ئەو نەبزە شۆڕشگێڕە پاککردەوە کە سەرەتا زۆر ئازاریدەدا، دیاربوو لە هەموو شوێنێک کەوتۆتە دژایەتیم، منی بە کەسێکی ترسناک ناودەبرد کە زیانم بۆ سەر پێکەوەژیان و ئاشتی هەیە، وەک گوندەکییەکی توندڕەو باسیدەکردم کە بە هۆی کەمی ڕۆشنبیریی سیاسیمەوە، بوومەتە دژی ڕەوتە نوێکانی دونیا. لە ڕاگەیاندنە تازەکاندا قیافەی کەسێکی عاقڵی دەگرت و چاوەکانی بچوکتر و تەسکتر «لە بچوکی و تەسکی سروشتی خۆیان» دەهێنایەوە یەک و دەیگووت «ناڵێم

حیزبی ئێمەش هەمووی چاکە، ئێمەش بەشی خۆمان خەڵکی شەڕانگیز و خراپمان تێدایە کە هەر بە عەقڵییەتی کۆن و بەزمانی فیشەک دەیانەوێت بگەنە ئامانجەکان. ئەشخاسێکی لومپن و ئاژاوەچی کە هیچ لە نەزمی نوێی دونیا و مەیلی ناوچەکە بۆ ئاشتی تێنەگەیشتوون»... هەر کات وایدەگووت دەمزانی مەبەستی منە. دوای بیرکردنەوەیەکی ورد و دوای تووڕەبوونەکانی سەرۆک، گەیشتمە ئەو بڕوایەی هێزم لە دەزگای ئاسایش هیچ کات لە ڕووی زەبر و تواناوە ناگاتە ئەوەی عفریت و دایناسۆرەکانی حیزب، کە سەرۆکیان لە پشتە بدەم بە زەویدا. توانای هەموو کارێکی ترسناکم بوو، بەڵام کار کەی دەبێتە کار، گەر پێشبینی هەموو دەرەنجامەکانی نەکەیت. لە دیدی هەڤاڵانی ترەوە پلەوپایەم پتر تەکنیکی بوو، زۆربەی ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی وەک خاوەن پیشەیەکی لێزان سەیریاندەکردم تا سیاسەتمەدارێکی خەوندار و نەخشەکێش. وەک پاسەوانێکی سەگ سیفەت لێیان دەڕوانیم تا پیاوێک سەری پڕ بێت لە خەیاڵاتی گەورە. بەڵام خۆم ڕوانینێکی دیکەم بۆ پیشەی خۆم هەبوو، بێئەوەی گوێی بدەمێ و خۆم تووشی ململانێی لابەلا بکەم، ڕوومکردە دامەزراندنی دەزگا و تاقیکردنەوەی شێوازەکانی چاودێری و هەواڵگری، بڕیارمدا پلانەکانم هەڵپەسێرم و بڕوانم ئایا مرۆڤەکان هەر بەڕاستی وەها خوێن شیرین و لێبوردە بوون وەک خۆیان باسیدەکەن، یاخود ئەوەی دەیبیستم و دەیبینم تۆبەتێکی کورتە لە مرۆڤدۆستی درۆزنانە کە ناو بە ناو وەک پەتا بڵاودەبێتەوە و هەموو جانەوەرێک دەیگرێت. کەوتمە سەرکاری ئەوەی بەهرەی خۆم گەشەپێبدەم و تۆڕی بندەستم وەها چالاکبکەم ببمە هێزێک نەشێت هەر کەس و ناکەسێک هەستێت و فەرامۆشمبکات. شارم دابەشکردە سەر چەندین ناوچە، لە هەر ناوچەیەکدا چەندین چاوم بە جۆرێکی ئەندازەیی ئەوتۆ چاند بتوانن هەموو کونج و کەلەبەرێک داپۆشن و بگەنە هەر جوڵە و ڕەفتارێکی گوماناوی کە لە دەوری خۆیان دەیبینن. تەکنیکێکم پەیڕەوکرد بە ناوی تەکنیکی ماسی کڕ و ماسی گەڕۆک. ماسی کڕ ئەوانە بوون کە لە جێگای خۆیان نەدەجوڵان. ئەو سیخوڕانەی شوێن کار و ژیانی خۆیان جێنەدەهێشت، لە شوێنێکدا

دەوەستان و سەیری دونیایان دەکرد، ئیشیان تەنیا ئەوەبوو چواردەوری خۆیان بپشکنن، شوێنی جوگرافی کارکردنیان سنووردار بوو. بەڵام ماسییە گەڕۆکەکان ئەوانە بوون بە ناو هەموو حەوزەکەی خۆیاندا دەگەڕان، هەتا دەکرا بیاننێرینە ناو حەوزی تریش، هەموو حەوزێک کەسێکی هەبوو ناوی «دڕەماسی» بوو، ئەوە بەرپرسی تەواوی حەوزەکە بوو، دڕەماسی ئەوانە بوون دەیانکرا هەمو کات هەموو شار بە سیفەتی چاوی نهێنی بگەڕێن. لە کاتێکدا کرەماسی، لە ژێر هەلومەرجی تایبەتیدا نەبووایە کاریان بە دەرەوەی شوێنی خۆیان نەبوو. گەر یەکێکمان بخستبایەتە ژێر چاودێری، ئەوکات دڕە ماسییەکان شوێن دوای شوێن دوایدەکەوتن و لە هەر جێگایەکدا پێویست بایە ماسییەکانی تریان لێ ئاگاداردەکردەوە. لە کتێبی «چاوی خودا» دا هەموو ئەو سیستمە ئەندازەییەم لە بەشێکدا بە ناونیشانی «دەریاچەی ماسییە ژیرەکان» نوسییەوە. بوون بە ئاسایش لای من هەڵوێستێکی فەلسەفی بوو لە ژیان و مرۆڤەکان. بە بڕوای ئەو سەردەمەی خۆم پیاوی ئاسایشی ڕاستەقینە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ فەیلەسوف یان ڕۆماننوسێکی مەزندا نەبوو، بۆیە من لە فەسڵەکانی تایبەت بە ژیان لە «دەریاچەی ماسییە ژیرەکان»دا، عەودالّی هەمان ئەو پرسیارانە بووم کە فەیلەسوف و نوسەرەکان دوای دەکەون، سەبارەت بەوەی مرۆڤەکان چۆن دەژین و چۆن بیردەکەنەوە. پرسیاری گەورەی پیاوانی هەواڵگر و نهێنیدز پێشتر ئەوە بووە، بۆ من دەمەوێت کەسێک چاودێریبکەم؟ ئەوە ئەو پرسیارە گرنگ و هەمیشەییەیە کە هەر بەڕێوەبەرێکی ئاسایش لە خۆی دەکات. بەڵام من نیگایەکی دیکەم بۆ شتەکان هەبوو، بەشێکی کتێبەکەمم بۆ ئەوە تەرخانکرد «بۆدەبێت من چاودێریت نەکەم؟». هەموو مرۆڤێک شایەنی چاودێرییە، هەموو مرۆڤێک بەشی ئەوە گوناهی هەیە بۆمان هەبێت بیخەینە ژێر وردبینێکی گەورەوە و بیپشکنین، هەموو مرۆڤێک جنسێکی سەربەخۆ و تاقانەیە لە مەخلوقات، هیچ شتێک وەک وشەی مرۆڤ گشتی و فریودەر و درۆزن نییە. مرۆڤ چۆلەکە یان قالۆنچە نییە بکرێت هەموویان بخرێنە ژێر یەک ڕەگەزەوە، هەموو مرۆڤێک ڕەگەزێکی

سەربەخۆی مەخلوقاتە کە بۆ جارێک لەدایکدەبێت و ئیتر دووبارەنابێتەوە، بۆیە چۆن پشکنینی مێروویەک کە وەختە لە نێو دەچێت پێویستە، پشکنینی هەر مرۆڤێکیش بەتەنیا و وەک ڕەگەزێکی تایبەتی و سەربەخۆ کاری ناچارییە. لەو کاتەوەی فریشتەکەم ڕۆیشتبوو، من ڕۆژ دوای ڕۆژ لە خۆم و لە مرۆڤ بەدگومانتر دەبووم، کینەم لەوە دەردەچوو بەرامبەر هێزێک، نەتەوەیەک، مەزەبێکی دیاریکراوبێت، بەڵکو بوغزم هێدی هێدی دەبووە بوغز لە کەسەکان، لە تاکە تاکەی ئادەمیزادان. وەختێک دەمبینی خەونە گەورەکانم بۆ پاراستنی ئەو گیانی خەبات و سوارچاکییە لە مرۆڤەکاندا خەریکە دەمرێت و ناگاتە هیچ، مۆتەکە و دێوەزمە ڕەشەکانی نائومێدی دەستیان دەخستمە بینم و وەختبوو دەیانخنکاندم. دەمێک کتێبەکەمم دەنوسی، لە هەندێ جێگادا، چۆن سۆفییەک موچڕکی ترسی پێدادێت کە تێدەگات سەر بە هۆزێکی گوناهبارە، ئاوا دەکەوتمە بیرکردنەوە لە جەوهەری سست و گوناهباریی مرۆڤ و لەگەڵ ئەو بیرانەدا هەموو لەشم دەنیشتە سەر عارەق. شەوانە دەستنوسی کتێبی چاوی خودام لەگەڵ خۆمدا دەبردەوە ماڵێ و لەسەر کورسی و مێزە ڕەقەکەم بە هەستی سۆفییەک کە لە گوناهی مەخلوقات و گوناهی ژیان دڵنیایە دەمنوسی. لە یاداشتەکانیشمدا تۆمارمدەکرد کە هەندێک کتێب وەک ماڵێک وەهان مرۆڤ بۆ خۆی دروستیاندەکات، تا لە ناویاندا دابنیشێت. دێڕەکان و ڕستەکانی پەرژینێکن و لە دەوری خۆی هەڵیاندەچنێت... نوسینی کتێبی چاوی خودا بووە گرنگترین شتێک کە پێموابوو دەتوانم بیکەم، سەعاتەکانی پشووم لە دائیرە و شەوانی ساڵی نەوەدودووم لە نوسینی ئەو کتێبەدا بەسەر برد، نوسینی کتێبەکە هێزێکی دەدامێ و خەیاڵی بۆ شتی ترسناک دەبردم، هەر شتێک دەهاتە خەیاڵم دەمنوسی، هەندێ جار پەراوێزەکانم لە تێکستەکەم درێژتر دەبووەوە، ئەوەی مەبەستم بوو ئەوەبوو، هونەرێک بۆ بینین و کۆنترۆڵکردن و ئاراستەکردنی مرۆڤ دابرێژم پێشتر بوونی نەبوو بێت. لە تیورەی چاودێری موتڵەقدا، هەموو مرۆڤێک دەبوو لە زیاد لە جێگایەکەوە تیشکی لێدرێت و ڕۆشنبکرێتەوە و بپشکنرێت. تەواوی ئەو کارەشم هەم وەک وەزیفەیەکی

سیاسی، هەم وەک وەزیفەیەکی ئەخلاقی دەبینی، هەتا هەندێ جار بە ڕاستی ئەو هەستە دایدەگرتم کە ئەوەی من دەیکەم، لە ساڵانی داهاتوودا پێکوڵکەری ئاینێکی تازە دەبێت، ئاینێک لەبری نوێژ لەسەر دانپیانانی ڕۆژانە بەنددەبێت بە گوناهدا. ئەوە ئەو خواستە بوو کە بە شێوەی جۆراوجۆر لە هەمووماندا سەریهەڵدا، هەموو پیاوە گەورە و گرنگەکانی ئەو مێژووە، هەموو بە جۆرێک لە جۆرەکان شەیدای ئەوەبووین هێزی خۆمان لەسەر بوونەوەران و هێزەکانی تر و دونیا تاقیبکەینەوە... هەموو دونیای ئەو ساتە، لەوەدا کورتبووبووەوە، پیاوانی وەک ئێمە زۆرترین لەزەت لە دەسەڵاتێک ببینین کە سەدان ساڵ بوو هەموو نێرێکی خەسێنراو و ژێرپێنراوی کورد خەونی پێوە بینیبوو. ئێستا ئەو سەعات و ڕۆژە لێرە بوو کە تۆڵەی دوو هەزار ساڵ بێدەسەڵاتی لە دونیا بکەینەوە. کە کتێبی چاوی خودام دەنوسی، خۆم وەک ئەندازیاری شەمەندەفەرێکی سیحراوی دەبینی کە هەمیشە دەبێت بگاتە ئەو جێگایەی دەیەوێت. دەمویست هەموو شتێک تاقیبکەمەوە، دەسەڵاتەکانم بەکاربهێنم تا تاریکترین جێگای ئەم شارە ڕوناک بێت لە بەردەممدا. ئیشی ئاسایش لای من ئیشێکی ئەندازەیی و ڕۆحی بوو، دەرەنجامگیرییەک بوو بە عەقڵ و ویژدان و تێڕوانین، کاری ژمارەگرتن و فۆرم ڕەشکردنەوە نەبوو. ئیشی پیاوی ئاسایش ئەوە نییە خەڵک بگرێت و لە ژێر داردا شوناسێکیان بەسەردا بسەپێنێت، ئیشی ئەوەیە بە دوای نێچیرەکەیدا بڕوات و بێئەوەی ئەو هیچ بزانێت، دەرکی بە هیچ مەترسییەک کردبێت، هەموو شتێک ببینێت و تێبیگات. هەڵبەت دواتر شێوازی دیکەی چاودێریم دۆزییەوە، بەڵام هەمیشە کارم بۆ ئەوە دەکرد یاسای یاریکردنی ئاسایشی ڕاستەقینە وەک یاسای شەترەنج وابێت، دەستت لە هەر داشێکەوە دا دەبێت بیگریت و بیجوڵێنیت، ئەوە یاساکەیەتی، لە بەرئەوە هیچ جۆرە هەڵەیەک قەبووڵناکات، ئەو داشەش کە دەیجوڵێنیت دەبێت هەمیشە داشە ڕاستەکە بێت. گەر وانەکەیت هەر ئاسایشیت، بەڵام ئاسایشێکی گەمژەیت. من خۆم لەسەر کاغەز و لە بیرکردنەوەدا ئاسایشێکی زیرەک بووم، بەڵام بەرز و

نزمییە ترسناکەکانی دەڕونم، زۆر جار کارێکیاندەکرد، بچمە ڕیزی گەمژەکانەوە.

لە نیشتەجێ تازەکەدا بیرۆیەکم بۆ خۆم ڕێکخست و شەو و ڕۆژ خەریکی کۆبوونەوە و ڕێکخستن و خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکان و تەماشای وێنە بووم. ئیشکردن لەسەر ئەرشیف و ڕێکخستنی نێوان بەشەکان و دروستکردنی بەشی نوێ بووە کاری شەو و ڕۆژم. ئیتر جگە لە ژیانی ناو ژوورەکانی دەزگا کاتم بۆ هیچ شتێکی تر نەما. هیچ شتێکم لە دەرەوە بۆ گرنگ نەبوو، ئەو زانیارییانە نەبێت کە لە سەدان لاوە دەڕژانە بەردەمم و دەبوو لێیان ڕابمێنم. ژیان بە هەموو لق و پۆپ و پارچەکانییەوە دەکرا بە وێنە و ڕاپۆرت و لە ژێر دەستی مندا دەگیرسایەوە، من ئەو بەنداوەبووم کە هەواڵەکان لە پێشدەممدا کۆدەبوونەوە و دەبوونە دەریاچەیەکی گەورە و فراوان. مرۆڤەکان لەزەتێکی زۆریان لەوە دەبینی چی لە سەر یەکتر دەزانن ئاشکرابیکەن، منیش لەزەتێکی زۆرم لەوە دەبینی، ببینم مرۆڤەکان چۆن بە شەڕانگێزییەکی بێوێنەوە دەیانەوێت یەکتری وێرانبکەن. زۆربەی زانیارییەکان سوودێکی سیاسیان نەبوو، بەڵکو زیرەکی و لێهاتوویی کارمەندەکانیان دەردەخست، لە پشکنینی یەکدا. خەڵکی شار بێڕەحمانە یەکتریان لە بەردەم مندا ڕووتدەکردەوە، بە جۆرێک ژوورەکەی من وەک ئەو کونەی لێهاتبوو کە لە دیواری گەرماوێکی گەورەدایە و لەوێوە دەکرێت عەورەتی ژن و پیاوانی شار ببینیت. هێدی هێدی بە ترساندن و فریودان، بە سەرقاڵی پوچ و دروستبوونی خواستی بێشەرمانە، خولیا گەورەکانیان بۆ جەنگێکی نەتەوەیی و سەرتاسەریی کوشتم و بوومە چاوبزبزۆکێکی بە تەماح کە تەنیا لەزەت لە درزە نیگاکانی خۆی دەبینێت ... ئێستا لە بری ڕۆحی شاسوارەکان، گیانی سیخوڕێکی پیسدڵ و بەدنیاز لە شارەکەدا دەگەڕا، لە بری جەنگاوەرانی ئومێد، کەسانێک هاتنە مەیدان بە دوای پشووی درێژ و ئاسوودەگی تەمبەڵان و ژیانی چڵێساندا دەگەڕان.

وای لێهات من عاشقی ژوورەکەی خۆم بووم لە دەزگا... کاتێکیش هەڵبژاردن و هەرا و بەزمە بێسنوورەکانی هاتنە پێش و دەبوو هەموان

دەنگبدەن، من کاروبارم ڕادەستی جێگرەکانم کرد و ئەو ڕۆژەم کردە پشوو و لە نزیکی مێزەکەی خۆمەوە جێگایەکم لە ماڵ ڕاخست و لێیخەوتم، بێئەوەی خۆم فریوبدەم و بچم دەنگ بدەم. وەک ڕۆشنبیرانی ئەم میللەتە هێندە گەمژە نەبووم، وابزانم لەم دارستانە ڕەشەدا دەشێت شتێک لەدایکبێت ناوی لێبووردنی ڕاستەقینە بێت. شتێک لە ڕۆحی مرۆڤەکاندا بوونی نەبێت ئاسان ناخرێتە ناو ڕۆحی مێژووەوە. من بەیەک چاو سەیری هەموو مێزەکانم دەکرد، تەنیا جیاوازیان ئەوەبوو من سەر بە یەکێکیان بووم و سەر بەوانی دی نەبووم. ڕۆژان و مانگانی دوای هەڵبژاردنیش من بێئاگا لە دونیای سیاسەت کارمدەکرد، نە لە تەلەفزیۆنی نوێی حیزبم دەنواڕی و نە تەواوی ڕۆژنامەکەشم دەخوێندەوە. خولیای سەرەکیم لە پاڵ کارەکەمدا دۆزینەوەی فریشتەکەم بوو، هەر لەسەرمدا بوو بیدۆزمەوە و بیکوژم. بەڵام نە ئەو و نە هۆشەنگی بولبولیار دیارنەبوون، چیم دەکرد و چەند دەگەڕام نەمدەدۆزییەوە. دەمزانی تا ئەو بژی مەترسییەکی قووڵ لەسەر من هەیە، نەمدەزانی ئەو مەترسییە چییە ... مەترسییەک بوو کە ناوی نییە. وەک ئەوەی ڕۆژێک هەستم و ڕوانینم بەرامبەر هەموو شتێک گۆڕابێت، وەک ئەوەی لە ناکاو خەیاڵم بچێتە سەر شتێکی تر و واز لەم ژیانەی ئێستام بهێنم، وەک لە ناکاو لە خۆمدا شتێکی ونبوو بدۆزمەوە، تەواوی وجودم بگۆڕێت. دەترسام، دەمزانی ئەو فریشتە مەلعونە شتێکی لە مندا جێهێشتووە ... فریشتەکان بە مردوویش شت جێدەهێڵن کە دوایی وەک خۆرەیان لێ دێت. دەبوو بیکوژم، تا دڵنیابم بۆ هەتا هەتایە وەکو خۆم دەمێنمەوە.

## ئەنوەر پۆخان لە داوی شەیتاندا

هیچ کەس گومانی لەوە نەبوو کە ئەنوەر پۆخان و گۆڤاری بوهاران هێندەی نەیار و ناڕازین، لەگەڵ دەسەڵاتدا نین. لە ڕاستیدا ئەنوەر پۆخان چەندین ساڵ بوو دژێکی ڕاستەقینەی دەسەڵاتداران بوو، ڕای وابوو ئەمجۆرە دەسەڵاتدارانە هەرێم و ئەزموونە تاقانەکەی بەرەو هەڵدێر دەبەن. بەڵام لە ناکاو تووشی ئەو بێهیواییە کوشندەیە بووبوو کە هەندێ جار وا لە عاشقێک دەکات خۆی بداتە دەست قێزەونترین کەس تا لە ژانی کوشندەی عەشق دەربازی بێت، لە ڕاستیدا زۆر لە ئۆپۆزسیۆنەکانی ئێمەش شتێکی لەوجۆرە بوون، هەموویان ساتێکی نائومێدی قووڵیان هەبوو بەرەو باوەشی دەسەڵاتی دەبردنەوە. پۆخان لە ناکاو هەستی بە ماندووبوونێکی زۆر گەورە دەکرد. هەستیدەکرد هەموو شتێک پوچە و باشترین چارەیەک ئەوەیە کە شتێک بکات ژیانی خۆی بگۆڕێت. بێتاقەتی خۆی، ڕەفتاری نادۆستانەی ژنەکەی، کێشەی کەڵەکەبووی ماڵی باوکی، بەزم و باوی منداڵانەی ڕۆژنامەنوسە گەنج و بێ ئەزموونەکان، هەموو بە جۆرێک ماندوویانکردبوو، ڕقی لەو ڕۆژەش بوو کە خۆی تێکەڵ بەم جەنگە گەورەیە لەگەڵ حوکمڕاناندا کرد. لە دوو ساڵی ڕابوردوودا نزیکییەکی کەمی لەگەڵ پرۆفیسۆر شالیاردا پەیداکردبوو، هەردووکیان لەوەدا بەشداربوون زۆر ڕقیان لە شەفیق هرووری بوو، پرۆفیسۆر لەوەدا لێزان بوو گەنجان و خەڵکانی خوێندەوار و کەسانی مایل بە ئۆپۆزسیۆنیش لەخۆی نزیکبکاتەوە، کەچی لە ناو حیزبدا و لە دەزگا ناوخۆییەکاندا ترسناکترین کەسێک بوو کە توندوتیژی وەک چەکێکی سیاسی ڕاستەقینە بەکاردەهێنا. پۆخان بە هۆی کاری ڕۆژنامەگەرییەوە چەند جارێک پرۆفیسۆری بینیبوو، هەتا جارێکیش دوو بە دوو دانیشتبوون... پرۆفیسۆر گەرچی پیاوێکی

سادە نەبوو، هەمیشە ویقارێکی ئیمپریالیستی لە دانیشتن و قسەکردنیدا بوو، بەڵام بەوەدا چاوی بڕیبووە جێگاکەی سەرۆک، هەم لە ناو حیزبدا کەوتبووە پاکسازی و ترس دروستکردن، هەم بۆ دەرەوەش و لە ناو گەنجاندا کەوتبووە گەرمکردنی بازاڕ و سەرگەرمی بەستنی زۆرترین هاوڕێتی بوو. نزیکبوونەوەشی لە ڕۆژنامەنوس و هونەرمەند و شاعیران ئامانجی سەرەکی بوو، هەتا بۆ ئەوەی خۆی وەک پیاوی ئەدەب و کولتوور نیشانبدات، بەرهەمی هەندێک نوسەری پیر و گەنجی لەسەر دارایی خۆی چاپکرد و لەگەڵ خاوەنەکانیاندا وێنەیەکی پڕ خەندەی گرت و لە ئەرشیفی شەخسی خۆیدا هەڵیگرتن.

دوو ڕۆژ دوای دانیشتنەکەی لەگەڵ شەفیق هروریدا، پۆخان کە حەزێکی گەورەی هەبوو لە پرۆفیسۆر نزیکبێتەوە، زەنگی بۆ نوسینگەی شالیار دا و بەرپرسی بیرۆکەی وەڵامیدایەوە کە گەنجێکی باڵابەرزی چاوشین و خۆشتیپ بوو. کوڕەکە پێیگووت کاتێکی دیدارت لە پرۆفیسۆر بۆ وەردەگرم و ئاگادارتدەکەمەوە. دوو سەعات دواتر کوڕەکە تەلەفونی بۆ پۆخان کردەوە و گووتی پرۆفیسۆر سبەی شەو چاوەڕوانتاندەکات. پۆخان تەنیا دەیویست دڵسۆزییەک دەربخات و نامەکەی ئەزمێرا وەک کەرەستەیەکی نزیکبوونەوە بەکاربهێنێت. پێشتر هەندێ شتی بچوکی لەو جۆرەی کردبوو، لەسەر ئەو پرەنسیپە کاریدەکرد کە ڕۆژنامەنوس دەبێت شت ببەخشێت بۆ ئەوەی شتی دەستبکەوێت. سەرەتا نیازی لەوە تێنەدەپەڕی کە خۆی وەک دوژمنی شالیار دەرنەخات و بەم هەنگاوەی متمانەیەکی زیاتر لە نێوان خۆی و ئەودا داڕێژێت. بێگومان تەماحی زۆرتر بوو، دوورتر دەیڕوانی، دڵنیابوو لە داهاتووی نزیکدا پرۆفیسۆر دەبێتە یەکێک لە جەمسەرە بەهێزەکانی دەسەڵات، دوور نییە گەر سەرۆک بمرێت «کە مردنی تادەهات نزیکتر دەردەکەوت» پۆستی هەرە گەورەی بەرکەوێت. ئەنوەر لە مێژبوو تەمای بوو لەم گۆڤاری بوهارانە خۆی دووربخاتەوە و دەزگایەکی ڕۆژنامەگەریی دیکە دابمەزرێنێت و ژیانێکی نوێ دەستپێبکات. تا ئەو کاتە دووجار ویستبووی دەست لە کار بکێشێتەوە،

بەڵام بۆ ئەوەی گوشارەکە نەکەوێت و تووشی لۆمەی هاوکارانی نەبێت، بڕیارەکەی خۆی دوا خستبوو. ئێستا بەڕاستی دەیویست پێکوڵکاری بۆ شتێکی نوێ بکات. کە چوو بۆ لای پرۆفیسۆر خۆی بە جوانترین شێوە گۆڕی، دەیویست سەرنجێکی جوان لای ئەو جێبهێڵێت کە بایەخی زۆر بە جلوبەرگ و قیافەی ئەندامانی تیمی تایبەتی خۆی دەدا. پرۆفیسۆر بە زەردەخەنەیەکی گەورەوە پێشوازی لێکرد و بەو دەنگە تایبەتییەی خۆیەوە کە ڕۆژانە لە تەلەفزیۆندا دەیبیست، گووتی «یاخودا بەخێر بێیت نوسەری نارازیمان. چۆن بوو ئێمەت بە یادهاتەوە؟ کاکە، تۆ لەدەوڵەت عاجزی، خۆ لە ئێمە عاجز نیت. بۆ دەنگت نییە». شالیار خۆی تا شوێنی تایبەت بە میوانان پێش پۆخان کەوت و بە ڕێزەوە گووتی «دەبێت شکایەتێکی سەختت هەبێت وا هاتوویت. چی بووە؟ خۆت دەزانی من ئازادی ڕۆژنامەگەری بە موقەدەس دەزانم، وەک برادەرانی تر نیم. لە حیزبدا کەس باوەڕی بە ئازادی ڕۆژنامەگەریی نییە من نەبێت». شالیار لە قاتە جوان و لە قیافە ئەوروپییەکەیدا، دەیتوانی سیحری خۆی بەسەر هەر کەسێکدا بسەپێنێت. پۆخان دەمێک ساڵ بوو لەگەڵ سیاسەتمەدارانی دیکەی هەرێم و وڵاتیشدا سەروکاری بوو، زۆر چاوپێکەوتنی گرنگ هەبوون خۆی ئەنجامیدابوون، شێوازی قسەکردن و میوانداری هەموویانی دەزانی، ئەو هارمۆنییەتەی لە پێشچاوبوو چۆن هێدی هێدی قسەکان لە گاڵتەوە دەگوازنەوە بۆ گفتوگۆی سەنگینتر و مانادارتر. پۆخان وەک یەکێک خۆی بە شایستەی ئەو ڕێزە بزانێت و خۆی لەوە بە کەمتر نەگرێت، بە دڵنیاییەکی زۆرەوە بەرامبەر پرۆفیسۆر دانیشت و قاچی نایە سەر قاچ و گووتی «بیرۆکەتان تازەکردۆتەوە یان من چاوم گۆڕاوە، پار کە هاتم جۆرێکی تر بوو. وانییە؟»». پرۆفیسۆر داوایکرد دوو چا بهێنن و بەدەم گەڕانەوە بۆ پاکەتە جگەرەکەی گووتی «شتێکی کەم گۆڕانکاریمان تێدا کردوە، شتێکی کەم». ئینجا بە نیگایەکی کەمێک جیدی و کەمێک گاڵتەجاڕەوە گووتی «چییە، دادگایی ترتان لەسەر گیراوە. یان دەبێت لەسەر تەکەتولاتی حیزب لێدوانتان بۆ بدەم. ها ئەنوەر گیان، کارتان بە من چی بوو؟»». وایگووت و لە ژێرەوە

نیگایەکی گرتە پۆخان کە وەک کەسێک پەیوەندییەکی زۆر دێرین و خۆبەخۆی لەگەڵ پرۆفیسۆر هەبێت، دوگمەی چاکەتەکەی ترازاند و بە دەنگێکی نەترس و ڕەوان گووتی «هیچیان جەنابی پرۆفیسۆر، هەر تەنیا وەک دوو هاوڕێ ویستم پرسیارێکتان پێبکەم». هەر دووکیان ویستیان خۆیان وەک هاوڕێی نزیک نیشانبدەن تا بیانکرێت زۆرترین فێڵ لەیەک بکەن. پۆخان نامەکەی لیوا جەنگیزی دەرهێنا و خستییە سەر مێزەکە و گووتی «شتێکە سەبارەت بەم نامەیە. دەمەوێت دڵنیابم بزانم ئێوە لیوا جەنگیزتان گرتووە؟ دەزانم شتەکە نهێنییەکی گرنگی حیزبە، بەڵام هەر بابەتێک گەیشتە ڕۆژنامەکان ئیتر نهێنی نییە، مەگەر زوو بەری پێبگیرێت». پرۆفیسۆر نامەکەی هەڵگرت و بە هێمنی خوێندییەوە. کەمێک پەشۆکاو گووتی «چاوەڕوانی ئەوە نەبووم، ئەمجارە بۆ شتێکی وا بێیتە لام. ڕاستت پێدەڵێم، ئەمجارە بۆ پرسیارێکی زۆر نائاسایی هاتویت، دەتەوێت چی بزانیت؟»، پۆخان وەک کەسێک بزانێت بۆچی هاتووە و بەدوای چیدا دەگەڕێت، گووتی « دەمەوێت بزانم ، هەواڵەکە بڵاوبکەمەوە یان نا؟». پرۆفیسۆر بە ڕوویەکی گرژەوە سەیریکرد و گووتی «نا هاوڕێ هەواڵەکە بڵاومەکەرەوە، دەبێت چاکەیەکیشم لەگەڵ بکەیت، کارێکبکەین بتوانین گەر بڵاوبووەوە بەدرۆی بخەینەوە». پۆخان پرسی «چۆن؟ نامەکە تەنیا لای من نییە، لای شەفیقیش هەیە. لیوا پێشگرتنی، هەمان نامەی ناردوە بۆ ئەو هروریبە تەرەسەش». پرۆفیسۆر بە هێمنی بەرامبەری دانیشت و گووتی «من پێتدەڵێم چۆن؟».



ماوەیەک دوای ئەو دانیشتنە کە ژمارەی نوێی گۆڤاری بوهاران دەرچوو. لەسەر بەرگەکەی وێنەیەکی من هەبوو، لە خواریشەوە نوسراوبوو «لیوا جەنگیزی ڕەفعەت بەگ دەنگۆکانی گرتنی بە درۆدەخاتەوە». لە ناوەوە

چەندین وێنەی دروستکراوی من لەگەڵ ئەنوەر پۆخاندا چاپکرابوون. لە کاتی دانیشتندا، لە کاتی پیاسەکردندا، لە کاتی چاخواردنەوە و قسەکردندا. لەو ساتەوە ئیدی منێکی تر، لیوا جەنگیزێکی تایبەتی دروستدەبێت کە لە ژوورێکی تەکنیکی و بە کۆمەکی تیپێکی بچوکی ڕۆژنامەوانی دروستدەکرێت، تیپێک پرۆفیسۆر شالیار ڕاستەوخۆ خۆی سەرپەرشتیاندەکات، بە یارمەتی چەندەها دەزگای کۆمپیوتەری، لە ڕێگای کۆمەڵێک پرۆگرامی ئاڵۆزەوە لیوایەکی نوێ دەخولقێنرێت، دەجوڵێنرێت، دەهێنرێتە قسە. لیوا جەنگیزێک بەوێنە منم، بە دەنگ منم، بە ڕەفتار منم، بەڵام منیش نیم. لەو ساتەدا کە من لە ژێر ئەشکەنجە و هەلاکەتی مەرگدام، لیوا جەنگیزێکی خەیاڵی، لە ڕۆژنامەی بوهاران و ڕۆژنامەی «شکۆی کوردان» چاوپێکەوتندەکات، هەندێ شەو لە کەناڵەکانی حیزبەوە هەندێک لە چالاکییەکانی بە وێنەی نوێوە بڵاودەبنەوە، تەلەفونی بۆ دەکرێت، لەسەر بارودۆخی ئەمنی شار قسەدەکات. وەک جاران «وەک دەمێک کە من شای شاهانی دەزگای ئەمنییەت بووم» بیروڕا لەسەر شتەکان دەگۆڕێتەوە و لەسەر ئەو خەتە پێدادەگرێت کە ناوی دەنێت «کوردایەتی خالیس» یان «فەلسەفەی کوردایەتی موتڵەق».

بینینی من لەسەر بەرگی گۆڤاری بوهاران، هەمووانی تووشی شۆک و شپرزەییەکی گەورەکرد. چەند شەو دوای دەرچوونی گۆڤارەکە، تەلەفزیۆنی مەرکەزی حیزب دەستیکردە بڵاوکردنەوەی ڕیکلامێک دەربارەی بەرنامەیەک تێیدا تێکۆشەری ناسراو جەنگیزی ڕەفعەت بەگ، یادگاریی ساڵانی خەباتی ژێر زەمینی دەگێڕێتەوە. من ئیتر بەردەوام لە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکاندا هەم، کەچی لە ڕاستیدا بوونم نییە. هەر کەس بۆم دەگەڕێت، سەری لەوە دەسوڕمێت کە من نیم و ناگیرێم و نابینرێم، بەڵام میدیاکان بەردەوام هەواڵی ژیان و کار و چالاکییەکانم بڵاو دەکەنەوە.

******

شالیار دەیویست تێبگات من خەریکی چی بووم. دەیزانی پرۆژەی نوسینێکی گەورە لە پشت هەموو ئەم کارەوەیە. بەڵام شێوەی ئیشکردنی جەمعییەتی ژیانە ونەکانی نەدەزانی، دڵنیابوو دەمانەوێت مێژووی نهێنی وڵاتەکە لە فەوتان بپارێزین، دەیزانی چیرۆکنوسەکان لەوەدا کاردەکەن، دەیزانی هەموو شتەکان تورەیبیەکی گەورەی لە پشتە، بەڵام نەیدەزانی، جگە لە من، کێی تر سەرە داوە گرنگەکانی لە دەستدایە، دەستنوسی یەکەمی ئەرشیفەکەی من لە کوێیە، کە مێژووی نهێنی حیزبی تێدا هەڵگیراوە. ئەو سیاسییە واقعیانە لە هیچ شتێک تێناگەن گەر تەواو واقعی نەبێت. بەوەدا بەشێکی زۆر بچوکی دونیا واقعییە، ئەوان هیچ کات لە هیچی دی تێناگەن، لەو بەشە بچوکە نەبێت. جەمعییەتی ژیانە ونەکان هیچ نیازێکی نەبوو جگە لە بیرکردنەوە لە ژیانە ونەکان. بەڵام ژیانە ونەکان، گەرچی لە ڕووی زمانەوانییەوە دوو وشە بوو، کەچی دەرگای لەسەر دەریایەکی پڕ نهێنی و سەرسامی دەکردەوە. لە ڕووی واقعییەوە هەموو دەیانزانی من لەسەر خەزنەیەکی بێسنووری نهێنیم، دەیانزانی نهێنی گەورەتریش دەزانم لەوەی خاوەن نهێنییەکان خۆیان دەیزانن. ئەوانە منیان کردبووە کاراکتەرێکی ترسناک. هەموو دەیانزانی من بۆ ئەوەی نەهێڵم یادەوەریی وڵاتەکە بسڕێتەوە، تۆڕێکم دروستکردوە تا لە ڕێگایانەوە حەقیقەت بۆ نەوەکانی پاشەڕۆژ بگوازمەوە، بڕیارمداوە یاداشتەکانم بە ورد و درشتییەوە ئاشکرابکەم. هەموو دەیانزانی من چیتر لەو بازنەیەدا نەماوم کە نهێنی هەڵدەگرن و دەیپارێزن. پیاو و ژنە دەسەڵاتدارەکانی شاری ئێمە، هەردووک لەسەر تەختی ئەو دڵنیاییە خەوتبوون کە دەیانزانی خەڵک چیتر یادەوەریان نەماوە، شتەکان دێن و دەچن و بیردەچنەوە. لەو سەردەمە ترسناکەدا من، ئەو کەسەی کە دەبووایە لە هەمووان زیاتر مەراقی سڕینەوەی یادەوەرییەکانم بێت، دەچووم و ئامێرێکی گەورە و ترسناکم دروستدەکرد، تا مرۆڤەکان هەم

خۆیان و هەم خەونەکانیان بیرنەچێتەوە، خۆشم تا پلەی هەڵکۆڵینی چەپەڵترین نهێنی خۆم، ئامادەبووم خۆم ڕووتبکەمەوە. کەس باوەڕی بەوە نەدەکرد، لیوا جەنگیز، شەیتانە ترسناکەکەی حیزب، کاری وەهای لێبوەشێتەوە. بە عەقڵی کێدا دەچوو، من بێڕەحمترین و ساردترین کارمەندی دەزگای ئەمنییەت لە ناکاو ببمە فریادڕەسێکی گەورە و بکەومە سەر خولیای زیندووکردنەوە و پاراستنی یادەوەری نغرۆی ئەم مەملەکەتە. شالیار مەبەستی بوو، من لە بەرچاوی خەڵک هەر وەک پیاوە دڕندەکەی حیزب بمێنمەوە، دەیزانی گەر دەرچم لەو بازنەیە و ببمە خاوەنی وێنەیەکی دی، دەشێت هێزێکی ترسناک وەربگرم و ببمە خاوەنی ئەفسونێکی بێسنوور. نەدەبوو هیچ کات بەڵگەیەک هەبێت کە من ونبووم، یان لە شوێنێکی نهێنی و نادیاردا دەست بەسەرم. من یەکەم کەس و دوا کەس نەبووم بە جەستە دیل و بە وێنەش لە بەرچاوی دونیا وەک سەرکردەیەکی ئاسایی ناو حیزب دەژیام. دەیان ئەندامی تریش هەبوون کە تەنیا وێنە و دەنگ و فیلمەکانیان دەژیا و خۆیان بوونیان نەبوو، بە جۆرێک دەتوانم بڵێم جگە لە هەیئەتێکی نهێنی کە لە بورجەوە حوکمی شاریان دەکرد، بکەرەکانی تر کۆمەڵێک وێنە و مۆنتاژ و دەنگی لێکدراو بوون، بێئەوەی هەندێکیان جەستەی ڕاستەقینەیان هەر مابێت. بەڵام ئاگاداربن، هەموو بوونەوەر و ژیانە لێکدراوەکان کە دەردەکەوتنەوە، خاوەنەکانیان زیندان یان مردوو نەبوون، هەتا زۆریان نەشگیرابوون، ئازادبوون، لەماڵی خۆیاندا دەژیان، بەڵام چونکە توانای شتێکی نوێیان نەبوو، تەنیا دەنگ و وێنە و وشە دێرینەکانیان حوکمیاندەکرد. ئەوە نەبوو هەموو بەو نمایشە ناڕازیبن، بە پێچەوانەوە زۆر لە پیاوانی حیزب کە خۆیان تەنیا قاوغێکی بۆشیان مابووەوە، خۆشحاڵبوون حیزب لە میدیاکانی خۆیدا وەک مەخلوقاتی چالاک و زیندوو و قسەزان بەدونیایان دەناسێنێت. زۆربەی مەخلوقاتی ئەو سەردەمە وێنەی خۆیان لە خۆیان لاگرنگتر بوو، چونکە سەردەمێک بوو خەڵک بایەخیان بە ئادەمیزادە ڕاستەقینە و زیندووەکان نەدەدا، بەڵکو تەنیا وێنەکانیان دەبینین. هیچ مرۆڤێک چیدی خۆی نەبوو، هەموو تەنیا وێنەکانمان بووین و بەس. ئێمە

نەوەیەک بووین ئێستا لە ڕێگای ئەو پاشماوانەوە حوکمماندەکرد کە لە ڕابوردووەوە مابووەوە، ئێسکەکانمان فەرمانڕەواییان دەکرد نەوەک گۆشتمان ... ئەوەی لەسەر حوکم بوو یادگارەکان و دەنگی کۆن و وێنەی ژەنگاویمان بوو لە یادەوەرییەکاندا. من جەنگیزی جاران، جەنگیزی ڕابوردوو، چیتر بوونم نەمابوو، بەڵام ئێستاش تارماییە کۆنەکەم، جەستە شۆڕشگێڕە خەیاڵییەکەی سەردەمی کۆنم حوکمیدەکرد. کەسانێک هەبوون پێویستیان بە من نەمابوو، بەڵام پێویستیان بە سێبەرەکەم بوو. .. ئەو سێبەرەی لە هەناوی مێژووەوە دەریاندەهێنا و وەک جانەوەرێکی زیندوو دەیانخستەوە سەر شانۆ.

دەرکەوتنی من لە میدیاکانەوە هاوڕێ و دۆستەکانمی شڵەژاند. ئەوانەی دوور و نزیک پەیوەندیان بە منەوە بوو، تووشی گێژی و تێنەگەیشتنێکی کتوپڕ بوون. ئەزمێرا لە پێشی ئەوانەوە بوو کە چووە لای ئەنوەر پۆخان بپرسێت لیوای لە کوێ بینیوە. وەڵامی پۆخان ئەوە بوو لیوا زەنگی بۆ داوە و شوێنی دیداری بۆ دیاریکردوە و لە جێگایەکی دەرەوەی شار چاویان بەیەک کەوتووە. قسەکانی پۆخان نە جێگای باوەڕ و نە شوێنی متمانەی ئەزمێرا بوون. گەرچی کچەکە زانیارییەکی ئەوتۆی دەربارەی جۆری حوکمداری ناو مەملەکەتی ئێمە نەبوو، کەچی سەیرکردنی چاوانی پۆخان بەسبوو تا تێبگات جەناب ئاغا درۆیەکی نابەجێ دەکات. وەک ژن هەڵگری سەلیقەیەک و غەریزەیەکی ڕاستتر بوو لە هەر کەسی دیکە، هێندەی بەرامبەر پۆخان دانیشت و لە چاوانی ڕوانی، دڵنیابوو پۆخان دەیەوێت ئەم خێرا پرسیارەکانی بکات و ئەویش خێرا وەڵامە ئامادەکانی خۆی بداتەوە و بڕوات و لەم گێچەڵە دەربازبێت. ئەزمێرا دەیزانی ئەو ناڕەحەتی و ترسە نهێنییەی ئەنوەر پۆخان بێهۆ نییە، دڵنیابوو شەرمێکی نهێنی لە چاویدایە کە دانیشتنی ئەزمێرا بەرامبەری تۆختر و گەورەتری دەکاتەوە، بۆیە دەیویست ئەم کچە زوو هەستێت و دووربکەوێتەوە، تا ئەو هێندە ئازاری ئەم تەریقییە قووڵە نەکێشێت. بەڵام پرۆفیسۆر بە پۆخانی گووتبوو لە هیچ شتێک نەترسێت و سڵ نەکاتەوە. پۆخان دڵنیابوو ئەو

دانیشتنە کورتەی لەگەڵ پرۆفیسۆردا، سەرلەبەر ژیانی تێکداوە، دەیزانی بە ویستی خۆی چۆتە ناو یارییەکی سەیرەوە کە تەنیا ئەمڕۆ تێدەگات چ ترسناک و کوشندەیە. هەمیشە زانیویەتی نزیکبوونەوە لە بەرپرس و فەرماندارەکان ترسناکە، بەڵام بەو ئەندازەیەش نا. دڵنیابوو ئەمە لەو یاریانەیە کە ناتوانێت ئاسان لێی بێتەدەرێ. ئەو شەوە کە لای پرۆفیسۆر گەڕایەوە ئەرشیفی هەندێک لە چاوپێکەوتنە دێرینەکانی خۆی لەو دوو ساڵەدا هەڵدایەوە، سەیریکرد هەندێک لەو چاوپێکەوتن و لێدوانانەی بەتەلەفون لە هەندێک بەرپرسی باڵا وەریگرتوون زۆربەیان جێگای گومانن، هەندێکیان خاوەنە ڕاستەقینەکانیان دیارنین و لە مێژە کەس نایانبینێت. هەستیکرد هەم ئەو و هەم بەشێکی زۆر لە ڕۆژنامە و میدیاکان بەردەوام لە ناو بازنەی فریوێکی گەورەدا دەسوڕێنەوە، چاوپێکەوتن لەگەڵ خەڵکانێکدا دەکەن کە بوونیان نییە، گفت لە کەسانێک وەردەگرن کەس نازانێت جەستە و ڕۆحی ڕاستەقینەیان لە کوێیە، ئەوەی هەمیشە قسەدەکات ئامێرێکی گەورەیە کە لە بورجەوە شێوەی شار بەو جۆرە ڕەنگدەکات کە خۆی دەیەوێت. هەموو شتەکانی وەک داشماڵی شەترەنجێک بینی کە هەر داشە و دەستێک لە جێگایەکدا دایناوە، بەڵام هەموو داشەکانیش پێکەوە لەو خەیاڵ و وەهمەدا دەژین کە خۆیان چوونەتە ئەوێ و ئەو جێگایەیان هەڵبژاردوە. یەقینێکی تراژیدی هەبوو کە تا ئێستا گێژەنێکی درۆ لەگەڵ خۆیدا پێچیداوە و هەرچییەکی کردوە بەشێک بووە لە پرۆگرامێکی لە خۆی گەورەتر. دڵنیابوو زۆر لەو چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنیانەی تێیاندا بەشداربووە، لەگەڵ خەڵکانێکدا گفتوگۆیکردوە کە گوایە بە تەلەفون یان لە ستۆدیۆیەکی ترەوە قسەدەکەن، بێئەوەی بوونیان هەبێت. هەستیکرد لە سکایپ و یاهوماسنجەرە وە چەند چاوپێکەوتنی کردوە زۆربەیان درۆبوون، هەموو وێنەیەکی دروستکراو لەوسەرەوە قسەیان لەگەڵ کردوە. ئێستا تێدەگات زۆرجار چۆتە بینای گەورەوە کە نیشتەجێی وەزارەتی گرنگ و گەورە بوون، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ نەبوون جگە لە جێگایەکی نمایشی، لە قەوارەیەک وەک تارمایی، کە کەسانێک وەک تارمایی ئیشیان تێداکردوە و

ئەمیش وەک تارمایی چۆتە ناویان و هاتۆتە دەرەوە. ئێستا دەیزانی تەنیا جیاوازییەکی لەگەڵ جاراندا ئەوەیە کە ئەمجارە بە ڕاستی چۆتە ناو گەمەیەکەوە کە چەند ساڵە بێ ئاگای خۆی لە ناویدا دەژی و دەسوڕێتەوە ... گەمەی سوڕانەوە و مامەڵەکردن لەگەڵ ئاغایەکی خەیاڵیدا کە جەوهەرە ڕاستەقینە و ترسناکەکەی چۆتە پشتەوە و خۆی دەرناخات. هەستیکرد ئەوە تەنیا لیوا جەنگیز نییە وێنەکانی دروستکراونەتەوە و دانراون، بەڵکو وێنەکانی خۆیشی لەوانی جەنگیز کەمتر نادروست و دەستکار نییە... بەڵکو بگرە زیاتریش. لەو ساتەوەی هاوکارێکی پرۆفیسۆر دەقی چاوپێکەوتنەکە و وێنەکانی بۆ هێنا، هەستیکرد وێنەکانی لیوا لە وێنەکانی ئەم ڕاستتر دەنوێنن، هەستیکرد ئەم لە چاوپێکەوتنەکەدا ساختەتر دەنوێنێت. مەسەلەکە ئێستا ترسناکی ئەو ئامێرە تەکنیکییە نەبوو کە بۆ هەتاهەتایە حەقیقەت لەسەر زەوی دەسڕێتەوە، ئەو ئامێرە تەکنیکییە کوشندەیەی کە کەوتۆتە دەست عەشرەتە دواکەوتووەکانی ئەم جەنگەڵستانە شەرقییە و بە جۆرێکی سەرسوڕهێنەر و خێرا فێری بەکارهێنانی بوون، چەکێکی نوێی کوشندە کەوتۆتە دەست دواکەوتووترین عەشرەت و بنەماڵەکانی سەر زەوی و دەتوانن یاری کوشندەی پێبکەن. وەک چۆن زیاد لە دووسەد ساڵ لەمەوبەر کە تفەنگ گەیشتە ئەم دەڤەرە هەر زوو بۆ یەکدی کوشتن هەڵیانگرت و بوونە یەکەمین مەسرەفکەر و لێزان و عاشقانی. جاران زۆر لەزەتی لەوە دەبینی بڵێت «ئەم جەنگەڵستانە شەرقییە» ... ئێستا کاتێک ئەو جەنگەڵستانە خەریکبوو لووشیدەدا، کەمتر دەیوێرا بیر لەو وشانە بکاتەوە. هەستیکرد بە سادەیی و تەماع و گەمژەیی خۆی، بووە بە بەشێک لە کەڵبە و چڕنوکی جانەوەرەکانی ئەو جەنگەڵستانە، جەنگەڵستانێک جەنگاوەرە خوێنخۆرەکانی جاران بەسەر ماین و ئەسپەوە شەڕیاندەکرد، ئێستا سوار زینی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و بەرنامە ترسناکەکانی بوون. ئێستا کە بەشەرمەوە لەسەر لاپتۆپەکەی سەیری چاوپێکەوتنەکەی خۆی و لیوا جەنگیزی دەکرد، هەستیدەکرد نا، ئەوەی دەیبینێت ئەنوەر پۆخانێکی دروستکراو نییە، بەڵکو ئەو وێنە ساختانە لە

خۆی ڕاستەقینەترن. ئەو ڕاستییە زۆر ئازاری دا. ورد لە هەموو وێنەکانی ڕوانی و هەستیکرد ئەوە دیوە هەمیشەیی و ئەبەدییەکەی خۆیەتی کە ئێستا دەیبینێت. هەستیدەکرد ئەو ئەنوەر پۆخانەی، پرۆفیسۆر شالیار دەیەوێت، بەرهەمی کاری کامێرا و کۆمپیوتەر و فۆتۆشۆپ و ئامێرەکانی مۆنتاژ نییە، بەڵکو بەشێکی ئەبەدیی و هەمیشەیی ئەو ئەنوەر پۆخانە ڕاستەقینەیەیە کە ئێستا وەک جاران لە بیرۆکەی گۆڤاری بوهاران دانیشتووە و قیافەی پیاوێکی جیدی داوەتە خۆی و سەیری لاپتۆپەکەی دەکات. وێنەکان دیوەکەی تری خۆی بوون کە هەمیشە ئامادەبووە بازبدات و بێتەدەرێ. کە ئەزمێرا ڕۆیشت هەستیدەکرد هیچ شتێک لەو چاوپێکەوتنەدا درۆ نییە، ئەوەی لە وێنەکاندا دەبینرێت یەکگرتنەوەی لیوا جەنگیزێکی ڕاستەقینەیە لەگەڵ ئەنوەر پۆخانێکی ڕاستەقینە. بۆ ساتێک چاوی لێکنا و هەناسەیەکی هەڵکێشا و گەیشتە ئەو یەقینەی ئەم چاوپێکەوتنە، ئەم درۆ ڕۆشن و بێچەندوچۆنە لە هەر کارێکی تری ژیانی ڕاستەقینەترە. ئەمە ئەنوەر پۆخان بوو، پیاوێک کە هەمیشە وێنەیەکی درۆی دەربارەی خۆی بەخشیوە بە دونیا، ئەوە لیوا جەنگیز بوو کە هەمیشە خزمەتکارێکی زەلیلی حیزب بووە. لە خۆی پرسی: لیوا خۆی جگە لە پیاوێک کە هەمیشە سێبەر بووە چی بووە؟ تارماییەک حیزب خستوێتییە ناو مێژووەوە، ئەو لە چ سەردەمێکدا کەسێک بووە لە گۆشت و خوێن و حەقیقەت تا ئێستا وا بێت، لە چ ڕۆژێکدا ئەوەی نەکردوە و ئەوەی نەگووتووە کە حیزب دەیەوێت؟ بە جۆرێک ئەمڕۆ گەیشتووینەتە جێگایەک کەس پێویستی بە لەش و سەر و ڕوخساری ناشیرینی ئەو نەماوە، خۆی بۆتە شتێکی زیاد. ئێستا وێنەکان و دەنگ و فیلمەکانی ئەو ئیشەی بۆ دەکەن کە دەبوو خۆی بیکات. ئەوە تووشی ترسێکی ڕاستەقینەی کرد، دەکرا ڕۆژێک بێت ئەویش وای لێبێت، دەکرا بگاتە جێگایەک بیگرن و ونیبکەن و تەنها وێنەکان و فیدیۆکان و قسەکانی بخەنەوە کار. بۆ ئێستێک ترسێکی گەورە دایگرت، بۆ کورتە ساتێک وای بە خەیاڵدا هات هەتا نوسینگە و ژوورەکانی گۆڤاری بوهاران جێگایەکی وەهمی ترسناکن و دەبێت دەمودەست لێیان ڕابکات. دوودڵی و پەشۆکانی

بە جۆرێک بوو شەو نەیتوانی بخەوێت، نیوەشەو بە ترس و هەراسێکی قووڵەوە لە پاڵ ژنەکەیدا هەستا و تەلەفونی بۆ پرۆفیسۆر شالیار کرد و بە دەنگێکی گریاو لێیپرسی «پرۆفیسۆر، خەوم لێناکەوێت، دەمەوێت بخەوم بەڵام ناتوانم. لەوکاتەوەی وێنەکانم بینیوە دەپرسم بۆ؟ ... پرۆفیسۆر گیان ئەم هەموو شتە بۆ؟». پرۆفیسۆر لە خەودا بوو، هێزی ئەوەی نەبوو بەو نیوەشەوە هیچ بۆ پۆخان تەفسیربکات، ژمارە تەلەفونی کەسێکی دایە و گوتی ئەوە مێژوونوسی حیزبە و دەتوانێت هەموو شتێکت بۆ ڕوونبکاتەوە. بە خێرایی و بەدەستێکی لەرزۆکەوە تەلەفونی بۆ ئەو ژمارەیەی تر کرد، لەوسەرەوە دەنگێکی باریک هاتە سەر خەت. ناسییەوە دکتۆر زەندیان بوو، بەرپرسی لێکۆڵینەوە ستراتیژییەکانی حیزب، سەرۆکی زانکۆی نیشتیمان بۆ لێکۆڵینەوە سیاسییەکان. ئەو هەموو شتێکی پێگووت، ئەو خۆشی هەموو شتێکی دەزانی. نەیزانی بۆ زەندیان تا ئەو درەنگانە نەخەوتووە و دەنگی وەها بێدار دێتەگوێی، وەک یەکێکی ئاسوودە بە پێکەنین و ئارامییەوە گوتی «من ئیشم ئەوەیە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە کە خەو لە چاوی هەڤاڵانی حیزب دەتارێنێت... وەڵامی تۆ ئەوەیە، ئێمە حیزبێکی کوردین لە کۆمەڵگایەکی عەشایەردا، دڵسۆزی و وەلا لە هەر شت لامان بەنرخترە. نامانەوێت ئەو هەڤاڵانەی مێژوویەکی پڕ شکۆیان لە حیزبدا هەبووە ڕابوردوویان بشێوێت، دەبێت هەمیشە بە جوانی و پاکی و دڵسۆزی خۆیان بمێننەوە. هەتا گەر خۆشیان خیانەتیان لە نیشتیمان کرد، ئێمە ناتوانین بهێڵین خیانەتیان ئاشکرابێت. کوڕی شیرینم حیزب نایەوێت قارەمانەکانی خۆی لەدەستبدات، هەتا گەر خۆشیان نەیانەوێت. ئەوە ڕێنمایی سەرۆکە، بەشێکە لە کولتووری عەشایەریی نەتەوەکەمان، وەفا و وەلا، کە دەبێت بیانپارێزین». دکتۆر پێکەنینێکی نەرمی دیکە پێکەنی، لە قاقایەک دەچوو کە کەم کەم لە هەوادا دەخنکێت و خەفەدەبێت، پاش ئێستێک خەتەکە ئۆتۆماتیکی، وەک یەکێک لە ناوەڕاستدا قرتاندبێتی، پچڕا.

کە پۆخان تەلەفونەکەی دانایەوە، ترسێکی گەورە دایگرت، ترسێکی کوشندە. ئەوەی لەوسەری خەت لەگەڵیدا بوو دکتۆر زەندیان بوو و دکتۆر زەندیانیش نەبوو، ئامێرێک بوو، مەکینەیەکی پرۆگرامکراو بوو... دڵنیابوو، هەستیکرد لە پشتی وشەکانی دکتۆرەوە گوێی لە دەنگی ئیشکردنی مەکینەکە بووە. بە هەر دوو دەست کێشای بەسەری خۆیدا و نەیدەزانی ڕاست و هەڵە، حەقیقەت و درۆ لە کوێدایە.

لەبەری ئەمبەر، لە ڕیزی هاوڕێ و دڵسۆزەکانی مندا، بولبولیار یەکەم کەس بوو گومانی توندی لە پۆخان پەیداکرد، هەر ژمارەکەی گۆڤاری بوهارانی بینی و کردییەوە و لە ناوەوە ئەو وێنانەی تەماشاکرد کە گوایە پۆخان لەگەڵ لیوا جەنگیزدا گرتوونی، بە جۆرێکی سەیر ڕاچڵەکی، لە وێنەکاندا ئەو شتەی بینی کە دەترسا ببینێت ... ئەنوەر پۆخان جووتێک باڵی گەورەی هەبوو، جووتێک باڵی زۆر زۆر گەورە، کە وەک تارماییەکی تەنک و غوبارین لە پشتەوە لە وێنەکاندا دەرچووبوو.



دوو ڕۆژ دوای سەردانەکەی ماڵی من و بینینی ئەزمێرا، مامۆستا ئەسغەر تەلەفونی بۆ ژمارەکەی هۆشەنگی بولبولیار کرد. لە زەنگی چوارهەمدا بولبولیار مۆبایلەکەی هەڵگرت و پێکەوە قسەیانکرد. مامۆستا ترسێکی گەورەی لە مردن لا دروستبووبوو، دەیزانی دەستێکی بێڕەحم بەدوای چیرۆکنوسانەوەیە، دەستێک دەیەوێت هەر کەسێک چیرۆک دەنوسێت لە ناوی بەرێت. بولبولیار هەر بە دەنگ و تۆندا زانی کێیە، خۆی گوێی لە کاسێتی هەندێک لە گفتوگۆ و چیرۆکەکانی گرتبوو، دڵنیابوو کوشتنی چیرۆکنوسێکی دی مامۆستا سەلیمی شێواندوە. یەکتر بینین لەو کاتەدا مەترسی خۆی هەبوو، بەڵام دەنگی پیاوەکە وەها غەمگین لە گوێی

بولبولیاردا زرنگایەوە نەیتوانی. داواکەی پشتگوێ بخات و نەچێتە دیداری. هۆشەنگ تاکە کەس بوو زۆربەی نهێنییەکانی جەمعییەتی ژیانی ونی لابوو، بەڵام من و نهێنییەکانم تاکە مەراقی بولبولیار نەبووین، ئەو کەسێک بوو ئازاری هەمیشەیی خۆی هەبوو ... مەزنترین و چێژبەخشترین ئازاریش، ئەو جۆرە ئازارانەن کە کۆتاییان نییە و وەک جادوو مرۆڤ بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشن. چەند هەفتەیەک بوو لە پێشگرتنی منیشدا بەڵگە و نیشانەی ترسناکی دەبینییەوە. زۆربوونی نائاسایی ئادەمیزادە باڵدارەکان، تووشی غەم و دوودڵیان کردبوو. پێشتر یادگاری تاڵ و ترسناکی لەگەڵ ئەو وێنانەدا هەبوو، نەیدەویست چیدی مێژوو خۆی دووبارەبکاتەوە. پێش گرتنی من بە چەند هەفتەیەک، هێندەی دەنگۆکانی ئەو یاداشتە مەلعونانەم بڵاوبووەوە، سەرەتاکانی وەرزێکی تازە دەستی پێکرد. ڕاستە من تا سەردەمێکی زۆر نزیکیش، گەرچی بەرپرسی باڵای دەزگای ئاسایش نەبووم، بەڵام جۆرە متمانەیەکیان پێ دابووم، هەستم بە بێدەسەڵاتی نەدەکرد. سەرۆک زۆرجار ئەو هەستەی پێدەبەخشیم کە من لە شوێنێکدام، بۆم هەیە هەموو بەڕێوەبەرەکانی ئاسایش و هەتا پرۆفیسۆر شالیاریش، بخەمە ژێر چاودێری و بیاندەمە بەر تانە و توانجی خۆم. من هێشتا ئازادبووم و خۆم بە یەکێک لە کەڵەشێرە پۆپنەدارەکانی حیزب دەزانی، گەرچی لە مێژبوو لە ڕووی ڕۆحییەوە دابڕابووم و خەریکی خەون و خەیاڵی خۆم بووم، بەڵام تەواو نەکەوتبوومە بەرچاوان و کارم هەمووی نهێنی بوو. ئەوکات هەر لە ناو دەزگادا، پۆستێکیان دابوومێ بە ناوی «ڕاوێژکاری باڵای کۆی دەزگاکانی ئاسایش و زانیاریی»، لەو پۆستانەی سەرۆک بە زۆر دروستیدەکرد، تا هەست نەکەیت حیزب بێوەفایی بەرامبەر کردویت. خۆشم لەو باوەڕەدابووم، دونیای داخراوی بورج نەبێت، لە هەموو جێگایەکی تردا دەتوانم هێز و چالاکیم هەبێت. لەو دەمەدا کە هەموو ئەم ئیمپراتۆریەتەی لیوا جەنگیز خەریکبوو بەرەو ئاوابوون دەچوو، ڕۆژێک بولبولیار هاتە لام و گووتی هەموو «نیشانەکان» دووبارە خەریکە دەردەکەونەوە ... چەند ڕۆژێک بوو ورد دەگەڕا و ئامارەکانی کۆدەکردەوە، لە هەموو جێگایەک خەڵکی باڵداری دەبینی،

دەچوو بۆ هەموو جێگایەک و دەگەڕا، هەستیدەكرد هیچ كات و لە هیچ سەردەم و قۆناغێكی پێشیندا بەوجۆرە مرۆڤی باڵداری نەبینیوە. دەچوو بۆ دادگا، بۆ بیمارستان، بۆ تاپۆ، بۆ شارەوانی... لە هەموو جێگایەكدا بۆ ماوەی سەعاتێک لە سوچێكدا دەوەستا و سەیریدەكرد بزانێت چەند كەسی باڵدار دەبینێت. دوو هەفتە بەر لە گرتنم، كە بینیم ڕوخساری ئەو سەرسامییە قووڵەی تێدابوو كە تەنیا لە كاتی نیگەرانی زۆردا دەپەڕییە سەر سیمای. وەک شەوانی تر هاتبوو چەند سەعاتێک لەلام بێت و بڕوات، بەڵام بە غەمگینییەوە گووتی «وەفا شەپۆلێكی تر بەڕێوەیە... شەپۆلێكی گەورەی تر». دەمزانی باسی چیدەكات، بەڵام دڵنیابووم بەرامبەری هیچمان بۆ ناكرێت، دڵنیابووم ناتوانین بەر بە هیچ شتێک بگرین. گووتی «هەموو نیشانەكان لێرەن، وەک سیازدە ساڵ لە مەوبەر، وەک پاییزی سیازدە ساڵ لەوەوبەر». من سەیرمكرد و هیچم نەگووت، سیازدە ساڵ لەوەوبەر من مەخلوقێكی تر بووم، ژیانێكی ترم هەبوو، لە بەرەیەكی تردا بووم. كەسەیری منی دەكرد و باسی لە سیازدە ساڵ لەوەوبەر دەكرد، چاوانی پڕبوون لە ئاو، ڕووداوە سەیر و نهێنییەكانی ساڵی 1996 ی بیردەكەوتەوە. من نەمدەتوانی هیچ بڵێم، جگە لەوەی بە غەمگینی و بێدەنگ سەیریبكەم. گووتی «ئەگەر شتێكی تری وا ڕوویداتەوە، هیچ كات هیچ كەس نابەخشم. خۆت دەزانی من ئارەزووی شەڕم نییە، پیر بووم و نەچوومە هیچ جەنگێكی گەورەوە، پەشیمان نیم لەوەی كە نەبووم بە جەنگاوەر. بەڵام گەر جارێكی تر شتەكان دووبارە ببنەوە، سەیری ئەوە مەكە لەسەروو پەنجا ساڵەوەم، سەیری ئەوە مەكە ڕیشم سپی بووە، دەبم بە جەنگاوەر. ئەمجارە ناتوانم دانیشم و سەیربكەم». من دەمزانی ئەو قسانە چەندە سەختە بۆی، بەڵام گەر شەپۆلێكی نوێش بهاتبایە و گەر هەمان ئەو ڕوودوانە دووبارەببوونایەتەوە كە سیازدە ساڵ لەوەوبەر ڕوویاندا، چی بكردایە. من دەمزانی پیاوان لەسەروو پەنجا ساڵەوە بە دەگمەن دەبن بە جەنگاوەر، بەڵام گەر لەو تەمەنەدا دەستیان دایە چەک، ئیدی هیچ شتێک نایانوەستێنێت. لە ناخی دڵەوە ئارەزووم بوو، هیچ كات هۆشەنگی بولبولیار نەبێت بە جەنگاوەر. هەستمدەكرد هەرچی پیاو و ژنی

ئەم شارەیە بە جۆرێک لە جۆرەکان قاچمان لەو داوە ترسناکانەوە ئاڵاوە، ئەو نەبێت. ئەو بۆ من سەمبولی مەحاڵ بوو... لە هەموو دونیایەکدا ڕەگەزێک سەرهەڵدەدات لە ناو ڕەگەزەکانی تردا جێگای نابێتەوە، بولبولیار ئەو ڕەگەزە بوو، گەر ئەویش بمردایە، هیچ شتێک لەو جیهانەی ئێمەدا نەدەما لەگەڵ شتەکانی تردا جیاواز بێت. شتێک نیشانەیەک بێت بۆ دەروازەیەک بەرەو جێگایەک لە دەرەوەی ئەم دونیایە.

بولبولیار, دەمێک مامۆستا سەلیم ئەسفەر و سەلام باباجانی لە چایخانەیەکی نزیکیماڵی مامۆستا سەلیمدا بینی، پێیگوتن لیوا چەندین جار ژیانی ئەوی ڕزگارکردوە، ئەو پیاوە گەرچی مێژوویەکی ڕەشی هەیە، بەڵام چیرۆکێکی هەیە لە خۆی گرنگترە، کتێبێکی پێیە دەبێت ڕزگاربکرێت... ئەوەی ئێستا گرنگە خودی لیوا نییە، بەڵکو نرخەکەیەتی وەک تەنیا شاهید لە سەر دونیای تاریکی ئەم شارە. کەسیان پلانێکی دیاریکراویان نەبوو، لە کوێوە و چۆن بۆ ڕزگارکردنی من دەستبەکاربن، منێک دەشیا لەناو ئەو بورجە بەرزەدا بمرم و جارێکی دی ڕۆشنایی نەبینمەوە. سەلام باباجان پێشتر چیرۆکێکی لەسەر بورج بیستبوو، گوایە ئەوانەی لەوێ دەمردن و دەیانەوێت گۆڕەکانیان ونبکەن، دەیانبەنە قاتی سەری سەرەوە، بۆ جێگایەک وەک حەوزێکی گەورە وایە، لەوێ لاشەکانیان فڕێدەدەن و کۆمەڵێک باڵندەی گۆشتخۆر لەسەریان دەنیشنەوە و دەیانخۆن. چیرۆکەکە جێگای باوەڕ بوو، ماوەیەک بوو پۆلێک لاشەخۆرە بەردەوام بەسەر بورجدا دەسوڕانەوە. هەر سێکیان بە جۆرێک لە جۆرەکان دڵنیابوون کە لیوا لە بورجدایە. کەس نەبوو نەزانێت هەموو فایلە ترسناک و ڕووداوە گرنگەکان ئێستا گوازراونەتەوە بۆ بورج، بورجیش جێگایەکی داخراو و مەملەکەتێکی جیاوازە لەم وڵاتە، کە کەس نە پاسەوانانی دەناسێت و نە هێزێک هەیە بتوانێت تێکەڵی ئەو جیهانە داخراو و کۆنترۆڵکراوەی بێت. گەر بکرایە کەسێک دزەبکاتە ناو بورجەوە، دەشیتوانی تەواوی ئەو دونیایە بخاتە مەترسییەوە، لەبەرئەوە بورج ئەو بەشە داخراو و دوور و قەڵاتاسایەی دەسەڵات بوو کە هیچ هێزێک نەبوو

بیبڕێت و لە نزیکەوە تێیبگات. تاکە چەکێکی کاریگەر بەدەست ئەوانەوە بوو، ئەو یاداشت و نهێنیانە بوو کە من جێمهێشتبوون. دەستنووسی یەکەمی هەموو یاداشت و فایلەکانیش لای بولبولیار بوو. پرسیارەکە ئەوەبوو چۆن و لە کوێوە دەست پێبکەن. حیزب دەیویست لە ڕێگای مۆنتاژ و دەستێوەردان و یاریکردن بە دەنگ و نیگارم تا هەتایە من وەک وێنە کۆنەکەم لە خەیاڵی خەڵکدا زیندوویم. حیزب دەیویست ونبوونی من نەبێت بە بابەتی هیچ قسەکردنێک، بۆ ئەوەی ڕێگا لەوەش بگرێت، تەواو دەزگا میدیایی و ئەلکترۆنی و هونەرییەکەی خستبووە کار. دەرکەوتنی وێنەکەی من لە بوهاران نائاسایی و کوتوپڕ بوو، بولبولیار دڵنیابوو من یاخود لە ژێر فشارێکی زۆردام یان تەواوی چیرۆکەکە گەمەیەکی دروستکراوە. جگە لە بولبولیاریش، کەس نەبوو خەیاڵی بۆ ئەوە بچێت ئەنوەر پۆخان بووبێت بە بەشێک لە یارییەکی وەها چەپەڵ. ئەو کە گۆڤارەکەی کەوتە دەست و بەوردی وێنە نوێکانی پۆخانی بە وێنە کۆنەکانی بەراوردکرد، بینی باڵەکانی پۆخان تازەن، پۆخان دەمێک نییە گەیشتۆتە پنتێکی وەها ڕەش، فریشتەکەی یاخی ببێت. هەریەک لە مامۆستا سەلیم و سەلام باباجان، ئەنوەریان بە یەکێک لە دەموچاوە ناسراوەکانی میدیای ئازاد دەزانی، پێیان ئاسایی بوو بۆ پرسیارکردن لە دۆخی لیوا بچنە لای و سەبارەت بە شوێنی دیدار و چۆنێتی تەندروستی ئەو پرسیاری لێبکەن. بولبولیار دژی ئەوە وەستایەوە... پۆخان پیاوێک نەبوو چیتر جێگای متمانەبێت، ئێستا شتێک لەوێنەکانیدا بوو نارەحەت و نائاسوودەی دەکرد. ژیانی ئەو سی ساڵەی دوایی بولبولیاریان فێری ئەوەکردبوو، ئادەمیزادەکان زۆر خێرا و بە جۆرێکی ترسناک دەگۆڕێن. بە دڵسۆزییەکی زۆرەوە ئامۆژگاری سەلامی کرد، توخنی پۆخان نەکەوێت، متمانەی پێ نەکات. بە مامۆستا ئەسغەریشی گووت نەکەوێتە ئەو خەیاڵەوە گوایە لەبەرئەوەی نوسەرێکی ناسراوە، پرۆفیسۆر و دەزگا ئەمنییەکان دەستی لێ بپارێزن.

شتێک دەبوو ئێستا بیکەن ئەوە بوو، بە جۆرێکی نهێنی سوود لە یاداشتەکان وەربگرن بۆ ئازادکردنی من.

تەواوی کارەکان سەلام باباجانیان دڵخۆشدەکرد، ئێستا دڵنیابوو چۆن لە شارەکەدا مەکینەیەکی ترسناک هەیە یادەوری مرۆڤەکان دەسڕێتەوە، هێزێکیش هەیە هەموو شتێک دەکات بۆ ئەوەی ئەو یادەوەرییە لە مردن ڕزگاربکات. چۆن هێزێک هەیە تاعوون بڵاودەکاتەوە، گروپێکی بچوک و بێ هێز و ژیرەوانکێش دەیانەوێت شتەکان بپارێزن و هەڵیانبگرن. بەختەوەربوو کە دواجار بووە بە بەشێک لەو گروپە، بەختەوەربوو بەوەی ئێستا جگە لەو لاپەڕە پڕوپوچەی وەرزش شتێکی دی باشتر هەیە بۆی دەژی. لیوا جەنگیز بۆ ئەو و سەلیم ئەسفەر سەرێکی زل بوو کە نهێنییەکانی نیوسەدەی لە خۆیدا قفڵکردوە، ئەو ئاژەڵە گەورەیەبوو کە پاراستنی وەک پاراستنی وەحشێکی ناوازە گرنگە کە هاوشێوەی دیکەی نییە، جانەوەرێک کە کلیلی نهێنییە بایۆلۆژییەکانی سەردەمێکی دێرینی لەلایە.

ئەوان تیمێکی سێ کەسی بچوک بوون، بەڵام ئیماندار و چالاک. لەو سێ ساڵەی دواییدا من هەوڵم دابوو هەموو شتێک بۆ ڕۆژانی ڕەش ئامادەبکەم، دەمزانی درەنگ یان زوو ئەم شتانە دێنە پێشێ. دوو پەناگای بچوکم دروستکرد، تەنیا بەشی ئەوە بوون بکرێت ئەرشیف و شتە گرنگەکانی من بپارێزن. خۆشم جێگای پەناگاکانم نەدەزانی، بولبولیار سەرپەرشتی هەموو کارەکان بوو، تاکە کەسێک بوو دەمتوانی ئەو نهێنییانەی لادابنێم کە لە خۆمم دەشاردەوە. سێ ساڵ لەمەوبەر، بۆ ئەوەی شتەکان لە بێباری و دوودڵی خۆم بپارێزم، بولبولیارم ڕاسپارد ئەو جێگایە دروستبکات. ئێستا منیش شوێنی پەناگا نهێنییەکانم نەدەزانی و خۆشحاڵبووم پێستیشم کەوڵبکەن ناتوانم شوێنیان ئاشکرابکەم. پێش گرتنیشم بە مانگێک هەندێک پارەی جەمعییەتەکەم لابوو، دامە دەستی بۆ ئەوەی هەڵیبگرێت، لەو ڕووەوە خاترجەم بووم کە دەتوانێت دەست بەکار بێت. دوای بڵاوبوونەوەی چاوپێکەوتنەکەی بوهاران، هەر سێکیان دوای

چەند ڕۆژ پلاندانان گەیشتنە ئەوەی چەند برگەیەک لە یاداشتەکانی من بنێرن بۆ هەر یەک لەسەرۆک، پرۆفیسۆر شالیار، نەغەدە ماردینی و لیڤیتانت. لەگەڵ هەرەشەی ئەوەدا کە ئەگەر لیوا ئازاد نەکرێت، تەواوی یاداشتەکان پارچە پارچە و بەدەستخەتی خۆی لە پەیجێکی تایبەتی ئینتەرنێت بڵاودەکەنەوە و بۆ هەموو میدیا و ڕۆژنامەکانی دەرەوە و ناوەوەی دەنێرن و باڵوێزخانەکان و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لە دیارنەمانی من ئاگاداردەکەنەوە. لە نامەکەدا هاتبوو کە بڵاوکردنەوەی چاوپێکەوتنەکەی بوهاران لە ژێر گوماندایە و دەیانەوێت کەسی لیوا خۆی بێتە دەرەوە و بگەڕێتەوە ماڵی خۆی و ئازادانە بسوڕێتەوە. بولبولیار دڵنیابوو لە ژێر فشاری یەکەم و دووەمیشدا خۆیان دەگرن، بەڵام ئەمان گەر بتوانن ئاشکرانەبن، دەکرێت لە دوا دەرەنجامدا لیوا ڕزگاربکەن.

هەموو مێژووی نهێنی وڵاتەکە ئێستا لەسەری مندا بوو، هەر کەسە و دەیویست کلیلی ئەو سەرەش بە دەستی خۆی بێت.

بەر لەوەی نامەکان ڕەوانەبکەن، دەبوو هەموو ئەندامانی جەمعییەت ئاگاداربکەنەوە. هۆشەنگ چەند جارێک ویستی پەیوەندی بە واعیزەوە بکات، بەڵام ئەو کۆنە سافاکییە پیرە وەها خۆی ونکردبوو، بە کەس نەدەدۆزرایەوە. ئەو بە قاسیدێکی نهێنیدا هەواڵی بۆ هەموو ئەوانە نارد کە دەستی پێیان ڕادەگەیشت. دەبوو ئاگاداربن کە ڕۆژانی داهاتوو ترسناک و ناخۆش دەبن. دواتر بولبولیار چەند شەو و ڕۆژێک لە یادەوەرییەکانی مندا نوقمبوو، ڕۆژ تا ئێوارە دەیخوێندنەوە و کۆپیدەکرد و تێبینی تۆماردەکرد. چەندەها برگەی گرنگ و ترسناکی بینییەوە کە تایبەت بوون بە ژیانی ئەوانەی نامەکانیان بۆ دەچوو. دەبوو بزانن ئەگەرچی لیوا لە ژوورەوەیە، بەڵام خەڵکانێکی تر هەن دەتوانن دوای چیرۆکەکەی بکەون. دوای زیاد لە بیست ڕۆژ لە گرتنی من و بڵاوبوونەوەی چاوپێکەوتنەکەی پۆخان، دەمێک من لە بورج دۆزەخم بەچاوی خۆم دەبینی و ئاواتیشم دەخواست بمرم، یەکەم زنجیرە نامە گەیشتە هەر یەک لە لیڤیتانت، نەغەدە ماردینی، مەکتەبی سەرۆک، پرۆفیسۆر شالیار. نامەکە دە ڕۆژی دانابوو بۆ

ئازادکردنی جەنابی لیوا بە سەلامەتی، بێئەوەی دواتر ئەوە ڕوونبکاتەوە چی دەکەن. هەموو دەیانزانی ئەوە ناتوانێت دوافشار بێت، دەیانزانی ڕێگایەکی درێژیان لە بەردەمدایە کە لەوانەیە هەرگیز نەگاتە جێ.

لەو دە ڕۆژەدا یەکەمین ڕیکلامی تەلەفزیۆنی دەرکەوت، کە جەنابی لیوا جەنگیز بەمزوانە لە بەرنامەیەکی تایبەتدا چیرۆکی سەرهەڵدان و دروستکردنی دەزگای ئاسایش لە هەناوی شۆڕشی ڕەوای گەلەکەماندا دەگێڕێتەوە، ریکلامەکە نیشانەی ئەوە بوو کە دەزگاکان هێشتا ترسیان لە هیچ نییە... حیزب لەوە بەهێزتربوو بترسێت.

## دکتۆر مستەفا شوکاک و ئەهریمەنەکان

هەموو شارەکانی خۆرهەڵات ناوچەیەکیان هەیە پێیدەگووترێت ناوچەی پیشەسازی، لەڕاستیدا کەس نازانێت بۆ بەو کۆمەڵە دوکانە پیس و پۆخڵ و نارێکانە کە هەمیشە پڕن لە پاشماوەی ماشێنی شکاو، کەرتە ئاسنی ژەنگاوی، پەڵە گریسی ڕژاو، بۆنی بانزین، نیگای چەوری دوکاندار و شاگردە ماندووەکان، دەگووترێت ناوچەی پیشەسازی. ئەوەی شارەکانی خۆرهەڵات بگەڕێت و یەکە یەکە ڕوو لەو ناوچانە بکات، جگە لە پایتەختەکان و دەرووبەری شارە گەورەکان، کەم و زۆر شتێک لەو دەورو و بەرە نادۆزێتەوە بۆنی سەنعەتی ڕاستەقینە و پیشەسازی دروستی لێ بێت. ئەوەی هەیە و نییە ئەو فیتەرانەن کە بە هەندێک زانستی سەرەتایی و کەرەستەی کۆن هەندێک گرفتی بچوکی ماشێنەکان چاکدەکەنەوە، بە چەکوش ئاسنی خوار و قوپاوی ئوتومبیلە شکاوەکان هەڵدەستێننەوە، بە جۆرێکی ناپرۆفێشنال ماشێن بۆیەدەکەن، تایە دەگۆڕن، پەنجەرچێتی ئەنجامدەدەن. لەوانە دەرچێت نە کارخانەیەک دیارە، نە جێگایەکی بەرهەمهێنانی مس و نە کوورەیەکی تواندنەوەی ئاسن دەبینرێت. لەوێ

هەتا کەسێکیشت نابینیت کرێکاری ڕاستەقینە یان سەرمایەداری ڕاستەقینە بێت.

لە ڕۆژێکدا کە دەکەوتە سەرەتای هاوینی ساڵی 1991، هێشتا بەعسییەکان لە شاردا بوون و لە سەر هەموو شەقام و شۆستەیەک مەتەریزیان بەستبوو، گونێیان هەڵچنی بوو، دەلاقەی چکۆلانەیان لە دیوار و ستارەی بنکەکانیان نابوو، لەوێکانەوە لوولەی دۆشکە و تیرهاوێژە ئۆتۆماتیکەکانیان کردبووە شەقامەکان. دکتۆر شوکاک بەخۆی و ماشێنەکەیەوە لە خەستەخانە بەرەو ئەو ناوچەی پیشەسازییە بەڕێکەوت، کە هێشتا بە کاریگەریی ڕەوە گەورەکەی خەڵک، زۆری دوکانەکانی بەسترابوون و نیشانەیەکی ئاشکرای کار و ژیانی پێوە دیار نەبوو. دکتۆر بێئەوەی دابەزێت، لە نزیک یەکەم دوکانی کراوەی سەر ڕێگای خۆی، سەری لە پەنجەرەی ماشێنە کۆنەکەی دەرهێنا و بەلوتفەوە پرسی: ئاخۆ کەسێک بە ناوی ماکوان مەهدییەوە کە دەبێت لەم نزیکانە دوکانی هەبێت دەناسن؟. هەر لەوێدا فیتەرێکی گەنج کە ڕەنگی برۆنزیی مەکینەیەکی گریسکراوی هەبوو، ناونیشانی شوێنکارەکەی ماکوانی بۆ هەڵدا. دکتۆر بێئەوەی بیر لە هیچ دەرەنجامێک بکاتەوە، بەرەو ڕووی ناونیشانەکە ماشێنی خۆی بازۆت. دەبێت بڵێم دکتۆر ئەوکات هەستێکی تایبەتی نەبوو، گەر هەستێکیشی بووبێت، هەستی ساردی مردوشۆرێک بووە، کە بۆ هەزارەمین جار دەست بەسەر جەستەی مردوویەکدا دەهێنێت. وەک خۆی دەیگووت، هەموو ژیانی هەر خەریکی ئەوە بووە بچێتە ناو قەفەزی شێر و بێتەدەرێ، بە جۆرێک ئیتر نە شێر و نەقەفەز مانایان نەمابوو لای. بۆ ئەو هەستە بێباکەی هەبوو؟ بۆ چاوەڕوانی شتێکی تایبەتی لەم سەردانە نەدەکرد؟ نازانم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێک پاڵی پێوەدەنا بێت و مەهدی دەریایی ببینێت. هەستێک نەبوو بە ئازایەتی، بەڵکو لە هەستی کەسێک دەچوو قەدەر هەڵیبژارد بێت لاشەی ئەو کەسانە کۆبکاتەوە کە جانەوەران دەیانخۆن.

بینینی دکتۆر کەمێک ماکوانی دەستەپاچەکرد، پێدەچوو هاتنی چاوەڕوانکراو بووبێت. نیگای ماکوان شتێکی تێدابوو وەک بڵێت، دەمزانی دێیت و دەپرسیت. گەرچی دکتۆر و ماکوان لە دوای هەڵهاتنی مەهدییەوە لەخەستەخانە یەکتریان نەبینیبوو، بەڵام ئێستا فەزای نێوان هەردووکیان بووبوو بە مەودایەکی سەرشار لە ترس و دوودڵی. دکتۆر شوکاک بەو دەنگەوە کە بێباکی و ئیرادەشی تێدابوو، گووتی « هاتووم بۆ بینینی باوکت. هەندێک پرسیارم هەیە، دەبێت جەنابیان ببینم، پەیوەندی بە دوا گفتوگۆمانەوە هەیە، دەمێک جەنابیان لای من لە بیمارستان بوو، گەر پێیبڵێت خۆی دەزانێت باس لە چی دەکەم». ماکوان دەستەپاچە دیاربوو، گووتی « نازانم باوکم لە کوێیە. هیچ خەبەرێکم لێی نییە. نا ماوەیەک دەبێت خەبەرم لە باوکم نییە». شتێک لە دەنگ و جۆری سەیرکردنیدا بوو، وەک ئەوەی خۆی بە مەبەست بە دکتۆر بڵێت «باوەڕم پێمەکە». ماکوان بە قیافەت باڵا بەرز بوو، بەڵام هێشتا پاشماوەی منداڵییەکی درەنگ وەختی تێدا دەبینرا... دەستێک جلی شینی کارکردنی پۆشیبوو، چاویلکەیەکی ڕەشی گەورەی کردبوو بە بەرۆکیدا. دکتۆر پێشتر ئەو جۆرە چاویلکەیەی تەنیا لای لەحیمچییەکان بینیبوو. ئێستا موستەفا شوکاکی دۆستمان، هەر لە یەکەم ساتەوە دڵنیابوو ماکوان شتێک دەزانێت و دەترسێت، بێئەوەی خۆی وەک کەسێکی کەم ئەدەب دەربخات کە پێ لەسەر شتێکی ناماقوڵ دادەگرێت، گووتی «کاک ماکوان، بە ڕاستی کارم بە باوکتە. تکایە لەوەدا یارمەتیم بدە. تۆ بیرتە من کێم؟ من دکتۆر شوکاکم، ئەوەی شەوی زامداربوونی لە کاتی ڕەوەکەدا تیمارمکرد، شەوێک سەربازەکان پێکابوویان و تۆ خۆت هێنات بۆ نەخۆشخانە، ئەسڵەن زۆر نیگەرانم، نازانم گوللەکانی دەرهێناوە یان نا. هێشتا کاتێکی وەها بە سەر ئەو شەوەدا تێنەپەڕیوە، منت یادکردبێت ... دڵنیام منت جوان لە بیرە». وەک بەدرۆ شتێک بهێنێتەوە یاد خۆی کە بە ڕۆشنی لە چاویدا دیاربوو لە یادێتی، گووتی «ئەها دکتۆر شوکاک؟ سەرچاو دکتۆر گیان... عەفومکە قوربان، وەڵا زەینم تێکچوو، شتم زوو بیردەچێتەوە، بە

حوکمی کارەکەم، مشتەری زۆر دێنە لامان، دەموچاو زۆر دەبینم و تێکەڵیاندەکەم». بە ڕوونی بە دەنگ و سیمایەوە دیاربوو، درۆدەکات.

مستەفا شوکاک لە دڵی خۆیدا گووتی « لەو کوڕانە دەچێت کە لە نێوان گوشاری باوک و گوشاری دونیادا تێکدەشکێن، هەم ساویلکە و هەم ترسنۆکە، بەڵام بەشی ئەوەش زۆڵ و وریایە بتوانێت خۆی بپارێزێت». شتێکی تێدابوو بە ڕوونی لە گەنجی ئەو سەردەمە و سەردەمەکانی تری ئەم شارەشدا دەبینرا، بێزارییەکی قووڵ لە هەموو شتێک، تووڕەییەکی نادیار و بێزارکەر لە خۆی و لە دونیا. دکتۆر ئێستا لە چاوانی ماکوانەوە بە ڕوونی دەیبینی کە مەهدی دەریایی شتێکی شاردۆتەوە، شتێکی گرنگ، شتێک کوڕەکەی دەیزانێت و لێی دەترسێت. لە یەکەم شەوەوە کە ماکوان لە تەکیدا جەستەی بابە زامدارەکەی هەڵگرت، بێئەوەی غەمێکی قووڵی تێدا بێت، بێئەوەی بلەرزێت و ترسی لە دەستدانی باوک گرژیبکات، بێئەوەی زامداری پیرەباب شپرزەییەکی زۆری تێدا دروستکردبێت، بێئەوەی باکی بەوە بێت ئەم پیاوە پێکراوە و ڕەنگە هەر ئێستا گیان لەدەستبدات، بە زمانی کەسێک قسە لە غەریبەیەک بکات کەوتە باسکردنی. ئەو تێبینییە بەس بوو دکتۆر دڵنیابێت ئەم کوڕە کینەیەکی شاردراوەی بەرامبەر باوکی هەیە، بەڵام تێبینییەکەی لەو چەشنە تێبینییە نهێنیانە بوو کە مرۆڤ پتر لە نەستی خۆیدا هەڵیدەگرێت و دواتر لە کاتی پێویستدا دەریدەهێنێتەوە و کاری لەسەر دەکات.

دکتۆر شوکاک پیاوێکی زیرەک بوو، بەڵام بە گشتی مرۆڤی وەک نەخۆش دەبینی، دکتۆرەکان زۆربەیان وان، بەڵام تێڕوانینی شوکاک لەمڕووەوە، لە چاو نیگای دکتۆرەکانی تردا فەلسەفیانە تر بوو. نەخۆشی لای ئەو دۆخێکی بایۆلۆژی نەبوو، بەڵکو سروشتی ئینسان بوو، مرۆڤ لای دکتۆر بوونەوەرێک بوو کە ناتوانێت ساغ بێت، ساغبوون ئەو دۆخە ئەستەمە بوو کە مرۆڤ نایگاتێت. ئەو ڕۆژە لە چاوی ماکواندا ئەو لاوازییەی خوێندەوە. لاوازی کەسێکی سەرلێشێواو کە نازانێت چۆن لەگەڵ ئەو بوونەوەرە نامۆ و ترسناکەدا ڕەفتاربکات کە ناوی باوکە. هیچ بوونەوەرێک وەک مرۆڤ

لەگەڵ باوانیدا پەیوەندی ئاڵۆز و پڕ دوودڵی و ناکۆکی نییە. دکتۆر ئێستا دەیویست بۆ یەکەمجار سوود لە بڕوا تیۆرییەکانی ببینێت و بیخاتە پراکتیکەوە، دەیتوانی دڵنیابێت کە چاوانی ماکوان، دەنگی، هەناسەکانی هەموو پێکڕا ئەوە ئاشکرادەکەن کە گرێیەکی سەیری بەرامبەر مەهدی باوکی هەیە، بەڵکو لە دڵەوە ئارەزوودەکات، هەلێکی بۆ هەڵبکەوێت و تەواوی کینە و شەڕانگێزی خۆی بۆ دەربخات. هەر کات ناوی باوکی دەهێنا چاوانی بەو ڕقە قووڵە دەدرەوشایەوە کە بێویستی خۆی لە بیلبیلەکانییەوە تیشکی دەدا. دکتۆر دەیزانی، ئێستا گەر گوشارێکی زۆری بخاتە سەر لەوانەیە دەرەنجامەکان پێچەوانە بکەونەوە، بەڵام دڵنیابوو بۆ وەدەستخستنی دەرەنجامی باش، هیچ شتێک لە نەرمەفشار چاکتر نییە. ئەمجۆرە کەسانە لەوانەن تەنیا بە دۆستایەتی و نزیکی و فشاری هێورانە دەکرێت شتیان لێ دەربهێنرێت. دکتۆر، ئەوی ڕۆژ پێداگری نەکرد، خۆی وا دەرنەخست نیازێکی شەڕانگێزانەی هەیە و دەیەوێت لەسەر ئاوازێکی توند لەو بخورێت. بەهێمنی و دۆستانە گووتی، کارێکی هەیە و هەر دەبێت جەنابی کاک مەهدی ببینێت، ئەو هۆیەش وادەکات جارەجارە بۆ زانینی هەواڵێک و دروستکردنی دیدارێک لەگەڵ ئەودا بگەڕێتەوە و سووکە پرسیار لەو بکات.

کە دکتۆر ماکوانی بەجێهێشت، ئەو لە دوورەوە سەیریدەکرد و دوودڵ بوو لەوەی ئایا دکتۆر بانگبکات یاخود لێیگەڕێت بڕوات. دکتۆر گومانی لەوە نەبوو، کە لە جاری دووەمدا ماکوان باشتر لەگەڵی ڕەفتاردەکات. بۆیە هەم ژیرانە و هەم پێویستیش بوو، لێیگەڕێت بیربکاتەوە و بەکاوەخۆ بەسەر دوودڵییەکانی خۆیدا سەربکەوێت. لە دوودڵیدا مرۆڤ زۆربەی کات بەسەر نیوە زاڵ و باڵادەستەکەی خۆیدا سەردەکەوێت، هەمیشە ئەو دیوەش دەشکێت و نوشوستی دەهێنێت کە بە ڕوکەش بەهێز و نەشکستەتر دیارە.

دوو ڕۆژ دوای ئەوە، دکتۆر شوکاک جارێکی تر گەڕایەوە، وەهابوو وەک ئەوەی ماکوان لەسەر ئاگر چاوەڕوانی کردبێت، بەقسە و ڕوخسار شتێکی

ئاشکرای پێوە دیارنەبوو، بەڵام جۆری سەیرکردن و جوڵاندنەوەکانی درکاندیان کە ئارەزوویەکی گەورەی هەبووە دکتۆر ببینێتەوە. دکتۆر راشکاوانە پێیگوتەوە «من پێویستم بەوەیە باوکت ببینم، گەر ناکرێت تۆ کۆمەکمبکە و هەندێک زانیاریم بدەرێ». ماکوان بۆ ئەوەی گومانی کەس نەبزوێنێت، بێئەوەی دکتۆر هیچ بڵێت، سەری بۆنیتی ئوتومبێلەکەی دکتۆری هەڵدایەوە و خۆی وادەرخست لە مەکینەکەدا تەماشای کێشەیەک دەکات. دکتۆر بە وردبوونەوەیەکی کەم لە سروشتی وەستان و قسەکردنی ماکوان تێگەیشت، کە ئەمجارە دەتوانێت دڵنیابێت لەم گەنجەوە هەندێک شتی دەستدەکەوێت. گەنجەکە هەستێکی سەیر و ناوەکی بە غەدر تێدابوو، لەو کەسانەبوو بە هۆ و بێهۆ هەستدەکەن زوڵمێکیان دەرهەق کراوە. ئەو رۆژە لە کاتێکدا خۆی وادەردەخست، بەوردی مەکینەی ئوتومۆبیلەکەی مستەفا شوکاک دەپشکنێ، داوای لە دکتۆر کرد، ناونیشانێکی بداتێ و جێگایەکی بۆ دیاریبکات تا بیبینێت، هەندێک قسەی گرنگی هەیە دەبێت بە دکتۆری بڵێت. دکتۆر بیمارستانی لە هەرجێگایەکی دی پێ باشتر بوو، بیمارستان یانماڵەوە. بەوەدا دکتۆر دڵنیابوو لەوانەیە ماڵەکەی لە ژێر چاودێری بەردەوامدا بێت، تێکچڕژان و زۆرەسەری بیمارستانی بە گونجاوتر زانی. لە بەشەکەی خۆیان ژوورێکی تایبەت و بچوک هەبوو بۆ دانیشتنی چەند نەفەرە و هەر دکتۆرێک بیویستایە دەیتوانی سوودی لێ وەربگرێت... لەجێگا و پەنایەکیشدا بوو، کەس لە دەرەوەی بیمارستان نەیدەکرا بینێتە ژێر چاودێرییەوە.

رۆژێک بەیانی زوو، نزیکی کاتژمێر هەشت و نیو «ماکوان» گەیشتە بیمارستان. وەک بترسێت لەوەی کەسێک بەدوایەوە بێت، بەردەوام ئاوڕی دەدایەوە. ترسەکەی پتر ترسێکی ناوەکی بوو. وەک تاوانێکی ئەنجامدابێت و بیەوێت زوو لە شوێنی گوناهەکەی دووربکەوێتەوە، بە دکتۆری گووت، تکایە دکتۆر با زوو بچینە جێگایەک کەس نەمانبینێت.

دکتۆر خۆشی نەیدەویست کەس بەم چاوپێکەوتنە نهێنییە بزانێت، بە سەرێکی دیش مەبەستی نەبوو لەبەردەم ماکواندا خۆی وادەربخات وەک

بەدوای شیکاری تەلیسمێکی گرنگەوە بێت، سروشتی دکتۆر وەها بوو، هەمیشە شتەکان ئاسان بگرێت و خۆی وادەربخات بۆ هەر شتێک ئەلتەرناتیڤێکی گونجاوی هەیە. دکتۆر شوکاک ژیانی لە دەرەوەی هەر پرسیارێکی ئەخلاقی دەنرخاند، بە جۆرێکیش گوزارشتی لەو ڕاستییە دەکرد، مرۆڤ هەستێکی لادروستدەبوو کە دکتۆر دەرهەق بە هەر شتێکی دیکەی مرۆڤ بێباکە ژیانی نەبێت، ژیانی دابڕاو لە هەر شتێک. هەموو چیرۆکەکانی مرۆڤ لای دکتۆر پوچ و گەمژانەبوون، ئەوە کردبووی بە فانەتیکێکی توندڕەو کە وردەکارییەکانی هەر بەسەرهاتێک بێزاریدەکرد و هەموو چیرۆکەکانی بە بابەتی دووبارە دەزانی. ئەو ڕۆژەش کە ماکوان هات و ویستی قسەی لەگەڵ بکات، ئەو تەنیا ژیانی بولبولیار، ڕێزانی مەلەک، مەلەکبینەکانی بۆ گرنگ بوو... هێشتا ئەوەی لە ناخیدا کاریدەکرد کاراکتەری دکتۆر بوو، نەوەک کاراکتەری کەسێکی مرۆڤدۆست. ماکوان لەم خەیاڵاتانەی سەری دکتۆر بێخەبەربوو، ئەو کارێکی گرنگی هەبوو دەبایە ڕایپەڕێنێت. هەڵبەت ماکوان دکتۆری وەک پیاوێکی زیرەک دەبینی، وەک هەموو خەڵکی دیکەی شار دکتۆرەکانی لەلا زیرەکترین جۆری ئادەمیزادان بوو، وەک عەوامی خەڵکیش باوەڕی هێنابوو کە زیرەکەکان دەبێت وەک مەلاکان یان لە مەلاکان زیاتریش بە ئاکار و خۆش ڕەفتار بن. ماکوان وەک کەسێک تازە مردوویەکی لێ مردبێت، چاوانی سوور و ڕیشی کەمێک هاتبوو، بە ڕیشەوە جوانتر و غەمۆکانەتر دیاربوو. بەردەوام سەیری چواردەوری خۆی دەکرد. ئێستا پەشۆکانێکی پێوەبوو کە دکتۆر جارەکانی پێشوو بەو ڕوونییە سەرنجی نەدابوو. دکتۆر چاوەڕوانییەکی دیاریکراوی لە ماکوان نەبوو، هەر دەیویست کۆمەکیبکات و بیگەیێنێت بە مەهدیی باوکی. بەڵام ماکوان بە ڕوونی بۆ کارێکی تر هاتبوو، بە ئەدەبێکەوە خاڵی نەبوو لە دوودڵی بە دکتۆری گووت «دکتۆر دەمێکە بەدوای کەسێکی خۆت ئاسادا دەگەڕێم، داخی دڵی خۆمی لا هەڵبڕێژم. باوەڕم بە شێخ و مەلا نییە بچمە لایان. دەزانم دوو سەعات لەسەر ئەجری دایک و باوک قسەم بۆ دەکەن. من ئەم باوکەم هیچ ئەجرێکی بەسەرمەوە نییە. بۆیە چەند وەختە کە بیردەکەمەوە داخی دڵم

هەڵرێژم نازانم ڕوو لە کێ بکەم. ئێستا واهەستدەکەم تۆ ئەو کەسەیت کە دەتوانم دەردی دڵمت بۆ بدرکێنم». چاوانی غەمگینی و دوودڵییەکی زۆریان تێدا بوو، بەڵام هێشتا خاڵی بوو لەسێبەری ئەو ترس و مەکرەی تۆزێکی تر دەردەکەون. «لە شەوی ڕەوەکەدا من بە چاوی خۆم بینیم، تۆ تاکە دکتۆرێکی ئەم شارە بوویت خەستەخانەکەت چۆڵ نەکردبوو، ئەوە ڕێزێکی زۆری خستە دڵمەوە... خوا شاهیدە بە ڕاستمە، من حورمەتێکی زۆرم بۆ جەنابت هەیە... ئەم دانیشتنەی من هەرچۆنێک تەواو بێت، هیچ لەوە ناگۆڕێت کە من حورمەتێکی زۆرم بۆ جەنابتان هەیە. هیوادارم هیچ کات من وەک کەسێکی بێشەرم و بێعەیەب تەماشانەکەن». چاوانی ماندوو و سەر ڕوومەتەکانی تەواو سوور هەڵگەڕابوون، پتر وەک قوتابییەکی شەرمن نەوەک فیتەرێکی بازاڕی هاتە بەرچاوی دکتۆر. ئەو هێشتا تەواو لەسەر کورسییەکەی خۆی دانەنیشتبوو، هێشتا چەمکی بەربەرۆکە سپییەکەی بەرزنەکردبووەوە بیداتەوە بەسەر قاچیدا، بەخێرایی ئەو قسانەی تاوتوێکرد و بەسەر ئەو هەستە کتوپڕانەدا تێپەڕی کە ماکوان بە ڕاستگۆییەوە دریکاندنی. شوکاک وەک پزیشکێکی لێزان کە دڵنیایە دەتوانێت شتێکی گرنگ بۆ نەخۆشەکەی ڕوونبکاتەوە پاڵیدایەوە و سەیری گەنجە فیتەرەکەی کرد و گووتی «ماکوان، دەمەوێت بزانم باوکت بۆ بە دوای هۆشەنگی بولبولیاردا دەگەڕێت؟ هۆشەنگ هاوڕێی من بووە و ماوەیەکە دیار نەماوە... ئێستا ئەوە بۆتە مەراق لام». دکتۆر لەگەڵ ماکواندا ئەو شێوازەی گرتە بەر کە لەگەڵ نەخۆشەکانیدا دەیگرێتە بەر، پرسیاری ڕوون و ڕاستەوخۆ. ساڵانێکی زۆر بوو ئەو هەستەی لادروستببووبوو کە پرس و دۆزی پزیشکان جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ شێوازی پرس و دۆزی پۆلیسدا نییە. هەستیدەکرد هەندێک نەخۆش بەڕاستی دەبێت بخرێنە ژێر فشارێکی زۆرەوە تا نەخۆشییەکەی خۆیان ئاشکرادەکەن، تا جێگا ئازاری خۆیان دەستنیشاندەکەن و شێوەی ئێشەکەی خۆیان ڕووندەکەنەوە. دکتۆر دەیزانی بەشی هەرە زۆری مرۆڤەکان تەنیا بەدوای نەخۆشییەکدا دەگەڕێن، وەک چۆن کەسێک لە ناو ئەشکەوتێکی تاریکدا زەوی و دار و دیوار بەدوای خەزنەیەکی گەورەدا

هەڵدەکۆڵێت، هەندێک کەس بەو جۆرە ناخی خۆیان بەدوای نەخۆشییەکدا هەڵدەکۆڵن. دکتۆر بە ئەزموونی درێژی لە بیمارستاندا دەیزانی خەڵکی ئەم وڵاتە حەزدەکەن سزادراو و نەفرەت لێکراو و نەخۆشبن، لەزەت لەوە دەبینن بڵێن خودا و زەمین و ئاسمان دژمانە. دۆزینەوەی ئازاری گەورە و دوژمنی گەورە دەستکەوتێک بوو بچوکی و تەنهایی لە بیر مرۆڤەکان دەبردەوە. لەوەش بترازێت دکتۆر بە تێبینکردنی بەردەوامی نەخۆشەکانی، تێگەیشتبوو خەڵکی ئەم شارە زۆر لە پرسیاری کورت و دیاریکراو دەترسن، هەموو شتێکیش دەکەن وەڵامی کورت و دیاریکراو نەدەنەوە. نەیدەزانی بۆچی وایە، وەک خۆی چەندەها جار دەیگووت نەگەیشتبووە نهێنی ئەوەی، تێبگات بۆ مرۆڤەکان خۆیان لە ناو وەڵامێکی ئاڵۆز و فرەدیودا وندەکەن، بۆ خۆیان لە تەمێکی وەها تاریکدا دەشارنەوە... ئایا بەر لە هەر شت مەبەستیان نییە، خۆیان لە خۆیان ونبکەن؟. ئێستا دڵنیابوو ماکوان لەو دۆخە بەدەر نییە. ئاشکرابوو کوڕەکەی مەهدی دەریاییش وەک هەموو ئەوانی تر لە پرسیاری ڕوون و ڕاستەوخۆ دەترسێت. بۆیە گووتی «دکتۆر، باوکم ماوەیەکە تووشی نەخۆشییەکی ترسناک بووە، پێیوایە مەخلوقێکی عەجایەب دەبینێت. بڕوای وایە ئەو مەخلوقە لە دەستکردنی شەیتانە، دەڵێت شەیتان بۆ هەر کەسێک لە ئێمە سێبەرێکی ترسناکی دروستکردوە کە وەک موسڵمان واجبمانە بیکوژین ... باوکم بە دوای بولبولیارەوە نییە ئەوەندەی بەدوای خۆیەوەتی. دکتۆر گیان، من نازانم ناوی بنێم چی... جگە لە سێبەری خۆی نازانم ناوی بنێم چی. عیلم وماریفەتێکی زۆرم نییە، بەشی ئەوە بێت هەموو شتەکە بە جوانی بۆ جەنابت ڕوونبکەمەوە. بەڵام وەک باوکم خۆی دەڵێت، یەک مەراقی تر لە کەللەیدا نەماوە، ئەوەنەبێت سێبەرەکەی خۆی بکوژێت». دکتۆر دەیزانی و نەشیدەزانی ماکوان باسی چی دەکات. بەڵام دووبارە پرسیارە ڕۆشن و کۆنکرێتەکەی خۆی دووبارەکردەوە «بۆ باوکت بەدوای بولبولیاردا دەگەڕێت؟»، چاوانی ماکوان نیگەرانی کەسێکیان تێدابوو، بزانێت دوای ئەم دانیشتنە، ئیتر ژیانی بە ڕێگایەکی تردا دەڕوات. جارێکی تر بێئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی دکتۆر بداتەوە، گووتی « من باوەڕم بە

شەیتان هەیە ... حەزدەکەم بزانم جەنابتان باوەڕتان پێیەتی؟». دکتۆر پێشتر پرسیاری وای لە خۆی نەکردبوو. لای دکتۆر خراپە لە خودی سروشتەوە هەڵدەقوڵێ، نەوەک لە هیچ هێزێکی ئەو دیو سروشتەوە. دکتۆر وەک عادەتی هەمیشەیی خۆی بە پرسیارێک وەڵامیدایەوە «چ پێویستییەکت بە شەیتانە؟ شەیتان چ کارێکت بۆ دەکات کە ئینسان ناتوانێت بیکات؟ قسەکردن لەسەر شەیتان کاتێک ڕەوایە کە ئەو کارێکبکات بە من و تۆ نەکرێت». ماکوان بێئەوەی سەیری چاوی دکتۆر بکات، وەک شتێک بڵێتەوە کە بیستوێتی گووتی «گەر شەیتان نەبێت خوداش نییە». دەنگی دوودڵییەکی قووڵی تێدابوو، وەک بیەوێت دکتۆر لە وەڵامدا بڵێت «نا، شەیتان نییە، بەڵام خودا هەیە». دکتۆر ئەو خەوشەی بوو، لەگەڵ هەر کەسێک قسەی بکردایە هەر لە دونیای خۆیدا بوو، گووتی «پێتوایە بۆ ئەوەی زەردەواڵەیەک بدات بە منداڵێکەوە، پێویستی بە شەیتان هەیە؟ پێتوایە بۆ ئەوەی جاڵجاڵۆکەیەک مێشوولەیەک بخوات پێویستی بە شەیتان دەبێت؟ کاتێک بۆقێک مێشێک دەگرێت شەیتان چووبێتە بنکڵێشەی؟ کێ من و تۆی فێرکردوە کاتێک منداڵێکی بچوکین بەدوای پەپولەدا ڕابکەین و بیانگرین و بیانکوژین. شەیتان یان خودا؟ کامیان؟». ماکوان کەمێک بیری لە قسەکانی دکتۆر کردەوە، قسەکانی زۆر ئازاربەخش بوون، گووتی «نازانم بڵێم چی. بەڵام دەڵێن گەر ژنێک خیانەتیکرد ئەوە دەستی شەیتانی تێدایە، یان گەر ئینسان وەسوەسەی خراپی هەبوو». دکتۆر لە ناخی خۆیدا دڵنیابوو نەغەدە ماردینی بە هۆی هیچ شەیتانێکەوە لە ماڵی ئەو هەڵنەهاتووە. وەک قسەکان یادگارێکی خراپی بەیادا بهێننەوە و بیەوێت زوو لەو بابەتە دەرچێت، گووتی «منیش تێناگەم. بۆ گەر سەد هەزار کەس لە جەنگدا بکوژرێن ئەوە کاری خودا بێت، بەڵام گەر ژنێک دەرپێکەی داکەند ئەوەیان ببێتە کاری شەیتان. تێناگەم لەو ڕووەوە خودا و شەیتان ئیشەکەیان چۆن دابەشکردوە ... هیچ کەسیش تێناگات ... هیچ کەس. بەڵام ماکوان، وازبهێنە، ئارەزووم نییە دانیشم کاری خودا و شەیتان لە یەکتر جیابکەمەوە... ئیشەکە وا ئاڵۆزکاوە، بە کەس جیاناکرێتەوە. ئەوەش

دەبێت حیکمەتێکی تێدا بێت، بەڵام من لەو کەسانە نیم زۆر سەری خۆم بەو حیکمەتانەوە بێشێنم. دەمەوێت بزانم بۆ باوکت بەدوای بولبولیاردا دەگەڕێت، کاری بە بولبولیار چییە؟». ماکوان زەردەخەنەیەکی گەمژانەی گرت و گووتی «دکتۆر، پەیوەندی بە شەیتانەوە هەیە». دکتۆر خۆی گومانی کردبوو کە باوکی ماکوان پەیوەندییەکی بە جەمعییەتی دوژمنانی شەیتانەوە هەبێت، بەڵام ئەو زانیارییە چ سوودێکی هەیە گەر هەموو وردەکارییەکانی دەست نەکەوێت و تەواوی وێنەکە لە هەموو لاکانییەوە نەبینێت. دڵنیابوو، ماکوان بەشی هەرە زۆری ئەو زانیارییانەی دەیانزانێت ئاشکرایاندەکات. ماکوان مەهدی بەختەوەر بوو کە دواجار کەسێکی چنگ کەوتبوو قسەی بۆ بکات، بە هێمنی پاڵیدایەوە و بە زەردەخەنەیەکەوە کە نیوەی نوقمی ترس و نیوەکەی دی نوقمی سەرسامی بوو، کەوتە گێڕانەوەی چیرۆکی خۆی.

«جەنابی دکتۆر، چیرۆکەکەی باوکم پەیوەندی بە شەیتانەوە هەیە. دەبێت بڵێم من ئەسڵەن نازانم باوکم چۆن کەوتە سەر خەیاڵی دوژمنایەتی شەیتان. باوکی من خراپترین باوکێکە خودا دروستیکردبێت، هەموو ژیانم ڕەحم و زەردەخەنەی باوکانەم لێ نەبینیوە. لەو ڕۆژەوەی فاممکردۆتەوە، ئیشدەکەم و بەردەستی خەڵکیم تا خۆم و دایکم بژێنم. ئەو جگە لە دەردەسەری شتێکی بۆ من نەبووە. دەڵێن سەرەتا کەسێکی چەقۆکێش بوو، من شتێکی زۆر لەسەر گەنجێتی نازانم، حەزم نەکردوە بزانم کێیە و چی دەکات و چی بووە، بەڵام هەرچییەکی لەسەر بگێڕنەوە باوەڕ دەکەم. پیاوێک بوو ... تەنیا پیاوێک کە دەبێت بە باوکت. ئێستاش بەلامەوە گرنگ نییە بزانم کێیە. چەندە ناسینی سەگێکی لاکۆڵانم مەبەستە، هێندەش ناسینی ئەوم مەبەستە. لای من جانەوەرێکە، جەنابی دکتۆر دەبێت ڕابوردووی جانەوەریش چی بێت لە کاری خراپ زیاتر. من وەک منداڵ لە ژێر باری ترسدا گەورەبووم، ترسێک ئێستاش بەرمنادات، ترسێک وادەکات ئێستاش هەر ئەو شتە بکەم کە ئەو دەیەوێت. من و دایکم لە ژێر لێدان و ئەشکەنجەدا ژیاوین، هیچ کات ڕۆژێکی ئاسوودەمان لەگەڵ ئەو

جانەوەرەدا نەبردۆتە سەر. تەمەنم دە ساڵ بوو کە ژنێکی تری خواست و لە ئێمە دوورکەوتەوە. ژنهێنانی بۆ من و دایکم وەک سەفەری بەهەشت وا بوو، هەتا دایکیشم دڵخۆش بوو کە ژنی هێنا و لە ئێمە دوورکەوتەوە. گرنگ ئەوەبوو لێمان دووربکەوێتەوە، بڕواتە لای دۆست و ڕەفیقەکانی کە زۆربەیان وەک خۆی بوون، سەرسەری و چەقۆکێش. باوکم لەوانەبوو بە هەر دین و مەزهەبێک سەیرتبکردایە جێگای جەهەنەم بوو، قومارچی بوو، ژنباز بوو، ئازاری خەڵکی دەدا، ئیشنەکەر بوو، لەسەروو هەموو شتێکیشەوە خودانەناس بوو. لەو باوەڕەدا نیم خودا هیچ کات بیبەخشێت. هەموو جار دایکم بە منی دەگووت ـ ماکوان، تۆ هەتیویت و باوکت هەیە ـ. من هەر زوو لە خوێندن دوورکەوتمەوە، مەکتەب جێگای هەموو کەسێک نییە. قەت حەزم لە مەکتەب نەبووە. مەکتەب سوودی بۆ من چی بوو، کات کوشتنێکی زۆر و بێفایدە و هیچی تر».

وەک بەدەم خەوەوە قسەبکات وەهابوو، وەک ڕستەکانی لەبەرکردبێت، بێئەوەی تەماشای چاوی دکتۆر بکات بەردەوام بوو، دەستی خستە سەر ئەژنۆی، دەستەکانی لە ڕوخساری پیرتر و ماندووتر دیاربوون. دیاربوو هەموو ژیانی تەنیا بەدەست کاریکردوە، هیچ کات پەنجەکانی جگە لە مەتریاڵی ڕەق، لە زبری بەرد و ئاسن زیاتر کاڵای نەرمی نەبینیوە. گووتی «دەزانم ئەم قسانە بایەخێکی وەهایان بۆ تۆ نییە. بەڵام من هەمیشە کۆیلەی بووم، ئێستاش کۆیلەی ئەوم، دەمەوێت لەوە تێبگەیت. من دەڵێم هەموو شتێک هۆیەکی هەیە، باوکم جانەوەرێکی بێئیمان بوو، بەڵام ماوەیەک لەوەوبەر لە ناکاو گۆڕا. لە ناکاو شەوێک منی بانگکرد و گووتی کە شەیتانی بینیوە. نازانم بۆ منی بانگکرد. شەوێکی باران بوو، ئەو هەمیشە چەتر و پاڵتۆ و ملپێچی باشی بوو، بەڵام شەوێک وەک یەکێک کارەساتێکی لەدەست ترازا بێت، لە دەرگای داو و بە دایکمی گووت دەیەوێت من ببینێت. جاران دەهاتە ژووری و بە هاوار و جنێو و نەڕە بانگیدەکردم، چی لەفزێکی سووک بەدەمیا بهاتایە نەیدەگێڕایەوە. ئەو شەوە باران بە خوڕ دەباری، لێزمە و چەخماخەیە بوو مەپرسە، بێ پاڵتۆ،

بێ چەتر، بێ ملپێچ، بێ جامانە، وەک چەتە چووبێتە سەر ڕێگای و لە هەموو شت ڕووتیکردبێتەوە، هەر لە دایکم دەپاڕایەوە، من ببینێت. دایکم داوایکرد بێتە ژوورێ و لەو بارانەدا نەوەستێت، بەڵام وەک زەرنەقی چووبێت، هەر لەو دیو دەرگاکەوە دەیگوو با ماکوان ببینم ... با ماکوان ببینم. من کاک دکتۆر، لە منداڵیمەوە کە لە بازاڕ بۆ شت فرۆشتن دەوەستام و لە ناکاو باران دایدەکرد، حەزم لە باران نەکردوە... هیچ شتێک لە باران ناخۆشتر نییە لەلام».

لە ناکاو سەری داخست و ماوەیەک بێدەنگ بوو، وەک شەرمبکات، ئێستێکی کورت چاوی لێکنا و توند هەر دوو دەستی نوساند بە خۆیەوە و گووتی «ئەوە یەکەمجاری بوو، وەک ئینسان لەگەڵمدا بجوڵێتەوە».

مستەفا شوکاک لێگەڕا ماوەیەک لەویادا بوەستێت، هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە ئەسپایی لە ژێر لێویەوە گووتی «لەو شەوەوە زۆر ڕقم لە باران نییە».

پاش بێدەنگییەکی درێژ، وەک چاوەڕوانبێت دکتۆر کۆمەکی پێبکات، کارئاسانییەکی بداتێ بەردەوام بێت، خۆی ڕاستکردەوە و گووتی «ئەو شەوە لە پیکابێکی دەبڵ کابینەی کۆندا منی برد بۆ ماڵێکی تر. بە درێژایی ڕێگاکە گیانی دەلەرزی، بە زەحمەت دەیتوانی پیکابەکە لێخوڕێت، پێشتر هەر جارێک ئاوا دەست و قاچی لەرزی بن، لە تووڕەییدا بووە. بەڵام ئەوجارە نەخۆش بوو. بۆ یەکەمجار دەستم خستە سەر شانی و گووتم باوکە چییتە؟ ئەوە یەکەمجار بوو لە ژیانمدا بەوجۆرە دەست بخەمە سەر شانی و هەستبکەم منیش ئینسانێکم وەک خەڵک. هیچی نەگووت، تا نەگەیشتینە جێگای خۆمان و دانەبەزی و منی نەبردە ژوورێکی داخراو و دەرگای دانەخست و پەردەی دانەدایەوە هیچی نەدرکاند. لەوە دەترسا کەسێک گوێی لە قسەکانمان بێت، دڵنیابووم شتێکی گرنگی هەیە بۆمی باسبکات... لە سواربوون و دابەزیندا منیش بارانێکی زۆر لێیدام، هەموو گیانم دەلەرزی، لە سەرما و لە ترسدا دەلەرزیم. کە دڵنیابوو لە ژوورەوە

کەس نامانبیستێت بە چیەوە پێی گووتم، تۆ کوڕی منیت. وەک ئەوەی تا ئەو کات نەیزانی بێت من کوڕی ئەوم. دەستی لێدام و باوەشی پیاکردم و گووتی تۆ کوڕی خۆمیت. بۆنێکی زۆر ناخۆشی لێدەهات، وەک هەموو ژیانی لە تەویلە و گەوڕ و ئەو شوێنانەدا ژیابێت. هیچم نەگووت، بەڵام بۆم ڕوونبوو ناتوانم ببەخشم. کاک دکتۆر لەوانەیە تۆ بڵێی من حەرامزادە و بێسفەتم و ڕێزی ئەو پیاوەم لا نییە کە لە پشتی کەوتوومە، بەڵام وانییە. بەڵام باوەڕم بە بەخشین نییە، باوەڕم بە بەخشینی باوک نییە. دەکرێت هەموو کەس ببەخشین، بەڵام باوک نا... دەبێت ملکەچی بین، گوێڕایەڵی بین، بەڵام نابێت بیبەخشین... بۆ نازانم؟ تۆ جەنابت دکتۆری باشتر حاڵی دەبیت. هۆکەی نازانم چییە، بەڵام باوک لای من شوێن و مەقامێکی گەورەی هەیە، وەک چۆن ئەستەغفیروڵا خودا نابەخشرێت، باوکیش نابەخشرێت ... خوایە گیان عەفوومبکە».

دکتۆر بە هێمنی گوێی دەگرت، ئەویش هێمنی دکتۆری بە ڕەزامەندی وەرگرت و لە سەرەخۆ لە سەر چیرۆکەکەی بەردەوامبوو. «کاک دکتۆر من بیستوومە دەڵێن دینداری لە ناسینی خوداوە نایەت، من خۆم شارەزاییم نییە، بەڵام ماوەیەکە خەڵکێکی بەڕێز و خۆت ئاسا دەناسم، خەڵکی خراپ نین و ئەهلی ئیمانن، ئەوان دەفەرموون کە دینداری لە ناسینی شەیتانەوە دێت. ئەو قسەیە چەندە ڕاستە نازانم، بەڵام شتێکی وام بیستووە، باوەڕدەکەم باوکیشیم هەر ئەوەی بیستبێت. ئەو شەوە مەهدی بۆ یەکەمجار لە بەردەممدا گریا، لە منداڵییەوە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەبووم، دایکم لە منداڵییەوە پێیدەگووتم ـ هەموو باوکێکی زاڵم، ڕۆژێک دێت خودا زەلیلیدەکات و لە بەردەستی فەرزەندیدا داماودەبێت و دەگری ـ . من لە منداڵییەوە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەم دەکرد، بەڵام دەمویست بزانم چی بووە، باوکم چ ژەقنەبووتێکی خواردوە وا بووە بە بەشەرێکی تر، وا لاواز و عاتیفی باوەش بە مندا دەکات. بۆ ئەوەی لە خۆمی نەڕەنجێنم و هیچم لێ نەشارێتەوە، گووتم باوە گیان چییتە، خۆ نەخۆش نیت، خۆ شتێکت لێ نەقاوماوە، کەس تەعەدای لێ کردویت، کەس دڵی شکاندویت. گووتی

لەمڕۆوە من دەبێت ژیانی خۆم بگۆڕم. ماوەیەکە شتێکی عەجایەب کە لە کەم کەس دەگوزەرێت هاتۆتە ژیانمەوە، دانیشە و گوێبگرە با چیرۆکەکەت بۆ بگێڕمەوە. باوکم ئەو شەوە بەسەرهاتی ژیانی خۆی بۆ گێڕامەوە، هەرزەکارێتی و گەنجێتی، شەڕ و حیزبایەتی، شەڕەچەقۆ و عارەقخواردن، قومارکردن و ژنبازی... هەموو شتێک، چەندی ڕاستە و چەندی درۆ نازانم، لاشم گرنگ نییە بزانم. گووتی من لە هەموو ژیانمدا تەنیا ئەو کارانەم کردوە کە خودا دەڕەنجێنێت، نە بۆ خۆم باش بووم و نە بۆ ژنم و نە بۆ ئەولادم. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێمەوە و تۆبەبکەم و بە ڕاستی بکەومە خزمەتی خودا و ببمە ئیماندارێکی دڵسۆز کە جگە لە ئەمری تەبارەک وە تەعالا، هیچی تر جێبەجێ نەکەم. شێوەی قسەکردنی بە جۆرێک نەبوو باوەڕی پێ نەکەم، یەکەمجارم بوو لە جێگای ئەو باوکە دڕندەیە، باوکێکی ترم دەبینی، کەسێک ترسێکی قووڵ لە خودا لە چاویایەتی».

دکتۆر پەلەی بوو بزانێت چی مەهدی دەریایی بەو جۆرە لە ڕیشەوە گۆڕی، هاتە قسە و گووتی «بەڵام هۆی ئەم گۆرانە کتوپڕ و عەجایەبە چی بوو؟».

ماکوان پاڵیداویەوە و گووتی «نازانم کەی، بەڵام ماوەیەک بەر لەو شەوە، بە دروستی ناتوانم بزانم کەی بووە، هەفتەیەک بووە، مانگێک بووە، ساڵێک بووە، دووان بووە. ڕۆژێک مەهدی باوکم ڕێکەوتی کەسێک دەکات، پیاوێک لە ڕوخسار و هەیکەل و قەڵافەتدا لە خۆی دەچێت، هەموو شتێکیان وەک یەکە، وەک برای دووانەبن و بە زگێک لە دایکبووبن و ئەمیان دایکێک بەخێوی کردبێت و ئەویتریان دایکێکی تر. خۆی بە ناوی مەهدائیلی فریشتەوە بە باوکم دەناسێنێت و پێی دەڵێت کە ئەو فریشتەی تایبەتی ئەو بووە و نزیکی حەڤدە ساڵ لەوەوبەر لە دەستی هەڵهاتووە و بە دونیادا ئاوارە بووە و ژیانێکی سەیر و عەجایەب ژیاوە و لەم شارەدا زیندەگییەکی قەلەندەری بردۆتەسەر. شتێک باوکم تووشی داچڵەکان و نەخۆشی دەکات».

ئەوە ئەو شتەبوو کە دکتۆر شوکاک چاوەڕوانی نەدەکرد، لێرەدا و لە دەمی ئەم گەنجە دڵتەنگ و بێقەرارەوە ناوی مەهدائیلی فریشتە ببیستێتەوە. دکتۆر بە بیستنی ناوی مەهدائیل موچڕکێکی درێژی پێداهات و هەستیکرد بۆ دووەمجار لە ژیانیدا، دوای ئاشنابوونی بە دونیای فریشتەکان، دەکەوێت بەسەر نهێنییەکی ترسناک و گەورەدا. ماکوان بێئەوەی هەست بە هیچ گۆڕانکارییەک بکات، گووتی «یەکتر بینینی ئەو کەسە و باوکم، لەویادا کۆتایی نایەت. باوکم دەڵێت جۆرە شتێک بووە لە نێوان ئینسان و تەیرو تیوردا، وەک ئەو باسیدەکات دوو سێ جار دەرکەوتووە و ونبووە، هەموو کەسێکیش نەیتوانیوە وەک خۆی بە باڵداریی بیبینێت، خەڵکی تر هەر لە قیافەی عادەتیدا بینیویانە، وەک چۆن من و تۆ دەبینن. وەک باوکم دەڵێت ئەوەی ئەو مەخلوقە سەبارەت بەو و بە ژیانی گێڕاوەیەتەوە شتی ڕاستبوون، وەک ئەوەی بە دەقیقە و سەعات بەدوای باوکمەوە بووبێت و شان بە شان لەگەڵیدا ڕۆیشتبێت. باوکم دەڵێت ئەو ساڵانەی لە بیرە کە خۆشی تووشی ئەو خەیاڵپڵاو و شتە بووە و چاوانی ڕێشکەوپێشکەیان کردوە و وای زانیوە باڵ لە پشتی ڕواوە. ئەو شەوە بەدەمی خۆی باسی بۆ کردم چۆن ساڵانێکی زۆر لەوەوپێش کە هێشتا گەنج بووە، ڕۆژێک لە بەر ئاوێنەی چایخانەیەک ئەو باڵانەی بینیوە، دواتر ماوەیەکی درێژ نەخۆش بووە، فێی لێهاتووە، وەک دەستی کەسێکی تر بیجوڵێنێت بەدەوری خۆیدا سوڕاوەتەوە، فڕیوە، کەوتووە بە دیوارەکاندا، ڕشاوەتەوە، خۆی پیسکردوە... باوکم ئەو شەوە هەموو ئەو شتانەی گێڕایەوە کە من وادەزانم جۆرە نەخۆشییەک بێت. کاتی خۆی پێمگووت خۆی پیشانی دکتۆر و شت بدات. بەڵام ئەو دەڵێت دکتۆری باوە حیز هیچ نازانن».

دکتۆر خۆی ڕاستکردەوە، سەرسامییەک لە دەنگیدا بوو، هەرچەندی دەکرد ئاسان بۆی جڵەو نەدەکرا، گووتی «لەوانەیە نەخۆشی بێت، ختوورەیەکی ڕەش بێت کە لای هەندێک کەس وەک ڕاستی و واقع

قەبووڵدەکرێت. کێ چوزانێت؟ بەڵام گەر باوکت گووتبێتی پێش چەند ساڵ شتێکی وا ژیاوە، کەواتە چیرۆکەکە مێژوویەکی کۆنی هەیە».

ماکوان گووتی «بەڵێ، مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە، زۆر زۆر. بەڵام گرنگ ئەوە نییە... من بۆیە هاتم بۆ لای ئێوە، دەمەوێت باسی تێکچوونی پەیوەندی باوکمت لەگەڵ ئەو مەخلوقەدا بۆ بکەم. هۆی دەرکەوتنی مەهدائیل دوای ئەو هەموو ساڵە ئەوەیە کە گوایە دەیەوێت یارمەتی خۆی و باوکم بدات لە خۆیان تێبگەن، وابکات باوکم لە کۆچی فریشتەکەی ئاگاداربێت، بیریبخاتەوە گوایە هەموو کەسێک فریشتەیەکی هەیە و لەوجۆرە قسانە... بە کورتی و زۆر سەرت نەیەشێنم، مەهدائیل هاتووە بە باوکم بڵێت خودا و شتی وەها بوونی نییە، من فریشتەی تۆم نەوەک فریشتەی خودا. فریشتە و ئینسان یەک دەعبای پێکەوە نوساون و دەبێت پێکەوەبن. گووتوویێتی چەند ساڵە توانیویێتی تەنها بژی، بەڵام ئێستا پیرە و لە مردن نزیک بۆتەوە و پێویستی بە یارمەتی و عاتیفەی ئەوە بۆ ئەوەی بەردەوام بێت و باوەڕی تەواوەتی بە ئینسان لەدەست نەدات. بەڵێ جەنابی دکتۆر، ئەوەی من بۆت دەگێڕمەوە، قسەی ئەو تەیرەیە وەک باوکم بۆی گێڕامەوە».

موستەفا شوکاک بیریکەوتەوە کە مەهدائیل تاکە فریشتەیەک بووە، زۆر باوەڕی بە مرۆڤ بووە. لەو دواییەشدا گەیشتبووە ئەو بڕوایەی بۆ ئەوەی فریشتەکان ڕزگاربکەین دەبێت سەرەتا مرۆڤ ڕزگاربکەین. ماکوان بێباک لە هەر خەیاڵاتێک، وەک لەزەت لەوە ببینێت کە دواجار وەک پیاوێکی خاوەن نهێنی بەرامبەر کەسێکی پایەدار دانیشتووە و قسەدەکات، دەستێکی بە ئەژنۆیدا هێنا و بێئەوەی بوێرێت چاونەترسانە سەیری دکتۆر بکات، بە شتێک لە شەرمەوە بەردەوام بوو «باوکم هەر دوای یەکەم بینینی مەهدائیل، دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە ئەم شتە شەیتانە و خودا بەتایبەت ڕەوانەی لای ئەوی کردوە. باوکم لەو کەسانە بوو بڕوای بە هیچ شتێک نەبووە. پیاوەکانی دراوسێمان هەموو بۆ خۆیان شتێک بوون، دینداربوون یان بێدین، سەر بەم حیزب یان ئەویتر بوون ... بەڵام ئەو

ماوەیەکی درێژ بوو هیچ نەبوو. بیرم نایەت بیری لەوە کردبێتەوە خودا هەیە یان نا. تا ئەو شەوەش لە جنێودا نەبێت، ناوی خودام لە دەمی نەبیستبوو. بەڵام دوای دەرکەوتنی مەهدائیل، لەترسی ئەوەی خەڵکانی نزیک و هاورێکانی نەیدەنە بەر کلکان و پێی پێنەکەنن، نەیوێرا لای کەس نهێنی ئەو باسە ئاشکرابکات یان غیرەت بداتە خۆی و بڕواتە سەردانی پزیشکێک ... دەیگووت ـ مەسەلەکە شتێک نییە، کەڵکی پزیشکانی پێوە بێت ـ. واتێگەیشتبوو هیچ لوقمان و حەکیمێک ناتوانن تیماری دەردی بکەن. بۆیە یەکێک لە هاورێ نزیکەکانی کە بە حاڵی دەزانێت و بە چاوانی خۆی دەبینێت چۆن ئەم پیاوە زل و بێعارەی دوێنێ، گومان و گینگڵ لوولیدەدەن، ئامۆژگاریدەکات پرسیارێک بە خەڵکی ئیماندار بکات و لە ئەهلی دین بپرسێت هۆی غەمی چییە و ڕۆحی بە چی ئاسوودە دەبێت؟.

لە دوای دەرکەوتنی ئەم مەهدائیلەوە، باوکم بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا بە ڕاستی بیری لە خودا کردەوە. لەوەدا ناهەقی ناگرم، منیش بم هەر وادەکەم. تۆ بیهێنە بەرچاوت کەسێک زۆر لە خۆت دەچێت، دێتە بەردەمت و دەڵێیت من فریشتەی تۆم، هەموو ژیان ئاگاداربووم چی دەکەیت و چی ناکەیت. لە جۆرە حاڵەتێکی وادا مرۆڤ جگە لەوەی دەرکەوتنی ئەم مەخلوقە بە نیشانەیەکی غەیبی بزانێت، چی بکات؟. باوکم دەمودەست وایدانا کە ڕابوردووی خراپی خۆی بۆتە مایەی توڕەیی باری تەعالا و خودا بە گەورەیی خۆی لە دونیادا خستویتییە ژێر سزا و چاودێرییەوە. بەڵام ئەوەی باوکمی گۆڕی بۆ کەسێکی سەر لێ شێواو، ئەوەبوو ئەو تەیرە هەموو هەوڵێکی دەدا، خۆی لە خودا و ئاسمان جیابکاتەوە و بڵێت مەلایکەت لە ئاسمان نییە و بەس من مەلایکەتم و لەوجۆرە کوفرانەی تر کە ئەستەغفیرەڵا گوناهی گەورەن. ئەوە باوکمی شپرزەکرد، گەر وانەبووایە دڵنیابووم پەیوەندی باوکم و تەیرەکەی ئاوا خراپ تێکنەدەچوو. مەهدائیل لە ماوەیەکدا دەرکەوت و هاتە کن باوکم کە ئەو پێویستی بە خودا بوو نەوەک بە مەلایکەت. ئەوە قسەی خۆیەتی،

ئەوە قەناعەتی باوکم بوو کە لەو شەوەدا دە جار زیاتر بۆ منی دووپاتکردەوە. دیارە من چیرۆکەکەت وەک خۆی بۆ دەگێڕمەوە، نازانم چی ڕاستە و چی درۆ، چی بووە و چی نەبووە، لەو ڕووەوە وەک گووتم هیچ نازانم. بەڵام باوکم ئەو شەوە کە شتەکەی گێڕایەوە. دەیگووت گەر ئەو باڵدارە ڕەوانەکراوی خودا نەبێت، دەبێت ڕەوانەکراوی شەیتان بێت. باوکم وایە، لە نێوان خودا و شەیتاندا هیچی تر نابینێت». دوای ئەو ڕستەیە تۆزێک وەستا، هەوایەکی هەڵمژی و سەیری دکتۆری کرد و گووتی «منیش وام، لەوەدا وەکو باوکم وام، لە نێوان خودا و شەیتاندا هیچی تر نابینم».

هێدی هێدی سەرسامی دکتۆری دادەگرت، پرسیاری تاریک و سەیری لادروستدەبوو، گومانی ڕەشی لە مرۆڤ دەهاتەوە سەرەوە، بۆ ئێستێک ئارامی لەدەستدا و ویستی تکا لەم گەنجە بکات هەستێت و بڕوات. ئەو سەرەتا دەیویست ماکوان بیباتە لای باوکی و پرسیارە سەختەکان لە خودی مەهدی دەریایی بکات، بەڵام ئێستا ماکوان خۆی بێ هیچ شتێک دەرگای نهێنییەکی گەورەی بۆ دەکردەوە. شوکاک بە شتێک لە بێزارییەوە پرسی. «بوەستە، بوەستە ماکوان، بەرلەوەی هیچ شتێک بڵێی، پێمبڵێ بۆ وا ئاسان هەموو ئەم چیرۆکەم بۆ دەگێڕیتەوە. نامەوێت بچیتە جێگایەکەوە دوایی پەشیمان بیت، شتێک بدرکێنیت هەموو ژیانت سزای بچێژێت. پێمبڵێ بۆ دڵی خۆتم بەمجۆرە بۆ دەکەیتەوە... بۆ؟ من کێم تۆ وا قسەم بۆ دەکەیت؟»، ماکوان سەیری دکتۆری کرد و بە دەنگێک پڕبوو لە ئاوازێکی زۆر غەمگین، وەڵامیدایەوە «لەبەر ئەوەی شتەکان پەیوەندیان بە من و تۆوە هەیە. هەمووی عەلاقەیان بە من و تۆوە هەیە. گەر هەموو شتێکت بۆ نەگێڕامەوە نازانیت باسی چی دەکەم».

بۆ یەکەمجار دکتۆر سەیری چاوانی ماکوانی کرد و ترسا. ئێستا شتێکی تێدابوو ئاسان نەدەخوێنرایەوە، چاوانی پڕبووبوون لەو ئاڵۆزییە ترسناکەی دەشێت هەر هێزێکی ڕەشی لێ بێتەدەرێ. گەرچی پرسیارەکەی دکتۆر ماکوانی تێکدا، بەڵام بێئەوەی چیرۆکەکەی بیربچێتەوە، بێئەوەی بهێڵێت

دکتۆر لە بەردەمی هەڵبێت، هەناسەیەکی هەڵکێشا، دەستێکی بە نێوچاوانیدا هێنا و گووتی «دکتۆر ببورە. گەر هەموو چیرۆکەکەت بۆ بگێڕمەوە، دڵنیابە تێدەگەیت. تا بزانیت بۆ لێرەم، دەبێت هەموو شتێکت بە وردی بۆ باسبکەم».

دکتۆریش بە بێزارییەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گووتی «بەردەوام بە، بزانم».

ماکوان گووتی «باوکم بۆ ئەوەی دڵنیابێت و نەکەوێتە هەڵەی گەورەوە، بۆ یەکەمجار پرسی هەندێک مەلای کرد. دوای ئەوە باوکم کەوتە دونیایەکی ترەوە. من لە منداڵییەوە دەزانم، ئەهلی ئیمان هێندەی بەدوای شەیتاندا دەگەڕێن بەدوای خودادا ناگەڕێن. لەوەشدا لەسەر هەقن، ئەوەی مەترسی لەسەر ئیمانی خەڵکی وەک من هەیە، کە زۆر سەر و دەر لە دین دەرناکەین، شەیتانە نەوەک خودا. لێرەدا ناتوانم بەدرێژیی بۆت بگێڕمەوە چی بووە، بەڵام دەتوانم دڵنیاتبکەمەوە کە هێندەی پیاوانی ئیماندار بە چیرۆکی دەرکەوتنی مەهدائیلیان زانی، وەک هاوارێکیان لە مەحشەرەوە بیستبێت، خرۆشان. لەترسی دەوڵەت نەیاندەتوانی زۆر جموجۆڵبکەن، بەڵام دەرکەوتنی مەهدائیل و قسەکانی ئەویان بە سەرەتای قیامەت و دەرکەوتنی شەیتان لە شاردا لەقەڵەمدا. ئەو دەم هەموو شتێکی ڕێکخراوە دینییەکان زۆر بە نهێنی بوو. ئایا ئەوانەی لە سەرەتاوە باوکم پەیوەندی پێوەکردن حیزبێکی دینی بوون، تەنیا ئیمانداری خوداناس بوون و لە ترسی قیامەت و ئیمان بەوجۆرە لەگەڵ بابم ڕەفتاریان کردبوو، نازانم؟. بەڵام چیرۆکی باوکم بە نهێنی و دەماودەم لە ناو خوداناسان و هەیئەتی عولەما ئاینییەکاندا بڵاوبووەوە و لەوێشەوە گەیشتە گوێی خەڵکانی وەک من و تۆ. باوکم لەو هەرا و بگرە و بەردەیەدا بەخۆشی بێت یان بە زۆر ئیمان بەخودا دەهێنێت و تۆبەدەکات و دەبێت بە ئەندام لە جەماعەتی دوژمنانی شەیتاندا کە تۆ پێشتر پێیان ئاشنابوویت. دکتۆر من هەموو شتێکیش لەسەر تۆ دەزانم، بەڵام ئەوەم بۆ گرنگ نییە. لەو نێوەدا شت زۆر ڕوویانداوە کە من نایانزانم. ئەوەی گرنگە تۆ بیزانیت ئەوەیە منیش

ئێستا ئەندامی ئەو جەماعەتەم، بە خۆشی بێت یان بە زۆر، من ئێستا لەگەڵ جەماعەتی دوژمنانی شەیتان ئیشدەکەم و وەزیفەی سەرەکیمان ئەوەیە کە هەر کەسێک ئیدیعای بینینی مەلەک و بوونی مەلەک بکات، بیکوژین، چونکە ئیدیعاکەی ئێوە کوفرێکە و لە پلەی شەیتان پەرستیدایە. هۆی ئەوەش کە من چیرۆکی خۆمم بۆ گێڕایتەوە ئەوەیە، من ئەو کەسەم ئەرکی ئەوەم پێسپێردراوە، دکتۆر مستەفا شوکاک، پزیشکی سەرەکی کەشتیی شەیتانەکان، یەکێک لە گەورەترین مەلەکبینەکانی شار، بکوژم ... ئەوە هۆی سەرەکی هاتنی منە بۆ لای تۆ».

ساتێکی ناخۆش و سەخت بوو. دکتۆر شوکاک سەیری چاوانی ماکوانی کرد و هەستیکرد، ئەم گەنجەی بەرامبەری دانیشتووە، ئێستا بێ هیچ شتێک دەتوانێت بیکوژێت، هەستیکرد بە جۆرێکی بێمانا کەوتۆتە چاڵێکەوە کە خۆی بۆ خۆی هەڵکەندووە. پێشتر شتەکانی بەوجۆرە نەبینیبوو، بەڵام لە چاوتروکانێکدا هەموو شتێک لە بەرچاوی گۆڕا، ئێستا دڵنیابوو چاوی ئەم کوڕە، دەستی، شێوەی ڕەفتاری، جۆری نیگاکردنی، هەموویان پێکڕا، ئاکاری پیاوکوژن. بێئەوەی بلەرزێت و بپاڕێتەوە و لە هۆش خۆی بچێت، بە زەردەخەنەیەکەوە کە خاڵی نەبوو لە بێباکی، گووتی «ئێ، ئەی چاوەڕوانی چی دەکەیت. بۆ ئیشی خۆت جێبەجێ ناکەیت. کوشتنی من کارێکی وەها قورس نییە، خۆ پلان و بیرکردنەوەی ناوێت». ماکوان بە هێمنییەوە پاڵیدایەوە و گووتی «ئەگەر پەلەم لێ نەکەیت دکتۆر، ئەگەر پەلەم لێ نەکەیت». وایگووت و سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و چاوانی لێکنا و وەک دۆعایەک بخوێنێت یان بیر لە شتێکی قووڵ بکاتەوە، بێدەنگ بوو.

## ئارەزووەکانمان، دەمامکەکانمان، زیندانەکانمان

لەم سەر ئەستێرەیە، هێندەی دەمامکەکان دەژین و دەبینرێن، ڕوخسارەکان ناژین. ئەوەشی وادەکات دەمامکەکانمان دیارنەبن، دەموچاومانە. ڕوخسار خۆی گەورەترین و ترسناکترین دەمامکە کە وادەکات دەمامکەکانی تر دەرنەکەون. خەڵکی تا ئێستا واتێگەیشتوون سەرەتا دەموچاو هەیە و دواتر دەمامکەکان دێن و دەنیشنە سەری، بەڵام لەوەدا بە هەڵەداچوون، سەرەتا دەمامک هەیە و دواتر دەموچاو دێت بۆ ئەوەی بیشارێتەوە. دەموچاو ئەو فێڵ و مانۆڕە ترسناکەیە کە دەمامکەکان دروستیانکردوە تا بەڕوونی دەرنەکەون، مەترسی هەرە گەورەش لەوەدایە کە دەمامک تەنیا پارچەی ڕاستەقینەی جەستەی مرۆڤە کە لادەبرێت و ئاسان دەگۆڕدرێت، بەڵام دەموچاو هەرگیز لانابرێت... ئەو شادەمامکەیە کە هەموو دەمامکەکانی لە ژێریدا خۆیان دەشارنەوە. دەموچاو هیچ نییە جگە لەو پەرژینە ئاسنین و ئەستوور و تاریکەی کە دەمامکەکانمان پێویستیانە بۆ ئەوەی بە ئاسانی و بێگرێ بتوانن بژین و بمێننەوە.

شتێک پێش ڕاپەڕین لە لیڤیتانتدا حورمەتم بۆ دادەنا، دەموچاوی بوو. دوای ڕاپەڕین لیڤیتانت بووە پیاوێکی فرە ڕوو، کەسێک کە چەندەها دەمامکی جیاوازی لەسەردا بوو، بەڵام بەو ڕوخسارە جیدی و بێخەندەیەی خۆی هەموویانی دەشاردەوە. هێندەی من پێشنیاری ئەوەم بۆ کرد، ببێت بە بەڕێوەبەری زیندان، پاش هەفتەیەک هات بۆ لام و ڕەزامەندی خۆی لەسەر کارەکە پیشاندا، نەک هەر ئەوە، بەڵکو لە جەنابی سەرۆکەوە بڕیارێکی نوسراوی لە گیرفاندا بوو کە لیڤیتانت هۆمەر بۆتانی دەکرێ بە

بەرپرسی هەموو زیندانەکانی هەرێم لە سنووری دەسەڵاتی حیزبدا، بەوەش سنووری بەرپرسیارێتی و ڕکێفی دەگەیشتە هەندێ جێگا کە من دەستم پێیاندا ڕانەدەگەیشت. لیڤیتانت لەوە وریاتربوو خۆی بخاتە فەلەکی منەوە، یان بهێڵێت وەک منەتباری من دەربکەوێت، ئەو دووربینترین کەسێک بوو دیبێتم، لەو کەسانەبوو کە بەردەوام لە بیری پاشەڕۆژی دووردان و هەموو خەیاڵ و نائاسوودەگیان وابەستەی ئەو پلانانەیە کە لەمڕۆوە بۆ داهاتووی دادەڕێژن. ئەو شەوەی من لە ناو چراخانی کۆشکەکەی خۆیدا پێشنیارم بۆ کرد بگەڕێتەوە جیهانی زیندان و بچێتەوە سەر پیشە هەرە کۆنەکەی خۆی، لەو باوەڕەدابووم لیڤیتانت لەم سەردەمە تازەیەدا بۆ جێگایەکی نوێ بگەڕێت و پتر لە خوێن و دڵ، عەقڵ بڕیاری بۆ بدات و هەوڵبدات ڕابوردووی خۆی بسڕێتەوە. کەوا دەڵێم ئەو دەمیش دوودڵ و گوماندار بووم لیڤیتانت بتوانێت لە جۆرە خرۆشی وەها ڕزگاری بێت. هەر ئەو دەمیش دەمزانی کە حوکمی غەریزە و خوێن لە ناو ئەودا لە هەر شت بەهێزترن. کە هات بۆ لام، وەک سەردەمی جاران، دەستێک جلی کوردی ڕەشی پۆشیبوو، هەندێک تکە عارەقی ورد و برۆنزی لەسەر ناوچاوانی بوو، وەک شەوانێک لە ئێران، کاتێک لە ژوورەکەمدا پشتم بۆ دەکردەوە تا بمکوتێ و ئەشکەنجەم بدات، ئێستا هەم دوودڵی و هەم ماندووبوونێکی لەو جۆرە لەسەر ڕوخساری بوو. گووتی «جەنابی عەقید، من دوێنێ لای سەرۆک بووم، خۆت دەزانی هەموو ئەم ئیشانە سەرۆک خۆی بڕیاریان لەسەر دەدات. جگە لە جەنابیان کەس دەسەڵاتی وەهای لە حیزبدا نییە. من ئێستا بەرپرسم لە هەموو زیندانەکانی نیشتمان، ناونیشانی وەزیفەکەم ئەوەیە ـ موفەتیشی باڵای هەموو زیندانەکان ـ».

ئەوە سەرەتای تێکچوونی پەیوەندییەکانی من و لیڤیتانت بوو، من توڕەبووم لەوەی لیڤیتانت ویستبووی بەوجۆرە بە دەوری مندا پێچبکاتەوە و لە جێگایەکی باڵاترەوە فەرمان بۆ من بهێنێت و شوێنێک بگرێت من لە بەردەمیدا بچوک و دەستەوەستان دیاربم. نەدەکرا مەقامی تازەم لەسەر عەرشی ئاسایش بە شەرم و تەنگییەکی وەها دەست پێبکەم. سەرۆک خۆی مەبەستی بوو بەوجورە بماندات بە یەکدا و بمانکاتە نەیاری یەک و

متمانەمان لە نێواندا نەهێڵێت. هەرچی لیڤیتانتیش بوو باکی بە هیچ نەبوو، بۆ ئەوەی پلەیەک لە من بەهێزتربێت، ئامادەبوو هەموو ملێک بشکێنێت. من بۆ ئەوەی جەنگ و جەدەلم لەگەڵ لیڤیتانتدا قورس نەبێت و ڕەچاوی هەلومەرجم بکات، بە ڕوونی و وەک هاوڕێ، بە لیڤیتانتم گووت «جەنابی ڕەشمارای ئازیز. لە بەینی پیاواندا قسەی پیاوانە خۆشە. ئەم بڕیارەی تۆ بۆ منت هێناوە کارێکی بەو پێشنیارەوە نییە کە من لەو شەوە دڵڕفێنەی کۆشکی خۆتاندا بۆ ئێوەم بەیانکرد، من ویستم تۆ بەرپرسی زیندانێک بیت، بەڵام لەم وڵاتەدا پۆستێک نییە ناوی لێپرسراوی هەموو زیندانەکان بێت، موفەتیشی باڵای زیندانەکان... ئەوە خەیاڵپڵاوی پیاوی نەزانە و تۆش خوا نەیبڕێت کەسێکی بە ئیدراکی. ئەم وەزیفەیە یەکێکە لەو وەزیفە خەیاڵیانەی تەنیا لەسەری جەنابی سەرۆکدا بوونی هەیە. ئەوە ئەو شتەیە کە من زۆر لێیدەترسم، تۆ دەزانی جەنابی سەرۆک پیاوێکی خەیاڵاتییە، کۆمەڵێک پلە و مەقام و وەزیفەی لە مێشکدایە کە جگە لەوەی بەرهەمی فەنتازیا و خەیاڵی خۆین، لەم کوردستانی من و تۆیەدا بوونیان نییە. لە ئێستاوە هەناسەم گیراوە و نەفەسم توند بووە، حاڵمان بە کوێ دەگات و کارمان لە کوێ تەواو دەبێت گەر جەنابیان بەردەوام وەزیفە و مەقامێک ببەخشنە خەڵک کە بوونی ڕاستەقینەیان نییە و ئاسانیش دروست نابن، دەترسم پاش ماوەیەک چواردەورمان پڕببێت لە حاکم و وەزیر و قایمقام بەسەر شار و هەرێم و شارۆچکەگەلێکەوە کە لەسەر نەخشەی ئەم ئەرزە بوونیان نییە، لەشکرێک لە حوکمدار و مەنسەبدارمان بۆ دروست بێت کە جگە لەوەی حاکمی سەر عەرشی خەیاڵاتی خۆیانن، حاکمی هیچ پۆستێکی ڕاستەقینە نین و هەر پارەی مفت دەخۆن. لیڤیتانتی برام، تۆ لە زمانی وەفای کۆنە دۆستی خۆتەوە وەریبگرە، لێرە هیچ کەس ناتوانێت ببێت بە موفەتیشی گشتی تەواوی زیندانەکان. سەرۆک دەیەوێت بە کوشتنت بدات یان چی؟ لێرە هەر زیندانە و هی کەسێکە، یان هی منە یان هی تۆیە یاخود هی بەرپرسێکی دیکە و حیزبێکی دیکەیە، ئەوەی دەستوەردات و لووت بهاوێژێتە کاروباری ئەوانەوە، بە قەبری مردووی هەردووکمان، سوێندت بۆ دەخۆم و جگە لە

نیازی پاک هیچی تر لە دڵمدا نییە. کەسی وەها کاری بە خۆشی و ئیشی ڕەوان مەیسەر نابێت. لەوەش بگوزەرێین، منیش گەرچی دۆست و هاوڕێی نزیکی خۆتم، بەڵام هەموو شتێک عورف و ئسوڵی خۆی هەیە. هەر زیندانییەک لای من زیندان بێت، دیلی دەزگای ئاسایشی گشتی بێت، من بەرپرسی سەرەکیم بەرامبەری، لێرەوە تۆ گەر بەرپرسی ئەو زیندانانەی مانای لە ژێر ڕکێفی مندایت و هەر کارێک کە دەیکەیت بێ پرسی من ناچێتە ڕێگاوە. من لێرەدا دەتوانم تەنیا ڕۆڵی چاوەدێرێک بدەم بە تۆ کە بۆت هەیە چ کاتێک ویستت بێیت و زیندانەکان بەسەر بکەیتەوە و ڕاپۆرتێک ڕەوانەی بەرپرسە باڵاکانی خۆت بکەیت، لەوە بترازێت تەواوی کارەکانی تری ئەم دەزگایە لای منە. بۆ ئەم مەسەلەیە دەبێت سنووری دەسەڵات و وەزیفەکانت لەگەڵ سەرۆکدا ڕوونبکەیتەوە».

دوای یەکەمین هەوڵی کوشتنی لە سەرەتای دەستپێکردنەوەی شۆڕشدا، ئەوە دووەمجار بوو لیڤیتانت ببینێت من دەتوانم زۆر شەڕانگێز بم. لیڤیتانت دڵنیابوو گەر بگەڕێتەوە بۆ لای سەرۆک، تووشی ئیشێکی پێچداری سەد سەر و سەد دامانی دەبێت کە هەر زوو لە توێ تاریکەکانیدا ڕێگای لێدەشێوێت و ونەبێت، دواجار دەکەوێتە شوێنێکیشەوە ئیدی خۆشی نازانێت لە کوێدا وەستاوە و دۆست و نەیاری کێن. دەبێت بڵێم هەر ئەوەش نیازی سەرۆک بوو، هەموو ونبین و لای ئەو خۆمان بدۆزینەوە، هەموو بکەوین و ئەو دەستبداتە دەستمان هەڵمانبسێنێتەوە. ئەوە جۆرێک بوو لە شەرانگێزی نوێ کە دوای ڕاپەڕین لە جەنابیاندا تەواو تۆخبووبووەوە. سەرەتا بەردەوام قسەی لەسەر یەک ڕیزی حیزب دەکرد، ئێستا خواستێکی منداڵانە و شەڕانی تێدابوو، هەمووومان بدات بە شەڕ و دابنیشێت لە دوورەوە پێبکەنێت. خودا لە گوناهی خۆش بێت، لەزەتێکی منداڵانەی لەوەدا دەبینی هەموو هاوڕێیەتییەکی نزیک تێکبشکێنێت و لە شوێنیدا گومان و دوودڵی بڕوێنێت. ئەوە ترۆپکی ئاواتی بوو، هەموومان لە هەزارپێچێکی بێ دەر و دەربازدا گێژبین و نەزانین لە کوێوە هاتووین و بۆ کوێ دەچین. هەموو

ئەو کارەشی بۆ ئەوەبوو دواجار خۆی ئاشتمانبکاتەوە و ڕێکمانبخات و دەستی باوکانەی بهێنێت بەسەرماندا و بڵێت «گەر من نەبم، ئێوە ئیدارەی جووتە گوونەکەی خۆشتان بۆ ناکرێت». من ئەو ڕۆژە بۆ ئەوەی کینە و دوژمنایەتییەکی کوشندەی ڕەشمارا لەخۆم لادەم، دەستم خستە سەر شانی و وەک دۆستێکی غەمخۆر کە چاکەی ئەوم دەوێت، پێمگووت «ڕەشمارا، گوێبگرە لێم. یەکێک هەیە دەیەوێت من و تۆ بکاتە دوژمنی یەک، من دۆستی تۆم. با نەبینە نەیار و خەندەک لە یەکتر نەگرین. بڕۆ زیندانێکی گەورە بۆ خۆت دروستبکە، ئەو پۆستەی خۆت وەها تەفسیربکە کە بۆت هەیە زیندانێکی مەرکەزی دروستبکەیت و ببیت بە پادشاهی ئەوێ. لەم وڵاتەدا دیل وەک خەزنە وایە، گەنجینەیەکی نهێنی پڕ زێڕە، کەس ناتوانێت لە خۆیەوە بێت و بە دیلی من بڵێت ئەمە دیلی تۆ نییە و دیلی منە. کاری واناکرێت، خۆ خۆت لەم وڵات و مەملەکەتەدا ژیاویت. نا عەزیزم، دیلی من یەعنی دیلی من، ئەوە قسەی تێدا نییە. دیل تەنیا کەسێکی تاوانبار نییە کە گوناهێکی کردوە، دیل گەنجینەیەکی گەورەیە کە دەشێت بنەماڵەیەک یان خانەوادەیەکی گەورە لە بەروبومی بخۆن. هەموو کەس دەیەوێت دیلی خۆی هەبێت... دوور نییە زیندانییەک زێڕ و سامانی دونیات بۆ بهێنێت، تۆ لە من باشتر دەزانی دەڵێم چی... ئەوە پیشەی دێرینی خۆتە. تۆ بە گرتن و بەردانی زیندانەکان لە سەردەمی دەوڵەتدا سامانێکت پێکەوە ناوە. خەڵکی تریش هەن دەیانەوێت وابکەن. دیل لێرە هیچ نییە جگە لە بارمتەیەک، بارمتەیەکی سیاسی یان بارمتەیەک بۆ ئەوەی بە جۆرێک لە جۆرەکان بەکارییبهێنن... تۆ دەتوانیت زیندانی خۆت هەبێت، زیندانی ڕەشمارا. بیکەیت بە ترسناکترین و تۆقێنەرترین زیندانی وڵات. پسپۆڕ و جەلادی لە دەرەوە بۆ بهێنیت. من ئەوە ناکەم، من پیاوی ئاسایشم، من شتی ترم لا گرنگە، دەمەوێت بناغەی دەوڵەت دابمەزرێنم. تۆ بڕۆ بەسەرۆک بڵێ ـ من زیندانی گەورەی ڕەشمارا دادەنێم ـ. زیندانی خۆت. دڵنیام ئێستا هەر چییەک بڵێیت ڕەتی ناکاتەوە».

لە ڕاستیدا حەزمدەکرد من و ڕەشمارا پێکەوە کاربکەین، دەمویست مێژوو خۆی بە جۆرێکی تازە دووبارەبکاتەوە، بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی پسمامان و پێکەوە زیندانێکی هاوبەشی خۆمان هەبێت، بەڵام لە زەمانێکی تردا، لە ژینگەیەکی تر و بە کەرەستەی مۆدێرنتر. من حەزم لەو زیندانە بوو تا هەستبکەم ژیان زۆر دوور تورِی نەداوم، هێشتا لە سەرچاوە سادە و سەرەتاییەکانی شۆڕش دانەبڕاوم، هێشتا لە ناو سوڕی بازنەیەکی ئەبەدیدا دەسوڕێمەوە کە هەمیشە دەمباتەوە هەمان خاڵ، بەڵام لە ئاستێکی باڵاتر و کامڵتردا... ئەوە ئومێدی گەورەم بوو. ئومێدێک جێبەجێکردنی ئەستەم و نەکردە بوو. ئێستا بۆ ئەوەی بتوانم ئیشی خۆم بە دوور لە چاودێری و دەستێوەردانی ئەو بە هێمنی ببەمەڕێوە، ڕێنمایمکرد بڕوات و دەزگایەکی تر دابمەزرێنێت و لە جێگایەکی دیکەوە ئیمارەتێکی سەربەخۆ و چکۆلە بۆ خۆی دروستبکات. زۆر درەنگ تێگەیشتم چ هەڵەیەکی کوشندە و چ ڕێچکەیەکی دۆزەخیم بۆ شکاندوە. هێندەی نەبرد بەیانییەک لە ڕۆژنامەی مەرکەزیی حیزبدا خوێندمەوە کە هەڤاڵی تێکۆشەر هۆمەر بۆتانی کراوەتە بەرپرسی دەزگایەکی نوێ بە ناونیشانی «دەزگای لێپرسینەوەی تایبەت» و ئەو دامەزراوە گرنگ و نوێیە، بەرپرسی هەندێک دۆسییە دەبێت کە ڕاستەوخۆ لەلایەن بیرۆی سیاسی حیزب و ئەنجومەنی باڵاوە دەخرێنە بەردەمی. ئەوە سەرەتای دامەزراندنی ناوکەی ئەو دەزگا شاردراوە و تاریک و بەهێزە بوو کە دواتر لە بورجەوە حوکمیدەکرد و ئێمە و هەموو دونیای وەک پەراوێزی خۆی دەبینی... بەڵام تا گەیشتە ئەو پلە و پایەیە ساڵگەلێکی زۆری ویست.

ئەو ڕۆژە لیڤیتانتم بەڕێکرد و تا نزیکی ماشێنەکەی یاوەری بووم، لە خوداحافیزیدا ئەو دەموچاوەیم بینی، دەموچاوی کەسێک کە بیر لەوە دەکاتەوە من لە بیست ساڵی داهاتوودا دەبێت لە کوێ بم. نە خۆی وەک دۆستم پیشاندا و نەوەک دوژمن. گەرچی من زۆر جار ژیانیم ڕزگارکردبوو، بەڵام پێدەچوو لەگەڵ سەرەتای ئەم سەردەمە تازەیەدا، هەموو شتەکان بە جۆرێکی نوێ دەستیان پێکردبێتەوە و ئەوەی لە ڕابوردوودا ڕوویداوە

نرخێکی نەمابێت. نا من دەمزانی لیڤیتانت لە ئێستادا نابێتە دوژمن، بەڵام لە خەیاڵی دووری خۆیدا، لە پلانە درێژخایەنەکانیدا، وەک دۆست بیری لە من نەدەکردەوە. بۆ تێگەیشتن لە کەسانی وەک لیڤیتانت دەبوو بزانیت لە خەیاڵاتە دوورەکانیاندا چی وێنەیەکت بۆ دەکێشن ... کە لە بەر ماشێنەکەدا دەستی دایە دەستم، بە ساردی سەر پەنجەکانیدا تێگەیشتم کە هیچ کات نابێت متمانە بەم پیاوە بکەم. هەر ئەو ڕۆژە لە ئەرشیفی ئەرخەوانیدا، فایلێکی تایبەتیم بۆ کردەوە، کە دواتر بووە یەکێک لە کەرەستە گرنگەکانم، لە فایلەکەدا ئەو بەڵگەنامانەی تێدا بوو کە کاتی خۆی چۆتە ڕیزی فاشیستەکانەوە، وێنەی ئەو سەردەمە کە گرتوویەتی، هەندێک لەو ڕاپۆرتانەی کە بۆ دەوڵەت بەرزیکردونەتەوە و خەڵکانێکی بە گرتداوە و کەسانێکی تا بەر پەتی سێدارە بردوە، دواجاریش وێنەکانی لە پسمامان دەمێک نزار بە زینداندا دەگێڕێت... هەڵبەت دروستکردنی فایلەکە هەم گەڕانێکی زۆری ویست، هەم ماوەیەکی زۆریشی برد، بەڵام گرنگ ئەوە بوو دواجار فایلێکی دەوڵەمەندم دەربارەی لیڤیتانت لەبەردەستدا بوو، کە زۆر نهێنیی گرنگی تێدابوو.

لیڤیتانت هێدی هێدی کەوتە ژیانە نوێ و ئاڵۆزەکەی خۆیەوە. ژیانێک بە پێچ و لۆچێکی زۆرەوە. ژیانێک تێیدا جەلادە، بازرگانە، پیاوی ئەتەکێت و ئاهەنگە، دۆستی سەر مێزە، هاوڕێی خانەوادەگی سەرۆکە، دوژمنی هەتاهەتایی کتێبە، ڕاوچییەکی تەنهایە، قومارچییەکی غەمگینە، بیناسازێکی پڕخەونە، مێردی دڵسۆز و ئەبەدی خانمی ماردینیە، بەڕێوەبەری کۆمپانیایە، پارەگێڕی بنەماڵەی ئەندامە بەرزەکانی حیزبە، ئەندازیاری گۆڕینی هەموو شارەکەیە بۆ کرێکار، دروستکەری بورجە، دزی هەرە گەورەی هەموو نامەکانی دڵدارییە لە سەر زەوی. بەڵام لە پاڵ هەموو ئەم شتانەشدا ئەوەی لیڤیتانت هیچ کات لە یادی نەچووەوە دوژمنایەتی نزار ئیدریسە... ئەو جیا لە هەموو ئەو شتانە و زیاد لە هەر شت دوژمنی ئەبەدی و کوشندە و سەرسەختی نزار ئیدریسە.



دوای هەڵبژاردن ئەگەرچی وڵات چەند جارێک لە لێواری جەنگی خوێنین نزیکبووەوە، ئەگەرچی هەتا باڵە ئاشتیخوازەکەی حیزبیش کەوتبوونە سەمای جەنگ، بەڵام بە هەر هۆیەکەوە بێت جەنگ بەردەوام دوادەخرا. شێرخان یەکێک بوو لەوانەی بە جۆرێکی سەیر فووی بە شەیپوری شەڕدا دەکرد، ئەو رقێکی دێرین و گەورەی بەرامبەر دوژمنانی حیزب هەبوو، ئاشکرا لە هەندێک ناوچەدا کە دەسەڵاتی ئەوان لاوازتر بوو، بۆماڵی بەرپرس و لایەنگرە ناسراوەکانیان، ناوە ناوە پشیلەی سەربڕدراوی لە کیسەی سپیدا دەکردە دیاری و بەدەستی کەسانی نزیک لە ئەڵقە و بازنەی خۆی، فڕێیدەدایە حەوشەکانیان ... پشیلە و تەنیا پشیلە... بۆ ئەوەی هەموو کەس بزانێت کێ لە پشت ئەو کارەیە و سەری بڕدراوی گیاندارە بەستەزمانەکان لە سندوقی کێدا ماونەتەوە. ساڵانێک دواتریش لە فیلمێکی کورتدا کە نەیارانی حیزب ماوەیەک لە یوتوپ دایاننا، شێرخان خۆی باس لەوە دەکات پلاستیکی سپی بۆ پێچانەوەی لاشە لە هەر شتێک باشترە، چونکە دڵۆپی خوێن لەسەر رووپەکی ساف و بەفرین ترسناکتر و کاریگەرتر دەردەکەوێت. من لەوماوەیەدا چەند جارێک سەردانی شێرخانم کرد، تاکە ئومێدم بۆ هەڵگیرساندنی شەڕێکی گەورە کە تێیدا حیزبی ئێمە بتوانێت هەموو دەسەڵاتە سێبەر و درۆزن و ئیفلیجکارەکان لابدات تەنیا ئەو بوو. من و ئەو تاکە دوو کەس بووین هەواداری بە کوڵی شەڕێکی سەرتاسەری و یەکجارەبووین، وەک ئەو شەڕانەی تێیدا بەعسییەکانمان لە شاردا وەدەرنا. لەو باوەڕەدابووم هەموو دەسەڵاتە بچوکەکان، هەموو حیزبەکانی تر، هیچ نین جگە لەو درزە گەورانەی دەکەونە سەقفێکی سفتەوە و وادەکەن لە هەر ئان و ساتێکدا بنمیچەکان بڕوخێن و ببین بە ژێر داروپەردووی مێژووەوە. حیزب دەبوو یەکجار هەموو شتەکان بە گورزێکی قارەمانانە چارەسەربکات و خۆی وەک تەنیا هێزێکی دروستکەر بۆ دونیای نوێ بهاوێتە مەیدان. هەموو ئەم

هێزانە وەک ئەو گژوگیا تەرزدارانە بوون کە لە ڕاکردندا دەشێت لە دەست و پێی پڵنگێکی بە هەڵمەت بئاڵێن، کاتێک لە چڕ و زەبەندی پێدەشتێکی کێویدا بەرەو نێچیر ڕادەکات. شێرخان وەک من بیریدەکردەوە، دەسەڵات لای ئەو یان دەسەڵاتێکی ڕەها بوو کە هیچ کات لەوە ناکەوێت بەسەر هەموو جێگا و هەرێم و ڕۆح و گیاندارێکدا حاکم بێت یان دەسەڵات نییە. بەڵام هەر ئەو هۆیەی وایدەکرد لە یەکدی نزیکبین، هەمان هۆش لە یەکدی دوور دەخستینەوە. شێرخان وەک چۆن لە سەردەمی شۆڕشدا ستایشکاری هەموو توندوتیژییەک بوو دژی خودا و سروشت و دوژمن، لە هەموو جێگایەکدا دەیویست حاکمی هەموو شتەکان بێت، لە حاکمی ناوگەڵی ژنەکانەوە تا حاکمی سەر خەون و خەیاڵاتی ئینسانەکان، ئێستاش لەوانەبوو نەیدەویست هێزێک لە نیشتماندا مابێت گورزی دەست و دەسەڵاتمان نەچێژێت ... دەبوو هەموو هێزێک، هەموو ئادەمیزادێک، هەموو مێروویەک بزانێت کە کێ بەهێزترین هێزی ئەم سەر زەمینەیە. من هەمان شەیدایی و تێگەیشتنم بۆ دەسەڵات لە ناخدا سەوزبووبوو، بەڵام من عاشقی خوێن نەبووم، عاشقی ئەوە نەبووم مرۆڤەکان بە زامداری و برینداری ببینم، عاشقی ئەوە نەبووم دەسەڵات ئینسانەکان زەلیلبکات، بەپێچەوانەوە من لە توخمێکی تربووم، من دەمویست شانازی ببەخشم، شەڕم بۆ ئەوە نەبوو لەزەت لە ئەشکەنجە ببینم، بەڵکو بۆ ئەوە بوو ڕۆحێکی ترساو لە تەپوتۆزی مێژوویەکی تاریک بتەکێنم... بۆ ئەوەش سڵم لە توندوتیژی نەدەکردەوە. دەبوو ئەو پڵنگەی لە خەو هەستاوە نەنوێت، هیچ شتێک نەیبەستێتەوە. من دەمویست چ گیانی خۆم، چ گیانی ئیفلیجی ئەم وڵاتە تەکاندەم، بەبێ جەنگێکی گەورەش تەکانی وا ئەستەم بوو. دەمویست لەشی ئەم سەردەمە لە هەموو قەوزە و لیخ و گیامردەیەک بتەکێنم. من دەمویست ئەوەبکەم، من ... بیرتان نەچێت ئەو منە لەوێکانەدا نرخێکی باڵای هەبوو. منێک گەر نەتوانێت بکوژێت، نەترسێت، بە تونێلی خوێندا نەڕوات، تا بنی بنەوە بە نوتەکی مێژوودا ڕۆنەچێت، ناتوانێت بەسەر ترسە گەورەکانی خۆیدا زاڵ بێت. لەو سەردەمەدا لە یاداشتەکانمدا دووبارە نوسیومەتەوە کە جگە لە سەرکەوتن

بەسەر ترسێکی خەوتوو و بێقەرار و قووڵدا کە لە منداڵییەوە هاوڕێم بووە، نیازێکی ترم نییە ... من پیاوێک بووم بەردەوام لە ترسی خۆم هەڵدەهاتم، ئەو ترسەشم بە درێژکراوەی ترسێکی تر دەزانی کە لە ڕۆحی هەموو کوردێکدا نوستووە. دەمێک بەوپەڕی دڕندەیی دەمکێشا بەدەرگاکانی ترسی خۆمدا، هەمان کات لە قاپییە تاریک و ئەستوورەکانی ئەو ترسەم دەدا کە لە دڵی هەمووماندا نوستووە. هەرجارێکیش دەستەکانی من لە کاتی کوتاندا نەلەرزیبن وامزانیوە ئەوە دەستی هەمووتانە کە ناڵەرزێت ... شێرخان دڕندەبوو، بەڵام من ئاواتم هەبوو... زۆرجار لە مێژووشدا ڕێدەکەوێت ئەو کەسانەی خەونیان هەیە، وەک ئەوانە ڕەفتاردەکەن کە تەنیا خوێنمژ و وێرانکاری ڕووتن، ئەوەش ستەمێکە زۆرجار مێژوو لە خەڵکی خاوەن خەونی دەکات، کاتێک لە ڕیزی خوێنمژ و ستەمکاراندا ڕیزیاندەکات. هەر یەک لە من و شێرخان عاشقی شەڕ و تەکاندانی دونیا بووین، ئەو بۆ ئەوەی تا دەتوانێت چارەنوسی ئینسانەکان بخاتە ژێر دەستی خۆی، من بۆ ئەوەی لە ژێر دەنگی تەقینەوە و خومپارە و موشەک هاوێژەکاندا دونیا خەونێکی گەورە ببینێت. من دەمزانی لە پێناوی چیدا فریشتەکەمم کوشتوە، ئەوان نەیاندەزانی... گەر قووڵیش بیری لێبکەنەوە ئەوە جیاوازی هەرە گەورەی نێوان مرۆڤ و شەیتانە.

شێرخان منی وەک ترسنۆکێک دەبینی، کە زۆر لەخۆم دەکەم نەترسم و لەو ڕێگایەشدا ئامادەم کاری ترسناک ئەنجامبدەم. وەک کەسێک بە فیترەت زیرەک نەبێت و بیەوێت بە زۆر و لە ڕێگای کۆششی بێوچانەوە زیرەک دەربکەوێت. ئەو قێزی لە هەر شتێک بوو ڕاستەوخۆ لە سروشتی مرۆڤەوە هەڵنەقوڵێت، حەزیشی لە وێرانی لەوەوە هاتبوو ڕاستەوخۆ بە بەرهەمی سروشتی خۆی دەزانی. هەوڵەکانی من بۆ ئەوەی پێکەوە هاوکاربین بە جۆرێکی کۆمیدی هەرەسیهێنا، ئەو تاکە شەڕخوازی ڕاستەقینە بوو لە سەردەمێکدا، هەموو کەم تا زۆر ژەهری ئاشتی ئیفلیجیکردبوون. بەڵام کە گوێی لەو تەفسیرە دووروودرێژانەی من دەبوو دەربارەی فەلسەفەی ئەو جەنگەی کە دەبێت ڕووبدات، خەوی دەهات و لە

شوێنی خۆی لەشی خاوەدەبووەوە. دواجار ئەویش وەک زەندیان نائومێدیکردم، ڕۆژێک بەدەم باوێشک و لەگەڵ نیگای وەڕزیی و قێزدا، پێیگووتم «بڕۆ و بەکاری حیزبی نەبێت مەیەرەوە بۆ لام ... شەڕ شەڕە، دوژمنەکەت دەگریت و سوار خوشک و دایکی دەبیت، ئەم قسە قۆرانە چییە». ئەو نەیدەزانی من دەڵێم چی. جەنگی بۆ تێرکردنی شتێکی نهێنی دەویست لە خۆیدا، نەوەک وەک بابەتێک بیر لە مانا گەورە و مەزن و گرنگەکانی بکاتەوە... وەک زۆربەی ئەندامەکانی تری حیزب لەوە کەوتبوو بیر لە مێژوو بکاتەوە، سەیری لەو سەرە گەرم و دۆنکیشۆتییەی من دەهات، کە بە خرۆشێکی وا شێتانەوە بە دوای گۆرەپانێکی پڕ کوشتار و لاشەدا دەگەڕا. لە ناکاو ڕۆحی حیزب، ڕۆحی مرۆڤە سادەکانی ئێمە، ڕۆحی هەموومان پێکڕا نوقمی ئەو ساتەوەختە بووبوو کە تیا دەژیاین... لە ناکاو هەموو بووین بە دیلی جێگا و کاتێکی دابڕاو لە هەر ئاسۆیەک. شارەکان نوقمبوون لە خۆیاندا، گوندەکان نوقمبوون لە خۆیاندا، خێڵەکان نوقمبوونەوە لە خۆیاندا، پیاوەکان نوقمبوون و ژنەکانیش، هەموو شتێک و هەموو کەسێک لە ساتی خۆیدا خنکا، بە جۆرێک ئیتر هەستم نەدەکرد هیچ پەیوەندییەک لە نێوان شتەکان و شتەکان، مرۆڤەکان و مرۆڤەکاندا مابێت. من تاکە کەسێک بووم کە تووشی دەردی بیرکردنەوە لە مێژوو ببووبووم، ئەوانی تر خەیاڵیان تەنیا لای ئەوەبوو دونیا برسێتییە نهێنییەکەیان تێربکات. لەوێوە پەیوەندی من و شێرخان بووە پەیوەندییەکی شەڕانگێزانە، من وەک پشیلەیەکی سەربڕاوم لێهات کە لاشەکەم زیندووە و دەمەوێت هەر بۆم کرا چنگێک لە دەموچاوی ئەو پیاوەبدەم کە هەستمدەکرد سەری من درەنگ و زوو وا لە یەکێک لە تورەکەکانیدا.

* * * * * *

لیڤیتانت و بڕێکی زۆری ئەندامانی بیرۆی سیاسی و ئەنجومەنی باڵا، لە نێوان هەڵبژاردن و سەرهەڵدانی شەڕی ناوخۆدا، ڕۆژانە چەند سەعاتێک لای باهیری دەیانخوێند. باهیری فێریدەکردن چۆن لە هەر شوێنە و ڕوخسارێکیان هەبێت، لە ڕوخساری پێشوویان نەچێت. سەیربوو کە زانیم دکتۆر زەندیان و ژنەکەشی چوونەتە کۆرسەکانی باهیرییەوە، لە ماوەیەکی کورتدا، من کاریگەری وانەکانی ئەوم لەسەر شێوەی خۆگۆڕین و قسەکردنی دکتۆریشدا بینی کە لەو بەینەدا دەزگایەکی دانابوو بە ناونیشانی «بنکەی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی بۆ توێژینەوەی سیاسی لە تەواوی ڕۆژهەلاتی ناوەندا».

لیڤیتانت لە ماوەیەکی کورتدا زیندانی دێرینی شاری تەعمیرکرد و لە دەستی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی دەرهێنا و خستییە سەر دەزگایەک بە ناونیشانی «مودیرییەتی زیندانە تایبەتەکان» کە هەر خۆی بە سەربەخۆ دایمەزراند، هاوشان بەوەش لە دەرەوەی شار، لە سەر داروپەردووی گەورەترین سەربازگەی لەشکری بەعس، کەوتە ئاوەدانکردنەوەی زیندانێکی گەورەتر. من هەر زوو چەند چاوێکی خۆم لە دەوروبەری لیڤیتانت چاند و کەوتمە کۆکردنەوەی زانیاری ورد لەسەری، نەبا ڕۆژێک بچمە جەنگی گەورەوە و هیچ چەکێکی قورسم بەرامبەری پێ نەبێت. بەیانیان زوو هەڵدەستا و بەرچاییەکی شاهانەی لەگەڵ خانمی ماردینیدا دەخوارد کە پڕبوو لە شیری مەڕ، پەنیری سوێر، قەیماغی گامێش، کەرەی کوردی و هێلکەی مریشکی خۆماڵی... لەدوای ڕاپەڕینەوە، هەردووکیان سوور بوون بەیانیان پێکەوە بەرچاییبکەن. خانمی ماردینی لەو سەردەمەوە ئیتر هێدی هێدی لە خەڵوەتی درێژی ماڵ هاتەدەر و نیشانیدا ئارەزوویەکی قووڵی تێدایە وەک شاعیر بەردەوام بێت و بناسرێت. هیچ کات دەستبەرداری روخساری ژنێکی یاخی نەبوو، بەڵام تا دەهات شێوازی یاخیبوونەکەی لە هەموو ناوەڕۆکێکی قووڵ خاڵیدەبووەوە. بۆ ئەو ئێستا شتێک بایەخداربێت ئەوە بوو، وەک شاعیر بژی و وەک ئەرستۆکراتیترین خانمی شاریش دەربکەوێت. لەو کاتەوەی فریشتەکەی مردبوو توانای

نەبوو سەرکێشی خۆی بگێڕێتەوە بۆ سروشتە ژنانەکەی. ئێستا ژنێکی خۆویست بوو، کە هەستیدەکرد هەر لە لەدایکبوونەوە بە مۆرک و ئاکاری شازادانەوە هاتۆتە دونیا. بە جۆرێکی توند و بە پێچەوانەی مێردەکەیەوە ڕابوردووی خۆی لە بیرکرد، وەها بوو وەک ئەوەی نە ڕۆژێک لە ڕۆژان باوکی هەبووبێت یان دایک، هەتا بە قێز و بێبایەخیشەوە سەیری هەوڵەکانی نەوای تاکە خوشکی دەکرد بۆ نزیک بوونەوە. گەر کەسێک ناوی دایکی یاخود دکتۆر جەلال ماردینی لابیردایە، بێئەوەی هیچ پەرچەکردارێک یان عاتیفەیەک ئاشکرابکات، خێرا بابەتەکەی دەگۆڕی. ئەوەشی کە لە یادی نەمابوو و نەیدەتوانی ڕوون ڕوخساری بهێنێتەوە پێشچاو، مستەفا شوکاکی بەدبەخت بوو، کە نە وەک مێردی کۆن، بەڵکو وەک تەپوتۆزێک لێیدەڕوانی کە گەردەلولی ژیان کردویتییە بار لەسەر یادەوەری ئەو. ئێستا تەنیا شێوەی یاخیبوونی بووبوو بەوەی ژیانی لە ژیانی هیچ ژنێکی تری ئەم شارە نەچێت. لە ناخیدا نیازی بوو، هەم لووتبەرزی خانمێکی ئەرستۆکرات و هەم غروری شاعیرێکی گەورە لە خۆیدا کۆبکاتەوە. ئێستا وەک جاران هەستی نەدەکرد بۆ ئەوەی یاخیبێت پێویستی بە پیاوێکە، دەیتوانی بێئەوەی سەرکێشی و ناوازەیی خۆی بە کەناڵی هیچ کەسێکی دیکەدا ببات، سەرکێش بێت. یاخیبوون لای ئەو، چیتر غەمێکی سیاسی یان جەستەیی نەبوو، بەڵکو جۆرێک بوو لە خۆجیاکردنەوەی ڕەها و پردپسێن لە نێوان خۆی و خەڵکی دیکەی ئەم شارەدا. کەم تا زۆر یاخیبوونی خۆی لە خواستە جەستەیی و سێکسییەکانی پاککردبووەوە، هەستیدەکرد ئیتر بۆ ئەوەی یاخیبێت پێویستی بەوە نییە خۆی ڕووتبکاتەوە، بەڵکو پێویستی بەوەیە لە کۆشکێکی شکۆداردا بژی کە ڕوناکی و بریقەی چراخانەکانی لەو وێرانە و خەرابستانەدا بێباکی و کەمتەرخەمییە قووڵەکەی بەرامبەر دونیا نیشانبدەنەوە. بە ئاشکرا لای ژنە هاوەڵەکانی گوتبووی کە چیدی پێویستی بەوە نییە دەرپێکەی دابکەنێت و بچێتە باوەشی نزار ئیدریسێکەوە تا بڵێ من بێباکم، ئیدی کۆشکەکەی، جلەکانی، نیگاکانی بەسبوون تا بتوانێت بێباکی خۆی بۆ خەڵک دەربخات و بە خەڵک بڵێت

من لە جنسی ئێوە نیم. هەر جارێک دەمبینی، بە پێچەوانەی جارانەوە کە چیرۆکە سێکسییەکانی تەزووی بە پیاوەتیماندا دەهێنا، وەک ژنێکی ساردی بێمەیل دەهاتە پێشچاوم کە لە پشت نیگا ساردەکانییەوە لەشێکی ساردیش هەیە کە هیچ وەخت پێخەفی پیاوێک گەرم ناکاتەوە. خانمی ماردینی لەو سەردەمەوە خۆیکرد بەو میرژنە تاقانەیەی پیاوان ناوێرن لێی نزیکبکەونەوە و ژنان پێکڕا ئیرەیی پێدەبەن. لەو زەمانەوە تا ئەمڕۆ بەردەوام لەو هێمنی و ئاسوودەگییەدا دەژی، بێئەوەی هیچ شتێک جگە لە بولبولیار بتوانێت غەمگینیبکات.

دەمێک لیڤیتانت بەیانیان دەچوو بۆ «زیندانی مەرکەزی کوردستان» کە ناوی فەرمی و تۆمارکراوی گرتووخانەکەی بوو، خانمی ماردینی لەو کاتەدا چ ئیشێک خۆی حەزی لێبایە دەیکرد. گوڵەکانی ئاودەدا، گوڵدانەکانی ڕێکدەخست، خواردنی دەدا بە ماسییە زێڕینەکانی ناو ئەکواریۆمەکەی، سپرای تایبەتی دەدا لە کاکتۆسەکان، دواتریش گوێی لە مۆسیقا دەگرت و شیعری دەنوسی و کتێبی دەخوێندەوە. بەڵام ڕوخساری خانم وەها هێمن و فریشتەیی نەبوو، ئەو ڕاپۆرتانەی دەگەیشتنە دەستی من باسیان لە دڵڕەقییەکی گەورەی ئەو لەگەڵ ژنە ئیشکەرەکاندا دەکرد، باسی ئەوەیان دەکرد خانم سەدان جووت پێڵاوی کڕیوە و ئیشکەرەکانی دەبێت هەموو ڕۆژێک پێڵاوەکانی یەک بە یەک بۆ پاکبکەنەوە، بە جۆرێک هەر کات ئەو دەرگای دۆڵابەکانی کردەوە، بریقە و باقیان ئاوی چاوان بەرێت. حەزی شتی گرانبەها چووبووە خوێنییەوە، من باوەڕم نەدەکرد ئەو ژنەی ڕۆژگارێک تاکە خانمی شۆڕشگێڕی وڵاتەکە بوو، شێتانە شیعری دەخوێندەوە، تاکە ژنێک بوو لە پەخشکردنی یەکەمین بەیاننامەکانی شۆڕشدا بەشدار بوو، ئێستا بەوجۆرە لە ناو شکۆی کۆشکێکی سارددا خۆی بخنکێنێت. هاوکارە سابڵاغییەکەیان کە پیاوێکی دەمشڕ بوو، هەفتانە لە تارانەوە باری تایبەتی بۆ لیڤیتانت و خانم ڕەوانەدەکرد و زوو زووش بۆ وەرگرتنی هەق و حسابی خۆی لە بەرماڵی لیڤیتانتدا دەردەکەوت، لە زۆر شوێن بە دەنگی بەرز دەیگووت «جگە لە خەرجکردن

هیچ شتێکی دیکە مەستیان ناکات، گرانترین هۆرتەیان کڕیوە و سەرجێگای ئاوریشمیان بۆ ژوورەکانیان سفارشداوە». خانم دەیویست لە جێگایەکدا بژی دیکۆرەکانی لە ئەفسانە و مەحاڵ نزیک بووبێتنەوە. تا وای لێهات خانم لە ناو جوانی ئاوریشم و بریسکەی جامی ستیل و باق و بریقی گوڵدانی زێڕین و ناسکی پەرداخی بلوورینیدا نەبایە شیعری بۆ نەدەنوسرا.

ئەو کاتانەی خانم خەریکی شیعر بوو، لیڤیتانت لە زیندان خەریکی ئەشکەنجە بوو. زیندانەکەی لیڤیتانت هەر زوو دەنگیدایەوە و ناو و ناوبانگێکی خراپی تۆمارکرد، چەند مانگێکی نەبرد خەڵک لە بری زیندانی مەرکەزی کوردستان ناویان نا زیندانی مەرکەزی کەڕووستان. کەسانێک دەچوونە ئەوێ و دەهاتنەدەرێ، زۆریان بە جۆرێکی نائاسایی لەشیان کەڕوو دەیگرت و بەپەڵەی جۆراوجۆر دادەپۆشرا، هەندێکیشیان دوای زیندان تا مردن بە گەڕیی دەژیان و دەردەکە تا گۆڕ لە کۆڵیان نەدەبووەوە. زیندانەکەی لیڤیتانت بۆ کەسانێک بوو کە نە لای دەزگای ئاسایش و نە لای پۆلیس گوناهبارنەبوون... بۆ ئەو کەسانە بوو کە دەکرا بێهۆیەکی تایبەتی بگیرێن و لە زیندان بمێننەوە. زۆربەی گیراوەکانی لیڤیتانت تۆمەتێکی دیاریکراویان لەسەر نەبوو، بەڵکو خودی زیندانەکە بۆ ئەو کەسانە بوو کە تاوانبار نین. لیڤیتانت حەزی لەوە نەبوو بەدوای گوناهباراندا بگەڕێت، بەدرێژایی ژیانی کە من ناسیومە بۆ گوناهبار نەگەڕاوە، هەمیشە ویستویەتی کەسێک بگرێت و بیخاتە ژێر ئەشکەنجەوە و بۆی بسەلمێنێت کە بوونەوەرێکی لاوازە. لای لیڤیتانت زیندانەکان مشکی لابۆربوون، تاقیکردنەوەیەکی سەختی هێز و لاوازیان لەسەر دەکرا. سروشتی سەرەکی سیستمی ئەشکەنجەدان لە زیندانی مەرکەزی بۆ ئەوە نەبوو وا لە گوناهبار بکات دان بە تاوانێکدا بنێت، بەڵکو بۆ ئەوە بوو جار دوای جار پتر هەست بە لاوازی و وابەستەیی و بێنرخی خۆی بکات. وەک دواتر یەکێ لە گیراوەکان لە ئەورووپاوە، لە چاوپێکەوتنێکدا گووتی جێگاکە پتر «کامپێک بوو بۆ ئەوەی بەهێز و لاوازەکانی دونیای نوێ لە

یەک جیابکاتەوە». لە پسمامانەوە بۆ کەرووستان لیڤیتانت بە هەمان ئەو سیستمە کاریدەکرد کە سەردەمێک وایکرد نزار ئیدریس بەرامبەری یاخی بێت. ئەوانەی دەگیران زۆر نەبوون، لیڤیتانت دەیزانی ناتوانێت وەک جاران جەڵەبی خەڵک بگرێت، دەبوو ورد و بێهەڵە قوربانییەکانی هەڵبژێرێت، شارەکە چەکدارێکی زۆری تێدابوو، خەڵک بە گشتی رووبان لە شەرانگێزی بوو، عەشرەتەکان روویان لە سەربەخۆبوون بوو، هەندێک خێڵ تفەنگچییەکانی خۆیان بە کوچە و کۆڵاناندا بڵاوکردبووەوە. لەبەرئەوە لیڤیتانت بە ئەندازەی پێویستییە دەرونییەکانی خۆی کاریدەکرد. تا ئەو جێگایەی من دەزانم نەیدەهێشت ژمارەی دیلەکانی لە ژمارەیەکی کەم بچنە سەرێ، هەندێ جار دیلەکان بە جۆرێک کەم بوون، مانایەکم لە هێشتنەوەی زیندانەکەدا نەدەبینی. بەڵام بۆ لیڤیتانت ئەو دیلانە نرخی تەڵایان بوو. تا چیتر خەڵکی نەدەگرت و بە پارە ئازادیانبکات، بەڵکو خەڵکی دەگرت و بە ئازادکردنیان شتێکی گرنگتر و گەورەتری دەستدەکەوت، شەراکەت، پێکەوەکارکردن، بروا، هێز، متمانە. ئێستا بە عەقڵی سەرمایەدارێکی نوێ زیندانەکەی دەبردبەرێوە، کەسێک کە ژێردەستەکانی هەم دەکاتە کاڵا و هەم تێکیاندەشکێنێت. دیلەکانی خۆی هەمیشە بە شتێکی گرنگتر دەگۆڕییەوە، لەبەرئەوە وەک جاڵجاڵۆکەیەک کە هەمیشە دەبێت بزانێت تەونی خۆی لە کوێدا دەچنێت، زیرەکانە نێچیرەکانی هەڵدەبژارد و دەیزانی بە چ بیانوویەک دەیانگرێت. ئێستا وەک ئەو پیاوەی جاران نەدەهاتە بەرچاوی کەس، لیڤیتانتی سەردەمی مەفرەزە تایبەتییەکان، پیاوی هاوکار لەگەڵ جەلادە عەرەبەکانی دەزگای ئاسایشی بەعسدا، ئەوە بە یەکجار و بۆ ئەبەد لە یادەوەری هەمووان‌دا بووبوو بە ژێرەوە. ئەو خۆشی هێدی هێدی بووبوو بەکەسێک هەموو دونیای وەک بازارێکی گەورە دەبینی، خەڵکیش وەک کەسێک حسابیان بۆ دەکرد کە پتر لە ناو کاسب و بازرگاناندا دەجوڵێت نەوەک لە ناو حیزبدا. هەموو قوربانییەکانی لیڤیتانت لە یەک توخم و رەگەز نەبوون، کەسانێکی دەگرت تەنیا بۆ ئەوەی لەزەت لە تێکشکاندیان ببینێت، کەسانێکیشی دەگرت بۆ ئەوەی بتوانێت بە شتی گرنگتر بیانگۆڕێتەوە... هەموو ئەو شتانەی هێندە

زیرەکانە دەکرد، هەمیشە سەرکەوتوو لە هەموو کارێک دەهاتەدەرێ. پیاوێکی بیروڕد و هەڵدۆزبوو، دەموچاوە جوان و قیافەتە نێرانە و ڕێکەکەی کۆمەکێکی زۆریان پێدەکرد بگاتە هەر شوێنێک بیەوێت، بێدەنگی و ویقارە تەماوییەکەی وایدەکرد کەمجار خەڵک ڕاستە و ڕاست وێنەی ئەو پیاوەی تێدا ببین کە لە ناخیدا ئەشکەنجەبازێک و ئەفیندارێکی ئازار هەیە، زیندانی مەرکەزیش لە ڕاگەیاندنی حیزبدا وەک شوێنێک پڕوپاگەندەی بۆ دەکرا کە فایلە زۆر مەترسیدار و گومان لێکراوە زۆر ترسناکەکانی لە خۆی گرتووە. ئەوە پشتی لیڤیتانتی بەهێزتر دەکرد و دەبووە مایەی ئەوەی هەر کارێک مەیلی دەخوازێت بیکات. ئەو چەند جارەی لیڤیتانت لە ڕۆژنامەی حیزبدا دەرکەوت و قسەیکرد، ئاشکرابوو کەسێکی زمانزان و وریا تەواوی ڕستەکانی بۆ داڕشتۆتەوە، سەیریش لەوەدا بوو دوای پشکنین و پرسیار بۆمدەرکەوت، ئەوەی وەڵامەکانی لیڤیتانت بۆ ڕۆژنامەکان دادەڕێژێتەوە، زیندانییەکی گەنجی زیندانی مەرکەزییە و هەر لە خودی زیندانەوە ئەو کارانە بۆ لیڤیتانت دەکات. سەردەمێکی سەیر بوو، من خەریکی دروستکردنی زیندانی تایبەتی خۆم بووم و لیڤیتانتیش خەریکی دروستکردنی زیندانی تایبەتی خۆی، نەوەک هەر ئێمە هەموو حیزبەکانی تریش خەریکی دروستکردنی زیندانی تایبەتی خۆیان بوون. هەموو بە نهێنی لە زیندانەکانماندا کارماندەکرد، هیچ زیندانێکیش لە زیندانەکان بە دادگایەک یان حاکمێکی مەدەنییەوە نەبەسترابوون. زیندان بوون، زیندانی تایبەتی ئێمە... زیندانێک وەک تاکە بەرجەستەکەری هەقی ئێمە لەسەر ژیان. لەو سەردەمەشدا کە ڕۆژگاری هەژاری بوو، شارەکان لە نەداری و پیسوپۆخڵیدا نوقمبوون، جگە لە زیندان دروستکردن، شتێکی تر نەبوو ژیانی خۆمانی پێخۆشبکەین. لە کاتێکدا من سەرقاڵی ئیشکردن بووم لەگەڵ ئەندازیارەکانی خۆمدا، ڕۆژێک داوام لە لیڤیتانت کرد مۆڵەتم بدات تا سەیری هەندەسەی ئەو گرتووخانە بچوکەی ئەو بکەم کە لە سەر زیندانی کۆن دوای تەختکردنی دروستیکردبوو، زیندانەکەی ئەو تادەهات ناوی بەسەر هەموو گرتووخانەکانی دیکەدا زاڵدەبوو. کە چووین هێشتا کۆمەڵێک کرێکار لە

ناوەوە کاریاندەکرد. ببینم لیڤیتانت هەر زیندانێکی ناو خودی کەڕووستانی کردوە بە سەرپەرشتی دروستکردنی زیندانەکە. یەکەم شت لیڤیتانت کردی، منی بردە لای ئەو ئەندازیارە لاواز و ترساوە کە دیاربوو لە ماوەیەکی کەمدا برێکی زۆر لە کێشی خۆی لەدەستداوە. لە ژوورێکی تاریکدا بوو، پاسەوانەکان مۆمێکیان داگیرساند تا بە ڕوونی ببینین. ئەو هەر منی بینی وەک پەلاماری شەیتانێک بدات، گووتی «ئەمەبوو ئەو ئازادییەی بۆ ئێمەتان هێنا... ئەمەبوو. تففففف، سەگی سەگباب». من ڕاچڵەکیم و شڵەژام، بەڵام خۆشبەختانە دووربووم و تفی ئەندازیارە شێتەکە نەگەیشتە ڕوخسارم. دواتر بە دەنگی بەرز گووتی «داگیرکەران سواریشم بوونایە خەفەتم لێ نەدەخوارد. بەڵام ئێوە بۆ... ها.. ژن حیزینا بۆ... ئەو خەڵکەتان بە ناوی ئازادییەوە برد بۆ شەڕ و لە دواییدا ئاوا قوڕتانکرد بەسەری باوک و باپیرماندا، یەعنی خۆ دایکتانمان نەگابوو، بۆ وامان لێدەکەن ... تۆ گورگی، گورگی پیسی حیزی برسی... سەگی سەگباب، تۆ ناوت چییە، ها ناوت چییە؟ تۆ کێییت؟ ها دەی بڵێ تۆ کێیت... چیت کردوە بۆ ئەم میللەتە... دەی خێرا بیڵێ». زمانی هێندە پیس بوو، من لەرزم لێهات و چەند هەنگاوێک چوومە دواوە. لیڤیتانت هیچی لە هێمنی و ویقاری خۆی نەشێواند و بە دەموچاوە سارد و یەک ڕەنگەکەی خۆیەوە، گووتی ئەم پیاوە بەر لە گرتنیشی لەمجۆرە قسانەی کردوە، زۆر نزیکە لە شێتبوونەوە، بەڵام هەندێ جار بە تەواوی ئارامدەبێتەوە و ئامادەیە هەموو شتێک بکات، دان بەوەدا دەنێت کە شۆڕش بێتاوانە و گوناهباری گەورە خۆیەتی کە خودا دەمپیس و بێهەست و تەماعکار دروستیکردوە. دەگری و دەپاڕێتەوە و داوادەکات یان بیکوژین یان لێیخۆش بین. گووتیشی ئەم ئەندازیارە بچکۆلەیە «کە قژێکی زەرد و لووتێکی زلی سووری هەبوو، وەک لووتی لێبوکەکانی سێرک» لە ڕۆژە ئارامەکانیدا بە هێمنی دادەنیشێت و وەک بیەوێت لە گوناهەکانی خۆی پاکبێتەوە، نەخشەی نوێکردنەوەی زیندانمان بۆ دەکێشێت.

ئەوە ئەو ساتەبوو بۆ یەکەمجار بەر دووکەرتبوونی ناوەکی و ترسناکی خەڵک کەوتم و دەمودەست فریشتە مەلعونەکەی خۆم بیرکەوتەوە. ئەو ئەندازیارە شێتەی زیندانی مەرکەزی لە یەکەم پێشڕەوانی ئەو نەخۆشییە بوو کە دواتر هەموو میللەت دەگرێتەوە. دووکەرتبوونێک لە سەرەتاوە دیاربوو تیماری ئاسان نییە. مرۆڤگەلێک بە جۆرێکی دەستەجەمعی تووشی ئەو هەستە ناکۆکە بوون کە لە یەککاتدا تا سەر ئێسقان دەستەمۆ و ئارام هەموو شتێک جێبەجێبکەن، بەڵام وەک شەیتانیش بیانجوڵێنێت، ناوەناوەش دەبنە دوژمنی سەرسەخت و دڕ، خۆیان بە زوڵملێکراو و خەڵەتاو دەزانن، کە ڕابەران لەسەر شانی ئەوان هاتوون و ئێستا تەنیا بیر لە خۆیان دەکەنەوە و ئەو حەشامەتە ڕەش و ڕووتەیان یادکردوە کە پێی دەگووترێت میللەت. لەو ساتەوە ئەوە دەبێتە نەخۆشی نەتەوەیی ئێمە، لە ناو هەموو مرۆڤێکدا فەرمانبەرێکی ملکەچی دەوڵەت و ناڕازییەکی دەمدرێژ و تووڕە لە دایکدەبێت. بە جۆرێک دەتوانم بڵێم، زۆرینەی خەڵک دوو دوموچاویان بۆ دروستدەبێت، دەموچاوێکیان سەر بە دەسەڵاتدارانە و بە کۆمەکی ئەو ڕوخسارە کار دەدۆزنەوە و پارە دەخۆن، دەموچاوێکی دیکەشیان ناڕازیی و تووڕەیە و ویژدانی پێ پارسەنگ دەکەن، بە جۆرێک گەر بهاتبایە و هەر کەسێک لەوانەت لەسەر تەختەیەکی بازنەیی دابنایە و خێرا بتخولاندبایەتەوە، هەرگیز تێنەدەگەیشتی چ ڕوخسارێکیان ڕوخساری خۆیەتی، دەموچاوی یەکەمیان کە هەواداری حاکمانە یاخود دەموچاوی دووەمیان کە تووڕە و ناڕازییە. بەڵام یەکەمین نمونەی ئەو دۆخە شیزۆفرینییەم لای ئەو ئەندازیارە شێتە بینی، کە ڕۆژێک ناڕازییەکی شێت و هیستیریی و تووڕە بوو، ڕۆژێکی دیش خزمەتکار و بەردەست و ملکەچی لیڤیتانت بوو.

ساڵانێکی سەیربوو، ئەوەی لەو سەردەمەدا خەڵکی تووڕەدەکرد برسێتی بوو، دەوڵەت گەمارۆیەکی ئاسنینی خستبووە سەر شارەکانمان، خەڵکی دەبوو بە هەرزانترین ژەم و کۆنترین جل و کەمترین موچە ژیان ببەنەسەر. لەو دەمەدا من بە پارەیەکی کەم توانیم زیندانەکانی خۆم دروستبکەم و

حیزب لەسەرفیاتی پوچ بپارێزم. دوایی زانیم کە لیڤیتانت تەواوی زیندانەکەی بە خودی زیندانییەکان دروستکردوە. ژوورەکانی زیندانی مەرکەزی تاریک و نزم و بێ هەواکێش بوون، لە زینزانەکاندا هەستم بە بوونی شێیەکی خنکێنەر کرد، دڵنیابووم لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا دیلەکان تووشی تەنگە نەفەسی و هەوکردنی سی دەبن. سەقف و چوار دیوارەکان کۆنکرێت بوون، بەڵام تەختی ژوورەکان هەر گڵ بوو، لە بری پەنجەرە تەنیا هەندێک درزیان جێهێشتبوو کە پانی هەر یەکەیان لە دە سانتیمەتر تێنەدەپەڕی. لەوێ ئەوەی زۆرتر بەرگەی بگرتایە لە هەمووان زیاتر ژیانی خۆی دەخستە مەترسییەوە، هیچ کەس لەوێ ئاسان دەرنەدەچوو، هەر کەس بکەوتایە ئەوێ دەبووە کەسێکی تر ئەوسا دەهاتەدەرێ. لە گەشتەکەمدا سەرنجمدا ژمارەی ژوورە چۆڵەکان لە زیندان زۆر بوون، کەچی لیڤیتانت هەر ژووری تری دروستدەکرد. لێمپرسی نیازێتی ڕۆژێک هەموو زیندانەکە پڕبکات یان چی، وا بەردەوام ژووری نوێ دروستدەکات. گووتی گرنگی زیندان لەوەدا نییە چەند کەسی تێدایە، یان ئاخۆ هەر کەسی تێدایە، بەڵکو لەوەدایە هەموو کەس لە دەرەوە بزانن کەسێک خەریکە و زیندان دروستدەکات، ترسی زیندانی خاڵی لە ترسی زیندانی پڕ کاریگەرترە. ڕای وابوو، هیچ شتێک وەک خەیاڵی بوونی زیندانێکی خاڵی کە دەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان پڕ بێت، خەڵک ناترسێنێت. ئەو کات من بیرمکردەوە کە لیڤیتانت بەڕاستی وانەی لە ئەزموونەکانی خۆی لە سەردەمی حوکمداری بەعسدا وەرگرتووە، ئەوان تەواوی سیستمی زیندانیان لەسەر تەکنیکی پڕکردن و چۆڵکردنی بەردەوام دامەزراندبوو، هەندێ جار لە ناکاو وەک بیانەوێت موعجیزەیەکی ئیلاهی نیشانبدەن هەموو دیلەکانیان بەردەدا، بەیانییەک هەڵدەستاین و دەمانبینی دەرگای هەموو زیندانەکانیان کردۆتەوە، خەڵکی بە خۆشی و شادییەکی بێوێنەوە دێنەدەرێ و هوتاف بە گیانی سەرۆکدا دەکێشن. بەڵام هەفتەیەکی نەدەبرد لە چەندەها ڕەشبگیری گەورەدا زیندانەکان دووبارە پڕدەکرانەوە، لێرەوە ئەوە چووبووە نەستمانەوە کە زیندانی چۆڵ بۆنی ئەو مەترسییەی لێدێت کە دەشێت وەرزی داهاتوو، ئێمە میوانی نوێی قەفەزەکانی بین.

ئەندازیارە دووفاقەکەی لیڤیتانت زۆرجار لە دارشتنی فۆرمی ئەندازەیی ژوورەکاندا هونەری نواندبوو، زینزانەی دروستدەکرد سێگۆشەیی، بە جۆرێکی وەها دیلەکان نەدەیانتوانی نە تێیدا بوەستن، نەدابنیشن، نە پاڵبکەون. یان زینزانەیەک پێیدەگووت «سەندەویچ»، دەبوو دیلەکە وەک شفتەی ناو سەمون لە درزێکی تەسکدا پاڵکەوێت و تا دەریدەهێنن نەجوڵێت، لەوێکانەش لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرا، شەکراو دەکرا بە لەشیدا و لەقووتووی تایبەتدا «کە پاسەوانەکان بەرپرسی بوون» مێش و مێروولە و هەنگ لە لەشی بەردەدرا. ئەشکەنجەکانی لیڤیتانت کوشندەنەبوون، ئازاری زۆریان نەبوو، بەڵام کەرامەتی دیلەکانی وەها دەشکاند، ئامادەبوون دواتر هەموو سوکایەتییەک وەک بەشێکی ئاسایی ژیان قەبووڵبکەن. من زیندانەکەم وەک شوێنێکی دڕندە و نائینسانی بینی کە هەستی مرۆڤ بە بچوکی و تێکشکان گەورەتردەکات. بێئەوەی هیچ بڵێم گەشتەکەی خۆم پچڕاند و داوامکرد لە بەر تەنگانەفسی و بەدبۆیی زوو بمبەنە دەرێ.

لیڤیتانت خۆی هەمیشە سەعات هەشت و نیوی بەیانی لە زیندان بوو، پێلاوە چەکمەییەکانی هەمیشە بۆیاغکراو و بریقەداربوون، وەک فێربووبوو بە هەنگاوی سەربازیی ڕێک خۆی دەکرد بە شوێنکاری خۆیدا، هەندێک ڕۆژ جلە سەربازییەکانی سەردەمی حوکمڕانی بەعسی لەبەردەکردەوە، بێئەوەی کەس هەست بە ترسان و شڵەژانێکی قووڵ بکات، لەوەی بەرپرسێکی باڵای شۆڕش جارێکی تر لە جۆرە یونیفۆرمی وەهادا دێتەوە مەیدان. هەندێک ڕۆژیش جلی کوردی جەنگاوەرانی دەپۆشی و وەک سەردەمی پسمامان خۆی دەگۆڕی. خەڵکانێکی زۆر وایاندەزانی زیندانی مەرکەزی لە ژێر سەرپەرشتی ئاسایشدایە، زۆرجار نوسەران یان ئەندامی حیزبەکانی تر دەهاتنە لای من و سەرسامدەبوون کە دەیانزانی ئەو زیندانە جێگایەکی تایبەتە و دەزگایەکی سەربەخۆیە کە جەنابی سەرۆک وەک دیاری بەخشیوێتی بە لیڤیتانت تا لەوێوە ناوکەی جیهانێکی تر بچێنێت کە چەندین ساڵی دیکە مانا و روخساری بەتەواوی دەردەکەوێت.

لیڤیتانت تا نزیکی دوانزەونیو لە زیندان دەبوو، لە ناکاو دوازدەونیو وەک دونیا گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی بەسەردا هاتبێت، وەک ساتوورن لە بورجێکەوە چوو بێتە بورجێکی تر، لە قاتی سمۆکن و کراسی سەد دەر سەد کەتاندا لە دەرگای دەرەوەی زیندان بە ڕوخسارێکی جیاوازەوە دەهاتە دەرێ و سوار جۆرە ماشێنێکی تر دەبوو و دەچوو بۆ جێگایەک کە پتر شوێنی کۆبوونەوەی بازرگان و سەراف و قاچاغچی و بەڵێندەرە کۆنەکان بوو. شوێنەکە لە سالۆنی ئوتێلێکدا بوو، نیوەڕوان بازرگان و پارەدارە گەورەکان لەوێ کۆدەبوونەوە و زۆربەی پرۆژەکانی کار و بیرۆکەکانی ئیش لەوێ تاوتوێدەکران. لەو سەردەمەدا پارەدارە کۆنەکان پێکڕا لە بەر مەترسی هەرەس و مایەپوچییدا بوون، حیزب زۆریانی خستبووە ژێر سیستمێکی باجی قورسەوە و دەبوو بەردەوام شتێک لە سامانی خۆیان بە هەیئەتی کاروباری شار ببەخشن. بەڵام لە ژێرەوە سەرمایەداری تازەش وەک قارچک هەڵدەتۆقین. تا ئەو جێگایەی من بزانم لیڤیتانت خۆی لە ترساندن و وەرگرتنی ڕاستەوخۆی هیچ پارەیەکدا بەشدارنەبوو، بەڵام هەموو دەیانزانی کە بەو قژە ڕەش و نیگا کێوییە و جوانییە میرانەیەوە دەردەکەوێت، بۆ چی مەبەستێک دێت. ئەو خەڵکانێکی زۆری لە هەموو جێگایەکی شاردا بڵاوکردبووەوە، تا بزانێت خەڵکی چی موڵک و ماڵێک دەفرۆشن، لەوەشدا بێویژدانییەکی نەدەکرد، وەک بیستوومە دەڵێن جگە لە بێڕەحمی بازاڕ بێڕەحمی خۆی زۆر نەخستۆتە سەر مامەڵە و کڕینکارییە زۆرەکانی، بە پێچەوانەوە سەخاوەتی دەنواند و خۆی واپیشاندەدا بە کڕینی زەوی و ماڵ و دوکانەکان کۆمەک بەو بەدبەختانە دەکات کە بۆ ئەوەی تۆزێک زۆرتر بژین دوا پاشەکەوتی تەمەنیان دەفرۆشت. لەو باوەڕەدابووم دەیەوێت تا پاشەڕۆژێکی دوور ناوی وەک بازرگانێکی پاک بڕوات، تا هەر خەوش و لکەیەک لە زیندانەوە دەچێتە سەر ناوبانگی لە ژێر جبەی کاسبێکی بە ئینسافدا کە هەقی خەڵکی بە زیادەوە داوە ونببێت. تا هیچ کات ناوی وەک کەسێکی گزیکار و هەقخۆر نەکەوتە سەر زاران، واهەستدەکەم ئەوە کۆمەکێکی گەورەی پێکرد بتوانێت ڕووە تاریکەکانی خۆی داپۆشێت و ڕووپۆشێکی

ئەستووریان بەسەردا بدات. دواتر من سەرنجمدا کە ئەم سروشتە، ئەدگاری تاقانەی لیڤیتانت نییە، بەڵکو هەموو کەسێکی ترسناکی دونیا کە لە نزیکەوە لێی بڕوانیت، ڕوویەکی وەهای هەیە. هەر کاتێک دەچووە سالۆنی بازرگانان «یانەی ئوتێلەکە لەو دەمەدا ئەو ناوەی وەرگرتبوو» کەس هەستی نەدەکرد هەر ئێستا ڕاستەوخۆ لە ئەشکەنجەدانی کەسێکەوە هاتووە. لە زیندان بەر لە دەرچوونی دوشێکی دەگرت، بۆنی لە خۆی دەدا و ئەوسا بە ڕێ دەکەوت. ئەو دوشە کە زۆرجار زستانانیش بە ئاوی سارد دەیکرد، نوێیدەکردەوە و هەستێکی پێدەبەخشی کە ئەوەی لە ئێستاوە تا شەو ڕوودەدات کاری کەسێکی ترە، جیاواز لە لیڤیتانتی بەیانیان. تا لیڤیتانت دوو کەس نەبوو، کەسێکی بەد و کەسێکی باش، ئەوە خراپترین وەسف و سادەترین تێگەیشتنە بۆ کەسێکی وەک ئەو. من زۆرجار بینیومە و بیستوومە عەوامەکان جگە لەوەسفی چاک و خراپ وشەگەلی تریان بۆ ناسینی یەکتر نییە، بەڵام پیاوێکی ئاڵۆز و تێکەڵ و فریودەی وەک لیڤیتانت، ئەستەمبوو بەو جۆرە وشانە باسبکرێت. ئەو کەسێک بوو بە کۆمەڵێک دەمامکەوە، بەیانیان تا لە زیندان دەهاتە دەر وای هەستدەکرد هێشتا لیڤیتانتی جارانە، لیڤیتانتی سەردەمی پسمامان، ئەو پێویستی بوو لە یەککاتدا هەم لە ڕابوردوو و هەم لە داهاتووی دووریشدا بژی، وەک چۆن باهیری کۆمەکی پێدەکرد بەرەو سەردەمە تازەکان هەنگاوبنێت. زیندانە تایبەتییەکەی ئەو هەستەی پێدەبەخشی کە هەمیشە لە ڕابوردوودایە، هەمیشە خۆیەتی، هێشتا لەو جیهانە دانەبڕاوە کە عاشقێتی. جارێک بولبولیار پێیگووتم «هیچ شتێک لە سۆزی مرۆڤ بۆ ڕابوردووی خۆی ترسناکتر نییە». لیڤیتانتیش خەریکبوو دەچووە تەمەنێکەوە یادی ڕابوردووی خۆی بکات. بەڵام ئەو کەسێک بوو دەیتوانی هەموو کێشە دەروونییەکانی خۆی لەسەر حیسابی دونیا چارەسەربکات. ڕۆژانە بێ هیچ دوودڵییەک خۆی دەکرد بە هۆڵ و ڕیستۆرانتی ئوتێلەکەدا و لەوێ فرۆشیار و کڕیار و بازرگانان لە دەوری ئاپورەیان دەبەست. هەر زوو خەڵکانێکی زۆر زانیان گەر لەگەڵ لیڤیتانت کاربکەن، پاشەڕۆژیان زامنتر و ڕوونتر دەبێت لەوەی کوێرانە قولاپی خۆیان هەڵدەنە ناو بازاڕ. لیڤیتانت

تاکە ماسیگرێک بوو تا ماسی نەدیبایە، تا دڵنیانەبایە نێچیرێکی گەورە لە تۆڕەکەیدا دەگیرسێتەوە، نەشارەزا هیچی نەدەخستە ئاو. کە لەسەر کورسییەکەی خۆی دادەنیشت و قژە نیمچە تەڕ و ڕەش و نەرمەکەی بەدەست بۆ سەرەوە هەڵدەدایەوە، کە قاچی دەخستە سەر قاچ و هەموو ئەو گۆرەوییە ڕەشە بریقەدار و نوێ و ئاوریشمییەیان لە پێیدا دەبینی، کە دەیانبینی هیچ کات بنی پێڵاوەکانی گەردێکیان پێوە نییە، دامێنی پانتۆڵەکەی وەک هەمیشە تۆزێکی لەسەر نانیشێت، لە کاتی خواردندا بە ئەتەکێتی کەسێکەوە دێتە سەر سفرە کە فێربووە بە هێمنی تێر بێت، بە هێمنی دەست پێبکات و بە هێمنی کۆتایی بێت، ئیدی باوەڕیان بەو چیرۆکە ترسناک و ناماقوڵانە نەدەکرد کە لە زیندانی مەرکەزییەوە دەهاتنە دەرێ. کەس لەو باوەڕەدا نەبوو پیاوێکی وەها پاک و تەمیز، کەسێک بەر لەوەی لێوانەکان بەرزبکاتەوە بۆ زاری، بەدەستەسڕی ئاوریشم دەیگرتن نەبا جێپەنجەی لەسەر شوشەکان بنیشێت، کاری توندی لێبوەشێتەوە. نازانم کێ ئەو نازناوەی پێبەخشی، بەڵام لە ناو بازرگان و سەرمایەدارە تازەکاندا، ناوی وەک «پرنس هۆمەر» ڕۆیشت، ناوێک لە بازاڕدا هێدی هێدی بەسەر لیڤیاتانت و ڕەشماړادا سەرکەوت و بووە نازناوی ئەو. ئیدی گەر ناوەکە لاقرتی و تانەش بێت، بۆ لیڤیاتانت لەوە باشتر بوو، بە ناوێک بانگیبکەن کە تەنیا بە ناوی بەیانیانی خۆی دەزانی، نەوەک ناوی نیوەڕوان. نا لیڤیاتانتی نیوەڕوان کەسێکی دیکە نەبوو جیاواز، ئەو بەیانیان و نیوەڕوان و شەویش هەمان کەس بوو، ئەوەی دەگۆڕا خودی لیڤیاتانت نەبوو، بەڵکو تەختەی شانۆکان و شوێنی نمایشەکان و سروشتی ڕەفتارەکان بوو، ئەوەشی کارئاسانییەکی گەورەی بۆ کردبوو بتوانێت لە یەککاتدا لە کۆمەڵێک نمایشی گەورەدا بەشدار بێت، لە بەیانییەوە کە هەڵدەستێت تا دەگاتە ناو پێخەفی خەو چەندین سەرشانۆ ببینێت و ڕۆڵەکان و ئاخافتنە پێویستەکان بەیەکدا نەپژێنێت، وانەکانی باهیری بوون، کە لیڤیاتانت چێژێکی زۆری لێدەبینین. لیڤیاتانتی نیوەڕوان کەسێک بوو لە نمایشێکی دیکەدا، دەبوو ناوێکی دیکەشی هەبێت، ئەو لەگەڵ فرۆشیارەکان دەچوو بۆ سەیری خانوو، بۆ

پێوانەکردنی زەوی، بۆ تەماشاکردنی بارە کاڵای هاوردە لەو دیوەوە. هیچ کات بارێکیشی نەدەکڕی دڵنیانەبێت گومرگی لێدراوە و حیزب هەقی خۆی لێ هەڵگرتووە. بەردەوام دوای سەعات چوار کاتژمێرێکی تایبەتی هەبوو لەگەڵ هەندێک هاوکارانیدا دادەنیشت و بیری لەو پرۆژانە دەکردەوە کە دەشێت گرنگ بن و پاشەڕۆژیان هەبێت. لەگەڵ ئەندازیارە گەنجەکان، دەچووە سەر ماڵ و بینای بازاڕە کۆنەکان، بزانێت دەتوانێت چی بکات، وەک هەمیشە لە کاری ئەندازیارانی کورد بە گومان بوو و هەوڵی دەدا بۆ ماوەی کورتیش بووە ئەندازیار لە تاران و بەغداوە بهێنێت بیری بۆ بکەنەوە. لەو سەردەمەدا، هێدی هێدی خەیاڵی بورج هاتەوە سەری و لە ڕێگای کۆمەڵێک بەڵگەنامە و ئیسنادی یاساییەوە، بە یارمەتی تیمێک لە پارێزەران کە خۆبەخشانە کاریان بۆ دەکرد، ئاسان هەموو شتێکی هێنایەوە سەر ناوی خۆی. سەرەتا تەنیا خەونەکانی بەرزبوون... بەڵام چ ئادەمیزادێک هەیە خەونی وەها خورافی و بەرزی نەبێت؟. ناتوانم تێبگەم لیڤیتانت لە چ ئان و ساتێکدا بەتەواوی گەیشتە ئەو بڕوایەی دروستکردنی بورج خەیاڵ نییە، بەڵام دەزانم لە ڕۆژێک لە ڕۆژە خۆڵەمێشی و بێڕەنگ و پڕ گومانەکانی ساڵی نەوەدوسێدا تێگەیشتووە کە دروستکردنی بورج، بەوجۆرەی کە بیری لێدەکاتەوە تەنیا تەمەنێکی درێژ و ئیرادەیەکی ئاسنین و بێرەحمییەکی زیاتری لە ئێستا دەوێت. ڕۆژانە لە نزیکی سەعات پێنج تا پێنج و نیوی ئێوارەش لیڤیتانت دەموچاوێکی تری دادەنا، لەو کاتەدا دەچووە نوسینگە فەرمییەکەی خۆی کە ناوی نابوو «نوسینگەی بۆتان بۆ کاروباری بازرگانی»، لەوێ جۆرە ئاکار و سیمایەکی تر بەسەریدا زاڵدەبوو. دەبێت بڵێم لیڤیتانت بەدەگمەن ئەو جێگایەی بۆ کاروباری بازرگانی بەکاردەهێنا، نوسینگەکە تەنیا ناوێک بوو بۆ جێگایەکی چۆڵ کە پێویستی بوو هەندێ ئیشی نهێنی خۆی تێدابکات. دەمێک دەگەیشتە نوسینگەکەی، یەکەم شت دوو گەنجی بارێک و سیسی دەبینی، دوو گەنجی دەموچاو قوپاو، کە هەردووکیان کەمێک ڕیشیان هەبوو، باڵایان بە ئەندازەی یەک بوو، نیگایان وەک نیگای منداڵێکی دڕ و برسی بوو. ئیشیان ئەوە بوو کە نامەکانی دڵداری بۆ لیڤیتانت کۆبکەنەوە،

نامەی دڵداری ڕاستەقینە. پێش ئەوان هاوکارێکی دی ویستبووی لیڤیتانت بخەڵەتێنێت، خۆی بە کۆمەکی هەندێک هاوڕێی دیکەی نامەی درۆی دروستکردبوو، ناوی کچ و کوڕی خەیاڵی خستبوونە سەر، بە ناوی ئەم گەنج و ئەویدییەوە کاغەزی ڕەشکردبووەوە. لیڤیتانت لە هەقی ئەو درۆیەیدا سزایدا و دەبوو بەردەوام سەر و برۆ و سمێڵی خۆی بتاشێت، سزایەک لای ئەو تەزویرچییە بەدبەختە لە مردن سەختتر بوو، شتێک پاڵی پێوەنا ژیانی بخاتە مەترسییەوە و بیەوێت بەپێ لە سنووری ئێرانەوە بچێت بۆ تورکیا و خۆی لە لیڤیتانت ڕزگاربکات، بەڵام وەک دەڵێن نەهامەتی بە یەکجۆر نایەت و کە هاتیش دەست هەڵناگرێت، ئەوەبوو لە کاتی پەڕینەوەدا لە سنوور کوژرا و کەسوکاری دوای سێ مانگ لاشەکەیان لە پاسدارە ئێرانییەکان وەرگرتەوە. لیڤیتانت هەموو شتێکی دەکرد بۆ ئەوەی بگاتە نامەی دڵداری نێوان دوو کەس، ئارەزوویەکی سەیربوو، بەڵام وادەزانم هەر درێژکراوەیەکی سروشتی ئەو ئارەزووە گەورەیەی بوو بۆ هەستکردن بە هێز و باڵادەستی بەسەر شتەکاندا، نامەی دڵداری نهێنیترین، تایبەتیترین و بەنرخترین شتی مرۆڤەکان بوو، دەستخستنی ئەو نامانە وەک جۆرە داگیرکردنێکی تربوو، فەتحێکی گەورەبوو لە خاک و مەملەکەتێکدا لیڤیتانت خۆی هەرگیز پێی تێنەنابوو... لە گەنجییەکی زووەوە ئەو خولیا گەورەیەی تێدا سەوزبووبوو، بزانێت عاشقان چی دەڵێن، خۆی بە هیچ جۆرێک توانای عاشقی تێدا نەبوو، لە بەرئەوە تەلیسمی وشەکە و هەستەکان هەستێکی ڕەش و تاریکیان تیا دەبزواند. لە سەردەمێکەوە کە نامەی دڵداری لە کوڕ و کاڵان دەستەند، ئەو ئارەزووە پتر بەرەو خۆی کێشیدەکرد و نەیدەتوانی لە بەر فریویدا دەربازبێت. وەک چۆن دونیای شیعر بۆ ئەو سەرزەمینێکی غەریب بوو، دونیای عەشقیش وەها بوو، وەک چۆن کە نەغەدەی ڕووتدەکردەوە وایدەزانی هەموو شاعیرانی سەر زەوی ڕووتکردۆتەوە، دەمێک کە نامەکانیشی دەگەیشتە دەست وایدەزانی سەرباز و تۆپ و تانکی خۆی لە مەملەکەتێکی دوور و نامۆدا دابەزاندوە. ئەم دوو گەنجە کە ئێواران وەک دوو سەگ بۆ نان بگەڕێن، دەگەیشتنە نزیکی

نوسینگەکەی، تاکە دەلاّلی ئەو نەبوون، بەڵکو لە پشت ئەمانەوە زنجیرەیەک خەڵکانی تر لە شار و شارۆچکەکاندا هەبوون نامەی دڵداریان بۆ کۆدەکردەوە، زۆربەی نامەکان بە پارەیەک دەکڕدران، هەموو نامەیەک و هەموو کەسێک نرخی خۆی هەبوو، گەر نامەکان دزرابان و بێویستی خاوەنەکانیان گەیشتبانایەتە دەست لیڤیتانت نرخیان گرانتر بوو. نامەی کیژانی ناودار بە جوانی و کوڕانی خانەدان پارەی زۆرتری پێدەدرا. تا کەسێکی بەدسوود نەبوو، نامەکانی هەمیشە لە شوێنی قایمدا هەڵدەگرت و گەر دەستیبکەوتایە لەگەڵ وێنەی خاوەنەکانیاندا دەیخستنە فایلێکی نهێنییەوە، بەلاّم لەزەتێکی بێوێنەی لەوە دەبینی کە ئەو نامانە بخوێنێتەوە، بە جۆرێک نەغەدە ماردینی سەیری لەو دەردەی مێردەکەی دەهات، کاتێک دەیبینی هەندێک شەو، دەمێک ئەو خۆی لە نوسینی شیعرێکدا دەجەڕاند، ئەویش بەرامبەری دەکەوتە خوێندنەوەی ئەو پارچە کاغەزە ڕەنگین و بۆندارانەی کچان و کوڕانی مەملەکەت بۆ یەکدیان دەنوسی. ئەوەی نەغەدە تێینەدەگەیشت شێوازی مێردەکەی بوو لە ڕوانین و هەستکردندا، سەیرکردنی لیڤیتانت بۆ نامەکان وەها بوو وەک لەشی خاوەنەکانیان بە ڕووتی کەوتبێتە دەستی. لەو سەردەمەوە لە هەموو شار و شارۆچکەیەکدا، شوێنێک و دەلاّلییەکی نهێنی پەرکەوت کە کاریان کڕینەوەی نامەی دڵداری بوو بۆ ئەو. کوڕان لە کچان زیاتر نامە دڵدارییەکانی خۆیان دەفرۆشت ... ئەوە ئاسایی بوو، کوڕان هەمیشە نامەرد و بێغیرەتترن، بەلاّم ئەو تۆڕە گەورەیەی لیڤیتانت دروستیکردبوو هێدی هێدی ئەو کچانەشی تێدەکەوت کە دەیانتوانی متمانەی خانمی تر ببەنەوە و وابکەن بە جۆرێک لە جۆرەکان بە زۆر بێت یان بە خۆشی نامەکانی خۆیان ببەخشن و بیفرۆشن. مەرجەکانی لیڤیتانت بۆ کڕینی نامە ئاسان بوون، نەدەبوو هیچ ناوێک گۆڕدرابێت یان سڕدرابێتەوە، دەبوو خاوەنەکانیان زیندووبن، دەبوو بەدەست نوسرابن، دەبوو مێژوویان لە پێنج ساڵ کۆنتر نەبێت. من دووجار دەرفەتم بۆ خولقا و لە دوو شوێندا ڕێگام کەوتە ئەو کونجانە کە ئیشیان پەیداکردنی نامە بوو بۆ لیڤیتانت، یەکێکیان دوکانی عەترفرۆشێکی پیربوو کە کیژان و کوڕان ئازادانە ڕوویان

تێدەکرد و لەوێ حیساب و مامەڵەیان دەکرد و بەرامبەر نرخێک کە بۆ ئەو سەردەمە پارەیەکی باش بوو، نامەکانیان دەفرۆشت، ئەوی دیشیان شیرینیفرۆشێک بوو کە لە پاڵ فرۆشتنی برمە و پاقلاوەدا بە نهێنی هەموو جۆرە نامەیەکی دڵداری دەکڕییەوە. تا ئەو سەردەمەی مۆبایل و ئیمەیل و فەیسبوک بەتەواوی نامەی دڵداریان لە ناو برد و کردیانە شتێکی لە یادکراو و مێژوویی، لیڤیتانت وازی لەو ئارەزووەی نەهێنا. لەگەڵ سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا کە مۆبایل گەیشتە هەموو دەستێک و ئینتەرنێت گەیشتە ماڵەکان، من هێدی هێدی لە سەر پەیژەکانی سیاسەت بە کاوەخۆ دادەبەزیم و هەنگاو دوای هەنگاو بەرەو خوار دەبوومەوە، ئەویش تا دەهات بەرزتر و بەرزتر سەردەکەوت، ڕۆژێک وایلێهات ئیتر نەمدەبینی، ئەو لە چاوی من ونبوو، چیتر توانام نەبوو بزانم چی دەکات و چی نهێنییەکی نوێی هەیە. بەڵام دەمبیست کە دەزگایەکی خۆی هەیە گوێ لە تەلەفونی عاشقەکان دەگرێت، خەڵکانێکی شارەزای گرتووە ئیمەیل و کۆمپیوتەرەکانی بۆ هاکدەکەن. ئایا ئەوە ڕاستە؟ نازانم، لەو کۆتاییەدا هیچ ئارەزوویەکم نەبوو دوای نهێنییەکانی لیڤیتانت بکەوم، هێدی هێدی خۆم ئامادەدەکرد جەمعییەتی ژیانە ونەکان دابمەزرێنم و گەورەیبکەم، بەڵام دڵنیابووم حەزی گەورەی ژیانی لیڤیتانت ئەوەبوو ئەوانی تر تا دوا پلە، تا دەشێت و دەکرێت ڕووتبکاتەوە و لاوازییەکانیان ببینێت. لەزەتی لەوە دەبینی کە پاڕانەوەی عاشقەکانی لە یەکتر دەخوێندەوە، کە فرمێسکی کوڕانی لە بەردەم کچاندا دەبینی، کە نامەی کیژانێکی دەبینی هێندە لاوازبوون دەیانەویست لە بەر سەعاتێک عەشق خۆیان بسوتێنن. کە شەوان لە ڕۆبێکی ئاوریشمدا لەسەر مێزەکەی دادەنیشت و وەک ئەمیرێک پاڵیدەدایەوە و نامەکانی دەخوێندەوە، هەموو شەوێک دواجار بە دەنگی بەرز، وەک لە هەموو شتێک نائومێد بووبێت، ڕوویدەکردە نەغەدە و بە دەنگی بەرز دەگووت «وەرە ببینە ئەمانە چ بێعورزە و کەساسن و لە بەر چی خۆیان دەکوژن و دەسووتێنن». خوێندنەوەی نامەکان زیاتر ئەوەیان بۆ دەسەلماند کە ئینسان مەخلوقێکی بچوکە و شایەنی پلیشانەوەیە. چەندە ئینسانی بە لاوازی ببینیایە، زیاتر هەستیدەکرد مافی

خۆیەتی لەسەرووەڕا بڕوانێت و هەست بە ناوازەیی و تاقانەیی خۆی بکات. ئەو نامانەی تەنیا بۆ ئەوە نەبوو کە بزانێت ئەوانی دی چۆن دەژین و چۆن بیردەکەنەوە، بەڵکو ڕوانگەکەی بۆ گرنگ بوو، ئەوەی بۆ گرنگ بوو نامەکان لەدەستیدا ئەوەی بۆ دەسەلمێنن کە خۆی لە جێگایەکی دونیادا وەستاوە، دەتوانێت ڕوونتر و باشتر لە هەر مەخلوقێکی تر شتەکان ببینێت. مەبەستی بوو هەموو تێبگەن ئەو لە کوێدا وەستاوە و لە چ گۆشەیەکەوە سەیرماندەکات. دروستکردنی بورجیش ترۆپکی ئەو خواستە مەحاڵەی بوو تا بگاتە ئەو پلەیە لە بەرزی بتوانێت لە بالاوە وەک خودایەکی گریکی تەماشامانبکات. تا ئەمڕۆش هیچ کەس نازانێت چ ئەرشیفێکی گەورە و ترسناکی کۆکردۆتەوە کە دەرکەوتن و هاتنەدەرەوەی دوور نییە ماڵی دەیان خانمی بەڕێز وێرانبکات کە ئێستا لە ماڵ و مێردی خۆیاندا هەزار سوێند دەخۆن، هیچ کات جگە لە مێردەکانیان پیاوێکی دی لە ژیانیاندا نەبووە. بەڵام نا ... ئەو جگە لەوەی لەزەت لەوە ببینێت کە ئەو لیڤیتانتە، ئەو حاکمە مەغرور و چکۆلە و چاوتیژەیە کە ئێمە دەبینێت و دەزانێت چین و چ لاوازین، نیازێکی تری نەبوو. زیندانەکانی، کۆشکەکانی، پرۆژەکانی، نامە کڕینەکانی هەموو بۆ ئەوە بوون دڵنیابێت لە جێگایەکی بەهێزترەوە لە جێگای من و تۆ دونیا دەبینێت.

ناوەڕاستی ساڵی نەوەدوسێ، سەرەتای گەڕانەوەی نەغەدە بوو بۆ دونیای شیعر، لەدوای ڕاپەڕینەوە دەنگی نەبوو. من دەمزانی بەردەوام لەگەڵ شاعیراندا کۆدەبێتەوە، لە ماڵی خۆیدا دانیشتنی شیعریی سازدەکات، ژنە شاعیرەکانی شار کەمتازۆر هەموو بوونەتە ناسیاوی، لە جاران زیاتر کتێبی شیعری هەیە، کتێبخانەکەی لە جاران گەورەترە. بەڵام لە ئاستی گشتیدا، هیچ دەرکەوتن و بەشدارییەکی بەرچاوی نەبوو. لە دوای شەوی ئاهەنگەکەوە کە داوای لێکردم بولبولیاری بۆ بدۆزمەوە، ماوەیەکی زۆر تێپەڕی بوو، نە من دەمتوانی بولبولیار بدۆزمەوە و نە خۆی دەردەکەوت. شتێکی سەیربوو، بولبولیار وەک هەست بە هەموو جوڵە و نیازێکی من بکات، دەیتوانی لە هەموو تەڵە و داو و پشکنینێک دەرباز بێت کە من

پلانم بۆ دەکێشا. یەکەمجارم بوو بەرامبەری بەوجۆرە تورە و هاربیم، هیچ ڕێگایەک و دەروازەیەکم چنگ نەدەکەوت بمباتەوە سەر ئەو. وەک ئەوە بوو زەوی قووتی دابێت یان ئاسمان هەڵیکێشابێت. من زیاد لە ساڵ و نیوێک بوو بەردەوام لە دوای ئاماژەیەک و ئاسەوارێکی دەگەڕام، زۆر لە کارمەندانی خۆم ڕاسپاردبوو سۆراغی بزانن، بەڵام وێنەیەکی وەهای ئەوم لە بەردەستدا نەبوو... چەند ئەرشیفە کۆنەکانی حیزب دەگەڕام، چەند خەڵکم ڕادەسپارد، بەڵام وەک ئەوەی ئەم کوڕە هەر لە ڕاستیدا بوونی نەبووبێت و دەستکردی خەیاڵی من بێت، کەس هیچی دەربارەی نەدەزانی. چەندەها ڕۆژ بە تایبەت دەچوومە گەڕەکی غەمپاشا، ئەو کوچە هەزارەی کە ئەگەر هەموو زەویش بگۆڕێت، ئەوێ ناگۆڕێت، گەرچی ئێستا بۆنی هەژاری زۆر ئازاریدەدام، بەڵام بەرگەی بۆنی منداڵە نەدارەکانم دەگرت و سۆراغی بولبولیارم لە هەموو کەسێک دەپرسی. هەموو یەک وەڵامیاندەدەمەوە «لە مێژە، بولبولیاریان نەبینیوە». هەندێکیان بڕوایەکی تەواویان بوو کە بولبولیار مردووە، هەندێک دەیانگووت خۆیان بە چاوی خۆیان بینیویانە لە ژێر چادرێکی شینی سەردەمی ڕەوەکەدا گیانی لە دەستداوە، هەندێکیش پێیان وابوو چۆتە ئێران و دوای کۆچەکە نەگەڕاوەتەوە، بەڵام خۆم هەستێکی ترسناکم هەبوو کە فریشتەکەم زۆر لێمەوە دوور نییە. من لە ڕووی دەروونییەوە بە جۆرێک لەو مەخلوقە ترازابووم، هەستکردنەکەم پابەندی بوونی پەیوەستێکی نهێنی نێوان من و ئەو نەبوو، بەڵکو گرێدراوی بۆنی پیاوی ئاسایش بوو، بۆنی کەسێکی سیخوڕ کە دەزانێت ئەوەی بۆی دەگەڕێت زۆر لە خۆی دوور نییە.

شار بە جۆرێکی سەیر بووبوو بە جێگایەکی جەنجاڵ و پیس و بێسەروبەر... وێرانبوونی گوند و شارۆچکەکان ئێرەی کردبوو بە گۆماوێکی لیخن کە تێیدا نە شوێنی دانیشتن، نە شوێنی کار، نە جێگای جوڵاندنەوە نەمابوو. بەیانیان سەدان هەزار کەس بەدوای تیکەیەک نان‌دا دەڕژانە سەر شۆستە تەسک و مەیدانە بچوکەکان، جەنجاڵییەکی وەهایان دروستدەکرد، دواکەوتن و چاودێری تا دەهات سەختتر دەبوو. فەرمانبەرەکانی ئاسایش

و ماسییە هەرە وریاکانی منیش هەموو داد و بێدادیان بوو لەوەی ناتوانن بە ڕاستی هیچ کەس بنێنە ژێر چاودێرییەوە. قەرەباڵغی ناو شەقامەکان و قەیسەرییەکان و گوزەرەکان نەیدەهێشت کەس بخەیتە ژێر حوکمی بینینی خۆتەوە. زۆرجار خۆشم دەچوومە بازاڕ و لە ناو حەشاماتەکاندا خۆم وندەکرد. جار بووە هەستمکردوە وەفائیل و بولبولیار لێمەوە نزیکن، بەڵام لەو تێکچرژانی مەخلوقاتەدا، نزیکترین کەسیش هەر دوورە و ناگیرێت. من جار دوای جار، بە هەواڵی ئەوەوە کە بولبولیار بێسەروشوێنە و دیار نییە دەگەڕامەوە لای خانمی ماردینی. هەستمدەکرد دەیەوێت پێشئەوەی بە گەورەیی بگەڕێتەوە ناو دونیای شیعر هۆشەنگ ببینێت. هەستمدەکرد نەغەدە باکی بە هیچ بوونەوەرێک و پیاوێکی دونیا نییە، بەڵام لە بەر هەر هۆیەک بێت، شاعیرەکەی ناخی بەرامبەر بولبولیار شەرمێکی قووڵی تێدا بوو. وای هەستدەکرد تاکە کەسێک بتوانێت بە ڕاستی پێیبڵێت تۆ شاعیریت یان نا، بولبولیارە. نەغەدە لای هەموو پیاوانی شار ژن بوو، بەڵام لای بولبولیار شاعیر بوو... ئەو تاکە پیاو بوو دەیتوانی نەک وەک ژن، بەڵکو وەک شاعیر سەیربیکات. بۆ دەیویست بولبولیار ببینێت؟ نەمدەزانی. چەندەها جار لە خۆم پرسیوە.. بۆ؟ خۆشیدەویست؟ ڕقی لێی بوو؟ متمانەی پێ بوو، یان چی؟. بەر لە گەڕانەوەی گەورەی، بەر لەوەی بە یەکجار جبەی شاعیرییەت بدات بە شانیدا و خۆی بکات بە ئەستێرەیەکی درەوشاوە کە لە هەر جێگایەک باسی شیعر کرا دەبێت ناوی بێت و لەگەڵ شاعیرە گەورەکاندا باسبکرێت ... شتێک ڕوویدا، کە کەمتازۆر هەندێک نهێنی بۆ من ئاشکراکرد. شتێک بۆ خانم تراژیدی و غەمگین بوو. لە بەهاری ساڵی نەوەدوسێدا لە کاتێکدا خانم ڕۆژێک بڕیار دەدات هەموو کتێبە کۆنەکانی کتێبخانەکەی دەربهێنێت و بە نیازی تەجلید بیانخاتە سندوقەوە تا بیاننێرێت بۆ لای بابەعەلی سەحاف، ئەو نامەیە دەدۆزێتەوە کە ساڵانێک لە مەوبەر هۆشەنگ بۆی ناردوە و بێئەوەی بیخوێنێتەوە خستوێتییە نابەینی کتێبەکانییەوە... قەسیدەی پەترۆس ـی تشارلز بۆدلێر. خانمی ماردینی بە هێمنی کاغەزەکە دەکاتەوە و بە وردی دەیخوێنێتەوە، جارێک دەیخوێنێتەوە، دووان دەیخوێنێتەوە،

سیان دەیخوێنێتەوە و وەک ئەوەی کەسێک لەسەر یەک چەند گوللەیەکی پێوە نابێت، لە ناوەڕاستی کتێبەکاندا دەکەوێت و دەبورێتەوە. کە من گەیشتمە لای بۆ بیمارستان هۆشی هاتبووەوە خۆی. دکتۆرەکان و لیڤیتانت هۆی لە هۆشچوونەکەیان دەگێڕایەوە بۆ دابەزینی کتوپڕی فشاری خوێن کە دەشێت هۆکەی فەرامۆشکردنی بێت بۆ باری تەندروستی خۆی. هۆی ئەوەی داوای لە لیڤیتانت کردبوو بنێرێت بەدوای مندا، ئەوە بوو لەسەر پێخەفی بیمارستان جارێکی دی تکام لێبکات بولبولیار بدۆزمەوە... ڕوخساری ژنێکی عاشقی هەبوو کە لەبەرچاوی مێردەکەی تکادەکات ئەو پیاوەی بۆ بانگبکەن کە خۆشیدەوێت، بەڵام عاشق نەبوو، نەیدەتوانی عاشق بێت، ڕۆحی بوو بوو بە چیلکەیەکی وشک، بەڵام کە داوای لە من کرد بۆ بولبولیار بگەڕێم و بیدۆزمەوە، منیش و لیڤیتانتیش تێگەیشتین، بولبولیار تاکە مایەی ناڕەحەتی و بەدبەختی ژیانێتی. من دەمزانی هیچ کەسی خۆشناوێت، بەڵام شتێک لە ناخیدا بوو نەیدەتوانی بولبولیار فەرامۆشبکات. ترسی یەکێک دڵنیایە دەتوانێت هەموو کەسێکی دونیا فریوبدات، ئەو نەبێت ... بۆ نەیدەتوانی فەرامۆشیبکات؟ بۆ نەیدەتوانی نادیدە بیگرێت؟ بۆ نەیدەکرا بڵێ بولبولیار نییە و نەبووە؟ نازانم. منیش وابووم... منیش نەمدەکرا فەرامۆشیبکەم، چی هەوڵمدەدا لە خەیاڵی خۆم بۆم دەرنەدەکرا. ئەو هیچ هێزێکی نەبوو، خاوەنی هیچ نەبوو، کەم و زۆر دەسەڵاتی بەسەر ئێمەدا نەدەشکا. دڵنیابووم ئێستا لە دۆخێکی نالەباردا دەژی، بە دەردەسەر پەناگایەکی پەیداکردوە، کەچی نە بۆم دەدۆزرایەوە و نە بۆم فەرامۆش دەکرا.

ئەو ڕۆژە کە لە بیمارستان هێنامانەوە، بۆ یەکەمجار هەواڵی کچەکەی پرسی، ماوەیەکی زۆر بوو ناوی نەهێنابوو، دوو مانگ جارێک بە کەسێکدا پارەیەکیان دەنارد بۆ من، ئەو کەسانەی ئاسمانیان بەخێودەکرد دەهاتن پارەکەیان وەردەگرت و دەڕۆیشتن. دەبێت ڕاستی بڵێم، من لەو کاتەوەی کچەکەم دابووە دەست ئەو خانەوادەیە، کاتی ئەوەم نەبوو سۆراغیبکەم، هێند هەبوو ئەو جارانەی میواندارەکان دەهاتن بۆ پارەکەیان، من زارەکی

و سەرپێیی هەواڵی کچەم دەپرسی و ئەوان دڵنیایاندەکردمەوە کە باشە. ئەو ڕۆژەش کە خانم پرسیاری لێکردم، بۆ ئەوە نەبوو دڵنیابێت کە ئایا تەندروستی چۆنە؟ گەورە بووە؟ کەی دەچێتە قوتابخانە؟ نا بۆ هیچ شتێک نەبوو. بەڵکو وەک ئەوە بوو بڵێ نەمردووە؟ هێشتا لە دونیادایە؟ بۆ نامرێت؟ چی لەم ژیانە دەوێت؟.

ئەو شەوە کە لای خانم هاتمە دەرەوە لەرزێک و موچڕکێکی لە ناکاو گرتمی. شتێکی نهێنی لە ناوەوە ڕایتەکاندم، هەستێکی توند و ئازاربەخش، کە لە زەمانێکەوە فریشتەکەم ترازابوو، هەستی وەها داگیری نەکردبووم. هەستێک بوو بۆم نەدەخرایە قاڵبی وشەوە، پێویستییەکی تاریک و بەهێز بوو بۆ شتێک، دەکەوتە ئەودیو سنووری دونیای ئێستای منەوە... لە ناکاو بۆ یەکەمجار چاوم لێکدەنا و ئەو منداڵە نەخۆش و کەمئەندامەی خانمم دەهاتەوە پێشچاو، دڵنیابووم ئێستا هێزێک دەمجوڵێنێت کە خۆشم تێی ناگەم، ئارەزوویەک دەسەڵاتێکی ڕەهام بەسەریدا نییە. بێئەوەی بیربکەمەوە ڕاستە و ڕاست چووم بۆ ئەو ماڵەی ئاسمانی لێیە، ئێستا دەمزانی چیم دەوێت، بەڵام نەمدەزانی بۆ دەمەوێت ... نەشمدەویست بزانم بۆ دەمەوێت... بەڵام هەستێکی کوتوپڕ و بێبن و بەهێزبوو، شتێک بوو لە قووڵایی هەرە تاریکی بوونمەوە دەهات و بەریم بۆ نەدەگیرا. لە دەرگامدا و بێ ئەوەی بوەستم تا دێنە پێشوازم، خۆم کووتایە ژوورێ. ماڵەکە خێزانی کۆنە پێشمەرگەیەکی پەککەوتووی بریندار‌بوو، چەند ساڵ لەمەوبەر لە یەکێک لە چالاکی و نەبەردەکانی هێزی پێشمەرگەدا سەخت پێکرابوو. نمونەی ئەو مرۆڤە قارەمان و بێدەنگانە بوو، کە بە هەموو هێزی خۆی خزمەتی کوردستانی کردبوو، ئێستاش لەوە شەرمنتر و بە ئابڕووتر بوو داوای مافی خۆی بکات. نەدەیتوانی کاربکات، نە حیزب کۆمەکی پێ دەکرد، نە سەرچاوەیەکی هەبوو پارە و دەرامەتێکی لێ وەدەستبهێنێت، من ئەو کچەم لا دانان و بەشی زیندەگییەکی مەمرەومەژیم لای خانم و لیڤیتانتەوە بۆ زامنکردن. کە چوومە ژوورەوە شەو درەنگ بوو، خێزانەکە دوو منداڵیان هەبوو، هەم

پیاوەکە و هەم منداڵەکان خەوتبوون، تەنیا ژنەکەی لەسەر تەشتێکی گەورە خەریکی دروستکردنی ملوانکەی مێخەک بوو. کە منی بینی، بەرزەپێ هەستا و بە دەنگی بەرز تا مێردی وەئاگابهێنێت فەرمووی لێکردم، وەک هەموو ماڵە هەژارێک پڕ لە ڕێز و حورمەت و بەخشندەیی بوو، چەندین جار گووتی «یاخوا عەقید گیان بەخێربێیت... خێرت هێنا عەقید گیان. لە لوتفتان بەزیاد بێت عەقید گیان». لەو کاتانەدا مێردەکەی بە ئاگاهاتەوە و شەرمەندە و تێکشکاو « تێکشکاو، بە کاری خەوی ئێستا و بە کاری ئازاری هەموو زیندەگی» پەتۆکەی لادا و دەستیکردە سڵاوی گەرم و بەخێرهاتنی شەرمنانە. من لە خۆمەوە بڕیارێکی سەیر و شێتانە کەوتبووە سەرم. دوای چا خواردنەوەیەکی ناوەخت و هەندێک قسەوباسی ڕۆژ، ژن و مێردەکەم دانا و پێمگووتن «باجی گیان، کاک موحسین، لە سبەینێوە ئاسمانم بۆ ئامادەبکەن، دەیبەم، دەمەوێت ئیتر لەگەڵ خۆمدا بژی ... من هەموو ڕۆژێک بەیانیان منداڵەکەتان بۆ دەهێنم و شەو دەیبەمەوە لای خۆم ... شەو دەبێت ئەم منداڵە لای من بێت، لە ئێستا بەدواوە من باوکی ئەم منداڵەم». هیچ کات لە ژیانمدا و لەسەر هیچ شتێک وەها لە یەقین و دڵنیاییدا نەبووم. هەر دوو میواندارەکەم بڕیارەکەیان بۆ سەخت بوو، دیاربوو منداڵەکە ئەرکێکی ئەوتۆی نییە، توانای قسەکردن و پەیوەندی لەگەڵیدا سەختە، ئەوان ڕۆژی چەند ژەمێکی هەژارانە خواردنی دەنێنە بەردەم و هیچی تر. من دەمزانی خێزانەکە زۆر پێویستیان بەو موچەیە هەیە کە لەم کیژە منداڵەوە دەستیاندەکەوێت. بۆ ئەوەی شتەکە نالەبار بەسەر ئەم بەستەزمانانەدا نەشکێتەوە، گووتم «تا بکرێت و تا کارێکی باش بۆ خۆت یان باجی دەدۆزمەوە، ناهێڵم موچەکەی ماڵی کاک عومەرتان ببڕێت، خۆشم شتێکی تری دەخەمە سەر. بەڵام لە سبەینێوە، ئەم کچە کچی منە و دەبێت شەوان بێتەوە ماڵی من... شۆفێرەکەم بە ڕۆژ منداڵەکە دەهێنێت بۆتان و بە شەو دەیگێڕێتەوە لای من، بەڵکو لە داهاتوودا بکرێت بیبەمە لای خۆم و دایەن و خزمەتچییەکی بۆ بگرم».

هەموو شتێک کتوپڕ و شێتانە بوو. بەڵام هیچ کارێکی شێتانە و کتوپڕیش نییە ڕیشەیەکی درێژی نەبێت. وەک بروسکەیەک لێیدابم، وەک ئیلهامێکم لە خودا یان شەیتانەوە بۆ هاتبێت ... بۆ دوای بینینی خانم لە بیمارستان، ئەو بڕیارەمدا؟ نازانم. بۆ ساتێک کە سەیری چاوی نەغەدەم کرد، دەمێک لەسەر تەختی نەخۆشەکان کەوتبوو، کە زانیم چەند پێویستی بە بولبولیارە، هەستمکرد منیش شتێکی وا سامناک دەمجوڵێنێت. شتێکم دەویست سەر بەم دنیایەی ئێستا نەبێت، تاکە شتێکیش کە لەم شارەدا دەمبینی و هەستم پێدەکرد و دەمزانی سەر بەم دونیایە نییە ئەو منداڵە بوو. هەموو ئەوانی تر خەڵکی ئێرە بوون... ئەو و بولبولیار نەبێت. بولبولیار دووربوو، ئەوەی کە بە دەستمەوە مابوو، ئەو منداڵە نابینایە بوو. لەساتێکدا هەستمکرد پێویستیم بە شتێکی ترە، شتێک لەو ژیانەی ئێستام نەچێت. گەشتەکانم بۆ ناو دارستانەکان، بۆ ناو سروشت، بۆ قووڵایی خەزان ئیتر بەشی نەدەکردم. بێدەنگی سروشت تا دەهات زیاتر و زیاتر دەیترساندم، لە نابەینی چۆم و هەرد و درەختاندا جگە لە دڕندەکەی ناخی خۆم هیچی ترم نەدۆزییەوە، ڕەنگە گوناهـ گوناهی سروشتیش نەبێت، من خۆم لەو لێواری زۆنگ و لاڕێگا چەپەک و سوچە عاسیانەی دونیادا بۆ تیژکردنەوەی چڕنوکەکانی ئەو جانەوەرە گەڕابووم کە ناوی جەنگیزە، ئێستا تینووی شتێکی تر بووم.

لە یەکەمجارەوە کە ئەو کچە هاتە ژیانمەوە، کە بردم و لە دایەنی پێشووی وەرمگرت، منداڵەکەم وەک کەسێکی ئاسایی نەبینی، بەڵکو وەک پارچەیەک لە سروشت هاتە بەر دیدەم، سروشتی ڕووت. وەک کچێک نا کە لە دامێنی ژنێک یان لە نوتفەی پیاوێک کەوتبێتە خوار، بەڵکو وەک بەشێک لە دیوێکی یادکراو و فەرامۆشکراوی تەبیعەت. منداڵەکە ئەو شتەی تر بوو کە ناوی نییە، ئەو شتەی تر کە لێیدەڕوانی و لە هیچ شتێک ناچێت لەو شتانەی تۆ لە ناویدا ژیاویت و پێیان ئاشنایت، ڕوخسارێکی تری ئینسان بوو، کە من نەمدیبوو، منیش بە جۆرێک لە ناو شتە ئاشناکاندا خنکابووم، بەجۆرێک هەموو ئەم شارەم وەک لەپی

دەستی خۆم دەبینی و دەناسی، تووشی ترس بووبووم ... ئەو، ئەو تەنیا غەریبەیەک بوو کە لە هیچ شتێکی ناو ئەم شتانەی دی نەدەچوو.

ئەو تاعوونە نەرمە، فریشتەکەم بۆی جێهێشتبووم، ئەو دەردە بوو کە دەرکردنی فریشتەکەم نەیتوانیبوو تەواو بنەبڕیبکات، ئێستا بێئەوەی بزانم بۆ ... پێویستیم بە شتێکی تر بوو، لە ڕێگایەوە هەستبکەم دەژیم، وەک دەمێک لە سەقز ڕەشمارا لێیدەدام و لە ڕێگای گورز و ئەشکەنجەی ئەوەوە دەمزانی وەفای ڕەفعەت بەگ هێشتا زیندووە، لە ڕێگای ئازارەکانەوە دڵنیادەبووم وەک خەڵکانی تر لەشێکم هەیە و نەبوومەتە ئامێرد.

دەمێک خواستی هەبوونی ئەو منداڵەم تیا سەوز بوو، دڵنیابووم وەفائیل نەمردووە و هێشتا کلکێکی لە ژیانمدا هەیە.

ئەو هەستە بە کاریگەری وەفائیل لە سەرم، نەوەک هەر مایەی دڵتەنگی بوو بۆم، بەڵکو زۆریش ئازاری دەدام. لە کاتێکدا دڵم ئەو پەڕی مەیلی بۆ ئەو منداڵە تێدابوو، لە هەمانکات دەمویست بە هەموو ڕێگایەک یادگاری ئەو فریشتە لە ڕۆحی خۆم پاکبکەمەوە. نەمپرسی، من دەتوانم چی بۆ منداڵەکەم بکەم؟ من پیاوێکی تا سەر ئێسقان نوقم لە کار و خەون و ئازاری گەورەدا، ئەو کچێکی نابینا و بەستەزمان و منداڵ کە پێویستی بە کەسێکە خزمەتیبکات. بیرم لە هیچ نەکردەوە، یەک شتم دەزانی... ئەویش ئەوەیە پێویستیم بە منداڵێکە، منداڵێک هی خۆم بێت... شتێکی تر بهێنمە ژیانمەوە کە نە شۆڕش، نە ڕاپەڕین، نە ئیمان، نە دەسەڵات نایبەخشێت. منداڵێک کە شەوان دەگەڕێمەوە ببینم و لە جێگاکەیدا دایپۆشم و ماچیبکەم و باوەشیبکەم و بیخەوێنم. منداڵێک وەک هەر منداڵێکی تر نا، بەڵکو شتێکی دیکە بێت، لە ژیان و مێژوودا نوقم نەبووبێت، بێگوناهی خالیس بێت، کە گرتمە باوەش بزانم ئەو بەشەی دونیا دەگرمە باوەش کە پاکترە لە هەر شتێکی تری سەر زەمین ... من بە درێژایی ڕۆژ سەر و سیمای ئەو مرۆڤە سیخوڕ و چاوە شەڕانیانەم

دەبینی کە جگە لە پشکنینی دڵی ئینسان کارێکی تریان نەبوو، هەستمدەکرد لە کۆتایی شەودا پێویستیم بە نەفەسێکی تۆزێک هێمن و ناسکە. نەمدەتوانی ژن بهێنم، هەزار هۆکارم هەیە بۆتان حیسابیکەم بۆچی نەمدەتوانی ژنبهێنم. لەسەروو هەموویانەوە ئەوە بوو نەمدەتوانی عاشق بم و خۆشەویستی بکەم، هیچ کەسم خۆش نەدەویست. خەریکبوو خۆم لە ناوەڕاستی چلەکانی تەمەن دەدا و دڵم مەشقێکی دروستی عەشقی نەبینیبوو، عەشق بەرەو ڕووی بچیت یان لێی ڕابکەیت هەردووکیان پێویستی بە مەشقە، بەڵام من نە لە چوون و نە لە هەڵهاتندا مەشقم نەبوو، بۆیە گەر عەشق لەمبەری ڕێ بووایە، من دەچوومە ئەوبەر. دواتەوە ئیشم لە ئاسایش، سەیرکردنی بەردەوامم بۆ نهێنی مرۆڤ متمانەی لانەهێشتبووم، کێشەکەش هەر ئەوە نەبوو کە من متمانەم بە هیچ ژنێک نەمابوو، بەڵکو ئەوەش بوو کە چاوی من بوو بوو بە چاوی جاسوسێکی هەتاهەتایی، هەر ژنێکم بهێنایە هەر وەک ڕۆحلەبەرێک سەیرمدەکرد کە دەبێت بەردەوام بیپشکنم و بیدۆزم و بیخەمە ژێر پرسیارەوە. جاسوسی لە جەوهەردا هیچ نییە جگە لە شێوەیەک لە شێوەکانی دڵپیسی و دڵپیسیش خۆی هەر بەشێکە لەو ویستە هەمیشەیی و شەیتانییەی مرۆڤ بۆ پشکنین و دۆزینی ژیانی ئەوانی تر. من وەک لیڤیتانت خۆشبەخت نەبووم، ئەو جەلاد و دز و بازرگان بوو، بەڵام من پیاوی ئاسایش بووم... ئەگەر ژنم بهێنایە، چۆن چاوە نهێنییەکانم دەخستە دوای دوژمن، شەو و ڕۆژ دەمخستە دوای ژنەکەشم. پیاوێکی بەدگومان بووم، پیاوێکی بەدگومانیش بچێتە ژیانی هەر خانمێکەوە وێرانیدەکات. هێشتا بەشی ئەوە هەستم تێدابوو، مرۆڤێک نەخەمە ژێر بەرداشە ڕەقەکانی ژیانی خۆمەوە، نە لە بەر ئەو، بەڵکو لە بەر خۆم، چونکە ژن و مێرد دوو کەسن هەر کامێکیان کەوتە ژێر بەرداش، ئەویدیشیان بە ناچاری دەبێت لەگەڵیدا بچێت. دوا ئەوە من گەر ژنیشم بهێنایە نەیدەتوانی منداڵێکی وەک ئاسمانم پێ ببەخشێت. منداڵێک تەنیا پارچەیەک گۆشتی پاک و زوڵم لێکراو بێت، کەسێک کە نە ماڵ، نە خێزان، نە پاشەڕۆژی نییە... گەر

منداڵیشم بایە دەبووە کەسێکی ئاسایی وەک خۆم، نوقم لە شتە بچوک و ڕۆژانەکاندا، دەبوو بە یەکێک لە ئێمە، لە بوونەوەرە دووبارەکان.



هەندێ جار شتەکان بە شێوەیەکی سەیر نزیک لە یەکتر ڕوودەدەن. زۆر جار بیردەکەمەوە و دەڵێم زیندەگی وەک کێڵگەیەکی مین وایە، کە لە جێگایەکدا مینێک دەتەقێت، بەدوایدا هەمیشە زنجیرەیەک تەقینەوەی تر ڕوودەدات، زۆربەی کات مرۆڤ پەیوەندییەکی مەنتیقی لە نێوان ڕووداوەکاندا نابینێت، بەڵام گەر قووڵ بڕوانیت هەموویان هیچ نین جگە لە خولاندنەوە و کلافەبوونی بەردەوامی زەمان بەسەر خۆیدا. لە کۆتایی ساڵی نەوەدودوو و سەرەتای ساڵی نەوەدوسێدا «ڕەنگە تا ماوەیەکی درەنگتریش» ڕابوردوو و داهاتوو بە جۆرێکی کوشندە لە ژیانی هەمووماندا تێکەڵ بووبوو، شوێنەکان و کاتەکان و مرۆڤەکان یەکتریان ڕادەکێشا و یەکتریان دەشێلا. هەموو شتێک لە شەڕی ئەوەدا بوو بگۆڕێت یان وەک خۆی بمێنێتەوە، بەتەنیا هێزە گەورەکان و دەسەڵاتە بەرجەستەکان لەو ململانێ و دوودڵییەدا نەدەژیان، بەڵکو هەستە بچوک و عاتیفە نهێنییەکانیش لەو دۆخە نالەبارەدا بوون. پاشەڕۆژ بە جۆرێکی دڕندانە دەیویست بێتە پێشێ، پاشەڕۆژێک من و شێرخان و لیڤیتانت و ئەوانی تر بە هەموو هێزی خۆمان چەکوشکاریمان تێدادەکرد، خستبوومانە ژێر گورز و کوتەکی خۆمان و بێڕەحمانە دەمانتاشی، بەڵام ڕابوردووش سەرسەخت و بێئینسافانە دەگەڕایەوە و ڕایدەکێشاین. ئێستا لە کۆتایی هەموو ئەم گەمە ترسناکانەدا، لە ساتێکدا من بەناو مێژووی هەموو سەرکەوتن و شکستەکاندا ڕۆیشتووم و پاشەڵم تۆزی هەموو جۆرە جەنگێکی لەسەر نیشتووە، گەیشتومە ئەو بڕوایەی کە پاشەڕۆژ یەک مانای هەیە و هیچی تر. پاشەڕۆژ تەنیا ئەو شتەیە کە لە دوێنێ ناچێت،

لە دوێنێ نەرمتر و هێمنتر و جوانترە، هەموو شتێکی ترسناک، هەموو دووبارەکردنەوەیەکی مرۆڤ بۆ دڕندەیی خۆی پاشەڕۆژ نییە، بەڵکو تەنیا دووبارەکردنەوەی تاریکییە هەرە قووڵ و ترسناکەکانی ڕابوردووە. من ئێستا وا لە پاشەڕۆژ دەگەم، پاشەڕۆژ ئەو زەمەنە نییە کە دێت، بەڵکو ئەو خەونەیە کە دەبێت بێتە دی، ئەو مەحاڵەیە کە هەموو باوەڕیان وایە دەستمان پێیداناگات. زۆربەی خەڵک وادەزانن لە بەلەمێکی تۆکمەدان و بە ئاوێکی هێمندا بەرەو داهاتوو دەڕۆن، وادەزانن گەر خۆیان دایە دەست زەمەن بەرەو پاشەڕۆژ دەیانبات، هیچ شتێک لە گەیشتن بە پاشەڕۆژ سەختتر نییە. پاشەڕۆژ شتێکە کەم کەس دەتوانێت ڕووی تێبکات، بەدەگمەنیش کەسێک هەبێت بیگاتێ. ئەوە موسیبەتی ئێمەیە، لە کاتێکدا لە ماڵی خۆمان دانیشتووین و زەمەن بەڕێدەکەین وادەزانین بە ڕێگاوەین بەرەو پاشەڕۆژ.

ئەو زەمانە کە من و لیڤیاتانت زیندانمان دروستدەکرد، من چاوم لەوە بوو دەزگایەکی گەورەم هەبێت بتوانێت ترسەکانی خۆم بڕەوێنێتەوە، لیڤیاتانت هەموو خەیاڵی خستبووە سەر بازاڕ و موڵک و پارە، نەغەدە بەدوای بولبولیاردا دەگەڕا، بولبولیار خۆی دەشاردەوە، ئاسمان کەسی نەبوو، شێرخان ڕاوە پشیلەکانی گواستبووەوە ناو شار، سەرۆک ڕۆژانە لەگەڵ نوێنەری سوپای ئەمریکی و سی ئای ئەی دا دادەنیشت، دکتۆر زەندیان ڕاگەیاندنێکی گەمژەی دامەزراندبوو ... هەمووی بەشێک بوون لە خەونە پوچەکانی ڕابوردوو، ڕابوردوویەکی ترسناک کە بێئینسافانە دەیەوێت هەمیشە لەگەڵمان بێت. ڕەنگە مەڤاڵێکی عەزیزم بپرسێت، ئێستا بۆ بەم وردەکارییە زۆرەوە کە ئێمە شێت و بێحەوسەڵە دەکات، هەموو ئەم چیرۆکانە دەگێڕیتەوە، ئێمەیەک فێرنەبووین دوو لاپەڕە بخوێنینەوە، چۆن بتوانین دوای تەواوی ساتەکانی زیندەگی ئەو هەموو بوونەوەرە دژ و جیاوازانە بکەوین؟. ڕەنگە ئێوە لەسەر هەق بن، بەڵام ئەم کتێبە کتێبی لوولبوونی زەمانە لە ناو خۆیدا، کتێبی ئاڵۆزکانی ساتەکانە لە ناو یەکدا، کتێبی کڵافەبوونی مەخلوقات و سوڕاندنەوەی هێمن و دڵڕەقانەی

مەکینەیەکی گەورەیە، کە نەرم نەرم، بێهیچ دوودڵی و شەرمێک دەمانهارێت، ئەمە کتێبی مێژوو یان ژیان نییە، بەڵکو کتێبی زەمانە کە هێزێکی خاوتر و تێکدەرتر و کوشندەترەی لە هەر هێزێکی تری سەر رووی زەمین هەیە. کتێب چییە گەر چیرۆکی هارینی ئێسکەکان و لەتبوونی ڕۆحەکان ورد ورد نەگێڕێتەوە... هەموو کتێبێک کارێکی بێڕەحمانەیە لەوەدا، کە ناهێڵێت زەمەن تێپەڕێت بێئەوەی پێیبڵێت، سەیرکە چ جێگایەکی خوێنین و تاریکت خولقاندوە، کە شێتانە دوای دەنگی چرکەژمێرە کوشندەکەی دەکەوێت و بەردەوام تەقینەوەی سامناکی ئەوسەری ڕێگاکانمان پیشاندەدات. من بینیم، من بە تەنیا بینیم چ دەسکێکی گەورە لەم دەستکەوانەدا دەیکێشا بەسەرماندا، سەری من نا بە تەنیا، بەڵکو سەری هەموومان، سەری ئێوەی خوێنەریش. بۆیە لێگەڕێن بیگێڕمەوە ڕۆحەکان چیان بەسەر هات و بەچی وا ورد و خاش بوون.



ماوەیەکی کەم دوای ئەو شەوەی من چووم بە دوای ئاسماندا و کردم بە کچی خۆم، شەوێک نزار ئیدریس کە بووبوو بە پیاوێکی ترساو، لە پەناگایەکی نهێنی و قایمی خۆی هاتەدەرێ، پەناگایەک دڵنیابوو بەتەواوی ناپیارێزێت، هەمووی چەند سەد مەترێک بەپێ ناڕوات، لەویادا دوو ماشێنی چەکدار چاوەڕوانیدەکەن، بە هێمنی دەیگرن، بە هێمنی سواریدەکەن، ئەو هیچ بەرگرییەکی ئەوتۆ نیشان نادات. بە پێچەوانەوە واهەستدەکەم هەر خۆی، وەک هەستێکی ترسناکی ناوەکی پاڵی پێوەنابێت، هاتۆتەدەرێ... وەک خۆی خۆی دابێت بەدەستەوە، وەک زانیبێتی لەوێدا چاوەڕوانیدەکەن، وەک بێزاربووبێت چیتر ئەو ڕادارە بخاتە کار کە پێیدەگووت لیڤیتانت لە کوێوە دێت و بۆ کوێ دەچێت. لەویادا کەلەپچەیدەکەن، چاوی دەبەستنەوە، لەژێر چاودێرییەکی توندا دەیبەن

بۆ زیندانی مەرکەزی، بۆ بەردەم دوژمنە هەرە دێرین و سەرسەختەکەی لیڤیتانت هۆمەر بۆتانی، کە هیچ کات ئەو زیندانە هەڵهاتووەی پسمامانی لە یادنەکردوە و بۆی لە یاد ناکرێت.

ئەو سەردەمە تازەیەی کە من پێموابوو لەگەڵ ڕاپەڕیندا دەستی پێکردوە، بەگرتنی نزار ئیدریس کۆتایی هات... گرتنی نزار منی گێڕایەوە بۆ خاڵی سەرەتا، بۆ ئەو شوێنەی چیرۆکەکان تێیدا دەست پێدەکەن. شتێک بوو، لەگەڵیدا تەواوی ئەو شتانە ڕوخان کە بۆنی دەستپێکردنی پاشەڕۆژی لێدەهات. ئێمە هەمیشە لەوێدا بووین، لەسەرەتای سەرەتادا، لە یەکەمین پلە و سادەترین پلەی هەستە ترسناکەکانی خۆماندا، ئەو هەستە خنکێنەرانەی کە هەرگیز دەستبەردارمان نەدەبوون و هەمیشە ئێمەی بەرەو سەرەتای سەرەتا ڕادەکێشایەوە. ئینسان مەخلوقێکی گەمژەبوو کە خۆی دووبارەدەکردەوە، زەمەن شتێک بوو بەسەر خۆیدا لوول و کلافە دەبوو... زۆری نەبرد دەستپێکردنی جەنگی ناوخۆ ئەو ڕاستییەی دووبارەکردەوە، کە ئێمە لەسەر هەر ترۆپکێک بین، هەمیشە بەرەو خوار، ڕووە و جەهەنەم دادەبەزین.

## یاداشتەکانی مەهدائیلی فریشتە «3»

ژیانم لە کەشتی ناخۆش نەبوو، ئەوەی لەسەرەتاوە کارم ئەوەبوو بەو عەرەبانە گەورەیە شار بگەڕێم و فریشتە نەخۆش و مردووڕەنگەکان کۆبکەمەوە کەمێک ئازاری دەدام، من لەگەڵ ئەو هەموو ساڵانەی ئازادی و گەڕاندا هێشتا ترسێکم لە هەوای سارد هەبوو. بەڵام گەڕانی شەوانەم هەستێکی زۆرتری پێدەدام و پتر دڵنیایدەکردمەوە کە فریشتەم. بە ڕۆژ کەم دەگەڕام، گەر بشگەڕابامایە کەمتر دەکەوتمە سۆراغی فریشتە

نەخۆشەکان. گەر ڕۆژ بڕۆیشتمایەتە دەر، یەک خولیا دەیجوڵاندم، خاوەنەکەم ببینم، هەمیشە لەوێبوو، وەک خۆی، دەهات و دەڕۆی، دەچووە چاخانەکان، قوماریدەکرد، شەڕیدەکرد، مەستدەبوو، دەڕشایەوە، بۆ ژنی سۆزانی دەگەڕا، بلۆفی لە هاوڕێکانی دەدا، ژن و منداڵی خۆی فەرامۆشکردبوو. ئەو هەستەی دەبێت خۆمی بۆ ئاشکرابکەم و کۆمەکی پێبکەم تا دەهات کاڵتر دەبووەوە لەلام. وەردە وردە کەشتییەکە بووبوو بە خولیا و خەونی هەموو ژیانم. بەیانیان کە خاتوون دەچوو بۆ قوتابخانە من سەرپەرشتی تەواوی شتەکانم دەگرتە دەست. ئەو مەلەکبینانەی دەهاتنە کەشتییەکە و کۆمەکیان بە فریشتەکان دەکرد کەمبوون، بەڵام خزمەتێکی ڕاستەقینەیان بە نەخۆشەکانی ئێمە دەکرد، دەیانگێڕان، چیرۆکیان لەگەڵدا دەنوسین، نیگاریان لە گەڵیاندا دەکێشا، هەتا هەندێ جار هەوڵیاندەدا شتی تەواو نوێیان فێربکەن، کتێبی جوانیان بۆ بخوێننەوە، چیرۆکیان بۆ وەربگێڕن، لەگەڵیاندا بچنەدەرێ و بۆ خاوەنەکانیان بگەڕێن. لەو چەند ساڵەدا چەند جارێک ڕێکەوتیکردوە کە لە ناکاو فریشتەیەک و مەلەکبینێکیش پێکەوە ونبن و ئیتر ئاسەواریان نەمێنێت. ڕێزانی مەلەکبین تەفسیرێکی دیاریکراوی بۆ ئەو جۆرە ونبوونانە نەبوو، بەڵام نە من و نە ئەو هەستێکی بەدمان نەبوو. ئاسایی بوو، مرۆڤێک فریشتەکەی خۆی بباتەوە، یان فریشتەیەکی خۆشبوێت و بیەوێت بەتەنیا خۆی غەمی بخوات. من کارێکی زۆر کۆیلانەم لە کەشتییەکەدا دەکرد، لەگەڵ باغەوانەکاندا، لەگەڵ چێشتکەرەکاندا، لەگەڵ گۆڕهەڵکەنەکاندا ... هەتا کاری چاککردنەوە و نوێکردنەوە و بۆیەکردن کە جار جار دەهاتنە پێش، من دەمکردن، جگە لەوەی زۆر ڕۆژ تەواوی ئیشی بازاڕ لەسەر من بوو. ئەوەی کە هەمیشە مایەی سەرسامی من بوو، ڕێزانی مەلەکبین بە دەگمەن منی وەک فریشتەیەکی ڕاستەقینە سەیردەکرد، زۆرجار وەک پیاوێکی دەبەنگ دەیبینیم کە شوناسی خۆم لێگۆڕاوە. گەرچی هەندێ جار بۆچوونەکانم دەربارەی ئینسان و فریشتە ڕایدەگرت و دەگەیشتە ئەو بڕوایەی کە من دەبەنگ نیم، بەڵام هێندەی قەد و قەڵافەتە زلەکەمی دەبینی و سەیری دەموچاومی دەکرد، دەیکێشا بە ناوچاوانی

خۆیدا و دەیگووت «نازانم بۆ ئەوەندە گێژۆکە دەتبینم. تێناگەم، خۆت گەمژەیت یان دەموچاوت وایە». ساڵی یەکەم سووکایەتییەکانی زۆر بریندارییاندەکردم، ڕاستە من مرۆڤێک نەبووم ئاسایی، بە جۆرێک هەموو تانە و تەشەرێک بمبرێت، بەڵام ئەوەی کە هیچ کات قسەیەکی منی بە جیدی وەرنەدەگرت، ئەوەی هەندێک ڕۆژ بە ئەنقەست فەردەیەک پەتاتەی قوڕاوی لە بەردەمدا ڕۆدەکرد و وەک خزمەتکارێکی گێلی دەستکەوتبێت، دەیگووت «دەی مەهە گیان، تۆ ئیشت نییە هەموویان پاکبکە و بیانشۆرەوە و بیانجنە و بەش بەش بیانخە زەرفەوە و جوان لە سەلاجەکەدا هەڵیانگرە... ئەم هەفتەیە هەمووی دەخورێت». من بە ڕاستی تورەدەبووم. نازانم من بەدبەخت بووم یان چی؟ ڕەفتاری خانم لەگەڵ هەمووواندا نەرمبوو، یاخود گەر توندی و قسەی ناخۆشیشی تێدا بووبێت، بەو جۆرە بریندارکەر نەبوو، وەک لەگەڵ مندا هەستم پێدەکرد و سەرنجمدەدا. زۆرجار دەمپرسی کەسێکی وەک ئەو مەلەکبین، کە ژیانی بۆ خۆشی و چاکەی ئەوانی تر تەرخانکردوە، ژنێکی خوێندەوار و قسەزان، بۆ لەتەک مندا وا دەجوڵێتەوە. کە لێم دەپرسی، هەمیشە سەیرێکیدەکردم و بە گاڵتەوە دەیگووت «بەساقە، پیاو لە نوسخە ئەسڵییەکەتاندا گەمژەن، جا وەرە کاربۆنیشتان بخەنە ژێر». من تێنەدەگەیشتم مەبەستی چییە. زۆرجار کە دەگەیشتە تینم، پێمدەگووت «منیش تێناگەم ئەو فریشتە بێئینسافەی ناوت، کەی غیرەت دەداتە بەر خۆی و باڵەکانی خۆی درێژدەکات و لەدەستت ڕادەکات. کەسێکم بینیبێت شایەنی ئەوە بێت فریشتەکەی لە دەستی ڕابکات... تۆیت». هەر کات وام دەگووت لە شوێنی خۆی دەوەستا. هەر کارێکی بکردبایە ڕایدەگرت و ماوەیەکی درێژ سەیریدەکردم، وەک بیر لە شتێک بکاتەوە، وەک چاوەڕوانی قسە و تێبینی وا لە کەس نەکات. زۆرجار دەیگووت «ئاە مەهدائیل، دڵنیابە خۆشحاڵدەبم ڕۆژێک بتوانم فریشتەکەی ناخی خۆم بکوژم. ئەوە کاری هەر کەس و ناکەسێک نییە». هەندێ جار بۆ ئازاردان و ترساندنی من وایدەگووت، بەڵام هەندێ جاری دیش بە ڕاستی بوو. خزمەتی فریشتەکان ماندوویدەکرد، هەمیشە و هەمیشە لە ڕووداوێکی کتوپڕ و نادیار دەترسا

کە نەمدەزانی چییە. زۆر شەو کە لەو دیو دەرگاکەوە گوێم لێدەگرت، لەبەر خۆیەوە دەگریا و دەیگووت «بەمجۆرە ناڕوات، بەمشێوەیە نامێنێت». هەر کاتێک دەرفەتم هەبووایە و لێم بپرسیایە مەبەستی چییە دەیگووت «هیچ... هیچ». بەڵام دەزانم هەموو ئەو ساڵانە ترسێکی قووڵی ناوەکی هەبوو. هەندێ جار شەوان بە ئاگادەهاتمەوە و دەمبینی لە پشکنینی هەموو کۆشکەکە دەگەڕێتەوە. زۆرجار دەیگووت، ئەم شوێنە ترسناکترین شوێنە. کەسمان نەماندەزانی لە چی دەترسێت، بەردەوامیش زۆر کورت و بێمانا وەڵامی دەدایەوە «لە ئینسان دەترسم، لە ئینسان». لەو چەند ساڵەدا دەیان جار منی داناوە و تکایکردوە متمانە بە مرۆڤ نەکەم. هەر کات دەچوومە دەرەوە بە گومانەوە سەیریدەکردم، زۆربەی شەو تا خۆم و عەرەبانەکەم لە گەشتی شەوانە نەگەڕابایناوە، نەدەخەوت. خۆی نەیدەوێرا لەگەڵمدا دەرچێت، دەیگووت «دوو شەو لەدەرەوە بەتەنیا بمبینن دەڵێن بۆتە قەحبەی عەرەبان و دەمکوژن. گەرچی شوکور بۆ خوا عەرەب ئەوەندەی سوار پیاوی کورد بوون ئەوەندە سوار ژنمان نەبوون، کەچی هەر ژنێک دوای تاریکی بەتەنیا سەرێ بکێشێتە کۆلان، دەڵێن ئالۆشی نێرە عەرەب هاریکردوە».

ئاسینی دکتۆر شوکاک کەم تا زۆر ژیانی منی گۆڕی. دکتۆر کاتێک کەشتیی فریشتەکانی بینی، وەک نەخۆشخانەیەکی ئاسایی هاتە بەرچاوی کە پڕە لە نەخۆشگەلێک ئومێدی چاکبوونەوەیان نییە. هەر کە هاتە کەشتی، مامەڵەی وەک مەلەکبینەکانی تر نەبوو، کەمتر بایەخی بەو سیستمە دەدا کە ئێمە لە چارەسەری فریشتەکاندا دەمانگرتە بەر. کاریگەری چالاکییەکانی دیکەی بۆ فریشتەکان بە لاوەکی و بێسوود دەبینی. بڕوای هەرە گەورەی تەنیا بە هێزی سیحراوی دەرمان بوو. لە ڕووی بایۆلۆژییەوە جیاوازییەکی قووڵی لە نێوان فریشتە و مرۆڤی ئاساییدا نەدەکرد، دەیگووت جیاوازییەکان تەنیا دەروونی و ڕۆحین. دکتۆر ڕای وابوو ئێمە هیچمان فریشتە نین، بوونەوەری سەربەخۆین، باڵەکانمان خەیاڵیین. یەقینێکی سەیری هەبوو کە ئێمە مرۆڤی بێکەس و نۆرماڵ و

نەخۆشین. بەڵام دکتۆر بە جۆرێکی سەیریش ئەو دیوە سەمبولی و مەجازییەی چیرۆکی ئێمەی قەبووڵ بوو، کێشەی نەبوو بە ئێمە بڵێت فریشتەکان، کێشەی نەبوو هەموو شتەکان وەک میتافۆرێکی گەردونی جوان ببینێت کە مرۆڤ دەتوانێت زۆر شتی لێوە فێرببێت. کە دەهات بۆ بیمارستان و من لەگەڵیدا بە پلەکەکاندا سەردەکەوتم، بە خرۆشی کەسێکەوە بزانێت چی دەکات و بۆ لەم جێگایەدایە، دەیگووت «مەهدائیل بزانین ئەمڕۆ دەتوانین چەند خزمەت بە ژیان بکەین». ئەو قسەیەی توانا و هێزێکی گەورەشی بە من دەبەخشی، زۆرجار دڵنیاتر ئیشمدەکرد و خۆبەخشیم دەنواند کە هەستمدەکرد لە نێوان من و مرۆڤ و بوونەوەرەکانی تردا، شتێکی هاوبەش هەیە ناوی ژیانە.

گەر لەو ئازارانە بگەڕێم، کە ژیان بێدەنگ و بەردەوام کۆیاندەکاتەوە و دەیانوروژێنێت، ژیان و ئارامی کەشتی، هێمن منیان لەگەڵ خۆیاندا برد، لە ڕاستیدا خۆشحاڵیش بووم بەو ئارامییە، هەستمدەکرد ئەوەی دەتوانم خزمەت بە فریشتە بەدبەختەکان بکەم، لە ڕووی هێز و تەندروستییەوە تینم دەداتێ و وادەکات خۆگرتربم و نەخۆشی و نائومێدی کەمتر دەستیان بمگاتێ. هەر کاتێکیش ژیان جۆرە ڕیتمێکی وەهای وەرگرت ئیتر دەبێتە مایەی مەترسی. من بەوجۆرە بووم، کاتێک دڵ دەکەوتە ئەرخەیان و خاترجەمی، کە دڵنیایی زۆر لە دەورم ئاپۆرەیدەگرت، هەمیشە ترسێکی ناوەکیم هەبوو کە ئێستا نا ساتێکی تر هەموو شتێک دەڕوخێت و تۆفانێک دێت من و دونیا لەگەڵ خۆیدا دەبات. ئەوە هەستێکی نائاسایی بوو، بەڵام هەر کات هێمنی و هارمۆنییەت و یەک ڕەنگی ماوەیەکی درێژ زاڵ بانایە، ئیتر چاوەڕێی شتێکی خراپم دەکرد... چەندین ساڵە بیر لەوە دەکەمەوە کە ڕۆژێک شتێکی گەورە و ترسناک ڕوودەدات، کەچی هەرگیز ڕوونادات. ئیتر زۆر شەو ئارام دەخەوم و دڵنیام ئەو شتە هەرگیز ڕوونادات. بەڵام چەند دەنگێکی نهێنی هەیە، بەردەوام دەگەڕێنەوە و بە سوکیی و دڵنیایی پێم دەڵێن «ڕوودەدات ... بەڵێ ڕوودەدات». هێندەی

هەستی ئارامی و ئاسوودەگی دامدەگرێت، ئەو هەستە بەدتەبار و چەپەڵانە دێن و لێم تێکدەدەن و دەکەومە بیرکردنەوە لەو بەدبەختیانەی کە دێن.

لە ناکاو شتێک ڕوویدا کە منی سەر لە بەر گۆڕی ... شتێک کە هیچ کەس نەیبینی و هەستی پێ نەکرد، شتێکی گەورە نەبوو بە مانای ئەو ڕووداوە سەیرانەی کە ڕاستەوخۆ هەستکردن و دەرککردنی مرۆڤ بە ژیان دەگۆڕن. شەوێک دوای ئەوەی مستەفا شوکاکم بردەوە بۆ ماڵی خۆیان بە پیاسە گەڕامەوە بۆ کەشتیی فریشتەکان، شەوێکی تاریک بوو، لەو شەوانەی لە کتێب و نوسیندا بە ئەنگوستەچاو وەسفیاندەکەن. دەبوو ماوەیەک بەسەر شەقامی سەرەکی شاردا بڕۆشتبامایە... ئەو شەقامەی بە شەو هەمیشە چۆڵە و بینینی کەسێک لەو درەنگ وەختانەدا دەگمەن و نائاساییە. ڕێناکەوێت ئادەمییەک بوێرێت لە شەوی وەهادا، ئازاد و بێترس بەوێدا بڕوات یان هەر لە سەری کۆڵانێکەوە تا دەروازەی کۆڵانێکی دی ئەمبەرەوبەر بکات. هێندەی چوومە سەر دەمی ئەو کوچەیەی دەبوو لێوەی ڕووەو شوێنی نیازم سەربکەوم، کەسێکم بینی بێهۆش لە بەردەم دەرکی ماڵێکدا کەوتبوو، لە تاریکییە چڕەکەدا سەرەتا تەنیا سێبەری جەستەیم بینی کە وەک شتێکی ڕەشی زل لە نزیک دەرگایەکی گەراجی گەورەوە کەوتبوو، ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا بریسکەی فسفۆڕی کاتژمێرەکەی دەستی بوو کە لەو زوڵمەتە بێسنوورەدا جوان دەدرەوشایەوە، گەر ئەوە نەبایە ڕەنگبوو هەر چاوی نەکەم. نازانم بۆ لە ناکاو دڵم کەوتە لێدانێکی خێرا و کتوپڕ، بێئەوەی بزانم بۆ دەستم دەلەرزێت، لەو جەستەیە نزیکبوومەوە و ڕۆحم بێ هۆیەکی دیاریکراو خرۆشابوو. چەندین ساڵ بوو ئیشی من شەوگەڕیی و کوچە تەیکردن بوو، زوڵمەت نەمابوو پێیدا نەڕۆم و شێوەی شەو نەمابوو نەیناسم، ئەوەش لە ساڵانێکدا مرۆڤە سادەکان کەم دەهاتنە ناو تاریکی و شار لە مێژبوو بێ بەزمی شەو دەژیا ... ئێستا بۆ دەترسام و چی بوو وا ناکاو دڵی هێنامە لەرزە؟. لە نزیکەوە بینیم... چوومە سەری، لایتەکەی گیرفانم دەرهێنا و بەوردی سەیری ڕوخساریم کرد، خۆم بووم ... من بووم ... منی

ڕاستەقینە. مەهدی ... خاوەندار و خانەخۆیی دێرین و نیوەی ترازاو و لە یادکراوی من. دڵم خێراتر و ترسناکتر کەوتە لێدان، وەک دواجار کە بەجێمهێشت. ئەو کات لە ژوورێکی ماڵی خۆیاندا چوومە سەری، ئەو کاتیش نیوەهۆش بوو، ئەو کاتیش جنێوی پێدام. بۆ یەکەمجار بە ڕاستی نەفرەتم لە شانس و بەختی خۆم کرد و تفم لە تاریکی کرد کە منی بەم کوچەیەدا ڕاکێشاو دوای ئەو هەموو ساڵە، دووبارە ڕووبەڕووی ساتێکی وەهای کردمەوە. مەهدی من بێهۆش بوو، بەدەم وڕێنە و هەڵبزڕکانەوە هەندێک جنێوی بە من و ئاسمان و دونیادا، پێدەچوو زیادەڕەوییەکی بێمانای لە خواردنەوەدا کردبێت و لەویادا هەم هۆش و هەم هێزی لەدەستدابێت و کەوتبێت. سەردەمێک کە دەمناسی ئەوجۆرە پەککەوتن و بێهۆشییە توندانەی هەبوو، هیچ کات سنووری خۆی نەدەزانی و دەمێک دەکەوتە فرکردنی عارەق وەستانی بۆ نەبوو. دەمزانی تێپەڕینی ساڵان گۆڕانکارییەکی زۆریان تێدا نەکردوە. من چوار مانگ لەوەوبەر جارێک لە دوورەوە بینیم، واهاتە پێش چاوم کە پیری زەفەری پێنابات و ڕوخساری هەمان ڕوخسارە کە سروشت لە گەنجییەوە پێی بەخشیوە. بەڵام ئەو شەوە کە لە بەر ڕۆشنایی لایتە دەستییەکەی خۆمدا، ورد سەیری دەموچاویم کرد، دەستە نادیارەکانی تەمەنم بینی کە کەم کەم ئاسەواری جێدەهێشت و چرچ و سپێتی و وشکی دەخستە سەر سیمای، وەکو ڕوخساری من، کە هێدی هێدی هەستمدەکرد سافێتی کۆنی لەدەستدەدات و دەبێتە سیمای فریشتەیەک کە زەمەن خەریکە لە زەلکاوی خۆی هەڵیدەکێشێت. هەردووکمان پیر بووبووین، بەڵام ئێستاش وەک جاران من نیوە هوشیارەکە بووم و ئەو نیوە مەست و بێباکەکە. لەوێدا بێباک لە هەر شتێک کەوتبوو ... مەستێک بە تەنیا بۆ مەستی مەستدەبێت. ماوەیەک لە سەری وەستام و نەمدەزانی چی بکەم، دەمزانی ئەمە یەکەم شەوی ئەم وەرزەی نییە، بەوجۆرە لە کوچاندا مەی دەستی لێبوەشێنێت و بکەوێت. دوودڵ بووم، بڕۆم و فەرامۆشیبکەم و بەجێیبهێڵم یاخود هەڵیبگرم و بیگەێنمە جێگایەکی باش و بیبەمەوە بەر دەرکی ماڵی خۆی. لەو دوودڵییەدا هەستمکرد ئەم ڕێکەوتە سەیرە، دەستێکی نهێنی گەورە

ڕێکی خستووە و هەموو ژیانی من بە جۆرێک لە جۆرەکان بەم ڕێکەوتەوە بەندە و ڕاکردن لێی، هیچ نییە جگە لە ترسنۆکی مەخلوقێک کە ناوێرێت سەیری چارەنوسی خۆی بکات. ئەو شەوە هەستمکرد هێشتا بەکارم و ئەو هێزە گەورەیەی وەک فریشتەیەک هەمە، هاوشانی توانایەکی گەورەی جەستەیە. مەهدیم دا بە شانمدا و هەڵمگرت، دەمزانی لە گەڕەکی «تەیرباران» لەگەڵ ژنی دووهەمیدا دەژی. دەکرا بیبەمە بەر قاپیماڵی خۆی و لەبەر دەرگاکە دایبنێم و بڕۆم، دەکرا زەنگ لێدەم و بیدەمە دەست ژنەکەی و بڵێم لە کوچەیەکی دووردا کەوتووە و نەمویستووە ڕیسوا بێت و هێناومەتەوە بۆت و ئاگات لێی بێت. بەڵام کوچە بە کوچە بردم و لە بری ماڵی خۆی، گەیاندمە ژێر خانێکی دێرین و چۆڵ کە لە وەرزی بارانی زۆردا، شەوانی تۆفان و هەڵکردنی گەردەلوولە زستانەکاندا، خۆم تێدا حەشاردەدا و فریشتەی بێکەس و سەرسەختم بۆ دەبرد کە نەیاندەویست لەتەک مندا ڕووبکەنە ناو نوێنە گەرم و جێگا نەرمەکانی کەشتییە گەورەکەمان. ویستم لە نزیکەوە بیبینم و قسەی لەگەڵدا بکەم، دووبارە شتێکی ترسناک لە ناخەوە بەرەو ئەم پیاوەی دەجوڵاندم، لەو ساتەوەی لە تاریکیدا ناسیمەوە هەستمکرد ناتوانم ئیتر جێیبهێڵم، لەو کاتەدا کە ورد لە بەر ڕۆشنایی لایتەکەدا سیمایم دەپشکنی، تۆوی ئەو دەردە کوشندەیەم تێدا ڕوایەوە کە من جگە لەو کەشتییە، جگە لەو فریشتە بەدبەختانە، جگە لە ڕێزانی مەلەکبین، وەزیفەیەکی دیکەم هەیە و دەبێت دوایبکەوم کە ئاگادارییە لەم پیاوە پەرێشانە کە ڕۆحی پەشۆکاوی بە جۆرێکی نهێنی بانگیدەکردم. نا... ئێستاش لە هیچ دڵنیانیم... سەرەتا وامدەزانی ڕۆحی پەژموردە و ماندووی ئەوە من بانگدەکات، بەڵام ئێستا دەمێک ئەم دێڕانە دەنوسم لە هیچ دڵنیانیم... بە پێچەوانەوە هەستدەکەم ئەوە ئەو ڕادارە نهێنی و ئەبەدییەی ناخی من بووە کە لەو شەوەدا، لەو ساتەدا، لەو شوێنەدا منی بەرەو لای مەهدی ڕاکێشاوە. ڕووداوەکانی دواتر هەموو بە ڕیتمێکی سەیر ڕۆیشتن، ئێستا کە من بووم بە فریشتەیەکی نائومێد و غەمگین و ئامادە بۆ مردن، کەس بە دروستی لە نهێنی ئەو گۆڕانکارییە قووڵە نازانێت کە بینینەوەی مەهدی لە مندا

دروستیکرد. ڕێزانی مەلەکبین نەبێت کە دەزانێت ڕۆحی من چەند لە ژێر زەبری ڕووداوەکان و شێوازی ڕەفتاری ئەم پیاوەدا ئازاری پێگەیشت و زیانی خوارد، کەسی دی هیچ نازانێت. ئەوە ئەو شتە نادیار و ترسناکەیە کە بە جۆرێکی ڕاستەوخۆ بڕوای منی بە ژیان و چالاکییەکانم ڕوخاند. ئێستا کە دەمەوێت بە خێرایی یاداشتەکانم بنوسمەوە، لە ژێر فشارێکی ڕۆژانە و توندی خانمی مەلەکبیندا کاردەکەم کە وەک من هەستێکی ترسناک و زەنگێکی گەورەی مەترسی، لە دڵیدا لێدەدات.

ئەو شەوە بەدیار مەهدییەوە دانیشتم تا بە ئاگاهاتەوە، کە وردە وردە گێژی و وڕی بەریاندا، خۆر کەوتبوو، ڕۆژێکی نوێ و ژیانێکی تازە خەریکبوو دەستیان پێدەکرد. مەهدی کە تەواو هۆشی هاتەوە خۆی، سەراسیمە و ترساو بە چوار دەوری خۆیدا ڕوانی و منی بینی لە نزیکییەوە دانیشتووم، ترسێک و سڵێکی گەورە کەوتە گیانی و وەک لە خەوێکی ترسناکدا بیت، خەریکبوو بقیژێنێت و تەکانبداتە خۆی هەڵبێت و لە مەترسییەک دەربازبێت. من توند توند بە هەموو هێزی خۆم گرتم. هەموو توانای خۆی کۆکردەوە خۆی ڕاپسکێنێت، بەڵام مەستی و گێژی شەو وەها شەکەتیانکردبوو، هەوڵەکانی بێسود بوون و نەیکرا لە چنگ و ئەڵقەی بازووەکانم دەرچێت، ئەو تلی بە مندا و من تلم بەودا، ماوەیەک یەکدیمان هێنا و برد. مەبەستم بوو توند بیگرم و لە جووڵەی بخەم تا تێبگات سەروکاری لەگەڵ بوونەوەرێکی بەهێزدایە. کە زانی هەوڵەکانی بێسوودن و ناتوانێت لە بازنەی مەچەکانم دەرباز بێت، بە دەنگێکی نیوە خنکاو، دەنگێک بوو لە مێژبوو بەوریایی گوێم لێ نەبووبوو، هەمان دەنگی من بوو بەڵام گڕتر، لە قرخنی و هێڵنجدا هەڵکشاو، کینەدار. پرسی «تۆ کێیت و چیت دەوێت لە من. من چی دەکەم لێرەدا و ئێرە کوێیە؟»، چەندین ساڵ بوو وەها لە نزیکەوە گوێم لە دەنگی نەبووبوو، وەها لە نزیکەوە دەستم لێ نەدابوو، بۆنم نەکردبوو... ئەو هەر من بوو، مەهدائیلی فریشتە بوو، بەڵام لە دونیایەکی تردا دەژیا، حەزمدەکرد هەردووکمان ئێستا بچینەوە بۆ سەرەتا، ببینەوە بە دوو کانزای بێ قاڵب و بێ شێوە،

بە بوونەوەرێکی بێڕوخسار تا سەر لە نوێ لە شێوەیەکی تر و لە ژیانێکی تردا گەورە ببینەوە. ئەگەرچی هەموو شتێک تێیدا مایەی قێز بوو، هەموو شتێک تێیدا بۆنی پیسییەکانی کوچە و کۆڵانە چەوتەکانی دونیای لێدەهات، بەڵام من لە ناخی دڵمەوە هەستمکرد دەبێت لەم پیاوە نزیکبم. نە دەکرا ئیتر خۆمی لێبشارمەوە. ئەو ڕۆژە لەو جێگایەدا دامناو هەموو چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە، چیرۆکی خۆی و چیرۆکی من. لەگەڵ هەر بەشێکی قسەکانمدا ترس و سامێکی بێسنوور دەکەوتە سەر سیمای، چاوانی هێندە ترسابوون و لەشی وەها دەلەرزی، بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا لە تەواوی دڵییەوە هاواری خودای کرد. زۆرم هەوڵدا بۆی ڕوونبکەمەوە کە خودا کارێکی بە چیرۆکی من و ئەوەوە نییە، بەڵام تا زیاتر قسەمدەکرد، تا زیاتر دەچوومە وردەکاری ژیانی خۆم و خۆیەوە بڕوایەکی سەیرتر و بەهێزتری لا دروستدەبوو کە سەروکاری لەگەڵ مەخلوقێکی غەیبیدا هەیە کە نزیکە لە جنۆکە و خێوە ڕەشەکان و دێوەزمە خنکێنەرەکانەوە. هەوڵەکانم بۆ هێورکردنەوەی سوودێکیان نەبوو. سەرەتا وامدەزانی هێشتا کاریگەریی مەستی بەرینەداوە و هێزی تێکشکێنەری مەی دەستی لە خەیاڵی وەشاندوە و شتەکانی بۆ کۆناکرێتەوە، بەڵام بەوجۆرە نەبوو. ترسێکی قووڵ و دێرین لە ناخیدا بوو، ئێستا دەرفەتی بۆ رەخسابوو بێتەدەرێ. ترسی ئەوەی بوونەوەرگەلێکی غەیبی بەدوایەوەن و کارێکی بەدیان پێیەتی و ئەوان هەمیشە بە لاڕێدا بردوویانە. لە کۆتاییدا گریا و گووتی ئەو زانیوێتی هەموو ژیانی شەیتان بەلا ڕێدا بردوێتی و ئەوەتا ئێستا دەبینێت و بە ڕوونی هەست بە هەموو شتێک دەکات. زۆرم هەوڵدا تێیبگەیێنم کە شەیتان ئەوە و فریشتە منم... سوودێکی نەبوو، ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی هەرچییەک لە ژیانیدا کردوێتی شەیتان پێیکردوە و شەیتانەکەش منم. ئەوە کێشەیەکی گەورە بوو بۆم هاتە پێش، من دەمزانی مرۆڤەکان بوونەوەری نامەنتیقین و شێتانە لە ژیان دەڕوانن، بەڵام ئەوەی مەهدی دەرکەوتنی منی بە دەرفەتێکی باش زانی تا هەموو گوناهی ژیانی بخاتە ئەستۆی شەیتان، ئەوە گرفتێکی نالەبار و نوێ بوو کە من ئەزموونێکی پێشوەختم لەگەڵیدا نەبوو. تێگەیاندنی ئەم پیاوە تێکشکاو و

گوناهکارە ئەستەم بوو، جگە لەوەی ڕێگای بدەمێ بڕوات و پێیبڵێم بە زووترین کات دەگەڕێمەوە لات و من و تۆ یەک کەسین و دەبێت پێکەوە بیر لە پاشەڕۆژێکی تر و ژیانێکی تر بکەینەوە، کاری ترم لە دەست نەهات. کە مەهدی لێم دوورکەوتەوە دڵنیابووم چیتر ئەو پیاوە مەستەی دوێنێ شەو نییە کە من دامە کۆڵمدا... هەستمکرد تووشی دوودڵییەک بوو کە بە خۆی چارە ناکرێت. هیچ شتێکیش لەوە ترسناکتر نییە مرۆڤ چارەی دوودڵییەکانی خۆی بداتە دەست کەسانی تر. لەو ساتەوە هەستمکرد ئیتر من بەرپرسیارم لەوەی کارێکبکەم ئەو دوودڵییە گەورەیەی دەرکەوتنی من دروستیکرد، بێتەوە دەستی من و من چارەیبکەم. ئومێدێک نە ئاسان بوو، نە ڕێگا و ڕەوشێکی ڕوونیشم بۆی هەبوو.

## پەترۆس و ئاسمان

***زۆرجار دەریاوانان بۆ خۆشی / ڕاوی ئەم باڵندە گەورەیەی دەریا ئەلپەترۆس دەکەن/ کە بێخەم وەک ڕێبواری سەفەر دوای کەشتییەک دەکەوێت/ دەمێ ئەو بەسەر گەرداوە هارەکاندا دەخزێت/ هێندەی ئەم پادشایەی ئاسمان نیشتەوە لە سەر کەشتی/ نارێک و شەرمنۆک، چەشنی سەوڵەکانی ئە ملا وئلا/ باڵە گەورە سپییەکانی شۆڕدەکاتەوە،/ بە جۆرێک شایەنی بەزەییە/ دزێو و خەندەهێن/ ئەم ڕێبوارە باڵدارە کە گەلەک جوان و شکۆداربوو/ یەکێک بە سەبیلەکەی دەکێشێ بە دەنوکیدا/ یەکێک بەدوایدا شەلە شەل لاسایی دەکاتەوە/ شاعیر زۆر لەم شازادەیەی نێو هەوران دەچێت/ کە لە نێو زریاندا نیشتەجێ و گاڵتەی بە تیرهاوێژان دەهات/ لەسەر زەوی نامۆیە لە ناو هوردوو و حەشاماتدا/ باڵە زەبەلاحەکانیشی دەچنە بەرپێی و ناهێڵن بڕوات «تشارلز بۆدلێر»***

قەسیدەکەی چەند جارێک خوێندەوە... دەبوو زۆر بیربکاتەوە. بۆ بولبولیار لە سەرەتاوە تەنیا ئەم شیعرەی بۆ دەنێرێت و بۆی دەنێرێتەوە، پەیامی

نهێنی پشت ئەم کارە چییە. یەکەمجار کە لە سەرەتای ژیانی ئەدەبیدا بوو، واتێگەیشت کە تەنیا خولیای بووە سەرنجی بۆ شیعرێک ڕابکێشێت. بەڵام ئەوەی جارێکی دی هەمان قەسیدەی بۆ بنێرێتەوە مانایەک و نهێنییەکی لە پشتە دەیترسێنێت. نەغەدە هیچ کات ژنێکی گەمژە نەبووە، بەڵکو لەو خانمانەیە کە زیرەکییەکی شەڕانگێزانەیان هەیە، واتە دەتوانن شیفرەی نهێنی پشت هەر هێمایەک بخوێننەوە... ئێستا بە وردی بیری نەبوو دواجار کە ئەم نامەیەی بۆ هاتووە نەیخوێندۆتەوە یاخود فەرامۆشیکردوە، دوور نییە خوێندبێتییەوە و بەسەریدا تێپەڕی بێت، دوور نییە ئەو کات لە ماناکەی تێنەگەیشتبێت، بەڵام ئێستا کە بووە بە خانمێکی تر، بووە بە ژنێک لە سەرەتای وەرزێکی تری ژیان و لە بەردەم ڕۆژگارێکی نوێدایە ترسی تازە و هەستی نوێی بۆ دروستبووە، ناتوانێت قەسیدەکە وەک پەیامێکی نهێنی و ماندار بۆ خۆی تەماشانەکات. دوای لە هۆشچوونە کوتوپڕەکەی، ڕۆژێک دواتر منی بانگکردەوە، کراسێکی سپی فشی لە بەرکردبوو، باڵای بەرز و قژی بە جۆرێکی فیتنەکارانە داهێنابوو، بەڵام جوڵەکانی خاو و ڕەوتی هەر بەڕاستی شێوەی باڵندەیەکی گرتبوو باڵە درێژ و ماندووەکانی نەهێڵن ئاسان بڕوات. گووتی «عەقید گیان، دەمەوێت بزانیت بۆ ئەو ڕۆژە لە هۆشچووم و ئاوا گیانم تێدا نەما. هەمووی پەیوەندی بەو هاوڕێ دێرینەمانەوە هەیە، بولبولیار. بیخوێنەوە، ئەو شیعرە بخوێنەوە، بزانە چی تێدەگەیت». خۆشحاڵ بووم خانم لە شتە زۆر تایبەتییەکانی خۆیدا ئاوا متمانەم پێدەکات. من کە شیعر ناسێکی بلیمەت و عاشقێکی بەرزی ئەدەبیات نەبووم، بە شەرمێکەوە لە خانمم پرسی «ئەمە چییە خاتوون گیان، هیچ حاڵی نابم؟». خانم لە دوای وانەکانی باهیرییەوە گەلەک شاژنانە دادەنیشت، گەرچی شێوە دانیشتنی جارانی وەک ژنانی شار نەبوو، بەڵام وەهاش نەبوو وەک ئێستا هێز و دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا دەربخات. ئێستا گەرچی شێوازی پێشوازی و ڕەفتاری بەرامبەر من، وەک دۆست و هاوڕێ بوو، بەڵام توانای باهیری لەسەر گۆڕینی هەموو جوڵە و وەستانێکی مایەی سەرسامی بوو. بە غەمێکی قووڵەوە کە هیچ کات لە گەڕوویدا نەمبیستبوو، گووتی «هاوڕێ دێرینەکەمان، هۆشەنگی هاوڕێمان،

کەسێک کە پێکەوە دەستمانکردە خەبات و من هەموو متمانەیەکم پێیەتی، وەک ژنێکی شاعیریش هەستم نەکردوە هیچ کات لەو کوڕە خوێنەرێکی باشتر و ڕاستگۆترم بووبێت. تاکە پیاوێک لە دونیادا بتوانم پێیبڵێم هاوڕێم... لە ماوەی ئەو ساڵانەدا چەند جار ئەم قەسیدەیەی بۆ ناردوم. دەمەوێت ببینم و تێبگەم بۆ؟ دڵنیام قسەیەکی هەیە بە منی بڵێت. ڕەنگە زۆرجار ویستبێتی دڵی خۆی بکاتەوە و من نەمهێشتبێت، بەڵام دوێنێ ئەم نامەیەی کەوتەوە دەستم، خەریکبووم کتێبەکانم دەنارد بۆ باباعەلی سەحاف، نامەکە وەک شەیتان بەریداتەوە لە نێو کتێبێکی کۆنەوە کەوتەوە بەردەمم. خوێندنەوەی قەسیدەکە کوشتمی، خۆت دەزانیت من ژنێکی ئازادم، بەڵام دەمەوێت تێبگەم ئەوەی ئەم قەسیدەیە باسیدەکات منم یان من نیم. پەترۆسم یان نا؟... ئارام ناگرم و دڵم ناکەوێتە ئاسوودەگی تا نەیدۆزمەوە. من بە ڕاستی پێویستیم بە بینینەوەی بولبولیار هەیە. وا تێدەگەم ئەو کوڕە لە سەرەتاوە نیگایەکی خراپی بۆ من بووە. من پەترۆسم؟ من ئەو شاعیرەم کە لە کەشکەشانی فەلەکەوە بەردەبمەوە و دەکەومە ناو خەڵکی ڕەشۆکی و ئیتر باڵەکانم ناهێڵن بە ڕەوت و ئازاد بڕۆم؟... ئەم شیعرە زۆر ئازارم دەدات عەقید، زۆر. چونکە من هەموو ژیانم ویستوومە لە ئاسمان بم، ڕەنگە بەردەوام نەمویستبێت لە ناو زریاندا نیشتەجێ بم وەک شیعرەکە دەفەرموێت، بەڵام جەنابی عەقید ویستوومە لە ئاسمان بم، دەمەوێت لە ئاسمان بم، کێ نایەوێت لە ئاسمان بێت؟. بولبولیار نەبێت کێ هەیە حەزنەکات هەمیشە لە لوتکەدا بێت؟ منیش ئێستا خۆم دەناسم، کەسێکم بە سروشت نامکرێت تا مردن لە خوارەوەی دونیا بم و بڵێم هەر لە ڕیزی ڕووت و ڕەجاڵ و لات و لومپاندا یاخی دەبم. ژیان فێریکردم یاخیبوونی خەڵکانی بەهێز لە یاخیبوونی لات و لومپنان جیابکەمەوە، ئێستا هەر شتێک بەوە دەپێوم، ڕۆژێک لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا بووم وامدەزانی هەموو کەسانی بڵند و گیانی سەرکەش و لوتکەنشینن، بەڵام تۆ خۆت حیکایەتی من دەزانی، ئاگاداریت چیم بەسەرهات و بە چ جەهەنەمێکدا ڕۆیشتم کە ئەگەر ژنێکی بەهێز نەبوومایە خودا دەیزانی ئێستا گۆڕ و گڵکۆم لە کوێ بوو. تۆ چی دەڵێیت جەنگیز گیان... ها.. وانییە.

ئەو سەردەمە بەسەرچوو وابزانین هەر لەگەڵ لات و لومپێناندا دەشێت یاخی ببین. بەڵام هەستدەکەم ئەو بەردەوام منی لەسەر زەوی بینیوە، وەک باڵندەیەک توانای فڕینی دۆڕاندوە، وانییە کاک عەقید، تۆ جوان قەسیدەکە بخوێنەوە، نازانم ئەو کوڕە بۆ وەها دەمبینێت؟ بۆ لە سەرەتاوە بەو چاوە لە منی ڕوانیوە کە ڕۆژێک دێت بەربمەوە و باڵم لە بری ئەوەی لە هەور و بەرزیدا شەقەی بێت، لە تەختی پیسی هەر ئەرد و هەر جێگایەکی چەپەڵ دەخشێت؟. ئاخۆ ڕاستدەکات، من وام ... هەر لە یەکەم ڕۆژەوە وابووم؟ من ڕقم لێی نییە، بەڵام دەمەوێت ببینم، پێویستم پێیەتی... لە ناخی دڵەوە دەمەوێت ببینم. دەمەوێت قسەی لەگەڵدا بکەم و بزانم پەیوەندی نێوان من و پەترۆس چییە. جەنگیز گیان خۆت ئەو کوڕە دەناسیت، لەو دواییەدا دژی هەموو شتێکی من بوو، عومەری تەنیا وەک جانەوەرێک دەبینی. ئاخ خۆزگە ئەو شتەم هەر نەدیبایە، ئەو کتێبانەم هەر نەناردایە لای سەحاف... بڵێ من چیم بوو لەو مەراقە زیادە ئێستا بێتە ڕێگام».

خانمم بەردەوام وشک و بەهێز بینیبوو، کەچی بولبولیار بە نەرمی درزێکی گەورەی کردبووە ئەو دیوارە ئاسنینەی ماڵی دڵنیایی ئەو. دڵنیابووم شازدە ساڵ لە مەوبەر، دەمێک بولبولیار ئەو قەسیدەیەی بۆ یەکەمجار داوەتە ئەم خانمە، ترسی ئەو ڕۆژەی هەبووە بەربێتەوە و وەک ئەو باڵندەیە ببێتە مەلێکی بێئەفسون. من دەمزانی بولبولیار لە هەر کەس زیاتر، هێز و توانای خانمی ماردینی دەناسێت، بەڵام لە هەموانیش زیاتر توانیویێتی ئەو ڕێگایە ببینێت کە خانم لە داهاتوودا پێیدا دەڕوات. غەمخۆری ساڵانی سەرەتای بۆ ئەوەبووە، خانم وەها لە بەرزایی فەلەکەوە بەرنەبێتەوە بۆ سەر زەوی. من نەمزانی چی بە خانم بڵێم، هێند هەیە قەسیدەکەم بە جوانی قەدکرد و بە هێمنی دامەوە دەست خانم و بە ئەدەبێکی زۆرەوە گووتم «خانم لەوانەیە پەترۆس ئێوە نەبن، لەوانەیە من بم، لەوانەیە شۆڕش بێت، دەمێک لە ئاسمانەوە دادەبەزێتە سەر زەوی... کێ چوزانێت؟ لەوانەیە هەمووومان بین. کێ چوزانیت؟ خانم گیان؟ کێ چوزانێت؟».

خانم بە شپرزەییەکی زۆرەوە داوای لێکردمەوە کە هەر چییەکم کردوە، بولبولیار بدۆزمەوە و گەر بە قۆڵبەستیش بووە بیهێنم بۆی. داواکارییەکەی خانم ئاسان نەبوو، سوێندم بۆ خوارد هیچ درێغییەکم نەکردوە و ڕێگایەک نەماوە نەیگرمە بەر، چی هێزێک و چی ئامێرێک وا لە بندەستمدا خستوومنەتە کار، هەموو بەڵگە و نیشانەکانیش وادیارن هەر لە شاردا بێت، بەڵام وەک کلیلی دونیایەکی نهێنی پێبێت، خۆی لە کونجێکی تاریک خزاندووە و جارێکیش دەرناکەوێت، بزانین بۆ وەک ئاسکی بیمار بەوجۆرە سڵۆک و ڕەمیدەبووە. من هەموو کەسم ڕاسپاردوە، بەڵام چی بکەم، هێزی ئەفسوناویم نییە و سەرەداوێکم گیر نایەت بمکرێت لەوێوە دەست پێبکەم و بیدۆزمەوە.

خانم لە دونیا نوێکەیدا دەیویست لە جوانیدا وەک تاوس و لە بەرزەفڕیدا وەک تەوار بێت. ئێستا خۆی لە نیگارێکی ترسناکی تردا دەبینی، وێنەی باڵندەیەکی دەنوک زلی کەوتوو کە لە ئاسمان بەربۆتەوە و لە سەر تەختی کەشتییەک باڵە شۆڕەکانی و شێوەی ڕۆیشتنی مایەی گاڵتەجاڕی و پێکەنینی هەموانن. ئەوە غروری ژنانە و شاعیرانەشی بە جۆرێکی کوشندە بریندارکردبوو. وەک ئەوە بوو چی شکۆ و ویقارێکی دەستکرد کە باهیری لە ناویدا چاندوێتی و لە وانەکانی ئەوەوە فێربووە بە کاری ئەو نیگاری پەترۆسە، یەکجار و بۆ هەمیشە تێکشکابێت. هەستمکرد تا نەچووبووە بندەستی باهیری، تا ئەو خواستە نهێنی و گەورەیەی لادروست نەبوو بوو وەک میرخانم بژی، ئەم شیعرە بەوجۆرە نەیترساندبوو. وای بۆچووم خانم پێشتریش قەسیدەکەی هەر بەرچاوکەوتووە، بەڵام دەمێک دەیزانی بە جۆرێک لە جۆرەکان هێشتا هەر باڵندەی ئاسمانە و بەرنەبۆتەوە سەر زەوی، ترسی لەوە نەبووە لەو پەترۆسە گەلاگەڵکەرە بچێت، دەمێک دەنیشێتەوە و لە بڵندایی هەورانەوە دەکەوێتە ناو ئاپۆرەی قۆشمەبازان و لاقرتیکەران کە بۆ تیز دەکەونە دوای و شەلەشەل لاسایی ڕەفتار و ڕۆیشتنی دەکەنەوە.

نەمدەزانی بەڕاست منی تەنیا بۆ ئەوە بانگکردوە تکای دۆزینەوەی بولبولیارم لێبکات، یاخود هەر ویستی گرێیەکی دڵم لابکاتەوە کە دڵنیابوو لای هیچ کەسی دی وا ئاسان بۆی ناکرێتەوە. من هەم ناسیاوی کۆن بووم، هەم هەڵگری زۆر نهێنی دێرینی ئەو بووم، هەم درەنگ و زوو چیرۆکەکان دەهاتنەوە بەردەمم. نازانم ئاخۆ دواتر قەسیدەکەی پیشانی کەسێکی دی دابوو یان نا. بەڵام وەک هەر کەسێکی ئەو سەردەمە کە ئامادەنەبوو وەها سووک و سانا دەست لە غروری خۆی بەردا، دەیویست هەر شتێک بکات وێنەی ئەو پەترۆسە باڵشۆڕە لە خەیاڵی خۆی دەربهێنێت و فڕێیبدات و لەوە نەکەوێت خۆی هێشتا وەک تەوارێکی بەرزە فڕ ببینێت. ساڵانێک دواتر ڕامسپارد دیوانی گوڵەکانی خراپەم بۆ بکڕن تا هەمیشە لەلام بێت و هەر کات خانم هاتەوە خەیاڵم، بیخوێنمەوە.

من گەرچی بە ڕووکەش و هەندێ جار لە دڵیشەوە ڕێزم بۆ خانمی ماردینی دادەنا، بەڵام ئەوەی دەمبینی خۆی و مێردی بەو شێوەیە دەتوانن پێشەنگی هاتنی سەردەمێکی نوێ بن، ئیرەییەکی زۆرم پێدەبردن و شکانی غروریانم بە شکانی ڕواڵەتی درۆزنێ سەردەمێک دەزانی کە من هێشتا خەیاڵم بوو کار لە ناخیدا بکەم و دەروونی بکۆڵم. دڵنیابووم خانمی ماردینی ئەم سەردەمە وەک تەختی شانۆییەکی گەورە دەبینێت کە تاوسکارانە لەسەریدا پەڕی قەشەنگی خۆی دەرخات، ئەو ئەم سەردەمە تازەیەی وەک ئاوێنەی سافی ئارایشتگایەک تەماشادەکرد کە دەچێتە بەردەمی تا تاقانەیی و ناوازەیی خۆی دەربخات. ئەو ڕۆژەی قەسیدەکەی نیشاندام، من مەراقی زۆرترم هەبوو، کێشەی پەیوەندی ئەو بە پەترۆسەوە وەک کێشەی پەیوەندی نێوان خۆی و ئەو وێنەیە هاتە بەرچاوم کە باهیری بۆی دروستکردوە. باهیریی فێریکردبوو وەک شاژن بێت و بڕوات، بەڵام ئێستا لە ناکاو ئەو نامە سەیرە، ئەم قەسیدە مەلعونە کە بولبولیار وەک بیەوێت بیترسێنێت، وەک بیەوێت سزای بدات، ئا لەم سات و کاتەدا دەردەکەوێتەوە. من کە چووم نیازێکی ترم لە دڵدا بوو، کە سەیریدەکردم دەترسام بتوانێت هەستە تاریکەکانم بخوێنێتەوە، خەریکبوو بیدرکێنم کە

دەمەوێت ئاسمانی بچکۆلە بکەمە کچی خۆم و حەزانەتی تەواوی لە ئەستۆبگرم، بەڵام دوودڵییەکی کتوپڕ گرتمی و ترسام گەر بزانێت خواستێکی وەها لە دڵمدایە، هەر زوو کچەم لێبستێنێت و کەسێکی تر بکاتە سەرکاری، دواتر بۆم دەرکەوت هەستەکانم ڕاستبوون و گەر شتی وام بدرکاندبایە، بەختێکم نەبوو خانم قەبووڵیبکات. دەمزانی لە ڕووی خۆپاراستن و بە نیازی ئەوەی چیرۆکی کچەکەی نەکەوێتە سەر زاران بیری وەها بە شێتی دەزانێت و وەک سەرەتای ئابڕووچوونێکی دی دەیبینێت. هەڵبەت گەر منداڵە نابیناکە ببایەتە کیژی من، دەبوو من دەمودەست لە بەڕێوەبەرایەتی سەرنشین و ناونوسین بمخستایەتە سەر خۆم و بەناوی خۆمەوە شوناسنامەی نوێی بۆ دەربهێنم، ئەوەش مانای دۆسییەکەی بهێننەدەرێ و بزانن کێ کەسوکاری ئەسڵییەتی، مانای خۆی و ئاغای هاوسەری بێن و ئیقرار بدەن تا ببمە باوکی ڕاستەقینەی، کارێک دڵنیابووم خانم هیچ کات نایکات و خۆی ناخاتە بەر گێژاوی وەها و ئابڕووی خۆی ناداتە بەر ڕەشەبای لەوجۆرە، کە دڵنیابوو جگە لە شەرم و شورەیی گەورە، هیچی تری لێ دەست ناکەوێت. ئەو خوێندنەوەیەم هەم ورد و هەم دووربینانە بوو، بەڵام هەرچی بیریشم دەکردەوە گەر ئەو کارە ئێستا نەکرێت دەبێت کەی بکرێت؟ دڵنیابووم تێپەڕینی کات دەبێتە مایەی ئەوەی خانم زیاتر لە ئابڕووی بترسێت و هەڵای وای پێ شەرمتر بێت، ئەوەش خواستی من دەدات بە بادا و وادەکات من هیچ کات نەبم بە خاوەنی ئەو کیژە. دەمزانی خانم دەڵێت «تۆ شێت بوویت، عەقید گیان، شێت بوویت. کاری وا واتای حەیاچوونی تەواوی من، دوایی بچینە سەر هەزار قورئان خەڵکی دەڵێن، ئەو منداڵە بەدبەختەشم لە تۆ بووە ... بەس نییە ئەو هەموو چیرۆکە خراپەی کەوتۆتە دوام، بەس نییە؟ ئێستا هەر شتێکی تر بێتە پێشێ خەڵکی چیان لە یادکردوە دەیهێننەوە سەر سفرە و دەبمەوە بنێشتەخۆشەی ژێر ددانی خەڵکی دێز و بێویژدانی ئەم شارە، چییە جەنابی عەقید، خۆ تۆ دۆستمیت، حەزدەکەیت تا مردن وەک ژنێکی پرهەوەس و داوێنتەڕ ناوم بڕوا؟ ». لەوەدا لەسەر هەق بوو ... منیش و ئەوانیش لە کاری وەهادا ئابڕوومان دەچوو. ئێستا خانم بە

جۆرێکی بێمانا کەوتبووە سەر ترسی حەیای خۆی، پێدەچێت مردنی فریشتەکەی گۆڕیبێتی بۆ ژنێکی موحافەزەتکار کە سڵ لە هەر شتێک دەکاتەوە ناوی خراپبکات. بەردەوام لە قسەیدا ترسی لە خەڵکی «خوێڕی و ڕیسوا» نیشاندەدا، چیتر خاتوونە مگێزەکەی جاران نەبوو، حەزی لەوە بێت بەدناوییەکانی بە دونیادا بڵاوببنەوە. بەڵام منیش جیاوازییەکی زۆرم لەگەڵ ئەودا نەبوو، منیش کەسێک نەبووم داب و نەرێت بنێمە پشتی سەر و بڵێم دەی عەزیزان بە جەهەنەم چی دەگوزەرێت با بگوزەرێت. لە بەر کەس نا، لە ترسی گڤە و ڕووتاڵی سەرۆک کە دەیویست من ئابڕووی پاکی خۆم بپارێزم و ناموسی خۆم لەگەڵ ناموسی حیزبدا ئامێزانکەم، هەمیشە دەیگووت «هەتیم لە هەمگێکی زۆریان سەگبابتری، وەلێ هەقی خودایە هێشتا ناموست هەیە و نێوگەرت وەک ئەوانی تر بۆگەنی لێ نایە، دەی خۆت تماشایە بکە، بزانە رەفیقە دەبابەخۆرەکانی دوێنت جگە لە گەروگون هیچیان ماوە؟». نەمدەزانی گەر چیرۆکی چوار ژنە کوژراوەکەش بزانێت هەر وادەڵێت؟. بەڵام سەرۆک بەڕاستی دەیویست هەموو ئەندامان و بەرپرسانی حیزب وادیارنەبن کە کۆیلەی ئارەزوو و شەهوەتەکانیانن. هۆیەک بووبووە مایەی ئەوەی دەست بە منەوە بگرێت، ئەوەبوو دەیگووت، بەوانی دی ناچم کە هەر دەگەنە بەر دەمی خانمێکی بەستەزمان، ئەو هێشتا نەیگووتووە مەرحەبا برام، ئەوان شەرواڵی خۆیان هێناوەتە بن چۆکان.



من و خانمی ماردینی یەک شتی دیمان هەبوو لە یەک دەچوو، من و ئەو کە خولیایەک دەکەوتمە سەرمان دەبوو بە هەر ڕێگا و کونێکدا بووە بیگەینێ. ئەو هەوای دۆزینەوەی بولبولیار دابووی لە کەللەی و منیش ئێستا هەستێکی تاریک و دڕ و ترسناک دەیخواردم، ئەو کچە نابینایە

هەڵگرمەوە و بیخەمە سەر ناوی خۆم و لە فایلەکانی دەوڵەت و بەڕێوەبەرایەتی سەرنشینی ببم بە باوکێکی ڕاستەقینە. من نەمدەزانی تا چەندی تر لەم پۆستەدا دەبم، دەمزانی حیزب ئامانی نییە و هەر ساتێک بێت، گەر تەنیا بۆ خۆشی و گۆڕانکاری ڕوکەشیش بووە، من دەهاوێژنە دەر، ڕووتمدەکەنەوە و لە هەر دەسەڵاتێک دامدەبڕن، کە ئەوەش هاتە پێش توانای زۆر شتم نامێنێت. ڕۆژێکیان ناردم بە دوای ئەو فەرمانبەرەی کە تەواوی تۆمارەکانی بەڕێوەبەرایەتی نفوسی لەلایە. ژنێکی حیجابداری ورگ زلی شەڕانی بوو، لەوانەی بە زەحمەت هەناسەیان بۆ دەدرێت و دەجوڵێن و قسەدەکەن و گوێشدەگرن. ئاشکرا هەموو ژیانی لە ناو تۆمار و نوسراو و بۆڵەبۆڵی بەردەوامدا ژیابوو. چاوانی پڕبوون لە گومان، کە هاتە ژوورێ و بەجەستە زلەکەیەوە لەسەر کورسییەکی بچوک بەرامبەرم دانیشت، ناوچاوانی هەمووی تکە و تنۆکی عارەق بوو. نازانم ترسی چاوپێکەوتنەکەی من شڵەژاندبووی یان خۆی کەسێک بوو لە شڵەژانێکی هەمیشەییدا دەژیا. پێمگووت هۆی داوەتەکەم شتێکی زۆر نهێنییە، کە پەیوەندی بە هەندێک کاری زۆر گرنگ و تایبەتەوە هەیە و لە جێگای باڵاکانی حیزبەوە ڕاسپێردراوم کە دەبێت ئەو کارە بکرێت و بە نهێنی بمێنێتەوە. چاوانی پڕبوون لە ترس و گومان، بە دەنگێکی خیشن و نیگایەکی منجڕەوە گووتی «چییە؟ تۆ خۆت دوایی تەحەمولی هەموو شتێک دەکەیت؟». لە جێگای خۆم هەستام و ناوی ئاسمانم لەسەر کاغەزێک بۆ نوسی و دامەدەستی و گووتم «ئەم ناوە لە سجلەکاندا دەدۆزیتەوە و دەیخەیتە سەر ناوی من، منداڵەکە شەش ساڵانی تەواو نەکردوە، ناوی دایک و باوکی ئەسڵی دەسڕیتەوە و دوو ناوی تر دەخەیتە جێگایان». بە مۆنییەکەوە دیاربوو هەموو ژیانی خووی پێوەگرتووە گووتی « سجلەکان زۆربەیان لە ڕاپەڕینەکەدا سووتاون». گووتم «دەزانم، باشتر، گەر سووتا بوو ئەوا لەسەر ناوی من و دایکێکی خەیاڵی، دایکێک کە خۆت دروستیدەکەیت شوناسنامەی نوێ و سورەت قەیدی تازە و فایلی نوێی بۆ دروستدەکەیتەوە. گەر نەشسووتابوو، ئەو سجلە دەسووتێنیت و ئەو کارە دەکەیت». دەمزانی کارەکە سەختە، بەڵام چما

چاری ترم هەبوو؟. بە دوودڵی کەسێکەوە فێربووە لە هەموو کارێکی ئیدارییدا گرێیەک بدۆزێتەوە و گرفتێک سازبکات، گووتی «گەر سجلەکان مابوون، پێویستیم بە ئیقرار و ڕەزامەندی دایک و باوکی منداڵەکە دەبێت». کە وایگووت من بەهەموو هێزم دەستم کوتا بە مێزەکەی بەردەمیدا و هاوارمکرد « تۆ فەرمانبەری دەوڵەتی یان ژنێکی بێمێشکی... چیت؟». لە شوێنی خۆی ڕاچەنی و لە ترسدا ڕەنگی سپی بوو، هەستمکرد شێوەی هەناسەدان و سەیرکردن و دانیشتنی هەمووی گۆڕان، زۆر زۆر ترسا، بەڵام نیگایەکی کەچ لە چاوانیدا بوو وەک خۆی مایەوە. بە هۆی ترسەوە بوو یان بە هۆکاری گۆشتنی و قەڵەوی، بۆ ئێستێکی کورت هەوای بۆ نەکێشرا و هەناسەی وەستا، ئەوەم پێخۆش بوو، چونکە ئیدی بەشی پێویست دەنگ لە گەرویدا نەبوو قسەبکات. لەسەر تورەبوونی خۆم بەردەوامبووم و گووتم «گەر دایک و بابی ئیقراربکەن و ڕەزامەندبن، کارم بە تۆ چییە، تۆم بۆ هێناوە بۆ ئێرە. ئەوە زانین و ماریفەتێکی دەوێت تۆ تێینەگەیت. تۆ چ موچەخۆرێکی دونیانەدیوی کە نازانیت هەندێ کار هەیە دەبێت بە نهێنی بکرێت، چونکێ شتی گرنگتری بە دواوەیە. من فەرمانێکت پێدەدەم و لە بەر ئاسایشی وڵات و شارەکە بێدەنگ و بە نهێنی جێبەجێیدەکەیت. تۆ ئێستا لە دائیرەی ئاو و کارەبا نیت، لای بەڕێوەبەری دەزگای ئاسایشی گشتیت... ئەوە ئێوە بۆ هێند نانەجیبن، فەرمانی کورد نرخێکی لاتان نییە و ئاوا سووک و بێسایە سەیرماندەکەن، گەر ئەمنی عەرەب باین، دەهاتین لە ژوورەکانی خۆتاندا لە دائیرە سوارتاندەبووین و ئیشەکەشمان پێدەکردن. بەڵام بەو پەڕی ڕێزەوە و بە سەیارەی خۆم ناردوومە بەدواتدا، کەچی حۆل حۆل باس لە ئیقراری دایک و باوکی بۆ من دەکەیت. ئەوە کاری نهێنی حیزبە، شتێکی گەورە لە پشت ئەم ئیشەوەیە، تۆ خۆشت تەنیا کەسی بەرپرسیت لە هەموو شتێک و هەموو شت بە تەنیا لە ملی خۆتە. هەر هەڵەیەکیش لەو کارەدا بکەیت، یان بهێڵیت نهێنییەکەی بڕواتەدەرێ، بزانە یاریت بە ژیانی خۆت کردوە... ئەوکات وای لە خۆت و وای لە حاڵت». ژنەکە زارەترەک بوو، وەها ترسا گووتم ئێستا نا کەمێکی دی

دڵی دەوەستێت. کەمێک بە بێدەنگی لەسەری وەستام تا توانی هەناسە وەربگرێت و بکەوێتەوە قسە. ژنێک بوو لە توخمی سەرسەختان، لەوانەی گەر ترسی تەواویان لێ نەنیشێت، لەسەر ملنەدان و کەللەڕەقی پێدادەگرن. بەڵام لە شێوازی قسەکردنی مندا زانی ئەوەی دەمەوێت گەر لە سەر لاشەی ئەویش بووە جێبەجێدەبێت. چەند چینێک عارەقی دەردا و چەند جارێک ڕەفتەی حیجابەکەی توندکردەوە و لە نێوان شەرمی ژنانە و بێدەنگی قیناوی مەخلوقێکی کینەدۆزدا، نیگاکانی پڕ لە ترس، پڕ لە شەرم، پڕ لە ڕق بوون. چوومەوە پشتی مێزەکەم و پاش ئێستێک بەردەستەکەی خۆمم بانگکرد و گووتم «چایەک بۆ خانم بهێنە». لەو کاتەوەی لە ئاسایش کارمدەکرد ئەوە شێوازم بوو، توڕەبوونی خێرا، هێوربوونەوەی خێرا، هەڵچوونی کتوپڕ، ساردکردنەوەی بە کاوەخۆ ... بەوجۆرە تا لەو وازییە بەردەوام و چێژبەخشەدا بەرامبەرەکەم لە کاریگەریی لێکدانی بەردەوامی نەرمی و ڕەقیدا دەشکا و ئەوەی دەگووت و دەکرد کە من نیازم بوو. ژنەکە هاتەوە سەرخۆی، ئێستا لە دۆخێکدا بوو نەیدەزانی چی بڵێت، منیش لەسەرپێ بووم هەر جۆرە چەنەحاڵییەکی بێسوود دابمەزرێنێت، بەسەریدا بخوڕم و هەناسەی بتاسێنم و زارەترەکی بکەم. ژنەکە دواجار بە دەنگێکەوە کە خاڵی نەبوو لە قینێکی شاردراوەی گەورە، وەک کەسێک بەزۆر تاوانێکی ترسناک ئەنجامبدات، گووتی «هەموو ناوەکانم بۆ بنوسە، ڕەسمم بۆ بنێرە. بەڵام بزانە هەر شتێک کەشف بێت، من حاشای لێدەکەم و ناچمە ژێرباری. دڵنیام خوداش عەفوومدەکات، چونکە تۆ بە زۆر ئەو کارەم پێدەکەیت». من هێورمکردەوە و گووتم «خانم دڵنیابە هیچ کەسێک بەمە نازانێت، دەبێت دۆسییەکان هەموو بچنە ژێرێ. ئەمە منداڵێکە دایک و بابی خۆی نایانەوێت، خستوویانەتە ملی خەڵکی تر، بەڵام هۆی گرنگ هەیە ناتوانن ئەوە ئاشکرابکەن. هیچ کەسێک دوای ئەم مەسەلەیە ناکەوێت و کەسیش نایەتە سەر ڕێگای تۆ و وەک ژنێکی خوداناسیش بزانە، بەو کارەت ئیشێکت بۆ خودای خۆت و بۆ مەخلوقێکی بەستەزمان کردوە و بەخێر بۆت دەنوسرێت. چونکە ئەو کچە ئێستا لەم دونیا گەورەیەدا لە من زیاتر

کەسی تری نییە». نەرمی لەگەڵ ژناندا چەکێکی ئەفسوناوییە و هەمیشە کاری خۆی دەکات، ئەوان چەندە بە فرمێسک ئێمەی پیاو دەنێنە جوغزی تەنگەوە، ئێمەش لە بەرابەردا بە نیشاندانی میهرەبانی درۆ، خراپتر دەیانخەینە سەر کار و نیازی خۆمانیان لێدەستێنین. ژنەکە دوای خواردنەوەی چاکە، کەمێک ڕەنگی تێگەڕاوە، هەستمکرد ئیتر پێویست بە هیچ هاوارێکی تر ناکات و ئەم ژنە پەپوڕەنگە ئیشم بۆ دەباتەڕێوە.

زۆری نەبرد دەنگۆی سووتانی ئەرشیفێکی دی لە نفوس بڵاوبووەوە، بۆ ئەوەی شتەکان چەوتە ڕێ نەگرن، خۆم بێ هیچ پاساوێک، تەنیا وەک بەرپرسی ئاسایشی شار چوومە دائیرە و ژوورە سووتاوەکانم بەسەرکردەوە، هەندێ وردە لێپرسینەوەم کرد و لە هەندێ فەرمانبەری بەستەزمان تورەبووم و بەدبەختێکی پاسەوانیشم ڕەوانەی گرتووخانە کرد. پاش دوو هەفتە لەوە من شوناسنامەی ئاسمان وەفا ڕەفعەت لە گیرفانمدا بوو.

دەبێت بڵێم کە ئاسمان هەر نابینا نەبوو، بەڵکو کچێک بوو هەستی بە دەوروبەری تەواو کەم بوو، توانای قسەکردنی زۆر لە خوار بوو، بە ئەستەم دەیتوانی هەندێک وشە بڵێت، گەرچی لە دایک و باوکێکی جوانیش بووبوو کەچی پێنەدەچوو هیچی لە جوانی ئەوان بردبێت، هەر ئەوە نەبوو بەکاری نابینایی ڕوخساری شێوابێت، بەڵکو هێڵکاری سیمای، سروشتی دەرکەوتنی ماسولکە و ئێسکەکانی، کەوانەی برۆ و چەنەی، هەر لە منداڵییەوە دیاربوو کە پاشەڕۆژ خانمێکی جوانکیلەی لێ دەرنایەت، لەو تەمەنەوە بەکاریگەریی دەردێکی نادیار قژی کەوتبووە وەرین، من یەکەمجار کە باوەشمکرد و دەستم بەسەریدا هێنا، هەستمکرد کە قژی بە جۆرێکی نائاسایی تەنکە و تەنانەت بە دەست پیاهێنانیش دەوەرێت. منداڵێکی ئارام بوو، یەکەم شەو کە بردمەوە، قسەیەکی ئەوتۆم نەکرد، ئەو منی نەدەبینی، هێندە بوو دەیزانی کە چیتر لەو جێگایەی جاران نییە و گوێی لەو دەنگانە نییە کە هەردەم گوێی لێ بووە، وەک منداڵی تر نەبوو بگری و هاواربکات و داوابکات بیبەنەوە بۆ هەواری کۆنی، پێدەچوو

هەوای دونیای ئێمە بۆ ئەو لە هەموو گۆشەیەکدا وەک یەک بێت، یان لەوەتەی بووە کەس هیچ شتێکی بۆ جێبەجێ نەکردبێت تا فێربێت بۆ شتەکان بگری و بە فرمێسک بگاتە نیازی خۆی. سەرەتا هەر لەو جێگایەدا دانیشت کە من دامنا و وەک بە هەستە نهێنییەکانی درێژیی و پانی جێگاکە پێوەربکات، سەری بە هەموو لاکاندا گێڕا، دوایی بە وریایی گیاندارێکەوە ئامادەبێت هەموو پەلامارێکی ناگەهان بە پەرچەکردارێکی خێرا و زیرەکانە وەڵامبداتەوە، لە دۆخی ئامادەباشێکی سەرنجڕاکێشدا دانیشت، پاش ماوەیەک بێدەنگی، وەک ئەوەی گەیشتبێتە هەندێک دەرەنجام، لە جێگای خۆی هەستا و بە کاوەخۆ کەوتە هەنگاونان، ئاشکرا دەیزانی یەکێکی تر لە ژوورەکەدایە، بەڵام دڵنیاشبوو ئەو یەکە جگە لەسەیرکردن هیچی تر ناکات. هەستمکرد بۆی گرنگ نییە من بدۆزێتەوە یان چاوەڕوانی شتێکی دیاریکراوم لێ بکات، هێندە هەبوو دەیویست شوێنەکە بپشکنێت. کورت و لەسەرەخۆ هەنگاوی دەنا، وەک یەکێک بە نزیک کەسێکی خەوتوودا بڕوات و نەیەوێت بە چرپەیەکیش وەئاگای بهێنێتەوە. کەمێک بە ژوورەکەدا سوڕایەوە و هەستێکی ناوەکی هێوریکردەوە و بە ئارامییەکی ڕوونەوە، وەک توانیبێتی بزانێت هەڕەشەیەکی هەنوکەیی لەسەر نییە، بە چ ڕێگایەکدا هاتبوو، بە هەمان ڕێگادا گەڕایەوە سەر کورسییەکەی خۆی. ئەوە یەکەمجارم بوو لە نزیکەوە بەوردی سەرنجی منداڵ بدەم. چاوە چنۆک و نیگا بڕندە و درک ئاساکانم لە هەموو شتێکی دونیا هەڵچەقیبوون لەم بوونەوەرە گچکەلە و ناسکانە نەبێت. هیچ کات نە بوارم هەبوو و نە بەبیریشمدا هاتبوو، منداڵان بخەمە ژێر تیشکۆی ئەو غەریزە ڕەشەی خۆمەوە. دونیای من بە گشتی دونیایەکی بێ منداڵ بوو، نهێنی هەموو جۆرە ئادەمییەک دەهاتە دۆسییەکانی بەردەمم، نهێنی ئەم بوونەوەرە بچوکانە نەبێت. من پێشتر خۆشم لە منداڵان نەدەهات، هەر وەک گەورەیەکی چکۆلانە دەمبینین. من هیچ کات لەگەڵ زاراوەی «جیهانی پاکی منداڵان»، «وردیلە بێگەردەکان»، «ساوایانی بێ گوناهـ» دا نەبووم کە هەر کات قسە بهاتبایەتە سەر دونیای ئەوان، خەڵکانێک بۆ پاککردنەوەی نیگای پیسی

خۆیان لە هەر شت، دەکەوتنە پیاهەڵدان و ستایشکردنی ئەم مەخلوقە بچوکانە. تەواوی ئەو قسانەم وەک سەرپۆشێکی سپی دەبینی کە سەرێکی دێز لە ژێریدا خۆی دەشارێتەوە. زیادەڕەوی لە وەسفی منداڵ و لە خۆشەویستی ئەواندا، جۆرە نمایشێک بوو، خەڵکانێک دەیانکرد تاوەکو بڵێن ببینن هێشتا ناخی ئێمەش بەچەیەکی ساوا و پاکی تێداماوە کە بە سۆزەوە بیری ڕۆژانی منداڵی دەکات. بەڵام هەر کات ناخی ئەوانە بە ڕاستی هەڵکۆڵیت لە بری ئەوەی بگەیتە سەر کانی و کانگای منداڵی، دەگەیتە سەر شوێنی ئاڵۆز و ڕەشتر لەوەی چاوەڕوانتکردوە. هەتا جارێکیش بیستم یەکێک لە چیرۆکنوسانی ئەدەبی منداڵمان کە بە ناسکی و بیرتیژی ناوی دەرکردبوو، لەماڵەوە زۆر خراپ منداڵەکانی خۆی داغدەکات و بە کەوچکی گەرم پشتی دەست و سەرلێو و پەڕەی گوێیان دەسووتێنێت. ئێستاش لەو بڕوایەدام منداڵ خاڵی نییە لە شەڕانگێزییەکی تایبەت بە خۆی، ئەوانیش بە ئەندازەی توانای خۆیان و بگرە زۆر زیاتریش لە توانای خۆیان، حەزیان بە بەدبەختی و غەمگینی ئەوانی ترە. کەمن ئەو منداڵانەی بە ڕاستی ناوی زارۆکی پاکیان بەسەردا ببڕێت. ئاسمان لەو منداڵە هێمن و پاکانە بوو. هەمیشە بێدەنگ لە جێگایەکدا دادەنیشت و وادەردەکەوت وەک بیربکاتەوە، دیارە دەزانم زاراوەی بیردەکاتەوە بۆ منداڵی وەها کارێکی شیاو نییە، بەڵام دانیشتن و دەستخستنە ژێر چەنەی و سەربەرزکردنەوەی ڕوخساری، شێوەی کەسێکیان پێدەبەخشی لە تێفکریندا بێت. من دەمزانی ئەو هێمنییە سەیرەی هێمنی پەپویەکی گەمژە نییە کە لە چاوەڕوانی نێچیردا چاو لە تاریکی دەبڕێت، بەڵکو هێمنی کەسێکە کە هەمیشە شتێکی هەیە بیری لێبکاتەوە، بەڵام بیرکردنەوەیەک هیچ کەس ناتوانێت بگاتە دۆزینەوەی شێوە و بابەت و ناوەڕۆکی.

•

من لەو چەند ساڵەدا زۆر بیرم لەوە کردۆتەوە ئاخۆ کەسێک هەیە بتوانێت بگاتە سنوورە هەرە تەنکەکانی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە، بیرکردنەوەی کەسێک کە نە دونیا دەبینێت، نە دەتوانێت تەواو قسەبکات، نە

قسەوباسێکی لەگەڵ ئادەمیزادانیشدا گۆڕیوەتەوە، بیرکردنەوەیەک دەکەوێتە ئەوبەری زمان و ئەودیوی ڕوانینەوە... بوونەوەرێکی عاقڵ کە پتر وەک ئاژەڵێک سەیرکراوە و تەنیا خواردنی خراوەتە بەردەم. بێگومان بیرکردنەوەی بوونەوەرێکی منداڵ لەو دۆخەدا وەک بیرکردنەوە شەیتانییەکانی ئێمە نییە کە دەیەوێت پەی بە هەموو ئەندازەیەکی سەختی ژیان و هەموو شفرەیەکی تاریکی بوون ببات، نا بەڵام بیرکردنەوەیە لە جۆرێکی دیکە، بۆ نمونە، من واهەست ناکەم بیرکردنەوە لە قووڵایی تاریکی ئاسانتر بێت لە بیرکردنەوە لە دونیای ڕۆشن. زوڵمەت تەنیا لای ئێمە ڕەشێتییەکی بێسنوورە و هیچی تر، بەڵام دڵنیام شار و میترۆپۆلە گەورەکان لە دیدی ئێمەدا چەندە جەنجاڵ و پڕ دیمەن و هەزار ڕەنگن، تاریکیش لای نابیناکان هەمانشێوە، پڕە لە جێگای نادیار و شوێنی بۆ ئێمە نەناسراو. دوائەوە نابینایەک هەمیشە بۆ گەیشتن بە دونیای ئێمە کلیلی خۆی پێیە، بێئەوەی ئێمە هیچ کات بتوانین دەرگای دونیای ئەوان بکەینەوە و ببینین لە بنی ئەو جیهانەدا چی دەگوزەرێت... ئەوان پەی بە دونیای ئێمەدەبەن، بەڵام ئێمە پەی بە دونیای ئەوان نابەین، لەبەرئەوە گەر قووڵ بڕوانین ئێمە نابینا و ئەوان بینان، ئەوان لە دوو جیهانی گەورەدا دەسوڕێنەوە و ئێمە بە ئەستەم چواردەوری خۆمان دەبینین. بۆیە هەر لە سەرەتاوە هەستمدەکرد کیژەکە شتێکی تایبەتی هەیە کە ئێمە دەستمان پێیداناگات، ساڵ دوای ساڵ ئەو ڕاستییەم زیاتریش بۆ چەسپا کە بە ڕاستی ئەم کچە لە دونیایەکدایە زۆر دوور لە دونیای ئێمە. کچەکە بوونەوەرێک بوو تەواو پێچەوانەی خۆم، من کەسێک بووم هەموو گیانم بووبووە چاو، وەک دێوێکی میکانیکیم لێ هاتبوو کە بە جۆرێکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هەزاران دیەی ترم بە خۆمەوە بەستوە تا بە هەستۆکە ئامێرییەکانم زیاتر ببینم و ببینم و لە بینین تێرنەبم. وشەی چاوچنۆک بە واتا حەرفی و پڕاوپڕەکەی کاڵای بە قەد باڵای من بوو. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو چاوانەشدا زۆر جار ئەو هەستەم هەبوو کە هیچ نابینیم. کیژەکە بە پێچەوانەوە، ئاشکرا پێویستی بە چاو نەبوو، دیاربوو زۆر شتیش دەبینێت. لە یەکەم شەوەوە سەرنجمدا، کێشەیەکی

وەها قوولّی لەگەڵ نابینابوونی خۆیدا نییە، بە پێچەوانەی منەوە کە هەموو ژیانم لە دەوری جوغزی ئەو گرفت و داو و دەردانە دەسوڕایەوە کە چاوم بۆی دروستکردبووم، لە ڕاستیدا چاوساغ و دیدەدارەکان هیچ نین جگە لە کەسانێک کە برسێتی چاویان دەیانکوژێت، بەڵام هیچ کەسیش نییە بە ئەندازەی من، کوشتەی تێرنەبوونی دیدە و چڵێسی نیگای بووبێت. نامەوێت بڵێم کە کیژەکە بە نابینایی خۆی بەختەوەر بوو، بەڵام دەتوانم بڵێم نابینایی وەک دۆخ و شێوەی ژیان، هەندێک دەردی گەورەی لە کۆڵکردبووەوە کە من لە ژێر باریاندا خەریک بوو دوو کەرت دەبووم.

لەگەڵ هاتنی ئاسماندا بۆ ژیانی من، شتگەلێکی زۆر گۆڕان. ئیتر شەوان تا نیوەشەو لە پشت مێزەکەی دەزگاوە دانەدەنیشتم. کاری نوسینی یاداشت و کتێبەکەمم لە بیرۆوە بردەوە ماڵەوە. هەردەم پێش ئەوەی تاریک دابێت شۆفێرە دڵسۆزەکەمم دەنارد و کیژەکەی دەگەیاندەوە مەنزڵ و هەواری من. بۆ ئەو کاتانەش من لەوێ نیم باجییەکی قەیرەم لەو کۆڵانەی خۆمدا پەیداکرد، لەکاتی پێویستدا بڕوات و ئاگای لە منداڵەکە بێت. کیژەکە گۆڕانکارییەکی سەرەتایی لە مندا سازان، هەموو مرۆڤێک بۆ دۆزینەوەی دیوەکەی تری خۆی پێویستی بە سۆنگەیەک هەیە، هەیە خۆشەویستی دەبێتە دەلیلی و هەیە کینە، هەیە شیعرێک هەشە ئایەتێکی قورئان، هەیە بینینی لاشەیەک و هەیە ماچێک، هەیە نوێژ و هەیە مەستی، هەیە سێکس و هەیە ئیمان، بەڵام دواجار هەمووان دەڕۆنەوە سەر یەک ڕێگا، ڕێگای گەڕانی ئێمە بەدوای خۆماندا دەمێک کە دڵنیادەبین مرۆڤەکەی دەرونمان دوور لە ئێمە لە تاراوگەیەکی دۆزەخیدا گیریکردوە ... نا هیچ کەسێک نییە پێویستی بە هۆیەک نەبێت تا ئینسانییەتی ڕاکردووی خۆی بیربکەوێتەوە. بەڵام بە هەڵەدا مەچن، شتەکان هەروا میکانیکی و سادە و لە خۆوەهاتووش نین. من ئێستا کە بۆتان دەنوسم چەندەها ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕیون کە ئەو ژنە دۆسییە بەدەستەی نفوسم بانگکرد و لە هیچە خۆم کرد بە باوک. ئەوکات شتەکانم بەمجۆرە نەدەبینی، کیژەکە لای من تەنیا خولیایەک بوو بۆ

ئەوەی شتێک لە خۆم دووربکەومەوە و هەندێک لە هەستە سەرەتاییەکانی خەڵکی ئەزموونبکەم کە تا ئەو دەم هیچم دەربارەیان نەدەزانی. تا هیچ کات شتەکان بەوجۆرە نیین، من منداڵەکەم گرتبێتە ئامێز و گووتبێتم «ئەی منداڵی پاک تۆ ژیان و بێگەردیی لەدەستچووی خۆمم بەیادادەهێنیتەوە، بابڕۆم لەم کوچە تەنگەبەرەی دەزگا دەرچم و فریشتە بەدبەختەکەم بدۆزمەوە و باوەشی پێدابکەم و بڵێم، بڕوانە من بوومەتە کەسێکی دی». تا ئەوجۆرە دەرەنجامگیرییە بێمانایانە ڕەنگە کاریگەریی سەیرکردنی زۆری زنجیرە تەلەفزیۆنییە پوچەکان بێت لەسەری ئێوەدا، بەڵام لای من جۆرێکی تر بوو، کارێکی لەسەرەخۆ و ورد و ئازاردەر بوو، کە تۆزە تۆزە وردديدەکردم و دەیهاڕیم و دەیخواردم.

دۆزینەوەی ئینسانییەتی خۆت وەک دۆزینەوەی گەنجینەیەکی تەلا وەهایە کە زۆر قووڵ لە بنی زەوییەکی ڕەقەندا هەڵگیرابێت، کارێکی ورد و بە تاقەتی دەوێت، کە زۆرجار هاودەمی ناکامییە و لەبەر بەردەن و سەختی ناگاتە هیچ جێگایەک. زۆرینەی خەڵک تەنیا لەسەرە مەرگدا یان تەنیا چەند هەنگاوێک بەر لە مەرگ بیریاندەکەوێتەوە کە دەبێت لە ڕێگای شتێکەوە تێبگەن مرۆڤن. گەورەترین گەمژەییەک کە من لە مرۆڤدا بینیومە ئەوەیە مرۆڤبوونی خۆی وەک بەڵگەنەویست وەرگرتووە و وادەزانێت شتێک نییە پێویستی بە سەلماندن هەبێت. بەڵام بە ئەزموونی خۆم تێگەیشتم کە مرۆڤبوون هەستێکە هێندەی فەرامۆشتکرد هێنانەوەی سەختە، کە هێناشتەوە پاراستنی سەختترە. مرۆڤبوون وەک ماسییەکی تەڵای بچوک وەهایە لە حەوزێکی لیخنی پڕ جانەوەر دا، دەبێت شەو و ڕۆژ ئاگاداری بیت، نەوەک جانەوەری لابەلا، بەر هێرش و پەلاماری بدەن یان پیسبوون و ئالوودەبوونی زۆری دەوروبەر بیکوژێت. مرۆڤێک تێبگات مرۆڤبوون چییە، شتێکی دەگمەن و ناوازەیە، یان وەختە بڵێم هەر نییە، لە نێوان ئێمەی ئادەمیزاداندا بەدترین سووکایەتییەک بەکاربێت، ئەوەیە یەکێکمان بەوی دی بڵێت «تۆ مرۆڤ نیت»، ئێستا من ئەوە بە سووکایەتی یان تانە نازانم، ئەوە حەقیقەت و دۆخی ڕاستەقینەی

هەموومانە، کە ئێمە هێشتا مرۆڤ نین. ئەوەی کە کۆمەکی بە من کرد لە تەنگی و داشکانی خۆم تێبگەم ئەو ڕێگا دژوار و دوورکەوتنەوە زۆرەم بوو لە خۆم. مرۆڤە ئاساییەکان کە هەست بە نامرۆڤی خۆیان ناکەن. کێشەی ئینسان هیچ کات ئەوە نییە جانەوەرێک لە گیانیدایە، بەڵکو ئەو دەمامکی ئینسانییەتەیە کە دەیکاتە سەری خۆی و تاسەر ئێسقان فریوی پێدەخوات و بەهۆیەوە ترسناکترین شتگەلێک دەکات کە گەردون پێشتر نەیدیوە. دەغەڵی ئێمە لەوێوە دەست پێدەکات کە بێ هۆ و بێ دەلیلێکی دیار، خۆمان لێ بۆتە مرۆڤ. مرۆڤبوون دیارییەک نییە خودا بەخشیبێتی، ئەمە درۆ و دەلەسەیەکی دیکەیە کە بیروڕا کۆنەکان لە ئێمەدا چاندوویانە. ئاینەکان بە ناوی خوداوە، ئەم مرۆڤە لە ئاوی پیرۆز هەڵدەکێشن و وەک موعجیزەیەکی خودا دەیخەنە سەر شانۆی گەردون و ئەو وەهمەی تێدا بەهێزدەکەن کە بۆتە مرۆڤ، ئەوە بەسە مرۆڤ واتێبگات کە خودا کردوێتی بە بوونەوەرێکی ناوازە تا بە ناوی ئەوەوە زەوی خاپووربکات... بەڵام بۆ کەسێکی وەک من، کە جانەوەرەکەی ناخم تا دوورترین جێ لەگەڵ خۆیدا بردمی، بینینی ڕاستییەکان ئاسانتر بوو. دەمێک دەگەیتە سەر ترۆپکی جانەوەریی و لەوێوە تەماشادەکەیت و ترۆپکی ئەوبەر دەبینیت، لوتکەی مرۆڤبوون تەماشادەکەیت، لەوێدا هەستێکی سەیر داتدەگرێت کە دەبینیت ئەوێ چ خاڵی و بێمیوانە، چەند دەگمەنن ئەوانەی دەگەنە سەرەوە و چەند دەگمەنن ئەوانەی دەتوانن لەوێدا بمێننەوە.

نا منداڵەکە سەرەتا شتێکی ئەوتۆی پێنەبەخشم. من ئەو دەم وەک هەمووتان خۆم بە مرۆڤێکی تەواو دەزانی، کە تەنگی و کەمییەک لە خولق و خەلیقەتمدا نییە، بە پێچەوانەوە خۆم وەک سوارچاکی دروستکردنی ئەفسانەیەکی نوێ و بەیداخشەکێنی دەسەڵاتێکی تازە لەسەر زەوی دەزانی کە پاشەڕۆژ شوێنێکی گرنگی لە مێژوودا دەبێت. کاریگەریی کیژۆڵە بچوکەکە لەسەر من گەلێک کاوەخۆ و درێژخایەن بوو، ئەو سەرەتا تەنیا شتێکی تر بوو، بەڵام چی؟ ئەوە پێویستی بە چەندین ساڵ بوو تا تێبگەم. هێند هەبوو شەوان کە دەگەڕامەوە دەمخستە ئامێزم، ئەوەی

شتێک هەبوو بیگرمە باوەش خۆشییەکی گەورەی دەدامێ. ئەو هەموو ساڵانە بەردەوام بە تەنیا خەوتبووم، ئێستا کیژێکی چکۆلانە هەبوو دەمخستە سەر سنگم و دەخەوتم. من بە تەواوی نازانم هەستی باوکایەتی چۆنە، پێدەچێت باوکە سروشتییەکان لە یەکەم ساتەوە ئەو هەستەیان هەبێت، کە من کەمەکەمە بەرامبەر کچەکەم بۆم دروستبوو. سەرەتا پەیداکردنی منداڵەکە پابەندی ئەوەبوو دەلاقەیەکی تر بدۆزمەوە کە شتێک لە جیاوازی و ڕەنگ ببەخشێتە ژیانم، لەوەدا لاسایی نیازی فریشتەکانم نەدەکردەوە، بەڵکو دەمویست بە شێوەە و شێوازی خۆم وەک لیڤیاتانت بەردەوام لەسەر یەک شانۆ و یەک تەختی نمایش نەبم. هەموو ئەو هەوڵەی من بۆ وەدەستخستنی ئەو منداڵە جۆرێک لە گەڕان بوو بۆ دەمامکێکی دی، تا بیسەلمێنم منیش بوونەوەرێک نیم ڕەنگی تر لە بن ڕوخساری ئێستامدا نەبێت. من بە چاوی خۆم سەردەمەکەم دەبینی و شەرم و شورەیی بوو بۆم نەتوانم لە ڕۆڵێک زیاتر نمایشبکەم و وادەریکەوم تەنیا مەکینەیەکی قورمیشم و هەر بەیەکجۆر دەزانم دەست و قاچ بجوڵێنم.

ڕەنگە یەکێک بپرسێت جەنابی وەفای ڕەفعەت بەگ، تۆ باس لە چ شانۆ و چ دەمامکێک و چ ئەکتەربازییەک دەکەیت، کە کەم کەس دەیانزانی تۆ منداڵی وات لە ماڵدایە و تا بۆت دەکرا دەتویست هەموو شت بە نهێنی بێت و لای ژنی دایەنی ئێوارانیش گوتبووت، کیژەکە خوشکەزایەکی بێکەسی خۆتە و موجاهیدینی خەلق لە نزیک کەرکوک دایک و باوکیان سەربڕیوە و ئەم بەدبەختەیان بۆ تۆ جێهێشتووە. هەڵبەت کەسێک ڕەخنەی وەها بگرێت هێشتا تێنەگەیشتووە کە من لە ڕاستیدا دەمویست لە ڕێگای ئەم منداڵەوە خۆم تاقیبکەمەوە. ئەوەی لەو کاتەدا بۆ من گرنگ بوو، بزانم دەتوانم ببمە شتێک جیاواز لەوەی شۆڕش و مێژووی ئەو ساڵانەی پێشوو سەپاندبووی. ئەو دەم خولیاکەم لەگەڵ ڕۆحی ساتەوەختەکەدا ناکۆک نەبوو، ئەوەی باهیری دەیکرد، من دەبوو بە جۆرێکی تر بۆ خۆمی بکەم.

هەمیشە لە دونیادا دوو جۆر ئەکتەر هەن، یەکێکیان ئەوانەن کە لە بەرچاوی تەواوی خەڵک نمایشی خۆیان پێشکەشدەکەن، لەگەڵ جۆرە ئەکتەرێکی دیکەدا کە لە ژوورێکی داخراودا، لە جێگایەکدا کە دەرگای قفڵە و پەنجەرەی بە پەردەی ئەستوور داپۆشراوە بەهرەی خۆیان تاقیدەکەنەوە. زۆرینەی خەڵک تەنیا لە دەرەوە نمایشدەکەن و لە ژووری تاریک و دەربەستدا ڕاستی خۆیان دەژین و حەقیقەتی خۆیان بەیاندەکەن، هەشە بە پێچەوانەوە لەدەرەوە بوونی ڕاستەقینەی خۆیان دەژین و چۆنن بەو شێوەیە لە ناو خەڵکدا دەردەکەون، بەڵام دەمامک و نمایشی خۆیان دەبەنە شوێنە تاریک و داخراوەکان.

من لە جۆری دووهەم بووم. تا ئەو کاتە دەموچاوی «عەقید جەنگیز» دەموچاوی ڕاستەقینەی خۆم بوو، دەموچاوی «باوکی ئاسمان»یش، دەمامکەکەم بوو.

شانۆ گەورەکەی ژیان ئەو شوێنە بوو کە تێیدا حەقیقەتی خۆم دەژیام، بەڵام کێ هەیە بتوانێت سەنگی حەقیقەتی خۆی تا مردن لە کۆڵ بگرێت؟ کێ هەیە بوونی خۆی نەپسێنێت و لە ژێر باری خۆیدا پایەماڵی نەکات؟. ئەوانەی لەدەرەوە بەدرێژایی ڕۆژ کاریان نمایشە هەمیشە خۆشبەختترن، ئەو کاتەی بۆ ڕوخسارە ڕاستییەکەی خۆیانی دادەنێن، کەمترە. مرۆڤ بۆیە هەمیشە دەمامک دەکاتە سەری، چونکە دەموچاوی ڕاستەقینە بە جۆرێک سەنگینە هەموو سەرێک ناتوانێت هەڵیبگرێت. من ئەوکاتەی کە کیژەکەم خستە سەر خۆم، کە شەوان لە تاریکیدا دەمخستە سەر سنگم، نمایشمدەکرد، حەقیقەتی من لە دەزگابوو ... لە پشت دەرگای بیرۆکەمەوە بوو لە ئاسایش، نەوەک لە پشت دەرگای ژووری خەوتنەکەم لە ماڵ.

******

بەدرێژایی ساڵی نەوەدوسێش گەڕانی بێوچانی من بەدوای بولبولیاردا بەردەوام بوو، ئاگاداریشبووم خانم لای خۆیەوە لیڤیتانتی ڕاسپاردووە کە ئەویش چی بۆ دەکرێت بیکات، بەتایبەت لیڤیتانت ئێستا جگە لە دەزگایەکی ئەمنی چکۆلە، تۆڕێکی باڵکشاوی لە بازاڕی ناوەوە و دەرەوەش هەبوو، کە دەیانتوانی وەک من پرس و سۆراغ بکەن. ئەوەی ناتوانم بولبولیار بدۆزمەوە بووبوو بە مایەی ئەوەی چ من چ خانم هەست بە لاوازییەکی گەورە بکەین. خانم کە جار بەجار داوەتێکی دەکردم، دەمێک دەچووینە سەر مێزی خواردنەکە و من بە حەماسەتی دێرینەی خۆم باسم لە دامەزراندنی ژێرخانی دەوڵەتێکی نوێ دەکرد، ئەو هەمیشە بە حەسرەتەوە دەیگووت «ئاه، جەنابی عەقید، گەر ئێمە بەدبەختێکی وەک بولبولیارمان بۆ نەگیرێت، چۆن دەتوانین دەوڵەت دروستبکەین». گەرچی من پەیوەندییەکم لە نێوان بولبولیار و دەوڵەتی کوردیدا نەدەبینی، بەڵام قسەکەی خانم سرپیدەکردم و لە گیڤەی جۆش و خرۆشی دادەبەزاندم. نەدۆزینەوەی بولبولیار ئەو شتەبوو کە هێزی ڕاستەقینەی منی دەخستە ژێر پرسیار. ئێمە هەفتانە لە شاردا تۆڕ و شانەی سیخوڕی دەوڵەتە گەورەکانمان ئاشکرادەکرد، دەمانزانی کێ بۆ چ ئاژانسێکی دەرەکی کاردەکات و بە چ نرخێک، کێ لەگەڵ ئێرانییەکان یان میتی تورکی یاخود بەعسییەکان داوی گرێداوە، بەڵام هەموو ئەو هەموو بینینە بەس نەبوو خۆم لە خۆم خاترجەمبکات. بولبولیار منی خستە گومانەوە لە توانای خۆم.

لە کۆتایی ساڵی نەوەدوسێدا ڕۆژێک لە تەوالێتەکانی دەزگا لە بەردەم ئاوێنەیەکدا وەستام و ئەو باڵانەم لە پشتی خۆمدا بینییەوە، باڵەکانی پەترۆس، باڵەکانی مەخلوقێک کە لە ئاسمانەوە بەربۆتەوە. منیش پەترۆس بووم، منیش وەک ئەو باڵندەیە خۆم بە نیشتەجێی بان

هەورەکان دەبینی، بەڵام لە ڕاستیدا مەخلوقێکی باڵشۆڕی پێکەنیناوی بووم لە ژاوەژاوی خەڵک و لە ئەردی پڕ حەشاماتی دونیادا ونبووبووم. دەمێک ئەو باڵانەم لە پشتی خۆمدا بینییەوە، دامە هاڕەی پێکەنینێکی هستیریی، وەک ئەو لووتە دەستکردە هاتە بەرچاوم کە دەدرێتە لێبوکێک، تا هەموو کەس بزانێت لێبوکە. ئەم باڵانەم باڵی فریشتە نەبوون، بەڵکو باڵی کەسێک بوو لە نێوان هێزی درۆ و لاوازی ڕاستەقینەدا گیریکردبوو. من ئەو باڵانەم لە پشتی نەغەدە ماردینیشدا بینییەوە، بەڵام ئەو وەک هەمیشە توانای بینینی هیچی نەبوو، ئەو باڵانە بەرهەمی هەستێکی تراژیدۆکۆمیدی من بوون، تەنیا من دەمبینین و من دەمتوانی پێیان پێبکەنم. من و خانم هەر دووکمان دوو پەترۆس بووین، دوو پەترۆسی زل کە گەڵاگەڵ و باڵشۆڕ دەڕۆیشتین، خۆمان بە پادشای ئاسمان و میری نێو هەوران دەزانی، گاڵتەمان بە تیری ڕاوچیان دەهات، بەڵام لە ڕاستیدا تەنیا دوو پەترۆسی نەخۆش بووین و هیچی تر.

## پیاوکوژێکی گرینۆک

ماکوان چاویکردەوە و بە دکتۆری گووت «تۆ پیاوێکی مردوویت دکتۆر، دڵنیابە تۆ پیاوێکی مردوویت. درەنگ و زوو مەلەکبینەکان هەمووتان مردون». دکتۆر هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو سەیرێکی چاوی کوڕەی کرد، ئەو جارێکی دی خۆی لە هەر چاوچاوانێکی ڕاستەوخۆ پاراست، نیگای زیاتر بەرەو بان بوو، وەک کەسێک دەیروانی ڕاستەوخۆ گوێ لە خودا بگرێت و پرسیار لەو بکات. دکتۆر گەرچی لە دڵەوە ترسابوو، گەرچی خەیاڵات و بیرکردنەوەی تێکەڵبووبوون، لەسەردا پەشێو و شڵەژاو بوو، بەڵام هەستیکرد ترس لە ئێستادا خراپترین چەک و بێسوودترین ڕێگای ڕاکردنە. ماکوان لە ناکاو ببووبوو بە کەسێکی دیکە، دکتۆریش زۆر لە خۆی نائومێد بوو، باوەڕی بەوە هەبوو دەکرێت مرۆڤ لە ناسینی

بوونەوەراندا هەڵبکات، بەڵام نەوەک تا ئەو ئەندازەیە. لە ڕاستیدا عەیبی هەرە گەورەی دکتۆر ئەوەبوو هیچ کات نرخێکی زۆری لەسەر ژیانی خۆی دانەنابوو، بەڵام ئێستا وەک حەیفی لێبێت ئاسان ڕۆحی خۆی ڕادەستی ئەم گەنجە بکات، زیرەکانە سوودی لە کاتی بێدەنگی و پەشۆکانی ماکوان بینی تا خۆی هێوربکاتەوە و نەپەشۆکێت. دڵنیابوو گەر بترسێت ئەو حورمەتە قووڵەی لە ناخی گەنجەکەدا بەرامبەری سەوزبووە دەبێتە بێڕێزی و شەڕانگێزییەکی گەورەتر. ماکوان چاوی داخست و سەری دانەواند و گووتی «دکتۆر بڵێ باوەڕت بە خودایە یان نا؟». ئەوە ئەو پرسیارە گێلانەیە بوو کە ئیمانداران بەردەوام دەیانکرد، پرسیارێک لای دکتۆر، جگە لە نیشانەی کورتبینی و گەمژەیی هیچی تر نەبوو. دکتۆر بێئەوەی بهێڵێت ترس و پەشۆکانێکی زۆر بە دەنگییەوە دیاربێت، بە شتێک لە گاڵتەوە گووتی «لەگەڵمدا سەرکەوە بۆ ئاسمان، لەوێ وەڵامی تەواومان دەستدەکەوێت. منیش دەمەوێت کە چوومەماڵی ئاخیرەت، بپرسم ئەرێ من چۆن بووم، باوەڕم بەخودا بوو یان نا؟ چونکە تا لەسەر زەوی بووم لە دین و مەزەبی خۆم حاڵی نەبووم». ماکوان لەخودای بوو دکتۆر دەمودەست بڵێت «من باوەڕم بەخودایە، باوەڕم بە پێغەمبەری ئیسلامە». ئەو ڕستەیە دەیتوانی ئارامیبکاتەوە و بەهانە بداتە کوشتنی ڕاڕایی و دوودڵییەکەی. بەڵام کە دکتۆر وایگووت بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی «دکتۆر تۆ مردوویت، دەتوانم ئێستا بتکوژم و دەتوانم کوشتنەکەشت بۆ ڕۆژێکی تر دوابخەم، لای ئێمە ئەمری کوشتن بە تاقە زەلامێک نادرێت، زۆرن ئەوانەی لە یەک کاتدا فەرمانی هەندێک قەساسیان پێدەدرێت. بەڵام تا من لە ژیاندا بم، ئەرکی جێبەجێکردنی قەساسی تۆ بە من سپێردراوە، باوکم وادەزانێت بەوە دیارییەکی بەنرخی پێشکەشی من کردوە تا بە هۆیەوە دەستم سەوز بێت و بچمە جەننەت. عولەماکان دەڵێن، بۆ تۆڵەی ئیلاهی کاتێکی دیاریکراو یان کەسێکی دیاریکراو دەستنیشان ناکرێت، ئەوە واجبی هەموو کاتێک و وەزیفەی هەموو ئیماندارێکە ئەو کارەبکات. بەڵام باوکم دەیەوێت من ئەم کارەبکەم. دەتوانم ئێستا دەمودەست شەرعی ئیلاهی جێبەجێبکەم، بەڵام دەکرێت

هەر ڕۆژێکی تر یان هەر شەوێکی تر، دەمێک بە شاردا دەسوڕێیتەوە و پیاسەدەکەیت، ئەو واجبە تەواوبکەم. تۆ تەواو، خۆت بە مردوو حساب بکە». دکتۆر گووتی «گوێبگرە ماکوان، تۆ ئەندامی ئەو ڕێکخراوە نیت... تۆ کوڕێکی بەدبەختی بێچارەیت، بەس خۆت بەمجۆرە دەرخە، دەزانم کارێکیان پێ سپاردویت، بەڵام تۆ نازانیت بۆ دەبێت ئەو کارەبکەیت، ڕەنگە نەشتوانی، بەڵام بە هەر جۆرێک بێت، تۆ ئەندامی هیچ شتێک نیت، کوڕێکی ترسنۆکی باوکتیت و تەواو». بە دوودڵی و سامێکەوە سەیری دکتۆری کرد، هەردوو دەستی قووڵ خستە گیرفانی شەرواڵەکەیەوە، چاوانی پڕبوون لەو گومانە گەورەیەی هەر لە سەرەتاوە سێبەری لەسەر نیگای بوو. شوکاک جارێکی تر وەک ترساندن و هەڕەشەکەی ماکوان نادیدە بگرێت و بیەوێت بە جۆرێک بە سەریدا بازبدات ئەویش نیازی خۆی لە یادبکات، گووتی «بەڵێ بەوجۆرەیە. تۆ گەر باوەڕیشت بە خودا بێت، ئەندامی ئەو ڕێکخراوە نیت، ئیمان و بڕوای خۆت بەرەو ئەوێی نەبردویت، ملکەچی باوکێکی زاڵمیت کە ناتوانیت لە ژێر فەرمانی بێیتە دەر، گەر بڵێت نوێژ بۆ خودا بکە لەترسدا نوێژی بۆ دەکەیت، گەر گووتی سوژدە بۆ شەیتان بەرە، سوژدە بۆ ئەو دەبەیت ... تۆ هیچ نیت. کە منیش دەکوژیت، هێندە بە هۆیەکی هیچ دەمکوژیت، شایەنی ئەوەش نیت مرۆڤ پێت بڵێت پیاوکوژ. تۆ بە قەد و باڵا لە گەورە دەچیت، بەڵام لە ناختدا هێشتا منداڵێکی ترسنۆکیت». سەری دانەواندبوو و هیچی نەدەگووت. دکتۆر نەیزانی قسەکانی چەند کاریان تێکردوە، بۆ ئەوەی زیاتر بیکوتێت و لاوازیبکات پرسی «ئەو شەوەی کەشتیی فریشتەکانتان سووتان تۆ لەوێ بوویت؟ لەگەڵیان بوویت؟ باوکت چۆن سووتا؟... ها بۆ درۆت لەگەڵ کردم، هەر یەکەمجار تۆ دەتزانی کە مەهدی دەریایی لە ئاگری کەشتییەکەدا سووتاوە». ماکوان بە هێمنی سەری بەرزکردەوە، چاوانی پڕبوون لە فرمێسک، دوو دڵۆپ ئەشکی گەورە لە چاویدا بوو، بە سەرسەختییەکی گەورەوە گووتی «دکتۆر دەبێت بکوژرێیت، تێدەگەیت، جار و دووان و سیانی تر من دەنێرنەوە، گەر دەتەوێت بژیت ئەم شارە بەجێبهێڵە، بچۆ بۆ هەر شارێک، هەر وڵاتێکی تر، ئەمری کوشتنی تۆ

دەرچووە. گەڕانەوەی تێدا نییە». دەنگی گریەبار و کیناویش بوو، هەر گوێت لە دەنگی بایە دەمودەست دووکەرتبوونە گەورەکەی ناو ڕۆحیت دەبینی. دکتۆر گوێی نەدایە قسەکانی، وەک پزیشکێکی شارەزا لە دواندنی بیمارەکانیدا لە جێگای خۆی هەستا و هەموو هێزی خۆی کۆکردەوە تا هەم قیافەی پزیشکی شارەزا لەدەست نەدات و هەم وەها لەرزۆک دەرنەکەوێت، گەنجەکە حەز بە پلیشاندنەوە و تێکشکانی بکات. چووە بەردەمی و هەموو هێز و بێباکی ناوەکی خۆی خستەکار و گووتی «هەموو کێشەکە ئەوەیە تۆ ناتوانیت لەدەست باوکێکی دڵڕەق خۆت ڕزگاربکەیت. وامەزانە مەتەڵ و لوغزێکت خستۆتە بەردەمم، هەر ئەو شەوەی هاتیتە بیمارستان بە ڕوونی بینیم هیچ خۆشەویستییەکت بۆ باوکت نییە، لەوەشدا جێگای سەرزەنشت و گلەیی نیت، ئەوە بابی منیش بێت هەر زەڕەیەک عاتیفەی تێدا سەرف ناکەم. کابرا ... من عەجایەبم لێ دێت، تۆ بە هەر هۆیەک بێت، پێویستت بەم باوکەیە، چونکێ کەسێکی لاوازیت، ئەوەتا بیر لەوە دەکەیتەوە بۆ کەسێکی وەها کە خۆت دەڵێیت تەواوی ژیانی نەیتوانیوە باوکێکی باش بێت خەریکە ئەوەشی هەتە دەیشێوێنی و لەدەستی دەدەیت، تۆ ژنت هەیە، ژیانی خۆت هەیە. باوکێک دوای ئەو هەموو خراپەیە خۆی لە عەبای خوداناسی پێچاوە و گەڕاوەتەوە ناو ژیانی تۆ. تۆ وەک منداڵێک هەموو ژیانت باوکێکی میهرەبانت ویستووە، ئێستا ئەو باوکە دەیەوێت هەروا بتکاتە پیاوکوژ، دەیەوێت بڵێت من گەرچی پیاوێکی پیس و چەپەڵ بووم، بەڵام منداڵێکم پەروەردەکردوە ئامادەیە لە ڕێگای خودادا گیانی خۆی بەختبکات، لەم شارەدا سەرنجم داوە هەرچی باوکی دەغەڵ و داوێنپیس هەیە، دەیەوێت بەدروستکردنی منداڵێکی چاکەکار و ئیماندار خۆی پاکبکاتەوە. پێمبڵێ ... شەوی سووتانی کەشتیی فریشتەکان تۆ لەوێ بوویت یان نا. پێمبڵێ؟». ماکوان سەری خستە ناو دەستییەوە و بە دەنگی بەرز دەستیکرد بە گریان، قسەکانی دکتۆر بە جۆرێکی بێمانا لەگەڵ حەقیقەتی زەق و ڕۆپی ئەودا جووتدەبوونەوە. گووتی «دکتۆر تۆ ڕاستدەکەیت، بەڵام لێرە دوورکەوەرەوە. ئەم شارە بەکەڵکی تۆ نەماوە». ئێستا زۆر بە

دەنگی بەرز دەگریا. شوکاک پلەیەک بێڕەحمانەتر چووە پێشێ و گووتی «دەمانچەکەت دەربهێنە و ئەو کارە بکە کە باوکە چەپەڵەکەت و جەمعییەتەکەی پێیان گوتوویت. کەسێک بکوژە کە نایناسیت، نازانیت چی کێشاوە، چی بینیوە، چی لە دڵیایەتی، باوەڕی بە چییە و باوەڕی بە چی نییە... پێمبڵێ گەر تاوانی وابکەیت، چ خودایەک لێت خۆشدەبێت؟». کوڕەکە ئێستا بە ڕاستی لە دڵەوە دەگریا، هەر کەسێکی تر بایە لەبری دکتۆر ڕەنگ بوو بە ڕاستی دڵی بۆی بسووتێت، بەدەم گریانەوە لە دکتۆری پرسی «پێمبڵێ تۆ مەلەکەت بینیوە؟ بە ڕاستی ئەو مەلەکانەی تۆ بینیوتن، شەیتان ڕەوانەیکردون و ناتوانن بفڕن؟ ڕاستیم پێبڵێ؟ دەمەوێت بزانم شتی وامەیە؟»...

ئاشکرا کوڕە بەستەزمانەکە گیرۆدەی دەردێکی گەورە بووە، کۆمەڵێک پرسیار لە ناوەوە هەلاهەلایانکردبوو، کەوتبووە جیهانێکەوە ڕاست و هەڵەی تێدا نەمابوو، ڕقی لە خۆی بوو، لە خەڵک و لە خوداش، بەڵام نەیدەتوانی لە چنگی ئەو هێزە دەرونییە ڕەشانە دەربازبێت کە لە ناخەوە نینۆکیان لە دڵی گیرکردبوو.

شوکاک نەیدەزانی ئەم کوڕە هاتووە بیکوژێت یان ئاگاداریبکاتەوە، لە ڕاستیدا کوڕە بەستەزمانەکە خۆشی نەیدەزانی، پێدەچوو فەرمانێکی پێ کرابێت، بەڵام ئازادییەکی زۆریان پێدابێت کەی جێبەجێیدەکات بیکات، یان لەبەر هەر هۆیەک بووە پەلەی تێدا نەکات و کاتی تەواو بداتە خۆی. دەبێت بزانین فەرمانەکانی کوشتن لە گروپە دینییەکاندا، کەمجار سروشتی ئەو فەرمانانەی هەیە کە لای سیاسەتمەداران و هێزەکانی دیکە دەیبینین، ئەو فەرمانانە سەرتاسەری و جاویدانەگین، وەک نەفرەتی ئەبەدی وەهان کە دەشێت هەموو ئیماندارێک خۆی بە بەرپرس بزانێت لە جێبەجێکردنی، واتە وەک جۆرە سزایەکی یاسایی نییە، کە هەردەم کاتێکی دیاریکراو بۆ دەرکردن و جێبەجێکردنی هەیە، زیاتر شێوە حوکمێکی دۆزەخییە کە کات و ناکاتی بۆ نییە و وەک نەفرەتێکی ئەبەدی دوای نێچیری خۆی دەکەوێت، قوربانییەکەی خۆی بە گوللەیەکی یەکجارەکی ناکوژێت و لە

دەست دوودڵی پشووی پێبدات، بەڵکو تێکەڵ بە گێژەنی چاوەڕوانییەکی ترسناکی دەکات و پەلی هەر کار و کردارێکی دەشکێنێت. شوکاک سەرەتا وایدەزانی دەمێک نایکوژن هۆکەی ئەوەیە دەیانەوێت وەک مشکێک وازی پێبکەن، بەڵام ئێستا دڵنیایە پیاوکوژەکەی هەم کەسێکی ترسنۆکە و هەم کاتیشی هەیە. کوڕەکە چەند جارێک وشەی قەساسی خودایی بەکارهێنایەوە، بە ڕوونی دیاربوو لە ماوەیەکی کەمدا تێکەڵ بە دونیایەک بووە، لەو دونیایەوە زاراوە و وشەی سەیروسەمەرەی هەڵگرتۆتەوە. تووشی دادڕانێکی دەروونی و شەبەقێکی ڕۆحی بووبوو، کە ئێستا بەدروستی نەیدەزانی چی دەوێت و دەبێت چی بکات. ماکوان لەو نێوەدا بێوەڵام و دەستەوەستان مابوو، ئاخۆ دکتۆر شوکاک بکوژێت و بە پڕتاو لە بیمارستانەکە هەڵبێت، یان لێگەڕێت فرمێسک و دوودڵییەکانی بەسەریدا زاڵبن و دان بەوەدا بنێت بە ڕاستی پەلی باوکی لە پشت لاوازی ئەمەوەیە.

دکتۆر دڵنیابوو کوڕەکە بوونەوەرێکی مەترسیدارە، کەسێکی دوو دیوە، ناتوانێت دوای بڕوای خۆی بکەوێت، بۆ بەهانەیەک دەگەڕێت فەرمانەکانی باوکی جێبەجێبکات. کینەی زۆری بەرامبەر بابی، ناتوانێت بیگەێنێتە پلەی یاخیبوون، باوکەکە هێزێکی نهێنی و دەسەڵاتێکی بێوێنەی بەسەر کوڕەکەیدا هەیە. دکتۆر دەیویست خەیاڵی بە ڕێگایەکی تردا ڕابکێشێت، لێی پرسی «چی دەزانیت؟ دەربارەی کەشتیی فریشتەکان و ڕێزانی مەلەکبین؟». گەنجەکە گەرچی کەوتبووە ژێر کاریگەریی جۆشێکی کتوپڕی گریانەوە، بەڵام بە جۆرێکی بەرچاو خۆی لە هەر پرسیارێک دەدزییەوە پابەندی کەشتییەکە بێت و خۆی وا دەرنەدەخست ناوەکەی بیستبێت. ماوەیەکی زۆر گریا، هۆی گریانەکەی ئەوەبوو ناتوانێت بڕیاربدات. لەو ماوەیەدا دکتۆر کاتی تەواوی بەدەستەوە بوو دەرگای ژوورەکە بکاتەوە و هەڵبێت یان یەکێکی دی بانگبکاتە ژوورەوە یان هەر گەنجەکە پەلبەستبکات و بیداتە دەست پۆلیسەکانی بیمارستان، بەڵام

هیچ کامیانی نەکرد، بەرامبەری دانیشت و بێباک و تا ئەندازەیەکی زۆریش بێ عاتیفە سەیری کوڕەکەی دەکرد کە هۆن هۆن فرمێسکی دەڕێژا.

دکتۆر لێگەڕا تا کوڕە هێمن بووەوە.

دوای گریان وەک پێش گریان نییە، مرۆڤ دوای گریانی بە کوڵ ناتوانێت کەس بکوژێت، کەسێک بکوژێت و دوایی بگری ئاساییە و شتێکی عەجایەبی تێدا نییە، بەڵام بگری و دوایی ڕاستەوخۆ کەسێک بکوژێت، ئەوە دەگمەنە، چونکە گریان وەها ڕۆح سافدەکات، ئارامییەکی وەها دەهێنێت، ماوەیەکی دەوێت تا جانەوەرە مەترسیدارەکەی ناومان فەرمان دەگرێتەوە دەست. ماکوان دوای تاوێکی درێژ لە ئەشک و هەنسک، کەمێک هێمن بووەوە و دەموچاوی خۆی سڕی و چەند جارێک داوای لێبوردنی لە موستەفا شوکاک کرد کە ئێستا دڵنیا و بێترس وەک نە بای دیبێت و نە باران، قاچی خستبووەوە سەر قاچی و لەسەر کورسی خۆی قیافەی پزیشکانە و ئاسایی خۆی وەرگرتبووەوە. دوای چەندین قسە و هێمنکردنەوە و لەیەک بووردنی پەیتا پەیتا، گووتی «دکتۆر ناتوانم بتکوژم، دەمەوێت بتکوژم بەڵام ناتوانم. هێزم نییە بتکوژم، پێویستە پشووبدەم، دەبێت بچمەماڵەوە و خۆم داپۆشم، تایەکی زۆرم لێهاتووە. هەتا ناتوانم بچمە سەر دوکانەکەش. بەڵام دکتۆر ئەوەی وەزیفەی منە بتکوژم، شتێکە ناتوانم گوێی لێ بخەفێنم. ئەوەندە بەهێز نیم بمکرێت خۆم لە بابم بدزمەوە، هەرچی دەکەم ناتوانم لێی عاسی بم. ئێستا کوشتنی تۆ لەوەدەرچووە لەدەستی مندا بێت، شتەکە پەیوەندی بە شوێنی باوکمەوە هەیە لە جەمعییەت. ئەو ڕۆژەی ئازادیانکردیت، مەبەست بوو بتکەنە دەلیل بۆ سەر بولبولیار، بەڵام ئەوە خواست و ئارەزووی بابیشم بوو، کە ئێستا قسەی لە جەمعییەتەکەدا زۆر دەڕوات. بەدرێژایی سەعاتێک لەگەڵ ئەمیرەکەدا قسەیکرد و گووتی، بۆ ئەوەی کوڕەکەم بچێتە بەهەشت، دەبێت ئەو بەو کارە هەستێت. بابم ئیمانی بەوەیە گەر من یەکێک لە مەلەکبینەکان بکوژم دەچمە بەهەشت، دەڵێت لەم دونیا نەمتوانیوە شتێکت بۆ دابینبکەم، دەبێ کارێبکەم لەو دونیا و لای خودا

مەرتبەت بەرز بێت ... گەر ئەو ڕۆژە بمتوانیایە بتکوژم، بابم حازربوو لە بولبولیاریش بگوزەرێت. بەڵام نەمتوانی، ئەو ڕۆژەی تۆیان فڕاند من لەوێ بووم و کارم ئەوەبوو بتکوژم، بەڵام وەک ئێستا دەستمکرد بە گریان، فرمێسک وەک هەوری بەهار لە چاوم دایکرد، نازانم هەر بیر لە کوشتنی تۆ دەکەمەوە دەستدەکەم بە گریان. ئێستا لە ژێر ئەو تاقیکردنەوەیەدام، درەنگ یان زوو دەبێت ئیشەکە جێبەجێبکەم. گەر تۆ خۆت نەپارێزیت، هیچم بۆ ناکرێت و لە دەستم نایەت لە ئەمری بابم عاسی بم، لەم شارە مەمێنە، بچۆ بۆ هەر جێگایەک نەتوانن من بنێرنە دووت». کوڕەکە ئێستا چووبووەوە سەر زمان و سروشتی ئاسایی خۆی.

لەو ڕۆژەوەی جەمعییەتی دوژمنانی شەیتانیان دامەزراند، باوکی کردیە ئەندام لەوێدا، پێشتر دوو مانگ شەوانە دەهات و لە تەک خۆیدا دەیبردە مزگەوت، لەوێ بە زانایانی ئاینی ناساند، فێریکرد چۆن دەستی ئیماندارە پلەدار و پایەبەرزەکان ماچبکات، چۆن گوێ لە گووتاری مەلاکان بگرێت، تا بۆی بکرایە لەگەڵ خۆیدا دەیبرد کۆڕ و کۆمەڵی ئیمانداران، کوڕەکەش کە بە منداڵی سۆز و عاتیفەیەکی باوکانەی نەچەشتبوو، ئێستا منداڵییەکی دووهەمی دەست پێکردبوو، بەڵام هیچ کات لە یەکەم بینین و نزیکیدا ئەوەی نەدەشاردەوە کە قێز و نەفرەتێکی ناوەکی بێوێنەی بەرامبەر باوکی هەیە، بەڵام ئاشکراش قێز و نەفرەتەکەی خۆی کە زۆرجار بە زمانێکی بێلایەن گوزارشتی لێدەکرد، ڕێگر نەبوو لەوەی دوای باوکی بکەوێت و بۆ کوێی بوێت لە پشتی خۆی کێشیبکات. مەهدی شاگەشکە دەبوو بڵێت «ئەوە کوڕمە، تابڵێی ئیماندار و لە خودا ترسە، هاتۆتە سەر ڕێگای ڕاست و سەری بچێت نوێژی ناچێت». باوکەکە لەو ساتەوە لەسەر دەستی جەمعییەتی عولەمای ئیماندار تۆبەیکردبوو، سووربوو کوڕەکەشی ڕێگای ئیمان بگرێت و مێژووی چەپەڵی ئەو دووبارەنەکاتەوە. هەڵبەت تۆبەی مەهدی دەریایی، لە ناو خەڵکدا وەک موعجیزەی ئاخر زەمان و دەرکەوتنی ئەستێرەیەکی پرشنگداری گەورە و کتوپڕ لە ئاسماندا

سەیردەکرا، کەس هەر باوەڕی نەدەکرد پیاوێکی وەها تۆڵاز و بەدمەست بتوانێت جارێک لە ئیمانەوە ناوی خودا بکەوێتە سەر زوبانی.

## قێز
## یان دۆنکیشۆت ناچێت بۆ جەنگ

بەر لەوەی شەڕی ناوخۆ سەرهەڵبدات، منیش لە ڕیزی ئەو کەسانەدابووم کە باوەڕیان وایە، شەڕ هۆکاری سیاسی یان ئابووری هەیە. ئەو کەسانەی خۆیان بە حیسابی داهاتەکان و بودجە و سەرچاوەکانی سامانەوە بۆژۆدەکەن، لە کاتی جەنگدا پرسی دەسەلات و قەڵەمڕەوی سیاسی دەکەن بە بابەتی گفتوگۆ، هۆی شەڕ دەبەنەوە بۆ تەماع و پاوانخوازی ئەم هێز یان ئەویدی. بەڵام کاتێک لەو ئان و ساتە ناسکەی مێژووی ئێمەدا شەڕ سەریهەڵدا شتێک من لێی دڵنیابووم ئەوەبوو، ئەم جەنگە یەک هۆکاری هەیە، ئەویش قێزی خەڵکی ئەم خاکەیە لە یەکتر. دەشێت زۆر دانا و زانا هەبن ئەم بۆچوونە سادەیەی منیان قەبووڵ نەبێت، بەڵام بۆچوونێک مرۆڤ لە دەرەوەی ڕووداوەکان دروستیبکات جیاوازە لە بۆچوونێک لە ناو خودی جەنگ و لە نێوان جەنگاوەراندا پێیبگات. قێز شتێکی زانستی نییە بکرێت بزانین چییە، مەتریاڵێک نییە قابیلی پشکنین بێت، هەستێکی نادیار و کوشندە و ئاڵۆزە، بگرە زۆر لە عەشق ئاڵۆزتریشە، عەشق لایەنی کەم ئاڕاستەیەکی هەیە، بۆ کەسێکی دیاریکراوە، قیبلەنومایەکی مەترسیداری هەیە کە هەر چۆنێک وەریدەگێڕین ڕوودەکاتەوە یەک کەس. کینەش وەهایە، من لە کینەدا کەمم نەبوو، کینەش شتێکە بۆ دوژمنی ڕاستەقینە دەگەڕێت، دوو دوژمن هەمیشە ڕقیان لە یەکە، بەڵام ڕق هەمیشە لەسەر ویژدان سەنگینە، ئەوەی کینەیەک لە دڵیایەتی هەتا کاتێک دوژمنەکەشی دەکوژێت، تەواو لە عەقڵ

و عاتیفە دوورناکەوێتەوە. بەڵام قێز نا، قێز خەڵکانێک دروستدەکات کە بە ئاسوودەگی دەتوانن یەکدی بکوژن.

لەگەڵ کینەدا دوژمن بوونەوەرێکە هێشتا کەرامەتی خۆی لەدەست نەداوە، هێشتا مرۆڤە. بەڵام بۆ قەتڵوعامە گەورەکان، بۆ پایەماڵکردنی مرۆڤەکانی دی، بۆ پلیشاندنەوەی جەستەیان یان ڕۆحیان، جگە لە قێز هێزێکی ترمان نییە ئەو کارەمان بۆ بکات، لەگەڵ قێزدا مرۆڤێکی ئاسوودە دێتە پێشێ کە دەکوژێت و پێدەکەنێت، کە سووکایەتیدەکات و ڕۆحی نەشئە و کەیفێکی نهێنی دەپپۆشێت، لەگەڵ قێزدا هەتا کاتێک لێدەگەڕێین دوژمنمان بژی، ئەوە لە بەزەیی و ڕەحمی نێو دڵەوە نایەت، بەڵکو لە خودی قێزەوە هەڵدەقوڵێت کە لێدەگەڕێین وەک بوونەوەرێکی چەپەڵ بۆ نەفرەت و تیزی ئێمە بژی.

کاتێک جەنگ سەری هەڵدا، قێز تا دەهات کەڵەکەدەبوو ... ئەوکات لە نێوان ئێمە و دوژمنانماندا مێژوویەکی درێژ لە قێز هەبوو. لەو دوو ساڵەی ڕابوردوودا هەردوولامان، هەم ئێمە و هەم دەسەڵاتدارانی دەڤەری بەرزان و بادینان کۆمەڵێک وردە شەڕمان کردبوو، ژمارەیەکی زۆر لە مارکسیستە توندڕەو و ئیسلامیستە نوێکان لە زینداندا بوون، لە زیندانەکانی مندا ئەشکەنجە و ئەتککردن کەمبوون، بەڵام لە زیندانە نهێنی و گەورەکانی دیدا چیرۆکی زۆر دەهاتنەدەرێ کە موویان ڕەپدەکرد و موچڕکیان بە لەشی ئیبلیسیشدا دەهێنا. من جەنگاوەرێکی کلاسیکی بووم و بە لۆژیکی کینە دەجەنگیم، دوژمنم خۆشنەدەویست، دەمویست تەواوی خەڵک لە ڕووی ڕۆحییەوە نەیاری ئەوان بن، بەڵام قێز پلەیەکی باڵاتر بوو، دەبوو بەرەو لای سەربکەوم. وەک من پێشبینیمدەکرد، هەوای برایەتی و ئاشتی تەنیا شنەبایەکی لاوازی هاوینە بوو، کە دۆزەخێکی پڕوکێن و سووتێنەری لە ژێردا بوو. پێش سەرهەڵدانی جەنگ بە ساڵێک هەوای شارەکان پڕبوون لە بۆنی بێزهاتنەوەیەکی کوشندەی هەموو مەخلوقاتی خودا لە یەکتر، وردە وردە ئەو قوتابیانە لە فێرگاکانماندا دەرکەوتبوون کە بێزیان لە خوێندن دەهاتەوە، ئەو مامۆستایانەی خۆیان نەخوێندەواربوون و بینینی

کتێب موچڕکی بە گیانیاندا دەهێنا، دراوسێکان بێزیان لە یەکدی دەهاتەوە و دۆست و خزمەکانیش هەمان شێوە، تۆ هەر کەسێک بوویتایە و بۆ هەر کارێک بچووبایتایە چاوانێک لە دواتەوە بە قێز و نەفرەتەوە لێیاندەڕوانیت، تەواوی خەڵک ڕقیان لە تەواوی شتەکان بوو، هەتا کە ژن و مێردیش پێکەوە دەخەوتن دەمێک لەیەک تێردەبوون هەردووکیان هێڵنجیان دەدا و دەیانویست بە دزی یەکەوە بڕشێنەوە. ڕووت لە هەر ئاوەدانییەک بکردبایە، چپەی پێکەنین و لاقرتێت لە دوای خۆتەوە دەبیست، ئاسایی بایت لەبەرئەوە نەفرەتیان لێدەکردیت کە بوونەوەرێکی هیچ و بێنرخ و ئاساییت، نائاسایی بایت لە بەرئەوەی کەسێکی بەدبەختیت و لە هیچدا لەوانی دی ناچیت. ئەوەی منی لەو شتانە ئاگادارکردەوە سەرەتا ڕاپۆرتی پیاوان و ژنانی سەر بە دەزگابوو، هەر دەم بەیانیان پۆستێکی گەورە دەخرایە بەردەستم و فایلی ڕاپۆرتەکان دەهێنرایە سەر مێزەکەم، لە پشت هەموو دەستێک و هەموو وشەیەکەوە قێزی بوونەوەرانم لە یەکتر دەخوێندەوە. سەرەتا شتەکانم زۆر لە یەک جیانەدەکردەوە، دیاریکردنی سنووری نێوان کینە و قێز هەروا سادە و ئاسان نییە، من قوتابییەکانی ژێردەستی خۆم لەسەر کینە ڕاهێنابوو، بەڵام ئەوەی من لە نامە و ڕاپۆرت و دەم لێدانەکاندا دەمخوێندەوە، نەفرەت و ڕشانەوە و بێز لێهاتنەوە بوو. هەموو هەواڵ و نوسراوەکان، دەستی نەفرەت و بێز دەیجوڵاندن، هەر کات دەمخوێندەوە نیشانەیەکم تێدا نەدەبینین، بەڵگەی ئەوەبێت ڕاپۆرتنوسەکانم بە هیمەت و دڵسۆزییەوە کاری خۆیان بێلایانانە دەکەن. وشەکان و گوزارشتەکان پێکرا بەدەستی کەسانێک دەنوسران دیاربوو لە ساتی نوسیندا هێڵنجێکی گەورە بەری دەرونی گرتوون. ئەوە دۆخی تایبەتی ڕاپۆرتێک یان دووان نەبوو، بەڵکو کارمەندانم بە گشتی لە باری هێڵنج و بێزهاتنەوەیەکی بەردەوام و ڕەشدا دەردەکەوتن، دۆخی دەرونی کەسانێکیان گرتبوو دەیانەوێت تەواوی خەڵکان وردبکەن و هەق بە تۆزەکەشیان نەدەن بابیبات. قێز و لاقرتی وەها بڵاوبوو، هەر زوو گەیشتە سەر خودی خۆم، ڕۆژێک بە ڕیواق و داڵانەکانی دەزگادا دەڕۆیشتم و هەستمکرد چاوانێک بە بێز و هێڵنجەوە

سەیرمدەکەن، دەمبینی لە درزی دەرگاکانەوە بە خەندەیەکی ڕەش و بزەی لاقرتییەکی تاریکەوە لێمدەڕوانن، دڵنیابووم لە هەموو سەرکەوتن و دابەزینێکمدا، دەمێک بەو چاوە سوور و ماندووانەوە بە پلەکاندا بەرەو ژوور ملدەنێم، نیگای گاڵتەجاڕی ئەوانی تر وەک تیر تێم دەچەقێن. سەرەتا زۆر بۆم سەخت و کاریگەر نەبوو، بەڵام کە هەموو شتەکانم پێکەوە گرێدایەوە، لە ناکاو وەک بایەکی توند بمبات و لە کونی گێژەڵووکەیەکدا گیرمابم، ڕوانیم من لە شارێکی گەورەدام کە جگە لە قێز هیچی تر تێیدا مەلەناکات. تا ئەو کات من هەر پیاوی کینەبووم و قێزی وەهام تێدا سەوز نەبووبوو. من دەمزانی تۆفانەکە هاتووە، دڵنیابووم بۆ ئەوەی قاچ لەسەر زەمینی ئەم سەردەمە تازەیە گیربکەم، ببم بە کەسێکی مۆدێرن، دەبێت فێری بێزکردنەوەبم لە زۆر شتی دونیا. سەرەتا بڕیارمدا خۆم بگرم و نەهێڵم تۆفانەکە بمبات، نەمدەویست قێز بە قێز وەڵامبدەمەوە، سەرەتا شتەکانم هەر وەک دەرکەوت و پێدراوە سەیرەکانی تری مرۆڤ دەبینی، لای من وەک پەتایەک بوو کە دێت و دەڕوات، هێشتا وەک درمێکی کوشندە تەماشام نەدەکرد کە بە هەموو کوچە و کۆڵانێکدا دەکشێت و لە دەرگای هەموو ماڵێک دەدات و دەمێنێتەوە. ئەوەی دواتر ڕوویدا ساڵانێکی زۆر منی برد و کردمی بە بەشێک لە سەردەمێک، نەمدەویست هیچ کات بەشێک بم لێی... لە سەردەمێکدا قێز سەرداری ڕوانینەکان بێت، مرۆڤ چەند بیەوێت دەرباز بێت، بە هەمووان دەیگرن و دەیخەنە ئەو حەوزە سامناک و ساردەوە.



کە جەنگی ناوخۆ دەستی پێکرد، من بەپێچەوانەی چاوەڕوانی دونیا و چاوەڕوانی خۆشمەوە خۆشبەخت و کامەران نەبووم. ئەمە ئەو جەنگە نەبوو کە من دوو ساڵ لەوەوبەر و بەر لە هەڵبژاردن بانگەشەم بۆ کردبوو.

ئەو شەڕە کاریگەرە نەبوو کە من دەمویست، جەنگێک تێیدا بەسەر ترسە ئەبەدییەکانماندا زاڵ بین، جەنگێک لە پیاسە دووروودرێژەکانی ناو سروشتدا خەونم پێوەبینی بوو. نا، ئێستا جگە لە تەماعی بچوک و ڕۆحی بودەڵە و چۆکدادانی دڕندانە بەوی تر نیاز و خەونێکی تر لە پشت شەڕەوە نەبوو. ڕۆژێک جەنگ بە ڕاستی بڵێسەی سەند، جەنابی سەرۆک وەک بەشی هەرە زۆری ژیانی، لە دەرەوەی وڵات خەریکی نیشاندانی وەلا و وەفا بوو بۆ خۆرئاواییەکان تا بیسەلمێنێت کورد میللەتێکە لەگەڵ کۆمەککەرانی خۆیدا سپڵە و ناکەسبەچە نییە. یەکەمین کۆبوونەوەی باڵای حیزب بۆ تاوتوێی شەڕ و تەدارەکسازیی هێزەکان بە ئامادەگی من بەڕێوەچوو. ئەندامانی بیرۆی سیاسی، هەڤاڵانی مەکتەبی عەسکەری، من و دکتۆر زەندیانیش ئامادەبووین. شەو بە ماشێنی تایبەت هاتن بە دواماندا. هەڤاڵی جێگری گشتی گەرچی لە ژیانیدا فیشەکی نەتەقاندبوو، بەڵام فەرماندەی عەسکەری هێزەکانیش بوو، ئێمەی لە هۆڵێکی تایبەتی و نهێنیدا کۆکردەوە، من لەو ڕۆژەدا هیچم نەگووت، خۆم وەک کەسێک نیشاندا دوێنێ شەو نەخەوتبێت و لەبەر هیلاکی و بێبڕستی حەوسەڵە و تاقەتی قسەی نەبێت. بڕواکانی دوو ساڵ لەمەوبەرم کەمی نەکردبوو، جەنگم وەک تاکە ڕێگای شکۆ و گەورەیی دەبینی، بەڵام ئەوی ئێستا جەنگێکی درەنگ وەخت بوو کە ئەم پیاوانە بۆ بەتاڵکردنەوەی باری کەڵەکەبووی ڕۆحیان دایانگیرساندبوو، جەنگی بودەڵەکان بوو، هەردوو سەرۆکەکە و بیرۆی سیاسی هەر دوو حیزب خۆیان لێ لەبان و بێبەریدەکرد، لە تەلەفزیۆن دەردەکەوتن و دەیانگووت شەڕمان بەسەردا سەپێنراوە. ئەو جەنگەی من دەمویست، شەڕێک بوو سەرکردەیەکی قارەمانی پێویست بوو بچێتە سەر جێگایەکی بەرز و بە دەنگێکی بڵند بڵێت ئەمە جەنگی منە و ئەمەش ئومێد و ئامانجێتی. لە جەنگدا گەر سەرۆکەکان دەرکەوتن و قیافەی مەیمونێکی بێگوناهیان بەخشییە خۆیان، بزانە ئەو جەنگە شایەنی ئەوە نییە ڕۆحی خۆتی تیا بسووتێنێت. من هەموو ئەو شەوانەی لە دکتۆر زەندیانی تەرەسدا دەپاڕامەوە کارێکبکەین و زوو بچین بۆ جەنگی خۆمان و بیبینەوە، جگە لە شەڕانگێزی و

کینەدۆزی برِوایەکیشم هەبوو، هیوایەکم هەبوو، پلانێکی گەورە بۆ پاشەڕۆژ خەیاڵی گرتبووم. جەنگ دوای هەڵبژاردن جەنگی گەمژەکانە، جەنگی کەسانێکە ڕوون و ڕۆشن لاوازییەکی گەورەیان تاقیکردۆتەوە و ئێستا دەیانەوێت ئەو لاوازییە بەچەک بسڕنەوە. دەمزانی ئەم جەنگە جەنگێکە کەس نایباتەوە، چونکە هەر هێزە و بنکەیەکی وەهای سازاندوە، نەشکێت و نەخرێتە پەراوێزی مێژووەوە. لە کۆبوونەوەکەدا بەس قسە لەو قێز و کینەیە بوو کە لە هەموو ئەندامانی حیزبدا بەرامبەر دوژمن خرۆشابوو، هەموو پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە خیانەتێکی نەتەوەیی لە گۆڕێیە. من تەواو هێمن و بێدەنگ دانیشتبووم و تەنیا سەیرمدەکرد، هەموو دەیانزانی دوای ڕاپەڕین چ دڵگەرمییەکم بۆ جەنگ تێدابووە، چۆن دەمویست تا حیزب بە ئەفسانە گەورەکانی خەباتی شاخ پڕ چەکە، بە سەرکەوتنە دێرینەکان و سوارچاکییە مەزنەکانی ڕابوردوو شکۆدارە، یەکجار پەلاماری گەورەی خۆی بدات و هەموو شتێک لە کورتە جەنگێکی ئەفسانەییدا بۆ ئەبەد یەکلابکاتەوە. ئەوسا کاری وەها نەوەک دەکرا، بەڵکو ئاسان و کەم خوێن تر بوو. لەو کۆبوونەوەیەدا زەندیان بەرامبەرم دانیشتبوو، لەم ساڵ و نیوەدا شێوەی جلوبەرگی تەواو گۆڕا بوو. هەر ئەویش وانەبوو، وام هەستکرد هەموو ئەندامانی بیرۆی سیاسی بەرلەوەی بێن بۆ ئێرە چوونەتە لای باهیری و ئەو بۆ ئەم بۆنە تازەیە، جلی دی و ڕێنمایی نوێی پێداون. لەو ماوەیەدا دکتۆر زەندیانم تەنیا لە وێنەدا دیبوو، هەندێ جار کە لە دەزگا، ڕۆژنامەی زمانحاڵی حیزبیان بۆ دەهێنام، ڕێدەکەوت چاوم بە وێنەی یەکێک لەسەرکردە و بەرپرسەکان دەکەوت کە پێکڕا بووبوونە مۆدێرن و قات لەبەر، جارجار زەندیانیشم لە وێنەکاندا دەدیت، قاتی بریسکەداری شێوە ئاوریشمیی دەپۆشی و چاویلکە کۆنەکەی گۆڕیبووە سەر یەکێکی چێوەتەلا. هەڤالانی مەکتەب عەسکەریش هەموو جلی سوپای نیزامیان لەبەربوو، کە هەیبەتی ژەنراڵ و سوپاسالاری ڕاستەقینەی پێدەبەخشین. دوو ساڵ بوو من بۆ هیچ کۆبوونەوەیەکی گەورە بانگ نەکرابووم، گەرچی من ئاگام لە ورد و درشتی هاتوچۆ و ڕەفتار و نهێنی هەموو ئەم پیاوانە بوو کە ئێستا گردبووبوونەوە، بەڵام بە

ڕێکەوت نەبێت کەسیانم لە بۆنەیەکی گرنگ و ڕەسمیدا نەبینیبوو. هەموو گۆڕابوون، هەموو شێوەی دانیشتن و پاڵدانەوە و قسەکردنیان لەسەر پلانێکی داڕێژراوبوو، ئەوەی تورە و بێزاریدەکردم ئەو هەستە قووڵەی نامۆیی من بوو لە ناویاندا، کاتێک منیان بینی بە سەرە ڕووتاوە و چاوە سوورەکانمەوە، وەک گورگێکی نەخۆش ببینن، وەک کەسێک ببینن لە تابووتێکی کۆن هاتبێتەدەرێ، پەرێزیان لێگرتم و تەنیا بە سڵاوێکی ژێر لێو بەسەریانکردمەوە، بەر لەوەی بچینە هۆڵەکەوە هەموو تۆپەڵ تۆپەڵ وەستابوون و پێدەکەنین، هەمووش منیان فەرامۆشکرد و تەنها جێیانهێشتم. ئەمانە وەک کادێرانی ژێرەوە نەبوون کە پێیان وابوو گەرم و گوڕی و دۆستایەتی دەتوانێت من فریوبدات و ڕێگا لە جەوهەری کارەکەم بگرێت، هەموو دەیانزانی من موفەتیشە ترسناکەکەی سەرۆکم، پیاوی فایلە ئەرخەوانییەکانم کە هەموو نهێنی دونیای تێدایە، ئەو کەسەم کە زانیارییە ترسناکەکانی دەچێتە لا. لەو دانیشتنەوە تێگەیشتم بۆ هەتا هەتایە کەسێکی نامۆ و ناخۆشەویستم و بەوجۆرەش دەمێنمەوە. ڕاستە ترسناکترین دەزگام لە بندەستە، بەڵام گۆشەگیر و کەنارخراوم. هەستدەکەم سەرەتای ڕقی تەواوەتیم لە حیزب دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دانیشتنە، بۆ ئەو قێزە قووڵەی لە چاوی هەمووواندا بینیم، بۆ ئەو نیگا سەیر و تاریکانەی دکتۆر زەندیان لە پشت چاویلکەکەیەوە تێیدەگرتم، ئەو بەدرێژایی دانیشتنەکە بەرامبەرم بوو، زوو زوو تیلەچاوێکی قێزەون و شەڕانی دەدامێ. من کە ئەو سەیرکردنە ترسناکانەم دەبینی، کە لە شێوە بێزێکی نەدرکاو هەڵکشابوو، پتر لەوەی خەیاڵم لای ئەو شەڕە بێت کە هەڵگیرسابوو، خەیاڵم لای خۆم بوو کە بەو هەموو نیگا ترسناکە گەمارۆدرابووم. شەڕی من لەبەرەکانی جەنگ و مەیدانەکانی کوشتاردا نەبوو، بەڵکو لێرە و لەم هۆڵەدا بوو. هەموو دەیانزانی ئیشی من ئەوەیە بزانم چی دەکەن و چۆن بیردەکەنەوە و دەچن بۆ کوێ و لەگەڵ کێدا سەروکاریان هەیە، ئێستا وەک پێکڕا بەچاو گەمارۆم بدەنەوە، وەک بیانەوێت بڵێن تۆ چۆن بە چاوانت ئەشکەنجەمان دەدەیت، ئێستا ئان و ساتی تۆڵەیە و ئێمەش بەوجۆرە ئەشکەنجەت دەدەینەوە. دوو ساڵ بوو

زۆربەی ژیانم لە دروستکردن و گەورەکردن و فراوانکردنی ئاسایشدا بەسەربردبوو، سەدان زیندانیم هەبوو کە ئەندام و هەواداری گروپە سیاسییەکانی دیکە بوون، ئیسلامییە توندڕەوەکانم خستبووە سەغڵەتەوە و لە هەموو جێگایەک خستبوومنە ژێر گوشار. بە هەموو هەستەوەرەکانم ئەم پیاوە بودەڵانەم دەپاراست کە هیچ بەهرە و هونەرێکیان نەبوو، ئەوە نەبێت دەسەڵاتدارن و هیچی دی، کەچی ئێستا وەک قالۆنچەی توکنی ناو تەوالێتی مزگەوتێک سەیرمدەکەن. من لە ڕاستیدا هیچ نەبووم جگە لە پاسەوانی ئەم پیاوە سپڵە و بێوەفایانە، پاسەوانی خۆیان و ژنەکانیان و عەشیقەکانیان و قازانجەکانیان. ئەو هەستە تووشی ترسێکی کتوپڕ و تورەبوونێکی گەورەی دەکردم، چاوم بە نێودا دەگێڕان و جگە لەوەی خۆم وەک ئەو باڵندە باڵشۆڕە دەبینی کە ئەوانی دی لە پشتەوە لاقرتی پێدەکەن و لاساییدەکەنەوە، وێنەیەکی دیم نەدەهاتە بەرچاو. ئێستا هەستم بە کەمییەکی گەورە دەکرد. ئەوەی ئێسکی منی قورستر کرد، ئەو بێدەنگییە قووڵەبوو کە تا نزیک کۆتایی کۆبوونەوەکە دایگرتم، تەواوی شەڕەکەم وەک کارێکی پوچ دەبینی کە تا زووتر بوەستێت لە خزمەتی ئێمەدایە. شێرخان بە جۆشێکی بێوێنەوە هانی هەمووانی دەدا، ڕای وابوو حیزب لە چەند سەعاتێکدا هێزی بەرامبەر تا ناوەڕاستی دۆزەخ ڕاودەنێت و خۆی لەوسەرەوە بە مەشخەڵی سەرکەوتنەوە دەگەڕێتەوە. زەندیان کە تا ئەمڕۆ خۆی وەک کۆتری ئاشتی دەردەخست، لە ناکاو بووبوو بە سوارچاکێکی جەنگاوەر کە پێشنیاریدەکرد ڕۆژنامەنوسانی حیزب چەک هەڵبگرن و بڕۆنە پێشەوەی مەیدان و پێش تفەنگچییان پەلاماری بنکەکانی دوژمن بدەن. لە ناکاو ڕاگەیاندنی حیزب لە دەستی زەندیاندا بوو بە ڕاگەیاندنی جەنگ، خرۆشێکی وەهای بۆ پەلامار پیشاندا، دڵنیاییکردم کە سبەی ئۆرگانی حیزب بە چ مانشێتێکی ئاگرین و سەرنجڕاکێشەوە دێتەدەرێ. لە کۆتاییدا بێدەنگی من وەها دیار و سەرسوڕهێنەر و قورس بوو، جێگری گشتی داوایکرد ڕای خۆم بۆ هەمووان بەیانبکەم. من زەردەخەنەیەکی شەیتانی و گاڵتەجاڕانە پەڕییە سەر لێوم، بەڵام هەستەکانم خستە ژێر ڕکێفی عەقڵم و بە ڕستەیەکی

وشک و کورت کە نیشانەی بێزاریی و کینەی قووڵم بوو لە هەموو ئەوانەی چاویان تێبڕیوم، گووتم ئەندام و هەوادارانی دوژمن دەخەمە ژێر چاودێری وردەوە و هەوڵدەدەم لە هەموو شتێکیان بەخەبەربم. ڕاستییەکەی نەمدەویست لەو ڕستە کورتە زیاتر هیچی دی بڵێم، وام هەستکرد ئەوە تەنیا وەزیفەشم بێت و لەوە زیاتر شتێکی دی نەکەوێتە قەڵەمڕەوی بڕیاری منەوە. ڕستەکەم وەها کورت و بێڕۆح بوو، جێگر کەوتە گومان لێم، پێدەچوو ڕستەکەم جۆرێک بێت، دەربیخات بەربەستی نێوان من و ئەم پیاوانەی دەورووبەرم چ بەرز و عاسییە. تا پێشتر لە هیچ جێگایەک وەها نەدوێن و لێوقورس نەبووم، نەمکرێت لە ڕستەیەکی وەها سارد زیاتر هیچی دی بدرکێنم. هەڤاڵی جێگر بۆ ئەوەی برینی ئەو وشە وشک و بێڕۆحەم سارێژبکات و من هەست نەکەم لە ناو بازنەی دۆستایەتی ئەوان دەرکراوم و بووم بە بەشێکی زیاد لە لەشی حیزب، پرسی هەڤاڵ نا، ڕای تۆمان لەسەر تەواوی ئەم شەڕە دەوێت، چی بکەین، لەگەڵیدا بڕۆین، بوەستین، چی قورێک بکەین بەسەری خۆماندا؟. من وەک شمشێرێک لە زگی دکتۆر زەندیان و شێرخان ڕابدەم، سەیری چاوی هەردووکیانم کرد و بە گەروویەکەوە خەریکبوو دەنوسا، بەسەرێکەوە خەریکبوو گەرمدەبوو، بە لەپی دەستێکەوە خەریکبوو عارەقی دەگرت، گووتم «هیچ شتێک لە شەڕێک پوچتر نییە کەس باوەڕی پێ نەبێت. شەڕ پیاوکوشتن نییە، بەڵکو خەونێکی گەورەیە ... ئەو جەنگەی خەونێکی لە پشت نەبێت، دەبێتە تاوان... هەڤاڵ تکایە تا سەعاتێک زووتر ڕایبگریت درەنگە».
دوای ئەو قسەیەم بێدەنگییەکی کوشندە و خنکێنەر باڵی بەسەر هەمواندا کێشا، تا ئەوکاتە هەموو هاوارەکان بۆ جەنگبوون، زەندیان منیشی وەک ڕۆحێکی شەڕخواز ناساندبوو کە بەردەوام لە بیری هەڵگیرسانی فیتنەیەکی گەورەدام. بێدەنگییەکە چەند سانێکی سەنگین و کوشندەی بڕی. لە ناکاو زەندیان بێ هیچ هۆ و بەهانەیەک قاقایەکی بەرزی لێدا، کە تەواوی هۆڵەکەی لەراندەوە، بەدوای ئەودا شێرخانیش پێکەنی، بەدوای شێرخانیشدا هەموو ئەوانی تر یەکە یەکە کەوتنە قاقا لێدان، تا دواجار گەیشتە سەر هەڤاڵی جێگر و ئەویش بە دەنگێکی بەرز

تێکەڵاوی کۆراڵی تریقەکان بوو. من سەرسام و سووردا‌گەڕاو، یەکەیەکە تەماشامکردن، ئەوان لەسەر کورسییەکانی خۆیان بە پشتدا کەوتبوون، هەموو چاویان ئاوی پێکەنینی لێدەچۆڕا. پێکەنین و قریکەیان ماوەیەکی درێژی خایاند، هێندەی هێور دەبووەوە یەکێک بە پرمەیەکی کتوپڕ دایدەگیرساندەوە و هەمووان بە پشتدا دەکەوتنەوە و قاقا هەناسەی لێدەبڕین. ئەو شەوە ژیانم بەتەواوی گۆڕا، بە هێمنی لە جێگای خۆم هەستام، لەگەڵ جوڵەی مندا پێکەنینەکان هێور و کەم و کەمتر بوونەوە، من بە ئەسپایی ڕوومکردە دەرەوە، دەرگای هۆڵی کۆبوونەوەکەم کردەوە و بە چەند هەنگاوێکی خاو و تێکشکاو بەرەو ڕووی ماشێنەکەم ڕۆیشتم. دەنگێک لە دواوە بانگیکرد «جەنابی عەقید». من ئاوڕم نەدایەوە بزانم کێیە، جارێکی تر بانگیکردەوە »هۆی جەنابی عەقید، جەنابی عەقید». من لەسەر ڕۆیشتنی خۆم بەردەوام بووم. چوومە ناو ماشێنەکە و لە کیفەکەمدا قەڵەم و کاغەزێکم دەرهێنا و لەوێدا دەست لە کارکێشانەوەی خۆم لە حیزب و پۆستی بەڕێوەبەری ئاسایش و ژیانی سیاسی نوسی و بە شۆفێرەکەمم گووت بیباتە ژوورێ. هێندەی لەو کارە تەواوبووم، بێهیچ پەشۆکان و وەستان و دوودڵییەک بەرەو ماڵ لێمانخوڕی. بۆ چەند ساتێکی کورت هەستێکی ناخۆشم هەبوو کە من بە ڕاستی وەک پەترۆسێکی شەلم لێهاتووە و شایەنی پێکەنین و هەموو جۆرێک گاڵتەجاریم. بەڵام هێندەی ماشێنەکە کەوتە گوڕ و لەو جێگایە دوورکەوتینەوە، هەستێکی فڕین و بەرزبوونەوەی کتوپڕ دایگرتم، وەک ئەوەی باڵندە شەل و بێشکۆیە دەستێک لە ئاسمانەوە هەڵیگرتبێت و بەرەو باڵا بفڕێت و بەرزبێتەوە. شەوێکی هێمن بوو، لە ڕێگا جگە لە بەتاڵی و سەیرکردنی ئەستێرە و هەڵمژینی هەوای ساردی شەو بیرم لە هیچی تر نەدەکردەوە، دڵنیابووم بۆ ئەبەد شتێک لە نێوان من و حیزبدا شکاوە، حیزب کە من هەموو ژیانی خۆم دابوویە، ئێستا دەمکرا لێرەدا بە قەیچییەکی تیژ ئەو وێڵاشە ببڕم. شەوێکی سەیربوو هەستم بە لەش سووکییەکی زۆر دەکرد، گەرچی لەدوای ڕاپەڕینەوە، زۆر وەک جاران سەر و دڵم بارمتەی حیزب نەبوون، بەڵام هیچ کات هەستم نەکردبوو کۆت و

پێوەندە نهێنییەکانی لەسەر دەست و مەچەکم نین و بە هەر لایەکدا دەجوڵێمەوە گوێم لە خشە و زرینگەیان نابێت. بۆ یەکەمجار کاتێک هەوای شەو لێیدەدام، هەستم بە فێنکی ڕاستەقینە دەکرد، هەستم بە هەوا دەکرد، بە تریفەی شەو، بە بۆنی گیای نزیک ڕێگاکان، ئەوە یەکەمجارم بووم لە قووڵاییمدا ئەو بڕوایە سەری هەڵدا کە دەرچوون لە حیزب وەک دەرچوون وایە لە دۆزەخ. دەمزانی کە چیرۆکی من لەگەڵ حیزبدا لێرەدا کۆتایی نایەت، بەڵام لە ڕێگای گەڕانەوەمدا بۆ ماڵ چەند ساتێکی ئازادی گەورە ژیام. شەو کە گەڕامەوە هەموو پاسەوانەکانم ئیزندا و گووتم بەیانی بچنەوە بۆ بارەگای مەکتەبی عەسکەریی و بڵێن عەقید جەنگیز خۆی مەرەخەسیکردوین. پاسەوانەکان دەترسان لەو ڕۆژە ترسناک و تاریکانەی سەرهەڵدانی شەڕدا هەروا بڕۆن و بەر ماڵم چۆڵبکەن، دەیانزانی گەر شتێکم لێ بەسەربێت، کەسێک نابێت ببێتە شاهیدیان و بڵێت عەقید خۆی دەستبەرداریان بووە، بەڵام مەبەستم بوو هەموو بزانن من سەروسەوایەکم لەگەڵ حیزبدا نەماوە، پێمخۆش بوو یار و نەیار بزانن کە من و حیزب چیدی ئەو جمکە پێکەوەنوساوە نین بە نەشتەری حەکیمانیش لەیەک جودا نەبینەوە. هەر ئەو شەوە کیژە بچوکەکەی خۆم نایە سەر سەنگم و بەخەیاڵێکی ئاسوودە و بێباک لە هەر شتێک لێیخەوتم ... نەبوونی پاسەوانەکانم پتر لەوەی بمترسێنن مایەی هەستکردنێکی بێوێنەبوون بە ئەمان و دڵنیایی. ئەوە یەکەم هەستکردنی ڕاستەقینەم بوو بەوەی حیزب چ ژوورێکی دوکەڵاوی و خنکێنەرە و چ خۆش و چ پاکژ، دەشێت هەوای جیهان هەڵمژین، دەمێک سەر لەو ژوورە دەبەینەدەر. ئەو سەعاتانەم لە ساتەکانی سەرەتای عەشق دەچوون دەمێک خانمێک کە شەیدا و شێتی بووین ڕەزامەندیمان دەداتێ و وەک دڵدار قەبووڵماندەکات. تا بەیانی هەڵنەستام و ئاسمانی چکۆلەم لەسەر کۆشم دانەنا و دەستم نەکرد بە بەرچایی، ئەوەم بیرنەهاتەوە کە دەرچوونم لە حیزب چ خەیاڵ و ئەستەمێکە. بیرمکەوتەوە هەموو دەزانن من کانییەکی ڕەش و ترسناکی زانیاریم و نهێنی ئەم مەملەکەتە هەمووی وا لە کەللەی زل و بێتووکی مندا. بەڵام هەرچییەک بێت، ئەو سەعاتانە لە تۆماری ڕۆحمدا لە یاد

ناچنەوە، بۆ یەکەمجار تامی ئازادی ڕاستەقینەم کرد، ئازادییەک نە سالأنی شۆڕش، نە ڕۆژەکانی ڕاپەڕین، نە سەروەختێک فریشتەکەم دەستی لێ بەردام و ڕۆی، نە ئەو ماوەیەی لە دەزگا چێژی دەسەڵاتی بێسنووری خۆم دەکرد، نەمچەشتبوو. ئازادی بەو مانا گەورەیەی مرۆڤ هەستبکات بە تەنیا دەتوانێت بژی ... ئێستا شتێکم تاقیدەکردەوە، پێشتر ئاشنانەبووم پێی، ئازادیی تەنهایی ... ئازادییەک لەسەر توانای دابڕان و پچڕان و دەستبەرداربوون لە هەموو دونیا بەندە، شتێک ڕۆحی هیچ مەخلوقێکی سیاسی ناتوانێت بیچێژێت، بەڵام لە ناکاو من دەمتوانی چێژی لێ ببینم... چێژێکی بەتام کە تا ناو قووڵترین دەمارم ڕۆدەچوو.



ئەو شەوە، سەرۆک لە ئوتێلێکی پێنج ئەستێرەی ڤییەنادا خەوتبوو، کەسانێک کە گرنگی بەسەرهاتەکەیان دەرککردبوو، دەمودەست هەواڵی دەرچوونی منیان گەیاندبووە ئەو. هەواڵەکە یەکجار خەوی لە سەرۆک تەراندبوو، دوایی بیستم ئەو شەوە چەند سەعاتێکی تەواو بێدارماوەتەوە و تا بەیان نەخەوتووە. ئەوکات متمانەی پێمبوو، دەیزانی ئەوانیدی بۆ دەیانەوێت نالەبار و گاڵتەجاڕ دەرمبخەن. گەر لەم ساتی شەڕ و کاولکارییەشدا لە حیزب دەربچووبامایە و کەڵکەڵەی هەڵهاتن بۆ لای دوژمن بکەوتبایەتە سەرم، شتێک بوو وەک هەرەسی دیواری ژووری نهێنییەکانی حیزب، دەلاقەیەک بوو چی شتێک خودا حەزی پێ نییە دەیخستە ڕوو. ئەو ڕۆژە کە نەچووم بۆ ئاسایش پەشێوییەکی توند کەوتەوە و دەزگا پڕبوو لە دەنگۆی جۆراوجۆر و چیرۆکەکەی شەو بە چەندین شێوەی جیاواز لە ناو خەڵکدا بڵاوبووەوە، هەتا یەکێ لە هەواڵەکان کە برەوێکی زۆری سەند و خێرا تەنییەوە دەیگووت، من خیانەتکاربووم و حیزب دوێنێ شەو لە دادگایەکی خێرا و نیزامیدا

تیربارانیان کردوم و لاشەکەم لە جێگایەکی دەرەوەی شار بە نهێنی کراوە بە ژێر خاکەوە. لای نیوەڕۆ هەڤاڵی جێگر بە بروسکەیەکی سەرۆکەوە و بە ڕەنگێکی پەرێو و بە هەناسەیەکی سوارەوە لەگەڵ هێزێکی مەغۆل بەزێندا لە بەر دەرکی ماڵمدا دابەزین. نەبوونی من لە جێگای کارم شارەکەی خستبووە شڵەژان و ئیشی دەزگای پەکخستبوو. من گەرچی چاوەڕوانی هەڕەشە و هەدیدان بووم، لەگەڵ ئەوەشدا هەر پێشوازییەکی ساردم لە جێگر کرد و بە ناوی ئەوەی چای بۆ لێدەنێم هەستام و چوومە چێشتخانەکەم و خۆم بە جۆرێکی وەها سەرقاڵکرد بزانێت بە مەبەست ڕۆیشتووم و ئارەزوویەکم نییە میوانداری گەرمی لێبکەم. خۆی زوو هەستی بە ساردی و بێمەیلی من کرد و هاتە چێشتخانەکە لام و کەوتە قسە. کورتەی پەیامی ئەوە بوو، بڵێت من هاتووم بە ناوی هەمووانەوە داوای لێبوردن بکەم، هاتووم بمانبەخشیت و ئەوەی شەو ڕوویدا شتێکی وەها نەبوو نیازی خراپی لە دووبێت، هەڤاڵان کە لە ژێر باری ماندوێتی و ناجۆری دۆخەکەدا بوون، چاوەڕوانی ئەوە نەبوون ئەوە لە ئێوە ببیستن، بەو دەنگە و بەو شێوەیەش ... ئیتر پێکەنینیان جگە لە دۆستایەتی و گەپی برایانە هیچی لە پشت نەبووە. هەر لەوێدا بروسکەیەکی خێرای سەرۆکی دەرهێنا و دایە دەستم و گوتی سەرۆک تەواو ناڕەحەتە لەوەی ڕوویدا، گەر تۆ نەمانبەخشیت من خراپم بەسەر دێت و ئاسان لە سزای ئەو دەرناچم. من نامەکەی سەرۆکم خوێندەوە کە هەڕەشەیەکی توندی لە هەموو ئەوانە تێدا بوو کە سوکایەتیان بە من کردوە و بە ستایشێکی بێوێنەی من دێڕەکانی ڕازاندبووەوە و نوسیبووی گوایە ئەو وەک کوڕی تاقانەی خۆی سەیرمدەکات.

دەکرا ئەم ڕووداوە شتێکی گرنگ نەبێت، دەکرا ئەوەی ئەو شەوە ڕوویدا چیرۆکێکی بێمانا و تێپەڕ بێت کە شایەنی گێڕانەوە نییە، بەڵام ئەوەی ڕوویدا نرخێکی گەورەی هەبوو، ئەوە سەرەتای تووشبوونی من بوو بە بەتای کوشندەی قێز. دەردێک دواتر دڵنیابووم سەرۆک لە مێژە تووشی بووە و زۆر لە خۆی دەکات تا بەرگەی بگرێت. بۆ یەکەمجار کە هەڤاڵی

جێگر هاتە چێشتخانەکەم و لە بەردەممدا وەستا، هەستم بە بۆنێکی ناخۆش کرد، وامزانی ئەوە چەندین ڕۆژ بێت، هەڤاڵ ئاو بەر جەستەی نەکەوتبێت، گووتم بۆ چڵکی ئەوانە کە هەوای دەورووبەرمانی پڕکردوە، بەڵام نا، ئەوە گەردەلولی سامناکی قێز بوو، دەگەیشتە لام. من بە پێچەوانەی سەرۆکەوە ئەو بۆنە ناخۆشە ئازاری نەدام، بەڵکو هەستێک دایگرتم بمەوێت بۆیبکەم و هەڵیمژم. ئەو بۆنە ناخۆشەی هەڤاڵی جێگر، ئەو بۆنە قێزەونە، منی گێڕایەوە ناو دونیای حیزب ... لەو ساتەوە ژیانم هەموو گۆڕا، ئیتر ئەو هێڵنج و بۆیە دەستیگرتم و بردمییەوە ئەو جێگایەی لێوەی هاتبووم. من داوام لە هەڤاڵی جێگر کرد تا وادەی گەڕانەوەی سەرۆک یەکێک بخەنە جێگام و لە کاری ئاسایش مەرەخەسمبکەن، هەڤاڵ بە گوپە شەرابی و سەرە سپی و چاوە بۆقیلەیەکەیانییەوە، سەیریکردم و گووتی «نا هەڤاڵ کاری وامەکە، مەهێڵە کەس هەستبکات دەتوانێت جێگای تۆ بگرێتەوە».

ئامۆژگارییەکەی لە شوێنی خۆیدا بوو. تا ئێوارە بەرگەم گرت و دەمە و تاریکی چوومەوە بۆ دەزگا. بەڵام دونیا و حیزب هەردووکیان لە بەرچاوم گۆڕابوون. ساتێک دەرگای ژوورەکەی خۆمم کردەوە، بەر لەوەی یەکەم هەنگاو بنێم بۆ ناوەوە، هەستێک ڕایوەشاندم و تەزوویەکی سەیر گیانی داگرتم، بۆنێکی ناخۆش لە بیرۆکە دەهات، گەڕامەوە دواوە و پڕ بە سینەم هەوای ناو داڵان و ڕاڕاوەکانم هەڵمژی، هەموو دەزگاکە بۆنێکی گەندی هەبوو، یەکەیەکە ژوورەکان ئەو بۆنەیان گرتبوو، دەرگاکان و کورسییەکان و مێزەکان و ئادەمیزادەکان، وەک ئەو بۆگەنە ڕۆحم لە شتێک پاکبکاتەوە تێر هەڵمژی. بۆیەک بوو کەسکون و قێزەون، کەچی شتێک نەبوو جاڕز یان هەراسانم بکات، بەڵکو بۆیەکی توندبوو کە ئاسوودەیدەکردم و ئۆقرەی پێدەبەخشیم. ترسام سبەی نەتوانم ئەو بۆنەبکەمەوە، لەبەرئەوە وەک شتێکی گرنگ بۆ ساتی تەنگانە لە گەنجینە بنێم، پەیتا پەیتا قووڵ هەڵمدەمژی و لە لووت و سینەمدا دەمهێشتەوە. هەستمکرد تاوانی ئەو فریشتە مەلعونەیە کە شەو ئەو نامەی دەست لە کارکێشانەوەیەم نوسی. گووتم دەیەوێت بەمجۆرە هەستانە، لەم دونیایە

دەرمبهێنێت و لە ژیانی خۆم دوورمبخاتەوە. گەرچی فریشتەکەم ڕۆیشتبوو، کەچی ئێستاش هەموو لە ڕێلادانێکی خۆم دەگێڕایەوە بۆ کاری ئەو بەستەزمانە، هەستێک هیچ بنەمایەکی مەنتیقی نەبوو، بەڵام نەشمدەتوانی لەسەری خۆم دەریبکەم. گەڕامەوە ژووری و ئارەزوویەکی کوشندەم تێدا بوو هەر ئێستا وەفائیل بگرم و بیکوژم.

ئەو قاقایانەی من لە هۆڵی یەکەمین کۆبوونەوەی شەڕدا بیستم، بەشێک بوون لە خودی ئەو جەنگە، نا لە ڕاستیدا جەوهەری جەنگەکە بوون، بەوەدا من لەو هۆڵەدا خەیاڵم لای ئەرکی مێژوویی جەنگ بوو، قسەکانم قێزێک و نەفرینێکیان بۆ دوژمن تێدانەبوو، بەوەش شایستەی پێکەنین بووم. ڕاستە من دەزگای ئەمنییەتم دەبردبەڕێوە، بەڵام هێند کارمەندگەرا و بێعاتیفە کارمدەکرد، وەک پێویست هێشتا لاقرتی و بێزم بەرامبەر دونیا تێدا دروست نەبوو بوو، ئەو دوو شتەی کە تاکە دەستکەوتی مرۆڤی نوێی ئێمە بوو دوای ڕاپەڕین. مرۆڤی ئازاد ئەوە بوو کە قێزی لە هەموو شت دەهاتەوە خۆی نەبێت، جەنگ بریتی بوو لە تاقیکردنەوەی ئەو ئازادییە، ئازادی قێزکردنەوە، کە پێدەچێت تا ئەمڕۆ بە نرخترین دەستکەوتێک بێت ڕاپەڕین بە ئێمەی بەخشیبێت. ئەگین گەر وانییە کێ دەیتوانی لەو ساتەدا کە بوونی نیشتیمان بە دەزوویەکی باریکەوە گرێدرابوو، بیر لە جەنگێکی وا سارد و بێسوود و سەرسەختانە بکاتەوە. من کە دوای بیست سەعاتی پڕ جاروجەنجاڵ دووبارە لەسەر کورسییەکەی خۆم دانیشتم، بووبووم بە کەسێکی تر و ئێستا وەک هەر ڕۆحێکی تەبا و تەندروست لەگەڵ دونیادا قێزم لە دونیا دەهاتەوە، ئەو هەستە کورت و تێپەڕانەی دوێنێ شەو بە ئازادی، ئێستا لە پێش ئەم قەڵبەزە و قوڵپدانەی دەروندا کۆتاییان دەهات. لەو کاتەدا هەستێکی خۆشترم هەبوو، دەمزانی کە من دەڕوانم و بۆندەکەم و بێزدەکەمەوە، هەموو دونیاش لێم دەڕوانێت و بۆنمدەکات و بێزم لێدەکاتەوە ...

خودایە ... خودایە گەر ئەو هەستە نەبووایە لە پوچی و قێز و ساردیی، ئەوا لە ساڵانی شەڕی ناوخۆدا دەمردم.

لە ساڵانی شەڕدا فەرمانمدا بە کەمترین شێوە ژوور و زیندانەکانی دەزگا پاکبکەنەوە، تەنیا بەشی ئەوەی دەستمان نەگرێت و بتوانین کار بکەین. تۆزە تۆزە چڵک و پیسییەکی بینراو و نەبینراو لەسەر شتەکان کەڵەکەبوون، بۆنێکی تایبەتی هەموو جێگاکانی گرت، زیندان و زینزانەکانی دەزگا، بە هیچ جۆرێک پاک نەدەکرانەوە. لە ژوورەکانی کارکردن و لە ڕاڕەوەکاندا خۆڵ و پاشەڕۆ تا زۆر زۆر نەبایە لانەدەبران. من بەیانیان لە ماشێنێکی جام ڕەشدا دەچووم بۆ سەر کار... لە ماوەیەکی کورتدا چی ئەندام و هەوادارێکی دوژمنمان دەناسی، بە کۆمەڵ لە پەلاماری شەوانەی گەورەدا دەستبەسەرمانکردن و لەو شوێنە پیس و چەپەڵانەمان خزاندن... هێندەی دەستە دەستە دەگەیشتنە زیندان، من دەچوومە سەیریان و ئەو نیگا تار و تۆقێنەرە لە چاومدا بوو، نیگای قێز. دوژمن لە شارەکانی بندەستی خۆیدا، ژن و ماڵ و منداڵی لایەنگرانی ئێمەی دەگرت و ئەتکیدەکردن، ئێمەش لە هەموو شار و شارۆچکەیەکدا فەرمانی گرتن و ئەتککردنی هەموو هەوادارانی ئەوانمان دا، هەردوولامان هێندەی بە قێز شەڕمانکرد، بە گوللە نەجەنگین ... هەموو ڕۆژێک دووجار زینزانە و زیندانەکانی دەزگام بەسەر دەکردەوە، ژوورەکانمان وەها لە دیل و بارمتە سیخناخ بوون، جێگای دانیشتنی ڕاحەت و شوێنی خەوی گونجاو بۆ کەس نەمابوو، من و هاوکارانم بە جێگاکاندا دەگەڕاین و چاومان ئەو بێز و لاقرتییەی تێدابوو، دەموچاومان فەساڵ و ڕەنگوڕووی کەسانێکی بوو کە هەر ئێستا لە تۆزێکی تر دەرشێنەوە، سووکایەتییەکی وەها لە چاوماندا بوو، لە برسێتی و بێخەوی زیاتر ئازاری گیراوەکانی دەدا. کە بەسەر زیندانەکاندا دەگەڕام، کەسێکی توانجبازم دەخستە دووی خۆم تا ئەو چەند پێیدەکرێت تانە و ناتۆرە لە گیراوەکان بدات و ئێمە بە دەنگی بەرز پێبکەنین... هەموو ڕۆژ لە ناو دیلە نەخۆش و پیرەکاندا یەکێکمان دەردەهێنا کە نەتوانێت ڕێک بڕوات، واماندەکرد بە بەردەم دیلەکاندا بێت و بچێت و قۆشمەچییەکەی ئێمە لە پشتییەوە لاساییبکاتەوە و ئێمەش پێبکەنین، هەموو ڕۆژێک چەند جار ئەو نمایشەمان دووبارەدەکردەوە،

تاکە نمایشێک بوو زۆر خۆشم لێیدەهات و زۆر پێدەکەنیم. پەترۆس من نەبووم... من نەبووم، ئەوانی دیکە بوون.

پاش ماوەیەک بە هۆی کەڵەکەبوونی پیسییەوە لە زیندانەکانی مندا کۆلێرا بڵاوبووەوە، بێئەوەی بهێڵم هیچ کەس لە زیندانەکانی مندا بمرێت، هەموو نەخۆشەکانم سوار چەند لۆرییەکی گەورەکرد و بە کاروانێکی درێژ بەرەو سنووری هەرێمی خۆمان لەگەڵ جەنگاوەرانی دوژمندا بەرێمکردن. لەوێ لە سەر شەقامێکی چۆڵ، دەمەوبەیانییەکی سارد دامگرتن و بەرەو ناو دوژمن رێگام نیشاندان... بەوجۆرە بوو کۆلێرا لە هەموو شوێن و شارەکانی نیشتماندا بڵاوبووەوە.

من لە زیندانەکانی خۆمدا، کوژراوێکی ئەوتۆم نەبوو، سەردەمی کوشتنی زیندانییەکان بە سەر چووبوو، لەم رۆژگارە نوێیەدا هەتا ئەشکەنجەدان نرخێکی نەبوو، بەڵکو تەنیا شتێک لە رێگایەوە دیلەکانمان پێ وردەدەکرد، قێزبوو... قێز و لاقرتی.

## نزار ئیدریس لە زیندان

«دەزانی لەوانەیە تۆ رقت لە من بێت، لە بەرئەوەی لە کەسێکی تر دەچم کە تۆ خۆشت ناوێت. لەوانەشە خۆشت بوێم، چونکە لە کەسێکی تر دەچم تۆ حەزت لێیەتی. زۆر ژن حەزیان لە من کردوە، چونکە لە کەسێکی تر چووم کە حەزیان لێکردوە... جەنابی عەقید. لەوانەیە کەسێکیش بکوژیت لە بەر ئەوەی ئەو کەسە هەر باوکت یان خاڵێکی دەغەزاری خۆت بیردەخاتەوە... ژیان چونکە پروپوچە لەسەر ئەم شتە پروپوچانەش وەستاوە... من ئەسیری دەستی شتێکی وەهام، دیلی دەعبایەکم بە دەست ئەم دەردەوە گیری خواردوە، بەو عومەر بۆتانییە کەللە پوتەی هاورێت بڵێت، دڵم بۆی دەوستێت و بەزەییم پێیدا دێتەوە...

پیاوێکی پوتە، ئەگینا دوای ئەو هەموو ساڵە، دوای ئەو هەموو ساڵە، من لێرە نەدەبووم».

سەیرم لێهات کە نزار ئیدریس، بکوژی باوکی خۆی، قارەمانی سالوک و دڵڕەقی هەشتاکان، بە کۆمەڵێک زام و جەستەیەکی تێکشکاوەوە بەو جۆرە و بێ هیچ پێشەکییەک، بەو ڕستە پڕوپوچانە دەست پێبکات. هەر منی بینی وەک گاڵتەی بە دونیا بێت، گووتی «ئەم لیڤیتانتەی تۆ کەسێکی لەوجۆرەیە، هەموو شەوێک لە خەویدا پیاوێکی غەریب سوار ژنەکەی دەبێت، دەموچاوی ئەو پیاوە غەریبە لە دەموچاوی من دەچێت، بۆیە قینی لێمە... ڕەنگە ئەو پیاوە غەریبە پێشتر لە خەویدا سوار دایکی بووبێت، سوار نەنکی بووبێت، سوار یەکە بە یەکەی ژنانی بنەماڵەکەی بووبێت... تۆ چوو زانیت ئینسان هەزار وەسواس و خەیاڵاتی وەهای هەیە... دەبێت ئەوە یان شتێکی لەو بابەتە بێت، ئەگین من دوای ئەو هەموو ساڵە هۆیەک بۆ ئەم شەڕانگێزییە شک نابەم».

ویستم بڵێم «خودایە چ مرۆڤێکی قێزەون و دەمپیسی»، بەڵام قاقایەکی بەرزتری لێدا و گووتی: «من بە لیڤیتانتم گووت، دەتەوێت باسی ژنەکەتت بۆ بکەم. دەتەوێت بۆت باسبکەم لە کاتی سێکسدا چی دەڵێت، دەتەوێت پێتبڵێم نیشانە و خاڵەکانی بە کوێوەن، لە کوێدا پیستی کاڵ و لە کوێدا ئەسمەرتر دەنوێنێت... دەتەوێت باسی چاویت لە کاتی جووتبووندا بۆ بکەم ، دەتەوێت پێتبڵێم چی بکەیت بۆ ئەوەی خێراتر ڕەحەت بێت... ها دەتەوێت».

لە جلێکی دڕاودا بەرامبەرم دانیشتبوو، سەروچاو و لالێوی هەمووی برین، بەڵام نیگای پڕ لە جەسووریی و بێباکی... خۆی بوو، نزار ئیدریسە دێرین و دوپشک ئاساکەی جاران، لیڤیتانت توانیبووی زیان و زەبرێک بە جەستەی بگەیێنێت، بەڵام ڕۆحیی هەڵگڕاو و سەرچڵی وەک خۆی هەر لە گڤیندا بوو.

دوو مانگ بوو هەوڵمدەدا ئەو دیدارە لەگەڵ نزاردا ڕێکبخەم، هەم سەرۆک و هەم نەغەدە ماردینیم کردبووە تکاکار، خۆشم ڕۆژانە لە بۆتانی دەپاڕامەوە ڕێگام بدات ببینم، ئێستاش ئەو بەرامبەرم دانیشتبوو، مەخلوقێکی بێتەگبیر بە هەموو کەمتەرخەمی کەسێکەوە کە دەزانێت کەوتۆتە سەرەولێژێک دوا دەرووی لە دەمی خەرەندێکی بێبندا کۆتایی دێت. سەرەتا هەر بەو نیازە هاتم بزانم ماوە و زیندووە، دواتر حەزم لێ بوو لە ساتی تێکشکان و لاوازییدا ببینم. تەنیا من دەمزانی بۆ نزار لێرەیە، زەمەن هەموو شتێکی لە یادەوەری هەمووان‌دا سڕیبووەوە، من و خۆی و لیڤیتانت نەبێت.

دەستم خستە سەر دەستم و بە نیازی ئەوەی لە شتێکی گرنگ ئاگاداریبکەمەوە گووتم «بیرت نەچێت کە تۆ لیڤیتانتت بریندارکرد. لە ناوەڕاستی شار و بە بەرچاوی خەڵکەوە داتە بەر گولله. ڕاستە لەگەڵ ئێمەدا بەو کارە هەستایت، بەڵام ئیشەکە بۆ خۆت بوو. لیڤیتانت هەموو ئەو شتانە دەزانێت. دوا ئەوە لیڤیتانت بەوجۆرە سەیری شەرەف ناکات، من ئەو پیاوە دەناسم، کەم کەسی وا دەگمەنم دیبێت کە ئەسڵەن ناموسی خۆی بە ناوگەڵی ژنەکەیەوە گرێنادات. لەو ڕووەوە تەواو لەگەڵ خواستی ئەو خانمانەدا هاوڕایە کە بە ئێمەی پیاوان دەڵێن ئابڕووی ئێوە لە ناوگەڵی ئێمەدا نییە. گەرچی ڕاستت دەوێت من تا ئێستا ژنێکیشم نەدیوە هێندە دڵ گەورە بێت، وانەزانێت ناموسی ئێمەی پیاویش بە ناوگەڵمانەوە نەنووساوە. هەر شتێک لە دامەنی ئێمەی پیاو بترازێت دەمودەست دەڵێن های بێناموس، های بێئەخلاق، وای دەرپێ پیسی فاسیق، بە جۆرێک من تێیدا ماومەتەوە ئایا تەنیا ناموسی ژنانە پەیوەندی بە ناوگەڵەوە نەماوە، یان ناموسی ئێمەشە. بەڵام هەموو ئەم قسانە لای لیڤیتانت بەهای سەلکە تورێکی نییە، ئەوەی تۆ پێش ئەو پەیوەندییەکت لەگەڵ ژنەکەیدا بووە ناتکات بە قارەمان. دەبوو زیاتر لەوە ئاگات لە خۆت بێت و نەهێڵیت بکەویتە ئێرە ... نا کاکە گیان، ئەو کابرایە بە جۆرێکی تر سەیری

ناموس دەکات و ئەو قسانەی تۆ جگە لەوەی سەرئێشەی بۆ دروستدەکەن، کارێکی ئەوتۆ ناکەنە سەر ناموسی».

«زۆر هەوڵمدا سەرۆک ببینم، سێ جار نامەی تایبەتم بۆ نوسی، ئەو دیکتاتۆرە گێژە وەڵامی نەبوو، ورگزلی سەر گامێشی وەها منی هەر بیر نەماوە. دووجار ویستم خۆم بگەێنمە شوێنی دانیشتنی و لەوێ مانبگرم تا دەمبینێت، بەڵام ئامادەنەبوو هەر چاوی پێمبکەوێت، هەر دوو جارەکە پاسەوانەکان باڵبەستیانکردم و بە ماشێنی پێشمەرگە گەیاندیانمەوە سەرای شار و لەوێ وەک چۆلەکەیەکی زیقن بەرەڵا بکەن، ئازادیانکردم».

«نزار ئیدریسی عەزیز، من دەزانم تۆ خراپەت زۆرە، بەڵام باوەڕناکەم خراپەکانت بەرامبەر لیڤیتانت شتێکی وەها گەورە بێت نەکرێت کەس بۆت تێبکەوێت و بە تکا و پاڕانەوە بگاتە جێگایەک. بەڵام هەموو شتەکە لای لیڤیتانت نرخێکی ڕەمزی هەیە. دەزانی چۆن؟ هەڵبەت ڕوونکردنەوەی ئاسان نییە، تۆ خۆت لەو شتانە دەزانیت... دەزانیت سەردەمەکە بە جۆرێکی نالەبار گۆڕاوە، شتەکان زیاتریش دەگۆڕێن، من ناویدەنێم توانای مەلەکردن لەگەڵ شەپۆلی عەسرەکەدا. تۆ هەمیشە کەسێکی بەهێزبوویت، جەنابی لیڤیتانت ناتوانێت بتبەخشێت، هۆکەشی ئەوەیە گەر بتبەخشێت شتێک لە ناخی خۆیدا دەشکێت. ئەو ئەسڵەن بۆی گرنگ نییە تۆ لەگەڵ نەغەدە ماردینی خەوتوویت یان نا، بوونی تۆ لێرە کاری بەوەوە نییە ڕەنگی ناوگەڵی ژنی ئەو چۆنە یان چۆن نییە، ئەوە کارێکی بەسەر ئیشەکەوە نییە، نازانم بۆ وابیردەکەیتەوە. زۆر غەڵەتیت واتێبگەیت ڕەشمارای برادەرمان بە جۆرە قسەی وەها دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە و ئیحساساتی بریندارەبێت. تۆ لێرەیت چونکە شکستێک بیری ئەو دەهێنیتەوە، شکستێک هەموو مێژووی گۆڕیوە. بیرت نەچێت، بە هۆی تۆوە لە شۆڕش تەرە بوو، پلەی مەسئولی زیندانی لە دەستچوو، وەک یەکێک لە جاشە ئەوەڵییەکان ناوی بە ناو خەڵکدا ڕۆیشت. ئەوە هەستێکە هەموو ژیانی لێی ڕادەکات... شکست و مردن لای جەنابی لیڤیتانت یەک شتن، من هاوڕێی دێرینەمە، لەو پیاوانەیە کە خواردنەوەی

پەرداخێک ژەهری لە بێهێزی لا باشترە، گرنگ نییە چۆن و کێ هێزی دەداتێ، گەر لە شەیتانیش بووە سواڵیدەکات. تۆ نایناسی، لە نزیکەوە نەتبینیوە، هەر لە کاتی ئەشکەنجە و زینداندا سەروسەودات لەگەڵ بووە، یان لەدەستی هەڵهاتوویت یان لە زیندان بوویت لەلای».

نزار بە وریایی گوێی لێدەگرتم، ئاشکرا دەرکەوتنی من و ئەم سەردانە کتوپڕەم ئومێدێکی بچوکی پێدابوو. ئەو دوای دەرکردنی بەعسییەکان کەوتە ژێرەوە و کەس خەبەرێکی ڕوون و یەقینی دەربارەی نەبوو. سەرەتا بە جۆرێکی زیرەکانە ڕابوردووی خۆی لەگەڵ دەوڵەتدا سڕییەوە، خۆی تێکەڵ بە شۆڕش و ڕاپەڕین کردەوە، بەڵام دواتر وەک تارماییەک بەدوایەوە بێت، وەک بزانێت دەرەقەتی ئەم سەردەمە نایەت، بەویست و ڕەزامەندی خۆی سەر شانۆی چۆڵکرد و دیار نەما. لەو ساتەوەی گیرا، لاوازی و هەڵهاتنی ئەو بۆ من وەک تەلیسم و مەعمایەکی بێوەڵام بوو. دەبێت ڕاستی بڵێم لەو ساڵ و نیوەی دواییدا بەدەگمەن هاتبووە خەیاڵم و بیرم لێ کردبووەوە. هێندە سەرقاڵی دروستکردنی دەزگا و نوسینی کتێبەکەم بووم، کاتێکی وا زۆرم نەبوو لە سەر یادەوەرییەکانی ڕابوردووم ئیشبکەم. ئەوەندەش لە دووی بولبولیار و فریشتەکەم گەڕابووم هێزم نەبوو کەسی دی بخەمە لیستی پشکنینەکانمەوە، ناوەکانیش ڕۆژ بە ڕۆژ لە بەردەممدا کەڵەکەدەبوون، وەک بەڕێوەبەری زیندان و ئاسایش هەر سەعاتە و چەندین ناوی بایەخدار و ترسناک بە بەرچاومدا تێدەپەڕین کە دەبوو بیانناسمەوە و غافڵیان نەکەم. دوو ڕۆژ دوای گیرانی، ڕاپۆرتێکی نهێنی لە زیندانی مەرکەزییەوە ئاشکرایکرد کە نزار گیراوە و زیندانە. تا ڕاپۆرتەکەم نەبینی، ئەوەم لە خەیاڵدا نەبوو کارێک بۆ ئەم پیاوە بکەم و سۆراغێکی بگرم. وەک لە یادکردنی کۆمەڵێک هۆکاری دەرونی لە پشت بوو‌بێت و بە فەرامۆشکردنی منیش خۆم لە شتگەلێکی ئازاربەخش بپارێزم، تورمدابووە دەرەوەی هەر فیکر و هەر یادێک. کاتێک هەواڵی گرتنەکەی بە من گەیشت، دەقی هەواڵەکە کورت و بێ زانیاری بوو، تەنیا دەیگووت چەند شەو لەوەوبەر نزار ئیدریس ناوێک، لە سوچی شەقامێکی

تاریکدا کەوتۆتە دەست هێزێکی سەر بە «عومەر بۆتانی» و لەو کاتەوە بردوویانەتە زیندان و کەس هیچ دەربارەی چارەنوسی نازانێت. هەڵبەت زۆر کەس دەیانزانی نزار کێیە، بەڵام ئەوەی هەواڵەکەی دارشتبوو لەو ئاسایشە گەنج و بێئەزموونانە بوو کە لە مێژووی پێشینەی شاردا شارەزاییەکیان نییە و دونیای پێش راپەڕین ناناسن، لەبەرئەوە بێئەوەی هیچ دەربارەی نرخی ئەو خەبەرە بزانێت، وەک شتێکی سەرپێی و ڕۆژانە و بێبەها تۆماریکردبوو.

گرتنی نزار منی زۆر دڵتەنگکرد ... تا هیچ بەزەیی و سۆزێکم لەگەڵ ئەم کوڕەدا نەبوو، کە لە دیوەخانەکەی مەنسوور بەگەوە دەمویست خودا بەر غەزەبی خۆیی بخات، بەڵام شتێک ئاوها زۆر بە ڕابوردووەوە گرێیدرایە، شتێک نەمردبایە و بەردەوام بگەڕابایەتەوە و لە کۆڵ ئادەمیزاد نەبایەتەوە، دەیترساندم. لەوەش زیاتر ئەوە پرسیار بوو بۆم، لەبەرچی لە ناو هەموو کەسانی سەردەمی پێشوودا نزار لەسەر شانۆی ئەم عەسرە تازەیە دیار نییە، چی نیازێکی هەیە وا چۆتە پشتی سەحنە و لەو دیو پەردەوە خۆی قایمکردوە. کەم کەس هەبوو لە کاتی پەڕینەوەدا بۆ ئەمڕۆ، پردی ڕابوردووی بۆ تەی نەکرێت و نەگاتە کەناری ئارامی و نەجات، مەگەر مردووەکان. ئەو ڕۆژەی هەواڵەکەم بیست، بیرم لە دوا دانیشتنی خۆمان کردەوە، شەوێک دواجار بینیم و ئەو هەراس و دڵەڕاوکێ قووڵەم هەست پێکرد لە ناخیدا. من دەمزانی هەر چی تکایەکیش لە لیڤیتانت بکەم بێسوودە و ئازادکردنی نزار ئەستەمە. لەگەڵ ئەوەشدا هەر یەکەم ڕۆژ کە هەواڵەکەم بیست، شەو درەنگ زەنگێکم بۆ لیڤیتانت لێدا، تا لە هێمنی شەو و دوور لە هەر ئاڵۆزی و جەنجاڵییەک تکای هاوڕێیەکی لێبکەم، ڕابوردوو لە بیربکات و ئەو تارماییە ترسناکانە لە خەو هەڵنەستێنێت کە دەشێت وریاکردنەوەیان دەیان چیرۆکی تر لە گۆڕستانەکاندا بەخەبەر بهێنێت و بیانخاتەوە سەر شانۆ. ئەو کاتانەی من بەو تۆن و وشانە قسەمدەکرد، ئەو بە هێمنی گوێیدەگرت. گەر بەرابەریشی بوومایە نەمدەزانی کاریگەریی وشەکانم چیین، نەخوازا لە

تەلەفوندا بایە و ئەو لەو بەر تەنیا بێدەنگ گوێبیگرتایە و وشەیەکی وەها ڕوونی نەدرکاندبایە تێبگەم چی لەسەریدا دەگوزەرێت. تکاکانی من لە دڵەوە بوون، بۆ ژیانی نزار نەبوون، هێندەی بۆ ئەوە بوون هیچ چیرۆکێک نەبیستم، سەرەتای ژیانی خۆمم لەم دەزگا مەلعونەدا بیربخاتەوە... تا من هیچ کات نارازی نەبووم لە ئیشی دەزگا، بەڵام خۆشبەختیش نەبووم. ئەم چیرۆکەی نزار و لیڤیتانت منی خستبووە ئەم ژیانەوە، منی لە کوردپەروەرێکی سادەوە کە چووبووم بۆ جەنگی عەرەبی داگیرکەر، کردبوو بە سیخوڕێکی ئەبەدی. هەر کات ئەو چیرۆکە زیندوو دەبووەوە من هەموو زیندەگی خۆم بیردەکەوتەوە، ناکامییەکانم، تەنهاییەکەم، لەدەستدانی فریشتەکەم، کوشتنم بۆ ژنە بێگوناهەکان، یاداشتەکانم، ئەرکە سەختەکانم، لەگەڵ تەواوی ساتە دژوارەکانی مێژوویەک کە هەرگیز نەیدەویست کۆتایی بێت و بوەستێت. هەمیشە کە سەربوردی نزار و لیڤیتانت زیندوودەبووەوە من لە خۆمم دەپرسی ئایا ڕاست بوو من بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتم، ئایا ژیانێکی تر نەبوو من بیگرمە بەر، ئایا ئەوە تەنیا دەربەند و گەروو بوو لەو بانهەوار و هەردەبانە بەرزانەدا پێیدا بڕۆم، یاخود فریشتەکەم لەسەر هەق بووە و دەبوو من ڕێگایەکی تر بگرم؟. هەر کات ئەو وێنەیەی نزارم لە زنجیرەکانیدا دەهاتە بەرچاو کاتێک لە پسمامان و گوندەکانی دەوروبەری بۆ ئەتککردن دەمانگێڕا، لەگەڵیدا باڵەکانی خۆم دەهاتەوە پێشچاو، ئەو ساتەم دەهاتەوە یاد لە لێواری ئەو چۆمە ئارامەدا باڵە گەورەکانی خۆمم بینییەوە، هەموویم بە گوناهی ئەم دوو پیاوە دەزانی، بە تاوانی ئەو هەڵهاتنە ناوەخت و کاریگەرەی نزارم دەبینی کە وایکرد عەشقی ئەم پیشەیە بمبات و بمکات بە کارمەندێکی دڵسۆزی خۆی. کە هەواڵی دووبارە گرتنەوەی نزارم خوێندەوە، یادی جاران هاتەوە خەیاڵم و دەستم کێشا بە کاغەزەکەی بەردەممدا و گووتم «وای کوڕی سەگ، نزار ئیدریس، کەی ئەم حیکایەتە سەخیفەی تۆ کۆتایی دێت». وام هەستکرد لە سەرەتاوە بۆیە بوومەتە جاسوس تا نزار بگرم و بیدەمە دەست لیڤیتانت، هەستمکرد ئەو کارە ئێستا گەیشتۆتە دوا ئامانجی خۆی، بەڵام ئەوەتا من گەیشتوومەتە شوێنێک، نەدەتوانم بە

گرتنی هەست بە کامەرانی بکەم، نە دەشتوانم بەرەو دوا بگەڕێمەوە و بچمەوە ڕۆژانی پێش ڕاکردنی ئەو لە پسمامان.

دەمێک نزار گیرا هێشتا شەڕی ناوخۆ هەڵنەگیرسابوو، لە نێوان گرتنی ئەو و هەڵگیرسانی جەنگدا چەند مانگێک هەبوو. لە ناکاو لەسەر کورسییەکەی خۆم لە دەزگا هەستێکی نامۆ گرتمی و وامزانی گەر بتوانم ئێستا نزار ئازادبکەم، بەوە لە هەموو ڕابوردووی خۆم دەبووریم و هەموو شتێک ڕەوتێکی تر دەگرێت و من ئاسانتر و بێغەمتر دەتوانم لەم جێگایەی خۆمدا دانیشم و بوونم لێرەدا ببەستمەوە بە پێداویستی ئەم دونیا تازەیەوە بە کەسانی شارەزا و لێهاتووی وەک من. ئەو ڕاستییە زۆر ئازاریدەدام کە بیرمدەکردەوە من لە گیرفانی دوژمنایەتی دێرین و سەرسەختی ئەم دوو پیاوە هاتوومەتەدەرێ. چیرۆکی نزار ئەوەی هێنایەوە یادم کە ئێمە هەموومان، من و پیاوانی تری فەرمانڕەوای ئەم شارە هەر یەکە و چیرۆکێکی پوچ کردوینی بە فەرماندارى ئەم سەردەمە، ژیانێکی هەڵە، بڕیارێکی سەیر و ناوەخت، کە لە ساتێکی سەیر و نالەباردا هاتووە و لە شوێنێکدا ژیانمانی لە ڕیشەوە گۆڕیوە.

ئەو شەوەی کە لەگەڵ لیڤیتانتدا قسەمکرد، دوای بێدەنگییەکی زۆر پێیگووتم، من هیچم نەکردوە جگە لەوەی ئەو پەیمانە دێرینە جێبەجێدەکەم کە دەبایە لەو هەموو ساڵەدا حیزب جێبەجێیبکات، پەیمانێک ئەو بەشی خۆی جێبەجێکردوە، بەڵام خاڵێکی گرنگی ماوە و دەبێت بگاتە کۆتایی و لاپەڕەی ئەو مێژووە بۆ هەتاهەتایە هەڵبدرێتەوە، هەر کەسە و قەرزی خۆی بدات و بچێت بە لای کاری خۆیەوە، ئەو بەشە فەرامۆش و یادکراوەش مردنی نزار ئیدریسە. لیڤیتانت هیچ کات ئەو پەیمانە دێرینەی یاد نەکردبوو، ئەوەی حیزب هێدی هێدی ئەو بەشەی ڕێکەوتنەکەی لە بیر خۆی بردبووەوە مایەی نیگەرانی ئەو بوو، دوایی زانیم پێش ئەوەی دەستبەکاربێت و نزار بگرێت، هەم سەرۆک و هەم جێگر و هەم زۆرینەی هەڤاڵانی بیرۆی سیاسی و مەکتەبی عەسکەری ئاگادارکردبووەوە. خۆی چوو بووە دیوانی سەرۆک و نوسخەیەکی ئەو

پەیمانە کۆنەی خستبووە بەر دەست و داوایکردبوو ئەم ڕێکەوتنە دێرینەی نێوان ئەو و حیزب کە هێشتا ناتەواو ماوەتەوە، تەواوبکرێت. هیچ کەس نازانێت سەرۆک چی بە لیڤیتانت گووتووە، بەڵام دڵنیابووم یادێتی ساڵانی شۆڕش ئەم ڕێکەوتننامەیە چ سوودێکی بە سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی ئەو گەیاندوە، دەمێک من و لیڤیتانت پەیتا پەیتا نەیارانی حیزبمان لە بنەوەڕا ڕادەستی زیندانە تاریکەکانی دەوڵەت دەکرد. سەرۆک لەوە وردبینتر بوو نەزانێت، ئەم شکۆ و جەبەروتەی لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە و لە کوێوە هاتووە. بەڵام ئەوەی مایەی سەرسامی من بوو، خودی نیازی لیڤیتانت نەبوو، بەڵکو دەستبەردابوونی نزار بوو لە هەر بەرگرییەکی ڕاستەقینە، بە تایبەت لەو باوەڕەدا نەبووم نزار هێند کاڵفام و نەزان بێت هەستبکات، تێپەڕینی کات لیڤیتانتی لێ ئارامدەکاتەوە. زۆر بە سەبر و ئارامی قسەم لەگەڵ لیڤیتانت کرد، گووتم من بەشێکم لەم چیرۆکەی ئێوە، لە یەکەم ڕۆژەوە سەنگی سەرەکی چیرۆکی ئێوە بۆتە باری ئەستۆم، ناکرێت وەها کەنارم بخەیت و نادیدە بمگریت و بێ هیچ پرس و ڕاوێژێکی برایانە بمکەیتە دەرەوە، چونکە خۆت دەزانی منیش و تۆش بە هۆی ئەو چیرۆکەی نزارەوە لێرەین، هەموومان بە جۆرێک لە جۆرەکان لە گیرفانی ئەو حیکایەتەوە هاتووینەدەر، هەم من، هەم تۆ، هەم نەغەدە ماردینی. لە ڕاستیشدا هەر وابوو، کێ هەیە لە ئێمە کاریگەریی ئەو سەربوردەی لەسەر نەبێت، هەتا ترازانی فریشتەکەم، هەتا وێرانبوونی ژیانی دکتۆر شوکاک پێکڕا درێژکراوەی ئەو چیرۆکە بوون. لیڤیتانت گەر بیویستبایە سەرسەخت بێت، منجڕی و پاچەقێنییەکی وەهای دەکرد، تۆقرەی لە ئەیوبیش دەبڕی. ئەو شەوە من زۆرم گووت و لیڤیتانت کەمی بیست، لەوبەری خەتەکەوە بە بێدەنگی و بە وشەی کورت و بە منجەمنجی دڵتەقێن وەڵامیدامەوە. تا لە جێگایەکدا ئیتر سەبرم بڕا و بە دەنگی بەرز و بە ناڕەحەتییەکەوە کە ئیتر نەمدەویست دایپۆشم، هاوارمکرد «دەتەوێت بیکوژیت، جەنابی لیڤیتانت دەتەوێت بیکوژیت... گەر دەتەوێت بیکوژیت و پەیمانەکە بهێنیتە کۆتایی، بیکوژە. بەڵام من

دەزانم ناتەوێت بیکوژیت، دڵنیام ناتەوێت بیکوژیت و شتی ترت نیازە، بڵێ چیت دەوێت؟».

نەمدەزانی بۆ لە ناکاو بوومە پارێزەری نزار ئیدریس، ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت کە نەمدەویست لیڤیاتانت واهەستبکات لەسەروو هەموو هێزێک و لە دەرەوەی هەموو یاسایەکە، ڕەنگە لەبەرئەوە بێت بوونی نزار ئیدریس گرنگ بوو تا لیڤیاتانت هەست بەو بێهێزییە ئەبەدییەی خۆی بکات، بزانێت مرۆڤێک دەمێنێت ناچێتە ژێر ڕەحمەتی ئەو و گومان دەخاتە سەر هێز و دەسەڵاتەکانی کە تائێستا ئاسان، وەک ئاوی ڕووبار بە هاژە و خۆشڕۆ، لەم هەرێمەوە دەڕژێت بۆ ئەو هەرێم و بەربەستێک نەیەتە پێشدەمی. لیڤیاتانت دەیزانی من کەسێک نیم زۆر گاڵتەم لەگەڵ بکرێت، شوێنێکی گرنگ و دەزگایەکی ترسناک و ڕاستەقینەم لەبەردەستدایە، جگە لەوە هاوڕێیەکیشم پەیداکردنی ئاسان نییە. دۆستێکی وەک من کە لە پلە و پۆستدا بێت و متمانەشی پێبکات، هەموو ڕۆژێک گیرناکەوێت. لیڤیاتانت ڕێوییەکی تەکتیککار و بۆنتیژ بوو، بێئەوەی هیچ لە شێوە زمانی خۆی بگۆڕێت، گووتی «نا جەنابی عەقید نامەوێت بیکوژم، دەمەوێت نامەیەک مۆربکات ببێتە ئیشکەرم، بنوسێت من گەورە و سەروەری ئەوم، خۆی بنێتە بەردەستم و ئیشم بۆ بکات تا ڕۆژێک دێت، درەنگ یان زوو خۆم ئازادیدەکەم». کە گوێم لەو داوایە بوو، بێدەنگییەکی کتوپڕ و سەنگین دایگرتم، پێشتر لە ژیانمدا داوای وەهام نەبیستبوو. بێدەنگییەکەم وەها سەنگین بوو، لیڤیاتانت هەستیکرد لەبەر سەختی داواکەی ئەو زمانم قورس و لێوم قفڵ بووە، گووتی «جەنابی عەقید، شتێکی سەیرم داوانەکردوە، ئەوە حاڵی هەموو خەڵکە. کەس هەیە لە ئێمە بارمتەی کەسێکی تر نەبین؟». دوا ڕستەی لەوی پێشووی نابەجێ تر هاتە گوێم، شتێک بوو دەبوو بیری لێبکەمەوە، لەو جۆرە ڕستانە بوو هەتا ئەگەر لە ناوەڕاستی فیلمێکیشدا بیبیستیت، ئاساییە هۆڵی سینەماکە جێبهێڵیت و بێیتە دەرێ و لەسەر کورسییەک دابنیشیت و بچیتە تێفکرینی قووڵەوە. من دوای وچانێکی تر و شەپۆلێکی نوێ لە کاسبوون پرسیم «لیڤیاتانت ... داوات

لە نزار کردوە نامەی وات بۆ مۆربکات یان نا؟». وەڵامیدایەوە «نا، جەنابی عەقید، خۆت دەزانی شتی وەها چاکترە کەسی زیندانی خۆی داوابیکات، خۆی پێشنیاریبکات، من بەدرێژایی ئەو ساڵانە ئیشم بۆ ئەوە کردوە نزار بکاتە ڕۆژێکی وا ڕەش، بۆ پەیمانێکی وەها بگری و بپارێتەوە». تا قسەیبکردبایە زیاتر هەستم بە خنکان دەکرد... بۆ؟ نازانم. وەک ئەوەی داواکەی لیڤیتانت ڕاکێشان و ڕووتکردنەوەی درندەیی هەموو ئەو سەردەمە بێت تاسەر ئێسقان. کە تەلەفونەکەم داخستەوە سەرم پڕبوو لە هەرا و ژاوەژاوێکی گەورە، لە چەندەها دەنگ کە نەمدەزانی دەنگی کێن و چی دەڵێن، بەڵام دڵنیابووم دەنگی بوونەوەران و کەسانێکی دیکەن کە ڕۆحیان بە پەیمانێکی وەهاوە بەستراوەتەوە. دوای تێپەڕاندنی شەپۆلی کاسبوونی دووەم و سێیەم، هێدی هێدی هاتمەوە سەر خۆم و کەوتمە بیرکردنەوەی قووڵ و ڕاستەقینە لە تەواوی دیمەنەکە. هەندێک داوا هەن سەرەتا زۆر نابەجێ و ناماقووڵ دیارن، بەڵام دەمێک بنجوبناوانیان دەپشکنی دەبینیت هیچ نین جگە لە دۆخێک هەموو لە ناویدا دەژین و بێئەوەی بزانین حوکم و مەرجەکانیشی جێبەجێدەکەین. زۆرن ئەو مرۆڤانەی، ڕۆژانە کاتێک داوای ناسیاو یان نەناسیاوێک دەبیستن دەڵێن «وای زۆر سەیر بوو، قەت چاوەڕوانی ئەوە نەبووم داوای وام لێبکات»... ئەمجۆرە خەڵکە، بێشومارن و لە حسێب نایەن. هەموو ئەو مرۆڤانە زۆریان دەچنە ژێرباری ئەو داوایانە و دەچنە ژێر داوای قورستر و سەختتریش. بەڵام سەرسامی ساتی یەکەم هەر دەمێنێت، هۆکەشی ئەوەیە مرۆڤ بوونەوەرێکی گەمژەیە، دەبێت زۆر بیریکاتەوە و زۆر گێژ بێت و بە زۆر پلە و قۆناغی سەرسامیدا بڕوات تا دەگاتە ئەوەی هەموو ئەو شتانەی سەیر و هەژەندە و نائاسایی دەردەکەون، لە ڕاستیدا زۆر سادە و ئاسایی و ڕۆژانە و پوچیشن. لە ڕاستیدا داواکەی لیڤیتانت شتێکی وەها سەیریش نەبوو کە یەکەمجار منی شڵەژاند و ڕادەستی پەشۆکانێکی زۆری کردم. هەموو مرۆڤەکان کەم تا زۆر لە جۆرە پەیمانێکی وادا دەژیان، بێئەوەی بە ڕوونی بیخەنە سەر کاغەز... کەس نەبوو لە شارەکەدا ڕۆحی خۆی نەفرۆشتبێت و نەبووبێت بە کۆیلەی

شتێک. ئەوەی لیڤیاتانتی ئازاردەدا، هەمان ئەو هۆیە بوو کە وایکردبوو سالەهای سالّ من ڕقم لە نزار بێت... ئازادییە ترسناکەکەی، ئەوەی بیەوێت بێ دەمامک بژی. گەر بولبولیار بۆ من فریشتەیەک بوو بێ دەمامک، نزار پۆلّی پێچەوانە و جەمسەری ئەوبەری ئەو بوو؛ ئەم شەیتانێک بوو بێ دەمامک... نزار نەیدەتوانی هیچ دەمامکێک لەسەر بکات، لیڤیاتانتیش دەیویست بەوە بیکوژێت، دەمامکێکی بخاتە سەر. لە ڕاستیدا من سەرنجم دەدا کە پێکدادانی ئەم دوو کەسە هێدی هێدی لە بەریەککەوتنێکی نابەجێی دوو مرۆڤەوە، دەبوو بە بەریەککەوتنی دوو جۆرە نیگای جیاواز بۆ ژیان. نا لیڤیاتانت نەیدەویست ڕۆحی بکڕێت، ئەو وەک من ڕۆحی نزاری نەدیبوو، قسەی لەگەلّ نەکردبوو، شتێکی ئەوتۆی لەسەر زیرەکی و هۆشمەندی و بلیمەتی ئەو نەدەزانی، بەلاّم لە دلّەوە دەیویست بیسەلمێنێت کە دەتوانێت بە نمایشکردنی شتێک ناچاریبکات کە نزار نایەوێت و نەفرەتی لێدەکات. کاتێک دەیویست پەیمانێکی وەها مۆربکات، بەو ڕێگایەوە لیڤیاتانت بەر لە هەر شت دەیویست بۆ خۆی بسەلمێنێت کە مرۆڤەکان ناتوانن سەربەخۆ بن و تێک نەشکێن، هەموو کەسێکی بەهێز دەبێت شتێک لە کۆیلەیی و سەرنزمی بۆ هێزێکی لە خۆی گەورەتر تێدا بێت، وەک من، وەک خۆی. لای لیڤیاتانت مرۆڤی ئازاد تەنها و لاوازە و قابیلی وردکردنە، کۆیلەکان هەمیشە بەهێزترین هێزی دونیان. ئەوە تێگەیشتنی لیڤیاتانت بوو لە دونیا. تێگەیشتنێک ئەو کات بە ڕاست و ڕەوام دەزانی. بەلاّم نزار جۆرێکی تر بوو لە مرۆڤ. لە سەردەمی جەنگدا بە هەلّهاتنی بەردەوامی، بە یاریکردنی بێوچانی توانی بووی بمێنێتەوە، لیڤیاتانت زۆر لەو ئازادی و کۆلّنەدانەی نزار دەترسا. هەستمدەکرد لەبەر هەر هۆیەک بێت ئازادی بولبولیاری بۆ گرنگ نییە، ئازادی بولبولیار لای ئەو، ئازادی مرۆڤە لاوازەکان بوو، بەلاّم ئازادی نزار، ئازادی کەسێکی شەڕانی و شەیتانی و کۆلّنەدەر بوو. مرۆڤی دڕ هێندەی لە ئازادی خەلّکانی بەهێز دەترسێت، لە ئازادی لاوازەکان ناترسێت.

دوو مانگ زیاتر هەوڵمدا نزار ببینم. دوای دوو مانگ شەوێکیان پێمگووت، ڕێگامبدە نزار ببینم و پەیامەکەی تۆی پێبگەیەنم، هەوڵبدەم ڕازیبکەم مەرجەکانت قەبووڵبکات. هەستمکرد خۆگری نزار تا دێت لیڤیتانت زیاتر دەترسێنێت، من دەمزانی لیڤیتانت ڕۆحی زیندانەوانی هەیە نەوەک پیاوکوژ. پیاوکوژ تەرم و لاشەکان دڵخۆشیدەکەن، بەڵام ئەو دیتنی مرۆڤەکان لە زنجیر و ئەسارەتدا، لە حاڵی ملکەچی و کۆیلەییدا. ئەوەی منی تووشی سەرسامی و ترسێکی گەورەکرد و لە جێگای خۆم وشکیکردم، ئەوەبوو لەو سەردانەمدا زانیم هەر کەسێک لە زیندانی مەرکەزی دەچووەدەرێ، دەبوو بە کۆیلەی ئەو، ئەوە ئەو شتەبوو کە جاسوسەکانم بەوردی بۆ منیان ڕووماڵ نەکردبوو. ئەو نەیدەویست کەس بکوژێت، بەڵکو پێویستی بە لەشکرێک لە بەردەست و خزمەتکار و چاودێری ملکەچ بوو، هەموو ئەوانەی ئازاد دەکران دەمودەست هەر لە پرۆژە و ئیش و بینا و بازاڕ و مەخزەن و باغەکانی لیڤیتانت خۆیدا دادەمەزرانەوە و پەیمانێکیان مۆردەکرد تا مردن لیڤیتانت بە سەردار و سەروەری خۆیان بزانن. کۆیلەگەرایی لیڤیتانت وەک کۆیلەگەرایی کۆن نەبوو، ڕاستە هەندێک لە دیلەکان بووبوونە خزمەتکاری ماڵەوە و کاری بەردەستیان دەکرد و لە کۆشکی لیڤیتانت جێگای تایبەتی خەویان بۆ دابیندەکرا و لەوێ دەمانەوە، بەڵام بەگشتی کۆیلەکانی لیڤتانت ئاوێتەیەک بوون لە شێوە فەرمانبەری نوێ، لە سەربازی نیزامی، لە سەپانی کۆن، لە کرێکاری ئەم ڕۆژگارە، لە هەموو ئەو نیشانەدا چی لایەنێکی ملکەچانە هەیە، دەبوو لە ژێردەستەکانی لیڤیتانتیشدا هەبێت، بەردەستەکانی ئەو هەم ڕۆح، هەم عەقڵ، هەم جەستەی خۆیان بە جۆرێکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دەبەخشی، گەر ئەو بەخشینە ڕاستەوخۆ بە خودی لیڤیتانتیش نەبایە، خۆبەخشین بوو بە ڕۆحی ئەو یاسایانەی سەریان هەڵدەدا و لیڤیتانت بە هەیبەت و قیافە و جوانی خۆیەوە نوێنەرایەتیدەکردن.

بۆ من گرنگ بوو بزانم نزار بۆچی وا ئاسان کەوتە داوی لیڤیتانتەوە. لە دوا قسەکردنماندا شەوی ماڵاوایی ئەبەدیمان لە بەعسییەکان، نزارم وەک پیاوێکی بێئاسۆ بینی بوو، وەک کەسێک یان دەبێت خۆی بدۆڕێنێت یاخود ئەم سەردەمە. هۆی هەوڵەکانی بینینی نزار لای منەوە بۆ خۆشم زۆر ڕوون نەبوون، ئەوەی من لە ئێستادا سەرنجیدەدەم ئەوەیە، کە لە ژیانی مندا هەمیشە دیلێک هەبووە ویستوێتی لە زیندان بێتەدەرێ، هەندێ جار ئەو دیلە من بووم یان فریشتەکەم، هەندێ جاریش کەسانی تر بوون، بەڵام تەواوی ئەم گەشتە سامناک و ساردە کە ناوی ژیانی منە، هیچ نەبووە جگە لە سوڕانەوەیەکی بێمانا لە جوغزی زیندانەکان، زیندانییەکان، پاسەوانەکان، ڕاونانەکان و خۆشاردنەوە گەورەکان .

ئەو ڕۆژە کە لیڤیتانت ڕەزامەندی پیشاندا و من چووم بۆ بینینی نزار، هەستمدەکرد هێندەی دەمەوێت دیمەنێکی تازەی شانۆگەرییەک ببینم کە پێشتر لە هەموو بەشەکانی دیکەیدا خۆم ئەکتەر بووم، نیازێکی ترم نییە. کە یەکەمجار گەیشتمە زیندان و پاسەوانەکان هێنایان لە هەمان ئەو جل و بەرگانەدا بوو کە پێوەی گیرابوو. مرۆڤ دڵی لە بینینی دەگیرا، سەراپای لە چڵکدا نوقمبوو، ئاسەواری لێدانی زۆر بە هەموو گیانییەوە بوو، جلەکانی زۆر پەڵەی خوێنیان لەسەر بوو، نزار خۆشی بەجەستە لاواز و کەنەفتە دەردەکەوت، زۆربوونی ڕیش و سمێڵی ڕوخسارێکی تریان پێ بەخشیبوو. کە بەرامبەرم دانیشت و دەمودەست کەوتە باسکردنی لیڤیتانت، من تەنیا لەو سیحرە نهێنییەی چاوانی ورددەبوومەوە، کە سیحری شەیتانێکی نەسرەوت و بێئۆقرەبوو ... ئێستا بەو ڕیشە زۆرەوە ڕیشی هۆشەنگی بولبولیاری بیردەخستمەوە، کە بۆ من وەک سەمبولێکی ئەبەدی شۆڕشگێڕە شکست خواردوەکان بوو. ڕیشی نزار گەرچی زۆر جوان بوو، هەیبەتێکی نوێ و تایبەتمەندییەکی تری پێبەخشیبوو، بەڵام هەستمکرد ڕیشی زیندانییەکە و هیچی تر، ڕیشێکە گوزارشت لە بنبەستی ژیانی پیاوێک دەکات. ڕیشی کەسێکە دەستی بە گوێزاندا ناگات، نەوەک ڕیشی کەسێک کە دەستی بە ئومێددا ناگات. دڕ و بێسرەوت بوو،

سەیربوو بەو چڵکنی و سیپاڵە پرزۆڵ پرزۆڵ و لچ و لووتە ئاوساو و جەستە کوتراوەوە، هێشتا لە چاو دواجاردا کە بینیم، سرک و چەتوونتر دیاربوو. هەستمدەکرد زیندان ئەو کەشوهەوایەی بۆ ڕەخساندۆتەوە بڕوا و تێگەیشتنە دێرینەکانی خۆی ڕوونتر بژی، بەڵام دەشیزانی کە ژیانی لە مەترسییەکی ڕاستەقینەدایە، ئێستا نیشانەیەکی وەهای پێوە نەدەبینرا، ئامادەبێت بۆ شکست و خۆبەدەستەوەدانێکی خێرا، بە دڕی و بێڕەحمییەکی بێوێنەوە کەوتە سووکایەتیکردن بە لیڤیتانت. من بۆ ئەوەی نیازی ڕاستەقینەی تاقیبکەمەوە گووتم «نزار گوێبگرە، بە ڕاستیمە، واز لەم قسانە بهێنە، من پێتدەڵێم، تۆ شەو و ڕۆژ باسی لیڤیتانت و ژنەکەی بکەیت دەرمانی دەردت ناکات. تۆ یاخییەکی لەوە گەورەتر بوویت بەمجۆرە کۆتاییت پێ بێت و شانازیت کورت بێتەوە بۆ ئەم قسە هیچانە، ئەوەی نەغەدە ماردینی زیاد لە هەژدە ساڵ لە مەوبەر بە ڕووتی هاتۆتە باوەشت و گۆشتی خۆی خستۆتە بەر دەستت، هیچ لەوە ناگۆڕێت کە ئێستا گۆشتی جەنابت بە کاڵ و کوڵاویی لە سەر سفرەی لیڤیتانتەوە و ئارەزووی لێ بێت بە زیندوویی دەتخوات. من دەتوانم شتێک بۆ تۆ بکەم، شتێک کۆتایی بە هەموو ئەم چیرۆکە بهێنێت. ڕازی بە، تکایە ڕازی بە... دەمەوێت ببیت بە یاریدەدەری لیڤیتانت، ببە بە هاوکاری، ببە بە دۆستی، ئێستا ئەو بەڕێوەیە سەرمایە و ماڵ و ئیشی خۆی زۆر پەرەپێبدات، پێویستی بە تۆ دەبێت. دڵنیام قسەی لەگەڵدا بکەم دەتوانم بیخەمە سەر ڕا، لەم زیندانە پیس و چەپەڵە بێیتە دەرێ و ژیانێکی باش بژیت، بەڵام بە مەرجێک خۆت بگۆڕیت و واز لەم ڕۆحە نەگریسەی خۆت بهێنیت... گەر دەتەوێت درۆشت لەگەڵ نەکەم، ئەوە پەیامی لیڤیتانت خۆیەتی بۆ تۆ، دەیەوێت تۆ ئیشی بۆ بکەیت».

کەمێک وەستا، لە چاوانیدا تیشکێک بە ڕۆشنی مەلەیدەکرد، هەمان ئەو تیشکەی لە سێناسکێ لە چاوانیدا بینیبووم، نیگای کەسێک چاوانی پڕن لە گاڵتەیەکی بێسنوور، خەندەی قۆشمەیەکی شەڕانی، لێبوکێک کە لە جەهەنەمەوە هاتووە. ئێستا بە ڕوونی دەمناسییەوە، نزار ئیدریس بوو،

نزار خۆی بەر لەوەی بێتەوە شار، بەرلەوەی پلانی کوشتنی لیڤیتانت دابڕێژێت، بەر لەوەی ببێتە دۆستی نەغەدە ماردینی، ببێتە خاوەنی هێزی تایبەت لە دەوڵەتدا، نزار بێ دەمامک... بە دەموچاوە دڕ و یاخییەکەیەوە، بەنیگا چرنوکدارەکانییەوە. بێسۆز و بێ هیچ بەزەییەک سەیریدەکردم، من لە ناخی دڵەوە ئاواتم دەخواست کە بڵێت نا. دوای بێدەنگییەکی درێژ گووتی «هەڤاڵ، تۆ لە نزیکەوە ئاگات لە ژیانی من هەیە، من خراپەم لە بەر خراپە هەڵنەبژاردوە، بەڵکو خراپەم لە پێناوی ئازادیدا هەڵبژاردوە. تۆ ئاگاداری هەموو ژیانی منیت، جگە لە خراپە ئینسان ڕێگایەکی تری نییە تا بیسەلمێنێت کەسێکی سەربەستە. ڕێگایەکی تر هەیە؟. بەڵام جەنابی عەقید، ببورە ئێستا وات پێنالێن؟ پێتنالێن جەنابی عەقید؟ بەڕێوەبەری دەزگای ئاسایشی گشتی و سەرکاری باڵای ژووری زانیارییە نهێنییەکانی حیزب، تۆ ئەوە نییت؟ ها جەنابت ئەوە نیت؟ هەمیشە لە بەرچاومی دەمێک ژنەکانت کوشت، دەزانی جەنابی عەقید من لە وڵاتێکی تردا بژیابام وەک کازانۆفا، وەک دۆن جوان سەیر دەکرام، بەڵام هەموو دونیا لە دەرەوە من بە تاوانبار دەزانێت و تۆ بە بێتاوان. هیچ کات بیستووتە نزار ئیدریس وەکو تۆ چوار ژن پێکەوە بکوژێت؟ ئەوە ناودەنێیت چی ... ها، جەنابی عەقید ... ناوی دەنێیت چی؟ ئەوە بێئینسانی نییە؟. بەڵام گرنگ نییە، من حەزم لەو خراپانەشە کە نەمکردون. ئەو خراپانەی کە ئێوە لە حیزبدا لە من زۆرتر کردوتانە و دەیکەن، بەڵام چۆن پشیلە گووەکەی خۆی دەشارێتەوە بەو جۆرە دەیشارنەوە». وەک هەمیشە ڕەزاتاڵ و بەدفەساڵ و توانجهاوێژ بوو، بەو برینانەوە قاقایەک لە قاقا ترسناک و قێزەونەکانی خۆی لێدایەوە کە هەمیشە ئەو ئاواتەی لە مندا زیندوودەکردەوە، وەک سەگێکی تۆپیو کەلاکەکەی ببینم. گووتم «بێدەنگ بە. من هاتووم چاکەت لەگەڵدا بکەم و لێرە دەرتبهێنم». دیاربوو شەڕانگێزیی جارانی تێزاوەتەوە، لەو ساڵانەدا کە لەگەڵ دەوڵەتدا دەستی تێکەڵبوو، کە خراپەکانی دەرهەق بە ژنان و کچانی شار لە ترۆپکدابوون، کە گاڵتەکردنی بە ناموسی خەڵک سەرلیستی هەموو خواستەکانی بوو، شتێک لە کپی و مەنگی تێگەڕابوو، وایدەکرد

کەمتر ئەمجۆرە زمانە بەکاربهێنێت. دیارە ئەو دەمیش نەبووبوو بە شەکرەپیاو، بەڵام لەم تاڵی و گازندە ڕەشەی کەمتربوو. ئێستا چاری نەبوو جگە لەوەی خۆی وەک قوربانی ئازادییە شەڕانییەکانی خۆی ببینێت و تا ئەوسەر لەگەڵ نمایشی پاڵەوانی ئازاد دا بڕوات. من لە دڵەوە دەپاڕامەوە کە خۆگربێت و خۆی بۆ لیڤیتانت نەدات بەدەستەوە. دەمزانی بەو خۆگرییەی هەم خۆی و هەم لیڤیتانت تێکدەشکێنێت ... ئەوەش خواستی ڕاستەقینەی ناخم بوو، هەردووکیان لە نەهامەتی و شکستدا ببینم. دەبوو شتێک هەبێت لیڤیتانت نەیگرێت، دەبوو زنجیرێکیش هەبێت ئەم جانەوەرە ببەستێتەوە کە دڵنیابووم بێتەوە دەر، بە جۆرێکی ترسناک و تا سنووری خۆ فەوتاندن لە چەپاوڵ و تۆڵازیی و داوێنپیسیدا نوقمدەبێت. بۆ ئەوەی جەسارەتی پتر تێدا بجوڵێنم، گووتم «بە ڕاستیمە و جوان بیری لێ بکەوە، لیڤیتانت پێشنیاری پێداوم، گەر بۆی مۆربکەیت تەواوی ژیانت دەبیتە ئیشکەر و هاوکاری ئەو، دەچیتە ڕیزی بەردەست و کرێکارانی بەڕێزیانەوە، بەرامبەر بەوە ژیانی خۆت ڕزگاردەکەیت و دەچیتەوە ماڵی خۆت. هیچت ناوێت. تەنیا کاغەزێک مۆردەکەیت و ڕۆح و لەشی خۆت دەکەیتە بارمتە لای بەڕێزیان، وەک من چۆن ساڵەهای ساڵ ڕۆح و لەشی خۆم بە بارمتە لای شۆڕش داناوە و ئێستاش بۆم وەرناگیرێتەوە... جەنابی لیڤیتانت هەر ئەوەی لە تۆ دەوێت، کابرا نایەوێت بتکوژێت، گەرچی دڵنیام موستەنەدێکی لەژێردەستدایە دەیکرێت هەر ئێستا گۆڕی خۆتت پێهەڵبکەنێت و بتکات بە قوربانی دووسەد دیناری تەزویر، بۆ ئەو کارە ڕەزامەندی هەموو لایەکیشی هەیە. ئیتر هیچ کەس نازانێت دەمدرێژ و قسەتاڵێکی وەک تۆ هەر لەم دونیایەدا بووە».

لە ژێرەوە سەیریکردم، چاوانی هەمان ئەو چاوانەی نۆزدە ساڵ لەمەوپێش بوون، لە بنیدا ڕۆحێکی نەسرەوت و کۆڵنەدەر دەجوڵایەوە، بە دەنگێک تێکەڵبوو لە قیژێکی گەورە بەرامبەر بە من، گووتی «من لەش و ڕۆحی خۆم بە بارمتە دانەناوە، کە ڕاپەڕین سەرکەوت و پێکەوە قسەمانکرد، ویستم کارێکی وەها بکەم، وازبهێنم و ئازادی و یاخیبوون و خراپە بخەمە لاوە. دەمتوانی وەک هەزارانی تر، وەک لیڤیتانتی هاوڕێت خۆم لە

ئەندامانی مەکتەب سیاسی نزیکبکەمەوە... هەموو دەرگاکان کراوەبوون بۆم. حیزبەکان بە بڕوای من، هەموو حیزبێک لەدونیادا، هەر ئەم حیزبەی تۆ نا، لە ماڵە قەحبە دەچن، پیاو لە هەموو جۆر و چیزەیەک خۆیانی پێدادەکەن، لە هەر توخم و بیچم و ئەسڵ و فەسڵێک بن دەیانکەنە ژووری، لە لات و لومپنەوە بیگرە تا دانا و زانا، منیش دەمتوانی وەک شای نێران، بگەمە پلە و پایەی جەنابت و لیڤیتانت، بەڵام ئەو کات ئیتر، من نەدەبوومە نزار ئیدریس». بە دەنگی بەرز پێکەنی و لە ژێرەوە سەیریکردم و گووتی «من کەسێ نیم بۆ بەتاڵکردنەوەی خۆم، ڕوو لە قەحبەخانە بکەم». ئینجا چەند قاقایەکی بێشەرم و بێشەرەفانەی تری لێدا. خۆشحاڵ بوو کە بەرامبەر من بەو برینداریيەش، لەو گەمارۆ گەورەیەشدا هەر دەنگی زوڵاڵە، لەزەتێکی شەیتانی لەوە دەبینی دەنگی بەرز بێت و ئەو قسەیە بکات کە دەیەوێت. شوبهاندنی حیزب بە ماڵە سۆزانی، ڕیتۆریکێکی کۆن بوو، کە ئێستا زیندوویدەکردەوە تا خۆی ئازادتر و چەسپیوتر لە ئێمە نیشانبدات. دەیزانی بە پێکەنینەکانی تووڕەمدەکات، بەڵام دەشیزانی چەند خراپ بێت، من نامەوێت بەرامبەر لیڤیتانت لە تەوق و تەڵەزگەدا بیبینم. دوای پێکەنینەکەی سەری نزیککردەوە و بە ئەسپایی گووتی «دەزانی بە لیڤیتانت بڵێ چی؟». منیش بە نزمییەوە گووتم «چی؟». گووتی «پێیبڵێ گوو بخوات ... گووووو». دوای ئەوە ڕوخساری گۆڕا و وەک گورگێکی تێر پاڵیدایەوە و کەوتە تەماشاکردنم.

ئێستا دڵنیابووم، لە هەر شت زیاتر، پاراستنی ڕۆحی خۆی وەک شەڕانگێزێکی ئازاد، لا گرنگ بوو ... بەڵێ، ئەوەی هەتا لە ژیانیشی بە بایەخدارتر دەزانی ... هەستمکرد بەڕاستی نایەوێت ئەو دەمامکە هەڵبگرێت کە دوای شۆڕش سەدان هەزار مرۆڤ خۆشحاڵ و بێ هیچ تەنگەدڵییەک کردیانە سەریان. نەمدەزانی دوای ئەو وەڵامە، ئیدی چارەنوسی بەرەو کوێ ملدەنێت، بەڵام دڵنیابووم ئەو قسەیەی لیڤیتانت دەترسێنێت. ئەو لە هیچ شتێک نەدەترسا لەوە نەبێت، نزار ناچاریبکات

وەک قارەمانێک بیکوژێت، دڵنیابووم دەزانێت ئەوە ئەوپەڕی نەگبەتی و بەدبەختییە، نەوەک سەرکەوتن. کە وایگووت خەندەیەکی چەپەڵ کەوتە سەر لێوی من. بێ دوودڵی سەیری چاوانیم کرد، هەستام و دانەویم و بێئەوەی هیچ بڵێم دەستیم گرت و بەرەو لێوم بەرزمکردەوە و بە هێمنی ماچمکرد و گووتم «سوپاس». خۆشم سەیرم لەو ڕەفتارەم هات، ئەویش بێدەنگ و سەرسام سەیریکردم و نەیدەزانی لەبەرچی دەستی ماچدەکەم و سوپاسیدەکەم، لە بەرئەوەی لە بەردەم لیڤیتانتدا چۆک نادات؟ یان لەبەرئەوەی، دەشێت تامردن، بە دیلی و بەدبەختی لە زینداندا بمێنێتەوە؟. نا من لەبەرئەوە سوپاسمکرد کە دەمامکێکی دانەنابوو، ئەو ڕێگایەی گرتبووە بەر کە قارەمانە شێت و تەنیا و سەوداسەرەکان دەیگرنە بەر. لەو ساتەدا نزار بڕیاریدا کە بۆ هەتاهەتایە بەشێک نەبێت لەم سەردەمەی ئێمە، بەوەش نەوەک لەم سەردەمە دانەبڕا، بەپێچەوانەوە جارێکی تر ئەو ڕۆژگارەی کردەوە بە ڕۆژگاری ڕاستەقینەی خۆی. بەوەدا بڕیاریدا ژیان بە هەمان ئەو ڕۆحەوە بژی کە پێش ڕاپەڕین لە جەستەیدا بوو، لە خەیاڵی مندا وێنەی کەسێکی ئەفسانەیی وەرگرت. سەردەمێک گومانم بوو ئەو ڕۆحە تاکرەوەی ڕۆژێک بژێتەوە و دونیا بە ئازایەتیی خۆی ڕەنگبکاتەوە، بەڵام ئێستا بەرامبەرم دانیشتبوو، قورس، ڕەزاگران وەک شەیتانێکی قێزەون، بەڵام جوان وەک جنۆکەیەکی فیتنەباز، شایستە بۆ کینە، شایەن بە سزا، بەڵام شکۆدار، بە هەیبەت، بەشی ئەوەی کڕنوشی بۆ بەرم و بڵێم تۆ قارەمانی ڕاستەقینەی منیت. غروری هەمان ئەو غرورە بوو کە لە دڵەوە بەرز ڕامدەگرت و نرخی گرانم لەسەر دادەنا. ئەو سەرسام و ناحاڵی سەیریدەکردم، دڵنیابووم نازانێت بۆ لە ناکاو، بێ هیچ پێشەکی و تەفسیرێک دەستیم ماچکرد. دڵنیابووم گەر ڕۆحی خۆی بە لیڤیتانت بفرۆشتایە «وەک هەزاران کەسی تر کردیان» بۆ هەتاهەتایە قێزێک و نەفرەتێکی قووڵم لە ناودا سەوز دەبوو. بەڵام ئێستا نا، ئێستا هاتمەدەرێ و پڕبووم لە حورمەت بۆ نزار ... ئەو ئیتر یەکێک بوو لە قارەمانە هەرە گەورەکانی من.

لیڤیتانت لە ژوورەکەی خۆی چاوەڕوانیدەکردم. بە بینینی بێزاری و نەفرەت دایگرتم، نەمویست بەرامبەری دانیشم و قسەبکەم. پرسی «ها، جەنابی عەقید چی بوو؟». سەیرمکرد و بە ساردییەوە گوتم « هیچ نەبوو، هەر گووتی بە لیڤیتانت بڵێ با گوو بخوات». وام گووت و بێئەوەی هیچی دی بۆ زیادبکەم، لە ژوورەکەی هاتمە دەر و دڵنیانەبووم ئاخۆ جارێکی دی نزار ئیدریس دەبینمەوە یان نا.

## یاداشتەکانی مەهدائیلی فریشتە «4»

نازناوی دەریایی، توانج و تانەیەکی ناخۆش بوو. دەمێک یەکەمجار چیرۆکەکەم بۆ ڕێزانی مەلەکبین گێڕایەوە، دایە قاقای پێکەنین و بە توانجەوە گووتی، وای خودایە نازناوی مەهدائیلی دەریایی چ نازناوێکی گونجاو بوو، گەر سەرەتا بمانبیستایە و لە سەری ڕاهاتباین. نا نازناوەکە بۆ سووکایەتی بوو، دەریا لەویادا ئامازەبوو بۆ دەریایەک لە پیسیی، بۆ کەسێک لە چەپەڵییەکی زۆردا نوقمبووە.

خۆ ئاشکراکردنم بۆ مەهدی دەریایی، هەڵەی گەورەی ژیانم بوو. هەندێک مرۆڤ تەنیا بە یەک شێوە دەتوانن بیر لە ژیان بکەنەوە، گەر هاتوو وێنە سادەکان گۆڕانکارییان بەسەردا هات، ئیدی توانای بیرکردنەوە و تێگەیشتن لەدەستدەدەن. بەوەدا مەهدی خاوەنم ئەزموونێکی پێشتری لەگەڵ کەسی وەک مندا نەبوو، ئەستەم بوو باوەڕم پێ بکات. دەرکەوتنی من تێکچوونی تەواوی دونیای مەهدی لێکەوتەوە، هەر هەمان ڕۆژ کە من مەرەخەسمکرد و لێگەڕام بڕوات، دوودڵی وەها ناخی تەنیبوو، نەیدەزانی بچێت بۆ کوێ و چی بکات. من دڵنیابووم گەر زۆر لە ناخی خۆیدا بگەڕێت، ئاسەوار و پاشماوەی من دەدۆزێتەوە. فریشتە کرێچییەکی هێمن

و نەجیبی ناو گیانی ئادەمیزاد نییە، هەمیشە ناوەوە وەها بریندارەکات ئاسەواری نیشتەجێبوونی درێژ و غەمگینی خۆی بە ڕوونی جێدەهێڵێت. بەڵام ناخ بۆ ئەو شتێک بوو مایەی پێکەنین بوو، وشەیەک بوو نەیدەزانی مانای چییە. کە کەوتە گەڕان بەدوای مندا لە پلانی خۆیدا هەموو شتێک و هەموو شوێنێکی دانابوو بگەڕێت و بپشکنێت، ناو ڕۆحی خۆی نەبێت ... دوو ڕۆژی یەکەمی گەلێک پەرێشان بوو. من لە دوورەوە دەمتوانی پلەی شپرزەیی و پەشۆکانی هەست پێبکەم، لەو دوو ڕۆژەدا بۆ یەکەمجار لە دۆڵابە داخراو و کۆنەکانی سەریدا، لەو چەکمەجە ژەنگاویانەدا کە ئەمجۆرە مرۆڤانە هیچ کات نایکەنەوە، خودای دۆزییەوە. ئەم خودایەی کە کەسانی وەک مەهدی دەریایی و لە هەلومەرجێکی وەهادا دەیاندۆزییەوە، خودای ڕاستەقینە نەبوو، واتە ئەو هێزە بێ شوێن و بێ زەمانەی کە دەشێت مایەی هەر جوڵەیەک بێت. نا ئەم خودایە پەیوەندییەکی بە باری تەعالاوە نەبوو کە دەشێت لە پشت مەعما و نهێنی گەردونەوە بێت، بەڵکو پتر لە ڕۆبێکی حەمام دەچوو کە کەسێکی ڕووت، بە پرتاو و شپرزە، لە دۆڵابێکی پیسدا دەیدۆزێتەوە و دەیکاتە بەری خۆی تا عەورەتی لە بەردەمی ئەوانی تردا دەرنەکەوێت. خوداکەی مەهدی دەریایی، خودای سۆفییە گەورەکان نەبوو، واتە خودای ڕاستەقینە نەبوو، هەر خودایەکیش خودای ڕاستەقینە نەبێت ترسناکە، کوشندەیە، سەرسەختە، دڵڕەشە. خودایەک بوو کەسانی وەک مەهدی لە ناکاو، لە هیچە دروستیاندەکرد بۆ ئەوەی فەرمانی لێوەربگرن، بۆ ئەوەی لەوپەڕی پیسیدا هەستبکەن لە ڕیزی پاکەکاندان، خودایەکی ئاسان بوو، زۆر ئاسان، بە جۆرێک، پیاوێکی خراپەکار و بێدەروەستی وەک مەهدی، بە دوو ڕۆژ دروستیکرد و کەوتە پەرستنی و بوو بە ئیماندار و عەبد و نوێژخوێنی.

لە ئێوارەی ڕۆژی دووهەمدا، سووڕی دەرکەوتنی ئەم دیندارە لە ناکاو و تازە خولقاوە هێدی هێدی کەوتە گەڕ. ئێوارەی ئەو ڕۆژە، حامید نەوەریی کە دۆستێکی دێرینی مەهدی بوو و دوای ساڵانێک نوقمبوونی ڕەها لە

سەرخۆشی و پارەپەرستی و دزیدا، کتوپڕ بووبوو بە خوداناس... ئامۆژگاری مەهدی کرد کە سەربوردی خۆی و فریشتەکەی بۆ مەلا ناجی سەڵتەپۆش بگێڕێتەوە، کە لای ئەو زانایەک بوو «علومی دینی» لە مسەر بۆ ئەوسەر «دەرخ» بوو. هەڵبەت حامید نەوەری خۆی شتێکی ئەوتۆی لە سەر «علومی دینی» نەدەزانی، هێند هەبوو رۆژێک کە ترسی لە ناکاوی مردن دایگرت و ویستی نیگایەک بۆ ئەو دیوی ئەم ژیانەی ئێستای بهاوێت کە هێدی هێدی هەستیدەکرد وەک جاران مسۆگەر و ئەبەدیی نییە، بۆ شتێک گەڕا ئاسوودەیبکات، ئارامیبکاتەوە، شتێک بێئەوەی عەقڵی خۆی پێوە بجەڕێنێت و هۆشی ماندووبکات، دەرەنجامێکی خێرا و خۆشبەختییەکی دەمودەستی پێببەخشێت... ئیتر لە خوداکەی مەلا ناجی سەڵتەپۆشی ئاسانتر لە بەردەستدا نەبوو.

حامید کە خڕکەڵێکی گوپن و کوپەڵەئاسا بوو، دەمێک چیرۆکەکەی مەهدی دەریایی بیست، دەستی خستە ژێر چەناگەیەوە و بە قیافەی کەسێکەوە لە تێڕامان و فیکردا ونبووبێت، گووتی «گەر ئەو مەخلوقە گووتبێتی فریشتەم، دەبێت پرسی مامۆستا ناجی بکەین، کەس نییە لەو زیاتر لەو شتانە سەر دەربکات». تا ئەو دەمە مەهدی گاڵتەی بەو هەوا و هەوەسە ئاینییە دەهات کە ماوەیەک بوو سەری حامیدی پڕ کردبوو، هەر کات حامید شتێکی دەگووت وەک جاران بۆنی شەراب و پارەی لێ نەهاتبایە، مەهدی بە دڵێکی تەنگەوە دەیگووت «ئۆۆۆۆ و لێگەڕێ باوکم، کفری ناوەختمان پێ مەکە». ئەو شەوە مەهدی بەڕاستی پێویستی بە چاوڕوونییەک بوو. دوو بە دوو لەگەڵ حامیددا چوونە ماڵی مەلا ناجی، کە لە ڕاستیدا نە مەلا بوو نە هیچ، بەڵکو یەکێک بوو لەو گەنجانەی ساڵانێک بوو کەوتبووە سەر هەوای خوێندنەوەی کتێبە ئاینییەکان و بە هۆی زانستی زۆر و وریایی خۆیەوە لەو گەڕەک و کوچانەی نزیک ماڵی مەهدیدا بووبوو بە کەسێک وەک وەلی و پیاوچاکان سەیریاندەکرد. نازناوی مەلا شتێک بوو پتر وەک ڕێزلێنانێک خرابووە پاڵی، کەسوکار و خزمانی وەک چۆن پارچەیەک تەڵا دەکەن بە بوکێکدا، لە خۆشەویستی و سەرسامیاندا

بە ئیمانی ئەم گەنجە، بۆ بەخشینی بڕوایەک و پایەیەک کە شایستەیەتی بە مەلا بانگیاندەکرد. مەلا ناجی وەک زۆربەی دیندارە شارەزاکان، هێندەی لە تێکست و ڕاڤە و کتێبەکانی دیندا زانا بوو، شتێکی ئەوتۆی دەربارەی خودا خۆی نەدەزانی، خودا لەلای وەرگەڕابوو بۆ مەخلوقێکی نهێنی کە لە ناو ئەو کتێب و گوفتار و حەدیسانەدا، واتە لە ناو تێکستە ڕووتەکاندا تواببووەوە. خودا لای ئەو، ئەو شتە بوو کە لە کتێبەکاندا پێیاندەگووت خودا. گەر کتێبەکان بە شتێکی دیان بگووتبایە خودا، ئەویش ئەوکات بێدوودڵی بۆچوونی خۆی دەگۆڕی و خودای بەو شتە دەناسی کە کتێبە دینییەکان باسیدەکەن. خودا لای ئەو لە بری لە وێنەی خالقی گەورەی گەردوندا دەربکەوێتەوە، وەک دەڤەر و شارێکی دوور بوو کە خەڵکانێک پێشتر چووبوون و بینیبوویان و شتگەلی جیاوازیان لە سەر گێڕابووەوە، ئیدی گەر خۆشی بچووبایە و لەوێ شتێکی دیکەی بدیبایە، هەر باوەڕی بە خۆی نەدەکرد و لە چیرۆکی گەڕاڵە دێرینەکان لای نەدەدا و سەربووردی ئەوان دەبووە جێنشینی چاوی خۆی «من هەموو ئەم زانیاریانەم لە فریشتەیەکی وێڵگەردەوە وەرگرت کە ماوەیەک بوو لەو گەڕەکەدا دەژیا».

مەلا ناجی لەوانە نەبوو فێس و جبە لەبەربکات، گەنجێکی شەوکەتداری هەڵکشاو بوو کە ڕیشێکی پڕ و درێژی بەردابووەوە، باڵای هێندە بەرز بوو، لە مەهدی دەریایش دەگوزەرا کە ئەویش وەک من کەسێکی بە هەیکەل و ڕەهەندە بوو. شتێک لە ڕەنگزەردی لە ڕوخساریدا بوو، کە بێگومان تەنیا لە ترس و خەشییەتی خوداوە نەهاتبوو، بەڵکو لە مەنگی و ئاسوودەگی دەرونەوە هەڵقوڵابوو، وەک بوونەوەرێک کە ناخی بە هێزی ئیمان هێمنییەکی وەهای دەستکەوتووە، بووە بە مایەی نەجوڵانی ڕۆح و یەک ڕەنگی ڕوخساری. زەردەییەکەی بە زەردی گۆمێک دەچوو سروەیەکی لاواز و شنەیەکی هاوینەش چییە بەسەر ڕوویدا هەڵنەکات. بەڵام مەلا ناجی لەوانەبوو هەر کەسێک دەیبینی بەو برۆ ڕەش و ڕەنگە زەردەیەوە ڕاستە و ڕاست ڕوخساری عاشقێکی غەمگینی وەیادا دەهاتەوە نەوەک

خوداناسێکی وشک و سەلەفی. لە ڕاستیدا گەر وابوویە، تۆ گەڕیدەیەکی دونیا تەیکەری سەدەی هەژدە بیت، ڕێگات بکەوتبایەتە ئەو چیا و هەردەبانانەی وڵاتی ئێمە، لە کاتی دابەزیندا لە توناوتونی خاکێکی عاسیدا یان دەمی گوزەر لە گەروی دەربەندێکی سامناکدا، مەلا ناجیت بەو سەر و ڕوخسارەوە بدیبایە کە من بینیم، دەمودەست خەیاڵت بۆ عاشقێکی هەردەگەڕ دەچوو کە بای سۆز فڕاندوێتی و ئازاری سووتێنەری ئەڤین سەری لێتێکداوە. بەڵام لەم سەردەمەی ئێمەدا و لەم شارەدا، ئەمجۆرە کەسە ڕەنگ زەرد و ڕیش درێژانە کە نیگایەکی وا هێمنیان هەیە، لە بری عەشقی دونیایی، دەمودەست ترسی خودا دەخەنەوە یادی خەڵک. دەمێک مەهدی و حامید نەوەری چوونە بەردەمی مەلا ناجی، هەردووکیان گەرچی بە تەمەن و ئەزموون لەو گەورەتربوون، بەڵام خۆیان گەلەک بچوک بینی و هەستیانکرد بەرامبەر وی زۆر گچکەڵە و بێزمانن. مەهدی وەک منداڵێک بێت و شکایەتی خۆی لە منداڵێکی گەورەتر و خراپەکار بگێڕێتەوە، بەزمانێک خاڵی نەبوو لە خولیای دروستکردنی بەزەیی، کەوتە گێڕانەوەی چیرۆکی خۆی. هەڵبەت هیچ درۆیەکی لەوەدا نەکردبوو بڵێ کەسێکی فرەنۆشم و دەمێک دەنیشمە سەر بادە سنوور دەبەزێنم و عەقڵم لام میوان نامێنێت. بەڕاستی هەموو چیرۆکی مەستی خۆی گێڕابووەوە کە چۆن پێک لە پشتی پێک فڕێکردوە و دواجار وەک کەلاکە تۆپیوێک لە کوچەیەکدا کەوتووە. کە چیرۆکەکەی بەوجۆرە بۆ مەلا گێڕایەوە، سەرەتا پیاوە ئیماندارەکە وایدەزانی ئەوەی مەهدی بینیوێتی ڕێشکەوپێشکەی چاوی بادەنۆشێک بێت کە ساتی مەستی خەیاڵاتی پوچ دەیکەنە نیازی خۆیان و وێنەی وەها نابەجێی تێدا دەجوڵێنن. بەڵام مەهدی دڵنیایکردەوە ئەو فەرخەی دوێنێ نییە و لە مەستی و بادەدا ڕەزم و ڕمبازی هەیە. گوتی کە ئەو هەموو ژیانی نیوەی مەستبووە و ئەوەشی بینیوێتی لە سات و کاتێکدا بووە هۆشی هاتۆتەوە بەر و هۆشیار بووە، هەتا قۆڵی خۆی نیشاندا بە سووکی زامدار بووبوو، دەمێک لەگەڵ فریشتەکەیدا چووبوونە سەر تل و قۆڵبادانی یەک. مەلا ناجی کە بڕوایەکی زۆرتری بە حامید نەوەری هەبوو، چونکە ماوەیەک بوو بەڕاست خەریکبوو دەکەوتە

سەر خەتی خودا، هەر مەهدی قسەیدەکرد، بۆ ئەوەی لە ڕاست و دروستی دڵنیابێت سەیری چاوانی نەوەری دەکرد، کە وەک یەقین ببەخشێتەوە، پڕبوون لە دڵنیایی و هێمنی. ئەو هێمنییەی چاوانی نەوەری و ڕیتمی هەناسەدانی، مەلای خاترجەمکرد و بە گوێیەکی هەستیار و بیستۆکەوە، هۆشی خستە سەر چیرۆکەکەی مەهدی. دەمێک گەیشتە سەر ئەوەی بڵێت فریشتەکە گوتوویەتی من مەلەکێکی سەربەخۆم و کارم بە خوداوە نییە، مەلا ناجی موچڕکێکی پێداهات و تەزوویەکی سارد و ڕاستەقینە هەژاندی کە هێند بەهێز بوو، دوو میوانەکەش هەستیان پێکرد. مەلا بۆ ئێستێک چاوانی داخست و کاتێک کردییەوە، نیگای وەکو پێشتر نەبوو، لە بەر خۆیەوە چەند جار گووتی «استغفرالله ... استغفرالله». لە بەردەم خۆیەوە ئایەتێکی خوێند و گووتی «کە فریشتەیەک گووتی پەیوەندیم بە خوداوە نییە، ئەوە شەیتانە ... دوا فریشتە لە مەلەکوتدا جورئەتی قسەی وای بووبێت ئیبلیس بووە، خۆیەتی، دەمزانی دێت». ڕەنگ و ڕووی تەواو گۆڕا، وەک ئەوەی لە مێژ بێت چاوەڕوانی دەرکەوتنی نیشانەیەکی ترسناک بێت و ئێستا دەرکەوتبێت. بە پەلە لە جێگای خۆی هەستا و گووتی «هەر ئێستا دێمەوە. هەر ئێستا، ڕەحمەتی خواتان لێبێت مەجوڵێن».
کە هەستا جارێکی دی باڵای وەها بڵند و ڕوخساری وەها سارد و بێبزە بوو، مەهدی سەرسامییەکی تەنک و دڵەڕاوکێیەکی ناوەخت گرتی. لە هیچ دڵنیانەبوو، ئایا بە ڕاست ئەوەی ئەو بینیویەتی شتێکی بەوجۆرە تاک و ناوازەیە، ئایا مانایەکی وەها قووڵی هەیە، پیاوێکی زانا بەمشێوەیە بترسێت و دەمی لە کلیلە بچێت. پێدەچوو قسەکەی مەهدی بە ڕاستی مەلای لە ڕیشەوە هەژاندبێت، کە گەڕایەوە دیاربوو مەلا تووشی فشارێکی میزەڵان بووە و ناچار هەستاوە خۆی خاڵیبکاتەوە. کە بەرامبەریان دانیشتەوە دوو دڵۆپ عارەق بە نێوچاوانییەوە بوو، یەکێک لە لا چەپی نێوچاوان و ئەویدیان لەلای ڕاستی. دووجار لە بەر خۆیەوە شایەتومانی هێنا و گووتی «ئەگەر بە ڕاست مەخلوقێکی وەهات دیبێت، بەڕاست شتی وا هاتبێتە سەر ڕێگات، بزانە کە شەیتانە. فریشتە جۆرێکی ترن، کوتوبی دینی بە شێوەیەکی تر باسیاندەکەن. مەرجەعی ئێمەش جگە لە کوتوب

هیچی تر نییە. مەلایکەت نیشتەجێی غەیبن، ئێمە بە چاو نایانبینین، مەگەر خودای تەبارەک وە تەعالا بیەوێت موعجیزەیەکمان نیشانبدات، ئەوان لە گۆشت و پێستی ئێمە نین، ئەعزایان سەراپا لە نور دروستبووە، یەکێک لە ڕوکنەکانی ئیمان باوەڕهێنانە بە مەلەک ... بەڵام مەلەک ئەستەغفیروڵا حاشا لە خالقی خۆی ناکات». لە ژێر لێوییەوە هەندێک سورەتی تری خوێند، خۆی وادەرخست لە ترس و حەسرەتدا دڵی ناسک بۆتەوە، بزەی دڵێکی دلۆڤان و میهرەبان کەوتە سەر لێوی، کە نازانێت ئاخۆ بگری یان پێبکەنێت، دوو فرمێسکی ڕۆشن پەڕیبوونە چاوی، بە دەنگێک کە عەشقی خودای لێدەباری، گووتی «مەلەک فەرمانبەری خودان، موەزەفی مەلەکوتن، ئیشیان ئەوەیە یەزدان هەر کار و فەرمانێکی بێت جێبەجێیبکەن. لە هەوادان، دەفڕن، هەر مەلەکێک نەیتوانی بفڕێت، ئەوە لە ئەتباعی ئیبلیسە، ئەتباعی ئیبلیس باڵشکاو و لە ئاسمانەوەڕا بەربوونەتەوە بۆ زەوی، لە بەرئەوە جارێکی تر هێزی بەرزبوونەوەیان تا جینانی خودای تەبارەک وە تەعالا پێ نییە». دەستێکی بەڕیشیدا هێنا، جوڵەکەی لە جوڵەی کۆنە دیندارێک نەدەچوو، بەڵکو تەواو لە دەست و پەنجەی تازە پیاکەوتوویەکی دەکرد، کە دەیەوێت ئیمانداره کۆنەکان چ جوڵە و بزاڤێکیان کردوە لە سەر ڕێیان بڕوات. مەلا بەردەوامبوو و گووتی «مەلەک شێوەیان زۆرە، مەلەکی دوو باڵ هەیە، مەلەکی سێ باڵ هەیە، مەلەکی چوار باڵیش هەیە کە ئیشیان ئەوەیە ئیش و کاری خێرای مەلەکوت ڕاپەڕێنن و هەر خودا ئەمریکرد لە شوێنی مەقسەددا ئامادەبن. خودای جەلە جەلالوهو لە سورەتی فاطر دا دەفەرموێت «الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَاعِلِ الْمَلَائِكَةِ رُسُلاً أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ».

مەهدی عاجباتی لێهات کە مەلا وا ڕەوان سورەتەکان دەخوێنێت. هەمیشە سەرسام بوو بە عەرەبیی مەلاکان، کە لەو عەرەبییە نەدەچوو، کە سەدام حوسەین و سەربازە عەرەبەکانی ناو بازاڕ قسەیان پێدەکرد، بەڵکو بە شێوەی گووتن و بە مۆسیقای وشەکانیش وەک دوو زمانی جیاواز و

بەیەک نامۆ دەهاتنە گوێی. مەلا ناجی گووتی «تێدەگەن، مەلایکەت پەیامهێنی خودایە، ئێمە نایانبینین، هەموو ئادەمیزادێک دوو مەلەکی هەیە، بەڵام لە ناوەوەی ئینساندا نیین وەک مەلەکە درۆزنەکەی تۆ بینیوتە، بەڵکو لە سەر شانی ڕاست و شانی چەپن، ئەوی ڕاست چاکە دەنوسێت و ئەوی چەپ خراپە. خودا فەرمویێتی «وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ». مەهدی لەوانە نەبوو لەو ئایەتانە تێبگات، بەڵام دەنگی مەلا لە نورێکی وەها هەڵکێشرابوو، دەمودەست کاری لە مەهدی کرد و دەرگای ئیمانی بۆ خستە سەر پشت. نەوەری تۆزێک لەو خوێندەوارتر بوو، بەڵام ئیمانی هێشتا بەشی ئەوەی نەدەکرد بەرامبەر کەس دانیشێت و بە سەعات گوێ لە ئایەتگەلێ بگرێت کە هیچ لە سەر و ژێریان حاڵی نەدەبوو، لەبەرئەوە ڕووی دەمی کردە مامۆستا ناجی و پرسی «ڕاست دەفەرمووی مەلا، بەڵام بە ڕای ئێوە چی بکەین؟». مەلا گووتی «عەزیزی دڵم، خەبەرێک هێناوتانە ئیعتیادی نییە، لە مەرتبەیەکی بەرزی خەتورەتدایە، دەبێت هەم موتمەئین بین کە ئەوەی زهوریکردوە جارێکی تریش زاهیر دەبێت، تا دەلیلی یەقین و ئیسباتی عەقڵی و ئیمانیمان بەدەستەوە بێت، ئینجا ئەمە شتێکە واجبە عولەما و مەشایەخی لە من بە ماریفەتتر نەزەری تیا بدەن، وجودی ئەم شتانە ئەساسییە، گەر ئەمە مەلەک بێت یان شەیتان و بەو شێوەیە خۆی نیشاندابێت، یەعنی موسڵمانان واجب و فەریزەیەکی گەورە هاتۆتە ئەستۆیان، شتەکە بۆ تەواوی ئوممەتی ئیسلامە. با سەبربکەین، گەر دەرکەوتەوە هەوڵبدە بیگریت. هەر چەند چ مەلەک و چ شەیتان، چونکە ساکنی مەملەکەتی غەیبن زهور و ئیختفایان بەدەستی خۆیانە. بەڵام وەک بیستوومە، ئیماندار هەیە دەتوانێت جن و مەلەک و شەیاتینیش بە چاوی موجەڕەد ببینێت، ئەوە بەهرەیەکە خودا داوێتی. کەس لە حیکمەتی کار و کرداری خودای تەبارەک وەتەعالا تێناگات، ئەگین چۆن شتێکی وەها خەتەرناک و پەیامێکی ئیلاهی وا گەورە بۆ سەرخۆش و کەسێکی بێدەستنوێژ و بێئیمانی وەک تۆ دەنێرێت، عەجایەبە. ئەوەش یەکێکە لە

حیکمەتە ئیلاهییەکان کە بە ئێمەی عەبدی فانی تەفسیرناکرێت ... بەڵام من یەقینم هەیە ئەوەی زەوریکردوە شەیتانە».

نەوەری سەری خوراند و وەک هێشتا تێنەگات، گووتی « مامۆستا گیان خولاسەی کەلام، ئێمە چی بکەین؟ چارمان چییە؟». مەلا ناجی سەری داخست و بێئەوەی لێیان بڕوانێت، وەک چاوەڕوانی ئیلهامێک بێت لە جێگایەکی دیکەوە ماوەیەک بێدەنگ بوو، ئینجا سەرێکی حەکیمانەی لەقاند و گووتی «ئینتیزاردەکەین تا جارێکی تر زەوردەکاتەوە. بزانین ئەمجارە چی دەکات و چی دەڵێت. من حیکایەتەکەی ئێوە بۆ خەڵکی زاناتر دەگێڕمەوە و بزانم نەزەری ئەوانیش چییە».

من دەبوو مەهدی ببینمەوە، قەدەر شتێک نییە خۆتی لێ لابدەیت. قەدەر وەک خۆرە وایە دەچێتە گیانەوە، قەدەر خۆی قاچی نییە، هیچ کات ئەو ڕوو لە ئێمە ناکات، بەڵکو ئەوە ئێمەین بەرەو ڕووی دەچین و باوەشی پێدادەکەین. ئەوەی لە من ڕوویدا شتێکی لەو جۆرە بوو، من دەمتوانی خۆم لە زۆر شت لابدەم، بەڵام فریشتەی پیر وەک کۆچەریی پیر وایە، بە جۆرێکی غەمگین بیری نیشتیمانی دەکات. هەر چیمکرد نەمکرا خۆم لە مەهدی بدزمەوە، وەک باوکێک سەیری خۆمم دەکرد کە کوڕێکی بەدبەخت و گەوجی هەیە و جگە لەوەی بەدوای بکەوێت و ئازاری هەڵبگرێت چارەی تری نییە. لە ناکاو هەستێکی غەمخۆری و هەستێکی نابەجێی بەرپرسیاری بەرەو ئەو کابرایە دەیبردم. جاری دووهەم لە نزیکی ماڵی خۆیانەوە بینیم، خۆی تەواوی دیدارەکەی لەگەڵ مەلا ناجیدا بۆ گێڕامەوە، پەلیم گرت و لە چایخانەیەکی لاکۆڵاندا دانیشتین، چاخانەکە شوێنی پیر و پەککەوتەی ئەو دەوروبەرە بوو، لە خۆشبەختی ئێمەدا ئەو کات تەواو چۆڵ بوو و دەمانکرا بەبێ ترس قسەی دڵی خۆمان بکەین. من پێمگووت «تۆ پیاوێکی بێمێشکی، باوەڕ بە ناخ و ڕۆحی خۆت ناکەیت و پەناتبردۆتە بەر کەسێکی نەفام و خورافاتی تا بۆت ڕوونبکاتەوە من چیم». کەوام گووت زۆر ناڕەحەت بوو، وەک ئەسپی پەتپسێن هەڵچوو و گووتی «خورافات، خورافات؟ ئەی ئەوەی تۆ بە منی دەڵێیت خورافات

نییە؟ تەحا عاسمانت بمێنێت، وەڵا پیاو ئیمانی لە کەللەدا نامێنێت. ئەی ئەمەی تۆ دەیڵێیت چییە، گەر خورافات نییە گووی سەگە ... ها ... چییە؟ پێمدەڵێیت، من فریشتەم و لە قوونی تۆوە هاتوومەتە دەرێ... ئەمە چییە، خورافات نییە؟». وەک زۆربەی خەڵکی ئەم شارە، زمانێکی پیس و پڕ لە وشەی هەرتۆک و ناخۆشی هەبوو. کە زۆر دەمیدەکردەوە بۆی دەمی هەراسانیکردم، پێشتر هیچ بۆیەک بەوجۆرە ئازاری نەدابووم، لە دڵی خۆمدا گووتم، ببێت و نەبێت کاتی خۆی لە تاو ئەم بۆگەنییە جێم لەقبووە و ڕامکردوە. تەواوی چیرۆکی فریشتەکانم لە نوکەوە بۆ گێڕایەوە. پێمگووت بمبە بۆ لای ئەو پیاوە ڕۆحانییە تا قسەی لەگەڵدا بکەم. گەرچی یەکێک لە ئامۆژگارییە زۆر کۆنەکانی ئەلیائیلی فریشتە ئەوە بوو هیچ کات لەگەڵ ئیمانداریێکدا نەکەومە گفتوگۆ و حەقیقەتی خۆم بۆ هیچ خوداناسێک ئاشکرانەکەم، ئەوەی بە ترسناکترین کارێک دەزانی فریشتەیەک بیکات، بەڵام بەدبەختی و سەرەڕۆیی من، باوەڕی زۆرم بە مرۆڤ، وایکرد ئامۆژگاری ئەو فەرامۆشبکەم و دوای خولیایەکی شێتانەی سەری خۆم بکەوم. مەهدی گووتی «وەرە خۆت پیشانی مەلا ناجی بدە، گەر ئەو گووتی تۆ مەلەکیت، بە ناموسم تۆ چی بڵێیت وادەکەم ... دەست بهێنە وەعدی شەرەف، قسەی پیاو».

من بە ڕاستی دەمویست پەیوەندییەکی هێمن و دۆستانە و پڕ مەحەبەت لەگەڵ مەهدی دابمەزرێنم، هەستمدەکرد تا دێت پیردەبم و پێویستم بە وزە و تین و توانای مرۆڤەکانە. پێویستیم تەنیا بە سۆز و تێگەیشتنی مەهدی نەبوو، بەڵکو دەمویست ئەو درزەی کە لە نێوان من و ئەم هەموو مرۆڤەدا دروست بووە، یەکبگرێتەوە و دابخرێت. مرۆڤ بوونەوەرێکی سەیرە، بۆ ئەوەی لێی دووربکەویتەوە، هەزار کلیل و هەزار دەرگای هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی بگەڕێیتەوە بۆ لای، هەتا یەک درز و دەلاقەش نادۆزیتەوە، مرۆڤ لە شارێک دەچێت هەر کات بتەوێت لێی دەربچیت، لە هەموو لایەکەوە دەرگایە و بۆت دەکرێتەوە، کەچی کە دەتەوێت بگەڕێیتەوە، دەرگایەکیش نابینیت، سەیرت لێدێت، کوان ئەو دەرگایانەی

لەودیو هەن و لەمدیو نین... لە کوێن؟ ئەوە ڕۆشنترین نیشانەیەک بوو من سەرنجم دابێت سەبارەت بە مەحاڵیی تێگەیشتن لە مرۆڤ. مرۆڤ، چونکە خۆی لوغز و مەتەڵە، نایکرێت بە نهێنی ئەم دونیایە بگات. مرۆڤ مەتەڵێکە، هێزێکی زۆر گەورە لە خۆی یان لە یەکێکی تری داهێناوە، ئەو ڕۆژەی ئەو لوغزە ڕۆشندەبێتەوە ئەم جیهانە کۆتایی دێت، بەڵام بەوەدا ئەم لوغزە کەس هەڵیناهێنێت، واتیدەگەم دونیاش ئەبەدیی بێت. من نیازم نەبوو مەتەڵەکە شیبکەمەوە، بەڵام نیازم بوو کە لە مەهدی نزیکببمەوە، بیری بخەمەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان فریشتەیەکی هەبووە، پێیبڵێم دەمێک ئەو فریشتەیە وندەبێت و دەڕوات دەچێت بۆ کوێ. پێیبڵێم تکایە بە هاوڕێکانت بڵێ فریشتەکەی خۆیان لە یادنەکەن. من تەنیا فریشتەیەک نەبووم کە هەڵهاتووم، بەڵکو دەبوو بەر لە مردنم، بەر لە دوا هەناسەم، ئیشێک بۆ ئینسان و فریشتەکان جێبەجێبکەم. دۆخێک کە زۆرجار خانمی مەلەکبینی توڕەدەکرد و بە ڕاستی تووشی نیگەرانی دەکرد، دەیگووت « بەساقە، گەر دەتەوێت دونیا بگۆڕیت، بچۆ بۆ لای کیم ئیل سۆنگ یان فیدل کاسترۆ، یان نازانم هەر گەوجێکی تری لەو جۆرە. یەکێکم دەوێت لەم کەشتییە تەڕەماشەدا لەگەڵمدا نەختێک گەڵوقنگی ئەو نەگبەت و نەخۆشانەی قاتی سەرەوە پاکبکاتەوە... ڕاستت دەوێت ئینسان و ئەم فریشتانە، بە هەڵە پێکەوە لەم سەر ئەرزە دەژین. لەوە زیاتر خۆتم لێ لەبان مەکە، زێدەڕۆیی شتێکی باش نییە، منیش گوناحم، ژنێکی تەنیای بێکەسم، نە پیاوێکم لە پشتە، نە نێرەکەرێک تۆزێک دڵنەواییم بداتەوە... گەر دەتەوێت فریشتەیەکی باش بیت بۆ ئینسان، تۆزێک ئینسافت بێت و لایەنی کەم لە منەوە دەست پێبکە».
بەڵام من لێتان ناشارمەوە کە کەسێکی بێگوێ بووم، ئاسان ملم بۆ ئامۆژگاریی و ڕێنمایی کەس نەدا. ڕاستە خانمی مەلەکبین نرخێکی گەورەی هەبوو لام ، بەڵام دەمێک دەمبینی هێندە لە پەیوەندی من و مرۆڤەکان دەترسێت، دەمویست شتێک بکەم بۆی بسەلمێنێت، گەر خۆمان ماندووبکەین، مرۆڤ دەتوانێت ڕاچەنێت و بکەوێتە گەشت بە دوای فریشتەکەی خۆیدا. ئەو قسانەم خانمی زیاتر هاردەکرد و دەپەڕییە سەر

تەپۆڵکان و دەیگووت «دەتەوێت بڵندگۆیە بنێم بە دەممەوە و جاڕبدەم، خەڵکینا بڕۆن بەدوای فریشتەکانتاندا بگەڕێن. هەر ئەو حەیاچوونە ماوە بەسەرمدا بهێنن، ئەوەی لە سەرمە کردومە، تاکە ژنێکی گەوجم لەم سەر ئەرزەدا خۆم بۆ خزمەتی کەسانی نیوەمردوو و بێهیوای وەک ئێوە تەرخانکردوە؟ لەوە زیاتر چ گەمژەیی و گەوجییەکی ترتان لێمدەوێت. وای خوایە. ئەوەی وەک سەگی پێخاوسماڵە و ماڵ بگەڕێم و بەسەر دەست و قاچی خەڵکدا بکەوم، کاری وام پێ ناکرێت ... هەستە و برۆ، تووشی دەرد و موسیبەتی وەهام مەکە».

دڵنیابووم ڕێزان خان هەست بە مەترسییەک دەکات کە من نایبینم، لە ڕاستیدا سنووری تێڕوانینی من بۆ توانای شەڕانگێزیی مرۆڤ لە جێگایەکدا دەوەستا. من شتی زۆرم لە سەر مرۆڤ خوێندبووەوە، بەڵام زۆربەی ئەو کەسانەی لە ژیانی خۆمدا هاتبوونە سەر ڕێگام، گەرچی هەموو چاک و نمونەیی نەبوون، بەڵام هێند شەڕانی نەبوون، بڵێم هیوایەک لە مرۆڤدا نییە و دەست لە هەموو شتێک بشۆن. ڕێزانی مەلەکبین خۆیشی بەو جۆرە بەدبین نەبوو، بەس بۆ ئەوەی من لە هەڵەشەیی و چەوتەڕێی بپارێزێت هەر کات باسم لە نزیکبوونەوەی زۆرتری نێوان ئینسان و فریشتە دەکرد، ئەو تا سنوورێک بۆ خەیاڵ خۆشیم دابنێت، بە زمانێکی وەها بەدبین قسەیدەکرد.

من گوێم نەدایە هیچ و لە سەر دواکەوتنی خولیای خۆم بەردەوام بووم.

لەگەڵ مەهدیدا ڕێکەوتم بچم بۆ لای مەلا ناجی، دەبوو لەوە بکەوم بەردەوام خۆم بشارمەوە، دەبوو خۆم دەربخەم و خەڵکی بزانن کە بەڵێ فریشتە بوونی هەیە. دیدارەکەم لەگەڵ مەلا ناجیدا پتر لەوەی تراژیدی یان فەلسەفیانە بێت، کۆمیدی بوو. مەلا کە منی بینی هەر بە ڕاست ترسێکی کتوپڕی لێنیشت کە نەمدەزانی ترسێکی نمایشکارانەیە یاخود جۆرە زیکر و فێیەکی مەزهەبیانەیە کە دینداران خوویان پێوەگرتووە. هەڵبەت مەلا توانایەکی نەبوو باڵەکانی من ببینێت، بەڵام بە دەنگێکی

بەرز وەک شەیتان لە خۆی دەربکات، سێ جار گووتی « اعوذ بالله من الشیطان الرجیم » دوایی لە دوورییەکی گونجاوەوە نەوەک مەلمەسی من بۆ دین و ئیمانی خراپ بێت، گووتی «فریشتەکان دووانن لە لای ڕاست و لە لای چەپ...». پێش ئەوەی قسەکانی تەواو بکات من لە سەر کورسییەک دانیشتم و بەبێ خۆ سەغڵەتکردن پاڵمدایەوە و گووتم «مامۆستا گیان گوێبگرە، ئەو قسانە بۆ من، مەهدائیلی فریشتە، ڕاست نین، من ئینکاری ئەوە ناکەم خودا مەلەکی وەهای هەبێت، کردبێتنی بە چاودێر بەسەر مرۆڤەوە، شەو و ڕۆژ خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری و ڕاپۆرت نوسین بن لە سەر شانمان ، بەڵام من ڕاستیت پێدەڵێم، فریشتەی زۆرم بینیوە کە هەر ناتوانن بنوسن و بخوێننەوە. من لەو جۆرە فریشتانە نیم کە کاری وەها دەکەن، من جۆرە مەلەکێکی ترم. لەو جۆرە مەلەکانەم کە خودا بەجێیهێشتووین تا ئێوە بە زیرەکی و وریایی خۆتان هەستمان پێبکەن، بماندۆزنەوە. ئێمە بەشێکین لە ئێوە، لەگەڵ خۆتانداین. خودای گەورە هیچ کات چاوەڕوانی ئەوەی لە ئێوەی ئادەمیزادان نەبووە هێندە لە خۆتان دووربکەونەوە، هێندە لە جەوهەری خۆتان بترازێن ئێمە ئیتر بەرگەنەگرین و بێینەدەرێ. ئێستا کە هاتووم و دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم، بۆ ئەوەیە تۆ بەخەڵک بڵێیت، فریشتەیەک لەگەڵیاندایە ئاگادارییبن ... فریشتە لە مرۆڤ لاوازترە ... هاتووم تکات لێ بکەم ...». مەلا وەها موچڕکەی پێدا دەهات و تەزووی یەک لە سەر یەک بە جۆرێک لێیان دەدا، هەر نەمزانی گوێی لە من بوو یان نا. گووتی «خودای تەبارەک و تەعالا گووتوویتی کە شەیاتین لە زۆر هەیئەت و شێوەدا دەردەکەون. مەهدی تۆ چ خراپەیەکت کردوە، چ خراپەیەک؟». مەلا بۆ ئەوەی پیس نەبێت و نەجاسەتی ئەهریمەن نەیپێکێت، قسەیەکی لەگەڵ من نەکرد. بەڵام لێکچوونی نێوان من و مەهدی ترساندبووی، گەر لە منی بڕوانیبایە تەنیا بۆ ئەوەبوو لە نزیکی ڕوخساری من و مەهدی وردبێتەوە. مەهدی کە گوێی لەو قسانە بوو، ڕەنگی پەڕی و لێوەلەرەیەکی توند گرتی. مەلا وەک یەکێک ئەم بیر و خەیاڵە ماندوویکردبێت و بیەوێت خۆی قوتاربکات، گووتی «مەهدی هیچم بۆ ناکرێت، هیچم بۆ ناگووترێت، دوو سبەی

جەمعییەتی عولەما لە سەر ئەمە کۆدەبنەوە، دەمەوێت خۆت و ئەم شەیتانە بێن بۆ ئەوێ ... حوکم لای ئەوانە. خودا بمانپارێزێت. خودا بمانپارێزێت». وەها هاواری خودای کرد، وامدەزانی هەر ئێستا هێرشێکی گەورە بۆ سەر زەمینی کافران لە تەواوی دونیادا دەست پێدەکات. مەلا ناجی بۆ من کەسایەتییەکی کۆمیدی بوو، دیمەن و شێوەی سەیرکردن و جۆری ڕەفتاری چەشنێک نەبوون لەرز بخەنە دڵم. کە هاتینە دەرەوە مەهدیی بردە ئەولاوە و هەندێک شتی بە گوێدا چپاند، بێباک وەک بمەوێت قسەکانی بە هەند وەرنەگرم، پشتمکردە هەر دووکیان و دەستم خستە گیرفانی پانتۆڵەکەم و دەستمکردە فیکە لێدان.

جەمعییەتی عولەما ڕێکخراوێکی دوو دیو بوو، بە سەرێک ڕێکخراوێکی شەرعی و دەوڵەتی بوو، بەڵام بە سەرێکی تر، خەڵکانێکی دیکەی تێدا بوون، ئەو شەرعییەتەیان بەکاردەهێنا تا لە بنەوە دادگای پشکنین دابمەزرێنن و قەپانێک بۆ کێشانی عەقائید و بیروڕا دابنێن. دەوڵەت جەمعییەتەکەی دامەزراندبوو تا ئاگای لە هەموو جوڵە و هاتوچۆیەکی پیاوانی دین بێت، ئەوانیش جەمعییەتەکەیان دامەزراندبوو تا ئاگایان لە هەموو جوڵەیەکی خەڵک بێت. چەند ساڵ بوو جەمعییەتەکە دامەزرابوو، بەڵام ڕاستییەکەی شتێکی ئەوتۆی نەبوو بیکات، لە کۆبوونەوەکاندا هێندەی مەلاکان لە سەر ڕاست و دروستی هەندێک تەفسیر بە شەڕ دەهاتن و لە سەر جیاوازی دەستکەوتی مەلا کوێر و قورئان خوێنەکانی سەر قەبران لەگەڵ عولەما ڕاستەقینەکانی دیندا گفتوگۆیاندەکرد، شتێکی گەرم و گوڕتر و گرنگتر لە ژیانیاندا نەبوو، هەتا جارێک لە جاران یەکێک لە عالمە بەرزەکانی جەمعییەت بە گاڵتەوە گوتبووی، گەر بە پەلە شەیتان سەرێک لە شارەکەمان نەدات، ناچارم خۆم هەفتەیەک جلی شەیتان لە بەربکەم و بە شەو بچمە سەر ماڵان. ئەهلی ئیمان وەها بە شتەکان ڕاهاتبوون و بڕوا بە خودا وەها بووبووە شتێکی ڕۆتین، خەڵک پرسیارێکیان سەبارەت بە دین نەمابوو، ئەوەشی گومانێک یان وەسوەسەیەکی تێبگەڕایە زوو دەینارد بۆ مەلاکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و

ئاورێکی لە جەمعییەتی عولەما نەدەدایەوە. بەڵام دەبێت بڵێم، وەک دواتر بۆم دەرکەوت مەلاکانی جەمعییەت دوو جۆر بوون، هەندێکیان تەنیا مەلابوون، واتە خودایان دەپەرست و لە کاروباری جەمعییەت نانێکیان دەخوارد و ڕزقێکیان وەدەست دەهێنا، خەڵکیان بۆ ئیمان و کاری باش ڕێنماییدەکرد، چاکە و موحەبەت و خوداناسی دەلیلی ئیشیان بوو، بەڵام جۆری دووەم ترسناکتر بوون، بەردەوام لە خەیاڵی پشکنینی عەقیدە و لە ترسی لەدەستچوونی دیندا بوون... شتێک لەم تاقمەدا سەیربوو، بەردەوام لە قسە و گوفتاریاندا لە کۆتایی دین دەترسان، ترسێک من وەک فریشتەیەکی بێلایەن لە هۆکانی تێنەدەگەیشتم و بەهانەیەکی باشم بۆ نەدەدۆزرایەوە بۆی. ڕۆژی پێش کۆبوونەوەکەی من، هەندێک لە ئەندامانی جەمعییەتی عولەما پرس و گفتوگۆیەکیان لەگەڵ مەهدی کرد، هەمان ئەو قسە و پرسیارانەیان کردبوو کە مەلا ناجی کردبووی، من دواتر زۆر ئارەزووم نەبوو لە مەهدی بپرسم باس و حیکایەت چییە و شتەکان بەرەو کوێ چوون، بەڵکو چاوەڕوان بووم خۆم بچم و لەوێ بەرامبەر جەمعییەت بوەستم و پەیامی خۆم ئاشکرابکەم و تکایان لێ بکەم لە پەیوەندی مرۆڤ و فریشتەکان تێبگەن.

کۆبوونەوەکە وەک من چاوەڕوانمدەکرد لە مزگەوتێک یان هۆڵێکی ئەوقاف یان دیوانی جەمعییەت نەبوو، بەڵکو لە ماڵێکدا بوو، کە ژووری دانیشتنەکەی لە دیوەخانێکی گەورە و شاهانە دەچوو، گەورەترین جێگایەک بوو تا ئەو کاتە دیبێتم، زیاد لە دە هۆرتەی کاری کاشانی تێدا بوو، جگە لە وردە فەرش و ڕاخەری دیکە. کە چوومە ژووری نیوەی مەلای شارەکە و بگرە زیاتریش لەوێ بوون، هەموو بە ڕیز لە قەراغی دیوارەکاندا لە سەر دۆشەکی بەرزی لۆکە دانیشتبوون و یەکی سینییەک چەرەسات وخورما و شەکری کلۆیان لە بەردەمدا بوو. سەرەتا گومانمکرد، ئایا بە ڕاست ئەمە بۆ منە یاخود بۆنەیەکی ترە و منیان ناواخنکردوە. پێشتر من و مەهدی لە چایخانەیەکی نزیکی مەیدانی ماسیفرۆشان یەکدیمان بینی، پێکەوە تاکسییەکمان گرت و چووین بۆ کۆبوونەوەکە،

هەر دووکمان پێکەوە سەرمان بردە ژووریّ، لەگەڵ دەرکەوتنی ئێمەدا هاواری یااللەیەکی کپ لە زۆر جێگاوە بەرزبووەوە و پاش کەمێک بێدەنگییەکی دۆزەخی و خنکێنەر باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشا. هەندێک کە منیان بینی گوتیان اعوذ بالله من الشیطان الرجیم. مەلاکان هێندە زۆربوون من نەمدەتوانی بە تەنیا سەیری دەموچاوی یەکێکیان بکەم و تێبگەم چۆن دەمبینێت و بە چی تێمدەگات. لە یەککاتدا دەیان چاو سەراسیمە و واقوڕماو دەیانڕوانی. یەکەمجار بوو بکەومە بەر لێشاوی ئەو هەموو نیگایە. گەرچی وەک فریشتە هەستێکی قووڵی شەرم و پەشۆکانم نەبوو، بەڵام وەهاش نەبوو حەشاماتێکی لەمجۆرە بە گومان و ترس و کینەوە سەیرمبکەن، من هەر بێباک و لە کەیفدا بم. شتێک دوای ترازانەکەم هەستم پێ نەکردوە، ترسی گەورە بووە لە مەرگ. هەڵبەت مەرگی فریشتەکانی هاوڕێم دڵتەنگیدەکردم، یان کاتێک مستەفا شوکاک شەوان لە یانەی پزیشکان دایدەنام و باسی جەنگی بۆ دەگێڕامەوە، دڵم بۆ مرۆڤەکان دەسووتا و غەم بەر گەروومی دەگرت، بەڵام بە گشتی ترس لە مردن لە مندا لاوازبوو. بەڵام تا لەو جێگایەدا کە ئەو هەموو چاوەم دەبینی بە نەفرەت و گومانەوە لێم دەڕوانن، بۆ یەکەمجار هەستمکرد پێویستە لە مرۆڤ بترسم. بەڵێ، تا ئەوکاتە نائومێدی، بێزاریی، نەفرەت، تووڕەییم بەرابەریان هەبوو، بەڵام هۆیەکم نەدەدۆزییەوە زۆر لەم مەخلوقاتانە بترسم. کە گەیشتمە ناو ژوورەکە و لە هەنگاوناندا بووم بۆ پێشەوە، زانیم هەڵەیەکی کوشندەم کردوە کە چاککردنەوەی ئاسان نییە، بەڵام تازە هاتبووم و گەڕانەوەم نەبوو. ڕاستییەکەی من بە هیوای دیالۆگێکی فەلسەفی قووڵ و درێژ لەگەڵ کۆمەڵێک ڕۆحانی ژیر و حەکیمدا هاتبووم، ئێستا لەشکرێک پیاوانی مۆن و تووڕەم دەبینی کە پێشوەخت بڕیاریاندابوو من شەیتانم و دەرگای هەموو قسەیەکی دیکەیان داخستبوو. ئەو بێدەنگییە کتوپڕ و قورسە کە لەگەڵ هەنگاوەکانی مندا زیاتر و زیاتر دەبوو، ناڕەحەتیدەکردم، حەزمدەکرد هەموو ئاسایی قسەبکەن. مەلا ناجی لە ناکاو بە چاکەت و پانتۆڵێکی تازە و ئوتوکراوەوە لە سوچێکەوە لە جێگای خۆی هەستاو دەرپەڕی و بە دەنگی بەرز گووتی «سەڵەوات

مامۆستایان، سەڵەوات». لە هەر چوارلاوە دەنگی مامۆستاکان بڵندبووەوە. مەلا ناجی، بە پەنجە وەک ئاماژە بۆ شتێکی ترسناک بکات، نیشانەی خستە سەرم و گووتی «ئەوەیانە مامۆستایان، ئەوەیانە... ئەوەیە ئیدیعای مەلەکێتی دەکات». کە وایگووت هەڵایەکی زۆر بەرزبووەوە، دەنگێکی وەها پڕ ژاوەژاو و هەمهەمە دروست بوو، وشەیەک چییە لە ناویدا نەدەناسرایەوە. بەو قسەیە بێدەنگی شکاو قاوەقاوێکی عەجایەب سەریهەڵدا. سەرەتا وەها بوو من هەر زمان نەزانم، هیچ تێنەدەگەیشتم و هیچی ڕوون و ڕۆشنیش نەدەهاتە گوێم. بەڵام پاش ئیستێک، دەنگێکی سوڵتانی و هەیبەتدار هەمووانی بێدەنگکرد و بە زمانێکەوە بۆنی فەرمان و حوکمی لێدەهات گووتی «ئیمانداران، مامۆستایان، ڕەحمەتی خوداتان لێ بێت، ڕەحمەتی خوداتان لێ بێت، تۆزێک بێدەنگ بن». پیاوێکی بە قیافەی ڕیش سوور بوو، دوایی زانیم ناوی مەلا مونزیرە، لە ناو مەلاکاندا پلە و پایەیەکی هەبوو، نە لەبەرئەوەی شارەزایەکی زۆری زانستە دینییەکان بوو، بەڵکو لەبەرئەوەی هەمیشە فەرمانی دەگرتە دەست و خۆی دەکوتایە پێشێ و دەبووە ناخودای هەموو کەشتییەک. مەلا مونزیر، بە جۆرێک هەڵیکوتایە ناوەڕاستی ژوورەکەوە منی داپۆشی، لە پڕدا تەواوی مەلاکان لە بری سەیری من، چاویان بڕییە مەلا. هەستمکرد هەندێک لە عولەما و پیاوە دینییەکان لەو هەڵمەت و تاوەی مەلا بۆ ناوەڕاستی ژوورەکە نیگەران بوون، بەڵام جگە لە بزەیەکی تاڵ و سەربادانێکی گاڵتە هیچیان نەگووت و پەرچەکردارێکی دییان نەبوو. مەلا مونزیر دەنگێکی زۆر گەورە و گڕی هەبوو. هێندەی زانی سەرنجی هەمووانی ڕاکێشاوە، گووتی «مامۆستایان ڕەحمەتی خواتان لێ بێت، سەڵاواتێک لە دیاری حەبیبی خودا... دەی سەڵاواتێک لە دیاری ئەو»، دەنگی سەڵاوات جارێکی تر بەرزبووەوە. ئینجا گووتی «سەعاتی لێپرسینەوەیە، با کات بە فیڕۆ نەدەین، تکایە ئیمانداران، ڕەحمەتی خواتان لێ بێت بانەبێتە گەڕەلاوژە، با نەبێتە گەڕەلاوژە، با مامۆستایەک دیاریبکەین کاری پرسیار و جەواب بگرێتە ئەستۆ... بفەرموو کاک مەهدی، بفەرموو». کە وای گووت هەر بەڕاستی

بوو بە گەڕەلاوژە و هەڵاو دەنگەدەنگێکی زۆر و لە ڕادەبەدەر. دیسانەوە مەلا مونزیر وەک سەرکردەی سوپایەکی شڵەژاو نەڕەی گەیشتەوە عەرش و هاواریکرد «موسڵمانان، موسڵمانان، من جەنابی مەلا فاتیحی ئاشیباغ یان جەنابی خەتیب خۆی مامۆستا مەلا حسامەدین هەڵدەبژێرم، ئەم لێپرسینەوەیە بەڕێت بەڕێوە». نازانم بۆ لەو کاتەدا هەستمکرد کە نۆبەتی من و دەرفەتی منە خۆم دەربخەم و قسەبکەم و نەهێڵم کەس وەک قازی و حاکم بمخاتە ژێر پرسیار. من دەستم بەرزکردەوە و گووتم «مامۆستایانی بەڕێز، سڵاو، سڵاوی زۆرم، من مەهدائیلی فریشتەم». هەر وام گووت، بێدەنگییەکی قووڵ و کپییەکی سەرتاسەریی باڵی کێشا. من هەنگاوێک زیاتر چوومە پێشێ و گووتم «دەزانم ئێوە بۆیە لێرە کۆبوونەتەوە، من ببینن، قسەم لەگەڵ بکەن. من خۆشحاڵم بەم کۆبوونەوەیە، لە مێژە دەمەوێت من و مەعشەری ئینسانەکان بەڕاستی لە جێگایەکدا کۆببینەوە. مامۆستا ئازیزەکان، من فریشتەم، بەڵام وەک ئێوەم، لەم شارەدا لە دایکبووم، لەم شارەدا ژیاوم، زمانی ئەو خەڵکە قسەدەکەم... ناتوانم تەواو ڕوونیبکەمەوە چۆن، بەڵام سەردەمێک هاودەم و هاوڕێی ئەم پیاوە بووم کە ئێستا لەگەڵمدایە... من تەواوکەری ئەم کەسەم، هەر یەکێک لە ئێوەش مەلەکێک لە ناختاندایە، مەلەکێکی وەک من کە تەواوکارتانە، بەشێکە لە ئێوە و لە بوونتان». بەوجۆرە هاتمە قسە، وەک یەکێک سوپایەک بۆ جەنگ ئامادەبکات چوومە ناوەڕاستی ژوورەکە و دەنگم لێ بڵندکردەوە. گەرچی پێشتر لە هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا وتارم نەدابوو، بەڵام تا سنوورێکی باش سەرەحاڵ و سەرکار بووم. قسەکانم گەرچی جارە جارە ناڕەزایی توندی دەجوڵاند، بەڵام من گوێم لێ نەبوو، وەک مەستێک چەند ساڵ عاشقی کچێک بووبێت و نەیتوانی بێت ڕازی خۆی بەیانبکات، ئێستا دەرفەتی بۆ گونجابێت و مەستی شەرمی شکاندبێت، بێئاگا لەوەی چ بەڵایەک سازدەکات، بە ئارەزووی خۆی کەوتبێتە قسە و وتاردان. لە کاتی قسەکردندا، زۆرجار لە نزیکەوە گوێم لێدەبوو مەلا مونزیر بە دەنگی بەرز دەیگووت «یا حافیز نفرۆمان نەکەیت... استغفرالله ... استغفرالله... خودایە نەمانخەیتە بەر

مەوجی غەزەبی خۆت». زۆرینەی مەلاکان، وەک گوێ لە چیرۆکی شێتێک بگرن، گوێیاندەگرت، زۆریان منیان بە دێوانەیەکی تەواو لە قەڵەمدا. تا من لە چیرۆکەکەی خۆمدا دەچوومە پێشێ، زۆریان پتر بە زەردەخەنەیەکی بەزەیی و بە نیگای یەکێک لە دڵەوە ڕەحمی ببزوێت، دەیانڕوانی... ڕەنگ بوو لە کۆتاییدا هەموو وەک شێتێکی شایەن بە شێتخانەیان بزانیبام، گەر لە ناکاو «مەلا ئەسعەدی مزگەوتی ئاشنایان»، وەک فێی لێهاتبێت نەیگووتبایە «ڕاستدەکات ... ڕاستدەکات ... ئەم مەلعونە ڕاستدەکات، باڵەکانی دەبینم، قەسەم بە عەرشی عەزیم دەیبینم، قەسەم بە عەرشی عەزیزم خۆیەتی، ئەم مەلعونە باڵی هەیە». مەلا ئەسعەد کوڕێکی باریک و گەنج و زۆر لاواز بوو، جووتێک چاوی گەورە و پڕ حەسرەتی هەبوو، هەر بتدیبایە دەتزانی زیرەکە و خاڵیش نییە لە هەوایەکی شێتی، بەڵام بە شێوەی سەیرکردن و تێڕوانینیدا لە من، دڵنیابووم باڵەکانم دەبینێت. کە وایگووت، لەگەڵ قسەکردندا هەستا و بەرەو ڕووم هات. هێشتا نەگەیشتبووە ئاستی من، وەک فێی لێهاتبێت پێچێکی خوارد، هەوایەکی نادیار لوولیکرد، بە جۆرێک پێشتر نەمدیبوو، ئەژنۆکانی چەمینەوە و دوای دوو لەتری خاو، بەلادا کەوت و سەری دوو مەترێک دوور لە منەوە دای بەزەویدا. لەگەڵ کەوتنیدا، لەرزێکی توندگرتی و لالێوەکانی کەفێکی زەردی عەجایەبیان دەردا، کەوتنی وەها سەیر و نابەجێ و کتوپڕ بوو، هەموو وایاندەزانی هێزێکی شەڕانگێزی غەیبی دەستی لێوەشاندوە. مەلا لەگەڵ کەوتندا لەقەفرتێیەکی توندی پێکەوت و وەک قەلەمونێکی هەر ئێستا سەربڕدراو، کەوتە تەکان و هەڵبەزین، قاچەکانی وەها توند دەجوڵاند و پای وەها لە هەوادا دەکوتی، هەموو واتێگەیشتن من دەستێکی شەیتانیم لێوەشاندوە و خەریکی ڕۆحکێشانە و هەر ئێستاکێ دەمرێت. چەندین مەلا بۆ فریای هەستان و خێرا گەیشتنە سەری و هاواری یا الله لە هەموو کونج و لایەکی هۆڵەکەوە بەرزبووەوە. بە خێراییەکی وەها چوار دەوری مەلا ئەسعەدی بێهۆشیان گرت، ئیتر من نەمدەبینی، تەنیا گوێم لە دەنگی سنگی بوو وەک ماشێنێکی شکاو خیزەی دەهات. ئاوڕمدایەوە و مەلا مونزیرم لە بەرامبەر خۆمدا بینی،

ڕیشێکی سووری عەجایەب و چڕی هەبوو، برۆکانی زەرد و پڕ، هەر یەکەش بە قەد سمێڵی سوڵتانێکی تورک درێژبوون، نیگایەکی ئاگرینی تێکرتم و گووتی «سەگ دووربکەوە لەمناوە، لەعنەتی خودات لێ بێت، اعوذ بالله من الشیطان الرجیم ». چاوانی هەڕەشەیەکی ترسناکی تێدابوو، ئیمانی کوێری پیاوێک کە بڕوای وایە لە ئەزەلەوە دەزانێت ڕاست و هەڵە چییە. بۆ ساتێک ویستم نەچمە دەرێ و لەویادا بوەستم، بەڵام وەک لە ناو ئەو هۆسە و جەنجاڵییەدا هۆشم هاتبێتەوە بەر خۆم، شتێک ڕایتەکاندم و وەستاندمی، شتێک پێشتر هەستم پێنەکردبوو، شتێک بوو وەک ئەوەی من سەر بەم جێگایە نەبم و لە ناو ئەم پیاوانەدا جێگام نەبێتەوە و دەرگایەکم دەست نەکەوێت، هیچ دەرگایەک، لێوەی پێ بنێمە ناو دونیای ئەوان. هەستمکرد هەرچییەکم کردوە چەوت و نابەجێ بووە، من بوونێکی مەحاڵ و نەناسراو بووم... شتێک دەبایە هەر بە تاریکی بمێنێتەوە. ئەوەی دەرگای ئەو بێدەنگییەم شکاند و نهێنیم ئاشکراکرد، هەڵەیەکی کوشندە بوو، چونکە ئەوەی لە تاریکییەکی قووڵەوە هاتبێت، وەها مۆرک و ڕەنگی زوڵمەت دەگرێت، دەکرێت هەر کەسە و ئەو ناوەی لێبنێت و ئەو ڕەنگەی پێ ببەخشێت کە خۆی دەیەوێت... دڵنیابووم چیتر ناوی من، بوونی من، سیفاتی من، موڵکی خۆم نین. جەهەنەم ئەوەیە کە ئەوانی تر ناوە ڕاستەقینەکەی خۆت نەزانن، من لە ناکاو، لەو ساتەدا کە مەلا ئەسعەدی مزگەوتی ئاشنایان کەوت، کە ویستی حەقیقەتی من بە مۆری ئیمانی خۆی مۆربکات، ویستی دەستی بگەێنتە باڵەکانم و ڕامکێشێت تا هەموو ببینن من باڵم هەیە و دەکرێت وەک مراوی نەخۆش لە باڵەوە بگیرێم. لەو ساتەدا بیرمکەوتەوە فریشتەم، سەر بە جێگایەکم مەحاڵە عەقڵی سادەی مرۆڤ بیگاتێ. نەفرەت و ترسێکی قووڵم لە چاوی ئامادەبوواندا دەبینی، مەهدی لە هەمووان بەدتر و شەڕانگێزتر لە منی دەڕوانی ... وەک سیحربازێکی شەڕانی بە هێزێکی شەیتانییەوە دەیانبینم. ژوورەکە وەها شڵەقا و دانیشتنەکە ترسێکی وەها باڵی بەسەردا گرت، جگە لەوەی لە پێشچاوی هەمووان، لە بەر لێشاوی نەفرەت و هەڕەشە و دەرکردندا، پاشەوپاش ژوورەکە جێبهێڵم، کاری دیم لە دەست نەهات.

ژمارەیەک مەلا بە خۆیان و جبە و چاوە ئاگرینەکانیانەوە، هەنگاو هەنگاو تا نزیکی دەرگای دەرەوە دوامکەوتن. ترسیان هەبوو بەرمبکەون، ترسیان هەبوو پەلامارم بدەن، من بۆ ئەوان بوونەوەرێکی نەناسراو بووم، ئەو دیوە تاریکەی شەیتان بووم کە خودا بە ئازادی هێشتویێتییەوە و کەس نازانێت چ دەردێکی لێوەدێت و چ ئافاتێکی لێوە دەردەچێت. لەو ساتەدا جگە لەوەی بەجێمبهێڵن، دووربکەونەوە تا لەوە زیاتر سەری سندوقی بەدئەفسونم هەڵنەدەمەوە، ڕێگایەکی تریان لە بەردەمدا نەبوو، ئەو ترسەی ئەوان تەنیا دەروازە بوو بۆم لێوەی هەڵبێم و خۆم بگەێنمەوە کەشتیی فریشتەکان. وەها پڕتاو و باڵدار بە کوچە و شەقاماندا ڕامدەکرد، دڵی شپرزەم وەک دڵی چۆلەکەی ترساو دەلەرزی.

دەمێ گەیشتمە ژوورەکەی ڕێزان، وەها پەشۆکاو و شەپرێو بووم، بێئەوەی زارم بکەمەوە و وشە لە دەمم بترازێت، ئەو کەمتەرخەم و بێئاگا، گووتی « چی بووە؟. دەڵێی بێچوە ورچیت و لە پڵنگ ڕاتکردوە؟ بۆ وا شپرزە و مەلوول دیاریت؟». بەوەدا من هیچ کات فریشتەیەکی درۆزن نەبووم و لە کاتی زۆر زۆر ناچاریدا نەبایە، درۆم نەدەکرد، پێمگووت «ڕێزان خان، فیداوبم دانیشە و گوێم لێبگرە. شتێکی خراپم کردوە، دەبێت لە نوکەوە بۆت بگێڕمەوە، بەڵام تورە مەبە و هیچم تێمەگرە و مەیقەومێنە». ئەوەی کە گووتم «لە نوکەوە بۆت دەگێڕمەوە» گوزارشتێکی خۆی بوو، هەردەم گەر شتێک ببایە، دەیگووت «وەرە دەمت داخە و لە نوکەوە بۆم بگێڕەوە». بەردەوام سەرم لەوە دەسوڕما کامیان بکەم، دەمم دابخەم یان لە نوکەوە شتەکان بگێڕمەوە.

ئەو ئێوارەیە چیرۆکەکەی خۆم و جەمعییەتی عولەمام لە نوکەوە بۆ گێڕایەوە.

کاتێک شتێک بێتاساندایە و وەها لە دڵی بگرتایە قسەی بۆ نەکرێت، مەمکە زلەکانی بە جۆرێک دەکەوتنە هەڵچوون و داچوون، وەک کەشتییەکیان لێدەهات لە شەپۆلاندا هەڵبەز و دابەزی بێت. کە من لە

هەموو شتێک بوومەوە، گووتم «تەواو، خانم گیان، ئەوە هەموو چیرۆکەکە بوو». هیچی نەگووت، هەر سەیریکردم و گووتی «هەستە برۆ دەرەوە». دەمزانی زۆر لە خۆی دەکات و دەیەوێت سەرەتا بیربکاتەوە. دڵنیابووم لە دڵەوە دەیویست ئاوەڕووتم بکات و پەڕوباڵی من و قژی خۆی پێکەوە برنێتەوە، هێندە توڕەبوو، بوغز وەها بەرچاو و بەر گەردنی گرتبوو، نە هیچی دەبینی و نە وەک بەشەر هەناسەی بۆ دەدرا. من بە بێدەنگ چوومە ژوورەکەی خۆم و لێی خەوتم. لەو شەوەوە ژیانی خانم بەتەواوی گۆڕا، تا ئەم کاتەی من لە سەر داوای ئەو ئەم یاداشتانە دەنوسم، باوەڕناکەم چۆن بوومە مایەی ئەو هەموو پەژارە و ناڕەحەتییە. ئەو شەوە سەعاتێک دوای نیوەشەو، لە سەر دەنگی گریانێکی بە کوڵ لە بەردەم دەرگای ژوورەکەمدا بە ئاگاهاتمەوە، کە چوومە دەرێ، ڕێزانم لە سەر و قژێکی بژ و دۆخێکی ڕۆحی شێواودا بینی، کە بە درێژایی ئەو هەموو ساڵەی ژیانم لە کەشتیدا، بەوجۆرە نەمبینیبوو، پێشتریش شەوان لە خەو هەڵدەستا و بە کۆشکدا دەسوڕایەوە، بەڵام نیگەرانی وەها قووڵ بگاتە ئاستی وەها گریانێکی کوڵدار و فوغانێکی لەو جۆرە دەست پێبکات، شتی وەهام لێ نەدیبوو. سەرەتا دڵم لەوە لەرزی بەڵایەک بەسەر یەکێک لە باغەوانەکانمان یان بولبولیاردا هاتبێت. بەڵام بە چاوی پڕ فرمێسکەوە سەیریکردم و گووتی «ئیتر لێمان ناگەڕێن». بە سەرسامییەوە پرسیم «کێ لێمان ناگەڕێت خانم، چی بووە؟ چی قەوماوە؟ دەخیلم ئامان قسەبکە». هەستمکرد لە ترس و لە سەرما و لە توڕەییدا دەلەرزێت. گووتی «ئیماندارەکان لێمان ناگەڕێن؟». «ئیماندارەکان کاریان بە ئێمە چییە؟ دەی ناتوانن زیانی قونچکێکیشیان بۆ ئێمە هەبێت. تاکە فریشتەیەک بتوانن ببینن منم، ئەویش بێ باڵ و بێ جوبە و جەوالّی مەلەکیانەم، ئیتر چوزانن فریشتەم، وای خانم دەڵێی ئێمە دوێنی دەستمانداوەتە کار. گەر مەترسیمان لە سەر بووایە دەمێ ساڵ بوو دەرکەوتبوو». چاوانی وەک جۆگە فرمێسکیان لێ دەهاتە دەر، ڕوخساری ژنێکی بوو شتێکی گرانبەهای لەدەستدابێت، بە قینێکی زۆرەوە سەیریکردم و گووتی «ئەمجارە جیاوازە. لەوەو پێش هیچیان نەدەزانی،

ئێستا نا... ئیتر دەستبەردار نابن. شتێک هەیە دەبێت بیزانیت، شتێکی نهێنی کە تۆ قەت بە تەواوی نەتزانیوە». دەستی گرتم و لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ ژوورێکی تایبەت کە کلیلەکەی هەمیشە بە خۆی بوو، ژوورێکی حەرام و قەدەغە نەبوو، بەڵام ئاسان و بێ ئیشیش نەدەکرا بچیتە ئەوێ، زۆر شتی نهێنی و کۆنی کەشتییەکە لەوێ هەڵگیرابوون، من تا ئەو کات چەند جارێکی تریش چووبووم، بەڵام کاتێکی وەهام نەبووبوو بزانم چی تێدایە. ڕاستییەکەی بمزانیبایە شوێنێک سەرنێشەم لەگەڵ خانمدا بۆ دروستدەکات، توخنی نەدەکەوتم، ئەم ژوورەش لەو شوێنانە بوو. هەر کات بمگووتبایە دەمەوێت بچم، خاتوون وەک سەگێک بە چڵپاودا ڕاکێشێت، سەعاتێک بە پرسیار و وەڵامدا دەیبردم و دواجاریش کلیلەکەی نەدەدامێ، لەبەرئەوە لە سەرەتاوە ژوورەکەم لە خەیاڵ دەرکرد و بایەخێکم نەدەدا بەوەی ببینم. سەیربوو بە لامەوە کە بینیم ژوورەکە هەر کارەبای تێدا نییە، بەڵام مۆمێک و شقارتەیەک لە پشت دەرگاکەوە دانرابوون تا بکرێت لە کاتی پێویستدا ڕۆشنیبکەینەوە. خانم وەها لەرزۆک و شڵەژاو بوو، ئەسڵەن دەستی گوێ نەکرد مۆمەکە دابگیرسێنێت و بەر دەرکی ژوورەکە ڕوناکبکاتەوە. من هەم مۆم و هەم شقارتەکەم گرت و گووتم «خانم بۆ خاتری گۆڕی باوکت وا لە خۆت مەکە، من دەزانم کارێکی خراپم کردوە، بەڵام کاری خراپ کە لە دەست ترازا ئیتر غەم و دڵتەنگی ناوێت. من هیچم پێناکرێت تازە ئەو هەڵەیەی خۆم چاکبکەم. ئێستا من چی بکەم، ئەوەندەیە دەزانم تاوانێک دەکەوێتە ملی من. گەر مەلا ئەسعەدی ئاشنایان بمرێت هەر وەی، نەشمرێت هەر وەی، بمرێت تا قیامەت مەلاکان بە شەیتانم دەزانن، گەر نەشمرێت موسیبەت ئەوەیە لە ناو مەلاکاندا یەکێک هەیە من بە پەڕوباڵەوە دەبینێت ... گەر ئەم مەلایەی مزگەوتی ئاشنایان نەبایە، هەر ئەمشەو دەچوومە لای مەهدی و دەمگووت کابرا چیم پێ گووتوویت لە بیرییبکە، هەمووی یارییە و کڵاو لە سەر نانێک بووە بە نیازی کەیف و خۆشی. من نە فریشتەم و نە تەڕەماش، عەبدێکی خودام و خۆم لە تۆ گۆڕیوە و داوای لێبوردن دەکەم، نەبا شتەکان ڕێوڕەوتێکی خراپ بگرن... ئا خانم گیان، بەڵام دەستم

دامێنێت خۆت وەها مەڕەنجێنە و شتەکە هێشتا وەها خراپ نییە و گەر چەند ڕۆژێک سەبربکەین، دەرووی ڕەحمەتمان لێ دەکرێتەوە». خانم بە فرمێسکەوە گووتی «دەمت داخە و ئەوەندەی تر بە چەنەبازیی ڕۆحم ئازار مەدە، خۆم کەم عەزابم نییە و تۆش بەم فڵتە بێتامەت، ئەوەندەی تر پەرێشانم مەکە ... وای بەشی خۆم پەرێشانم، بەشی خۆم و بگرە زیاتریش پەرێشانم». من بە مۆمەکەوە پێش خانم کەوتم بۆ ناو ژوورەکە و گووتم «باشە خانم، هەق بە تۆیە، لە ڕاستیدا گەر تۆ بەوجۆرە نارەحەت بیت، عەقڵی خۆم لەدەستدەدەم و وەها هەست بە شەرمدەکەم، ڕووم نەیەت لە ئاستی ئێوەدا سەربەرزبکەمەوە، خۆت دەزانیت شەرمی وەها شایستە بە مەلەکێکی بێخەتای وەک من نییە، کە ئەسڵەن نازانێت شەرم چییە». پاڵێکی بچوکی پێوەنام و چاوی سڕی، بەڵام بە دڵێکی هێشتا پڕەوە، گووتی «بێخەتا، وای، بێخەتا... دەمت داخە و چرت وپرتی خۆتم لێ کۆمەکەرەوە. لە خەتادا هەموو وەک یەک وەهاین، هەم من و هەم تۆ، هەم هەموو دونیا، چی لە سەر ئەرز و چیش لە ئاسمانە خەتامان وەکو یەکە». لە ژوورەکەدا شتێکی وەها نەبوو هەستێک بداتە من کە شوێنێکی زۆر گرنگ و گەنجینەی ڕازێکی گەورەیە، هەندێ کارتۆن، کەلوپەلی کۆن، شتگەلێکی لەکەڵک کەوتوو کە پێدەچوو شڕ و شیتاڵی داپیرە و باپیرە کۆچکردوەکانی خانم بن. بە منی گووت «مۆمەکەم بۆ بگرە و مەجولێ، من حەزناکەم ئەمجۆرە ژوورانە ڕوناکیان تێدا بێت، هەموو ماڵێک دەبێت ژوورێکی تاریکی هەبێت ... باوکم غەریقی ڕەحمەت بێت، دایمە دەیگووت خۆشی ژووری تاریک لەوەدایە هیچیشی تێدانەبێت، واهەستدەکەیت پڕە لە جڕ و جانەوەر. وای پێغەمبەری خودا، پێمگووتی ئەوەندە دەستت مەجولێنە، ڕوناکی مۆمەکە وا دەجولێت دەڵێیت بومەلەرزە داوێتی لە سەرم». ڕێزان لە ناو هەموو شتەکاندا و دوای گەڕانێک کە کاتێکی باشی برد، دوو دەفتەری کۆن و زەردی دەرهێنا و بە ئەسپایی تەکاندنی و یەکێکیانی ماچکرد و نەرم نوساندی بە سنگییەوە و گووتی با بڕۆینە دەرێ. لە دەرەوە، تۆزێک دەستی بە سەر و قژی خۆیدا هێنایەوە، جارێکی تر چاوانی سڕی و خۆی ڕاستکردەوە و

سنگی لێ هەڵقیتاند، هەستمدەکرد زۆری پێناخۆشە لەو پشێویی و سەربزێنییەدا کەس بیبینێت. وەک ژنە ئەفسەرێکی پوتبەدار، خۆی کۆکردەوە و بە هەموو گورجوگۆڵییەکەوە بەرەو ژوورەکەی خۆی پێشمکەوت. ئێستا بۆ ئەوەی ئەو سەرنجی گریان و لاوازییەی پێشتری بشارێتەوە، هەوڵیدەدا گەلێک بەهێز و توند دەربکەوێت، لە پشت مێزەکەیەوە دانیشت و چاویلکەیەکی تایبەتی دەرهێنا، کە تەنیا بۆ تەماشاکردنی شتی گرنگ و ورد دەیکردە چاوی. سەیرێکی دەفتەرە بچوک و باریک و زەردەکانی کرد. شتێک نەبوون وەها دیاربن بەو جۆرە بە نرخ و ترسناکبن، بەڵام چەشنێک ورد و هێمن لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوە، من دڵم دەلەرزی. نا، پەڕەکان ئێجگار وا هەڵوەرۆکیش نەبوون پێویست بەو هەموو وریاییە بکات، بەڵام دیاربوو ئەوەی ژێر دەستی شتێکی بەنرخە و ساڵانێکە فەرامۆشیکردوە، ئێستا وەک هەستێکی گوناھ بەرامبەری، بەو جۆرە ڕێزی لێدەنا و دەترسا نەبا لە ژێر پەنجەیدا بپروێت. دوای سەیرێکی ورد، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و سەری بەرزکردەوە و بە دەنگێک کە تەنیا بۆ کاتی گێڕانەوەی یادگاری کۆن و بیرەوەری جاران بەکاریدەهێنا، گووتی « مەهدائیل، باش گوێبگرە، ئەمشەو دەمەوێت زۆر قسەت بۆ بکەم، من ژنێکی خراپ بووم لەگەڵتدا، خۆت دەزانی دەردم زۆرە و دەرمانم کەمە، دانیشە ڕۆڵە، دانیشە». کە وایگووت، من لە مێژبوو دانیشتبووم، بەڵام وەک بۆ یەکێکی تر قسەبکات، هەر دەیگووت «دانیشە باوکم، دانیشە، بۆ دانانیشیت؟»، کەمێکی تر سەیری سەر مێزەکەی کرد و وەک دڵنیابێت هەموو شت لە جێگای خۆیەتی، دەفتەرێکیانی بەرزکردەوە و گووتی « ئەمە تاکە نوسراوی باوکی ڕەحمەتیمە، ڕەحمەت لە گۆڕی بێت. ئەمە تاکە نوسراوێتی. باوکم لەو پیاوانە نەبوو وەسێت و ئامۆژگاری و شت بۆ منداڵی جێبهێڵێت، قەناعەتی بەو شتە پڕووپووچانە نەبوو، بڵێ کچم ئاگات لێ بێت، مێردەکەت دزیت لێ نەکات، ئاگات لێ بێت ئەوەندە قەرزم لای فلانە حاجی و ئەوەندە زێڕم لای فیسار زەڕەنگەرە، یان هێندەم ماڵ لە فلانە کوچە و ئەوەندەم موڵک لە فڵان شوێن هەیە. ئەو دەیگووت، دونیا وەک نوێنی ژنی جوندە وایە، هەر شەوە

و هەوەسێک تیا دەخەوێت، چۆن و بە پێی چ تەدبیرێک قسەی ئەمڕۆی من و تەگبیری ئێستام بۆ دە ساڵی تری تۆ بخوات. بە ڕەحمەت بێت دەیگووت، عەقڵ شتێک نییە پێش دونیا بکەوێت، عەقڵ یان نییە یان دەمودەست لە شوێن و کاتی خۆیدا دەردەکەوێت. باوەڕی بە تەجروبە نەبوو. نور لە گۆڕ و مەرقەدی بارێ دەیگووت، هەر کەس گووتی من تەجروبەم لە تۆ زیاترە، جرتێکی گەورەی بۆ لێبدە. هەندێ ڕۆژ زۆر باوەڕی بە جرت بوو، هەندێ ڕۆژیش نا. دەیزانی من ناتوانم جرت لێبدەم، ماوەیەک بە ڕاستی ویستی فێرمبکات، گووتی بە جەهەنەم کچیت، گەر ژن بیت یان پیاو پێویستت بە جرت دەبێت، لەوانەیە ئەسڵەن وەک ژن زۆر زیاتر پێویستت بە جرت بێت. قەبرەکەی پڕ لە نور بێت، زۆر حەزی لە ژنێک بوو بزانێت جرت باش لێ بدات. هەندێ جار بە لاقرتێیەوە دەیگووت، کچم ڕاستت دەوێت من نە مەلەکبینم و نە هیچ، بەس جرتزانێکی باشم، ئەوە تاکە هونەرێکە ژیان فێریکردووم. دەیگووت، کەسێک نەتوانێت جرت باش لێبدات، هەموو ژیانی ناچارە گوێ لە خەڵکی گەمژە بگرێت و بێدەنگ بێت، جرت فێربە و بزانە کەی بەکاریدەهێنیت، بەوە دەبیتە شاهەنشاهی ژیانی خۆت. نا.. بە ڕەحمەت بێت، بەردەوام وا قورس و حیسابی بێئەدەب نەبوو، هەندێ جار عاقڵانەتر ڕەفتاریدەکرد، دەیگووت نا ڕێزان گیانم، کچی خۆم، تەجروبە شتێکی ئەوتۆ نییە، تەجروبە ئینسان تەنیا بە هەڵەدا دەبات. ئیدی وابوو.. باوکم هیچ ئامۆژگارییەکی وەهای بۆ جێنەهێشتووم. وەک دەبینی ژنێکی بەدبەختم دەبێت بە تەنیا لەمماڵەدا هەم کاری ژن و هەم کاری پیاو بکەم. نا باوکم پیاوی ئامۆژگاریی و ڕێنمایی و ئەو شتانە نەبوو، باوکم پیاوی زانیاریی بوو، حەزیدەکرد زانیاریی ببەخشێت نەوەک ئامۆژگاریی. ئەو کاتەی ئەم دەفتەرە نوسراوە، من لە شێتخانە بووم، من ساڵانێکی باش لە شێتخانە بووم، چەند ساڵ و چەند مانگ لەوێ مامەوە، ئەوەیانت پێ ناڵێم، ئەوە نهێنی خۆمە، ڕاستە ماوەیەکی درێژە وەکو خوشک و برا بەیەکەوە دەژین، بەڵام بە پێویستی نازانم کەسێکی وەک تۆ ئەو هەموو زانیارییە وردە لە سەر من بزانێت، ئەوەی دەزانی لە شێتخانەبووم بۆ

خۆی زۆرە. خراپترین شتێک لە سەر ئینسانێک بیزانیت ئەوەیە، بزانیت لە شێتخانە بووە ... ئیتر بەساقە لەوە زیاتر چیت دەوێت؟». لەویادا وەستا، چاوانی غەمێکی کتوپڕیان تێگەڕا، غەمێکی ڕاستەقینە بوو، لە پشت ئەو شەوقە وردانەی نیگایەوە، فریشتەیەکی تەنهام بینی کە قووڵ ئەشکەنجەی مرۆڤبوون دەکێشێت. لەویادا هەستم بە ڕاستییەکی ترسناککرد، تا ئەوکات نەهاتبووە خەیاڵم و بیرم لێ نەکردبووەوە، ئەو مرۆڤانەی دوای دەنگی فریشتەکەی ناخیان دەکەون، بەدبەختترین مرۆڤ و غەریبترین غەریبانی دونیان. من وەک فریشتەیەکی ترازاو کە تەنیا سێبەرەکەم مابوو، کە بووبووم بە ڕۆحێکی دەرکراو و بۆ ئەبەد ئاوارە، خۆشبەختتر بووم لەو کە هەم دیلی جەستە و هەم دیلی ڕۆح بوو. من تەنیا ئازاری فریشتەبوونم دەچێژت، ئەو ئازاری فریشتەبوون و ئینسان بوونیش، ژانێک مایەی ئەوەبوو حورمەتێکی زۆری لێبنێم.

دەستی خستە سەر مێزەکە و گووتی «ئەوکاتەی من لە شێتخانە بووم، باوکم ئەم زانیارییانەم بۆ بەجێدەهێڵێت، شێتخانە شتی زۆر فێرکردم، زۆر... مەهدائیل هەموو مرۆڤێکی ڕاستەقینە دواجار دەبێت بچێتە شێتخانە، دەبێت بچێت، دەبێت. لێرە دەڵێن هەموو ڕێگاکان دەچنەوە بانە، بەڵام وانییە، هەموو ڕێگاکان دەچنەوە سەر شێتخانە. تەنیا لە شێتخانەدا مرۆڤ دەتوانێت لە دونیا تێبگات، دەزانی من چەند خەفەت بۆ بولبولیار دەخۆم کە بەدبەختە شێتخانەی نەبینیوە. مرۆڤ کە شێتخانە نەبینێت بڕیاری هیچی بۆ نادرێت... دەزانم ئێستا دەڵێیت بڕیاری چی؟. مەهدائیل گیان هەموو بڕیارێک... هەموو بڕیارێک. لە سەروو هەموویانەوە ئەو بڕیارە، من بۆ ئەو کەسەبم کە یەکێکی تر دەیەوێت، بۆ وابکەم کە خەڵکی دەیانەوێت... وا سەیرم مەکە، شێتخانە جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ژیان لەم شارەدا، لەوێش دەیانەوێت بە زۆر دڵت خۆش بێت، بە زۆر بتکەن بەو کەسەی کە دەڵێیت من باشم، عەیبم نییە، لە هیچم کەم نییە، ئەوەتا نابینن تەواوی تەواوم. هەر کاتێک واتگووت ئیتر تەواو، تۆ شێت نییت، دەبیت بە عاقڵی عاقڵان، هەموو ماچتدەکەن، بەساقە، هەموو

خۆشیان دەوێیت، هیچ غەمێک لەوە گەورەتر نییە بە زۆر بەختەوەر بیت، بەو مەرجە خۆشیان دەوێیت بەختەوەر بیت. باوکم نەیدەزانی شێتخانە چییە، بەڵام دەیزانی من غەمگینم، کچێکی تەنهای غەمگینم، نە هاوڕێم هەیە و نە کەس دەبێتە هاوڕێم، جوان نیم، تەنهام، مۆتەکە و دێوەزمەی خۆمم هەیە، بەدبەختی بە ڕوخسارمەوە دیارە... بێدەنگم. وای مەهدائیل، من جاران وا زۆربڵێ نەبووم، هەندێ جار بە هەفتە دەنگم لێ نەدەهات، بە هەفتە. بەڵام ئێستا تەنیا بە قسە دەتوانم ئەوە لە بیریەمەوە کە لە ڕاستیدا بەردەوام بێدەنگم. شێتیی بەقوربان ئەوەیە قەبووڵی نەکەی بە درۆ بەختەوەر بیت. باوکم نەیدەویست بمنێرێت بۆ شێتخانە، ئەو کات تەمەنم زۆر نەبوو، بەڵام هەموو دونیا دەیگووت شێتم. باوکم بردمی بۆ هەموو دکتۆرەکان، من هیچم نەبوو جگە لەوەی غەمگین بووم، بێدەنگ بووم، تەنها بووم، نانم نەدەخوارد، شەو باش نەدەخەوتم... ئەوانە و کۆمەڵێک شتی تر، کە دەشێت هەموو مرۆڤێکی عاقڵ هەیبێت. ئا، بەساقە شتی تریشم هەبوو، وەک زۆر دەرپشامەوە، شەو هەڵدەستام و بە گریانەوە لە ژوورەکەم دەردەپەڕیمە دەرێ و هاوارمدەکرد، قیژەم دەگەیشتە عەرشی عەزیم. نەمدەزانی بۆ، ترسم لە هیچ نەبوو، هیچم نەدەویست، بانگی شتێکم نەدەکرد، هەر شتێک لە ناخمدا دەیگووت، ڕێزان هاواربکە. مەهدائیل گیان ... هەموو دکتۆرەکان گووتیان، چونکە بێ هۆ و بەهانەیەک هاواردەکات کەواتە شێتە. شێتی تەواوە، مەعنای نییە یەکێ هەر لە خۆیەوە هاواربکات، کەس بە تێڵا نەیکێشاوە بە کەفەلێدا، کەس دەرزی نەکردوە بە سمتیدا، ئیتر ئەم شیرەشیرەی لە چییە. بەڵام من شتێک لە ناخمدا بوو، شتێک ئێستاش نازانم چییە، کەسی تریش نازانێت، ئەو شتە وایدەکرد هاواربکەم ... ڕەنگە ڕاستیان گووتبێت، ئەوە شێتی بێت، شێتی تەواو، بەڵام من دەبوو هاواربکەم... هاوار بۆ هیچ، هاوار تەنیا وەک هاوار، دەمت بکەیتەوە و بقیژێنیت. بۆ من شتێکی زۆر ئاسایی بوو، وەک چۆن ئینسان هەقی هەیە ئاو بخواتەوە، دەبێت هەقیشی هەبێت هاواربکات... چەند ویستی هاواربکات، هاواربکات، بێئەوەی کەس پێیبڵێت بۆ هاوار دەکەیت. هاوار مەرج نییە بۆ ئازارێک بێت کە خۆت هەتە یان

دەتبیێت، ڕەنگە بانگکردن بێت بۆ ئازار، ئازارێک پێویستت پێیەتی و نایەت ... بە هەمووان باوکمیان ڕازیکرد کە من شێتم. گووتیان شێت چییە گەر ئەمە نەبێت، گووتیان فریای بکەوە تا نەکەوتۆتە سەرجادە و ئابڕووتی نەبردوە. باوکم هەر نەیدەویست من بنێرێت بۆ شێتخانە، زۆر شەو دەستیدەکردە ملم و دەگریا. دەیگووت «کچم دەزانم چ کەسێکی ئازا و بەهێزی. دەزانم باشترین ئینسانت لێ دەردەچێت». تێدەگەیت؟ هەمیشە دەیگووت «باشترین ئینسانت لێ دەردەچێت، ڕۆژێکیش یەکێک دێت دەتخاتە ناو کتێبێکەوە». من دەستمدەکردە ملی باوکم و تۆزێک دەگریام، نا مەهدائیل تۆزێک نەبوو، زۆر دەگریام، دەگریام، دەگریام تا وەختبوو خوێن لە چاوانم بچۆڕێت... ئینجا تۆزێک هێمن دەبوومەوە و دەمگووت «بابە. چ شێتێک هەیە من بخاتە کتێبەوە». باوەشی پیادەکردم و دەیگووت «با، تۆ نازانیت، ڕۆژێک نوسەرێکی شێت پەیدا دەبێت، لە تۆ شێتتر دەبێت، لە من، لە هەموو خەڵکی ئەم شارە، لە هەموو خەڵکی ئەم دنیایە، کتێبێکی گەورە گەورە دەنوسێت، ئەو کتێبە ناوی کەشتیی فریشتەکان دەبێت، ناوی بە ناوی ئەمماڵەوە دەبێت. ئەوە ئیتر شێتترین کەسێک دەبێت کە جارێک لە سەر ئەم ئەرزە لەدایکبووە، بەڵام زۆر باسی تۆ دەکات، هەرچی ڕۆژێک شتێکی خراپ لە سەر تۆ گووتراوە، ئەو دەیگۆڕێت، دەیخاتەوە سەر حەقیقەتی خۆی ... ڕێزانی مەلەک بین، جوانترین ژن و باشترین ژنی دونیا، ژنێک لە هەموو پیاوەکانی دونیا ئازاتر و گەورەتر». ئەوە هەمیشە دڵی خۆشدەکردم، هەمیشە، باوکم بە ڕەحمەت بێت بە ڕاستی دەیزانی دڵم خۆشبکات... مەهدائیل، من چاوەڕێی ئەو کەسەم کە بێت و ئەوە بنوسێت، نازانم ڕەنگە ئەو ڕۆژەی کە دێت من نەمابم، کێ چوزانێت ڕەنگە تۆش نەمابیت، بەڵام لەوانەیە بێت... ئەوەی چیرۆکێک چاوەڕوانی چیرۆکنوسێک بکات، ناخۆشترە لەوەی دەردێک چاوەڕوانی دەرمانێک بکات. من بیست ساڵە چاوەڕوانم ئەو کەسە بێت کە باوکم باسیکردوە... بەڵام بەساقە نەهاتووە، لە دەوری سەرت گەڕێم لەوانەیە نەشییێت، لەوانەیە هیچ کات کتێبێک چاپ نەبێت ناوی کەشتیی فریشتەکان بێت. بەڵام دەزانم ئەم حیکایەتەی ئێمە

هەر چاوەڕوان دەبێت، هەر چاوەڕوان دەبێت، هەر چاوەڕوان دەبێت تا یەکێک دێت دەینوسێتەوە».

ئەو شەوە لە شەوانی تر نەدەچوو، غەمگین بوو، کراوە بوو، گریانەکە دەرگایەکی گەورەی نێو دڵی شکاندبوو و قسەی گەمارۆدراوی دەرونی دەیانویست بێنەدەرێ. زۆر ورد گوێم بۆ گرت. جارێکی تر دەستی خستەوە سەر دەفتەرە کۆنەکان و گووتی «هیچ نییە، تەنیا زانیارییەکی گرنگە. باوکم بە ڕەحمەت بێت پیاوی ئامۆژگاری نەبوو. هەر باشتر ئامۆژگاری نەدەکرد، وای مەهدە گیان کاتێک ئامۆژگاریدەکرد، خەڵکی گوێیان لێیبایە لە پێکەنیندا دەمردن. بە ڕەحمەت بێت لە شتی خراپ زیاتر هیچی فێرنەدەکردیت» ئینجا دەنگی هێمنکردەوە و گووتی «بەڵام ئازیزی دڵ، مەهەکەی خۆم، بەساقە، ئەم دوو دەفتەرە زۆر گرنگن... تێدەگەیت. تۆ ئیشێکی باشت نەکردوە، بەڕاستیمە، مەهە گیان بەو کارە پڕوپوچ و کەرانەیەی ئەمڕۆت هیچ ئیشێکی باشت نەکردوە، باپێت بڵێم، ئێستا ژیانی هەموومان لە خەتەردایە، هەتا ئەو بولبولیارە قوڕبەسەرەش ئیتر لە ئەمن و ئوماندا نییە. تێدەگەیت بەقوربان، تێدەگەیت، ژیانی هەموومان، لە دەوری باڵات گەڕێم، ئیتر تەواو... بەڵگەشم بۆ قسەکانم ئەم دوو دەفتەرەیە، بەڵام دەخیلم، ئامان و هەزار ئامان نەهێڵیت بولبولیار بزانێت، چونکە ئیتر خەو و خۆراک لە خۆی حەرامدەکات و دەبێتە ئیشکگری دار و دیواری ئەم کەشتییە. دەیناسم، وادەکات، با لەوە زیاتر نەکەوێتە بەر ئازار و مەینەتییەوە ... وای چ کوڕێکی غەمخۆرە کە ئەگەر خودا دڵی بە من بسووتابا، وەک هەموو ژنانی دونیا، کوڕێکی لەوجۆرەی دەدامێ».

من بەردەوام سەیری دەفتەرەکانی ژێر دەستیم دەکرد و دواجار پرسیم «ئەو دەفتەرانە چیین؟». گووتی «ئەگەر قسە نەکەیت و پێم نەبڕیت، پێت دەڵێم چیین. کە دەڵێم پێم مەبڕە مەبەستم ئەوە نییە بە چەنەحەڵی بپەڕێیتە ناو قسەکانمەوە، مەبەستم ئەوەیە بە چاویش، بە دەستیش، بە هیچ شتێک پێم مەبڕە، بەساقە». تەواو خۆم کۆکردەوە و هەموو لەشم لە

جوڵە خست و بوومە پارچەیەک گوێی ئامادە. کە زانی لە ئامادەباشی تەواودام بۆ بیستنی چیرۆکەکەی، بە هێمنی دەستی پێکرد «وەک گوتم، مەهدائیل گیان، ئەوەی لێرەدا نوسراوە، دەمێک ڕوویداوە کە من لە شێتخانە بووم، من شاهیدی هیچ یەکێک لەو ڕۆژانە نیم. سەردەمێک باوکم و حاجیئیل و ئەلیائیل پێکەوە لەم کۆشکەدا دەژیان. خۆت دەزانی من سەرەتا خۆشم لە حاجیئیل نەدەهات، ئەسڵەن حەزم لێ نەبوو ببینم. نە بینینی، نە بۆنی، نە قیافەی، هۆکەی ئەوە بوو زۆر لە باوکم دەچوو، باوکێک خۆی ناسک و عاقڵکردبێت. سوێند بە عەرشی عەزیم، ئێستاش حەزم لەو ئەخلاقەی فریشتەکان نییە ئاوها ناسک و شکاو دەردەکەون دەڵێی شوشەی بلوری چران و درزیان تێکەوتووە. فریشتەیت یان فریشتە نیت بە جەهەنەم، هەر چییەکیت دەبێت تۆزێک تۆکمە و بەکار بیت. حاجیئیلیش هەر باوکم بوو، ئەی چۆن فریشتەی باوکم یەعنی باوکم، بەڵام لەبری ئەوەی لە باوکە قایم و توندوتۆڵەکەی خۆم بچێت، لەوە دەچوو یەکێک باوکمی گرتبێت و بردبێتی بۆ حەمامێکی تورکی و هەیبەت و جەبەروتی لێ داماڵی بێت و بە تەنافدا هەڵیواسیبێت تا ساف و سپی وشکدەبێتەوە و دوایی گووتبێتی، فەرموو ئێستا لە حاجی تەواو دەچیت، هەر وەک لەقلەقە بێ لاق و بێ دەنوکەکەی مەلای مەشهور. ڕقی من لە حاجیئیل ئەوە بوو کە لە ڕاستیدا باوکمم وەک خۆی دەویست، نەوەک فریشتە. ئاخر حەوت برا، من باوکمم دەویست، باوک بە هەموو شتێکییەوە، بە باشی و خراپییەوە. فریشتە نابێتە باوک. لەو دەمەدا کە هێشتا سەرەتایە و فریشتەی تر زۆر دەرنەکەوتوون، شەوێک باوکم و حاجیئیل بۆ گەڕان بە شار و دەوروبەریدا دەچنە گەشت. لە کاتێکدا دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ ماڵ، لە کۆڵانێکی نزیک مزگەوتی کاک ئەحمەدەوە، تاپۆ بە دەستێکیان لێ پەیدا دەبێت، کە دیارە ماوەیەکە خستوونییە ژێر چاوان، لێیان دەخوڕێت «حاجی، حاجی ... خۆت و شەیتانە باڵدارەکەت بوەستن، لە شوێنی خۆت حەرەکە نەکەی، قەسەم بە ئەولیا بجوڵێیتەوە نابووتتدەکەم ». باوکم پێشتر کەسی وای نەدیوە، دێتە نزیک و دەڵێت « ناوم سمایلی مەلەککوژە، کافری مەلعون، خودام

خودایە قامکێک بجولێنێت و لە جێگای خۆت نەسەکنێیت. جولە و مردنت یەک شتە و حسابیشت لای خوا لە گەردنی خۆتە» ... دوایی خەدەم و حەشەمی دەوری باوکم دەیانگووت، سوبحانەڵا ئەو کابرایە زۆر لە حاجی خۆی چووە، بەڵام مەرحوم لەم دەفتەرەدا ئاماژەیەکی بەوە نەداوە. ئیتر لەو چوو بێت یان لەو نەچوو بێت کەی شتێکی وەها گرنگە. ناوی مەلەککوژ خەڵک پێیانداوە، خۆی بۆ باوکمی ڕووندەکاتەوە کە ئەویش تووشی ئەو دەردە بووە، وەک ئەو باڵی دەرداوە، واهیمە چۆتە سەری گوایە خاوەن مەلەکە، بەڵام دانەنیشتووە عەقڵی خۆی بکاتە مەحەک، پرسی مەلای کردوە، لە مەککە و مەدینەوە تا نەجەف و کەربەلا تا ئەزهەری شەریف، دوای ئەسڵی ئەم مەخلوقە کەوتووە، هەموو عولەما و مەراجیع لە مەشریقی زەوی تا مەغریبی، کۆکبوون شتی وەها نییە، گەر هەشبێت، ئەوا بێ قسە و بێ ئەمسەر و ئەوسەر لە جنسی جنۆکەی بەد و لە خزمەتکارانی شەیتانە... هەر شەیتانێکی سادە نییە، بەڵکو لە ئیبلیس خۆی پیس و پەلید و بێناموسترە، چونکە دەچێتە ناو بەشەر و دێتەدەرێ. ئینجا ئەوە بۆ حاجی باوکم ڕووندەکاتەوە کە ئەم بۆ ڕزگارکردنی دین و دونیا لە دەستی ئەو هۆردوی شەیتانە، کە خودا نیعمەتی بینینیانی تایبەت بە کەمایەسییەکی بچوک بەخشیوە، بڕیاریداوە ببێتە مەلەککوژ ... هەموو شتێک خێرا و بە ڕستەی کورت دەگێڕێتەوە، هەموو وەختەکەش تفەنگی لە سەر پێیە و زامنی هەڵگیراوە و لوولەی ڕووی لە مەرحوم و مەلەکە بەستەزمانەکەیەتی کە دەڵێن بێباک وەک ئەوەی شتەکان پەیوەندیان بەوەوە نەبێت، وەستاوە و بێغەم گوێیگرتووە، وەک ئەوەی چ دەگووترێت و چ ناگووترێت کاری بەوەوە نەبێت. باوکم کە پیاوێکی خۆشدوو بوو، بە قسە و پرسیاری زۆر سمایلی مەلەککوژ غافڵدەکات، پێیدەڵێت بەساقە کە وایە تۆ بۆ ناڕەحەتی، بۆ تفەنگت خستۆتە سەر پێ، چۆن لەجیاتی ڕێنمایی و هیدایەت، تفەنگ لە برای دینی خۆت بەرزدەکەیەوە، کە وایە عەزیزی دڵم بۆ زوو دەرنەکەوتی، گەر من دڵنیابم ئەمە شەیتانە، خۆ ئیمانی خۆم ناکەمە قوربانی، خودای خۆمم لە هەر کەسێکی تر خۆشتر دەوێت، هەر خۆم لەم حەیوانە عەجایەبە

دوودڵ بووم و نەمدەزانی چ جنس و چ جانەوەرێکە، بۆ ئەوەی تووشی گوناهـ نەبم، هیچم لێ نەکردوە و نانم داوەتێ، بەڵام هەر بەدوای چاوساغێکی وەک تۆدا گەڕاوم لێزان بێت تا بەرەو ڕێگای ڕاست ئیرشادمبکات، ئێستا کە هاتوویت و دڵنیام وەک من ئەم مەخلوقە دەبینی، ئامان سەد ئامان، با خودا لە گوناهم خۆشبێت و لە هەقی هەڵە و ئیشتیباهی خۆمدا نەمخاتە بەر سزای قورس، دەستم دامێنت و چاکەیە لەگەڵ عەبدێکی کڵۆڵدا بکە، با ئەو پەڵەیە لە ئیمانی خۆم بسڕمەوە، تفەنگەکەتم بدەرێ خۆم دەیکوژم و لە گوناهی پێشووم گەر کەمێکیش بووە، ویژدانم ئاسوودەدەکەم، تا ماوم دەروێشت دەبم و لە سەر چ دینێک بیت دێمە سەر دینت، گەرچی وەک دەڵێن گوناهـ باری سووکدەکرێ، بەڵام جێ و شوێنی لای خودا ناسڕێتەوە. بەڵێ مەهدائیل گیان بەساقە، مەلەککوژ تا خودا حەزبکات سەرسەخت و بێڕەحم بووە، بەڵام باوکم بە قسە دەیهێنێت و دەیبات، ئەوەندە ئامان ئامان دەکات و دەخیلی دەبێت تا تفەنگەکەی لە دەست دەگرێت. هێندەی تفەنگەکە دەکەوێتە دەست باوکم، شتەکان دەگۆڕێن و یارییەکە وەردەگەڕێت، بابم کابرا بە چۆکدا دەهێنێت و پێیدەڵێت کوڕی سەگ، شەیتان ئەم هاوڕێ بەدبەخت و بێوەیەی من نییە، شەیتان سەگێکی وەک تۆیە کە بە تفەنگەوە پەڕیوێتە سەر ڕێگا و بانان و بە ناوی خودای تەبارەک وە تەعالاوە خەڵک دەکوژێت، بەڵام وەک باوکم نوسیوێتی، مەلەککوژ هەر نایەتە بار و لە ژێر لوولەی تفەنگیشدا دەست لە فەحش و نەڕین بەرنادات و غەمی ئەوەی بە قسە فریوی خواردوە، هێندەی تر بەلەسەیدەکات، هەڕەشەدەکات و دەڵێت، درەنگ یان زوو مەلەککوژەکان دونیا پڕدەکەن و دەبنە پێشەنگی ئیمان و زەوی لە پەڕ و باڵی ئەم جنۆکانە پاکدەکەنەوە. باوکم بە زەبری تفەنگ و بۆ ئەوەی نەیکوژێت، هەڵیدەستێنێت و قەسەم دەخوات گەر بەرۆکیان بەرنەدات خراپی بەسەر دێنێت و دونیای ڕۆشنی لێ تاریکدەکات».

من لە جێگای خۆم هەر گوێمدەگرت، نەمدەویرا شتێک بکەم و بڵێم نەبا تورە بێت و بڵێ «دەبینیت تۆ ناهێڵیت چیرۆکەکەشت بە ڕاستی بۆ بگێڕمەوە». هەتا سەریشم نەدەلەقاند، ئەو وەک حیکایەت بۆ خۆی بکات بەردەوامبوو، هەڵدەستا، دادەنیشت، دەڕۆیشت، سەیری بنمیچەکەی دەکرد، پەردەکەی پشت خۆی لادەدا و سەیری شەوی دەکرد، هەموو ئازادییەکی دابووە خۆی، بەڵام گرنگ نەبوو، من دەمویست زۆرتر بزانم، فریشتەکانی تر کە دەگەیشتنە کەشتیی فریشتەکان ئارەزووی فێربوونیان مردبوو، بەڵام من هەستەوەرەکانم تیژ و نیازم بە زانین هێشتا گەورەبوو.

«مەهدەکە، بەساقە، ئەو ڕۆژە باوکم ڕزگاری دەبێت، خۆی و تاپڕی کابرا دەگەڕێنەوە ماڵ و شەو دەخەون، بەڵام بابم کەسێک نییە هەڕەشە و گورەشەی وەها لە خەیاڵ نەگرێت، خۆی دەزانێت جارێکی تر و لە ڕێکەوتێکی تری وەهادا، ئیتر دەم بەفریای ناگات و لە داوی مەلەککوژ دەربازی نابێت. بۆیە دڵنیایە درەنگ و زوو کابرا دێتەوە بەر ماڵی و بەرۆکی بەرنادات. بۆ دوو ڕۆژ دواتر، بەیانی کە بابم لە خەو هەڵدەستێت، لە بەردەم دەرگای ئەم کەشتییەدا سمایلی مەلەککوژ دەبینێت، دیسان بەخۆی و تفەنگێکەوە بەردەرگای پێگرتوون. یەکەم شت باوکم حاجیئیل و ئەلیائیلی فریشتە لە جێگایەکی نهێنی و قایمدا دەشارێتەوە تا دەستی ئەم مەلەککوژەیان نەگاتێ، کە دیارە ناونیشانی بابمی لە دەمی حاجی و مەلای شار وەرگرتووە. بابم دەمودەست فەرماندەدات کەس دەرگای لێ نەکاتەوە و جگە لە تاپڕی گیراوی مەلەککوژ، خۆشی برنەوە کۆنێکی دەبێت، ئەویش دەردەهێنێت و لەو میوانە زۆرداره دەچێتە سەنگەرەوە، ئەویش بێنەوەی گوێبداتە حاکم و حکومەتێک، فیشەکلەقی لەخۆی بەستووە و لە گوللە و عەتادا بریقەی دێت. وەک دەڵێن، لە بەیانییەوە تا دەمێک خۆر ئاودیوی کێوان بووە، لە نێوان حاجی سمایلی مەلەککوژ و حاجی سمایلی مەلەکبیندا شەڕە گوللە بووە، فیشەک بەرامبەر بە فیشەک. لەو تەقەیەک لەم تەقەیەک، بێنەوەی دەوڵەت کەم و زۆر خۆی لەو شەڕە گوللە و هەرایە هەڵقورتێنێت. وەک دەڵێن، باوکم جێگای قایمتر

و سەنگەری مەحکەمتر بووە، چەندجار توانیویێتی بیکوژێت، بەڵام دەستی پاراستوە و هەر ویستوێتی بەر دەرکی بەردات و وازی لێبهێنێت، بەڵام بەر لەوەی تاریک دابێت، سمایلی مەلەککوژ کە ئیمان کوێریکردوە، دەکەوێتە تەقەکردن لە دار و دیوار و دەرگاکە دەشکێنێت، دەیەوێت بەر لە کەوتنی تاریکی، هەڵبکات بە ژووردا و کاری خۆی تەواوبکات. ئیدی باوکی ڕەحمەتیم بۆ یەکەمجار دەیپێکێت، بە فیشەکێکی برنەو لە لای ڕاستی دەدات و دەفەی شانی بۆ هەڵدەتەکێنێت. مەلەککوژ لەویادا خەڵتانی خوێن دەبێت و بێهۆش لە بەر قاپی کەشتیدا لاردەبێتەوە. بۆ ئەوەی نەمرێت، هەر بابی سەر و دڵ پڕ میهرم، هەڵیدەگرێت و دەیهێنێتە ناو کەشتیی و بە پەلە و بێ وەستان دوو دکتۆری دێنێتە سەر، ئەوانیش کەمێک بە هیمەت و زۆرێک بە قیمەت دەیگوازنەوە بۆ بیمارستان و لە مەرگ قوتاریدەکەن. دەمێک مەلەککوژ هەڵدەستێتەوە، باوکم بۆ ئەوەی ئەلیائیل و حاجیئیل لە شەڕی لابدات، هەردووکیان بۆ چەند مانگێک لە حەشارێکدا لە دەرەوەی شار قایمدەکات. تا ئەویش هەڵدەستێتەوە و زامی سارێژ دەبێت، شەوانە خۆی دەبێتە ئێشکگر و تیمارپێچی و ناهێڵێت شەو و ڕۆژ خزمەتی باشی لێ ببرێت. نازانم بۆچی وایە مەهدائیل، مرۆڤی دڕندە و دڵڕەق هەمیشە لە کاتی بیماریدا زۆرتر قسەدەکەن... زۆرتر شت ئاشکرادەکەن. لەو شەوانەدا مەلەککوژ بە باوکم دەڵێت، چۆن جنسێک هەیە پێیان دەگووترێت مەلەکبین، جنسێکیش هەیە پێیان دەگووترێت مەلەککوژ، لە ناو هەموو مرۆڤێکدا مەلەکبینیش و مەلەککوژیش هەیە، هەڵبەت مەهدی گیان بەساقەی سەرت بم، ئەوە منم پێتان دەڵێم مەلەک، ئەو شتێکی تری پێ گووتوون، شتێکی وەک ئیبلیس، شەیتان، یان هەر شتێکی تر. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە، حاجی سمایلی مەلەککوژ بە باوکم دەڵێت بەشەر خۆیان مەلەککوژن نەوەک مەلەکبین بن. ئیتر ئەو خەیاڵە لە سەرت دەربکە ڕزگارت بێت. مەلەککوشتن واجیبی ئیمانە و درەنگ و زوو خەڵک هەموو لە ڕووی عەقیدەوە هوشیار دەبنەوە و هەر کەسێک لەو بەرگەدا بێت، لەم ڕووی زەوییە پاکیدەکەنەوە. مەلەک و مرۆڤ، خودا لە یەکی جیاکردونەتەوە و هەر هەوڵێک بۆ موتوربەکردنیان،

جانەوەرێکی شەیتانی دروستدەکات کە خیلافی یاسای ئاسمانە. باوکم دەکەوێتە قسەوە لەگەڵیدا و پێی دەڵێت بەشەر دەبێت گوێ لە ناخی خۆی بگرێت، ئەویش دەڵێت «حاجی ناخی ئینسان گووشی تێدا نییە، تا دەمریت هەر گوێی لێبگرە، بزانە گوێت لە هیچ دەبێت. بەشەر دەبێت گوێ لە خودای خۆی بگرێ، ئەوە تەنیا دەنگە لەم ئەرز و ئاسمانەدا بە ڕاستی قسە لەگەڵ من و تۆدا دەکات، ناخی چی و تەرسەقوولی چی». بەوجۆرە ناگەنە هیچ و لە شوێنێکدا قسەی نێوانیان کۆتایی دێت ... بە کورتی سەرت نەێشێنم، حاجی سمایلی مەلەککوژ، پاش دوو سێ مانگ، بە هۆی خواردنی گیای ژەهراوییەوە، ڕۆح تەسلیمدەکات و فریشتەکان دەگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆمان و باوکم غەریقی نور بێت، وەک گوڵ خزمەتیاندەکات و زەمینە بۆ دروستکردن و گەورەکردنی ئەم کەشتییە دادەڕێژێت. دواتر باوکم هەموو چیرۆکەکەی لێرەدا تۆمارکردوە و نوسیوێتی، بە قسەی ئەو، ڕۆحم قوربانی ڕۆحیانەتە پاکەکەی بێت، ڕۆژێک لە ڕۆژان جۆرێک لە مەلەککوژ سەر هەڵدەدەن کە دەتوانن مەلەک ببینن، بەڵام ناتوانن خۆیان لەو وەسوەسەیە ڕزگاربکەن کە نەیانکوژن، بەوەدا مەهدائیل گیان فریشتەی ڕاستەقینە هیچ کات ناتوانێت بیسەلمێنێت کە فریشتەیە، لێرەوە ئێوە ناتوانن بگەڕێنەوە ناو بەشەر... دەزانی هۆکەشی چییە... من زۆر بیرم لێکردۆتەوە، بەساقە یەک شتی بچوک و ئاساییە، ئەویش ئەوەیە ئینسان پەیوەندی بە دوو جێگاوە نەماوە، یەک دڵی خۆی، دوو ئاسمان. هەر دەنگێک لەم دوو جێگایەوە بێت، مرۆڤ ناویدەنێت دەنگی شەیتان. عەزیزم، من ئەو ڕۆژە دەبینم کە حاجی سمایلی مەلەککوژ باسیکردوە، ئەوە ڕۆژێکە خەڵکێک لە دایکدەبن دینیان هەموو لە بەرە، هەموو فەرزەکان جێبەجێدەکەن، بەڵام خودایان لە بیرکردوە ... بە هەموو دەنگێکی تر دەڵێن دەنگی شەیتان. من گەر سەرنجت دابێت دوو ساڵە کە ڕۆژی هەینی دێتە پێش، کاتێک دەگاتە دەمی بانگ و سەڵای نیوەڕۆ، دەچمە سەربان و گوێ لە مەلاکان دەگرم، ئەی بەساقە خۆ تۆ ئاگات لێیە، هەروام نەکردوە؟ جوان گوێیان لێدەگرم، هەر کە قسەدەکەن دەزانم بۆ شتێک دەگەڕێن ورد و خاشی بکەن... هەر

کات هەندێک کەس کەوتنە پشکنینی دڵی خەڵک بەدوای کافر و ئیمانداردا، ئیتر تەواو، دەست لە دونیا بشۆ. دوای ئەوە هیچ کەس نازانێت کێ کافرە و کێ ئیماندار. ئێستا تێدەگەی بۆ گریام... تێدەگەیت ... لە کاتێکی وا ترسناکدا تۆ دەچیت و هەرچی نهێنییەکی گەورەمانە ئاشکرایدەکەیت. دەزانم، من تۆ بناسم ئێستا دەڵێیت، دەی هەموو نهێنییەک بۆ ئەوەیە دواجار ئاشکرا بێت. لەوەدا لە سەر هەقی، بەڵام نازانم بۆ هەستدەکەم کە ئەوە دەرهەق بەم چیرۆکەی ئێمە ڕاست نییە. فریشتە شتێکی نهێنییە، دووردەستە و دەبێت هەروا بمێنێتەوە، باشترە مرۆڤ نەزانێت فریشتەی هەیە و بۆی بگەڕێت، لەوەی بزانێت هەیەتی و تێینەگات و نەیناسێتەوە و بە شەیتان حیسابی بکات ... نا مەهدائیل گیان، ڕەنگە من قەت پێم نەگووتبیت بۆ ئەم کارەدەکەم، ڕەنگە وابزانیت ئیشەکەم بە ئیرس لە حاجی باوکمەوە بۆ ماوەتەوە. وانییە، دڵنیابە عەزیزم وانییە». من لە ناکاو لە دەمم دەرچوو و گووتم «ئەی چییە، ئەی چۆنە؟». بە بەزەییەوە سەیریکردم و گووتی «جوان دانیشە، ڕاحەت بە، چیتە دەڵێی حیمایەی پاشای، بۆ وا خۆت ڕەقکردوە، میزت دێت؟ گەر میزت دێت برۆ بیکە». کەمێک خۆم چاککرد و گووتم «نا ڕێزان خان، هەر ویستم شتێک نەکەم تۆ ناڕەحەت بیت». «من گووتم پێم مەبڕە، نەمگووت وەک هێستری قاچاغچی خۆت بجەڕێنە. ڕاحەت بە باوکەکەم، خۆت شلکەرەوە». وەک قسەکانی خۆی بیرچووبێتەوە، تۆزێکی تر وەستا و گووتی «لەبەر ئەوە نییە وابزانم ئینسان شتێکی خراپە و ئێوە دیوە باشەکەی ئێمەن... دەزانیت ئەوە قسەیەکی نابەجێیە. سەدجار ئەو قسەیەم بەو بولبولیارە بەدبەختە گووتووە، ئەوەندەم گووتووە ئێستا وەک ئاو و دۆ لە بەرێتی. ئەو قسەیە کە ئێوە پاکن و ئێمە پیسین قسەی نەفامەکانە یان شاعیرەکان یان هەر نەفامێکی تر کە نازانم ئیشی چییە. بە خاتری ئەوەی ئێمە چەپەڵ و چڵکاوین، ئێوەش پاکییە لەدەستچووەکەی ئێمەن، ئەم بەزمە ناکەم. نەوەڵا بەساقە، لەبەرئەوە خۆم ناخەمە ژێر باری وەهاوە. پێش ئەوەی باوکم بچێتە دیاری هەقی خۆی، شەوێک دایانم و ویستی قسەم بۆ بکات. لە نزیکی خۆی دایانم و

نیازی بوو بڵێ کچم، ئەم جێگایەت بۆ جێدەهێڵم و وەسیێتم ئەوەیە بیپارێزیت و ڕووو لە فریشتەکان هەڵ نەکەیت و خۆت بە پشت و پەنایان بزانە. هێشتا قسەکە هەر لە سەری زبانیدا بوو، گووتم بابە گیان خەمت نەبێت، چونکە گەر بۆ تۆبایە نەمدەکرد، خۆم پێویستیم بە شتێکە ئەو هەستەم بداتێ کە ژیانێکی ترم هەیە، نیگەران مەبە و خۆت تووشی پرس و دوودڵی مەکە. ئەی چۆن بەساقە، ئێوە ژیانەکەی تری منن». خەندەیەکی جوان و دەگمەن کەوتە سەر لێوی و گووتی «با پێت بڵێم، لە دوای شێتخانەوە بوومە کەسێکی تر، لە دوای شێتخانەوە ئینسان وەک دوو بەش دەبینم، بەشێک خەریکی ژیانی ڕۆژانەی خۆیانن. ژیانی ڕۆژانە بە هەموو قانون و یاسا و عورفێکییەوە، لەگەڵ بەشێکدا ناچنە ئەم ژیانەوە یان کەمتر بۆیان گرنگە و بایەخی پێدەدەن. لە شێتخانە کەسمان بە کەڵکی ژیانی ڕۆژانە نەدەهاتین، ئێستا وای لێهاتووە کەسێک بە کەڵکی ژیانی ڕۆژانە نەیەت، دەڵێن ئیتر بە کەڵکی هەموو ژیان نایەت، بەڵام عەزیزم، منیش و هەموو شێتەکانیش لە شێتخانە یەک شتمان دەزانی، هیچمان نەزانیبێت ئەوەمان زانیوە کە هەموو جوانی ژیان لە بەشە بێکەڵکەکەیدایە، وای بەساقە، بەخودا بەس ئەو ڕۆژانەم خۆشبوو کە شێتبووم، ئێستا لەو مەکتەبە پیس و چەپەڵەدا، جگە لەوەی فێری ملهوڕی بووم و منداڵەکان فێری ملهوڕی دەکەم، چیم بۆ دەکرێت. دەوام، دەوام، دەوام ... بێزاربووم. ئەگەر بمتوانیایە لەم شارەدا جێگای ئێوە بکەمەوە، لەم دونیایەدا، بۆ لێرەدا بەگیرم دەمێنان؟ هەموو بەدبەختییەکە ئەوەیە ئێمە لە لیتە و چڵپاوی ژیانی ڕۆژانەدا چەقیوین، ئەوەیە یان شێتیت و فەرموو ئەوە دەرگای شێتخانە، یان وەک ئەو خەڵکە مل بۆ هەموو شتێک دەدەیت. بەساقە کە من خزمەتی ئێوە دەکەم، ئەوە هێزێکە دەیدەمە قاچی خۆم تا بتوانم و بمکرێت لەم دونیایە ڕابکەم، ڕابکەم تادەتوانم. لەوە زیاتر نییە، دڵنیابە لەوە زیاتر نییە. بەڵام ڕۆژێک ئەم ژیانەی ئێوەم نەمێنێت، ئەو ژیانەی تریشم نامێنێت. ئەوەی بەرگەی ژیانی ڕۆژانە دەگرم، بۆ ئەوەیە ئەم ژیانەی ئێوە بپارێزم».

تۆزێک وەستا، هەستا، چووە دەرێ، بە دۆلکەیەک ئاوەوە گەڕایەوە، دوو پەرداخی پێ بوو، ئاوی بۆ هەردووکمان تێکرد، بێئەوەی بپرسێت دەخۆیتەوە، ئاوەکەی لە پێشدەممدا دانا و خۆی گەڕایەوە پشتی مێزەکە و پەرداخێک ئاوی نۆشکرد، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، سەر تا خوار دەستێکی بە قژ و سنگ و تەنوورەکەیەدا هێنا و نیگایەکی شازنانەی گرتە بنمیچەکە و گووتی «گەر ئەمڕۆ لە جەمعییەتی عولەما، ئەو بەزمەت نەکردبایە، بچووبایتایەتە سەرچۆک، سەرت دانەواندایە، ملت وەها کوڕ بکردایە کەس چاوانت نەبینێت و بتگووتبایە مامۆستایان عەفوومبکەن، بتگووتبایە من سەر لێشێواوم، من ڕێگای ڕاستم ونکردوە، من نازانم چیم، گوناهبارم و لە ئێوە زیاتر کەس شک نابەم کۆمەکم پێ بکات، دڵنیابە هیچ نەدەبوو، ڕۆژێکی خۆشدەبوو بۆ تۆ و بۆ ئەوان... بەڵام تازە تەواو. باشتر وات نەکرد، وەک چوویت چاکتر بەوجۆرە زەلیلانەیە نەهاتیتە دەرێ. گەر کاری وات بکردبایە، نەمدەهێشت لەم کەشتییەدا ڕۆژ بکەیتەوە، حەزم لە ملهوڕی نییە، بە جەهەنەم مەلای مزگەوتی ئاشنایان چ دەردێکی بەسەر دێت، کێ چوزانێت، ڕەنگە فتقی بووبێت، ڕیخۆڵە کوێرە، پەرکەم یان هەر نەخۆشییەکی تر، هیچ عاقڵێک ناتوانێت ئەوە بەسەر تۆدا بهێنێت».

بێئەوەی سەیرمبکات قسەیدەکرد. دوایی ئێستێکیکرد و گووتی «مەهدائیل. من چەندین ساڵە دەمەوێت پەیوەندی بکەم بە فریشتەکەی خۆمەوە لە ناخمدا، بەڵام ناتوانم. هەستدەکەم مەلا سمایلی مەلەککوژ ڕاستیکردوە، ناو ناخمان هیچی تێدا نییە. یان ئەوەی لە ئەسڵدا لەم دونیایە هەڵدێت، پێویستی بە فریشتە نییە. ئێوە لە ڕۆحماندا نین، لە جەستەماندا نین، تەنیا تارماییەکن لە خەیاڵماندا، کە دەترازێن لە خەیاڵمان دەترازێن، هەموو ئەو شتە دووروودرێژەی بە دەرکەوتنی باڵ دەستپێدەکات و بە ترازان کۆتایی دێت، هەمووی لە خەیاڵدا ڕوودەدات... ئەوەی کە ئەمڕۆ مەلاکان بینیان تۆ نەبوویت، تێدەگەیت، خەیاڵەکانی ئێمە بوو، خەیاڵەکانی من، خەیاڵەکانی بولبولیار، خەیاڵی هەموو

مەلەکبینەکان بوو. ئێستا دەزانی بۆ دەترسم، چونکە نەدەبوو کەس ئەوە ببینێت، ئەوان لەوە ناترسن تۆ مەلەکی خودا یان شەیتان بیت، بەڵکو دەپرسن تۆ لە چ سەرێکەوە هاتوویتە دەرێ، کێ باوەڕی پێ هێناویت، کێ ڕێگات پێدەدات بژیت. بەشی هەرە زۆری ئەو مرۆڤانەی دەکوژرێن، خەیاڵیان دەیانکوژێت. ئەو جۆرە کەسانەی تۆ ئەمڕۆ بینیوتن، تەفتیشی خەیاڵ دەکەن، هەر خەیاڵێکی خراپ ببینن، دەڵێن بیکوژە. لە یەک کاتیشدا دەتوانن تەواو دڵنیابن کە خەیاڵەکەیان کوشتووە، کاتێک فیشەکێک بنێن بە سەرەتەوە... بەساقە، من دەزانم، من خەڵکی ئەم شارەم، دەیانناسم، لە سەر پێن بۆ ئەوەی گوللە بنێن بە هەموو سەرێکەوە تا خەیاڵەکەی بکوژن. بەڵام مەهدە گیان، برای خۆم، خەیاڵ تا ئەو ڕۆژە خەیاڵە کە باوەڕی پێدەهێنین، کە باوەڕمان پێهێنا، ئیتر دەبێت بە خراپترین جۆری ڕاستی، کێشەکە ئەوەیە ئێمەش باوەڕمان بە ئێوە هێناوە. وای مەهدائیل، ئێوە بۆ وان، توخنی هەر کەسێک دەکەون، تووشی نەخۆشی غەریبی دەکەن. ئەی چی... گەر وانییە بۆ بە تەنیا ئەوانەی لەم دونیایە دەرکراون یان ڕادەکەن دەتانبینن. سەیرکە دەستەودایەرەی ئێوە کێن؟ من، بولبولیار، دکتۆر شوکاک، مەلەکبینەکان، کەسمان بە ڕاستی لەم دونیایەدا ناژین. وەک دز بۆ تیکە نانەکەمان دەچینە دەرەوە و دەگەڕێینەوە ماڵ، لەوە زیاتر شتێک بەم شارەوە نامانبەستێتەوە. لەوەتەی لەدایکبووم لەم شارەدا وەک پەنابەر دەژیم، شوکاکیش ئەوەتەی ئەو ژنە بێناموسەی ئەو داغەی ناوە بە جەرگیدا، قاچی لە ئەرز براوە، خۆشی نازانێت لە کوێیە، ئەوە بۆ بولبولیار هەر هیچ مەڵێ، کوڕە بەستەزمانەکە بەخۆی دەڵێت شۆڕشگێڕێکی گەردونی و نازانم چی، بەڵام ڕاستیت دەوێت لەو کەسانەیە، نەخودا نە تۆمەت نە شەیتان بۆ ڕۆژێکیش لە ماڵی خۆیاندا ڕاینەگرن. هەر مەلەکبینێکی تریشم بینیبێت هەر وابووە... هیچ مەلەکبینێک خەڵکی ئەو شوێنە نییە کە تیا دەژی».

ڕێزان لەوەدا لە سەر هەق بوو. نیازی ئێمەی فریشتە، بریتی بوو لە هەڵهاتن لە دونیا، کەشتییەکەشمان تەنیا کەشتی ڕاکردن و دوورکەوتنەوە و تاراوگە بوون بوو.

لە سەرەتای قسەکانییەوە پرسیارێک لە دڵمدا بوو، دەبوو بیکەم. لێم پرسی «ڕێزان گیان، من و تۆ دەمێکە پێکەوە لەم کەشتییەداین، واخەریکە پێکەوە ژیان دەگوزەرێنین و پیر و خەرۆ دەبین، پرسیارێکت لێدەکەم ڕاست وەڵامم بدەرەوە، تۆ ڕۆژێک لە ڕۆژان دەتوانیت مەلایکەتێک بکوژیت؟». تۆزێک وەستا و سەیریکردم، ئاشکرا چاوەڕێی هەموو شتێکی کردبوو ئەو پرسیارە نەبێت. ئینجا بە دوودڵییەوە گووتی «سەیرکە مەهدائیل، ئینسان پارچەیەک تەختەیە، دەکرێت لە ژێر کووتان و چەکوشکاریدا هەر شتێکی لێدروستبکەیت، من نازانم لە ژێر لێداندا چیم لێ دروستدەکرێت، خۆت دەزانی ژنێکی بەدبەختم دەبێت هەزار و یەک حساب بۆ ناموسی خۆم و ناموسی باوکم و ناموسی مردووەکانی تایەفەکەم بکەم، بەڵام پێتدەڵێم من کەسێکم دونیام خۆش ناوێت، ڕاستە خۆمم خۆشدەوێت، ژیانم خۆشدەوێت، بەڵام دونیا نا. ئەوەش لە شێتخانە فێربووم. لە شێتخانە پێیاندەگووتین دونیاتان خۆشبوێت، هەموو ئیشی دکتۆرەکان ئەوەبوو کە دونیامان خۆشبوێت، دونیا ئەوەیە کە هەیە و لە ناویدا دەژین، بە زۆر دەبوو دونیامان خۆشبوێت، دونیا هەموو ئەو شتانەی تێدایە کە من ڕقم لێیانە. بەڵام لەوێ حەبیان دەداینێ دڵمان خۆشبکات و بڵێین دونیا زۆر خۆشە، کارەبایان لە سەرمان دەدا تا ئەوە لە سەرمان بسڕنەوە کە دونیا ناخۆشە. مەهدائیل، وای بیرمکەوتەوە، لەوێ نەخۆشێکی عەرەبمان هەبوو زۆر سەیربوو، لەوەوە ئەم بەرچاو ڕوونییەم بۆ هات، هەمیشە شتێکی دەگووت دکتۆرەکان نەیاندەزانی دەڵێت چی، بەڵام ئێمەی شێتەکان هەموو تێدەگەیشتین مەبەستی چییە، دەزانی دەیگووت چی، دەیگووت «من حەزم لە دونیا نییە، حەزم لە ژیانە». مەهدە گیان بە چاوی عەزیزی هەردووکمان. دکتۆرەکان گەمژەبوون، نەیاندەزانی دەڵێت چی، دونیا لای کچە عەرەبەکە دونیای

دکتۆرەکان بوو، دونیای باوکی بوو، شوێنی برا زاڵم و درندەکانی بوو، نیشتیمانی مێردە مەلعونەکەی بوو کە ویستبووی ئیشی خراپی پێ بکات، بەڵام ژیان ئێمە بووین، خۆمان بووین، کۆڕ و مەجلیسی گەرموگوڕی شێتەکان بوو. منیش وام، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر وام لێدێت، حەزم لە دونیا نامێنێت، بەڵام ژیان بریتییە لەم کەشتییە، لەم دانیشتنەی ئەمشەوی من و تۆ، لەو هەستە نابەجێ و مەحاڵەی بۆ ئەو دکتۆرە بێمێشکە هەمە کە ناوی مستەفا شوکاکە. ژیان پێچەوانەی دونیایە، ژیان ئەوەیە نەهێڵم ئەم دونیایەم خۆش بوێت، نەهێڵم ڕامکێشنە ناوی، دەزانم عەزیزم دەزانم، مەڵێ ئێستا کەس پەلی نەگرتوویت بتباتەدەرێ، بەڵام لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان شتێکی لەوجۆرەش بێتە پێش، بە خۆشی خۆم بێت یان بە زۆر ... نازانم؟. گەر توانیان کارێکبکەن و وەها بمخەنە ژێر چەکوشکارییەوە دونیام خۆشبوێت، ئەوکات دەتوانن وام لێبکەن بکەومە مەلەک کوشتنیش. مەلەککوژ کەسێکە دونیای خۆشدەوێت و ڕقی لە ژیانە، بەڵام من نا. من تا ئێستا هەر لە شێتخانەم، دکتۆر شوکاکیش هەر لە شێتخانەیە، ئەویش شەو و ڕۆژ دەڵێت من ئینسان ڕزگارناکەم، ژیان ڕزگاردەکەم ... بەس لێگەڕێ، شوکاک بە ڕاستی کارەساتە، کە باسی ژیان دەکات، ئەسڵەن لە نێوان من و پشیلەیەکدا جیاوازی ناکات، وای ئەمجارە کە قسەیکرد گوێی لێبگرە، کە دەڵێت ژیان لە هەموو عاتیفەیەکی دابڕیوە، تەنیا باسی ژیان دەکات لە ژووری عەمەلیاتدا لەو خەستەخانە پیس و چەپەڵەی خۆی، ژیان لەو خەتەدا کە زەق و زۆپ لەگەڵ مردندا چاویان لە چاوی یەک بڕیوە. مەهدەکەی خۆم، ئیتر نازانم، من ئێستا وام، ئیتر یەکێک بێت دواتر بتوانێت بمکاتە مەلەککوژ نازانم... من لە منداڵییەوە لە مەکینەکەدام، ئێستا لەبری مەلەککوژ، مەلەکبینم لێ دەرچووە، خاوەنی کەشتیی فریشتەکانم. کەشتی شتێکە بۆ هەڵهاتن لەسەر ئەرز، هەرچی دەچێتە سەر کەشتی و دەبێتە سەرنشینی، ڕقی لە دونیایە و عاشقی ژیانە. بەڵام وای لە کەشتیشدا ئەوە زۆر ناخۆشە چەند لە ئاودا دوور بڕۆی، هەر دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ وشکایی. پێمبڵێ مەهدائیل، لەو باوەڕەدایت، ڕۆژێک ئەم کەشتییەی ئێمە بگەڕێتەوە بەندەری دونیا ...

لەوێ لەنگەر بگرێت، من و هەموو دەریاوانەکان دابەزین و ئیتر نەگەڕێینەوە... بڵێیت؟ یان باشتر وایە لە ناوەڕاستی دەریادا بخنکێین، نوقمبین، بسووتێین، نەوەک لە ناو دونیادا ونبین و ببین بە بەشێک لە شتەکان؟ کامیان باشە، مردن یان گەڕانەوە بۆ ئەم دونیایە؟ کامیان باشە؟».

من هیچم نەگووت، لە ڕاستیدا نەمزانی چی وەڵامبدەمەوە، نە توانا نە ئازایەتی ئەوەم نەبوو بیر لە وەڵامی پرسیاری وەها بکەمەوە.

ئینجا دەستی خستە سەر دەفتەری دووەم و گووتی «مەهدە گیان... ئەوەی زۆر خراپە وماڵی من وێراندەکات ئەم دەفتەرەیانە. ئەمەیان بە دەستخەتی حاجی سمایلی مەلەککوژ خۆیەتی، ئەو نوسیوێتی. لێرەدا هەموو شتێک لە سەر ئێمە هەیە، لە سەر ئەم کەشتییە. ئەمە دەفتەرێکی ترسناکە، هیچ کەس نازانێت چەند دەستخەتی لەبەر گیراوەتەوە، چەند نوسخەی هەیە. ئەگەر بمزانییایە هەر زوو کارێکم دەکرد تەفروتونایبکەم، بەڵام کەس نازانێت لە چەند شوێن هەیە و لای چەند کەس هەڵگیراوە. ئەوەی باسکراوە ئەوەیە، حاجی سمایلی مەلەککوژ دوو مانگی پێش مردنی، شەو و ڕۆژ خەریکی نوسینەوەی ئەم یاداشتە بووە، بەڵێ بەقوربان، ئێستا بەمجۆرە شتانە دەڵێن یاداشت، جاران وشەی وا عەجایەب هەر نەبوو، چی بکەین دنیایە و تا بمێنین شتی عەجایەبتر دەبینین. ئیتر چەندی لەبەر نوسراوەتەوە، بۆ کوێ نێردراوە، بۆ کێ نێردراوە، بەس خودا بۆ خۆی دەزانێت. حاجی سمایل لێرەدا بە وردی باسی هەموو شتێکی مەلەکەکانی کردوە، چۆنێتی ترازانیان، چۆنێتی ئاوارەبوونیان، هەر لێرەشدا بە نەخشە و بە دیقەتی کەسێکی سەگوسەگبابەوە باسی ئەم ماڵەی کردوە و ناوی ناوە کۆشکی شەیتانەکان... ئەوەی من دەیزانم ئەوەیە، دەستنوسەکە لە کتێبخانەی هەندێک مەلا و لە ئەرشیفی نهێنی ئەوقافیشدا هەیە».

## چاوە ترسناکەکانی من ... چاوە ترسناکەکانی ئەو

لە ساڵانی شەڕدا، من لە ئاواتە گەورە و ڕاستەقینەکانم بەتەواوی دوورکەوتمەوە، هیوای دروستبوونی کوردستانێکی گەورە و یەکگرتوو، دەوڵەتێک بە بنەمایەکی بەهێزەوە بووە خەیاڵ. شەڕی ناوخۆ تەنیا لەوەدا ناجوامێر و نامەردانە نەبوو کە شەڕێکی پوچ بوو لە سەر هەندێک سەروەت و سامانی کەم، بەڵکو لەوەشدا کە بووە جەنگی نێوان هێزگەلێکی ترسنۆک کە کەسیان جورئەتی سەرکەوتنیان بەسەر ئەویتردا نەبوو. لەگەڵ شەڕی ناوخۆدا، شۆڕش بۆ هەتاهەتایە کۆتایی هات، شۆڕش بەو مانایەی لانکەی مرۆڤانێکە ئامادەن بۆ ئاواتەکانیان بمرن و بجەنگن. شەڕی ناوخۆ بۆ ئەوەبوو خواستی مردن تێبپەڕێنن، لە شەڕی ناوخۆدا، ئەو نیازە دێرینە بوو بە دروشمی هەموو تاک و کەسێکی مەملەکەت «نامەوێت بمرم». لەو سەردەمەدا سەرنجی ئەو ڕاستییەمدا کە تا ئەودەم بەو ڕوونییە نەمدەبینی، ئێمە تاکە میللەتی سەر زەوین کە لە سەرکەوتن دەترسین. هەمیشە بەو دەستکەوتە ڕازین کە زیندوو دەمانهێڵێتەوە. گەورەترین نیشانەی مرۆڤی ترسنۆک ئەوەیە، دەزانێت چۆن جەنگ هەڵبگیرسێنێت، بەڵام نازانێت چۆن کۆتایی پێبهێنێت، شەڕی ناوخۆش شەڕی پیاوە هەرە ترسنۆکەکان بوو، پیاوانێک نە دەیانەویست جەنگ بدۆڕێنن، نەدەشیانزانی چۆن سەربکەون. لێرەوە شەڕێکی خاو و مردوو و بێئەنجام و بێکۆتایی بوو. من هیچ کات نەچووم بۆ شەڕ، لە ڕاستیدا زۆربەی سەرکردە بەرزەکان جەنگی ڕاستەقینەیان نەبینی ... ڕۆژانە هەواڵەکان دەهاتنە سەر مێزەکەم و شەوان خۆم ڕاپۆرتم لێ دروستدەکردن و دەمنارد بۆ خوالێخۆشبوو، سەرۆکی فەوتکردومان. شەڕەکان پتر بە هێزی بچوک و سەرکردەی لاوەکی دەکران، هێرشێکی

ڕاستەقینە و شەڕێکی گەورە لە بەرەکاندا ڕووی نەدەدا، کەس نەیدەوێرا بیر لە سەرکەوتنی تەواو بکاتەوە، لە بەرئەوە دەمێک هێزێک دەشکا ئەوی بەرامبەر بوێری نەدەکرد دوویکەوێت و سەرکەوتنی بگەیێنێتە کۆتایی. ئەمجۆرە شەڕە خەونی من نەبوو، دۆنکیشۆتەکەی ناخم یان دەبوو بخەوێت، یان یارییەکی شێتانەتر بۆ خۆی بدۆزێتەوە، ئیدی لەبری ئەوەی خەیاڵ و داڵغە بخەمە سەر جەنگ، دەستم بە پۆستەکەمەوە گرت و وەک وەزیفەیەکی بەدەر لە هەر ئاوات و خەیاڵێک درێژەم پێدا.

ساڵانی جەنگ، پیسی لە سەر شەقامەکان، لە کوچەکان، لە نەخۆشخانەکان، لە زانکۆکان، لە هەموو شەقام و سەر ڕێگاکانی مەملەکەت کۆدەبووەوە، ئادەمیزادەکانیش بەختەوەر لە ناو ئەو زبڵدانە گەورەیەدا دەژیان. مرۆڤەکان لە ناو ئەو هەموو پیسییەدا ئارام دەهاتن و دەچوون. ئەوەی لەو سەردەمە و سەردەمانی دواتردا سەرنجی هەر کەسێکی ڕادەکێشا، ئەوەبوو لەگەڵ ئەو پیسییە سەرسوڕهێنەدا، خەڵکی بایەخێکی بێوێنەیان بە پاکی جلوبەرگ و مەکیاژی ڕوو و تەمیزی سەرووڕوخسار دەدا. تا زبڵ پتر بایە لە بازاڕەکاندا، نرخی مەکیاژ، قوماشی گرانبەها، عەتری بیانی دەچووە باڵا.

سەرەتای شەڕ، پەڵۆخی و چەپەڵی، سیپاڵ و ڕوخساریشی گرتبووەوە، بەڵام هێشتا چەند مانگێک بەسەر یەکەمین فیشەکی جەنگدا تێنەپەڕیبوو، لە ناکاو وەک نیشانەی دابڕانێکی گەورە و بیرچوونەوەیەکی قووڵی دونیا هەموو کەوتنە سەر هەوای ئارایشتکاری و شیکپۆشی و خۆشئەندامی. ئیدی گەر لە شاردا پیاسەتبکردبایە، دەتبینی خەڵکانێکی ڕێکپۆش گەلەک بە بڕوا و بە بۆشناخی بە ناو دەریای زبڵ و پیسیدا هەنگاو دەنێن و هیچ هەستێکی نامۆ و خراپیشیان نییە.

لەو وەرزەدا چەند جارێک کۆلێرا بڵاوبووەوە و کشایەوە دواوە، دەهات و دەچوو. تەنیا مەخلوقێک کە بۆنی پیسی لێ نەدەهات، ئاسمانی کچم بوو. بە درێژایی ڕۆژ لە هەموو جێگایەکەوە ئەو بۆ پیسییە هێرشی دەهێنا،

شەوان کە دەگەڕامەوە، کە دەخەوتم، کە ئاسمانم دەخستە سەر سنگم و توند بە خۆمەوە دەمنوساند، هەستم بە دڵنیاییەکی گەورە دەکرد. سەیربوو، بە درێژایی ڕۆژ ئەو هەموو چەکدار و دیوار و پاسەوانانە لە دەورم بوون، هەتا سەرۆک ناردبووی ماشێنی دژە گوللە بۆ من و وەزیرەکان و ئەندامانی بیرۆی سیاسی دابینبکرێت، کەچی هیچ کات وەک ئەو ساتە هەستم بە ئەمان و دڵنیایی نەدەکرد کە ئەو کچە چکۆلەیەم دەخستە سەر سنگم و دەخەوتم. کە ئاسمان دەهاتە باوەشم، هەموو ئەو دونیایەی تر کۆتایی دەهات، هەموو شتەکان وەهابوون وەک کتوپڕ هیچ نەمێنێت، من و بەختەوەرییەکی تاک و تەنها و نهێنی نەبێت، بەختەوەری لە باوەشکردنی ژیان لە سەرچاوە هەرە بێگەرد و بێدەنگ و پاکەکەیدا. هیچ کات هەستم نەکردوە کە ژیان، کە ئەم جیهانە دەموچاوێکی تری هەیە ئەوکاتانە نەبێت کە ئاسمانم بۆندەکرد و دەمنووساند بە خۆمەوە، کە بەیانیان هەڵدەستام و هەستم بە دەستی دەکرد لە دەوری ملم، کە دەستم لە قژی دەدا و تاڵە قژە لاوازەکانی دەهاتن بە دەستمەوە، کە سەیرمدەکرد، بێئەوەی جوانییەکی تێدا بێت، وەک قەشەنگترین مەخلوقی سەر زەوی دەمبینی.

هەستمدەکرد ئێستا ژیانم زۆر جوانە، شەوە خۆش و پاکەکانم لەگەڵ ئاسمانی کچمدا، هاوسەنگی دەدایە ڕۆژە خۆش و پیسەکانم لە دەزگا. وەک هەموو یاریزانە باشەکانی ئەو سەردەمە، فێربووبووم لە یەککاتدا لە سەر دوو شانۆ سەمابکەم، ئەوە گەورەترین ئاواتی ئەو ساتەم بوو، لە کاروانە گەورەکان دوانەکەوم ... بۆ دەبێت هەموو ئادەمیزادەکان زیاد لە شانۆیەکیان هەبێت، بۆ دەبێت زیاد لە سەمایەک بزانن من نەبێت. ئایا تەنیا لەبەرئەوەی سەرێکی زلی ڕووتاوە و ورگێکی گەورە و نیگایەکی هەمیشە نەخۆش و دەنگێکی لەرزیوم هەیە؟. دەبوو بکرێت منیش لە سەر زیاد لە شانۆیەک دەربکەوم. ئێستا توانیبووم جیهان بە چەقۆیەکی گەورە، بە کێردی قەسابە کوشندە و شارەزاکان لەتبکەم، بۆ جیهانی شەو

و جیهانی ڕۆژ، جیهانی زیڵخانە بێسنوورەکان لەگەڵ دونیای بچوک و بێدەنگ و نەرمی منداڵی، ئێستا ئەوەم بەس بوو.

بەڵام دەمزانی ئەو فریشتە تۆپیوەم کە ساڵەهای ساڵ بە باڵەکانی ژیانی لێکردبوومە جەهەنەم، وازم لێناهێنێت.

کێشەم لەگەڵ فریشتەکەمدا ئەوە بوو، کە چیتر هەستم پێ نەدەکرد، چیتر هیچ جۆرە پەیوەندییەکم پێوەی نەمابوو، بەڵام هیچ شتێک لەوە ترسناکتر نییە کە دەزانی شتێک هەیە، بەڵام هەستی پێ ناکەیت، دەزانیت دەبێت لە جێگایەک خۆی شاردبێتەوە، بەڵام لە کوێ، چۆن؟. من لە یەکەم ڕۆژەوە هەستم بەرابەر ئەو فریشتەیە ناکۆک بووە. سەرەتا دەمویست دەریبکەم، دوایی ونبوو، ئیدی بۆی دەگەڕام. فریشتە تا لە ناختدایە بەوە ئازارت دەدات کە هەستدەکەیت چاوێک لە ناوەوە سەیرتدەکات و نایبینیت، دواتریش کە دەزانیت دەرتکردوە، بەوە ئازارت دەدات کە دەزانیت چاوێک لە دەرەوە سەیرتدەکات و نایبینیت. ڕەنگە ئەو دوو چاوە هیچیان چاوی ڕاستەقینە نەبن، بەڵام ئاخۆ هیچ چاوێک لە گەردوندا هەیە، بشێت مرۆڤ ناویبنێت چاوی ڕاستەقینە؟. بەڵام نا... من چونکە خۆم بە چاو هەموو دونیام خستبووە ژێر کۆنترۆڵەوە، ئاگاداربووم، چاوێکی تر هەیە منی خستۆتە ژێر چاودێری خۆی. ئەوەی دەمویست فریشتەکەم بکوژم، جۆرە هەڵهاتنێکی تر بوو لەو نیگایە. بەڵێ، لە دوای دەستپێکردنی جەنگ و خەستبوونەوەی تەنهاییە قووڵەکەم، لە ژێر ئەو ترسە بەردەوامەدا دەژیام کە چاوێک بەدوامەوەیە... بە چاوی خودای تێدەگەیشتم، بە چاوی هەندێ سیخوڕیی مەلەکوتی، بە چاوی جاسوسەکانی دوژمن. بەڵام دڵنیابووم، چاوی هەر کەسێکە و هەر هێزێکە لە ڕێگای چاوانی وەفائیلەوە سەیری من دەکات.

من لە ڕێگای کوشتنی فریشتەکەمەوە، دەمویست هەر چاوێک کوێربکەم کە تەماشامدەکات. من بۆ ئەوە دروستبووبووم ببینم و نەبینرێم.

بەڵام فریشتەکەم لە کوێ بوو؟ دەبوو گەر هەموو دونیام هەڵگێڕاوەتەوە، بیدۆزمەوە.

لەو دەمەدا بوو ئەو فەرمانەم دەرکرد، هەرچی کەسێک لە من دەچێت بیگرن. سەدان وێنەی تایبەتی خۆم بەسەر خاڵەکانی پشکنیندا بڵاوکردەوە، بەسەر بنکە جیاوازەکانی دەزگادا، بەسەر کارمەندەکاندا، لە هەر کوێیەک یەکێکیان بدیایە لە من بچێت، دەبوو دەمودەست قۆڵبەستیبکەن. بۆ یەکەمجار لە حیزب و وڵاتدا بڵاوبووەوە کە سەرۆکی دەزگای ئاسایش عەقڵی لەدەستداوە و فەرمانی گرتنی خۆی دەرکردوە و وێنەی خۆی بە هەموو وڵاتدا بڵاوکردۆتەوە. لەڕاستیدا خەڵکانێکی زۆر گیران کە لە من دەچوون، هەندێکیان زۆر لە من دەچوون، دەگووترێت خودا لە هەموو شێوەیەک تەنیا چل دانە دروستدەکات، بەڵام وانەبوو، لە شێوەی من زۆر زیاتر لە چل کەسی تەنیا لەم شارەدا دروستکردبوو. هەندێک ڕۆژ بەشێکی ژێر زەمینەکەی دەزگا پڕدەبوو لەو هاوشێوانەی من کە لە شار و شارۆچکەکانی دەورووبەرماندا دەگیران. یەکەم ڕۆژ کە هەواڵی گرتنی هاوشێوەکانی خۆمیان پێگووتم، وامدەزانی دەنگۆکە هەر درۆ و فیشاڵی کارمەندانی دەزگایە کە لە گواستنەوەی هەواڵ و چنینی خەبەردا، فیشاڵ و هەڵبەستن و پێوەنان پیشەیان بوو. بەڵام کە چوومە خوارێ، سەرم لەو هەموو پیاوە سوڕما کە هەموو گەلێک لە یەک دەچوون، من دەمودەست فەرمانم دایە پاسەوانەکان لە دەوری من نەجوڵێن و نەهێڵن تێکەڵاوی ئەوان بم، چونکە دواتر کاری جیاکردنەوەم بۆ کەس ئاسان نەبوو. فەرمانمدا بەر لەوەی دەرگاکان بکەنەوە بچن مۆرێکی ئاسن دروستبکەن، دوو پزیشک بهێنن یەکێکیان پسپۆڕی بەنج، ئەویدیکەیان پسپۆڕی پێست و سووتان بێت، دەبوو هەر کەسێک کە دێت و پشکنینی بۆ دەکرێت، بۆ ئەوەی دووبارە نەگیرێتەوە و لەگەڵ فریشتەکەی مندا تێکەڵ بە کەس نەبێت، مۆرێک لە سەر پوزی قاچی چەپی وەربگرێت. تا شتەکە بەو جۆرە نەبوو، من هەر کەسێک بگرم بە زۆر ئەو مۆرە بدەم لە پوزی، مۆرەکە خۆویست بوو، من بۆ هاوشێوە و گیراوەکانم ڕووندەکردەوە

کە ئەگەر مۆرەکە وەرنەگرن، مەترسی ئەوە هەیە بەردەوام بگیرێنەوە، ئەوسا دەبێت قەبووڵیان بێت کە بهێنرێنە دەزگا و دووبارە کۆنترۆڵی شوناسنامەکانیان بکرێتەوە. بەشی زۆریان سەرەتا نەیاندەویست مۆرەکە وەربگرن، بەڵام کە وای لێهات رۆژی دووجار بگیرێن و بە قۆڵبەستکراوی بهێنرێن بۆ دەزگا، زۆربەیان ملیاندا و کاری من و تیمە گەرۆکەکانیشم ئاسان بوون. مۆرەکە هێلکەیییەکی درێژکۆلەبوو، لە سەری نوسراو بوو، «لە هاوشێوەکانی عەقید جەنگیز ـ پشکنینی بۆ کراوە ـ». دکتۆرەکان کارەکەیان بە وریاییەکی زۆر و لە ژێر چاودێرییەکی گونجاودا ئەنجامدەدا، جێگا مۆرەکەیان بەنجدەکرد و ئینجا بە مۆرە ئاسنینە داغەکە جێگاکەیان بە جۆرێک دەسووتاند زۆر نەسووتێت و ئاسەواری مۆرەکەش زوو بە گۆشت پڕنەبێتەوە... سەرەتا یەکەیەکە گیراوەکانم دەپشکنی، هەموو بە جۆرێکی بێمانا لە من دەچوون، هەموو نیگا و ڕوانین و دەنگ و ترسەکانی سەر ڕوخساری منیان هەبوو. کە خۆم لەو هەموو ڕوخسارەدا دەبینییەوە، ترس و قێزێکی قووڵ دایدەگرتم، هەموو ڕۆژێک دەیان دەموچاوی وەک خۆم دەبینی، هەموویان من بوون، منیش هەموویان بووم ... بینینی ئەو هەموو منە زۆرە کە هیچیان من نەبوون، تا ئەندازەیەک دەیترساندم. ئەو هەستی قێزەی سەرەتای شەڕ تێمدا دروستبوو، سەرەتا نەگەیشتبووە خۆم، ئێستا دوای بینینی ئەو هەموو منە کە هەموویان من بوون و ژیانێکی تریان هەبوو، من بوون و لە جێگایەکی تردا درێژەیان بە چیرۆکێک دەدا کە زۆرجار هەستمدەکرد زۆر لە چیرۆکی من دوور نییە، قێز و نەفرەتێکی توندی بەرامبەر خۆم تێدا دروستکردم. تا ئەو کاتە وامدەزانی من ناوازەم، کەسێکم لە وێنەم نییە. ئێستا یەکجار خۆم لە هەموو ئەو ژیانانەدا دەبینییەوە. ڕۆژی یەکەم تەنیا موچڕکەم پێدادەهات، لە بڕیاری خۆم پەشیمانبووم و دەمگووت بریا بۆ وەفائیلی مەلعون نەگەڕابام، چونکە ئەوەی دۆزیمەوە وەفائیل نەبوو، بەڵکو پارچە شکاوەکانی خۆم بوو. لە ناکاو جیهان ئاوێنەیەکی دایە دەستم و گووتی تۆ کەسێکی تایبەت نیت، تۆ هیچ نیت، ژیانێکی لە ژیانەکانی بوونەوەرێکی تر کە پارچەپارچەبووە، دەکرا من هەر یەکێک بم لەوانەی لە

ژێر زەمینەکەی دەزگادا زیندان بوون، دەکرا هەر یەکێکش لەوانەی لە ژێر زەمینەکەدان ببنە من و بێنە جێگام... ئەوە هەر یەکەم ڕۆژ تووشی دەردی سکچوون و ڕشانەوەی توندی کردم، ماوەیەک بوو هەروا پشێوییەکم تووشبابە دەکەوتمە سەر سکچوون. دوای دیداری گروپی یەکەم لە هاوشێوەکانی عەقید جەنگیز، دوای ئەوەی گوێم لە هاواری هەندێکیان بوو کە داغی مۆرە ئاسنینەکە لەگەڵ هەموو بەنجێکیشیدا هەر زوڕەی لێ هەڵدەستاندن، ئەو قێزەم بەرامبەر خۆم زیادیدەکرد، قێزی مەخلوقێکی لاواز و دووبارە کە بێ هیچ هۆیەک، بۆتە خودا بەسەر شارێکی گەورەوە. کێشەکە ئەوەبوو لە هەموویاندا خۆم دەبینییەوە، بە جۆرێک ئیتر هەستم بە توانەوە و ونبوون و بێمانایی خۆم دەکرد. دۆزینەوەی ئەو هەموو ڕوخسارەی دیکەی خۆم، ئەو هەموو ژیانانەی دەکرا ژیانی من بن، غروری وێرانکردم و کەوتمە داڵغە و تێفکرینی شەو و ڕۆژ. لەو سەردەمەدا، لە دەزگا بڵاوبووەوە کە عەقید پیاوێکی ئەوتۆ بێوێنە نییە و دەکرێت هەر کەسێکی تر ئیشی دەزگا لەو باشتر بەڕێوەبەرێت. بینینی ئەو هەموو پیاوەی لە من دەچوون، کارمەندانیشی لە من خستە گومان و منیان بە ورچی سەد کۆپی ناودەبرد. دەبوو شتێک بکەم کەمێک لە تۆرانم لە خۆم کەمبکات و حورمەتم بە دەست بهێنمەوە. فایلێکی گەورەم کردەوە، بە ناوی «فایلی ئەرخەوانی عەقید جەنگیز و هاوشێوەکانی». هەموو هاوشێوەکانی خۆم لەوێدا بە وێنە و ناو و ناونیشان و ئیشەوە کۆکردەوە، هەر یەکێکیان بهتبایەتە دەزگا، مۆری لێبدرایە یان نا، دەبوو ژیانی خۆی بگێڕێتەوە و ئەوسا بڕوات. دوو تایپیستی کچم گرت و دەبوو هاوشێوانم چی دەڵێن هەم تۆماری دەنگ و هەم چاپی لێبگرن. لە ژیانی هەر یەکێکیاندا پارچەیەک ئاواتی ونبووی من هەبوو، لە هەر سەرگوزشتێکیاندا شتێک لە خەون و دیوە مەحاڵەکانی منی تێدابوو. ئەوە ئیتر ئەو ڕۆژگارە بەدەبوو کە خراپترین و تاریکترین قۆناغەکانی جەنگی من لەگەڵ خۆمدا دەستی پێکرد، بڕیارمدا هەموو ئەوانەی لە من دەچن لەم شارەدا نەمێنن، دەبوو کارێکبکەم هەموو وێنە شێواوەکانی خۆم بسووتێنم. لە پاییزی ساڵی نەوەدوپێنج و لە

سەرەتاکانی نۆڤەمبەردا، لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا پێنج لە هاوشێوەکانم، لە هەلومەرجی نادیاردا، بە هۆی دیاری نەکراوەوە، بە دەستی نەناسراو، لە ڕووداوی ڕێکەوتدا، ژیانیان لەدەستدا ... بۆ؟ من نەمدەزانی و خۆم لەبان کرد. گووتم هەر کەس دەستێک بۆ هاوشێوانم دەبات، بە قەسدی کوشتنی من ئەو کارە دەکات. ئەوانیدی، هەموو نامەی نهێنییان بۆ چوو و بە چەند شێوەیەکی هەڕەشەیان لێکرا. کاری کوشتن و هەڕەشەکان وا بڵاوکرانەوە، وەک هەوڵ بن بۆ کوشتنی «عەقید جەنگیز» لە لایەن دوژمنانی حیزبەوە. من بۆ ئەوەی خۆم لە دۆخی مەترسی و هەڕەشەدا نیشانبدەم و گرنگی خۆم بۆ حیزب زیاتر دەربخەم، ژمارەی پاسەوانەکان و ماشێنەکانم دوو بەرابەرکرد. لە ماوەی شەش مانگدا، شار و دەوروبەری بە جۆرێکی بەرچاو خاڵی بوونەوە لە هەموو هاوشێوەیەکی من، زۆربەیان بەپێ ڕوویانکردە تورکیا و لەوێوە بۆ یۆنان و لەوێشەوە بۆ خۆرئاوا. هەتا دەڵێن بەلەمێکی پڕ لە هاوشێوەکانی من لە بەرابەر کەنارەکانی ئیتاڵیادا کەوتۆتە ئاوەوە و سەرجەم سەرنشینانی خنکاون. هەندێک لەو بەستەزمانانە ڕوویانکردە ئێران و لەوێ بە پارەی گەلەک خەیاڵی نەشتەرگەریی گەورەیان بۆ ڕوخساریان کرد و بە دیمەن و دەموچاوێکی دیکەوە گەڕانەوە. هەندێکی کەمیشیان هەر لە ناو شار و دەوروبەریدا خۆیان ونکرد و دەرنەکەوتنەوە.

کۆتایی ساڵی نەوەدوپێنج و سەرەتای نەوەدوشەش بۆ هاوشێوەکانی من زەمانی دوودڵی و تیرۆر بوو. کەس نەیدەزانی چی ڕوودەدات و لە پشتی چیرۆکی عەجەیابی من و هاوشێوەکانمەوە چ چیرۆکێک هەیە. ئادەمیزادێک نەبوو خەیاڵی بۆ ئەوە بچێت من لە دوای فریشتەکەم دەگەڕێم، بە دوای بەشێکدا دەگەڕێم لە خۆم کە چەند دەمەوێت بۆم ناگیرێت، هەموو کەسێکم بۆ دەخرێتە زیندان و هەموو تارماییەکم بۆ دووردەخرێتەوە، ئەو نەبێت.

لە ئێوارەیەکی چلەی زستانی ساڵی نەوەدوشەشدا، سەرما و زەمهەریرێکی زستانە بوو، لەو ئێوارانە بوو کە باڵندە بە ئاسمانەوە دەیبەستێت، هەوا

وەها سارد بوو، مرۆڤ سەد هەنگاو برۆیشتبایە سەر پەنجە و لێو و سەر گوێکانی بە چەشنێک دەتەزین، ترسی لە بەستنی خوێن و پەلوپۆکەوتن هەبێت. ساڵانێک بوو سەرمای وەها نەهاتبوو، بە جۆرێک هەتا بۆنی ناخۆشی زبڵ و هەوای پیسی گەورەی گەورەی شاریش بەستبووی و مرۆڤ جگە لە لووتێکی تەزیویی مردوو، هەستی بە شتێکی تر لە سەر دەمووچاوی خۆی نەبوو. نزیکی پێنج ساڵ بوو نەمدیبوو، لەگەڵ هەموو جەنگ و سەرقاڵی و پشێوییەکیشدا بەردەوام بۆی گەڕابووم، ئەوەی چاوەڕوانم نەدەکرد لە ئێوارەیەکی وەها سارددا دەربکەوێت، چاکەتێکی ئەستووری ڕەش و ملپێچێکی خۆڵەمێشی و جووتێک پێڵاوی چەرمی ئیتاڵی لە پێدابوو، باڵەکانی وەک هەمیشە بەهێز لە پشتییەوەڕا بڵند کشابوون، سەری وەک من تاس، چاوانی غەمگینتر و نائومێدتر لە چاوانی من. لەو کاتەدا کە خەریک بوو سوار ماشێنەکەم دەبووم، سێبەری گەورەی باڵەکانی کەوتنە سەرم و بە دەنگێکی هێمن لە دوامەوە گووتی «جەنابی عەقید، من وەفائیلی فریشتەم. دەزانم بۆم دەگەڕێیت، هاتووم خۆم ڕادەستبکەم». دەنگی لە هەوای شەو ساردتر بوو، وشەکانی وشک و غەمگین بوون، لە دەنگی مردوویەک دەچوو لەو دیو دەرگایەکی شوشەوە قسەم لەگەڵدا بکات. سەرما لە بری ئەوەی تووڕەمبکات هێمنی کردبوومەوە، لە ناخەوە هەستم بە ترسێکی گەورەکرد، ئەو لەو فریشتە زیندووانە بوو کە بە جۆرێک لە شێوەی مرۆڤەوە نزیکن، جگە لە باڵەکانیان ناتوانن هیچی تر بشارنەوە. ئاوڕمدایەوە و سەرسام بەرامبەری وەستام، نە سەرمام لە یادما و نە خۆم. دەنگی گەلەک نامۆ هاتە گوێم، هەر دەنگی خۆم بوو، بەڵام نەرم و نیانتر و ناسکتر، وەلێ لەرزێکی بچوکی تێدابوو، وەهابوو وەک بای شەو بتوانێت دەنگی پتر لە دەنگی ئێمە بلەرزێنێتەوە. نەمدەزانی کاریگەریی سەرماکەیە وەها وشەکانی دەلەرزین یان بە هۆی ئەم دیدارەوەیە کە بایەخی گەورەی لای ئەویش هەبوو. لە ناکاو شێوەی سەرماکە گۆڕا لە لەشمدا. تا ئەو ساتە سەرما سەرمای شەوێکی زستانەبوو، بەڵام ئێستا وەک زەمهەریرێکی ناوەکی دەستی پێکردبێت، وەک ئەوەی لەشم بسووتێت و لە ناخمدا شەپۆلی

سارد بە گوڕم بکێشن بە ڕۆحمدا وەهابوو، وەک دەورم ئاگر بێت و ناخم بەستەڵان. لەو گەرماوگەرمەدا هەستم بە هیچ نەکرد، گەرچی بە ڕوونی دەمبینی، کەچی وام هەستدەکرد تاریکییەک لە نێوانماندایە ناهێڵێت بیبینم. ڕوناکیم دەویست، ڕوناکییەکی زۆرتر، بەهێزتر لە تیشکی چراکان، بەتینتر لە هەر جۆرە ڕوناکییەک پێشتر بینیومە. ئەو وەک چاوەڕوان بێت بیکوژم، سەیریدەکردم. تا ئەو کاتە نەمدەزانی فریشتەکان هەستێکی گەورەیان بەمجۆرە ترسانە نییە. گەرچی چەند وەخت بوو دونیام لە دوو تەیدەکرد، کەچی ئێستا وەک ئاواتەخوازیم دەرنەکەوتبایە و نەمدیبایە، وەک ئەوەی چەند ساڵە من لەو هەڵبێم و ئێستا ئەو منی دۆزیبێتەوە، دەمویست هەڵبێم و بە تاریکی و سەرمای شەودا ڕابکەم. بۆ ئێستێک وەخت بوو چی هێزێک لە گیانمدایە کۆیبکەمەوە و دەربازبم، بەڵام ئەوە کاری نەکردەبوو. بە ترسێکەوە دەستم دایە دەستی، لە بری ئەوەی بیبەمە ژووری بۆ ناو دەزگا و لە پشت دیواری زیندان قایمیبکەم، دەرگای ماشێنەکەم بۆ کردەوە و پێمگووت «سوار بە». لە پیاوێک دەچووم ژنەکەی پێنج ساڵ ڕایکردبێت و لەناکاو و بێ نیشانەیەکی پێشوەخت، لە ئێوارەیەکی زەمهەریردا گەڕابێتەوە و کابرا نەزانێت چی بکات، بیکوژێت، بیباتەوە ماڵ، دەستبەرداری بێت و بڵێت بڕۆ؟. لە ماشێنەکەدا کەمێک وردتر سەیرمکرد، بێئەوەی بیریبکەمەوە، پرسیم «پێنج ساڵە لە کوێیت؟». سەیری نەکردم و گووتی «کارت چییە بەسەر منەوە؟ بۆ ئەو هەموو خەڵکە بەستەزمانانە ئازار دەدەیت. گەر ئەوەت نەکردایە چ شتێک لە نێوان من و تۆدا ماوە؟ ». دەنگی هێمن بوو، توڕەییەکی پێوە دیارنەبوو، ئەو دەنگە نمونەیی و ئارامەبوو کە تەواوی ژیانم حەزمکردوە هەمبێت. هەوڵمدا منیش ئارامبم، لەو بچم، بەڵام لە بری هێمنی، ماشێنەکەم خستە ئیش و بە شپرزەیی ڕوومکردە سەر شەقامە چۆڵەکانی شار. سەرما خەڵکی خزاندبووە ژوورەکانی خۆیانەوە، تاکە تاکە ماشێن دەهاتن و دەچوون. بەدەم لێخوڕینەوە، گووتم «هەست ناکەم لە دەست تۆ ڕزگارم بووە، قەت هەستناکەم. شتێک نییە بیرتبکەم یان کارم پێت بێت، لەگەڵ ئەوەشدا وەک بارێکی گەورە وەهایت لە سەر ئەستۆم.

هەستدەکەم شتێکی منت لایە، بەڵام ڕاستیت دەوێت نازانم چییە، جگە لەوە چاویشت بەردەوام بەدوامەوەیە، بەردەوام ... هەستدەکەم خودا و شەیتان پێکەوە لە ڕێگای چاوی تۆوە سەیرمدەکەن، ماندووبووم». هیچی نەگووت، بێدەنگییەکەیم وەک بێدەنگی بەهێزەکان لێکدایەوە، بێباک بوو، نیشانەیەکی دوودڵی تێدانەبوو. چەند ساڵ بوو ئارەزووم بوو بیدۆزمەوە و بیکوژم، کەچی ئێستا هاتبووە بەردەمم هەستم بە بێزاری و ساردی و دوودڵییەکی زۆر دەکرد. ئارەزوویەکم نەبوو دەستی بۆ بەرم، وەک ئەوەی گەڕانەوەی وایکردبێت ببەخشم، یان لێی نەترسم، وەک هەموو مەترسی و هێز و دڕندەیی لە نادیاربوون و ونبوونیدا بووبێت. لە ناکاو ماشێنەکەم وەستاند و ترسێکی گەورە لە ڕوخسارمدا بوو، هەرچی بیرۆکەیەک بە خەیاڵمدا تێدەپەڕی، کتوپڕ هەستە هاوشانەکانی دەپەڕینە سەر ڕوخسارم. هەستمکرد گەر بیکوژم، وەک مۆتەکەیەکی ترسناک لە کۆڵم نابێتەوە. ئەو خاوەنی ئەو چاوە نهێنییە نادیارەیە کە هەر کات نەبینرێت، هەر کات نەزانم لە کوێوە نیگامدەکات، دڵنیانەبم لێم دەڕوانێت یاخود نا ئەو دوودڵی و پەشێوییەم تێدەگەڕێت. ئێستا پرسیارەکەم ئەوەبوو ئایا گەر بیکوژم لە دەست چاوی ڕزگارم دەبێت، لە دەست نیگاکانی ڕزگارم دەبێت؟ بەڵام هیچ کەس بەتەواوی لە دەست نیگای مردووەکان ڕزگاری بووە تا من ڕزگارم بێت؟ لە دەست چاوی ئەسپە نەخۆشەکان ڕزگارم بووە تا لە دەست چاوی ئەم فریشتە قووڵبین و ترسناکە دەرچم و ئاسوودەبم؟ دەستم بە فەرمانی ماشێنەکەوە تەزیبوو. ئێستا هەستمدەکرد ئەو چاوەی کە من لێیدەترسم کەوتۆتە دەستم، ئیتر دەتوانم دڵنیابم لە کوێوە دەمبینێت... ئەوەی نهێنی نیگا بەتاڵدەکاتەوە، ئەوەیە بزانیت کێ و لە کوێوە و کەی تەماشاتدەکات. جارێکی تر لە سەر لا نیگامکردەوە. دڵنیابووم نازانێت بیر لە چی دەکەمەوە. دڵنیابووم نازانێت چەند لەو چاوە نادیارەی ئەو دەترسم کە بەر لەوەی چاوی ڕاستەقینەی خۆی بێت، چاوی ترسە قووڵ و بێبەهانەکانی منە. بەڵام چ باک، دەزانێت یان نا؟ گرنگ ئەوە بوو ئێستا دیلی منە. بەخێراییەکی شێتانە ڕووی ماشێنەکەم وەرگێڕا و گەڕامەوە بۆ دەزگا. پێمگووت «ئیتر بۆ هەتاهەتایە دیلی من

دەبێت، لە ژێر زەمینەکەی دەزگادا دەرگات لە سەر دادەخەم و ئەوێ دەبێتەماڵی تۆ». بە بێباکییەوە گووتی «بۆ نامکوژیت؟ من هاتووم چیرۆکێکم هەیە گوێت لێی بێت و کۆمەکمان بکەیت، نەوەک بەمجۆرە دیلمبکەیت. بمکوژە یان کۆمەکمبکە، لەم دوو ڕێگایە زیاتر ڕێگایەکی تر لە بەردەم تۆدا نییە». ویستم وەڵامیبدەمەوە، بەڵام وەک بترسم نهێنی ڕازی خۆمی پێبڵێم، بێدەنگ بووم. نەمدەویست ئێستا گوێم لە هیچ جۆرە چیرۆکێک بێت، کەی کاتی چیرۆک بوو، ئەوە ساتێکی تاڵ و سەنگینی حەقیقەت بوو کە لە مێژبوو منی ئەشکەنجە دەدا. ویستم پێیبڵێم لە چاوت دەترسم، لە نیگات دەترسم، دەترسم ڕۆژێک هەموو ئەم دونیایەم بگۆڕیت، پەشیمانم بکەیتەوە لەوەی کردومە، لەوەی دروستمکردوە، لەوەی تیا ژیاوم ... پێیبڵێم من ترسم لە مردن نییە، بەڵام ترسم لە پەشیمانی هەیە، تۆش تەنیا کەسێکی دەتوانیت پەشیمانمبکەیتەوە. هیچ سزایەک و هیچ هەڵەیەک و هیچ تاوانێکی گەورە لە سەر زەوی ناتوانن پەشیمانمبکەنەوە، تۆ نەبێت... تۆ دەتوانیت. بەڵام ترسام هیچ بڵێم، ترسام دەرگایەک لە سەر دڵم بکەمەوە ڕوون بمبینێت. وەک لە دەستی هەڵبێم، بە خێراییەکی شێتانە ماشێنەکەم پارککرد و جارێکی تر لە حەوشی دەزگادا پێکەوە دابەزین. دامە پێش خۆم و بەرەو ژێر زەمینەکەمان بردم، ئەفسەری خەفەرم بانگکرد و پێمگووت، هەر ئێستا ژوورێکی گەورەم بۆ چۆڵ بکە. زیاد لە دە دەقیقە چاوەڕوان بووین. نە ئەو سەیری منی دەکرد و نە من سەیری ئەو. هیچ شتێک لە یەک بینینەوەی مرۆڤ و فریشتەکەی بێماناتر و غەمگینتر نییە. ساتێکی پوچی خەیاڵییە خۆت لە بەرامبەر وێنە جوان و نمونەییەکەی خۆتدا دەبینیتەوە، بەڵام لە ساتێک و جێگایەکدا سوودێکی بۆ تۆ نییە، ئەوە نەبێت بیرتبخاتەوە چەندە دووری لە خۆت. لە ناکاو بە جۆرێکی بێمانا توڕەبووم، بەسەر ئەفسەر و پاسەوانەکاندا دەمنەڕاند، شەقم لە دەرگاکان هەڵدەدا، چاوانم وەک شێتێک ئاگریان لێ دەباری، وەک یەکێک بیەوێت بەسەر ترسەکانی خۆیدا زاڵ بێت، بە سەر هەمووواندا دەمقیژاند. بە ئەفسەری خەفەرم گووت «ئەمە بەرە ئەو ژوورەوە و بە هیچ جۆرێک

دەرگای لێ مەکەوە تا من پێت دەڵێم»، بەڵام بە چ دەنگ و بە چ نەڕەیەک. ئەو هێمن بوو، وەک هیچ شتێکی بۆ گرنگ نەبێت، تەنیا سەیری پیسی و پاشماوەی کەڵەکەبووی دەوری خۆی دەکرد و شتێکیش لە خەندەی تەوسهێن لە سەر لێوی بوو، وەک بڵێ هەر ئەمەت لێ چاوەڕواندەکرێت و هیچی تر نا. بەر لەوەی ئەفسەرەکە بیبات، ئاوڕێکی لێدامەوە و گووتی «بیرت نەچێت، دەمەوێت شتێکت بۆ بگێڕمەوە». من دەستم ڕاوەشاند، بە تورەیی و خێرایی هاتمە دەرێ و بە ڕاکردن چوومەوە ناو ماشێنەکەم، دەستم گرت بە دەموچاومەوە و دەستمکرد بە گریان ... زۆر لە مێژبوو نە گریابووم... زۆر لە مێژ ... ئێستا دەنگی ئەو لە گوێمدا دەزرینگایەوە و لە گەڵیشیدا سەراپای گیانم دەلەرزی. بۆ یەکەمجار هەستمکرد نەوەک قێز، بەڵکو ئەمشەو غەم دەمکوژێت.

## یاداشتەکانی مەهدائیلی فریشتە «5»

هەواڵی دابەزینی هێزێکی سەر بە لەشکری شەیتان بە جۆرێکی خێرا لە شاردا بڵاوبووەوە، بابەتی وتارەکانی ڕۆژی هەینی مامۆستاکان و عولەماکانی ئایین ئەوەبوو، خۆیان بە چاوی خۆیان ئەتباعی شەیتانیان بینیوە. لە دەیان مزگەوتەوە و بە بڵندگۆی گەورە هۆشیاری درا بە خەڵک کە شەیتان لێرەیە. زۆریان بە وردی دانیشتنەکەی من و جەمعییەتی عولەما و دەستەبژێری مەلاکانیان بۆ خەڵک گێڕایەوە. قسەیان لە مەخلوقاتێکی شەیتانی دەکرد شێوەی مرۆڤیان هەیە، باڵدارن و ئیدیعای فریشتەبوون دەکەن، هەندێکیان دەبینرێن و هەندێکیان نابینرێن، باڵەکانیشیان بۆ چاوی ئاسایی دەرناکەوێت، دەکرێت لە شێوەی هەر کەسێکدا خۆیان هەڵیدەبژێرن دەربکەون، دەشێت لە شێوەی خۆتدا یان دراوسێکەتدا یان ژنەکەتدا خۆیان بگۆڕن و بێنەلات. خەڵکی بێدین و شەیتان پەرستیش هەن فریویان دەخۆن، داڵدەیان دەدەن، باوەڕیان

پێدەکەن و وەک فریشتە «لبیک»یان پێدەڵێن... تاکە پەنا و پارێزیش لە دەستی ئەوانە کەمایەتییەکن کە خودا بە پێشەنگی لەشکری خۆیانیان دەزانێت، ئەوانەن باری تەعالا چاوێکی خودایی پێداون و دەتوانن باڵی ئەو ئیبلیسانە ببینن و مەلەکە درۆزنەکان بناسنەوە.

لەو ڕۆژی هەینییەدا، چوومە دوو مزگەوت، نیوانیو گوێم لە وتاری دوو مامۆستا گرت، دزەمکردە نێو خەڵک و بۆ یەکەمجاریش دوودڵییەکی زۆرم هەبوو، سڵم لەوە دەکردەوە یەکێک مەلەکبین بێت و باڵم ببینێت و لەوێدا بمبە قوربانی سەری سەرکەشی خۆم. ڕاستییەکەی گەر ڕێزان بیزانیبایە کاری وام لێ وەشاوەتەوە، لە کەشتی دەیخستمە زیندان و ئیتر سەیری ئاسمانیشی لێ حەرام دەکردم. وتاری مامۆستایان وا توندبوو، بە نائومێدییەوە گەڕامەوە بۆ کەشتی و هەموو گیانم خەفەت و دوودڵی بوو لەوەی ئایا من چیم؟ وا بە دڵنیاییەوە قسەیان لەوە دەکرد کە من شەیتانم، خۆشم خەریکبوو ژیاننامەی خۆم لە بیربکەم و بڵێم دیارە وایە و من سەر بە عەشرەتی ئیبلیسم..

چیرۆکەکە وا بانگی بۆ درا، وەک ئەوەی شەیتان و یاوەرانی لە شاردا هەواریان هەڵدابێت و دەبێت بۆ ئەو ئیماندارانە بگەڕێین کە توانای بینینی ئیبلیسە باڵدارەکانیان هەیە. هەر ئەو هەفتەیە وشەی بەچکە ئیبلیس و شەیتانۆچکە وەها کەوتنە سەر زاران بوونە دوو وشەی ڕۆژانەی باو. ڕاستییەکەی شتێک بە قازانجی من گەڕا نەوەبوو، هەندێک لە عولەما لەم چیرۆکەدا وەک شوانە درۆزنەکەیان لێ هات کە هەموو جار دەیکردە هات و هاوار «گورگان هاتن... گورگان پەلاماریاندا ... گورگان دایان بەسەر مێگلەمدا»، تا خەڵک باوەڕیان لە دەستدا و ئەوێ ڕۆژ کە گەلە گورگ بەڕاستی دەرکەوتن، کەس بە فریای شوانەوە نەهات. پێشتر هەندێک لە مەلاکان، هێندەیان گوتبوو شەیتان لە ناوماندایە، شەیتان لێرەیە، شارەکە بووە بە کولانەی ئیبلیس، ڕوو لە هەر کوێ دەکەین مەزهەری شەیتان و نیشانەی دیارە... ئیتر ئەمجارەش کە کردیانەوە هات و هاوار، کە گوتیان شەیتانمان بینیوە و شەیتان شێوەی خۆی گۆڕیوە و شەیتان

لە شێوەی خۆتاندا بۆتان دەردەکەوێت، زۆرینەی خەڵک هەر ڕایان وابوو ئەمجارەش فیشاڵبازی شوانە درۆزنەکەیە و نە شەیتان لە گۆڕێیە و نە هیچی تر. بەڵام ئەوەی ئەمجارە شتەکەی کەمێک لە سنووری ئەو خەیاڵە دینییە ترازان کە لە پشتی سەری هەموو پیاوێکی ئیمانداردایە، ئەوەیە هەموو مەلاکان پێکەوە و لە یەک هەینیدا و بە یەکجۆرە حیکایەتەوە هاتنەوە سەر ئاوازی کۆنیان. ئەوە لە بری ئەوەی خەڵک بترسێنێت، پتر پیاوانی دەوڵەت و بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی ترساند کە عەرەبێکی خەڵکی موسەیەب بوو، ئەو کات پارێزگاری شاریش هەر کەسێکی نیوە مەستی کوفەیی بوو کە هەواڵی لەوجۆرە دەیتۆقاند. لە گەرمەی ئەم هەموو جەنگ و پێکدادان و کوشتنەدا، هەواڵێکی لەو جۆرە دەکرا شار بخاتە شپرزەیی و تێکچوونێکی وەهاوە ئەو سەری دیار نەبێت. هەر بۆیە دوای ئەو هەینییە کە خەڵکێکی زۆر چیرۆکی باڵە شەیتانییەکانی منیان بەو جۆرە بیست، سەید زولفەقاری موسەیەبی و هادی خوزاعی، وەک ڕاکێتێکی درێژی زەمین بۆ زەمین لە ناوەڕاستی شاردا لە ئەردی دابێت، بە پەلە خەتیبی شاریان بانگکرد و ڕایانسپارد تا زووە چی مێزەر بەسەرێک لە شاردایە، مەلا بێت و مەلا نەبێت، لە هۆڵی کۆبوونەوە گەورەکان ئامادەبکات و کۆیانبکاتەوە. گەر بمزانییایە قسەکردنێکی من لەگەڵ مەهدیدا بە ئەنجامێکی وەها تەواو دەبێت، هەر ئەو شەوەی کە وەک تەڕاحێکی تۆپیو لەو لاکۆڵانەدا هەڵمگرتەوە، نەدەچوومە لای.

کۆبوونەوەی پیاوانی فەرماندار لەگەڵ مەلاکاندا پڕ هەڕەشە و گوڕەشە بوو، دەوڵەت ترسی هەبوو قسەیەکی وا ببێتە مایەی ئاژاوەی گەورە، سەید زولفەقار بە ڕوونی بە هەموانی گووت، ئەوەی دەیەوێت شەڕ لەگەڵ شەیتاندا بکات، بچێت بۆ بەرەکانی شەڕی پیرۆزی قادسییە، شەیتان لەوێیە. پارێزگاریش هەر هۆشیاری پێدان کە چیرۆکی وەها لەوانەیە ببێتە مایەی یاخیبوون و بەدبەختی و دوور نییە دەردەکە بگوازرێتەوە بۆ شارەکانی تر و خەڵک بە ناوی ڕاکردن لە شەیتان یاخود شەڕی ئیبلیسەوە، مزگەوتەکان بکەنە مۆڵگەی خۆیان و شوێنی داڵدە و پەناهیان

و لەوێوە ئاژاوەگێڕان بەزمەکە خۆشبکەن و وڵات تووشی چورتمێک بێت ئەوسەری دیارنەبێت. هەڕەشەکان ئاشکرابوون، دەوڵەت قەبووڵ ناکات بە ناوی شەیتانەوە مەلاکان خەڵک کۆبکەنەوە و شیرازەی ژیان بشێوێنن. هادی خوزاعی بە ڕوونی گووتی «شەیتان و باوکی شەیتانیش پێکەوە بێنە ژێر جبەکانتانەوە قسە ناکەن، دەمدادەخەن و دەڵێن ئەوە حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسحاقی کوڕێتی». مەلاکان کە پلانیان هەبوو خەڵک وریابکەنەوە، بە ئاشکرا بانگ هەڵدەن هەر کەس مەخلوقی باڵداری بینی، جەمعییەتی عولەما ئاگاداربکاتەوە، دوای قسەی سەرانی شار، لە جێگای خۆیاندا کڕ و کەساس دانیشتن و کەس هیچی نەگووت. دەوڵەت وەها دڵڕەق و بێبەزەییانە نەیارانی دەکوتا کەس بوێری قسەی زیادی نەبوو. دوای جەنگی ئێرانیش، شوێنێ ئیمانداران دە هێندە کەوتبووە ترس و لەقینەوە، لە بەرئەوە هەموو بێدەنگیان پێ باشتر بوو لەوەی خۆیان بکەن بە سوورەی بەر لەشکر و سەرتۆپی ئیمانداران. مەلاکان کە هاتنەدەرێ، بێئەوەی کەس ورتەی لێوە بێت، ملی ڕێگایان گرت و بەرەو ماڵی خۆیان گەڕانەوە و هەندێکیان تا ئەمڕۆ دەربارەی ئەو مەجلیسە ورتەیەکیان لێوە نەهاتووە. ئەو ڕۆژە مەلا ئەسعەدی مزگەوتی ئاشنایانیش لەوێ بوو، وەک هەموو ئەوانی دی نە فزەی کرد و نە جوکە، بەڵکو خۆی وا پیشاندا شتەکان ئاسایین و هەر دەبێت وابن و بێدەنگی لێرەدا ئەوپەڕی حیکمەت و عەقڵە.

هەر ئەو شەوە کۆبوونەوەیەکی چوار قۆڵی ترسناک لە نێوان مەهدی دەریایی، مەلا ناجی سەڵتەپۆش، مەلا ئەسعەدی مزگەوتی ئاشنایان، مەلا مونزیر ئەبوبەکردا ڕوویدا. ڕودانی ئەو کۆبوونەوەیە گرنگییەکی زۆری هەبوو، لەوێدا مەلا مونزیر لە بێدەنگی و لەخودانەترسی پیاوانی جەمعییەتی عولەما پڕ دەبێت و دەڵێت، چیتر لە ڕێگای جەمعییەتەوە ناتوانین شەڕی گەورەی ئیبلیس بکەین و بە ڕۆژێک گەیشتووین بۆ بەرگری لە خودا دەبێت چەک هەڵبگرین، ڕۆحانییەتی ترسنۆک و دوو ڕوو بلەرزێنین و دوژمنانی خودا و ئەتباعیان لە ئەهریمەن پەرستان بترسێنین.

مەلا گووتی «وای ئەوە چ ئیمانێکە لە بەر خاتری هادی خوزاعی خودا لە بیربکەین و بە ئیبلیسی مەلعون بڵێین حەزرەتی ئیبراهیم». مەلا ئەسعەد کە پێدەچوو لە مۆش چوونەکەی کردبێتە مایەی شانازی و وەک مەدالیا لە بەرۆکی خۆی دابێت، چەند ڕۆژ بوو بەخۆی دەگووت «تەنیا ئیماندارێک کە شەیتانی لە هەیئەتی کامیل و موکەمەلیدا بینیوە، منم». ئەو تەنیا مەلەکبینی ناو مەعشەری مەلاکان بوو، دەمێک مەلا مونزیر قسەکانی تەواوکرد، دەستیکرد بە گریان و گووتی «وای ئەگەر ئیبلیستان وەک من بدیایە، وەک من ئەو باڵە ترسناکە سپییانەتان بکەوتایە بەرچاو، تا ماون لە خەوفی خوا غافڵ نەدەبوون، هەموو دەبوون بە سەربازی تەبارەک وە تەعالا. مامۆستا گیان سپێتی باڵی ئەو مەلعونە، وەک سپێتی بەفر نەبوو، خودای واحیدولقەهار بەو سەرەوە شاهیدە کە سپێتی ڕۆحێکی پاک نەبوو، وای قوڕ بە سەرمان بۆ خۆمان و عاقیبەتمان، سپێتییەک بوو وەک نیشانەی نەبوونی بڕوا بێت، نیشانەی ئەوەبێت ئەو مەلعونە چەند لە بەرەکەت و ڕەحمەتی خودا موجەڕەدە... مەلا گیان، عەزیزم، من بۆ بوورامەوە، هەر ئەو باڵانەم بینی یەکسەر زانیم خودا هەقە، دین هەقە، مامۆستا واوەیلا لە خۆم و لە قەدەرم، هەر بینیم تاسام، سپێتییەکە ئەوەی پێوە دیاربوو پێشتر ڕەنگێکی تری لە سەر بووبێت، بەڵام خودا کە ئەم مەلعونە و ئەعوانی لە فیردەوسی موبارەک دەرکردوە، هەموو شتێکی لێ سەندون... تێمدەگەیت مامۆستا گیان، سپێتی تەیرێکی خواگرتووی هەبوو، تەیرێک هەموو شتێکی لێ زەوتکرابێت، سپێتی جانەوەرێک خودا لە نێو مەخلوقاتی خۆی وەدەریناوە و جگە لە ژیانێکی خاڵی و پەتی، هیچی نەداوەتێ ... ئا لەویادا شایەتومانێکی بە هەقم هێنا و لە جێی خۆم هەستام پەلاماری ئەو مەلعونە بدەم، ئیتر ئەوەبوو ترسی خودا وەها لە دڵی دابووم بێهۆش کەوتم». مەلا مونزیر کەیفی بەوە نەدەهات مەلا ئەسعەد بەوجۆرە شتەکەی دەگێڕایەوە و ئەزموونێکی باسدەکرد کە خودا نیعمەتی تێگەیشتنی بەو نەبەخشی بوو، بەڵام گووتی «ئەسعەد گیان، خودا واجبێکی گەورەی ناوەتە ئەستۆی تۆ، بتەوێت و نەتەوێت تۆ ئێستا تەنیا کەسی دەتوانیت ئەو مەلعونانە ببینیت». مەلا ناجی سەڵتەپۆش

ئەو ڕۆژەش بە قاتێکی نیللی گەلەک جوانەوە دانیشتبوو، وەک هەمیشە خۆی وا پیشاندەدا جگە لە ترسی خودا، غەم و خەیاڵاتێکی تری نییە. هەر سێ مەلاکە ڕێکبوون لە سەر ئەوەی نابێت هەروا دابنیشن و بە قسەی مەقاماتی حوکمدارێکی عەلمانی کافر دەستبەرداری فەرمانی دینی خۆیان بن. دیاربوو مەلا مونزیر جوان بیری لە هەموو شتێک کردۆتەوە، گووتی «من بە واجبی دەزانم کە شەڕی خۆمان دژی شەیتانەکان ڕابگەیێنین، بۆیە ئێوەم بانگکردوە متمانەم پێتانە، بۆیە مەهدیشم بانگکرد دەمەوێت بەڕاستی خۆی پاکبکاتەوە و لە ڕێگای نەقاوەت و تەهارەتەوە ئەو ئیبلیسە ببەزێنێت کە شکڵ و شێوەی ئەمی دزیوە. دڵنیام ئیبلیسەکان زۆرن، یەک و دووان نین، دەزانم ئەعوان و کۆمەککاریان زۆرە، بەڵام ئێستا جگە لەم مەهدائیلی مەلعونە، ڕێگای ترمان لە بەردەستدا نییە، بگەینە سەرچاوەیان... ئەو ڕێگای گەورە و ئەو دەرگای سەرەکیمانە بۆ گەیشتنەوە بە باری تەعەلا کە دیارە لێمان زیزە و توڕەیە، وا دەمانخاتە بەر تەجروبەی وەهاوە». مەلا ناجی سەڵتەپۆش، دەستێکی درێژی بە ڕیشیدا هێنا و گووتی «مامۆستا مەلا مونزیر، تەگبیرتان بە چییە، ئێوە چی بفەرموون من لە قسەتاندام». مەلا مونزیر لە ژێر برۆ زەردە ئەستوورەکانییەوە، سەیرێکی هەر سێکیانی کرد و گووتی «من چیم بەقوربان، بەس خودای تەبارەک وە تەعالا ئەمردەکات، هیچ ڕێگای وەهامان لە بەردەمدا نییە. گەر جەمعییەتی عولەما و مەلا ورگ زلەکانی دەوری مامۆستا مەلا حسامەدین بە واجبی ئاینی خۆیان هەڵنەستن، دەبێت ئێمە هەستین. دەبێت هەر ئەمشەو جەمعییەتی دوژمنانی شەیتان دامەزرێنین و بە وریاییەوە ئیشبکەین، خۆ سەر و بنی کارەکە مەعلومە، دەبێت ئەو ئیماندارانە بدۆزینەوە کە توانای بینینی شەیتانیان هەیە... چیترمان لە بەردەمدایە جگە لەم ڕێگایە، ژیان کورتە و کاتمان کەمە؟ کاتێک ناهێڵن بە ئاشکرا شەڕی شەیتانی لەعین بکەین، دەبێت ژێرا و ژێر دەست بەکاربین. جگە لەوە چ چارە و عیلاجێکی ترمان هەیە؟»

ئەو ڕۆژەی هەینییە کە مەلاکان وتاریان دا، ڕێزان خانی مەلەکبین، بە جۆرێک دوودڵی گرتی، تکای تێدا کردم ئیتر کەشتی بەجێ نەهێڵم و واز لە خولیاکانی خۆم بهێنم دەربارەی نزیککردنەوەی ئینسان و فریشتەکان، ماوەیەکیش بوو میرائیل کارێکی کردبوو زۆربەی فریشتەکان ئارەزوویەکیان نەبوو گوێ لە وتەکانم دەربارەی ئینسانییەتی فریشتە و فریشتەبوونی ئینسان بگرن. من گووتم کە مانای من لە بووندا ئەوەیە بۆ فریشتە نەخۆشەکان بگەڕێم و ئیشم ئەوەیە بەدوای ئەو بێلانە و بێکەسانەدا عەودالبم، چۆن دەمکرێت هەر لەگەڵ دەرکەوتنی سەرەتای یەکەم ترسدا بکشێمەوە و خۆم لە ژوورێکی تاریکدا بشارمەوە و لێگەڕێم بیمارەکان لە دەرەوە، لە سوچ و کەلێنی بێمروەتی ئەم شارەدا بمرن و کەس لێیان نەپرسێتەوە. من سوێندم بۆ ڕێزان خوارد کە ئاگاداردەبم و خۆم دەپارێزم و هەوڵدەدەم کەشتی لە هەموو بەلایەک لابدەم.

وەک پەیمانم دا، شەوان درەنگتر لە جاران دەچوومەدەرێ، وریاتر دەسوڕامەوە، پتر لە چاوی خەڵک وردەبوومەوە بزانم بە نیگایاندا دیارە باڵەکانم دەبینن یان نا، گەر گومانم لە یەکێ بایە، زوو ئەو جێگایەم جێدەهێشت و بە ڕێگایەکی پێچاوپێچ و وێڵکەردا دەگەڕامەوە ماڵ. بەر لە گەشتنیشم بە کەشتی، بە چوار دەوری خۆمدا دەمڕوانی، تا سەد دەر سەد دڵنیانەبوومایە کەس لە دوام نییە، هەنگاوی ترم نەدەنا.

لەو ماوەیەدا، جەمعییەتی دوژمنانی شەیتان لە ژێرەوە گەورەدەبوو. من گەرچی زۆر حەزمدەکرد مەهدی ببینمەوە، بەڵام چونکە سوێندم بۆ ڕێزان خواردبوو خۆم نەخەمە مەترسییەوە، هەوڵێکی وەهام نەدەدا بیبینم و بیدۆزمەوە. هێشتا سێ مانگ بەسەر کۆبوونەوەکەی من و جەمعییەتدا تێنەپەڕی بوو کە لە شەوێکی تاریکدا دونیای فریشتەکان گۆڕا، من چەندین ساڵ بوو بەردەوام لە شەوی ئەم شارەدا بۆ فریشتەی بیمار دەگەڕام، تا ئەو کاتە شتی وەها نەژیابووم و دیمەنی وەهام نەبینیبوو. شەوێکی تاریکبوو، زوڵمەت خەست و هەوا سەنگین بوو. هێمن بە خۆم و عەرەبانەکەمەوە یەکێک لە کوچەکانی باشووری شار دەگەڕام. زۆربەی ئەو

کوچانەی باشوور بێ دار و درەخت بوون، بەڵام جارجار ڕێدەکەوێت لە یەکێک لە کۆڵانەکاندا دار توویەکی گەورە، یان گوێزێکی زەبەلاح لە ئەردی کوچە خۆیەوە یان لە باغی ماڵێکی نزیکەوە لقی درێژدەکرد و سێبەرێکی گەورەی بڵاودەکردەوە. دارەکان کەمبوون، بەڵام هەر وەختێک ڕێکەوتی یەکێکیانت بکردبایە، بە جۆرێکی سەرسوڕهێن گەورە و زەبەلاح بوون. یەکێک لەو دارانە دەکەوێتە سەر سوچێکی گرنگەوە لە نێوان شەقامێکی سەرەکیدا کە بەرەو ناوەڕاستی شار وەردەگەڕێت، لەگەڵ کوچەیەکی تەسکدا کە ڕێبواران بەرەو کۆڵانە کۆن و باریکەکانی شار داوەتدەکات، ئەو شەوە لەویادا و لە بەردەم ئەو درەختەدا سەرسام و غەمگین بۆ یەکەمجار دوو فریشتەی خنکاوم بینی بە درەختێکدا هەڵواسرابوون. دەستێکی دڕندە قۆڵی هەردووکیانی بەستبوو، باڵی هەردووکیانی شکاندبوو، ملی هەردووکیانی کردبوو بە پەتدا و لەوێکانەدا بە کوژراوی جێیهێشتبوون. کە دەستم لە لاشەکان دا، پێدەچوو دوو ڕۆژ زیاتر بێت مردبن. هەستم بە دوودڵی و نادڵنیایی کرد، ترسام تەڵەیەکی گەورە بێت و منیشی تێبکەوم، بەڵام دیمەنەکە وەها غەمگین و ترسناک بوو، بە جۆرێک بەنجیکردم و دەست و پێی سڕکردم، ماوەیەک نەمتوانی لە جێگای خۆم بجوڵێم. گەر داوبایە و بیانویستبایە تێیبکەوم، لەوێدا دەیانگرتم و لە تەنیشت فریشتەکانەوە دەیانخنکاندم. بەڵام ئاشکرا مەلەککوژەکان ئەو دوو فریشتە نەخۆش و لاوازەیان گرتووە و لەوێدا هەڵیانواسیوون و ڕۆیشتوون. دوو فریشتەی باڵ شکاوی لاواز بوون لەوانەی تەنیا چاوانی مەلەکبینەکان دەیانبینن. لە دڵی خۆمدا هاوارمکرد «مەلەککوژەکان لێرەن». ئەوە سەرەتای دەرکەوتنیان بوو، ئەوە یەکەم نیشانەیان بوو، هەرچۆنێک بوو، بەسەر درەختەکەدا هەڵگەڕام و لاشەکانم داگرت و خستمنە سەر عەرەبانەکەم و هێنامنەوە بۆ کەشتی. ڕاستە و ڕاست لاشەکانم برد بۆ گۆڕستانەکە و بێئەوەی کەس پێ بزانێت، بێچرپە خۆم کردەوە بە کەشتییەکەدا و چووم بۆ بینینی ڕێزان خان. گەرچی شەو درەنگ بوو، بەڵام ئەو تا ئەو کاتە لە ژووری کتێبخانەکەدا خەریکی خوێندنەوە بوو. پێمگووت «خانم هەستە، هەر ئێستا شتێک هەیە دەبێت

بیبینیت». ئەو وەک بزانێت شتێکی گرنگ هەیە، بێئەوەی هیچ بپرسێت، لە تەکمدا هاتە دەرەێ. پێشیکەوتم بۆ سەر لاشەکان و داوام لێکرد بە وردی لێیان وردبێتەوە. گووتم «تەماشابکە هەردووکیان خنکێنرابوون، هەردووکیان بە دارێکی گەورەوە لەو کۆڵانانەی باشووری شار هەڵواسرابوون. ئەم فریشتانە نەمردون، بەڵکو کوژراون». بە وردی سەیری لاشەکانی کرد و دووجار گووتی «دڵنیایت؟... دڵنیایت؟». گووتم «خانم بە دەستی خۆم لە پەتەکەم کردنەوە و دامگرتن، پێدەچێت دوو شەو لە مەوبەر بووبێت، دوو شەو لەمەوبەر. دڵنیام مەلەککوژەکان لێرەن». هەستم پێکرد دەستی دەلەرزێت، بە ترسەوە گووتی «گەر وابێت دەستیان پێکردوە». منیش دڵنیابووم دەستیان پێکردوە. گووتی «ئیتر مەچۆ دەرەوە، تەواو مەچۆ دەرەوە». بە هێمنی پێمگووت «گەر بکرایە نەدەچووم، بەس ئیتر ناکرێت، گەر نەچمە دەرێ ئاگامان لە دونیا نابێت، کێ هەواڵێکمان بۆ دەهێنێت؟. بەڵام دەرگای پێشەوە بەکارناهێنم، هەوڵدەدەم لە پشتەوە دەلاقەیەک دروستبکەم و لەوێوە بێم، گەر لە پشتەوە بگەڕێمەوە، رووبەرێک چۆڵەوانی گەورە هەیە، دەتوانم هەر کەسێک لەوێوە بێت، بیبینم. هەر کەس لە دوام بێت ئاسانتر ئاشکرا دەبێت». ڕێزان دەیزانی لە سەر هەقم، گەر من هەر لە کەشتی دانیشم لە هەواڵی دونیا دەپچڕێین و ڕۆژێک بێئەوەی بزانین چی بووە دەگەنە سەرمان.

دوای ئەو شەوە بۆ ماوەی مانگێک هیچم نەبینی، هەندێ فریشتەی نوێم هێنا بۆ کەشتی، ئەوانیش شتێکی ئەوتۆیان نەبینیبوو، بەڵام ئەو هێمنی و ئارامییە هەمووی کورت خایەن بوو، شەوێک لە پشتی دائیرەی سەربازگیریی لە کەلاوەیەکدا لاشەی فریشتەیەکی ترم دۆزییەوە کە زۆر دڕندانە سەربڕدرابوو، باڵەکانی بە تەور شکێنرابوون و جەستەی هەموو جێگە زامی گەورە گەورە بوو. شێوازی کوشتنەکەی ترسناک بوو، وەک ئەوەبوو بۆ ترساندن بەو جۆرە کوشتبێتیان، وەک بیانەوێت فریشتەکانی تر بیبینن و بتۆقن. هەر ئەو شەوە کە لاشەی ئەو فریشتە سەر بڕدراوەم

دۆزییەوە، فریشتەیەکی بچوکی ترم ناسی کە پێدەچوو دوور بە دوور ئاگاداری من بووبێت و چاودێری کردبم. فریشتەیەکی لاواز بوو، لە دوورەوە بینیم، بانگمکرد و گووتم « وەرە.. وەرە ئەی فریشتەی بەدبەخت، وەرە. مەترسە، من وەک خۆتم». وەک پشیلەیەکی شەرمن بێت و خۆی لە تاریکیدا ونبکات، هەوڵیدا ڕابکات. کچێک بوو بە دوو باڵی زۆر باریک و چکۆلانە و جووتێک چاوی شینەوە، بە جۆرێک شین کە تاریکایی شەو نەیدەتوانی داپۆشێت. کە پێمگووت مەترسە، لە جێگای خۆی وەستا. بە هێمنی لێی نزیکبوومەوە، باڵەکانی خۆم پیشاندا و گووتم «سەیریبکە، منیش وەک تۆ وەهام، باڵم هەیە». لێمپرسی «دەزانیت کێ ئەو لاشەیەی وا لێکردوە، کێ سەریبڕیوە؟». هەموو شتێکی بۆ گێڕامەوە، فریشتەیەکی نەخۆش بوو، دوای دوو هەفتە لەو شەوە، لە کەشتیی فریشتەکان گیانی سپارد. دەیگووت دوو پیاو و ژنێک بوون، بە تەور کوشتوویانە، دەیگووت ئەو بکوژانی بینیووە و هەڵهاتووە. دەیگووت چەند شەوە زۆربەی کات لەم کۆڵانانەدا دەگەڕێن، دەموچاویان داپۆشراوە، بە دزییەوە دەسوڕێنەوە، ئەم کوچە و ئەو کوچە دەکەن، کەمجار دەچنە سەر شەقامە گشتییەکان. دواتر تەواوی چیرۆکەکەشی جارێکی تر، بۆ ڕێزان گێڕایەوە. من هەر ئەو شەوە لەگەڵ خاتوونی کەشتیدا جارێکی تر دانیشتم، پێمگووت، لێمگەڕێ لەگەڵ مەهدیی دەریاییدا قسەبکەم، دەزانم ترسناکە، دەزانم چاوەڕوانی ئەوەن من دەربکەوم، دەزانم بۆ من دەگەڕێن، بەڵام گەر مەهدی ڕازیبکەم واز لە کۆمەکیان بهێنێت، لایەنیکەم من ئەوەندە هەست بە پەشیمانی و نائومێدی ناکەم. ڕێزان ئەوەی لێ قەدەغەکردم ... نەک هەر ئەوە، ئەمجارە بە ڕاستی چوونە دەرەوەی زۆر بۆ سنووردارکردم، مەترسییەکان چیتر ڕاگوزەر و تێپەڕ نەبوون. مەلەککوژەکان لە شاردا بوون و بە هەموو توانای خۆیان پەلاماریاندەدا.

بڕیارەکەی ڕێزان بۆ من کوشندە بوو، هەفتانە دەبوو یەک شەو بچمە دەرێ. من فریشتەیەکی ئازاد و بەرەڵا بووم، هەموو لەزەتی ژیانم ئەوەبوو کە وەک فریشتەکانی تر لاواز نیم و عاشقی ئازادیی خۆمم. بەر لە

کەشتیی فریشتەکان، نیشتیمانی من کوچە و کۆلانی ئەم شارە بوو، گەڕانی بێوچان پیشەی سەرەکیم بوو، هیچ کوچەیەک نەبوو نەمدیبێت، سوچ و حەشارێک نەبوو بشێت فریشتە نەخۆشەکان لە ترسی با و باران و سەرما بچنە ناوی، تێی نەچووبم، کۆلانێک نەبوو مانگانە چەند جارێک گوزەری پێدا نەکەم... لە هەموو ئەو ساڵانەدا لە مرۆڤ نەترسابووم، ئێستا دوای بینینی کوژراوەکان، دوای دەرکەوتنی مەلەککوژەکان، وێنەی مرۆڤ بە جۆرێکی خێرا و کتوپڕ لە بەرچاوم دەگۆڕا. لە ناخی دڵەوە دەمویست پەت بپچڕێنم و گوێ بە خاتوون نەدەم و درێژە بە ژیانی جاران بدەم، بەڵام بڕوام بە مرۆڤ بە جۆرێکی خێرا و سەیر بەرەو کاڵبوونەوە دەڕۆیشت. شەوێکیان چوومە ناو بازنەکەی میرائیل، کە ئەویش وەک من لە فریشتە پیرەکان بوو، ئەو لە ناو فریشتە نەخۆشەکاندا بە بێباوەڕی بە ئینسان ناسرا بوو. هەموو تێڕوانینی ئەوە بوو کە فریشتە هیچ نییە جگە لەو مرۆڤەی کە بڕوای بە مرۆڤ نییە. لە کەشتی بە فەیلەسوفی فریشتەکان ناویاندەبرد، بەڵام من لەبەر ئەو بۆچوونانەی ئارەزوویەکی وەهام نەبوو گوێی لێبگرم، بە پێچەوانەوە زۆرجار کێشە و گرفتیشم بۆ دروستدەکرد، بەتایبەت ئەو لە مەلەکبینەکانی وەک دکتۆر شوکاک و بولبولیاریش بە گومان بوو. هەر لە هەفتەی یەکەمەوە هەستم بەوە کرد کە ئیتر هێدی هێدی وادەم بەسەر دەچێت و پیردەبم و کاتی مردنم هاتووە، تاکە هێزێک تا ئەو کاتە توانای بەردەوامی و ژیانی دەدامێ، چوونە دەرەوەکانم بوو، بەڵام لەو کاتەوەی ڕێزان ئەوەی لێ قەدەغەکردم، ڕەشبینییەکی کوشندە لە دڵەوە گرتمی. هەموو هەفتەکە چاوەڕوانی ئەو شەوەم دەکرد بێت و بچمە دەرێ. بەڵام کە ئەو شەوەش دەهات، چوونە دەرەوەم لەزەت و خۆشی جارانی نەبوو، کەم جار هەبوو نەچمە دەرەوە و لاشەی فریشتەیەکی کوژراو نەبینم.

شەوێکیان وەک هەمیشە لە گەردش و گەڕاندا بووم، کات هێدی هێدی بەرەو درەنگی دەڕۆیشت و بە نیازی گەڕانەوە بووم بۆ کەشتی. لە ناکاو گوێم لە دەنگێکی کز بوو لە جێگایەکەوە بانگمدەکات «تۆ، تۆ...

پیاوەکە، پیاوە باڵدارەکە تۆ؟». دەنگێکی سووک و لاواز بوو، سەرەتا نەمبینی، بەڵام وەستام و سەیری دەورووبەری خۆم کرد، دوایی تارمایی کەسێکم بینی لە ژێر چەرداخی سەر لۆرییەکی نزیکەوە سەر دەردەهێنێت و دەڵێت «لێرەم، لێرە وەرە». هێمن بەرەو لای دەنگەکە چووم، گووتی «وەرە ئێرە، خۆت بشارەوە، تەور بە دەستەکان لەم ناوەن». بە ترسەوە سەیری دەورووبەری خۆم کرد و هیچم نەبینی، بە چپەوە گووتی «پەلەبکە، چی دەکەیت؟ هەر ساتێک بێت دەردەکەون، لەودیوەوە لە سەر شەقامەکانن، وەرە ژێر چەرداخەکە». سەرکەوتم و پێکەوە چووینە پشتی لۆرییەکە. گووتی «برۆ ئەو سەر، ئەوسەر، لەوێوە سوچێکی چەرداخە لادە و سەیربکە، ئێستا دێنەوە، نەهێڵیت هەستمان پێبکەن، بزانن کوژراوین». فریشتەیەکی زۆر لاواز بوو، بەڵام زۆریش گەنج و گورج و گۆڵ و بەتوانا. ماوەیەک بێدەنگ لە پشتی لۆرییەکەداماینەوە و هیچ نەبوو، دووجار ویستم بازبدەمە خوارێ و برۆم، گووتی «نەکەیت، کاری وا نەکەیت، خۆت بە کوشت مەدە، دەزانم تۆ کێیت، نەمزانیبایە بانگم نەدەکردی، تێدەگەیت، چوار ساڵە لێرەم، دەزانم چی دەکەیت... بێدەنگ بە کاتی ئەو قسانە نییە، کاتی ئەو قسانە نییە». چەند دەقیقەیەک دواتر دەرکەوتن. چوار پیاوبوون، زل و بە قەڵافەت، هەر چواریان تەوریان پێ بوو، فریشتەیەکی ژنیان بە دەستەوە بوو، پێدەچوو نەیانویستبێت لە سەر شەقامە گشتییەکە بیکوژن و ئەم کۆڵانەیان پێ سەلامەتتر و چاکتر بووبێت، پەنجا مەترێک دوور لە لۆرییەکە وەستان، یەکێکیان بە دەنگی بەرز گووتی «بسم الله الرحمن الرحیم، اعوذ بالله من الشیطان الرجیم». وای گووت و بە تەواوی توانای تەورێکی ئاوقای گەردنی فریشتەکە کرد، سیانەکەی دیش هەر سێکیان بە نۆبەت چەند گورزی کوشندەی تریان وەشاند، فریشتەکە دەنگێکی لێوە نەهات، هێند هەبوو لە گورزی یەکەمەوە کەوت و گیانی تێدا نەما. ئینجا من و ئەو فریشتەیەی تر، جگە لە دەنگی تەورەکان، دەنگێکی ترمان نەهاتە گوێ. هێند نزیک بوون گەر بەرز هەناسەمان بدایە دەیانبیست. من لە درزی چەرداخەکەوە جوان سەیری مەلەککوژەکانم کرد، یەکێکیان نەبێت ریشی هەبوو، سیانەکەی تر

پیاوی ئاسایی بوون زیاتر لە فەرمانبەری دەوڵەت، مامۆستای زانکۆ، بازرگانی گەورە دەچوون تا مەلەککوژ. ئەو شەوە چەند لەگەڵ فریشتەی چوست و چالاکی پشت لۆرییەکەدا خەریکبووم لەگەڵم بێت بۆ کەشتیی فریشتەکان، سوودێکی نەبوو. فریشتەیەکی بە جوڵەی بزۆک بوو، دەتوانم بڵێم تا ئەوکات لە ژیانمدا فریشتەی هێندە سەرەحاڵ و زیندووم نەدیبوو، گووتی من فریشتەی ناو جێگا و ناو ماڵ نیم، کەسێکی گەڕۆکم، دەچمە هەموو جێگایەک، هەموو شوێنێک، لە نزیکەوە دونیا دەژیم، جێگاکان تاقیدەکەمەوە، ڕووداوەکان بە چاوی خۆم دەبینم. هەموو شتێکی لە سەر ئیشەکەی من دەزانی، گووتی «نا ئەو جێگایەی ئێوە بە کاری من نایەت، مەترسە من خۆم دەپارێزم، من فریشتەیەکی نەخۆش نیم، دەتوانم ڕابکەم، گەر بشفڕیبام هەر هێندە خێرا دەبووم ... من ماڵی خۆمم هەیە، خاوەنەکەم مامۆستایە، ماوەیەکە لێرە نییە، هەر خۆم بە تەنیا دەژیم، گەر دەتەوێت وەرە و لەگەڵمدا بژی». سوپاسمکرد و گووتم «من جێگا و ڕێگای خۆمم هەیە و بمبەخشە و کارم هەیە و ناتوانم فەرامۆشیبکەم». نەمزانی ناوی چییە، ویستم ناوێکی بدەمێ، گووتی «نا پێویست ناکات. ناوم نییە، ناوم نییە، ڕقم لە ناوە... فریشتە دەبێت فریشتە بێت و بەس». تێنەگەیشتم مەبەستی چییە، بەڵام دەمێک بەجێمهێشت، هەم دەنگی و هەم قسەکانی لە گوێمدا زرەنگەیان دەهات.

دوای ئەو شەوە ترسەکانم گەورەتر بوون، هێدی هێدی بە دانیشتنی درێژ لە کەشتییەکەدا ڕاهاتم، دونیای ناوەوەی کەشتییەکە تا دەهات تاریکتر و غەماویتر دەبوو، فریشتەکان زۆرتر دەمردن و کەمتر دەهاتە جێگایان. وام لێهات کاتێکی زۆرم لە مەجلیسی مارائیلدا بە بێدەنگی دەبردەسەر، خۆم لە هەموو بوونەوەرێک دەدزییەوە و لە هەر ڕووبەڕووبوونەوەیەک هەڵدەهاتم. کاتی هەرە زۆری خۆم دایە ئەم نوسینە، بە هۆیەوە ڕابوردووی خۆم ڕۆژ بە ڕۆژ بەیادا دەهێنایەوە، بووم بە فریشتەیەک هێندەی بۆ یادگار دەژیم بۆ پاشەڕۆژ نەدەژیام. ئیتر بۆ من شتێک نەمابوو ناوی پاشەڕۆژ بێت. لەو ماوەیەدا ڕێزان دەیویست دڵ خۆشم بکات، بەڵام

تا دەهات هەستی پیری و مردن زیاتر و زیاتر بە سەرمدا زاڵدەبوون. ئەو ماوەیە ئیدی من هەر نەدەچوومە دەرێ. هۆشەنگی بولبولیار لە بری من جار جار دەکەوتە گەڕان بەدوای فریشتەکاندا، بەڵام ڕاستە ئەو مەلەکدۆستێکی گەورە بوو، بەڵام نە توانی زانیارییەکی وەها گرنگ بهێنێتەوە بۆ کەشتی و نە هەستی بەو دۆخە تاریک و ترسناکە کرد کە مەلەککوژەکان دروستیانکردبوو.



لە کۆتاییەکانی ساڵی نەوەددا، شەوێک مەلایەک بە ناوی «مەلا ئەرسەلانی عەسکەری» بەخۆی و دەستنوسێکی کۆنەوە دەچێت بۆ ماڵی مەلا مونزیر، ئەو یەکێکە لە مەلککوژە هەرە درەکان، شەوان لەگەڵ دوو کەسی تردا کۆڵانە و کۆڵان شار بەدوای فریشتەدا دەگەڕێن و بە ڕۆژیش سەر دەکاتە سەر خوێندنی ئیلاهیات و خوێندنەوەی ئەدەبیاتی دینی. دوو ڕۆژ پێشتر لە ناو کۆمەڵێک دەستنوسی کۆندا کە پاشماوەی بیست و پێنج ساڵ لە مەوبەری دینداریکی کۆچکردوە، یاداشتەکانی ئیسماعیلی مەلەککوژ دەدۆزێتەوە و یەکسەر هەست بە بایەخە گەورەکەی دەکات بۆ تێگەیشتن لە مێژووی دەرکەوتنی شەیتان لە شارەکەدا. لەوێدا هەموو شتێک لە سەر ماڵی حاجی سمایلی مەلەکبین هەیە کە وەک مۆڵگە و نیشتەجێی دێرینی شەیتانە گەڕۆکەکان ناوی هاتووە. زانیارییەک، مەلا ئەرسەلانی عەسکەری پێیوایە شایەنی ئەوەیە بگاتە دەست بەرپرسە باڵاکانی جەمعییەتی دوژمنانی شەیتان کە تا دێت ئەندام و هەوادارانی نهێنیان لە زیادبووندایە. ئەو یەکەم کەس بوو سەرنجی مەلەککوژەکانی بۆ ئەم کەشتییەی ئێمە ڕاکێشا. شەوێک کە من لە حاڵێکی پەرێشاندا بووم، لە پەنجەرەی ژوورەکەی خۆمەوە لە قاتی سەرەوە سەیری شەوی کشاوی ناو باغی کەشتییەکەم دەکرد، لە ناکاو ناخم بە جۆرێکی بێمانا خرۆشاو

ترسێکی کتوپڕ دایگرتم، هەستێک بوو پێشتر تێیدا نەژیابووم و ڕۆحم پێی ڕانەهاتبوو، خرۆشێکی توند دەرونی گرتم و هەستمکرد مەهدی دەریایی گەلێک لێمەوە نزیکە... وەک زەنگی مەترسییەکی گەورە لە سەرمدا لێبدات، زەنگێکی گەورە کاسیدەکردم و لەرینەوەی دەنگی هەراسانیکردم. لەوێ بوو، مەهدی دەریایی بە خۆی و تارماییە قورسەکەیەوە، بە ئێسکە گران و هەنگاوە پانەکانییەوە لەم دەور و دوکانە بوو. بە پڕتاو چوومە خوارێ و گوێم لە دەنگی بەرزی ڕێزان خانی مەلەکبین بوو توند دەیقیژاند و دەیگووت «هەقتان نییە، بە هیچ جۆرێک هەقتان نییە، شتەکە موڵکێکی تایبەتە، هیچ کەسێک جگە لە من خاوەنی بڕیار نییە». زیاتر گوێم شلکرد و دەنگی مەلا مونزیر و مەهدی دەریایم ناسییەوە. هیچ شتێکی ڕوون لە قسەکانیان تێنەگەیشتم، بەڵام بە پڕتاو ڕۆیشتم کارەبای هەموو بیناکەم کوژاندەوە و بە خێراییەکی گەورە چوومە سەرێ و دەستەی کلیلەکانم هەڵگرت کە دەمزانی لە کوێدایە و دەرگای هاتنە ژوورەوە و سەرکەوتنم بۆ قاتی سەرەوە و بۆ ژوورەکان هەموو داخست. هەرچییەکم کردوە نەدەبوو بهێڵم مەلەککوژەکان سەربکەونە قاتی سەرەوە و فریشتەکان ببینن، ئەوە تاکە شتێک بوو لەو کاتەدا بۆم دەکرا. دواتر گوێم ڕادێرا و هەستمکرد دەنگەدەنگێکی زۆر لە خوارەوە دەستی پێکرد، من هیچ تێنەدەگەیشتم، تەنیا گوێم لە ژاوەژاوێک بوو، نەمدەزانی دەڵێن چی یاخود چییان نیازە، بەڵام باشترین شت لام ئەوە بوو، کارەبای ماڵەکە ببڕم و دەرگاکان دابخەم تا فریشتەکان نەبینن. دڵنیابووم مەلەککوژەکان لێرەن، بۆنمدەکردن، هەستم پێدەکردن. پاش ئێستێک دونیا ئارامبووەوە، بێدەنگییەکی گەورە باڵی بەسەر کەشتییەکەدا کێشا، بێدەنگییەکی قووڵ، تا نزیکی دە دەقیقە هیچ دەنگێک نەبوو... هەتا چرکەیەکیش چییە نەدەهات. ئەو بێدەنگییە ترساندمی، خەیاڵم بۆ هەموو سیناریۆیەکی ترسناک و ڕەش چوو «چی دەبێت گەر ڕێزان خانیان کوشتبێت، بردبێتیان یاخود شتێکیان لێ کردبێت؟ کێ دەڵێت تەڵە نییە تا ئێمەی فریشتە لە پەناگای خۆمان بێینە دەرەوە و هووروژم بهێنن و بە تەور بکەونە وێزەمان». دوای وەستان و تێڕامانێکی زۆر، هەر دەبوو

بەسەر دوودڵی و وەسواسی خۆمدا سەریکەوم و بێمەدەرێ. لە سەرەخۆ هاتمە خوارێ، دەرگای نێوان قاتی سەرەوە و خوارەوەم کردەوە و جارێکی دی لە پشت خۆمەوە دامخستەوە، لە سەر نوکی پێ و بێئەوەی هیچ دەنگێک دروستبکەم، بەرەو بەر دەرگای ژووری خانم ڕۆیشتم، گوێم نا بەدەرگاکەوە، بێدەنگییەکی ترسناک و کوشندە حاکم بوو، وام هەستکرد کەس لە ژوورەکەدا نەبێت، وەک هەمیشە بە سووکی و ترسەوە دەرگاکەم کردەوە، بەڵام خانم بە ڕێکی و قنجی و بە شانازییەکی ژنانەی کوشندەوە لە سەر کورسییەکەی خۆی لەبەردەم کۆمەڵێک مۆمدا دانیشتبوو، ڕوومەتی کەمێک سوور هەڵگەڕابوو، نەمزانی تیشکی مۆمەکان ئەوجۆرە ڕەنگەیان داوەتێ یان هەڵچوون و خرۆشانی پێش ئێستا وەها ڕەنگیانکردبوو. چاوانی غەمگین، بەڵام لە جاران شکۆدارتر دیاربوون. بەر لەوەی بهێڵێت بچمەژوورێ، گووتی «برۆ کارەباکە هەڵکەرەوە و وەرەوە». کارەباکەم دووبارە هەڵکردەوە و بە ترس و نیگەرانییەکی زۆرەوە گەڕامەوە. گووتی «گوێبگرە مەهدائیل. چ کارێکت هەیە تەواویدەکەیت. کەشتییەکە تەواو. ئەوانەی لێرەبوون مەلەککوژەکان بوون، هاتبوون بە ناوی کڕینی کۆشکەکەوە سەیری جێگاکە بکەن، گووتم نا، من بە هیچ جۆرێک ئەم کۆشکە نافرۆشم، ئەمە موڵکی حاجی باوکمە و دوای خۆم بەجێیدەهێڵم بکرێت بە هەتیوخانە یانماڵی منداڵانی بێسەرپەرشت و بێکەس. مەهدیم لە ناویاندا ناسییەوە پیاوێکی باشە، بڵێم چی بەقوربان لە تۆ باشتر هاتە بەرچاوم، هیچ نەبێت ئێستا نوێژەکانی دەکات و ئێمە نایکەین... نا مەیکە بە گاڵتە، مەیکە بە گاڵتە».

ئەو شەوە خانم بۆی باسکردم کە زانیاری تەواوی لە سەر هەموو شتێک پێگەیشتووە، لە سەر ئەندامانی جەمعییەتی دوژمنانی شەیتان، لە سەر دانیشتنەکانیان، لە سەر بەرنامەی دامەزراندنیان، لە سەر سەرۆکەکەیان مەلا مونزیر. من لە زاری خانمەوە چیرۆکی دروستبوون و گەورەبوونی جەمعییەتەکەم لەو چەند مانگەی دواییدا بیست. نەمزانی خانم چۆن دەستی بەو هەموو نهێنییە گەورەیەدا گەیشتووە، دوایی بۆم دەرکەوت

یەکێک لە کچە مەلەکبینەکان خوشکی مەلا ئەسعەدی مزگەوتی ئاشنایانە. کچێک ماوەیەک لە مەوبەر جارجار سەردانی کەشتییەکەی دەکردین و کۆمەکی پێشکەش بە مەلەکە پەککەوتەکان دەکرد. زانیارییەکانی خانم گەیشتبووە ئەوەی بزانێت کە مەلا ئەرسەلانی عەسکەری دەستنوسەکەی حاجی سمایلی مەلەککوژی داوەتە دەست مەلا مونزیر و ئەویش لەگەڵ ئەندامە باڵاکانی دیکەدا قسەی دەربارە کردوە. خانمەکەی خوشکی مەلا ئەسعەدی ئاشنایان، دەمێک زانیبووی کەشتیی فریشتەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان مەترسی لە سەرە، هاتبووەوە کەشتی و چووبووە لای ڕێزان خان و هەموو شتێکی بۆ ئاشکرا کردبوو. دوای یەکەم سەردانیشی، چەند جارێکی دی دیدەنی خانمی کردبوو و هەر جارەی نهێنییەکی گرنگی سەبارەت بە جوڵە و نیازی جەمعییەتی دوژمنانی شەیتان خستبووە بەر دەستی. واتە دەمێک مەهدی دەریایی و مەلا مونزیر و مەلای ئاشنایان هاتن بۆ کەشتییەکە، ئەو پێشوەخت خەبەری لە هاتنیان هەبوو. دوای ئەوە پێیگوتم کە چوونە دەرەوەی من ئیتر بە ڕەهایی قەدەغەیە، چونکە گەر بتبینن لێرە دەچیتەدەرێ، حسابی من و حسابی هەموو سەرنشینان پاکە و هێزێک نییە فریامان بکەوێت. من ملکەچ و نائومێد بە خانمم گووت «خانم گیان، من لە مێژە نەچوومەتە دەرێ و تەواو نەخۆش و نائومێدم و جگە لە چاوەڕوانی مردن ئاسۆیەکی دیکەم نییە و نیازێکم نییە تا مردن بچمە دەرێ و ئومێدێکم بە ئادەمیزادان و بە خۆشم نەماوە». قسەکەشم ڕاست و دروست بوو، ئەو دەم ماوەیەکی باش بوو شەوگەڕم واز لێهێنا بوو و تەنیا بۆ نائومێدی دەژیام. بەڵام وەک هەمیشە خانم پێی بریم و گووتی « بە ڕای خۆت چەند ڕۆژت دەوێت بۆ ئەوەی شتێکی درێژ و باشم لە سەر ژیانی مەهدی دەریایی بۆ ئامادەبکەی، شتێک هەموو شتێکی تێدابێت، نهێنییەکانی و هەر شتێکی تریش کە بایەخی هەیە؟ بە ڕاستمە بەساقە، قسەکەم بە گاڵتە مەگرە». دەمودەست زانیم خانم نیازی چییە، گەرچی لەو باوەڕەدا نیم پلانەکە سوودێکی ئەوتۆی هەبێت، بەڵام ئێستا کە ئەم دێڕانە دەنوسم واتێدەگەم ئەوە هەوڵێکی گەورەی خانمە بۆ ڕێگرتن لە مەلەککوژان بگەنە سەر ئێمە،

ئەو شەوە شتێکی ئەوتۆی پێ نەگوتم، نەیدرکاند چ نیازێکی بەو ژیاننامەیە هەیە. من لە سەر داوای خانم لە ماوەی هەفتەیەکدا و بە پەلەپەلێکی بێوێنە، بە دەستخەتێکی شلّەژاو و خێرا، کە لە دەستخەتی فریشتە ناچێت، شتەکانم بۆ نوسییەوە. ئێستا ژیاننامەی دەریایم بە ڕوونی و بە هەموو لایەنە تاریکەکانییەوە خستۆتە بەردەستی. نە من و نە ئەو باوەڕمان بەوە نییە کەس بە چیرۆکەکان بخەینە ژێر گوشارەوە، بەڵام دەبوو ئەو ژیاننامە پیسە ئامادەبکەم تا وەک چەکێک بەکاریبهێنین... بۆ نا، گەر مەسەلە ڕێگرتن بێت لە قەومێکی بکوژ و خوێنخۆر. لە ڕاستیدا ئارەزوویەکی وەهام نەبوو لەگەڵ مەهدیدا بچمەوە جەنگ، دەشمزانی دەسەڵاتی مەهدی لەوە بچوکترە بیکرێت بۆچوونی ئیماندارەکان بگۆڕێت، بەڵام بیرمکردەوە، ژیاننامەیەکی لەوجۆرە هۆیەک دەبێت تا مەهدی تێبگات من نیوە خراپەکەی ئەو نیم، بەڵکو من زیاتر لەو لە خوداوە نزیکم. من ئێستا ژیاننامەی مەهدیم ئامادەکردوە و داومەتە دەست خانم و بە هێمنی هاتوومەوە سەر نوسینی چیرۆکی ژیانی خۆم، کە دەبێت بۆ ئەرشیفی فریشتەکانی ئامادەبکەم.

ئێستا شەوان، لە سەر ترسێکی دەرونی قووڵ بەئاگادێمەوە و هەڵدەستم. زۆربەی شەو خانمی مەلەکبین لە دۆخێکی خراپ و پەشۆکاودا دەبینم، هەمیشە بە ناو کەشتی و باغ و گۆڕستانی فریشتەکاندا دەگەڕێت ... هەمیشە ترسێک لە چاویدایە، هەفتەیەک لەمەوبەر پێیگووتم «مەهدائیل لێرەن، دزەیان کردۆتەوە ناو کەشتییەکەوە، شەو بەسەر دیوارەکەدا بازدەدەن و دێن و نوسراوی سەر گۆڕەکان دەخوێننەوە، من بینیوومن، تا ئێستا دووجار بینیوو......».

* * * * * *

لەویادا لە ناکاو یاداشتەکانی مەھدائیلی فریشتە دەپچڕێت و کۆتایی دێت.

لەو کاتەدا کە بولبولیار لە خوێندنەوەی یاداشتەکان دەبێتەوە، سەرسامە لەوەی ڕێزان خانی مەلەکبین هەموو ئەو شتانەی لەم شاردۆتەوە. لەو ساتەدا کە یاداشتەکە دادەخات، ئیدی دەزانێت کێن ئەوانەی بەدوایەوەن. دڵنیایە بۆ ئەوەی خۆی و وەفائیلی فریشتە بپارێزێت، دەبێت شوێنێکی باشتر بدۆزێتەوە... دوژمنەکان گەورەتر و زۆرتر و ترسناکترن لەوەی ئەو چاوەڕوانیدەکرد.

## فریشتەیەکی دی

هەوڵەکانی هۆشەنگی بولبولیار و سەلیم ئەسفەر و سەلام باباجان بۆ ڕزگارکردنی من لە دوو مانگی یەکەمدا، بە جۆرێکی ترسناک نوشوستیان هێنا، وەهابوو وەک ئەوەی دەوڵەت باکی بە هیچ شتێک نەبێت، کۆپییە ئەلەکترۆنییەکەی من بە جۆرێکی سەرکەوتووانە دەژیا، کاریدەکرد، لێدوانی دەدا، وێنەی بڵاودەکردەوە، فەیسبوکی خۆشی هەبوو. گەرچی سەلام باباجان و سەلیم ئەسفەر زۆر پێداگریان لە سەر بڵاوکردنەوەی هەندێک بەشی یاداشتەکانی من دەکردەوە لە ڕۆژنامەکاندا، بەڵام هۆشەنگ ڕایوابوو هەر جۆرە کارێکی وا بێسوود دەبێت و دەوڵەت لە ڕێگای لیوا جەنگیزەکەی خۆیەوە دەتوانێت بە درۆیان بخاتەوە و وەک گەمەیەکی ساختە بیناسێنێت، ئەمە جگە لەوەی شەفیق هروری و ئەنوەر پۆخان دوو پاسەوانی دڵسۆزی چیرۆکەکان نین. دەبوو سەرەتا ڕێگایەک بدۆزنەوە وەها کاریگەر بێت لە ڕەوتی شتەکان بگۆڕێت و وەرگەڕانێکی کاریگەر دروستبکات... بەڵام چی؟ بولبولیار شەو و ڕۆژ لە ناو ئەو ئەرشیفە گەورەیەدا کە من بۆم بەجێهێشتبوو، کاریدەکرد.

لە ماوەی ئەو دوو مانگەدا، چەند چیرۆکنوسێکی دی بە شێوەی گوماناوی و کتوپڕ مردن. بەڵام بێباکییەکی گەورە و بێدەنگییەکی هاوبەش سەبارەت بە چارەنوسی چیرۆکنوسان لە هەموو شوێنێک بوو. بە جۆرێک سەلام باباجان دەیگووت «عەجایەب، لەو بڕوایەدان، گەر گۆرانیبێژە بلًح و دەنگ ناخۆشەکانیشمان ئاوا بەڕیز بکوژرابان، خەڵک هەر بێباک و کەمتەرخەم دەبوون؟» . کوشتنی چیرۆکنوسەکان، بە پلانی ورد بەڕێوەچووبوو. هەموو مەرگەکان وەک کۆچی سروشتی دەردەکەوتن، وەک خۆکوشتن، کێشەی بنەماڵەیی و خێزان، مردن بە خواردنی خراپ، بە فیاگرای زۆر، بە ماشێن، بە ئاگرکەوتنەوە، بە خنکان. لەبەرئەوە کوشتنەکان بێدەنگ تێپەڕین. هەر کات هەواڵی مردنی چیرۆکنوسێک بڵاودەبووەوە، دوای تەواوبوونی پرسەکەی، خەڵک لە یادیاندەکرد و لە بیری کەسدا نەدەما. ئەو بیرچوونەوە و بێباکییەی وەک تاعوون لە وڵاتەکەدا دەگەڕا، تا سەرە مەرگ بەدوای مرۆڤەکانەوە بوو. چیرۆکنوسە زیندووەکان هێدی هێدی دەستیانکرد بە کۆچێکی نهێنی، کە دەڵێم کۆچێکی نهێنی، دروست نازانم بەرەو کوێ، بەڵام لە ناکاو ونبوون، لە ناکاو نەوەک چیرۆکنوسەکان، بەڵکو خودی چیرۆک نەما... گۆڤارەکان، ڕۆژنامەکان، کتێبخانەکان، بە جۆرێکی بەرچاو خاڵی بوونەوە لە چیرۆک. لە ماوەی ساڵێکدا لە کۆچێکی نەبینراو، بێدەنگ و هەست پێ نەکراودا، نیشتیمان، بێئەوەی هەناسەیەکی غەم هەڵکێشێت، ماڵاوایی لە هەموو چیرۆکنوسەکانی خۆی کرد. ئەو دوو مانگەی سەرەتا سەلیم ئەسغەر لە دوودڵییەکی زۆردا دەژیا، ڕاستە زیاتر وەک نوسەری وتار و کۆمێنتاری فیکری ناسرابوو، بەڵام کەس نەیدەتوانی نکوڵی لە بەهرە زۆرەکەشی وەک چیرۆکنوس بکات. لەو ماوەیەدا و بەر لەوەی خۆی ونبکات لە ستوونەکەی خۆیدا لە ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەن، وتارێکی بە ناوی «بۆ چیرۆک لە حەقیقەت ترسناکترە» بڵاوکردەوە. لەوێدا نوسیبووی «حەقیقەت ئەو شتانەیە کە هەن، لە دەستماندان، تیا ژیاوین و دووبارە و هەمیشە تێیدا دەژینەوە، دیوە نەگۆڕ و هەمیشەییەکی سوڕاندنەوەی دونیایە بە دەوری خۆیدا، بەڵام چیرۆک ئەوەیە کە دەبێت ببێت یان دەبێت بۆی بگەڕێین یان بە خەیاڵی هەبوونییەوە دونیا بگۆڕین

... حەقیقەت ئەو ژیانەیە کە لێی بێزاربووین، چیرۆکیش ئەو ژیانەیە کە هەرگیز نایگەینێ. چیرۆکنوسەکان شۆڕشگێڕە گەورەکانی ئەم سەردەمەن، دوای ئەوەی سیاسی و فەیلەسوفەکان نەیانتوانی هەتا یەکجۆری دیکەی ژیانیش پیشانی مرۆڤەکان بدەن، ئێستا چیرۆکنوسەکان بە خۆیان و نەخشەی هەزارەها دونیای نەدۆزراوەوە لێرەن. لە بەر ئەوە، بە جۆرێک لە جۆرەکان رێکەوتنێکی نهێنی و پەیمانێکی نەنوسراو و مۆرنەکراو لە نێوان هەمووواندا هەیە بۆ کوشتنیان». لەدوای ئەو ستوونەوە، زۆر لە خوێنەرەکانی هەستیانکرد ئیتر بە ناچاری دەبێت بچێتە ژێرەوە و خۆی ونبکات. تا ئەو ساتە وەها بوو وەک بە تەنیا پرۆفیسۆر شالیار و هاوەڵانی بزانن چیرۆکنوسان چەند ترسناکن، بەڵام ئێستا چیرۆکنوسەکان خۆیان وەک جنسێکی ترسناک دەناساند و خۆیان ئاشکرادەکرد. ئیتر مامۆستا ئەسغەر هیچ بوارێکی نەبوو جگە لەوەی لەگەڵ مەترسی ئیشەکەی خۆیدا تا کۆتایی بڕوات. دوای نوسینەکەی و لە سەر پێشنیاری بولبولیار، مامۆستا بڕیاریدا خۆی بشارێتەوە. دوای سێ کۆمەڵە تێکست و نامەی رەوانەکراو بۆ لیڤیتانت و جەنابی سەرۆک و پرۆفیسۆر شالیار، ئاشکرابوو گوشارەکان کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نییە. سەلام باباجان چەند جارێک ویستی شەفیق هروری ڕازیبکات لە سەر کوشتنی چیرۆکنوسان هەواڵ بڵاوبکاتەوە و مانشێت دروستبکات، بەڵام هروری جگە لەوەی ڕقی لە چیرۆکنوسان بوو، بەردەوام دەیگووت، بەڵگەیەکی گەورەمان لە ژێر دەستدا نییە بیسەلمێنێت تاوانێکی سیاسی لە گۆڕێیە، دوای ئەوە وڵات گەر ڕۆژنامەنوسی باشی هەبێت، چ کاری بە چیرۆکنوسان هەیە.

سەلیم ڕۆژ دوای ڕۆژ هەستیدەکرد، خۆپاراستن تا دێت سەختتر دەبێت. لەگەڵ کەوتنی هەموو چیرۆکنوسێکدا دەیگووت، شەهیدی دواتر منم. ئێستا جگە لەوەی بە قسەی بولبولیار بکات و خۆی ونبکات، چارێکی تری نەبوو. بولبولیار هەموو رێگا و شوێنێکی خۆشاردنەوەی بۆ دابینکرد. ئەو بە درێژایی ژیانی هەستیکردبوو پێویستی بە چیرۆکنوسێکە لە نزیکییەوە بێت، لەگەڵیدا بژی، متمانەی پێبکات و هەموو ژیانی خۆی بۆ

بگێڕێتەوە. ئێستا لەگەڵ سین ئەسفەردا دەیتوانی کاتێکی گرنگی هەبێت و لە نزیکەوە ئەو ژیانەی خۆی بگێڕێتەوە کە لە مێژە دەیەوێت تەواوی سەربوردە سەیرەکانی تۆماربکات. بەڵام لەوە گرنگتر، دەیویست سین ئەسفەر وەک ڕۆشنبیرێک و چیرۆکنوسێکی ناسراو لەگەڵیدا بەشداری خوێندنەوەی ئەرشیفەکە بێت، کە جگە لەوەی خەزێنەیەکی سیاسی و مێژوویی گرنگە، بەهرەیەکی شەیتانیانەی ئەدەبیش لە پشت چاوی نوسەرە شەڕانگێزەکەیەوە بووە کە ورد و درشتی ژیانی سەردەمێکی بە ڕۆحێکی دژوار و نەخۆش و تاریکەوە نوسیوەتەوە. لەو ماوەیەدا پێکەوە لەگەڵ بولبولیاردا کەوتنە گەڕان بە ئەرشیفەکانی مندا، بە یادگارەکانمدا، بە فایلە ئەرخەوانییە بێشومارەکانمدا، بەو کتێبخانە نهێنی و پڕ دۆکۆمێنتەی هەموو ژیانم کارم تێداکردبوو و کۆمکردبووەوە. ڕۆژێک کەوتن بە سەر ئەو فایلە گەورەیەدا کە تەواوی چیرۆکی من و پیاوە لێکچووەکانی منی تێدا بوو، بولبولیار سەرسام نەبوو، بەڵام دڵنیابوو خەزنەیەکی گرنگی دەستکەوتووە، ئەو دەمێ ساڵ لە مەوبەر، لە سەردەمی گەڕانی مندا بۆ فریشتەکەم، ئاگاداری بەشێکی چیرۆکەکە بوو، چونکە دەمێک وەفائیل هات و من زیندانم کرد، ئەو خەبەری لە بەدبەختی ئەوانە هەبوو کە شێوەیان دەهاتەوە سەر من و ئاگاداربوو خواستی دۆزەخینی من، وڵاتی لە چ قەیران و بەدبەختییەکەوە ئاڵاندوە. بەڵام فایلەکە دوای ئەو هەموو ساڵە نرخێکی گەورەی هەبوو، ناو و ناونیشانی بەشی هەرە زۆری هاوسیماکانی منی تێدابوو. لەو ساتەدا بیرۆکەیەکی سەیر و شەیتانی دێتە خەیاڵی بولبولیار، ئەوەی بەرامبەر ئەو لیوا جەنگیزە خەیاڵی و ساختەیەی دەوڵەت، ئەوان لیوا جەنگیزێکی دی دروستبکەن کە لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە یاداشتەکانی من بگێڕێتەوە، یادەوەرییەکانی لەگەڵ سەرۆکدا باسبکات، نهێنی ساڵانی پەیامنێریم لە نێوان دەوڵەت و حیزبدا ئاشکرابکات، هەموو چیرۆکە ترسناکەکان، بەڵام بەش بەش و لەگەڵ هەرەشەیەکی ئاشکرادا کە پیاوانی دەوڵەت و لە سەروو هەموویانەوە شالیار تێبگەن، گەر لیوا ئازاد نەکرێت ئاشکراکردنی نهێنییەکان بۆ هەمیشە بەردەوام دەبێت و ڕاستی کوشندەتر دەکەوێتە بەر خۆر. سەلام

باباجان و مامۆستا ئەسغەر بیرۆکەکە هەم سەرسامیکردبوون و هەم ترسێکی قووڵی تێدا چاندن ... هەر دووکیان فایلی هاوپوخسارەکانی منیان گرتە دەستەوە و یەکە یەکە سەیری هەموو لاپەڕەکانیان کرد، چیرۆکەکە شتێک نەبوو چاو یان عەقڵ باوەڕی پێبکات، وەک ئەوەی هەموو شتەکان لە جیهانێکی تاریکەوە هاتبن و پڕبن لە ئاماژە و تەلیسمی نەکراوە. لیوا جەنگیز لە دەیان ژیانی جیاواز جیاوازدا، لە دەیان ئیشی جیاواز و ڕۆڵی جیاوازدا... کەسێک ئاوێنەی کات و ئاوێنەی جێگاکان لە ناو خۆیاندا دووبارەیدەکەنەوە. سەلام گووتی «بەڵام چ سوودێکی ڕاستەقینەی هەیە گەر ئێمە لیوا جەنگیزی دووەم دروستبکەین؟ دەترسم ئەوە بە کوشتنی لیوا خۆی تەواو بێت». بولبولیار گووتی «دوور نییە لیوا جەنگیز کوژرا بێت، ئەگەر کوژرا بێت ئەوا لە ڕێگای ئەم هاوشێوەیەوە ئێمە زیندووی دەکەینەوە و دەیکەین بە گژ فەرمانڕەوایانی بورجدا، گەر نەشکوژرا بێت، بۆ ئەوەی حەقیقەتی ئەو لیوا جەنگێزە ساختەیەی خۆیان بسەلمێنن و ئەوەی ئێمە بەدرۆ بخەنەوە، ڕەنگە لیوا دەربهێننەوە و دەریبخەن و بە جۆرێک لە جۆرەکان پیشانمانبدەن. دەبێت چاوەڕوان بین. گەر هیچیشان نەکەن، ئێمە لیوا جەنگیزێکمان دەبێت کە بە دڵی لیوا جەنگیزی ڕاستەقینە هەڵدەسوڕێ و قسەدەکات، وەک ئەو پیاوەی ئەم یاداشتانەی نوسیوە و ئەم نهێنیانەی پاراستووە. لیوا جەنگیزێک بە پێچەوانەی لیوا جەنگیزی کۆنەوە ڕاستی لایە و دەسەڵاتی لا نییە، لەو ڕێگایەوە ئێمە هەمیشە ڕۆحی کەسێکی نهێنی و گرنگمان لەگەڵدایە کە دەوێرێت حەقیقەت بە هەموو ژەهرەکەیەوە بڕێژێت». بیرکردنەوەی بولبولیار بیرکردنەوەیەکی وردبوو. بەڵام گەڕان بە دوای ئەو کەسەدا کە ڕۆڵێکی وەها بگێڕێت، ئاسان نەبوو. ئەو کەسەی دوای کاری وەها دەکەوت دەبوو بە سەلیقە بێت و گەلەک بە نهێنی هەموو شتێک ئەنجامبدات، تا دەستی دەگاتە یەکێک لە هاوشێوەکان و دەیخاتە سەر ئەو بڕوایەی بەو کارە هەستێت. تەنیا کەسێک لەو سیانە بیتوانیبایە ئەو ئیشە ڕاپەڕێنێت، سەلام باباجان بوو. ڕاستییەکەی دەبوو یان ئەو یان ئەزمێرا کارەکە جێ بەجێبکەن، بەڵام ئەزمێرا زمانێکی وەهای نەدەزانی و

کێ بۆ ئیشێکی وەها ترسناک دەچووە ژێر قسەی کچە خزمەتکارێکی ئەفریقاییەوە. سەلام باباجان ئێستا بە جۆرێک دڵخۆش بوو، بە جۆرێک ژیانی گۆڕابوو، بە شێوەیەک خرۆشانەکان دەژیا، هەندێ جار هەر یەک لە بولبولیار و سەلیم ئەسغەر ترس دایدەگرتن. گەرچی هەموو شتێک تراژیدی بوو، بەڵام ئەو ڕای وابوو تراژیدیا مانای ئەوەی ژیان هەیە، زیندەگی لە زنجیریی خۆیدا دیل نەبووە و شتێک هەیە دەجوڵێت و هێزێک هەیە ڕۆح ڕادەتەکێنێت. دیارە پیشەکەی وەک ڕۆژنامەنوس گومانێکی زۆری لە کۆڵدەکردەوە تا بتوانێت ئازادتر لە هەر کەس بگەڕێت و بپرسێت. بەڵام جگە لە شوناسی ڕۆژنامەوانی، سەلیقەی خۆشی ڕۆڵێکی گەورەی بینی لەوەی بتوانێت ئیشەکە بە جوانی ڕاپەڕێنێت. لە گەڕانەکانی هەفتەی یەکەمدا، سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا، بەڵام خودی ئەو گەڕانانە فێری زۆر شتیان کرد کە پێشتر نەیدەزانی، بە جۆرێک بڕیاریدا دەمێک لەم کێشەیە تەواو بێت بۆ هەتاهەتایە ڕۆژنامەوانی وەرزشی جێبهێڵێت و دوای شتە ناوازەکانی ژیانی ڕاستەقینە بکەوێت. لە هەفتەی دووەمەوە ئەو ڕاستییە هاتە دەستی کە زۆرینەی هاوسیماکانی لیوا جەنگیز لە پتر لە سیازدە ساڵ لەوەوبەرەوە شاریان جێهێشتووە و ئیتر هەرگیز نەگەڕاونەتەوە و یەکی مۆرێکی تایبەت بە لەشیانەوەیە. ڕێکەوتی کەسێکی دیشی کرد بە ڕێگای جوانکاریی سیمای خۆی گۆڕیبوو و ئێستا شتێکی ئەوتۆی لە لیوا نەدەکرد و کەڵکی کاری وەهای پێوە نەبوو. تەنیا لە کۆتایی هەفتەی چوارەمدا ئەو پیاوەی دۆزییەوە کە دەبێتە جێگرەوەی شوێنی من. ناوی ڕاستەقینەی «سەفا زێوان» بوو، ناوی لە ناوی ئەو برا کۆچکردوەم دەچوو، کە چەند ساڵ لەوەوبەر لە ئەمریکا بە بێدەنگی کۆچی دوایی کرد. لە وێستگەیەکی کارەبا ئیشی کۆنترۆڵی فیدەرەکان و جێبەجێکردنی پلانی دابەشکردنی کارەبا بوو بە سەر گەڕەکە جیاوازەکاندا. لەو کەسانە بوو بە ڕۆژ دەخەوت و بە شەو دەچووە سەرکار، کەم دەردەکەوت و دەبینرا، هەتا خزمە نزیکەکانیشی جەژنا و جەژن دەیانبینی. بێخەویی و وڕەوڕی ماتۆڕ و گوێگرتن لە جنێوی بەردەوامی ئەوانەی لەبەر بێکارەبایی نەفرەتیان بۆ دەنارد،

ڕوخساری پیاوێکی ماندوویان پێبەخشیبوو، کە وردە وردە لە ژێر کاریگەریی تاعوونی لە یادچوونەوەدا ڕابوردووی خۆشی لە بیردەکرد. چوار ساڵ لەمەوبەر، ژنەکەی بێئەوەی منداڵێک دوای خۆی جێبهێڵێت، بە شێرپەنجەی مەمک کۆچی دوایی کردبوو، ئێستا یەکێک بوو لەوانەی بە توندی نەیاری دەسەڵاتدارانی هەرێم بوو، بێزار بوو لە ژیانی خۆی لەو وێستگە کوشندەیەی کارەبادا، بەڵام شتێکی ئەوتۆی نەبوو بیکات، چ ئەلتەرناتیڤێکی هەبوو؟. سەردانەکەی سەلام بۆ لای سەفا زێوان، بە ناوی پرس و ڕاوەبوو دەربارەی کێشە هەمیشەییەکانی کارەبا. بەڵام هەر لە سەرەتاوە سەلام قسەکانی بەو ئاڕاستەیەدا برد کە بتوانێت تەواوی مەیلی سیاسی سەفا بخوێنێتەوە. سەفا لە پیاوە ئاگراوییە تووڕەکان بوو، گەندەڵی و دزیی بەرپرسەکانی زۆر بۆ گرنگ نەبوو، بەڵام ئەوەی لە بەغداد وەک نیشتیمانفرۆش دەیبینین، تووڕەیدەکرد و کەفی ئاگرینی پێدەردەدا. بە شێوەی کەسێکی نەفام کە تەنیا ڕووکەشی دەسەڵات دەبینێت و لە گرێ قووڵەکانی ناوەوەی تێناگات، زوو زوو دەیگووت «کاکی برا کوردی چی، کێ کوردی قوڕبەسەری لە بیرە، هەر کورسییەکە لە بەغدا سەلامەت بێت، تەواو ... هەمووی دەردی کورسییەکەیە. تۆ دەڵێیت چی، هەر باسیشی مەکە». پیاوێک بوو دەنگێکی ڕۆشن و جوانیشی بوو، لەو ئەکتەرانە دەچوو کە لە سەر شانۆ بە توانا و بلیمەتن، بەڵام خۆیان مرۆڤی گەمژە و بێ هەیبەت و قسەنەزانن، دەتوانن لە سەر شانۆ وەک پاشا و قارەمان و شۆڕەسوار دەربکەون، بەڵام لە ژیاندا هیچ نین جگە لە ئادەمیزادێکی نسکۆدار و بێچوست. وەک هەموو ئادەمیزادەکانی دی بە چاویدا دیاربوو دەیەوێت ڕۆڵێکی تریش بگێڕێت، ژیانێکی دیکەی هەبێت، تەختەی شانۆیەکی تر ئاوەدانبکاتەوە. بەڵام چەقینی لە ناو ئەو بۆرد و دوگمە و فیوز و ماتۆڕ و فیدەر و کابڵ و عەمودانەدا خەیاڵیان وەها خەساندبوو، پێیوابوو دونیا هیچ نییە جگە لە وێستگەیەکی کارەبای وەک ئەم وێستگەیەی ئەو، کە هیچ کات و لە هیچ شوێنێکدا بە تەواوی و ڕێکی ناکەوێتە ئیش. دەیگووت «ئەم وێستگەیەی من دنیایەکی بچکۆلەیە، خودای گەورەش، بە قوربانی ناوی بم، هەر وەک

بەڕێوەبەری وێستگەیەکی گەورە وەهایە، ناشوکری نەبێت، مەحەتەکەی ئەو لەمەی من باشتر ئیش ناکات». لە ناوەڕاستی قسەکاندا سەلام وریایانە چووە پێشێ و گووتی «تۆ دەزانیت، لە نێوان تۆ و وەفای ڕەفعەت بەگدا لێکچوونێکی زۆر هەیە. دەیناسیت، وەفای ڕەفعەت بەگ دەناسیت؟». کابرا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گووتی « کێ هەیە نەیناسێت؟ داخی ئەوە وا لە دڵی مندایە... ». سەلام سەری لەقاند و گووتی «ڕاستدەکەیت، پیاوێکی باش نەبوو، ساڵانێک کە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو شتی زۆر خراپی لێدەگێڕنەوە. دەزانیت چی بەسەر هاتووە ئێستا؟» . کابرا گووتی «نەوەڵا، لە کوێ بزانم، خەبەرم لە برای خۆم نییە، ئینجا لە وەفای ڕەفعەت بەگی گەواد».

ئەو ڕۆژە سەلام زیاتر درێژەی نەدایە ئەو باسە، بە سەفای گووت، چەند شەوێکی تر دێتەوە لای و ڕاپۆرتێک لە سەر ژیانی شەوانەی لە شوێنکارەکەیدا دروستدەکات. نەدەکرا یەکسەر بیخاتە بەر گەمەیەکی گەورە و ترسناک هەر زوو سڵۆکی و غەریزەی هەڵهاتنی تێدا بەئاگابهێنێت. دڵنیابوو بە تەنیا ناتوانێت بیخاتە سەر بیرۆکەی کارێکی وەها، پێویستی بە کۆمەکی مامۆستا ئەسغەر یان بولبولیار هەبوو. دوای سێ شەو لەوە لەگەڵ بولبولیاردا گەڕایەوە، بولبولیار بێئەوەی ئەملاولایەکی درێژبکات، پێیگووت بۆیە هاتوونەتە لای تا خزمەتێک بە مێژووی شارەکە و مێژووی حەقیقەت بکات. کابرا سەرەتا تێنەگەیشت باس لە چییە و چی دەگوزەرێت. بولبولیار بۆ ئەوەی هەم تێیبگەینێت و هەم بیخاتە سەر بڕوای تەواو، چیرۆکی گرتنی منی بۆ گێڕایەوە. کابرا سەرەتا گووتی «جا گەوادی وا بیگرن یان نەیگرن چییە؟ عیلاقەی بە منەوە چییە؟ تا زوڵم و زۆرداریی کرد، کردی، ئێستا دەتانەوێت بۆی بگرین؟ چیتان لە من دەوێت؟». بولبولیار بە شێنەیی تێیگەیاند کە کێشەکە کێشەی ژیانی وەفای ڕەفعەت بەگ نییە، وەفای ڕەفعەت بەگ لەوانەیە مردبێت، هیچ نیشانەیەک نییە کە زیندوو بێت و لە ژیاندا بێت، بەڵام وەفای ڕەفعەت بەگ خەزێنەی نهێنییەکانی ئەم مەملەکەتە بووە،

ئەو سەرەیە کە نهێنییەکانی هەموو ئەم حاکم و حکومەتەی تێدایە، ئەو سەرەی کە گەر بمرێت و تەواو چیرۆکی خۆی نەگێڕابێتەوە، وێنەی ئەم ژیانەی ئێمە و شێوەی ئەم عەسرەمان کاتێک دەیگوازینەوە بۆ نەوەکانی تر، پڕ هەڵە و کەموکورت دەبێت. بولبولیار چەند سەعات قسەی بۆ کرد، هەموو ئەو بەلاغەتەی سالآنێک زۆر لە خوێندنەوەی شیعر و تێڕامان و گوێگرتن لە چیرۆکی فریشتەکانەوە فێریبووبوو، ئێستا بەکاریدەهێنا تا ئەم پیاوە ڕازیبکات کۆمەکیانبکات، چونکە وەک خۆی دەیگووت ئەوە دوا ئومێد بوو، بتوانن نهێنیی و تاریکییەکانی سەردەمێک وەک خۆی بگوێزنەوە. سەفا زێوان سەرسەختییەکی زۆری پیشاندا، گووتی کە لیوا وەفا خۆی شتەکانی نوسیوە بۆ بلآوی ناکەنەوە و تەواو، بۆی چاپبکەن و بیکەنە کتێب و ئاو بێنە و دەست بشۆ، ئیتر هەموو ڕزگارمان بێت. بولبولیار بە وردی بۆی ڕوونکردەوە، هەموو ڕاستییەک کاتێک دەبێتە ڕاستی کە یەکێک ببێت بە شاهیدی، گووتی ئەو کتێب و نوسراو و کاغەزانەی بەردەستی ئێمە نرخی نامێنێت گەر قسەکەرێک، کەسێک، پەیامنێرێک لە پشتیانەوە نەوەستێت... حەقیقەت تەنیا کاتێک مانای هەیە، ئەوەی کە دەینێرێت دەمامکی لە سەردا نەبێت. حەقیقەت ئەو کاتە دەناسرێت و دەبینرێت کە لەگەڵیدا دەموچاوی ئەو کەسەش بناسرێت و ببینرێت کە هەڵیگرتووە. لێرەوە حەقیقەتی هەموو نوسینەکانی لیوا وەفا بەبێ خۆی، بەبێ ئەوەی بیسەلمێنین کە ئەوە قسەی خۆیەتی، ئەستەمە. ئەوانەشی کە لیوا وەفایان گرتووە لە پێناوی یەک شتدا گرتوویانە، خۆی لە نوسینەکانی جیابکەنەوە، دیلیبکەن و ونیبکەن بەر لەوەی بتوانێت بیسەلمێنێت ئەو هەڵگر و بینەر و پارێزەری ئەو حەقیقەتەیە. گرنگترین شت بۆ ئەوان ئێستا ئەوەیە لیوا لە دەفتەرەکانی، لە چیرۆکەکانی، لە ئەرشیفەکەی داببڕن، لە تۆماری زیندەگی خۆی دووریبخەنەوە، بەو مانایەی کە زیندەگی خۆی، هەرگیز زیندەگی خۆی نەبووە، بەڵکو هەمیشە فەرمانێک بووە لە جێگایەکی ترەوە دەرچووە، ئاماژەیەک بووە لە شوێنێکی ترەوە نێردراوە. کابرا بە زەحمەت لە قسەکانی بولبولیار تێدەگەیشت، بەڵام تێگەیشت گەر نوسینەکان مۆری وەفای ڕەفعەت بەگی

پێوە نەبێت نرخی نامێنێت، ئێستاش ئەوەی کە دەبێت دەوری وەفا ببینێت و ئەو مۆرە بنێت بە نوسراوەکانەوە ئەوە، وەفایەکی ساختە کە دەبێت جێگای وەفای ڕاستی بگرێتەوە. بولبولیار پێیگووت «گرنگ ئەوە نییە وەفای ڕەفعەت بەگ کێیە. وەفا ڕەفعەتی ڕاستەقینە بوونی نییە، هەتا ئەو ژەنراڵە خوێن تاڵەش کە ئێستا زیندانە و دەمانەوێت ئازادیبکەین، وەفای ڕاستەقینە نییە. گرنگ ئەوەیە کێ دەتوانێت ئەو ڕۆڵە بگێڕێت کە دەبێت ئەو ناوە لە مێژوودا بیگێڕێت، ئەوە گرنگە». بولبولیار بە هێمنی ئەو ئیشەی بۆ سەفا زێوان ڕوونکردەوە، ئەوەی پیشاندا کە دۆزینەوەی ئەو لای دەزگا و پیاوانی شالیارەوە ئاسان نییە. ئەوان دەزانن هاوسیلکانی لیوا زۆریان بەرەو دەرەوەی وڵات کۆچیانکردوە، گومانیان بۆ ئەوە دەچێت یەکێک لە دەرەوەی نیشتیمانەوە، لە کوردە ناڕازییەکانی ئەوروپا ئەو گەمەیە ڕێکدەخات. ئەمانیش هەموو شتێک دەکەن ئەو هەستە بگەێنن کە یەکێک لە دەرەوەی وڵات ئەو گەمەیە دەکات. لەوەش گرنگتر، ئەو هیچ شتێک لە ڕەوتی ژیانی خۆی ناگۆڕێت، سەرەتا هەموو شتێک تۆماردەکەن ئەوسا بەش بەش دەستدەکەن بە پەخشکردنی، بە جۆرێک دواتر چەند بیخەنە ژێر چاودێرییەوە، شتێکی نائاسایی لە سەر نادۆزنەوە، هەموو ئەم ماوەیەش ئەو هەر وەک فەرمانبەرەکەی جاران لە کاری خۆی بەردەوام دەبێت. سەفا زێوان داوای دوو ڕۆژ مۆڵەتی کرد تا بیربکاتەوە، بەسەرێک گەمەکەی بە ترسناک دەزانی و بە سەرێکی دیش دەیویست شتێک بکات ژیانی لەم دووبارەبوونەوە و خەوتن و خواردنە ئاژەڵییە دەربهێنێت و بتوانێت گەر جارێکیش بووە، لە ژیانیدا ببێتە ئەو قارەمانەی کە سەفای ڕاستەقینە، چاودێری بچوک و ناچیزی وێستگەیەکی کارەبا هیچ کات ناتوانێت ببێت، ئەوە یەکەم دەرفەت و دوا دەرفەتی ژیانی بوو شتێک بکات لە ڕەوتی پوچ و دووبارەی ژیانی خۆی کەمێک دووریبخاتەوە. هەموو ژیانی هەستیکردبوو جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ ئاژەڵدا، ئێستا دەرفەتێکی بۆ هاتبووە پێش ژیانێکی تر تاقیبکاتەوە، بچێتە بەرگی کەسێکی ترەوە، مێژووی کەسێکی تر لەبەربکات کە هەستێکی تری لێی دەوێت. سەفا پیاوێکی ئازا نەبوو، بەڵام

ترسنۆکیش نەبوو، لەوەشی نەدەپرسی ئاخۆ عاقیبەتی ئیشەکە دەشێت بە کوێ بگات، بەڵکو دەترسا وەها لەگەڵ ڕۆڵی وەفای ڕەفعەت بەگدا تێکەڵ بێت. ئیتر خۆی بۆ نەدۆزرێتەوە. ترسێک بە دڵنیاییەوە بنەما و مانای خۆی هەبوو.

ڕۆژێک بڕیاریدا هەموو ئەو کارانە بکات و بێتە تیمی بەرگریکەرانەوە لە من، ناوی لە سەفا زێوانەوە بووە وەفای دووەم. لە ڕاستیدا ئێستا وەفای یەکەم من نەبووم، بەڵکو ئەو وەفا ئەلکترۆنییە بوو، کە شالیار دەیجوولاند. بوونی ئەو لە بوونی هەموو وەفا دیار و نادیارەکانی تر بەرجەستەتر بوو، دواهەمین وەفا ئێستا من بووم لە مەخزەنە تاریکەکەی خۆمدا. من هێدی هێدی دەبووم بە بێکەڵکترین کۆپی خۆم. ڕەنگ بوو هەمیشەش هەروا بمایەتەوە، گەر لە ناکاو شتێک ڕووینەدایە، تەواوی گەمەکە بگۆڕێت و ئاڕاستەیەکی تری بداتێ.

✻✻✻✻✻✻

فریشتەکان سەر بە زەمینی ئەفسانەن، بەڵام کێشەکە لەوەدا نییە، بەڵکو لەوەدایە ئەفسانە خۆی بە جۆرێکی ترسناک سەر بە هەرێمی واقعە، سەر بە بوونی ئێمەیە، سەر بە ناوکە هەرە تاریک و ڕەق و داخراوەکەی ژیانی خۆمانە. من لای خۆم و دونیاش بووبووم بە جەستەیەکی مردوو، لە زیندانەکەمەوە چیتر ئومێدی هیچ گەڕانەوەیەکم بۆ دونیا نەبوو. زیندانەکە لەو جۆرە شوێنانە نەبوو کە ڕۆژێک لە ڕۆژەکان دەرگاکانی بشکێت و دیوارەکانی بڕوخێن ... نا، ئەوەی شۆڕشێک ڕووبدات و سەرنشینانی ئەم جێگایە سەرفراز و قامەت بڵند بێنەدەرێ، کاری نەکردە بوو. زیندانەکە لەو شوێنانە بوو کە هیچ شۆڕشێک دەرگاکانی ناکاتەوە و کەسە

گیرۆدەکانی ناوی ئازاد ناکات. گەر شۆڕشیش ڕوویبدایە لە ناو شاردا ڕوویدەدا، لە کوچە و شەقامە دوورەکان، ئەو زیندانیانەی ئازاد دەکرد کە لە زیندانە ئاساییەکاندان، بەڵام بورج... بورج جێگایەک بوو هیچ هێزێک نەیدەگۆڕی، دەکرا دەسەڵاتەکان تێیدا ئاڵۆگۆڕبکرێن، بەڵام ئەوەی هیچ هێزێک بتوانێت سەرلەبەری ڕێکخستن و پێکهاتی بگۆڕێت، ئەستەم بوو. بورج لەو جێگایانەیە کە هەموو دەسەڵاتێک پێویستی پێیەتی، منیش لە مەخزەنی بوونەوەرە لە یادکراوەکاندا بووم، ئەو بەشە تاریک و خەوتووەی یادەوەریی کە هیچ دەسەڵاتێک نایەوێت بە تەواوی بە ئاگای بهێنێتەوە.

شتێک ئەو کات و هەمیشەش لێی دڵنیابووم ئەوەبوو، دەمێک دەسەڵاتێک دەگۆڕێت، فەرمانڕەوایەک جێگای فەرمانڕەوایەک دەگرێتەوە، لەو ساتەدا کە حاکمی نوێ لە سەر لاشەی دوژمنە دێرین و کوشندەکەی دەوەستێت، دروست لەو ساتەدا هەستدەکات کە دەسەڵات میراتە و تەنیا خاوەن موڵکەکەی دەگۆڕێت، بەڵام موڵکەکە خۆی نەگۆڕە و موقەدەس دەمێنێتەوە. لەو ساتەدا هەموو شۆڕشگێڕێک بە دەنگی بەرز دەڵێت، ئەو دژی موڵکەکە نەبووە، بەڵکو دژی خاوەن موڵکەکەیە. ئەوانەی دژی موڵکن هیچ حاکمێک پەیمان و ڕێکەوتن و ئاشتیان لەگەڵدا مۆرناکات، بەڵام ئەوانەی دژی خاوەن موڵکن دەشێت مرۆڤ لەگەڵیاندا بکاتە هەر عەهد و قەرارێک. ئەوەی لە یادەوەری مندا پارێزرابوو، بەشێک نەبوو لە دژایەتی کەسێک یان دووان یان سیان، بەڵکو هێدی هێدی من وەک نیشانەی هەرەسی دەسەڵاتم لێدەهات، لەو پەڕی هێز و شکۆی خۆیدا. وەک یاخیبوونی خاوەن موڵک لە موڵکەکەی خۆی، وەک هەستکردنی دەسەڵاتدار بە پوچی هەموو دەسەڵاتێک ... ئەوە دەیکوشتم، ئەوە ئەو خاڵەبوو کە هەموو فەرمانڕەوایەکی دونیا لێی دەترسا. ئەو مۆتەکە تاریکە بوو کە هیچ دەسەڵاتێک نەیدەویست بیری بکەوێتەوە. من نوێنەری دەسەڵاتێک بووم کە هیچ هێزێک لە دەرەوە نەیڕوخاندبوو، بەڵکو خۆی، بەو پەڕیی ئازادییەوە، لە ناو خۆیدا، بە تەواوی ئیرادەی خۆیەوە دەڕوخا ... ئەوەش ترسناکترین جۆری هەرەسە، کە هەموو دەسەڵاتێکی دونیا

وەک تاعوون سڵی لێدەکاتەوە و لێی دەترسێت. من لەم زیندانە قفڵ و ئەبەدییەمدا دەمڕوانی و تێدەگەیشتم کە من نوێنەری ترسناکی ئەو شۆڕشەم کە لە دەرەوە هەڵناگیرسێت، میللەتێک مەشخەڵانی بەرزنەکاتەوە و قارەمانانێک بەیداخی ڕاناتەکێنن، بەڵکو لە ناوەوە، بێ هیچ بەرگرییەکی دەرەکی، لە ڕۆحی حوکمڕانیدا خۆی بڵێسە دەستێنێت.

من یەکەم شەو لەم مەخزەنە تاریک و بچوکەدا بڕیارمدا بیرنەکەمەوە، لە شوێنێکی وەها داخراو و تاریکدا کە دەزانیت بۆ ئەبەد لەوێیت، بیرکردنەوە ترسناکترین شتێکە کە مرۆڤ ئازاردەدات. من لە یەکەم شەومدا لە مەخزەن بیرم لەوەکردەوە بۆ مرۆڤ بەمجۆرە سزای مرۆڤ دەدات؟. زیندان، خزاندنی مرۆڤ بۆ ناو ژوورێکی بچوکی تاریک، تاکە شتێک لەوێدا زۆر ئازارماندەدات نە بچوکی ژوورەکە، نە تاریکی، نەدابڕانە لە دونیا، بەڵکو بیرکردنەوەیە... هیچ شتێک لەوە ترسناکتر نییە کە دڵنیا دەبیت بیرکردنەوەکانت بێسوودن، کە هەستدەکەیت ئەوەی زیندانە تۆ نیت، بەڵکو بیرکردنەوەکانتن کە ئێستا جگە لە ناو سەری خۆت هیچ جێگایەکی تریان نییە تیا بسوڕێنەوە. چی دەبوو گەر سزای مرۆڤ بە جۆرێکی تربایە؟ وەک ئەوەی لە بری ئەوەی لە ژوورێکدا بەندیبکەن، نەهێڵن هیچ کات پێبخاتە ناو ژوورێکەوە. مەحکوم بایە بەوەی هەمیشە لە دەرەوە بێت، لە سەرما و گەرما و خۆشی و ناخۆشیدا بۆی نەبێت پێ بخاتە ژێر هیچ سەقفێکەوە. گەر ئەوجۆرە سزایە جاران مەحاڵ بووبێت، ئێستا ئاسانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتداران هەمیشە ئەوەیان پێ باشترە بەمجۆرە سزات بدەن، چونکە دەزانن زیندانی ڕاستەقینەی مرۆڤ وا لە ناو سەریدا. لە زیندانە بچوکەکاندا ئەوەی دەمانخوات بیرکردنەوەیە بیرکردنەوە لە شتێکی دیاریکراو نا، بەڵکو بیرکردنەوە وەک ئەوەی هەیە، وەک ئەو بەتاڵییە قووڵ و بێبنەی ناخمان کاتێک هەستدەکەین دەتوانین بیربکەینەوە، دەتوانین بیر لە هیچ بکەینەوە، بیربکەینەوە بێئەوەی بابەتمان هەبێت، بێئەوەی زمانمان هەبێت، بێئەوەی بتوانین بیکەین بە قسە، بتوانین بزانین چییە و بۆچی و چی لێمان دەوێت. من چەند

دەمویست لەو بێدەنگییە قووڵەی بیرکردنەوە ڕابکەم، کە جیاوازە... زۆر جیاوازە لە بێدەنگی ئاسایی، نەمدەتوانی. لە شەوی یەکەمەوە تێگەیشتم ئەو بێدەنگییە قووڵەی کە لە شتەکانەوە هەڵدەستێت، جیاوازە لەو بێدەنگییەی لە قووڵایی سەری خۆمدایە. دوای ئەو هەموو ئەشکەنجە دوورودرێژەی جەستە، ئێستا لە پاڵ تلانەوە و ژانی ئێسکەکانمدا ئەو بێدەنگییە قووڵە وەک خەنجەر دەیپێکام. ڕۆژ دوای ڕۆژ تاریکی و بێدەنگی زیاتر و زیاتر دەیانخواردم.

نازانم چەندە بوو لەوێ بووم، چونکە نەمدەزانی کەی ڕۆژە و کەی شەو، کەی دەخەوم و چەند دەخەوم، کەی بە ئاگام و چەند بە ئاگام. مەخزەن هیچ نەبوو جگە لە گۆڕێک کە دەسەڵات بۆ سەیری لاشەکانمان دروستیکردبوو، تا دڵنیابن هەر کاتێک ویستیان دەتوانن بێن و لە دەلاقەیەکەوە سەیری ناو گۆڕەکانمان بکەن و لەزەت لە بینینی لاشە زیندووەکانمان وەربگرن. لاشەی زیندوو، ئەوە سزای هەرە گەورەیە، ئەو ئاواتەیە کە هەموو کەس بۆ دوژمنە هەرە سەر سەختەکانی خۆی دەیخوازێت... ئەو ماوەیە هیچ کات دەرگای ژوورەکە نەکرایەوە، هەمیشە بڕێکی کەم نان و ئاو لە دەلاقەیەکەوە دەخرایە ئەو دیو. نانێک بوو تامێکی تایبەتی نەبوو، نانێک بوو بۆ لاشەیەک دروستکرابوو، لە بەرئەوە تامێکی نەبوو تا بەراوردیبکەم بەو خواردنانەی تا ئەو دەم چەشتبووم. خۆراکی لاشەیەک هەمیشە دەبێت خۆراکێکی بێتام بێت، بۆنی نەبێت، چێژی نەبێت، ڕەنگی نەبێت... هیچییەک بێت و بووبێت بە مەتریاڵ. خواردنی من بەو جۆرە بوو، بەڵام سەیربوو ڕۆژ دوای ڕۆژ بەو بێتامییە ڕادەهاتم، ئەو ساتەی کە خواردنەکە دەردەکەوت، دەبوو بە گرنگترین ساتەوەختی ژیانم، ئیتر حەزم لێدەکرد، بەڕاستی چێژم لەو بێچێژییە زۆرە وەردەگرت کە لە قاپەکەدا بوو. هێندەی نەبرد هەستێکی سەیر دایگرتم کە چاوێک هەیە لە دەلاقەیەکی بچوکەوە لە دەرگاکەدا سەیرمدەکات، هیچ شتێکم نەدەبینی، هەستم بە هیچ دەنگێک یان گۆڕانێک نەدەکرد، تاریکی

وەها قورس بوو هیچ بە ئاسانی نەدەبینرا، هەستم نەدەکرد کەسێک دیارە یان شتێک بە بەردەم دەرگاکەمدا تێدەپەڕێت. گەر میرزا یان ئەو کەسەی خواردنی دەهێنا بە بەردەم دەرگادا تێپەڕابان هەستم پێدەکرد، بەڵام ئێستا هەستم بە هیچ نەدەکرد، بە هیچ، کەچی ئەو هەستەش دەستبەردارم نەدەبوو کە چاوێک هەیە سەیرمدەکات، بێئەوەی دڵنیابم کێیە و چییە ... لە ناخی دڵمدا هەستمدەکرد نیگاکانی ئەمجارەی چاوەکە جیاوازە لە نیگای فریشتە دێرین و پیرەکەی خۆم، جیاوازە لەو چاوانەی لەم ماوەیەی دواییدا حیزب خستبوونییە دوام، چاوێک بوو پڕ بوو لە بەزەیی، هەستم پێدەکرد، هەستمدەکرد یەکێک لێم دەڕوانێت و عاتیفەیەکی قووڵ و بێسنووری هەیە بۆم. چاوی کەسێکی بە ڕەحمە، کەسێک نە پاسەوانە، نە کارمەندی بورجە، بەڵکو لێرەیە و لێم دەڕوانێت. هەر کات دەهات من هەستم پێدەکرد، بێئەوەی بزانم چۆن، بەڵام دەمزانی ماوەیەکە بەردەوام دێت و دەڕوات... دێت و دەڕوات و سەیرمدەکات.

کاتێکیان دونیا زۆر خامۆش بوو هات، من لە جێگاکەی خۆمدا دانیشتبووم. لێم پرسی «تۆ کێیت؟». هیچ وەڵامی نەدامەوە، ورتەی لێوەنەهات، من سێ جاری تر دووبارەمکردەوە «تۆ کێیت؟». دڵنیابووم لەوێیە... دڵنیابووم بەردەوام و بێوچان سەیرمدەکات، هەستکردنم بە نیگای، تاکە بەڵگەم بوو کە هەیە و لەوێیە و تەماشامدەکات. پێمگووت «لەوانەیە من دەنگت نەبیستم، لەشم وەها تێکشکاوبێت هیچ هەستێکی تێدا نەبێت، کەڕ بم، تام نەکەم، نەبینم. بەڵام هەست بە هەموو نیگایەک دەکەم. دەزانم لەوێیت، پێمبڵێ تۆ کێیت؟». کە وامگووت دەمودەست ڕۆیشت و تا سێ ڕۆژ نەهاتەوە. من هەموو کاتەکە دادەنیشتم و چاوەڕێمدەکرد، هیچ کارێکی ترم نەبوو جگە لەوەی دابنیشم و چاوەڕێبکەم. ئەوە بوو بە پرسیارێکی گەورە لەلام. من دەبوو تەواو لە یادەوەری و نیگا و خەیاڵی خەڵکدا ونببم، دەبوو مرۆڤەکان لەمسەر بۆ ئەو سەر لە یادمبکەن، ئێستا ئەوە چاوی کێیە یاساشکێنی دەکات و لێ ناگەڕێت لەیادبچمەوە، کێیە دەسەڵاتدارانی بورج نەیانتوانیوە

بیوەستێنن... ئادەمیزادە یان جانەوەر... چییە و بۆچی دەگەڕێت؟. دوای سێ شەو کە گەڕایەوە، بۆ یەکەمجار گوێم لە دەنگی جوڵەکانی بوو لەو دیو دەرگاکەوە، هەستمکرد زۆر لە سەرەخۆ کلیلێکی لە دەرگاکە ڕاکرد و بایدا و بە جۆرێک دەنگ دروست نەکات دەرگاکەی کردەوە. ئەوە یەکەمجار بوو لەو کاتەوەی لە گەنجینەی هەڤاڵە لەیادکراوەکان دیلم، دەرگاکە بکرێتەوە. هەستم بە ترس و دڵەکوتێیەکی گەورەکرد. کە هاتە ژوورەوە بۆ یەکەمجار ڕوناکی لەگەڵ خۆی هێنا، لایتێکی دەستی گەورەی پێبوو، بۆ ئەوەی ئازاری چاوم نەدات، ڕوویکردە بنمیچەکە، ئەوە یەکەمین تیشک بوو لەو کاتەوەی گیرابووم ببینم. بەڵام ئەوەی دەم و دەست سەرنجی ڕاکێشام تیشکەکان نەبوون، بەڵکو خۆی بوو. سەراسیمە و حەپەساو ماوەیەکی درێژ سەیرمکرد و هیچم بۆ نەدەگووترا ... هیچ ... فریشتەیەکی باڵ درێژ، فریشتەیەک هەر کەس دەیتوانی دەم و دەست بیناسێتەوە، هەمان جلەکانی میرزای لەبەردا بوو، میرزا ئیحسان ... فریشتەی تایبەتی ئەو، فریشتەی ترازاو و بزۆک و چاونەترسی ئەو. چاوەڕوانی هەموو شتێکم دەکرد، فریشتە تایبەتییەکەی میرزا نەبێت. ئەوە ئەو کەلێنەی ناو دونیا بوو، ئەو درزە بوو کە لە بورجدا نەیاندەبینی و بۆیان دانەدەخرا... هەموو زیندانێک چەندە قایم بێت، دەلاقەیەکی تێدایە، گەر تۆش نەتوانیت لەو دەلاقەیەوە بچیتە دەرێ، دونیا لەو دەلاقەیەوە دێت بۆ لات. بە هەنگاوێک گەیشتە بەردەمم و باڵەکانی تەواو کردەوە و بە خێرایی گووتی « ناوم میرزائیلە، هاوڕێی وەفائیلی فریشتەم، فریشتەکەی خۆت»، دەنگی خۆشییەکی تێدابوو، بەڵام خاڵیش نەبوو لە دوودڵی. بە پەلە کۆمەڵێک کاغەزی سپی لە ژێر جلەکانییەوە دەرهێنا و دەستیکرد بە گیرفانەکانیدا و لەوێش کۆمەڵێک پێنوس و هەندێک پاتری و لایتێکی دەستی دەرهێنا و گووتی «کاتم زۆر نییە، چیت هەیە بینوسە، نامەیەک بنوسە و بینێرە بۆ ئەوەی دەتەوێت، من دەیگەێنمە وەفائیل... نازانم کەی دەگەڕێمەوە، بەڵام چیت دەوێت بینوسە». فریشتەیەکی چوست و چالاک بوو، گەرچی وەک میرزا بە تەمەن بوو، بەڵام بەراورد بە میرزا خۆی بە جوڵە و زیندووتر دیاربوو. بێئەوەی هەتا بە پرسیارێکیشدا

ڕابگەم بە پەلە ژوورەکەی جێهێشت و دووبارە دەرگاکەی داخستەوە. شتەکان وەک خەوێکی خێرا هاتنە بەرچاوم، بەڵام کە دەستم لە وەرەقەکان دا، کە پێنوسەکانم گرت بە دەستەوە دڵنیابووم هەموو شتێک ڕاستە. بۆ یەکەمجار دوای ماوەیەکی درێژ دەستم بە کاغەزدا ڕادەگەیشت، بە ئازادی خۆم قەڵەمم دەگرت. لەو ساتەدا هەستمکرد کە گەورەترین دۆزینەوەی مێژووی مرۆڤ قەڵەم و کاغەزە و بۆ هەتا هەتاشە هەر وا دەبێت. بەبێ قەڵەم و کاغەز نە دین هەیە، نە دەسەڵات، نە ئیمان، نە کوفر. ماوەیەکی درێژ وەک عاشق تەنیا بۆنم بە کاغەز و پێنوسەکانەوە کرد و گووتم «وای، چەندە لێتان دەترسم».

یەکەمین نامەم بۆ بولبولیار نوسی، لە یەکەم ساتی گرتنەکەمەوە تا ئەو ساتەی میرزائیل خۆی کرد بە ژوورەکەمدا هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە. ئەوەی جارێکی تر دەمتوانی لە بەر تیشکێکدا بنوسم دڵخۆشیدەکردم ... کە مرۆڤ پێنوس و کاغەز دەبینێت، ئیتر دەستبەرداری ئەو خەیاڵە دەبێت بیرکردنەوەکانی خۆی بکوژێت، یان لە ڕاستیدا ڕەنگە پێچەوانەکەشی ڕاست بێت، ئەوەی وادەکات بنوسین پێنوسە. نوسین و یادەوەریی و بیرکردنەوەکانمان شتێک نین پێش ئەوەی پێنوسمان هەبێت و کاغەزمان لە پێشدەمدا بێت ئامادەبن، من ئەوە لەم زیندانەوە فێربووم، تا پێنوس نەبینین هیچ شتێک لە سەرماندا بوونی نییە. سەرمان ئەو بۆشاییە گەورەیەیە کە ئازارماندەدات. نوسین پڕکردنەوەی بۆشاییەکەیە، ئەوەک بەتاڵکردنەوەی کانێکی پڕ و ئامادە بێت.

دوو شەو دواتر میرزائیل هاتەوە بۆ لام، ئەمجارە بێترس بوو، هەتا دەرگاکەشی دانەخست. گووتی «میرزا نەخۆشە، تا سبەی ئێوارە نایەت. خەڵکیش لە بەزم و جەژنن، من بەتایبەت هاتووم بۆ لای تۆ. تۆ مەلەکبینی، ئەوانی ئێرە کەسیان مەلەکبین نین، من هەر بە میرزا تێدەگەن. زۆرجار پێیاندەڵێم من میرزا نیم، من فریشتەکەی میرزام. باوەڕناکەن... شتێکی مەنتیقییە باوەڕنەکەن. وانییە؟». وایگووت و خەندەیەکی بچوک و شەرمنانەی گرت. دواتر گووتی «من لە مێژە

شارەزای ئەم جێگایەم، زۆر لە مێژە، بیست ساڵیش دەبێت، ها ئێستا دەزانم دەڵێیت درۆمەکە، بورج خۆی تەمەنی ئەوەندە نییە، بەڵام درۆ ناکەم، بەڕاستیمە. گەنجینەی پیاوە لە یادکراوەکان زۆر کۆنە، لە جێگایەکی دیکە بوو، تێدەگەیت، لە جێگایەکی نهێنی دیکەبوو، کە بورجیان دروستکرد ئەو شوێنەیان بە هەموو شتێکەوە گواستەوە، باوەڕم پێبکە، ژوور ژوور، زینۆچکە زینۆچکە، وەک کێکێک چۆن لەتدەکەیت بەوجۆرە لەتیانکرد، خستیانە سەر بارهەڵگری زۆر گەورە، بە سلینگی زۆر گەورە بەرزیانکردەوە و لێرەدا دایاننا. سەرۆک خۆی سەرپەرشتی هەموو شتێکی کرد، گوتی نابێت دەرگاکانی ئەم جێگایە بکرێتەوە، یادەوەری خەوتوو دەبێت هەمیشە بخەوێت. شتێکی مەنتیقییە سەرۆک وابیربکاتەوە، وانییە؟ زۆر مەنتیقییە. لەبەرئەوە من لە مێژە هەموو ژوورەکان دەناسم، ئەم ژوورەی تۆ، ژووری چوارسەدوشەست، پێش تۆ هەڤاڵ مەعسومی ڕێحان خانی تێدا بوو. دەزانیت کێ دەڵێم؟ ئەوەی لە شەڕی ناوخۆدا لە بناری سەفین، سەرکەوتی مام ئایشی کوشت، بیرتە، دڵنیام ئەو ڕووداوەت لە بیرە». نا من زۆر شتم یادکردبوو، لەو ساڵانەی دواییدا زۆر وردەکاری شەڕ و پێکدادانەکانم بیرچووبووەوە، زۆرجار بۆ ئەوەی شتێکم بیربکەوێتەوە دەگەڕامەوە سەر یاداشتەکانم. گوتم «نا بیرم نییە، دەزانم کەسێک هەبوو ناوی مەعسومی ڕێحان بوو، بەڵام ئەوەی من بزانم دەمێک ساڵە کوژراوە، بیستوومە کە لە شەڕی ناوخۆدا کوژراوە». میرزائیل بەرامبەرم دانیشت و قاچی درێژکرد و گوتی «داوای لێبوردن دەکەم، من دەبێت قاچم درێژبکەم و تۆزێک ڕاحەت دابنیشم، لە ژیانمدا زۆر جوڵاوم. نا مەعسومی ڕێحان نەکوژراوە، دەڵێن لە شەڕی ناوخۆدا ویستوێتی ڕابکات، لەگەڵ دوژمندا ڕێکەوتووە بینێرن بۆ ئەورووپا، سەرۆک پێیزانیوە و ئیتر ماڵاوا، ناردویانە بۆ ئەم ژوورە. وای قاچم ماوەیەکە زۆر ئازارمدەدات، فریشتەیەک بووم لەوانەی ڕەحمم بە خۆم نەکردوە، زۆر گەڕاوم، زۆر زۆر، فریشتەیەکی ئاسایی توانای نییە بەوجۆرە بژی کە من ژیاوم. هەتا مەرحوم مەهدائیلیشم بینیوە، بەڵێ من زەمانی مەهدائیلیش هەبووم، کۆنم، لە مێژە لە میرزا ترازاوم. میرزا ناتوانێت من ببینێت... مەبەستم

ئەوەیە ناتوانێت باڵەکانم ببینێت و بزانێت من فریشتەم و ئەو شتانە، لەبەرئەوە خۆمی لێ ئاشکرا ناکەم، هەمیشە بەدوایەوەم، هیچ نیازێکم پێی نییە، بەڵام وەسواسێک لە دڵمدایە و دەمەوێت بزانم چی دەکات و لە کوێیە. دەبێت زۆر وریابم، دەبێت شتێک نەکەم ناحەزێک پێم بزانێت و ئاشکرابم، بەتایبەت من زۆر حەزم لە سەرە ڕۆیی و نەسرەوتنە. سەیرکە بەردەوام وەک ئەو جل دەپۆشم، وەک ئەو دەجوڵێمەوە، وەک ئەو قسەدەکەم، گەرچی لە داخی ئەو ترازام و هاتمەدەرێ، بەڵام بڕوانە، جوان سەیربکە، ئێستا ناچارم بچمەوە بەرگی ئەو، بەردەوام ناچارم بچمەوە قاڵبی ئەو بۆ ئەوەی تێبگەم، بجوڵێم، هەندێ کاری باش بکەم. دەزانی من کەسانی وەک میرزا ناودەنێم چی؟ ناویاندەنێم ڕۆبۆتی ئێڵ و عەشرەت. وەک چۆن دەور و زەمانی گەشەی تەکنۆلۆژیا ڕۆبۆتی خۆی هەیە، دەور و زەمانی خێڵ و خێڵبازیش ڕۆبۆتی خۆی هەیە، میرزا یەکێکە لەوانە. وەک گووتم، من مەرحوم مەهدائیلی فریشتەشم بینیوە، بەڵام نەچووم بۆ کەشتیی فریشتەکان، شەوێک تازە مەلەککوژەکان دەرکەوتبوون بینیم، ئەوەندە لەگەڵمدا خەریکبوو هەر مەپرسە. ویستی بچم بۆ کەشتیی فریشتەکان، گووتی ژوورێکی خۆتت دەدەمێ، دادەنیشیت، وەک گوڵ خزمەتدەکەین و نازانم هەزار شتی تریش. منیش گووتم نا بابە، من ئەهلی جێگای وا نیم، من دەبێت ئازاد بم، بگەڕێم، بێم و بڕۆم. بەسەری تۆ وام پێگووت، گووتم نا چاوەکەم شتی وا بۆ من باسمەکە. بەڵام کەسێکی باش بوو، لە دوای ئەوەوە تاکە فریشتەیەکی زۆر بەهێز و چالاک دیبێتم وەفائیلە. پێمخۆشە دواجار کەسێک دەبینم فریشتەکەی خۆی دەناسێت. بەڵێ ئەم خەزێنە تاریکەیان بەو جۆرە دروستکرد، قاش قاش گواستیانەوە، بێئەوەی بهێڵن بەردی لەبەردی بکەوێت. خۆم لەوێ بووم، بە چاوی خۆم بینیم، نەدەبوو کەس لە ژوورەکان بێتەدەرێ. ها خەڵکی تێدایە خودا دەزانێت چەند ساڵە لەوێیە، لە ناکاو لە سەرەوە بڕیاردەدەن فلانی کوڕی فلان بۆ خەزێنەی هەڤاڵە لە یادکراوەکان، ئیتر تەواو، بای بای... لێرە خۆت دەبینیتەوە». من گووتم «نامەیەکم نوسیوە بیدەرە دەست وەفائیل. ئەو خۆی دەیداتە دەست ئەو

کەسەی کە پێویستە». نامەکەی وەرگرت و خستییە گیرفانییەوە و گووتی «ئەگەر ماوەیەک ونبووم دڵت هیچ نەکات، ناتوانن من بگرن، نا دەرەقەتی من نایەن، مەبەستم مەلەککوژەکانە. پێت عەجایەب نییە من لە هەموو شتە سەختەکان دەرچووم، لە مێژە لە شاردام، بەڵام ڕاستتدەوێت حەزم لێیەتی، حەزم لە شارە، ئەوەش شتێکی مەنتیقییە». لێم پرسی «چۆن منت ناسییەوە؟». تۆزێک خۆی ڕاوەشاند و وەک بیەوێت باڵەکانی سرپنەبن دوو جار کردنییە، ڕایتەکاندن و دایخستن، گووتی «ئاسانە، لە دەرەوە هەرایەکی گەورە لە سەر تۆ هەیە». بەفزولەوە پرسیم «هەرای چی؟». گووتی «دوو لیوا جەنگیز هەن، یەکێکیان هاوڕێکانت دروستیانکردوە، یەکێکیشیان پرۆفیسۆر شالیار». تۆزێک بێدەنگ بوو و گووتی «مەنتیقییە، کەسێک لە نێوان ژیان و مردندا بێت زۆر کەسی تر دەتوانن بەرگی بپۆشن و ژیانی لەبەربکەن. تۆ ئەو ڕۆژەی گیرایت لە جێگایەکدا بوویت بکرێت زۆر دەموچاوت هەبێت. شتێکی مەنتیقییە بەوەدا هیچ کەس بە ڕەسمی مردنی ڕانەگەیاندویت، هەر کەس دێت و تۆ بۆ خۆی داگیردەکات، ئەوەت لێ دروستدەکات کە خۆی دەیەوێت». کەمێک وەستا و گووتی «چۆن توانیوتە ئەو هەموو ساڵە فریشتەت نەبێت و هێشتا بەمجۆرە لەت لەت بیت؟». من نەمدەزانی باسی چی دەکات. پرسیم «بۆ شەوانە وا سەیرت دەکردم؟ سەیرکردنی وا زۆر ئازارم دەدات». هەستا و بێئەوەی وەڵامبداتەوە، گووتی «گەر هاوڕێکانت نامەیان هەبوو من دەیهێنم بۆت، هیچ کەس تا ئێستا لەم مەخزەنەوە دەنگی نەچۆتە دەرەوە. تۆ یەکەم کەس دەبیت. شتەکە گاڵتە نییە. دەمێک ساڵە دەمەوێت ئەوە بکەم، بەڵام کوا دەرفەتی گونجاو دەرەخسێت. ئێستا هەستدەکەم وردە وردە دەبێت چیرۆکی ئەم جێگایە بڵاوبێتەوە. من بەهرەی نوسینم نییە، بیستوومە دەڵێن تۆ نوسەرێکی باشیت. وەفائیل پێیگووتم، گووتی تۆ نوسەرێکی باشیت. گەر بتوانی چیرۆکی ئەم جێگایە بگێڕیتەوە، کارێکی گەورەت کردوە، من دڵنیام لە قووڵایی ناخی میرزاشدا حەزێتی چیرۆکی ئەم شوێنە بۆ دونیا بگێڕێتەوە، بەڵام میرزا سەگێکی دڵسۆزە، وەک تۆ نییە، ئەو تا دەمرێت هەر وەک سەگێکی دڵسۆز

دەمێنێتەوە. بەڵام هەموو شتێک لە کاتی خۆیدا، دەبێت هەموو شتێک بە ڕێکی و بە حیساب بکرێت. جەنابی لیوا هەرکات بچوکترین هەواڵ لە سەر ئەم جێگایە بڕواتە دەرێ، میرزا تیادەچێت، میرزا دەفەوتێت، هەر کاتێک ئەویش فەوتا ئیتر منیش ناتوانم بێمە ئێرە، ئەو کات هەموو شتێک دەپچڕێت و تاکە هیوایەک هەمانە دەبێتە تۆز و ئەم جێگایە بۆ هەتا هەتایە وەک کونجێکی نهێنی و نەدۆزراوە دەمێنێتەوە. حەقیقەت وایە، بۆ ئەوەی دەریبخەیت دەبێت بیشاریتەوە یان بە پێچەوانەوە بۆ ئەوەی بیشاریتەوە دەبێت دەریبخەیت. بەڵام بنوسە هاوڕێم، بنوسە، لەو ڕێگایەوە هیچ نەبێت یادەوەری خۆت لە فەوتان ڕزگاردەکەیت. من کاغەز و پێنوس و ڕۆشناییت بۆ ئامادەدەکەم. وەک فریشتەیەکی بێدەسەڵات هەر ئەوەم بۆ دەکرێت».

قسەکانی دوودڵیانکردم، گەر قسەکانم ئاشکرابایە، نەمدەتوانی چی تر بنوسم، بەڵام گەر ئاشکراش نەبێت بۆ چی بنوسم. بە نائومێدییەوە گووتم «من هەموو ژیانم یاداشتم نوسیوە، بەڵگەنامەم کۆکردۆتەوە، هەموو شتێکم کردوە، بۆ ئەوەی دواجار، بەر لە مردنم بیانکەمە کتێبێکی گەورە. ئێستا سوودی چییە کە ئەم کتێبە هەرگیز نەیەتە دەرێ. دوای ئەوە من لێرە خۆم یادەوەریم نەماوە، گەر دەستم نەگات بە نوسینەکانمدا چیم و چیم پێدەکرێت؟».

ئێستا بەپێوەبوو، ژوورەکە لەوە بچوکتر بوو بتوانێت پیاسەی پێدابکات. کەچی لەو مەودا بچوکەشدا هەر دەجوڵا و سرەوتی نەبوو، یاری بە دەستی دەکرد، قاچی ڕادەوەشاند، باڵی دەکردەوە و دایدەخست. گووتی «نوسین کارێکی باشە، ناهێڵێت زوو بمریت. بە قسەم بکە. نوسین تاکە شتە لە جێگایەکی وادا تەمەنت درێژدەکات. بۆچی بمریت؟ مەڵێ ژیانم بۆچییە و ئەم قسانە، هەموو وادەڵێن، تۆ وامەڵێ. من دەزانم دەرچوونت بۆ نییە، مەگەر موعجیزەیەکی خودایی، ئەمە لە حاڵەتێکدا گەر خوا بوونی هەبێت، گەر وانەبێت دەبێت بە دیار موعجیزەی ترەوە دابنیشیت،

ڕووداني ئەوانیش لە ڕووداني موعجیزەی ئیلاهی ئەستەمترە، ئەوانیش هەر کێشەی ئەگەر و نەگەرە. بەڵام هەموو شتێک لە مردن باشترە».

بە دوودڵییەکەوە گووتم «وا لە قسەکانت تێدەگەم، وەک ئەوەی خەڵک لە دەرەوە نەزانن من لێرەم و ئاگادارنەبن کە حیزب گرتوومی». سەری بادا و گووتی «مەبەستت چییە لە خەڵک، خەڵک کوا هەیە؟ ... خوایە گیان زۆر دەمێکە گوێم لەو وشەیە نەبووە. خەڵک؟ گەر شتێک هەبێت ناوی خەڵک بێت، ئەوا باوەڕ بە هیچ ناکەن. من تەمەنێکە لەم شارەدام، خەڵک باوەڕ بە هەموو شتێک دەکەن و باوەڕیش بە هیچ ناکەن، خەڵک هەمیشە دەڵێن یەکێکی تر وادەڵێت، کەسێکی تر وای بۆ دەچێت. ئەگەر باوەڕیش بکەن چ نرخێکی هەیە؟ هەموو شتێک زوو دەڕوات و زوو بیردەچێتەوە. ئاە تۆ پیاوێکی وا عاقڵ و بە ئەزموون، ئەو هەموو پلە و مەقامە گرنگەت بڕیوە، هێشتا نازانیت خەڵک درۆیەکە خەڵک خۆیان دروستیانکردوە بۆ ئەوەی خەڵکی پێ فریوبدەن... گەر بەتەمای خەڵک بیت لەم بورجە دەرتبهێنن، دڵنیابە زۆر نائومێد دەبیت». من لە ناکاو سەرئێشەیەکی توند گرتمی، کەمێک بە تووڕەییەوە گووتم «من هیچم نەگووتووە. چاوەڕێی هیچ نیم، بەڵام دەمەوێت خەڵک بزانن لێرەم، گیراوم، بزانن حیزب وەک سکرابی ژەنگاوی فڕێیداوم. ئەوەم دەوێت». بە سەرسامییەوە گووتی «بۆچییتە؟ هەموو شار یەک بە یەک بزانن تۆ لێرەیت هیچ لە هیچ دەگۆڕێت؟ بە تەمای چیبکەن، بێن ئازادت بکەن؟ ئەو خەیاڵاتانە لە سەری خۆت دەربکە. خەڵک بزانن یان نەزانن بەیانی هەڵدەستن لە خەو و دەچن بۆ سەر کاری خۆیان. تۆ خۆت ساڵەهای ساڵ خاوەن زیندان بوویت، لە ژێر زەمینی ئاسایشدا گوونی گووندارت دەردەهێنا، کەس بەخەی تۆی گرت بڵێ بۆ وادەکەیت. لەبەرئەوە هەیئەتی پیاوی مەزلوم لە خۆ مەگرە. نا بەڕاستیمە جەنابی لیوا، زوڵمێک لە گۆڕێ نییە... هەموو شتەکان زۆر مەنتیقین، تۆ لە پێناوی حیزبدا خەڵکت ئازار داوە، حیزبیش لە پێناوی خەڵکدا تۆ ئازاردەدات. ئەمجۆرە گێژاوە ئەبەدییە، هەمیشە تۆ لە پێناوی یەکێکدا یەکێک ئازاردەدەیت، ئەو لە پێناوی یەکێکی تردا تۆ

ئازار دەدات، ئەو یەکەی تریش لە پێناوی یەکێکی تردا یەکێکی تر ئازار دەدات، ئەو یەکەی تریش بۆ یەکێکی تر، ئیتر بەو جۆرە زنجیرەکە تا قیامەت درێژدەبێتەوە. ئاە، لێت تێک نەچێت من لەو فریشتانەم کە باوەڕم بە ئینسان نییە، ئینسان هەمووتان مەلەککوژن، بێناوازە و ڕیزپەڕ. جەنابی لیوا ئەوەی لە تۆدا نرخی هەیە نە ویژدانتە، نە جەستەتە، نە مێژووتە، نە ئەخلاقتە... هیچ شتێک... تەنیا شتێکت نرخی هەیە یادەوەریتە. هەر تۆ وا نیت، هەموو ئەوانەی لە سەردەمی تۆدا ژیاون و سیاسەتتان کردوە، تەنیا یادەوەریتان بە کەڵک دێت ... نیگەران مەبە، من خەڵکی ئەم شارەم، فریشتەکان لە کوێدا بترازێن هەر لەوێ دەمێننەوە، حەیواناتی ماڵین، حەیواناتی ماڵی لە پشیلە بێکەڵکترن. من هەمووتان دەناسم... بەشی هەرە زۆری خەڵکی ئەم شارە. سەیرکە من دوژمنی کەس نیم، دوژمنی هیچ کەسێک، بەڵام دوژمنی میرزام. میرزا دەیەوێت هەرچی یادەوەریی ئینسانەکانە بیسڕێتەوە. لێرەدا مانا و ئیش و وەزیفەی من وەک فریشتە ڕووندەبێتەوە، دەزانم بۆ ترازاوم، دەزانم بۆ لەم دونیایەدا ژیاوم و ماومەتەوە. بۆ وەک فریشتەکانی تر نەچووم بۆ کەشتی و لەوێ تیا نەچووم؟ چونکە دەبوو شتێک بکەم سنوورێک بۆ میرزا دابنێم. من لێرەم بۆ ئەوەی یادەوەری تۆ ڕزگاربکەم... ئەو یادەوەرییە مەلعونەت کە بەهای گەنجینەیەکی ئاڵتونی هەیە، هەستدەکەم ئەم هەموو ساڵە تەنیا بۆ ئەم ڕۆژە ژیاوم و دانیشتووم. خەڵک لە هیچ شوێنێک باسی تۆ ناکەن... تۆ کێیت جەنابی لیوا تا باستبکەن، کێیت؟ خەڵک تەنیا باسی یادەوەریت دەکەن. تۆ لە مریشکێکی نەخۆش دەچیت کە هێلکەیەکی زێڕ لە قوونتایە، هەموو دەیانەوێت ئەو هێلکە زێڕە دەربهێنن و بیبەن بۆ خۆیان، بەڵام ئەو هێلکە زێڕە ئێستا هێلکەی منە، هێلکەی منە و بەس، یان دەیدەی بە من یاخود دەمریت و هێلکە زێڕەکە لە قوونتا لە نێودەچێت ... کامیان جەنابی لیوا؟ کامیان... خۆت هەڵیبژێرە».

قسەکانی خاڵی نەبوون لە شەڕانگێزی و گاڵتەجاڕی، بەڵام پڕیش بوون لە حەقیقەت. بەر لەوەی بڕوات، گووتی «هەموو ئەو ژوورانەی تریش لەم گەنجینەیە پڕن لە خەڵکانێک وەک تۆ یادەوەریان ئازاریان دەدات، بەڵام

چەند ساڵە سەیردەکەم و دەڵێم ئەمە یادەوەرییە بچوکەکانن، ڕۆژێک دێت یەکێک دەهێنن کە هەموو نهێنییەکانی لە ژێر سەردا دەبێت، هەتا ئەو نهێنیانەش کە سەرۆک و میرزا نایزانن، من دەبێت چاوەڕێی ئەو نەهەنگە گەورەیە بکەم، دەبێت بوەستم تا دەکەوێتە تۆڕەکەوە. ئێستا بەڕێزتان لێرەن، تۆ ئەو نەهەنگەیت کە من چەند ساڵە دەمەوێت بکەویتە تۆڕەکەوە». لەو ساتەدا بە قووڵی سەیریکردم، دیاربوو چەند گرنگم بۆی، دڵنیاشبوو لە دۆخێکدا نیم بتوانم هیچ مەرجێک دابنێم. هەستمکرد لە سەر هەقە، من هیچ شتێک و مانایەکم لە دونیادا نەماوە ئەوە نەبێت کە دوا چیرۆکی خۆم بنوسم. میرزائیل گووتی «گوێبگرە، تۆ ئاگات لە دەرەوە نییە، ئەوەش شتێکی مەنتیقییە، دوای کوشتنی سەعید یۆنان، چەندین چیرۆکنوسی تر کوژراون، گێڕانەوەی چیرۆک بە جۆرێک لە جۆرەکان و بە پێی یاسایەکی نهێنی و نەنوسراو بۆتە کارێکی قەدەغە. لە هەر شارێکیشدا چیرۆک لە مەترسیدا بوو واتە ژیان لە مەترسیدایە. ئەوە قسەی خۆم نییە، ئەوە قسەی هەموو فریشتەیەکە. بەڵام من تەمەنێکە دانیشتووم ئەو کەسە ببینم کە چیرۆکە گەورەکە دەگێڕێتەوە، ئەمە قەدەری تۆیە. ئەوە تەنیا ئیشی گرنگە کە تۆش هەموو ژیانت لە پێناویدا ژیاویت، ئیتر درۆ لەگەڵ خۆتدا مەکە ... تۆ لەو کەسانە نیت کلیلی گەنجینەیەکی نهێنیت لابێت و هێندە نافزول بیت نەتەوێت بیکەیتەوە. تۆ کە بوویت بە ئاسایش ئەم ڕۆژەت لە بەرچاو بوو، ئەو ڕۆژەی هەموو شتێک دەڕوات و تەنیا یەک چیرۆک دەمێنێتەوە، من بە هاوڕێکانتدا دەزانم، بەوانەی لە ژوورەکانی تردان لێرە، هەموو دڵنیابوون ڕۆژێک لە ڕۆژان بە هەر هۆیەک بێت هەموو شتێک دەڕوات و بەسەردەچێت و تەنیا یەک چیرۆک دەمێنێتەوە، بەڵام لە ناو چیرۆکەکاندا، چیرۆک هەیە دەبێت بژی و چیرۆک هەیە لە بیردەچێتەوە... ئەم چیرۆکەی تۆ کە من هاتووم بۆ وەرگرتنی، لەو چیرۆکانەیە کە دەبێت بژی و بمێنێتەوە».



کتێبی کەشتیی فریشتەکان بەو جۆرە دەستی پێکرد. دڵنیابووم ئەو چیرۆکە قەدەری منە. هەموو مرۆڤێک بۆ یەک شت دروستدەبێت، ئێستا لە دوا جێگادا کە دڵنیابووم ئیتر خۆر نابینمەوە، مانای ڕاستەقینەی ژیانی خۆم یەکجار و بۆ ئەبەد دەدۆزییەوە، من بۆیە ژیابووم بۆ ئەوەی بگەمە ئەم جێگایە و فریشتەیەک کەرەستەی نوسینم بۆ بهێنێت و تەواوی چیرۆکی ئەو گەشتە درێژەم بگێڕمەوە. هەر زوو، دەمێک سەعید یۆنان هات بۆ پسمامان و بینی من بە چ ئارەزوویەکی شێتانەوە یاداشتەکانم دەنوسم، گووتی «هەڤاڵ وەفا ، واز لەم بەندیخانەیە بێنە و برۆ درێژە بە خوێندنی ئەدەبیات بدە، لەوە دەچێت تۆ بەهرەت لەم ئیشە گەورەتر بێت». ئەوکات پێمگووت «مامۆستا منێکی زیندانەوان، کادێرێک لە دەزگای ئاسایشی شۆڕش، تازە ئەدەبیاتی چی؟ ئیتر من و ئەدەبیات کوجا مەرحەبا؟». خوالێخۆشبوو گووتی «تۆ لەوانەی چیرۆک زۆر دێنە سەر ڕێگات، بڵێم چی. بیرێک لە قسەکەم بکەرەوە». ساڵان هات و ساڵان ڕۆی، سەعید یۆنان منی بیرچووەوە، کاتێکیش دۆزیمەوە و قسەم لەگەڵ کرد، هەم من و هەم ئەو شتێکی ئەوتۆمان لەو زەمانە یادنەمابوو. بەڵام چیرۆک وەک قەدەر وایە، تۆ بیرتدەچێتەوە، بەڵام ئەو تۆی بیرناچێتەوە.

کێشەی گەورەی هەموو چیرۆکەکانی دونیا ئەوەیە کە هەرگیز لە سەرەتای خۆیان ڕزگاریان نابێت، گەرچی من پێشتر هیچ کات خۆم بەمجۆرە بۆ گێڕانەوەی هیچ چیرۆکێک ئامادەنەکردبوو، بەڵام هەندێک چیرۆک هەن تەنیا بەدوای یەک حیکایەتخواندا دەگەڕێن و هیچی تر، دیارە قسەی ناوێت، هەندێ چیرۆکیش هەن هەمووومان دەتوانین بیانگێڕینەوە، وەک چیرۆکی ئاورنگی کچی پادشا و حەوت بستەباڵاکە، یان لەیلا و گورگەکەی، یاخود سەفەرەکانی سندباد. بەڵام هەندێ چیرۆکی دی هەن کە ساڵەهای ساڵ دادەنیشن و خۆیان پەنهاندەکەن، لە هیچ کونج و

کەلێنێکەوە سەر دەرناهێنن و چاوەڕوانی حیکایەتخوانێکی تایبەت دەبن. ئەوەی لەو چیرۆکانەدا من زۆر ئازاردەدات، بەدنیازی و شەڕانگێزیانە، بە گشتی ئەم چیرۆکانە لە جانەوەرێکی دڕ دەچن، کە سەدان ساڵ لە بۆسەدا دادەنیشن و چاوەڕوانی ئەو کەسانە دەکەن کە دەبێت بیانگۆڕنە سەر حیکایەت، وەک چەند مارێک وەهان لە جێگایەکی شاردراوەدا چاوانیان کردبێتەوە و بۆ چەند کەسێکی دیاریکراو بگەڕێن پێوەیانبدەن. لەو جۆرە دۆخانەدا هەموو شتێک بە جۆرێکی ترسناک ڕێک و بە بەرنامە دەڕوات، وەک ئەوەی پێشوەخت یەکێک چیرۆکەکەی نوسیبێت و ژیان ئێستا بیکات بە فیلمێکی ڕاستەقینە کە بەبێ ئامادەبوونی کامێرا و بینەر، ئەکتەرەکان بێئاگایی خۆیان و لە مەودایەکی درێژدا سیناریۆکە گەمەدەکەن.

هەموو دەزانن من لە سەرەتای پەیوەندیکردنم بە شۆڕشەوە، خولیای نوسینەوەی یاداشت کەوتە سەرم، بەڵام ئەم خولیایە جودایە لە خولیای چیرۆکنوسان، هیچ کات هەستم بەوە نەکردوە کە دواجار سەرنجامم وەک چیرۆکنوس کۆتایی دێت، یاخود چارەنوسی هەموو چیرۆک لە وڵاتەکەدا بە جۆرێک لە جۆرەکان دەکەوێتە سەر ئەستۆی حیکایەتێک کە دەبێت من بیگێڕمەوە. نوسینم بۆ یاداشتە ڕۆژانەکان و وردبینی زۆرم لە وەسفکردنی هەموو شتێکدا، کارێکی بە غەریزەی ڕاوکردنی چیرۆکەوە نەبوو، بە پێچەوانەوە من دەمویست جیهان وا ببینم کە دواتر چیرۆکێک نەیەت و فریوم بدات. لە ڕاستیدا ڕۆحی دوژمنانی چیرۆک و هەوادارانی ئەم هونەرە شەیتانییە زۆر لە یەک نزیکە، هەردووکیان پێویستیان بە وردەکاری زۆر هەیە، هەردووکیان دەبێت دوو چاوی تیژیان هەبێت، یەکەمیان دەبێت ئەو توانا و بەهرەیەی خۆیان بخەنە خزمەت جۆرێک لە وێناکردنی دونیاوە کە وەها ڕاست و دروست بێت، چیرۆک نەتوانێت لە ناو کەلێنەکانییەوە دزەبکات. ئەویدیشیان دەبێت هەموو ئەو هونەر و وریاییە بە جۆرێک بخەنە گەڕ بتوانێت خودی وردبینی بخاتە خزمەتی گومانەوە لە واقیع، بە جۆرێک بیسەلمێنێت، لە دونیادا شتێک نییە ناوی حەقیقەت بێت، تەنیا

چیرۆکە هەیە و بەس. رێدەکەوێت هەندێ جار کەسانێکی وەک من دێنە دونیاوە کە لە سەرەتاوە بۆ وێناکردنی حەقیقەت و ڕاوکردن و وردکردنەوە و تێگەیشتنی دەژین، بەڵام لە ناکاو تێدەگەن حەقیقەت سندوقێکی گەورەیە، ناوەکەی پڕە لە شتێک لە حەقیقەت ناچێت، ئیتر ئەوە سەرمان لێ دەشێوێنێت و دەکەوینە گومانەوە لە دونیا، بە جۆرێک ئیدی هیچ کات نازانین ئێمە لە کوێین و حەقیقەت لە کوێیە. کە لەگەڵ سەعید یۆنان دەستمانکرد بە دامەزراندنی جەمعییەتی ژیانە ونەکان، بە منی گووت «چیرۆک، وەک گوللەیەکی زیرەک وەهایە بۆ سەرێک دەگەڕێت بیپێکێت. تۆ حسابت پاکە، سەرت ڕۆژانە لە سەد لاوە دەپێکرێت». زۆر عەودالی ئەوەبوو، من ژیانی خۆم بنوسمەوە، یاداشتەکانم تەواوبکەم، کورتیانبکەمەوە، پێی وابوو ژیانی من خۆی شوێنێکی ترسناکی لێکدانی ژیانە ڕاستەقینەکانمانە لەگەڵ ژیانە ونەکاندا. چەند هەفتەیەکیش بەر لە کوشتنی، بە نهێنی بینیمەوە، دەستی خستە سەر شانم و گووتی «بنوسە، هەموو شتەکان بنوسە، لەوە مەترسە خۆت تاوانبار دەبیت، لە هەموو دیانەت و یاساکاندا داننان بە تاواندا گەر پاکیش نەبەخشێتەوە بە مرۆڤ، ئەوا جوانی پێ دەبەخشێتەوە». دواتر گووتی «نابێت بمریت، بەر لەوەی هەموو ئەم چیرۆکە بگێڕیتەوە؟». ئەو مرۆڤی وەک بوونەوەرێک دەبینی کە لە ماڵێکدا دەژی ئاگرێکی گەورەی تێدا کەوتۆتەوە، ئاگرێکی ئەزەلی کە لە سەرەتای بوونەوە مرۆڤ گەمارۆدەدات و دواجار کەس لە چنگی ڕزگار نابێت. چیرۆک تەنیا کەشتییەکە مرۆڤ دەتوانێت هەندێ شتی تێبخات و دوای خۆی بەرەو ڕزگاریی بیاننێرێت... بەڵام بەرەو کوێ، خۆشی نەیدەزانی.

من لە پسمامانەوە ئەو خولیا شێتانەیەم لە سەعید یۆناندا بینی، دەمێک زیندانەکانی بەسەردەکردەوە و لە ژیانیانی دەپرسی. وەک چۆن ڕاوکەرێک لە بۆسەی نێچیرداندا دەبێت، سەعید یۆنان لە دوای چیرۆک بوو. دوای ئەوەی لیڤیتانت پسمامانی جێهێشت، شۆڕش پیاوێکی غەمگینی کردە بەڕێوەبەری زیندان، ناوی « مامۆستا سوارە» بوو. من هەر بینیم زانیم

بە کەڵکی بەڕێوەبردنی زیندان نایەت. مرۆڤی غەمگین ناتوانێت خۆی زۆر بە کاروباری ئەوانی دییەوە سەرقاڵبکات، مامۆستا سوارەش لەوانە بوو. لەبەرئەوە گەرچی من بە ڕەسمی بەڕێوەبەر نەبووم، بەڵام چاودێری تەواوەتی زیندان کەوتە ئەستۆی من. ئەو کات لە ڕێکەوتێکیشدا دەرفەتی ئاشنایی مامۆستا سەلیم ئەسغەرم بۆ ڕەخسابوو، زانیاریشم هەبوو کە دۆست و هاوڕێی سەعید یۆنانە و هەردووکیان وەک دوو نوسەری گەنج هەم عاشقی ئەدەبیات و هەم سەوداسەری فەلسەفە و ڕەخنەن. دەبێت بڵێم جگە لە داوەتەکەی من و جگە لە خولیای ئەو دوو هاوڕێیە بۆ ئەوەی ماوەیەک لە هەرێمێکی وا شاخاویی و سەیردا پێکەوە بەسەربەرن، چیرۆکەکانی نزار ئیدریس دەربارەی ترسناکی زیندانەکە ڕۆڵێکی گرنگی لەوەدا بینیبوو کە یۆنان ئارەزووی داگیرسێت و بەڕاستی بیەوێت پسمامان ببینێت. سەعید ئەودەم هێشتا کەمێک هیوای بە چاککردنی دونیا هەبوو، هێشتا ڕای وابوو ئاشکراکردنی هەندێک چیرۆکی غەمگین و چنینێکی سیحراویی بۆ سەربورد و بەسەرهاتەکان، لەوانەیە کاریگەرییەکی وەهایان هەبێت ببێتە مایەی گۆڕینی دونیا یاخود چاککردنی ئەخلاقی ئادەمیزادەکان. ئەوە دەردێکە هەموو چیرۆکنوسێک سەرەتا تووشی دێت، هەموو چیرۆکنوسێک وادەزانێت گەر کارەساتێک یان بەدبەختییەکەی گێڕایەوە، بەوە کاریگەرییەکی قووڵ لە سەر ویژدانی مرۆڤەکان جێدەهێڵێت، لەو ڕێگایەشەوە وانەیەکی ئەخلاقی قووڵ دەداتە خەڵک و ئەخلاقیان بۆ پلەیەکی باڵاتر بەرزدەکاتەوە.

من لەوێ زۆر کۆمەکی هەردوو چیرۆکنوسی لاوم کرد، کە هەردووکیان غرور و غوبابی لاویی، خەیاڵاتی سەیری خستبووە دڵیانەوە. هەر ئەوکات زانیم کە سەعید یۆنان بە جۆرێک لە جۆرەکان و بێئاگایی خۆی، بایەخێکی گرنگ بە ژیانی دووەمی مرۆڤەکان دەدات، ژیانە بەباچووەکەیان، ئەو ژیانەی کە دەشیا بژیابان. زۆرجار کە لە چاوپێکەوتنی دیلێک دەگەڕایەوە غەم دایدەگرت، غەمێکی قووڵ... دەیگووت «ئەم گەنجە لە هەرجێگایەکی دونیادا بایە، جگە لەم

کوردستانە کاولە، دەکرا ژیانێکی باشتری هەبێت». ڕستەکە لای من ئاوازێکی گەلەک بێتام و بێمانای هەبوو. نەمدەزانی ئەم گەنجانە جگە لەم وڵاتە دەکرا لەکوێی تر بژین؟ دەمگووت دەبێت دڵخۆش بن کە ژیانی بن بنمیچی زیندانی پسمامانیشیان دەستکەوتوە. بەڵام لەو سەردەمەوە زانیم کە سەعید یۆنان لە دوای ژیانێکی ترە، ژیانێک وەک من لە ڕێگای گۆڕانکاری سیاسی گەورەوە نەیدەبینی، بەڵکو وەک دونیایەکی شاردراوە دەهاتە پێشچاوی کە دەکەوێتە سەرداب یان بن ئەم ژیانەی ئێستامان.

ئەو شەوە کە میرزائیل «ئەوە ناوێک بوو دواتر بەخشیمانە ئەم فریشتەیە» هاتە لام و بەو زمانە قسەی لەگەڵ کردم و پێشنیاری پێدام کە دەتوانێت نەهێڵێت یادەوەریم بخنکێت، هەستمکرد ڕیشەکانی ئەم هەوڵە سەیرە دەگەڕێتەوە بۆ شەوە دوورەکانی پسمامان، بۆ سەردەمی ناسینی ئەو دوو چیرۆکنوسە و ئیشکردنیان لە سەر چارەنوسە ونەکان و یادەوەرییە دیلەکان. ئەو دەمیش زیندانییەکان سەعید یۆنان و مامۆستا ئەسفەریان وەک دوو هێزی فریادڕەس دەبینی کە لە ئاسمانەوە بۆ کۆمەکی ئەوان هاتوون... ئەودەم ئەوان فریشتەکانی پسمامان بوون. لە دڵی خۆمدا گووتم «هەموو چیرۆکێکی گرنگ فریشتەیەکی هەیە ڕزگاریدەکات».

بەوجۆرە لە ناو ئەو قەڵا تاریکەی بورجەوە، دەستمکرد بە نوسینی «کەشتیی فریشتەکان». دەبێت دان بەوەدا بنێم، شتێک زۆر لە نوسیندا کۆمەکیدەکردم تاریکی بوو، لە تاریکییەکی وەها درێژ و بەردەوامدا، مرۆڤ جگە لە یادەوەری خۆی، هیچی تری نییە تەماشایبکات. هەموو ژیانم سات دوای سات دروستکردەوە، سات دوای سات، ڕستەکان و ئاماژەکان و چیرۆکەکان وەک تۆفان بەسەرمدا دەهاتن، لە سەر کاغەزەکان بە خەتێکی زۆر ورد دەمنوسین، چی چیرۆکێکم بیستبوو، چی ڕاپۆرتێکم خوێندبووەوە، چ دیالۆگێکم دەزانی، هەموویم تۆماردەکردن، لە زۆر جێگاشدا کە پێویستبایە، ڕۆڵی خودام دەگرتە بەر و خۆم وردەکارییەکانم دەهێنایە پێشچاو و دروستمدەکردنەوە. دواجار من ژیانی خۆم یان ژیانی

ئەوانی دی یان مێژووم نەدەگێڕایەوە، بەڵکو چیرۆکم دەنوسی. لە چیرۆکیشدا مرۆڤ خۆی دەخاتە جێگای هەموو هێزە گەورەکان، بەسەر هەموو بەربەستەکاندا زاڵدەبێت. تا دەستم نەکرد بە نوسینی ئەم کتێبە، نەمدزانی بۆ چیرۆکنوسین هونەرێکی وا مەترسیدارە. گەرچی من لە قووڵایی تاریکیدا دەمنوسی، گەرچی هەرچی دەرگا و دیوارەکانە لێم داخرابوون، گەرچی لە نهۆمێکی نادیاری بورجێکی زەبەلاح و ئەفسانەییدا دیل بووم، گەرچی هیچ گوێیەک لەم سەر زەوییە نەیدەبیستم، بەڵام چیرۆک ئەو هێزەی دەدامێ کە هیچ کات هەستم پێ نەکردبوو، هێزێک ئەو کاتانەش بە خۆمەوە نەدیبوو کە هەموو ئاسایشی وڵات لە ژێر چنگی مندا بوو، سەردەمانێک سەرۆک خودا لێیخۆش بێت، مافی دابوومێ هەتا خێزانەکەشی بخەمە ژێر چاودێرییەوە. هەستێکی بێسنوور بە توانا و دەسەڵات بەسەر شوێنەکان و چارەنوسەکان و بوونەوەراندا، هەستێک پێتدەڵێت ئەوە تۆیت حەقیقەت دروستدەکەیت. هەستی دیکتاتۆرێکی ترسناک کاتێک هەموو ئادەمیزادەکان دەکەونە ژێر ڕکێفی. من لەوێوە، لە ترۆپکی لاوازی خۆمدا بۆ یەکەمجار هەستمدەکرد ئەوە منم کە وێنەی ئادەمیزادەکان دەکێشم و تەنیا ئەو وێنەیەش دەمێنێتەوە کە من بۆ ئەوانی تری دروستدەکەم. ئەو هەستە بە جۆرێک زاڵ دەبوو بە سەرمدا زۆر کات تورەیدەکردم، هەستێک بوو زۆر دوور نەبوو لە هەستی سیاسییەکان، لەو هەستەم ڕۆژگارێک لە ئاسایش تەواویی دەسەڵاتم هەبوو... هەستمدەکرد لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەر دەمەوێت ئەو چاوەبم کە دەبینێت، ئەو کەسەبم کە بە بینین دونیا دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. هێشتا چەند لاپەڕەیەکم نەنوسیبوو کە هەستمکرد جەلاد و چیرۆکنوس زۆر دوورنین لە یەکترەوە، بە جۆرێک زەحمەتە هەر دووکیان پێکەوە لە سەر زەمینێکدا بژین. بەڵام دواتر کە هەموو ئەم چیرۆکە لە دوا شێوەیدا هاتەوە دەستی من، تێگەیشتم، ئەم چیرۆکە گەورانە، هەمیشە زیاد لە جەلادێکیان هەیە و بە زیاد لە دەستێک دەنوسرێن.

## شاری کتێبە نەخوێندراوەکان

لەگەڵ گەرمبوونی شەڕی ناوخۆدا، شوێنی لیڤیاتانت بە جۆرێکی بێهۆ گەورە و پایەداربوو. هۆی ئەو بەهێزییە تەنیا نزیکی و ناسیاویی لیڤیاتانت نەبوو لەگەڵ بازرگانە ئێرانییەکاندا، بەڵکو پیاوەکانی لیڤیاتانت، ئەوانەی دەبوونە کۆیلە و پەیمانێکی نهێنی و تایبەتییان لەگەڵدا مۆردەکرد، گەیشتبوونە زۆربەی خاڵە سنوورییەکان و لە بەشی هەرە زۆری گومرگەکاندا شوێنی خۆیان کردبووەوە، تورێکی گەورەش لە پیاوانی ئەو لە هەموو کونج و جێگایەکدا دەبوونە شت و دەسەڵات و هێزیان دەکەوتە دەست. لەو سەردەمەدا شەڕێکی نهێنی لە نێوان بەشی هەرە زۆری ئەندامانی بیرۆی سیاسی و کەسایەتییە دیارەکانی حیزبدا لە سەر دانانی کەسانی خۆیان لە جێگا گرنگەکاندا دەستی پێکردبوو، بە جۆرێک دامەزراندنی هەموو کارمەندێک لە شوێنە هەستیارەکاندا دەبووە مایەی گرفتی گەورە. من سەرنجمدا کە پیاوانی لیڤیاتانت بە دڵسۆزییەکی بێوێنەوە خزمەت بە ئاغاکەیان دەکەن، لیڤیاتانت چیتر تەنیا زیندانەوانێک نەبوو کە لە ژێر گوشار و دیلکردندا ئەوانی دی کردبووە گوێڕادێری خۆی، بەڵکو بە جۆرێکی زیرەکانە ئەو هەستەی لە پیاوەکانیدا دروستکردبوو کە ئیشکردنیان لەگەڵ ئەو، پاشەڕۆژیان بۆ مەیسەر و زامن دەکات، بە مەرجێ هەموو کات بەشێک بن لە لەشکرە نەبینراو و نهێنییەکەی خۆی. هەر ئەو کات بیستم کە چەندین کەس خۆبەخشانە لە خزمەتی لیڤیاتانتدان و هەر کاتێک بیەوێت دەتوانێت بانگیانبکات و بیانخاتە بەر لێدان و قامچی. ئەوەی هەواڵەکەی بۆ هێنام، لیستێک ناویشی لەگەڵ نامەکەدا هەڵپێچکردبوو، کەسانێک «وەک من لە شەوانی سەقزدا» هەستیاندەکرد کە دەبێت بە دەستی هێزێکی لە خۆیان گەورەتر و برسیتر سزا بدرێن...

سزا لە سەر تاوانێک کە شێوە و ڕەنگ و ناوی نییە، بە جۆرێک دەڵێن زۆر شەو کە لیڤیتانت چیرۆکی ئەو پیاوە خۆبەخشانەی بۆ خانمی ماردینی باسکردوە، خانم باوەڕی بەوە نەکردوە لە شارێکی وەهادا کە نێرەکانی خۆیان بە قارەمانتر لە پاڵەوانی داستان و ئەفسانە کۆنەکان دەزانن، هێندە پیاو هەبێت، حەزیان لە خۆ سزادان و زەلیلییەکی لەو چەشنە بێت.

دواتر بۆم دەرکەوت گەورەبوونی دەسەڵاتی لیڤیتانت هۆکاری دیکەی لە پشتە و بە پلانێکی گەورەتر و ئاڵۆزتر بەڕێوەدەچێت. ئەو کەسەی دواتر بە «پسپۆڕ» ناسراو لە هەموو شتێکی ئەم وڵاتەدا ڕۆڵێکی گرنگ و ترسناکی بینی، یەکەمجار لە چیرۆکی ئاوسان و گەورەبوونی دەسەڵاتی لیڤیتانتەوە هاتە زیندەگیمانەوە. پسپۆڕ کاری ئەوە بوو وابکات مرۆڤەکان بە هێمنی ڕۆڵی خۆیان بگێڕن، سەرەتا لەگەڵ تیمەکەی باهیریدا کاریدەکرد، بەڵام هەڵبەت وەزیفە و کاری دیکەشی هەبوو. کەس ناوی ڕاستەقینەی کابرای نەدەزانی، پێیاندەگووت «پسپۆڕەکەی باهیری». بەپێی زانیارییەکانی من لە ئەکادیمیاکەی باهیریش تەنیا بە «پسپۆڕ» بانگیدەکەن. کەسایەتییەکی تەماوی و بێناونیشان بوو، سەرەتا ویستم دەسەڵاتی خۆم تاقیبکەمەوە و بەو پێیەی بەرپرسی دۆسییەی ئەمنییەتم، بکەومە دوای ئەم مەخلوقە نەناسراوە و هەتا گەر پێویستیشیکرد بیگرم و لای خۆم بیخەمە ژێر پرسیار و وەڵامەوە. بەڵام هێندەی دەستمکرد بە بەدواداچوون، نامەیەکی تایبەتی سەرۆکم بۆ هات، تەنیا یەک دێڕی کورت بوو «وەفا کارت بە کاری ئەو پسپۆڕەوە نەبێت کە لای باهیری ئیشدەکات». دەمودەست تێگەیشتم حکایەت چییە و کێ لە بنەڕەتدا لە پشتی پسپۆڕە و کار ئاسانی بۆ کردوە لێرە وا چالاک بێت، زانیم ئەوە جێگایەکی حەرامە و من هەر ناو و نیشانێکم هەبێت، بۆم نییە دەست بۆ قەڵەمڕەوی وەها بەرم. «پسپۆڕ» لای باهیری ئیشیدەکرد، کاری ئەوەبوو وابکات بەرپرسە باڵاکانی حیزب بتوانن بێ هیچ توندوتیژییەکی زیاد و بێ هیچ خۆزڕاندنێکی بەرچاو، نیازەکانی خۆیان تێربکەن و بگەنە ئەوەی

دەیانەوێت. لە ناکاو هەموو هەستمان بە نزیکبوونەوەیەکی زۆر لە نێوان پسپۆڕ و لیڤیتانتدا کرد. سەرەتا وەک هاوڕێتییەکی ئاسایی هاتە بەرچاو، بەڵام دواتر شتەکان چوونە پێشێ و وای لێهات ئێوارانێک پسپۆڕ لە باڵکونیماڵی ئەوان لە نێوان خانمی ماردینی و لیڤیتانتدا دادەنیشت و شەربەتی مێوژ و قاوەی دەخواردەوە. ئاشکرا مەسەلەکە هەر هێندە نەبوو کە لیڤیتانت لە پەیمانگاکەی باهیریدا شەریکە، بەڵکو شتێکی دیکەش بوو کە پەیوەندی بە ئامادەکردن و ئیشکردنێکی زۆری ئاغای پسپۆڕەوە هەبوو لە سەر کەسی لیڤیتانت. پێدەچوو سەرۆک تایبەت پسپۆڕی ڕاسپاردبێت، لیڤیتانت لە کەسێکی کێوییەوە بگۆڕێت بۆ دەوڵەمەندێکی شارنشین و شارستانی. سەرەتا خەیاڵم بۆ بیرۆکەی وەها نەچوو، دەبێت سەرۆک بۆ کاری وەها بکات و بۆ لیڤیتانتی بەو جۆرە بۆ گرنگ بێت؟. بەڵام یەکێک لە هەرە کارمەندە دڵسۆزەکانم کە تەنیا بە «کارمەندی دڵسۆز» ناویدەنێم و ناوی ئاشکرا ناکەم، بە ڕەزامەندی کەسی سەرۆک لە نزیک بیرۆکەی ئەوەوە و لەگەڵ هێزی خۆپارێزی ئەودا کاریدەکرد، ئەو هەموو شتێکی لە ڕاپۆرتێکی نهێنی و تایبەتدا بۆ ڕوونکردمەوە، کە لەبەر تایبەتمەندی و نهێنیبوونی بە دەستی خۆی پێشکەشیکردم و نەیویست بە ڕێگای هیچ پۆستەبەرێکدا بگاتە لام. کارمەندە دڵسۆزەکەم ڕایوابوو، بایەخی گرنگی سەرۆک بە لیڤیتانت دەگەڕێتەوە بۆ قەناعەتێکی قووڵی جەنابیان بەوەی بەشی هەرە زۆری سەرکردایەتی حیزب لە پیاوانی ناشارستانی و کێوی و مایل بە شەڕانگێزی پێکهاتوون و کەسێکی وەهایان تێدا نییە بە توانا و ئەخلاق بە کەڵکی سەردەمی ئەمڕۆ بێت، یان جگە لە هێز و توندوتیژی، ڕێگایەکی تر بزانن بۆ ئەوەی بگەنە ئاواتەکانیان. بەپێی ڕاپۆرتەکەی ئەو، لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆدا، سەرۆک کەوتۆتە ژێر فشارێکی گەورەی دەوڵەتە ئەوروپییەکانەوە تا ئەم جەنگە دوایی بهێنن و بە جۆرێکی تر کێشەکان چارەبکەن. بە قسەی کارمەندەکەی من، جەنابی سەرۆک «خودا بە بەهەشتی بەرینی بسپێرێت»، دووجار بەسەر شان و ملی ڕەوانەکراوە ئەوروپییەکاندا گریاوە و گووتوویەتی «تووش بوویمە، کەس لەگرە نازانێ عەقر بەکاربێنی. یەکێکی عاقڵم بدەنێ ڕێم بۆ دانێ».

بەپێی ڕاپۆرتەکە پسپۆڕەکە، تەنیا یەکێکە لە ژمارەیەک پسپۆڕی تر کە بە نهێنی لە شوێنی تر و لە ژێر ناوی تردا کاردەکەن و هەر یەکەیان ئیشێکیان هەیە. لیڤیتانت لە ڕوانگەی سەرۆکەوە، یەکێکە لە هەرە توندترین و کێویترین سیاسەتمەدارەکانی ئەمڕۆ. دیارە جەنابی سەرۆک شتگەلێکی زۆری لە سەر زیندانەکانی پرنس بۆتانی بیستبوو، شتگەلێک زۆرتر لەوەی لە ڕاپۆرتەکانی مندا بوو، دەمێک هەموو زانیارییەکی گرنگ و بایەخدارم بۆ دەنارد. سەرۆک دڵنیابوو گەر بکرێت ڕۆحی توندوتیژ و جەنگەڵیی لیڤیتانت ڕامبکرێت، ئەوا دەکرێت تەواوی دەستەو تاقمەکەی نزیک خۆشی لە پیاوانی شاخاوییەوە بکرێنە بازرگان و سیاسی و سەرمایەداری نوێخواز کە بە وەبەرهەمهێنان و پارەداریی و پێشخستنی ژیانی مەدەنییەوە سەرقاڵبن. واتە خەونی بوو لیڤیتانت بکاتە نمونە و نوێنەری خەونەکانی لە گۆڕینی حیزبدا لە ئۆرگانێکی چەکدار و کێوییەوە بۆ ئۆرگانێکی مەدەنی و سڤیل پەروەر و خۆرئاوایی. هەڵبەت ئەودەم سەرۆک تیورەیەکی هەبوو، کە هیچ چارێکم نییە ئەوە نەبێت بڵێم تیورەیەکی پوچ و حولحولیانە و بێ بنەما بوو، ڕایوابوو خەڵکی ئەم شارەی ئێمە هەر بە فیترەت دیموکراسی و ئاشتیخوازن، بەڵام دەرفەت و هەلی گونجاویان بۆ نەڕەخساوە ئەم جەوهەرەی خۆیان ئاشکرابکەن و ئەو ڕاستییە پیشانی جیهانی مۆدێرن و خۆرئاوای پێشکەوتوو بدەن. وەک دەڵێن سەرۆک لەو پێناوەدا، بۆ ئەوەی سەرکردایەتییە کێوی و دڕەکەی بگۆڕێت بۆ ئەو شتەی جەنابیان ناویاندەنا مرۆڤی شارستانی، لەگەڵ چەند شاندێکی ئەورووپی و چەندین جاریش لەگەڵ باهیری کۆبووبووەوە «کە ئێستا ئەکادیمیاکەی برەوێکی گەورەی بەخۆیەوە دەبینی و کەم کەم پیاوە جەنگاوەرەکان و ژنەکانیانی ئامادەدەکرد، تابن بە هەڵگری بڕوانامەی حقوق و ئەدەبیات». ڕامکردنی لیڤیتانت بۆ جەنابی سەرۆک، سەمبول بوو بۆ کۆتاییهاتنی پیاوانی توندوتیژ و هەڵهاتنی خۆری سیاسەتمەداری مەدەنی و بۆینباخدار. لێرەوە بە ڕاسپاردنێکی تایبەتی و بۆ سەلماندنی تیورەکەی خۆی، سەرۆک پسپۆڕی خستبووە ژێر ئەو ئەرکەوە لیڤیتانتی بۆ بکاتە «تەیرێکی دەستەمۆ»، بیکاتە کەسێک چیدی

بەمجۆرە عەشقی بەندیخانەی خۆی و دیلی خۆی و ژووری ئەشکەنجەی خۆی نەبێت، یاخود هیچ نەبێت شێوازێکی بداتێ، ڕوخساری حیزبێکی کۆن و پۆلیسیمان پێ نەبەخشێت. وەک دەڵێن جەنابی پسپۆڕیش کە لە ڕاستیدا کەس ئەسڵ و فەسڵی نەدەزانی، بە حەوت زمان قسەیدەکرد، عەرەبییەکی باش و کەمێکیش کوردی دەزانی، بە سەرۆکی گووتبوو «جەنابتان غەمی لێ مەخۆن، کارێکدەکەم فیلەکەتان بچێتە نێو دوکانێکی پڕ فەخفوری بچوکەوە، وەها لێزانیش سمتی بجولێنێت، بێئەوەی هیچ بشکێنێت بێتەدەرێ». دەڵێن سەرۆکیش بە ئینگلیزییەکەی خۆی گووتوویێتی «واو ... ئەگەر تۆ ئەو کارە لە بۆ خزمی خۆت بکەیت، ئەمنیش جووتە گوونانت لە زێڕ و مجەوهەرات دەگرم». بەڵام چۆن ئەوەی بە ئینگلیزی دارشتووە، ئەوە خودای تەبارەک وە تەعالا بەس خۆی دەیزانێت. تا سەرۆک نەیدەویست ئەندامانی کۆبکاتەوە و پێیانبلێ ئیتر ئەو جانەوەرەی ناخی خۆتان کۆنترۆڵبکەن، وەک هەمیشە هەڕەشەیان لێبکات و بڵێت «بە قەبلی پێغەمەل، لە بنەوە بۆتان دەبلم». پسپۆڕەکان پێیان گووتبوو ئەوە سوودی نییە، ئەوە ئیشەکە سەختتر و ترسناکتر دەکات و هیچی تر، چونکە ئاژەڵە ترسناک و جانەوەرە حەوت سەرەکە دەچێتە ژێرەوە و دوایی هەر هەلی بۆ هات، سەر دەردەهێنێت و زیندوو دەبێتەوە، لەبەرئەوە چارە تەنیا ئەوەیە سەرکردەکانمان شێوازی تر بۆ گوزارشتکردن لەو شەڕانگێزییە بدۆزنەوە.

لیڤیتانت هەر لە ژێر چاودێری پسپۆڕدا، کەوتەوە سەر ئارەزووە دێرینە نەگریسەکەی بۆ ڕاوکردنی شاعیران و کتێبدۆستان، بەڵام بە شێوەی نوێ. دانیشتنەکانی لیڤیتانت و جەنابی پسپۆڕ «کە لە حیزبدا ناویان نابوو عالمە ئەجنەبییەکە و من لە داخ و حەسرەتدا ناوم نابوو پسپۆڕئاغا»، پتر لەو دانیشتنانە دەچوون کە کەسانی دەروونناس لەگەڵ نەخۆشەکاندا ئەنجامیدەدەن. لەو دانیشتنانەدا لیڤیتانت ئەوەی بۆ پسپۆڕئاغا ئاشکراکرد کە ڕقێکی بێسنووری لە کتێب هەیە، بینینی نوسەران و شاعیران ئالۆشێکی تایبەتی تێدا دەخولقێنن، لە گەنجییەکی زووەوە ئەو هەستەی

لەگەڵدایە و چۆن ناتوانێت خواستی لێدان و زەوتکردنی جەستەی نێران لە خۆیدا بمرێنێت، ئەو خوو و ڕەفتارانەی تریش چوونەتە خوێنیەوە و ڕامکردنیان ئاسان نییە. پسپۆڕەکە زۆر هەوڵیدابوو تێبگات ئاخۆ لیڤیتانت بەڕاست دەیەوێت ببێتە کەسێک لە توندوتیژی دووربکەوێتەوە یان نا، وەک بیستم بەستەزمانە هیچ کات وەڵامێکی ڕوونی چنگ نەکەوتبوو دڵ ئاوی پێ بخواتەوە. لیڤیتانت بە شێوازە ئاڵۆز و تێکەڵاوەکەی خۆی، بە ڕستەی کورت و بە بێدەنگی زۆر لە پسپۆڕی گەیاندبوو کە لە ڕاستیدا ئەو دەیەوێت هەم خۆی بێت «واتا هەر پیاوە کێوییەکەی جاران بێت» هەم کەسێکی نوێش بێت... هەم دڕندەبێت و هەم زۆر شارستانی. گووتبووی باهیری فێریکردوە چۆن شارستانی بێت، بەڵام چۆن دڕندە بێت، ئەوا خۆی بە فیترەت و هەر لە منداڵییەوە دەیزانێت. پسپۆڕە بەستەزمانەکە نەیزانیبوو چی بڵێت و چۆن تێیبگەێنێت کە ناکۆکی وەها کوشندەیە و لەوانەیە لە ناوەوە لەتیبکات و بیکات بە دوو کەس. پسپۆڕ بۆ ئەوەی هەنگاو هەنگاو سەرنجی لیڤیتانت بۆ لای ئەوە ڕابکێشێت کە دەکرێت کینەکانی هێوربکاتەوە، پلانێکی جەهەنەمی بۆ دانابوو. دەبوو وەک چۆن ڕامکەران و مەشقدەرانی سێرک پڵنگە هارەکان ڕامدەکەن، ئەویش بەو جۆرە نوسەر و شاعیران دەستەمۆبکات. هێشتا شەڕی ناوخۆ نەگەیشتبووە ترۆپکە تراژیدییەکەی خۆی، لە کاتێکدا سەرتاپای شار بۆنی زبڵ و خۆڵ و گەنینی لێدەهات، لەو دەریای گەنین و لەو بۆگەنستانە عەجایەبەدا کە بۆی تا عەرشی عەزیم دەڕۆیشت، لەو وەرزی زبڵ سالارییەدا، هەواڵێکی عەجایەب گەیشتە لام، ڕۆژێک کە پۆستمکردەوە، ڕاپۆرتێکی تایبەتم بۆ هاتبوو دەڵێت، بەمزوانە «پرنس بۆتانی» دەزگای «گەشەپێدان و پێشخستنی ئەدەبیات» دادەمەزرێنێت و لەلایەن سەرۆک و بیرۆی سیاسی حیزبەوە بودجەی تەواوی بۆ تەرخانکراوە، ڕۆژی کردنەوەی دەزگاکەش، هەم سەرۆک و هەم ڕەحیمە خانی ژنی و ژمارەیەکی زۆر ئەندامانی بیرۆی سیاسی و ژنەکانیان ئامادەدەبن. هەواڵەکە بۆ من هێندە سەیر و نابەجێ بوو، وەک ئەوەبوو بە ڕۆژی نیوەڕۆ لە ناوەڕاستی شاردا لەشکرێک حوشتری باڵدار ببینم. لیڤیتانت و

دەزگای پێشخستنی ئەدەبیات بۆ من وەها ناکۆک بوون، وەک ناکۆکی نێوان خودا و شەیتان. دەمودەست گومانمکرد و گووتم «ببێت و نەبێت ئەم بەزمەش کارێکە لە کارەکانی پسپۆرپاغای برادەرمان». گومانم لە جێگای خۆیدا بوو، پسپۆڕەکە بە لیڤیتانتی گووتبوو هەڵەی هەرە کوشندەی تۆ ئەوەیە وادەزانیت کتێب یان نوسین گەر کەم بێت و نەبێت لە نرخ و مانا دەکەوێت، تەواو بە پێچەوانەوە، دەبێت کارێک بکەیت کتێب زۆر بێت، بێمانا زۆر بێت، بە جۆرێک کەس نەزانێت چی کتێبێک گرنگە و چی بێنرخ، نەزانێت چی بخوێنێتەوە و چی نەخوێنێتەوە. ئەوەی شت بێنرخ دەکات شاردنەوە و قەدەغەکردنی نییە، بەڵکو ئەوەیە بە لێشاو بەرهەمیبهێنیت و وەها بێنرخ تورپیدەیت، سیحرێکی لای کەس نەمێنێت.

لە ڕاستیدا ناوهێنانی ئەدەبیات لە ناو ئەو شاخە گەورانەی زبڵ و شەقامە چڵکن و بازاڕە پیسانەدا، نەوەک هەر سەیر بوو، بەڵکو زرینگەیەکی ناخۆش و نابەجێی دەگەیاند. وەک ئەوەی لە فیلمێکدا ساتێک پاڵەوانەکە بە تراژیدیترین جۆر دەکوژرێت، گوێمان لە ئاهەنگی زوڕنا و زەماوەند بێت. من کە هەواڵەکەیان پێگووتم، هێشتا تەواو پاشخانی پشت شتەکەم نەدەزانی، لەبەرئەوە سەرسامیم بێسنوور و تووڕەیشم لە ترۆپکدا بوو. بۆ بەدواداچوونی نهێنی ئەم کارە، «کارمەندە دڵسۆزەکەم» بانگکرد و گووتم «عەزیزم، خەریکە عەقڵ لەدەستدەدەم و دەکەومە کێوان، تێمبگەیێنە چی لەم وڵاتەدا دەگوزەرێت؟. من دەزانم بێمانایی هەموومانی گرتۆتەوە، بەڵام لیڤتانت و ئەدەبیات، ئەمەیان کاری نەکردەیە و ناچێتە عەقڵەوە». کارمەندە دڵسۆزەکەم گووتی «نا گەورەم وانییە و هەموو شتێک مەنتیقی خۆی هەیە، ئەم وەزیفەیەی لیڤیتانت بە ئارەزووی خۆی نییە و پلانی پسپۆڕەکەی هاوڕێیەتی». هۆی ئەم ڕەفتارەشی بردەوە سەر ئەوەی سەرۆک دەستەیەکی بچوک لە پیاوانی دیاریکردوە و ناوی لێناون «جۆکەرەکان»، چەند کەسێکن دەبێت بچنە هەموو پێڕێک و هەموو لکێکی نوێی ژیان بگرنەوە، هەر دەزگایەکی تازەش کە دروستدەبێت بێ دەست و قەڵەمی ئەوان تێناپەڕێت، ئەمانە دەستەیەکن دەبێت لە حیزبدا

بن، لەدەوڵەتدا، لە شەڕدا، لە بازاڕدا، لە ڕاگەیاندندا، لە هونەردا، لە وەرزشدا، لە شاخدا، لە شاردا، لە ناو ئۆرگانە عەسکەرییە تایبەتییەکاندا، لە ناو ڕێکخراوە مەدەنییەکاندا، لە ناو گەنجاندا، لەگەڵ پێشمەرگە کۆنەکاندا، لەگەڵ مولحیدەکاندا، لەگەڵ ئیماندارەکاندا... و هەتا دوایی. کە دەڵێم هەتا دوایی، مەبەستم ئەو «هتد» ـە ئاساییە نییە کە لە دوای زۆر ڕستەوە دێت، بەڵکو هەتا دواییەکی ترسناک، هەتا دواییەک کە دەرەنجام وەک چەقۆیەکی ژەهراوی لە ناخی ئێمەدا کۆتایی دێت. کارمەندە دڵسۆزەکەم، ناوی هەندێ کەسی دامێ لە پێڕی جۆکەرە ترسناکەکان، لەوانە مەلای سەفا، مەلای دوڵدوڵ، عومەری مامە جوجەڵ و هەندێکی تریش... کەسانێک بشێت بچنە هەموو پێڕێکەوە. منیش گووتم «ئەها... کەواتە لیڤیتانت ئێستا بووە بە یەکێک لەو دەستەبژێرەی ناونراون جۆکەرەکان». کارمەندە دڵسۆزەکەم سەری بۆ لەقاندم و گووتی «بەڵێ، جەنابی عەقید، ئەو دەستەیەش دەستەیەکی زۆر نهێنییە و بڕیارە لە داهاتوودا هەم سەروەت و سامانی حیزب بگرێتە دەست و هەم ئیدارەی مالیاتی ماڵی سەرۆکیش بباتەڕێوە». ئەو هەواڵەی کارمەندە دڵسۆزەکەم ترساندمی، لێمپرسی بە ڕای تۆ هۆی چییە سەرۆک لە هەموو ئەم شتانەدا منی کردۆتە دەرەوە و بە بای فەرامۆشی سپاردوم، بۆ منی ئاوا خستۆتە کەنار و وازی لێهێناوم. کارمەندە زیرەکەکەم گووتی «جەنابی عەقید... دوو هۆ لە پشتی فەرامۆشکردنی تۆوەیە، یەکەم سەرۆک بیر لە پاشەڕۆژی دوور دەکاتەوە و بۆ ئەو پاشەڕۆژە دوورە دەستەبژێرێکی تایبەتی هەڵبژاردوە کە بتوانن هەم سیاسەتمەداربن، هەم بازرگان بن و هەم جەنگاوەریش، چونکە سەرۆک بە دڵنیاییەوە نازانێت پاشەڕۆژ بۆ کام یەک لەم ئەگەرانەیە. تۆش لەو دەستەبژێرەدا نیت کە پاشەڕۆژ دروستدەکەیت. تۆ لە مەودای دووردا جێگایەکی ئەوتۆت لە حیزبدا نابێت، مەگەر لە ئێستاوە بە جۆرێک لە جۆرەکان وەها خۆت قایمبکەیت نەکرێت لە داهاتوودا فەرامۆشتبکەن، ئەوەش کارێکە پێناچێت ئاسان بێت و بە تۆ بکرێت. هۆی دووەم ئەوەیە کە سەرۆک پێیوایە تۆ لەو کەسە دەگمەنانەی ناو حیزبی کە وەفاداری لە خوێنتدایە و پێویستت بە هیچ تەماحێکی

زیادە نییە تا دڵسۆز بیت و ملکەچی فەرمان و خواستەکان بیت، لە هەردوو حاڵەتەکەشدا تۆ لەگەڵ تێپەڕینی کات و بە گۆڕانی هەلومەرجەکان دۆڕاوی یەکەمیت کە وردە وردە پیردەبیت و دەکرێیتە دەرەوە و جێ قاچێکت لەم دونیا تازەیەدا نابێت». قسەکانی کارمەندە دڵسۆزەکەم گەلێک جێدار و وەفادارانە بوون. بەڵام دەمزانی بە جۆرێک کەوتوومەتە نێوان بەرداشەکان، دەرچوونم بۆ نییە و ڕزگاربوونم مەحاڵە، ئیتر لەو ڕۆژگارەوە بە خوێندنەوەی بەردەوامی قسە و ئامازەکان هەستمکرد لافاوێکی گەورە، بایەکی بەهێز، تۆزە تۆزە، هەر ڕۆژە و کەمێک دەمجوڵێنێت و لەو عەرشە دامدەگرێت کە هەمیشە وامزانیوە لە سەری دانیشتووم.

ئیمپراتۆرییەتی لیڤیتانت لەوێدا دەستی پێدەکرد و لەوێدا دوایی نەدەهات.

دەزگای «گەشەپێدان و پێشخستنی ئەدەبیات»، دەزگایەکی گەورەبوو، لیڤیتانت لە ماوەیەکی کەمدا باڵەخانەیەکی بۆ تەرخانکرد و ژمارەیەکی زۆر نوسەر و شاعیری تێدا دامەزراند، نوسەرەکان ئازادبوون چی دەنوسن، سانسۆر بوونی نەبوو، بەڵام ئازاد نەبوون چی دەکەن. هەر کەسێک دەچووە دەزگا ڕێکەوتنێکی نەنوسراوی مۆردەکرد کە دەبێت هەموو ئەو شتانە بکات کە پرنس بۆتانی دەیەوێت، لە ڕاستیدا لیڤیتانت گەرچی حەزی لە بۆنی کاغەز نەبوو، گەرچی وەک هەمیشە بینینی کتێب دوودڵیدەکرد، بەڵام دەیزانی تاکە شتێک بتوانێت لە ڕێگایەوە دەست بەسەر ڕۆحی کتێبداراندا بگرێت، دەزگایەکی لەمجۆرەیە. پسپۆڕەکەی سەرۆک پێی گوتبوو «ئەمیگۆ، دەزگایەکی لەوجۆرە زۆر لە بەندیخانە باشتر دەیانخاتە بندەستی تۆ، لە جێگایەکی وەهادا موچەیەک دەگرن، نانێک دەخۆن، دەستگیرانەکانیان دەبینن، ژنێک ژێر بە ژێر دەکەن بە ژوورەکاندا، کتێبەکانیان چاپدەکەن... ئیتسێتەرا... ئیتسێتەرا. ناوەناوەش دێنە بەردەمی تۆ و لە چاویاندا ئەوە دەخوێنیتەوە کە هەموو شتێک دەکەن ژیانیان لێ تێک نەدەیت، دڵنیام ئەوجۆرە دەزگایە لە

هەموو زیندانەکان زیاتر دەیانخاتە ژێر ڕێنوێنی تۆوە و ئەوە لە چاویاندا دەخوێنیتەوە کە دەتەوێت ببینی ... پاڕانەوە و ملکەچی».

وەک دەڵێن لیڤیتانت هەر تەواو تێنەگەیشتووە و پسپۆڕەکەی ناچارکردوە ڕوونکردنەوەی درێژتر و زۆرتری بۆ ڕیزبکات، پێیگووتووە «ئەمیگۆ، بیهێنە پێشچاوی خۆت، تۆ دەچیتە ئامەنگێکەوە کە هەمووی ژنن، یەک و دووان و سیان نا، بەڵکو سەدان ژن، بە سەدان جلی ڕەنگاوڕەنگەوە، بە چەندین شێوە خشڵ و زێڕ و زیوەوە، بە جۆرێک هەر یەکەیان لەویتر جوانترن، تۆ کە دێیتە دەرێ دەڵێیت چیم بینیوە؟ ها دەڵێیت چی؟ هیچ کە دێیتە دەرێ وەک ئەوە وایە ژنێکیشت نەدیبێت... ئەمەش بەو جۆرەیە، خوێنەریش کە دەیخەیتە ناو کتێبخانەیەکی گەورەوە لە ناویدا وندەبێت، ئیتر لەوێدا مەترسی ئەو کتێبانە کەم دەبنەوە کە ترسناکن و نابێت زۆر بخوێنرێنەوە، ئەوانەی دەچنە کتێبخانەی گەورەوە کە دێنە دەرەوە وەک ئەوەیە چووبێتنە ئامەنگێکی وەها گەورە یان چووبێتنە شارێکەوە زمانەکەی نەزانن. ئەمیگۆ ... من بۆچی باوەڕم بە حیکایەتی ئادەم و حەوا نییە؟ لەبەر ئەمە، گەر خودا دەیویست ئادەم لە سێوەکە نەخوات، پێی نەدەگووت ئا ئەم سێوە مەخۆ، گەر یەکێک لە ئامەنگە پڕ ژنەکەدا بە تۆی بگووتبایە سەیری ئا ئەم ژنە نەکەیت، تەنیا سەیری ئەو ژنەت دەکرد، ئەوەی دواتریش یادت دەبوو هەر ئەو ژنە بوو، گەر خوداش بیویستبایە ئادەم سێوەکە نەخوات لە باغێکی پڕ سێودا دەیشاردەوە و بە ئادەمیشی نەدەگووت مەیخۆ، ئەو کات هیچ کەس نەیدەتوانی باوانمان بخاتە سەر ئەو کەڵکەڵەیەی سێوەکە بخۆن، سێوەکە تا ئەبەد بەو دارەوە دەبوو، بێئەوەی کەس بیخوات. ئەوە سروشتی ئێمەیە، گراسیا گراسیا ... میمی گۆرا میگۆ، تۆ گوێگرێکی باشیت. تۆ ئێستا بە خەڵک بڵێ ئەم کتێبە مەخوێننەوە، ئیتر خەڵک هیچیان لە بیر نابێت ئەو کتێبە نەبێت. هەموو دونیا هێز و دەسەڵاتی تۆ لە بیردەکات و سەرقاڵی ئەوە دەبێت، چۆن ئەو کتێبە بخوێنێتەوە. شارەکە پڕبکە لە کتێب و مەترسە، نوسەر ئەو کاتە مەترسیان هەیە کە خەڵک بە دوایاندا گەڕان، ئەوانەی شتێک

دەگێڕنەوە کە نابێت بگێڕدرێتەوە. من لەگەڵتدام ئەمیگۆ، هەندێ نوسەر هەن دەبێت بکوژرێن، تەق، یەک فیشەک لە تەوقە سەریان و تەواو. بەڵام زۆر نین، خودا شوکور کە زۆر نین ... هەرکات یەکێک هاتە پێشێ مەترسی هەبێت، تەق بیکوژە ئەمیگۆ».

هەرواش بوو وەک پسپۆڕ پێشبینیدەکرد، لە ماوەیەکی کەمدا دەزگاکەی لیڤیاتانت کەوتە کار، لیڤیاتانت بۆی گرنگ نەبوو چی دەنوسرێت، گرنگ بوو ئەو کەسەی دەنوسێت سنووری غروری خۆی بزانێت، تێبگات دواجار بەردەستی لیڤیاتانتە، کارەکەی وەک ڕەحمەتێک تەماشبکات کە دەشێت لە هەموو ساتێکدا نەمێنێت و ببڕێت و وەرگەڕێتە سەر بەدبەختی و نەفرەت. بەڵام لیڤیاتانت خۆی لە هەموو بەریەککەوتنێک لەگەڵ کتێبدا دەپاراست، هەر کەس دەچوو بۆ لای نەدەبوو کتێبی پێ بێت، ئەو ڕێگایەی ئەو پیا دەڕۆیشت نەدەبوو کتێب لە ڕاڕەو و داڵانەکانیدا دانرابێت، هەر کەس کە دەچووە لای نەدەبوو باسی کتێب بکات، نوسەرەکان دەچوونە مەجلیسی بۆ ئەوەی باسی سیاسەت بکەن، باسی جەنگ، بازاڕ، گرانی، سێکس، پارە، موچە، نەخۆشی ... هەموو شتێک، تەنیا باسی کتێب نەبێت. ئەوە سزای هەرە گەورەی لیڤیاتانت بوو، دەزگاکە دەکرا چەند کتێب چاپبکات بیکات، دەکرا چەند گۆڤار دەربکات بیکات، هیچی کێشەی لیڤیاتانت نەبوو، بەڵام لە بەردەم لیڤیاتانتدا قەدەغەبوو کەس باسی شتێک لەوانە بکات. کتێب شتێک بوو وەک پاکەتێکی بۆش، دەفتەرێکی سپی، بوکەشوشەیەکی پلاستیکی، کە دەکرا هەبێت و لە هەموو جێگایەک بێت، بێئەوەی هەڵگری شتێک بێت بۆ قسە و باس. حەرامێک هێدی هێدی بە جۆرێکی ترسناک پەرە دەستێنێت. زۆری نەبرد باس نەکردنی کتێب لە ڕیواق و ژوورەکانی دەزگاشدا بڵاوبووەوە، هەر کات باسی کتێب دەکرا، وەک تۆپەڵە کاغەزێکی ڕەشکراوە باسدەکرا و هیچی تر، هیچ کەس لە سەر ناوەڕۆکەکان شتێکی ئەوتۆی نەدەزانی، کتێب بەردەوام وەک شتێکی گشتی نادیار، بێ ناونیشان، بێ مانا، بێ بابەت باسدەکرا. وەک

«کتێب»... وەک ئاماژە بۆ شتێکی نەناسراو و نەخوێندراوە... وەک عەدەمێک کە لە کاغەزەوە پێچرابێت.

من کارمەندە زیرەکەکەی خۆم بەتایبەت ناردە دەزگاکەی لیڤیتانت، تا راپۆرتێکم بۆ ئامادەبکات و بزانم لەوێ چ باسە و شتەکان چۆن دەڕۆن، لە ناو دەیان تێبینیدا کە لە سەر دەزگاکە کۆیکردبووەوە، نوسیبووی «ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا، ئەو کتێبانەی لێرە چاپدەکرێن کەسێکی بەدبەخت هەموویان دەخوێنێتەوە، کەسێکی لاڵ، کە هەستدەکەم بۆیە هەڵیانبژاردوە تا نەیکرێت دواتر ناوەڕۆکی کتێبەکان بۆ کەسی تر بگێڕێتەوە. فەرمانبەرێکە لە سەروو چلوپێنجەوە، بەڵام وەها دیارە تەمەنی شەست ساڵ بێت، غەمگین و گوشراو دێتەبەرچاو، وەک بیستوومە کۆن لە دەزگای سانسۆری دەوڵەتی کاریکردوە، سەلیقەیەکی باشی هەیە تێکستی مەترسیدار و تێکستی ئاسایی جیابکاتەوە. ئیشەکەی بە سانسۆر ناونابرێت، وڵاتی ئێمە خۆشبەختانە سانسۆری تێدا نییە، هێند هەیە گەر کتێبەکەی بە دڵ نەبوو لە سەری دەنوسێت: لای ئێمە چاپ ناکرێت. ئەوەندە و هیچی تر. بە تەنیا بۆی هەیە هەموو کتێبێک بخوێنێتەوە، پێناچێت لەزەتێکی تایبەتی لە خوێندنەوە ببینێت، ئیشەکەی بە ڕۆحییەتی فەرمانبەرێکی ئاسایی دەکات، وەک هەر موچەخۆرێکی دی لە تاپۆ یاخود دادگای شار. وەها چوست و چالاکە لە خوێندنەوەدا کە لەگەڵ سەر و ڕوخسارە پیرەکەیدا ناگونجێت. هەر کات ئەو دڵنیابوو شتێکی دژی سەرۆک یان حیزب تێدا نییە، دەستنوسەکان دەڕۆن بۆ چاپ. دواتر هیچ کەس نازانێت ناوەڕۆکەکان و بابەتەکان باس لە چی دەکەن، هیچ کەس نابیستێت لە جێگایەک باس لەو کتێبانە بکرێتەوە، لە هیچ شوێنێک و لە سەر هیچ زارێک ناوی کتێبەکان یاخود نوسەرەکان نابیستێتەوە. چاپخانەکان بەردەوام لە کاردان، شەو و ڕۆژ ئیشدەکەن، ناکوژێنەوە و پشوویان نییە. هەموو شتێک چاپدەکرێت، بەڵام هەستێکم هەیە وەک ئەوەی پێش ئەوەی کتێبەکان چاپبکەن خوێنەرەکانیان هەموو کوشتبێت، وەک ئەوەی شتێک لە یارییەکەدا گۆڕابێت و کەس هەستی پێ نەکردبێت.

لە سەردەمی بەعسییەکاندا کتێبەکانیان دەخنکاند، ئەمڕۆ کتێبەکان ئازادن، بەڵام خوێنەرەکان دەخنکێنرێن. لە دەزگا ڕێکەوتنێکی بێدەنگ هەیە باسی هیچ شتێک نەکرێت. لیڤیتانت لێرە بوار دەدات هەموو شتێک بڕوات، کاری بە هیچ شتێکی ڕاستەقینەوە نییە، بوونی لە دەزگاکەدا بوونێکی سەیرە، وەک ئەوەی ژەنەڕاڵێکی نەخوێندەوارت کردبێتە بەڕێوەبەری کتێبخانەی گشتی. لە ئاغایەک دەچێت ڕێگە بە جووتیارەکانی بدات لە سەر زەوی و خاکی هەر بەروبوومێک دڵیان دەیگرێت بیڕوێنن، بەڵام بۆیان نییە لێی بخۆن، دواتر چی حاسڵات و ڕزقێک هەیە کۆیدەکاتەوە و فڕێیاندەداتە ئاوەوە، یان لەبەر هەتاو دایاندەنێت تا دەگەنێن و سوودیان نامێنێت». لەگەڵ ئەم ڕاستیانەشدا کارمەندە زیرەکەکەم پێیوابوو، ڕێگای لیڤیتانت لەگەڵ کتێبدا، ڕێگایەکی ڕاست و دروستە.

هێدی هێدی ئەو حەرامەی لە ژوورەکەی لیڤیتانتدا دەستی پێکرد، بە هەموو وڵاتدا بڵاوبووەوە، ئەو دەردە لە ڕیواقەکانی دەزگاشەوە دزەیکرد و هاتەدەرێ و گەیشتە ناو شار، ساڵێک نەبوو کە دەزگا دامەزرابوو، من داوام لە هاوکارانم کرد ڕاپۆرتێکم بۆ ئامادەبکەن، بزانم خەڵکی چی دەخوێننەوە، چی کتێبێک سەرنجیان ڕادەکێشێت، باسی چی بەرهەمێک زۆرتر دەکەن. ڕاپۆرتەکە بە دەرەنجامێکی سەیرەوە هاتە بەردەمی من، لە شاردا و لە هیچ جێگایەکدا باسی کتێب ناکرێت، نە لە زانکۆ، نە لە ڕۆژنامەکان، نە لە تەلەفزیۆن، نە لەناو خوێندکاراندا، نە لە حیزبدا، نە لەچاپخانەکان، نە لە سەرتاشخانەکان و نە لە ماڵی نوسەران، نە لە کۆڕە ئەدەبییەکانیشدا... لە هیچ جێگایەک... هیچ جێگایەک. کتێبگەلێکی زۆر کەڵەکەیە و هیچ بەڵگەیەک لە بەردەستدا نییە کە دەخوێنرێنەوە، بە جۆرێک گەر خوێنەرێکیش هەبێت، کەسێکە بە نهێنی و تایبەتی و لە فەزایەکی داخراودا بۆ خۆی دەخوێنێتەوە و وەک نهێنییەکی تاریکی خۆی هەڵیدەگرێت. ڕاپۆرتەکە زۆر جێگای سەرسوڕمانی من بوو، من بەرپرسی ئاسایشی شار بووم، گرنگ بوو بزانم خەڵک چی دەخوێننەوە، چ

نوسەرێک کار لە خەیاڵ و خولیاکانیان دەکات. لە ڕاستیدا دوای ئەو ڕاپۆرتە، دەزگام ڕاسپارد بە جۆرێکی بێدەنگ و نهێنی بە دوای خوێنەرێکدا بگەڕێن کە دڵنیابین کتێبەکان دەخوێنێتەوە و دەتوانێت باس لە ناوەڕۆکەکانیان بکات، هەموو ماسیبەکانی خۆمم لە گۆمەکەدا خستە کار تا جۆرە خوێنەرێکی وەها بدۆزنەوە، کەسێک دڵنیابم چۆتە دونیای کتێبەکانەوە و لەوێوە بەرەو لای ئێمە دێتەوە. سەیربوو کە دەزگاکانم چی کەسێکیان دەخستە ژێر چاودێری، ئەو خوێنەرە تایبەت و ڕاستەقینەیە نەبوو کە من بۆی دەگەڕام، هەر شتێکیش بخوێنرابایەتەوە وەک ئەوەی لاستیکێکی گەورە و نهێنی و خودایی بیسڕێتەوە پاش ماوەیەکی کورت لە یادەوەری خوێنەرەکاندا نەدەما. نا حیزب گلەییەکی لە سەر خۆی نەهێشتبوو، کتێب هەبوو، بەڵام دیار نەبوو دەچن بۆ کوێ ... دوای مانگێک هەوڵی بەردەوام، هەموو ئەو خوێنەرە بچوک و لاوازانەی خرانە ژێر چاودێرییەوە، ئەو خوێنەرە نەبوون کە کتێب دەناسێت و لە ناویدا دەژی و بە هەوای ئەو هەناسە دەدات. شارەکە تەنیا خوێنەرێکی بوێریشی تێدا نەبوو، بوێرێت خۆی ئاشکرابکات. نابەجێ بوو بزانم سەرۆکی دەزگای ئاسایشی شارێکی وا گەمژەم. هەر زوو کارمەندە زیرەکەکەی خۆم هێنایەوە و لێمپرسی «عەزیزم تێمبگەێنە ئەمە چییە و چۆن وا دەبێت، دەنگوباسێکی زۆر هەیە کە هیچ کەس لە شاردا باسی کتێب ناکات، گەر باسیشی بکات، دەمو دەست وەک باسی ناموسی دایکی هاوڕێیەکی خۆی کردبێت، دەبێت داوای لێبوردن بکات و بێدەنگ بێت... ئەمە چییە و تۆ چۆن تێیدەگەیت؟». کارمەندە دڵسۆزەکەم کە زیرەکترین کەسی دەزگا بوو، لە سەردەمی سەقزەوە سەر بە تیپی تایبەتی خۆم بوو، سەری لە شتە نوێکان و لەم شارە تازەیە دەردەچوو پێکەنی و گووتی «جەنابی عەقید ئاساییە، ئێمە پێمانخستۆتە ئەو سەردەمەوە کە تەنیا شێوەی شتەکان گرنگە، لەم عەسرە تازەیەدا شارەکە یاسا و ڕێسای خۆی هەیە، نابێت لێمان تێک بچێت و شتەکان تێکەڵاوبکەین. نە ئەو یاسایانەن لە ڕابوردوودا حاکم بوون، نە ئەو یاسایانەن لە خۆرئاوا بەکارن، لێرە جێگایان نابێتەوە... لەم عەسرەدا چەندەها زانکۆ دەکەینەوە، بەڵام

ئەوەی بە ڕاستی حەزی لە زانست بێت، دەبێت ئەم شارە بەجێبهێڵێت و بچێت لە جێگایەکی تر بخوێنێت. هەموو باسی خودا دەکەن و نوێژدەکەن، بەڵام ئەوەی لە دڵەوە باوەڕی بە خودا بوو ناتوانێت لێرە بژی. هەموو باسی نیشتیمان دەکەن، بەڵام ئەوەی نیشتیمانی خۆشبوێت دەبێت سەری خۆی هەڵبگرێت. هەموو باسی عەشق و مەزنی عەشق دەکەن، بەڵام هەر کەسێک گەیشتە یەکەمین عاشقی ڕاستەقینە، واجبێتی بیکوژێت. هەر کتێبێکیش بتەوێت چاپدەکرێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە هیچ یادەوەرییەک نابێت هەڵیانبگرێت. کتێب هیچ کات خۆی گرنگ نییە، بەڵکو ئەو خەیاڵ و یادەوەرییە گرنگە کە دەیپارێزێت. هەموو کتێبێک بەبێ خەیاڵ و یادەوەری خوێنەر مەحکومە بە مردن... با کتێب هەبێت، با کتێبخانەکان هەبن، بەڵام لە نێوان کتێب و ژیاندا ڕێگایەکی درێژ هەیە. جەنابی عەقید یەکێک ئەو ڕێگایەی پچڕاندوە و پێناچێت ئاسان پێکەوە گرێ بدرێنەوە». من لە هیچ حاڵی نەدەبووم، گووتم «کارمەندە دڵسۆزەکەم، من پیاوێکی زۆر عاقڵ نیم، بەڵام زۆر کەریش نیم. تێناگەم چۆن؟ سەر لە شتەکان دەرناکەم ... ناکرێت شارێکی وەها لە سەر هەوای دڵی لیڤیتانت بڕواتە ڕێگاوە. من دەزانم ئەو دوژمنی کتێبە، بەڵام گەر وابڕوات بە کوێ دەگەین؟ ». کارمەندە دڵسۆزەکەم گووتی «نا جەنابی عەقید شتەکە وەها مەترسیدار نییە، ئێمە میللەتێکی بێ کتێبین، بیرچوونەوە سوودی خۆی هەیە، وادەکات تەنیا لەو سەردەمەدا بژین کە تێی کەوتوین، ئێمە لەو میللەتانەین نە ڕابوردوومان هەیە و نە داهاتوو، هەمیشە لە ئێستادایین... جگە لە ئێستا جێگایەکی ترمان نییە بۆی بچین، ئەوەش وەک لە ڕووکەشدا دیارە شتێکی هێندە خراپ نییە. کتێب جۆرە نەخۆشییەکە ئەو میللەتانە تووشی دێن کە زۆر بیر لە ڕابوردوو و داهاتوو دەکەنەوە، خۆشبەختانە ئێمە لەو میللەتانە نین، ئەوەش فەزڵ و باشەی خۆی هەیە». نازانم بۆ قسەکانی زیاتر نیگەرانیاندەکردم، گووتم «دەستت ماچدەکەم، ئەم قسانە چیین، خۆ من ناڵێم خەڵک بۆم ببن بە ئەرستۆ، بەڵام هیچ دڵخۆش نیم لە شارێکدا بژیم کە پیاوێک یان ژنێکی تێدا نەبێت ئەهلی ڕاستەقینەی کتێب و کتێبخانە بێت، من دەمەوێت هەستێکم هەبێت

کە بەڕێوەبەری ئاسایشم، نەوەک شوانی ڕانە مەڕێکی کەڕ و کوێر».
گووتی «ناهەقت نییە جەنابی عەقید، بەڕاستی لۆمەت ناکەم گەر تێنەگەیت، بەڵام شتەکە بەمجۆرەیە، هەموو سەردەمێک شتێکی ترسناکی هەیە و دەبێت بەسەریدا سەربکەوێت، ڕێگرێکی ترسناک، کۆسپێک کە شای هەموو کۆسپەکانە. لەم سەردەمەی ئێمەشدا کە دەسەڵاتمان گرتۆتە دەست، کە کولتوورمان لاواز و پرسیارەکانمان زۆرن، کتێب مەترسی خۆی هەیە. ترسی جەنابی لیڤیتانت لە کتێب ئاوێنەی ترسی هەموومانە لەو شتە ناشیرین و ترسناکەی پێیدەڵێن کتێب. من گەرچی لە تێڕوانینی ئێوە تێدەگەم، بەڵام ناتوانم هەق نەدەم بە جەنابی لیڤیتانت. منیش کتێب تووشی هێڵنج و دڵ تێکەڵاتن و ترس و هەست بە کەمیم دەکات. کتێب شتێکی ترسناکە، بەڵێ جەنابی عەقید، دەبێت دان بەوەدا بنێین کە کتێب سندوقێکی داخراوی ئافەتاوییە و ناتوانین بزانین چ جانەوەرێکی لێ دێتە دەرەوە، لەوەدا من وەک کارمەندێکی ئاسایش لەگەڵ جەنابی لیڤیتانتدا تەبام و کێشەی گەورەم نییە. کتێب وەهایە، گەر نەتبێت دەبێتە خولیا و خەیاڵ و هەموو دەکەونە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی هەیان بێت، گەر نەتبێت وا هەستدەکەیت هەموو دەرد و نەگبەتییەکانت هی ئەوەیە کتێبت نییە. کە یەکێک دەڵێت ئێمە بەدبەختین و نەخوێندەوارین، مەبەستی ئەوەیە بڵێت کتێبمان نییە. بەڵام هەبوونی کتێب شتێکی وا ئاسانیش نییە، هێندەی بەڕاستی کەوتیتە ناو دونیای کتێبەوە هاتنە دەرەوەت مەحاڵە... ئاە جەنابی عەقید، ڕەجایەکی برایانەم لێت هەیە، چیمان لێ دەردەچێت گەر ببین بە میللەتێک سەرمان لە کتێبدا چەقیبێت، ها، خۆ ئێمە ژاپۆنی نین کتێب خوێندنەوە بمانکاتە میللەتێکی پیشەساز و دەست ڕەنگین... ئێمە هێشتا کۆمەڵێک ئێڵ و عەشرەتی ژێر دەستین، گەر گەنجانمان فێری خوێندنەوە بن، دەردمان دەبێتە زامی بێدەرمان. من لەگەڵ زیرەکیدام، زیرەکییەک کە خودا بە فیترەت دەیبەخشێت. شتێکی باشە کتێبیش هەبێت، بەوە هەم نوسەرەکان سەرقاڵدەکەین، هەم چاپخانەکان، هەم کتێبفرۆشەکان، بەڵام خوێنەر نا، تا دەکرێت دەبێت هەموو شتێک بکەین لە کتێب دووریانبخەینەوە، گەر نەمانتوانی، دەبێت نەهێڵین کتێبەکان لە

ژوورەکانی خۆیان بهێننە دەرێ و تێکەڵ بە ژیانمانی بکەنەوە، ئەو هەستەمان پێ ببەخشن کە کتێب جۆرە مرۆڤێک دروستدەکات کە لەوانی تر ناچن، ئەو خوێنەرەی بتوانێت بەباشی قسە لەسەر کتێبەکان بکات، دەتوانێت بە باشی قسە لەسەر دونیایەکی جیاوازتریش بکات، دونیایەک کە من و تۆ و لیڤیاتانت نازانین چییە، ناتوانین بچینە ناوی، جەنابی عەقید ئەو جۆرە خوێنەرە شایستەی کوشتنە، چونکە هیچ جاسوسێکی وەهامان نییە بتوانێت بەرەو ناو دونیاکەی خۆی دوابیکەوێت و بزانێت چی دەبینێت. کوشتنی کتێب ئیشێکی کۆمەڵکارە، هەمووومان پێکەوە دەبێت هەوڵبدەین بە بیدەنگی کتێبەکان بکوژین، لیڤیاتانت تەنیا ڕێگاکەی پیشاندواین، ئیشی ئێمەیە، هەمووومان، نەهێڵین کتێب بخوێنرێتەوە، وە ئەگەر خوێنرایەوە نەهێڵین باسبکرێت، وە ئەگەر باسکرا بە جۆرێک نەبێت خوێنەری تر ڕابکێشێت، بە پێچەوانەوە ببێت بە کەرەستەیەک نوسەرەکان شەرمبکەن لەوەی نوسەرن و دەنوسن ... زۆر شت هەیە مرۆڤ نابێت بەدوایدا بچێت، نابێت تێیدا قووڵ ببێتەوە، گەر وایکرد، دەبێتە کەسێکی مەترسیدار... بەڵێ جەنابی عەقید، من خۆم ئەهلی کتێبم، بەڵێ گەورەم، جورنەتدەکەم و دەڵێم ڕەنگە من ئەو خوێنەرەبم کە تۆ لە دووی دەگەڕێیت، بەڵام فێربووم هەر شتێک دەخوێنمەوە لە سەری خۆمدا گەمارۆیبدەم، پەرژینی بۆ دروستبکەم، نەهێڵم وشەکان و هەستەکانی وەک لوویەکی شێرپەنجەیی بە عەقڵمدا بڵاوبێتەوە. من بۆیە بوومە ئاسایش، تا کتێب حەقیقەتی دونیام لە بیر نەباتەوە، گەورەم شتەکە مەترسی خۆی هەیە و نازانم جەنابتان چۆن وەک من یان وەک جەنابی لیڤیاتانت ترستان لێی نییە. گەر تۆ ژنێکی جوانت هەبێت، یانماڵێکی گەورە، یاخود چەند کوپەڵەیەک زێڕ، ئەوانی دی گەر ئیرەیش بەرن، هێشتا دەزانن دوور نییە ڕۆژێک ئەوان ژنێکی جوانتریان هەبێت، یان کۆشکێکی شکۆدارتر، یان زێڕ و جەواهیری بە بەهاتر، بەڵام دەمێک یەکێک دەست دەگرێت بەسەر ناوەڕۆکی کتێبێکدا، دەمێک خۆی بادەدات و وادەردەخات قەڵای تاریکی کتێبێکی شکاندوە و چۆتە ناوی، لەویادا دەبێتە کەسێک کە شوێنی گومانە، ئیتر من و تۆ و جاسوسەکانمان بۆیان

ناناسرێتەوە. بەڵێ جەنابی عەقید. ئەوەی لەم شارەدا کتێب دەخوێنێتەوە، دەزانێت دەستی بەسەر شتێکی ترسناکدا گرتووە، ئەویش نهێنی دونیایەکی ترە کە ئێمە جاسوسی وەهامان نییە بتوانێت بچێتە ناوی و بیپشکنێ و بەسەلامەتی بگەڕێتەوە. کاتێکیش هەموو دەزانن بۆتە خاوەنی شتێک کە ئەوانی دی ناتوانن هەیانبێت، چارەنوسی دەکەوێتە ئەگەر و نەگەرەوە، لێرەوە دوور نییە کتێبێکی ڕاستەقینە خوێنەرەکەی بکوژێت... بەڵێ جەنابی عەقید، پسپۆرە ئەجنەبییەکە هەموو ئەم شتانە دەزانێت. کتێب نابێت بشاردرێتەوە، چونکە شاردنەوە بەهێزتریدەکات، ناشبێت ئاشکرا بکرێت، چونکە ئەوەی بە ناویەوە دەدوێت دەبێتە کەسێکی ترسناک. مەترسی گەورەی کتێب ئەوەیە ڕێزی مەخلوقاتی وەک ئێمە زۆر دادەگرێت، سیحری ئێمە لە چاو سیحری کتێبێکی جواندا دەبێت چی بێت؟ لێرەوە تاکە ڕێگایەک بۆ ئەوەی بتوانین هەم وەک کۆمەڵێک ئاژەڵی کێوی دەرنەکەوین و هەم خۆمان لە مەترسییەکانی کتێب بپارێزین ئەوەیە چاپیانبکەین، بەڵام دوایی هەر چییەکمانکردوە بیانخنکێنین، ئێمە ناچارین جانەوەرەکە دروستبکەین، بەڵام ناچارنین دەرگای قەفەزەکەی بۆ بخەینە سەرپشت ... وەک پادشایەک بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت نەزۆک نییە منداڵ دروستدەکات، بەڵام دواتر کە دەزانێت عەرافەکان دەڵێن، ئەم منداڵە دەتکوژێت، دەیکوژێت یان دووریدەخاتەوە. بەڵێ جەنابی عەقید، کتێب وەک خانمان وەهان، بۆ نمونە بۆمان هەیە باسی ژن بکەین، هەر ژنێک دەمانەوێت ناوی بهێنین، کەچی بۆمان نییە لە جەستەی بدوێین، باسی شوێنە گرنگەکانی لەشی بکەین. ئەی چۆن جەنابی عەقید، کتێب حەڵاڵێکی هەمیشە حەرامە».

ئەو قسانەی کارمەندە دڵسۆزەکەم، تورەیکردم. لەو ساتەوە هەستمکرد شتێکی سەیر و فریوێکی کوشندە بەرەو لای کتێبم دەبات... بە درێژایی ژیانم بەرامبەر کتێب بێلایەن بووم، بەڵام ئێستا نا، ئێستا هەستمدەکرد دەبێت من نوێنەری ئەو دیوەی تری دونیا بم کە لیڤیتانت دەیویست بیخنکێنێت. بێئەوەی بزانم دەڵێم چی، بێئەوەی ئاگاداربم ئەوەی دەیڵێم

تەواو پێچەوانەی ئەو جێگایەیە کە لەم شارەدا داگیرمکردوە، هاوارێک لە دڵمدا دەیگووت «کتێب ترسناکە و با بەو جۆرە بمێنێتەوە و کەس لە ترس و هەیبەتی کەم نەکاتەوە». لەویادا ئەوی منی دەجوڵاند قێز بوو، قێزم لە لیڤیاتانت، لە حیزب، لە سەرۆک، لە ئاغای پسپۆڕ، لەو نوسەرانەی لە سەر کتێبی هاوەڵەکانیان بێدەنگ دەبن، لەوانەی کتێب دەخوێننەوە و بە زوویی و خێرایی هەموو ماناکانی لە سەری خۆیاندا دەسڕنەوە تا دیار نەبێت، لەوانەی کتێبێک چاپدەکەن تا کتێبێکی تر بخنکێنێت ... قێز ... قێز ... قێز... بۆ یەکەمجار هەستمدەکرد قێز هەر هەستێک نییە کە تووڕەمدەکات و ئازارم دەدات، بەڵکو هەستێکە بەرەو دەرەوەی ئەم دونیایە دەمبات. خودای گەورە جێگای باوەڕ نەبوو، هەموو ئەو شتانەی لیڤیاتانت لێی دەترسا لە ناکاو لە ڕۆحی مندا سەوزدەبوون و دەبوون بە شتی گرنگ و بایەخدار... لە ناکاو ئەو خولیایە دەهاتە ڕۆحمەوە کتێبێکی ترسناک بنوسم و وابکەم هەموو مرۆڤەکانی تر کتێبی ترسناکی خۆیان بنوسن. هەستمکرد هەر شتێک لیڤیاتانت ڕقی لێیە، دەبێت من خۆشم بوێت، هەر شتێک ئەم بوونەوەرە قێزەونانە دەترسێنێت، دەبێت من ئامێزی بۆ بکەمەوە ... کینەیەکی قووڵ و بێبن بەرامبەر لیڤیاتانت منی بەرەو ئەو شتانە دەبرد. کە دەچوومەوە ماڵ، سەرەتا باوەشم بە «ئاسمان» دا دەکرد و تێر ماچمدەکرد، دەمگووت «دەزانم ئەوان هەموو تۆیان خۆش ناوێت، هەموو قێزت لێدەکەنەوە، بەڵام من تۆم خۆشدەوێت، تۆم خۆشدەوێت و تا من مابم تۆ لەگەڵ باوکی خۆت دەبیت، لەگەڵ من». ئینجا دەکەوتمە سەیرکردنی کتێبی «چاوی خودا» و لە کاغەزەکانم دەپرسی «تۆ کتێبیت یان نا؟ ... تۆ کتێبیت یان نا؟». چاوانم پڕدەبوون لە ئاو و نەمدەزانی «چاوی خودا» کتێبە یان نا... نەمدەزانی هەڵیبگرم یان بیسووتێنم... بیپارێزم یان خێرا نەفرەتی خودای لێبکەم و تووڕی دەمە ئاگرەوە؟



نەغەدە ماردینی لە دونیایەکی بە ڕوکەش جیاواز لە دونیای مێردەکەیدا دەژیا. پاش چەند مانگێک لەو یەکدی بینینەی کە قەسیدەی پەترۆسی پیشاندام، بەڕێکەوت لە چلەی ماتەمینی یەکێک لە سەرکردەکاندا بینیمەوە کە بە ڕوداوێکی هاتوچۆ گیانی لەدەستدابوو، وەک ژنانی تر سەرپۆشێکی ڕەشی دابوو بەسەریدا و لە ڕیزی دووەم لە بەردەمی مندا دانیشتبوو. بە هێمنی سڵاوم لێکرد و گووتم، ماوەیەکە هەواڵم لە تەندروستی و ژیانتان نییە و هیوام وایە شتەکان لای ئێوەوە لە سەر ڕەوتی خۆیان بڕۆن. نیگای وەک چاوانی لیڤیتانت ساردییەکی قووڵی تێدابوو، گووتی «خراپ نیم، بولبولیارم لە بیر خۆم بردۆتەوە، تەنیا جار جارێک لە خەودا دەیبینم». هەستمکرد لەوەدا ڕاستدەکات. ماردینی بووبوو بە ژنێک هەر شتێک نائاسوودەی بکردبایە بە شتێکی تر لە بیر خۆی دەبردەوە. وردە وردە بولبولیار لە خەیاڵی من و ئەویشدا وەک خەوێکی دووری لێدەهات، خەونێک ساڵانێک لەمەوبەر دیبێتمان.

هەواڵەکانیش کە سەبارەت بە خانم بۆ من دەهاتن، دەیانگووت «خانم هەوڵدەدا ژیانێکی خۆش بژی». بەیانیانی بۆ شیعر و ئینجانەکانی دانابوو، ئێوارانیشی بە ئاهەنگ و میوانییەوە دەبردە سەر. لەو ماوەیەدا یەکەمین کۆڕی شیعری خۆی سازکرد، کۆڕەکە تێکەڵەیەکی سەیربوو لە بۆنەی سیاسی و ئەدەبی، وەک ئەوەی لە ناکاو بووبێتە پردێک بیەوێت نوسەران و سیاسییەکان پێکەوە گرێبدات. لیڤیتانت سەرەتا بیرۆکەکەی پێخۆش نەبوو، بەڵام بەوەدا کۆڕەکە شتێک نەبوو لە هەیبەت و گەورەیی ئەو کەمبکاتەوە، بەهانەیەکی قورسی شک نەبرد ببێتە ڕێگر. بەتایبەت ئێستا ئەوەی دۆزیبووەوە باشترین شتێک بۆ شکاندنی تەلیسم و سیحری ئەم نوسەرانە ئەوەیە، لێیان گەڕێیت بە ئازادی خۆیان هەر شتێک دڵیان دەیەوێت، بیکەن.

ئەو ماوەیەی لیڤیاتانت بوو بە خاوەنی دەزگای گەشەپێدانی ئەدەبیات، سەرنجیدا نوسەرەکان مەخلوقاتی وەها مەزن و گەورەش نین وەک ئەو بە درێژایی ژیانی لێیان ترساوە و ویستویێتی بە شکاندن و وێرانکردنی جەستەیان هاوسەنگی ڕۆحی خۆی ڕابگرێت. نەک هەر ئەوە، بەڵکو هەندێکیان لەزەتێکی گەورەش لەوە دەبینن ملکەچ و بێدەنگ بن، بە جۆرێک لیڤیاتانت دەمێک هەندێکیانی دەبینی ئەو پرسیارە بێوەڵامەی لادروست دەبوو، تۆ بڵێی لەزەتی ملکەچی لە لەزەتی ئاغایی هێند زۆرتر بێت وا ئەمانە بەوجۆرە چێژی لێ دەبینن؟ دەبێت تامێکی وەهای هەبێت ئەم نەیزانی بێت؟.

لەو دەمەدا بەردەوام چیرۆکی ئەو پەیمانە بچوک و نهێنییەی لیڤیاتانت لەگەڵ ژێر دەستەکانیدا مۆریدەکرد پەرەیدەسەند و بڵاودەبووەوە. کێ دەیگووت لەو ڕۆژگاری شەڕ و پێکدادانەدا کەسێک دروستدەبێت وەک لیڤیاتانت تەنیا چاوی لە دروستکردنی ئیمپراتۆرییەتێکی وا گەورە بێت، خەیاڵی وەها بە بازاڕەوە گرێدرابێت و هەموو ئەم جیهانەی ئێستای بۆ بێنرخ و کەم بەها بێت. هاوکارەکانم ڕۆژێک ئاگاداریانکردمەوە کە لیڤیاتانت جۆرە گرێبەستێکی چاپکردوە ناوی «گرێبەستی ڕەش»ـە، پەیمانێکە لە سەر کاغەزێکی تایبەت و بە مەرەکەبێکی تایبەت دەنوسرێت، کورت و سادەیە، دێڕێکی لە سەر نوسراوە «من لای هۆمەر بۆتانی ئیشدەکەم». ئەوەندە و هیچی دی. بەڵام لە ڕاستیدا لە پشت ئەو واژۆ و مۆرەوە، بێدەنگییەکی زۆر و شتگەلێکی نەدرکاو هەن هەموو دەیزانن، دەریایەکی ترسناک لە ئاماژەی نهێنی کە دەبێت هەر کەس و خۆی تێیبگات. کورتی ڕستەکە ئاماژەیە بۆ ئاڵۆزی و ترسناکی گرێبەستەکە، نەوەک سادەیی و ساکاریی. ئەوەی گرنگ بوو ئەو ڕێکەوتنە نەدرکاو و نەگووتراوانە بوون، کە دەکەوتنە سەر ڕووبەرە نەنوسراوەکانی ئەو پەیمانە. من هێندەی نمونەیەکی گرێبەستەکەم کەوتە بەردەست و بینیم، تێگەیشتم زیندان لای لیڤیاتانت شوێنێکی ئەبەدییە، گرێبەستەکە دەرگای جۆرێک لە زیندانی تازەی لە ژیانی ئێمەدا دەکردەوە کە پێشتر نەبوو، خەڵک ناویان دەنا

گرێبەستی کار و من ناوم دەنا ئەسارەتی ئەبەدی جەستە و ڕۆح. ئەو لە هەر کوێ بووبێت زیندانەوان بووە و واش دەمێنێتەوە، چەند شانۆ ببینیت، چەند ڕۆڵ نمایشبکات، ئەو هەر زیندانەوانە ئەبەدییەکەی پسمامانە کە تەنیا شێوە و شوێنی زیندانەکەی خۆی دەگۆڕێت.

لیڤیتانت لەو سەردەمەدا لە سێ سەرچاوەی سەرەکییەوە گرێبەستەکانی مۆردەکرد. سەرچاوەی یەکەم، ئەو نوسەرانەبوون کە نوسەر و هونەرمەند و خوێندەوارانی تریان دەهێنا و لە دەزگاکەی لیڤیتانتدا کاریان پێ دەسپاردن، ئەوە سەرەتای لە دایکبوونی نوسەرانی فەرمانبەر بوون کە نوسینیان گرێدراوی دونیای وەزیفەکانیان بوو. سەرچاوەی دوومیش زیندانەکەی خۆی بوو کە تادەهات ناوی تاریکتر و ترسناکتر دەکەوتە سەر زاران و بەردەوام خەڵکانی تێدەکەوت و لە ڕێگای گرێبەستەکانەوە ئازاددەکران. سەرچاوەی سێهەمیش ئەوانە بوون هەمان گرێبەستیان لەگەڵ وەستا و کرێکارانی بازاڕدا مۆردەکرد تا تەنیا ئیش لە پرۆژەکانی لیڤیتانتدا بکەن. ئەوە سەرەتای ئەوجۆرە ڕێکخستنە ترسناکە بوو کە دە ساڵ دواتر بە ناوی کۆمپانیاکانەوە، تەواوی دونیای ئێمەیان کەوتبووە دەست.

دەمێک نەغەدە کۆڕە شیعرییەکەی گرت، لیڤیتانت لە هۆڵەکەدا ئامادەنەبوو. «شیعر شتێکە بۆ لاواز و کۆیلەکان»، ئەوە ئەو ڕستەیە بوو کە لە سەر بەرچایی ئەو ڕۆژە کاتێک خەریک بوو هەندێک ئاو پرتەقاڵ بخواتەوە، بە نەغەدە ماردینی گووت، بەڵام نەغەدەش بێئەوەی سەیرییکات یان تورە بێت یاخود هیچ چەشنە نارەحەتییەک بە دەنگییەوە بێت، بە هێمنی وەڵامیدایەوە «ڕەنگە وابێت، بەڵام ئەو لاواز و کۆیلانە کەسانێکن تۆ ناتوانیت ڕۆحیان داگیربکەیت». ژن و مێردێک بوون باش یەکدیان دەناسی. ئەوەی هەواڵەکەی بۆ هێنام، گووتی دوای ئەو قسانە هەر دووکیان هێمن و بگرە ئاسوودە پێکەوە بەرچاییانکردوە، لیڤیتانتیش لە سەر سفرەکە بە جۆرێک دانیشتووە وەک خۆشحاڵ بووبێت لەوەی دەتوانێت ئاوا ئاسوودە لەگەڵ ژنێکی هەمیشە تەماوی و تاریکدا بژی.

کوڕەکەی خانم پڕبوو لە سیاسەتمەدارانی گەورە و نوسەرانی ناسراو کە بە شەیداییەوە گوێیان لە شیعرە تازەکانی خانم گرت. من گەرچی شارەزاییەکی قووڵی ئەدەبیات نەبووم، شیعرەکانم وەک تێکستە کۆنەکانی ماردینی نەکەوتە بەر گوێ. ساڵانێک دواتر کە بولبولیار لە سەر شیعرەکانی خانم لە گەڵمدا کەوتە گفتوگۆ، هەمان ڕستەی دووبارەکردەوە کە لە سەر شاعیرە خراپەکان دەیگووت «خانم ئێستا شاعیر نییە، بەڵکو دەتوانێت شیعر بنوسێت». شیعرەکانی ماردینی بە ڕوکەش هەموو شتێکیان تەواو بوو، بەڵام لەو جۆرە شیعرانە بوون کە هیچ کەس ناتوانێت هیچیان لە سەر بڵێت. دیارە من حوکمدەرێکی لێزان و بە ئینساف نیم تا کەس لە دەمی منەوە دوا بڕیار لە سەر نوسینەکانی خانمی ماردینی بدات. ڕەنگە کارەکان قووڵ بووبن، گرنگ بووبن، بەڵام لەوجۆرە بوون کە لە شارێکی وەک ئێرەدا تەنیا بە بێدەنگی پێشوازیدەکرێن. من یەکێک بووم لەوانەی حەزمکرد نمایشەکە تا کۆتایی ڕابکێشم و لە هەموو دیمەنەکاندا ئامادەبم، ڕۆژی کوڕەکەی ماردینی پێش خەڵکی کەوتم و هەر زۆر زوو لەوێبووم، لە ڕیزی دووەمدا کورسییەکم هەڵبژارد تا پێویستم بەوە نەبێت دواتر جێگا بە کەس چۆڵبکەن، بەڵێ گەرچی نەمدەویست خاڵی لە شانازیی و غروریی دەسەڵات دەربکەوم، بەڵام هێندەش هۆشم هەبوو، لەو جێگا گشتیانەدا ڕوویەکی خۆش و ڕوخسارێکی خاکیانە دەربخەم. خانم شیعرەکانی بە دەنگێکی ناسک و تا بڵێی کاریگەر خوێندەوە، من و خەڵکانێکی زۆر هێندەی چێژمان لە خوێندنەوەکە وەرگرت و جوانی ماردینی سەرسامیکردینەوە، ناوەڕۆکی شیعرەکان وا نەهاتنە دەستمان. دوای تەواوبوونی نەغەدە، چەپڵە ڕێزانێکی عەجایەب خەریکبوو دار و دیواری هۆڵەکە بڕوخێنێت. دەمزانی زۆربەی چەپڵەکان بۆ لیڤیتانتە نەوەک بۆ نەغەدە ماردینی، کەسانێک لە هۆڵەکەدا بوون، هەر نەیاندەزانی گوێزی شیعر هەزاری بە چەندە و وەک مەیمونی قورمیشکراو چەپڵەیان دەکوتا، پێیان وابوو گەر توند بۆ خانم چەپڵە لێدەن، لیڤیتانت لەگەڵیان سەخیتر و دەستبڵاوتر دەبێت، گەرچی لیڤیتانت لەوێ نەبوو، بەڵام ئەو بەدبەختانە وایاندەزانی لە جێگایەکدا خۆی شاردۆتەوە و یەک

یەک سەیریان دەکات و دەبینێت کێ چەپی توندتر لێدەدات. شاعیرەکان و نوسەرەکانیش، بێئەوەی شتێکی ئەوتۆ لە ڕۆحی لیڤیتانت و تاریکییە ناوەکییە سەیرەکانی بزانن، پێیان وابوو نزیکبوونەوە لە خانم هەنگاوێکیشە بۆ نزیکبوونەوە لە پرنس بۆتانی کە ئیتر لە هەموو کارێک و هەموو جێگایەکدا ناوی دەهات. دوای کۆڕەکە، خەڵکانێک بە بەلاغەتێکی بەرزەوە وەسفێکی زۆری خانمی ماردینیان کرد. شاعیرێک کە پسپۆڕی شیعری ئیرۆتیکییە، لەو دەستە و تاقمەی شیعر کەرەستەی سەرەکی نزیکبوونەوەیانە لە ژنان، بە جۆرێکی ئەفسانەیی وەسفی ماردینی کرد، ناوینا «فریشتەکەی خوشکی سافوا» «کچی باخۆس» «جێگرەوەی مەستورەی ئەردەڵانی» «ڕامکەری ئەنکیدۆ» «دەستەخوشکی سیرینەکان» «ڕەوانەکراوی ئاهورامزدا» و چەند نازناوێکی تر کە لە ئەفسانەی کۆنەوە دەیهێنان. وەک هەمیشە قسەکردن لە سەر ناوەڕۆکی شیعرەکان نەبوو، بەڵکو لە سەر مەزنی خانم بوو، کە لە ناکاو وەک سیمرغێکی ئەفسانەیی باڵی خۆی لە ئاسمانی ئەدەبیاتدا دەکردوە. لە کاتی داباریني ستایشەکاندا، هەندێ جار بە تیلەی چاو سەیری منی دەکرد، دڵنیابووم هەردووکمان لەو ساتەدا بیر لە بولبولیار و قەسیدەی پەترۆس دەکەینەوە. نەمدەزانی خانم تەواو بڕوای بەم پیاهەڵدانانە هەیە یاخود وێنەی پەترۆس بۆتە مۆتەکەیەک و لە خەیاڵی دەرناچێت. کە کۆڕەکە تەواو بوو، من وەک هەموو ئەوانەی ملی خۆیان دەشکێنن تا پیرۆزبایی لە خاوەن کۆڕ بکەن، بە تەکان خۆم گەیاندە سەر شانۆکە بۆ لای خانم. هەموو ئامادەبووان پێیان سەیربوو عەقید جەنگیز بەڕێوەبەری گشتی دەزگا و بەرپرسی هەرە گەورەی ئاسایش، پیاوە ترسناکەکەی شار، ئەوەی ڕۆژانە ئەندام و هەواداری حیزبەکانی دی بە لۆری دەگرێت و لە شار دەریاندەکات، بەوجۆرە خۆی وەک عاشقێکی حەماسەتداری شیعر دەردەخات و تەکان دەدات و گوژم دەگرێتەوە تا بگاتە بەردەمی شاعیرە نازدارەکەمان. کەسیان نەیاندەزانی دەمەوێت تێبگەم خانم ئێستا خۆی چۆن دەبینێت. کە کەسانێک بە ترسەوە خۆیان لادا تا تێپەڕم، گەیشتمە نزیکی و پیرۆزبایم لێکرد و گوتم «هیوادارم ئێوارەیەکی جوان بووبێت بۆ

ئێوە... زۆر جوان بوویێت». تێگەیشت مەبەستم چییە و بە دەنگی بەرز بۆ ئەوەی هەموو ئەوانی تر گوێیان لێبێت، گووتی «جوانی؟ جوانی و درۆ هاوڕێی هەتاهەتایی یەکن، عەقید». لە چاوانیدا بەختەوەرییەکی نهێنیم خوێندەوە، دەیویست خۆی سەرکەوتوو و بەختەوەر پیشانبدات، دەیویست درۆکانی ژیان تا ئەوسەر بژی، دەیزانی درۆیەکی گەورە دەبینێت، بەڵام چ باک، چ غەم، لە ترۆپکی هەموو جوانییەکدا درۆیەکی گەورە هەیە، وەک جەوهەری ژیان خۆی کە ناوەڕاستەکەی درۆیەکی مەزنە.

سەرەتا ویستم سەری بۆ بلەقێنم و بڵێم گوڵت فەرموو خانم، دەمزانی دەیەوێت چێژێکی زۆر لەو درۆیە وەربگرێت کە ئەوانی تر ئاوها بە خۆڕا پێشکەشیاندەکرد. بەڵام بۆ ئەوەی خۆم فەلسەفی و عەقڵدار نیشان نەدەم، گووتم «نانا خانم.. نانا... نابینیت ئەم خۆشەویستییە زۆرەی دەوری تۆ، پڕ جوانییە و پڕ ڕاستی». دڵنیابووم دەیویست پێمبڵێ «وای تۆ چ درۆزنێکیت». بەڵام پێکەنی و هیچی نەگووت. پێکەنینەکەی پێکەنینی شادییەکی ڕاستەقینە بوو، لەو ساتەدا من لە جێگای خۆم وەستام و لە دڵی خۆمدا گووتم «شادی ڕاستەقینە لە درۆوە نەبێت لە هیچی دیکەوە نایەت». نەغەدە لە ناو ئەو هەرایەی دەوروبەریدا بە چاو پێیگووتم «عەقید دەزانم، هەموو شتەکان درۆن، بەڵام شادییەکەی من ڕاستەقینەیە». شەپۆلی خەڵک کە دەیانەویست بگەنە بەردەمی خاتوون کەمێک پاڵی پێوەنام و بەرەو دوا گێڕامییەوە، من لە پشتەوە لە ناکاو هاوارمکرد «خانم... خانم ... دەزانی فریشتەکەی من و تۆ بۆ مرد؟ بۆ ئەوەی لە ڕۆژێکی وەهادا هەست بە خۆشی بکەین ». بینیم لە جێگای خۆی سڕ بوو، بۆ ئێستێکی کورت خۆشی بە ڕوخسارییەوە نەما، بەڵام شەپۆلی خەڵکەکە توندتر پاڵیان بە منەوە نا بۆ دواوە. ئیتر چاوم لێ نەبوو ڕوخساری چی بەسەر دێت و بە چ جۆرێک دەگۆڕێت. دواجار لە ناو هەڵا و شەپۆلانی چواردەورمدا گوێم لێ بوو گووتی «جەنابی عەقید... جەنابی عەقید، وەک دەبینیت من دەتوانم لە ئاسمان بم». مەبەستی بوو بڵێت «ببینە ... ببینە. من پەترۆس نیم». من لە ناو هەرا و دەنگە

دەنگەکەدا لە پشتەوە، هاوارمکردەوە «زۆری ماوە خانم بزانین ئێمە لە کوێین، هێشتا زۆری ماوە، پەلەمەکە».

## وەفائیل و من

خۆشحاڵ بووم فریشتەکەم هاتۆتەوە دەستم ... هەر زوو سەرلێشێوانی ئەو شەوە ساردەم تێپەڕاند و تێگەیشتم مانای چی وەفائیل وەک دیل لە چنگی خۆمدا بێت. ئێستا هەستێکم هەبوو، وەک ئەوەی دووبارە توانیبێتم بیهێنمەوە ناو خۆم و دەلاقەی ئەو شەبەقە داخەم کە ونبوونی دروستیکردبوو. چەند هەفتەیەک فەرامۆشمکرد و چێژم لەوە دەبینی کە دەمزانی لە ژێر زەمینەکەدا زیندانە، ئەوە بەسبوو زۆر لە ترس و لەرزە دەروونییەکان و هەستە ناخۆشەکانم بڕەونەوە.

فەرمانمدا بە پاسەوانەکان چراکانی لێ بکوژێننەوە و لە تاریکیدا نوقمیبکەن، سەیربوو دوای دوو ڕۆژ، بە جۆرێکی سەیر و بێمانا لەیادمکرد، وەک ئەوەی هیچ کات کێشەی فریشتەیەکی ترازاوم نەبووبێت.

دوای چەند هەفتەیەک، بڕیارمدا سەری لێبدەم و بزانم چی بەسەر هاتووە.

کە چوومە ژووریێ بۆ زیندانەکەی، لە سەر دۆشەکێکی کۆن ڕاکشابوو، باڵەکانی گەورە و بەهێز و زەبەلاح بوون، ساڵەهای ساڵ ئەو باڵانەم بە شانی خۆم هەڵگرتبوو، کەچی هەر پێم نامۆ و نەناس بوون. ئێستاش وەک جاران سەنگین و بەتوانا دەردەکەوتن. کەس لە پاسەوانەکان باڵەکانی ئەوی نەدەبینی. لە چاو ئەو ئێوارەیەدا کە کردمە زیندان زۆر ئارامتر بووم، ناکۆکییە دەروونییەکانم لە شوێنی خۆیان بوون، بەڵام ناکۆکی دەروونی شتێک نییە بەردەوام ئازارتبدات، مرۆڤ دەتوانێت فەرامۆشییبکات و دواتر بانگهێشتیبکاتەوە، بیخەوێنێت و وریاییبکاتەوە. کە

منی بینی هەر وەک خۆی سارد و بێمەیل دیاربوو، بۆ ساتێک هەستمکرد هیچ سۆز و هەستێکی تایبەتی بۆ من نییە، وا دەڕوانێت و ڕەفتاردەکات، وەک هیچ کات بەشێک نەبووبێت لە من. بە پاسەوانەکەم گووت کورسییەکم بۆ بێنێت، تا پاسەوانەکە کورسییەکەی هێنا، هەر بە هێمنی سەیری یەکترمان دەکرد، تاریکی ئەو ماوەیە هەستێکی تایبەت یان توڕەی تێدا دروست نەکردبوو، سەرەتا نە ئەو هیچی گووت و نە من. لەبەرچاوم گەنجتر و خاوێنتر لە من دەینواند، بەڵام غەمگینتر بوو لە ڕۆژی یەکەم. بەرامبەری لە سەر کورسییەکە دانیشتم و پرسیم «بەرچاییت خواردوە؟». بێئەوەی دەنگی لێوەبێت سەری لەقان و بە ئاماژە گووتی «بەڵێ». لە چاویدا پرسیارێک هەبوو، دڵنیابووم دەیەوێت بزانێت بۆ هاتووم. گووتم «دەتەوێت شتێک بپرسیت، فەرموو پرسیارەکەت بکە». گووتی «بۆ نامکوژیت؟ ... بۆ دوای دەخەیت؟». گووتم «بۆ هاتیتەوە؟ ڕاستیم پێبڵێ، دوای ئەو ماوە دوور و درێژە، دەمەوێت بزانم بۆ هاتوویتەوە؟». بێئەوەی لە جێگای خۆی هەستێت، گووتی «بەرلەوەی بڕۆم، ڕۆحی تاریکی تۆ زیندانم بوو، ئێستاش ئەم دەزگایەت لە سەر ئەو شێوەیە دروستکردوە. ئێرە ئاسایش نییە، شوێنێکە زۆر لە دڵی تاریکی خۆت دەچێت».

دەنگی هێمن و خەواڵوو بوو، تەنیا دەمی دەجوڵاند، جوڵەیەکم لە لەشی یان ڕوخساریدا نەبینی. یەکەمجار بوو سەرنجی ئەوە بدەم ئەم زیندانە درێژکراوەیەکی مەجازی خۆمە. لەوەدا لە سەر هەق بوو، ئیشکردنی بەردەوامم لەم دەزگا تاریک و ئاڵۆز و گەورەیەدا ئیشکردنم بوو لە سەر ڕۆحی خۆم. .

لە ڕاستیدا نەمدەویست زۆر بیوروژێنم، دەمویست جارێ کپ لە زیندانەکەی خۆیدا دابنیشێت. ئێستا نیازم بەس لەسەر دیلکردن و ونکردن و بێدەنگکردنی بوو، بەڵام پرسیم «دەزانم پێم ناڵێیت بولبولیار لە کوێیە، گەر بیویستبایە ببینم خۆی دەهات، دەزانێت بەدوایدا دەگەڕێم. بەڵام گەڕانەوەی تۆ تا ئێستا شوێنی گومانە... بۆ هاتیتەوە؟». شێوەی

پرسیارەکەم وەک شێوازی پرسیارکردنم بوو لە کاتی لێپرسینەوەکانی ئاسایشدا. وەفائیل لە شوێنی خۆی نەجولا، بەڵام گووتی «زۆر شت هەیە تۆ نایزانیت و نایبینیت و تێی ناگەیت ... خۆ شارەکە لەو سنوورەدا ناوەستێت کە چاوانی تۆ دەیبینێت». گەرچی قسەکەی بەو نیازە نەبوو غروری من بشکێنێت، بەڵام هەستم بە لاوازییەکی کتوپڕ کرد و پرسیم «چۆن؟ شارێکی تر هەیە من نایبینم؟». گووتی «نا، شارێکی تر بوونی نییە، هەر ئەم شارەیە، بەڵام ژیانی تر، مرۆڤی تر، جەنگی تر هەیە تۆ نایانبینیت».

ئەوە یەکەمجاری بوو کە ویستی باسی کوشتاری فریشتەکانم بۆ بکات، من تا ئەو کاتە هیچ شتێکم لە سەر ئەو چیرۆکە نەبیستبوو. پرسیم «چ جۆرە جەنگێک؟ شتێکی زیاترم پێبڵێ». بۆ یەکەمجار لە شوێنی خۆی هەستاو گووتی «شەڕێکی گەورە دژی فریشتەکان، چەندین ساڵە شەڕێکی گەورە دژی ئێمە و مەلەکبینەکان هەیە و تۆ بێئاگایت، ئێستا شێوەیەکی زۆر خوێناوی وەرگرتووە، ڕۆژ دوای ڕۆژ دڕندەتر و گەورەتر دەبێت، تا دێت قوربانی زیاتری لێ دەکەوێتەوە... ئێستا ژیانمان لە مەترسیدایە، ژیانی من، ژیانی بولبولیار، من لێرەم بۆ ئەوەی داوای یارمەتیت لێبکەم، کارێک بکە مەلەککوژەکان بوەستێنیت».

ئەوە ترسێک بوو، ساڵانێک بوو لە دەستی هەڵدەهاتم. چ ترسناک بوو ڕامکێشێت بۆ دونیای خۆی، چ بەدبەختییەک بوو بتوانێت وەها شێتمبکات، باوەڕ بە بوونی جەنگێکی لەو چەشنە بکەم. ترسی گەورەم ئەوە بووە، وڕێنەکانی ئەم مەخلوقە لەگەڵ خۆیدا بمبات. دەترسام بتوانێت لە واقعم دووربخاتەوە، نەدەبوو گوێ لە شتی وەها بگرم.

خۆم ڕاوەشاند و گووتم بەس نییە باوەڕم هێناوە بەوەی فریشتەیەکی هەڵهاتووم هەیە؟ بەس نییە ئەو دوو کەرتبوونەم قەبووڵکردوە؟ گەر ئەم کەرتبوونەی خۆم لە نێوان من و تۆدا بگوازمەوە بۆ هەموو دونیا، گەر

باوەڕ بەوە بهێنم کە ئەم دونیایەش شتێکی دوو دیوە، ئەوکات بەرەو شێتی دەڕۆم، توانام لە سەر بەڕێوەبردنی دەزگا نامێنێت.

ئەوەم هاتەوە یاد سەردەمێک من لە سەقز بووم، مەلاکانی شار جاڕی دەرکەوتنی ئیبلیسیان دابوو، ئەوکات لە یادمە هەموو قاقامان لێدەدا و دەمانگووت مەلاکان شێت بوون. ئەوە لەرزێکی خستە گیانم و بۆ یەکەمجار هەستمکرد من شێتم، هەستمکرد ئەم فریشتەیەشم دەیەوێت زیاتر شێتمبکات. سەیری چاوانیم کرد و تێگەیشتم کە بوونی لێرەدا، بەرامبەرم، نیشانەیەکە بۆ ئەوەی هیچ کات لە کۆڵم نەبۆتەوە. وەک چۆن حیزب هێزێکی ڕەش بوو، ڕزگارم نەدەبوو لە دەستی، ڕۆحی گرتبووم و ئازادی نەدەکرد، ئەم فریشتەیەش لە ڕۆحم دانەدەبەزی و ژیانی تاڵکردبووم.

ویستم بیکوژم. بەڵام بێئەوەی بزانم بۆ، توانای ئەنجامدانی ئەو کارەم نەبوو. لە دڵی خۆمدا گووتم، کەوتوومەتە سەردەمێکەوە پڕە لە دەست و دڵی ئیفلیج و کەس کارێکی گرنگی بۆ ئەنجام نادرێت. لە ناکاو توانای سەیرکردنیم نەما، وەک لە خەوێکی ناخۆش هەڵبێم، بێئەوەی هیچ بڵێم لە سەر کورسییەکەم هەستام و بێ هیچ قسەیەک لە زیندانەکە چوومەدەرێ ... هەستمکرد هەڵەمکردوە چوومەتە لای، دەبوو یان ئەو یان شتێکی دی بکوژم... دەبوو یان ئەو یان حەقیقەت یەکێکیان بکوژم.

توانای ئەوەم نەبوو تا کۆتایی گوێی لێبگرم. لە نێوان واقعییەت و شێتیدا گیرم خواردبوو، خۆم وەک گایەکی هار دەبینی کە لە نێوانی دوو دیواردا دیلە. دیوارێکیان دونیایە و دیوارێکیان شێتی، جارێک سەر دەدات بە دیوارە دەرەکییەکەی دونیادا و جارێکیش سەر دەکێشێ بە دیوارە ناوەکییەکەی شێتیدا، بەڵام لە هیچ دیوێکەوە دەربازی نییە.

ئەو ڕۆژە فەرمانم بە پاسەوانەکان و ئەفسەری خەفەر دا، خێرا گڵۆپەکان خامۆشبکەن و دەرگاکان مەحکەم دابخەن و بیخەنەوە تاریکی. هەموو سەرسام لێیان دەڕوانیم و لە هۆی ئەو هەڵهاتنە سەیر و خێرایەم

تێنەدەگەیشتن. نەمدەویست هیچم بۆ بگێڕێتەوە، نەمدەویست تارمایی بولبولیار بهێنێتەوە ژیانم، نەمدەویست ئەو پیاوە ببینم کە یەکەمجار باڵەکانمی بینی و منی خستە ئەم دۆزەخەوە. ئێستا هەمان ئەو دوودڵییە گرتمی کە یەکەمجار لە شەوی تیربارانەکەی بولبولیاردا هەستم پێکرد، ئەو شەوەی حەقیقەت و خەیاڵم بۆ ئەبەد لێ تێکەڵبوو. دەبوو بۆ ئێستێکی کورتیش بووە هەڵبێم ... دەرگام لە سەر داخست و هاتمەدەرێ. هەستمکرد دەبێت یان وەفائیل یان کەسێکی دی بکوژم. لەو دوو ڕیانەدا وەستان جگە لە بەدبەختی، هیچی تری بۆ نەدەهێنام.

ئەوە بڕیاری گەورەم بوو، ڕۆحی خۆم ڕزگاربکەم.

لە زستانی ساڵی 1996 دا، شار بە جۆرێکی ترسناک پیس بووبوو، چەندین جار سکچوونی کوشندە بڵاوبووەوە، خەڵکانێکی دەکوشت و پاشماوەیەک وەکی هیچ نەبووبێت خەفەدەبوو و دەنگی نەدەما. هەموو بە جۆرێک عادەتمان بە پیسییەوە گرتبوو، هەموو دونیامان دەبینی پیسییەکانی نەبێت. ژیان لە ناو ئەو کۆمەڵە ترسناک و بۆگەنەی خۆڵ و خاشاکدا کە کەس نەبوو لە شەقامەکان و بەردەم ماڵەکان و ژوورەکاندا کۆیانبکاتەوە، بووبوو بە ژیانێکی بێخەوش کە هیچ کەس گلەییەکی وەهای دژی نەبوو. شەڕی ناوخۆش هێدی هێدی دەبووە شتێکی ڕۆتینی و ڕۆژانە و دووبارە. شەڕی ناوخۆ چیتر شەڕ نەبوو، بەڵکو ئەو دۆخە ئاساییەی ژیان و پەیوەندێ ئێمە بوو وەک مرۆڤ لەگەڵ یەکدا. زۆر هەوڵمدەدا چالاکییەکانی ڕۆژانی شەڕ، دیلکردنی نەیاران و ئەشکەنجەدانیان هەستی تازەم بدەنێ، بەڵام شتێکی نوێ لە ڕۆحی مندا دیار نەبوو. وەک سەرۆک، وەک لیڤیتانت، وەک شێرخان، وەک هەموو ئەوانی تر، پیاوێکی دووبارەبووم بە ژیانێکەوە وەک ژیانی دووبارەی ئەوانیدی. دڵنیابووم حیزب یاریم پێدەکات، ڕۆژێک ئەو هەستەم پێدەبەخشێت کە خودام و ڕۆژێکیش ئەو هەستەم تیا گەورەدەکات کە تەنیا جرجێکی گەورەم. لە نێوان ئەو دوو هەستەدا وردبووبووم.

ئەو ماوەیە بە زۆر بڕوام بە خۆم هێنا شەڕ بێت و نەبێت، هەمیشە هەر شەڕە. قێزم تا دەهات لە فەرماندە و سەرکردەکانی حیزب زۆرتر دەبوو. تاکە شتێک لەو سەردەمەدا وەک هەستێکی گرنگ و سەرەتایی تەماشامدەکرد، ئەو خولیا قووڵەم بوو بۆ سەربەخۆیی، هەندێ جار وام هەستدەکرد ئیتر لە ڕکێفی ئەو حیزبپەرستییە دێرینە دەربازم بووە و بوومەتە ڕۆحێک تەنیا بۆ خۆم ئیشدەکەم. کاتێک لە ماشێنە جام ڕەشەکەمدا دادەنیشتم و پاڵمدەدایەوە و چاویلکەیەکی ڕەشم دەکردە چاوم، پێموابوو گەیشتوومەتە ئەو پلەوپایە گەورەیەی سەر بە هیچ هێز و دەستەیەکی دونیا نەبم، پاڵمدەدایەوە و دەستم دەخستە سەر ورگم و بەخۆم دەگووت «هێی عەقید جەنگیز، دواجار بوویت بە پیاوێکی ئازاد». هەستێکی سەیرم هەبوو کە دەزگای ئاسایش دەزگای خۆمە، وەک چۆن مرۆڤێک هەستدەکات ماشێنەکەی، ژنەکەی، منداڵەکەی هی خۆیەتی، منیش وامدەزانی ئەو دەزگایە موڵکی تایبەتی منە. دەبێت ڕاستیتان پێبڵێم، ئێرە جێگای درۆ نییە، ئەو هەستانەم زۆر کورتخایەن بوون، چەند ساتێک دایدەگرتم و زوو دەبوونە هەڵم و لە نێو دەچوون و دەکەوتمەوە نێو دۆزەخی ئەو گومانانەی کە وێرانیدەکردم. دوای ئەو نۆبەتە توند و کاریگەرانەی ئازادی، لە ناکاو هەستمدەکرد من مرۆڤێکی ئازاد نیم و هەر چییەک دەکەم دواجار لە قازانجی حیزبدایە و هیچ کات و بە هیچ کردارێک لە وێنەی ئەو ئەسپکوژەی پسمامان ڕزگارم نەبووە. ئەو کاتە زۆر لە خەیاڵی ئەوەدا بووم شتگەلێکی زۆرم هەبێت هی خۆم بن، هەستمدەکرد نهێنی لیڤیتانت ئەوەیە کە دەتوانێت شتەکان بکات بە موڵکی خۆی و من تا ئێستا هەر چییەکم کردوە هەر بۆ حیزبە. ئەو هەستە هەندێک ڕۆژ زۆر ئازاریدەدام، دەچوومە دەزگا و دەکەوتمە هەڵدانەوەی فایلەکان و دەڕۆیشتم بۆ پشکنینی ڕۆژانەی زیندانەکان و هەموو دیلێکی تازەم بەسەر دەکردەوە، زۆربەی کات هەستێکی ناخۆشم هەبوو کە من ئەم کارە بۆ خۆم ناکەم، گەر کورت هەستە دژەکەی زاڵ بایە، هەستم بە دڵشادییەکی زۆر دەکرد و خەندەیەکی گەورە دەپەڕییە سەر ڕوخسارم. بۆ ئەوەی ئەو هەستە ترسناکە زۆر ئازارم نەدات، تەکنیک و گەمەی نوێم دەدۆزییەوە،

زۆرجار بە کۆمەڵ خەڵکم ئازاد دەکرد، زۆرجاریش بە پێچەوانەوە دەمنارد وەک ڕەشبگیر ژمارەیەک خەڵکم بۆ بگرن، لێتان ناشارمەوە هەندێ جار ڕێکەوتیگردوە فەرمانی کوشتنی بێبەهانەشم دەرکردوە، فەرمانێک تەنیا فەرمانی من بووە، تا بۆ خۆمی بسەلمێنم، بەڵێ من ئازادم، بەڵێ من، هیچ کەس نییە لە سەرو خۆمەوە بتوانێت لە گەورە و بچوکدا لێپرسینەوەم لەگەڵ بکات. قسەکانی نزار ئیدریس هێدی هێدی دەچوونە خوێنمەوە. ئەوەی چەندەها ساڵ بوو ئەو بانگەشەی بۆ دەکرد، ئێستا دەگەیشتە لام و باوەڕم پێدەهێنا. لەم شارەدا مرۆڤ تەنیا لە ڕێگای تاوانەوە سنووری ڕاستەقینەکانی ئازادی خۆی دەدۆزێتەوە. بۆ ئەوەی بیسەلمێنم ئازادم، پەنامدەبردە بەر کاری هەوایی و نیشاندانی مەزاج لە هەموو حوکم و بڕیارێکدا. تا ئەوکات سێبەری ئەسپەکان هەر بەدوامەوە بوون، هەر دەیانترسانم، هەر پێیان دەگووتم من کۆیلەم. ئەو ساڵانە کە من وەک پیاوێکی ئاسایش و بە شێوەیەکی تایبەتی ڕۆژەکانی شەڕی ناوخۆ دەژیام، هەمیشە پرسیارەکەم ئەوە بوو، ئایا من ئەم یارییە گەورەیە کە سەدان کەسی تێدا بەدبەخت دەبێت بۆ خۆم یاخود بۆ حیزب دەکەم؟ کە تارمایی ئەسپەکان دەهاتنەوە خەیاڵم، ئەو ماخۆلان و خۆرکەیە دەیبێژام کە هێشتا لە قسن و مەرقەدی حیزبدا زێوانم و هەر مجێوری ئەو مزگەوتەم کە سەرۆک بانگی تێدا دەخوێنێت، هەر چییەک دەکەم تەنیا بە خەیاڵ و فەنتازیا و درۆ وادەزانم بۆ خۆمە، ئەگین کاتێکیش بێپرسیی حیزب خەڵک دیلدەکەم و دەیانکوژم هەر بۆ ئەو کاردەکەم. ئێستا لەم زستانە ساردەی ساڵی نەوەدوشەشدا، دڵنیابووم دەزگاکەم پڕبووە لە چاوانێک کە چاوی من نین، زۆر ڕۆژ کاتێک ژوورەکانی دەزگا و فەرمانبەرانم بەسەر دەکردەوە، دڵنیابووم چاوی تر درزەیانکردۆتە ئێرە، بەشی ئەوە ئەزموونم هەبوو سەیری چاوی کارمەندەکانم بکەم و ببینم ئاخۆ نیگاکانیان نیگای منە یان بۆ کەسێکی تر کاردەکەن و دەڕوانن. سەرەتا هەندێک کارمەندم دەرکرد، بەڵام بە جۆرێکی چاوەڕوان نەکراو و بە شێوەیەکی کوشندە هەر زوو لە دیوانی سەرۆکەوە «خوا لێی خۆش بێت»، نامەیان کردە سەرم بیانخەمەوە

جێگای خۆیان. کارمەندە دڵسۆزەکەم بە ڕوونی لە ئازارەکانم تێدەگەیشت، زۆر ڕۆژ دەمناردە دوای و دەهاتە لام و پێکەوە چا و پێپسی ئێرانیمان دەخواردەوە و قسەماندەکرد. جارێکیان لێم پرسی «هەڤاڵ، من نازانم بۆ وا ئولفەتم بە تۆوە گرتووە، بۆ وا پێویستم پێتە». کارمەندەکەم «کە هیچ شتێکی تایبەتی دەربارە ئاشکراناکەم» گووتی «لەبەر ئەوەی ئێستا ئێمە لە سەردەمی کارمەنداندا دەژین». سەری دانەواند و بە ملکەچییەکی پڕ ڕێز و بە وەفایەکی برایانەوە، گووتی «جەنابی عەقید، سەردەمی پێشمەرگایەتی تەواو، لەو سەردەمەدا بەرپرسەکان هەموو بۆ پێشمەرگەی دڵسۆز دەگەڕان، ئێستا سەردەمەکە گۆڕا، ئێستا عەسری کارمەندانی دڵسۆزە، تۆش پێویستت بە پیاوێکی دڵسۆز و بە وەفایە بڕوات پێی بێت و دڵی خۆتی بۆ بکەیتەوە». لەوەدا لە سەر هەق بوو، هەستمدەکرد هەموو ئەندامانی بیرۆی سیاسی و فەرماندە باڵاکانی حیزب خۆیان بە تاقمێک لە کارمەندی وردەکار و بێدەنگ و دڵسۆز گەمارۆ داوە. لەو سەردەمەدا گەرچی شەڕ بوو، بەڵام فەرماندەکانی حیزب هیچیان لە فیشەک نەدەترسان، بەڵکو دەترسان نهێنی کار و پلان و پەیوەندییەکانیان ئاشکرا بێت. وەک گووتم کارمەندە دڵسۆزەکەم لە قوتابییە دێرینەکانم بوو، من وانەی سیخوڕیی و هەواڵدزیم پێدابوو، بەڵام جیا لە هەموو قوتابییەکانم ئەم زیرەکییەکی بێوێنە و چاوێکی وردەکاری هەبوو. دەردی خۆمم بردە لای و گووتم «کارمەندی زیرەکم، من ماوەیەکی درێژە بە دەست دەردێکی سەختەوە دەناڵێنم، خەو و خۆراکی تاڵکردووم، من لێت ناشارمەوە لە مێژە لەوە بێزاربووم تا مردن کار بۆ حیزب بکەم، دەمەوێت ڕاستبمەوە و بکەومە سەر قاچی خۆم و هەستبکەم ڕۆحی خۆم هاتۆتەوە دەستم و چیتر وەک بیست ساڵ لەمەوبەر گیانم بارمتە نییە و دیلی ئەم واجیبە نیم. بەڵام هەر چییەک دەکەم هەستێکی ناخۆشم هەیە کە ئازاد نابم و شتێک هەیە بۆم تەواوناکرێت، گەرچی چەند ساڵە بە ڕۆحی ئەوەوە کاردەکەم، ئەم دەزگایە ماڵی منە، شوێنی منە، کەچی نا... ئەو هەستە بەرم نادات کە من بارمتەم و هەموو شتم بۆ کەسێکی دیکەیە ... چەند فێڵ لە خۆم دەکەم و دەڵێم چیتر کەسێکی حیزبی نیم،

بەڵام بۆم ناچێتە سەر و ئەو هەستە بەرم نادات کە بەڵێ من هەر سەر بەم حیزبەم و هیچ کات ڕزگارم نابێت لێی. دەمەوێت بگەمە ڕۆژێک ئینتیمام نەمێنێت، پاڵبدەمەوە و بڵێم ڕاستە من لە سەر ئەم کورسییە دانیشتووم، بەڵام ڕاستتان دەوێت من کەسێکی ئازادم... بۆ ناگەمە ئەو هەستە؟ بۆ ئینسان جارێک ڕۆحی خۆی دا بە بارمتە ئیتر بۆی وەرناگیرێتەوە؟ ئەوە لە یەکەم ڕۆژەوە تا ئێستا پرسیاری گەورەی ژیانم بووە و قفڵی سەر سندوقی هەموو هەستەکانمە». کارمەندەکەم گەرچی تەمەنێکی زۆری نەبوو، بەڵام قژی ماشوبرنج بووبوو، هەمیشە زەردەخەنەیەکی گەورە لە سەر لێوانی بوو، بۆ هەموو پرسیارێک ڕوونکردنەوەیەکی وردی هەبوو، دڵنیابووم کە دەزانێت باس لە چ جۆرە دوودڵی و ئازارێک دەکەم، گووتی «جەنابی عەقید، شتێکی ئاساییە، هیچ کات لەو مەسەلەیەدا ناگەیتە دڵنیایی، هۆکەشی وەها قورس نییە جەنابتان لێی حاڵی نەبن، لە سەردەمی شۆڕشدا حیزب ئاواتی هەبوو، دروشمی هەبوو، ئامانجی هەبوو، شتێکی هەبوو ئێمە کردبوومانە ئامانجی خۆمان. حیزب ئازارێکی گەورە بوو، هەموو سەر بەو ئازارە بووین، خۆ بیرتان نەچۆتەوە کە حیزب شەهید و پرسە و گریانی زۆری هەبوو. سروشتی ئێمە وەک شۆڕشگێڕ وەهایە، فرمێسک زوو ڕۆحمان پێکەوە دەبەستێتەوە. گەورەم ئەوە کاری فرمێسک بوو، دەمێک دەچووینە حیزبەوە، هەستماندەکرد لەگەڵ خەڵکانێکی تردا هاوبەشی ژانێکی قووڵ دەبین، ئازار بەشدەکەین و غەم پێکەوە گرێماندەدات. جەنابی عەقید ئەوسا وەتەن زامداربوو، هاواریدەکرد. ئەوکات تۆ دەتتوانی بڵێیت نا، من ناچمە ئەو پرسە گەورەیەوە، هۆیەک شک نابەم ببم بە هەڵگری ئەو غەمە، بۆ خۆم دەژیم و تەواو. ئەو کات گەر لە دەرەوەی حیزبدا بوویتایە بە ڕوونی دەتزانی، چونکە حیزب داوایەکی لێت هەبوو. بەڵام ئێستا نا، هەموو شتەکان گۆڕاون، حیزب داوای هیچ شتێکمان لێ ناکات، حیزب هیچ شتێکی لێمان ناوێت، هیچ فەرمانێکی نییە بۆمان جێبەجێبکەین... ئێستا شتەکە لەو مەجلیسی عاشقە غەمگینانەی کۆن ناچێت، ئێستا وەک ئاهەنگ وایە. کەس داوایەکی تایبەتی لە ئێمە نییە، هەموو دەتوانین ئەو

کارەبکەین کە دەمانەوێت، گەورەم، حیزب دەیەوێت ئەوپەڕی ئازادبین، لەزەت ببینین، خۆشی بچێژین، بەهێزبین، پارەداربین، ئەوە بکەین کە دەمانەوێت. ئەها، بۆچی سەرسامی جەنابی عەقید... ئێستا حیزب تەنیا ئەوەی دەوێت. دەمێک تۆ بۆ خۆت کاردەکەیت، بۆ خۆت چێژ دەبینیت، بۆ خۆت نەرم نەرم لە ناو شتەکاندا دەژیت، وادەزانیت ئازادیت، وادەزانیت ئەو بێباکییەت لە خۆتەوە هێناوە، بەڵام نا جەنابی عەقید ... ئەو ساتانەی تۆ تێیدا هەستدەکەیت ڕۆحت لە چنگی بارمتە دێرینەکە هاتۆتە دەر، هەمووی خەیاڵپڵاوە. ئەوە ئەو ساتەیە کە لە هەر ساتێکی تر تۆ زیاتر گرێدراویتەوە بە حیزبەوە. حیزب داوات لێدەکات وا هەستبکەیت کە چیتر تۆ ڕۆحلەبەرێکی ئازاد و سەربەخۆیت، ئەو ئازادییە فەرمانێکە لە فەرمانەکانی حیزب، بەڵکو گەورەم ئەوە تەنیا فەرمانێتی و جگە لەوە ئێستا فەرمانی تری نییە». قسەکانی کەمێک ڕایانچڵەکاندم، بۆ ئێستێک چاوم برییە چاوی، ئەو هەمیشە ئەو خەندە گەورەیە لە سەر لێوی بوو، خەندەیەک ڕێگر نەبوو لەوەی قسەی خۆی بکات و مەبەستە وردەکانی بپێکێت. هەمیشە بە شتێک لە حورمەت و ملکەچییەوە قسەیدەکرد، حورمەتی قوتابییەک زۆر لە مامۆستاکەی زیاتر دەزانێت، بەڵام بە شوێنی خۆی ڕازییە و بێدەنگ خزمەتدەکات. چاکەتێکی خۆڵەمێشی لەبەردابوو کە لە بیرم ناچێتەوە، گەڵێک جوان لەگەڵ ڕەنگی سەروسمێڵیدا دەگونجا. هەستم بە بێزارییەکی زۆر کرد، بە خۆم گووت «هەموو ئەو ئازادییەی ئەم ماوەیە هەستم پێکردوە، فەرمانی حیزب بووە... وای لە من وای». بێئۆقرە و دوودڵ لە ژوورەکەدا جێمهێشت، وەک دێوانەیەک بداتە کێوان، بۆ بیرکردنەوە ڕوومکردە دەشت و دەر، تا ڕۆیشتم و لە دەرگای ئاسایش چووم بەو دیودا هەموو وەک شێتێکیان دیبێت شپرزەیی منیان بینی و نەیاندەزانی چی نهێنییەکم هەیە، ئەم ماوەیە وا زوو زوو پەرێشان لە هەموو جێگایەک هەڵدێم و ئۆقرە بەخۆم ناگرم. هەستێکی ناوەکیم هەبوو کە قسەکانی ئەو کارمەندە ڕاستە و ئازادی من تەنیا دیارییەکە لە دیارییەکانی سەرۆکی بەخشندەم. وەک تەنهایەکی هەمیشە تەنها، بەرەو دەرەوەی شار ڕۆیشتم و قەدپاڵێکی چۆڵم دۆزییەوە، عاشقێک چۆن

سەیری خۆرئاوابوون دەکات، بەوجۆرە بەرامبەر ئاسۆ دوورەکان دانیشتم و غەمێکی قووڵ لە دڵمدا بوو. هەرچۆنێک بێت دەمویست چۆن سەردەمێک ئازادانە ڕۆحی خۆم بەخشیوەتە حیزب، هەمانشێوە ئازادانە وەریبگرمەوە، بەڵام شتێک لەو نێوەدا شکابوو نەمدەزانی چییە، شتێک گۆڕابوو دەرفەتی نەدەدا ئاسان بیمەوە بە وەفا ڕەفعەتە کۆنەکە و جارێکی تر هەست بە ئازادی ڕاستەقینەی خۆم بکەمەوە. دڵنیابووم ئێستا حیزب هێدی هێدی دەموچاوی نەماوە، حیزب چیتر ڕوخسارێکی نەبوو تا بیبەخشێت بە ئێمە. لە بەر ئەوە ئێمە چ دەمامکێکمان بکردایەتە سەر ئەوە دەبوو بە دەموچاوی ئەویش. شەو لە دەفتەری یاداشتەکانمدا شتێکم نوسی کە بۆ هەتا هەتایە لە یادمدا دەمێنێتەوە «حیزب بۆتە گەردێکی ورد، بۆتە بوونەوەرێک لە غوبار، بۆتە گەردیلەی ئاسک و لە هەوادا پەخشبۆتەوە، ڕوخسارێکی نەماوە، هەر کەسێکمان ئازادین چ دەموچاوێک هەڵدەبژێرین، باهیری بۆیە بە فەرمانی سەرۆک لێرەیە تا ئەو دەموچاوە بە ئەندامە بەرزەکان ببەخشێت کە چیتر حیزب نایبەخشێت، هەر یەکێک لە ئێمە ئازادین چ دەموچاوێک هەڵدەبژێرین، هەر دەمامکێک بکەینە سەر گرنگ نییە، حیزب هەموو دەموچاوەکان و هەموو ڕوخسارەکان قەبووڵدەکات، خۆی ڕوخسارێکی نییە بمانداتێ، هەر سەرێک دەنێیت بە سەرتەوە گرنگ نییە، سەری فیل یان سەری مشک، هەر ڕۆحێک دەکەیتە بەرت گرنگ نییە، ڕۆحی دڕندەیەکی بێباک یان ڕۆحی حەکیمێکی ئارام... هەموو شتەکان بۆ حیزب یەک شتن، حیزب فەرمانی پێکردوین کە ئازاد بین، مەستدەکەم ئەوە نهێنی ئەو قێزە گەورەیەیە کە لە دڵمدایە. من ئێستا هیچ دەموچاوێکم نییە، هیچ دەموچاوێک، هەر دەموچاوێک دەیکەمە سەری خۆم زوو دەبێت بە دەموچاوی ئەو. هەتا ڕۆژێکیش کە یاخی دەبم، ڕۆژێکیش کە چەک لە دژی هەڵدەگرم، یاخود حیزب دەمگرێت و لە تاریکترین زیندانی خۆیدا دەمرزێنێت، هیچ کات بۆم ڕۆشن نییە و ڕۆشن نابێت کە لە حیزب چوومەتە دەرێ یان نا، چونکە حیزب هیچ شێوە، هیچ ڕەنگ، هیچ قاڵبێکی نییە بزانین لە چی دەچێت تا بتوانین لەو نەچین».
ئەوە ئەو ساتە ترسناکە بوو کە هەستمکرد بێڕوخساری حیزب وایکردوە

من هەر ڕوخسارێک بپۆشم بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەو دەیبات بۆ خۆی و دەیدزێت لێم، ئێستا من شتێک نەبووم کە حیزب بیەوێت شێوە و مانا و وەزیفەم بداتێ، بەڵکو حیزب شتێک بوو من هەر چییەکم هەڵبژاردایە دەیکرد بە شێوە و مانا و ڕوخساری خۆی. کە دیلەکانم دەگرت، حیزب لەگەڵمدا دیلەکانی دەگرت، کە دیلەکانم بەردەدا حیزب لەگەڵمدا دیلەکانی بەردەدا، کە قێزم لە هەموو شت دەکردەوە، حیزب لەگەڵمدا قێزیدەکردەوە، کە هەستمدەکرد ئازادم، ئەویش لەگەڵمدا هەستیدەکرد ئازادە، کە هەستمدەکرد من خودام، حیزبیش لەگەڵمدا هەستیدەکرد خودایە، کە هەستمدەکرد من جرجم، حیزبیش لەگەڵمدا هەستیدەکرد جرجە ... خودایە، خودایە بۆ یەکەمجار تێدەگەیشتم ئێستا فریشتەکەم ڕۆیشتووە و لە بری ئەو هیولایەکی بێڕەنگ، بێشێوە، بێبۆن، بێئامانج و بێداوا هاتۆتە جێگای، حیزب ئێستا لە هیچ جێگایەک نەبوو لە ناوەوەمدا نەبێت، هەر ڕێگایەکم بگرتایە هەر دەیبردمەوە بۆ ناو خۆی... ئەو بەوە کۆنترۆڵیکردبووم کە ڕەنگی خۆی وەک ڕەنگی من لێبکات.

لەویادا بۆ یەکەمجار هەستمکرد کە تەنیا بەشێکی من کە حیزب داگیری نەکردوە، وەفائیلی فریشتەیە، ئەوە تەنیا بەشی منە کە نە بە من، نە بە خوداکان، نە بە حیزب ڕام نەکراوە و نەدۆزراوەتەوە. ئەوە ئەو ساتەبوو کە تێگەیشتم گەر منێکی ڕاستەقینە بوونی هەبێت، ئەو فریشتەیەیە، ئەو بوونەوەرەیە کە من دیلمکردوە و خستوومەتە زیندان. لەو ساتەدا هەموو هەستەکانم بە جۆری کیمیایەکی ڕەش و سەیر تێکەڵدەبوون، بە سەرێک دەمویست کتێبێک بنوسم کە هەموو کتێبەکانی وڵاتەکەی لەگەڵدا لە خنکان ڕزگاربکەم، بە سەرێکیش دەمویست بگەمە جێگایەک ئەو گەمەیەی حیزب هەڵوەشێنمەوە کە بە هەموو ڕێگایەک ئێمەی دەستەمۆکردەوە، لەو ساتەدا بڕیارمدا یاخی ببم... بۆ هەتا هەتایە یاخی ببم، بەڵام تادەکرێت نهێنی ئەو یاخیبوونەم لە هەموو مەخلوقێک بشارمەوە، هەتا لە وەفائیل، لە کارمەندە زیرەکەکەم، جگە لە ئاسمانی کچم نەدەبوو هیچ کەس گوێی لێم بێت کاتێک ئەو نهێنیانە دەدرکێنم. بڕیارمدا ئەو بەشە لە ژیانم لە

دەفتەری یاداشتەکانیشدا نەنوسمەوە و تەنیا هەڵیگرم بۆ ئەو ڕۆژەی کتێبی هەرە گەورەی ژیانم دەنوسم، کتێبێک ئێستا لە بەردەستی ئێوەدایە و دەیخوێننەوە.

شەوی دواتر بێئەوەی هیچ کەس بزانێت، چوومە سەر ڕێگای باهیری، دەمزانی کەی لە شوێن کارەکەی خۆی دێتە دەرێ، خۆم لە ماشێنێکی بێ ژمارەدا شاردەوە و لە کوچەیەکی نزیکی ماڵی خۆیدا چاوەڕوانمکرد. نزیکی سەعات یازدەی شەو بوو کە بە خۆی و هۆندا سپییەکەیەوە دەرکەوت. بواری یاریکردن و هەڵەکردنم نەبوو، پێشم لێگرت و سڵاوم لێکرد و وەستانم، دیاربوو بینینی خەڵکی زۆر زەینی کوێرکردوە، منی نەناسیەوە. پێمگووت بوەستە من عەقید جەنگیزی بەڕێوەبەری ئاسایشم، کە وامگووت زیاتر گەشایەوە و هەستی بە ئەمان و دڵنیاییکرد، سڵاوێکی گەرمی لێکردم و بە ڕوویەکی زۆر خۆش گووتی «وای حەزرەت، دەنگوباستان، شەوێکی خۆشە حەزرەت»، دابەزی و بە ڕوویەکی خۆشەوە لێم نزیکبووەوە، هێشتا سێ تا چوار هەنگاوی مابوو بگاتە لام، دەمانچەکەم دەرهێنا و بێئەوەی دەستم بلەرزێت، بەو پەڕی بڕواوە، بەو پەڕی جێگیری و سەقامگیری ڕۆحەوە، وەک کەسێک بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا کارێک بۆ خۆی بکات، یەکەم گوللەم نا بە سەرییەوە، یەکەم فیشەک بەر لووتی کەوت و لە جێگایەکی نادیارەوە سەری پێکا. خولی خوارد و کەوت، بێئەوەی لە ماشێنەکەم بێمە دەری، هەر لەپەنجەرەکەوە دەستم کێشا و سێ گوللەی ترم نا بەسەریەوە، کە نزیک لە دەرگای دواوەی ماشێنەکەمدا دای بەزەویدا. ئەوە یەکەمجاربوو دڵنیابم کارێک بۆ خۆم دەکەم، دەمانچەکەم بردە دواوە و تفێکم کردە لاشەکەی و بە خێرایی دوورکەوتمەوە، ئەوە سەرەتای دەستپێکردنەوەی من بوو، سەرەتای لەدایکبوونەوەی وەفای ڕەفعەت بەگ بوو، دوای زیاد لە بیست ساڵ، هەستمکرد دەگەڕێمەوە بۆ لای خۆم، بۆ ئازادی خۆم. گرنگ نەبوو لام وەفائیل چۆن سەیری ئەم تاوانەم دەکات، من مرۆڤم و فریشتە نیم و بۆم گرنگ نەبوو فریشتەکان دەڵێن چی، جگە لەم ڕێگایە ڕێگای تر نەبوو

لەم دونیایە بە ڕاستی یاخیببم. دڵنیابووم پیاوێکم کوشتووە دەموچاوی درۆزنی دونیایەکە خەریکە دەمخوات. ئەوە ئەو تاوانە بوو کە حیزب نەیدەتوانی بیکات بە گوناهی خۆی و لێی ببورێت، لەو ساتەدا کە بە خێراییەکی شێتانە لێمخوڕی و دووریکەوتمەوە، هەستمکرد ئەو خوێنە دەرگای هەرە گەورەی ئازادی من بوو، هەوڵێکی دیکەی گەورەم بوو بۆ وەرگرتنەوەی ڕۆحی خۆم... خۆشحاڵبووم، بەختەوەربووم و هاوارمکرد «تف لە تۆ ئەی باهیری».

## چیرۆکەکەی ماکوان

## «دەربارەی سووتانی کەشتیی فریشتەکان»

ماکوان بەر لە کۆتایی دانیشتنەکە، ماوەیەکی درێژ سەری داخست و گریا، چەندین جار داوای لێبوردنی لە دکتۆر کرد و دیسان گەڕایەوە بۆ ئەوەی بڵێت «گەر ئەم شارە بەجێ نەهێڵیت ناچارم بتکوژم». ماکوان بەر لەوەی بڕوات، گووتی «دکتۆر بە دەست تۆیە من ببم بە پیاوکوژ یان نا ... گەر بڕۆیت و لەم شارە نەمێنیت، من ڕزگارم دەبێت. بڕۆ لێرە مەمێنە». دکتۆر دەستی گرت و گووتی «بۆ کوێ بچم، جێگایەکم نییە بڕۆم. دوای ئەوە من پیاوێکم چوومەتە تەمەنەوە، گەنجێک نیم بتوانم لە هەر جێگایەک بمەوێت سەر لە نوێ دەست پێبکەمەوە، ئەم شارە نەبێت هەموو شارەکانی تری دنیا تەنگن بە بەرم، لە هیچ شوێنێکی تر ناتوانم دەست پێبکەمەوە، هەموو یادگارییەکانی ژیانم لەوماڵەدایە. دڵنیاشم ... دڵنیاشم تۆ پیاوکوژ نیت». دکتۆر نەیدەزانی بۆچی ئێستا لە ناکاو دڵنیایە ئەم کوڕە ناتوانێت بیکوژێت، لە دڵی خۆیدا گووتی، ڕەنگە ئەو هەستەم پەیوەندی بەو شتەوە هەبێت کە ناویدەنێم «گەمژەیی فەلسەفی». لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیابوو، دڵنیاییەک وەک ئەو کاتەی شەوان

دەچووە خەستەخانە و بڕوایەکی گەمژانەی هەبوو کە نەغەدە لە پێخەفەکەی ئەودا لەگەڵ کەسێکی تردا ناخەوێت. بەر لەوەی ماکوان بڕوات، دەستیگرت و پێیگووت «هەموو چیرۆکەکەم بۆ بگێڕەرەوە، بەڵکو ڕوونتر بیربکەمەوە و خێراتر بڕیاربدەم چی دەکەم... خۆ من گەر هیچ نەزانم باکم بە هیچیش نابێت، کوا مرۆڤی بێئاگا لە هیچ دەترسێت، ماکوان ... وریامبکەوە، ڕەنگە ئەوە هۆیەک بێت لەم شارە نەگریسە دووربکەومەوە و بڕۆم».

نا دکتۆر شوکاک لەوانە نەبوو بیر لە دوورکەوتنەوە و هەڵهاتن بکاتەوە، سەردەمێک کە لە باشوورەوە هاتەوە بۆ ئەم شارە، وای بەخەیاڵدا هات داوابکات بیگوازنەوە بۆ هەر شارێکی دی دونیا، هیچ نەبێت لە جێگاکانی تر خەڵک سەیری ناکەن و بە چپەوە بە یەک ناڵێن «ئەوە خۆیەتی، کابرایە کە ژنەکەی کڵاوی لەسەر ناوە». ئێستا بەرگەی دۆزەخی ئەم شارەی گرتبوو، ڕۆح و جەستەی لەگەڵ هەموو گەرمی و ساردییەکانیدا ڕاهاتبوو. کەسێکیشی لێ دەرچووبوو بێ نەخۆش و خەستەخانە نەدەژیا، نەیدەتوانی بیر لەوە بکاتەوە سەفەری دەرەوە بکات، زۆر ڕۆژ لەگەڵ هەموو چوست و چالاکییەکیدا هەستێکی تاڵی پیرێتی دایدەگرت کە وەک خۆی دەیگووت «هێندەی پەیوەندی بە دووبارەبوونەوەی بێمانای شتەکانەوە هەیە، پەیوەندی بە تێپەڕینی کاتەوە نییە». ماکوان گەنجێکی ترسناک بوو کە پڕ بوو لە هەستی ئاڵۆزکاو، بەڵام توانای بڕیاردانیشی نەبوو، گەر چیرۆکەکەی ماکوان ڕاست بێت، ئەمە دووەم جارێتی کە ناتوانێت دکتۆر بکوژێت، گەر سێیەم جاریش نەتوانێت، ئەوا ئیدی بۆ هەتاهەتایە ناتوانێت... نا دەبێت بڵێم کە دکتۆر بۆ یەک چرکەش دوودڵ نەبوو لەوەی کە ئەم شارە دوا جێگایە کە دەتوانێت تێیدا بژی. دکتۆر سۆزێکی نیشتیمانی بۆ شارەکە نەبوو، هەموو شتێکی ئەم شارەی بە مایەی شەرمەزاری و تووڕەیی دەزانی، زوو زوو دەیگووت «شاری چی، باشترە لە سەر خەریتە ناوی نەهێنن، نەبا غەریبێک بیدۆزێتەوە و ئابڕوومان بچێت» یان دەیگووت «شارەکە خۆی خەستەخانەیەکی

گەورەیە کە خەستەخانەیەکی بچوکیان لە ناوەڕاستدا دروستکردوە» یان دەیگووت «من ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بوومایە، شورایەکی قایمم بە دەوردا هەڵدەچنی، بۆ ئەوەی کەس لێرە نەڕواتە دەرێ و ئافەت و دەردەکانی ببات بۆ شارانی تر و خەڵکانی تر لە دونیادا تووشبکات» . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دکتۆر باوەڕی وابوو هەر مرۆڤە و دۆزەخی خۆی هەیە، خراپترین شتی مرۆڤ ئەوەیە دۆزەخی خۆی بە دۆزەخی ئەوانی تری بەراوردبکات ... بپرسێت دۆزەخی من باشترە یان دۆزەخی ئەو یاخود بیەوێت دۆزەخی خۆی بگۆڕێتەوە بە دۆزەخی کەسێکی تر. هەستیکرد ئەو هەموو ژیانی خەریکبووە تا ئەم دۆزەخەی بۆ خۆی دروستکردوە، ئێستا گەر بڕواتە دەرێ دەچێت بۆ کوێ. دواجار هەناسەیەکی هەڵکێشا و بەرەو لای ژووری دکتۆرەکان ڕۆیشت و بەدەم ڕێگاوە گووتی «مرۆڤی ئاوارە ئەو کەسەیە کە دۆزەخی خۆی لێ ونبووە». دکتۆر ئەوەی بە ڕاست بوو، بڕوای تەواوی بوو گەر لێرە بچێتە دەرێ دۆزەخی خۆی لە دەستدەدات. ئێستا ئینتیمایەکی بەهێزی بۆ ئەو دۆزەخە هەبوو، نەوەک بۆ ئەم شارە. کە گەیشتە نزیکی ژووری دکتۆرەکان، هەستی بە غەمێکی تیژ و کوتوپڕکرد کە لە ئازارەکانی نەغەدەوە هەستی پێ نەکردبوو، غەمێک بەرچاوی مرۆڤ تاریکدەکات، لەشی خاو دەکاتەوە و خەریکە دڵی دەهێنێتە دەرێ. بیری لە هەموو قسەکانی ماکوان کردەوە، غەمێکی سەیر بۆ مەهدائیل و ڕێزانی مەلەکبین دایگرت، زۆر بیری مەهدائیلی کرد... تاکە هاوڕێی ڕاستەقینەی بوو. بەرلەوەی بگاتە ژووری پزیشکەکان ڕووی وەرگێڕا و گەڕایەوە و خۆی کرد بە ژوورە بچکۆلە و تایبەتییەکەی خۆیدا، وەها سەری دانەواند تا کەس نەیبینێت کە دەگری. کە گەیشتە ژوورەکەی، دەرگاکەی داخست و سەری خستە سەر مێزەکەی و دایە پرمەی گریان و وەک منداڵێکی بێچارە، گووتی «بۆ خودایە، بۆ ... ئێمە چیمان کردوە». وەها گریا خەریکبوو ڕۆحی لەگەڵ فرمێسکەکاندا دەرچێت. هەموو ژیانی هەستی بە لاوازیی کردوە، هەموو ژیانی لە هەر جێگایەک بووبێت کەسێک بووە لە پەراوێزدا، هەموو ژیانی هەمیشە لە دەرەوەی ئەوانی تر ژیاوە... دکتۆر بیری نایەت

چەند گریا، چەند سەعات، بەڵام زۆر گریا، بە جۆرێک نزیکدەبووەوە لە سنووری ڕۆحکێشان. یەکەمجاری بوو بەو جۆرە بگری، وەک ئەوەی ئەو هەموو ساڵە چی لە ڕۆحیدا کۆبۆتەوە یەکجار بە لێشاوێکی ترسناکی فرمێسک بێتەدەرێ. دوای ئەوە، دکتۆر لە سەر مێزەکەی خەوی لێ کەوت، چەندین سەعات وەک بێهۆش سەری لە سەر مێزەکە دانا و لەگەڵ خەویشدا دەگریا و فرمێسک تک تک لە چاوانی دەڕژانە خوار. خەوتبوو کە یەکێک لە کچە سستەرەکان دەرگاکەی کردەوە و بینی دکتۆر بە خەوتوویی دەگری. کچەکە لە دڵی خۆیدا گووتی «بۆ ژنە کۆنەکەی دەگری». بە ئەسپایی کچێکی تری بانگکرد و گووتی «وەرە سەیرکە، دکتۆر خەوتووە و لە خەویدا دەگری»، ئەویش سستەرێکی تری بانگکرد و بەو شێوەیە تا بوون بە دەستەیەک، تا چەند پزیشکێکی دیش پێیانزانی و هەموو هاتن... سەیریان لێهات دکتۆر لە خەویدا بەوجۆرە و بێوچان فرمێسک دەڕێژێت. دواجار، دکتۆر جەلال ماردینی، بەڕێوەبەری خەستەخانە، لەوێوە تێپەڕی و هات بزانێت چ باسە. سەیری لێهات هەمووان لە نزیکی ژوورەکەی دکتۆر شوکاکەوە کۆبوونەتەوە، دواجار ئەویش لە سەرەخۆ هاتە سەر دکتۆر و بینی بە کوڵ لە ناخەوە دەگری. هەموو بینیان چۆن دکتۆر جەلال چاوانی پڕدەبن لە فرمێسک، چۆن وەک چەقۆیەک لە دڵی درابێت باوەش بە دکتۆر شوکاکدا دەکات و دەستدەکاتە گریان و دەڵێت «بمبەخشە کوڕم». گریانەکەی هێندە لە کوڵە سستەرەکانی تریش دەخاتە گریان. لە ناکاو هەموو دەگرین، لە ناکاو هەر کەسێک دێت و سەیری شوکاک دەکات، دڵی پڕدەبێت و دەداتە پرمەی گریان. ئەوە ئەو ساتەیە کە دکتۆر شوکاک لە خەستەخانەدا بەرزدەبێتەوە بۆ پلەی پیاوچاک و قەدیسەکان، بۆ وێنەی ئەو مەسیحە غەمگینە تێکشکاوەی واز لەوە ناهێنێت بەرگری لە مان و ژیانی ئەوانی تر بکات. دکتۆر وەک ئەوەی لاشەیەک بێت و بگری، فرمێسک و باوەشەکەی دکتۆر جەلالیش وریای نەکردەوە. بێئاگا لەوەی لە ساتێکدا هەموو هاوڕێکانی بیمارستانی، هەموو ئەو مرۆڤانەی کە بە درێژایی ژیانی ئازاریان داوە، بە کۆمەڵ بۆی گریاون، دەمە و ئێوارەیەکی درەنگ لە سەر ئازاری ناخی

خۆی بە ئاگاهاتەوە و بێئەوەی هیچ بکات و هیچ بپرسێت، بیمارستانی بەجێهێشت و گەڕایەوە ماڵ.

ڕۆژانی دواتر تاکە خولیای ئەوەبوو ماکوان ببینێتەوە، هەستێکی ناوەکی قووڵ پاڵی پێوەدەنا دوای سەربورد و چارەنوسی ڕێزانی مەلەکبین و مەهدائیلی هاوڕێی بکەوێت. دوو شەو بێئەوەی سڵ لە هیچ شتێک بکاتەوە، دەچێتەوە ناو وێرانەی کەشتیی فریشتەکان، هێز و تینی ئەو ئاگرە گەورەیەی هەموو شتێکی سووتاندوە سەرسامیدەکات. تەواوی کەشتییەکە لە کۆتەرە دارێکی سووتاو دەچوو کە دواتر بارانێکی لە ئاگر نەگریستر تەڕیکردبێت، سەیری لێدێت بولبولیار لە ئاگری وەها ڕزگاری بووە. هەفتەیەک بەسەر بینینەکەی ماکواندا تێناپەڕێت، جارێکی دی سوار ماشێنەکەی دەبێتەوە و دەچێت بۆ لای. دەیەوێت هەموو شتێک بزانێت، ماکوان بە بینینی تووشی شپرزەییەکی دەرونی دەبێتەوە، وەک ئەوە وایە دکتۆر هەموو ئەو شتانەی بیربخاتەوە کە لێیان هەڵدێت و نایەوێت بیریان لێ بکاتەوە. ماکوان لە ترسی ئەوەی کەس دکتۆر شوکاک لای ئەو نەبینێت و هەواڵەکە بباتەوە بۆ تاقم و دەستەی باوکی، پەیمان دەداتە دکتۆر، شەو درەنگ لە ماڵەوە سەردانیبکات. دکتۆر لەگەڵ هەموو ترسە شاردراوە و ئاشکراکانیدا، شەو دەرگا لەم میوانە دەکاتەوە کە پێدەچێت چیرۆکی بایەخدار دەربارەی هاوڕێکانی بزانێت. خواستی دکتۆر بۆ زانینی ئەو چیرۆکانە لە خواستی ژیانی گەورەترە، ماکوانیش بەدوای ئەوەوەیە نەبێتە پیاوکوژ... هەموو شتێک خەرجدەکات و هەر ڕێگایەک دەگرێتە بەر، بە مەرجێک ئەو قوربانییەی باوکی بۆی دیاریکردوە دووربکەوێتەوە و لێرە نەمێنێت، بە دکتۆر دەڵێت، گەر ناچاریی نەبێت، هیچ کەس نابێتە پیاوکوژ. گەر دکتۆر خۆی ونبکات دەتوانێت بڵێت کوشتوویێتی و لاشەکەی سووتاندوە و پاشماوەکەی شاردۆتەوە، بەڵام گەر دکتۆر نەیەتە ژێر بار، ئەوا تاوانێک لە بەردەمیدایە و هەر دەبێت جێبەجێیبکات. ماکوان لەوانەیە کە هێزی مرۆڤ کوشتنی نییە، گەرچی کوڕێکی بەهێز دیارە، گەر وردیش لێی وردبیتەوە کەمێک دڵڕەق دەنوێنێت، بەڵام ئەو سیفەتانە بارتەقای

ئەوە نین هێزی کوشتنی پێببەخشن. کە شەو درەنگ لە دەرگای ماڵی دکتۆر دەدات، دڵی وەک باڵی باڵندە چکۆلەکان دەلەرزێت، دەترسێت باوکی بەم سەردان و نزیکییەی نێوان ئەو و شوکاک بزانێت، ئەمجارە جگە لە خۆی هیچ کەس ئاگاداری هاتنەکەی نییە، دەیەوێت هەموو ڕەنجێک بدات دکتۆر بخاتە سەر کەڵکەڵەی سەفەر. هەستێکی ئاڵۆز و بێناو پاڵی پێوەدەنێت هەموو شتێک بۆ دکتۆر باسبکات، بڕوابوونی بە دکتۆر، تەنیا وەک بڕوابوونی جەلاد نییە بە قوربانییەکەی، بەڵکو پتر لە پاڕانەوەی کەسێکی گیاخۆر دەچێت، کە برسێتی ناچاریدەکات گۆشتی گیانلەبەرێک بخوات، بەڵام لە باڵندەکان دەپاڕێتەوە بفڕن تا ئەم دەستی پێیان نەگات. ئەو شەوە هەموو چیرۆکی سووتانی کەشتییەکە لە بنەوە دەگێڕێتەوە و ئومێدی وەهایە کە تێگەیشتنی دکتۆر لەم چیرۆکە لێرە دووریبخاتەوە.

چیرۆکەکە وەک ماکوان مەهدی دەیگێڕێتەوە بەمجۆرەیە:

دوای ئەوەی مەلا ئەرسەلانی عەسکەری یاداشتێکی نهێنی دەدۆزێتەوە، کە بیرەوەری پیاوێکە بە ناوی حاجی ئیسماعیلی شەیتانکوژەوە، بەپێی وەسفەکان و نەخشەکان، کەشتیی فریشتەکان لەلایەن ئیماندارانەوە دەدۆزرێتەوە و شوێنەکەی دیاریدەکرێت. لە یاداشتەکانی حاجیدا بە درێژیی باس لە هەندێک ئەعوانی باڵداری ئیبلیس کراوە کە تەنیا هەندێک لە ئیمانداران دەیبینن. مەلا مونزیر هەموو یاداشتەکەی حاجی مەلەککوژ بە وردی دەخوێنێتەوە و تێدەگات ئەم شارە لە مێژە نیشتەجێی شەیتانە باڵدارەکان بووە. وەسفی وردی حاجی بۆ کۆشکی مەلەکبین و موڵکە گەورەکەی، سەرنجی مەلا زۆر ڕادەکێشێت، هەم کینەئامێز و هەم ئەدیبانە و وردەکارە، لە شێوەی پەیامێکی نهێنیدا بۆ ئیماندارە دڵسۆزەکانی داهاتوو نوسراوە. سەرەتا مەلا مونزیر واتێدەگات چیرۆکەکە ئاماژەیە بۆ شوێنێکی دێرین و سەربوردێکی کۆن و بەسەرچوو، لەو باوەڕەدا نییە ئەم چیرۆکە پەڕیبێتەوە ئەم سەردەمە و خودی مەهدائیلی فریشتەش نیشتەجێی ئەو کۆشکە کۆنە بێت. هەندێک پرسیار دەربارەی کەشتییەکە

دەکەن و ئەوەیان بۆ ڕوونده‌بێتەوە کە جگە لە ڕێزانی کچی حاجی ئیسماعیلی مەلەکبین، هەندێکی دیش بە ناوی باغەوانەوە هاتوچۆی شوێنەکە دەکەن، ماوەیەک چاودێرییەکی چەند ڕۆژە دەخاتە سەر ماڵەکە، بەڵام چاوەدێرکەران جگە لەوەی کوڕێکی گەنجی نەناسراوی زۆر هەژار دەبینن هاتوچۆی ئەوێ دەکات، شتێکی گرنگ و گوماناوییان دەست ناکەوێت. وەک ماکوان دەگێڕێتەوە، ئەو دەم کە کەشتیی فریشتەکان یەکەمجار دەکەوێتە بەر سەرنجی جەمعییەتی دوژمنانی شەیتانەوە، جەمعییەتەکە لە مێژە چالاکە و لە هەر جێگایەک ئەو شەیتانە باڵدارانە ببینرێن بە خراپترین جۆر دەکوژرێن. تا ژمارەی مەلەکە کوژراوەکان زۆرتربن، مەلا مونزیر و مەلا ئەسعەدی ئاشنایان و مەلا ئەرسەلانی عەسکەری بڕوایان بە کار و هەڵبژاردنی خۆیان زیاتر دەبێت. لەو نێوەدا مەهدی دەریایی شوێنێکی گرنگ و بایەخدار لە جەمعییەتدا وەردەگرێت، وەک یەکەمین کەسێک بۆتە مایەی ئەوەی ئیمانداران لە مەترسی گەورەی سەر ئیمانیان وە ئاگا بهێنێتەوە. مەهدی لە ژێر کاریگەریی بوونی لە ناو ئەو ئیماندارە توندڕەوانەدا دەگەڕێتەوە سەر هەوای گەنجی، دەمێک بە دوای کۆمۆنیستەکاندا تیپی پشکنینی پێکەوەدەنا و بۆیان دەگەڕا. وەک چۆن جاران بە ئارەزوویەکی ترسناکی حیزبییەوە شیوعییەکانی ڕاودەکرد، ئێستا هەمان ئارەزووی کردبووە بەری خودا و بە ناوی ئیمانەوە بۆ جەمعییەت کاریدەکرد. دڵسۆزی مەهدی جێگای سەرنجی مەلاکان بوو، ئەو بە جۆرێکی توند وەرگەڕا و ڕوویکردەوە خوداپەرستی، یەکەم کەس کە هێنایە جەمعییەتەکەوە کوڕەکەی بوو. سەرەتا ماکوان مەهدی تەنیا بە ناسینی شەیتان و خراپییەکانی فێرکرا، مەلا ئەرسەلانی عەسکەری کە قوتابی علومی شەریعەت بوو، پەروەردەکردنی گرتە ئەستۆی خۆی، بەڵام کوڕەکە هێندە بێمەیل بوو، لە ناویشەوە وەها بە خەیاڵاتی بێدینیانەی چنرابوو، مەلا ئەرسەلان زوو زانی کە کاری ئەم گەنجە سەخت و ڕێگای لەوە درێژترە ئەم بتوانێت کاتی پێویستی بداتێ و دوای بکەوێت. دوای دوو هەفتە، مەلا ئەرسەلان خۆی لە ژێر باری ئەو کارە دەرهێنا و خوێندکارە پڕ گومانەکەی بەخشی بە مەلا ساجیدی مزگەوتی سێ دەرگا،

کە بەوە ناودار بوو هیچ کەس وەک ئەو شارەزای شەیتان نییە. مەلا ساجیدیش، پاشماوەیەک دەرکیکرد ئەم کوڕە لەوانە نییە زوو بڕوا بە شتەکان بهێنێت، هەر زوو لە قسە و ناڕەزایی و بۆڵەبۆڵە بەردەوامەکانییەوە تێگەیشت ئەوەی هێناویەتە جەمعییەتەکەوە ترسی گەورەیەتی لە باوکی. گومانی مەلاکان لە ئیمانی ماکوان لە جێگای خۆیدا بوو، بەڵام مەلا مونزیر لەو باوەڕەدا بوو کە لە جەمعییەت کاریان بە هەموو کەس هەیە، هەتا گەر ئیمانیشی «وەک خۆی دەیگووت»، بە وێنەی سەهۆڵی سەقەر ڕەق نەبێت. ئەوکات کە ماکوان لە بەردەستی مەلاکاندا ئەم ئوستاد و ئوستادی دەکرد، تازە بە تازە دەستیان دابووە ڕاوە فریشتە، هێشتا نەکەوتبوونە سەر کەڵکەڵەی کوشتنی کەس، بەڵام مەلا مونزیر بەردەوام پێی لە سەر ئەوە دادەگرت کە بەو زوانە دەستدەکەنە پاککردنەوەی مەلەکبینەکانیش، چونکە ئەوەی ترسناکە خودی ئیبلیس نییە، بەڵکو ئەو کەسەیە کە ناوی لە خۆی ناوە موسڵمان و بۆتە عەون و مەدەدی ئەو. ماکوان گەرچی خوێندەوار و بە بەهرە نەبوو، بەڵام قسەزان و بەسەلیقە و وریا بوو. لەو کەسانە نەبوو کە پرسیاری دینی گەورەی هەبێت، بەڵکو پرس و غەمەکانی پتر لە چوارچێوەی کێشەی دونیایی بچوکدا قەتیس مابوون. مەلا مونزیر باوەڕی وابوو بۆ ئەوەی کوڕەکە ببەسترێتەوە و نەکەوێتە بارودۆخێک ڕۆژێک لە ڕۆژان زیانی بۆ ڕێکخراوەکە هەبێت، دەبێت بە شتێکی توند بەم ڕێکخراوەوە شەتەک بدرێت، دەبێت وابێت گەر ڕۆژێکیش بیری بۆ ئەوە چوو دووربکەوێتەوە، بە جۆرێک لە ئیشوکاری جەمعییەتەوە گلا بێت نەتوانێت خۆی وەک بێگوناهێکی پاکدامێن دەربخات. مەهدی دەریایی گەلێک لە کوڕەکەی نیگەران بوو، لەو کاتەوەی بووبوو بە کەسێکی ئیماندار، بووبوو بە باوکێکی غەمخۆریش کە دەیویست کوڕەکەی ڕێگای بەهەشت بەرنەدا، یاخود بڵێم هێندەی غەمی ئەوەی بوو ماکوان لەو دونیا چۆن دەیگوزەرێنێت، ئەم دونیای بۆ گرنگ نەمابوو. بێمەیلی کوڕەکەی لەگەڵ زانستە دینییەکاندا و نەبوونی جۆش و خرۆشی کار، باوکی تەواو بێتاقەت و وەڕزکردبوو، بیرۆکەی بەشداریکردن لە کردە گەورەکانی

جەمعییەتدا بیرۆکەی مەهدی دەریایی بوو، دەیویست کوڕەکە لە سەرەتاوە لەگەڵ مێژووی ئەم جەمعییەتەدا گەورە بێت و بە بەشێک لە ژیانی خۆی بزانێت. باوکان زۆرجار دەتوانن ئەو شتە لە کوڕەکانیان دروستبکەن کە دەیانەوێت. کاتێک کوڕەکە لە بواری علومی دینیدا نەچووە پێشێ، بڕیاریاندا بە جۆرێکی تر سوود لە ئەندامێتی وەربگرن. سەرەتا لە ژێر چاودێری مەلا مونزیر و مەهدی خۆیدا شێوەی بەکارهێنانی چەک فێربوو. کە چیرۆکی کەشتیی شەیتانەکان هاتە پێشێ، تازە ئەو مەشقە سەرەتاییەکانی خۆی تەواوکردبوو، مەهدی بەردەوام ئەوەی بە یادا دەهێنایەوە کە ئەو نابێت ڕێگای جارانی باوکی بگرێت و دەبێت لە سەرەتاوە بە ئیمان دەست پێبکات. ماکوان هەمیشە شتێکی کەمی لە قسەکانی بابی وەردەگرت و بەشە زۆرەکەی وەک قسەی پوچ و بێ حاسڵ سەیردەکرد. کەشتییەکە تەواو نەکەوتە ژێر چاوەدێری ئەندامانی جەمعییەت، تا شەوێک مەلەککوژێک بە دزییەوە بازیدایە ئەو دیو شورای کەشتی و لە گۆشەیەکەوە کەوتە پشکنین و لە باغی بەردەم کەشتییەکەدا مەلەکێکی گەورەی بینی. بە بینینی ئەو مەلەکە بێباکە لە ناو درەختانی ماڵی ڕێزان خاندا، کەشتییەکە کەوتە لیستی ڕەشەوە و ڕابوردووی دێرینیشی بۆ زیندووبووەوە. پێدەچێت سەرەتا خودی مەلا مونزیر ئەو مەلەککوژەی ناردبێت بۆ سۆراغ و کۆکردنەوەی زانیاری زۆرتر. دوای بینینی ئەو فریشتەیە جەمعییەتی مەلەکبینەکان کۆبوونەوەیەک سازدەکەن و بڕیاردەدەن پتر ماڵی ڕێزانی مەلەکبین بخەنە ژێر چاودێرییەوە. وادیارە دەستکردن بە چاودێری خەستی کەشتی تەنیا دوای گەڕانەوەی تەواوەتی مەهدائیلی فریشتە بوویێت بۆ ماڵ و وازهێنانی بێت لە گەڕانی شەوانە، چونکە گەر وانەبایە، چاوانی سیخوڕ بەسەر کەشتییەوە، هەر زوو دەیانبینی و دەیاندۆزییەوە «گەرچی لەو ڕووەوە کەس ناتوانێت تەواو دڵنیابێت». چەند شەوێک مەلەککوژەکان بە دزییەوە لە دیوارەکانی کەشتییەوە بازدەدەن و دەچنە ناو گۆڕستانەکەوە. لەوێدا چەندین وێنە لە کێلەکان دەگرن و دەیهێننەوە بۆ جەمعییەت. سەرەتا هیچ شتێک ڕوون نییە، کەس بە تەواویی لە مانای نوسراوەکان تێناگات، تا ئەو دەم

بیرۆکەیەکیان لە سەر ئەوە نییە، فریشتەکانی شار گۆڕستانێکی وەها گەورەیان هەبێت. بەڵام مەلەککوژە جاسوسەکان باس لە گۆڕستانێکی سەیر و گەورە دەکەن، باس لەو ناوە مەلەکوتیانە دەکەن کە لە سەر کێلەکان هەڵکەنراون. ئەوە خودی مەلا مونزیر و مەلا ئەسعەدی مزگەوتی ئاشنایان و مەلا ئەرسەلانی عەسکەری هاندەدات، شەوێکی تاریک و خاڵی لە تریفە سێ قۆڵی خۆبگۆڕن، جل و جبە داکەنن، وەک هەر دزێکی لێزان و بە ئەزموون بازدەنە ئەو دیو شورای کەشتییەکەوە. لەوێدا بە چاوی خۆیان گۆڕستانێکی نەناسراو و شاردراوە دەبینن، بینینی ئەو گۆڕستانە گەورەیە تووشی سەرسوڕمان و غەمگینییەکی قووڵیان دەکات، بوونی گۆڕستانەکە دەلیلێکی حاشا هەڵنەگرە کە شار بۆتە شوێنی لەشکری ئیبلیس. ئەوان بێدەنگ بە لایتێکی بچوکەوە یەک یەک سەیری هەموو کێلێک دەکەن، تا لە ناکاو هاواری ژنێک لە دوورەوە بە دەنگێکی ترساو وریاباندەکاتەوە، دەنگەکە وەک بگری، دەپرسێت «هێی ئێوە کێن و چیتان دەوێت؟». لەگەڵ بیستنی دەنگەکەدا لایتەکانیان دەکوژێننەوە و لە سەر سیاجەکانەوە بازدەدەن و دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان. پێدەچێت ئەوە دەنگی ڕێزانی مەلەکبین بووبێت، دەمێک بۆ یەکەمجار دڵنیادەبێت بوونەوەرانێکی غەریب دزەدەکەنە کەشتییەکەوە و لە دوای شتێک دەگەڕێن. کاتێک مەلاکان دەگەنەوە ماڵی مەلا مونزیر، بنکەی سەرەکی هەموو چالاکییەکی گەورەیان، هەستێکی نائومێدیان هەیە. دەرهەق بە دینی موحەمەد، خۆیان بە گوناهبار و کەمتەرخەم دەبینن. چۆن ئەم هەموو ساڵە لە شارێکدا ژیاون بەوجۆرە پڕبووە لە ئەعوانی ئیبلیس و بێخەبەر بوون. ئەو شەوە تا بەیانی لە دیالۆگێکی لاهووتی قووڵدا سەبارەت بە مان و نەمانی مەلەک لە دیندا ڕووبەڕووی یەک دەبنەوە، دواتر تەواوی وردەکارییەکانی ئەو شەوە بۆ هەموو ئەندامانی جەمعییەتەکەش ئاشکرادەکەن، چونکە بەلایانەوە گرنگە ئیمانداران بزانن مەلەک گۆڕستانی نییە. بە بڕوای مەلا مونزیر، مەسەلەی مردنی مەلەک بەشێکە لە «ئەسراری غەیب» و ئادەمییەکان بۆیان نییە دەستی تێوەردەن و پرسیاری تێدا بکەن. بەڵام مەلا ئەرسەلانی عەسکەری کە

شارەزایەکی وردی وتەکانی پەیامبەر و دەقە قورئانییەکانە، پشت ئەستوور بەو ئایەتەی کە دەفەرموێت « كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ». دەڵێت کە بەڵێ مەلەک دەمرن، بەڵام مردنیان دەکەوێتە دوای ڕۆژی مەحشەر. هەرچی مەلا ئەسعەدی مزگەوتی ئاشنایانیشە لە مردنی مەلەک بە گومانە، دەڵێت لە چەندین ئایەتی موبارەکدا، جۆرە قسەوباسێک لە نێوان فریشتەکانی خودا و ئەهلی دۆزەخ یان بەهەشتدا هاتووە، ئەو گفتوگۆ و ڕاز و نیازە نیشانەی ئەبەدییەت و نەمری مەلەکەکانە، ئەو چەند جارێک لە قسەکانیدا ئاماژە بەوەدەدات کە لە سورەتی غافر دا دەفەرموێت « وقال الذين في النار لخزنة جهنم ادعوا ربكم يخفف عنا يوما من العذاب قالوا أولم تك تأتيكم رسلكم بالبينات قالوا بلى قالوا فادعوا وما دعاء الكافرين إلا في ضلال . » یان ئەو سوورەتانەی باس لە بوونی فریشتە لە بەهەشتدا دەکەن وەک ئەوەی « جنات عدن يدخلونها ومن صلح من آبائهم وأزواجهم وذرياتهم والملائكة يدخلون عليهم من كل باب سلام عليكم بما صبرتم فنعم عقبى الدار». گەر مەلەک لە دۆزەخ پاسەوان بن و لە بەهەشت سڵاو لە ئیمانداران بکەن، کەواتە فریشتەکان ئەبەدیین و نامرن. بەڵام مەلا ئەرسەلان بڕوایەکی بەو بۆچوونە نەبوو، ئایەتەکە دەلیل نییە لە سەر ئەوەی مەلەک نامرن، چونکە ئەوە ناکۆکە لەگەڵ ئەو بنەما دینییە بەرزەدا کە تەنیا نەمری ناو گەردون، خودای تەبارەک وە تەعالایە. مەلا مونزیر بۆ ئەوەی هەر دوو بۆچوونەکە کۆبکاتەوە و وابکات قسەوباسی دینی خودی خودایان لە بیر نەباتەوە، دەڵێت بە تەفسیری عولەما، مەلەک گەر بۆ ساتێکیش بووە دەمرێت و زیندوو دەکرێتەوە، تا هیچ کەس گومانی لەوەدا نەبێت کە تەنیا مەخلوقی زیندوو کە نامرێت، خودای گەورە خۆیەتی. پێدەچێت ساتی مردنی مەلەکەکان بکەوێتە پێش نەفخی گەورەوە کە بۆ چرکەیەک «هەڵبەت چرکەیەک بە کاتی ئیلاهی، نەوەک کاتی بەشەری»، هەموو مەخلوقات و مەوجودات دەمرن و دواتر بە ئیرادەی یەزدان پێکڕا بۆ حەشر زیندوودەبنەوە. مەلا مونزیر گووتی ئەو تەفسیرەی لە کتێبی «روح المعاني» ئالوسییەوە هێناوە، بەڵام ئایا وابوو یان نا، دوو مەلاکەی تر شارەزاییەکی زۆریان لەو کتێبەدا نەبوو. لەگەڵ

ئەوەی گفتوگۆ دینییەکان تا بەربەیانێکی درەنگ بەردەوام بوو، بەڵام هەر لەیەک لە مەلاکان دەیانزانی، مەلەک گەر بشمرێت لە سەر زەوی نامرێت و گۆڕستانی لەوجۆرەی نابێت. بوونی جێگایەک لە سەر زەوی ناوی گۆڕستانی فریشتەکانی لێ بنرێت، نیشانەی کوفر و گومڕاییە و هیچی تر. مەلای مزگەوتی ئاشنایان کە لە هەر دوو مەلاکەی دی خەیاڵی فراوانتر و ڕقی لە ئیبلیس گەورەتر بوو، بە دووری نەزانی ئەم مەخلوقانە نەوەی «هاروت و ماروت» بن و ئەوان بە جۆرێک لە جۆرەکان لە کۆت و زنجیری ئەبەدی خۆیان تا ڕۆژی قیامەت پسابێتن و لە ناو جنسی بەشەردا زاوزێیانکردبێت. بەڵام مەلا ئەرسەلانی عەسکەری توند دژی وەستایەوە و گووتی، تاوانبارکردنی هاروت و ماروت و بڕواکردن بە خورافاتی درۆزنان پیشەی ئێمە نییە، هاروت و ماروت وەک لە قورئانی پیرۆزدا ناویان هاتووە، مەلەکی گومڕا نین و لە بابل گیرۆدەنەبوون، بەڵکو بەپێی فەرمانی باری تەعالا هاتوون تا خەڵکی بابل لە داوی ئەو سیحربازانە ڕزگاربکەن کە دوای سلێمان پێغەمبەر کەوتبوونە نیفاق و پەیامی پاکی ئەویان کێشابووە ژێر گومان. دیالۆگی مەلاکان تا وردترین و پڕ کێشەترین چیرۆکە ئاینییەکان کشا و هەموو دیوە جیاوازەکانی ئەم چیرۆکەیان لە زەمانی خەلیقەتەوە تا ئەمڕۆ تاوتوێکرد. مەلا مونزیر بە داخ بوو لەوەی لە سەردەمێکدا دەژین کە ڕابەرێکی دینی وەها گەورە و مورشیدێکی وەها باوەڕپێکار بوونی نییە گومان و گلەیی خۆیانی ببەنە لا و تەفسیری کۆتایی ئەم ئەهریمەنبازییەی لا وەدست بهێنن. مەلاکان گەر بەدەستیانبایە و لەم دەوڵەتە زاڵمەی بەعس نەترسابان، لەم فیرعەونەی بەغدا سڵیان نەکردبایەتەوە، بەیانی جارچییان دەگرت و لە کوچە و کۆڵانی شاردا بانگی هاتنی شەیتانیان دەدا. ئەمە ئەو شەڕە بوو کە سێ ئیماندارەکە بە درێژایی ژیانیان چاوەڕوانیانکردبوو، جەنگی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئیبلیس خۆیدا، ئیبلیسێک هەموو مەکر و فێڵە ترسناکەکانی خستۆتە کار و ئەم شارە بچوک و چەپەکەی کردۆتە ئامانجی خۆی. بەڵام ئەفسوس، مەکری شەیتان زۆر گەورەیە، توانای لە سەر بەرجەستەبوون لە شێوەی مرۆڤدا ترسناکە. دواتر ماکوان هەموو ئەم چیرۆکانە و تەواوی

ئەم گومانانەی لە دەمی مەلای عەسکەرییەوە بیستەوە و هەموو شتێکی بە وردی بۆ شوکاکی حایر و سەراسیمە گێڕایەوە.

بۆ بیرکردنەوە لە کێشەی کەشتیی فریشتەکان، جەمعییەت بە ئامادەگی مەهدیی دەریایی دوو کۆبوونەوەی تر ڕێکدەخات. سەرەتا دەیانەوێت بگەنە قووڵایی کەشتییەکە و هەموو شتێک دەربارەی نهێنییە تاریکەکانی ناخی بزانن. هەوڵەکانی گەیشتن بە ناوەوەی کەشتی دەگاتە ئەوەی بیر لە کڕینی جێگاکە بکەنەوە، یاخود بە بیانووی کڕینەوە بەرەو ناو بیناکە دزەبکەن و ببینن. دووجار دەستەیەک لە جەمعییەتەوە دەچنە لای ڕێزانی مەلەکبین، بەڵام خانم ڕێگا بە پیاوەکان نادات ئازاد بە ماڵ و نیشتەجێی ئەودا پیاسەبکەن. ئەو هەموو شتێک دەزانێت و جگە لەوەی بە سەرسەختی پێشیان لێ بگرێت، ڕێگای تری لە بەردەمدا نییە. لەو سەردەمەدا ڕێزانی مەلەکبین بێئەوەی بیەوێت ترس و سام کارمەندانی کەشتییەکە پەکخات و فریشتەکان بخاتە سەر چاوەڕوانییەکی تاڵ، بڕیاردەدات خۆی بە تەنیا کەشتییەکە بپارێزێت. دواتر ڕووندەبێتەوە هۆی ئەو بڕیارەی سێ خاڵی گرنگە. یەکەم: باوەڕێتی بەوەی هەر کەسێکی تر لەم کێشەیەدا ناوی بکەوێتە سەر زاران بەدەستی مەلەککوژەکان تیادەچێت. دووەم: هیچ ڕێگە چارەیەکی ڕاستەقینە و ئاشکرا لەم مەسەلەیەدا نییە بیگرێتە بەر. سێهەم: کەشتیی فریشتەکان بە بوونی دوژمن و بێ بوونی دوژمن بەرەو کۆتایی دەڕوات. پێدەچێت ئەو بێدەنگییە لە دوو هەستی زۆر ناکۆکەوە هاتبێت، بە سەرێک لە هەستێکی زۆری توانا و هێزەوە، دووەم لە هەستێکی بێسنووریی بێهێزییەوە. هەردوو ئەو هەستەش گوشاردارن و دەیانکرێت مرۆڤ تێکبشکێنن، کاتێکیش بەمجۆرە تێکەڵدەبن، دەرەنجامی کوشندەیان لێدەکەوێتەوە. بە سەرێک ڕێزانی مەلەکبین بە جۆرێکی ترازیدی قەدەری کەشتییەکە دەبینێت و دەزانێت نغرۆبوون چارەنوسێکی چاوەڕوانکراوە و شتێکە خۆلادانی بۆ نییە، گەرداوێک لە بەردەمیدایە و دەزانێت ناتوانێت خۆی لێ لابدات، ئەوەش بێهێزی هەرە گەورەیەتی. بەڵام بە سەرێکی دیکە دەبینێت، ئاشکرابوونی

فریشتەکان درەنگ یان زوو مرۆڤ لە ناخی خۆی ئاگاداردەکاتەوە، مانەوەی ئەم چیرۆکە بە نهێنی و پێداگریی لە سەر خنکاندنی لە تاریکیدا هەموو ماناکانی دەکوژێت، دەبێت کەشتییەکە بخنکێت تا ببینرێت، بۆ ئەوەی ئەم چیرۆکە ئاشکرابێت، پێویستە بە جۆرێک لە جۆرەکان بە ناو کارەساتێک یان ڕووداوێکی گەورەدا تێبپەڕێت... هەموو حەقیقەتێکی گەورە پێویستی بە کارەساتێکی ترسناکە بە دونیای بناسێنێت. ئەوە ئەو ساتەیە کە تەواوی وڵات و مەملەکەتیش بە ناو تونێلی کارەساتی گەورە گەورەدا دەڕوات، جەنگ، ڕەشەکوژی، زیندەبەچاڵکردنی دەستەجەمعی، ژەهراویکردنی باغەکان و کێڵگەکان، خاپووركردنی دەیان هەزار هەکتار لە باغ و ئاوەدانی، بۆ ڕێزانی مەلەکبین هەر نیشانەی لێقەومان و کارەسات نەبوون، بەڵکو ئەو ڕێگایە بوون کە دەبوو حەقیقەت پێیدا بڕوات تا دەرکەوێت و ببینرێت، هەم حەقیقەتی جەلاد و هەم حەقیقەتی قوربانی. هیچ ڕاستییەکی گەورە نییە، بۆ ئەوەی دەربکەوێت، پێویستی بە کارەساتێکی گەورە نەبێت. نغرۆبوونی کەشتییەکە بەشێکە لە نغرۆبوونێکی ترسناکتر و گەورەتر کە ڕێزان خانی مەلەکبین بە ڕوونی لە چواردەوری خۆی دەیبینی.

ئێستا دوای زیاتر لە حەڤدە ساڵ کە چیرۆکەکەی ماکوان بۆ مستەفا شوکاک لێرەدا تۆماردەکەمەوە، کە دەیبەستمەوە بە هەموو بەشەکانی دیکەی ئەم کتێبە نەگریسەوە، گوێم لە دەنگی ترپەی دڵی ڕێزانی مەلەکبینە، دڵێک کە دەترسێت، شپرزەیە، تەنهایە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو سەرلێشێوان و لاوازیی و گەمارۆ گەورەیەدا، بە عەشقێکی سەیرەوە ڕووەو مەترسییەکی گەورە ڕادەکات و دەزانێت تاکە مانای هەموو ئەو شتانەی لە ژیانیدا بینیوێتی لە ناو ئەو مەترسییە گەورە و تاریکەدایە.

پێدەچێت خەڵکانی سەر بە جەمعییەتی دوژمنانی شەیتان لە ڕێگایەکی سەرەکییەوە زانیاری تەواویان لە سەر کەشتییەکە پەیداکردبێت، چیرۆکەکەی ماکوان بۆ دکتۆر شوکاک ئاماژە بە شێوازی مەلەککوژەکان دەکات بۆ بەدەستهێنانی زانیارییە تەواوەکانیان. خوشکەکەی مەلا

ئەسعەدی مزگەوتی ئاشنایان سەرچاوەی سەرەکی هەواڵەکانی جەمعییەت بووە. بە هەر ڕێگایەک بووە، مەلا ئەسعەد زانیویێتی خوشکەکەی مەلەکبینە، ئاخۆ خۆی ئەوەی درکاندوە یان مەلا ئەسعەد بە زیرەکی و تێبینی خۆی گەیشتۆتە ئەو دەرەنجامە، ئەوەیان کەس نازانێت، چونکە خوشکەکەی مەلا ئەسعەد لە ڕەوەکەوە تا ئەمڕۆ بێسەروشوێنە و چارەنوسی دیار نییە. مەلا هێندەی ئەو ڕاستییە دەربارەی خوشکەکە دەزانێت دەیخاتە ژێر ئەشکەنجەیەکی زۆرەوە، کچەکە دوای چەند ڕۆژ لێدان، توانای خۆی لەدەستدەدات و هەر شتێک دەربارەی فریشتەکان دەیزانێت دەیگێڕێتەوە، بەڵام پێناچێت لە دانپیانانەکانیدا زانیاری تەواوی لە سەر کەشتییەکە دابێت بە ئەسعەدی برای، وەلێ لە ژێر زەبری کوتەک و فەلاقەدا، دان بە کوفری خۆیدا دەنێت و پەیمان دەدات ڕووبکاتەوە ئیمانی ئاسایی. خوشکە بێوەژنەکەی مەلا، ئەوکات خاوەنی کۆرپەیەکی دوو ساڵانە دەبێت. دەمێک چیرۆکی کەشتیی فریشتەکان دێتە پێشێ، مەلا ئەسعەد پەیوەندی دێرینی نێوان خوشکەکەی و ڕێزانی مەلەکبینی دێتەوە یاد و بیئەوەی بە وردی بزانێت ئەو پەیوەندییە چ جۆرێک بووە و بۆچی بووە، خوشکەکەی دەکات بە کەرەستەی خۆی و دەڵێت شتێک بۆ خودای خۆت بکە، بەڵکو بتبەخشێت و لەو گوناهەت ببورێت دەمێک ڕۆح و جەستەی خۆت کردبووەماڵێک بۆ شەیتان. کچەکە دیسان لە ژێرباری ئازار و گووشاردا ئەوەی دەخرێتە بەر کە بڕوات و هەم ڕێزانی مەلەکبین بترسێنێت و هەم وێنەی کەشتییەکە بگرێت و زانیاری تەواو لە سەر سەرنشینانی بهێنێت. کچەکە دەچێتە لای ڕێزانی مەلەکبین و هەموو شتێکی پێدەڵێت، تەواوی چیرۆکی جەمعییەتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە و ئاشکرابوونی کەشتییەکەی بۆ باسدەکات، ئاخۆ بە ڕەزامەندی ڕێزان وێنەکانی گرتووە یان بە دزییەوە؟ ئەوە لەو نهێنیانەیە کە هیچ کات ئاشکرانابن. خوشکەکەی مەلا ئەسعەد بە خاتوونی کەشتیی دەڵێت، گەر ئەو شتانەی پێی ڕاسپێردراون نەیانکات، زیندەبەگۆڕی دەکەن. ئەوەشی بۆ ڕووندەکاتەوە کە ناتوانێت درۆبکات، چونکە گەر درۆکانی ئاشکرابن، مەلا ئەسعەدی برای نایبەخشێت و بە نیشانەی گەڕانەوەی شەیتانی

دەزانێت بۆ ناو جەستە و دڵی ئەو. بە حیسابی چیرۆکەکەی ماکوان، خودی ڕێزان ڕێگا بە خوشکی مەلا دەدات وێنەکان بگرێت، چونکە پێیوایە گرتن و نەگرتنی وێنەکان کاریگەرییەکی وەهایان نییە. لەو ماوەیەدا ڕێزان قۆناغێکی تێکچوون و سەرلێشێوانی گەورە دەژی کە لە ڕەفتاری ڕۆژانە و لە جوڵاندنەوە سەیرەکانی ناو پۆلی خوێندنیشدا دەردەکەون. بەپێی چیرۆکەکەی ماکوان، مەلەککوژەکان هەتا لە قوتابخانەش ڕێزان دەخەنە ژێر چاودێری بەردەوامەوە. ماکوان خۆی هیچ کات ئەو وێنانەی نەبینیوە کە خوشکی مەلا ئەسعەدی مزگەوتی ئاشنایان گرتوونی. چی تێدابووە؟ وێنەی فریشتەکانی لە سەر بووە؟ حەقیقەتی کەشتییەکەی وەک خۆی درکاندوە؟ ماکوان وەڵامی کۆتایی لا نییە و تەواوی قسەکانیشی تەنیا چیرۆکی ئەگەر و نەگەر بوون. وەک ماکوان دەیگێڕێتەوە، ڕاپەڕین و ڕووداوەکانی دواتر، دڵخۆشییەکی تایبەت بە ئەندامانی جەمعییەتەکە دەبەخشن، لەو ڕووەوە ئیتر دەتوانن ئاشکراتر و توندتر دژ بە دوژمنانی خودا دەست بە کارین. مەلا مونزیر بە ڕوونی بە هەموو ئەندامانی جەمعییەت دەڵێت ڕۆژ ڕۆژی ئیماندارانە و ئیتر ترسی سزای فیرعەونەکەی بەغدادمان نییە. لە ڕۆژانی دوای ڕاپەڕیندا، هەڵسوکەوتی مەلاکان دەگۆڕێت و ئاشکراتر دەکەونە قسەکردن لە سەر مەترسی هەمیشەیی شەیتان و جەنگی ئەبەدیی مرۆڤ لەگەڵ خراپەدا. مەلا مونزیر لە بەردەم قوتابی و موریدانیدا دەڵێت، ڕۆژی ڕاستەقینەی ئازادی ئەو کاتەیە هەموو موسڵمانان خۆیان لە گوناه و خراپەی شەیتان پاککردبێتەوە. ئازادی ئەوەیە ئیمان پێمانی ببەخشێ و لە ڕۆژی قیامەتدا گەردنمان ئازا بێت، نەوەک لەم دونیا دڵمان بەوە خۆش بێت کە ئازادی تەواومان بەدەستهێناوە. چەند ڕۆژێک دوای ڕاپەڕین، مەهدی بانگی ماکوان دەکات و پێیدەڵێت ئەمشەو کارێکی گرنگمان هەیە. ماکوان ڕقی لە هەموو کارە گرنگەکانی باوکێتی، بەڵام جگە لەوەی بێدەنگ بێت و ملکەچ بێت، چاری تری نییە. لەم دونیا شێواوەدا ماکوان نازانێت چی بڵێت، چی بکات، بڕیاری چی بدات... واهەستدەکات شێوانی دونیا و بومەلەرزە گەورەکانی سەردەم، پەڕیونەتە ناو ڕۆحی ئەو. ملکەچانە شەپۆلەکان چۆن ببیەن

وادەڕوات. شەو باوکی لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ ماڵی مەلا ئەرسەلانی عەسکەری، لە ڕێگا پێیدەڵێت بڕیارە ئەمشەو کەشتیی شەیتانەکان بسووتێنین، ئەو جێگایەی شوێنی ژیان و کۆبوونەوەی شەیتانە نالەبارەکانی شارە، نیشتەجێی ئەو جانەوەرەشە کە پێستی باوکی پۆشیوە و بە ناوی ئەوەوە وەک فریشتە لە سەر زەوی ئیمانداران فریودەدات. چۆن گەیشتۆتە ئەوەی کە مەهدائیل لەوێیە، ماکوان نازانێت، ئاخۆ خوشکی مەلا ئەسعەدی ئاشنایان ئەوەی بۆ باسکردوە؟ ئەوەش پرسیارێک و نهێنییەکی تایبەتە کە بەتەواوی ناتوانین بگەینە بنج و بناوانی. گرنگ ئەوەیە دەمێک مەهدی دەریایی لە هەفتەیەکی تەڕوتووشی مانگی ئازاری ساڵی ڕاپەڕیندا، دەچێت بۆ کەشتیی فریشتەکان، بە نیازی کوشتنی ئەو نیوەیەی خۆی دەچێت کە بە جۆرێکی ترسناک لێیدەترسێت. بە درێژایی ڕێگا بە دەنگێکی برسی و شادومان دەڵێت «دەبێت بیسووتێنم». قسەکانی وەک قسەی بوونەوەرێک وەهان لەگەڵ وێنەیەکی تایبەتی خۆیدا لە ئاوێنەدا قسەبکات، وەک مرۆڤێکی دوو کەرت نیوەی هەڕەشە لە نیوەکەی تری بکات. ماکوان سەیری لەو حاڵەتەی باوکی دێت، پێشتر وەها نەیبینیوە، بە جۆرێکی شێتانە توڕەیە و وەک لێبوکێکی گەمژەش دڵخۆشە، بەڵام تێناگات لە دژی کێ و لە چی توڕەیە و دڵیشی بۆ وا پڕ شادییە. ئەمشەو بە پێچەوانەی شەوەکانی ترەوە باس لە خودا ناکات، باس لە ئیمان ناکات، بەڵکو تەنیا باس لە سووتاندن دەکات، وەک هەڕەشە لە خۆی بکات، وەک باس لە سووتانی خۆی بکات. ماکوان هیچ کات بە تەواوی لە هەموو تان و پۆی ئەم چیرۆکە تێنەگەیشتووە، پێشی وایە هیچ کات تێناگات. شەو کە دەگەنە بەردەم ماڵی مەلا ئەرسەلان، حەوت کەسن، ماکوان و باوکی، مەلا مونزیر، مەلا ئەرسەلان، مەلا ئەسعەد، مەلا ناجی سەڵتەپۆش و مەلا ساجیدی مزگەوتی سێ دەرگا. ماکوان سەیری لێدێت کە بۆ ئەم کارەی ئەم شەو، هەموو سەران و میرانی ڕێکخراوەکە خۆیان هاتوونە سەر خەت. هیچ مەلەککوژێکی ئاسایی لە تیپەکەدا نییە... لە ژێر زەمینەکەی ماڵی مەلا ئەرسەلانی عەسکەری، هەشت دەبەی گەورەی بانزین دەردەهێنن و

دەیخەنە پشتی پیکابێکی دەبڵ کابینەوە و خۆیان دەچنە پێشێ و ماکوان بە تەنیا لە دواوە لە ناو بەنزینەکاندا سوار دەکەن. بۆ یەکەمجار دەبینێت کە سێ چەکیان پێیە، ئاشکرایە چەکی دەستکەوتی ئەم ڕۆژانەی دوای ڕاپەڕینە، کە تفەنگ و کەلاشینکۆفێکی زۆر لە بازاڕدا تالانفرۆش دەکران. بەپێی ماکوان بێت، نزیکی سەعات یەک و نیوی شەو گەیشتوونەتە بەردەمی کەشتیی فریشتەکان. بە خێراییەکی گەورە دابەزیوون، ئیشی ماکوان سەرەتا ئەوە بووە دەبە بانزینەکان بە بێدەنگی و خێرایی بگوازێتەوە بۆ ناو ماڵە گەورەکە. بە جوڵەیەکی بزێو و سەرسوڕهێنەر هەموو خۆیان دەکەن بەو جێگایەدا، بە ناو باغێکی کەمێک گەورەدا تێدەپەڕن، ماکوان سێ جار بە خێرایی دەڕوات و دێت تا بانزینەکان بگوازێتەوە، بۆ دووان لە جلیکانەکان مەلا ئەرسەلان کۆمەکی پێدەکات، کە دەگەنە ئەوێ، هەمووان بێدەنگی تەواو دەپارێزن. سەرەتا مەلا مونزیر و مەلا ئەرسەلان و مەلا ناجی سەڵتەپۆش خۆیان دەکەن بە قاتی خوارەوەدا. ماکوان و مەلا ساجید پێکەوە لە بەردەرگا بە تفەنگ و دەمانچەیەکەوە دەوەستن. هێند نابات دەبینن مەلا مونزیر ژنێکی بێهۆشی هەڵگرتووە و بەرەو دەرەوە تەکاندەدات. ئەوە یەکەمین بینینی ماکوانە بۆ ڕێزان خانی مەلەکبین، لە بەر تاریکی هیچ لە ڕوخساری خانم نابینێت. دەزانێت ئافرەتێکی بێهۆشە... نازانێت چۆن بێهۆشکراوە، بەڵام بێهۆشبوونی بە جۆرێک خێرایە، پێدەچێت بە زەبری پیاکێشانێکی توند یان بۆنێکی تایبەت بێت. ژنەکە توند دەمی بەستراوە، قاچی بەستراوە و دەستانیشی شەتەکدراون. بە خێرایی، خانمی بێهۆش دەگوێزنەوە ناو پیکابەکە و مەلا ساجید دەکەنە پاسەوانی، هەر شەش پیاوەکەی تر بە بانزینەکانەوە دەچنە قاتی سەرەوە. مەهدی سوورە لە سەر ئەوەی ماکوانی کوڕیشی بۆ ماڵی شەیتانەکان سەربکەوێت، بۆ ئەو جێگایەی بەچکە ئیبلیسە نەخۆشەکانی تێدایە. مەهدی ژوور بە ژوور دەگەڕێت و ماکوانیش لەگەڵ خۆیدا دەگێڕێت، بڕیارە هەر ژوورێکیان پشکنی بەنزینی پێدابکەن، بەڵام گردانی هەمووی کاتێک بێت کە خۆیان دێنە دەرێ. ئەوان هیچ نابینن، مەلەکبین نین، بەڵام دەزانن دەتوانن مەهدائیل ببینن،

مەهدائیل لەو فریشتانەیە کە هەموومان دەیبینین، هەموو ڕۆح لەبەریێک، ئەو، ئەو فریشتەیەیە کە بوونی فریشتەکان بۆ هەموومان ڕادەگەیێنێت. دواجار مەهدی لە هەموو ژوورەکاندا بەدوای مەهدائیلدا دەگەڕێت، تا دواجار لە ژوورێکی بچوکدا دەیدۆزێتەوە. ئێستا هیچی لەو مەهدائیلە بەهێزە ناچێت کە بەربەیانێک پەلاماری ئەویدا و خستی بە زەویدا و تلی پێدا و قۆلی بادا و شکستی پێهێنا. وەک ئامادەبێت بۆ مردن، وەک هەموو ژیانی چاوەڕوانی ئەو ساتەی کردبێت، وەک بزانێت کە مردنی فریشتەکان کۆتایی سەردەمێکە کە درەنگ و زوو دەبێت دوایی بێت، بێ هیچ بەرگرییەک دادەنیشێت و سەیری چاوە تورە و پڕ کینەکانی مەهدی دەریایی دەکات کە بە لەزەتێکی بێوێنەوە بانزینی بەسەردا دەڕژێنێت. ماکوان کە لە تەنیشت دەرگاکەوە وەستاوە و چاوی لەم بوونەوەرە زەبەلاح و گەورەیە بڕیوە کە هەر باوکێتی، هەر مەهدی خۆیەتی، مەهدییە بەبێ ئەو کینەیەی نێوچاوی، بێئەوەی وەک ئەو ترسناک بێت، بەڵکو بوونەوەرێکی هێمن و تێکشکاو و غەمگینە. هێزی ئەوەی نییە هاواربکات و بڵێت باوکە چی دەکەیت، هێزی نییە بڵێ ئەوە خۆتی، هێزی نییە بڵێ ئەوەی دەیبینیت هیچ نییە جگە لە ئاوێنەیەک کە بە جۆرێکی تر دانراوە، ئاوێنەیەک وێنەکەی دەبینین و شوشەکەی نابینین. ئەوە باوکی بوو، باوکی بوو لە ئاوێنەیەکدا، بەڵام چ ئاوێنەیەک؟ ماکوان نەیدەزانی. وەها واقی وڕ و شڵەژابوو، نەیدەتوانی دەمێک باوکی وەها بەنزین دەڕێژێت دەستی بگرێت... بەڵکو سەرسامبوو بەو خۆشییە گەورەیەی مەهدی کە بەوجۆرە خۆی دەسووتێنێت، هەستیکرد چاوانی پڕن لەو تینوێتییە بۆ مەرگ، بێئەوەی بیربکاتەوە چیدەکات، لەگەڵ ڕشتنی بانزینەکەدا وەک کەسێکی شەڕانی و چێژدیو لەم یارییە، سێ هەنگاوی سەیری بەرەو دوا نا. مەهدائیل بە بەنزینەکەوە لە ناو جێگاکەی خۆیدا وەک یەکێک لە ژێر باراندا خۆی بۆ تنۆکەکان شلبکات دەستی کردبووەوە، وەک باوەش بۆ چرکەیەک بکاتەوە کە دەبوو لە مێژە بگات و ئامێزی لێبدات، ئاوەها بوو، چاوەکانی گەش و کراوەبوون، بە درێژایی هەموو ئەو کاتە بە جووتێک چاوی کراوەوە تەنیا سەیری مەهدی دەکرد ... چاوانی وەک دوو چاڵی

قووڵ وەها بوون، دوو چاڵی تاریک و گەورە. لەو ساتەدا کە مەهدائیل شقارتە ئاگراوییەکەی بۆ هەڵدا، ماکوان بە ڕۆشنی و بۆ یەکەمجار باڵەکانی بینی، وەک بۆ یەکەمجار بفڕێت زۆر بە توندی باڵە زەبەلاح و سەیرەکانی کردەوە، ماکوان وایدەزانی کە کڵپەی کتوپڕ و شێتانەی ئاگرەکە باڵەکانی بەرەو دواوە هەڵداوە، بەڵام ئاشکرا وەک بفڕێت، جەستەی بە تینێکی بێوێنە لە ناو شاڵاوی ئاگرێکی گەورەدا بەرزکردەوە و بە گوڕمی ترسناکی ئاگرەکەوە بەرەو ڕوویان هات. ماکوان لە بەر دەرگاکەدا بوو، بەڵام وا مەست سەیری ئەو بوونەوەرە سەیرەیکرد کە بە گڕەوە بەرەو ڕوویان دەهات، بیریچوو کە هێزی کڵپەکان، باوکی بەرەو سوچێکی ژوورەکە ڕاوناوە. ئێستا مەهدائیل وەک بیەوێت لە ناو ئەم ئاگرەدا، لەم کورە گەرمەدا لەگەڵ خۆیدا یەکبگرێتەوە، وەک بیەوێت ئەوەی ساڵەهای ساڵە ترازاوە بەم ئاگرە گەورەیە بە یەکییەوە بلکێنێت، هێرشی هێنا و باوەشی بە مەهدی دەریاییدا کرد. هاوار و نەعرەتەیەکی سامناک لە مەهدی دەریایی بەرزبووەوە، هاوارێک مەلاکانی بە پرتاو بەرەو لای ژوورەکە ڕاکێشا. ماکوان وەک لەزەت لەو سووتانە ببینێت، وەک خۆشحاڵ بێت مەهدی لە ناو کڵپەکاندا بە سووتاوی دەبینێت. دەستەوەستان و سەرسام تەنیا سەیری جوانی ئەو ئاگرەی دەکرد کە بە جۆرێکی شێتانە لە هەموو شت بەردەبوو. دەریایی دەیویست بە هەموو توانای خۆی هەڵبێت و خۆی ڕابپسکێنێت، بەڵام دەستی ئاگرینی مەهدائیل تا دەهات توندتر ڕایدەکێشا. کە مەلاکان گەیشتن، لە بینینی ئەو کلافە گەورەیەی ئاگر لە دەوری دەریایی شڵەژان، ئەرسەلانی عەسکەری کە لە هەمووان بەهێزتر و چاونەترسنتر بوو، شێتانە خۆی هەڵدایە ئاگرەکەوە و بێئەوەی گوێبداتە سووتانی دەستی، لە ناو کڵپەکاندا قۆڵی مەهدی گرت و ڕایکێشا... جوڵانەوەکەی وەها خێرابوو، وەها بەهێز بوو، مەهدی لە مەهدائیل و کڵپەکانی ترازان. ئێستا مەهدائیل هەر دەسووتا، باڵەکانی بە شێوەیەکی ئەفسوناوی کڵپەیانکردبوو. بە خێرایی مەهدییان ڕاکێشایە دەرێ و لە بەردەم ژوورەکەدا کوژاندیانەوە، ئاگرەکە نیوەی سووتاندبوو، ئازاری سووتانەکە خستبوویە سەر

پەلەقاژەیەکی نائومێدانە. بە خێرایی هەڵیانگرت و بەرەو خوار دابەزین... دوا کەس کە هاتە خوار مەلا مونزیر بوو، کە یەکەیەکە هەموو ژوورەکانی گرِدا و قاتی سەرەوە بووە کڵپەیەکی ترسناک و یەکانگیری ئاگر. سووتانی مەهدی وایکرد بە پرتاو بێنە خوارێ و بەرەو لای پیکابەکە پەلەبکەن و هەوڵبدەن زووتر بگەنە بیمارستان. لە کاتێکدا کە دەهاتنە دەرێ و دەیانەویست کەشتییەکە چۆڵبکەن، دووبارە مەهدائیل لە ناو ئاگرەکەوە بە باڵە گەورەکانیەوە بە کڵپە بەرزەکانییەوە دەرکەوت، وەک بەدوایاندا بێت بە ئاگرەکەوە دەهات، چەند دەچوون مەهدائیل وەک تۆپەڵێک گڕی هار هەر دەهات. ئەوان بە ڕاکردن بەرەو دەرەوە ڕۆیشتن، دڵنیابوون هەموو فریشتەکانیان سووتاندوە، دڵنیابوون ڕێزانی مەلەکبینیان هێناوە، بەڵام مەهدائیل بە کڵپەکانییەوە نەدەوەستا و بە هەنگاوی هێمن و بەردەوام لێیان نزیکدەبووەوە ... هەموو وەک شێت سوار ماشێنەکە بوون و مەلا ئەرسەلان سلفی لێداو بە خێراییەکی شێتانە دەرچوون. لەو سەری شەقامەکە کەمێک وەستا، کڵپەکەی بینی لە دەرگای کەشتییەکە دێتە دەرێ... باڵدارێکی گەورە کە دەسووتێت و دەسووتێت و دەسووتێت، بە هێمنیش بەرەو ئەو سەری شەو دەڕوات و دەڕوات و دەڕوات تا دێتیش تاریکی زیاتر و زیاتر لە ناو خۆیدا دەیشارێتەوە و قووتی دەدات. مەلاکان بێدەنگ سەیری دیمەنەکەیان دەکرد، بە جۆرێک سەرسامبوون، بیریان لای هاوارەکانی مەهدی دەریایی نەبوو کە ژانی سووتان لەجێگاکەی خۆیدا هەڵیدەپەڕاند.

## کۆتایی بەرگی دووەم